حەمەی حەمە سەعید

# دەنگی خاڵ



## بیرەوەری

1991 ـ 2000

بەرگی دووەم

# دەنگی خاک

## بیــرەوەری
## 2000-1991

حەمەی حەمە سەعید

بەرگی دووەم / چاپی یەکەم
2020 زایینی

ناوی کتێب: دەنگی خاک

بابەت: بیرەوەری

نوسەر: حەمەی حەمەسەعید

دیزاینی بەرگ: نزار نوور

دیزاینی ناوەوە : عیرفان عەلی بەڵخەیی

نووسینی لاتینی سەر بەرگ  مامۆستا عوسمان محەمەد هەورامی

هەڵەبڕی: سەهەند محەمەد

پیتچن : نوسەر

پرۆفایلی نووسەر: کەمال نەجمەدین

بەرگ : بەرگی دووەم

چاپ : چاپی یەکەم

تیراژ: ١٥٠٠

چاپخانەی: کوردستان

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی سپاردن 1745 ساڵی 2020ی پێدراوە.

## پێشکەشە بە:

بە رۆحی هەڤاڵە شەهیدەکانم، بەهاوڕێ و هاوسەنگەرەکانم، بەدایک و باوک و خوشک و براکانم، بەحەمەسەعیدی باوک لەگەڵ هادی، بەغەریبەی دایک لەگەڵ مەهدی، بەئەدیبەو ئیقباڵ و کوێستان، بەشیروان و چنورو کۆسار، بە ئەسیری ئەسیر کراو لەسۆزی باوک، بەتۆ ئەی فرمێسکی گەش، گەشتر لەخوێنی کەیکاوس، بەنەوەکانی پڵنگەکەی دەربەنی زەوار، ئێوەی پەژموردە سۆزدارو هاوار. ئێوە هەر هەمووتان بوونە مایەی سەرکەوتنەکانم، بۆیە تا قیامەت قەرزارتانم.

بە ئێوەش جگەر گۆشەکانم، بەردەوامی خەبات و تێکۆشانم، نەیهێشت وەک پێویست بکێشم سۆزو نازتان. ئەمە وەسیەت و داوای منە بۆتان، دانیاڵ، سەریاڵ، ژیواری ژاگوار، لەگەڵ سەهەندو ساشا، ساسانی ساهر، قەد غافڵ نەبن لەڕەویەی خوشک و براییتان، قەد لانەدەن لەڕێی خزمەتی گەل و هۆز و خاک و ئاوی، بەتێکۆشان و بەوەفاداریتان.

دواجار بەئێوە، هاوژینەکانم، دایکانی غەدرلێکراو، جگەر گۆشەکانم، داوای لێبووردن لەو هەموو کێشمەکێش و ئاژاوە، تیر لەکەوان دەرچوو ناگەڕێتە دواوە.

# ناوەرۆک

# ڕوونکردنەوە

خوێنەری ئازیز، بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە، کتێبی دەنگی خاک، بیرەوەریەکانم بوو لەساڵی ١٩٧٦ بۆ١٩٩١، لەمانگی ٢٠١٦/٨ دا لەدووتوێی کتێبێکی ٧٦٤ لاپەڕەی قەبارە گەورەدا کەوتە بەردەست، چاپی دووەمی ئەم بەرگە بەدەستکاری و ڕاستکردنەوەی هەندێک هەڵەو زیادپێکردنی پرۆفایلی خۆمەوە بووەتە ٨٦٢ لاپەڕە.

دوا بابەتی بەرگی یەکەمی دەنگی خاک بەناونیشانی (دواجار گەیشتین بەئاوەدانی) بوو. ئەو بابەتە لەلاپەڕە ٧٣٩ بەرگی یەک چاپی یەکەم دایە، ناوەرۆکەکەی باس لەئامادەکاری بۆ ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ دەکات. بەم ڕستە کۆتایی هاتووە ( سەرەتا هەڤاڵەکانی خۆم لەتیپی ١١ی هەورامان گەیشتن و بەیەک شاد بووینەوە، وردە وردە ڕاپەڕین هەموو شارو شارۆچکەکانی گرتەوەو ڕزگار کران بەکەرکوکیشەوە). لەوێدا بەرگی یەکەم کۆتایی دێت.

وابەرگی دووەمیش کەدرێژەی بەرگی یەکەمەو بیرەوەری و یاداشتەکانمە، لەساڵی ١٩٩١ بۆ ٢٠٠٠، دەکەوێتە بەردەستان یەکەم بابەتیشی بەناونیشانی (ڕادیۆکەم دیارنەما) دەست پێدەکات، ناوەرۆکی بابەتەکە تەواوکردنی باسی پرۆسەی ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١.

هیوادارم توانیبێتم سودێکم بەئێوەو بەکتێبخانەی کوردی گەیاندبێ و گۆشەیەکی مێژووی گەلەکەشم، لەوسەردەمەدا ڕوون کردبێتەوە.

حەمەی حەمەسەعید
٢٠١٦/٩/٢٠
دۆڵبییان

## رادیۆکەم دیار نەما

ئەمشەو شەوی ٨ لە سەر٩ی/١٩٩١/٣ لەماڵی کاک حەمە سەعیدی مەحمودی حەمەی سان ئەحمەد شەمێرانیدا، میوان بووین، شەمێران ناوی هەڵکەوتەی جوگرافیای ئەو شوێنەیە کەکۆمەڵێک ئاوایی شەمێرانی نشینی لەخۆگرتووە، ئەکەوێتە بەری لای دەستە چەپی رووباری سیروان و لای باشووری رۆژهەلاتی دواوانی بەیەک گەیشتنی رووباری سیروان لەلایەک و هەردوو رووباری زەڵم و تانجەرۆ لەلاکەی تر. بەهۆی دروست کردنی بەنداوی دەربەندخانەوە لە دەهەی پەنجاکانی سەدەی رابردوودا، چەند ئاواییەکیان و بەشێکی بەرچاو لە لەوەرگەو مەرتەع و زەویە بەراو دێمەکارەکانیان ژێر ئاو کەوتوون، لەدوای دروست کردنی ئەم بەربەستە، هەڵکەوتە جوگرافییەکەشیان گۆڕا، بەشی سەرەکی شەمێران ئەکەوێتە دەستەچەپی باشووری رۆژهەلاتی دەریاچەکە، سێ ئاواییشیان لەوبەشە سەرەکیە دابڕاون، ئەوانیش ئاواییەکانی بانەبانان و بەشی پیرک ئەکەونە ئەمبەری پەنگاوی سیروان و بناری باشووری چیای نوەر، واتە بەری فەرمانداری هەڵەبجە، ئاواییەکی نوێشیان لەم دواییەدا لەسەرەتای دەشتی شارەزوور لەباشووری رۆژئاوایی هەڵەبجەدا بەناوی ئیمامی زامن درووست کردوە.

ئەم هۆزە یەزدان بەخشین، دیارە لەکۆچەری زووتر نیشتەجێ بوون، بەرلەتیرەکانی تری جاف، ناوچەکەشیان لەدێرزەمانەوە شوێنی ژیان بووە، ئاسەواری دێرینی قەلایەکی کۆن بەناوی قەلای شەمێران ئەمە پشت راست دەکاتەوە، سەبارەت بەناوی قەلای شەمێران و ناوچەکەو عێلەکەش (شەمێران)، چەندین رای جیاواز هەن، ، هەندێک دەڵێن لە ( شاماران) ەوە هاتووە، گوایا شاماران لەدینی میتراییدا خواوەندی مێینە بووە لەهەورامان،

ئەم بۆچوونە سەرچاوەکەی دیارنیە. هەندێکیتر دەڵێن لە (شیمە از ایران) وە هاتووە، رایەکیتر ئەوەیە لەشەش میرانەوە هاتوو[1].................تاد.

ریش سپی و دەمراستی شەمێرانیەکان، لەدەورانی عەشائیری و ئیماراتەکانی کوردیدا، لەنێوان چەندین کەسدا، دەستاو دەستی براگەورەی و ریشسپیەتی کراوە، ئەودەم دواکەس پیاوێکی عاقل و کامڵ بووە بەناوی عوسمانی خاڵە، لەم دەمەی دوایەشدا لەنەوەکانی ئەو کەسایەتیەکی ئازاو کورد پەروەرو قسە رۆیشتوو هاتووە، بەناوی حەمەی سان ئەحمەد، ئێمە ئەمشەو لەماڵی کاک حەمەسەعید کورەزای کاکەحەمە داین.

وەک پێشترو لەچەند جێگەدا ئاماژەم پێداوە شەڕی براکوژی کوردو تەفرەقە، بنەماڵەو هۆز نییە لەم کوردستانەدا نەیگرتبێتەوە، باڵی راست و چەپی کوردایەتی و شۆڕشی ئەیلول شەمێرانییەکانی کردە دووبەرەو خوێن ڕشتن کەوتە نێوانیان، هەرچەندە ئێمەی کورد ئێستاو دوای پەنجا ساڵ، لەوبارەوە خاوەنی تاڵترین یادەوەری و ئەزموون گەلێکی زۆرین، بەڵام بەهۆی دواکەوتویی و وەرنەگرتنی دەرس و پەند لەنەهامەتیەکان و چەند بارە خۆفرۆشتن بەدوژمنەکانمان بۆیەکتر شکاندن، ئێستاش و هەرسات مەترسی چەند بارەبوونەوەی ئەو شەڕە دوور نییەو لەئارادایە. تائێستاش زەمانەت و وزامنی چەندبارە نەبوونەوەی شەڕی ناوخۆمان نییە.

ساڵی ١٩٧٩ هەموو جەماوەریی ئەم ناوچەو شەمێرانییەکان کۆچ پێکران لەلایەن رژێمی بەعسەوە بۆ ناوکۆمەڵگە زۆرە ملێکانی سیروان و عەنەب و زەمەقی، لەدەشتی هەڵەبجەدا نیشتەجێکران .

ئەم شەو دوای نان خواردن لە پێشوازی میوانەکاندا بووین، خەڵک بەلێشاو روویان لەماڵی کاک حەمەسەعید کردبوو، بەجۆرێک سەر قاڵ بووین نەمان ئەزانی وەلامی کێ بدەینەوە، خەڵک داواکاری و پرسیاری جۆراوجۆریان هەبوو. هەندێکیش دەهاتن و دەچوون و ئەیان ووت: هاتن،

---

[1] بۆزانیاری زیاتر لەم بارەوە بروانە : ا- هەکبەو هەوارگە، ئەیوب رۆستەم، ل ١٠٨.
گۆڤاری هەورامان، ئەیوب رۆستەم ل ٣٦.
ب- چەردەیەک لەمێژووی عەشیرەتی شەمێران، ئارام مەجید عەلی، ل١٦ -٢٢.

بردیان، گرتنیان، تالانیان کرد، سوتاندیان، ئەیانکوژن، رایانکرد، فریاکەون، بابیان هێنین بۆ لاتان، چیبکەین؟.........تادوای .

لەوەلامی ئەو هەموو پرسیارو ژاوەژاوەدا، هەولم ئەدا وەلامی هەموو لایەک بدەمەوە، ئەوەندەی کرا ئەمشەو ئیشوکارەکانمان راپەراند، ئەمویست بەرێزەوە هەمووان رایی بکەین و کەس نیگەران نەبێت. ئەوەندە سەرگەرم بوو بووین، کاتێک خاوەن مال پرسیاری کرد ئەرێ ناخەون؟ ئەبینین کاتژمێر چواری بەیانییە، ئەمە یەکەم شەوە بەئازادی لەناو جەماوەردابین، هەڤالەکانی تریشمان لەرەتلی شارەزوور، بەشێکیان لێرە لەهەلەبجەی تازەو ئەوانی تریان لەزەرایەن و نەسرو باریکەو عەربەت، هەروەک ئێمە نەخەوتوون و سەرقالی ئیشوکار بوون، لەوانە کاک حامدی حاجی خالی، کاک جەمیل هەورامی، کاک فەلاحی حەمەبۆر، کاک ئەکبەر ئێناخی کاک جەلال کولکنی، مەلا ئەحمەدی دسکەرە و کاک سەردار ناوتاقی...........تاد .

بەرلەوەی بچین بۆ خەوتن، دەستم دایە کۆلە پشتەکەم کەلە پەنا دامنابوو، ویستم رادیۆ چکۆلەکەم دەرکەم، بەلام دیارنەمابوو، ئەم رادیۆ لەشاخ نزیکەی پێنج سالە پێم بووە، ئەمشەو بردیان، برێک ئەملاو ئەولام کرد کاک حەمەسەعید پرسی چیت ئەوێ؟ ووتم رادیۆکەم دیارنەماوە، بانگی کرد کێ ئەو رادیۆی بردوە؟ کەس وەلامی نەدایەوە.

چەند کەسێک لەولاوە پێدەکەنن، یەکێک لێیپرسین لای ئێوەیە؟ ووتیان نەوەلا ئێمە بۆ؟ ئەرێ برا ئەوهەموو دزە ئەمشەو هاتن و رۆیشتن خوا ئەزانێ کامیان بردویانە، مەبەستی چەکدارەکانی رژێم بوو. کاک حەمەسەعید زۆری پێناخۆش بوو، شەهید نیازی لەپەناما بوو بەهەورامیانە ووتی (مەلە سەرشەنە) واتە لەسەری مەڕۆ، منیش ووتم کاک حەمەسەعید گوێ مەدەرێ رەنگە ئەمرۆ لێم کەوتبێ، خۆشم نازانم تاکەی پێم بووە.

خاوەن مال ووتی هەستن بێنە ئەم دیوە بخەون، چووین بۆ (دیو- ژور) ێکیتر، کاتێک هەستاین حاجی جەمالی برای کاک حەمەسەعید دەستی نیازی گرتوو ووتی تۆ دوو سێ میوانی تایبەتت هەن، دەمێکە چاوەڕێن لەو ژورەی ئەو دیون تازە ئەوانیش بەرێکەن، نیازی لەگەل حاجیدا رۆیشت، ئەوەندەی نەبرد نیازی هاتەوە، دەم و چاوی گرژو تورەبوو، پرسیم چیە؟ چی رووی‌داوە کێبوون؟ ووتی نازانم، ئەو جەماعەتەن، دوژمنەکانی مالی

حاجی محەمەدی عەبابەیلی، هاتون داوا دەکەن بێن لەگەڵ مندابن، من نایانناسم جوابم کردن، منیش ووتم وەرە بخەوە ئێوە ماندوون ئەمڕۆ بەدرێژایی ڕۆژ بەڕێوە بوون. ووتی نەڕۆیشتوون لەودیو چاوەڕیی تۆ دەکەن دەڵێن با دووقسە لەگەڵ کاک حەمەدا بکەین، بڕۆ بزانە چی دەڵێن، باشە، هەستام چوومە لایان سێ پیاو بوون، چاکوچۆنیم لەگەڵ کردن و ووتم فەرموون.

یەکێکیان دوای چاکوچۆنی و بەخێرهێنانی پێشمەرگەو پیرۆزبایی ڕاپەڕین، سەری قسەی دامەزراندو ووتی: هەرچەندە ئێوە ماندوهیلاکن، بەڵام بەزەرورمان زانی باسی ئەوکێشەمان بکەین، ووتی ئەوانە بەناحەق کوڕیان کوشتوین....... یەکسەر قسەکەم پێبڕی و ووتم ئەزانم و تێگەشتم کێشەتان هەیە لەگەڵ ماڵی حاجی محەمەدی عەبابیلێ. دیارە ئەو چەند کەسەی لەماڵی حەمەسەعید من بینیمن و قسەمان کرد خزمەکانی کوڕە کوژراوەکەی عەبدولی ئەمن بوون. (من نەم ئەزانی ناوەرۆکی کێشەکەیان چیەو چۆنە بەڵام دواتر لەچەند کەسێکم پرسی ئاوایان بۆ گێڕامەوە (شێخ سەباحی شێخ عەبدلکەریم فەرماندەی فەوجی سوک بووە، کوڕێکی ئەم بنەماڵە، ماڵی عەبدولی ئەمن، لەو فەوجەدا مەفرەزە یان سریەی هەبووە لەسەر پارەو موچەی چەندکەسێک، کێشە لەنێوانیان دا دروست ئەبێت، سەرئەنجام کوڕەکەی عەبدول ئەکوژرێ، گوایا کوڕەکانی حاجی محەمەد کوشتویانە، حاجی محەمەد خاڵی شێخ سەباحە) .

بەڵی پێم ووتن: ئێوە پێتان وایە ماڵی کاک نیازیش لەگەڵ هەمان ئەوخزماندا کێشەیان هەیە، ئەتانەوێ بێن لەگەڵ نیازیدابن، ئەوە شتی وانابێت، پێم ووتن کاکە ئەوە کێشەی کۆمەڵایەتیی و عەشایرییە، ئەبێ ئێوە هەوڵی چارەسەر کردنی کێشەکەی خۆتان بدەن، نەک کردنەوەی بەرەیەکی دوژمنایەتی، ئەوە بەرەی کوردستانی لێبووردنی گشتی دەرکردووە، ئەمە بۆلایەنە سیاسییەکان و هاوکارانی ڕژێم و هەموو ئەو کوردانەیە خیانەتیان لەگەڵ و شۆڕش و کوردایەتی کردوە، بەڵام ئەوانەی خەڵک سکاڵای هەیە لەسەریان دەبێت ئاشتەوایی کۆمەڵایەتیی بکەن، یان مافی ماف خوراو بگێڕنەوە، کوڕانی حاجی ئێستا سەربەلایەنێکی سیاسین، ئێوە ناتوانن لەگەڵیان دەرگیربن باوەڕناکەم ئەوانیش بەبێ پرسی حزبەکەیان ئێستا بێن

لەگەڵ ئێوە دەرگیربین. بۆیە ئێوە ئەتوانن بچن کێشـەکەتان بەکۆمەڵایەتیی چارەسـەر بـکەن، مـاڵی کـاک نیـازیش خـەریکی چارەسـەر کردنـی کێشـەی خۆیانن ئێوە وابیرمەکەنەوە ماڵی کاک نیازی بەتەمای دەستەی دوژمنایەتی دروست کردنبن، بڕۆن خواتان لەگەڵ.

هەموو هەستاین، ئەوان خواحافیزیان کردو کاک حەمەسەعید خەریکی ڕەوانەکردنیان بوو، منیش هەستام و چوومەوە دیوی خەوتنەکەو بەنیـازیم ووت بـخەوە جوابم کردن، لەسـەر جێگاکەم ڕاکشـام نەمئەمتوانی بـخەوم، مێشکم جەنجاڵ بوو، بەبیرو لێکدانەوەی جیاواز جیاوازو جۆراو جۆر، ئاخۆ هێزەکانی سنووری پشدەرو بتوێن دوای گرتنی رانیەو چوارقوڕنە ئەتـوانن بەرەو شـەقڵاوە، کۆیە، هەولێرو دهـۆک بڕۆن؟ سـەرکردەکان بـزانن نـابێ ساردببنەوە، دوژمن لەکاتی شکاندا نابێ مۆڵەتی بدەی خـۆی ڕێکبخـاتەوە؟ ئایا قۆڵی سلێمانی لەدەربەنی چەرمۆ (بەردە قارەمان) ئەچەقن یان پێشرەوی بەرەو چەمچەماڵ دەکەن؟ ئەمانە ئەو پرسیارانەن خۆم لەخۆمیان دەکەم.

ئەی کەرکوک بەئاسـانی ئەمریکـا دەسـت بەرداری دەبێت بکەوێتە دەست کورد؟ رەنگە مام جەلال و کاک مەسعود لەگەڵ هاوپەیمانان هەموو شتیان بڕیبێتەوە؟ ئەگەر وابێت تەنها بەغداو ناوەراست بەدەستەوە عێراقەوە ئەمێنێت. تۆبڵێیت ئێران بەیانی بەفرسەتی بزانـێ هێز بهێنێتە سـەرکۆمەڵەو دیمـوکرات لەوشـوێنانەدا دوێنـێ و ئەمـڕۆ ئـازاد کـراون؟ ئەی چارەنوسـی موجاهیدین چی لێدێت؟ رەنـگە هەرێمەکە ببێتە مەیدانی جەنگێکی گەورە؟ ئەگەر ئێران ئەوە بکات، تورکیا دوای ئێران دێتە نـاوەوە، دواجـار بەخـۆم دەڵێم نا ئەمانە هیچی ڕوونادا ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لێرەن.

لەم بێنەو بەرەی جەنجاڵی مێشکدا چاوم هەڵبڕی بۆسەر دیواری لای دەستی چەپم، بینیم ڕووناکی ئاسۆ لەدەلاقەی لای ڕۆژهەڵاتی ئەو ژوورەوە کەتێیدا خەوتووین کەوتوەتە سەر دیوارەکە، ڕۆژهەڵهات و سەرەتای ڕۆژێکی نوێیە کەدەکاتە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٨.

ڕۆژی١٩٩١/٣/٨ بەڕۆژی ڕاپەڕینی شارەزوور دیاری کراوە، ڕاستە ئەمڕۆ بەتەواوەتی سەربازگەکان و مۆڵگەکانی سوپای عیراق لەدەوروبەری شـارۆچکەکان و کۆمەڵگاکـانی شـارەزوور بەتـایبەت لەسـەر شـاخەکان و بەرزاییەکان کۆتاییان هاتوو تەسلیم بوون، ئەگینا ئێمە سەرلەبەیانی ڕۆژی

١٩٩١/٣/٧ مەفرەزەکانی پارتیزانی لەگەڵ خەڵکدا دەستمان گرتبوو بەسەر کۆمەڵگاکانی باریکە و نەسر و شارۆچکەکانی عەربەت و زەڕایەن و هەڵەبجەی تازەدا.

هێزەکانی بەرەی کوردستانی بەتایبەت یەکێتی و سۆشیالیست ڕۆژی ٣/٧ هاتبوونە خوارەوە، عەسرو ئێوارەکەی گەیشتبوونە لامان، ئێمە مەفرەزە پارتیزانەکان لەگەڵ خەڵکەکە سەرلەبەیانی ڕۆژی ٣/٧ شارۆچکەکان و کۆمەڵگاکانی سنووری شارەزوورمان تاپاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ پاک کردبووەوە، هەموو ئیدارە و بنکەو بارەگاکان پاسەوانمان بۆ دانابوون، سەر لەئێوارەش هێزەکانی خۆمان گەیشتبوونە لامان، بۆیە لەڕاستیدا ئەبووایە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٧ یادی ڕۆژی ڕاپەڕینی شارەزوور بووایە، نەک ڕۆژی ١٩٩١/٣/٨.

ئەمڕۆ ١٩٩١/٣/٨ ئەوەندە کێشەو گرفت و ئیش زۆر بوو، نەمان ئەزانی لەکوێوەو لەچیەوە دەست پێبکەین، تالان و شرەخۆری لەشەوی٧ لەسەر٣/٨ دەستی پێکردوە، تازە تالان و برۆ کۆنترۆڵ نەدەکرا، ئەو قەرارو بڕیارو نەخشە ڕێگایەی بەرەی کوردستانی لەئێران دایدنابوو، تەنها یەکەم ڕۆژ ئێمە کارمان پێکردبوو، ئەویش لەبەر ئەوە خەڵکەکە ئەترسا، دڵنیا نەبوون لەوەی ڕاپەڕینەکە سەربگرێ. نەیان ئەوێرا دەست بۆ هیچ بەرن. ڕۆژی دوایی کەخەڵک دڵنیا بوون هێزەکانی ڕژێم چەککران و بڵاوەیان لێکرد، ئیتر قەرارو بڕیاری بەرە شکاو کۆتایی هاتوو تالان و شرەخۆری دەستی پێکرد.

بۆنموونە: بڕیار وابوو دەست لەئیدارەکانی دەوڵەت نەدرێ سەروسامانی گشتی بپارێزرێ، کەچی دوای دوو ڕۆژ، هیچ بەسەر هیچەوە نەما، جەماوەریی ناوچەکە ئاویان لێبڕا لەبەر ئەوە تەنکەرەکانی ئاو دابەش کردن برابوون و هەڵدەوەشێنران، کارەبا نەما لەبەر ئەوە محاویلەکان داگیرا بوون و مس وفافۆنی ناویان دەرئەهێنان، شوێنی بارەگاو کارکردن بۆ حزبەکان نەمابوو چوونکە کورسی و قەنەفەو دەرگاو پەنجەرەی ساختمانەکان دەرهێنراو بران.....تاد .

بەلای منەوە ئیشی زەروور ئەمڕۆ، یەکەم: ئەوەبوو، سەدان کارمەندی ئیدارەکانی ئەمنییەت کەعەرەب بوون لەلایەن کوردە هاوکارەکانیان و هەتا

خەڵکی سادەو کورد پەروەریشەوە لەماڵاندا پەنادرا بوون، بدۆزرێنەوە. بەرپرس و کارمەندە ئەمنەکان یان فەرماندەکانی عەسکەرو پۆلیسی عەرەب روویان دەکردە ماڵی هەرکەس، بێ ئەوەی خاوەن ماڵ پەیوەندیشی هەبێ لەگەڵ رژێم، تاوانبارو خۆفرۆشانیان ئەشاردنەوە، ئەوەیە دەڵێن کورد، بەبەزەییە، ئەوەش هەبوو خەڵک دڵنیا نەبوون بەعس بەوئاسانیە بڕواو بەجێبهێڵێ، هەرچەندە رەتڵی گەریمان لەخوارەوە رێگای شارەزوور بەغدای کۆنترۆڵ کردبوو لەباوەنورو کەلارو مەیدان، لەولاشەوە لەلای رۆژئاواوە رێگای سلێمانی کەرکوک لەلایەن رەتڵەکانی تری شارباژێرو سلێمانی و کەرکوکەوە بڕابوو. بەڵام هەندێک هەر لەهەوڵی دەربازبووندا بوون، بەتایبەت کوردە خۆفرۆشەکان، ئەوانەی نەیان توانی کەڵک لەلێبووردنە گشتیەکەی بەرەی کوردستانی وەرگرن.

دووەم : بەشێکی بەرچاو چەکداری کوردو ئەفسەری عەرەب و ئەندامانی ئیدارە ئەمنییەکان لەشارەزوورەوە هەڵهاتبوون لەدەربەندیخاندا کۆبووبوونەوە پەیوەندی نێوان رەتڵەکەی شارەزوورو گەرمیانیان بڕی بوو ئەوگرفتەش یەکێک لە ئەولەویاتی(بەرتریني) کارەکانی ئەمڕۆمان بوو، زوو کۆتایی پێبێت و دەربەن کۆنترۆڵ بکرێت.

ئەمڕۆ ئێمە لەهەوڵی دۆزینەوەی برادەراندا بووین بەتایبەت هەیئەتی باڵای رەتڵەکە، رەتڵی شارەزوور، لەوانە کاک عەلی شێخ حەمەسالح، کاک حامدی حاجی خالید کاک جەمیل....تاد، بۆئەوەی لەگەڵ کاک فەرەیدون عەبدلقادر، کاک شێخ جەعفەر،.......تاد، پەیوەندی بگرن و ئاگادارمان بکەنەوە بەرنامەی رۆژانی دواترو داهاتومان چیە؟ بەڵام زۆربەیان دیارنەبوون یان ئیشی تریان بۆدیاری کرابوو، یان هەریەک بەلایەکدا رۆشتبوو دەرکەوت تەشکیلاتەکەش کەلەئێران بۆ هێزەکان و محوەرو بەتالیۆنەکان کراوە لەچەند شوێنێکدا هەڵوەشاوەتەوە، ئەوەبوو دواتر خەڵکو پێشمەرگەو چەکدار بەنامنەزەمی بەرەو دەربەنیخان چوون و ئەوێش جاشکەلی لێنەماو رەتڵەکانی گەرمیان و شارەزوور لەیەکیان دایەوە.

جاش : پێشتر باسمان کردوە جاش کێیە؟ لەفەرهەنگی عەمیددا دەڵێت جاش واتە گەنمێک لەخەرماندا پاک کراوە یان ئەنباری گەنمی پاککراو، لەفەرهەنگی هەمانە بۆرینەدا دەڵێت بەمانای عەقدی نیکاحی کاتی دێت.....

بەلەهجەی هەورامیانە بەجاش دەڵێن: هۆڵییەر، واتە بەچکەی کەر، بەسۆرانیش تەمەنی ساڵێک زیاتر بێت پێی دەڵێن جاشەکەر، یان ئەگەر لەخوار ساڵێکەوە بێت پێی دەوترێت جاشولکە، ئەم ووشە بۆ کوردی چەکداری بەکرێگیراو بەکاردێت. بۆ ئەوکوردانەی چەک هەڵدەگرن بۆ دەوڵەتانی داگیرکری کوردستان و بەدژی گەلی خۆیان شەڕ دەکەن.....تاد.

ئەم ووشە کەی هاتووەتە نێو ئەدەبیاتی کوردی و بۆچی بۆ کوردی خائین و خۆفرۆش بەکار هاتووە؟ دیار نییە. کاک مەسعود بەرزانی لەکتێبی بیرەوەریەکانیدا، دەڵێت باوکم ئامۆژگاری ماجد مستەفای کردوە پێی وتوو ئەگەر پیاوی باش نەبیت و خزمەتی گەلو وولاتەکەت نەکەی پێت دەڵێن جاش وەزیر. لەدوای ڕەشبگیریەکەی ٩ نۆی حوزەیرانی ١٩٦٣ لەبلاو کراوەیەکدا شعرێک بەناونیشانی جاش بلاو بووەتەوە بەبێ ناوی خاوەنەکەی دەڵێن هی مامۆستا برایم ئەحمەدە،( هەی جاش هەی جاش جاشی عەفلەق پیسی زیانداری گوێ لەق.......تاد ) ئێستا دەیان جۆر جاش هەیە هەر خزمەت کردنێکی دوژمن ئەچێتە خانەی جاشایەتی، بۆنمونە جاش قەڵەم، جاش شەعبی.....تاد، دوژمنانیش لەبەرانبەر وشەی جاشدا بۆ بەکرێگیراوەکانیان چەندین وشەی جۆراوجۆریان بەکار هێناوە، وەک سوارەی حەمیدی فرسان سەلاحەدین.......تاد.

بۆ ناوی جاش خراوەتە سەرئەوانەی کەخزمەتی بێگانە و دوژمنان دەکەن؟ ئەویش ڕوون نیە، مەسعودی بابائی دەڵێت لەبەر ئەوەیە، جاشەکەر خەریکی شیرمژینی دایکەکەیەتی دوای تێر خواردن، هەڵدەبەزێتەوەو دەپەڕێتە کۆڵی دایکەکەی، لەکوردەواریدا نیکاحە کاتیەکە، پێیدەوترێت، مارە بەجاش، بەهەورامیانە پێی دەوترێت، خوڵ کردنەوە، ئەمە بۆ ئەو ژنانەیە کەپیاوەکانیان تەلاقیان دەکەوێ و چاک ناکرێتەوە. مەلاکان ئەوژنانە مارەدەکەن لەپیاوێکیترو دوایی ئەوپیاوە تەلاقی ژنەکە ئەداتەوەو مەلا مارەی دەکاتەوە لەپیاوەکەی خۆی. لەوە ئەچێت مادام ئەو کوردە بەکرێگیراوە لەبەرامبەر پارەدا، خیانەت دەکات، کاتێک پارەیان نەدایە وازدەهێنێ، ئەویش عەقدی کاتی کراوە، واتە جاش. مامۆستا مەلاتاهری بامۆکی دەڵێت مارە بەجاش، بنەمای شەرعی نیە وەک ئەوەی کە لەلای ئێمە باوبووە، لەڕابوردودا، بەلام دەکرێت

پیاوێک ژنەکەی تەڵاق بداو کەسێکی تر مارەی بکات، ئەگەر ئەوپیاوەش تەڵاقی دایەوە، پیاوە کۆنەکەی بۆی هەیە مارەی بکاتەوە.
رایەکیتر هەیە کەمن بۆخۆم ئەمەیان بەڕاستر دەزانم، ئەویش ئەمەیە: جاش لەکوردیدا دوو مانای هەن، یەکیان ئەوەیە بێچوی ماکەرە، ئەویتریان ئەوەیە کە بۆماوەی یەک شەو ژنێکی تەڵاق کەوتوی لێمارە دەکەن بۆئەوەی بەیانی تەڵاقی بداتەوە و دوای تێپەڕبوونی عیدەی شەرعی لەمێردی پێشوی مارە بکرێتەوە. جاش بەهیچکام لەو دوو مانایەدا هەڵگری سیفەتی خیانەت نیە.
داستانی بەکارهێنانی ووشەی جاش بۆ سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول دەگەڕێتەوە، ئەودەم سەرەتا بەکوردە چەکدارەکانیان دەگوت (جاش پۆلیس) ئەویش بەمانای زرە پۆلیس دەهات، چوونکە ووشەی(جاش) لەعورفی کوردیدا بەمانای زڕ دێت، بۆ وێنە بەباڵتۆی کورت دەڵێن ( جاش باڵتۆ). دواتر بەشی هەرە زۆری جاش پۆلیسەکان بوون بە پێشمەرگە، ئەوانە نارەزایەتیان نیشاندا کەبۆ بەوخایێنانەش دەڵێن جاش پۆلیس، ئەمەیان بەسوکایەتی بۆخۆیان دەزانی، لەبەرئەوە ووشەی پۆلیسەکەیان لابردوو، ناویان نان جاش، لەوێوە ئەو ناوە لەسەر کوردی خائین دانرا، ئیتر ناوەکە بوو بەهەڵگری مانای کوردی خائین و خۆفرۆش.

بەڵێ بابێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، خەڵکی خرۆشاون، زەماوەندە هەمووکەس شادە، پیرۆزبای کردنە لەیەک، بۆ ئەم جەژنی سەرکەوتنە، بەعسی قڕانە، کورد ئەمەی نەدیوە بەخۆیەوە خەڵک بڕواناکەن، وائەزانن ئەمە خەوە، خەیاڵە، ئەم ئازادییەی دوای دەیان ساڵ لەژێر دەستەیی، چەوسانەوە و داگیرکردن، ئەنفال، کیمیایی، کوشتن و بڕین، زیندان و ئەشکەنجەو سێدارە. ئای ئەمە سەدام و بەعسن وازەلیلن؟ ئەمە سوپا زاڵم و داگیرکەرەکەی سەدامە واداتەپیوە، بەلێشاو خۆیان تەسلیمی ژن و منداڵی پاشماوەی ئەنفال و کیمیاوییباران دەکەن.
ئەوەتا ئەو دەبابانەی بەگوللەی تۆپەکانیان گوندەکانی کوردستانی پێ تۆپباران و تەخت و وێران دەکرا، منداڵانی کورد لەسەریان یاری دەکەن و وێنە ئەگرن، ئای ئەمە ئێوەن کارمەندانی ئەمن و هەواڵگری چەند رۆژ لەمەوبەر ماڵان ئەگەڕان و خەڵکتان بەزۆر ڕاپێچی بەرە فشۆڵەکانی جەنگی

خۆتان و هاوپەیمانان دەکرد؟ ئێستا کونە مشکتان لێبووەتە قەیسەری، کوا بەرۆح و بەخوێن بەفیدای یاسەدامتان؟.

بەڵێ وا مێژوو دووبارە دەبێتەوە، وەلامەکەی خەسرەو پەروێزە لەئەکباتانەوە:

زشیر شتر خوردن سوسمار را
عرب بجای رسانید کار
باتخت کیانی کنند ارزو
تفو با چرخ گردون سد تفو

رەگەز پەرستانی شۆڤێنی عەرەب، ئارەزوی تەختی ئەردەلان وبابان و بادینانتان هەبوو؟ دەبۆ ئێوەش تفو سەد تفو، نەک بۆ چەرخی گەردون. سلاو درودیش بۆتۆ هەر لێرە هەتا فارس ئەی محەمەد شەمسەدین (حافز)، راستت فەرمووە:

دور گردون گر دو روزی برمراد ما نرفت
دایما یکسان نباشد حال دوران غم مخور

بەڵێ دەوری گەردوون گەڕاو رۆژێک بەکامی گەل و شەهیدەکانی ئێمە نەبوو، بەلام وائەمڕۆ پێشهات.

ئەی ئێوە، هەی بەکرێ گیراوانی ئەنفالچی پاڵەوانانی کۆکردنەوەی کیژۆڵەو مێرمندالان، پیرو پەککەوتەو پیرە ژنان، لەئاواییەکانی کوردستان و تەحویل دانیان بەئاغا سەرشۆڕەکانتان، ئەی ئێوە هۆهۆ کوردە خۆفرۆش و بەکرێ گیراوەکان، قارەمانانی دزین و بەتالان بەرانی قەل و مریشکە بەکرو جوجەڵە، ئێوەش بەلەعنەتبن و جەهەننەم نیوەی ڕێتان بێت.

هەر ئەمڕۆ من لەگەڵ چەند هەڤاڵێکدا بۆ چەند کاتژمێرێک نیوەڕۆ دوا چووینە سلێمانی بۆ بینینی ئەو هەڤالانەمان لەزیندان رزگار کرابوون، چوونکە ئاگادار کرابووین چەند کەسێکیان شەهید کراون، ئێمە ڕۆیشتین و بەلام بەخۆشحالیەوە وادەرنەچوو بینیمان هەموو سەلامەتن. کاک ئەکبەریش لەهەڵەبجەی تازەدا خەریکی کۆکردنەوەی هەڤالانی تیپەکەمان بوو .

کەگەیشتینە ناوشاری سلێمانی تەنها توانیمان بەهمەن حەمەرەشیدو عوسمانی سۆفی حەمەکەریم ببینین بەناوی خۆمان و هەڤالانی تیپی ١١ی هەورامانەوە خۆشحالی خۆمانمان بۆ دەربڕین، کاک سەردار حەمەسالح و

ئەوانیترمان نەدۆزینەوە، بەبەهمەنم ووت ئێمە ناتوانین بمێنینەوە هەر بۆلای ئێوە هاتووین چوونکە دەنگوباسی شەهید بوونتان بلاو بووبووەوە، بەخۆشحالیەوە وا ئێوە سەلامەتن، ئەگەر بۆتان کرا بەیانی سەردانمان بکەن لەهەڵەبجەی تازەین، ئەگەر هاتن بەڵکو هەڤالان م. عەبدوڵا بەڵخەیی، سەردار حەمەسالح، عەبدولای حاجی عەلی و بەهجەتی برایشی لەگەڵ خۆتاندا بهێن؟ ووتی چۆن بیان دۆزمەوە؟ ووتم نازانم ئەگەر بچیتە ئەسحابە سپی، بپرسی ئەیان دۆزیتەوە.

ئەسحابە سپی ناوی بازارو مەحەلەیەکە لەناو شاری سلێمانیدا، شوێنەکە دوو گۆڕی لێیە، لەسەرەتایی بنیاد نانی شاری سلێمانیەوە، لەساڵی ١٧٨٤ بەدواوە خانوو دوکانی پیشەگەرانی لێدروست کراوە. ئێستا ناوەڕاستی شارو شوێنێکی قەرەباڵقە، شوێنی کۆبوونەوەو یەکتر بینینی هەڵەبجەیەکان و هەورامییەکانە، بەر لەڕاپەڕین لەو شوێنەدا بەردەوام پیاوەکانی بەعس و خۆفرۆشەکان، بەدوای خەڵکدا ئەگەڕان، ئەو هەڵەبجەیی و هەورامیانەی لەخۆیان ئەترسان نەئەوێران زۆر خۆیان لەئەسحابە سپیدا دەرخەن، یان ئەیانگرتن یان پیاوەکانی ئەمن و تەواری سەرانەیان لێ ئەسەندن. بەڵام لەرۆژی راپەڕێن و رزگاربوونی سلێمانییەوە، ئەم شوێنە بوو بوو بەمەیدانی کۆبوونەوەو خۆدەرخستن و یەکتربینینی خەڵکە دڵسۆزو کورد پەروەرەکە ، ئەوجا ئەوانەی پێش راپەڕین، کە جاسوس و پیاوی حکومەت بوون و خەڵکی هەڵەبجەو هەورامان بوون، ئەوان نەئەوێران لەو شوێنەدا خۆیان دەرخەن. بەداخەوە دوای ماوەیەک و بەهۆی ململانێی پارتی و یەکێتییەوە، چەندین کەس لەوانە ئێستا لەناو لایەنەکای پارتی و یەکێتیدا یان بەرپرسن، یان خانەنشین، ئەوەندەش بێشەرمن ئەوان کوردایەتی بەخەڵک دەفرۆشنەوە.

کاتێکمان زانی خەڵکێکی زۆر لەدەورمان پورەیان داوە هەرکەسەو گرفتێکی هەیە، داوا دەکەن ئیشیان بەئێمەیەو لەکوێ و چۆن بمانبینن بەتایبەت هەڵەبجەییەکان و هەورامییەکان ؟ .

خەڵکی ناوچەی هەورامان لەدوای ساڵی ١٩٨٠وە لە هەڵگیرسانی شەڕی عێراق و ئێرانەوە ئاوارە بوون و لەزێدی باوباپیرانیان هەڵکەندران، جەماوەرەکە دابەش بووبوون بەسەر شارەکانی سلێمانی و هەڵەبجەدا. دووبارە لەبەهاری ساڵی ١٩٨٨وە لەکاتی کیمیاباران کردنی هەڵەبجەدا

زۆربەی زۆری خەڵکەکە شەهید بوون یان کۆچیان کرد بۆ ئێران، بەشێکی تری جەماوەرە ئاوارەکەی هەورامان لەگەڵ کۆمەڵێک لەهەڵەبجەییەکان ئاوارەی سلێمانی بوونەوە.

ئەم جەماوەرەی ئەمڕۆ لەسلێمانی هاتوون بۆ پێشوازی و بەدەستهێنانی هەواڵ و زانیاری لەسەر ڕاپەڕین و بارودۆخەکە زۆرترینی هەورامییەکان و هەڵەبجەییەکانن، کەزۆربەشیان یەکێتی و لەڕابووردداو و لەجێگەی خۆیاندا هاوکارو یارمەتی دەرمان بوون. ئەوانە لەسلێمانیش بۆ بەشداری لەم ڕاپەڕینەدا دەوری کاریگەرو بەرچاویان هەبووە، لەرۆژی ١٩٩١/٣/٧دا چەندین کوڕی قارەمانیان شەهیدبووە، لەوانە مەریوان حاجی حەمەسالح تەوێڵەیی و عادل خالید ئەحمەد، لەهەڵمەت بردنە سەر حامییەی شاری سلێمانیدا شەهید کران.

ئێمەش پەلەمانەو داوای مۆڵەتمان کرد پێمان ووتن لەشارەزوورین، بەرەی کوردستانی چەند رۆژێتر بارەگا چێدەکەن لەناوشاری سلێمانی خەڵک ئەتوانێ پەیوەندی بەوێوە بکەن. لەوێ دەرچووین بەلای ئەمنەسورەکەدا هاتینە خوارەوە، بینیمان لەدەرگاو دەلاقەکانییەوە سوکە تەپەدوکەڵی کۆتای ئاگری خامۆش بوو، دود ئەکا. ساختمانەکەش ستارەو قوللەو گۆێسوانەکانی سواو داخوراو داڕزاون، نما و رووی دیوارەکانی بوونەتە کەم (سەرەنگ)، هەزاران گوللەو ساچمە نەخشی خۆیان لەسەری نەخشاندوە، ئێستا ئەو بینایەی جەلادەکان کە بە ئەمنەسورەکە ناسراوە، لەدەرەوە لەکێوێکی کۆنەساڵی سروشت داڕزاندو دەچێت، لەناوەوە کراوەتە مۆەخانە.

کاتێک لەوێوە نیگا ئەدۆرێنم بەرەو سەرزەوی، بەلای راستدا بۆ سەرشەقامەکە راست بەرامبەر بەدەروازەی سەرەکی، لێژە کەلاکی بۆگەنی کارمەندانی بەسزای گەلوشۆڕش گەیێنراو ئەبینم، لەسەریەک هەڵچنراون، خەیاڵم دەروا، نەرمە باران خوێنی گلاویان لەسەر رووی شەقامەکە دەشواتەوە، سێلاوی قاوەیی دێز سەرەو خوار ملی ناوە تاشیواوشیو دۆلاو دۆل بگاتە رۆخانەو خاکی پیرۆزی کوردستان بخاتە پشت سەرو بگاتەوە بەتکریت و عوجە. بەڵێ ئەمەیە نیشانەی هێزی گەل، خەیاڵ بەرم ئەداو بڕۆکاکە بۆ وەستاوی؟ شۆفێرەکە، کاکە حەمە رێگەکە گیراوە، دەور بدەرەوە، لەکۆلانێکی تەنگەبەرەوە دەرچوین و هاتینە سەر راستە شەقامی سالم و

لەشار چووینە دەرەوەو بەرلەتاریک بوون، گەیشتینەوە لای شێرە کوڕانی ١١ی هەورامان لە (حلبجە سەدامیە) قەزای شارەزوور.

بەڵێ لەڕۆژی١٩٩١/٣/٧ وە تارۆژی ٣/١٢ بۆماوەی پێنج ڕۆژ لەناو ئەم شارەو شارۆچکەی زەڕایەن و کۆمەڵگەی نەسردا، تیپی ١١ی هەورامان، خەریکی ئیشوکاری بووین، ئیشوکاری وەک دۆزینەوەو گرتنی ئەوتاوانبارانە کەخۆیان رادەست نەکردبوو، کۆکردنەوەی ئەوچەکوتەقەمەنیەی لەماڵاندا یان لەبارەگاو ئیدارەکاندا بوو، چارەسەر کردنی کارەکۆمەڵایەتیەکان و دانانی بارەگای بەرەو زیاتر رێکخستنەوەی هێزەکەو وەرگرتن و ناونووس کردنی ئەوانەی ئەبوونە پێشمەرگە .......تاد. ڕۆژی ١٩٩١/٣/١٢ ناوچەکەمان بەجێهێشت کەوتینە رێ بەرەو کەلارو کفری.

## حەرەکەتی بێ حەرەکەتن

سێ ڕۆژ بەسەر ڕاپەڕیندا گوزەری کرد، لەهەڵەبجەی تازەدا خەریکی دانانی بارەگا بووین. لەلایەن کاک فەرەیدون عەبدول قادرەوە ئاگادار کرام بچم بۆ خاڵی سەر سنووری ئێران عێراق، لەنێوان شۆشمێ و تەوێڵە، لەوێ نوێنەرانی حکومەتی ئێران چاوەڕێی من دەکەن، تابیانهێنم بۆ سلێمانی.

کەوتینەڕێ بەدوو ئۆتۆمۆبێل، لەڕێگادا ئەماندا بەناو یان بەلای وێرانەی ئەو شارۆچکەو ئاوایانەدا کە ڕژێمی بەعس لەگەڵ خاکدا تەخت و یەکسانی کردبوون، یەکێک لەو شارۆچکانە سەیدسادقە، کەتاقە یەک لا دیوارمان نەئەبینی بەپێوە مابێ، لەوێ تێپەڕ بووین، ئەملاو ئەولای ڕێگاکەم تەماشا دەکرد، بینیم گەیشتینە پردی زەڵم لەئاواییەکانی، گامێشتەپە، گردەنازێ، قەدەفەری و تەپەڕێزینە تێپەڕ بوو بووین ئاسەواری هیچکام لەم ئاواییانەم نەبینی بوو. تەنها لێرەو لەوێ، لەمبەرو لەوبەری جادەکەوە لەدەوری چاڵاوەکان و گوێچەم و جۆبارەکاندا، پەڵەپەڵە تووترک و قامیشەڵان و داربیەکان بەرچاو ئەکەوتن کەلەزۆر شوێندا تووترک پەلوپۆی برکە بیەکانیان چەماندبووەوە بۆسەرزەوی، لەپردی زەڵمەوە تاوێرانەی شارۆچکەی خورماڵ بەناو هەمان سروشتدا گوزەرمان کرد.

ڕێگاکە لەسەیدسادقەوە تاناو تەوێڵە قیرتاوە، بەڵام لەکەلەکەو چاڵوچۆڵی و شوێن گوللەتۆپەکانی شەڕی عێراق و ئێران وای لێکردوە هیچ شۆفێرێک حەزناکا دوجار پێیدا بڕوات. لەخورماڵەوە تا تەوێڵە لەهەر پێچ و لەهەرملەیەکدا سەردەکەوین و ئاودیو دەبین، دیمەنگەلی یەک لەیەک جوانتری سەرەتای بەهارێکی ئازادی، کوردستانی ئازاد، خۆیمان پیشان دەدات.

بەدرێژایی ڕێگا جارجار ئەوەستاین و قسەمان لەگەڵ ئەوخەڵکەدا دەکرد کەخەریکی کۆکردنەوەی کەلوپەلی بنکە سەربازییەکان بوون، دەمانووت وریای خۆتان بن مین (ئەڵغام) تان پێدا نەتەقنەوە، لەبەر ئەوە ناوچەکە قەدەغە کراو ئاوەدانی تێدا نەبووە دارو درەخت و جەنگەڵ لەمبەرو لەوبەری جادەکەوە سەوزبووەو لەهەندێک شوێن هاتوەتە سەرقیرەکە.

بەتایبەت لەوشوێنانەدا ئاودارە، نزیک بووینەوە لەتەوێڵە، لەپێچی گەڕیات پێچمان کردەوە ئەمبەرو ئەوبەری چۆم و سێڕیانی بیارە تەوێڵە شۆشمێمان بەقەرەباڵغی بەرچاو کەوت، گەیشتینە لای خەڵکەکە بینیمان ئەو قەرەباڵغیە قافڵەیەکی سەربازین لەگەڵ نوێنەرێکی ئێران کەپێشتر ئەمناسی ناوی ئاغای کوهی بوو، ئەندامی قەرارگای رەمەزانە، لەگەڵ کادرێکی بزووتنەوەی ئیسلامی، کەکارگێڕی مەڵبەندی یەکی بزووتنەوە بوو بەناوی کاک ئیبراهیم رەشید خەڵکی نەورۆلیەو لەئێران بووە، چاوەڕێی ئێمەیان دەکرد.

ئوتۆمبێلە سەربازییەکان زیلی عەسکەری عێراقی بوون و پڕبوون لەسەربازی عێراقی بەچەکوچۆڵەی خۆیانەوە، ئێمە دابەزین و لەگەڵ کوهی و کاک ئیبراهیم ڕەشید برادەرەکەی بزووتنەوەدا یەکدیمان راموسی، لەگەڵ هەردوکیان چووینەلاوە، دوای بەخێر هێنانیان، بۆیان باس کردم ئەم سەربازە عێراقیانە، لەرۆژانی ٧و١٩٩١/٣/٨ دا کەراپەڕین بووە لەسنووری هەڵەبجەو هەورامان و بەرزاییەکانی دەوروبەریاندا بوون، دابەزیون و لەمەرزی شۆشمێوە چوونەتە ناو ئێران.

وتیان دوای ئەوە لەگەڵ کاک فەرەیدون عەبدلقادردا پەیوەندی کراوەو بڕیار دراوە لە ئێراندا کۆبوونەوە بەسەربازو ئەفسەرەکان بکرێ بەئازادانە کێ ئەگەڕێتەوە بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و ببێتە پێشمەرگە، ئەمانە هەموو بەڵێنیان داوە بگەڕێنەوەو ببنە پێشمەرگە، ئێمەش واهێناومانن، دیارە پەیوەندیەکانی حیزبەکان کۆبونەویان لەگەڵ کردون.

لەوێ کەووتینەڕێ بەرەو شارۆچکەی عەربەت، داوام کرد لەهەردوو نوێنەرەکە فەرموون لای من سواربن، سوار بووین و وێرانەی ئاواییەکانی سۆسەکان، بەڵخە، بیارە، زەردەهاڵ و رۆستەم بەگمان خستە پشت سەر، بەرلەوەی بگەینە نزیک کەلاوەکانی شاۆچکەی گوڵ عەنبەر(خورماڵ)، لەپشت ئەوساترە سەربازیەوە، کەلەناو خورماڵەوە تائاوایی رۆستەم بەگ لەدەستەڕاستی جادەکەدا بەدرێژایی شانی جادەکە دروست کراوە لەکاتی شەڕی عێراق و ئێراندا، دەیان چەکداری ڕیشن بەجلوبەرگی کوردی و کۆڵەپشت لەکۆڵ راست بوونەوەو میلی چەکیان لێ راکێشاین.

هاواریان کرد بووەستن و نەجولێن، من ماشێنەکەم لێدەخوڕی لامدایەوە بۆ پەنا ئەو ساترەی ئەوانی لێبوو، کاتێک دەرگاکەم کردەوە یەکێک

هاواری کرد دانەبەزی، منیش بەگوێم نەکردو دابەزیم پرسیم ئێوە کێن؟ لە چاو تروکانێکدا پێشمەرگەکانی هاورێم دابەزین و سەنگەریان گرت، یەکێک لەوانەی لەپشتی ساترەکەوە خۆیان مەلاس دابوو، هاواری کرد تەقە نەکەن ئەوە کاک حەمەی حەمەسەعیدە، هەرئەو کەسە وەڵامی دایەوە کاک حەمە ئێمە بزووتنەوەی ئیسلامین، نزیک بووینەوە لەیەکدی و دوای چاکوچۆنی، پرسیم کاکە چیدەکەن لێرە بۆ واکەمینتان گرتووە، ووتیان لەودیو لەئێرانەوە هاتوین و ئەمڕۆ لەدزلیەوە کەوتوینەتەڕێ، ئێمە بەرایی (پێشرەوی) هێزەکەی خۆمانین و لەدوورەوە ئەم قافڵە سەبازیەمان بینی وامانزانی لەناوچەی تەوێڵەو بیارەو لەسەر بەرزاییەکان ئێستا دابەزیون، دوای کەمێک گفتوگۆ، ماڵئاواییمان لەیەک کرد.

کاتێک سواری ئۆتۆمبێلەکە بووینەوە کوهی حالی بوو بوو لەم بگرەوبەردەیە، بەڵام هەربەئەنقەست لەمنی پرسی ئەمەمانە کێبوون ؟ ووتم حەرەکەتی ئیسلامین، ئەویش ووتی: وەڵا (حەرەکەتی بی حەرەکەتن) منیش لەبەر کاک ئیبراهیم رەشید برادەرەکەی بزووتنەوە کەلەگەڵمان بوو بۆ ئەوەی ئەو هەست بەبێزاری نەکات، وەڵامی کوهیم نەدایەوەو خۆم بێدەنگ کرد.

لەخورماڵ تاعەربەت لەچەند شوێندا دەبوو بووەستین و گفتوگۆ بکەین لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵک و چەکدارانەدا کەلەسەر جادەکەو لەمبەرو لەوبەرەوە هاتوچۆیان بوو، جەماوەرێکی زۆری عەربەت، زەڕایەن، هەڵەبجەی تازەو کۆمەڵگەکانی نەسر و باریکە، کۆمەڵ کۆمەڵ و گروپ گروپ لەتەوێڵەوە تاهەڵەبجەو شارەزوورو پێنجوێن وشلێرو شارباژێر، خەریکی کۆکردنەوەی چەکی قورس و سوک و ئۆتۆمبێل و تەقەمەنی و کەلوپەلی سەبازی بوون، لەم تالان کردنەی سوپای عێراقدا ژنانیش هاوشانی پیاوان بوون.

ئەم شوێنانەی باسمان کردن سەدان سەربازگەو رەبیەو مۆڵگەی سوپاو جاشەکانی مەفرەزە تایبەتەکان و فەوجە سوکەکانی لێبووە، ئەوناوچانەش سالانی پێشتر چۆلکراون لەخەڵک و بوونەتە ناوچەی قەدەغە کراو، بەشێکیان ئاواییەکانی سەر سنوورەکانن، ئەمانە لەساڵی١٩٧٩وە بەپێی بریاری جەزایری ساڵی١٩٧٥ داگیران و لەکۆمەڵگە زۆرەملێکاندا نیشتەجێکران، بەشێکیان بەهۆی شەڕی ئێران عێراق و لەساڵی١٩٨٠بەدواوە

چۆڵ کراون، وەک شارۆچکەکانی پێنجوێن و تەوێڵەو بیارەو ناڵپارێز، بەشێکی تریان بەهۆی کیمیاوی باران و ئەنفالەوە وەک شارو شارۆچکەکانی هەڵەبجە، سیراون، خورماڵ و سەیدسادق لەگەڵ ئاواییەکانی دەورو بەریان و هەموو ئاواییەکانی شارەزوورو شارباژێر.

بۆیە کاتێک راپەرینی بەهاری ١٩٩١کرا ئەم ناوچانە لەهەرێمەکەدا قەدەغەکراو ناوچەی سەربازی بوون. وائێستا جەماوەریی کۆچ پێکراو پاشماوەی ئەنفال کراو کیمیاوی باران کراوی ئەم ناوچانە، کەچەندین ساڵە ئاوارەو دەربەدەرن بەلێشاو رویان لەناوچەکانی خۆیان کردوە، هەندێک بەبێ سەرپەناو هەندێکیتر لەمۆڵگە چۆڵ کراوەکاندا خەریکی بنە دروست کردنەوەن، خەڵکێکی زۆریش میراتی سوپا شکاو هەڵوەشاوەکەی سەدام کێشە دەکەن بۆ کۆمەڵگاکانی نەسرو باریکە و عەربەت و هەڵەبجەی تازەو ناوچە ئاوەدانەکان.

بەرلەوەی هەوا تاریک بکات گەیشتینە عەربەت لەوێ لاماندا، بارەگایەکی لێبوو، لەسلێمانییەوە چەندکەس لەبرادەرانی خۆمان هاتبوون بۆئەوبارەگایەو لەوێ چاوەڕێی ئێمەیان دەکرد، دوای گفتوگۆ و پشوویەکی کورت، میوانەکان و ئەوهێزەی لەگەڵیان بوو لەگەڵ ئاغای کوهی بەرەو سلێمانی رۆیشتن و من و کاک ئیبراهیم و هاورێکانیشم گەراینەوە بۆ هەڵەبجەی تازە .

# ببوورن له یادم نه‌بوو

دوای یه‌ک هه‌فته له‌مانه‌وه‌مان له‌شاره‌زوور سه‌دان که‌س له‌گه‌نجان و لاوان له‌گه‌ڵمان ده‌بوونه پێشمه‌رگه، خه‌ڵکێکی زۆر سه‌ردانیان ده‌کردین و پێشنیارو داواکاریان هه‌بوو، ئێمه‌ش به‌پێی تواناو ده‌رکی ئه‌وکاته‌مان داواو پێشنیازو کاروباره‌کانمان به‌ڕێوه ده‌برد. له‌وانه گه‌نجێکی گورج و گۆڵ و خوێن گه‌رم به‌ناوی عومه‌ری ڕه‌حیم ماچۆ پێشنیاره‌که‌ی سه‌رنجی راکێشام.
له‌هه‌ڵه‌بجه‌ی تازه ئه‌م کوڕه گه‌نج جوانه، سه‌ردانی کردم و دوای چاکوچۆنی سه‌ره‌تا خۆی ناساند، زانیم خه‌ڵکی هه‌ڵه‌بجه‌و له‌بنه‌چه‌دا هه‌ورامی و باوباپیری خه‌ڵکی نۆدشه‌ی کوردستانی رۆژهه‌ڵاتن، برایه‌کیشی پێشمه‌رگه‌و هونه‌رمه‌ندێکی ده‌ست ره‌نگینه به‌ناوی که‌ریمی ره‌حیم ماچۆ، ئه‌م ناوی عومه‌ره‌و به‌دانا هه‌ڵه‌بجه‌یی ناسراوه و دانیشتوی هه‌ڵه‌بجه‌ی تازه‌یه، پێشنیاره‌که‌ی، ئه‌وه بوو ئه‌یوت بایادی کیمیابارانی هه‌ڵه‌بجه بکه‌ینه‌وه، منیش دوای وتو وێژێکی کورت راده‌ستی کاکه حه‌کیمی مه‌لاساڵحم کررد، پێم وت کاک حه‌کیم چیتان پێئه‌کرێت و چۆن ئه‌کرێت له‌وباره‌وه من هاوکارتانم، ئه‌وه‌بوو له‌رۆژی سێزده‌هه‌می ڕاپه‌ڕین دا یاده‌که‌یان کرده‌وه من له‌وێ نه‌مابووم، به‌ڵام کاک حامیدی حاجی خالیدی هاوکاری کردبوون. ئه‌مه‌ش ئه‌بێته یه‌که‌م یادکردنه‌وه‌ی سێهه‌مین ساڵوه‌گه‌ڕی یادی ١٩٨٨/٣/١٦ که‌ڕێخه ره‌که‌ی هه‌ڤاڵ دانای ره‌حیم ماچۆیه، که‌به‌دانا هه‌ڵه‌بجه‌یی ناسراوه.
سه‌دان چه‌کداری جاشیش کۆمه‌ڵ کۆمه‌ڵ و گروپ گروپ په‌یوه‌ندیان ده‌کردو ئه‌وانیشمان وه‌رئه‌گرت، تیپی١١ی هه‌ورامان بوو به‌یه‌که‌یه‌کی گه‌وره‌ی سه‌ربازی، دیاره ئه‌وگه‌نجانه‌ی که‌خاوه‌نی بیروباوه‌ڕی کوردایه‌تی بوون ئاسانترو زوتر رێک ئه‌خران، ئه‌وه‌بوو ئه‌وانه دواجار ده‌یان کادرو فه‌رمانده‌ی قاره‌مانیان لێ به‌رهه‌م هات، به‌ڵام چه‌کداره‌کانی سه‌ربه‌رژێم هه‌رچه‌نده زۆر خۆمان له‌گه‌ڵیان ماندو کرد، دوارۆژیان هیچ نه‌بوو، ئه‌وانه‌یان که‌پاشه رۆژیان باش وکه‌ڵکیان هه‌بووبێ له‌په‌نجه‌کانی ده‌ست زیاتر نه‌بوون، به‌شێکی زۆریان زیانیشیان هه‌بوو که‌له‌جێگه‌ی خۆیدا باسی ده‌که‌ین.

رەتڵی گەرمیان سنووری خۆیان پاک کردبووەوە، لەوانە شارو شارۆچکەکانی کەلار، کفری، سمود، سەرقەلا، قۆرەتوو، باوەنور، مەیدان، دەربەندیخان. پەلاماری شاری دوز و خانەقیشیاندا، بەلام سەرکەوتوو نەبوون، لەو دوو شوێنەدا، لەهەردوو شارۆچکەکە قوربانی گەورەشیان دا، لەخانەقین هێزێک بەفەرماندەیی سەلامی کوێخا عەزیز کەوتنە بۆسەوە لەنزیک ئاوایی مێرخاسی کاکەییەکاندا، زیانی ئێجگار گەورەیان لێکەوت، کۆمەڵێک پێشمەرگەی دێرین و قارەمان بوونە قوربانی لەوانە: براکانی کاک سەلامی کێوخا عەزیز، سەلاح و فەلاح، لەگەڵ چەندین خزمی تری، لەوانە فریا حەمەفەرەج و کامیل سالح و عەبدولا سالح و حسێن فەرەج ڕەشید و عەزیز خاوەر، لەگەڵ براکانی حەمەی تەلە( شەهید شاهۆ) هادی و عەتا، عەلی دەردۆینی خالیان و سالح سلێمان و چەندین شەهیدیتر لەوانە سەید نوری جیهازو عەبدولا قادرو والی ئاسکەو مستەفا حارس. هەرلەم بۆسەدا ٣سێ کەس لەڕیکخستنەکانی خانەقین کەشارەزایی هێزەکەیان دەکرد ئەوانیش شەهید بوون.

لەپەلاماردانی دوزدا، بەقیادە حەمە رەش و کاک عوسمانی حاجی مەحمود، شارەکەیان رزگار کرد، بەلام دواجار ئەوشارۆچکە بووەمەیدانی شەڕێکی سەخت و خوێناوی، دەیان پێشمەرگەو هاوولاتی بوونە قوربانی. لەوانە حەمەڕەش خۆی شەهید بوو، شارەکەشیان لەدەست سەندنەوە. دواترو لەجێگەی خۆیدا بەوردی باسی دەکەین.

رۆژی ١٩٩١/٣/١٢ سەرلەبەیانی لەخەو هەستام، چوومە سەر گردەکەی هەڵەبجەی تازە، بینای قائیمقامیەتی لەسەرە، کردومانەتە بارەگا، چەندین کەس سەرەیان گرتووە ئیشیان بەمن هەیە، منیش هەربەپێوە وەستاوم و دەفتەرێکی سپیم بەدەستەوە گرتووە، بۆهەرکەس و بەپێی ئیشەکەی نامە ئەنوسم و مۆری تیپی ١١ی هەورامانی لێ ئەدەم و کابرا ئەڕوات.

نامە ئاراستەی هەرکەس و لایەک دەکەین بەبێ یەک و دوو جێبەجێ دەبێت، ئەو رۆژە مۆری تیپی ١١ هەورامان زۆر بڕشتدارترە لەمۆرو نامەی ئەمڕۆی سەرۆکایەتییەکانمان. لەو بەیانیە زووەدا خاڵێکم هاتوو ووتی ئادەی سەیارەیەکی زیلم بەرێ باکۆچ و بارەکەم ببەمەوە بۆ تەوێڵە، ئەمویست

وەلامی بدەمەوە بلێم خالۆ کەی وەختی کۆچوبار کردنە و پەلە مەکە، وەلامی ئەوم نەدابووەوە، بێسیم چییەکە بروسکەی کاک فەرەیدونی دایەدەستم، دەڵێت: (بەگەیشتنی ئەم بروسکە خۆتان و هێزەکەتان بگەنە کەلار). دیارە رژێم پاشماوەی هێزەکانی کۆکردوەتەوەو لەگەڵ هێزەکانی موجاهیدینی خەلک نییەتی کۆنترۆلکردنەوەی کفری و کولەجۆو ناوچەکانی دەورو بەریەتی.

خالم رووبەرووی کەیکاوس کرد، کاک ئەکبەرو فەرماندە کەرتەکان دەستیانکرد بەئامادە کردنی ئوتومبێلی پاس و زیلی سەربازی (عەسری) هەمان رۆژ ئامادە بووین، لەو کاتەدا بڕیاردرا ئێمە سواربین و بڕۆینە کەلار، هێزە سەرەکیەکەی خۆمان کەلەشاخ هاتبوونە خوارەوە یەک کەسیان بەهیچ لایەکدا نەرۆیشتبوون، زۆر دلسۆزانە و بەردەوام چاوەڕوانی فەرمان بوون، ئەوانەشیان بۆسەردانی کەسوکار یان بۆ بینینەوەی دایک و باوک و خوشک و براکانیان کەلەودەورو بەرەدا نزیک بوون دوای چەندین ساڵ نەیانبینیبوون ئەرۆیشتن بەمۆڵەت و بۆچەند کاتژمێرێکیش زیاتر نەئەمانەوە.

لەوکاتەدا بەڕێ ئەکەوتین دوای عەسر بوو، کەیکاوس ووتی ئێوە بڕۆن من کەرتەکەم ئامادە نییە بەدواتاندا دێم، من توڕە ئەبم بۆ ئامادەنین؟ ئەویش دەڵێت ئاخر سەلاحی عەزە سمێڵە فەرمانەدەی مەفرەزە لەگەڵ ئەحمەدی عەلی مەحمود ماڵی خالۆتیان بردوەتەوە بۆ تەوێڵە. لەم بگرەوبەردە و قەرەباڵغیەدا، گرگر زیلێک لەپەناماندا ئەوەستێ و سەلاح دێتەخوارەوە، بۆئەوەی من زیاتر توڕەبکا، نیازی دەڵێت سەلاح چەکیشی پێنییە. منیش بانگ ئەکەم، وەرە سەلاح بۆ بێچەکی کوا چەکەکەت؟ وەڵام دەداتەوە چەکەکەم داوە بەمامۆستا شاهۆ، مامۆستا شاهۆ کێیە؟ مامۆستا شاهۆی[1] خۆمان عەبابەیلێ، لەڕێگەی تەوێڵەدا

[1]–دوای دوو رۆژ لەکفری سەلاحم بانگ کرد، تۆ ووتت چەکەکەی خۆت داوە بەمامۆستا شاهۆ، مامۆستات لەکوێ بینی؟ ئەو رۆژە چووین بۆ تەوێلە لەسەر پردی گەڕیات مامۆستا و کاک برایمی کوێخا عەلیمان بینی، لەئێرانەوە لەمەرزی شۆشمێوە لەئوردوگاوە هاتنەوە بەم دیودا سوارمان کردن و مامۆستا ووتی چەکم پێنییەو سەلاح خۆتۆ وەزعی من ئەزانی، ئەوچەکەی خۆتم بدەرێ دوایی بۆت ئەنێرمەوە. منیش پێم وت ئافەرم کارێکی باشت کردوە، ئەگەر نەیناردەوە داوای لێ نەکەیتەوە، من چەکێک ئەنێرمەوە بۆ نیازی لەباتی ئەوەی تۆ هەر چەک زۆرە.

بینیمان، باشە دەی، کاک نیازی ئێوە لێرە ئەمێننەوە چەکێکی تری بدەرێ با بەبێچەک نەیەت لەگەڵ ئێمە.

هەڤاڵ نیازیی و کاک حەکیمی مەلاسالح و چەند پێشمەرگەیەک لەو بارەگایانەدا مانەوە کەلەشارەزوور دانرابوون، بۆ ئیشوکاری حزبی و کاروباری ئەو هاوولاتییانەی ئیشوکاریان لای ئێمە بوو. ئێمەش لەگەڵ هەڤالانی تیپ و پێشمەرگەکان کەووتینە ڕێ بۆ شارۆچکەی کەلار.

ئەوە یەکەم جارە من بەورێگەدا دەڕۆم. تێپەڕ بوون بەدەربەنیخاندا و دوای خستنە پشت سەری پردی دیوانە، بانی خێلان، دەشتی پێپاز، بەرووناکی و ئاوە خوێڕی و باوەنور و ڕێگایەکی دوورو درێژ کەبەناو چەندین ئاواییدا گوزەر دەکەی بەتاریکی، دەبڕین و شەو گەیشتینە قەلای دێرین و بەناوبانگی شێروانە. ئەو شەوە لەناو شارۆچکەی کەلاردا قەرەباڵغ و هۆسەیەکە ئەوسەری دیارنییە، کاک مەحمود سەنگاوی و کاک عەدنانی حەمەی مینا ئەبینینەوە، پێمان دەڵێن با هێزەکەی ئێوە دانەبەزن بچنە کولەجۆ، بەسەرچاو، کەووتینە رێ بۆ کولەجۆ.

لەهێزەکەی ئێمە ئەوانەی دابەزیون بەملاو ئەولادا هەریەک بەدوای شتێکدا وێڵە یەکێ مزگەوت یەکێ نان یەکێ جگەرە.......تاد، دوای ماوەیەک کۆبونەوە و بەرێکەووتین. دوای مەسافەیەک ڕێگابڕین، نیوەشەو هەرلەسەر جادە قیرەکەدا قافڵەکە دایەکەنار و وەستان، خۆم دابەزیم و چوومە پێشەوە، لەوشەوە نوتەکەدا کاک ئەکبەرم دۆزیەوە پرسیم بۆ دابەزیون؟ ووتی ئەمە کولەجۆیە، لەدەستە راستی جادەکەوە تارمای و هەیکەلی چەند خانویەک بەدیار دەکەون پاش سەرنجدانیان، ئەپەڕمەوە بۆدەستە چەپ روبەرۆژهەلات ورد ئەبمەوە لەئاوداماني تاریکایی بەدرێژی قەراخی جادەکە پیزڵ و قەڕام و بێشە سەریان لەئاسۆدا دیارە.

بارودۆخ ئاسایی بوو، تازە ناخەوین و ڕۆژ دەبێتەوە، ئەمە زێدی هەڤاڵ عادل شوکرە، ئەودیمەنەی کولەجۆ کەمن لەمێشکم دا وێنام کردووە بەروئیاو خەیاڵ، لەگەڵ ئەم دیمەنەدا لێک نزیکە. بەیانی شارەزاکەمان شوێنەکانمان بۆ واجب گرتن پیشان ئەدا، پێشمەرگەی تری لێیە. ڕۆژی ١٩٩١/٣/١٣ دوا نیوەڕۆ، واتە هەر ئەو ڕۆژەی گەیشتبوین ئاگادار ئەکرێین ئێوە ئەبێ بچنە کفری، لای عەسری هەمان رۆژ خۆمان کۆکردەوەو

گەڕاینەوە بۆ کەلارو لەوێوە بۆ کفری، شەو گەیشتینە ناو شاری کفری، لەوێ بەرپرسێکی کفری هات بەدەمانەوە بەناوی حاکم غازی یەکترمان ئەناسی ئەویش لەدەرەوە پێشمەرگە بووە.

حاکم هاتوو لەخوار شارۆچکەکەوە شوێنێکی تەسلیم کردین، بەناونیشانی گەڕەکی ئەفسەران، هەرهەمان شەو لەچەند خانویەکدا کەهەموو پێداویستیەکی تێدا بوو جگە لەخواردەمەنی، خواردن نیە ئێوارەش ئەم هێزەنانی نەخواردووە، بارەگا و شوێنی حەوانەوەمان چێکرد، بەڵام نازانین ئازوقە و خواردن چۆن و کێ بۆمان دابین دەکات؟ دواتر حاکم غازی برێک ئازوقەو خواردنی بۆدابین کردین، شوێنی کەمین و پاسەوانی و بەرگریشیان لەکاتی شەڕدا کەبەشی باشووری شارۆچکەکە بوو پیشان داین. لەوانە لای کارێزو غەسلو سەرێگای ناحیەی جەبارە....تاد .

من یەکەمجارە شارۆچکەی کفری ببینم، لەمێشکی خۆمدا دیمەن و تەسویرێکیتر تۆمارە، بەڵام ئێستا بینیم بەشارۆچکەیەکی وشک بەرچاوم کەوت، لەدڵا بەخۆم ئەڵێم لەهەڵکەوتەیەکی جوگرافی وادا نابێت شارۆچکە هەبێت، چوونکە هەربەبینینی لەلام واوێنابوو ئەم شوێنە یان ئەم هەڵکەوتە جگرافیە نەشوێنی کشتوکاڵییە، نەمەرتەع و لەوەڕگەیە. نەناوەندی ئاوایی گەلو نەخاڵی بەیەک گەشتنەوەی چەندین رێگاوبانی کاروان و توجارەتە[1].

رۆژی دووەم هاتمە ناوبازارو برێک گەڕام بەناو کفریدا، بۆزیاتر ناسین و شارەزابوون، خەڵکێکی کەمی لێبوو چەندین گەڕەکی بەتەواوی چۆڵ بوون، شەو ئاگادار کراین وریابین چوونکە (مجاهیدن خلق) لەجەبارەو سلێمان بەگ کۆبونەتەوە. بەتەمان هێرش بکەن بۆ ناوشاری کفری، ئەوشەوە لەچەندین لاوە کەمین و پاسەوانمان داناو خۆشمان چووینە سەررێگای جەبارە کفری لەلای باشووری رۆژهەڵاتی شارۆچکەکەوە رۆژ بووەوە هیچ رووی نەدا.

[1]– بەڵام دواتر ئەم بابەتەم لەگەڵ عەزیز ئاغای زەنگنەدا باس کرد ووتی : نەخێر، شاری کفری سەرە ڕێگای کاروان و ڕێگای کاروان چیان و کاروان سەرای لێ بووەو شارێکی کۆن و دێرینە. چەندین ئاساری باستانی لێیەو مەرتەع و لەوەڕگەشی هەیە.

لێرە بەهارە، بەڵام تام وچێژو خۆشی و شادی وەرزی بەهاری زێدی منی نییە. تەنها گیاو گوڵی تۆڵەکەو چاوبازەڵە، لەگەڵ چەندین جۆرە دڕکوداڵ، لەباتی گوڵاڵە سورەو مێلاقەو گوڵە حاجیلەکان، لەباتی دەشت و دەری داپۆشراوی سورئاڵ و زەردو سپی و مۆر، نزارو خۆرەتاو ئەمبەرو ئەوبەری سەرسەوزی پڕبۆن و بەرامەی چنورو شەوبۆو کەماو لۆ، بۆژانەو بەرزەڵنگ. نا، نین و نابینم، کوا هاژەی تاف و شەتاوان؟ کوا دەنگی دەنگ دانەوەی سیاچەمانەو کنالەلیل؟ کوا ئاوازو ئاهەنگی یەزدان خوڵقێنەر؟ کوان لەکوێن چۆلەکەو بولبولانی خۆش ئاوازی ڕەنگاوڕەنگی ئەم سەرچڵ بۆ ئەو سەرچڵ؟ کوان بۆدیارنین باخەوانانی باخ پاککەرەوەی بەهاری، بۆ تەقەی پاچ و بێڵ و خاکەنازی دەستی قڵیشاوی مامە پیرەی هەورامی بەرگوێ ناکەون؟ کوا ستونی سەر بۆ ئاسمان کشاوی دودو دوکەڵی ئاگری کەیبانوان، بەناو چرۆی تازە دەمکراوەی داروودرەختەکانی میوەی جۆراوجۆرە؟ کواو کواو کوانێ................ تاد ؟

ئانا داوای لێبوردن دەکەم، لەبیرم نەبوو بەهاری کفری و گەرمیان و گەرمەسێر، بەهاری زێدی ئەنفالستان و شەهیدستان، داوای لێبوردن دەکەم، لەبیرم نەبوو ببورن بەخودا لەیادم چوبوو، کەبەهاری ئێوە بەهاری خوێن و مەرگە، بەهاری ڕەشپۆشی ئازیزان و جگەرگۆشە زیندە بەچاڵ کراوەکانتانە، بەهاری شین و واوەیلاو لاوانەوەی پیرەژنانی ڕەش هەڵگەڕاوی دەرون قرچاوی بەجێماوی دەشتی سەماوەو بیابانی عەرعەرە، بەهاری ماتەمینی پێشمەرگە شەهیدەکانی (٥١) پەنجاویەکی گەرمیان و (٥٣) پەنجاو سێی شێروانە و (٥٩) پەنجاو نۆی حەمرینە. کفری بەکفرنەبێت ئەوەتا تۆش داری خورماو کالیپتۆزو تەروت هەیە.

تەرو، درەختی ناو ئەو چۆم و دۆڵە وشکانەی بیابان و گەرمەسێرەکانە، زۆرتر لەناو ئەو چۆم و دۆڵانەدا سەوز ئەبێت کەلماوی و تەنها بەبەهاران دا ئاویان هەیە، جارێکیان گوێم لێ بوو، خوالێخۆشبوو مامۆستا ئیبرایم ئەحمەد لە تەلەفزیۆندا چاو پێکەوتنی هەبوو، لێیان ئەپرسی بۆ سەرەتاو بناغەی سیاسەت و کوردایەتی و نوسەرایەتیت داناو دواتر وەک بڵێیت پاشەکشەت لێکردون و لێیان دووریت؟ ئاتۆ سیاسی بوویت، سیاسی نەبون ئاتۆ نووسەرو شاعیر بوویت نووسەرو شاعر کەم بوون .........تاد ؟

لەوەڵامدا ووتی بەمیدیاکارەکە، تۆ تەرو ئەناسی؟ تەرو درەخت نییە بەڵام لەبەر ئەوە لەبیاباندا درەختی ترنین، بیابان نشینەکان تەرو بەدرەخت ئەزانن. مەبەستی ئەوەبو بڵێت کاتێک من سیاسی بوم سیاسی تر نەبوون کاتێک من نوسەر بوم نوسەری تر نەبوون ......تاد، تەماشا بکەن ئەوپەڕی خاکیەتی و خۆبەزل نەزانی و منەت نەکردن بەسەر گەلەکەیدا، کەبەڕای من ئەو شوبهاندنەی خۆی بەتەروەکە، دروست نەبوو، بەڵام ئەوەیە مامۆستا نایەوێت نەخۆی نەکەسیتر پێداهەڵدان و مەتحی بکەن، یان لەئەسڵدا بڕوای بەوشتانە نیە.

ببوورن لەیادم نەبوو بست بەبستی خاکی کوردستان قەرزارتانە، رەنگە زۆر کەس نەزانێ هەر لەهەکاری بۆ تەرگەوەرو مەرگەوەڕ، لەوێ ڕا بۆ هەورامان، لەهەورامانەوە بۆخانەقین، لەوێوە بۆحەمرین، لەحەمرینەوە بۆ قەندیل، بەتانوپۆدا، لەهەموو سەردوندو لاپاڵ و بنداروو بنارو نزارو خۆرەتاوی چیاکان، لەهەموودەشت و دۆڵ و هەردەو گوێ چۆم و سەرکانی و گوێ گۆلاو و لەهەموو ئاوایی و کوچەو کۆڵان و سەرجادەی شارو شارۆچکەکاندا، بەکورتی بڵێم لەم کوردستانەدا بستێک زەوی نەماوە تەرمی پیرۆزی پێشمەرگەیەکی گیانفیدای ئێوەی لێ بەجێنەمابێ. گەرمەسێرو گەرمیانییەکان، من دەزانم ئێوە فریادرەس بوون لەرۆژهەڵات بۆ رۆژئاوا لەباشوور بۆ باکووری نیشتمان، بۆیە ئەم بەهاری ئازادییە خوێناوی جگەرتانە.

ببورن منیش لەم بەهاری ئازادییەدا، لەم بەهاری مەرگ و خوێنەدا، لەگەڵ ئێوەدا ماتەمینی ئەگرم، ماتەمی بۆکۆڕی ماتەمینی ئەشکەووتی روخاو، بۆ مەلائەحمەد و هاوڕێکانی، بۆ ئاتێلای عاشقی کتێب و فاتیلە، بۆسەید محەمەدی خێڵ و ئەحمەدی حاجی رەشید و مەحمود گەرمیانی و حەمەی تەلە، بۆ عەلی سورو قاسمی فەقێ عەلی و شەهید سەردار، بۆ دلێر جاف و حەمید و نازمە چکۆل و حەمەی شاسوار، بۆحەسەن ئای ئای و بورهانی حەمەی مینا و خالید گەرمیانی و سەرکەوت، بۆ سەدان و سەدانیتری هاوگەشمەردەی وەک حەمەرەشتان.

بەشداری خەمی ئێوەشم: سەنگاوی، عەدنانی حەمەی مینا، عوسمان حاجی مەحمود، عادل شوکر، سەلاحی کوێخا، سەلامی کیوێخا عەزیز،

مامۆستا عەلی، کوردۆ، نازم و شامار و مەلاسەعید و سەلام شوشە. لەگەڵ ئێوەی پشتیوانانیان لەو سەرەوە، لەسەر سەری قۆپی و ئاش داخەوە: ئێوە شێخ جەعفەر، مام رۆستەم، ئازادی ٥٧، هێمنە رەش، ئاوات قارەمانی، مەحمودی مامە عەزەو هەموو گیان لەسەر دەستەکانی پێبنار.

بەڵی چەند رۆژێکمان لەکفریدا تێپەڕاندو هاتووچۆ لەسلێمانی و شارەزوورەوە بۆ کفری و بۆلای ئێمە دەستی پێکرد، خەڵک دەهاتن بۆ بینی پێشمەرگەکان و سەردانی کردنیان، هەندێک بەچەکەوە دەهاتن و لامان ئەمانەوە، ئەم هات و چۆو قەرەباڵغیە برێک کاریگەری خراپی بۆسەر هێزە سەرەکیەکەی ئێمە هەبوو، خەریک بوو ئەو نەزم ونیزام و گوێڕایەڵیەی لەناوماندا هەبوو کاڵبیبێتەوە، چوونکە ئەوانەی دەهاتن باسی ئەوەیان بۆ پێشمەرگەکان دەکرد، لەسلێمانی دەور و بەری دا حزبەکان و خەڵک خەریکی بارەگاو بنکە دانان و خۆنمایش کردنن، چەک کۆدەکەنەوە، ئۆتۆمبێل و کەرەستەی جۆراوجۆر ئاودیوی ئێران دەکەن و هەرکەس بۆخۆی و کەس بەکەس نییە. کاتێک بەخۆکەوتین ئەبینین ئەو چەکدارانەش دەستە دەستە بەناوی سەردان و یان مانەوەو هاوکاری کردنی ئێمە دێنە ناوچەکەو دەورو بەر، زۆریان سەر لەئێوارە واجبیان بۆ دیاری دەکەین لەناو شارۆچکەکەو بەتەماین وەک پشتیوان هاوکارمانبن، کەچی بەیانیان نەئەمان و شوێنەکانیان بەجێ ئەهێشت و ئەڕۆیشتن. کاتێکمان زانی جگەلەوەش دەستی ئێمەیان بریوە، شەوانە ماڵانێش ئەگەڕێن و ئۆتۆمبێل و تراکتۆرو کەلوپەلی ماڵە چۆڵەکان ئەدزن و ئەبەن و ئەڕۆن.

ماوەی چەن رۆژێک تێپەڕین و هێرش و پەلاماری سوپای عێراق و مجاهدینی خەلق کەئێرانین و لەناوچەی حەمرین و عوزێم لەپادگانی ئەشرەف نیشتەجێن، دەستی پێکرد، پێشمەرگەکانی تیپی ١١ی هەورامان، بەریان بەهێرشەکە گرتوو نەیانهێشت نزیک ببنەوە لەشارۆچکەی کفری، ماوەی چەند رۆژێک تەقەو لێکدان پەراگەندە و بەربڵاو جارجار چەندبارە ئەبووەوە. لەگەڵ ئەمەشدا تۆپخانەکانی سوپای عێراق ناو شارەکە و دەوروبەریان تۆپ باران دەکرد.

سەر لەبەیانی رۆژێک زوو هێرشێک دەستی پێکرد، ئێمە لەسەربانی خانویەکەوە لەگەڵ چەند هەڤاڵێک تەماشای دیمەنی مەیدانی هێرشی دوژمن و

رووبەروو بوونەوەی پێشمەرگەکانمان دەکرد، داوام کرد چەکێکی بیکەیسی بهێننە سەرەوە، کاتێک هێنایان شتێکی سەیرڕوویدا، ئەوپێشمەرگە چەکەکەی هێنا، هاتبووە سەربانێک لەپشتەوە و نزمتر لەو سەربانەی ئێمەی لێ بوو، لەناکاو دەستڕێژی گوللە ئەیدا بەستارە و ئەمبەرو ئەوبەری دیوارەکاندا هاوارمان کرد کێیە تەقە ئەکا؟ ئێمەتان کوشت مەکەن، تەقەکە نەما، بەلام هاوار بەرز بووەوە فریام کەون بریندارم، چوومە دواوە سەرم راکێشا بۆسەربانەکەی دواوە ئەبینم عەدەد ( بی کەی سی )ە کەیە لاقی شکاوەو خوێن سەری کردوە، چەکەکەی لەلایا کەوتووە، ئەویان بردە خوارەوە، من چەکەکەم هەلگرت و تەماشام کرد سوارەو پێنج فیشەکیش لەشریتەکەی خالیە، لەهیچ لایەکیشەوە گوللەی دوژمن ئەم شوێنە ناگرێتەوە، دەرکەوت کاتێک لەسەر بانێکی کەمێک بەرزتر بازی داوەتە خوارەوە تفەنگەکەی سوار بووەو ئەو دست رێژە لەدەست خۆی دەرچووە، ئەو پێشمەرگە حەسەن بامۆکییە، ئێستا لەهەلەبجەو بۆ هەمیشە کەم ئەندام بووەو کەسێکی ماندوە دلسۆزی کوردایەتییە .

لەشاری کفری دوای ماوەیەک کارەباو ئاو خزمەتگوزاریەکان نەمان، سەرقەلا ئەو ئاواییە کەچەند کیلۆمەتر لەکفریەوە دورە، ئەکەوێتە باکووری رۆژهەلاتی شارەکەوە. لەوێشەوە رێگایەکی خاکی بەرەوباکووری رۆژئاوا ئەڕوات بەرەو نەوجول. لەکفریەوە بەرەو کەرکوک زنجیرەیەک گردۆلکە هەن، دوای ئەوە کەلەنێوان سەرقەلاو شاری کفریدا چۆمێک ئەو زنجیرە گردۆلکەو بەرزاییانە لێک دادەبڕی دوبارە بەرەو شاری خانەقین بۆلای کولەجۆ دەست پێدەکەنەوە بەلام نزمتر، جارجار سەردانی ناوبازاری شارەکەم دەکرد، لەوێ قەیسەریەک هەبوو کەبەلگەیە بۆ دێرینی ئەم شارە، هەروەها ئیمام زادەیەکیش بەناوی (باوەشاسوار) شوێنەوارێکی تری دێرینی کفریە، هەرچەندە شار چۆل بوو، بەلام هەولم ئەدا ئەو کەسانەی لەوشارەدا ماونەتەوە بناسم، عەزیز ئاغای زەنگەنە، ئەو پیاوە سەرو سیماداره بوو بووین بەدۆست، پێکەوە بەهەورامیانە قسەمان دەکرد بەباشی زمان یان شێوەزاری هەورامیانەی ئەزانی چوونکە زمانی رەسەنی خۆیەتی.

زەنگەنە یان زەنگنە یەکێک لەعێلە گەورەکانی کوردن، سەرزەوی یان هەلکەوتەی جوگرافیان ئەکەوێتە ناوچەی گەرمیان لەکوردستانی باشوردا،

بەشێوە زاری ماچۆ دواون، بەڵام لەگەڵ تێپەربوونی زەمانەو تێکەڵاویان لەگەڵ هۆزەکانی دەوروبەریان، دواتر ئەو تێک دانەی هەڵکەوتەی جگرافیایی و فەرهەنگی و کلتوری و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و کۆچ پێکردن، هەموو ئەو ڕێوشوێنە سیاسی و سەربازیانەی عەرەبە شۆڤێنییەکان و دواتر بەعسی سەدامی گرتنییە بەر بۆ سڕینەوەی شوناسی نەتەوەیی نەتەوەی کورد، شێوە زارە ڕەسەنەکەی زەنگنەشیان بەرەو نەمان برد، بەجۆرێک ئێستا تەنها ئەوانەیان گەورە تەمەن و بەساڵا چوون تاک و تەراو زۆرکەم ئەبینی، بەو شێوەزارە شیرینە لەنێوان خۆیاندا گفتوگۆ بکەن.
ئەم هۆزە بەدرێژای مێژوو بەرگریان لەخۆیان کردوە و سەریان نەوی نەکردوە بۆ دوژمنانی نەتەوەی کورد، بەڵام بەداخەوە دواجار لەپرۆسەی ئەنفالی ڕژێمی سەدام حوسێن دا لەساڵی ١٩٨٨ دا گورزی کوشندەیان بەرکەوت.
هۆزی زەنگنە، جگە لەکوردستانی باشور، لەچەند شوێنێکی ئێران و تورکیاشدا هەن بەتایبەت لەدەشتی مایدەشت و لەناو شاری کرماشاندا، هەروەها لەباکوری ڕۆژهەلاتی ولاتی تورکیا بەتایبەت لەئەرزنجان و دەوروبەریدا، بۆ زیاتر ناسین و ئاشنابوون بە مێژووی هۆزی زەنگنەی ماچۆ زوان، تەماشای کتێبی ( مێژووی عەشیرەتی زەنگنە) بکە لەنوسینی محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگنە. یان کتێبی مێژوویی( کوردگال نامگ)ی حاجی محەمەد ئاغای بلوچی هاوسەردەم و هاوتوانای شەرەف نامەی میرشەرەفی بەدلیسی کەهەردووکیان نزیکەی ٤٠٠ چوارسەد ساڵێک لەمەو بەر، بەبێ ئاگا بوون لەیەکتر نوسیویانن. حاج محەمەد ئاغای زەنگنە ئەڵێت ئێمەی بلوچ کوردین، کاتێک کەیقوبادی ماد لەکوردستان ڕایگواستوین بۆ پاراستنی سنووری ئیمپراتۆریەت، لێرە بەتێپەڕبوونی سەردەم ناوەکەمان ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە و دواجار بووە بەبلوچ.
لەماوەیەکی کەم دا زۆربەی شارو شارۆچکەو ناوچەکانی کوردستان لەلایەن خەڵک و هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە ڕزکار کران، پاک کرانەوە لەسوپای داگیرکەری عێراق و دام ودەزگا ئەمنی و جاسوسی و جاشە کوردەکان، ئەو جاشە کوردانەی کەپەیوەندیان نەکرد و نەهاتنە بەرەی

گەلەوە، ئەو کوردانەی هاوکاری دام و دەستگا ئەمنییەکانی بەعس و سەدام بوون و تەسلیم نەبوون رایان کردو چوونە بەغدای پایتەختی عێراق.

ناوچە رزگار کراوەکان، لەمانگی بەهاری ساڵی ١٩٩١ دا، شاری سلێمانی ناوەندی پارێزگاو هەموو شارو شارۆچکەکانی حەوزەی ئەم پارێزگایە بوون. بەشێک لەناوەندی قەزاکان و سەرجەم ناوەندی ناحیەو هەموو ئاواییەکانی سەربەناحیەکان، چۆڵو وێران کرابوون لەساڵی ١٩٨٨ تا بەهاری ساڵی ١٩٩١، مرۆڤ و هەتا ئاژەڵ و گیان لەبەریش تێیاندا نەدەژیا، ئەو شوێنانە ئەمانە بوون:

هەڵەبجە ناوەندی قەزا، لەگەڵ ناوەندی ناحیەکانی بیارە، خورماڵ، سیروان. پێنجوێن ناوەندی قەزا، لەگەڵ ناوەندی ناحیەکانی گەرمک و ناڵپارێز. چوارتا ناوەندی قەزا، لەگەڵ ناوەندی ناحیەکانی ماوات و باسنێ . قەڵادزە ناوەندی قەزا لەگەڵ ناوەندی هەردو ناحیەی هێرۆ و سەنگەسەر لەگەڵ هەر چوار کۆمەڵگای بەستەسێن، ژاراوە، تومەسوران و راپەرین. دوکان ناوەندی قەزا، لەگەڵ ناوەندی هەرسێ ناحیەی خەلەکان و سورداش و بنگردا. هەروەها ناحیەی قەرەداغیش.

ئەو شارو شارۆچکەو کۆمەڵگایانەی ئاوەدان بوون، ئەمانە بوون، هەڵەبجەی تازە ئێستا (ناوەندی) قەزای شارەزوورە، ناحیەی عەربەت، کۆمەڵگاکانی، نەسر، باریکە، تاسلوجە، پیرەمەگرون، باینجان و بازیان. دەربەندیخان ناوەندی قەزا. کەلار ناوەندی قەزا، لەگەڵ ناوەندی ناحیەکانی کۆمەڵگەی سمود، باوەنور(پێباز). لەگەڵ ناوەندی چەند ناحیەیەکی قەزای خانەقین دا لەوانە کوڵەجۆ، قۆرەتوو و مەیدان. کفری ناوەندی قەزا، سەرقەڵا ناوەندی ناحیە، ئەم قەزاو ناحیە پێشتر سەر بەپارێزگای کەرکوک بوون بەڵام لەساڵی ١٩٧٠دا کەتکریت ئەکرێتە ناوەندی پارێزگای سەلاحەدین لەکەرکوک دادەبرێن و ئەخرێنە سەر سەلاحەدین.

دابڕینی چەند شارو شارۆچکەش لەسلێمانی و کەرکوک و هەولێر، وەبەستنیان بەموسڵ و تکریت و دیالەوە، مەرامی سیاسی عەرەبی شۆڤێنی و حزبی بەعس و تێکدانی جوگرافیای سیاسی و ئیداریی کوردستانی باشوور بووە، لەچوار چێوەی ستراتیجی بەعەرەب کردن و سڕینەوەی شوناسی نەتەوەیی نەتەوەی کورددا.

لەسەروی رۆژئاوایی سلێمانیشەوە ناوەندی قەزای رانیەو ناوەندی هەردوو ناحیەکانی چوار قورنەو سەروچاوە، لەگەڵ کۆمەڵگەکانی حاجی ئاواو شکارتە مابوون، لەرۆژی ١٩٩١/٣/٥ ئەم شوێنانە بوونە دەروازەی راپەرینەکەو تاجی سەرکەوتنەکەشیان لەرۆژی ١٩٩١/٣/٢١ لەکەرکوکدا لەسەرسەر دانرا.

## شاکەڵ

پاش نیوەرۆیەک ئاگادار کرام لەکفریەوە بچمە کەلار، دوو ئوتۆمبێل لەبەردەست دابوون، ئوتۆمبێلێکی لاندکرۆز لەرۆژی شەشەمی راپەرین دا بەختیاری کوێخا نەزهەتی تەوێڵەیی بۆی هێنام بووم بەدیاری، ئەویش هی دەوڵەت بوو دەستی کەوتبوو. لەگەڵ ئوتۆمبێلێکی قەمەرەی(گلانت) کەلەناو شاری کفریدا پێشمەرگەیەک بەناوی مەهدی مەحمودی تەیمەز (مەهدیە ریشە) بۆی هێنابووم، من لەم راپەرینەدا لەسەرەتاوە تاکۆتای، دەستم بۆهیچ شتێکی نەحکومەت نەخەڵک نەبردووە بیبەم بۆخۆم، لەوانە ئەو هەموو ئوتۆمبێل و چەکوچۆڵە زۆرو زەوەندە، هەڤاڵەکانم و خەڵک و بەرپرس و پێشمەرگەی ئەوکات ئەتوانن گەواهی ئەم راستیەم بۆ بدەن.
ئەو ئوتۆمبێلە (گالانت)ە لەکۆرەوەکەدا هێنابووم لەگەڵ خۆم بۆ کۆلێژ، ( کۆلێژ- باخێکە لەنێوان هەڵەبجەو ئاوایی خەرپابیدا)، لەوێ بارەگامان دانا، من خۆم گەرامەوە بۆسەراوی سوبحان ئاغا، چوونکە لەکۆرەوەکەدا سوپای عێراق لە چەناخچیان بەرەو ژوورتر نەیتوانی بێت رێگەی لێگیرا، حاجی ئەمینی دەرەشیشی ئێستا ماوەو لەهەڵەبجەیە، هات بۆلام ووتی ئەو ئوتۆمبێلەم بەرێ، بۆتۆ ناشێ ئەیبەم و لەباتیدا لاندکرۆزێکتان بۆ ئەکرم. ووتم باشە بردی دوای دومانگ هاتەوە ووتی بردمە پاوە، لەدوکانی محەمەد رەشیدی وەڵەدبەگی خوشکەزای مامۆستا مەلا قادری قادریدا دامناوە، دوای چەند رۆژێک ئیدارەی ئیتلاعات چوون دەرگاکەیان شکاندوەو ئوتۆمبێلەکەیان بردوە وتوویانە ئەمە هی کوری سەدامە، ئەوپیاوە حاجی ئەمین، بووە هۆی

ئەوەی تەنها شتێک لەڕاپەڕین دا بۆخۆم بەکار بهێنم ئەو ئۆتۆمبێلە بوو، حاجی ئەمینی دەرەشیشی ئەوی فەوتاند،

خوێنەری ئازیز بۆیە ئەم داستانەم لێرەدا گێڕاوەتەوە، ئەمشەو کەخەریکی پیت چنینی ئەم نوسینەم شەوێکی مانگی٢٠١٦/٩ یە، مامۆستایەکی ئاینی بەڕێزی هەڵەبجە، کەمامۆستا مەلاتاهیر بامۆکیەو دۆستێکی نزیک و ئازیزی خۆشمە، دوو رۆژ بەر لەئێستا لەوتارێکیدا بەبۆنەی خۆپیشان دانی مامۆستایانی پەروەردەوە، ووتی: شۆڕش گێڕەکانی شاخ و توجارەکانی شار، دیارە کەمەبەستی مەسئولین و لێپرسراوانی ئەم وولاتیە، من زۆر ئازارم پێگەشت، تۆمەت بەخشینەوە بەگشتی و تەڕو وشک پێکەوە سوتاندن و جیا نەکردنەوەی ڕەش و سپی، لەم وولاتدا عازابی زۆر کەس ئەدات. وەک ئەمەی مامۆستا مەلاتایەر بامۆکی. من بەڵێنم بەخۆم داوە لەو رۆژوە بووم بە پێشمەرگە تا ئەمرۆ، واتە لەساڵی ١٩٧٧ وە بۆ ٢٠١٦ ئەگەر شک ببەم خیانەتی یەک دینارم لەحیزبەکەی خۆم یان لەم وولاتە یان لەم حکومەتەی هەرێمی کوردستان کردبێ، لەم کتێبەی دەنگی خاکدا بڵاوی بکەمەوە.

دوای تەواو بوونی ئەم بەرگە، بەرگی دووەم چاوەڕێیی ئەوە ئەکەم سەرەتا نزیکەکان و دواتر هەڤاڵەکانم و بەرپرسەکانم و ئینجا هەر تاکێکی ڕیخنەگری ئەم هەرێمە بێتە سەرشاشەی تی ڤی و میدیاکان، یان بەهەر ڕێگایەکیتر بێت، پێم بڵێن تۆ ئەوکەم و کورتیەتت هەیە بەبەڵگەوە، ڕاستگۆ نەبوویت..

بەڵێ بابێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، لەبەر نەبوونی بەنزین دواکەوتین، لەسەفەرەکەمان بۆ کەلار پێشمەرگەیەکم بەنامەیەکەوە نارد بۆلای حاکم غازی، هاتەوە ووتی کاک حاکم دەڵێت: بەنزینمان نەماوە، لەم کاتەدا پێشمەرگەیەکی گورج وگۆڵ سەروسیما جوان و رووخۆش پەیدابوو. سڵاو کاکە حەمە، سەرچاو بەقوربان، ئەوەچیە لێرەدا وەستاوی؟ من سەلام شوشەم؟ بەڵێ کاکە سەلام ئەتناسم، ئەمەوێت برۆم بۆکەلار بۆ کۆبوونەوە بەنزینمان نیە، بەسەر چاوهەر ئێستە بۆت ئەنێرم. دوای کەمێک لاندکرۆزێکی پێکاب هاتوو بیست لیتر بەنزینی داینێ، کەوتینەڕێ، لەسەروی خۆرهەلاتی شارەوە، شارۆچکەکەمان خستەدواوە، بەرێگایەکی لارو پێچ و

بەرزو نزمدا ماوەیەک هاتین، ئەمە یەکەم جارە بەرۆژ ئەم ڕێگاو ئەم ناوچە ببینم، چوونکە لەم سەرەوە، لەکەلارەوە چووین بۆ کفری شەو بوو.

دوای ماوەیەک ڕێگابڕین خانۆچکەی بازگەو چەندین بینای کلک و گوێ کراوی سەربازگەو مۆلگەی بێ سەقف و بێ دەرگاو پەنجەرەمان لێوە دەرکەوتن، خەڵک چینکۆ و لۆح و دار سێرەکانیان بردبوو، کەمێکیتر دێین ودەگەینە ئاواییەکی ماتەم نوێن، ئەمە سەرقەڵایە. لەسەرقەڵا مەفرەزەیەک ڕامان ئەگرن، لەکوێوە کاکە؟ شۆفێرەکە وەڵامی دەداتەوە، لەکفریەوە دێین. باشە چیتان پێیە؟ هیچ، ئەی ئەوە نیە چەکتان پێیە؟ بەڵێ پێشمەرگەین، زیاتر لەسەری ئەرواو پاسەوانەکانی من دەیانەوێت هەڵچن ناهێڵم و خۆم ئەپرسم کاکە چیتان ئەوێت؟ یەکێکی کوڵەبۆزی خرپن، دەڵێت ئێمە پێشمەرگەی بەرەی کوردستانین لێرە ئەو ئەشیاو کەلوپەلەی لەکفری خەڵک ئەیدزن و ئەیهێنین لێیان وەرئەگرینەوە. (ئەمە خۆی دزە، مەبەستم یارۆی کوڵەبۆزە) باشە کاکە ئێمە هیچمان پێنییە. ئەپرسێ باشە ئەی ئەم ئۆتۆمبێلەتان لەکوێ بوو؟ من لەدوای ئەوهەموو دان بەخۆگرتنەدا پێدەکەنم، ئەوجا دەڵێن فەرموون برۆن.

کەمێک لەبازگەکە دوور ئەکەوینەوە، ڕێگاکە بەلای ڕۆژهەڵاتدا لاردەبێتەوە بەدەشتێکی چۆڵدا درێژ دەبێتەوە تا شارۆچکەی کەلار، دوای مەسافەی چەند کیلۆمەتر لەسەرقەڵاوە بۆ کەلار ئاواییەک دەرئەکەوێ، من نازانم ئەوە ئاوایی شاکەلە ئەوەستم و لەسەر جادەکە لە شۆفێرێک ئەپرسم ئەم ئاواییە ناوی چیە؟ ئەڵێت ئەوە شاکەلەو ئەولاتریش سەیدەیە، یەکسەر سەدای گۆرانییە دڵفرێنە هەورامیەکەی حەمەحسێن کێمنەیی دێتە گوێم (ئەی خاوەر خاوەری ئاسکە شەلەکەی دەشتی شاکەلی). ئەها نووسەرو ڕۆشنبیرو پێشمەرگەی دێرینیش شێخ محەمەدی شاکەلیم بیرکەوتەوە.

کاتێک گەیشتینە ناو شاروچکەی کەلار چووینە ئەوشوێنەی کاک فەرەیدونی لێ بوو دوای چاکوچۆنی و کەمێک پشوودان، لەبارودۆخی کفری پرسی و منیش وەڵامم دایەوە، ئەویش بەگشتی باسی بەرەو پێش چوونی هێزەکانی پێشمەرگەی بۆناوچەکانی تری کوردستان کرد، لەوانە بەرەو کەرکوک و هەولێر. من داوام لێکرد هێزێک بنێرێت بمانگۆڕێت، ووتی هێزی یەدەکمان لەبەردەستدا نییە، هەموو هێزەکان لەواجب دان، کاک فەرەیدون دواجار بانگی کردمە کەنارێکەوە، ووتی حەمە ئەبێ لەکفری زۆر وریابن دوای پێدانی

هەندێک زانیاری، ووتی: هێزەکانمان لە دوز فشاری زۆریان لەسەر بووە هاتونەتە دەرەوەی شارەکە، شەهیدو بریندارمان هەیە، لەوانە حەمە رەش، باوک و برای کاک عوسمانی حاجی مەحمود، بەبیستنی ئەو هەواڵە زۆر نیگەران بووم، هەروەها ووتی: ئێستا لەهەوڵی کۆکردنەوەی هێزو دەرکردنی ئێوەشدان لەکفری. بۆیە ئێمەش لەبەر مەترسی پەلاماری مجاهدینی خەڵق بۆ سەر کفری و کوڵەجۆ بەپەلە گەڕاینەوە بۆ کفری.

مجاهدین هێزێکی گەورەی ئۆپۆزسیۆنی ئێران بوون، لەڕاپەڕینی گەلانی ئێراندا لەدژی محەمەد رەزاشا، ساڵی ١٩٧٩ و لەسەرکەوتنی ئینقلابی ئیسلامیدا دەوری کاریگەریان هەبوو، بەتێپەڕ بوونی وەخت، بوونە معارەزە و لەئێراندا دواتر وەدەرنران و هاتنە ناو عێراق. ئەم هێزە لەڕووی سەربازیەوە مەشق دیدە و هێزێکی شەڕکەر بوون، لەمانگی ١٩٨٨/٨دا دوای دەرچوونی ڕێککەوتننامەی شەڕی هەشت ساڵەی عێراق و ئێران، لەخاکی عێراقەوە لەسنووری (کاخی) قەسری شیرینەوە بەستونێکی(رەتلێکی) پڕچەک و پۆشتەو پەرداخەوە کەسەدان تانک و زرێپۆشیان پێ بوو پەلاماری ئێرانیاندا، بەناوی عەمەلیاتی ( فروغ جاویدان).

لەماوەیەکی کورتی چەند رۆژەدا، شارەکانی قەسرو سەرپێڵی زەهاویان جێهێشت و بەپاتاقدا تێپەر بوون و شارەکانی کرندو شەهابادیشیان خستە پشت سەرو بەرەو کرماشان ڕۆیشتن، تا گەیشتنە کەلی چوار زەوار، لەنێوان مایدەشت و شەهاباد(شائاباد) ، کە لای ئێرانییەکان بەگەردەنەی مرصاد بەناوبانگە. چوونکە ئێران بەرگریەکەی ناونا عەمەلیاتی ( مرصاد)، مجاهدین لەوگەردەنەدا بەریان پێگیراو دوای حەوت رۆژ تارومار کران و سوپای پاسداران تا قەسر کەوتنە شوێن پاشماوەی ستونە تێک شکاوەکە. ڕابەرو بەرپرسی ئەم هێزە مەسعودی رەجەویە لەگەڵ هاوسەرەکەی مریەم. لەم هێرشەدا مریەم بەکۆپتەر هاتە شائاباد ( ئیسلام ئاباد) و لەوێ دابەزی و قسەی کرد.

لەم ڕۆژەدا ئێمە پاشەکشەمان کردبوو، هەڵبجەو ئەو شوێنانەشی کەپێشترو لەپارتی زانیدا لێیبووین چۆڵمان کردبوون و چووبووینە ناو ئێرانەوە، ڕۆژێک ئێمە خەریکی گواستنەوەی پاشماوەی هێزەکانمان و چەکوچۆڵیان بووین لەشێخانەوە بۆ پاوە، ئەمان بینی هێزەکانی ئێران

بەتایبەت کوردە چەکدارەکان شڵەژابوون و هیچ ورەیان نەمابوو ئەیان ووت کرماشان سقوت دەکاو ئێمە دەکەوینە پشتەوە برئەدرێین.

ئەو ڕۆژە مجاهدەکان گەیشتبوونە کەلی چووار زەوار، من لەپاوە بووم، کەسێک بەناوی ئیسماعیلی قەتێ خەڵکی پاوە و فەرماندەی دەستیەک پاسدار بوو وەبەئازایەتی ناوبانگی هەبوو لەشەڕی عێراق ئێراندا، هاتەلام و ووتی کاک ئەنوەری ئەحمەدی ناردومی بۆلات لەگەڵ چەند فەرماندە گوردان و گروهاندا ئەیانەوێ بتبینن، میش ووتم بەسەر چاو. یەکترمان بینی کاک ئەنوەر دۆست و پێشتر ناسیاویم هەبوو، سەرەتا پرسیاریان کرد ئەم بارودۆخە چۆن دەبین و بەڕای ئێوە ئەم هێرش و پەلامارەی عێراق و مجاهدین چیەو نەتیجەی بەکوێ دەگات؟ لەڕاستیدا من نەمدەزانی ئاخۆ پیلانی هەردوو وڵاتە، عێراق و ئێران، بۆلەناو بردنی مجاهەین، عێراق ناردبنی بەتاکتیک، ئێران هێزەکانی پاشیکشەیان پێکرابێ لەقەسرەوە بۆ ئیسلام ئاباد بۆئەوەی ڕایانکێشنە قوڵایی تائێران لەناویان ببات؟ یان عێراق بەفرسەتی بزانێ و پشتیوانی کردبن بۆ گرتنی ناوچەیکی سنوری لەناوخاکی ئێراندا و یان هەر سیناریۆیەکیتری مخابەرتی.....تاد

من لەوانم پرسی ئێوە چۆن تێدەگەن؟ ئێستا گەیشتوونەتە کوێ و شەڕەکە چۆنە بەریان پێگیراوە شکاون یان نا؟ ئەبینم هیچ ورەیان نیەو ئاگاداری هیچ نین، لەوەش ئەچێت داواکرابن هێزبەرن بۆ ئەوێ، زوورزوو ئەیان پرسی ئێوە چیدەکەن؟ منیش ووتم ئەگەر گەشتنە کرماشان ئەوە پاوەو جوانرۆش برئەدرێت و ئەکەوێتە دەستیان، ئەبینم دەموچاویان گۆڕا، بەگاڵتەوە ووتم لەوکاتەدا پێکەوە ئەچینە شاهۆو دەست دەکەین بەپارتی زانی، ئەوە ئێمە چەکوچۆڵەمان زۆرە و ئەتوانیین ٥٠٠ تا ٧٠٠ گەنجی ناوچەکە چەکیان بەسەردا دابەش بکەین، ئەر مەیلی بەرگریان هەبوو. ئیتر ئەوان ڕۆیشتن و منیش کاک لایقی ولدبگی هات بەدوامدا چووم بۆماڵیان زۆر ماندوو هیلاک بووم بۆ پشودان و حەوانەوە.

مجاهدین لەبەهاری ساڵی١٩٩١دا لەکوردستانی باشور بوون بە بەربەست و کۆسپێکی گەورە لەبەردەم هێزەکانی بەرەی کوردستانی و خەڵکدا لەدژی ڕاپەڕین لەباشوور، لەخانەقینەوە بۆلای دوز، لەو شوێنانەدا ئەوان بەریان بەهێرشی پێشمەرگەو خەڵک گرت، بوونە ڕێگر لەبەردەم ئازاد کردنی

خـــانەقین و قەرەتەپەو جەبــارەو ســڵیمان بەگ. ئەم خەتە بــووبە بەرەی پێشەوەی هێزەکانی پێشمەرگە.

کاتێک کەشـاری دوز ئـازاد کـرا لەلایەن ڕەتڵەکەی کـاک عوسـمانی حـاجی مەحمـــود و شــــەهید حەمە ڕەشـــەوە، ئەو هێـــزەی مجاهـــدینی خەڵـــق، کەلەســـەربازگەی نەوجـــول بـــوون، هـــاتنە خـــوارەوە، بەنـــاوی ڕۆیشـــتن و گەشتنەوەیان بۆ سـەربازگەی ئەشرەف لە عـوزێم، لەنـاو دوزدا پەلامـاری پێشـمەرگەو خەڵکـی ڕاپەڕیویـان دا، بـوونە هاوکـاری سـوپای عێـراق و شارەکەیان خستەوە ژێر دەستی سوپا. لەو بارەوە کاک عوسمانی حاجی مەحمود، لەچاو پێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانی لەرۆژنامەی کوردستانی نوێی ساڵی هەشتەم، رۆژی۱۹۹۹/۱۰/۳ و رۆژانی پێشتری ئەم بەروارەی کردووە بەسێ بەش ، لەوێـدا بەوردی باسـی چـۆنییەتی ئـازاد کردنـی شـارەکەو دواتـر گـرتنەوەی لەلایەن مجاهـدین و سـوپای عێـراقەوە کـردوە بەناونیشـانی( مجاهدینی خەڵق چۆن شەڕی گەلی کوردو ڕاپەڕینەکەیان کرد).

موجاهیدین هەربەوەشەوە نەوەستان چەندین جار پەلاماری شـاری کفریـان ئەدا بـۆ سـەندنەوەی لەدەسـت ئێمە، بەڵام هەرگیـز سـەرکەوتوو نەبــوون، لەدوای ئەوە کەزانیــان لەکفــری و کوڵەجــۆوە ســـەرکەوتونابن، هێرشێکی تەکتیکی و لەناکاویان لەچۆڵەوانی نێوان کفری و کوڵە جۆوە کرد بۆ ناو کەلار، هێزێکی گەورەیان بەسواری دەیان لاندکرۆزی پێکاب و تانکو زرێپۆشـەوە کە وێـنەی مـام جەلال و چەنـدین شـەهیدی دیـاری یەکێتـی و دروشمی بەرەی کوردستانیان پێوە کردبوون، بێ بەرگری و تەقە خۆیـان گەیاندە ناوشاری کەلار، ئەمە بۆ ئەوە بوو هێزەکانی ناو کفری و کوڵەجۆ پاشەکشە بکەنەوە و ئەوان بێنە جێگەکانیان. بەڵام هێزێکی ناوچەی گەرمیان و ئەو بەری سیروان پڵنگ ئاسـا پەلاماریـان دابـوون و تێکیـان شـکاندن و هەمویـان گـرتن و کوشـتن، بەجۆرێـک ئەوانەی گەیشـتبوونە نـاو شـارەکە کەسـیان دەرنە چـوون. شـەڕ لەکەلار کۆتـای هـاتبوو، ئینجـا ئێمە لەکفـری زانیمان، لەبەرئەوە هیچ کاریگەریەکی نەبوو بۆسەر کفری و کوڵەجۆ.

بابێینەوە بۆسەر باسەکەی خۆمان، بەڵی گەیشتینەوە کفری کۆمەڵێک هاوڕێ و دۆستمان لەشارەزوورەوە هاتبوون، لەوانە کۆمەڵێک گەنجی کاکەییەکانی سنووری هەورامان، ئەمانە بەر لەراپەڕینیش هەر هاوکارو دۆستمان بوون،

کۆمەڵێک مامۆستاو خەڵکی خوێنەوار، لەوانە مامۆستا نائیب سابیرو مامۆستا نازم، بەداوای لێبووردنەوە ناوی زۆریانم لە بیرنییە. هاتون بۆئەوەی بمێنەوەو پشتیوانمانبن، پەیوەندی ئێمە (هەورامییەکان)و کاکەییەکانی هەورامان جگە سیاسەت و بیرو باوەڕ، پەیوەندیەکی قوڵو ریشەیی دێرینە، ئەوان قەد بەهۆی جیاوازی مەزهەبی و دینی لەناوچەکانی ئێمەدا کەمینەشن، زیانیان پێ نەگەیشتوە واتە لەلایەن ئێمە و دەورو بەرەکەیانەوە، کە موسوڵمانی سونی مەزهەبین.

کاکەییەکان، لەدێر زەمانەوە سان و سوڵتانەکانی حوکمرانی ناوچەیی هەورامان، بەچاوی جیاواز تەماشایان نەکردوون لەگەڵ دەورو پشتی خۆیان، هەرکاتێکیش مەترسیان لەسەر بووبێ پاراستویانن نەیان هێشتوە کەس زوڵمیان لێبکا. ئەوانیش وەفادار بوون، هەتا لەم دواییەشدا، کەمن بۆخۆم لەبیرم دێت، ئەگەر کاکەییەکانی هاوارو ئاواییەکانی تری کاکەی نشین، کێشەو گرفتێکیان هەبووایە پەنایان ئەبرد بۆ ماڵی کوێخا رۆستەمی کەریم تەوێڵەی باوکی مامۆستا ئەیوب. یان بۆلای حەمەی سان ئەحمەد (مام رەئیس) لەتەوێڵە، یان بۆلای باپیرم عەلی محەمەد لەدۆڵبیان، یان زۆر جار بۆ لای شێخەکانی عەبابەیلێ.

کویخا رۆستەم پیاوێکی کورد پەروەرو دۆستی خەڵک بوو، خەڵکی ناوچەکە خۆشیان ئەویست، لەحیزبی هیوادا ئەندام و بەرپرسی رێخستنی ناوچەکەش بووە، لەشۆڕشی ئەیلول دا بەرپرسی رێخراوی تەوێڵەو دەوروبەر بوو، هەروەها بەرپرسی پەیوەندی نێوان شۆڕش و ئێران بوو لەمەرزی شۆشمێ، لەگەڵ ئەمەشدا پیاوێکی کۆمەڵایەتی و هەمیشە خەریکی چارەسەر کردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان بوو، کاتێک ئەچو بۆهاوارو ئەهاتەوە لەدۆڵبیان لای ئەدایە لای باوا حاجیم.

مام رەئیس(محەمەد سان ئەحمەد)، سەرۆکی شارەوانی تەوێڵە بووە، شارەوانی ساڵی ١٩٤٢ دامەزراوە سەرەتا میرزا عەبدول قادر ٦ شەش مانگ بەخۆبەخشی سەرۆکی شارەوانی بووە، دواتر مام رەئیس بووەتە سەرۆکی شارەوانییەکە. پیاوێکی ئازا و خزمەت گوزارو بەهیمەت بووە، ساڵی ١٩٥٥ چوەتە دوکان بۆلای نوری سەعید سەرۆک وەزیرانی عێراق و سەعید قەزازی وەزیری ناوخۆ، لەوێ و هەرلەوکاتەدا بەهەوڵ و هیمەتێکی زۆر

بڕیاری درووست کردنی جادەی ئوتۆمبێلی هێناوە بۆ هەورامان، پڕۆژەی ئاو کارەبای لەناو شارۆچکەکەدا جێبەجێ کردوە، ساڵی ١٩٥٦ مەلیکی عێراق هاتوە بۆماڵی بۆ تەوێڵە. پیاوێکی ژیرو شارەزای مێژوو بوو، ساڵی ٢٠١٣ لەتەمەنی نزیک بەسەد ١٠٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

بەڵی ماوەیەک بوو ئێمە کەوتبووینە حاڵەتی بەرگری و پاراستنی شاری کفری ، بۆیە بڕیار درا لەحاڵەتی بەرگری کردنەوە بکەوینە پەلامار دان و دوورخستنەوەی هێزەکانی دوژمن لە شارەکە. هێزەکەی ئێمەو لەگەڵ هێزێکی گەرمیان و چەندین فەوج و هێزو بەتالیۆن و گروپ و تاقمی تری چەکدار، کەناوی جۆراو جۆریان لە خۆیان نابوو، ئەوانەی دوو هەفتە لەوەوبەر واتە بەرلەرۆژی ٣/٧ دا لەبەرەی دوژمندا بوون، ئەمڕۆ لێرە لەکفری لەگەڵ ئێمە کۆبوونەتەوە، من و چەند هەڤاڵێکم و کاک مەحمود سەنگاوی و چەند بەرپرسێکی تری ناوچەی گەرمیان و خودی کفری، بەرنامەیەکمان دانا بۆ هێرش کردن، کاتژمێری سفر دانراو هێزەکان دابەش کران. لەکاتی پەلامار دانەکەدا مەخفەرێک بۆهێزێکی تیپ١١ هەڤالانی ئێمە دانرابوو، لەکاتژمێری سفرەکەدا، چەندین شوێنی تر ئەو هێزانەی بۆیان دانرا بوون و ڕۆیشتبوون نەگەیشتبوون و هەر نزیک نەبووبوونەوە لێی، لەگەڵ کاک مەحموددا چاوەڕێی ئەوانمان دەکرد، لەناکاو هێزەکەی تیپی ١١ی هەورامان لەنزیک مەخفەرەکەدا کەوتنە کەمینەوە، بەرنامەکەمان ئاشکرا بوو، هێرشەکە نەکراو گەڕاینەوە بۆ شوێنەکانی خۆمان.

لەراستیدا هێزەکانی پێشمەرگە سەرەتا زۆر بەرێکوپێکی نەخشەو پلانەکانیان جێبەجێ دەکرد، بەلام کاتێک ئەو حەشاماتەو ئەو چەکدارە زۆرەی کورد لەگەڵ رژێم دا بوون، ئێستا تێکەڵ بوون لەگەڵ پێشمەرگە، بەهۆی بێنەزمی و کۆنترۆڵ نەکردنیان لەچوارچێوەی یاساو رێسای پێشمەرگانەدا. وەلەراستیدا ماوەش نەبوو بۆ پاککردنەوەو بژار کردن و دابەشکردنیان بەسەر هێزەکاندا، هێزەکانی پێشمەرگەشیان توشی جۆرێک لەبێسەرەوبەرەیی کرد. ئەمە نەک هەرلەلای ئێمە، لەهەموو بەرەکانی شەڕو میحوەرەکاندا.

تەماشا بکەن هێزێک رژێم لەسەرۆک قەبیلە، بنەماڵە، عەشیرەت، شێخ، هۆز، پێکی هێناوە، کەسێکی مشەخۆر تالانکەری چاوچنۆکی کردووە

بەبەرپرسی دەیان یان سەدان کەس لەئەندامانی بنەماڵەو عەشیرەتەکەی، لەدەوری کەسێک بەناوی مستەشار، بەبێ بیروباوەڕ و مەبدەئێک، تەنها بۆ پارە کۆکردنەوەو ڕاوە پێشمەرگە بەکرێی و چەکداری کردوون. ئێستا ئێمە دەبێ چ سوودێکیان لێوەرگرین، ڕاست لەکاتی ڕاپەڕینـدا، ڕژێمی بەعس نزیکەی (٤٥٠٠٠٠) چوارسەدوو پەنجا هەزارمرۆڤی کوردی بەوجۆرە چەکدار کـردووە، بەکرێـی گرتـوون بـۆ دژایەتـی کردنـی پێشـمەرگەو هاوکـاری داگیرکەرانی گەلەکەی خۆیان.

ئەمانە کاتێک تێکەڵی هێزی پێشمەرگە بوون، لەهێرش و پەلامارەکانی پێشمەرگە لە ڕاپەڕیندا بۆ سەر دوژمن، لەوشوێنانەدا سوپای عێراق ئەشکا سـەرگەرمی تـالان و بـڕۆو دزی و ڕاوڕووت و شـڕەخۆری دەبـوون، لەهەرشوێنێک سوپا دەستی بکردایەتەوە، ئەمانە وەک ڕانەمەڕی پەلامار دراو لەلایەن گورگەوە بۆدواوە ئەسلمینەوە، پێشمەرگەش ئەمەی ئەبینی بێ ئومێد دەبوو، لەچەندین شوێندا پێشمەرگەیان بەجێ ئەهێشت و دەبوونە هۆی قوربانی دانی گەورە، ببوونە هۆی بێ متمانەیی لەناو هێزەکاندا. لەم هێرشەی ئەمشەوی کفریدا بۆسەر دوژمن، ئەوان بوونە هۆی سەرنەکەوتنی پلانەکە. لەولاشـەوە کەرکوکیان بەهەمـان دەردبـرد، بـۆیە زیانیـان زۆرتـر بـوو لە قازانجیان.

# یەکێتی ئیسلامی

لەکفریدا بووین رۆژێک بەکاک ئەکبەرم ووت من سەرێک لەسلێمانی دەدەم، دەبوو مۆڵەت لەسەرووی خۆم وەرگرم، بەلام ئەوەم نەکرد هاتمە سلێمانی، لەسلێمانی چوومەماڵی برادەرێکم خۆم شۆرد و ریشم تاشی و قاتێک رانکوچۆغەم پۆشی و دوای نان خواردن چووم بۆ ناوبازار، هیچ ئیشێکم بەبازار نەبوو قەلەقیش بووم، تازە کەرکوک گیرا بوو، بەبرادەرەکەم ووت بۆنەچین بۆکەرکوک؟ ووتی ئیشت چیە بەکەرکوک؟ ووتم هەرحەزدەکەم ئەو شارە ببینم کەرکوکم نەدیوە، ئەمزانی کەرکوک تاسەر بەدەستمانەوە نابێت، هۆکاری گرتنەکەی یەکەم: شکان و ورە بەردانی سوپای عێراقە لەسلێمانی و ناوچەکانیتر بوو، دووەم: ئەوجۆش و خرۆشە کاتیەی جەماوەربوو. بەلام لەراستیدا بەپێی باروودۆخە نێودەوڵەتی و ناوچەییەکە و شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنە سیاسییەکانی چاودێرانی سیاسی لەرادیۆ جیهانییەکان بەتایبەت (بی بی سی) وەزیاتریش دەست تێوەردانی ئێران لەراپەرینەکەی باشووری عێراق دا گەیشتبوومە ئەوبڕوایەی ئەمریکا ناهێڵێت عێراق بروخێ و ئاشکراش بوو چاوپۆشی دەکات تا سوپای عێراق کەرکوک بگرێتەوە و لە کوردی بسەنێتەوە، بۆیە حەزم دەکرد بچم کەرکوک ببینم، بەلام من ئەمەم شینەکردەوە بۆ برادەرەکانم.

یەکێک لەهەڤاڵەکانم ووتی منیش دێم چەند ماڵە خزممان هەن سەردانیان دەکەین و بزانین چیان بەسەرهاتووە، هەرئەو ئێوارە چووینە کەرکوک، بەلام بە چ نارەحەتیەک . هەرلەسلێمانی دەرچوین وەک مێروولە ئۆتۆمبێل بەدوای یەکدا دەهاتن بەرەو سلێمانی، تا دەچویتە پێشتر حەشاماتەکەو کێشەکردنی کەرەستەو تالانی زیاتر دەبوو، بەجۆرێک دەتوت شارەکە دەگوازنەوە. لەرێگا لەچەندین شوێندا دەمانبینی خەڵکی دەرگیرو شەریانە لەسەر چەپاو، لەچەمچەماڵ یەکێک لەپێشمەرگەکان ووتی ئەوە باوکت بوو لەوئۆتۆمبێلەدا بەرەو سلێمانی دەچێت، نەمان توانی بووەستین وببینین. گەیشتینە ناوشاری کەرکوک، راست چووینە بینای پارێزگا تابزانین

لەهەڤالانی خۆمان و ناسراو کێ لەوێیە، کەس بەکەس نەبوو، گەراینە دواوە چووینە بەنزین خانەیەک بەنزین وەرگرین، کوڕێکی بالابەرزی جوان جامەدانی سوری کردوەتە مل چەکی پێیەو ئۆتۆمبێل و خەڵکەکە رێک ئەخا، ووتم ئەو کوڕە شێوەی ئاشنایە باپێبڵێین پێشمان خات، ووتیان کوڕە ئەوە بێژەرەکەی تەلەفزیۆنی کوردی کەرکوکە.

دوای وەرگرتنی بەنزین چووین بۆگەڕەکێک لەسەر رێگای بەغدا، خەڵکەکە ئەترسێ، ئەوماڵانەمان دۆزیەوە ناسراو خزمی کوڕەکانی هاوڕێمان بوو، پێشوازی گەرمیان لێکردین، دوای کەمێک خەڵکی هەموو گەڕەکەکە هاتن بۆ لامان، ئەیان ووت ئەترسین کورد بمان کوژن یان تالانمان بکەن، ئێمەش قسەمان بۆ کردن و ووتمان نا شتیوانییە مەترسن، داوای عەدەمیانێ دەکرد( وەرەقەی دڵنیایی) ووتمان وەرەقەتان ناوێت و نەترسن ئەوەی ترسی هەیە برۆات خۆی بناسێنێ بەبەرەی کوردستانی. لەناکاو دە دوانزە ژن هاتنە بەردەمی من و دەستیان کرد بەهەلهەلەی خۆشی، منیش بەکوڕەکانی هاوڕێم ووت هەستن بابڕۆین ئەمە چیە؟ هاتینە دەرەوە لەوکاتەدا چەند پیاوێکی عەگاڵ بەسەر هاتن ووتیان فریامان کەون ئەوە لەو کۆڵانەی ئەودیو چەند چەکدارێک بەناوی پێشمەرگەوە پارەو ئاڵتون لەخەڵک ئەسەنن، منیش ووتم بەهاوڕێکانم بابڕۆین، ووتیان ناعەیبە بابزانین چیەو کێن، لەگەڵ پیاوەکاندا هاتین چەندکەسێکمان بینین من بەجلوبەرگ و چەکوچۆڵەکەیاندا زانیم ئەوانە پێشمەرگە نین نزیکەی دەکەس بوون زۆریان منداڵ بوون، بانگم کرد ئێوە کێن ماڵان ئەگەڕێن؟ یەکێکیان ووتی یەکێتین، یەکێتی سەر بەچ تیپێکن؟ ووتی تیپی یەکێتی ئیسلامی، بەدەم ئەم قسەکردنەوە رایان کردو دور کەوتنەوە. منیش بەپیاوەکانم ووت دزن درۆ دەکەن پێشمەرگە نین، ماڵئاواییمان لێکردن و ئەوناوەمان جێهێشت.

لەگەڕەکەکەوە دەهاتینەوە بۆ ناوەندی شار من سێ پێشمەرگەم لەگەڵ بوو بەڵام بەدەستوبرد بوون، بەکوڕەکانی لەگەڵمان هاتبوون و شارەزا بوون، ووتم من ببەنە شوێنێک برادەرانی یەکێتی لێبێت، ووتیان ئەچینە ماڵی ناسراوەمان زۆرن، ووتم من نایەمە ماڵی خەڵک بۆ خەوتن، یەک ئۆتۆمبێلمان پێبوو بۆیە، پێکنەهاتین و درەنگانی شەو گەڕاینەوە بۆ شاری سلێمانی.

ڕۆژی٢٦/٣/١٩٩١ لەسلێمانی بووین و سەردانی لیژنەی بەرەی کوردستانیم کرد لەبینایەی سەناعەدا کاک جەمیل هەورامیم بینی بڕێک فایل وکاغەز لەبندەستیدا بوون ئەو بەرپرسی لیژنەکەیە، ووتم ئیشم پێتە لەبەر قەربالْخی ڕێگە نەبوو دانیشین، چووینە گۆشەیەکەوە، سەری قسەم دامەزراند بەحیسابی ئەوەی کۆمەڵێک پێشنیار بخەمە بەردەستی، تائەویش لەگەڵ لیژنەی بالا گفتوگۆی لەسەر بکەن، سەبارەت بەو گلەوگازندەی خەڵک لەسلێمانی بیستبووم و وە لەکەرکوک بۆ چەند کاتژمێرێک بینیبووم، بەتایبەت لەسەر تالان و هەندێک هەڵسوکەووتی نابەجێ ونەشیاو لەگەڵ خەڵکی ئەو شارە، بەوەڵام دانەوەکەیدا بۆم دەرکەوت ئەو لەمن زیاتر ئەزانێ و پڕترە، منیش بڕێک داخی دڵم بەجنێودان بەکورد و بەسیاسەتی دەربڕی و خواحافیزیم لەکاک جەمیل کرد. بۆشەوەکەی هەواڵی شکانی هێزەکان لەکەرکوک بڵاو بوەوە، من بیستبووم کاک کەمال مفتی لەڕاپەڕینەکەدا بەسەرکردایەتی بەرەی کوردستانی ووتوە هێرش مەکەنە سەر کەرکوک.

کاک کەمال مفتی ئەوپیاوە تێکۆشەرو ناودارەیە، هەر لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە، بووە ناوی کەسایەتیەکی سیاسی و عەسکەری خۆشەویست لەمەیدانەکەدا، لەبەر ئەوە لەناو سوپای عێراق دا پلەی عەسکەری نەقیب بووە، لەناوشۆڕشدا شۆرەتی ڕەئیس کەمالی بەسەردا بڕا. من منداڵ بووم لەدورەوە بەکەسێکی عەسکەری و فەرماندەرێکی سەرکەوتووی ناو شۆڕش و پێشمەرگە ناویم بیستبوو، بەتایبەت ئەوکاتەی فەرماندەی هێزەکانی کەرتی سێ و چوار بوو واتە لەکورکوکەوە بۆ مەندەلی و لەوێوە بۆ هەورامان و سلێمانی، ئەودەم بارەگای لەقۆپی قەرەداغ بووە. دواتر کەلەنزیکەوە ناسیم بۆم دەرکەوت جگەلەوەی فەرماندەیەکی عەسکەری بووە، سیاسەت مەدارو پیاوێکی حیزبی و یاسایی سەرکەوتوش بووە، زیاتر لەمەش یەکێکە لەتێکۆشەرە دەست پاکەکانی مەیدانی کوردایەتی. ئەوەی مەبەستی منبوو لێرەدا باسم کردوە ئەوەیە بەهاری ساڵی ١٩٩١ کاتێک هێزەکانی بەرەی کوردستانی ئامادە ئەکرێن بۆ هێرش کردنە سەر شاری کەرکوک، چەند کەسێک لەقیادەی یەکێتی نیشتیمانی لەوانە کاک نەوشیروان، کاک فەرەیدون عەبدولقادر، کاک قادری حاجی عەلی، کاک عومەر عەبدولا سەردانی ئەکەن، لەناو شاری سلێمانی، سەبارەت گرتنی کەرکوک قسەوباسی

لەگەڵ ئەکەن، پێداگری لەسەر ئەوە ئەکات جارێک واز لەکەرکوک بهێنن، من ئەمویست بزانم بۆ؟ بۆیە لەسەردانێکیدا ئەوپرسیارەم لێکرد، ئەمەش وەڵامی کاک کەمال بوو: ( ئەوکات مام لەلوبنان بوو، ئەوان ووتیان، ئەمانەوێت کەرکوک بگرین من پێشبینی ئەوەم ئەکرد کەکەرکوک گیرا دوای گرتنی ١- ئەبێ بەرگری بکەیت و بیپارێزیت پاراستنیشی لەحەمرین ئەبێت، ئەوکات کورد هێزی پاراستنی نەبوو، ٢- لەوبڕوایەدا بووم تورکیا تەداخول دەکات.

بەیانی رۆژی٣/٢٧ بەرەتای هێزەشکاوەکان بەرەو باکوور و باکووری رۆژهەڵات دەستی پێکرد، بەقەولی مەعروف (ئەمریکا چرا سەوزی بۆسەدام هەڵکرد)، ئەمریکا بەدرێژایی پەیوەندی خۆی لەگەڵ کورددا و بەتایبەت لەشەڕو شۆڕ و پێشهات و روداو ئاڵوگۆڕەکانی ڕۆژهەڵاتی ناویندا، بەسەر هەڵدانی(داعش)دەوڵەتی ئیسلامی لەعێراق و شامیشەوە، مەسئەلەو کێشەکانی نەتەوەی کوردی بەکێشەی ناوخۆی وڵاتانی ئێران و عێراق و تورکیاو سوریا زانیوە، نەک بەکێشەی نەتەوەو گەلێکی داگیرکراو دابەش کراوی پەنجا ملیۆن کەسی. بۆیە ئێستاش من بەدوری نازانم، دوای تەواو بوونی شەڕی داعش ئەمریکا بەکورد بڵێت: سوپاس ئێوە شەڕکەری باش بوون، بڕۆن لەگەڵ حکومەتی عێراق کێشەکانتان چارەسەر بکەن.

بابێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، شیکردنەوەو پێشبینییەکانی ئەم مەسئەلە بدەینە دەست مێژوو.

چەن ڕۆژی تر تێپەڕین من لەسلێمانی لەماڵی کاک نورەدینی سەید قادری باخچەدا بووم، پێکەوە یەک دوجار چووین بۆسەیرکردن و بینینی هەڵەبجە و دەوروبەری و نەگەڕامەوە بۆ کفری، جارجار لەم شۆڕشەو لەم (کاروانە بێکۆتاییەدا) وەک ڕەحمەتی مامۆستا مەحمودی مەلا عیزەت کردویەتی بەناونیشانی بیرەوەریەکانی. هەندێک ئەرکو واجب هەبووە نارەحەتیەکەیم بڕیوەو تەواوم کردووە، لەئاخرو ئۆخرەکەیدا لەقەیەکم لێداوە، ئەوەتا هێزەکەم لە کفری بەسەر کاک ئەکبەرو فەرماندەکەرتەکانەوە جێهێشتووە. لەشکان و پاشەکەشدا ئەوان بەرەو بەمۆ و منیش لەسلێمانی وکەرکوکم و دواتر دەچم بۆهەڵەبجە و شارەزوور.

ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کاتێک ویستم بگەڕێمەوە لای هێزەکە فریانەکەوتم، ئەورۆژە بڕیار بووە برادەران بگوڕن، ئەوهێزەی چووە بیان گۆڕێ، دوای

دەور و تەسلیم و وەرگرتنی شوێنەکانیان، هێزەکەی تیپی ١١ ئەگەڕێتەوە، لەرێگای کەلار کفری بەرێوەیە بۆ کەلار، وەختێک دەزانن ئەوهێزەی هاتووە جێگەیان، ئەدا بەلایانداو ئەمانیش دەپرسن بۆ گەڕانەوە؟ چی ڕویداوە بۆ جێتان هێشت؟ دەڵێن هەموو پاشەکشەی کردووە.

بەڵێ، پێشمەرگەو خەڵک لەهەموولاوە بەرەو سەر سنوورەکان کەوتنە رێگە، ئەوەبوو ئەو پاشەکشەو کۆچە، بەکۆڕەو مەشهور بوو. هێزەکانی سنووری گەرمیان بەرەو بناری بەمۆ پاشەکشەیان کرد، تیپی (١١)ی هەورامانیش بەشێکی سەرەکی بۆ ئەوێ و لەگەڵ گەرمیان چوون، بەشێکی کەمیشی بەرەو شارەزوور هاتن و رۆژی١٩٩١/٤/٢ لەهەڵەبجەی تازە (قەزای شارەزوور ) یەکمان گرتەوە.

هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەگرتنی شاری کەرکوک و پاشە کشەکردن لێی قوربانی گەورەیاندا، بەتایبەت هێزەکانی یەکێتی، بۆ وێنە بەتالیۆنی حەوت کەنزیکەی (٨٠) هەشتا پێشمەرگە بوون (٦٠) شەست پێشمەرگەو فەرماندەیان شەهید بوون، لەوانە شەهید عەبدرەزاق سەرکردەی دیارو ناسراو. هێزەکانی رژێم بەبێ بەرگری زیان دەستیان بەرسەر کەرکوکدا نەگرتەوە، لەسەربازگەی خالید دا هەڤاڵ ئەحمەد بەڵخەی و کۆمەڵێک پێشمەرگەی یەکێتی و پارتی داستانی کەم وێنەیان تۆمار کرد بەخوێنی ئالی کوڕانی هەورامان و هەڵەبجە، هەروەها لەچیمەن، پۆلێک کوڕی قارەمان و هەڵۆی بەرزەفڕی وەک شۆڕشی حەپسەو هاوڕێکانی بەکۆمەڵ گیانی خۆیان فیدای کەرکوک کرد.

بەڵێ خوێنەری ئازیز تائێرەو ئەمەی لەم چەندبابەتەی سەرەوەدا بیرەوەریەکانی من بوون لەگەڵ راپەڕین. بەلام بەگشتی و بەکورتی، ئەو راپەڕینە یەک مانگ تەمەنییەی کورد لەکوردستانی باشوور، ئەکرێ بڵێین، ئەوەش ئەو جۆرە خەباتەیە خەباتی راپەڕین، بۆ ئەو جۆرە زەمەنە مێژوویانە کەلەئەنجامی رووداو گەلی چاوەڕوانکراو یان چاوەڕوان نەکراودا دێنە پێش. راپەڕین دەرئەنجامی بارودۆخێکی سیاسی و نێودەوڵەتی بوو، ئەشکرێت بڵێین خۆش بوونی زەمینەی راپەڕین لەئەنجامی هەڵەکانی سەدامی دیکتاتۆری عێراقەوە بوو، کەدوا هەڵەی ئەوکاتی پەلاماردانی وڵاتی کوێت و داگیر کردنی بوو.

راستە ئەمەی خوێندتەوە ئامادەکاری و ماندوو بوونی منی پێشمەرگەو هەڤاڵەکانم و ئۆرگانەکانی یەکێتی و ئەندامان و لایەنگرانی حزبی و لایەنە سیاسییەکانی تر و خەڵکی دڵسۆزو داخ لەدڵ و حەماسە گرتوو و خرۆشاو بوو بۆ راپەڕین. لەگەڵ ئەمەشدا، هەموو لاکانی بەرەی کوردستانی بیرکردنەوەو بۆ چوونیان سەبارەت بەراپەڕین لەسەرەتاوە وەک یەک نییە، سەرەرای کۆبوونەوەکانی لایەنەکان پێکەوەو کۆنوسینەکان و راگەیاندنەکان. کەچی هەندێک کەسایەتی و لایەن بروایان بەراپەڕین نییە و دوای کۆبوونەوەکانی ئامادەکاری بۆ راپەڕین، گوێم لێبووە بەگاڵتە جاڕییەوە باس لەکۆبوونەوەکان و بڕیارەکان دەکەنەوە، بەجۆرێکیتر تەماشای بارودۆخەکەیان دەکرد، دەیانوت مەفرەزەکانی پارتیزانی و ئامادەکاری هیچ ئەنجامی نابێت و سەدام و سوپاکەی لەکوردستان وەدەر نانرێت، لایەن هەبوو لەکۆبوونەوەکانی بەرەدا تارۆژی١٩٩١/٣/٥ و دوای گرتنی رانیەش باوەڕی بەراپەڕین نەبووە و نەچووەتە ژێر ئەوبارەوە .

هەنگاوەکان بۆ راپەڕین بەپێی بەرنامە نەبوو، ئەو بەرنامە کەم و کورتەش هەبوو هی نەوشیروان مستەفا بوو. ئەودەم ئەوسەرپەرشتی یەکێتی دەکرد، مام جەلال لە کوردستان نەبوو، بەرنامەکەی ئەویش وەک پێویست جێبەجێ نەدەبوو، سەرکردایەتی بەرە یەک دەنگ و یەک هەڵوێست نەبوون، راپەڕین راپەڕینێکی شپرز بوو، لایەنێک لەهەوڵی زیاتر رزگار کردنی ناوچەکان و خاک و شار و شارۆچکەکان و دەرکردنی حکومەت دا بوو، لایەکی تریش خەریکی کۆکردنەوەی دەست کەوت و خۆنمایش کردن و فروفێڵ بوو، جیاوازی بۆ چوون هەبوو لەسەر گرتنی کەرکوک و موسڵ، تواناکان دابەشکرابوون بۆپاک کردنەوەی ئەو دوو شارە، کەرکوک گیراو موسڵ کەس نزیکیشی نەکەوت .

سەرەتاو لەگەرمەی حەماسەی خەڵک و پێشمەرگەدا، بەرلە پەلاماردانی کەرکوک، لەلایەن سەرۆکەکانەوە هەرەشەی تێکەلاو کردنی دۆ و دۆشاو دەکرا، لەسەر چی؟ لەسەر قەسرێکی دیکتاتۆر کە بۆ بارەگای کام حزب و کام سەرۆک بێت، لەئازاد کردنی کەرکوک وشارەکانی تردا حیساب بۆ بەرگریکردنیان لەدوای رزگار کردنیان نەکرا بوو. لەگەرمەی راپەڕین و رزگارکردنی کەرکوکدا، داوای عێراق بۆ گفتوگۆ بەهەند وەرنەگیرا. دەوری

دیاری ئێران لەڕاپەڕینی باشووری عێراق، نەخوێندنەوەی سیاسەتی وڵاتانی دراوسێی عێراق سەبارەت بەبارو دۆخەکەو بەتایبەت بەرامبەر بەکەرکوک و راپۆرتەکانی چاودێرانی سیاسی بیانی سەبارەت بەبێ نەزمی هێزە کوردستانییەکان، ئەمانەو زۆرشتی تر بوون بەبەشێک لەهۆکارەکانی سەرنەکەوتنی راپەڕین و دروست بوونی کۆڕەو.

ئەگەر کەسێک گومانی لەدروستی و راستی ئەم چەند بڕگەی سەرەوە هەیە، بابچێتە لای کاک عوسمان عومەرو کاک بەختیار مستەفا و بێتەل چیەکانی ئەوسەردەمەو تەماشای پەیامە نێردرا و وەرگیروەکانی سەرکردەکانی بەرە بۆ یەکتر بکات.

# کۆڕەو

کۆرەو کۆچ و رەوی زیاتر لەملیۆنێک هاوولاتی کورد لەکوردستانی باشوور، ئەم رەوە سەرەتای مانگی چواری ساڵی ١٩٩١ بە گەورەترین کۆڕەوی کوردان ناوزەند کراوە، کۆڕەو لەدوای ئەوەڕوویدا، کە ئەمریکا چرای سەوزی بۆ عێراق هەڵکرد، تا کۆپتەر و چەکە قورس و دوور هاوێژەکانی بەکار بهێنێ، بەتایبەت بۆ کۆنترۆڵ کردنەوەی شاری کەرکوک.

سوپاکەی رژێمی بەعس هێرش و پەلاماری دەست پێکردەوە بۆسەر ئەو ناوچە رزگار کراوانەی کوردستانی باشوور کەلە سەرەتای مانگی سێی هەمان ساڵدا لەراپەڕینە جەماوەرییەکەی باشووری کوردستاندا ڕزگار کرابوون، بەپشتیوانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، ئەوناوچانەش هەموو ناوچەکانی پارێزگای سلێمانی و بەشێکی زۆری کەرکوک وهەولێرو دهۆکی گرتبووەوە، کۆڕەوەکە سەدان قوربانی لێکەوتەوە. قوربانییەکان لەئەنجامی سەرماو سۆڵەی ناوچە شاخاویەکان و مەیدانەکانی مین (ئەڵغام) و برسییێتیدا بوونە قوربانی.

١٩٩١/٣/٢٨ هێزەکان لەکەرکوک شکان و کشانەوە، لە ١٩٩١/٣/٣١ لەهەولێریش هاتنە دەرەوە، لەراپەڕیندا مام جەلال لەدەرەوە بوو. ئەوەبوو لە١٩٩١/٣/٣٠دا مام جەلال و کاک جەبار فەرمان و چەند هەڤاڵێکی تر لەسوریاوە گەڕانەوە بۆ کوردستان. کاتێک مام گەیشتەوە سنووری هەولێر، بارودۆخەکە ئەوە بوو هێزەکان لەشارەکان ئەکشانەوەو رەوی خەڵک دەستی پێکردبوو، ئەوە بوو بێ دواکەوتن، مام جەلال لەشەقلاوە کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ سەرکردەکانی بەرەی کوردستانی دا ساز کرد، بۆخۆسازدانەوە و بەرگری کردن، تا لەچەند شوێنێکدا بەرگری بکرێ بۆئەوەی سوپای داگیرکەر بەکەماڵی ئیسراحەت ناوچەکان نەگرێتەوە.

ئەوەبوو داستانی کۆڕێ و ئەزمڕ تۆمار کران، ئەوەی کۆڕێ ، بەبەشداری گشت هێزەکانی بەرە تۆمار کرا، ئەوانەی یەکێتی، کاک کۆسرەت، شەهید کوێستانی، شەهید رێباز، شەهید فاقە، شەهید تەحسین کاوانی و

سەفین مەلاقەرە......تاد بەشدار بوون. دوای ئەوە رۆژی ١٩٩١/٤/٢مام گەیشتە سلێمانی و لەبارەگای بەرەی کوردستانی کۆبوونەوەی ئەنجام داو لەوێش باسی ئەوەی بۆفەرماندەکان و سەرکردەکان کرد، تا لەچەند جێگەیەکی گونجاودا بەرگری بکرێت، بۆ ئەوەی هیچ نەبێ پارێزگاری لەجەماوەرە کۆڕەو کردووەکە بکرێ .

ئەوەبوو کاک عومەر عەبدوڵاو شێخ جەعفەرو شەهید شەوکەت و مام رۆستەم و قادری حاجی عەلی و چەندین فەرماندە تیپ وکەرت بەوکارە هەستان و لەچەندین شوێندا ڕوبەرووی دوژمن بوونەوە، دواجار داستانی پڕ قارەمانییەتی ئەزمەڕ تۆمار کرا.

هێڵەکانی کۆچ بەم شێوە و ئاراستانە بوون، لەدهۆک و سنووری بادینانەوە بەرەو ناوچە شاخاویەکان و سنوورەکانی دەوڵەتی تورکیا و بەشێکیشی بەرەو سۆران و حاجی ئۆمەران بەرێگەی هاملتۆن دا بەرەو خانێ و پیران لەکوردستانی رۆژهەلات.

رەوەکە لەهەولێر و شار و شارۆچکەکانی پارێزگاکەوە بە دوو ئاراستە، ئاراستەی یەکەم هەمان رێگای هاملتۆنە، بەرەو خانێ و پیران شار، ئاراستەی دووەم بەرەو رانیەو قەلادزێوە سنووری قاسمەرەش بۆ شاری سەردەشت لەکوردستانی رۆژهەلات.

لەکەرکوک و سلێمانییەوە بەسێ ئاراستە، یەکەم : لەسلێمانییەوە بەئەزمڕدا بەرەو شارباژێرو چوارتاو سەرچۆمی چۆمان بەرەو شاری بانەی کوردستانی رۆژهەلات.

دووەم: لەسلێمانی بەرەو شارباژێرو پێنجوێن لەوێوە بۆ شاری مەریوان لەکوردستانی رۆژ هەلات، لەپێنجوێنەوە لقێکی کۆچەکە بەرەو باکووری رۆژ ئاوایی شارەکە جیا دەبووەوە بۆسنووری سەیرانبەن لەوێوە دەچووەوە بۆشاری بانە.

سێهەم: لەسلێمانییەوە بەرەو شارەزوورو پێنجوێن و هەڵەبجە و هەورامان، لەسەیدسادق لقێکی لێ دەبووەوە بەرەو پێنجوێن، لقێکیتری بەرە و هەورامان، لەهەورامان کۆچەکە ئەبووە دوو لق، لقی سەرەکی لە بیارە و تەوێڵەوە بەرەو شارۆچکەی نەوسوودو شاری پاوە لەکوردستانی

ڕۆژهەلات، لقی دووەم لەخورماڵەوە بەرەو سنووری ملەخوردو لەوێوە بۆ شارەدێی دزلی لەکوردستانی ڕۆژهەلات.

لەسنووری ئیدارەی گەرمیانەوە هێڵی کۆچی کۆڕەو بەدو ئاراستە بوو، یەکەم: لەشارو شارۆچکەکانی دوز کفری و کەلار و باوە نور و دەربەندیخانەوە بەرەو دەربەنی سەرتەک و بناری بەمۆ و لەوێوە بۆ شارۆچکەی تازاوا و شاری جوانڕۆ لە کوردستانی ڕۆژهەلات. دووەم: لەهەمان شار و شارۆچکەکانی گەرمیانەوە بەرەو مەرزی تیلەکۆ و لەوێوە بۆ تازاوا و سەرپێل.

کۆچ و رەوی جەماوەریی بادینان و سنوورەکانی پارێزگای دهۆک و بەشێکی پارێزگای موسڵ، بەرەو سنوورەکانی تورکیا ملیان نابوو، سەرەرای سەختی کەشوهەواو پیادەڕەوی و برسێتی و نەخۆشی کۆچ بەران، کاتی گەیشتنیان بۆ خاڵە سنوورییەکان لەلایەن دەزگای ئەمنی میت و جەندرمەکانی تورکیاوە رووبەرووی توندترین شێوەی ڕێگری و مامەڵەی نامرۆڤانە بوونەوە، دەرگاکانیان بەڕویاندا داخستن و ئەوەی سوکایەتی بوو بەرامبەر بەو خەڵکە لێقەوماو دەربەدەرەیان کرد، بۆیە خەڵکەکە گەیشتن بەوباوەڕە بگەڕێنەوە بەعسییەکان و سەدامییەکان بیانکوژن باشترە تا ئەو سوکایەتی پێکردنەی تورک قبووڵ بکەن.

ئەوە بوو زۆربەی زۆری کۆڕەوەکە چوە ناو ئێرانەوە، بەشێکیشی لەناوچە شاخاویەکان و لەناو شار و شارۆچکەو گوندە وێران کراوەکان و لەسەر سنوورەکاندا مانەوە، بەتایبەت لەسەر سنووری کوردستان و تورکیادا، بەلام لەخاکی باشووری کوردستاندا. تورکیا ڕێگەی نەدا کۆچڕەوکەرەکان بچنە ناوەوە.

هاوکاری و یارمەتی دانی کوردەکانی باشور لەکاتی لێقەومان و ئاوارە بووینداو پشتگیری حیزبەکانیان و شۆڕش و مەسئەلە ڕەواکەشیان بەدرێژای مێژوویەکی زیاتر لە چل ساڵە، لەلایەن دراوسێکانیانەوە کە وولاتانی ئێران و تورکیاو سوریان. هەموکات ئێران لەوانی تر زیاتر هاوکاری و یارمەتی داوین، ئێران مەبەست لەدەولەتی کۆماری ئیسلامیە، خۆئەگەر بە تاکتیک و بۆبەرژەوەنی خۆیشی بووبێ وەک هەندێک ئەڵێن، ئەو هاوکارەیەکەی کردووە.

ئەم هاوکـــاری و پشـــتیوانییە لەهـــاتنە ســـەرکارو دەســـتەلاتی ئەوانەوە بۆحیزبەکان و شۆڕشەکان و ئاوارەکانی کوردستانی باشور بۆ یەکێتی و پارتی و شۆسیالیست بەردەوام بووە، ئەگەرچی بۆ یەکێتی بەپچڕپچڕیش بووبێ.

لەوانە یەکەم: وولاتەکەیـان دەرگـایەکی ئـاوەڵابووە بەڕووی کوردسـتانی باشوور و دنیای دەرەوەدا.

دووەم: وولاتەکەیـان پەنـاگەی ئـاوارەو لـێ قەومـاوانی کوردی باشـوور و مەیـدانی کـاری سیاسـی بـووە، لەسـەرەتای دەهەی هەشـتاکانی سـەدەی ڕابردوودا، بەتایبەت بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان، هەروەها بۆیەکێتی و شۆسیالیسـتیش لەکۆتـای سـاڵەکانی هەمـان دەهەدا. ئەمە بۆئۆپۆزسـیۆنی عێراقیش هەر بەهەمان شێوە بووە.

سێهەم: زۆر بەگەرمی پێشوازی و هاوکاریان لەگەڵ کۆمەلانی خەڵکی ئاوارەی کوردستان کردوە، لە کاتی پرۆسەکانی ئەنفالەکان و کیمیاباران و کۆڕەودا. دوا هاوکاری و یارمەتی دانیشیان لەم شەڕەی داعش و پەلاماردانی دا بـووە بـۆ سـەر هەرێمـی کوردسـتان. ئەوە وەک حکومەت، وەک خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەلاتیش لەهەموو ڕوداوو لێقەومانەکاندا، هاوکارو پشتیوانی بێوێنەی خوشکوبرا کوردەکانی باشوریان بوون بەدرێژایی ئەو چل ساڵە.

بەڵێ هێزی پێشمەرگە لەم کۆڕەوەدا بنکەو بارەگایان لەسەر سنوور و لەشـارۆچکە و دێهاتەکـانی نزیـک بەسـنوورەکان دانـایەوە، ئەوخەڵـکەی لەدیوی کوردسـتانی باشـووردا لەگەڵمـان مـابوونەوە، کەس بەکەس نەبـوو، خواردن و خۆراک نەبوو، بەرەی کوردستانی و حزبەکان، بەبەرنامە هیچان بۆ مەبادا نەکردبوو، ئەو هەموو تالان و پارەو دەست کەوتانە، لەماوەی ئەو مانگەدا، هیچی بۆ پێشمەرگە و حزب نەبوو، ئەوەی من ئاگادار بم تەنها کاک عـومەر فەتـاح بەرپرسـی بەرەی کوردسـتانی لەئیـدارەی سـلێمانی، برێـک ئـازوقەی نـاردبوو بـۆ مـالومەو مـاوات لەشـارباژێرو بـۆ گونـدی خەرپـانی لەنـاوچەی هەورامـان. لەگەڵ ئەوەشـدا لەبـانقی ڕەشـید فەرعـی سـلێمانی مەبلەغـی ۳۰۰۰۰۰۰سـێ ملیـۆن دینـاری کـوێتی و ۲۸۵۰۰۰۰ دوو ملیـۆن و هەشت سەد و پەنجا هەزار دیناری چاپی تازەو مەبلەغێک دۆلاری هێنابوو، ماوەیەکی کەم ئیدارەی هێزەکانی پێ درا.

من لەکاک عومەرم بیستووە، لەو ماوەی رەوەدا و لەوکاتی بێسەرەو بەرەییەدا، دەست پاکی و ئەمانەت پارێزی کاک سەعدون فەیلی جێگەی شانازی و دەست خۆشییە، کەپارەکان لای ئەو بووە لە گۆخلان.

لەو بارەوە پرسیارم لەکاک سەعدون کردو ووتی: ((ئێمە لەئەزمڕ بووین، خەڵک لەشار دەهاتنە دەرەوە، رادیۆکەی گەلی کوردستانمان لابوو، بەڵام کاری نەدەکرد پێچرابوەوە، پێشمەرگەش سەنگەر بەندی دەکرد. دەڵێت رۆژێک کاک عەلی فەتاح هاتوو بارێکی پێ بوو، بارەکە پێک هاتبوو لە ٦ شەش گونییە، پێی ووتم کاک عومەر، ئەم بارەی ناردوە لای تۆ بێت، پرسیم چیە، بەدیار خەڵکەکەوە ووتی وەسائقە (بەڵگەنامە)، ئەو رۆیشت و من دەستم دا لەبارەکە زانیم پارەیە، بردمان و چووین بۆ گۆخڵان لەناوچەی شلێر، لەوێ رادیۆکەمان خستە ئیش، ئەو هەڤاڵانەی کە ئەو ماوە پێکەوە بووین کاک شوانی کەریم کابان و زێرەڤان و عەبدل مەجید زەنگەنەو کاک باست و یوسف شەریف بوون.

کاک سەعدون ئەڵیت: زۆر ئەترساین کەسانیتر بزانن ئەوە پارەیەو هێرش بکەنە سەرمان، بۆیە لەگۆخلان کردبووم بەجێگاو لەسەری ئەنوستم، ئەو برادەرانەی ناوم هێنان ئەیانزانی ئەوە پارەیە بەڵام هەر لەدڵی خۆیان دا بوو یەکجاریش نەیان پرسی ئەو وەسائقانە چیە؟ تا ئەوکاتەی کاک عومەر هات و تەسلیمان کردەوە)).

بەڵێ لەشاخ و لەسەرتایی راپەڕینەوە، کادرو پێشمەرگەی یەکێتی، ئەمانە نموونەیان بوون، بۆ دڵسۆزی بۆ دەست پاکی بۆ ئەمانەت پارێزی، من بێگومانم کادر و پێشمەرگەی تریان لەگەڵ بووە، وەلەو کادرانە هەشیان بووە، محتاج و پارەی پاکەتێک جگەرەی پێ نەبووە، بەڵام پاسەوانی شەش گونییە پارە بوون. نەفسی بەرزو بیرو باوەرو ئەدەب رێگەی نەداون، پرسیاریش بکەن ئەوە چیە؟ تاچجای بڵێن باخەرجی لێ دەرکەین .

سەرەتای کۆڕەو لەرۆژی ١٩٩١/٤/٣وە دەست پێ دەکات، لەو رۆژەدا من لەشارۆچەی هەڵەبجەی تازەدام، لەگەرمیان و لەسنووری کەرکوکەوە خەڵک بەئوتۆمبێل و بەپێ کەوتونەتەڕێ، زریکەو هاتوهاواری ژن و منداڵ بۆمن وێنا ناکرێت لێرەدا، گەنج و لاوی کۆڵ بەکۆڵ، برێک هەڵگری منداڵانی شیرە خۆرە و هەندێکیتر خواردنی چەند ژەم، برێکیش تۆشەبەرە و جانتا بەکۆڵ،

کۆڵی ھەندێکیش پەتو و ڕاخەر، بەجۆرێک کاروان بەرو دوایی دیار نییەو ملی ڕێی گرتووە، بێ ئەوەی بزانێ بۆکوێ دەچێت و بەکوێ ئەگات.
دیمەنەکانی کۆڕەو خەماوی و ناخ ھەژێن و کاریگەر بوون، ئەندامانی خێزان و بنەماڵەکان زۆریان لەیەک دابڕاو بەئاراستەو مەسیری جیاوازدا ملی ڕێیان گرتووە، زۆربەی خەڵکەکە برسیە، سەرماو ڕێگەی نەبڕاوە بەپێیان شەکەتی کردوون، زۆربەی ژن و منداڵ پێخاوس و بێکەوش وپێی پەتین. لەکەناری ڕێگاو جادەکاندا ئۆتۆمبێلەکان کەوتون، بەھۆی بەنزین لێبڕان و پەنچەری و شکانەوە، کەم کەس خاوەنی ئۆتۆمۆبێلە، ئەوانەش ئوتۆمبێلیان ھەیە لەبەر قەرەباڵغی و نەبوونی ڕێگا بەھاوشانی پیادە ڕەوەکان ئەجوڵێن بۆ پێشەوە، شەوانە لەملاو لەولای ڕێگاکانەوە کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکی دەوری ئاگریان داوە، زۆر جار ئەبینی خەڵک بەرەودوا بەپێچەوانەوە ئەگەڕێنەوە، خەڵکی سەرلێشێواو ھەناسە ساردە. تاکوتەرا ڕۆژنامە نوس وکامیرامانی بیانی لەناو کۆڕەوی کوردەکان چاوپێکەوتنیان لەگەڵ خەڵکدا دەکرد، جیھان لەڕیگای میدیاوە ئەم کارەساتەی کوردیان بینی، ئەوەبووبەھۆی دەر چوونی بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لەرۆژی ١٩٩١/٤/٥دا.

ئەم بڕیارە بۆ پارێزگاری لەئاوارەکانی کورد و دابین کردنی خۆراک و دەرمان و دروست کردنی ناوچەی دژەفڕین و ئارام بوو بۆیان، لەسەروی ھێڵی پانی ٣٦، لەڕوی سیاسیشەوە ھەنگاوێکی گەورە بوو بۆ کێشەی کورد لەکوردستانی باشور. ڕۆڵی سەرەکی فەرەنسای سەردەمی میتران لەدەرکردنی ئەم بڕیارەدا لای گەلی کورد بۆ سەرۆک میتران و مادام دانیالی ھاوسەری لەبیر نەکراوە.

ئەم ناوچە ئارامە بووە ھۆی گەڕانەوەی ئاوارەکان ، دواتر ٥٠٠ پێنج سەد پۆلیسی نێودەوڵەتیش ھاتنە عێراق و کوردستان بۆ چاودێری بڕیارەکە. فڕۆکەخانەی ئنجەرلیکی تورکیا بوو بەجێگەی فڕۆکەکانی جەنگی ئەمریکا بۆ فڕین و سوڕانەوە بەسەرە ناوچەی دژەفڕین و پارێزگاری لەسەروی ھێڵی ٣٦ .

ئێمەش (پێشمەرگە)ی سنووری ھەڵەبجەو ھەورامان بەشێکی کەممان، دوای چەند ڕۆژ لەگەڵ ئەم خەڵکەو کۆتایی شاش و شەوێلی ستونەکەی کۆڕەودا لەھێڵی سلێمانی بەرەو ھەورامان، گەیشتینە دوڕیانی پردی زەڵم،

بەلای دەستی راست دا بۆلای وێرانەی شاری هەڵەبجە بامان دایەوە، نزیک بەخۆرئاوابوون گەیشتینە ناوشار، خەڵکێکی زۆرلەناو وێرانەی کەلاوەو کوچەی گەڕەکەکاندا دێن و دەچن، ماڵەکەی ئێمە ناپاڵ لێیداوە و ڕووخاوە. بۆیە بەرەوماڵی شەهید کەیکاوس لەگەڕەکی کانی شێخ ڕۆیشتین، لەگەڵ ئەو چەند هەڤاڵەی هاوڕێم بوون دەستمان کرد بەپاککردنەوەی خانووەکە، ئەوشەوە لەوێ خەووتین، ئەشزانم ئەگەر سوپاو عەسکەر لەسلێمانییەوە بێن بەرەو شارەزوور کەس نییە ڕێگریان لێبکات.

بەیانی ڕۆژ بووەوە هەستاین و چووم بۆلای گەڕەکی کانی قوڵکە، لەنزیک ماڵەکەیدا کاک نەجیمی نامداری ئێناخیم بینی، ئەزانم ئەمانە کۆمەڵێک چەکدارن ناچنە ناو ئێران، بەفرسەتم زانی پێموت منیش لێرە ئەمێنمەوە پێکەوە ئەبین و دوانیوەڕۆ دێم بۆلاتان لەوبارەوە قسە دەکەین، کەووتمە ڕێ بەرەو گەڕەکی شارەوانی شاری هەڵەبجە، لەلای مامۆستای نەناسراو لەکانی قوڵکە کەووتم بەسەر بازگەیەکدا، چەند پێشمەرگەیەک چەک لەوکەسانە وەرئەگرن لەهەڵەبجەوە ئەچنەدەرەوە بەرەو هەورامان، کۆمەڵێک چەکیان کۆکردوەتەوە، دابەزیم و پرسیم ئێوە کێن؟ ووتیان پارتی گەلین، پرسیم بۆ چەک لەخەڵک وەرئەگرن، یەکێک هاتە پێشەوە ووتی کاک حەمە کاک دکتۆر فایەق لێرەیە لەم ماڵەدا بارەگای داناوە، ئەم خەڵکە چەکەکانیان ئەبەنە ئێران لەوێ لێیان ئەسەنن دکتۆر دەڵێت بائێمە لێیان وەرگرین.

چووم بۆلای کاک د. فایق، لەماڵەکانی حاجی ئەولەدا بوو، دوای چاکو چۆنی و هەواڵپرسین ووتی ئێمە ناڕۆین بۆ ئێران، ئەگەر ئێوەش ئەمێننەوە بامەفرەزە پێکەوە بنێرینە پردی زەڵم. منیش ئەو هەڵوێستەم زۆر پێخۆش بوو، خواردنی باشی لابوو نیوەڕۆش لای ماینەوە، ئەو چەکانەش کۆیان کردبووەوە دانی بەئێمە. دوای نیوەڕۆ چەند کەسێکم بینی و چەند پێشمەرگەیەکیشم دۆزینەوەو کۆکردنەوە هەواڵیشم نارد بۆ تەوێڵە ئاگاداری ئەو پێشمەرگانە بکەن کەدابڕاو متەفەرقەن نەچنە ناوئێران، بگەڕێنەوەو بێن بۆلای ئێمە، وا لەهەڵەبجە بارەگامان داناوە.

هەردوای چەند ڕۆژ چەند پێشمەرگەیەکم بردو چووینە گوندی ڕێشاو لەپشتی هەڵەبجە بەدیوی ڕووباری سیرواندا، شوێنی سەردەمی پارتیزانی خۆمانە، لەوێ بارەگایەکمان داناو خەلیلی حاجی مەحمودم کردە لێپرسراوی

بارەگاکەو ئازوقەو کەلوپەلمان بۆ دابین کردن، ئەوچەکانەی کاک دکتۆر فایقی شەهید حەمەگوڵپی پێی دابووین لەگەڵ کۆمەڵێک چەکی تر هەمووی بووە ۷۰ حەفتا کلاشینکۆف و ۱۰دە دانە ئارپی جی و برێکی زۆر فیشەک و تەقەمەنی جۆراو جۆر گواستمانەوە بۆ ئەو بارەگا. ئەو پێشمەرگانەی لای هەڤاڵ خەلیل دانران دووکەس بوون، ئیقبال سەعید عەلی، شاهۆ عەلی عەزیز بیارەی.

ئەمە بۆ مەبادا وەک بنکەیەکی نهێنی، دوای دوو رۆژ چوومەوە بۆسەردانیان و برێک ئازوقەم بۆبردن، گەیشتمە سەرکانی وئاوەکەی رێشاو ئەبینم چۆڵەو کەسی لێنییە کەلوپەلەکانیش نەماون، لەگەڵ هەڤاڵەکانم ماوەیەک گەراین بەناو باخەکانداو دەستمان کرد بەبانگکردن، کەس دیار نەبوو، بەپەلە گەرامەوە بۆ هەڵەبجە، لەدڵا چەندین لێکدانەوەم دەکرد، نەخەوتبن بێ پاسەوان کوشتبنیان........تاد . بەقەلەقی ونیگەرانی گەیشتمەوە هەڵەبجە، لەئۆتۆمبێلەکە دابەزیم پرسیارم لەپاسەوانەکە نەکرد، خۆم کرد بەژووردا، ئەبینم خەلیل پاڵی داوەتەوەو منی بینی دەستی کرد بەپێکەنین. دیارە لەوکاتەدا من لەرێگای دەڵەمەرەوە چووم بەرەورێشاو ئەوان لەرێگای پیادە رێوە هاتوون و دزاودز کەوتوین.

چاوەرێم نەکرد نان بخۆین خەلیلم بردە لاوە پرسیم بۆ هاتونەتەوە چەکوچۆڵەکەتان چی لێکردوە، ووتی بەشی پاسەوانیمان نەدەکرد خواردنمان نەبوو، چەکەکەنمان بردووە لەئەشکەوتێکدا کە زۆر چەپەکە شاردونمانەتەوە. لەشەوی ۱۹۹۱/٤/۱۸دا خەریکی دەستکاری رادیۆکەم بووم بۆ (بی بی سی) ئەگەرام لەپڕ هەواڵی وتووێژو چوونی مام جەلالی بۆ بەغدا بڵاو کردەوە، رەنگە تێنەگەشتبم باشتر گوێم رادێرا، نەخێر وایە، بیرم جەنجاڵ بوو، چۆن؟ لەم کاتەدا، مام جەلال دەچێتە بەغدا، سەدام جێگەی بڕوا نییە، رەنگە بۆتێکدانی بەرەی کوردستانی بێت. تۆبڵێیت بەناوی بەرەوە چوبێت، کاک مەسعود ئاگادار بێت، چۆن چۆنی دەبێت؟.....تاد . تەحەمولم نەکرد تابەیانی، هەر بەوشەوە، چەند برادەرێکم لەونزیکانەدا ئاگادار کرد کە بی بی سی هەواڵی وای بڵاو کردەوەتەوە. لێرەدا تارادەیەک گەیشتمە ئەو بڕوایە ئێمە

بەبێ چرا سەوزی دۆستەکانمان وەبەبێ بەرنامە هێرشمان کردوەتە سەر شاری کەرکوک[1].

ئاشکرایە هەموو کێشەکانی کوردو حکومەتە یەک لەدوا یەکەکانی عێراق لەکاتی گفتوگۆو دانیشتنەکانی لەسەر پێکهاتن کراون، بێئەنجام بوون و پێک نەهاتنەکان هەمووی لەسەر کەرکوک بووە، لەگەڵ ئەوەدا بڕوایی تەواو نەگۆڕم بەوە هەیە بەپێی بەڵگەو ئاسەوارە مێژوویەکان سنووری کوردستانی باشور لەباشوورەوە زنجیرە چیاکانی حەمرینەو شاری دێرینی کەرکوکیش ئەکەوێتە ناو خاکی کوردستان و شارێکی کوردستانییە.
بەڵام شارێکی هاوبەشی نیشتەجێ بوونی چەند نەتەوەیەکە لەوانە: کورد، عەرەب، تورکمەن. دوارۆژو چارەسەری کێشەکە نەبەزۆرو نەبەهێز، نەبەپێداگری و ئینکاری، نەبەسپاردنی بەمێژوو و نەبەچاوەڕێ کردنی بارودۆخی نێونەتەوەیی، بۆهیچ کەس و لایەنێک یەکلایی نابێتەوە. بەداخەوە هێزە سیاسییەکانی کوردستان ئێستاش کە ساڵی ٢٠١٥یە کەرکوک بەکردەیی بەدەست کوردەوەیە، بەرپرسە باڵا ئیدارییەکان هەموو کوردن، هێزی پێشمەرگەی کورد پارێزگاری دەکات، سیاسییەکان بەڕوانینی تەسکی حیزبی و بەرژەوەندی کاتییەوەوە لەگەڵ ئەم شارەو ئەم کێشە بەردەوامەوە هەڵسوکەوت و معامەلە دەکەن. دیارە ئەم سیاسەتە هیچ ئەنجامی ئەرێنی بۆ ئەم کێشەو ئەم مەسئەلەی کەرکوک لێ سەوز نابێت.
بۆ چارەسەری ئەم کێشە، کورد پێویستی بەئاسایش و دڵنیاییدان بەنەتەوەکانی ترە، دیارە ئاڵۆزکردنی کێشەکە، هۆکارەکانن نەک ئامانجەکە.

بەڵی وتووێژی نێوان بەرەی کوردستانی و حکومەتی عێراق دەستی پێکرد، وەفدی بەرەی کوردستانی بەسەرۆکایەتی مام جەلال و بەئەندامیەتی کاک نێچیروان بەرزانی لەپارتی و کاک رەسوڵ مەمەند لەسۆشیالیست و کاک سامی عەبدولڕەحمان لەپارتی گەل، چوونە بەغداو لەگەڵ سەدام حسێن کۆبوونەوە. ئەم وتوو وێژە درێژەی کێشاو بارودۆخەکە ئارام بووەوە،

---

1_

ئاوارەکان گەڕانەوە، منیش ئەوماوە بارەگام بردە ناوباخەکانی هاوینە هەواری وەزەنێ و ناردم بەدوای منداڵەکانمدا لەئێران هاتنەوە، ئەوچەند مانگە پشوویەکی باشمان دا. بەڵام هەرکات گرژی و ئاڵۆزی روی دابایە دەچوین لەگەڵ هەڤاڵان بەشداریمان دەکرد، لەدەست پێکردنی ئەم وتوێژەوە هەڤاڵانی سنووری شارەزوور و هەورامان و هەڵەبجە ئەوانەی لەسنووری سەرتەک و پشتە و بەمۆ بوون، لەڕێی ئێرانەوە هاتنەوە سنوورەکە، بەتایبەت ئەوهێزانەی تیپەکانی ١٥ی شارەزوور و ١١ی هەورامان، لەگەڵ هەڤاڵان کاک حامیدی حاجی خالی و کاک شەوکەتی حاجی مشیرو کاک جەمیل هەورامی و کاک فەلاحی حەمەبۆر و کاک ئەکبەر ئێناخی وکاک جەلال کولکنی و............تاد .

ئەم هەڤاڵانەو هێزەکە لەبناری بەمۆوە بەناو ئێرانداو لەسەلاسی باواجانییەوە بۆ جوانڕۆ و لەوێوە بۆ پاوەو لەمەرزی نەوسوود شۆشمێوە هاتنەوە تەوێڵەو ناوچەکە. لەم شکان و رەوەدا حکومەتی عێراق و سوپاکەی هاتنەوە کەرکوک و سلێمانی و هەولێرو گەرمیانیان گرتەوە. لەقۆڵی سلێمانییەوە بەرەو شارەزوور تا بازگەی چەناخچیان لەنزیک عەربەت هاتن، ئەوەبوو ئەوهێزانەو ئەوهەڤاڵانەی کەگەڕانەوە ناوچەکە لە ئاوایی ئەحمەد ئاوایی لای خورماڵدا بنکەو بارەگایان دانا، تەشکیلات نوێکرایەوە.

## راپەڕینی دووەم ۱۹۹۱/۹

رژێمی بەعس و سوپا دڕندەکەی هەرچەندە لەسەرەتای ساڵی۱۹۹۱دا لەگەڵ هێزەکانی هاوپەیمانانی ئەمریکا لەشەڕەکەدا شکا و لەکوێت وەدەر نرابوو، لەسەرەتای مانگی ۳ی هەمان ساڵەوە لەکوردستان لەبەرامبەر خەڵک و پێشمەرگەدا سوپاکەی بەشێکی خۆی دابوو بەدەستەوەو بەشەکەی تری هەڵهاتبوو، دام ودەزگا ئەمنییەکانیشی بەشێکیان بەدەستی گەل تۆڵەی شۆڕش گێڕانەیان بەسەردا جێ بەجی کرابوو، بەشێکیشیان بەزەلیلی و رسوایی خۆیان قوتار کردبوو، کەچی ئەمە نەبووبوە دەرس و پەند بۆیان، لەهاتنەوەیان دا بۆ سەرشارەکانی کوردستان دوای کۆڕەو، لێرەو لەوێ خەریکی ئازاردانی خەڵک بوون.

کورد زوو شتی لەبیر دەچێتەوە، سۆزو عاتیفە زاڵە بەسەر دڵودەرونیدا، ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەنفال و کیمیابارانی کوردستاندا گوزەری نەکرد بوو، ئاسەواری ویران کردنی شارو شارۆچکەو ئاواییەکانی کوردستان لەبەر چاودا بوو، زیندانەکانیان پڕبوون لەتێکۆشەرانی گەلەکەمان، بەتایبەت تێکۆشەرانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان. راستە لەراپەڕیندا لێبووردنی گشتی دەرکرابوو، نازانم بۆ ئێمە لە راپەڕیندا ئەو هەزاران ئەفسەرو سەربازەی گیرا بوون و خۆیان بەدەستەوە دابوو، لەجێگەیەکدا کۆمان نەدەکردنەوە هیچ نەبێ سەد بەیەک بیانگۆڕینەوە؟ زیاد لەوەش ئەوجەماوەرە زوڵم لێکراو ئەنفال کراو کیمیاباران کراوەی کوردستانیش بەدەستی ئەمانە هەچی تاوانی نامرۆڤانە هەیە بەرامبەریان کرابوو، کەچی هاوکاری و یارمەتیان ئەدان و تێریان دەکردن و ئەیان ناردنەوە، بەگەیشتنەوەیان بۆلای حکومەت، دوبارە چەکدار دەکرانەوەو ئەنێردرانەوە بۆبەرەکانی شەڕ دوبارە دەکرانەوە بەگژ پێشمەرگەو خەڵکدا.

ئەم رژێمەی سەدامە ئەوەندە خەڵکی ترساندبوو، برێک خەڵکی سادە و ساکار دڵنیا نەبوون لەوەی جارێکی تر، ئەم مڵۆزمە نایەتەوە سەریان بۆیە بەدزییەوە هاوکاریان دەکردن، برێکیش بەسروشت خیانەتیان کردوەتە پیشە،

ئەندام و کارمەندانی دەزگا جاسوسی و ئەمنییەکانیان پەنا ئەداو ئەیان گەیاندنەوە بۆلای ئاغاکانیان.

بەگشتی وتاڕادەیەک خەڵکی کوردستان چاوکراوەو ورەبەرز بووبوون، پێشمەرگەش لەناویانداو لەنزیکەوە ئامادە بوون، هەرچەندە وتوویژ هەبوو، بەلام لەرۆژی١٩٩١/٩/٧ بەدواوە لەچەند راپەڕینێکی خەڵکی و پەلاماری پێشمەرگەدا دووبارە لەکوردستان وەدەر نرانەوەو بارودۆخی حکومەت گەیشت بەوەی لەرۆژی ١٩٩١/١٠/٢٢دا ئیداراتی حکومەتەکەی بکشێنێتەوە لە هەر سێ پارێزگاکانی دهۆک و سلێمانی و هەولێرو لەچەند قەزاو ناحیەیەکی کەرکوکیشدا.

خۆپیشاندانەکانی جەماوەریی بۆدووەم جار لەرۆژی ١٩٩١/٧/١٧کەوە لەشاری هەولێرەوە دەستی پێکرد دوای هەولێر سلێمانیشی گرتەوە، هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر خەڵکو پێشمەرگە شەهیدو بریندار بوون، بەلام دوژمن زیانی زۆرترو نزیکەی دوهەزار ئەفسەرو سەرباز گیران و خۆیان تەسلیم کرد.

لەرۆژی ١٩٩١/٩/٧دا دوبارە لەشاری نیشتمان پەروەرانەوە، لەکۆیەی مەکۆی کوردایەتییەوە، خەڵک راپەڕین و لەهەڵمەتێکی بێوێنەدا شارەکەیان ئازاد کردەوەو لەژێر دەستی رژێمدا دەریان هێنا، دوژمن بۆئەوەی تۆڵەی تێکشانی لەکۆیە بکاتەوە لەبێستانەو باداواوە پەلاماری هێزی پێشمەرگەی دا، لەوپەلامارەشدا حکومەت شکاو هێزەکانیان هەڵهاتن و نزیکەی حەفتاو پێنج ٧٥ دیل وبریندارێشیان لێ جێمان.

لەڕۆژی١٩٩١/٩/١٠دا من لەتەوێڵە بووم، ئاگادار کراین رۆژی٩/١١ هێزێک لەگەڵ خۆمان بەرین و بچینە سلێمانی بۆپاسەوانی و پارێزگاری لەیاریگای شارەکەو گەڕەکی چوارباخ، لەکاتی دیاری کراودا لەگەڵ هێزێکی پێشمەرگەدا، کەزۆربەی کادرو فەرماندەکانی هەورامان و هەڵەبجەو شارەزووری لەگەڵدا بوون، لەشوێنی دیاری کراودا ئامادە بووین و هێزەکەمان بڵاوە پێ کرد، لەوشوێنانەدا کە پێویست بوو.

خۆیشمان چووینە مەیدانی یاریگاکە، پاش نیوەڕۆکەی هەڤاڵ مام جەلال هاتە یاریگاکەو لەکۆبوونەوەیەکی جەماوەریی بەرفراواندا ووتارێکی پێشکەش کرد، دوای کۆتایی هاتنی رێوڕەسم و ووتارەکەی مام، هێزەکانمان

ناردەوە، خۆمان لەسلێمانی ماینەوە، ئێوارەی ئەورۆژە میوانی خاتوو زەکیەخانی خێزانی شەهید حامیدی حەمەتاهر بەگ بووین، شەو بۆ یەکەمجار پەخشی ( تیڤی) گەلی کوردستان کەوتە ئیش و ووتارەکەی مام جەلالی بڵاو کردەوە.

ئەم هەنگاوە بەتوانایەکی دارای کەم و نەبوونی کادری شارەزای تەکنیکی، بەهیمەتی چەند شارەزایەکی ئەو بوارە، لەورۆژەدا هەنگاوێکی گەورەو دڵخۆشکەر بوو، من هەر لەوماوەدا و دواتر سەردانی مام جەلالم کرد لە قەڵاچوالان بەو مەبەستەی هاوکاریمان بکات، بۆکڕینی مولیدەی کارەبا و دروست کردنەوەی مزگەوتیگەورەی تەوێڵە، بینیم کەسێکی هەڵەبجەی بەناوی کاک ( ساڵح) خەریکی ئیشوکارو گەشەپێدانی کاناڵەکەیە کەناڵی گەلی کوردستان، زۆر خۆشحاڵ بووم پێیی.

لەم سەردانەماندا بۆلای جەنابی مام جەلال، لەگەڵ مەلای ئەوکاتەی مزگەوتەکە بەناوی مەلا بێساران ڕەزا، دوای چاو پێکەوتن و وتووێژ لەبارەی ئاوەدان کردنەوەی تەوێڵەوە لەلایەن خەڵکەکە خۆیەوە، بۆبنیات نانەوەی مزگەوتەکە هاوکاری کردین بەبڕی ٢٠٠٠٠ بیست هەزار دیناری ئەوکاتەو هەروەها کڕینی مۆلیدەیەکی ٢٥٠ کەیفی بۆ دابین کردنی کارەبای ئاوایی. کاتێک هەستاین و خواحافیزیمان کرد پارەکە کاک مەلایاسین کردبوویە ناو گونییەیەک، مەلایاسین ئەوکات سکرتێری جەنابی مام جەلال بوو، ئێمە پارەکەمان نەژمارد، هەروا خستیانە ناو ئۆتۆمبێلەکەی من، چووینەوە بۆ تەوێڵە، بۆ بەیانییەکەی ئەو پارەکە تەسلیمی لیژنەی مزگەوت بکەین، هەرهەمان لیژنەش بچێت بۆکڕینی مۆلیدەی کارەباکە بۆ سلێمانی، کاتێک پارەکەمان تەسلیم کردو ژمارد (٥٠٠٠) پێنج هەزار دیناری زیاد بوو.

پارە زیادەکەم هێنایەوە و لەدڵا ووتم بەئەنقەست ئەم پارە زیادەیان پێداوین، بەبروسکەو لەڕێی بێسیمەوە بۆ سکرتاریەت پێم وتن (٥٠٠٠) پێنج هەزار دینارتان زیادە پێداوین وا ئەینێرمەوە، مەلایاسین وەڵامی داوەتەوە، دەڵێت ئەوە بۆخۆتە مەینێرەوە، منیش لەوکاتەدا خەریکی دروست کردنی خانوو بووم یارمەتیەکی باش بوو بۆم، لەو پارەی خۆم ١٥٠ سەد و پەنجا دینارم خستە سەر پارەکەی مزگەوت لەباتی ئاوی کانی وێشە، چوونکە

بەلوولە ئاوەکەم بردوە بۆ ماڵەکەم لەگەڕیاتدا، ئەم ئاوی کانی وێشە هی مزگەوتەکەی تەوێڵەیە.

دوای ئەم تێک شکانانەی حکومەت بۆسەندنەوەی ئابرووی و بەرزکردنەوەی ورەی هێزە شکاوەکانی هێرش و پەلاماری بۆسەر گەرمیان دەست پێکردەوە. بەم شێوە:

له گەرمیان رۆژی ۱۹۹۱/۱۰/٥ هێرشیان کردە سەر شاری کفری و گرتیان، خەڵکەکەو برێک پێشمەرگەی تێدابوو کشانەوە بۆ سەرقەلا، چەندین پێشمەرگە شەهیدو بریندار بوون، لەوانە دکتۆر ئاتێلا و حسێن حەمە و زۆراب هۆمەرملی. چەندین هاوولاتیش گیران و دەیان ماڵی هاو ولاتیانیش تالان کران.

دواتر رژێم کەوتە تۆپباران کردنی کوڵەجۆ و کەلارو دەوروبەری، لەکفریشەوە بەهێزێکی زۆرەوە بەپشتیوانی چەندین تۆپخانەی دورهاوێژو تانک و زرێپۆشەوە پێشرەویان کرد بەرەو سەرقەلا هاتن. بەلام لەسەرقەلا کەوتنە بۆسەو بەر پەلاماری هێزی پێشمەرگە، بەجۆرێک تێکشکان و پاشەکشەیان کرد دەیان تانک و زرێپۆش وئۆتۆمبێلی سەربازیان سوتاو لێ بەجێما، ئەم شەڕە سەرکەوتوو و بێ وێنەیە بەخوێنی چەندین شەهید و بریندار لەوانە قادری حاجی رەشید و چەند کەسی تر تۆمار کرا. لەم نەبەردییەدا، قارەمانانی حزبی شیوعی بەشدار بوون و مەردایەتیان نواند. شکانی دوژمن لەسەر قەلا کاریگەری هەبوو بۆ سەر ورەبەرزی هێزەکانی بەرەی کوردستانی و خەڵک.

بۆیە دوا بەدوای شەڕی سەرقەلا، لەبناری چیاکانی بەمۆو و خۆشک و زمناکۆدا هێزەکانی ئەوبەری سیروان ناوچەکەیان لەهێزەکانی دوژمن پاک کردەوە. هێزەکانی عێراق لەوبەر ئاوی سیروان بەجۆرێک شکان، نیوەی هێزەکانیان لەبناری زمناکۆ مابوون، پردەکەیان تەقاندەوە، هێزی پێشمەرگەو خەڵک دەستیان گرت بەسەر هێزە بەجێماوەکەو هێزەکانی رژێمدا لەدەربەندیخان و دەوروبەریدا، بەم جۆرە گەرمیان دوبارە کەوتەوە دەست هێزی پێشمەرگە. هێزێکی هەورامان لەگەڵ شەهید نیازی، شەوی۱٦لەسەر۱۹۹۱/۱۰/۱۷ لەهەورامانەوە چووبوون بۆ پشتیوانی هێزەکەی سنووری دەربەندیخان، رۆژی ۱۹۹۱/۱۰/۱۷ نیازی بریندار بوو، نیازی کوڕی

خاڵۆعیزەتی حەسن بوو لەتەوێڵە، کۆلیژی کشتوکاڵی لەبەکرە جۆ تەواو کردبوو، لەشۆڕشی ئەیلولدا لەیەکێتی خوێندکاراندا بوو، دوای ساڵی١٩٧٥ ئەبێتە کۆمەڵە، ساڵی١٩٧٩ هاتەدەرەوەو بووە پێشمەرگە، لەکەرتی دووی هەرێمی یەک، پێشمەرگەیەکی رۆشنبیرو ئاگاو رەوشت بەرزبوو. پلەکانی فەرماندەی مەفرەزەو جێگری کەرت و فەرماندەی کەرت و رابەرسیاسی تیپی تێپەڕاند بەر لەڕاپەرینی ساڵی ١٩٩١. دوای ڕاپەرینیش بووبە فەرماندەی بەتالیۆنی هەورامان و لە١٩٩١/١٠/٢٩دا شەهید بوو، لەدوای خۆی دوو کوڕ و کچێکی بەجێهێشتوە، بەناوەکانی هەورامی و نەروی و ئاڵا.

هاوسەرەکەی خانمێکە بەناوی شوکری خان خەڵکی ئاوای شۆشمێی کوردستانی رۆژهەڵات، نەیهێشت منداڵەکان بێ باوکیان پێوە دیار بێت و سەربەرزانە پێی گەیاندن. کەیکاوس و مەفرەزەیەک بەئۆتۆمبێل لەدەربەندیخانەوە بەرێگای قەرەداخ دا گەیاندبوویانە نەخۆشخانەی سلێمانی.

لەتەوێڵە رۆژی١٩٩١/١٠/١٧بەیانی زوو بوو ئاگادار کرام نیازی بریندار بووە، بەرلە نیوەڕۆی ئەورۆژە گەیشتمە نەخۆشخانەی تەواری لەسلێمانی، چوومە ژورەوە بینیم نیازی لەژێر دەستی دکتۆرەکاندایە، لەکاک د.تاهیر[1] هەورامیم پرسی چۆنە ووتی باشە، دواتر بردمیە لاوەو ووتی بەداخەوە گوللە ستونی فەقەراتی شکاندوە.

بۆ ماوەی نۆ(٩) رۆژ لەسلێمانی مایەوە، دوای تەواو کردنی ئیشوکارو معامەلاتی رۆژی ١٩٩١/١٠/٢٦ لەگەڵ کاک حامیدی حاجی خالیدو چەند هەڤاڵێکی تردا لەڕێگای خەلیفانەوە بۆ بلەو بارزان و لەوێوە بۆ شاری دهۆک بردمان، دوای رۆژێک مانەوە لەدهۆک رەوانەی تورکیا کراو لەوێ شەهید بوو.

ئەمڕۆ لەکاتی رۆیشتنماندا بۆ دهۆک لەهاوینە هەواری سوڵاف گەیشتین بەکۆبوونەوەیەکی جەماوەریی فراوان، کەبۆ کاک مەسعود بەرزانی رێکخرابوو، خەڵکەکە لەسەر ئەوراستە جادەدا کۆبووبوونەوە کەبەسەر

---

[1]-د . تاهرهەورامی خەڵکی شارۆچکەی تەوێڵەیە لەناوچەی هەورامان، دکتۆرێکی بەقابیلیەت و خاوەن ئەزمونە، سەر بەرێکخستنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و دۆستی مام جەلالە، لەشاری سلێمانی نەقیبی سەندیکای تەندروستی کارانە.

تاڤگەو شاخە سەختەکەدا لەسەرەوە ڕەد دەبێت، جادەکە بەجۆرێک گیرابوو ڕیگا نەبوو ئۆتۆمبێلەکانی ئێمە تێپەڕن، کاک مەسعود لەکەنار ئاوەکەدا بەبەرزیەکەوە قسەی دەکرد بۆ جەماوەرەکە، ئێمەش لەمسەرەوە وەستاین، چەندین کەس لەئەندامانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی پارتی لەوێ بوون.

لەناو جەماوەرەکەوە کاک نادر هەورامی هات بۆلامان دەرگای ئەمبولانسەکەمان کردەوەو لەگەڵ نیازی قسەی کرد و برێک دڵی دایەوە، ئینجا گەڕایەوە بۆلای کاک مەسعود، ئەوەندەی نەبرد چەند بەرپرسێک هاتن و ڕێگەکەیان بۆکردینەوە کاتێک بەناو ئاپۆڕەی جەماوەرەکەدا تێپەڕ دەبووین، گەیشتینە نزیک کاک مەسعود، لەناکاو بوو بەتەقەو عالەمەکە شڵەژا، هەندێک لولەی چەکەکانیان کردە ئێمە بێئەوەی بزانن روداوەکە چییە ، قافڵەی ئۆتۆمبێلەکانی ئێمەش ١٥ پانزە ئۆتۆمبێل بوون من ئاگاداری برادەرەکانی خۆمانم کرد بڵاوە نەکەن و دوور نەکەونەوە، لەوکاتەدا بینیم چەند کەسێک لەولاوە هاتن و داوای چەک لەکەسێکی تر دەکەن، ئەویش چەکەکەی ناداو دەڵێت دوژمنی خۆم کوشتوە و چەک تەنها بەسەرۆکی خۆ ئەدەم. دەرکەوت یەکێک لەپاسەوانەکانی کاک مەسعود پێم وابێت زێباری بوو دوژمنی هەبووە لەناو ئاپۆڕەی جەماوەرەکەدا بینیویەتی و دابوویە بەر دەست ڕێژی گوللەو کوشتبووی.

هەرچۆن بوو چەکەکەیان لەدەست سەند ئێمە وردە وردە تێپەڕ بووین، لەکۆتایی قەرەباڵغیەکەدا بینیمان کوژراوەکە کەوتبوو، لەتەنیشتیا منداڵێکی هەشت ساڵان دەگریا، منداڵی کابرای کوژراو بوو، بکوژەکە کارێکی ناشیرینی ئەنجام دا، دەبوو ئەگەر خاتری ئەومنداڵەشی نەگرت لەبەر حورمەتی کاک مەسعود ئەو جەریمەی لەوێدا نەکردبا .

لەوێ دەرچوین و نیازیمان بردە نەخۆشخانەی دهۆک و لەوێ خەواندیان، ئێمەش لەگەڵ کاک حامد هاتینەوە بۆ زاویتە بۆ بارەگای مەڵبەندی یەکێتی، لەوێ لای کاک حەمەتەوفیق رەحیم و شێردڵ حەوێزی و هەڤالان ماینەوە تابەیانی ڕۆژی دوایی چووینە زاخۆ و سەرپردەکەی برایم خەلیل، کاک دلێری سەید مەجید و کا ئارازی شێخ جەنگیمان بینی، ئەوان لەوێ بارەگایان هەبوو، نیازیان رەوانەی تورکیا کرد.

ئەوکات یەکێتی لەوێ باڵادەست و خاوەن جەماوەر بوو، پردەکەش بەدەست یەکێتیەوە بوو، هەڤاڵێک بەناوی سادق عومەر خەڵکی ئاوایی دەرکارعەجەم بەرپرسی هێزەکەی یەکێتی و سەرپردەکەش بوو، دواتر پارتی لەناو شاری زاخۆدا کوشتیان.

بابێینەوە بۆلای باسەکەی خۆمان لەدوای ئەم سەرکەوتنەی پێشمەرگە، لەراپەڕینی دووەمدا، حکومەت بەپەلە داوای لەبەرەی کوردستانی کرد لەگەڵ نوێنەرانی حکومەت کۆببنەوە لەسەر ئەم بارودۆخە گفتوگۆ بکەن، ئەوەبوو نوێنەرانی بەرە، کاک جەبارفرمان و کاک جەوهەر نامیق لەگەڵ نوێنەرانی وەزارەتی بەرگری عێراق لەبارەگای فرقەی ۳۲ سی و دوو کۆبوونەوە و بڕیاریاندا شەڕو پێکدادان بووەستێت.

بۆ ئەو مەبەستەو بۆ جێبەجێکردنی رێکەوتنەکە لەمەیداندا، لە ڕۆژی ۱۵/۱۰/۱۹۹۱دا لیژنەیەک دروست بوو لەهەڤاڵان کاک جەمیل هەورامی و کاک عوسمانی حاجی مەحمود و مامۆستا عەلی و حەمەعەلی قەرەچەتانی، ئەمانە نوێنەرانی بەرەو لەولاش ئەفسەرێکی هەواڵگری سوپای عێراق. بڕیار بوو دوای۲٤ بیست و چوار کاتژمێر هێزی هاوبەش دابنرێت لەدوبازگەداو پێکەوەش لەکفریدا بارودۆخەکە ئاسایی بکەنەوە.

سوپای عێراق چاوەڕێی نەکرد تاماوەکە تەواو بێت بارگەو بنەی خۆی پێچایەوەو شوێنەکانی بەجێهێشت، نەبازگەیان داناو نە لە کفریشدا مانەوە. دوای ئەم دەر چوونەیان لەکفری و دەورو بەریدا، لەسلێمانیش دەرکران و بەرەی کوردستانی بردنییە دەرەوەی شار.

هەرلەم ماوەدا رژێم بڕیاری دا ئیدارەی مەدەنی و ئەمنی و هێزە سەربازیەکەی لەکوردستان دا بکشێنێتەوە بۆکەرکوک و موسڵ، لەم کاتەدا عێراق بەرنامەی دانابوو لەگەڵ پاشەکشەکەیدا، کارەبای هەردو بەنداوی دوکان و دەربەندیخان تێکبدا، یەکێتی بەمەی زانی و کاک جەبار فرمان کەئەوکات بەرپرسی لەشکری ۱یەکی یەکێتی بوو، رێگری کرد لەجێ بەجێکردنی بەرنامەکەی سوپای عێراق.

هێزێکی یەکێتی چووە ناو هەردوو بەنداوەکەو هێزەکانی عێراقی دەرکرد، ئەوکات هەڤالانی پارتی نیگەران بوون لەمەوە بڕێک ساردی لەنێوانمان دا دروست بوو، کاک مەسعود لەوبارەوە بروسکەیەکی کردووە،

ناوەرۆکی بروسکە ئەوەیە دەڵێت: کوردستان موڵکی ڕۆستەم و مەحمود سەنگاوی نییە بەئارەزوی خۆیان تەسەروفی پێوە بکەن. مەبەستی مام ڕۆستەمە.

هەرلەدوای شەڕی سەرقەڵا و شارەزووریش کەووتینە خۆ، کۆبوونەوەیەک کرا لە ئەحمەد ئاوا لایەنەکانی بەرەی کوردستانی لێ بوو، نییەتی ئەم کۆبوونەوە بۆ پەلامارداني ئەو هێزە سەربازیەی حکومەت بوو لە عەربەت و دەورووبەریدا، لەکاتی کۆبوونەوەکەدا، هەواڵیان داینێ شەهید کەیکاوس لەسەیدسادق لەگەڵ مەفرەزەیەک عەسکەردا ڕووبەرو بوونەتەوە، عەسکەرەکان کوژراون، من کۆبوونەوەکەم بەجێ هێشت و چووم بۆ سەیدسادق، لەوێ زانیم مەفرەزەیەک عەسکەر بەتەنیا و بەسەرەڕۆی یان بەنەشارەزای لەلای کۆمەڵگەی باریکەوە هاتوون لەسەیدسادق، دەرگیر بوون لەگەڵ پێشمەرگەکان و کوژراون.

لەوێوە چووینە سەراوی سوبحان ئاغا، ئەو ئوتۆمبێلانەی لەسلێمانییەوە دەهاتن بەرەوهەڵەبجە ئۆتۆبێلێک لەلامدا وەستاو پیاوێک وتی کاکە چی دەکەن لێرە وا سوپای عێراق هاتن بەرەو ئێرە؟ پرسیم تاکوێ گەیشتون؟ وتی نزیک کەوتونەتەوە بۆ لای بازگە کۆنەکەی چەناخچیان. ئەوان ڕۆیشتن و ئێمە لەسەر جادەکە لامان داو چووینە سەرچاوگەکەی سەراو. لەوێ نامەیەکم بۆ کاک جەمیل هەورامی نوسی ونارد. نامەبەرەکە نەگەیشتبووە سەیدسادق کاتێکم زانی کاک جەمیل و ، کاک فەلاحی حەمەبۆرو ئاسۆ قەڵەو و چەندین فەرماندەو کادری تر لەماوەیەکی کەمدا لەگەڵ هێزێکی باش گەیشتن، هەڤاڵانی پارتی گەل و سۆشیالیستیش هاتن دکتۆر فایق بەرپرسی هێزەکەی پارتی گەل بوو، دکتۆر پیاوێکی ئازاو نەترسە، کە وتمان ئەبێ بەر بەسوپا بگرین یەکسەر وتی یاڵا ئێمە لەکوێوە بڕۆین.

سۆشیالیست هێزەکەیان هێرشبەرە، کاک نوری حەمەعەلی لەهەڵەبجەوە هاتبوو، کاک عەلی بچکۆلیش پیاوێکی بەهیمەتە لەپێنجوێنەوە هاتبوو، کاک شەوکەتی حاجی مشیر بەرنامەکەی دانا، لەدو قۆڵەوە یەکەم: لەسەراو بۆکانی پانکە و ڕاست جادە و جادە، دووەم: لەسەراو بۆکانی پانکە بەجادەی کۆنی مواندا.

نیو کاتژمێر ڕۆژی مابوو گەیشتینە کانی پانکە، بینیمان عەسکەر لەباڵانتەرانەوە سەرئەکەون بۆ سەر بەرزاییەکەی پشتی ئاوایی، لەوێوە بووینە سێ دەستە بەشێک بۆ پشتی ئاوایی بەشێک لەبەردەم جادەوە بۆ بوورجی کانی پانکە، ئەم دەستە من بەرپرسی بووم، بەشە سەرەکیەکەو بەرپرسەکانی تر لەگەڵ کاک شەوکەت و کاک جەمیل هەورامی فەرماندەو کادرەکانیتر جادەوجادە بۆبازگەی چەناخچیان.

ئێمە گەیشتینە بوورجەکە و بەردەم بازگەکە بێ تەق و تۆق، ئۆتۆمبێلێکی هەڵگری دۆشکای پێشمەرگە بەچەند سەد مەترێک بەدوامانەوە بوو، خەدەمەکەی ناوی کەمالی ئایشێ قەڵەو بوو، کەمال پێشمەرگەیەکی ئازاو ڕوخۆش و چەلەنگ بوو، ئێمەو سەربازو عەسکەر لەهەمووڵاوە نزیک بووینەتەوە لەیەک کەس تەقە ناکات لەکەس. کەمال بەدۆشکاکەی دەستی کرد بەدابێژانی ئەو بەرزاییەی پشتی کانی پانکە سەربازەکانی لێبوو، گۆمی مەنی و بێدەنگی مەیدانەکە شڵەقا، هاتو هاوارو وردە تەقەش دروست بوو. سەربازەکانی پشتی جادەی کانی پانکە - عەربەت و ئەمبەرو ئەوبەری جادەی بەرزنجە چەناخچیان هاتنە خوارەوەو بەراییان گەیشتە لای ئێمە. هەموو تەسلیم بوون، پێشمەرگەیەک هات بۆلام وتی ئەم سەربازە دەڵێت بمبە بۆلای بەرپرسەکەتان ئیشم هەیە، واهێناومە وتم فەرموو و، وتی من خەڵکی بەسرەو شیعەم ئامرلواکەمان دوێنێ کۆبوونەوەی پێکردوین، پێی وتوین ئێمە شیعەین و ئەمانە کوردن ڕژێم ئێمەی ناردوە تا یەکتر بکوژین، تەقە لەکەس نەکەن، ئەگەر شەڕ دروست بوو خۆتان تەسلیم بکەن.

لەگەڵ کاک جەمیل و هەموو هەڤاڵانی تر لەبازگەو سێڕیانی سەیدسادق-عەربەت-بۆیسان سوور، یەکمان گرتەوە، تاریکی کردو بووینەوە بە دوو ڕەتڵ، ڕەتڵێک بەرەو عەربەت و ڕەتڵێک بەرەو بۆیسان سوور، بێ ئەوەی بەرنامە دابنێین من کەووتمەڕێ بەرەو بۆیسان سوورو باریکە کاک جەمیل و هەڤاڵانیش بەرەو عەربەت.

من گەیشتمە بۆیسان سوورو شەهید تاهیرە بچکۆل بەجیهاز پێی وتم ئەوە لەناو کۆمەڵگەی باریکەین و عەسکەر کۆمەڵ کۆمەڵ بەپێ بەرەو سلێمانی و عەربەت هەڵدێن و سنوورەکەیان چۆڵ کردوە. پەیوەندیم بەرەتڵی سەرەوە کرد، ئەم هەواڵەیان بدەمێ هەڤاڵ خەلیل سەرکانی وەڵامی دامەوە،

لەوکاتەدا تەقینەوەیەکی گەورەڕوویدا لەلای ئەوانەوە لەسەر جادەکەی نزیک فرۆکەخانەی کشتوکاڵی ئێستا، تەقینەوەکە ناوچەکەی رووناک کردەوە. پرسیم ئەوە چیەووتی گەلابەی هەڵگری تەقەمەنییە. نیوەشەو ئاگادار کراین بگەڕێینەوە بەرەو کانی پانکە تابەیانی.

گەڕاینەوە بۆسەراو لەچەناخچیان کاک جەمیل چاوەڕێی دەکردم، پرسیم بۆ گەڕاینەوە چیڕوویدا؟ ووتی کاک شەوکەت دەڵێت مانوین و شەویشە. پرسیم ئێوە چیتان کرد؟ ووتی ئێمە چووینە ناو بارەگای لیواکە، بەرلەوە فەرماندەی لیواکە خۆی هاتوو تەسلیم بوو کاک شەوکەت بردی بۆسەراو.

کاتێک گەیشتینە سەراو چووم بۆبینینی فەرماندە لیواکە، ناوی عەبدزوهێر عەبدولحسێن بوو، کوڕێکی گەنجی خوێن گەرم بوو، کاک شەوکەت ووتی مام جەلال داوای کردووە بەیانی بیبەم بۆ قەڵاچوالان، لەناڵپاریزەوە ئەیبەم بۆلای. من ئەمویست بزانم ئەوکەسەیە سەربازەکە دەیوت کۆبوونەوەی پێکردوین، وتویەتی ئەگەر شەڕ بوو تەسلیم ببن و کورد نەکوژن، ووتیان خۆیەتی.

لەم ماوەدا، نەشەڕو نە ئاشتی، بەرەی کوردستانی بەتێکرای دەنگ، پێشنیارێکی مام جەلالیان پەسەند کرد کە هێزی پێشمەرگە لەشارەکان بکشێتەوە و هێڵی بەرگری قایم لەدەروەی شارەکان دروست بکرێت. لەرۆژی۱۹۹۱/۱۱/۱۲دا لەو بارەوە بروسکەمان بۆهات، لە جهازەکەی مام جەلالەوە.

ئەو بڕیارەی حکومەتی عێراق دابووی سەبارەت بەگواستنەوەی ئیدارەی مەدەنی لە پارێزگاکانی کوردستاندا، بڕیارەکەی لە ڕۆژی ۱۹۹۱/۱۰/۲۱وە خستە بوواری جێبەجێکردنەوە، من نازانم لێکدانەوەی رژێم و هۆکارە سەرەکیەکانی بۆ کێشانەوەی ئیدارات چی بوو، لەوکاتەدا نزیکەی ۱۵۰۰۰۰ سەدو پەنجا هەزار کەس موچەخۆری دەوڵەت بوون، هەروەها هەموو ئەوپارەو بووجەی هەبوو بۆکارە خزمەتگوزارییەکان بڕی. لەگەڵ بردنەوەی کەرەستەو کەلووپەلەکانی ئیدارەکان.

قسە هەبوو بیرکردنەوەی حکومەت ئەوە بووبێ، کورد دوای ئەمە ناتوانن بژین و دوای ماوەیەک ناچار ئەبن خۆیان داوای گەڕانەوەی

ئیدارەکان بکەن، یان حاڵی بووبن لەوەی جارێکی تر ناتوانن لەپشت هێڵی ٣٦ سی و شەش و پرۆڤاید کۆمفۆرتەوە حوکمڕانی بکەن، یان ناوچەکە لەڕووی ئـابووری وئیـدارییەوە زوو ئەکەوێ و خەڵـکەکەی هەڵ دەگەڕێـنەوە لەحزبەکـان، یـان نـاوچەکە لەوکـاتەدا بـۆ ئەوان گرنگـی وای نیـیە و سەرئێشەکەشی زیادەیە ...........تاد .
هەرچۆن بوبێت ئەم هەنگاوەی ڕژێم زەمینەی خۆش کرد بۆدروست کردنی ئیدارەی خۆماڵی و خۆبەڕێوە بردن لەهەرێمی کوردستاندا.

## کۆنگرەکانی یەکێتی / کۆنگرەی یەک

ئەم کۆنگرە لەڕۆژی ١٩٩٢/١/٢٧ لەشاری سلێمانی دەستی پێکرد، نـوێنەرانی هەردوو ڕێکخراوەکـانی نـاو یەکێتـی، کـۆمەڵەو شۆڕشـگێڕان کەلەدەرەوە لەسەر سنوورەکان و لەناو ئێراندا لەکۆنفرانسە ناوچەییەکاندا هەڵبژێردرابوون بەشدارانی ئەم کۆنگرە بوون. لەگەڵ ژمارەیەک کادری تری ناوشارەکان، کۆنگرە ١٧حەفدە ڕۆژی خایاند.
پرۆژەی یەکخستنەوەی هەردوو باڵی کۆمەڵەو شۆڕش گێران لەم کـۆنگرەدا ئەنجـام درا، سـاڵی١٩٨٩ لەدەرەوە، واتە لەشـاخ و لەنـاوچەی قاسمەرەش بڕیاری لێدرابوو. پرۆژەکە یەکەمجار لەلایەن یەکێتی شۆڕش گێرانەوە پێشنیار کرا، لەپلینۆمی ساڵی ١٩٨٩دا، دیارە لەدەرەوە ئاسانکاری بۆ پێشنیارەکە کراو کارەکان ئامادە کران و دواتر لەم کۆنگرەدا پرۆژەکە، پرۆژەی یەکگرتنەوەکە ئەنجام درا،
ئێمە واتە ئەوهەڤاڵانەی نوێنەرانی پێشمەرگە لەبەتالیۆنی یەک کە پێک هـاتبوو لە تیپەکـانی ١١ی هەورامـان و ٥١ی گەرمیـان و ٥٣ی شـێروانە، لەکۆنفرانسـی نـاوچەی لەڕۆژی١٩٩٠/١٢/١٠دا لەشـاری پـاوە کوردسـتانی ڕۆژهەلات هەڵبژێردرابووین بۆبەشداری لەکۆنگرەی یەکدا ئەمـانە بووین :
مەحمود سنگاوی، عوسمانی حاجی موحمود، م- عەلی عەبدولا، مامۆستا جوامێر، سەلاحی کوێخا محەمەد، ئەکبەر سان ئەحمەد، مامۆستا مەحمود

کەریم، حەسەن جیهاد، ئاسۆی شێخ نوری، مامۆستا دڵشاد، کەمال هەورامی، شێرزاد عەزیز، هاوڕێ مەجید هەورامی، مەلاسەعید، نیازی عیزەت هەورامی و حەمەی حەمەسەعید.

ئەو هەڤاڵانەش لەوکۆنفرانسەدا وەک نوێنەرانی ڕێکخستنەکانی ئاوارەی یەکێتی لەناو ئوردوگاکانی سنووری کرماشاندا لە(سەریاس، ڕەوانسەر، تازاوا، سنقور، کەنگاوەر، وەرمەهەنگ، کەچەلاوا، کامیاران) هەڵبژێردرابوون ئەمانە بوون: غەزالی مەحمود هەورامی، مەلاساڵحی هەڵەبجەیی، وەهبی پاشا نامدار ئێناخی، عوسمان عەلی عارف کوکۆیی.

کۆنگرەی یەکەمی یەکێتی لەشاری سلێمانی دەستی پێکرد، ڕۆژی یەکەم بەخێرهێنانی میوانان و خوێندنەوەی ووتارەکانیان بوو، ئەوانیش پێک هاتبوون لەسکرتێر و نوێنەرانی حزبە کوردستانی و عێراقیەکان و دەوڵەتانی ناوچەکەو ڕۆژهەلاتی ناوەراست و هەروەها ئەمریکی و ئەورووپیەکانیش. کۆنگرە لەهۆڵی ڕۆشنبیری شاری سلێمانیدا بەسترا، کارەکانی بەئاسایی بەڕێوە چوون تا ڕۆژی سێیەم، لەڕۆژی سێیەمدا کە دەکاتە ڕۆژی ١٩٩٢/١/٢٩ ئەندامێکی کۆنگرە، پیاوی ناودارو تێکۆشەری دێرینی کوردایەتی، کاک عومەر مستەفا (عومەر دەبابە) لەهۆڵی کۆنگرەدا کۆتای بەژیانی سەربەرزانەو پڕلەسەروەری هات، کۆنگرە کارەکانی خۆی ڕاگرت تاتەرمی دەبابە برایەوە بۆ کۆیە و لەوێ بەخاک سپێردرا، دواترکۆنگرە لەشاری هەولێرو لەهۆڵی میدیادا دەستی بەکارەکانی کردەووە. کاری سەرەکی کۆنگرە یەکخستنەوی هەردوو ڕێکخراوی کۆمەڵەو شۆڕشگێران و چەسپاندنی مەبدەئی دیموکراسی و بەرنامەی سۆسیال دیموکرات بوو، لەگەڵ هەڵبژاردنی سەرکردایەتییەکی تەباو پێکەوە گونجاو بۆ بەڕێوە بردنی یەکێتی نیشتیمانی. کە هەرگیز یەکێتی ئەو سەرکردایەتیە تەباو پێکەوە کونجاوەی بەخۆیەوەوە نەبینی، نەلەم کۆنگرەو نەلەکۆنگرەکانی دواتردا.

بەبەشداری ٧٥٠حەوت سەدو پەنجا ئەندامی کۆنگرە، کۆنگرە بەڕێوەچوو، سەرکردایەتی بەهەڵبژاردن دیاری کران هەرسێ سکرتێرەکەی یەکێتی و کۆمەڵەو شۆڕشگێران، مام جەلال، نەوشیروان مستەفا، فوئاد مەعسوم، لەهەڵبژاردن بەخشران بەتێکرای دەنگ نەخرانە چوارچێوەی هەڵبژاردن.

کارەکانی کۆنگرە کاتێک هاتەسەر مەسئەلەی جۆر و شێوەی تێکەڵ کردنەوەی هەردوو باڵەکەو دیاری کردنی دەسەڵات و چۆنییەتی هەڵبژاردنی سکرتێری گشتی، بۆ چوونی جیاواز هاتنە ئاراوەو بوونە هۆی سەرهەڵدانی چەندین گرفت کەدواتر لەرێگای گفتوگۆی لیژنەیەکی هەردوولاوە رێککەوتنیان لەسەر کرا و چارەسەریان بۆ دۆزرایەوە. لەرۆژی ١٠ی شوباتدا، پرۆسەی هەڵبژاردنی سەرکردایەتی دەستی پێکرد. ئەم کۆنگرە دوای ١٧هەفدە ساڵ لەدرووست بوون و دامەزراندنی یەکێتی بەسترا، ٥١ پەنجاو یەک کەس بۆ مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی هەڵبژێردران. لەم کۆنگرەدا چەند هەڤاڵێکم پێیان ووتم خۆت کاندید بکە، بەڵام من خۆم کاندید نەکرد، دیارە لەبەر بارودۆخی کۆنگرەو ململانێکان، ئەو داوا لەچەند کەسێکی تر کرا ئەویش لەچوارچێوەیەکی سنووردارداو، کەسیان ئامادە نەبوون خۆیان بپاڵێون، جگە لەوەش لەوکاتەدا بەبۆچوونی مام و لەبەر زۆری پاڵێوراوەکان رەنگە بۆ ئێمەمانان زووبێت ببینە ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی.

لەم کۆنگرەدا کاک کۆسرەت رەسوڵ هەرچەندە تەمەنی پێشمەرگایەتی لەساڵی١٩٨٤ وە دەست پێ دەکات، بەبەراورد لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی تردا کەبەشدار و کاندیدن لەم کۆنگرەدا و تەمەنی پێشمەرگایەتیان لەم زیاترە، بەڵام ئەم یەکەم دەنگی کۆنگرە ئەهێنێ، ئەوە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ ئەو، هۆکارەکەشی خۆشەویستی کەسێتی و نزیکی و تێکەڵ بوونی لەگەڵ ئۆرگانەکانی پێشمەرگە و فەرماندەیی کردنی هێزەکان و شەڕەکان بوو، دژی سوپای رژێمی سەدام و نەیارانی یەکێتی. لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی کۆمەڵایەتیی و تێکەڵ بوو لەگەڵ خەڵکدا، مێژووی کوردایەتی سەلماندویەتی، ئەو فەرماندەو سەرکردانەی پێشمەرگەو حزب دەرگایان کراوەو لەسەر پشت بووبێت بۆ فەرماندەو کادرەکانی خوار خۆیان و بۆ پێشمەرگەو ئەندامانی حزبی، یان لەخۆبووردو و فیداکار بووبن، ئەوە بوونەتە رەمزو خۆشەویستی خەڵک. کۆسرەت رەسوڵ لەوسەرکردانەیە.

# کۆنگرەی دوو

کۆنگرەی دووەمی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دوای ٩ ئۆسال لەکۆنگرەی یەکەم و لەرۆژی ٣٠ی کانونی دووەمی ساڵی ٢٠٠١دا لەهۆڵی رستن و چنینی شاری سلێمانی لەژێر ناونیشانی ((پتەو کردنی ریزەکان، گەشەپێدانی پرۆگرام و پەیرەو و رێبازو و دەزگاکان)) بەرای من دروشمێکی تێکەڵ و پێکەڵ بوو، بەئامادە بوونی (١٢٤٧) هەزارەو دوسەدو چل و حەوت ئەندام کە(٩٣) نەوەدو سێ ئەندامیان ژن بوون دەستی بەکارەکانی کرد. ئەم کۆنگرە ماوەیەکی زۆری بۆ تەرخان کرا، بۆ ئامادەکاری بەرلە وادەی بەستنی. لەمانگی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٠ دوو هەزارەوە، لە رۆژنامەی رۆژانەی کوردستانی نوێی زمانحاڵی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان پەراوێزو گۆشەی تایبەتی بۆ تەرخان کرا، تازۆر ترینی ئەندامانی یەکێتی راو و بۆ چوون و سەرنجی خۆیان لەسەر کۆنگرەی دوو دەرببڕن.

لەم کاتەداو لەرێگای ئەم رۆژنامەوە رێزداران دوو هەڤاڵی ئەندامی مەکتەبی سیاسی و سەرکردەو تێکۆشەری ناسراوی یەکێتی و گەلی کورد، رایان گەیاند، ئەیانەوێت وەک نەریتێک و داهێنانێک، سەرمەشقبن واز لەپۆست و پلە بهێنن و جێگە چۆڵ کەن بۆ گەنجە تێکۆشەرەکان و کوڕو کچە شەهیدەکان، لەم کۆنگرەداو وەک ئەندامی ئاسایی یەکێتی بمێننەوە، چیتر خۆیان کاندید نەکەنەوە. ئەوانەش کاک عومەر عەبدوڵاو کاک قادری حاجی عەلی بوون، ئەمە بریارێکی ئازایانە و بێوێنەیە، گەورەیی بوو بۆ ئەو پیاوانە، سەردەمی رۆژانی سەخت و تەنگانەی گەلەکەت لە شاخ تەواو کەیت و دوای سەرکەوتن و هاتنەوە بۆناوشارو سەرجادە، ئەمە هەڵوێستت بێت. لەبەرامبەریشدا هەن لەناو حیزبەکانی کوردستاندا کە هیچ دەورێکیان نییە، تاپەکیان نەکەوێ و نەکەونە جێگا حەزناکەن ئەو پۆستەی هەیانە وازی لێبهێنن، خۆ ئەگەر کەسێک کاریزماو پێویست بێت بۆحیزبەکان و پرۆسەی سیاسی وولات، ئەو پۆست و پلەشی نەبێت پێویستی قۆناغ و سەردەمەکەیەو راوێژی پێئەکرێ و کەڵک لەئەزمونی وەردەگیرێت، ئێستا لەکوردستان لەناو

حیزبەکاندا چەندین کەسی وامان هەیە، ئێمەش و نەوەی نوێش ئەبێت وەک مامۆستای خاوەن ئەزمون و ڕێنیشاندەر سەیریان بکەین و مەمنونیان بین، واش نییە هەرکەس بەساڵا چو ئیتر ئەبێ بچێتە لاوە، ئەوەتا لەوولاتانی پێشکەوتو و سەرکەوتودا، تەمەن هەورازەکان پۆست و پلە باڵاو کاریگەرەکان ئەگرنە دەست.

کۆمیتەی سەرکردایەتی دواکۆبوونەوەی خۆی بۆ گفتوگۆ لەسەر ئەم کۆنگرە، لەرۆژی١٨ ی کانونی دووەمی ٢٠٠١دا بەست.

دواتر لیژنەی ئامادەکاری کۆنگرە کە پێکهاتبوو لەم هەڤالانەی خوارەوە: ١- کاک عومەری سەید عەلی، ٢- کاک ئەرسەلان بایز، ٣- شەهید شاخەوان عەباس، ٤- چەتۆ حەویزی، ٥- سالار عەزیز، ٦- عوسمانی حاجی مەحمود، ٧- مامۆستا موحسن عەلی ئەکبەر، ٨-مستەفا چاورەش. بەرلە هەڵبژاردن و دانیشتنی دەستەیەک بۆ بەڕێوەبردنی کۆنگرەکە. یەکەم دانیشتنی کۆنگرە بەسەرپەرشتی سەرۆک تاڵەبانی و کاک نەوشیروان و دکتۆر فوئادو عادل موراد، وەک ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی بەڕیوە چوو. هەریەکەو وتەیەکی کورتیان پێشکەش کرد. دوای ئەوە داوایان لە کاک ئەرسەلان کرد ووتاری دەستەی باڵای ئامادەکاری کۆنگرە پێشکەش بکات.

لەوتارەکەیدا کاک ئەرسەلان رایگەیاند ئامادەبووانی ناو ئەم هۆڵە نوێنەرانی (٢٣٠) دووسەد و سی هەزار ئەندامی نهێنی و ئاشکرای یەکێتین و درێژەی دا بەوتارەکەی............تاد . دوای تەواو بوونی ووتارەکەی، لەپرۆسەیەکی هەڵبژاردنی ئاشکرادا دەستەی بەڕێوە بردنی کۆنگرە دیاری کران، کەئەم هەڤالانە بوون: ١- دکتۆر فوئاد، ٢ -کاک فەرەیدون، ٣ -کاک عەدنان مفتی، ٤- سەعدی پیرە، ٥-د. حەمە سابیر، ٦- ئاسۆ عەلی، ٧-جەعفەر مستەفا.

لەدانیشتنی پاش نیوەڕۆی هەمان رۆژ مام جەلال بەبێ هەڵبژاردن لەسەر داوای سەرجەم ئەندامانی بەشدار بووی کۆنگرە بەسکرتێری گشتی دیاری کرایەوە. دوای هەڵبژاردنەوەی بەسکرتێری یەکێتی، مام دوو پێشنیازی خستە بەردەم ئەندامانی کۆنگرە، یەکەم داوای کرد نەوشیروان مستەفا، عادل موراد، دکتۆر فوئاد، دکتۆر کەمال فوئاد بەبێ هەڵبژاردن ببنەوە بەئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی. دووەم کاک کۆسرەت رەسول وەک سەرۆک

وەزیرانی پێشو و کاک دکتۆر بەرهەم وەک سەرۆک وەزیرانی نوێ بەبێ هەڵبژاردن ببنەوە بەئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی. هەردوو پێشنیارەکەی بەزۆرینەی زۆر پەسەند کران. دوای ئەمە کاک کۆسرەتیش پێشنیاری کرد، کاک جەبار فرمان لەئەڵمانایە بۆ چارەسەری نەخۆشی بائەویش بەبێ هەڵبژاردن ببێتەوە بە ئەندامی سەرکردایەتی، پێشنیارەکەی بەچەپڵەرێزانی زۆرینە پەسەند کرا.

لەم کۆنگرەدا پرۆسەیەکی سەیر و سەمەرەی هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆمیتەی سەرکردایەتی بەڕێوەچوو، ئەویش ئەوەبوو، لە دووەم ڕۆژی کۆنگرەدا و بەرلەوەی کۆنگرە کارەکانی ئەنجام بدا، دەنگ درا بۆکاندیدەکانی کۆمیتەی مەرکەزی، سندوقەکانی دەنگ برانەدەرەوەو پێچرانەوەو رادەستی دکتۆر فوئاد کران، تادوا رۆژی کۆنگرە ئینجا ئەوکات دەنگەکان جیا بکرێنەوە. دوای ئەمە پرۆسەی دەنگ دانە کۆنگرە دەستی بەکارەکانی کرد.

دوای تەواو بوونی پرۆسەی دەنگ دان، کۆنگرە دەستی بەکارەکانی کرد، بەهەڵبژاردنی ٦ شەش لیژنە، لەوانە: لیژنەکانی بەرنامە، پەیڕەو، پێشمەرگە، دارایی، پێشنیار، راسپاردە و سکاڵا. لە ڕۆژی کۆتای کۆنگرەدا سندوقەکان هێنرانەوە بۆ هۆڵی کۆنگرە دەست کرا بەجیاکردنەوەی دەنگەکان، لەئەنجامدا (٤٥ ) چل و پێنج ئەندامی سەرکردایەتی، بەسکرتێر و جێگرەکان و مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی و یەدەکەکانەوە دەر چوون، لەکۆی نزیکەی ٢٠٠ کەسی کاندید کراو، من لەم کۆنگرەدا خۆم کاندید کردبوو، دەرنەچووم سێهەم کەسی دەرنەچو بووم لەدوای یەدەکەکانەوە کاک شەماڵ عەبدلوەفاو کاک ئاواتی شێخ جەناب هەریەکەو بەچەندین دەنگ لەپێشمەوە بوون، ئەوانەی لەم کۆنگرەدا دەرنەچوبوون و خۆیان بەشیاوتر دەزانی لەهەندێک کەس کەدەرچوبوون، جۆرەها قسەو توانجیان هەبوو، هەندێکیشی نابەجێ، هەندێک لەهۆڵەکەدا دەیان ووت ئەمەدەنگی حەلاڵی خۆمانە، واتە زۆرکەس بەپێدانی دەنگ زیاد لەوەی خۆیان، یان بەدەستەو دەستەگەری نەبووایە بەرندە نەدەبوون.

من لەو بارەوە هیچ قسەو گلەییەکم نەبوو، لەریزبەندی و لیستی هیچ لایەکیش دا نەبووم، ئەمەم بۆیەکەم جارو بەتاقی کردنەوەم ئەزانی، دەنگەکانی خۆشم بەزۆر دەزانی و دەنگی پێشمەرگەش بوون. بەڵام گلەیم

هەبوو لەدوو برادەری خۆم، ڕووبەرو بەبێدەنگ گلەییەکەمم پێگەیاندن، ئەویش ئەوە بوو بەهەڤاڵەکانی کۆنگرەیان وتبوو، لەنێوان کاک شەوکەتی حاجی مشیرو حەمەی حەمەسەعیددا، بۆسنووری شارەزوور، ئەگەر دەنگ بدەن بەهەردووکیان هیچکامیان دەرناچن، بەڵام ئەگەر دەنگ بەیەکێکیان بدەین ئەوە دەرچوونی ئەویتریان مسۆگەرە، هەرکەسیش ئەیوت ئەی بەکامیان دەنگ بدەین، ژیرانە ئەیانوت خۆت ئەزانی بۆ ئێمە جیاوازییان نییە، بەڵام کاک شەوکەت چانسی زیاترە. هۆکاری دەرنەچوونم لەکۆنگرەی دوو ئەوەبوو.

٢٧بیست و حەوت کەس لەئەندامانی کاندیدکراو بۆ کۆمیتەی مەرکەزی و ٩ نۆ کەس بۆئەندامی یەدەکی کۆمیتەی مەرکەزی هەڵبژێردران، مستەفای سەیدقادر بەرندەی یەکەم و دەنگی یەکەمی کۆنگرەی بەدەست هێنا. چوونکە لای هەردوولاکە وتبووی لەگەڵ ئێوەم، بەئاشکرا دوو لیست هەبوو، لەرۆژی ٩ نۆی شوباتدا لەناو ئەندامانی هەلبژێردراودا بۆ کۆمیتەی مەرکەزی مەکتەبی سیاسی دیاری کرا کەپێک هاتبوو لە١٥ پانزە ئەندام، ١٠ دە ئەندامی فەرمی و ٥ پێنج ئەندامی یەدەک.

ئەمە دەرچووانی کۆمیتەی سەرکردایەتی بوون لەکۆنگرەی دووەمی یەکێتی نیشتیمانی دا: ١- مستەفای سەید قادر، ٢- فەرەیدوون عەبدل قادر، ٣- عەدنان مفتی، ٤- ئەرسەلان بایز، ٥- عوسمان حاجی مەحمود، ٦- مستەفا چاورەش، ٧- عومەر فەتاح، ٨- شێخ جەعفەر، ٩- ئازاد جندیانی، ١٠- فەرید ئەسەسەرد، ١١- عیماد ئەحمەد، ١٢- بورهان سەعید سۆفی، ١٣- حاکم قادر، ١٤- کوردۆ قاسم، ١٥- عومەر سەید عەلی،١٦- حەمە سابیر، ١٧- سەعدی پیرە، ١٨- مەلا بەختیار، ١٩- عارف روشدی،٢٠- شاخەوان عەباس، ٢١- مەحمود سنگاوی، ٢٢- عوسمان بانی مارانی، ٢٣- شالاو عەلی عەسکەری، ٢٤- جەلال جەوهەر، ٢٥- محەمەتۆفیق رەحیم، ٢٦- سەفین مەلا قەرە ٢٧- جەمال یوسف.

ئەندامانی یەدەکی سەرکردایەتی لەم کۆنگرەدا ئەم هەڤاڵانە بوون: ١- رەفعەت عەبدولا، ٢- د. خەسرەو، ٣- ئاسۆ مەمەند، ٤- ئاسۆ عەلی، ٥- شۆڕش ئیسماعیل، ٦- شەوکەت حاجی مشیر ٧- رزگار عەلی ٨- جەمال محەمەد ٩- خەسرەو شێرە.

# کۆنگرەی سێ

دوای ٩ نۆساڵ لەکۆنگرەی دووەم و لەساڵیادی یادی دامەزراندنی یەکێتی و لەرۆژی ٢٠١٠/٦/١ دا لەتەلاری هونەر لەشاری سلێمانیدا یەکێتی کۆنگرەی سێیەمی خۆی بەست بەئامادەبوونی(١٢٠٠) هەزارو دوسەد ئەندام. لەم کۆنگرەدا دوئەندامی دەستەی دامەزرێنەر دوای رێزلێنانیان لەمەراسمێکی تایبەتدا خانەنشین کران، ئەوانیش هەڤالان دکتۆر کەمال فوئاد و عادل موراد بوون. کاک دکتۆر فوئاد مەعسومیش نەچووە ناو پرۆسەی هەڵبژاردنی کۆمیتەی سەرکردایەتیەوە، خۆی کاندید کرد بۆ بەرپرسی ئەو ئۆرگانەی خۆیی پێشنیاری دامەزراندنی کردبوو، بەناوی ئەنجومەنی ناوەند.

لەم کۆنگرەدا سەرەتا (٢٤٤) کەس خۆیان کاندید کردبوو بۆ بەدەست هێنانی دەنگ و متمانەیی ئەندامانی کۆنگرە بۆ بوون بەئەندامی کۆمیتەی سەرکردایرتی، لەو هەڤالانە (٤٢) کەس بەرندە و دەرچوون، ( ٥ ) ئەندامیش دەنگیان هێنا بۆ ئەندامی یەدەکی سەرکردایەتی. کەدواتر لەکۆبوونەوەی یەکەمی کۆمیتەی ناوەندیدا ئەندامانی مەکتەبی سیاسی دیاری کران.

لەهۆڵی کۆنگرەو بەرلە پرۆسەی هەڵبژاردنی کۆمیتەی سەرکردایەتی بەتێکرای دەنگی ئەندامانی کۆنگرە، جەنابی مام جەلال لەپرۆسەیەکی ئاشکرادا بەسکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی هەڵبژێردرایەوە، دوای هەڵبژاردنەوەی مام جەلال، ئەویش پێشنیار و داوای کرد لەئەندامانی کۆنگرە، هەریەک لەکاک کۆسرەت رەسوڵ و کاک د. بەرهەم ئەحمەد ساڵح ئەندامانی سەرکردایەتی لەپرۆسەیەکی ئاشکرادا، وەک جێگری یەکەم و دووەمی سکرتێری گشتی دەنگ بدەنێ، داواکەی بەچەپڵەرێزان و بەڵێی هەموو ئەندامانی کۆنگرە پەسەند کراو ئەوانیش بوون بە جێگری یەکەم و دووەمی سکرتێری گشتی یەکێتی. تەنها دوو دەنگ نارازی بوون، پێشنیارو داواکەی مامیان رەدکردەوە.

ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بەپێی مادەی ٣٦ سی وشەش لەپەیرەوی ناوخۆی پەسەند کراوی کۆنگرەی سێیەم پێکدێن لە ( ٩-١١ ) نۆ بۆ یانزە ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی، سکرتێری گشتی کاندیدیان ئەکاو کۆمیتەی

سـەرکردایەتی دەنگیـان دەداتـێ. بەڵام بەپـێچەوانەی پەیـرەوەوە، لەیەکەم کۆبـوونەوەدا ۱۷ حەڤـدە کەس بـوون بە ئەنـدامی مەکتەبـی سیاسـی، هەڵبژاردنەکەش بەم شێوە بوو:

کۆبوونەوەکە لەماڵی مام جەلال کرا لەدەباشان، کۆبوونەوەکە تایبەت بوو بەهەڵبژاردنی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، دوای کەمێک گفتوگۆ مام جەلال ووتی من (۸) هەشت کەس کاندید دەکەم، کاندیدەکانی بەم شێوە بوو: هەڤالان عەدنان مفتی و ئەرسەلان بایز بۆ هەولێر، عومەر فەتاح و هێرۆخان بۆ سلێمانی، مەلابەختیارو عیماد ئەحمەد بۆ گەرمەسێر، نەجمەدین کەریم و ڕەفعەت عەبدولا بۆ کەرکوک. تائێرە بەرواڵەت و روکەش هەموو ئەندامانی سـەرکردایەتی بەبەڵـێ دەنگیـان دا، مـن بۆخـۆم لەتەی دڵەوە دەنگـم دا بۆکەسیشیان پەشیمان نەبووم لەوکاتەدا.

دوای ئەوە، مام ووتی: ئێستا بۆسێ کەسەکەی تر دەرگای پاڵاوتن دەکەینەوە، هەڤاڵێک ناوەکەیم لەبیر نییە ، ووتی مام جەلال جەنابت و دوو جێگرەکەش ئەوە دەکاتە ۱۱یانزە کەسەکە، توڕە بوو ووتی نا بەئێمەوە ئەبینە ۱٤چواردە کەس، باشە دوای کەمێک بێنەو بەرە، بڕیار درا کێ خۆی کاندید ئەکا با ناوی بنوسێ، لەوکاتەدا کاک شاڵاوی عەلی عەسکەری ووتی مام جەلال خۆت ئەو سێ کەسەش دانێ هەڵبژاردنی بۆچییە؟ مام توڕە بوو ووتی نا شاڵاو ئەوە پێشێل کردنی دیموکراسییە نابێ، شاڵاو زانی مام جەلال زۆر توڕە بوو، ووتی نا مام جەلال ئەڵێم خۆت سـێ کەسـەکە کاندید بکە ئێمە دەنگیان ئەدەینێ، ووتی نا هەر ئەبێ بەهەڵبژاردنی نهێنی بێت.

بۆسـێ کەسـەکە نزیکەی ۱۰دە کەس خـۆی پاڵاوت، دەنگیـان درایە، ئەوسێ کەسەی دەر چوون، ئەمانە بوون: حاکم قادر، شێخ جەعفەر، مەحمود سەنگاوی. دواتر ئەوانەی خۆیان پاڵاوتبوو دەرچو دەرنەچو، لەگەڵ یەدەکدا، وەک یەک بوون بەئەندامی مەکتەبی سیاسی و ئەچنە کۆبوونەوەکانەوە، تەنها دووکەسی دەرنەچو وەک سەرکردایەتی مانەوەو نە چوونە کۆبوونەوەکانی مەکتەبی سیاسییەکەوە، ئەوانیش مستەفا چاورەش و سامان گەرمیانی بوون، ئەم دووکەسـە خۆیـان نە چوونە کۆبوونەوەکـانی مەکتەب ئەدەبـی خۆیـان ڕێگەی نەدانـێ، ئەگینـا یەکەم دانیشـتن نەهاتنـایەتە دەرەوە ئەوانـیش وەک عالەمەکە مەکتەبی سیاسی بوون. ئەوانەی دوو دەنگ و سێ دەنگیان هێنابوو

بوون بەئەندامی م.س، بەمانیان ئەوت بە سامان و مستەفا بۆ ببنە ئەندامی مەکتەبی سیاسی جاخۆ یەکی یەک دەنگیان هێناوە ئەویش دەنگەکەی خۆیانە، ئەوانەی ئەوە ڕایان بوو خۆشیان یان دوو دەنگ یان سێ دەنگیان هێنابوو، ئەو مەکتەبی سیاسییەکەدا لەکۆنگرەی سێ دا ئاوا هەڵبژێردراوە. ئێستا جگە لەوەی بەپێی پەیرەو سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی شەرعیەتی نەماوە، هەندێک لەئەندامانی مەکتەبی سیاسی دووجار شەرعیەتیان لەدەست داوە، کەچی ئەوان لەخەڵکیتر زیاترباسی شەرعی وناشەرعی بوونی ئەم و ئەودەکەن.

لەم کۆنگرەدا ( ٢٤٤) دووسەدو چل وچوار هەڤاڵ خۆیان پاڵاوتووە بۆ بوون بەئەندامی سەرکردایەتی، لەڕۆژی دەنگدان دا مانەوە (٢٢١) دووسەدو بیست و یەک کاندید، لەوانە سێ هەڤاڵ بەهەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ هەڵبژێردران، ئەوانیش هەڤالان مام جەلال تاڵەبانی ، کاک کۆسرەت ڕەسول، کاک دکتۆر بەرهەم سالح بوون. لەوانیتر کۆنگرە (٤٢) چل و دوو هەڤاڵی ئەوێت ، لەو (٤٢) چل و دوو کەسە کەبەرندە و دەر چوون، من لەریزبەندەکەدا، (١٤ ) چواردەهەمین کەسم بەم شێوە: ١- هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد، ٢- قادر حەمەجان، ٣- خەسرەو گوڵ محەمەد، ٤- مەحمود سەنگاوی، ٥-مەلابەختیار، ٦-عیماد حەحمەد، ٧- فریاد ڕەواندزی، ٨- عەدنان موفتی، ٩- شۆڕش ئیسماعیل،١٠- هەرێم کەمال ئاغا، ١١- شالاو کۆسرەت، ١٢-ئازاد جوندیانی، ١٣- مستەفا چاورەش،١٤- حەمەی حەمەسەعید، ١٥- سامان گەرمیانی، ١٦- ئەرسەلان بایز، ١٧- جەعفەر مستەفا، ١٨- ئاریێز عەبدولا، ١٩- سیروان کیخا نەجم، ٢٠- رزگار عەلی، ٢١- عەدنان حەمە مینا، ٢٢-شالاو عەلی عەسکەری، ٢٣- دکتۆر نەجمەدین کەریم، ٢٤- ڕەفعەت عەبدولا، ٢٥- سەعدی ئەحمەد پیرە، ٢٦- فەرید ئەسەسەرد، ٢٧- محەمەد وەتمان، ٢٨- حامیدی حاجی خالید ٢٩- بێگەرد دڵشاد تالبانی، ٣٠- ئالا تەحسین تاڵەبانی، ٣١- وەستا حەسەن نوری، ٣٢- خالید شوانی، ٣٣- ئاسۆ مامەند، ٣٤- هەڵۆ پێنجوێنی، ٣٥- وەستا رەسوڵ عومەر، ٣٦- عومەر فەتاح، ٣٧- دکتۆرە جوان ئیحسان،

٣٨- پەروین کاکە حەمە، ٣٩- وەسفیە بەنی وەیس، ٤٠- نەرمین عوسمان، ٤١- پەروین بابەکر پشتدەری، ٤٢- بلێسە جەبار فرمان.[1]

ئەم کۆمەڵە کادرە بەشێکی زۆرمان، کەبووینە ئەندامی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی، راستە تێکۆشەرو ماندوو مستەحەقین ، بەڵام لەڕاستیدا و نابێت کەسیش بیباتە سەرخۆی من بەگشتی قسە دەکەم، ئەگەر جیابوونەوەی گۆڕان و کاک نەوشیروان و ڕۆیشتنی ئەو هەڤاڵانەی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی نەبووایە لەگەڵ گۆڕان، پێموانییە بەشێکی بەرچاو لەم مەکتەبی سیاسییەی ئێستاو بەشێکی ئەم سەرکردایەتیە ببوونایە سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی.

جا لای من جێگەی شانازیە سەرکردە و سەرکردایەتیەکان کرێکار و جووتیاربن، لەبیروباوەڕی چەپ و چەپ گەرایەتیشدا، کەئێمە وەک یەکێتی بانگەشەی بۆ ئەکەین ئەوە پێویستە زیاتر جێگەی شانازیمان بێت. بەپێچەوانەوە کاک عومەری سەید عەلی دوای کۆنگرە جارێک بینیم من ڕێزی کاک عومەرم زۆر لاهەیە، وەک تەعلیق، دوای چاکوچۆنی ووتی ها حەمە ئەڵێیت ئەتانەوێت مقاوەلات بکەن لەمەولا، دیارە مەبەستی ئەوەیە بڵێت سەرکردایەتیەکەتان لەم کۆنگرەدا وەستاو کرێکاری زۆری تیایە.

ئەندامانی یەدەکی ئەنجومەنی سەرکردایەتیش (٥) پێنج هەڤاڵ بوون بەم شێوە: ١- لەتیف شێخ عومەر، ٢- ڕەهبەر سەید برایم، ٣- جەمیل هەورامی، ٤- بەرزان ئەحمەد کوردە، ٥- عارف ڕوشدی.

---

1 _

## کشانەوەی ئیدارەکان لە هەرێمی کوردستان

ئەوەی حکومەتی عێراق لەساڵی ١٩٩٢دا بەیەکجاری سوپا داگیرکەر و دەزگا ئەمنی و هەواڵگریە داپڵۆسێنەرەکانی خۆی لەسەردووند و بەرزایی و لوتکەی چیاکان و شارو شارۆچکەو دەشت و دەر لە پارێزگاکانی دهۆک، هەولێر، سلێمانی وبەشێکی پارێزگای کەرکوک لە کوردستان دەست لێ بەردا، دوابەدوای ئەم هەنگاوە هەنگاوێکی تری چاوەڕوان نەکراوی نا، ئەویش کشانەوەی ئیداراتی مەدەنی بوولە ١٩٩١/١٠/٢٣دا، سەرەرای ئەو هەموو کێشانەی ڕووبەڕووی بەرەی کوردستانی و خەڵکی کوردستان و عێراق بووبوونەوە، بەهۆی ئەو ئابلۆقە ئابووریە نێودەوڵەتییەی نەتەوە یەکگرتووەکان بەسەر عێراقیان دا سەپاند بوو، سەدام ئابلۆقەیەکی تری ئابووری ناوخۆیشی بەسەر کوردستاندا سەپاند، لەوانە بڕینی خۆراک و دەرمان و سوتەمەنی و کارەبا، دەرگاشی داخست بەڕووی هاوولاتییانی هەرێمدا بۆ ناوچەکانی تری عێراق.

بەرەی کوردستانی بەر لە کشانەوەکەش نیمچە حوکمڕانی و بەڕێوە بردنی ناوچەکەی لەئەستۆدا بوو، دەستەو دامێن نەوەستا وەک هەندێک چاوەڕێیان دەکرد. بێ دوو دڵی و شڵەژاوی کەوتنە کار کردن بۆبەڕێوەبردنی هەرێمەکە لەڕووی سیاسی و ئیدارییەوە، بۆئەم مەبەستەش لەبڕیارێکی بوێرانەدا سەرەرای هەموو ئاستەنگە ناوخۆی و دەرەکیەکان لیژنەو کۆمیتەکانی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ناوخۆی لەهەموو شار و شارۆچکەکاندا دروست کرد.

ئەو سەردەمە بۆ چوونەکان بۆ بەڕێوەبردنی ئیدارەیەکی مەدەنی، جیاوازیان تێدا بوو، یەکێتی نیشتیمانی بۆ چوونی وابوو شێوازێکی نوێ پەیڕەو بکرێ و ئەو بەڕێوەبردنە کلاسیکیە بەجۆرێک لەجۆرەکان گۆڕانی بەسەردا بێت، ئەویش لەجۆری هەڵبژاردن و دروست کردنی پەرلەمان و حکومەتێک کەبتوانێ ئەوبۆشاییە، ئیدارییە ڕژێمی سەدام دروستی کردووە پڕبکاتەوەو هەرێمەکە لەڕووی بەڕێوە بردن و گەشەکردن و پێشکەوتنەوە

بەڕێوە ببات و سیستەمی دیموکراسی پیادە بکات، هەروەها مەسئەلە سەربازی و سیاسییەکەی بەرەی کوردستانی ئیدامە بدات.

هەرچەندە لەم کاتەدا پارێزگاری نێودەوڵەتی بەهۆی بڕیاری ٦٨٨شەش سەدو هەشتاو هەشت بۆ هەرێمەکەو پشتیوانییەکی نێودەوڵەتی بەئاشکرا ئەبینرا، هەندێک لایەن و کەسایەتی، ئەم بۆ چوونانەی یەکێتیان بەسەرکێشی و ئایندەی ناڕوون و دوارۆژێکی تەمومژاوی بۆ ناوچەکە ئەبینی و وەسف دەکرد. باس لەنەبوونی ئیمکانات و کولفە، نەبوونی شارەزایانی بوارەکە، ئاماری دانیشتوان و.....تاد دەکرا. دواجار هەموو لایەک بەیەکدەنگی بڕیارەکەیان وەرگرت، لەڕووی یاساییەوە یاسای ژمارە یەک و دوو دەرکرا، لیستی خۆراک کرایە بناغەی ئاماری تۆماری دەنگ دەران.

لەزەمینەیەکی ئازادانەو بێ سانسۆر هەموو لایەنەکانی بەشداربووی پرۆسەکە کەوتنە کارو چالاکی، کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بەشەوق و زەوق و جۆش و خرۆشێکی بێوێنەوە کەوتنە شایی و زەماوەند، هەموو خەڵک زەماوەندیان ئەگێڕا،

یەکەم: بۆ ئازادی و هەڵبژاردنی پەرلەمان و حکومەتێکی هەرێمی کوردستان، دوای ئەو حکومەتەی کەدەیان ساڵ داگیر کاری و کوشتن و بڕین و دەربەدەر کردن، حکومەتی ڕووداو کارەساتبارە ماڵوێرانکەرەکانی ئەنفال و کیمیایی و کۆچ پێکردن و دەیان کارەسات و ڕووداوی تاڵ و ماڵوێرانکەری تری بەسەر کورد و کوردستاندا هێناوە، لایان خەون و خەیال بوو.

دووەمیان: زەماوەند و شایی و لۆغانی ئەندامان و لایەنگرانی هەر حزبێک بۆ لیستەکەی خۆیان.

بەڵێ ڕۆژی ١٩٩٢/٥/١٥کرایە ڕۆژی دەنگ دانی ڕزگار بوون لەمەینەتی، بەهۆی چەند گرفتێکەوە، ڕۆژی دیاری کراو گۆڕا بۆ ڕۆژی ١٩٩٢/٥/١٩. نامەوێ بەچاوێکی تەسکی حزبییەوە لایەنگری لایەک بکەم و دژبەلاکانی تر بنوسم، بەڵام ئەمە ئامانەتی مێژووە، سەرەڕای ئەوە گەلی کورد نەتەوەیەکەو لایەن و حزبە سیاسییەکان، پێک هاتەکەیان لە سەرکردەکان و ئەندامان و هەوادارانیان لەم نەتەوە پێک هاتوون. ئەوەندە جیاوازی نییە لەبیرکردنەوەو بیر و بۆچوون دا، لەهەڵسوکەوت و

خورەوشت و ئەدەب و ڕۆشنبیریدا، لەناو ئەندامانی ئەم نەتەوەدا جیاوازی ئەگەر هەشبێت لەنوخبەدایە.

ئەمەویت بڵێم، یەکێتی بانگەشەی لە بوارە سیاسییەکەدا جیاواز بوو لە هەڤاڵانی پارتی، بەتایبەت لەسەر ئۆتۆنۆمی و مافی چارەی خۆ نوسین، یەکەم ئۆتۆنۆمی داوای پارتی و دووەم مافی چارەنووس هی یەکێتی بوو، بەڵگەو ڤیدیۆکانی بانگەشـەکە ئەمەمـان بـۆ پشتراسـت دەکەنەوە. هەرلایەک و بـۆ داواکەی خۆی پەنای ئەبردە بەربەڵگە مێژووییەکان بۆ ئەو بانگەشـەو داوا جیاوازەکانیان.

هـەروەها هەوڵی زۆر درا بۆ چەواشـە کـردن و بـرێکیش نـاعەدالەتی هەبوو، بۆنموونە دانانی مەڵبەندەکان و دابەش کردنی سندوقەکانی دەنگدان بەسەریاندا، هەروەها لەکاتی بانگەشەدا، لەڕۆژی دەنگ دانەکەشـدا چەنـدین سەرپێچی کران، لەچەند شـوێنێکدا هەڤـاڵانی پـارتی ئەیـانزانی ئەنجامەکـان بەقـازانجی ئەوان نییە کۆنوسـەکانیان واژۆ نەدەکرد، لایەنەکـانی تریشـیان ناچار دەکرد، بەهیمەت یان بەقیمەت واژۆکان نەکەن. بەڵام ئەنجـام دان و سـەرکەوتنی پرۆسـەکە لەدیـدی یەکێتـیەوە لەوکێشـەو گرفتـانە زۆر گەورەتربوو.

گرنگـی سـەرکەوتنی پرۆسـەکە لەوەدا بـوو، ئـێمە بۆیەکەمجـارە مومارەسەی ئەم مافە دەکەین، دەوڵەتەکانی دەوروبەرو دراوسێمان بەچاوی گومانەوە لەم پرۆسە دەڕوانن، دەوڵەتـی عێراق بەئاشکرا هەڕەشـەمان لـێ دەکات، ئاگای سیاسـی و ڕۆشـنبیریمان کەمە، پرۆسەی دیموکراسی و یەکتر قبـوولکردن لاوازە لەهەنـدێک نـاوچەدا هەرنیـیە، ئاسـەوارو پاشـماوەی دوژمنایەتی تایفەگەری زاڵە، هەمووکەس چەکی پێیەو میلیشیا زۆرەو ئەوەی نـاوی یاسـاو دادگـایە لاوازە یـان کـاری پێنـاکرێ، گیـانی تـۆڵە سـەندنەوەو نـاوچەگەریەتی و ئەو تۆوە چێنراوەی دووبەرەکی و کلتورە بەعسییانەیە لەگەشەو نەشە نەکەوتوەو کاریگەری خۆی هەیە.....تاد..

سـەرئەنجام دوای چەنـدین بگـرەو بەردەو بێـنەو بەرە، دوای پێـک هاتنێـک لەنێـوان هەردوولای بـراوە، یەکێتـی و پارتیـدا، ٥٠بە٥٠ و ٥ پێـنج کورسیش بۆ پێکهاتەکان، ئەنجامەکان ئاشکرا کران، حزبەکانی تـر کەسـیان ڕێژەی ٧./. لەسـەدا حەوتەکەیـان نەهێنـا، کەوەک کەمترین ڕێژە دانرابوو

بۆیان تابتوانن نوێنەرایەتی خەڵک بکەن لەپەرلەمان. لەگەڵ ئەم هەڵبژاردنەدا، هەڵبژاردنیش بۆ ڕابەر کرا، ڕابەر پێشنیاری کاک دکتۆر مەحمود بوو، مەسئەلەی ڕابەر ئەوکات زۆر گرنگی پێنەئەدرا، چوار کەس لەسەرکردەکان پاڵێوراو بوون: مام جەلال، کاک مەسعود، مامۆستا مەلاعوسمان، کاک دکتۆر مەحمود عوسمان. بەڵام کەسیان ڕێژەی تەواویان بەدەست نەهێنا، ڕۆژی ١٩٩٢/٧/١٥ پەرلەمانی کوردستان یەکەم دانیشتنی کرد، سەرۆکی پەرلەمان بۆپارتی و جێگرەکەی بۆ یەکێتی و سکرتێری بۆپارتی.

دوای تەشکیل بوونی پەرلەمان و کۆبوونەوەکانی لەسەر پێکهێنانی حکومەت، کفتوگۆ دەستی پێکرد لەنێوان لایەنەکاندا، لەکۆبوونەوەو گفتوگۆکانی سەبارەت بەپێک هێنانی کابینەی حکومەت، کێشەو گرفتی زۆر هاتە ئاراوە، بیر و بۆ چوونی جیاواز لەنێوان پارتی و یەکێتی دا سەری هەڵدا، دواجار کڵێشەی پرۆژەی تەشکیل کردنی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئامادە کرا، ئەم پرۆژە لەکۆبوونەوەی ڕۆژی ١٩٩٢/٧/٤دا قبووڵ کراو یەکەم کابینەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بڕیاری لەسەر وەرگیرا.

سەرۆکی ئەم کابینەی حکومەت دکتۆر فوئاد مەعسوم بوو، لەسەر لیستی سەوز (یەکێتی) جێگرەکەشی بۆلیستی زەرد (پارتی)، کابینە پێک هات لە ١٥ پانزە وەزارەت، ٦ شەش وەزارەت بۆلیستی سەوزو و ٦ شەش وەزارەت بۆ لیستی زەرد، ٣ سێ وەزارەتەکەی تر هەریەک بۆ شیوعی و بێلایەن و ئاشوری. دوای ماوەیەک کارکردن و تێپەربوونی وەختێکی کەم بەسەر ئەم پەرلەمان و حکومەتەدا، بیری تەسکی حیزبایەتی و بۆچوونە جیاوازەکان و هەڵپەی بەش بەشینەی زیاتر، لەهەردوو دەستگاکەدا سەریان هەڵدا، ئەو ئومێدو ئارەزو متمانە و چاوەڕوانییەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی باشوور هەیانبوو بەرامبەر بەپەرلەمان و حکومەت وردەوردە بەرەو کاڵبوونەوە ڕۆیشت، بەجۆرێک دواتر شەڕی ناوخۆ دروست ئەبێت، شکۆی ئەم دوو دامەزراوە شەرعیە وائەشکێ، هەولێری پایتەخت کەوتە ژێر دەستی یەکێتی، سەرۆکی پەرلەمان لەناو بینای پەرلەمان و بە بێسیمی پەرلەمان زانیاری هەواڵگری ئەدات بەلایەنەکەی خۆی و داوای تۆپ باران کردنی خەڵکی لێ ئەکات.

ئەوکات کەهەرکەسەو خەریکی بانگەشەی هەڵبژاردنی خولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان بووین، من فەرماندەی (هێزی٣) سێی هەڵەبجە بووم، بەر لەوەی من ببمە فەرماندەی ئەم هێزە، هێزەکە تەشکیل کرابوو، لەلایەن کۆمەڵێک کادرو فەرماندەوە بەڕێوە ئەبرا، لەوانە کاک جەمیل هەورامی فەرماندە و هەڤاڵان کاک فەلاح و کاک جەلال کوڵکنی جێگری بوون، کاک جەمیل گوازرایەوە بوو بەئەندامی لەشکر، دوجێگرەکەش لەهێز نەمان و جێگری تردانران لەوانە  کاک ئەکبەر ئێناخی فەرماندەیی بەتالیۆنی هەڵەبجە بوو کرا بەجێگری هێز، شەهید کەیکاوس کرا بەفەرماندەی بەتالیۆن و جێگری دووەمی هێزەکە. من لەرۆژی ١٩٩٢/٨/٢٣دا لەکۆبوونەوەیەکدا لەهەڵەبجە دەورو تەسلیمم لەگەڵ کاک جەمیل هەورامیدا کردو دەست بەکار بووم، دەورو تەسلیم بە ئامادە بوونی هەڤاڵان ئەکبەر ئێناخی، جەلال کوڵکنی، عەزیز کوڵکنی و عەلی مامەیارەدا کرا. سنووری کارکردنمان ، هەمان سنووری مەڵبەندی ئێستای شارەزووری یەکێتی بوو، جگە لە قەزای پێنجوێن، واتە هەورامان، هەڵەبجە، سەیدسادق، قەزایی شارەزوورو عەربەت لەم شوێنانەدا من بەرپرسیار بووم لەهێزەکانی پێشمەرگەی یەکێتی ، بارەگای ناوەندی هێز لەناوشاری هەڵەبجەدا بوو، سەرەتای دامەزراندن و جێگیر بوونی ئیدارەو یاسا بوو، ئەمەش نەفەسی درێژ و ئەعسابی ساردی ئەویست، دەستەلاتی بەرەی کوردستانی و تەداخول کردنی حزبایەتی هەر بەردەوام بوو.

لەرۆژی١٩٩٢/٩/٣٠ نامەیەکی هێزی١٦ی گەرمیانم بەدەست گەیشت، لەو نامەدا داواکراوە، لەهەڤاڵانی هێزی پێشمەرگەو بازگەکانی بەرەی کوردستانی، حاجی ئەبوو عەلی( جاسم محەمەد کازم)، لەگەڵ پێنج برادەری تریدا بەچەکەوە، لەگەڵ بارێک کەلو پەلی بارەگاکەیان دا ئەڕۆن بەرەو تەوێڵەو بۆ سەر سنوور، هاوکاریان بکرێ و دەست نەهێنرێتە ڕێگەیان.

لەگەڵ نوێنەرانی ڕێکخستنی ئەوکاتە کە کۆمیتەکان بوون هەماهەنگیەکی ڕێک و پێکمان هەبوو، هەماهەنگی ووشەیەکی فارسیەو کوردیش زۆر بەکاری دەهێنین، بەڵام زۆرجار لەباتی ووشەی هەماهەنگی ووشەی هاوئاهەنگی بەکاردێت هەتا لەلایەن ئەکادیمیەکانیشمانەوە، من خۆم لەزاری ڕۆشنبیرانی دیارو وەزیرو پەرلەمانتارەکانەوە زۆر جار

لەشاشـەکانەوە گـوێم لێبووە، لەبـاتی هەمـاهەنگی هاوئاهەنگی بەکـاردێنن، کەهەریەکەیان ماناو واتای جیاوازو بۆمەبەستێکی جیاواز بەکار دێت. لەشار و شارۆچکە و گوندەکاندا لیژنەی بانگەشەی هەڵبژاردنمان پێک هێنابوو، شەو و ڕۆژ کارمـان دەکرد، سـنوورمان لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەرمـان لەلای باشووری خۆرئاواوە هێزی دووی قەرەداغ بوو فەرماندەی هێز کاک ئاواتی شێخ جەناب بوو، لەلای خۆرئاواو باکووری خۆرئاواوە هێزی سلێمانی بوو، فەرماندەی هێزەکە مامۆستا جەمالی حاجی محەمەد بوو، پەیوەندی باش و هاوکاری یەک بووین، هەموو کەسمان بەسەر دەکردەوە بەجۆرێک لەنێوانمان دا ئاوابییەک نەمێنێ هەریەکەو بەتەمای ئەویتر بێت سەردانی بکات.

ئەم سـنوورە هەمیشـە مەیـدانی ململانـێ و منافەسـەی هەمـوو لایەنەسیاسـییەکان بـووە، سـەرەتا لەنێـوان یەکێتـی و پارتیـدا، دواتـر لەم سنوورەدا پـارتی پاشەکشـەی کـرد و ململانـێکە کەوتە نێـوان یەکێتـی و بزووتنەوەی ئیسـلامی، تائێستاش ئەم سـنوورە جیـاواز لەناوچەکـانی تـری کوردستان بووەتە مەیدانی منافەسەو ململانێی هەموو لایەنەکان، بەجۆرێک، کەیەکگرتـووی ئیسـلامی و کـۆمەڵی ئیسـلامی و بـزووتنەوەش، لەگەڵ سۆشیالیستیش لەم سنوورەدا سەریان هەڵداوە، زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی و کادرە پێشکەوتوەکانیی هەموویـان خەڵکی ئەم دەڤەرەی شـارەزوور و هەڵەبـجەن، لەگەڵ ئەمینـدارو سـکرتێری سـێ حزبیشیان. لەگەڵ ئەوەشدا بەدرێژای مێژووی هەڵبژاردنەکانی هەرێم، یەکێتی لەسنوورەکەدا لەپێشەوە بووە.

# شەڕ لەگەڵ پەکەکە ١٩٩٢

پەکەکە، کورت کراوەی پارتی کرێکارانی کوردستانە، ئەم پارتە پێشینەی سیاسی و فکری و تەشکیلاتی لەکوردستانی باکوور هەیەو خەریکە بۆ پارچەکانی تری کوردستانیش ئەیگوازنەوە، بەبیرو باوەڕی چەپەوە لەساڵی ١٩٧٤ بەدواوە لەسەر دەستی عەبدوڵا ئۆجەلان دروست کراوەو بەنهێنی کاری سیاسی کردووە، ئەوکات ئۆجەلان خوێندکاری زانستە سیاسییەکان بووە لەزانکۆی ئەنقەرە.

ئەم پارتە سیاسییە دواجارو لەڕۆژی ١٩٧٨/١١/٢٧دا لەکۆنگرەیەکدا بەبەشداری ٢٣بیست و سێ هەڤاڵی خۆیان لەئاوابییەک بەناوی (گوندی فیسی) لەفەرمانداری لیجە سەربە پارێزگای ئامەد، خۆیان راگەیاند. ئەمە یەکەم کۆنگرەی پەکەکەیە، ناوەکەش لەلایەن ئەندامێکی ئەو کۆنگرەوە پێشنیار کراوە بەناوی فەرهاد کورتای. ئەم گروپە چەپە فکری وئایدۆلۆژیە مارکسیستییە، بەر لەکۆنگرە بەناوی ئاپۆچییەوە کاریان کردوە، دواتر بڕیار دەدەن بگەڕێنەوە کوردستانی باکوور و درێژە بەخەبات بدەن.

پەکەکە دەست دەکەن بەکاری سیاسی و پێش دەکەون و زیاتر گەشەدەکەن، حکومەت لەدژیان، هۆزو سەرەک خێڵەکان چەکدار دەکەن، بۆیەکەم جار پەکەکە لەگەڵ ئەوانەدا لەناوچەی حیلوان سیڤەرەک لەپارێزگای ئورفا توشی پێکادان ئەبن و دۆخی شەڕیان بەسەردا ئەسەپێ تاکاتی کودەتا سەربازیەکەی١٢ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠ بەسەرۆکایەتی کەنعان ئەڤرەن ڕوویدا.

لەدوای ئەمەوە ئەندامان و لایەنگران و هەوادارانی پەکەکە توشی راوەدونان و گرتن و کوشتن و ئەشکەنجەدان ئەبنەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٢وەوە بەشێک لەئەندامانی پەکەکە بەرەو لوبنان بڕۆن. لەوکاتە بەدواوە پەیوەندی زیاتر ئەگرن و لەلایەن کەسایەتی و رێکخراوەکانی وەک: نایف حەواتمەو جۆرج حەبەش و بزووتنەوەی رزگاری فەلەستینییەوە هاوکاری و پشتیوانی ئەکرێن.

پەکەکە لە لوبنان لەساڵی ١٩٨٢ کۆنگرەی دووەمی خۆی بەست، لەکۆنگرەدا بڕیاری گەڕانەوەی دەستە چەکدارەکانیدا بۆ باکوور، لەوێشەوە دەستیان کرد بەناردنەوەی ئەوگەنجانەی پەیوەندیان پێوە دەکردن بۆ لوبنان بۆ بینینی ئاموزش، بەهۆی فراوان بوونی کاروچالاکیەکانیانەوە لەباکوور، حکومەتی تورک پەلاماری بەربلاوی بۆ دەستکیر کردن و کوشتنیان دەست پێکرد. لەوماوەدا چەندین کادری پێشکەوتویان دەستگیرکران یان شەهیدکران. لەوانە مەزلوم دۆغان کەلەزینداندا بەبۆنەی نەورۆزەوە خۆی سوتاند.

لەساڵی ١٩٨٦دا ولە سێهەمین کۆنگرەدا بڕیاریاندا هێزی رزگاری کوردستان بگۆڕن بۆ (ئەرگەکە) کەکورت کراوەی ئەرتەشی رزگاری گەلی کوردستانە، هەروەها ئەکادیمیای سەربازیان دامەزراند. لەساڵی ١٩٩٠دا لە لوبنانەوە چەندین بنکەیان گواستەوە شام و لەوێ دامەزراندوە، ئۆجەلانیش هاتە ئەوێ.

لەساڵی ١٩٩٣دا تورگوت ئۆزاڵ هەشتەمین سەرەک کۆماری تورکیا چەندین جار باسی فیدراسیۆنی نێوان کورد و تورکی کرد، بەهۆی چاوپێککەتنی مام جەلالەوە لەسەر بەئاشتی چارەسەر کردنی کێشەی کورد لەگەڵ تورک، باسوخواسی لەسەر کرا، لەرۆژی ١٩/ئازاری ١٩٩٣ ئۆجەلان بەئامادە بوونی مام جەلال لەبیقاعی لوبنان لەکۆنفرانسێکی رۆژنامەوانی دا ئاگربەستی راگەیاند. لەکاتێکدا کەهەموو چاوەڕی ئەنجامی بۆپێشەوە چوونی گفتوگۆو چارەسەری سیاسی کێشەی کورد بووین لەباکوور، بەداخەوە هەواڵی مەرگی ئۆزاڵمان لەرۆژی ١٧ی نیسانی ١٩٩٣دا بیست. ئاگربەست کۆتای هات شەڕ دەستپێکردەوە دووبارە لەساڵی١٩٩٥ و لەساڵی ١٩٩٦ داو لەرۆژی ئاشتی جیهانیدا ئۆجەلان ئاگربەستی راگەیاندەوە بەلام هیچ ئەنجامی نەبوو.

بەڵی خوێنەری بەڕێز، بابێینەوە بۆلای شەڕی یەکێتی و پارتی لەگەڵ پەکەکەدا بەبڕیاری یەکەم پەرلەمانی کوردستان لەساڵی ١٩٩٢داو بیرەوەریە تاڵەکانی خۆم لەوبارەوە.

سەرەتا ئەمەوێت بڵێم من گەیشتومەتە ئەو بڕوایەی نەخشەی دابەشکردنی کوردستان بەجۆرێکە، ئاسان نییە پارچەیەکیان رزگاربێ یان لەگەڵ ئەودەوڵەتەی ئەو پارچە کەوتوەتە چوارچێوە، بەفیدراڵی یان

بەئۆتۆنۆمی، بتوانێ بژیت و پارچەکانی تر داگیرکراوبن، یان دەوڵەتەکانی پارچەکانی تریان لەبندەستە بەئاسانی لێگەڕێن ئەم بەشەیتر ئازاد بێت. لەکاتێکدا ئەم بەشە ئەتوانێ ئازاد بێت و دژایەتی نەکرێت، دژایەتی شۆڕشگێرانی پارچەکانی تر بکات، ئەمەش دەچێتە چوارچێوەی خیانەت، ئەگەر ئێستا لێگەڕاون کوردستانی باشوور، برێک ئازاد بێت، وە بەناو لەچوارچێوەی عێراقێکی فیدراڵدا، چوار پارێزگای هەرێمێکی سەربەخۆبن، هۆکارەکەی ئەو زەمینە سیاسییەکەدا ناجێگیرو پڕلەگێژاو پێچیدەی ڕۆژهەلاتی ناوەراستە.

هەروەها گەیشتومە ئەو بڕوایەی، ئەوانی لەسەردەمانی رابردوودا بۆ ڕزگار کردنی گەلەکەیان یان داواکردنی مافەکانیان، لەکوردستان جەنگاون و بەبێ ئەنجام بەبێ دەستکەوت کۆتاییان هاتووە، ئێمە کەدوای ئەوان هاتوین و تاوانباریان دەکەین بە نەزان و ئاغاو دەرەبەگ و سیاسەت نەزان و......تاد، لەوانە شۆڕشەکەی ئاگری داغ، شێخ سەعید، شێخ مەحمود، قازی محەمەد، بارزانی نەمر، ئەوە وانییە.

کوردستان بەدابەش کردنەکەی مەحکوم کراوە لەچوار چێوەی جوگرافیایەکی پێچیدە و ناهەموواردا، ئیدارەدانی پارچەیەکی دژوارە و ئەگەر داوای سەربەخۆیش بکات لەوانەیە گەلەکۆمەکی وهێرشی بکرێتە سەر، بۆیە ڕەنگە باشتر بێت کوردەکان بەگشتی، خۆیان بگونجێنن لەگەڵ فارس و تورک و عەرەبدا بۆ ئەوەی زیاتر نەفەوتێن، تائەوکاتەی هەمووان چاوەڕێی دەکەین.

بەڵێ کوردستانی عێراق بەنموونە، هێشتا بەنیوە چڵی وەک هەرێمێکی فیدراڵ ئیدارەی خۆی دەدات، هێشتا بەشێکی زۆر لەخاکەکەی و شار و شارۆچکەکانی کێشەیان لەسەرە و بەچارەسەر نەکراوی ماونەتەوە، ئیدارەی هەرێمەکە و لایەنە سیاسییەکان چەندە دڵنیایی دەدەن بەئێران و تورکیا، بەلام هەر لەسەر شۆڕش گێرانی کوردەکانی ئەو پارچانەو هاوکاری کردنیان، هەرێمەکە مەترسی لەسەرە. لەئەوپەڕی ئاڵۆزی و دوژمنایەتی نێوان تاران و ئەنقەرە و بەغدا و دیمەشق خۆیان، ئێستاو لەڕابردوشدا چەندین جار سەرەرای جیاوازی و بۆ چوونی سیاسییان لەسەر کورد بۆتاوتوێکردنی کێشەکانی کورد پێکەوە کۆبوونەتەوە.

پشتگیری هەرێمەکە لەم کاتەدا واتە لەسەرەتای بنیادنانیدا بۆلایەنە سیاسییەکانی تری پارچەکانی تری کوردستانی تەنها ئەوەیە مۆڵەتی داوە بمێنەوە خەریکی کاری سیاسی و رۆشنبیریبین و خۆ بەدور بگرن لەشەڕی چەکـداری، ئەو شـەڕە چەکـداریەی کەلەخـاکی هەرێـمەوە مەفـرەزە چەکدارەکانیان ئەنێرنەوە بۆ ئەودیو سنوورەکان. ئەمە تاڕادەیەکی باش، هەرێـم سـەرکەوتو بـووە لەگـوێڕایەڵی کوردەکـانی ئێـران، واتە هێـزە سیاسییەکانی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی پابەنـد بـوون بەداواکەی هەرێم. بەڵام کوردەکانی باکوورو بەتایبەت پەکەکە قەد ملی نەداوە بۆداواکانی هەرێم لەوبارەوە، زیاد لەوەش پێیان وایە لەنێوان پارچەکانی کوردستان دا سنوور نییە و لەهەر پارچەیەکدا ئەوان ئازادن خەبات بکەن، جگە لەمەش لەناو پارچەکانی تری کوردستان دا رێکخستن دەکەن، ئەو رێکخستنانەیان ئێستا لەچوارچێوەی پارتی سیاسیدا رێکخستوە.

دوای ئەمانەش ئەو هەڵکەوتە جوگرافیایەیی لەکوردستانی عێراقدا پەکەکە کردویەتیە بنکەو بارەگا ئەوناوچانەن کەزۆر سەخت و هەرێمی کوردستان تائێستا نەیتوانیوە و ناتوانێ دەستەڵاتی بەسەریان دا بشکێ، لەمبارەوە هەرێمی کوردستان گرفتی زۆرو چارەسەر نەکراو بەرۆکی گرتووە.

ئەمەیە دابەشـکردنی کوردسـتان لەڕووی جـوگرافییەوە، هەر لەسـاڵی١٥١٤وە لەشـەڕی چاڵـدیرانەوە لەنێـوان هەردوو ئیمپراتـۆرییەتی سـەفەوی و عوسـمانیدا، هەروەهـا دروستکردن و دابەش کردنی ئەمارەتە کوردییەکان بەسەرهەدولادا خۆیاندا. داگیرکەرانی نەتەوەی کورد بەمەش رازی نابن و ئەوەتا لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمدا و لەساڵی١٩١٤ بۆ ١٩١٧ لەدارڕشـتنەوەی نەخشـەی نـاوچەکەدا لەدوای نەمـانی ئیمپراتـۆریەتی عوسمانییەوە لەنیوان فەرەنساو بەریتانیادا، بەناوی رێککەوتن نامەی سایکس بیکۆوە کوردستانیان جارێکیتر دابەشکردەوە .

بەڵێ لەساڵی ١٩٩٢دا ئەوکاتەی خەڵکی هەرێمی کوردستان خەریکی خۆسازدان بوون بۆ هەڵبژاردنی یەکەم پەرلەمان، لەبارودۆخێکی تەم و مژاویدا، ئاخۆ چی رودەدات؟ عێراق دێتەوە سەرمان؟ ئێران هەڵوێستی چۆن دەبێت؟ تورکیا گێچەڵ و لەشکرکێشی ناکات.......تاد . لەم کاتەداو لەرۆژی

١٩٩٢/٦/٢٦ دا لەناوشاری هەولێر خۆپیشان دانێک کرا، بەدژی ئەو هەڵوێست و تاوانەی تورکیا لەشەڕناخ بەدژی خەڵکی مەدەنی ئەنجامی دابوو، خۆپیشان دانەکەی هەولێر لەلایەن ئەندامان و لایەنگرانی پەکەکەوە ئەنجام درابوو، تورکیا ئەمەی کردە بیانو فشارێکی زۆری لەسەر یەکێتی و پارتی دروست کرد، ئاسایش و پۆلیس لەبلاوە پێکردنی خۆپیشاندەراندا ڕووبەڕوی گرژی و ئاڵۆزی بوونەوە.

ئەنجامی خۆپیشاندانەکە ئەوە بوو، نزیکەی ٢٠ بیست کەس گیران، لە هەردوولاش خەڵک کوژران، لەوانە کچێکی پەکەکە بەناوی نەژبیر، حکومەتی تورک ڕێگای نێودەوڵەتی سلوپی زاخۆی داخست، ئەمە شادەماری ئابووری هەرێم بوو. هەرێم بلاوی کردەووە ئەمە دەستی بێگانەیەو بۆدژایەتی کردنی هەرێمە، پەکەکە جێبەجێ کاری نەخشەکەیە، ڕۆژبەڕۆژ ئاڵۆزیەکە پەرەی سەند، پەکەکە کەوتنە هەڕەشە کردن.

لەم ماوەشدا ئێمە خەریکی جیاکردنەوەی هێزەکانمان بووین، هێزمان ئامادە دەکرد بۆ دانانیان لەلەشکری یەکگرتووی کوردسان، لەکۆبوونەوەیەکدا بەئامادەبوونی کاک شێخ جەعفەر، م .جەمال، ئاوات شێخ جەناب، کاک نەبەز و من ( حەمەی حەمەسەعید) قسەمان کرد لەسەر دیاری کردن و پلەدانان بۆ ئەوانەی شیاون و ئەبن بە ئەفسەر. ئەمە پرۆسەیەکی قورس بوو، من لەو دیاری کردن و جیاکردنەوەدا، لە هێزێکی گەورەی وەک هێزی (٣) سێی هەڵەبجەدا ، کەسەدان فەرماندە و کادر و پێشمەرگەی کۆنی تێدا بوو، دەبوو تەنها نزیکەی چل ئەفسەرو پلەدار بۆ لیوای ٢٠ی حکومەتی هەرێم دیاری و پێشنیار بکەم.

ئەوە بوو دواجار لەڕۆژی ١٩٩٢/١٠/١ دا پەرلەمان و حکومەتی هەرێم بەفەرمی داوایان لەپەکەکە کرد، ئەبێ بنکەو بارەگاکانی لەشار و شارۆچکەکانی باشووردا دابخاو بچێتەوە باکوور یان بێن لەسنووری هەرێمدا بەپێی بەرنامەو ڕێنمایی و داواکانی حکومەت هەڵسوکەوت بکەن، ماوەی ٤٨ چل و هەشت کاتژمێریان بۆ دانرابوو. پەکەکە گوێی بەم داواکاریانە نەداو خۆیان لێ تێنەگەیاند .

لەم کاتەدا پەکەکە لە سێ ناوچەوە لەناو کوردستانی باشوور بنکەو بارەگای هەبوو لەنزیک سنوورەکان، ئەو شوێنانەش، خواکوڕک، چوقورجە و

حەفتانین، بوون بەڵام لەکاتی گرژیەکەوە وردە وردە شۆڕ بوو بوونەوە و هاتبوونە پێش، بەرلەوە شەڕ دروست ببێ، چەندین هەوڵدرا کێشەکە بەئاشتی چارەسەر بکرێت لەوانە، وەفدێک سەردانی پەکەکەی کرد، ئەم وەفدە پێک هاتبوو لەهەڤاڵان کاک حامیدی حاجی خالید، مام ڕۆستەم و مامۆستا حەمە ئەمین پێنجوێنی، بەڵام سەردانەکەیان بێئەنجام بوو، پەکەکە هەوڵی ئەدا یەکێتی و پارتی لەم مەسئەلەدا لەیەک دوور بخاتەوە، ئەیان ووت یەکێتی دۆستمانن و پارتی دوژمن، یەکێتی یارمەتی داوین پارتی لەسەر داوای تورک ئەوشەڕەمان هەر لەگەڵ دەکات، دیارە ئەمە ڕووی نەدا یەکێتی سارد نەبوونەوە. پەکەکەش ئەیان ووت ئێمە لەگەڵ حکومەت دانیشتوین ڕێکەوتوین کەشەڕ ڕونەدا، ئەوکات کاک فوئاد مەعسوم سەرۆک وەزیرانی هەرێم بووە، بەڵام بەداخەوە دواجار شەڕ ڕوویداو شەڕێکی خوێناویش.

لەکاتی ئەم شەڕەدا یەکێتی تەشکیلاتە سەربازیەکەی لەشکربوو، کوردستان کرابوو بەسێ لەشکر، لەشکری یەک، بارەگای لەبەکرە جۆ بوو، کاک جەبار فرمان فەرماندەی بوو، هێزەکانی کەرکوک و سلێمانی و هەڵەبجەو گەرمیان سەر بەم لەشکرە بوون، دوای لەشکر هێز هەبوو، هەڵەبجەو شارەزوور هێزێکی هەبوو بەناوی هێزی ۳ سێی هەڵەبجە، لەم کاتەدا من فەرماندەی هێزەکە بووم.

لەشکری دوی هەولێر هێزەکانی هەولێرو ڕاپەڕین سەر بەم لەشکرە بوون، فەرماندەی لەشکر کاک مستەفا چاورەش بوو، کاک مستەفا خەڵکی سلێمانی و پیاوێکی ناسراو فەرماندەیەکی ئازاو قارەمانی هەردوو شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێیە.

لەشکری سێ، هەموو هێزەکانی ئەوبەر زێ و بادینان، سەر بەم لەشکرە بوون فەرماندەی لەشکر کاک شێردڵ بوو، شێردڵ خەڵکی کۆیەیە، پیاوێکی بەویقارو لەسەرخۆ و نەجیبە، پێشتر لەسوپای عێراقدا ئەفسەر بووە.

شەڕەکە لەدوو قۆڵیانەوە دەستی پێکرد، هێزەکان هاوبەش بوون لەنێوان پارتی و یەکێتی دا، قۆڵی خواکوڕک کاک کۆسرەت سەرپەرشتی دەکرد و کاک مستەفا چاورەش و چەند هەڤاڵێکی تری لەگەڵ بوو لەوانە کاک حەمید ئەفەنی نوێنەری پارتی بوو. قۆڵی بادنانیش کاک فازل میرانی

سەرپەرشتی دەکرد وکاک حەسەن کوێستانی و کاک شێردڵی لەگەڵ بوو لەگەڵ چەند هەڤاڵێکی تردا.

هێزەکانی لەشکری یەک کران بەدوو بەش، سەرەتا بەشێکی لەگەڵ کاک عوسمانی حاجی مەحموددا ڕۆیشتن بۆ بەرەی خواکورک، بەتالیونێکی هێزی سێی هەڵەبجە کە کاک ئازاد گەلالی و نەبەز نەورۆلی فەرماندەیان بوون لەگەڵ ئەم هێزەدا ڕۆیشتبوون. ئەو ڕۆژە فەرماندەکانی ئەو بەتالیۆنەم بانگ کردبوو بۆ بارەگای هێز لەهەڵەبجە، بۆئەوەی کۆبوونەوەیان پێ بکەم، تا خۆیان ئامادە کەن لەگەڵ کاک عوسمان بکەونە ڕێ، پیاوێکی بەڕێز میوانم بوو بەناوی حەمەسەعید بەگی حەمەسەلیم بەگ، خالۆ حەمەسەعید شاعیر بوو، ئەوکاتە تەمەنیشی نزیکی سەد ساڵی کردبووەوە، بۆنیوەڕۆ نەمهێشت بڕوا، پێم وت کاک حەمەسەعید تۆ لێرە دانیشە من کۆبوونەوەکەم ئەکەم و دێمەوە بۆلات.

وتی باشە، دوای کۆبوونەوەکە هاتینەوە بۆلای کاک حەمەسەعید بەگ، کاک ئازادو ساڵحی سۆفی کەریمی گلالیشم لەگەڵ خۆم هێنابوون. نانی نیوەڕۆ دانرا برنجی سوورو تەماتەی کاڵمان هەبوو، داوای لێبووردنم لەبەگزادەی شاعیر کرد، ووتم نانەکەمان باش نییە، ووتی نا زۆر باشە نانی پێشمەرگە لەمە باشتری نییە. حەمەسەعید بەگ پیاوێکی قسەخۆش و کوردپەروەر بوو، دوای نان خواردن، کاک ئازاد لێی پرسی تۆکابرایەکی جاف و حەمە پیاوێکی هەورامی چۆنە ئەوەندەت خۆش ئەوێت؟ ووتی وەلا هەرلەدوورەوە لەخۆمەوە خۆشم ئەوێت. کەمێک وەستاو پرسی ئەی حەمە ئەم کابرا کێیە تۆ ئەوەندەت مەتڵەبە؟ ووتم خالۆ حەمەسەعید، ئەوە کاک ئازادەی برای مارف ئاغای گلالییە، ڕووی کردە کاک ئازادو ووتی کوڕی حسێن ئاغای؟ ووتی بەڵێ، ووتی ئازاد گیان لەدیواخانەکەی باوکتا دانیشتبووین قەرەباڵغ بوو لەدوامەوە دەستێک هات ویستی لەفیشەک دانەکەم دا پێنج فیشەک ببات، دەستەکەم گرت لامکردەوە ووتم عومەر ڕۆڵە ئەوە چی ئەکەی؟ نەیشی بەی هەر ئەزانم گلالیت. کاک ئازاد دەستی کرد بەپێکەنین تێگەیشت چی ئەڵێت و پێی خۆش بوو ڕەفیقی باوکی بووە لەدەورانی عەشایری دا.

دوای چەند رۆژێک شەڕ روویدا، کاک کۆسرەت داوای هێزێکی تری کردبوو. لە لەشکرەوە ئاگادار کرام هێزێکی ٣٠٠ سێسەد کەسی ئامادە بکەم، هێزەکەم ئامادە کرد خۆشم لەگەڵ هێزەکەدا رۆیشتم، ئەوکات هێزەکەمان دوو جۆر بوون بەشێکی فەرماندەو پێشمەرگەکانی شاخ بوون و بەشەکەی تری لەدوای راپەڕینەوە کرابوون بە پێشمەرگە تازادەیەک عەشایرو بێ ئەزموون بوون، بەڵام کادرەکانی شاخمان کردبووە بەرپرسیان، چەندین کادری رێکخستن و ناوشاریش کرابوونە فەرماندەی بەتالیۆن و تیپ و کەرت، ئەمانە زۆرتر وەک خزم و عەشرەت پێکەوە بووبوونە پێشمەرگە.

لەگەڵ ئەم هێزەدا ئەوەندەی لەبیرم بێت لەفەرماندەکانی شاخ هەڤاڵان شەهید کەیکاوس و شەهید عومەر کوڵکنی و کاک عەزیز کوڵکنی و کاک سەردار شەوکەت و کاک رۆستەم کۆکۆیی و چەندین پێشمەرگەی تری ئازا هاتبوون، کاک مەحمودی حەمەی فەتاح شاتری خۆی و بەتالیۆنەکەی بەناوی بەتالیۆنی شالاوەوە، حاجی ئەکرەمی دەربەندفەقەرەیی خۆی و هێزێک لەگەڵدا بوون، بەڵام حاجی و هێزەکەی لەرێگەدا گەڕابوونەوە.

رۆژی٢٣/١٠/١٩٩٢ هاتینە بارەگای لەشکر، دوانیوەڕۆکەی کەووتینە رێ بۆ سیدەکان بەسواری چەندین پاس شەو گەیشتینە جێ، من و چەند هەڤاڵێک چووینە دیواخانەکەی ماڵی کەریم خانی برادۆست، کەریم خان براگەورە و سەرۆک هۆزی برادۆستیەکانە، پیاوێکی دیارو قسە رۆیشتوو، خاوەن سفرەو نانە. دۆستی جەنابی مام جەلالەو خۆی و بنەماڵەکەشی چەکیان بۆیەکێتی هەڵگرتووە، لەسەر ئەمەش لەلایەن پارتییەوە دژایەتی کران و مالوحاڵیان داگیر کرا.

بەیانی زوو هەستام و هێزەکەم بەسەر کردەووە، بۆم دەرکەوت هەرلە سلێمانی دەرچووین کۆمەڵێک بەخۆیان و بەرپرسیانەوە خۆیان دزیوەتەوەو نەهاتوون. بڕیار بوو لێرە لەماڵی کەریم خان چاوەڕێ بکەم تا کاک کۆسرەت لەبەرەی شەڕەکەوە داوامان بکات، سایق پاسەکان داوای مۆڵەتیان دەکرد، مۆڵەتم نەدانێ. دوای نیوەڕۆ سەرکەوتین بەجادەیەکی خۆڵی بەرز و نزم و لار و چەوت و پێچاوپێچ دا، ئەم رێگا بەناو دارستانی داربەڕووە کۆنەساڵەکاندا دروستکراوە، هەرلە سیدەکان دەرچووین تا سەر

شـــاخ ھەرکەســـمان ئەبینـــی باســـی ئـــازایەتی پەکەکەو پێکـــانی قەنـــاس بەدەستەکانیان دەکات.

بەدرێژایی کەناری ئەم رێگادا لەناو دارستان و چەم و دۆڵەکاندا، ھەرلە خوارەوە تاسەر شاخ، ئەمانبینی کۆمەڵ کۆمەڵ پێشمەرگە لایان داوەو ئاگریان کردووەتەوە، بەدەوریا خەوتون یان دانیشتون. ئەوەندە ھێز زۆربوو ئەمووت ئەمە لەکوێ رێی دەبێتەوە ئەی بۆچی داوای ئێمەیان کردووە، کە گەیشتینە سەرشاخ تێگەشتم ئەمە ھەموو لەوھێزە تازەی دوای راپەرێن و بەشێکیان چەکدارەکانی پێش راپەرین، لەوانەی ئێمەن ئەمشەو لەرێگا خۆیان دزیوەتەوە.

لەسەر شاخ و لەمبەر ئاوی لۆلانەوە سەیری لای سێ سنوورم دەکرد، دیمەنی دنیایەکیتر لەشیوی قوڵ و نزارو خۆرەتاو لاپاڵی توند لێژو داپۆشراو بەدارستانی چڕوپڕ، لەگەڵ چەندین شاخی بەرزو لوتکەی سەربۆ ئاسمان ھەڵبڕاوی رووتورەش ھەڵگەڕاوی کوێستانی، لەبنەوە بەتان و پۆ تێھەڵکێشراوی و بەیەکدا چوو، لەسەرەوەو لەناو ئاسۆوە لوتکە تیژەکانی تەنھا تان و بەبێ پۆم لێوە دەرکەوت.

راســت بەرامبەرمـان چیـایەکی بەرزە، لەنـزارو خۆرەتـاو لاپـاڵ و دامێنەکانییەوە رووبەرووی ئێمە برەکە برکە پاشماوەی ئاگرو دوکەڵ دیارە، شارەزایەکم بانگ کرد و لێی ئەپرسم ئەوشاخە ناوی چیە؟ کام شاخە کاکە ھەمووی ھەر شاخە؟ ئەوە دوکەڵەکانی لێوە بەرز دەبێتەوە، نازانم ناوی چیە بەس ئەزانـم عوسـمانی حـاجی مەحمـود لەو شـاخەیە، ئەپرسـم پێشـمەرگە گەیشتونەتە ئەوێ؟ بەڵێ، ئەی نازانی ئەو شیوەی دەستەراستی چیاکە کوێیە؟ بائەوە گەروی شوشانە سەرکردایەتی پەکەکە لەوێن، ئەی ئەم دۆڵە قوڵەی بەردەممان؟ ئەوەش چۆمی لۆلانە.

لەو کاتەدا ھێزەکەمان ھەموو سەرکەوتن و گەیشتنە جێ، شـۆفێری پاسەکان کۆبوونەتەوە دەپرسن ئێمە چی بکەین؟ منیش پێم وتن، برۆن خوا حافیزتان، دوای کەمێک سـەیارەیەک دێت و یەکێک ئەپرسێ کاک حەمەی حەمەسەعید ھاتووە؟ بەڵێ فەرموو و، کاک کۆسرەت ئێمەی ناردووە ئەڵێ بابێت بۆئێرە. باشە لەکوێن ئەوتـان نزیکن، سـواری ئۆتـۆمبێلەکە بووین و بەدەستی چەپدا مـاوەیەک رۆیشـتین ئێرە بەرزترە کـاک کۆسـرەت و کـاک

مستەفا چاورەش لەوێن دوای چاکو چۆنی، کاک کۆسرەت پرسی هاتن ؟ وتم بەڵی، پرسی هێزەکەت باشە؟ ووتم بەڵی زۆر.

لێرە لای کاک کۆسرەت چاوم کەوت بە کاک نورەدینی سەیدقادری باخچەو کاک عادلی برای، ئەمانە براو دۆستی ئازیزی منن، چاکەو پیاوەتی زۆریان بەسەرمەوە هەیە، کاک ئازادی برایان دوو رۆژ پێشتر لەگەڵ ئەوهێزەدا چووەتە ئەوبەر ئاوەکەو لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تریدا شەهید بوون، لەجێگەیەکدان پەکەکە زاڵە بەسەر شوێنەکەدا، ئەمان لەم بەرەوە بەدووربین تەماشای جەنازەکانیان دەکەن، زۆر دڵگران بووم بۆ ئازاد، دووربینەکەی خۆمم دەرکرد و تەماشای شوێنەکەم کرد، دیم جەنازەکان نزیکن لەئاوەکەوە هەر ٥٠٠ پێنج سەد مەتر لەقەراغ چۆمەکەوە سەرکەوتوون، پەکەکەش دوورن لێیانەوە، بەدەنگی نزم ووتم کاک نورەدین نارەحەت مەبە ئەمشەو ئەیان هێنمەوە ئەمبەر. نەم ئەزانی هەرئەم ئێوارەیە و بەپەلە کاک کۆسرەت ئەمان نێرێت بۆ سەرئەو شاخەی کاک عوسمانی لێیە. کاک کۆسرەت ووتی بابچین بۆلای هێزەکەی ئێوە، گەڕاینەوە بۆ لای برادەران.

هەموو گەیشتین و خەریکە خۆرئاوا ببێت، کاک کۆسرەت و کاک مستەفا و برادەران بەخێر هاتنی هەڤاڵانیان کرد، ووتیان ئەو شاخەی ئەوبەر هێزەکەی گەرمیانی لێیە، کاک عوسمانی حاجی مەحمود لەوێیەو ماندوون، کاک کۆسرەت رووی کردە من و ووتی ئەتوانن ئەمشەو بگەنە لایان و قوللەیەک ماوە بیگرن ئەگەر ئەوە بگرین ئیتر فشاریان لەسەر نامێنێ؟ ووتم بەسەر چاو هێزەکەی ئێمە بۆ پەلاماردان و گرتن زۆرباشە ئەیگرین، بەلام بۆمانەوە کەم تەحمولن، کاک حەمە هاواری لەتەنیشتما بوو بەگاڵتەوە ووتی قۆنتەرات ئەکەی بەڵێنی گرتنی ئەدەی.

هەرلەوێدا لەئۆتۆمبێلەکەی خۆی چەند سندوق فیشەکیان داگرتوو دابەشمان کرد، دووباوەش نانیشیان هێناو هەریەکەو دوونانی وشکیان بەسەردا دابەشکرا، لەهێزە ٣٠٠ سێ سەد کەسیەکەی لەسلێمانی دەرچوو بووین نزیکەی ٢٠٠ دوسەد کەس گەیشتبوونە سەر شاخ، نزیکەی ٥٠ کەسمان بەجێ هێشت لای کاک حەمەهاواری و کاک حەمەی فەتاح تریفەیی کەوتینە ڕێ، دوکەس بەناوی شارەزاوە هاتن و پێشی هێزەکە کەوتن، بۆئەوەی بمان

گەیینە لای کاک عوسمان، بەدۆڵێکدا سەرەوخوار بووینەوە بۆسەر چۆمی لۆلان، دنیا خەریکە تاریک بکات، ماوەیەک ڕۆیشتین و وردە وردە گەیشتینە بەبەرایی هێزی شکاو، ماوە ماوە بەناوی دەرکردنی برینداریەکانەوە پێمان ئەگەن، ئەگەنە هەرکەس دەڵێن بۆکوێ هێز هەموو پاشەکشەی کردوە، کەس نەماوە لەوبەر، ئەو کەسانەی ئەمە دەڵێن، بۆئەوەیە ڕاکردنی خۆیان بشارنەوە.

بەڵێ دوای ماوەیەکیتر گەیشتین بەنەبەز نەورۆڵی، فەرماندەیەکی سەربەهێزەکەی خۆمانەو چەند ڕۆژ پێشتر لەگەڵ بەتالیۆنەکەیان هاتوون لەگەڵ بەشی یەکەمی هێزەکاندا، بریندار بووە و پارچەی نارنجۆک لووتی هەڵدڕیبوو، لەوێ دڵم دایەوەو ووتم برۆ برادەرانی خۆمان لەسەر شاخن ئۆتۆمبێلیشیان لایە، لەوکاتەدا ئەپرسی سەقەت و ناشیرین نابم؟ ووتم نامەترسە هیچ نییە، بەپێکەنینەوە ووتم لووتی دەستکردت بۆدروست دەکەن وەک ئەکرەمی مام برایمی پێنجوێنی[1].

نەبەز ئەگەر مەیلی هەبێت کوڕێکی ئازاو قارەمانە، لەباروودۆخەکەم پرسی چۆنە؟ ووتی باشە بەڵام پێشمەرگە دودڵن لەشەڕکردنەکە، ئەوە کاک مەحمود سنگاویش لەپێشتانەوەیە، باشە برۆ خواحافیزت.

ئەوندە سەرەو خوار دابەزین وەهەر نەگەیشتینە سەرئاوەکە لەدلا دەموت لەوبەرەوە تانیوەڕۆ ناگەینە سەر شاخ، ، کەس بەردەمی خۆی نابینێ لەکاتی دابەزیندا گەیشتین بەکاک سەعدونی ساڵحی نامداری ئێناخی[2]، لەسەر

---

[1]– ئەکرەمی مام برایمی پێنجوێنی، پێشمەرگەیەکی ڕۆح سوک، شیرین، بەوەفاو ماندوی سەرەتای شۆڕشی نوێ بوو، لەسنووری هەرێمی (٣) سێی یەکێتی نیشتیمانی، لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٣ لەشەڕێکدا لەگەڵ سوپای عێراق لەشاربازێر بریندار بوو، بەهۆی ئەو برینەوە دواجار شەهید بوو.

[2]– سەعدون کوڕێکی بەهیمەت و ئێستا بەڕێوەبەری دەستگای شەهیدانە لە پارێزگای هەڵەبجە، ناویشی لەلیستی پێشمەرگەکانی تیپی ١١ی هەورامان و بەتالیۆنی١ یەکدا ساڵی ١٩٨٩ لەکتێبی دەنگی خاک بەرگی یەک دا لەلاپەڕە٦٩٧دا نییە. دەقی لیستی تەشکیلات و ناوەکانی هێزەکەی بەتالیۆنی یەک ساڵی ١٩٨٩ لە بەڕێز مامۆستا عەلی عەبدوڵا وەرگیراوە، بۆیە زۆردرووست و تەواوە، ئەوانەی گلەیان هەیە بەداوای لێبووردنەوە، ڕەنگە پێشتر یان دواتر لە ناو بەتالیۆن و تیپەکان و کەرتەکاندا بووبن، ئەوە لیست و

ڕێگاکەدا وەستابوو، بەپێکەنینەوە ووتی ئەڕێ کوڕی ئاسمان بۆکوێ بەناشارەزای ملتان ناوە؟ ووتم بۆ ئەی ئەوە شارەزا لەپێشمانەوەن؟ ووتی نەوەڵا لەنیوقەی ئەم سەرەوخوارەدا هەر تاریکی کرد دوکەس بوون دەستیان کرد بەبیانوگرتن و ون بوون، وابزانم خۆیان دزیەوە، ئەوە کەیکاوس و ئەوانن ملیان ناوە، ووتم گوێ مەدەرێ ئەوە ئاگرەکان دیارن گەیشتینە سەر چەم ڕوو دەکەینە ئاگرەکان و سەر ئەکەوین شارەزامان بۆچیە.

گەیشتینە سەرئاوەکە، وەک چۆمی گریانە هاتە بەر چاوم، بەڵام ئاوی ئێرە ئەوەندە ساردە لاق ئەتەزێنێ ناتوانی یەک خولەک زیاتر پێکانت لەناویابن، چەند تاریکە، دار پەڵگ و سوورە چنارەکان، ئەوەندەی تر سەر چۆمەکەیان تاریک کردوە.

کاتێک قەتارەی پێشمەرگە لەئاو ئەپەڕینەوە، بەتایبەت لەشەوێکی ئەنگوستە چاوی وەک ئەم شەودا، کەپێڵاو گۆرەوێش دادەکەنن وەبەدوای یەکدا ریز ئەگرن، زۆریان پێ دەچێت بۆیە داوام کرد لەخوار ئەو ریزەوە ریزێکی تر دروست بکەن بازوتر بپەڕینەوە، من خۆم لەگەڵ ئەو ریزەی خوارەوە پەڕیمەوە، ئەوانەی ئەگەیشتنە ئەوبەرەوە کۆمەڵ کۆمەڵ کۆدەبوونەوە بۆپۆشینەوەی گۆرەوی و پێڵاوەکانیان، ئێمە لەوکاتەدا لەوبەرەوە کۆبوبووینەوە و خەریکی خۆکۆکردنەوە بووین، لەناکاو شەوق و برقێک دنیای کردە ڕۆژی نیوەڕۆ، دواتر دنیا بووە شەوە زەنگ و دوکەڵ، گرمەو دەنگ و دەنگدانەوەی ئەمبەرو ئەوبەری دۆڵ و شاخەکان، وامان زانی دنیا ڕوخا بەسەرماندا، خۆمان ماتکردو داروبەرد لەئاسمانەوە دائەبارینەوە بەسەرماندا، دوکەڵ و داروبەردەکە نەماو لەدوورەوە هێشتا دەنگی دەنگ دانەوەی تەقینەوەکان دەنگی ئەدایەوە، دوای ئەوە هاتوهاوار بەرز بووەوە، بانگم کرد ئەوە چیبوو کێبوون، ووتیان برادەرانی بەتالیۆنی شالاون سەیدساق، چەندین پێشمەرگەیان شەهید و بریندار بوون هەرلەوێ بێ شڵەژان ووتم کاک مەحمودی حەمەی فەتاح خۆی کوا سەلامەتە؟ خۆی وەلامی دامەوەو هات بۆلام بۆمان دەرکەوت دوو لوغمی ڤالمیرا لەسەر

---

تەشکیلاتی سەرەتای دروست کردنی بەتالیۆنەکەیە لە شاری پاوەی کوردستانی ڕۆژ هەلات.

ئاوەکە بەستراون بەدارەکانەوە بەشێوەی تەڵە پێشمەرگە لەکاتی پەڕینەوەدا داویەتی لەتەڵەکەو پێیاندا تەقیونەتەوە.

بەمەحمودی شاتریم ووت خۆت و چەند کەسێک برینندارەکان ببەنەوە بۆسەر شاخ و لەو هێزەی بەجێمان هێشتوە، بنێرە بەدوای شەهیدەکاندا. ئێمە کەووتینەڕێ و هەر نەشوەستاین بزانین چەندکەس شەهیدن و کێن و چەند کەس برینندارن.

لەسەر شاخەوە بۆسەر چەم ئەوەندە سەرەوخوارەو لێژە، ئێمە بەناڕەحەت هاتبووینە خوارەوە، بۆیە لێرەوە گەڕانەوە و سەرکەوتنەوە بۆسەر شاخ بەدەستی خاڵی بەهیلاک دەچیت، ئەمزانی هەر بریندارێک یان شەهیدێک ٤-٥ کەسی ئەوێت تا لەم سەر چۆمەو لەبنی ئەم کێوانەدا بیباتەوە بۆسەر چیاکە، دوای گەڕانەوەی هێزەکان و چۆڵ کردنی ناوچەکەو هاتنەوەمان بۆ شارەزوور زانیم ئەو شەوە بەتەقینەوەی مینەکان یەک پێشمەرگە شەهید و پێنج بریندار بوون.

کاک مەحمودی حەمەی فەتاح پیاوێکی بەڕێزە، پێم ووت بائێمە دوانەکەوین تۆ خۆت لەگەڵ برادەرەکانت شەهید و برینندارەکان ببەنەوە بۆسەرشاخ بۆ ئەوشوێنەی لێیەوە هاتوین، هەرچی لەمنە شەهیدەکان زۆرن، دوای زانیم یەک شەهید و پێنج بریندار بوون، ئەوانیش ئەم هەڤاڵانە بوون:١- عەبدوڵا ئەحمەد تەپەڕەشی شەهید، برینندارەکان ١- واحید ئەحمەد قەرەگۆلی، ٢- ئەحمەد قادر عوسمان،٣- مەحمود محەمەد شاتوانی،٤- دارا هەسەن بیەڕەشکەیی، ٥- مەحمود محەمەد مەحیەدین.

# گفتوگۆ لەگەڵ پەکەکە

نیوەشەو گەیشتینە سەر چیا، کاک عوسمانی حاجی مەحمودمان دۆزیەوە، لەپەنا بەردێکدا ئاگریان کردبووەوە، دوای چاکو چۆنی و بەخێر هاتن لەبارودۆخەکەمان پرسی، دیاربوو ئەویش بێزار بوو لەم شەڕە، من و کاک عوسمان و کاک مەحمود سەنگاوی و شێخ حوسێنە سوور و چەند هەڤاڵی تر چووینە پەنایەکەوە و کەنارمان گرت لەپێشمەرگەکان، دەستمان کرد بەگفتوگۆ، ووتمان بۆ هێزەکەی ئێمە ئەمشەو پەلامارێک نەدا، کاک عوسمان ووتی فەرهاد ئۆجەلان داوای کردووە بۆگفتوگۆ، کاک مەحمود ووتی باشتر باهێرشەکە بکەین بۆ بەهێزی هەڵوێست، کاتێک دولای شەڕکەر بەشەڕ دێن، هەریەکێکیان دەست پێش خەری وەستاندنی شەڕەکەی کرد، ئەوی تر هەوڵ ئەدات فرسەت بگرێ و پەلامارێک بدات بۆ ئەوەی لای دەست پێشخەر زیاتر ئامادەی وەستاندنی شەرەکە ببێت. دوای کەمێک پشوودان کاک عوسمان ووتی ئەوە فەرهاد ئۆجەلان هاتەوە سەر خەتەکەمان، لەگەڵ کاک عوسمان دەستیان بەقسە کردن کرد، داوای کرد بۆ دانیشتن و ڕاگرتنی شەڕو دەست پێکردنی گفتوگۆ. کاک عوسمان ووتی بائاگاداری کاک کۆسرەت بکەم .

لەم کاتەدا کاک مەحمود ووتی بادرەنگ نەکات هێرشەکە بکەین من دوودڵ بووم، بەڵام کەووتینە جیاکردنەوەو ئامادە کردنی هێزێک لەو برادەرانەی هێزی ٣ی هەڵەبجە لەوانەی تائەوکاتە هاتبوونە سەرەوە، چوونکە زۆریان لەرێگا پەکیان کەوتبوو، هێزەکە ئامادە کرا، من خۆم لەگەڵ هێزەکەدا رۆیشتم، کاک عوسمان شێخ حسێنە سوری پێنجوێنیشی بە٢٠ بیست کەسەوە لەگەڵمان نارد، پرسیم شارەزا هەیە شوێنەکەمان پیشان بدات، ووتیان بەڵی پێشمەرگەیەکیان بانگکرد کەووتینە رێ دوای بڕینی ٢٠٠ دوسەد مەترو دابڕانمان لەهێزەکەو سەنگەرەکانی پێشەوە، کوڕە شارەزاکە ووتی تەواو ئیتر لێرەوە ئەبی بەوریای بڕۆین، ووتم رەبیەکانی ئەوان کامەن؟ ووتی نازانم ئەوان رەبیەیان نییە، لەژێر زەویدا کون دروست دەکەن و بەگەڵای دار

دای ئەپۆشن. ووتم تۆ خەڵکی کوێی؟ ووتی ئەوبەریم، پرسیم کامە ئەوبەر؟ ووتی بناری بەمۆ. ئەی چۆن شارەزای ئەم وولّولاتاتی؟ ووتی وەڵا من لەدوێنێوە لێرەم بە ڕۆژ لەو نوقتەی پێشەوەدا بەجێمان هێشت پاسەوان بووم، سەیری ئەم ناوچەم کردووە ئاوا شارەزام. ئەوەم بیست تازە نەدەکراو عەیبم لێ دەهات بگەڕێینەوە.

ئاگاداری برادەرانم کرد بووەستن، هەموو وەستان، چووم بۆلای دەستەی پێشڕەو، فەرماندەی دەستەکە کەیکاوسی هەرگیز نەمر بوو، پێم ووت بووەستە، خەبەرم ناردە دواوە، فەرماندەی دەستەکانی تر تەنها خۆیان بێنە پێشەوە، هاتن زۆرتاریک بوو، بە چپە پێم وتن ئەم کوڕە شارەزا نییە ئێمە لەخۆمانەوە ملمان ناوە، بۆیە دەبێ دەستەکان هەر لێرەدا بەجیاو بەبەربڵاوی بچینە پێشەوە، حیساب بکەن لەناو دوژمنداین[1]. دەستەکەی کەیکاوس بەلای چەپدا ڕۆیشتن، ئەم پێشمەرگانەی لەگەڵ بوون، خەلیل ڕێشاوی، ڕۆستەم برای قادر کۆکۆیی، برایمی کاکە ئەحە، عومەری کوێخا ئەحمەد، سەلاح عەزیز......تاد، کاک شێخ حسێن لەگەڵ دەستەکەی خۆیدا لەدواوە بەمەسافەیەکی ١٠٠ سەد مەتریدا بە دوای ئێمەدا بێن، من خۆم و دەستەیەک لەگەڵ دەستەکانی کاک عەزیز کولکنی و کاک عومەر کولکنیدا هاوشانی دەستەکەی کەیکاوس و عومەری کوێخا ئەحمەدی کۆکۆیی بەلای ڕاستدا وردەوردە ئەچینە پێشەوە، تابزانین لەکوێداو کەی لەگەڵ پەکەکە پێکدا هەڵ ئەگژێین.

خوێنەری بەڕێز ئەزانم هەرکە ئەمە ئەخوێنیتەوە یەکسەر ئەزانیت ئەمجۆرە هێرش و پەلامارەی ئێمە ئەم شەو چەند هەڵە بووە، ئەمە لەباری زانستی سەربازیەوە، باشەوەش بووەستێ کەبەهیچ جۆرێک بڕواو قەناعەتمان بەو شەڕە نەبوو، ئەشزانم ئێستا ئەڵێیت ئەی ئەگەر بڕواتان پێ نەبوو بۆکردتان؟ ئاخر حزبایەتی ئەوەی خراپە بڕیارێکی هەڵە سوور ئەزانی هەڵەیە، بەڵام ئەبێ جێبەجێی بکەیت، بڕیاری حزبە، بەتایبەت بۆ ئەوانەی کاریان، سەربازی و شەڕە، واپەروەردە کرابووین، بڕیاری حزب و بەتایبەت بڕیاری سەربازی،

[1]– بەداخەوە کە ئەڵێم دوژمن ، قەد ئەوانە دوژمن نین و نابن.

ئەگەر سوور بشزانی هەڵەیە ئەبێ ئەنجامی بدەیت و دوایی بێیت مناقەشەی بکەیت یان ڕەخنە لەبڕیارەکە بگریت.

ئەمە و ڕوگیریش زۆر جارمنی توشی هەڵە کردوە، چوونکە کاتێک کاک عوسمانی حاجی مەحمود ووتی فەرهاد ئۆجەلان داوای وەستانی شەڕ و دەست پێکردنی گفتوگۆی کردووە، کاک مەحمود سەنگاوی دەڵێت حەمە هێزەکەی پەلامار دەرە، بائەمشەو هێرشێک بکەن بۆ بەقوەتی هەڵوێستمان، دەبوو من نەمکردایە، لەکاتێکدا دڵنیا بووم شەڕەکە ئەوەستێ، بەڵام خۆشم برێک لەگەڵ پێشنیارەکەی کاک مەحموددا بووم، بۆ ئەوەی زۆر لەم شاخە نەمێنینەوە.

لەشەڕی نێوان دوولادا، وەک پێشتر لەپەراوێزەکەدا باسم کردووە، کاتێک لایەک داوای وەستانی شەڕو ڕێککەوتن دەکات لاکەیتر ئەگەر بۆی بکرێت گورزێک ئەوەشێنی، ئەوە بۆ بەقوەتی هەڵوێستیەتی لەگفتوگۆکەدا. ئەو هێرشەی ئێران کردیە سەر هەڵەبجەو دەوروبەری و گرتی لەساڵی ١٩٨٨، لەو جۆرە شەڕانەبوو. ئەم هەڵمەتەی ئەمشەوی ئێمەش بۆسەر پەکەکە کاریگەری هەبوو بۆ زیاتر و زووتر هاتنە پێشەوەی پەکەکەو وەستاندنی شەڕەکە. هەرچەندە ئەو شەوە چەندین کوڕی قارەمانمان کردە قوربانی، لە هەردوولادا.

لە باسەکەی خۆمان لامان دا، دوای بڕینی ٢٠٠دووسەد مەتریتر، لەلای دەستەکەی کەیکاوسەوە، بووە تێخوڕین و هات و هاوارو شەڕە رومانە( نارنجۆک)ئێمە هەموو خۆمان دابەزەویاو بێدەنگ کوڕکەمان کرد، بۆمان دەرکەوت ئێمە لەدەستی چەپەوە زیاتر ڕۆیشتوینەتە پێشەوە، ئاگاداری هەموو ئەوانەی دەوروپشتی خۆم کرد یەک یەک بەهێڵێکی ئاسویی لەتەنیشت یەکەوە دانیشن، سەباحی مەحمود بەگ کوڕێکی گورج وگۆڵ و بەجەرگە، ووتم دوکەس لەگەڵ خۆت بەرەو برۆ بۆلای کەیکاوس پێی بڵێ ئەوە چی بوو و چیان کرد؟ بالەشوێنی خۆیان نەجوڵێن تا ڕۆژ دەبێتەوە، واخەریکە بەری ئاسۆ ڕووناکی کرد، شوێنەکەی ئێمەشیان پێ بڵێ، سەباح ڕۆیشت و زوو گەڕایەوە، هاچی بوو؟ ئەیەوێت جوابم نەداتەوە، دەستیم گرتوو بەدانیشتنەوە هەردووکمان هەنگاوێنک هاتینە دواوە سەرم بردە پەنادەمیەوە پرسیم بۆ قسە ناکەیت، بێدەنگ هەر سەیری بەرپێی خۆی ئەکا،

ووتم چیە بڵی کەیکاوس شەهید بووە؟ ووتی وابزانم بریندارە، نا ڕاست پێم بڵـێ؟ ووتـی بەڵـێ، تەزویەک لێیـدام و قـوڕگم گیـرا، مـن لەژیـانی پێشمەرگایەتیمدا، زۆر لەئازیزان و هاوڕێیانم لەپەنامداو بەدیار چاومەوە، خوێنی ئاڵیان فوارەی کردووە و ڕژاوەتە سەر زەوی و ژیانیان لەدەست داوە، ڕاستە لەوکاتەو بەدیار خەڵکەوە بەڕواڵەت لام ئاسایی بووە، بەڵام دوای دەیان ساڵ و تائێستاش زۆر جار کەبەتەنها دەبم دەگریم بۆیان، بەتایبەت بەشەوان و لەکاتی خەوتندا، بیری هەرکامیان دێت بەسەرما لەوانە براکانی خۆم هاوڕێ نزیکەکانم، بەهۆرەوە سۆزو شینێکی کورتیان بۆ دەکەم، دوای ئەوە دەروونم ئاسودە و لەشم سوک ئەبێت، سۆز کردنەکە لەزەتی لێ ئەبینم.

قوڕگ گیرانەکەی ئەمشەوم بۆ کەیکاوس بۆ ئەوە نەبوو، ئەسیرو فرمێسکی خوشکەزام بێناز ئەکەون، بۆ ئەوەبوو، لەڕێگادا کەنزیکی بەرەی شەڕەکە بـووینەوە، ئەگەیشـتین بەبریندـارەکان ئەیـانبردنە دواوە، کەیکـاوس هـاتە پەنامەوە، ووتی هەرگیز دڵم بەرایی نادا فیشەک بەئاراستە گەریلا بتەقێنم، منیش بەکەنینەوە ووتم جاچی بکەین؟ ووتی نازانم بەخوا وائەزانم بۆسەر ناسـیح و سـەباحی بـرام ئەڕۆم، لەوکـاتەدا لەگەڵ کەیکـاوس قسـە ئەکەم، پێشمەرگەیەک ووتی کاکە حەمە لەم لاوە سـەرکەون، گەیشتمە لای ئەبینم شەهید سەرحەدی برای کاک ئەنوەر دۆلانییە، دوای چاکو چۆنی ووتی ئەوە کاک عوسمان و ئەوانن لەو بن بەردەدا.

بەڵێ دوای ساتێک ئینجا پرسیم هەر ئەوشەهید بووە؟ سەباح ووتی برایمی کاکە ئەحەش بریندارە، باشـە بـڕۆرەوە بۆلایـان بڵـی بیـانبەنەدواوە، ووتی بردویانن. ئەوە کەمین بووە لێیداون و شوێنەکەیان بەجێهێشتوە.

ئەوەنـدەی نەبـرد ڕۆژ بـووەوە، خۆمـان لەجەنگەڵێکـی چـڕی داربەڕوەکاندا بینییەوە، لوتکەیەکی بەرز سوارە بەسەرماندا لەنێوان ئێمەو دارو بێداردا، قوللەیەک دەرکەوت تفەنگ هـاوێژێکە، لوتکەکە بێدارە، بەڵام سەختە، ئەوناوچـانەی شـاخاوین و لەدامێنەکانـدا دارسـتان هەیە ، لەسـەر بەرزای و لوتکەکاندا بەهۆی بەرزایی ئەوشوێنانە، لەئاستی ڕووی دەریاوە لەکوێستانەکاندا دارستانەکان نامێنن، لەو شوێنەدا درەختەکان کەم ئەبنەوە و وردە وردە دارەکـان بچـوک و قەزەم ئەبـنەوە تـا زیـاتر هەورازتـر بڕۆیـت

کۆتاییان دێت، لەو هێڵەدا دارە کۆتا و قەزەمەکانیش کۆتاییان دێت و ئیتر ئەوبەشەی شاخەکان ڕووت و بەگیای کوێستانی و بەبوتەگەون داپۆشراون، ئەو هێڵەی دارستان و ڕووتەن لەیەک جیا ئەکاتەوە، پێی دەوترێت (دار و بێدار).

بەری ئاسۆ ڕووناکی کردووە تفەنگێکی قەناسی لێیە ناهێڵێ سەر دەرکەین، هەرچۆن بوو لەچەندلاوە، بەدەستەی بچوک بچوک چووینە پێشەوە، خۆمان گەیاندە ژێر قوللەکەو هەوا ڕووناکی کرد لەدەستەکەی عەزیز کوڵکنی پێشمەرگەیەک بەناوی حەمەسەعید بەشارەتی شەهید بوو، بەراستی قارەمانی وام کەم دیوە، ناردمانە دواوە، تا نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە تەقەو لێکدان دووربە دوور هەیە، سەنگاوی بەتاکی واکی(جهاز) ئاگاداری کردین تەقە وەستاوە لەنێوان ئێمەو پەکەکەدا، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ ئەم لوتکەی پشتەوەتان.

دوای چی؟بەڵی باشە بزانین ئەتوانین، کاک سەردار شەوکەتم بانگ کرد تۆ خۆت و چەند کەسێک بەپەنا ئەم دارانەدا یەک یەک بڕۆنە دواوە، سەردار ٥٠ پەنجا مەتر دوور ئەکەوێتەوە، من لەدواوە تەماشای دەکەم، مەخزەنێک لەتاقمەکەی قەدی ئەپەڕێ و بەردەبێتەوە، کەمێک ئەوەستێ و وورد دەبیتەوە ئەوجا ئەزانێت ئەوە فیشەکی قەناس لەسەر شاڵەکەی پشتییەوە ئەڵقە چەرمەکەی بەرگی شانەیەکی کلاشینکۆفەی بڕیوە. ئاگاداری کاک مەحموودم کرد ناتوانین بگەڕێینەوە پرسی بۆ؟ ئەوە نییە تەقەمان لێئەکرێ مەگەر دەمەو ئێوارە تاریک بکا ئەوکات پاشەکشە دەکەین. ووتی دیارە ئەو جەماعەتە هەواڵەکەیان پێ نەگەشتوە. ئێمە لەجێگەی خۆماندا ماینەوە تائێوارە.

بەر لەتاریک بوونی هەوا گەڕاینەوە بۆلای برادەران، پرسیاری شەهیدو بریندارەکانم کرد ووتیان ڕەوانەمان کردون بۆ ئەوبەرەوە ، تەقەش وەستاوە، فەرهاد (عوسمان) ئۆجەلان هاتبوو کاک عوسمانی حاجی مەحمود بردبووی بۆلای کاک کۆسرەت و پێکەوە چووبوون بۆ هەولێر، لە بارمتەدا کاک عوسمانی قالەی منەوەر و مامۆستا بەکر هەولێری و کاک ئاواتی شێخ جەناب چووبوونە لای سەرکردایەتی پەکەکە، وتووێژیش دەستی پێکرد.

کـــاک عوســـــمان نەگەڕایەوە بـــۆ شــــەڕگە، کە لە ڕۆژی١٩٩٢/١١/١دا بەپێشـمەرگەیەکدا خەبەری نـاردبوو بـۆمن، لەوێ لەسـەر شـاخ بمێنمەوە، ئەوناگەڕێتەوە، هێزەکانی لەشکری یەک هەموو بێنە خوارەوە، تەنها هێزەکانی هێـزی ٣ سـێی هەڵەبـجە لەسـەرەوە بمێننەوە تـائەو کـاتەی بەتەواوەتـی شەڕگەکان چۆڵ ئەکرێن. بەنامەیەکیش کەبۆمنی ناردبوو، داوا دەکات بەتانی و خـواردەمەنی و قـاپ و قاچـاخ لەو هێـزانەی لەشـکری یەک وەربگـرمەوە کەدێنە خوارەوەو ئەگەڕێنەوە.

ئەو ئێوارە لەسەر چیاوە، بە دوو پێشمەرگەدا دەقی نامەکەی کاک عوسمانی حاجی مەحمودم ناردەوە بۆ کاک حەمەی فەتاح تریفەی و حەمە هاواری بۆ سەری دێل ئەمبەر ئاوی چۆمی لۆلان لەباکووری نـاحیەی سیدەکان. کـاکە حەمەی فەتـاح و حەمە هـاواری دوو پێشـمەرگەی دیـرین و بەئەزمـوون و عاقڵ بوون لەو شەڕانەدا هەردووکیانم دانابوو بەبەرپرسی ئیدارەی هێزەکانی ئـێمە، ئەرکیــان زۆر لەســـەربوو، جــگە لەئیــدارەدانی هێزەکــان لەڕووی خواردەمەنی و لۆجستییەوە، دەبوو بەژیرانە بەرخورد بکەن لەگەڵ ئەوانەی کە گلەیی و بۆڵەبۆڵ دەکەن، یان ڕادەکەن و خۆیان ئەدزنەوە، دەیانزانی چۆن گلیان بدەنەوە یان چۆن چەکیان بکەن، یان بیان گێڕنەوە بۆلای ئێمە......تاد .

بۆ ڕۆژی دوای، چەند کەسێکی پەکەکە هـاتنە لامـان و تەرمەکانیـان پیشان دران تـابیبەنەوە، بەڵام نەیـان بردنەوە پێکەوە ئێمەش هـاوکاریمـان کردن و هەر لە شوێنی خۆیان ناشتنمان، بەرپرسی ئەو دەستە هـاتنەلامـان خەڵکی قارس بوو، ئەوەنـدە زەویـان هەڵکۆڵی بـوو هەمـوو سـەرپەنجەکانی دەستیان بووبووە برین، زۆر بەداخ بوون بۆ ئەو کـچە گەریلا شـەهیدەی کەناوی گوڵناز قەرەتاش (بێریتان) بـوو خەڵکی دەرسـیم بـوو، تەماشـا بکە کورد چ بەد بەخت و نەگبەتە، ڕۆژی پێشوو یەکتـر ئەکوژین، ڕۆژی دواتـر سەرەخۆشی لەیەک دەکەین و پێکەوە ماتەم ئەگرین، لەملا شێرە کوڕی وەک کەیکاوس شەهید ئەبێ و لەولا شێرە کچی وەک گوڵناز.

عوسـمان ئـۆجەلان (فەرهـاد)، بـرای عەبـدولا ئـۆجەلان، مـاوەیەک لەهەولێر مایەوە، لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان ڕێکەوتننامەیەکی ئیمزا کرد و بڕیار درا هێزەکانی پەکەکە لەخواکورک و حەفتانینەوە بگوێزرێنەوە بۆ ناوچەی زەڵێ و بێدەلان و ڕەزگە لەسنووری فەرمانداری قەڵادزێ سەربە

پارێزگای سلێمانی، تا ڕێکەوتن کرا و وردە وردە هێزەکانی پەکەکە دەستیان بەگواستنەوە کرد، ئێمە هەر لەسەر شاخەکانی ناوچەی برادۆست و خواکوڕک داماینەوە، جار جار تاکو تەرا بەتایبەت بەشەودا گەریلای پەکەکە دەهاتن و تەسلیم دەبوون، شەوێک بەدیار ئاگرەوە لەگەڵ کاک کەمال شاکیرو چەند کەسێکیتردا دانیشتبووین، پاسەوانەکان گەریلایەکی کوڕیان هێنا، دامانناو ئاو چای خواردەوە و پرسیارمان لێکرد برسی نیت؟ بەتورکی قسەی دەکرد، ئێمە کەسمان تورکیمان نەئەزانی، ناردمان پێشمەرگەیەکی گەرمیان هات ناوی کاک سۆران و خەڵکی کفری بوو، تاپرسیارو جوابیمان بۆ وەرگێڕێت، سۆران لێی پرسی ناوت چیە و بۆهاتویت؟ دەستی بەقسەکردن کرد، پێشمەرگە لەدەورماندا کۆمەڵ بوون، سۆران وتی پرسیاری ئەوە دەکات ئێوە جەماعەتی تاڵەبانین یان بەرزانی، یەکێک ئەیوت پێی بڵێ تاڵەبانین و یەکێکی تر ئەیوت بڵێ بەرزانیین. برادەران هەریەکە شتێکی ئەوت سۆرانیش نازانێ بەقسەی کێ بکات.

من وتم کاکە ئەم کوڕە گەریلایەکی ئاسایی نیيە بۆیە ئەوپرسیارە دەکات، پێێ بڵێ ئێمە پارتین، سۆران وەڵامی دایەوە، ئەویش وتی ئێشم بە بەرپرسی تابوور هەیە، لەبیرم نییە هەڤاڵانی تری بەرپرس لەوکاتەدا کێ لەوێدا ئامادە بوو، برادەرەکانمان بڵاوە پێکرد، ماینەوە من و کاک کەمال شاکرو چەند برادەرێک، سۆران پێی ووت فەرموو و نان بخۆ قتویەک ماسی معەلەبیان لەبەردەمدا دانابوو، باشە ووتمان بانانەکەی بخوات، دوای نان خواردن دەستی کرد بەقسە کردن بۆ سۆران، بەرلەوەی سۆران قسەکانمان بۆتەرجومە بکات، سەیری کاک کەمال شاکیرم کردوو ووتم جاسوسی تورکە، سۆران ووتی ڕاست ئەکەیت وا دەڵێت، بەقسەی خۆی میت ناردبوویە ناو پەکەکە، گوایا پێیان ووتوە هەرکات کارت تەواوبوو، ئەگەر لەباشووردا بوویت خۆت تەسلیمی نزیکترین خاڵ یان بارەگایی پارتی بکە.

دووبارە برادەران هەریەکەو ڕایەکی هەبوو لەسەری، یەکێک ئەیوت بابیدەینەوە بەپەکەکەو پێیان بڵێین ئەمە جاسوس بووە لەناوتان دا، یەکێکیتر ئەیوت بابینێرین بۆ بەهەشت( واتە بابیکوژین) ووتمان نا، بەیانی ڕۆژبووەوە نامەیەکم نوسی بۆ برادەران و ناردمانە دواوە بۆپشتی بەرەی شەڕەکە بۆلای برادەران، جامن دواتر پرسیارم کرد تابزانم چیان لێکردووە، وەڵامم

دەست نەکەوت. هەردوای یەک دوو ڕۆژ لەمفاوەزات، برادەرانی گەرمیان گروپێکی ٣ سێ کەسیان، لەدوای جەبهەکەوە لەناو درناڵە بەردێکدا دۆزینەوەو هێنانیانن بۆ لامان، کە ئەو چەند ڕۆژە لە ناوەڕاستی ئەو هەموو هێزەدا بووبوون بەبێ نان و ئاو و کەسیش پێی نەزانیبوون.

بەڵێ بەدەست پێشخەری فەرهاد ئۆجەلان، ئەورێکەوتنە کرا و هێزەکانی پەکەکە گوازرانەوە بۆ ئەو سنوورەی باسمان کرد، هێزەکانی ئێمەو پارتیش لەوشاخە بەرزانە هاتنە خوارەوە، بەرێز جەمیل بایەک، پێی وایە پارتی و یەکێتی بەدەستی بێگانە و پیلانێکی نێودەوڵەتی بووە ئەو شەڕەیان کردووە، بەتایبەت حکومەتی تورکیا بەشداری سەرەکی پلانەکە بووە و شەڕەیان بەدژی ئەوان بەرپاکردووە، لەپەرلەمانی کوردستان شەرعیەتیان داوەتی، ویستویانە پەکەکە بشکێنن، دەڵێت: ئەوەی پێیان نەکرا عوسمان ئۆجەلان بۆی کردن، ئەوشەڕ وەستان و ڕێککەوتنە بەتەسلیم بوونی عوسمان ئۆجەلان (فەرهاد) ناو ئەبات، ئەوەتا لەکتێبی (پەکەکە مێژوویەک لە ئاگر) دا ئاوا دەنووسێت : (( بەلام لەوشەڕەدا لەبەرەی خواکورک کەفەرهاد(عوسمان ئۆجەلان) بەرپرسیاری بوو، بەرگری نەکرد، سەرەتا هەندێک بەرگری کرد، پاشان تەسلیم بوو.

تەنانەت بەبێ ئاگاداری تەڤگەرو سەرۆک دەست بەرداری شەرەکەبوو و چولەگەڵ یەکێتی و پارتیش دانیشت و بەناوی پەکەکە وە ڕێککەوتنێکیشی واژۆ کرد، لەو ڕێککەوتنەدا پەکەکەیان تەسلیم وەرگرت)).
هەروەها ئەنووسێت: (( شەڕ لەخواکورک ڕوویدا فەرهاد نەیکردو چوقورجەش نەکەوتە شەڕو شەڕی قورس و سەرەکیش لەحەفتانین بوو، کەفەرهاد ڕێککەوتنەکەی کرد، سەرۆکیش ئەوکاتە ووتی ئێوەش شەڕ لەبەرەی حەفتانین بووەستێنن، شەڕ لە حەفتانین وەستا)).

بەڵێ بەو جۆرە کۆتایی هات بەشەڕێکی سەخت و خوێناوی کورد کوژی، هەرچەندە لەماوەی نزیک بە٣٠ سی ڕۆژی ئەوشەڕەدا، بەداخەوە نزیکەی ٢٠٠ دوسەد پێشمەرگەو گەریلا بوونە قوربانی سیاسەت و هەڵوێستی هەڵەی سەرکردەکانی کورد بێ جیاوازی ئەم لایەن و ئەو لایەن.

# هێزی نیزامی

یەکێک لەوەزارەتەکانی کابینەی یەکەمی حکومەتی هەرێم، وەزارەتی پێشمەرگەبوو، ئەم وەزارەتە بەر لیستی سەوز کەوتبوو، وەزیرەکەی ئەفسەری بەناوبانگ لیوا ( کەمال موفتی) بوو، ئەم پیاوە پێشتر باسم کردووە، کەفەرماندەیەکی سەربازی و سیاسی و یاساییە، لەبواری کارو باری سەربازی و پێشمەرگانەدا خاوەن ئەزموونێکی دەوڵەمەندە، بۆئەم وەزارەتە لای من کالابوو براوو بەبالادا.

هەموو ئەوانەی کارو پیشەمان پێشمەرگایەتی بوو، چاوەڕێی ئەو ڕۆژەمان دەکرد ئەم وەزارەتە ئاوات و هیواکانمان بهێنێتەدی، کە نەهاتن، لەوانە: سوپای یەکگرتووی کوردستان، سوپایەکی سەردەمیانە بۆ پارێزگاری لەخاکی کوردستان، سوپایەکی پشتیوان بۆ چەسپاندنی یاسا، کۆتایی هێنەر بە فرە میلیشیایی، جێبەجێکاری یاسای ڕێزلێنانی پێشمەرگە بۆ ئەوەی ئەوانەی خەباتیان کردووە لە ڕۆژە سەختەکاندا، ڕێزیان لێبگیرێت و پاداشتی گیان فیداییان بدرێتەوە. ڕۆژی پێشمەرگە دیاری بکات، کارتێکیان بۆ دروست بکرێت، کەرێگەیان کەوتە هەر ئیدارەیەکی دەوڵەتەوە دەست بەسنگەوە بگرن بۆیان، منداڵەکانیان بەخۆرایی بخوێنن........تاد .

یاسایەک لەم بارەوە لەپەرلەمان لە ڕۆژی١٩٩٢/٩/٢٣ گفتوگۆی لەسەر کرا، دواتر بەهەوڵی لیژنەی پێشمەرگە لە پەرلەماندا دەنگی لەسەر درا و چەندین برگەو خاڵی لەخۆ گرتبوو، بەداخەوە کەهەرگیز جێبەجێ نەبوو، بەهۆی جیاوازی بۆ چوون و شەڕی ناوخۆوە. ئەمە بووە هۆی ئەوەی هەرلایەک بۆخۆی و بەمەیل و ئارەزووی خۆی، بەیاسای خۆی، بەژمارەی گەورە و قەبەوە، بەناعەدالەتیەکی بەرچاوەوە، بەبروبیانوی ناپەسەندەوە، پێشمەرگەو جاش، پیاوی باش و خراپ، ڕێکخستن و خائین، پێکەوە بەسەر یەکەوە ڕێز لێ بگرێ و خانەنشین بکات.

ئەم وەزارەتە لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٣وە هەوڵیدا بۆدروست کردنی سوپای یەکگرتووی کوردستان، لەهەردوو هێزەی پێشمەرگەی پارتی و

یەکێتی و لایەنە سیاسییەکانی تری کوردستانی، لەتەشکیلاتێکدا، کەیەکەکانی لەسەرەوە بۆخوارەوە بەم شێوە بوو، (قیادەی مەنتیقە، لیوا، فەوج، سریە، فەسیل، حەزیرە). قیادەی مەنتیقە لەسەر ئاستی پارێزگا دروست کرا. قیادەی سلێمانی قائیدی بەر پارتی کەوت و جێگریشی بەریەکێتی، پارتی هەڤاڵ دەروێش ئاغای ئامۆزای شەهید فەتاح ئاغای دیاری کرد بەقائید، دەروێش پێشمەرگەو پیاوێکی لەسەرەخۆ و لەبنەماڵەیەکی کورد پەروەرە، یەکێتیش هەڤاڵ مەحمود سەنگاوی دیاری کرد بۆ جێگری قائید. مەحمودیش یەکێکە لەپێشمەرگەو فەرماندە ماندووەکانی سەرەتای شۆڕش و بارەگای قیادەش برایە سەربازگەی سەلام لە سلێمانی.

لەمانگی ٣ی ساڵی ١٩٩٣دا ئەم قیادە ٤ چوار لیوای دروست کرد، لیوای٢٣ لەبتوێن و پشتدەر، لیوای٢٢ لە سنووری دوکان و پیرەمەگرون، لیوای٢١ لەسنووری شارباژێر، لیوای٢٠یش لەسنووری شارەزوور. لەم چوار لیوایە دوو لیوایان بۆ یەکێتی و دوانیان بۆ پارتی، لیواکانی بتوێن و دوکان فەرماندەکانیان بۆ یەکێتی و ئەوانی شارباژێرو شارەزووریش بۆ پارتی، ئەوانەی فەرماندەکانیان پارتی بوون جێگرەکانیان بۆ یەکێتی بوو، لیوای شارەزوور پارتی کاک ئەنوەری حاجی عوسمانی قەویلەیی دانا بەفەرماندەی، یەکێتیش منی دانا بۆ جێگری، بارەگای لیواکەمان لەسەراوی سوبحان ئاغا دانا، لەهێزەکانی هەردوولاش لەسنووری شارەزوور، ٤ چوار فەوجمان دروست کرد. لیوا هەیئەتی هەبوو، هەروەها فەوجیش.

هەیئەتی لیواکەمان پێک هاتبوو لە: فەرماندەی لیوا، جێگری لیوا، مقەدەم لیوا، ئیدارە، هەواڵگری، پشکنین، جوڵان، فەرماندەی فەوجی دیفاع و واجبات. دەستمان کرد بەکارکردن، هەرچەندە ئێمە گوێمان لەوە نەبوو کێ شیاو کێ بەرپرسی کێیە، چوونکە هەرلایەک لەقائیدی مەنتەقەوە تا جێگری حەزیرە، بەرێژەی ٥٠بە٥٠ دائەنرا، ئیتر وارێک ئەکەوت، بۆنموونە فەرماندەی فەوجێک بەرپارتی ئەکەوت کەسێکی نەخوێنەواری نە شیاوی بۆ دیاری دەکرد، جێگرەکەشی بەر یەکێتی ئەکەوت پاڵێوراوەکە کەسێکی خوێنەوار و زۆر لەفەرماندەکەی شیاوتر بوو. هەروەها بەپێچەوانەشەوە، بەڵام ئەم جۆرە گرفتانە نەبوونە رێگر لەبەردەم تەشکیلاتەکەدا، هەرپێشنیار کراوێکی یەکێتی بۆ هەر پلەیەک ناڕەزاییەتی دەربڕیایە، من خۆم بەنموونە ئەهێنایەوە، ئەموت

فەرماندەی لیوا بەریەکێتی بکەوتایە من فەرماندەی دەبووم، ئەوەتا جێگر بەرئێمە کەوتوە من جێگریم قبووڵ کردوە.

بەڵی دەستمان بەکار کردن کرد، بەدوو بیرکردنەو دوو بۆ چوونی کەمێک جیاوازو لەیەک، لەکاری ڕۆژانەدا ئێمە نەفەسمان درێژو تەحەمولمان زیاتر بوو، جگە لەوەی نێوان من و کاک ئەنوەر برایانەو مجامەلەی یەکترمان دەکرد، مقەدەمی لیواکەش ئەفسەرێکی ئەکادیمی و هەرچەندە لەسەر میلاکی پارتی بوو لەرووی حزبایەتیەوە زۆر تۆخ و بیر تەسک نەبوو، کەسێکی گونجاو دەوری باشی هەبوو، لەکۆبوونەوەکان دا هەمیشە لەسەر ڕاستی و چەووتیەکان هەڵوێستی دروستی خۆی دەرئەبڕی. ئەو ئەفسەرە کاکە حەمەی عەزەبابی بوو، دواجاریش بوو بەیەکێتی.

لەماوەی تەمەنی ئەوسوپا یەکگرتووە کرچوکاڵەدا کارێکی وانەکرا جێگەی دڵخۆشی بێت، میلیشیای حزبەکانیتر وەک خۆیان مابوونەوە، پارتی و یەکێتی لەدەرەوەی ئەم سوپایەدا هێزی پێشمەرگەیان تاڕادەیەک بەبێسەرو بەری هەبوو، بێمتمانەی نێوان لایەنەکان وایکردوە کەس دەست بەرداری هێزی پێشمەرگەی خۆی نەبێت.

ئەم هێزی نیزامیەش تێکەڵ کراوەو ناوی لێنراوە سوپای یەکگرتوو، تەنها بەرووکەش و ناو یەکگرتووە، ئەگینا هەرسات چاوەڕوانی ڕوودانی ڕووداو هەڵوەشانەوەو گەڕانەوەیە بۆلای حزبی خۆی، دواجار ئەوە ڕوویدا. کەشەڕی ناوخۆ لەنێوان پارتی و یەکێتیدا هەڵگرسایەوە، هۆکارەکەشی ڕووداوەکەی ڕۆژی ١٩٩٤/٥/١ی قەڵادزی و کوژرانی عەلی حەسۆ میرخان بوو لەسەر پارچە زەویەک. هەوڵی زۆردرا ئەوشەڕە تەشەنە نەکات بۆ ناوچەکانی تر، بەڵام هەوڵەکان سەرکەوتو نەبوون، ئەوە بووە هۆی هەڵوەشانەوەی بەناو سوپای یەکگرتوی کوردستان و هەرلایەک گەڕانەوە بۆلای حیزبی خۆی.

لیوای ٢٠ی شارەزوور هەیئەتی لیواکە پێک هاتبوو لە ٣٦ ئەفسەری هەردوولا، هەرلایەک و ١٨ هەژدە ئەفسەر، کەلیواکە هەڵوەشایەوە تەنها کاک ئەنوەر و سێ کەس لەئەفسەرەکان گەڕانەوە بۆ لای پارتی ١٥ پانزە ئەفسەریان نەڕۆیشتن و لەگەڵ ئێمە مانەوە یان لەماڵی خۆیان دانیشتن.

(محەمەد عەزیز، مقەدەمی لیواکەمان یەکێک بوو لەوانە، پیاوێکی ئیشکەرو شارەزای بواری سەربازی بوو، ئەفسەر بووبوو لە ناوسوپای عێراقدا ).

لە راستیدا بۆ گۆڕانکاری و گەشەکردن و بۆ پێشەوە چوون ئەوەی ئێمە بڕوامان پێی هەبوو، وەهەوڵیشمان بۆ دەدا لەهەموو بوارەکان و ئۆرگانەکانی دەوڵەتداریدا، لاکەیتر خۆی لێ ئەبووارد وەگومانی لا درووست دەکردن. لەبەرامبەر ئەمەدا یەکێتی وای دەزانی بەئاڵوگۆڕ کردنێکی ناو حکومەت لەپۆستەکانی خۆی هەنگاوێک ئەهاوێ بەرەوپێش.

ئەوەبوو لە مانگی ١٩٩٣/٤دا کاک کۆسرەت ڕەسوڵ دانرا بەسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لەجێگەی کاک دکتۆر فوئاد مەعسوم دا، هەروەها کاک جەبار فرمان دانرا بەوەزیری وەزارەتی پێشمەرگە لەجێگەی کاک کەمال موفتی دا.

## جیابوونەوەکان و یەکگرتنەوەکان

لەدێر زەمانەوە، جیابوونەوەو پارچە پارچە بوون و دواتر بەدژ یەکتر وەستانەوە، لەناو ڕێکخراو و کۆمەڵە و گروپ و حزبە سیاسییەکانی گەلان و نەتەوەکان لەسەرگۆی زەویدا هەبووە. مەرج نییە شەق بوون و هەڵگەڕانەوەکان تەنها لەنێوان پێکهاتە سیاسی و سەربازیانەدا بوو بێت. زۆر جار ڕێکەوتووە، لەناو هۆزو قەبیلەو پێکهاتە کۆمەڵایەتیی و عەشیرەییەکانیشدا ئەمە ڕوویداوە.

گەلی کوردیش لەوبارەوە پێشینەی هەیەو زۆرجار لەدەورانی عەشائیری وئیدارە لۆکالی و ناوچەییەکان و دواتریش لەنێوان گروپ و ڕێکخراو کۆمەڵەو حزبەکانی سیاسیدا، ئەو جۆرە شەق بوون و جیابوونەوەو بەیەکدا هەڵگژان، هەندێک جار دوای لێک جیابوونەوەکان پرۆسەی یەکگرتنەوە و پێکهاتنەوەیان ئەنجام داوە.

زۆرتر لەناو کوردەواریدا هۆکارەکانی شەقبوون کەڕوویداوە، چەند شتێک بوون، لەوانەو دیاریترینیان: جیاوازی بیرو بۆچوون، لەنێوان دوو ڕیزبەندیدا. یەکتر قبووڵ نەکردن لەڕێبەرایەتیدا، ئەمەش لەسەر مەسئولیەت و

لێپسراویەتی بەتایبەت لەنێوان کەسە یەکەم و دووەمەکاندا. لەسەر داهات و دەست کەوت، لەسەرپلەو پۆست، لەسەر ناوچەگەریەتی.......تاد.

زۆر جار رێکەوتووە حزبێک، چەندین حزبی لێکەوتوەتەوە، ئەوجۆرە حزبانە پێیان ئەوترێ حزبی دایک، جیابوونەوە (ئینشقاق) لەکوردستان دا زۆریان کە ڕویان داوە، کارەسات و مەینەت باری و خوێن ڕێژی بەدوای خۆیدا هێناوە. کێشەو گرفتی نەبڕاوەی لێکەوتوەتەوە، لەبەر ئەوەیە لەناوکوردەواریدا بەبیستنی ئەم وشە دڵگران ئەبین و شریتی پڕ لە ناسۆری کوشت و کوشتار و خوێن و مەرگ دێتە بەرچاومان. نموونەی جیابوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق .

لەساڵی ١٩٦٦دا جیابوونەوەیەکی پڕلەکارەساتی نەبڕاوە لەناو ریزەکانی پارتیدا ڕویدا، ئەم جیابوونەوە حزبەکە دەکات بەدوو بەش، لایەک بەناوی باڵی بەرزانی و لاکەی تر بەناوی باڵی مەکتەبی سیاسی، ئەم باڵە دواتر دەبێتە باڵی تاڵەبانی. دواتر و بەتێپەڕ بوونی کات، باڵەکانی هەردوولا، ناوی مەلاییی و جەلالیان بەسەردا ئەبڕێت.

ئەم جیابوونەوە، چارەسەر کردنی کێشەی ڕەوای کورد دوا ئەخات، هەردوولا یەک ئامانجیان هەبووە. لەئەنجامی شەڕو کوشتاری نێوانیان، دوژمن هیچ حیسابیان بۆ ناکات، لەئەنجامی پەنابردنیان بۆ دوژمنان، بۆیەکتر شکاندن و یەکتر بەچۆکدا هێنان. دوژمنی سەرەکی بەکەماڵی خەیاڵی ڕاحەت باڵی لێ دەداتەوە، هەرچەندە دوای تێپەڕاندنی مێژوویەکی ڕەش و پڕلەخوێن و مەرگ، لەساڵی١٩٧٠ یەک ئەگرنەوە، بەڵام ئەنجامی نابێت و بەرهەمی خەرمانی خەباتیان ئاوری تێبەرئەبێ و گەلەکەشمان پاش چواردە ساڵ زەحمەت و تێکۆشان ڕەنجەڕۆ دەبێت. تاوانبارو بێتاوان، خەتابار و بێخەتا، کێ لەسەر حەق و ڕاست بووە و کێ ناحەق و ناڕاست دادی گەلی کورد نادا. با ئەم بابەتە بەجێبێڵین، بەئامانەت بۆ مێژوو نوسانی بێلایەن و خاوەن ویژدان. من بابڕۆمەوە بۆ لای بیرەوەریەکانی خۆم و جیا بوونەوەکان و یەکگرتنەوەکانی دوای ساڵانی ١٩٧٩.

## جیابوونەوەی سۆشیالیست لە یەکێتی ساڵی 1979

یەکێتی نیمچە بەرەیەکە، سێ ڕێکخراوی سیاسی پێکیان هێناوە، کۆمەڵە، بزووتنەوە، هێڵی گشتی. لەبەرگی یەکی ئەم کتێبەدا (دەنگی خاک) لەسەر چۆنییەتی دروست بوونی یەکێتی لەبابەتێکدا وردتر نووسراوە. بەڵێ لەبەهاری ١٩٧٩دا، ڕێکخراوی بزووتنەوە ئینشقاقی کرد و بووە دوبەش، بەشێکی لەناو یەکێتیدا مایەوە، بەشەکەی تری کەزۆرینەی بزووتنەوە بوون جیابووەوەو حزبێکیان دروست کرد بەناوی حزبی سۆشیالیست. کەسە دیارەکانی سۆشیالست ئەوسەردەمە، ئەمانە بوون: ڕەسوڵ مەمەند، د مەحمود عوسمان، قادر عەزیز، سەید کاکە، محەمەد شاکەلی، شێخ محەمەد سەرگەڵویی،قادر جەباری، سەعد عەبدوڵا.........تاد. ئەوکات من لەگەڵ کاکە حەمەی حاجی مەحمود لەلای مام جەلال بووین لەناوزەنگ، بەیانیەک وتیان جەماعەت ئێرەیان بەجێهێشتوەو پەڕیونەتەوە بۆ ئەوبەر بۆئاواییەکانی گۆڕەشێرو بێدەلان، من ئەوکات دەمدانی کێشەکە چیەو بۆچی ڕۆیشتوون، لەوبارەگایە کەلێبووین پرسیارم دەکرد، بزووتنەوەم نەدەناسین، پێسمەرگەیەک وتی کاکە ئەمە تا کاک عەلی عەسکەری و دکتۆر خالد مابوون نەئەوێران باسی هیچ بکەن ئێستا ئەوان نەماون و شەهید کراون ئەمان هەوای سەرکردایەتی کردنی بزووتنەوە وەک حیزبێکی جیا کەوتوەتە سەریان وئەمەیان کردوە.......تاد.

لەدیداری تەمەندا بەشی دووەم، لەلاپەڕە١٢٩بۆ ١٣٦ مام جەلال بەوردی وەڵامی ئەوپرسیارەی داوەتەوە( بۆچی ڕەسول مەمەندو هەڤاڵەکانی لەیەکێتی جیابوونەوە)؟

## جیابوونەوەی زەحمەتکێشان لە سۆشیالیست

ساڵی١٩٧٩کاک قادر عەزیز لەگەڵ بەشێکی بزووتنەوە لەیەکێتی جیابووەوەو دواتر بوو بوو بەئەندامی مەکتەبی سیاسی سۆشیالیست، لە ١٩٨٥/١٢/١٢دا لەگەڵ گروپێک کەپێک هاتبوون لەبەڵێن عەبدولا، سەعد عەبدولا، بەهمەن حسێن و کۆمەڵێک کادری تر لەسۆشیالیست جیابوونەوە حزبێکیان بەناوی زەحمەتکێشانەوە دروست کرد، لەساڵی ١٩٩١دا لەژێر ناوی پرۆژەی یەکگرتنی چەپەکاندا رێکخراوی ئالای شۆڕش چووە ناو زەحمەت کێشانەوە، لەساڵی ١٩٩٢دا رێکخراوی کۆنفرانسی ئالاش چووەناو زەحمەت کێشانەوە. دواترو لە ٢٠١١/٨/٢٨ دا کۆمەڵێک کادریان لەگەڵ کاک شێرکۆ میروەیس هاتنەوە ناو یەکێتی و شێرکۆ کرا بەئەندامی سەرکردایەتی.
لەساڵی ٢٠١٣دا کێشە کەوتە ناو حێزبەکەیان بۆچارەسەر گەیشتنە بەردەم دادگاو داوەر. دوای ئەوە زۆرینەی زەحمەتکێشان لەگەڵ بەهمەن حسێندا بەهەمان ناوەوە مانەوە، دواجار کاک قادرعەزیز حزبێکی تری بەناوی حزبی ئایندە دروست کرد و دواتر لەساڵی ٢٠١٦دا خۆی و ئەوچەند کەسەی دەورو بەری هاتنەوە ناو یەکێتی خۆی کرا بەئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی، دوو هەڤاڵیشی کران بەئەندامی سەرکردایەتی، ئەوانیش هەڤالان نەسرولا سورچی و یاسین نەبی نێروەی بوون، دوای ئەوانیش کاک ئاسۆس عەلی لەلای زەحمەت کێشانەوە خۆی و کۆمەڵێک کادر گەڕانەوە ناویەکێتی و کاک ئاسۆس کرا بەئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی ،

## جارێکی تر جیابوونەوەی کاک رەسول لە حزبی یەکگرتن و دروست کردنەوەی سۆشیالیست.

کاک ڕەسول مەمەند و پاشماوەی سۆشیالیست لەگەڵ پارتی گەل و پاسۆک بریاریان دا یەک بگرن بەناوی حزبی یەکگرتن، سۆشیالیست لەچاو دوو حزبەکەیتردا زۆرینەبوون، لەکۆنگرەکەدا کاک سامی دەنگی زۆرتری هێنا

لەکاک رەسول، هەرلەویَ کاک رەسول پابەند نەبوو بەئەنجامی کۆنگرەو دەنـــگ دانەکە ئەوە بـــوو لەگەڵ کۆمەڵێـــک کـــادری سۆشیالیشـــت دا سۆشیالیستیان راگەیاندەوە و لە١٩٩٢/١١/٤دا کۆنگرەیەکیان بەست بەناوی کۆنگرەی (٣)سێی حزبی سۆشیالیست، لەوکۆنگرەدا سەرکردایەتی نوێیان هەڵبژاردەوە، ئەمانە سەرکردایەتیە نویَ کەبوون: رەسول مەمەند، محەمەد شاکەلی، شیروان شیروەندی، ئەحمەد قەدەفەری، بەهرۆز گەلالی، رێبوار عەبدولڕەحمان، جەلال عەینەک، محەمەد فاتیح، موحسن بایز، مامۆستا موحسن، مامۆستا حەسەن، عەلی ئەحمەد وەیس.

ئەم سۆشیالیستە تازە دوای کۆنگرە سەردانی حزبەکانیان کردبوو، لەسەردانی پارتیدا کاک مەسعود بەکاک رەسولی وتبوو، مام جەلال لەئەوروپا پێی وتوم، ئەو سیَ حزبە شتێکی باشیان کردووە یەکیان گرتووە، منیش ووتوم زۆرباشە ئەگەر نەبن بە چوار، مەبەستی کاک مەسعود ئەوەبووە لەهەر حزبەو کۆمەڵێک کادری بەناو حزبە کۆنەکەوە جارێکیتر حزبەکە دروست دەکەنەوە.

لەسەرەتای مانگی١سالی١٩٩٣دا ئەم بەشەی حزبی سۆشیالیشت بەسەرۆکایەتی کاک رەسول مەمەند سکرتێری حزبەکەو چەندین ئەندامی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی و کادر و فەرماندەو پێشمەرگە گەڕانەوە ناو یەکێتی .

## پارتی گەل

لەسالی١٩٨١دا و لەکۆنگرەی ٩ نۆی پارتیدا باڵێک لەو حزبە جیابوونەوە بەناوی پارتی گەل، ئەم جیابوونەوە بەسەرۆکایەتی کاک سامی عەبدولڕەحمان بوو. ئەوەیە حیزبە ڕەقیب و نەیارەکانی کورد، کاتێک گروپێک لەیەکێکیان جیا دەبێتەوە، یان جیابوونەوەی تەواو ڕوئەدا حزبەکەی بەرامبەر پێی خۆشەو بشکریَ هاوکاری جیابووەوەکان (منشەقەکان) دەکات، ئێمەش هەرچەندە کاک سامی بەبکوژی عەلی عەسکەری و د. خالد و شێخ حسێن و

هەڤاڵەکانیان ئەزانین، بەڵام پێمان خۆشبوو لەپارتیدا جیابوونەوە ڕووبدات، بەتایبەت ئەوکات ئەوترا ئەوانە واتە پارتی گەل چەپن.

پارتی گەل دواترو لەساڵی١٩٩٢دا لەگەڵ بەشێکی سۆشیالیست و پاسۆکدا لەکۆنگرەیەکدا حزبی یەکگرتنیان ڕاگەیاند، دواتر ئەم حزبە لە کۆنگرەیەکی پارتیدا بەناوی کۆنگرەی یەکگرتن کاک سامی و پارتی گەل، لەگەڵ پاسۆکو بەشێک لەسۆشیالیست گەڕانەوە ناو پارتی لەم کۆنگرەی یەکگرتنەدا دوای ماوەیەکی کەم کاکە حەمەی حاجی مەحمود دووبارە هاتەدەرو لەبەشەکەی سۆشیالیست سۆشیالیستێکی سەبەخۆی ڕاگەیاندەوە.

## ئاڵای شۆڕش

لەساڵی ١٩٨٦دا ڕێکخراو کۆمەڵەی ڕەنجدەران ئینشقاقی کرد، ئەم ڕێکخراوە باڵێکی سەرەکی نێو یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بوو. ڕێکخراوێکی تری لێ دروست بوو بەناوی ئاڵای شۆڕش، مەلا بەختیار لەگەڵ چەندین کادری پێشکەوتوو، هەروەها چەندین فەرماندەو دەیان پێشمەرگەو ژمارەیەکی بەرچاو لەئەندامان و لایەنگرانی ڕێکخستن لەگەڵیان ڕۆیشتن.

لەوانە بەرپرسە دیارەکانی وەک: مەحمود عەبدولڕەحمان (شێخ عەلی)، پشکۆ نەجمەدین، سالار عەزیز، عیماد ئەحمەد، مامۆستا جەعفەر، ئاسۆ عەلی، جەمالی حەمەی خوا کەرەم، فەرەیدون حەمەساڵح ،سەلاحی شێخ سدیق، حەمەئاوات، ئەبووبەکر خۆشناو، ..تاد.

ئینسیاکلۆپیدیای یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، چاپی دووەم ، لە لاپەڕە ٢٧-٢٨ دا لەبارەی ئاڵای شۆڕشەوە، ئاوایی نوسیوە: ((ڕەوتێکی فیکرییە لەناو کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا پەیدابوو و لەپەرەسەندنیدا ڕێکخراوێکی چەپی لێکەوتەوە. هۆی پەیدابوونی ئاڵا بۆململانێی و ناتەبایی ناو کۆمەڵەی ڕەنجدەران ئەگەڕێتەوە...... تاد)).

کێشەو ململانێی نێوان ئەم دوو باڵەی کۆمەڵە سەرەتا لەنێوان سکرتێر و دەستەیەک لەڕێبەرایەتی کۆمەڵە وەک باڵێک لەلایەک و لەلایەکی ترەوە مەلابەختیار و باڵێکی کەمینە وەک باڵێکی ناڕازی بەدژی سیاسەتی پەیرەوکراوی سکرتێری کۆمەڵە ( کاک نەوشیروان مستەفا) دەرکەوتن. باڵی ناڕازی ئیدعای ئەوەیان دەکرد، کۆمەڵە پاشەکشەی کردووە لەسیمای ئایدیۆلۆژی و چینایەتی خۆی، هەروەها ئەم باڵە خۆی بەمیراتگری هێڵی سیاسی و فیکری شاسوار جەلال، کاک(ئارام) ئەزانی. دواتر ناکۆکیەکانی نێوان ئەم دوو باڵەی کۆمەڵە لەساڵی ١٩٨٤ لەکۆنفرانسی سێی ڕێکخراوەکەدا ئاشکرا بوون و دەرکەوتن. وەک لەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا (دەنگی خاک) لەلاپەرە ٤٠٢ دا ئاماژەم پێکردوە.

من لەناو یەکێتی دا ئەودەم لەو هەڤالانەی ئالایان دروست کرد بەحوکمی کارکردن لەگەڵ زۆریان نزیک بووم، لەهەمووشیان زیاتر لەکاک بەختیار، بۆیە زۆرجار لەسیاسەت کردنیشدا هاوڕێیەتی و نزیکایەتی و تێکەڵاوی و ڕێزگرتن و پێزانینی ماندوبوون و کارکردنیشت، نەخشی هەیە لەچارەنوسی سیاسیشتدا، بۆمن ئەمە وای کردبوو سۆزم هەبێ بەلای ئالادا. بەڵام بۆ نەچووم لەگەڵ ئالای شۆڕشدا؟ هۆکار هەبوون، لەوانە: کاک شێخ عەلی و مامۆستا پشکۆ، بۆدانانی فەرماندەی کەرتی دووی هەورامان لەدوای شەهید بوونی شەهیدان ئەحمەد گریانەی و غەفور دەرەشیشی لەنێوان من و هەڤاڵێکی تردا کەنزیک بوو لەوانەوە، چوونە ناوزەنگ بۆلای مام جەلال، هەوڵیان دا من دانەنرێم، هەرچەندە هەوڵەکەیان ئەنجامی نەبوو، بەلام من ئەمەم گرتبووە دڵ. بۆیە ئەوان لەهەرشوێنێک بوونایە من دوور دەبووم لەو شوێنە، ئەوکاتەش ئەوان دوو کادری قیادی ئالا بوون.

هەرگیز نەم ئەویست لەقسەی سەرکردەیەکی تری یەکێتی دەرچم ئەوەش هۆکارێکی تربوو، ئەو سەرکردە پێی ووتم: ئەزانم کاک بەختیارت خۆش ئەوێت، هەموومان خۆشمان ئەوێت، برادەرمانە، پیاوێکی تێکۆشەرە، من نازانم لەو بابەتەدا چۆن بیردەکەیتەوە؟ حەزم کرد لەخۆت بپرسم. ووتم کاک ئازاد، بۆ چوونەکانی کاک بەختیار بەدروست نازانم، بەڵام کاک بەختیارم خۆش ئەوێت، ئەمویست درێژەی بدەمێ و ڕازی پەنهانی دڵی خۆمی بۆ باس بکەم لەو بارەوە، کەچی قسەکەی پێبڕیم و ووتی ، جگە

لەوەش کاتەکەی کاتی شەق بوون و ئینشقاق نییە، حەمە ئینشقاقی کۆمەڵە وەک جیابوونەوەی سۆشیالیست نییە لەبزووتنەوە، کاریگەری خراپ دەبێت لەسەر یەکێتی و کۆی بزووتنەوەی کوردایەتی .......تاد، قسەکانی تەواو بوو، منیش کەزانیم وایە، رازەکەی ناو دڵی خۆم بۆ ئاشکرا نەکرد بڵێم لەبەر ئەم هۆکارانە من ناچم لەگەڵ ئاڵای شۆڕشدا، کردم بەمنەت بەسەریەوە ووتم: بەڵێ کاک ئازاد تێگەیشتم لەبەر خاتری تۆ بەسەر چاو من لەقسەی تۆ دەرناچم.

هۆکاری تری سەرەکی نەک تەنها هەر سەبارەت بە نەچوونم لەگەڵ ئاڵاداو مانەوەم لەگەڵ یەکێتی تائێستاش، مام جەلال بووە، پێشتریش لەکاتی جیابوونەوەی سۆشیالیستدا، ساڵی ١٩٧٩دا هەرچەندە من کۆمەڵە بووم، بەڵام شەهیدی نەمر، کاک شەوکەتی حاجی مشیر، زۆر هەوڵیدا رازیم بکا کەرازی نەبووم گەیاندیە ناخۆشی و تەقوتۆق، وردەکاریەکەیم لەبەرگی یەکی دەنگی خاکدا باس کردوە. دواتریش لەجیابوونەوەی کاک نەوشیروان و دروست کردنی گۆڕاندا، پاشترو لەبەرگەکانی ترو لەجێگەی خۆیدا بەوردی دەخوێنیتەوە، کەدەبوو من لەگەڵ گۆڕاندا بڕۆم، بەڵام بۆ نەرۆیشتم هۆکاری سەرەکی هەر کەسێتی مام جەلال بووە.

با بێینەوە سەر ئاڵا، یەکێتی لەمانگی ١١ی ساڵی١٩٨٥دا کاک بەختیارو شێخ عەلی و مامۆستا پشکۆی لەناوچەی قەرەداخ دا گرتن و لەبەرگەڵو زیندانی کردن[1] ، تامانگی شوباتی ١٩٨٨. ئەوانیتر لەهاوڕێیانیان لەئاڵادا، ناوچە رزگارکراوەکانی ژێردەستەڵاتی یەکێتیان بەجێهێشت و چوونە سەرسنووروو ناو وولاتی ئێران. ساڵی ١٩٨٩ کاتێک شەری عێراق ئێران کۆتای هات، ناوچەکە ئەنفال کراو یەکێتی بنکەو بارەگاکانی سەرکردایەتی

[1]– مەلا بەختیار لەزینداندا شەڕی نەفسی زۆری لەگەڵ کراوە، گەیشتوەتە ئەو بڕوایەی ئەیکوژن، وە لەکۆبوونەوەی کادرانی کۆمەڵەشدا بریاری کوشتنی ئیمزا کراوە، بۆیە جارێک نامەیەک ئەنوسێ بۆ ئەڵقەی ناوەندی نوسەرانی ئاڵای شۆڕش، بەقسەی کاک بەختیار خۆی، ئەونامەی بۆ ئەوە نوسیوە، تابکەوێتە بەردەست سەرکردایەتی کۆمەڵەو رایان لەسەری بگۆڕێ. جارێکیتر لەزیندان هەڵدێ و بەڵام لەئاوای قزلەر ئەیگرنەوە. دواجار شەخسی مام جەلال تاڵەبانی ناهێڵی بکوژرێ، وە بۆ بەردانیشی تەلاشی زۆری کرد لەگەڵ سکرتێر و سەرکردایەتی کۆمەڵەدا.

پێچایەوە و رۆیشتن بۆسەر سنوور، هەڤالانی زیندانی کراوی ئالایان برد بەرەو دۆلەکۆکە. لەگەڵ کاروانە کۆچکەرەکانی پێشمەرگەو خەڵکی رزگاربووی دەستی ئەنفال و کیمیاباران کەوتنەڕێ بەرەو سەر سنوور، لەرێگا لەنزیک شاری سەردەشت مامۆستا پشکۆ رای کردو خۆی رادەستی ئێران کردو مافی پەنابەرێتی وەرگرت.

دوای ماوەیەک شێخ عەلی ئازاد کرا. بەڵام کاک بەختیار بەزیندانی کراوی مایەوە تاهاوینی ١٩٨٩. کە ئازاد کرا دواتر لەگەڵ هەڤالانیان لەزێویێ پارێزگای ورمێ یەکیان گرتەوە. بەشێکی ئالاو حزبی زەحمەتکێشان هەمان ساڵ لەناو ئێران دا یەکیان گرتەوە.

ساڵی ١٩٩٢ بەشەکەیتری ئالا لەسلێمانی کۆنفرانسێکیان بەست و لەو کۆنفرانسەدا، ناوی ئالا گۆڕا بۆ کۆمەڵەی سۆسیالیستی کوردستان. دواتر ئەم کۆمەڵە چوونە ناو حزبی زەحمەتکێشانەوە. لەمانگی ١٩٩٣/٧دا بەشێک لەباڵەکەی ئالای شۆڕش لەناو حزبی زەحمەتکێشانەوە لەگەڵ کاک مەلابەختیار گەڕانەوە ناو یەکێتی. بۆ زانیاری زیاترو زانینی هۆکارەکانی جیابوونەوەی ئالا لەکۆمەڵەو یەکێتی، دیداری تەمەن بخوێنەورەوە، بەشی دووەم لەلاپەرە ١١٥ بۆ ١٢١، لەوێدا مام جەلال زانیاری وردترو نەبیستراوتر دەخاتە ڕوو سەبارەت بەهۆکاری درووست بوون و بەرنامەو مەرامی ئاش.

# کۆمەڵی ئیسلامی

لەرۆژی٢١/٥/١٩٩٩دا بـزووتنەوەی ئیسـلامی و راپەڕینی(نەهـزە) ئیسلامی لەشاری هەڵەبجە کۆنگرەیەکیان گرێدا بەناوی کۆنگرەی یەکبوون لەوکۆنگرەدا یەکیان گرتەوە، بزووتنەوە ناونرا بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی، (نەهـزە) راپەڕینـی ئیسـلامی بەرابەرایەتی مامۆستا مەلاسەدیق عەبـدولعەزیزبوو، بـزووتنەوەش بەرابەرایەتـی مامۆسـتا مەلا عەلـی عەبوولعەزیز،ئەم دوو رابەرە بران، لەم کۆنگرەدا مامۆستا مەلاعەلی بەرابەرو مامۆستا مەلاسەدیق بەجێگر هەڵبژێردران. مامۆستا عەلی باپیر و مەلاشێخ محەمەدی بەرزنجی ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوون.

دواتـر لە ڕۆژی٣١/٥/٢٠٠١دا بـزووتنەوە کـۆنگرەیەکی تـری لەشارەدێی تەوێڵە بەست، لەم کۆنگرەدا بزووتنەوە جیابوونەوەیەکی تێکەوت کۆمەڵی لێ جیابوویەوە بەرابەرایەتی مامۆستا مەلا عەلی باپیر. ئێمە ئەمان زانی جیابوونەوە روئەداو زۆرینە لەگەڵ باپیردا ئەڕۆن، من لەچاوپێکەوتنێکی مامۆستا مەلاعەلیدا لەچوارچێوەی پەیوەندی و دیدارە دۆستایەتیەکانماندا، لەهەڵەبجەو لەبارەگای مامۆستادا بەئامادەبوونی کاک کامیلی حاجی عەلی ئەندامی مەکتەبی سیاسی، ماوەیەکی کەم بەر لەکۆنگرەکە، بەمامۆستام ووت بەرای ئێمە مامۆستا عەلی باپیر جیادەبێتەوەو زۆرینەش لەمەکتەبی سیاسی وسـەرکردایەتی لەگەڵـدا ئەڕۆن، هەروەهـا ووتـم زۆربەی سـەرکردایەتیە کۆنەکەی نەهزە لەگەڵیانن، دیارە جگە لەوە مامۆستا قسەکەی پێناخۆش بوو، ووتی وانییە، بەتوڕەییەوە هەڕەشەی لێ دەکردن، ئەیوت چەندکەسێکی کەم و نەگەنجاو ئاژاوە چین ناتوانن ئەوکارە بکەن.

بەرای من نەهزە هەڵەیەکی سیاسییان کرد لەگەڵ بزووتنەوە یەکیان گـرتەوە، چـوونکە بەرواڵەت کێشـەیان نەبـوو، وەباشـترین کـادرو سەرکردایەیان هەبوو لەچاو حیزبە ئیسلامیەکانی تردا و وەلە گەشەکردن و پێشکەوتنیشدا بوون، بەڵام سەریان لەخۆیان شێواند.

# گۆڕان

بەر لەوەی بچمە سەر بابەتەکە پێویستە بڵێم لەم کتێبەدا لەجیابوونەوەکاندا گۆڕانی تێدا نەبوو، چوونکە بابەتەکانی ناو ئەم کتێبە تاساڵی ٢٠٠٠، لەم دواییەدا بەپێویستم زانی بەکورتی ئەم بابەتەی گۆڕانیشی پێ زیاد بکەم، چوونکە ئەمیش لەجیابوونەوەکانە. وردەکاری بابەتی دروست بوون و جیابوونەوەی گۆڕان وەرئەگرین بۆ کاتی خۆی و بەرگەکانی دواتری دەنگی خاک و بیرەوەریەکانی ئێمە لەو بارەوە.

بابچینە سەرباسەکە، لە مانگی ٢٠٠٩/٤دا کاک نەوشیروان و چەندین ئەندامی مەکتەبی سیاسی وسەرکردایەتی لەیەکێتی جیابوونەوە و حزبێکیان بەناوی گۆڕان دروست کرد. سەرەتا لەساڵی٢٠٠٤داو لەکاتی هەڵبژاردنەکانی مەڵبەندەکاندا بەناوی باڵی ڕیفۆرمەوە لەناویەکێتی دا ئەم باڵە دروست بوو بەسەر پەرشتی کاک نەوشیروان، داوای چاکسازی و ریفۆرمیان دەکرد، کەزانیان بەرەی زۆرینە یان ڕوونتر بڵێم سکرتێری گشتی مل نادات پەنایان بردە بەر پرۆسەیەکی ئیمزا کۆکردنەوەو ئاراستەکردنی نامەیەک بۆ سکرتێری گشتی، لەکۆکردنەوەی واژۆکاندا یان واژۆکارەکان کەم نەبوون .

سەرەتاو پێشینەی دروست کردنی گۆڕان لەساڵی ٢٠٠٦ وە دەست پێ دەکات، ئەوکاتە کاک نەوشیروان، جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی بوو، لەسەر ناکۆکیەکانی ناوخۆی یەکێتی و چارەسەر نەکردنیان و درێژەکێشانی ململانێکان، لەم ساڵەدا دەستی لەکار کێشایەوە، دوای ئەوە دەستی کرد بەکارکردن بۆ دامەزراندنی دامەزراوەیەکی رۆشنبیری کەدواتر ناونرا کۆمپانیای وشە، من لەنزیکەوە ئاگادار بووم لەوەی چەند هەڤاڵێک بەمام جەلالیان ئەوت کاک نەوشیروان حزب دروست دەکات، مام بەگژیاندا چوەوە، زۆریش دڵی بەو دامەزراوە ڕۆشنبیریەی کاک نەوشیروان خۆش بوو، هاوکاریشی کرد بۆ پەرەپێدانی. ئەوەبوو ماڵپەڕی سبەی وکاناڵی سەتەلایتی کەی ئێن ئێن و رۆژنامەیشی پێزیاد کرد.

بەدەست لەکار کێشانەوەکەی کاک نەوشیروان نەک کێشەکانی یەکێتی ڕویان لە لاوازی و کەمبوونەوە نەکرد، بگرە ئاڵۆزتر و زیاتربوون. ئەوەبوو لەمانگی ٢٠٠٩/٢دا چوار ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی دەستیان لەکار کێشایەوە و چوونە لای کاک نەوشیروان، ئەو چوار کەسە ئەمانە بوون؛

کاک عومەری سەید عەلی، کاک مستەفای سەید قادر، کاک عوسمانی حاجی مەحمود و جەلال جەوهەر.

لەسەرەتای مانگی ٢٠٠٩/٤دا رایان گەیاند بەلیستی سەربەخۆ بەشداری هەڵبژاردن دەکەن، لە٢٠٠٩/٤/٢٨دا کۆمیسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان بەفەرمی لیستی گۆڕانی بەسەرۆکایەتی نەوشیروان مستەفا وەک قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ پەسەند کرد. تائەوکاتە ئاشکرا نەبوو لە بەرپرسی سەربازی و حزبی و لەئەندامانی کۆمیتەی مەرکەزی یەکێتی کێن ئەوانەی لەگەڵ گۆڕان دا ئەڕۆن، لەسەرەتای بانگەشەی لیستەکەوە وردە وردە ئەوانەی لەگەڵ گۆڕان دەڕۆیشتن دەرکەوتن، لە کۆمیتەی ناوەندی دا ئەم هەڤاڵانە بوون : ١- نەوشیروان مستەفا، ٢- عومەر سەید عەلی، ٣- مستەفا سەید قادر، ٤- عوسمان حاجی مەحمود، ٥- کوردۆ قاسم،٦- جەلال جەوهەر، ٧- محەمەد تەوفیق رەحیم، ٨- جەماڵ حاجی محەمەد، ٩-عوسمان بانی مارانی،١٠- شەماڵ عەبدول وەفا ١١- ئاسۆ عەلی ١٢- سەفین مەلاقەرە.

ئەمانەو چەندین فەرماندەو دەیان لێ پرسراو سەدان کادر و هەزاران ئەندامی یەکێتیان لەگەڵ ڕۆیشت، سەرەتا خەڵک زۆریان چاوەڕێ بوو لەگۆڕان بەڵام لەدوای کارکردن و تێپەڕ بوونی چەندین ساڵ، دواجار دەرکەوت نەک هیچیان پێنەکرا، ئەگەر بارودۆخەکە هەروا بڕوات خۆشیان وردەوردە بەرەو لاواز بوون ئەچن و یەکێتی نیشتیمانیشیان بەپەرو باڵکراوی خستە بەردەست پارتی .

دوای بێ ئەمەل بوون لەهەموو شتێک وا لە ٢٠١٦/٥/١٧دا لەگەڵ یەکێتی دا ڕێککەوتن نامەیەکی سیاسی واژۆ دەکەن، کەبەڕای من ئەو ڕێککەوتن نامە ناچێتە بوواری جێبەجێکردن.

بۆ ئەوەی باڵانسی حزبی و تەوازنی سیاسی لەهەرێمدا بگەڕێتەوە دۆخی پێشترو بۆ کارا کردنەوەی پرۆسەی دیموکراسیش تەنها ڕێگە چارە یەکگرتنەوەی یەکێتی و گۆڕانە لەچوار چێوەی یەک حزبدا، هەرچەندە ئەو هۆکارانەی لەناویەکێتیدا بوونە هۆی دروست بوونی گۆڕان، هەروەک خۆیانن و زیاتریش بوون، یان ڕێککەوتنێکی ستراتیجی و وەلانانی کێشەکانی نێوانیان، ئەوکات هەردوولا لەگەڵ پارتیدا ڕێکبکەون

## بزوتنەوەو سەرەتای ئاڵۆزییەکان1993/10/21

بزووتنەوەی ئیسلامی، تەنها لایەنی ئیسلامی بوون پێش راپەڕین و لەساڵی ١٩٨٧ تەوە خۆیان راگەیاندو بڕیاری رووبەروو بوونەوەی چەکداریان دژی رژێمی عێراق دا. دوای راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ لەکوردستانی باشوور، لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی تری کوردستاندا، بەتایبەت دوای ئەوە بڕیاری٦٨٨ و ناوچەی ئارام و دژەفڕین دروستکرا، کەوتنەکارو چالاکی، سەرەتا ئەم بزووتنەوە لەدوولاوە بەدوو شێوەی جیاجیا هاوکاری دەکران، یەکەمیان هاوکاری مادی بزووتنەوە بوو لەلایەن قەتەر و سعودیاوە، بەناوی خێرخوازە قەتەری و سعودییەکان، دووەم هاوکاریان لەلایەن ئێرانەوە بوو، ئێرانیش هاوکاری مادی سنووردار و هاوکاری لۆجستیکی دەکردن ، کەوتنە گەشەکردن و بنکەو بارەگا کردنەوەو چەکدارکردنی ئەندام و لایەنگرەکانیان و دروست کردن و کردنەوەی چەندین سەربازگەی مەشق و راهێنان لەناوچە جیاجیاکانی هەولێر و سلێمانیدا.

دواتر هاوکاریە مالیەکەیان بڕا لەلایەن قەتەرو عەرەبستانەوە، هەرچەندە بنەماڵەو ماڵی خوالێخۆش بوو مامۆستا مەلاعوسمان لەلایەن ئالی سعودەوە ناسراو بوون. بزووتنەوە ئەمەیان بەدەستی ڕابیتەو مامۆستا عەلی قەرەداخی ئەزانی، هەرچەندە ڕەنگە هۆکاری سەرەکی لەبەر ئێران بووبێت. دواتریش ئێرانییەکان ساردبوونەوە لەو هاوکاری و پەیوەندییە گەرمەی لەگەڵ بزووتنەوە هەیانبوو، ئیتر بزووتنەوە بەچەندین وێستگەی جیاجیادا تێپەڕی و دواتر لەچەندین کاناڵەوە هەوڵی بەدەستهێنانی پشتیوانی مالیدا ئەمەجگە لەو یارمەتیە پچڕ پچڕەی مام جەلال و ئیدارەی سلێمانی و کاک مەسعود و پارتی ئەیدانێ.

بزووتنەوە ئەوکات پێکهاتەی هێزو تەشکیلاتی جیاواز لەم پێکهاتەی ئێستای، جیاواز لەبیر و بۆچوون سەبارەت بەلایەنەکانی مەیدانی خەباتی کوردایەتی، لەناو لایەنەکانیش دا تێڕوانینی جیاواز بەرامبەر بەیەکێتی و پارتی و ئەوانیتر. چەندین دیدو تێڕوانینی جیاواز لەناو خودی بزووتنەوەکەدا

بەرامبەر بەهەڵگرتنی پەیامی ئیسلامی. بزووتنەوەکە بەگشتی تورەو توندڕەو ئەم تورەی و توندڕەویە لەدەستەیەکەوە بۆ دەستەیەکیتر، لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکیتر جیاوازی هەبوو.

سەرەتا ڕابەرایەتی گشتی لەلایەن خوا لێخۆشبوو مامۆستا مەلاعوسمانەوە بەڕێوە دەچوو، کەسایەتییەکی نەرم و بۆچوونەکانی دژی توندووتیژی بوون، لەهەمان کاتدا کەئەم زاناو عالمە ڕابەر بوو، تاڕادەیەک ئیشوکارەکان و بڕیارەکان و دەستەڵاتەکانی بزووتنەوەکە لەلایەن خوالێخۆش بوو مامۆستا مەلاعەلیەوە ئەدران و مومارەسە دەکران، ئەم کەمێک توندتر بوو لە مامۆستا مەلا عوسمان، مامۆستا مەلاعەلی پیاوێکی خۆش باوەڕو زوو کاری تێدەکرا، توندڕەوەکانی ناو بزووتنەوەکە جارجار ئەیانکردە پشتیوانی هەڵەکانیان .

دواترو بەتێپەڕ بوونی کات بەسەر مێژووی ئەم بزووتنەوەدا بزووتنەوەکە چەندین ڕێکخراو توندڕەوی لێ جیابوونەوە لەوانە: تەوحید بەڕابەرایەتی ئەبووبەکر، حەماس، جوندل ئیسلام بەرابەرایەتی عەبدوڵا شافیعی (وریا هەولێری). لەگەڵ دوحیزبی میانەڕەوتر ئەوانیش باڵی ئیسلاح بەرابەرایەتی مامۆستا مەلا کرێکار. هەروەها جیابوونەوەی حزبی کۆمەڵی ئیسلامی بەرابەرایەتی مامۆستا مەلا عەلی باپیر، کۆمەڵ بەشێکی بەرچاو لەکادر و سەرکردەکانی نەهزەی ئیسلامی لەگەڵ ڕۆیشت، کەپێشتر نەهزەو بزووتنەوە یەکیان گرتبووەوە، هەرچەندە بەرنامە داڕێژەری یەکگرتنەوەکە ماڵی مامۆستا مەلاعەلی و خەتەکەی ئەوان بوو، ئەمە بەنییەتی خۆبەهێزکردنی ئەوباڵەی ماڵی مامۆستا، چوونکە ڕابەری نەهزە مامۆستا مەلاسدیقی برای مامۆستا مەلاعوسمان و مامۆستا مەلاعەلیە، کەچی ئەمە بەپێچەوانە دەرچوو، لەجیابوونەوەی کۆمەڵدا لەکۆنگرەی تەوێڵە، زۆربەی کادرو سەرکردەکانی نەهزە لەبزووتنەوە دەرچوون و لەگەڵ کۆمەڵ ڕۆیشتن وەک پێشتر باسم کردوە.

بیرکردنەوەی ئەم دوانەی دواتر (باڵی ئیسلاح و کۆمەڵ) بەرای من توندڕەو نەبوون بگرە خەڵکی توندڕەویان لەناودا بوو. دواتر و لەبەرگی سێدا لەجێگەی خۆیدا بەوردی باسی هەریەک لەم حزب و ڕێکخراوانە دەکەین.

ئەو مێژووە خوێناویەی شەڕی ناوخۆ، لەنێوان یەکێتی و بزووتنەوە، بەچەندین مەرحەلەدا تێپەڕی، بەرای من هۆکاری سەرەکی لەلایەک ئەوگروپ و تاقمە توندڕەوانە بوون لەناو بزووتنەوەدا خۆیان شاردبوویەوە، لەلایەکی

تریشەوە هەڵویستەکانی قیادەی بزووتنەوە بوو لەبەرامبەر ئەو هەنگاوانەی توندڕەوەکاندا، لەگەڵ ئەمانەشدا یەکێتی بۆ چارەسەر کردن و دورکەوتنەوە لەئاگری شەڕ هەرچەندە درێغی نەکرد، بەلام هەڵەشی هەبوون. هەڵەکانی یەکێتی لەجێگەی خۆیدا ئاماژەی پێدەکەم. بەداخەوە بزووتنەوە کاتێک ئەم راستیانەی بۆ دەرکەوت خەسارەتی بەرچاو بەرخۆیشی و بەر یەکێتیش کەوتبوو.

بابێینە سەر ئەسلی مەتلەب (راستی بابەتەکە) ئەمەیە، هەر لەسەرەتاوە بزووتنەوە لەئاستی گشتیدا دژی ستراتیج و بەرنامەی لایەنە کوردستانییەکان و حکومەتەکەیانە. لەگەڵ ئەوەشدا بەشداری لەهەڵبژاردن و پێک هێنانی حکومەتدا کردووە، حیساب بۆ یاساو بازگەو پۆلیس و ئاسایش و ئیدارە ناکات. گومرگ دائەنێن و بەئارەزوی خۆیان قاچاخ دەردەکەن و ئیجرائات و سزاو جەریمەو گرتن و ......تاد، بەشێک لەگرفتەکانی ئەم بزووتنەوەو شەڕو قەوماوەکان، لێرەوە سەرچاوەی گرتبوو.

گرژی و سەرپێچی و ملەجەڕێ، لەنێوان بزووتنەوەو هێزە ئەمنییەکان و بەتایبەت لەبازگەکاندا، چەندین جار روویدابوو، ئەو مەفرەزە چەکدارانەی بزووتنەوە کاتێک بەبازگەکاندا تێپەڕ دەبوون هیچ حیسابیان بۆبازگەکان نەدەکرد، بگرە حەرەکاتی ئفتیزاز ئامێزیشیان دەکرد. ئەوەبوو لە رۆژی۲۱/۱۰/۱۹۹۳ مەفرەزەیەکی چەکداری بزووتنەوە سەرنشینی ئۆتۆمبێلێک بوون، ئەم مەفرەزە مامۆستا محەمەد ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوەیان لەگەڵ بوو، هەروەها کەسێکی ئێرانیان لەگەڵ بووبوو، لەبەر ئەوە ئامادە نەبوو بوون کەخۆیان بناسێنن لەبازگەکەدا، ئەگەر خۆشیان بناساندایە شتێکی ئاسایی بوو. ئەندامێکی ئەوکاتی بزووتنەوەو ئێستا لەژیانداماوە، دەڵێت: ( ئەوکەسە ئێرانییەمان هێنابوو بۆ شناسایی ئاوای ناوتاق) . ئەوکات حیزبی دیمۆکراتی ئێران لەوێ بوون، بەلام مامۆستا جەلالی شێخ کەریم جێگری بەرپرسی ئاسایشی گەرمیانی ئەوکات، دەڵێت: ( ئاگادار کرابووین ئەو مەفرەزە کەسێکی ئێرانیان لەگەڵە ئەوکەسە پەیوەندی بەعێراقەوە هەیە، بزووتنەوە ئەیانەوێت بیبەنە خوارەوە بۆخەتی تەماس). دیارە زانیاریەکەی م_ جەلال هەڵەبووە.

بەڵێ لەبازگەی بەردەم تونێلی دەربەندیخان دەیانەوێت بچنە ناو شاری دەربەن، ئامادە نابن ناسنامەی خۆیان نیشان بدەن، دوای بگرەو بەردەیەک دەڵێن ئێستا خۆمان ئەچینە ئاسایشی ناوشار لەوێ خۆ ئەناسێنین.

ئەمە وەک ئیهانەکردن و شکاندنی بازگەکە، بازگەکەش دیارە خۆیان لاداوە لەو شــەڕ پێفرۆشــتنەو مۆڵەتیــان داوە ڕۆیشــتوون، لەبــازگەکەوە بەدوایانــدا هەواڵ دەدەن بەئاســاییش، ئاســاییش بــۆی دەرئەکەوێ ئەو چەکدارانە چوونەتە بارەگای مەڵبەندی بزووتنەوە، ئاساییش داوا لەمەڵبەندی بزووتنەوە دەکات نوێنەریان سەردانی ئاساییش بکات بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە.

نوێنەری بـزووتنەوە ئەحـمەدە ریشـەیە، بەپاسـەوانەکانیەوە خۆیـان دەکەن بەئاساییشـدا، ئەو پاسـەوانانەی ئەحـمەد لەدەرەوە ئەمێننەوە بەشـێوەیەکی ناشیرین، چەک بەدەستەوەو فیشەک لەپێشەوە، دەست لەسـەر پەلەپیتکەی تفەنگ. بەم شێوە هەڵکوتانەی بزووتنەوە بۆسـەر بارەگای ئاسـایش، خـۆی بۆخۆی جۆرێک بووە لەشەڕ پێفرۆشـتن، لەوجۆرە کاتـانەدا کە گـرژی یـان بارودۆخێکی نائاسایی لەنێوان دوولا یـان چەند لایەنێکدا دروست ئەبێت، وەفدێک یان نوێنەرێک یـان نێردراوانی لایەک کەسـەردانی لاکەیتر ئەکەن، ئەبێت ئەگەر لەناخیشەوە نەبێت، خۆیان واپیشان بدەن ئەعسـابیان سـاردە، ئەتەکێتی وەفـدەکانیش هەرخـۆی وایە، ئەبێـت لەوپەڕی هێمنـی و نوانـدنی ئەدەبـدابن بـۆئەولایەو ئەو جـێگەی کەسـەردانەکەی ئەکرێـت، هەروەهـا نێردراوەکـان پێویسـت ناکـات هێـز لەگەڵ خۆیانـدا بەرن، ئەگەر دڵنیـا بـن لەبەرامبەر.

لەم دانیشتنەی هەڤالان نەژاد حەسەن بەرپرسی ئاسایشی کەرکوک و مامۆسـتا جەلالـی شـێخ کەریـم جێگـری ئاسـایش لەبارەگـای ئاسـایش لەدەربەندیخان ئەبن، مامۆستا ئەڵێت: ئاسایی دانیشتبووین لەگەڵ ئەحمەدە ڕیشـە کـاک نەژاد قسـەی لەگەڵ ئەکـرد، بڕیـار بـوو کـابرای ئێرانـی بهێنە ئاسایش، لەدەرەوە بوو بەتەقە هەرسێکمان هاتینە دەرەوە، پرسیارمان کرد ئەوە چییە؟ ووتیان پاسەوانەکانی ئەحـمەدن تەقەمـان لـێ ئەکەن، لەوکـاتەدا ئەحـمەد هـاواری کـرد مەکەن مەکەن بەرەوڕویـان ڕۆیشــت و خۆیشــی بەپەنادیوارەکەدا رایکردو ڕۆیشت.

بەداخەوە بزووتنەوە بەشێکیان لەوکاتانەدا نەک ڕێزی بەرامبەرو ئەو جێگایانەیان نەئەگرت کەلەکاتی ئاڵۆزیەکان سەردانیان ئەکرد، ڕێزی بارەگای رابەری گشتی خۆیشیان نەئەگرت، کاتێک نوێنەرانی یەکێتی سـەردانیان

ئەکردن. بۆ نمونە لەسەرەتای مانگی ١٩٩٦/٤دا گرژی ڕویدابوو لەنێوان یەکێتی و بزووتنەوەدا، من سەردانی خوالێخۆش بوو مامۆستا مەلا عەلی ڕابەری بزووتنەوەم کردبوو، شەو بوو، کاک عەدنانی حەمەی مینا دوو پێشمەرگەی خۆی لەگەڵ ناردبووم، ئوتۆمبێلەکەم لەسەر جادە وەستاوە ئەو دوو پێشمەرگە لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزیون، لەحەوشەی بارەگای ڕابەر ئەوەستن، کاتێک من لەژوورەوە لەگەڵ مامۆستادا لەکۆبوونەوەدا بووبووم، بەحیلە دوو پێشمەرگەکەیان بردبووە ژێر زەمینەیەک و ئەشکەنجەیان کردبوون. هەر دوای چەند ڕۆژ لەم بەروارە لەهەمان بارەگای ڕابەری گشتی دا گوللەی ئارپ بی جیان ڕوو کردە عەدنان، ئەمانە دواتر و وردتر لەشوێنی خۆیدا ئەخوێنیتەوە. دەمەقاڵە و گرژی لەنێوان پاسەوانەکانی ئاسایش و پاسەوانەکانی ئەحمەدا ڕوئەدا، سابیرناوێک لەپاسەوانەکانی بزووتنەوە تەقە لەئاساییشەکان دەکات، دووکەسیان شەهید دەکات و دووانی تریش بریندار دەکات، خۆیشی بەبریندارێ، بەجێ ئەمێنێت، سەلاحی حاجی محەمەد پۆلیسی ئاساییشەو ئامۆزای سابیرە دەچێت بەمامۆستا جەلال دەڵێت: ئەوە سابیرە لەوێدا کەوتوە و گیانی تیایە، مامۆستاجەلال دەڵێت بیبەن بۆنەخۆشخانە، ئەیخەنە سەر عارەبانەیەک و ئەیگەیینە نەخۆشخانە، چاکبووەوە دوای چاکبوونەوەکەی چوەناو ئەنسارول ئیسلام، دواتر لەناو داعشدا کوژرا.

شەهیدەکان خەڵکی چەمچەماڵ ئەبن کاتێک تەرمەکانیان ئەگاتەوە ناو چەمچەماڵ، شەڕ لەنێوان یەکێتی و بزووتنەوەدا ڕویدا لەچەمچەماڵ، لەم شەڕەدا (٦)شەش پێشمەرگەی یەکێتی و١٢ دوانزەی بزووتنەوە بوونە قوربانی، نزیکەی ٨٠ هەشتا کەس خەڵک و پێشمەرگەش بریندار بوون. لەکەلاریشدا بزووتنەوە دوکەسی کوژرا، ڕۆژی ١٩٩٣/١٠/٢٣ بزووتنەوە ئامادەی دەربڕی بۆ وەستاندنی شەڕ و تەسلیم کردنی تاوانبارەکان بە دادگا. بۆ ئەو مەبەستە لە نوێنەرانی هەرسێ لای، بزووتنەوە و یەکێتی و پارتی لیژنە دروست کران بۆ چارەسەری کێشەکە. لیژنەکە پێک هاتبوو لەکاک حامیدی حاجی خالی نوێنەری یەکێتی و کاک عارف تەیفور نوێنەری پارتی و مامۆستا شێخ محەمەد بەرزنجی نوێنەری بزووتنەوە.

لیژنەکە سەردانی چەمچەماڵ و دەربەن و کەلاریان کرد، کاک مەسعودیش هەوڵی خۆی داو شەڕەکە وەستا، بەڵام کێشەکان بەچارەسەر

نەکراوی مانەوە تاوانبارو بێتاوان دیاری نەکران، تاتاوانبار سزابدرێت، کەسیش تەسلیمی دادگا نەکرا. لێرەوە ئاگرەکە خامۆش کرا، بەڵام سکڵەکەی (پشکۆکەی) لەژێر خۆڵەمێشەکەدا بەگەشاوەیی مابووەوە، بەشنەیەکی هێواش هەڵ ئەگیرسایەوە. ئەوە بوو ڕۆژی ١٩٩٣/١٢/١٧ لەکفری شنەی باڵی قاز، ئەوپشکۆی گەشانەوە و شەڕ چەند ناوچەیەکی گرتەوە، لەنێوان یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامیدا.

## سەنگین بەقەد کێوە ڕەش

پایزی ساڵی ١٩٩٣ لەهەڵەبجەو هەورامان سەرگەرمی ئیشوکاری حزبی و پێشمەرگانە بووین، بزووتنەوەی ئیسلامی لەم وەرزەدا، کۆمەڵێک کێشەو گرفتیان دروست دەکرد بەرامبەر بەیەکێتی نیشتیمانی و بەئاشکرا شەڕیان ئەفرۆشت بە هەڤاڵەکانی ئێمە، بێئەوەی هۆکارێکی ئاشکراو دیار هەبێت، بەرای من هۆکاری سەرەکی سەرەتا ئەم بۆ چوونە چەوتە بوولەناو بزووتنەوەدا کە حزبە عیلمانییەکانیان بەکافر یان بەمورتەدو هەڵگەڕاوە ئەزانی، هەڤالانی ئێمەش بەتایبەت پێشمەرگە، خۆیان بەخاوەنی شەرعیەتی شۆڕشگێڕی ئەزانن و ملیان بۆ بەعس و هێزو سوپاو توانای لەڕادەبەدەری سەدام نەداوە، ئیهانەو سوکایەتی پێکردن قبووڵ ناکەن. بۆیە ئەو جۆرە بیرکردنەوەی ناوبزووتنەوەو شەڕ پێفرۆشتنەکانی لە لایەک وئەم بیرکردنەوەی پێشمەرگەش لەلاکەی کەوە، کێشای بۆ شەڕی ناو خۆو ماڵوێرانییەکی تری کوردی لەگۆشەیەکی ترەوە لێکەوتەوە.

ئەم جەولەی شەڕ لەدوای ئەوەی دەربەندیخان و چەمچەماڵەوە دەست پێ دەکات، ئاسەواری ماوە لەدڵ و دەروونی هەردوولادا، لیژنەکانی ئاشتی و نێوبژیوانان لەشەڕەکانی ناوخۆدا، هیچ کاتێک هیچ کێشەیەکیان بەتەواوی بنەبڕ نەکردووە، چوونکە توانای دەستنیشان کردن و ناساندنی تاوانباران و سزادانیان نەبووە.

لەرۆژی١٩٩٣/١٢/١٧ دا لە شاری کفری دەمەقاڵە و دەنگە دەنگ لەنێوان دوو ماڵی دراوسێی یەکتردا دروست ئەبێ، ئەمە لەسەر باڵندەیەکی

قاز، بۆیە لەناو خەڵکدا بەتەنزەوە بەشەڕی قازەکە ناسرا. دوو دراوسێکە یەکێکیان ناوی رەشەی فەرەجی قازیە ناسراوە بەرەشە خومەینی سەر بەیەکێتی بووە. ئەویتر ناوی حەمەی کاکەمەندەو سەربە بزووتنەوە بووە، سێ کوڕی حەمە بزووتنەوە بوون، ئەوەی بزووتنەوە هانا بۆبارەگای بزووتنەوە ئەبات، ئەوانیش دێن و ڕەشە خومەینی ئەبەن لەبارەگاکەی خۆیاندا ئەشکەنجەی دەدەن. کۆمیتەی یەکێتیش لەتۆڵەی ئەمەدا چەند کەسی بزووتنەوە هەر ئەو شەوە ئەگرن، یەکێک لەوانە مەلا ئیحسان دەبێت، دوای ئەمە بزووتنەوە کەسێکی تر ئەگرن بەناوی ئازاد کە ئەندامی یەکێتی دەبێت شەو بەئەشکەنجەدان ئەیکوژن و فڕێی دەدەن، بەیانی کۆمیتە و خەڵک ئەچن بۆسەر تەرمی ئازاد ئەبینن پارچە قوماشێک ئاخێنراوەتە ناو دەمی دەری ئەهێنن لەسەری نوسراوە( لا اله الالله) بارودۆخەکە گرژتر دەبێت. هێزێکی بزووتنەوە لەرانیەوە دێت بۆ کفری، بەقسەی بزووتنەوە دێن بۆ چارەسەری ڕەوشەکە، لەدەروازەی شاردا یەکێتی بازگەی داناوە، لەگەڵ ئەم هێزەی بزووتنەوە دەبێتە قرە و دەنگە دەنگیان، تەقە بەرپا دەبێت ۹ نۆ چەکداری بزووتنەوە ئەبنە قوربانی .

دەنگ و باسی ڕوداوەکە بڵاو بووەوە، هەردوولا کەوتینە خۆ، ڕۆژی ۱۹۹۳/۱۲/۱۸ مامۆستا مەلا محەمەدی بەرزنجی بەسەرۆکایەتی هەیئەتێکی بزووتنەوە و کاک عیماد ئەحمەد بەسەرۆکایەتی وەفدێکی یەکێتی و بەئەندامیەتی هەڤالان عەدنانی حەمەی میناو عوسمانی حاجی مەحمود و مستەفا چاوڕەش و عەلی عەبدولا، چوونە شاری کفری. ئەم سەردانە بۆ هێور کردنەوەی بارودۆخەکە بوو، سەردانی هەردوو بارەگای کۆمیتەی یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامیان کردبوو. لەکۆمیتەدا هەڤالان وەک خۆی باسی چۆنییەتی سەرهەڵدانی کێشەکەو روداوەکانی دوای دەکەن. کەسیش قسەی بەرزو نزم ناکات، یەک دوو کەس دەیانەوێت شتێکی زیاتر بڵێن کاک عیماد ڕێگەیان نادا.

لەسەردانی بارەگای بزووتنەوەدا، بەپێچەوانەوە، هەرکەس بۆ خۆی هەڕەشەو گورەشە دەکات، هەتانییەتی ئەوەیان دەبێت مەلاشێخ محەمەدیش بەمانەوە بکوژن. مامۆستا شێخ محەمەد ئەیەوێت هێوریان بکاتەوە و بەرێگەی یاسایی و قانونی کێشەکان چارەسەر بکرێن، بەتوڕەییەوە ڕەدی

شێخ دەدەنەوە، باس لەشتن وکفن کردنی قوربانییەکان و ناردنەوەیان ئەکرێت بۆشوێنی خۆیان، دەڵێن نا ئەوانە شەهیدی دەستی کفرن دەبێت بەجلوبەرگی خوێناویەوە بەخاک بسپێردرێن.

شێخ محەمەد ترس ئەیگرێ دەڵێت توشی چیبووین، هەڤالانی ئێمە لەبەرامبەر قسەی ڕەق و هەتا سوکایەتی پێکردنیشدا دانبەخۆدا ئەگرن، دواجار دەیانەوێت زیاتر گوێیان لەبەد گوتن نەبێت، دەڵێن بەمامۆستا تەرمەکان شۆردراو کفن کراون ئامادەن بۆ ڕەوانەکردن بابڕۆین، بەوجۆرە دێنە دەرەوە. لەناردنەوەی تەرمەکاندا ئەوشوێنانەی تەرمی بۆ دەچێتەوە لەوانە کەلار، دەربەندیخان، رانیە، ئەندامان و چەکدارانی ئەوشوێنانەی بزووتنەوە گرژی زیاتر دروست دەکەن و دەڵێن نابێت ئەم شەهیدانە بەخاک بسپێردرێن تاتۆڵەیان نەکرێتەوە.

لەرانیە بزووتنەوە هێز کۆدەکاتەوەو تەرمەکان نادەنە دەست خاک، پەلاماری کۆمیتەی رێکخستنی یەکێتی دەدەن و پیاوی بەری و تێکۆشەری کوردایەتی و مامۆستای بەئەدەبی بەقەد کێوەرەش سەنگین، بەبێ ئاگاو بەبێ چەک، مامۆستا محەمەد سوڵتان، دەکەنە قوربانی. بەرپرسانی بالای بزووتنەوە، بەمەشەوە نەوەستان، لەباتی گرتنەبەری رێگای یاساو شەرع و قانون بۆچارەسەر، کەوتنە بانگەوازو بلاوکردنەوەی فتوا بۆشەڕی سەرتاسەری و قەتل وعام و خوێن ڕشتنی زیاتر. بەدەرکردنی ئەم دوو فتواو بلاوکردنەوەیان و ئاگادار کردنی هێزەکانی بزووتنەوە بەبروسکە.

بروسکەی یەکەم: بەناوی خوا، لە/ مامۆستا عەلی باپیر، بۆ/ هەموو مەڵبەندەکان و هەرێمەکان.

ئەی شێرە کوڕانی ئیسلام، ئەم ڕۆ پیرۆزترین رۆژە، لەمێژووی ئیسلامدا، جاهەر لەبەر ئەمە، بەتوندی لێیان بدەن و دەست مەپارێزن، هەوڵ بدەن پیاوە گەورەکانیان بکوژن، هەردیلێکتان گرت بیکوژن و مەیهێڵنەوە.

بروسکەی دووەم: بەناوی خوا، لە/ مەکتەبی سیاسی، بۆ/ هەموو لایەک تکایە لەهەموو کوردستان دەست بەکاربن، شەڕ دامەزرێنن و دەست مەپارێزن بە هیچ شێوەیەک، ئەوانە پیاوی بەکرێگیراوی ئەمریکاو یەهودن، بۆیە کوشتنیان خێرەو لەودونیا خوای گەورە ئەتبەخشێ.

دوای ئەم بروسکانەش یەکێتی هەر بەتەمای سوڵح و ئاشتەوای بوو، لەوبارەشەوە، لە هەوڵ و کۆششدا بوو، جەنابی مام جەلال لەدەرەوە بوو هەوڵی خۆیدا لەگەڵ دۆستانی هەردوولا و برادەرانی بزووتنەوەش، بەڵام ئەنجامی نەبوو شەڕەکە تەشەنەی کردو لەکۆنترۆڵ دەرچوو.

بـــزووتنەوەی ئیســـلامی هەر لەســـەرەتاوە لەدوای راپەڕیـــن، لەکوردستاندا وەک بڵێت لەبەرنامەیاندایەو ئەمڕۆ و ئەم شەڕانەیان لەبەر چاوە، کەوتنە بارەگا دانان و بنکەو سەربازگە کردنەوە، لەو شوێنانەدا کەشوێنی ستراتیجی و سەربازی و شوێنی بەرزایی و جێگەی رێگەگرتن بوون لەخەڵک، بەتایبەت لەسەر رێگای نێوان شارەکانداو لەسەر تەپۆڵکەو گردەکاندا بۆ ئەوەی زوو لەسەر جادەکاندا بازگە دابنێن، خۆیان قایم کرد.

لەم جەولەی شەڕدا یەکێتی شەڕی سەرتاسەری نەکرد، ئەوە بوو لەجێگەیەک شەڕ بوو، لەشوێنێکی تر دانیشتن و رێککەوتن مۆر دەکرا، بـزووتنەوەش ئەوەی پێی کرا کردی، بروسکە و فتواکان گەواهی ئەم راستیەن، ئەوەبوو لەگەرمیان و بتوێن و پشتدەردا بزووتنەوە دوای چەندین هەوڵ و کۆبوونەوە درێژەیان بەشەڕدا، سەرئەنجام لەشارەکانی کفری و کەلار و دەربەندیخان دا نەمان و بەرەو هەڵەبجەو هەورامان ڕۆیشتن، لەقەلادزە و رانییەو چوار قورنەدا نەمان و سەرکردایەتیشیان لەبێتواتە و دەوروبەریدا گیرا .

بەم شێوە ڕۆژی ١٩٩٣/١٢/٢٤ هێزەکانی بـزووتنەوە لە شار و شارۆچکەکانی قەلادزە، ژاراوە، چوارقورنە و سەروچاوە، بەرەو بیتواتە هەڵهاتن، گەمارۆی سەربازگەی سەلاحەدینیش درا لەنزیک چوارقورنەدا. لەکەلاریش مەلاعومەر دێتە لای هەڤاڵانی ئێمە و ئەیهێنن بۆ بارەگای مەڵبەندی دوو بۆلای کاک عیماد ئەحمەد و گیانی پارێزراو ئەبێت. ڕۆژی ١٢/٢٦ پاشماوەی هێزەکانیان لە هەردوو شارۆچکەی کفری و کەلار ئەچنەدەرەوە، هێز دوایان کەوت و دوای چەند ڕووبەڕوو بوونەوەیەک لەچەند ئاواییەکدا، بەتەواوەتی لەگەرمیان دا نەمان و پاشماوەی هێزەکانیان گەیشتنەوە بـۆ لای هەڵەبجە و شارۆچکەکانی سیروان و خورماڵ. ڕۆژی١٢/٢٧ مەڵبەندی بـزووتنەوە لەدەربەنیخان کە خوالێخۆشبوو مەلا محەمەدی هۆرێنی بەرپرسی بوو، خۆیان بەدەستەوەدا، هەرلەم ڕۆژەدا

سەربازگەی سەلاحەدین و سەرکردایەتی بزووتنەوە بەتەواوەتی دەستیان بەسەرا گیرا.

پاشماوەی هێزەکانیان بەرەو سەرسنوور و شاری سەردەشتی ئێران ڕۆیشتن و بەشێکیشی بەرەولای پارتی ڕۆیشتن مامۆستا مەلا عوسمانیش دوای گرتنی درایە دەست هەڤاڵانی پارتی و چووە سەلاحەدین.

کاتێک لە بتوێن شەڕ گەرم بوو لەشارەزوور ئێمە لەگەڵ بزووتنەوە دانیشتنمان دەکرد، بۆئەوەی لێرە شەڕ نەبێت، بەڵام ئەنجامێکی نەبوو لەجێگەیەک بارودۆخەکە ئارام ئەبووەوە لەجێگەیەکیتر شەڕ بەرپا دەبوو، بزووتنەوە لەدوای چەندین پەلاماردانی بنکەو بارەگا حزبیەکانی یەکێتی و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ پێشمەرگەکانی، لەمانگی ١٢/ ١٩٩٣دا دوای ئەوەی چەندین پێشمەرگەیان شەهید کرد لەوانە هەڤاڵانی کۆمیتەی خورماڵ. ئەوەبوو بارەگای فەوجێکی سەر بەلیوای ٢٠ لەناوخورماڵدا بوو، بەرپرسی فەوجەکە کاک فەیرۆز بیارەی بوو لەسەر لیستی زەرد، جێگرەکەی نەبەز نەورۆلی بوو(خولەی سەلە) سەربە لیستی سەوز، ئەفسەری هەواڵگری هاوڕێ عەزیزی سەرکانی لەسەر لیستی سەوز بوو. لەڕۆژی ١٩٩٣/١٢/٢٥دا کاتێک ئێمە ئاگادار کراین لەخورماڵ بزووتنەوە پەلاماری کۆمیتەی یەکێتی داوە، لەگەڵ کاک ئەنوەری حاجی عوسمان ڕۆیشتین، کاتێک گەیشتینە خوار گردی چەقەڵئاوا، لەوێ ماینەوە، حاجی مەهدی دەرەمەڕی هات بچێت بۆخورماڵ، منی بینی وەستا، دابەزین ووتی خێرە ووتمان شەڕ بووە، مەڕۆ تەقەت لێدەکەن، پێم ووت بگەڕێرەوە لەئاوایی حەمەو دێکۆنەوە بڕۆ، گەڕایەوە دوای یەک کاتژمێر بینیم وا لەخورماڵەوە هاتەوە، منی بردەلاوە، ووتی خورماڵ گیراوە برادەرانی ئێوەیی لێنەماوە ئاماژەی کرد بۆ دوای پیکابەی و ووتی ئەوە تەرمی عەبابەکری بەرپرسی کۆمیتەیە هێناومەتەوە، ئەزانن تۆش لێرەی واهێزیان نزیک بووەتەوەو بەرەو ئێرە دێن، ئەوەتا لەبەرامبەر چەقەڵاوا لەسەرجادەکەدا دامەزراون. بزووتنەوە لەپەلامارەکەیاندا بۆسەر بارەگای کۆمیتە، ئەم هەڤاڵانەیان بەدیلی و بەبرینداری شەهید کردبوو : ١- عەبابەکر مەجید هەورامی تێکۆشەری دێرین و بەرپرسی کۆمیتەی ڕێکخستن، ٢- جەلال باباڵە هەورامی کارگێڕی کۆمیتەو شاعیرو نوسەر،٣- فەیرۆز ڕەحمان حەمەسەعید تەوێڵەیی ئەندامی ئاسای یەکێتی، ٤-

شیروان مەحیەدین بیارەیی، بەرپرسی پاسەوانەکانی کۆمیتەو تێکۆشەرێکی نموونەی لەهەموو ڕوویەکەوە، ٥- بەختیار حەمەسالح ئەحمەد (شکۆف) پێشمەرگەی دێرین، ٦- کەمال ئەحمەد حەمەئەمین ئەندامی کەرتی ڕێکخستن، ٧- کەریم حاجی عومەر خەڵکی ئاوایی میراولی ناوچی نەوڕۆڵی پێشمەرگەی فەوجی هەورامان سەربەلیوای ٢٠ بیستی شارەزوور.

بەڵی کاک ئەنوەر ووتی مادام وایە تۆ لێرەبە بامن ئاگاداری بزووتنەوە بکەم کە ئێمە پارتین و ئەچینە ناو خورماڵ، ئەوان ڕۆیشتن و حاجی مەهدی بڕێک پارەو ناسنامەکەی شەهید عەبابەکری دامێ، ووتم با بەخۆت بێت تۆبڕۆ جەنازەکە بەرە. ئێمە لەوێ ٥ پێنج کەس بووین دامەزراین، دوای ماوەیەک کاک ئەنوەر هاتەوە، ووتی برادەرانی لیستی سەوز لەفەوجەکەدا نەماون ئەوە سێ پێشمەرگەی یەکێتین هێناومن، ئەوانیش ئەمانە بوون:١- زەکی غەفور، ٢- جەبار مستەفا، ٣- عیسا مەحیەدین.

لەم کاتانەشدا هێزەکانی یەکێتی تەنها و بەسەدان کیلۆمەتر لە بەرەکانی نێوان حکومەت و هەرێمی کوردستاندا لەکەڵەکەوە تا خانەقین لەسەنگەری پاراستنی کوردستان دا بوون، بەرامبەر بەسوپای عێراق. هەرچەندە هێڵی ئارام و دژەفڕین هەبوو، بەڵام جارجار و لێرەو لەوێ هێزەکانی ڕژێم پەلاماریان دەدا، هێزی پێشمەرگەی یەکێتی بەرەنگاریان دەبوونەوە، هەرچەندە هێزی هاوبەشی پارتی و یەکێتی و سۆشیالیست و شیوعیش هەبوو. ئەوەبوو لەوکاتەدا بزووتنەوە ئەم شەڕەیان بەرپاکرد، هێزەکانی سەدامیش بۆ مەشغوڵ کردن و فشار لەلای تەکیەوە بە هێزێکەوە بە پاڵپشتی تانک و تۆپ و کۆپتەر هێرشیان کردە سەر هێزی پێشمەرگە. لەم شەڕەدا هەرچەندە هێزی پێشمەرگە و بەرگری بۆ پشتیوانی فەوجی دووی لیوای سێ، بەرەنگاری سوپای عێراق بوونەوە، بەڵام عێراق چەند کیلۆمەترێک هاتە پێشەوە.

بەر لە دروست بوونی ئەم جەولەی شەڕی ناوخۆی یەکێتی و بزووتنەوە، زانیاری هەبوو لای پارتی و یەکێتی، کەبزووتنەوەی ئیسلامی بەهۆی لایەنی دەرکیەوە، هەوڵی پشێوی و تێکدانی ئەمنییەتی هەرێم دەدات، بڕیار بوو ئەگەر ئەم زانیاریانە دروستبن، پارتی و یەکێتی و لاکانی تریش پێکەوە هێزەکانی بزووتنەوە چەک بکەن. ئەوەبوو بزووتنەوە ئەگەر

بەرێکەوت بوو یان بەئەنقەست، دەست پێشخەری کرد. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو، پارتی ئەیزانی بزووتنەوە دەست پێشخەری کردووە، لەهەڵگیرسانی شەڕدا، بڕیارو بەرنامەش هەبوو هەردوولا پێکەوە ئەوکێشە چارە سەر بکەن، کەچی کاتێک بزووتنەوە شکان بەدەستی یەکێتی، پارتی پێی ناخۆش بوو، خۆیشی کردە دۆست و فریاد ڕەسیان.

بزووتنەوەی ئیسلامی کاتێک لەبتوێن گەمارۆ دران و زۆریان بۆهات، بەبروسکە هێزەکەی هەڵەبجەیان ئاگادار کردبوو شتێک بکەن. تالەوێ فشار لەسەر ئەوان کەم ببێتەوە. پەلاماری کۆمیتەی ڕێکخستنی خورماڵ، لە ڕۆژی١٩٩٣/١٢/٢٥دا وەک پێشتر ئاماژەمان پێداوە لەو چوارچێوەدا بوو.

هەرهەمان ڕۆژ لەهەڵەبجەش هاوکات لەگەڵ خورماڵدا پەلاماری کۆمیتەی ڕێکخستنی دەدەن و شەڕیش لەوێ دروست بوو، ئێمە لەنزیک خورماڵدا نەگەڕاینەوە بۆ سەراو لەوێوە چووینە شارۆچکەی سیروان. بەر لەوەی ئێمە بگەینە ناو هەڵەبجە، بزووتنەوە ڕووبەڕووی پێشمەرگەکانی یەکێتی بووبوونەوە چەند کەسێکیان شەهید کردبوو، لەوانە: ١- پێشمەرگەیەکی پاسەوانی بارەگای کۆمیتەی هەڵەبجە بەناوی حەمەئەمین (مینە پەرزە) ی شەمێرانی. ٢- کوڕێکی خوێندکاری نەوجوان بەناوی بەهجەت ئەحمەد قادر لەپۆلی یەکی ناوەندیدا بوو، برای هەڤال ئەکرەم کەئێستا بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی شارەزوورە.٣- سەروەت محەمەد عەلی جەلیلەیی ، ٤ – جەمال قادر خەڵکی کوڵکنی.

ڕۆژی ١٢/٢٥ تا ڕۆژی ١٢/٢٧ ئەو هێزەی یەکێتی لەهەڵەبجەدا کە سەر بەکۆمیتەی باڵای مەکتەبی عەسکەری بوون بە فەرماندەی کاک ئەکبەر ئێناخی و کاک ئەکرەم و شەهید مەهدی و چەندین هەڤاڵیتر بەرگریان کرد و شەوی ٢٧ لەسەر٢٨ /١٩٩٣/١٢ هەڵەبجەیان چۆڵ کرد و هاتنە شارۆچکەی سیروان و لەوێ یەکمان گرتەوە.

ئەوکات ئێمە، لەگەڵ دەیان کادر و فەرماندە و سەدان پێشمەرگە لەهێزەکانی یەکێتی لە سنووری شارەزوور و هەڵەبجە و هەوراماندا، لە لیوای ٢٠ بیستی قیادەی مەنتیقەی سلێمانی سەر بە لیستی سەوز لە شارۆچکەی سیروان کۆبوبووینەوە، بەرەو هەڵەبجە ئەچووین، تالەوێش بزووتنەوەی ئیسلامی دەرکەین.

ڕۆژی ١٩٩٣/١٢/٢٨ بوو کاتژمێر ١٠ دەی سەرلەبەیانی لەبارەگای کەرتی ڕێکخستنی شارۆچکەی سیروان، ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستانم کردەوەوە بۆ وەرگرتنی هەواڵەکان. کاتێکم زانی بەدەنگی زوڵاڵ ئەیئەڕاندو ئەیووت: ( خزمینە مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشیرەتی جافا مێرووله نەچێ چاکە بەگژ قوللەیی قافا ) ئەمە بەداوای لێبووردنەوە لەخزمانی ئێلی فەیزوڵلا بەگیانی موکریان.

ئەوەیە دەڵێن لەنێوان دوو لایەنی نەیاردا، هەرکەس بەراتی بۆ مامە شێخ هەبووبێ، بەپیا هەڵدان گەیاندویەتیە لوتکە و کۆتایی قوللە، بەرامبەریشی داشۆردوەو داپاچیوەتە خوارێ، هۆکاری ڕاستی ووتنی ئەم شعرەی شێخ ڕەزا، لەسەرچی و بۆکێ نوسراوە، من بێخەبەر بووم لێی، تەنها ئەمزانی مەدح و سەنای جافانی کردووە، تا لەڕۆژنامەی کوردستانی نوێی رۆژی ٢١٧/٢/١٩ ە ژمارەی ٧١٩٨ ساڵی ٢٦ بیستوشەشەم لە لاپەڕەی کۆتایدا برای ئازیزم کاکە جەمیلی مەلا قەرە، لەسەر سەرچاوەی (مێژو ئەدەب) ی کاک حەمەی حەمەباقیدا زانیاریەکی وەرگرتووە، لەوێدا نهێنییەکەی ئاشکرا کردووە و ڕاستیەکەی ڕوون کردووەتەوە. کەگوایا ئەو بابەتە پێچەوانەکەی ڕاستە.

ئەمەش وەڵامی سەرتیپ خانی سەرۆک ئێلی فەیزوڵلابەگیان بۆ مامە شێخ (نەتبیستوە چەند ساڵە لەمەوبەر لە مەسافا هەر جافە دەچوو نوکی ڕوومی موکری بەنافا). کۆپی لاپەڕەکەی کوردستانی نوێ، لەبەشی بەڵگەنامەکاندایە.

شێخ ڕەزا شاعیری هەجو و داشۆردن زاناو عارفێکی گەورەی دەورانی خۆی بووە، هاودەورانی قاجاریە بووە، دەگێڕنەوەو دەڵێن نەسرەدین شای قاجار داوای لەعارفانی ئێرانی کردووە بۆ لێکدانەوەی هەموو هۆنراوەکانی دیوانەکەی حافز، کۆمەڵێک لەعارفانی ئێرانیداواکەیان جێبەجێ کردووە، لەبەرگەوە بۆ بەرگ، کاتێک بۆیان بردووە پێیان وتووە، تەنها لێکدانەوەی ئەم بەیتەیان نەزانیوە، کام بەیت؟

بلبولی برگ گلی خوش رنگ در منقار داشت

واندر ان برگ و نوا خوش نالەهای زار داشت

ئەویش لێیان دەپرسێت، ئەی کەس نیە بزانێت؟ ئەوانیش دەڵێن کەسێک هەیە ڕەنگە بزانێت، دەپرسێ کێیەو لەکوێیە؟ وەڵام ئەدەنەوە ناوی شێخ ڕەزایەو

لەکەرکوکە. دەڵێت دەی باشە بەیتەکەی بۆبنێرن لەگەڵ نامەیەک، داوای لێبکەن لێکی بداتەوە بەچ مناسەبەتێک وتراوە. ئەوانیش داواکەی جێبەجێ دەکەن و شعرەکەی بۆدەنێرن. مامە شێخیش ئاوا وەڵامیان ئەداتەوە:

گفته بودی مقسد حافز چ بود از آن کەگفت
بلبولی برگ گلی خوش رنگ در منقار داشت
واندر برگ و نوا خوش نالەهای زار داشت
یک شب غواس گردیدم در بحر آبجدی
تا ببینم آن سدف چ دور در بار داشت
بلبولی برگ گل شد سسدو پنجاو شش
بەحسن و باحوسن و بەعلی معیار داشت
برگ گل سبز است آن دارد نیشان از حسن
چون در حین وفاتش سبزی رخسار داشت
رنگ گل سرخ است آن دارد نیشان از حسین
چون در حین شهادتش روخسار گلناری داشت
علی باشد و ان در میان هر دو گل
دائما در سینەاش نالەهای زار داشت

ئەم وەڵامەی بەنـاوی شـێخ رەزاوە، بـۆ وەڵامـی نـامەکەی عارێفەکـان و شیکردنەوەی دوو دێڕی (بلبلی بـرگ...... ) من بەزارەکی لەکاکە حەمەی حاجی حەمەسالحی تەوێڵەیم بیستووە، وەڵامەکەی شێخ ڕەزا سەرچاوەی نوسراو ئاشکرای لەبەردەست نیە، یان من بەرچاوم نەکەوتووە.

بەڵی دێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، دوای ووتنی شعرەکە، ڕادیۆیی دەنگی گەلی کوردستان، هەواڵی ڕاوەدونان و گرتنی سەربازگەی سەلاحەدین و سەرکردایەتی بزووتنەوەو گرتنی ڕابەری گشتی بزووتنەوەی خوالێخۆش بـوو (مامۆسـتا مەلا عوسـمان) بڵاوکـردەوە. هەر ئەمـڕۆ ئەو هەڤـاڵانەی لەهەڵەبجەوە هاتبوون لەسیروان گەیشتنە لامان و هەڵەبجەیان چۆڵ کردبوو، یەکەم جار کاک ئەکرەمم بینی سەرەخۆشیم لێکرد و دڵم دایەوە، هەرچەندە زۆر سـەختە تـۆ پێشـمەرگەو شـەڕکەر بیت، بەرامبەرەکەت پێت نەوێرێ

برایەکی تەمەن ۱۲ سێزدەساڵانت بەبێچەک شەهید بکەن، بەبێتاوان، تاوانی تەنها ئەوەبووە برای پێشمەرگە بووە.

لەو کـــاتەدا کە ئەم هەواڵەی گرتنـــی ســـەرکردایەتی بـــزووتنەوە بڵاوبـــووەوە، لە هەڵەبـجەوە ئەنـدامێکی رێکخسـتن هـاتوو ئاگـاداری کـردین بزووتنەوە ورەیان بەرداوە هەڵدێن بەرەو خورماڵ و هەنێکیش پەنـا ئەبەنە بەر بارەگاکـانی پـارتی ترسـیان لەوەیە تـۆڵەی چەنـد رۆژی رابردوویـان لێبکرێتەوە، دیارە ئەو چەند رۆژە زۆر کاری قێزەونیان ئەنجام دابوو. ئێمە بێدواکەوتن لە چەندلاوە بەرەو هەڵەبجە کەووتینەڕێ.

هەر هەمـان رۆژ لە سـلێمانییەوە هێزێکیتـر هـاتن و هەڤـاڵان کـاک شەوکەتی حاجی مشیرو چەند کادرو فەرماندەیان لەگەڵ بوو، پاش نیوەڕۆ گەیشتینە ناوشار، لە رێگا لەسیروانەوە بۆ هەڵەبـجە کاک ئەکرەمم لەگەڵ خۆمدا سوار کردبوو، لەرێگا دووبارە دڵنەواییم کرد و پێم ووت تۆ پێشمەرگە و کەسێکی شۆڕش گێڕی، جیاوازیت هەیە لەگەڵ چەکدارێکی وەک چەکدارانی بزووتنەوەدا، تۆ ئەوە نزیکەی ۱۲دەوازدە ساڵە لەتەنگانەو رۆژە سەختەکاندا خەبات ئەکەی بۆ بەدەست هێنانی ئازادی، ئێستاش بۆ بەرگری لەحکومەت و یەکێتی براکەت شەهید کراوە، کێشەکە کێشەی سیاسییە، شەخسی نییە بۆیە داواکارم کەچوینە ناوشار بەهیچ جۆرێک بیر لەتۆڵەکردنەوە نەکەیتەوە....تاد.

زۆر ئازایانە و جوامێرانە وەڵامی دامەوە ووتی بەسەرچاو، گەیشتینە ناوشار بەرگری نەبوو، کاک ئەکرەم لەباتی تۆڵەکردنەوەو بەدوای خەڵکدا گەڕان کەبۆ ئەو زۆر ئاسان بوو، ملی رێگای مزگەوتی کرتەبەر بۆ بەشداری پرسەی برا جوانە مەرگەکەی.

تالای عەسر سەرگەرمی ئیشوکاربووین، هێزەکانمان دابەشکردبوو، هێزێکـی چەمچەمـاڵ بەفەرمانـدەیی کـاک کەریـم چـاوڕەش، هەر ئەو رۆژە هاتبوون بۆ هەڵەبجە بۆ پشـتیوانی ئێمە، هێزێکـی تۆکمەو شـەڕکەر بـوون، هەواڵیان داینێ نزیکەی ۲۰ بیست چەکداری بزووتنەوە، پەنایان بردوە بۆ لای فەوجەکەی برادەرانـــی پـــارتی و پەڕۆی زەردیـــان بەســـتوەتە لـــولەی چەکاکانیـــانەوە، ئەو رۆژە ئەوەنیشـــانەی ئەوەیە هەرکەس پەڕۆی زەردی بەســـتبێتە لـــوولەی چەکەکەی ئەوە پێشـــمەرگەی پـــارتیە، بۆناســـین و جیاکردنەوەیان لە بزووتنەوە. بۆ ئێمە مەترسـی بـوو ۲۰ بیسـت چەکداری

بزووتنەوە لە سەربازگەکەی پارتیدابن و لەسەر جادەی گشتیین، چونکە هێزو هەڤاڵەکانمان هاتوو چۆیان دەکرد، بەتایبەت بیستمان هەڤالانی پارتی داوای چەکەکانیان لێکردون تەسلیمیان نەکردون، ئێمەش دەبوو کێشەکە یەکلایی بکەینەوە.

ئەوەبوو بڕیار درا هەڤاڵ کەریم چاوڕەش و هەڤاڵ سەریاس هاواری فەرماندەی فەوجێک بوو، بەهێزەکانیانەوە بگەڕێنەوە بۆلای سەربازگەکەی پارتی، سەرتا داوا لەکاک نەوزاد نەورۆلی بکەن یان چەکیان بکاو بەبێچەک لای خۆیبن یان چەکاکانیان بدەن بەبرادەرانی پارتی و بەبێچەک بڕۆنەوە ماڵی خۆیان دانیشن و بەڵگەیەکیان بدرێتێ کەخۆیان تەسلیم کردووە.

دوای نیوکاتژمێر ئاگاداریان کردین لەزەمەقی تەقەیە، هەستاین و ڕۆیشتین، گەیشتین ئەبینین، سەربازگەکە گیراوە، فەرماندە فەوجەکەی ئێمە سەریاس هاواری لەگەڵ فازلی برای کەریم چاوڕەش شەهید بوون و چەندین کەسیش بریندارن، دیارە کاتێک هێزەکە نزیک ئەبێتەوە لەبارەگای فەوجەکەی هەڤالانی پارتی، سەیاس و فازل ئەچنە پێشەوە داوا دەکەن کەئەیانەوێت لەگەڵ برادەرانی پارتی قسەبکەن، چەکدارەکانی بزووتنەوە لەسەر ساتری بارەگاکەدا دەست ڕێژی گوللە دەکەن و سەیاس و فازل شەهید دەکەن.

کاتێک ئێمە گەیشتین کەریم چاورەش و هەڤاڵەکانی و شەهید حەمە دوزی پەلاماری سەربازگەکەیان دابوو و گرتبوویان، ئەوانەی تەقەکەیان کردبوو هەڵهاتبوون و یەک دوو کەسیان کوژرابوون، لەکاتی وادا کەس بەکەس نییەو هەڤالانی پارتیشیان پێوە چەک کردبوون، فەرەج کەلوریش شەهید بووبوو، فەرەج پێشمەرگەی دێرینی پارتی بوو، نەوزادیش ئەیزانی کارێکی هەڵەی کردووە ئەوانەی پەناداوەو ئەم تاوانەشیان خوڵقاند، ئێمەی بینی داوای لەمن کرد کە ئاگامان لێی بێت تابەسەلامەت لەوجێگەدا دووربکەوێتەوە، جگەلەوەی لەبارەگای ئەودا ئەمە ڕویداوە، خۆی بەتاوانبار ئەزانێ ترسیشی هەبوو لەوەی کەکێشەی عەشائیری هەبوو، ئەوانەش ئەو کێشەی لەگەڵیان هەبوو یەکێتی بوون، ئێمەش ئەوەی پێویست بوو هاوکاریمان کرد، ناردمانەوە بۆلای هەڤالانی پارتی .

ئیتر بزووتنەوە لەهەڵەبجە و شارەزووردا نەمان و پاشەکشەیان کرد بۆ هەورامان و سەر سنوورەکان، دواتر لە چیاکانی بناری هەورامان لەپشتی

خورماڵ و لە وشکەناو بنکەو بارەگایان کردەوە، لەڕێگای ملەخوردەوە لەئێرانەوە کۆمەک دەکران، چەند کەسێکی سەر بەقەرارگای ڕەمەزان هاتوچۆیان دەکردن، لەوێوە دەستیان کرد بە خۆکۆکردنەوە و خۆڕێکخستنەوە .

## هیمەتی هەورامیانە

زۆرجار هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە بەڵام دواجار و لەکۆتاییەکەیدا نەیان چەسپاندوە، یان ڕوونتر بڵێم نەیان بردوەتەسەر، زۆرجار خۆم دیومەو بەشدار بووم لەو بێباکیەو لەوتەواو نەکردنەی سەرکەوتنەکان. کاتێک لەناوچەیەکدا دوژمن دەرئەکەی و شوێنەکانی لێئەگری، نابێ ئیتر پاڵی لێبدەیتەوە و شان لەسەر سەرینی سەرکەوتن دابنێیت. یان نابێت هێزەکەت بڵاوە بکات و هەریەک بەلایەکدا بۆ پشوودان یان بۆبینینی کەسوکار، یان بەهەربیانویەکی تر، بەتایبەت بە شەودا بۆ خەوتن و نان خواردن و تەنانەت بۆ دەستکەوت کۆکردنەوەو زۆرجار بۆ شرە خۆری.

جگەلەوەش ناوچەیەکی بەرفراوان ئامانجی تۆیە بیگریتەوە کەپێشتر لێیان داگیر کردویت، یان ئەتەوێ لەژێر دەستی دوژمندا دەریبهێنی، لە یەکەم هەنگاودا کەسەرکەوتوبوویت بۆدەرگا کردنەوە، دوژمنەکەت شکا نابێت لەسەری بووەستیتەوە، ڕەنگە تۆ بەرنامەیەکت هەبێ بتەوێ هەنگاو بەهەنگاو ئیشەکەت ئەنجام بدەی، بەڵام بۆت دەرکەوت بەرگری لاوازەو دوژمن لەشکاندایە نابێ لەسەری بووەستیتەوە، بەرنامەی هەنگاو بە هەنگاوەکەت وازلێبهێنەو بکەوە شوێن هێزی شکاوی دوژمن و لەسەری بڕۆ.

لە زۆرێک لەبابەتەکانی ئەم کتێبەدا ئەم بێسەرە و بەرەیە لەکۆتای شەڕو قەوماوەکاندا بەئاشکرا بۆت ئەسەلمێ، بەنموونە دواتر بابەتێک ئەخوێنیتەوە بەناونیشانی (زیانەکانی دوای غەڕابوون)، ئەوانەی کارو پیشەیان پێشمەرگایەتی و سەربازیە زوو تێئەگەن چوونکە زۆرجار ئەمەیان بەسەرهاتووە، لەوبارەوە خاوەن ئەزموونن، جیالەوەش ئەزانن هەریەکەیەک

فەرماندەکەی نەترس و شارەزای تاکتیکی شەڕ بوو، هێزەکەی نەترس و سەرکەوتوئەبن، بەپێچەوانەشەوە فەرماندەی ترسنۆک و نەزان هێزەکەی هەمیشە بەشی شکان و هەڵهاتن و لەئەنجامیشدا کاریگەری خراپی بۆ سەر هێزەکانیتر بەگشتی دەبێت.

لەمەیدانی شەڕکردندا ئەو هێزانەی دەورە دیدە و مەشق پێکراون، جیاوازیان زۆرە لەگەڵ هێزێکی ناڕێک و پێک و کۆکراوە و عەشائیری نەشارەزا لەزانستی جەنگدا، زۆرجار پێکهاتەی هێزەکانی ئێمە لەدوای راپەرینەوە لەم جۆرە هێزانە بوون، بەڵام لەشاخدا و لەسەردەمی شەڕی پارتیزانیدا هێزەکان لەبەر ئەوە پارتیزان و دەستە و کەرتی بچوک بچوک بوون، لەبارەی نەزم و گوێڕایەڵیەوە جیاواز بوون و هەمووشیان خۆبەخش، خاوەن بیرو باوەڕ، دڵسۆز و بەورە بوون، زۆرتر خۆیان شەڕەکان و مەیدانی شەڕەکەیان هەڵئەبژارد، زۆر سەرکەوتو بەئەزموون تربوون لەوانەی دوای راپەڕین، بەبێئەوەی مەشق و ڕاهێنانیشیان کردبێ.

لەمەیدانی شەڕدا بۆ حەسم کردن و یەکلاکردنەوەی شەڕەکە بەسودی خۆت، زۆرجار وارێک ئەکەوێت جێگۆڕکێیەک، کوشتنی یەک کەس، لێدانی یەک فیشەک لەنیشانە، دوو خولەک زیاتر دان بەخۆداگرتنێک، هەڵوێستێکی جیاواز، ئازایەتی نواندنی شەڕکەرێک، کەم و زیادی تەقەمەنی، هەڵکوتانە سەر سەنگەرێک یان پاشەکشە کردن لەسنگەرێکدا......تاد . دەوری کاریگەری خۆی هەیە، بۆسەرکەوتن یان بەپێچەوانەوە بۆ شکان .

بەڵێ ئێوارە ١٩٩٣/١٢/٢٨ هێزەکانی ئێمە لەناو هەڵەبجەدا هەریەک بەلایەکدا پرش بڵاو بووبوون، کاک شەوکەت ناردویەتی بەدوای مندا بچم بۆلای، کە چووم، لەگەڕەکی پیر محەمەد لەماڵی شێخ عیزەدینی نەورۆڵیدا بوو، چەند هەڤاڵێکیتر لەوێبوون، ووتی دانیشە بزانین چی بکەین؟ مەبەستی ئەوەبوو بۆ بەیانی رۆژی١٢/٢٩ بەرنامە دابنێین. پێم ووت تۆ زانیاریت هەیە بزووتنەوە بەرەوکوێ و ڕۆیشتوون و ئێستا لەکوێن؟ ووتی چوون بۆ ئەحمەدئاوا و سەرگەت. ووتم مامۆستا مەلا عەلی و مەلاشێخ محەمەدی بەرزنجی و مەلا ئەحمەدی بیلانیی و هێزێکیان ئەوەتان لە عەبابەیلێ زۆریشیان لەهاوارەوە بەرەو سەرسنوور بۆ شێخان رۆیشتون. لە ژووری میوانەکەی ماڵی کاک شێخ عیزەدیین دا دانیشتین.

شێخ عیزەدین کوڕی شێخ محەمەدی شێخ عەلیە، لەبنەماڵەی سەیدەکانی هانەسورەی ناوچەی نەورۆلین، هانەسورە ئەکەوێتە باشوری خۆرهەلاتی شاری هەڵەبجەوە، لە هەڵەبجەوە بڕۆیت بۆ ناوچەکەو سەر زێێی سیروان سەرەتا بە بەردەم ئاوایی تریفەدا یان بەنێوان ئاواییەکانی تریفەو حەسەن ئاوادا گوزەر ئەکەیت و دوای ئەوە بەناو ئاوایی پریس دا تێپەڕ ئەبیت، بەهەورازێکی داکەوتەی نزیک بە ٥٠٠ پێنج سەد مەتریدا سەرئەکەوی و لە ملەیەکەوە ئاودیو ئەبیت پێی دەگوترێ ملەی مزیاد، لەودیو ملەکەدا ئاواییەک دەکەوێتە سەر ڕێگاکەت ئەوە هانەسوورەیە، ئەم ناوە هەورامیانەیە، واتە کانی سوور. شێخ عیزەدین چواربرای تری هەیە، شێخ ڕەوف، شێخ نەجمەدین، شێخ نوری و لەتیف.

شێخ نەجمەدین پیاوێکی کورد پەروەرو دڵسۆزە لەکاتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شارەوانی هەڵەبجەدا بەئەندامی ئەنجومەن هەڵبژێردرا، لەوکاتەدا بزووتنەوەی ئیسلامی دەستی بەسەر هەڵەبجەدا گرتبوو، شێخ نەجمەدین هەوڵی ئەدا بۆئەوەی جیاوازی و غەدر لەخەڵک نەکرێت، پیاوێکی حیزبی نەبوو بەڵام دۆستی ئێمە و مام جەلالی خۆش ئەویست.

دواجار لەلایەن بزووتنەوەی ئیسلامیەوە شێخ نەجمەدین لەگەڵ شێخ عیزەدینی و شێخ نوری برای و چەند پیاوێکی تردا گیران و بردنیان لە تەوێڵە حەپسیان کردن، کاک شێخ نەجمەدین لەبارەی گرتنەکەیانەوە ئەڵێت : هەر دوای ئەوە ئێوە هاتنە ماڵمان، ئێمە هەواڵی کوژرانی زوبێری کوڕی مامۆستا مەلا عوسمانمان بیست لەبێتواتە، هەروەها گرتنی مامۆستا خۆشی لەلایەن یەکێتیەوە، ڕۆژی دوای چووینە لای کاک شەوکەت و داوامان کرد نامەمان بداتێ، نامەی پێداین بچین بەدوای جەنازەکەی زوبێردا. چووین جەنازەکەمان هێنایەوە، لە هەڵەبجە بەخاکمان سپارد.

دوای ماوەیەک یەکێتی لە هەڵەبجەدا نەما، بزووتنەوە، هاتن من و کاکە عیزەدین و کاکە نورەدینم، هەرسێکمانیان بردو چاویان بەستین، لەدوای ئۆتۆمبێلێکەوە سواریان کردین، ماوەیەک ڕۆیشتین، ئۆتۆمبێلەکە وەستاو دایان بەزاندین، دەستیان گرتین و لەچەند پلیکانەیەکەوە بردینیانە خوارەوە، دەرگایەکیان کردەوەو بردینیانە ماڵەکەوە، چاویان کردینەوە و ئەو شەوە لەوێ بووین، بەیانی کۆمەڵێک هاتن کەلوپەلی ناوماڵەکەیان برد و خاڵیان کرد

تەنها کومباریککیان لەژێر ئێمەدا هێشتەوە، پرسیارمان کرد ئێمەتان بۆ گرتووە؟ ووتیان ئێمە نازانین ، پرسیمان ئێرە کوێیە؟ یەکێکیان ووتی نازانین، یەکێک دەنگی هات لەدەرەوە ووتی تەوێڵەیە و ئەمەش ماڵی حەمەی حەمەسەعیدە کردومانە بەزیندان.

ئەوەندەی نەبرد، ئەحمەدی مەلەکیشیان هێنا بۆ لامان، شەو منیان بانگکردە دەرەوە، ووتیان بۆچی بوویت بە جەلالی، ووتم باشە ئەوا من جەلالیم، ئەی براکانم بۆ گیراون؟ ووتیان ئێمە نازانین. ووتم ڕاست ئەکەن ئێوە نازانن، ئەو شەوە منیان زۆر ئەشکەنجەدا، دوای من ئەحمەدیشیان هێناو زۆریان لێدا، من زۆر گوێم لێ نەبوو بەرگەم ئەگرت، لەدڵا ئەموت کاکە عیزەدین و کاک نورەدینم بەرگە ناگرن. منیان بردەوە بۆ ناو ماڵەکەو کەمێک حاڵم پەرێشان بوو، ئەوەندەی نەبرد ئەحمەدی مەلەکیشیان هێنایەوە بەر دەرگاکەو یەکێک پاڵی پێوەنا بەدەما کەوتە سەر زەوی و دەستی کرد بەناڵە و هاوار کردن، دوای ٣سێ شەو هاتن و بردینیان، بەچاو بەستراوی، هەندێک ئەملاو ئەولاو دابەزین و سەرکەوتنەویان پێکردین و دواجار بردینیانە جێگەیەک چاویان کردینەوە، ووتیان مامۆستا داوای کردوە، ئەتان بەین بۆلای، کڵاو جامەدانەکەی منیان بردبوو، بردینیانە بەردەم ماڵەکانی باقی هەورامی، دەرگایان کردەوەو چووینە ژورەوە.

مەلا عەلی دانیشتبوو سڵاومان کرد و دانیشتین، ووتی ئەوە کوا کڵاو جامەدانەکەت؟ ووتم تۆ ئەزانی. حەمەکەریمی فەرەج لەوێ بوو، لە پشتیا جامەدانەیەکی کردەوەو ووتی ئەوە ببەستە بەسەرتا، ووتم نامەوێت ووتی تازەیە و پاکە بیبەستە. تاماوەیەک ژوورەکە بێدەنگە وەک تەعزیە، ووتم بەمەلا عەلی بۆ قسەناکەیت، ووتی لەداخی ئێوە لێرە نەبووم ئێوەیان گرتووە، ووتمان تۆیت، کەسی ترنییە، خۆت ئێمەت گرتووە و لێرەش بوویت. لەوکاتەدا تەماشامان کرد ئەحمەدی مەلەکمان لەگەڵ نییە، ووتمان ئەی ئەو پیاوە کوا؟ ووتی حەقتان نەبێ ئەوە شەریکی ئێوەنییە، ئەوە جەلالیە، ئێوە دۆستن، ووتمان وەڵا دۆستنین و ئەو پیاوەش شەریکمانە و ئەبێ ئەویش بهێنن. نەیان هێناو ئێمەیان ناردەوە بۆ هەڵەبجە و لەوێ بەریان دایین، کەچی دوو ڕۆژ دواتر ئەحمەدی مەلەکیان ئازاد کرد.

بەڵـی هەوا تـاریکی کربـوو، لەکـاتی لەکـاتی کۆبـوونەوەکەدا شـێخ نەجمەدینی برای شـێخ عیـزەدین هـاتوو دەرگـاکەی کردەوە دوو چەکداری بزووتنەوە لە بەردەرگاو لەناو حەوشەکەدا وەستابوون، ووتی ئەمانە هاتوون خۆیان تەسلیم بکەن، بەناو ئاوەڕۆی ئەو گەڕەکەدا هاتبوون، پەڕۆی زەردیان بەستبوو بەلولەی تفەنگەکانیانەوە بۆئەوەی پێشمەرگەکانی یەکێتی وابزانن پـارتین، کـاک شـەوکەت قسـەی لەگەڵ دەکـردن، ووتـی لەکـوێ بـوون وا شپرزەن؟ ووتیان لەڕاو بووین، پرسی هیچتان کوشتووە بۆمـان؟ ئەوانیش کەوتبوونە ناو ئاو جلو بەرگ و کەوشەکانیان تەڕ و قوڕاوی بوو بوون، لەترسانیشـدا هەڵ ئەلەرزیـن نەیـان ئەزانـی چـی وەڵام بـدەنەوە، منـیش بە ئاماژەی برۆ بەکاک شەوکەتم ووت وازیان لێبهێنە، ئەویش بە شێخی ووت با چەکەکانیان بدەنە دەست پێشمەرگەکان و بیان بەن، شێخ نەجمەدین ووتی نا نابێت بەریان دەن بابڕۆن، کاک شەوکەت ووتی با لەودیوبن تادوایی.

دوو چیکـدارەکە بەتەمەن بـوون، کـاک شـەوکەت پرسـی چیـان لـێ بکەین؟ منیش ووتم مادام پەنایان هێناوە بۆ ئەمماڵە، چەکەکانیان بدەرەوە و بیاندەرە دەسـت شـێخ و بڵـێ بابیانفرۆشـن بۆمناڵەکانیـان و لەمـاڵی خۆیـان دانیشن. کاک شـەوکەت لەوێدا ووتـی باشـە، ئیتـر نـازانم دوایـی چەکەکـانی دابوونەوە یاننا. چەکدارەکان یەکێکیان حەمەرەشیدی کاکە خـانی ئیمـامی و ئەویتریشیان کوڕی کەریمی عەبدولقادری حەمەوەیسی سەراوی بوو، جگە لەمانە دواتر زانیمان هەر ئەوشەوە چەندین کەسێتری سەر بەبزووتنەوەی ئیسلامی پەنایان بۆماڵی شێخ عیزەدین بردوەو لەوێ خۆیان شـاردوەتەوە، چەند خزمێکی خێزانی شێخ بوون لەوانە: تەوفیقی حاجی حەمەسالحی هانە سـورەیی، عوسـمانی حـاجی عەلـی عەزەی نـادر چورەسـانەیی و.........تـاد . ئەوشەوە بزووتنەوە بەشێکیان چووبوونە دەڵەمەرو عەبابەیلێ، لەوێشەوە بۆ هەوراما‌ن، بەشێکیشیان چووبوونە خورماڵ.

بەیانی ١٢/٢٩ لەبارەگای شارەوانی کۆبوبووینەوە، خەڵکی هەڵەبجە هەموو خرۆشابوونە ئەوێ، نیوەی خەریکی شادی و نیوەی داواکاری و ئیشوکاری جۆراو جۆرو جیاواز جیاوازیان هەبوو، خەڵکێکی زۆریـش شـکات و گلەیـی وگازنـدەیان هەبـوو. لەکۆبـوونەوەکەدا کـاک شـەوکەت پێشـنیاری کـرد مـن دانیشم و لەجێگەی قائیمقامدا ئیشوکارەکانی خەڵک ئەنجام بدەم.

لەوکاتەدا چەند پیاوێکی هەورامی هاتن و ووتیان هێزێکی بزووتنەوە چووەتە هەورامان دەیانەوێت بچنە ناو تەوێڵە خەڵک نەیانهێشتووە، ووتیان فریاکەون هێزێک بنێرن بەدەم خەڵکەکەوە. باسمان کرد کێ بڕوا چۆن بڕۆن کەس نەبوو، چوونکە هێزەکان بڵاو بووبوونەوە. پیاوەکان کەزانیان بارودۆخەکە وایە، بەمنیان ووت باوکت و کۆسار و شیروانی برات، بەتەنها لەگەڕیاتن لەسەر جادەکەدا سەنگەریان گرتووە، فریایان کەون، منیش بەکاک شەوکەتم ووت من ئەچم بۆ هەورامان، ئیشوکاری قایمقامیەت بسپێرە بەکەسێکی تر، هەرچۆن بوو نزیکەی ٥٠ پەنجا کەسێکم کۆکردەوەو جێبێک کەتۆپێکی ١٠٦ سەدو شەشی لەسەر بوو لەگەڵ خۆم برد و جادەو جادە ڕاست تاچوینە ئاوایی بەڵخە کەسمان نەبینی.

تەنها لە بیارە هەڤالانی پارتی لێبوو. لەنێوان بەڵخەو سۆسەکان لەو جێگەدا ئاودیو ئەبیت بەرووی سۆسەکان و سنووری ئێران و عێراقت لێوە دەرئەکەوێ، پێی ئەوترێت کەلی تەوەن چەخماخ، ئەم کەلە یان ئەم ملە لەرووی سەربازیەوە ئەهمیەتی خۆی هەیە، بزووتنەوە لەهەڵەبجەوە هەڵکەندراون ژمارەیەکی کەمیان بەرەو هەورامان ڕۆیشتون، لەم ملەدا پێشتر بزووتنەوە ڕەبیەیەکیان هەبووە، ئەمانیش لایان ماونتەوە و دامەزراون. لەوکاتەدا یەکێتی لەهەڵەبجە و خورماڵدا شکاوین، لەناو شارەدێی تەوێڵەدا کەرتی ڕێکخستنی سەربەکۆمیتەی خورماڵی لێیە، چەند پێشمەرگەیەکی دێرینیشماڵیان لەوێیە، لەوانە کاک حەمەسەلیم فەتح لله، رزگار محی الدین، شەهید ساحیب جەعفەر و باوکم و....تاد . خەڵکی تەوێڵە ئەوکات ٩٠٪ لەسەدا نەوەد ئەندام و لایەنگری یەکێتین، زۆربەی زۆریشیان چەکیان هەیە. تەوێڵە دابڕاوە لێمان، بۆخۆیان تەشکیلاتیان کردووە و پارێزگاریان لە ئاوایی و دەورو بەری کردووە.

چەندجارێک بزووتنەوە هەوڵی داوە بچێتە سەریان نەیان توانیوە، بۆیە بزووتنەوە ئەوانەشیان چوونەتە ناو ئێرانەوە لەخوار تەوێڵەوە لەلای ئاوایی سۆسەکانەوە ئاودیوی سنوور بوون.

ئەم هێزەی خەڵک جگە لەوەی بەرگریان کردووەو شارە دێکەیان پاراستووە حەوت دیلی بزووتنەوەشیان لابووە، دیلەکان لەئوردوگاکانی ئێرانەوە گەڕاونەتەوە بەبێچەک لە تەوێڵە خەڵکەکە گرتبوونی، ئێوارەی ٢٨ /١٢/١٩٩٣

هەواڵیان زانیوە بزووتنەوە لە هەڵەبجە و دەورو بەریدا شکاون، هەوڵیان دابوو بێنەسەر ئەم ڕەبییەی بزووتنەوە لەگەڵی تەوەن چەخماخ لەدەستەی هێرش بەرەکەیان پێشمەرگەی دێرین ساحیب جەعفەر شەهید دەبێت، بۆیە ئەگەڕێنەوە.

شەوی دواتر لەدیوی ئێرانەوەو لەچۆمی دزاوەرەوە( ئاوایییەکی کوردستانی ڕۆژهەڵاتە) پەلاماری تەوێڵە دەدەن بۆ ڕزگار کردنی دیلەکانیان بەلام سەرکەوتوو نەبوون و شکابوون و گەڕابوونەوە، تەنها ژنێکیان بریندار کردبوو بەناوی منیرە حەمەسەعید ڕۆستەم، ئەویش خێزانی شەهید ساحێب جەعفەر بوو.

ئێمە ئەو ئێوارە واتە ١٩٩٤/١٢/٢٩ کاتێک گەیشتینە بەڵخە، گوێمان لەتەقە بوو لەنێوان بەڵخەو سۆسەکاندا، لەبازگەکەی ئێستاو گومرگدا، گەیشتمە هەڤاڵانی پێشڕەو، زەردەی سەر ڕووی دیوی ڕۆژئاوایی سەر قوللەکان لەئاوا بوون و نەبوون دا بوو، پرسیم چیی هەیە؟ ووتیان ئەورەبییەی بەو گرەدەوە تەقەی کردووە، ئەوبەرزایییەی بەرامبەرمان لە پشتی جادەش چەکداری پێوەیە. پێشمەرگە بەئاڕ بی جی و ١٠٦ ملیمەکە چەند گولەیەکیان هاوێشت بۆ ملەی تەوەن چەخماخ و لوتکەی پشتی جادە، ئەوانیش وەلامیان داینەوە، پێشمەرگەیەک بریندار بوو بەناوی مدریک دەگاشێخانی، ئێوارە وازمان لێهێنان و گەڕاینەوە بۆ ئاوایی بەڵخە تا تاریک بکات.

کەتاریکی کرد برادەرانی فەرماندە مەفرەزە و دەستەکانم بانگ کردن، خێرا چەند کەسێکیان ئامادە بوون، دوو دەستەمان دروست کرد، دەستەیەک لەخوار جادەوە بەجادەی کۆندا نارد، ئەمانە سەباحی مەحمود بەگ پێشیان کەوت، ئەبێ بچنە خوارەوە و لەشوێنێکی نادیاری ڕەبیەکەوە سەرکەون بۆی، دەستەیەکیش خۆم بەرپرسی ئەبم، تاریکی کرد ڕووبەڕوو ڕەبیەکە بەجادەدا ئەڕۆین، کاتێک لێیدرا و تەقە دەستی پێکرد لەهێزەکەی کەماوەتەوە لەدواوە، دوو دەستەی تر جیاجیاو لەسەرەخۆ بەدوای دەستەکەی ئێمەدا بێن.

ئێمە بەنهێنی و بەپەنا و پەسوێدا گەیشتینە ئەو شوێنەی ڕەبیەکەمان لێوە دەرئەکەوت، دنیا تاریکە، بۆخۆمان لەمبەر و لەوبەری جادەکەوە بێ

دەنگ دانیشتین و گوێمان ڕادێراوە بۆبیستنی سەداو چرکەیەک، چاوەڕێی ئەوەین دەستەکەیتر کە لەخوارەوە ناردومانە و لەپشتەوە ڕا بێنەوە و بگەنە سەر ڕەبیەکە. لەکاتی چاوەڕوانی و بێدەنگیدا، لەناکاو خرەی ڕاکێشانی میلی چەندین کلاشینکۆف بەجارێک مەنی شەوەزەنگەکەیان شلەقاند، کێن دەست بەرزکەنەوە؟ ئێوەکێن؟ لەباتی وەڵام وەرگرتنەوە، چەند دەست ڕێژی گوللەیان لێکردین، هاوکات و بێدواکەوتن هەڤاڵانی دەورووبەرم وەڵامیان دانەوە، کاتێک چەند هەنگاو بۆ جێگە قایم کردن هاتینە دواوە، تارمای کەسێک لەشوێنەکەمان دا جێما، دەستی هەڤاڵێک کەلەتەنیشتمایە ئەگوشم و ئاماژە بۆ تارمای و تاپۆکە دەکەم، تێناگا ناچار ئەڵێم ئەوە کێیە نەهاتە دواوە، دەڵێت نازانم، بەچەندکەس ئەڵێم وریابن بادەستان لەکاردا بێت، بەرامبەرەکانیشمان بێدەنگن، لەوانییە ڕایان کردبێتەوە بۆ ناو ڕەبیەکە.

لەگەڵ برادەرەکەم نزیک بووینەوە لەتارماییەکە، هەڤاڵێکمانەو گوللەیەک بندەستی سمیوە، هەستە بابڕۆینە دواوە کاک حەمە بڕۆ من خۆم دێم، ئەتوانی؟ بەڵێ هەستاو چەند مەترێک هاتە دواوە. ئێرە پەناو چەپەکە، کەدید نادا بۆ دوژمن، پێشمەرگەیەکم نارد بڕواتە دواوە بەئەمیری شێخ جەلال بڵێت ئۆتۆمبێلەکەی بەچرا خامۆش بهێنێت.

ئەوەندەی نەبرد ئەمیر لەدوامانەوە وەستا، بریندارەکە کوڕێکی چاونەترس و زرنگە، ناوی فاروق ڕەزا ئاغایە خەڵکی ئاوایی قوڵی متکانی ئێناخی نشینە، ئێستا یاریدەدەری فەوجی فریاکەوتن و بەرگری هەڵەبجەیە. سوارمان کردو ووتم بە ئەمیر مەفرەزەیەک لەگەڵ خۆت بەرەو بیگەیێنە هەڵەبجە. هەرلەوێدا، چاوەڕوانی لێدانی ڕەبیەکەم، لەلایەن ئەو دەستەوە سەباح لەگەڵیان ڕۆیشتوە لەخوارەوە، دەنگیان نییە، کاتێکم زانی ئەبینم کەسێک لەدواوە هاتوو ووتی برادەران گەڕاونەتەوە، زۆرباشە، لەدڵی خۆمدا ووتم تازە ئەیخەینەوە بەیانی.

لەتەوێڵەوە دوو ئەندامی ڕێکخستن هاتن بۆلامان لەپشتەوە بەچیاکاندا هاتبوون. شەو گەیشتن، یەکێکیان مستەفا ناجی بوو، ئێمە ئەودوو هەڤاڵە ئاگاداریان کردین لەهەواڵ و زانیاری ناو شارەدێی تەوێڵە، ئەوکات نەبێسیم نەتەلەفۆن هەبوو لەناو تەوێڵەدا. برادەرانی پارتیش لەبیارەوە نزیکەی ١٥ پانزە پێشمەرگەیان هاتن بۆلامان حامید بیارەییان لەگەڵ بوو، ووتیان ئێمە

وەک خۆمان نەک وەک پارتی، وەک خەڵکی بیارەو هەورامی هاتووین بۆلات، ئەگەر پێویستت پێمانە ئەوە ئامادەین. منیش دوای بەخێر هاتنیان سوپاسم کردن و پێم وتن، ئێستا هیچ لەئارادا نییە بڕۆنەوە بۆ بیارە ئەگەر پێویست بوو ئاگادارتان دەکەم.

شەو کاتێک ئێمە گەڕابووینەوەو خەریکی نان خواردن و پشوودان بووین، مەهدی برام لەگەڵ دەستەیەکدا چووبووەوە بۆ ملەی تەوەن چەخماخ تالەنزیکەوە چاودێری ڕەبیەکانی بزووتنەوە بکات. هەست دەکەن چۆڵەو کەسی لێنەماوە، چووبوونە شوێنەکانیان.

مستەفا ناجی ناردبووەوە بۆ تەوێڵە، دوای ئەو کاوە هەورامی و مەفرەزەیەکی ناردبوون بۆ ناو تەوێڵە، منی ئاگادار نەکردوە،

دوای سەعات ١٢ی شەو ئەمیری شێخ جەلال هاتەوە، هەواڵی فاروقم پرسی وتی زۆرباشە، عەمەلیاتیان بۆ کرد، دکتۆرەکان وتیان سەلامەتە. وتم زۆرباشە. بڕۆن بخەون تابەیانی، وتی کاک مەهدی لەملەی تەوەن چەخماخەو بزووتنەوە لەوێ نەماون و ڕێگای تەوێڵەش کراوەتەوە، چۆن؟بەسواری ئۆتۆمبێل چووم بۆلای مەهدی، گەیشتمە پێشەوە لەسەر جادەکەدا لەکەلی تەوەن چەخماخ، پێشمەرگەی دابەش دەکرد بۆسەرگرد و تەپۆڵکەکانی ئەو دەوروبەرە، چرای ئۆتۆمبێلەکە لێیدا بەرەو ڕووم هات. بەزەردەخەنەوە وتی خۆت تووڕە نەکەی، ترساوم تابەیانی قایمی کەن و بۆمان نەگیرێت، بۆیە هاتینە سەریان، بەڵام کە هاتین کەسی لێ نەبوو، ڕایان کردوەو بەبێ تەقە چۆڵیان کردووە، لەوە ئەچێ هەموو ناوچەکەیان بەجێهشتبێ و چووبنە ئێران. مەفرەزەکەی کەچوبوون بۆ ناو تەوێڵە هاتنەوە ڕزگاری عەزەقوڵ بەرپرسی ئەو خەڵکە چەکدارەی پاسەوانی شارەدێی تەوێڵە و دیلەکانیشیان لەگەڵ خۆیان هێنا بۆ ملەی تەوەن چەخماج.

کەڕۆژ بووەوە، کاک شەوکەتی حاجی مشیرو کاک مەحمود سەنگاوی و هێزێکی تر گەیشتنە لامان، لەبەر ئەوە ئێرانییەکان نەوروژێن، هێزەکەو ئۆتۆمبێلەکانی هەڵگری دۆشکا و تۆپی ١٠٦ سەدو شەشمان لەملە جێهێشت. چوونکە لەسۆسەکانەوە بۆ تەوێڵە بەبەردەم ئەواندا ئەڕۆین، بەهێزێکی کەمەوە چووینە ناو تەوێڵە. سەرەرای ماتەمینی خەڵکەکە بۆ شەهید ساحیب بەشادی وخۆشی جەماوەریی شارەدێکەدا پێشوازی گەرمیان لێ کردین. کاک

شەوکەت مزگەوتی تەوێڵەدا قسەی کردو دیلەکانمان بەخشی بەخەڵکی خۆراگرو بەهیمەتی هەورامان و ئازاد کران، کەسوکاریان لەهەڵەبجەوە هاتن بردنیانەوە.

## ژیانی دوای غەرابوون

ئەو ڕۆژە واتە ۱۹۹۳/۱۲/۲۹تا دوا تانیوەڕۆ هەموو هێزەکە لەتەوێڵەدا مایەوە، لای عەسرەوە، کاک شەوکەت و برادەران گەڕانەوە، بێ ئەوەی دانیشین بەرنامەیەک دابنێین، هەتا خواحافیزیش لەیەک بکەین، هەموو هێزەکەشیان لەگەڵ خۆیان خستەڕێ، ماینەوە من و دەستەی پاسەوانەکانم و هەڤالانی کەرتی ڕێکخستنی تەوێڵە ئەوانیش بەبێچەک، مامۆستا کەریمی حاجی محەمەدو چەند پیاوێک هاتن ووتیان ئەی هێز بەجێ ناهێڵن لەتەوێڵەو دەوروبەری، لەکاتێکدا ئەمانە خەڵکی مەدەنی و هیچ لەباری سەربازی و شەڕەوە نازانن کەچی دەرکیان بەم هەڵەی ئێمە کردووە.

ڕاستیان دەکرد دەبوو ئێمە هێزەکانیش زیاتر بکەین بۆ پارێزگاری ناوچەکە، دەبوو بمانزانیایە ئێران بزووتنەوە دەکاتەوە بەم دیوی سنووردا. بەڵام من بەدیار خەڵکەکەوە ووتم هێز زۆرە، ووتیان کوا هەموو ڕۆیشتەوە بەرەو خوار، بەپەلە چووم بەدوای کاک شەوکەتدا، لەنزیک ئاوایی بەڵخە گەیشتمەوە پێیان، وەستان و من دابەزیم و چووینە کەناری جادەکەوە، ووتم کاک شەوکەت با ۱۰۰سەد پێشمەرگە لێرە بمێنەوە نابێ ناوچەکە چۆڵ بکرێت، ووتی بۆ؟ ووتم ئەوە مامۆستا مەلاعەلی و ئەو هێزەشیان لەسەر سنووری مەڵەخوردی پشتی خورماڵ بووە ئێران لەپشتەوە هێناویەتی و هاتوون بۆلای ئەم هێزەی ئەمشەو لێرەوە چوونەتە ئێران، ئێستا لە ئاواییەکانی شۆشمێ و نەسود و سەرمەرزەکەن، بەرای من ئەیانەوێ بەپشتیوانی ئێران بێنەوە تەوێڵەو ئەم ناوچە بگرنەوە، کەسی لێ نەبێت بەئاسانی دێن و دوایی بۆمان دەرناکرێنەوە، ووتی نا وانییەو ئەوان دەیانەوێت لەولاوە لەلای دزلی و مەڵەخوردەوە پەلاماری خورماڵ بدەنەوە.

منیش ووتم باشە ئێستا ئەگەڕێمەوە بۆ تەوێڵەو ئاگاداری برادەرانی کەرتی ڕێکخستن دەکەم ئەوانیش لەوێ نەمێنن. کاک مەحمود سەنگاوی ووتی کاک شەوکەت مادام وایە باهیچ نەبێت ٢٠-٣٠ کەس بگێڕینەوە، بچنە مەخفەری سۆسەکان و ئەم ڕەبیە چۆلکراوانەی بزووتنەوە. بەڵی هەرچۆن بوو، کاک بەهجەتی حاجی خالی و عەبدوڵای حاجی عومەری عەنەبیان گێرایەوە، بەهجەت لەگەڵ نزیکەی ١٥ پانزە کەس لەڕەبیەکەی نێوان بەڵخەو سۆسەکاندا مانەوە، ئەو ڕەبییەی ئێوارە بۆ ئێمە نەگیرابوو شەو مەهدی چووبووە سەری، عەبدوڵاش لەگەڵ ٧ حەوت کەسدا هاتنە مەخفەرە چۆل کراوەکەی سۆسەکان. ئەم شوێنانە شەوی پێشتر هێزی بزووتنەوەی تێدا بووە.

منیش گەڕامەوە بۆ ناوتەوێڵە، لەوێش جگەلە برادەرانی ڕێکخستن ١٠-١٢ کەس متەفەرقە لای خزم و کەسوکاریان مابوونەوە. ووتمان بەخەڵک ئەوە هێز ماوەتەوە و خەڵک نەترسێ، هیچ لەئارادا نییە. دوای نانخواردنی ئێوارە، فاتیح سۆسەکانی هات بەدوامدا ووتی برادەرانی ناورەبیەکە ووتویانە جموجوڵێکی نائاسایی لەسەر سنوورو لەناو گوندەکانی ئێراندا هەیە، ووتم ئێستا خۆم دێم بزانم چیە، ئەمیری شێخ جەلال و ئاوات گوڵپیم بەجێهێشت ووتم لیرەبن ئێستا دێمەوە، خۆم چووم بەرەو سۆسەکان، سەرەتا چوومە مەخفەرەکە بۆلای عەبدوڵا، پرسیم چی هەیە؟ ووتی لەسەرەوە کاک بەهجەت ئاگاداری کردوین سەیارەی زۆر لەنەوسوودەوە بەرەو شۆشمێ دێن. ووتم ئێوە وریابن هیچ نییە، بائێمە بچین بۆلای بەهجەت، بەئۆتۆمبێل بەبێچرا مانگەشەوێکی ڕووناکە هاتینە سەرەوە، تەماشام کرد ڕاستە ئۆتۆمبێلەکان زوو زوو دێنە سەر سنوورەکەو ئەگەڕێنەوە.

ئەم زانی بزووتنەوە هێزەکەیان کۆکردوەتەوەو لەسەر سنوورە، مامۆستا مەلاعەلی و ئەوانی لای دزلی و ملەخورردیش لەپشتەوە بەناوخاکی ئێراندا هێنراونەتەوە بۆ شارۆچکەی نەوسوودو ئاوایی شۆشمێ سەرسنوور، وە لەخۆ ئامادەکی کردندان بۆگەڕانەوەو هێرشکردنە سەر ناوچەی هەورامان لەقۆڵی تەوێڵەوە، بەڵام نەوا زوو، پێم وابوو بەلانی کەم پاش چەند ڕۆژێکی تر ئەو هێرشە دەکەن، بەپێچەوانەی بۆ چوونەکەی من، هەرئەو شەوە هێرشەکەیان کرد.

من بەبەهجەت و برادەرەکانم ووت هیچ نییە، ئەو چراو چراخانە ئێرانە ئێرانیش دەوڵەتە، دوێنێ شەو ڕۆژانی پێشتر شەڕبووە لەسنوورەکەداو بزووتنەوە بەئاشکرا پاشەکشەیان کردووە بۆ ناو ئێران و ئەو قەرەباڵغی و هاتو چۆ پەیوەندی بەوەوە هەیە، ئێوە وریابن و منیش ناچمەوە تەوێڵە لەئاوایی سۆسەکان ئەخەوم بۆ ئەوەی نزیکتانبم، ئەمە هەڵەیەکە لەو هەڵانەی لەژیانی سیاسی و پێشمەرگانەم دا کردومە، هەرچەندە من بەرپرس نەبووم لەشەڕەکە خۆم هاتووم و متەفەرقەو بێکارم، بەرپرسی مەڵبەند کاک کوردۆ قاسم بەرپرسیاری سیاسی و کاک مەحمود سەنگاوی بەرپرسیاری سەربازی و کاک شەوکەتیش برای گەورە، بەڵام لەکاتی شکاندا ئەم جۆرە قسانە مانایان نییە، هەرچەندە ئێوارە بەکاک شەوکەت و کاک مەحمودم و برادەرانم وتووە: ( ئێوە بەدیار چاو بزووتنەوەوە ئەم هێزەتان گیرایەوە و ناوچەکە چۆڵ دەکەن شتێکی خراپ دەکەن ) .

بەڵام تازە ئەم شەو من بەرپرسیارم لەبارودۆخەکە، دەبوو بنێرم ئەو برادەرانەی متەفەرقە و کەرتی ڕێکخستن لەتەوێڵە کۆبکەنەوەو بیان هێننە بەرزاییەکانی نێوان بەڵخەو سۆسەکان خۆشم لەلای بەهجەت بمێنمەوە و مەخفەری سۆسەکانیش چۆڵ بکەین، تەوێڵەو سۆسەکان لەڕووی سەربازیەوە کەوتون و لەژێر لولەی تفەنگی ئێرانییەکاندان، من ئەمەم نەکرد، دانی پێدا ئەنێم ئیهمال بووم. بۆیە خوێنی ئەو شەهیدانەی ئەمشەو ئازاری زۆری دام.

بەڵی کە لەکەلی تەوەن چەخماخ گەڕامەوە و چوومە خوارەوە، دوبارە چوومە مەخفەرەکەی سۆسەکان لەوێش لەگەڵ عەبدوڵای حاجی عومەر قسەم کردو لای ئەوان دەرچووم شەو درەنگی کردوە، لەئاوایی سۆسەکان خەوتم و نەگەڕامەوە بۆ تەوێڵە، سۆسەکان ئەوکات زۆر ئاوەدان نەبووبووەوە، چەندماڵێک بەدارو بەردو چینکۆی تەحالوف خانۆچکەو سەرپەنایان دروست کردبوو.

لەماڵێکدا خەوتین خاوەن ماڵەکە کاک عەبدولقادر مستەفای ناوە، خێزانی ناوی ئەختەر کچی حاجی عەبدولایە[1] ( حاجی ئەولە). ئێوارە ماڵەکە

---

[1]- دادە ئەختەر ژنێکی دلسۆز و کوردپەروەر بەهیمەت بوو، لەڕێی کوردایەتی و یەکێتیدا زۆر ماندو بووە، بەجۆرێک دلسۆز بوو بۆیەکێتی و مام جەلال، کوڕی خۆی بووەتە

میوانداری عوسمان هەورامی و چەند هاوڕێیەکی دەکەن، شەویش لەوێ مابوونەوە، بۆیە ئێمەش بۆخەوتن چووین بۆلای ئەوان، بەر لەوەی بخەوم لەدڵدا بەرنامەم دائەنا بۆبەیانی بەم شێوە:

کەلەخەو هەستام بچمە هەڵەبجە لەگەڵ برادەرانی بەرپرس قسەبکەم هێزێک کەلە٢٠٠ دوسەد کەس کەمتر نەبێت بهێنینەوە بۆ هەورامان، بارەگایەکی سەرەکی فەرماندەی لەبەڵخە بکەینەوە.......تاد .

نیوەشەو پێشمەرگەی شەهید غەفار فایق کەلەدەستەکەی خۆمدا بوو بەخەبەری هێنام پرسیم چییە؟ ووتی شیروانی برات پاسەوانە دەڵێت، لەپشتی ئاوایی بەرد خلۆر ئەبنەوە، هەستام و چوومە سەر جادەکە لەشیروانم پرسی چی هەیە، ووتی لەسەر ئەم شاخەی پشتمانەوە خەڵکی لێیە، شیروان هەرچەندە منالە بەلام پێشمەرگەیەکی ترسنۆک نییە. برێک گوێمان ڕادێرا هیچ نەبوو، دنیا کشوماتە، سەیری بەرامبەرم کرد گڵۆپەکانی ملەی مەرزو پاسگاکانی ئێران خامۆش بوون، دەبوو بەمەدا بزانم کەبەڵێ بزووتنەوە هێرشەکە ئەمشەو دەکەن.

لەم کاتاندا هێزەکانی بزووتنەوە لەچوارلاوە مەرزیان بۆ کراوەتەوە هاتونەتە ئەمبەری چۆم و هەموو بەرزای و تەپۆلکەکانی زاڵ بەسەر ئاوایی سۆسەکان و مەخفەرەکەیدایە ئەوانی لێی دامەزراون، ئەو شوێنانە هەموو چۆڵبوون و کەسی لێ نەبوو. لەدولاوە هێزیان ناردوە بۆ ئەو رەبیەی نێوان بەڵخەو سۆسەکان، هێزێکیش لە چەندلاوە بۆ سەر سۆسەکان و مەخفەرەکەی.

ئەو هێزەی هاتووە بۆ دەورو بەری ئێمەو مەخفەری سۆسەکان زوتر گەیشتون، چاوەڕوانی ئەوانی تریان کردووە  بگەنە شوێنی مەبەست واتە ئەو رەبیەی کە سریەکەی بەهجەتی لێیە، بەرنامەکەیان ئەوەبووە یەکەم جار لەم خاڵەبدەن و دوای ئەوە هێرش بکەنە سەر ئەوماڵەی ئێمەی لێیە لەگەڵ مەخفەرەکە.

ڕۆژەکەی لەمەرزەوە چاودێریان کردووە  بینیویانە هێزەکان یەکێتی گەڕاونەتەوە تەنها ئەو رەبیەو مەغفەرەکەو ئەم ماڵە پێشمەرگەی لێیە، ئێمەش

---

کاندیدی پەرلەمان لەسەر لیستی گۆڕان دەنگی پێنەدا، بۆیە جێگەی خۆیەتی لێرەدا یادی بکەم و سلاو درود بۆ ڕۆحی نەمری بنێرم، بەتایبەت لەپای هیمەت و ئازایەتی ئەمشەویدا.

شەو چوبووینەتە ماڵەکە، بەڵام عوسمان و هاوڕێکانی کە میوانی ماڵەکە بوون ئێوارە ئەوان بینیبوویانن و بەمەدا زانیویانە ئەم ماڵە خەڵکی لێیە.

پاش چەند خولەکێک شیروانم بەجێ هێشتو گەڕاینەوە خوارەوە بۆ ناوماڵەکە، دوبارە خەووتمەوە، ئەمجار لەزرمەی تەقینەوەی گوللەی ئاڕ بی جی بەخەبەرهاتم، کاتێکم زانی ماڵەکە شڵەژان کەسبەکەس نییە یەکێک بۆ دەرگای دەرەوە ئەگەڕێ و ئایدۆزێتەوە یەکێک بۆ پێڵاوەکەی.....تاد، تاهاتمە دەم دەرگاکەی دەرەوە سێ گوللەی ئاڕبی جی بەرخانوەکە کەوتن، گەڕام پێڵاوەکانم دیارنین، بردبوویانن، پێڵاوێکیان بۆ بەجێ هێشتبووم زۆر گەورە ژمارە ٤٥ زانیم ئەمە هی عوسمانە، هاتینە سەرجادەکە بانگی شیروانم کرد وەڵامی دایەوە ووتی ئاڕ بی جی یەکە لەم لاشانی لای چەپەوەیە بێدەنگم کردوە.هەروەها ووتی: بەئاسۆی و بەدرێژی ٣سێ کیلۆمەتر لەمەرزەکەوە بەچەکی دۆشکاو بی کەی سی کوێرانە گوللەبارانی ئاوایی و سەرجادە و مەخفەرەکە دەکەن.

زوو ئەوبرادەرانەی ئامادە بوون کردمنە دوبەش ووتم بەمەفرەزەیەکیان زوو بەجادەدا بەرەو بەڵخە بڕۆن بۆلای بەهجەتی حاجی خالید. خۆشم وا بەدواتان دا هاتم. بانگم کرد عیسا (عیسا محی الدین) ئەوئوتۆمبێلە بخەرە ئیش، کۆسار ووتی ئوتۆمبێلی چی باڵەوێ بێت بەپێ وەرن، کەووتینەڕێ بەرەو لای عەبدوڵا، من گەیشتمە بەردەم دەرگای سەرەکی مەخفەرەکە لەهەموولاوە تەقەو زورمەیە، عەبدوڵام بانگ کرد پرسیم ئەوان لەکوێوەن؟ ووتی: یەکەمجار لەو ڕەبیەی ئەوسەریان دا ( مەبەستی نێوان بەڵخەو سۆسەکانە) دوای ئەوە ئەوەتا لەهەموولاوە تەقەی کوێرانە ئەکرێت لەسەر هەموو بەرزاییەکان ئەوانی لێیە. چەندین ئاربی جیان دانابوو بەتایبەت لەوبەرەوە لەسەر سنوورەوە ئەیاندا لەمەخفەرەکە.

عەبدوڵاو ٧ حەوت کەس لەم مەخفەرەدا بوون ئەوانیش هاتبوونە دەرەوەی مەخفەرەکە، پێم ووت زوو برادەرەکانت بانگ بکەو بەدوای ئێمەدا وەرە بۆسەرەوە بۆلای بەهجەت ئێرە بەجێبهێڵن، من ڕۆیشتم .

کاتێک گەیشتینە بەردەم ڕەبیەکە شەهید کۆساری برام لەپێشمەوە بوو وەستا ووتم هاچیە؟ ووتی ئەم ڕەبیە گیراوە بزووتنەوەی لێیە، پرسیم چۆن ئەزانی؟ ووتی لەخوارەوە چاوم لێبووە لەڕیبیەکەوە گوللەی گڕدار

بەرەو بەڵخە ئەڕۆن، ئەمە قەلەقی کردم، نزیک بووینەوە مەفرەزەکەی پێشتر ناردبووم لەبن رەبیەکەدا بوون، لەپەنایەکەوە هەموو کۆبووینەوە، دوای چەند خولەک ووتم ٣سێ کەس لێرە بمێننەوە مەیەنە سەرەوە تا ئاگادارتان دەکەینەوە، خۆم کەووتمە پێشی ئەوانی ترو بەجادەدا نەهاتین بەقەدبڕ پێچەکەمان بەجێهێشت. لەسەر جادەکەوە سەرمان هێنایە دیار لەبەرامبەرمان و رووبەروومان لەوبەر جادەکەوە دووکەس لەسەر ئەو رێگای دەچێت بۆرەبیەکە لەسەنگەردان و تەنها سەریان دیارە، لام کردەوە هەڤالان رزگارو فەیسەڵ و کاک فاتیح دەگا شێخانی کاوە هەورامی لەلامدا دانیشتون، بەچوتە ووتم کاک فاتیح تۆو کاوە لێرەبن، رزگارو فەیسەڵ ئێوە وەرن هەستاین و گەیشتینە ناوەراستی جادەکە، هەردوو بەیەکجار هاواریان کرد کێن بووەستن ؟ وەلامم دایەوە خۆمانین، ئێوە کێن؟ ووتم : مام هەڵمەت، نهێنی شەومان مام هەڵمەت بوو، ووتیان بگەڕێنەوە، نەیەنە پێشەوە منیش بەتوڕەییەوە هەنگاوم گواستەوە بۆ پێشەوە و ووتم بڕوانە چۆن ئێستا کە ئەزانن ئێمەین ئازابوون و کەوتنە چەلەحانێ.

لەوکاتەدا کابرا ئەوەندە ترسا ئەمنی کلاشینکۆفەکەی ترازان کەوتە سەر تەکتیرو فیشەکێکی پێوەناین بەرمان نەکەوت. رزگاری عەزەقولو فەیسەڵی مام کاکل بەدەست و برد دایانگرتنەوە تامن گەڕامەوە بۆ لای فاتیح. تازە زانیمان ئێرەش گیراوە، کەووتینە نێوان هێزەکانی بزووتنەوەوە، گەڕاینەوە، ئەبێ رۆژ نەبێتەوە خۆمان دەرکەین بۆلای بەڵخە، رێگا زۆرە و شارەزاین.

بەلام هەرچۆن بووە ئەبێ کەس بەجێ نەهێڵین، ترسی لای تەوێڵەم نییە چوونکە هێزی بزووتنەوە نەچووە بۆ ئەوێ، بەلام دورە بۆ ئێمە. لەو دۆڵەی نێوان رەبیەکەو مەخفەرەکەدا ئەوانی لەناو ماڵەکەدا و مەخفەرەکادا بوبووین تەنها چەند کەسێکمان دیار نییە عوسمانی سۆفی و عەبدولای حاجی عومەر شەهید عومەری حاجی حسێین عەنەبی....تاد . لەوێوە هاتینە خوارەوە بۆسەر جادە کۆنی خاکی. لەوێش دوکەسمان بینی لەدورەوە بانگم کرد عەبدولا ئێوەن هاتن؟ ووتی بەڵێ ووتم وەرن، دوبارە شەهید کۆسار پێشمان کەوت و لەکەلێکەوە هاتین بەم دیودا بەدیوی بەڵخەدا، بەری ئاسۆ رووناکی کرد، لەوێ گەیشتین بەجەماعەتی ناورەبیەکە، برێک قڕەقرم

بەسەردا کردن بۆخۆتان نەگرت تابگەینە لاتان.....تاد ،، تازە بەچی دەچێت.
سەرەو ژوور بووینەوە بۆ ئاوایی بەڵخەو سەرجادە، چووینە ماڵی مام هەڵمەت، ئێوارە لێرە بووە لای دایکی، ووتیان هەرشەو ڕۆیشتوە، دوبارە لەوێ برادەرەکانمان بەسەر کردەوە ٨ هەشت کەس دیارن ئەوانیتر لەبەڵخەشەوە نەوەستاون بۆ هەڵەبجە بەپێ ڕۆیشتون، لێرە دەرکەوت ئەوەی شەو لەباتی عەبدولا وەلامی داوەتەوە ئەو نەبووە، پێشمەرگەیەکی تربووە بەناوی سەید فاروقی سەید حەمەسالح ترساوە لەوەی من بیان نێرمەوە بەدوای عەبدولادا بۆیە بەناوی ئەوەوە وەلامی منی داوەتەوە وتویەتی بەڵێ هاتوین. (شەهید غەفور دەرەشیشی ئەیوت کێو بروخێ ئەتوانی بیگریتەوە، بەلام پێشمەرگە روخا ناگیرێتەوە)، ئەمە مەبەستی لەو پێشمەرگە پارتیزانانە بوو کاتی خۆی لەچیا توانایی پێشمەرگایەتیان نەئەما و تەسلیم دەبوونەوە .

لێرە لەئاوایی بەڵخە تەنها یەک کەس ئوتۆمبێلی هەبوو، کوڕێکی محەمەد بەگ بەناوی تەیمور، ناردم هات بۆلام، ووتم ئەتوانی بچیت تا هەڵەبجە ووتی بەسەر چاو، بەنزینیش دەست ناکەوێ و گرانییە، شەهید کۆساری برام بانگ کردو ووتم کاغەز نییە تانامەت بۆ بنوسم، سواربە لەگەڵ تەیمور بڕۆ بۆ هەڵەبجە کاک قادر کۆکۆیی لەوێیە بیدۆزەرە و روداوەکەی بۆباس بکەو بڵێ کاکەم ووتی زوو هێزێکم بۆ بنێرێت بۆ بەڵخە.

ئەو ڕۆیشتو ئێمەش هەموومان بووینە کەمین لەسەر جادەی بەڵخە سۆسەکان، پێم وابوو مادام بەو شێوە زوو ئێران کردنییەوە بەم دیودا و بەئاسانی و بێ بەرەنگار بوونەوە ئەم شوێنەیان گرت غەرا ئەبن و بەرەو بیارەو هەڵەبجە دێن، بەلام نەهاتن و ئەمان بینی بەقەرەباڵغی هێزەکەیان دوبارە پاشەکشەیان کردەوە بۆناو ئێران و بێشەڕ سنوورەکەیان جێهێشت.
بۆنزیکەی نیوەڕۆ کاک جەمیل هەورامی و هێزێکی باش گەیشتنەلامان، لەسەید سەلام لایاندابوو من هاتم بۆ لایان و حیکایەتەکەم بۆکردن، کاک جەمیل ووتی بائێستا بەرنامەی لێدانیان دابنێین، بردەمەلاوە ووتم لەوە دەچێت پاشەکشەیان کردبێ، پێکەوە چووینەوە بەڵخەو مەفرەزەیەکمان ناردە نزیک سەنگەرەکانی پێشەوەیان نەهاتنەوە خەبەریان داینێ بزووتنەوە لێرە نەماون چۆڵیان کردوە، کەچوینە شوێنەکە، تەرمی (٥) پێنج پێشمەرگەی خۆمان دۆزیەوە، کەسەر بەسریەکەی بەهجەت و فەوجەکەی هەڵەبجە بوون، بەدیلی شەهیدیان کردبوون.

ئەمە ئەو پێشمەرگانە بوون بەدیلی شەھید کرابوون ١- لاوەران رەحمان ولەوخان ھاواری، ٢- شەریف بەکر عەلی ئێناخی، ٣-عەبدولرەحمان قادر، ٤- حسێین نەورۆڵی، ٥ -مستەفا جۆلانەیی. دیارە زۆرجار بەرامبەر بەدیل و تەرمی ئەو قوربانیانەی ئەکەونە بەردەستی لابەشەڕ ھاتوەکانەوە، دوور لەبەھا مرۆڤایەتیەکان، بەدەر لەویاساو ڕێسایەی دانراوە بۆ معامەلە کردن لەگەڵ دیل و تەرمی قوربانییەکان، کرداری ناپەسەند ئەنجام ئەدرێت، لەوانە شێواندنی دەم و چاوی قوربانییەکان، گوێو لوت بڕین و......تاد، ئەوتا تازەش دنیا بینی ھێزێکی وەک دەوڵەتی ئیسلامی لەعێراق و شام، نەک تەرمی قوربانی بەمردوویی بشێوێنن ، خەڵکی بەزیندوی چاو دەردەھێنن و گوێ و لوت و زمان ئەبڕن و لەسەر بەرزایی فڕی ئەدەنە خوارەوە و لەناو قەفەزدا دیل ئاگر تێبەرئەدەن.

بەڵی ئەم چوار شەھیدەش دەم و چاویان شێواندبوون، کەخەڵک زانی و دەنگو باسەکە بڵاو بووەوە، بزووتنەوە لەڕاگەیاندنی خۆیەوە بەفەرمی بڵاوی کردەوە، ئەوە ئێمە نەبووین بەڵکو ئەوە جەمیل ھەورامی بووە ئەو گوێ بڕینەی ئەنجام داوە، بۆئەوەی بزووتنەوە تاوانبار بکرێت .

ئەو٤ چوار ھەڤاڵیش ڕۆژ بووبووەوە خۆیان تەسلیم کردبوو، ئەوانیش عەبدوڵای حاجی عومەر، عوسمان سۆفی، مدریک دەگاشێخانی و عومەر حاجی حسێین بوون . سەبارەت بەدیل کردنەکەیان عەبدوڵای حاجی عومەر کەئێستا ئەفسەری ئاسیشەو لەشاری ھەڵەبجەیە ئاوا ئەیگێڕێتەوە دەڵێت: (( ئێمە لەمەخفەرەکەوە ھاتین لەڕێگا لەگەڵ عومەر دواکەوتین و عوسمانمان بینی، لەنزیکی ڕەبیەکەدا گوێمان لەقرەقرەکەی ئێوەو بزووتنەوە بوو، کەئێوە گەڕانەوە دواو چوونە خوارەوە، ئێمە ئێوەمان بینی وامان زانی بزووتنەوەن، خۆمان پەنادا، ڕۆژمان لێبووەوە چووینە ژێر پردێکی جادەکە، تانیوەڕۆ تەحەمولمان کرد، عومەر سەرەتا ھاتەدەرەوە، من و عوسمانیش بەدوایدا، لەوکاتەدا کەس لەوناوە دا نەبوو.

بەجادەدا ھاتین بۆ پێچی بەردەم ڕەبیەکە، یەکەم کەس بینیمان کاک قاسمی مەلا مستەفا بوو ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزووتنەوە، ئێمەی نارد بۆ سەرپردی تەوێڵە مەرزی شۆشمێ، کاک حەمەی مەلا عەلی ئێمەی گێرایەوە بۆ مەخفەری سۆسەکان، لەوێ کاک کامیلی حاجی عەلی ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزووتنەوەی لێبوو. تا کاتژمێر ٧ حەووتی ئێوارە ماینەوە لوقمان عەزیزیشیان گرتبوو لەتەوێڵەو ھێنایان بۆلامان، دوای ئەوە ئێمەیان برد بۆسەر سنوور، مامۆستا مەلا عەلی و مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئێلانپێ (یەلانپێ) لەوێ بوون، بەرلەوەی بگەینە لای ئەوان ویستیان بمان کوژن پاڵیان داین بەدیوارێکەوە چاو دەستمان بەسترا بوو شایەتومانیان پێهێناین،

بەلام بوورهانی حاجی غەفور پالانەی چەکداری ئەوان بوو کردی بەدەنگە دەنگ و حاجی کامیلیش فریامان کەوت ئەگینا ئەیانکوشتین.

عوسمان بەمامۆستا مەلا عەلی ووت من کوڕی سۆفی حەمەکەریمم، کاتی خۆی تۆ لەتەوێڵە لەماڵمان بووی، ئەویش ووتی مەلعون بەڕاست کوڕی ئەو پیاوەی؟ ووتی بەڵێ. لەوکاتەدا هەموو هێزەکانیان کەنزیکەی ٤٠٠ چوارسەد کەس ئەبوون، بەکۆمەڵ بەرەو سنوور هاتن و چوون بەودیودا، ئێمەشیان بەردا و گەڕاینەوە بۆتەوێڵە. ئەوشەوە لەتەوێڵە بووین و ئەوەبوو بەیانی هاتینەوە بۆلای تۆ بۆ سۆسەکان)) .

ئەمەش زیانی دوای غەڕابوون و ئەوبێ بەرنامەییە بوو، چەندین جار ئەوەمان بەسەردا چەندبارە بووەتەوە و هێزەکانی یەکێتی دەرس و پەندمان لێ وەرنەگرتووە.

دواتر چەکدارێکی بەشداری ئەم شەڕە، وازیهێنابوو لە بزووتنەوە، هاتەلام و ووتی: ئەو ڕۆژەی ئێوە هاتن بەرەو هەورامان، شەوەکەی ئێمە لەسەروی خۆمان ئاگادار کراین پاشەکشە بکەین و بچین بۆ شۆشمێ. ڕۆژی دوایی چەندین کەسمان لەسەر سنوورەکەوە بەدوربین چاودێریان دەکرد، ئێمە ئەمانزانی هێزەکەی ئێوە گەڕاوەتەوەو تەنها مەجموعەیەکی کەم ماون ، بڕیار نەبوو ئەوشەوە هێرش بکەین، ئێرانییەکان وەک شێوە دەرکردنێک ئێمەیان کردەوە بەم دیودا، بەقسەی بەرپرسەکان ووتیان وتویانە یان چەک دابنێن و بێن بچن بۆئوردوگا یان ئەوە ناوچەکەی خۆتان چۆڵ بووە بچنەوە.

هەروەها ئەیوت کاتێک تۆ لەتەوێڵەوە بەسەیارەکە هاتیت بۆسۆسەکان، مەفرەزەی ئێمە گەیشتبووە سەر جادەکە، بەجیهاز ووتیان لەم سەیارە بدەین، لەوبەرەوە وەلامیان دایەوە ووتیان نا بابەرنامەکەمان تێک نەچێت باهەموو هێزەکان بگەنە جێگاکانی خۆیان، ڕۆژی دوای زانیان ئەو سەیارە تۆبوویت، بوو بەداخێکی گەورە بۆیان.

شەوی دواتر نامەیەکم نوسی بۆ کاک ملازم عومەر عەبدولا کەئەوکات سەرپەرشتیاری مەڵبەندی یەکی سلێمانی بوو، ئەمەی خوارەوە بەشێک لەناوەڕۆکی نامەکەیە: (( کاک عومەر بەپێویستم زانی ئاگادارت بکەم، بزووتنەوەی ئیسلامی بەکەڵک وەرگرتن لەوهاوکاریەی ئێران، وەبەهۆی لەباربوونی هەڵکەوتەی جوگرافیایی سنوورەکە، مەبەستم هەڵەبجەو

هەورامانە، هەروەها بەهۆی ئەو پێگە جەماوەرییەی هەیانە بەتایبەت لەناو هەڵەبجەو ناحیەی خورماڵدا. لەوە دەچێت بۆ دوارۆژ ببنە ئەرقەڵەو کۆسپ لەبەردەم پرۆسەی سیاسی و حکومەتدا. بۆیە داواکارم ئەم پێشنیارەم لەکۆبوونەوەی خۆتاندا بخەیتە بەردەم جەنابی بەڕێز مام جەلال و مەکتەبی سیاسی کە یەکێتی نیشتیمانی لقێکی سەرکردایەتی بهێنێتە ناوچەکە لەئەحمەد ئاوا یان لەبیارە دابنێ و هێزی زیادەش بهێنێ بۆ سنوورەکە لەوهێزەی کەلەسلێمانی زیادە، لەبیارە چەندین بینایەی حکومەت هەن چۆڵن، شوێنەکەیان ستراتیجی و گرنگە ئەتوانین نۆژەنیان بکەینەوە و بەکاریان بهێنین بۆ ئەو مەبەستە ....تاد)).

## پارتی و بەگژدا چونی سۆشیالیست 1993/12/11

یەککرتنەوەی هەرسێ لایەنی سیاسی، یەکەم: پارتی گەل بەڕابەرایەتی کاک سامی عەبدولڕەحمان، دووەم: حزبی سۆشیالیست بەرابەرایەتی کاک ڕەسوڵ مەمەند و کاکە حەمەی حاجی مەحمود و کاک د.مەحمود عوسمانیش نزیکیان و لەوبارەوە ڕاوێژیان لەگەڵ دەکرد، سێیەم: پاسۆک بەرابەرایەتی کاک ملازم شوان و ملازم کەریم، لەڕۆژی ١٩٩٢/٨/٢٠دا لەهۆڵی میدیای شاری هەولێر لەکۆنگرەیەکی بێبەرنامەو ئاڵۆزدا [1]، کەتارۆژی ٨/٢٧ ی خایاند بەحیساب یەکیان گرتەوەو بوون بەحزبی یەککرتن. هەرسێ لایەنی یەککرتن، لەڕۆژی ١٩٩٣/٨/١٦دا لەکۆنگرەیەکدا بەناوی گۆنگرەی یەککرتن کەدەکاتە ساڵڕۆژی دامەزراندنی پارتی دیموکرات، لەگەڵ پارتیدا بەڕابەرایەتی کاک مەسعود بەرزانی، یەککرتنەوەیەکی تریان کرد. ئەم کۆنگرە گرنگی و سەدایەکی گەورەو بەرچاوی هەبوو لەوکاتەدا، گرنگ بوو بەتایبەت بۆ پارتی لەناوچەی سۆران و بەتایبەتیتر لەدەشتی شارەزووردا. ئەو کۆمەڵە کادرو فەرماندانە، پاشماوەی حزبی سۆشیالیست و لەگەڵیشیدا کەسایەتی کاکە

[1]– بڕوانە ڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەک، بەرگی چوار، لاپەڕە ١٠٧ تا ١١٥ لەنوسینی کاکە حەمەی حاجی مەحمود

حەمە خۆی ببنە پارتی. بۆیە ئەڵێم پاشماوەی سۆشیالیست پێشتر بەشێکی زۆری حزبەکە لەگەڵ کاک رەسوڵ مەمەندداد دوای کۆنگرەی رۆژی ١٩٩٢/٨/٢٠ لەسەر پرۆسەی دەنگ دانەکە لەنێوان خۆی و دکتۆر مەحمود و ملازم شوان و سامی عەبدولڕەحمان دا، بۆ ئەنجومەنی سەرکردایەتی حزبی یەکگرتن ناڕازی بوو، دوبارە سۆشیالیستیان، راگەیاندەوەو دواتر هاتنە ناو یەکێتی.

ئەم یەکگرتنەوەی کاک سامی و کاکە حەمەو کاک ملازم کەریم، لەگەڵ پارتی، لەمیدیاکانی پارتیەوە، سەرو سەدایەکی بەرچاوی لەهەولێرو سلێمانی و ناوچەکانیتری کوردستاندا لێ بەرپا کرا، چەندین کۆڕو کۆبوونەوەو گردبوونەوەو هەتا خۆپیشاندانی جەماوەرییشی بەشێوەیەکی بەرچاو لێ نیشان درا، لەخۆنیشاندانەکاندا دەیان لافیتەو نوسراوەی جۆراو جۆریان نمایش دەکرد، یەکێک لەو دروشمانەی لەناو خۆپیشاندانەکەدا کەسێک بە بڵندگۆ دەیوت و حەشاماتەکە بەجارێ بەدوایدا ئەیانوتەوە ئەمەبوو: ( زەردو شینی ئاسمانی کاکە حەمەو بەرزانی)، دیارە لەکوردستان دا هەموو یەکگرتنەوەیەک سودی خۆی هەیە، یەکەم لەبەرژەوەندی ئەو حزبانەیە کەیەکگرتنەوەکە ئەنجام دەدەن، دووەم لەبەرژەوەندی گشتی دایە. بەلام بەراستی ئێمە وەک یەکێتی بۆ کاکە حەمە پێمان ناخۆش بوو، منیش بۆخودی خۆم زۆرم پێناخۆش بوو بۆکاکە حەمەی حاجی مەحمود.

بۆ، بۆ کاکە حەمە؟ چوونکە ئەمانزانی کاک سامی و پارتی گەل، دواجار هەرئەبێ بگەڕێنەوە بۆ ناو پارتی، ئەوجەماوەرەی پارتی گەل هەیبوو، دوجۆربوو، ئەوەی بادینان دەنگیان هەر بۆ پارتی بوو، ئەوەی سۆران بەشێکیان دەنگیان بۆ پارتی بوو، بەشێکی بەرچاویان دوای گەڕانەوەکەی پارتی گەل بۆناو پارتی دەنگەکانیان ئەگەرایەوە بۆ یەکێتی نیشتیمانی.

پارتی گەل لەشاخ وەزن و کاریگەری خۆیان هەبوو لەمەیدانەکەدا، دوای راپەڕین و ساڵی ١٩٩٢ بەلیستی سەربەخۆی خۆیان دابەزین بۆ پەرلەمانی کوردستان، پارتی بەرنامەیان هەبوو لەکاتی بانگەشە بۆ لیستەکەیان بیان شکێنن، ئەوەبوو لەشاری دهۆکدا پارتی بەرنامەکەی جێبەجێ کردو بەشێوەیەکی دوور لەیاساو رێسای حیزبایەتی و هەڵبژاردن، کاک سامیان لەکاتی پێشکەش کردنی ووتارێکدا، تەماتە باران و هێلکەباران کرد و نەیان هێشت ووتارەکەی تەواو بکات، لێرەوە کاک سامی تێگەیشت

کەئیتر ناتوانێت پارتێکی سەربەخۆ ئیدارە بدات. پاسۆکیش لەگەڵ ئەوەدا کۆمەڵێک کادری رۆشنبیرو کوردپەروەری پاک بوون، بەلام لەناوجەماوەردا قورساییان نەبوو.

سەبارەت بەکاکە حەمە جگە لەوەی خۆی کەسایەتیەکی خەباتگێرو تێکۆشەرو خۆشەویشتە، هەمیشە لەکاتی تەنگانەو هەڵوێست وەرگرتندا، لەگەڵ مام جەلال و یەکێتیدا بووە. ئەمە بۆ ئێمە گرنگی خۆی هەبوو. لەلایەکی ترەوە حزبی سۆشیالیست لەدروست بوونییەوە لەناو جەماوەری کوردستاندا خاوەنی سەدان شەهیدی فەرماندەو سەرکردەی قارەمان و دیاری ناوچە جیاجیاکانی سۆران بووە، لەناوچەکەدا چەند هەزار دەنگێکی هەیە هەرکەس وارسی سۆشیالیست بێت، ئەو هەزاران دەنگە هی ئەو دەبێت، ئەوکاتەو ئێستاش ئەو دەنگانە دەنگی کاکە حەمەن، پێناخۆش بوونەکەی من لەمەوە سەرچاوەی گرتبوو.

بەڵێ پاش ماوەیەکی کەم لەدوای ئاهەنگ گێڕان و شیرینی خواردن و خواردنەوەی ئەم یەکگرتنە، کاکە حەمە پاشەکشەی کردو دوبارە لەرۆژی١٩٩٣/٩/٦دا سەربەخۆی حزبی سۆشیالیستی راگەیاندەوە. بەلام نەبەو سەنگ و قورساییەی پێش یەکگرتنەکە، چوونکە بەشێکی بەرچاو لەکادرەکانی سۆشیالیست لەیەکگرتنەوەکەدا لەناوپارتیدا پۆست و پلەو ئیمتیازیان بەرکەوت و لەگەڵ کاکە حەمە نەگەڕانەوە، کە کاکەحەمەش گەرایەوە، ئەو کادرانەی لای پارتی مانەوە، پارتی زیاتر گرنگی دانێ، ئەوانیش ئەیانزانی دەست کەوتەکانیان لای پارتی و لەو کۆنگرەدا لەسایەی کاکە حەمەوەیە، جارێکی تر ئەم هەلەیان دەست ناکەوێ، ئەمانە بۆ خۆیان بەرای من عاقڵانە لای پارتی جێگیر بوون.

سەبارەت بەکاکە حەمە خۆی و چوونەکەی بۆناو پارتی، بەبۆ چوونی من هەڵەیەکی مێژوویی کرد، من نەم ئەزانی هۆکاری پاشگەزبوونەوەو گەڕانەوەی کاکە حەمە لەپارتی چیبوو، قسەیەکی باو هەیە سەبارەت بەکاکە حەمە، کەئەوترێت کاکە حەمە هەمیشە حەز ئەکات مەسئولی یەکەم و کەس بەرپرسی نەبێت، بەرای من ئەمە هۆکاری یەکەم نییە بۆ پاش گەزبوونەوەکەی، هۆکاری سەرەکی رەنگە روگیر کردنی بووبێت لەلایەن دۆستەکانییەوە. چوونکە کاکەحەمە هەم دۆستی دەرکی و هەم دۆستی ئازیزی ناوخۆیی هەیە. بەلام کاتێک کتێبی رۆژ ژمێری پێشمەرگەیەکم

خوێندەوە بەرگی چوار، بەپێی ئەو نوسینە بێت لەو بارەوە خۆی نوسیویەتی، نەخێر چوونەکەی کاکە حەمە بۆناو پارتی هەرلەسەرەتاوە لەژێر فشارو فێڵ و ڕوگیرکردندا بووە. سەبارەت بەلەدەست دانی ئەو کادرانەی لەو پرۆسەیەدا لەدەستی دان، چوونکە لەوپرۆسەیەدا نەبووایە دووربوو ئەوانە بەو ژمارە زۆرەوە، لەسەنگەر گواستنەوەدا بێنە پارتی.

پارتی گەڕانەوەی کاکە حەمەی لاقورس بوو، چوونکە لە ئەهمیەتی پرۆسەی یەککگرتنەوەکەی کەم کردەوە، پارتی زۆر زیاتر لەقەبارەی خۆیان بۆ لایەنەکانی بەشداربووی ئەو یەککگرتنەوە بانگەشەی کردبوو. بۆیە لەورۆژە بەدواوە، پارتی لەهەلێک ئەگەڕان تائەو دڕکە لەژێر پێی کاکە حەمە دەرکەن.

ئەوەبوولە نیوەی مانگی١٩٩٣/١٢دا پارتی لەسەر دەست بەسەراگرتن و گەڕانەوەی کەلوپەلی بارەگای لیوایەک لەتانجەرۆ، لەلایەن سۆشیالیستەوە، ئەو هەلەی بۆی ئەگەڕان دەستیان کەوت، بەڵام سەرنەکەوتن.

فەرماندەی ئەو لیوا کەلیوای حکومەتی هەرێم بوو، کاک مەلافایقی چوچانی بوو، مەلافایق پێشتر سوشیالیست و ئەوکات چوونە سەری پارتی بوو، لەوکادرانەبوو کەپێشتر باسمان کرد، کەدوای یەککگرتنەکەو گەڕانەوەی کاکە حەمە، ئەو پارتی بەجێ نەهێشت، کادرێکی بەتواناو دڵسۆزو ماندوشە لەکوردایەتیدا.

سۆشیالیست بارەگای لیواکەیان گرت، پارتی لەتۆڵەی ئەمەدا چوونە سەر بارەگای فەوجێکی لیوای ٢٢ ی سەربەقیادەی مەنتیقەی سلێمانی، لەبەر ئەوە ئیدارەی ئەم فەوجە سوشیالیستە، تالانیان کردو کەلوپەلەکانیشیان برد، لەوێ چەند کوژراو برینداریش هەبوون.

دوای ئەم روداوانە، پارتی هێزیان کۆکردەوەو هێزەکانیشیان لەقیادەی مەنتیقەی کەرکوک و سلێمانی سەر بەحکومەتی هەرێم بوون، رۆژی ١٩٩٣/١٢/٢٣ بەشداریان کرد لەو پەلاماردانەدا بۆ سەرسۆشیالیست. ئەو هێزانەی پارتی کۆی کردبوونەوە، هاتنە ناوشاری سلێمانی و لەگەڕەکی رزگاری گەمارۆی بارەگای سەرەکی سۆشیالستیان دا، کاکە حەمەخۆی لەوێ بوو.

ئەو رۆژە من لەسلێمانی بووم، تەلەفۆنێکم بۆکرا ئاگاداریان کردم ئەوە لەناوشاردا تەقەیەو گەمارۆی کاکە حەمەدراوە، پەیوەندیم بەچەند لاوە

کرد، تابزانم هەڵوێستی یەکێتی چیە لەو بارەوە، وەڵامی دروستم وەرنەگرت بۆیە سەرەڕۆیانە ملمنا بۆلای ماڵی کاکە حەمە، تاگەیشتینە ئەوێ چەندین بازگەو کەمینمان بڕی، لەراستیدا هەڤاڵانی پارتی ئەوانەی ئەو رۆژە ئێمە لەگەڵیان بەرخوردمان کرد، بەڕێزەوە قسەیان لێوەرگرتین و ئەیانووت ئێمەش حەزناکەین ئەم بارودۆخە روویداوە.

هەتا داوایان دەکرد ئێمە دەور ببینین بۆ کۆتای هاتن بەکێشەکە، بەڵام ئەمانە کەسیان کەسی یەکەم و دووەم نەبوون، لەچەند شوێنێکیش هات و هاوارو هەڕەشەو گورەشە دەکرا، بانگیان دەکرد مەیەنە پێشەوە. من لەنزیک ماڵەکەی کاکەحەمەدا رووبەروی مەفرەزەیەک بوومەوە پرسیان کاکە حەمە بۆ کوێ؟ ووتم ئەمەوێت بچم بۆلای کاکە حەمەی حاجی مەحمود. یەکێک لێم نزیک بووەوە بەهێواشی ووتی کاکە حەمە ئێمە یەکێتین، خەمت نەبێ کاکە حەمەی حاجی مەحمود لێرە نییە. ووتم چۆن ئەزانی ووتی لێرەوە چووە خوارەوە بەرەوماڵی کاک مەحمود سەنگاوی.

داگەڕامە خوارەوە هێزێکی زۆری یەکێتی ئەو گەڕەکەی نێوان ماڵی کاکە حەمەو کاک مەحمودیان کۆنترۆڵ کردبوو. گەیشتمە ماڵی کاک مەحمود سەنگاوی کۆمەڵێک لەفەرماندەو کادرەکانی یەکێتی لەوێبوون، لەوانە کۆنە سۆشیالیستەکانی ناو یەکێتی وەک قەدەفەری و ئەوانیتر. کەچوومە ژوورەوە تەماشا دەکەم کاکە حەمەی حاجی مەحمودو کاک مەحمود سەنگاوی دانیشتون و نان و چای بەیانی ئەخۆن، منیش لەپەنایانا دانیشتم و دەستم کرد بەنان و چا خواردن، بەرچاییان هێلکەی کولاو زۆر بەلەزەت بوو.

پێشتر لەسەر ئەم کێشەی نێوان سۆشیالیست و پارتی لەبینای بارەگای پارێزگای سلێمانی رێککەوتنێک بەئامادەبوونی رێکخستنەکانی هەردوو لا پارتی و یەکێتی و هەردوو قیادەی سلێمانی و کەرکوک کرابوو، قیادەی کەرکوک قائیدەکەی یەکێتی و قیادەی سلێمانی قائیدەکی پارتی بوو

ئەم دوو قیادە هێزە سەربازییەکانی حکومەت و هاوبەش بوون ، لەنێوان پارتی و یەکێتی دا، لەو دانیشتنەدا بڕیار دراوبوو ئارامی ناوشار بپارێزرێ و هێزەکانی سەر بەقیادەکانی مەنتقەکان لەناوشار بچنە دەرەوە، بەڵام ئەوبڕیارە جێبەجێ نەکراو بڕێک لەسەرکردەکان یەکتریان بەبروسکەو بروسکە کاری تاوانبار کرد.

سەرئەنجامی کێشەکە بەدەست تێوەردانی سەربەخۆیانەی فەرماندەکان و کادرەکانی یەکێتی، چارەسەر کرا بەبێ بریاری مەرکەزی حزبەکەیان، کاکە حەمەو حزبەکەی رزگاریان بوو لەوداوەی پارتی بۆی تەنیبوون .

لەکۆتای ساڵی ١٩٩٣و سەرەتای ساڵی ١٩٩٤دا سەرەرای شەڕەکانی ناوخۆی نێوان یەکێتی و بزووتنەوە، کەبووبووە هۆی ناثارامی ناوچەکانی شارەزوورو هەڵەبجەو هەورامان، خەڵکی چاوەڕێ بوون لایان لێ بکرێتەوەو ناوچەکانیان ئاوەدان بکرێتەوە. بەتایبەت خەڵکی زوڵم لێکراوی هەڵەبجە چاوەڕی بوون لەم ساڵی نوێ و لە١٦/٣دا پەرلەمان و حکومەت شارەکەیان ئاوەدان بکەنەوە، لەدوای راپەڕین و لەماوەی ئەم چوار ساڵەی تەمەنی حکومەتی خۆماڵیدا ئەوان هەر لەناو کەلاوەو وێرانەی ناپاڵمەکانی کیمیاییدا بەهاوینان تەپ و تۆزو بەزستانان قوڕولیتە، وەڕسی کردبوون، تائێستا شتێکی دیار کەبۆیان کرابێ بەستنەوەی خەتی کارەبابوو لەدەربەندیخانەوە بۆناو کەلاوەکانی شار، ئەویش لەسەر ئەرک و بووجەی جەنابی مام جەلال نەک حکومەت و پەرلەمان. ئێمەش زووزوو لەکۆڕ و کۆبوونەوە کانماندا وەک منەتکردن ئەمانداوە بەروویاندا.

لەماوەی ساڵانی ڕابردودا، ئەوەی رێکخراوە خێرخوازە جیهانییەکان بۆناوچە کارەسات بارەکانی کوردستانیان کردبوو، هەڵەبجەو هەورامان لەوەش بێبەش بوون، دیارە خەتاکەش بەشێکی بزووتنەوەی ئیسلامی بوو، جارێک رێگریان دەکرد لەخانمە بیانییەکان بەناوی بێ حیجابییەوە و جارێک ئەیانووت ئەو خانوانە ئەکرێتەوە یان ئەو یارمەتیانەی ئەدرێت، ئەبێ بۆئەوانە بێت لەناوچەکانی تری کوردستانەوە هیجرەتیان کردووە بۆ هەڵەبجە وجیهاد دەکەن.

لەسەرەتای ساڵ و بەر لە١٩٩٤/٣/١٦ هەرێم رووبەروو بووبوو لەگەڵ کێشەگەلێکی نەخوازراودا، کە بارودۆخەکەی بەرەو ئاڵۆزترو خراپتر ئەبرد. شەڕی پارتی و یەکێتی لەگەڵ پەکەکە بەناوی شەڕی بەرگری لە حکومەت و پەرلەمان، شەڕی یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامی، شەڕی پارتی و پەکەکە، شەڕی سۆشیالیست و پارتی.

کوشتنی لابەلاو بڵاوبوونەوەی ناثارامی لەوانە کوشتنی خاڵە حاجی لەسلێمانی و کوشتنی خاتولیسی و......تاد. هەرچەندە لەم ماوەشدا واتە

لەنیوەی مانگی ١٩٩٤/٢دا ڕێکەوتن لەنێوان بزووتنەوە و یەکێتیدا کراو، چەندین مەقالەو گفتووگۆی ڕۆژنامەوانی بڵاو دەکرانەوە سەبارەت بەیەکگرتنەوەی پارتی و یەکێتی و بوونیان بەیەک حزب. ئەمە زیاتر لەلایەن هە ڤالانی پارتیەوە ئەنوسرا، لەوانە زیاتر کاک فەلەکەدین و کاک فەرەنسۆ لەو بارەوە شتیان ئەنوسی یان لەکاناڵەکاندا قسەیان لەسەر دەکرد. بەڵام هەوڵەکانی ئاشتی کاتی بوون و گرنگیان نەبوو.

## شەڕی ناوخۆ 1994

بەداخەوە شەڕی ناوخۆ لەناو کوردو کوردەواریدا پێشینەی هەیە، لەمەیدانی سیاسیدا پانتاییەکی زۆری گرتوەتەوە، ئەم شەڕە پێشتر لەنێوان جەلالی و مەلایی و لەشۆڕشی ئەیلولدا ڕەگی داکوتاوە، دواترو دوای ساڵی ١٩٧٦ لەشۆڕشی نوێ و گولاندا دوبارە برینەکان کولانەوەو ئەم شەڕە لەنێوان یەکێتی و پارتیدا دەستیپێکردەوە. پەڕاکەندەو پچڕپچڕ تا ساڵی١٩٨٦ درێژەی کێشا، لەدروست بوونی بەرەی کوردستانییەوە تاساڵی ١٩٩٤ بۆ ماوەی نزیک بە٨ هەشت ساڵ زەمەنێکی باش بوو بۆ ساڕێژبوونی برینەکان لەنێوان هەردوولادا.

ساڵی ١٩٩٤ جارێکیتر شۆڵەی ئاگری شەڕی ناوخۆ لەنێوان پارتی و یەکێتیدا لەقەلادزێوە هەڵگیرسایەوە، دیارە لەشەڕی ناوخۆدا جگە لەوەی لایەنە بەشەڕ هاتوەکان درێغی ناکەن لەیەکتر کوشتن و بریندا، هەوڵ دەدەن یەکتر بشکێنن و زۆرتر زەویش لەژێردەستی یەکتردا دەربهێنن و کۆنترۆڵ بکەن.

بۆ ئەو یەکتر شکاندنە پەنا ئەبەنە بەر قێزەونترین شێوەی دژایەتی کردن، زۆرجار شەڕو کوشتنەکانیش هەرلەچوارچێوەی هێزە چەکدارەکانی هێزە بەشەڕ هاتوەکاندا نامێنێتەوە، بەڵکو نائارامی پەل ئەکێشێ بۆناو خەڵک و ئەو لایەنانەش کەئەیانەوێ لەنێواندا دەوری ئاشتی ببینن.

هەتا زۆرجار لەپەنا شەڕو نائارامیدا خەڵکی مەدەنی و لایەنە خزمەت گوزارو ڕێکخراوە فریا گوزارەکانی بیانیش زیانیان بەرئەکەوێ. زۆر جار گروپە تیرۆریست و جاسوسیەکانی شاراوەی ناوچەکەو دەوڵەتان لەکاتی شەڕەکانی ناوخۆدا زەمینەی ئەنجامدانی چالاکیان بۆ ئەڕەخسێ. ئەوەتا لەرۆژی ١٩٩٤/٤/٣دا لەشارەزوور دۆستی دڵسۆزی خەڵکی کورد خاتولیسی شیمیس تیرۆر ئەکرێ، لیسی کچێکی چالاک و خزمەت گوزارو خەڵکی ئەڵمانیا بوو، شەو رۆژ کاری دەکردو دۆستێکی راستەقینەی هەڵەبجەو کورد بوو، لەپای خزمەتەکانی بەدەستی خۆفرۆشیکی کورد بەناوی زەکی سەعید خەڵکی کەرکوک، شەهید کرا. لەکتێبی بەرگی چواری(رۆژمێری پێشمەرگەیەک) لەلاپەڕە٣٣٤ دا کاکە حەمە نوسیویەتی بکوژی خاتو لیسی پێشمەرگە بووە لای کاک عەتاسەراوی. بەڵام کاک عەتا ئەڵێت ئەوکەسە پێشمەرگە نەبووە، باوەڕ پێکراوی دەزگای زانیاری بووە، لەژێریشەوە پیاوی دەستگای هەوالگری عێراق بووە، خۆی و کەسێکی تر بەناوی محەمەد ئەو خیانەتەیان کردوەو هەردوکیان لەسێدارە دراون، برایەکی زەکی بەناوی سەمین سەعید پێشتر پێشمەرگەبووە و لەکێشەی کۆمەڵایەتیدا کوژراوە.

ئەمجارەو هۆکاری هەڵگیرسان و دروست بوونی شەڕەکە پارچەزەویەک بوو، ئەم پارچە زەویە لەناوشاری قەڵادزێ دا چەندین دوکانی لەسەر دروست کرابوو لەلایەن خەڵکەوە، عەلی کوڕی حەسۆمیرخان[1] داوای کردبوو لەدوکان دارەکان ئەوزەویەی ئەوان دوکانیان لەسەر دروست کردووە هی بابیەتی، بۆیە دەبێت بۆی بگێڕنەوە، ڕێک نەکەوتن، ئەوەبوو عەلی هێزێک لەگەڵ خۆی ئەهێنێ بۆ شاری قەڵادزێ و دەچێتە بارەگای ناوچەی پارتی، لەسەر ئەمە گرژی دروست بوو لەناوچەکەدا.

رۆژی ١٩٩٤/٥/١ پێک هەڵگژان دروست بوو لەنێوان هێزەکەی عەلی و خەڵکەکەدا، پێشمەرگەی یەکێتیش بۆ پشتگیری دوکان دارەکان پەلاماری

---

[1]- حەسۆ میرخان لەشۆڕشی ئەیلولدا فەرماندەی هێزی کاوە بوو، خەڵکی بادینان بوو، لەشۆڕشی نوێداو لەپایزی ساڵی ١٩٨٣دا لەبناری قەندیل لەشەڕی ناوخۆی یەکێتی و پارتیدا ئەویش بووە قوربانی شەڕی ناوخۆ.

عەلی و هێزەکەی دەدەن و چەندین کەس لەهەردوولا بوونە قوربانی، لەوانە یەکێکیان عەلی خۆی بوو.

هەوڵی کوژانەوەی ئەم ئاگرە درا، بۆئەوەی تەشەنە نەکات بۆ ناوچەکانی تر، بەتایبەت لەلایەن مام جەلال و کاک مەسعودەوە، ئەمەدەقی بروسکەی کاک مەسعودە لەو رۆژانەدا (بۆ/ ئازاد قەرەداغی و مستەفا چاورەش، هەردو مەکتەبی سیاسی، لە مەسعود بەرزانییەوە. هەردوکتان فەوری تەداخول بکەن و وەزعەکە هێور بکەنەوە، مەهێڵن خەڵکی نابەرپرس بارو دۆخەکە لەکۆنترۆڵ دەرکەن، هەردووکتان وەک یەک جیهەت ڕەفتار بکەن، مەجالی خەڵکی نابەرپرس مەدەن، بەرپرسیاریەتی دەخەمە سەرشانی هەردووکتان). ئەمە جێبەجێ ناکرێ و هەوڵەکانی تریش بێسود بوون.

رۆژی ١٩٩٤/٥/٢پارتی بۆتۆڵەکردنەوە پەلاماری یەکێتیان داو لەراستیدا تۆڵەیەکی چەند قاتیان کردوە، ئەوەش بەشەهیدکردنی ئەوانەی دەروازەی راپەرینیان لەبەهاری ساڵی ١٩٩١دا لەبتوێن و ناوچەکەدا کردەوەو بوونە هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنی راپەرین لەکوردستان[1]، بەڵی عەلی حەسۆ بووە هۆکاری هەڵگیرسانی جەولەیەکی تری شەڕی ناوخۆ، بەجۆرێک شەڕەکە هەموو کوردستانی گرتەوەو چەندین ساڵ درێژەی کێشاو سەدان فەرماندەو کادری هەردوولاو سەدان پێشمەرگەی نەحەساوەو کوڕی جوان و لاو بوونە سوتەمەنی ئەوشەڕە.

جگەلەوەش کوردستان بووە مەیدانی گەلەکۆمەکی کردنێکی خوێناوی لەیەکترو پەناپردن بۆ هێزە داگیرکەرەکانی کوردستان. بەجۆرێک کەپێشتر هەردوولا لەسەر ئەو باوەڕەبوون، بزووتنەوەی ئیسلامی کۆسپە لەبەردەم ئاوەدان کردنەوەو گەشەکردنی کوردستاندا، بۆیە هەردوولا بەدوای چارەسەرێکدا ئەگەڕان، بۆ ئەوەی ئەگەر بزووتنەوە نەیەتە ژێربارو بەشداری نەکات لەپرۆسەی سیاسی و بەرێوەبردنی وولاتدا بەئاراستەی بنیاد نانەوەو دەستەلاتی مەدەنی، وەسور بێت لەسەر سیاسەتی بەهێزکردنی میلیشیای چەکدارو دژایەتی کردنی پرۆسەی سیاسی، ئەوە بە هەردوولا یەکێتی و

---

[1]- ئەوانە شەهیدان عەلی نەبی و سمایل وەرتێ و مام جووتیارو رەحمانی مام خدرو حەوت پێشمەرگەی تر بوون.

پارتی چارەسەری ئەو گرفتە بکەن. روونتر بڵێم بریارە پێکەوە هەردوولا چەکیان بکەن. بزووتنەوە خەریک بوو لەو شوێنانەدا لەژێر دەستی دایە حکومەت دامەزرێنێ، لەهەڵەبجە سەرۆکی دادگای باڵای داناوە، کەسێکە بەناوی مەلا عەبدوڵای هەرتلی.

بەڵام لەبەر ئەوە بناغەی ئاشتی نێوان پارتی و یەکێتی پتەو نەبوو، ساڵی ١٩٩٢ کاتێک بزووتنەوە گێچەڵیان بەرپاکردو شەریان هێنایە بەردەرگای یەکێتی، پارتی لەباتی هاوکاری هاوپەیمانەکەیان، بەپێچەوانەوە لەبنەوە هاوکاری بزووتنەوەیان کرد. ئێستاش کە لەقەڵادزەوە شەڕ پەرپابوو لە١٩٩٤/٥/٢ لەنێوان پارتی و یەکێتی دا پارتی هێزی کۆکردەوەو جاڕی تۆڵەسەندنەوەی دا، بزووتنەوەی ئیسلامی بەهەلیان زانی و بۆ پشتیوانی پارتی لەرۆژی ١٩٩٤/٥/٣ پەلاماری یەکێتیان دا لە ناو شاری هەڵەبجەو شارۆچکەی خورماڵدا، لەپشتەوە سەنگەریان لەیەکێتی گرتوو بەرەیەکی تری شەڕیان کردەوە.

لەشەوی٤ لەسەر ٥ /١٩٩٤/٥دا لەشارۆچکەی خورماڵ بزووتنەوەی ئیسلامی، ئەو دەستە پێشمەرگەیەی کەبۆ پارێزگاری بارەگای کۆمیتەی رێکخستن لەپێنجوێنەوە نێردرابوون گرتن و کاتژمێر ٨ هەشتی بەیانی رۆژی ١٩٩٤/٥/٥ بەدیلی لەنزیک ئاوی گەڕاوی خورماڵدا شەهیدیان کردن، ئەوانیش هەڤاڵان، شەهید شەریفی قورئانی و ئەم هاورێیانەی بوون: عوسمان رەحمان، جەمال فەرەج، نەوزاد شێخ خالد نزارەیی، کەریم حاجی محەمەد هەلالاوایی، مەحمود هەلالاوایی........تاد .

هەرهەمان رۆژ لەناو شارۆچکەی خورماڵدا ٢٤ کەس بەرەشبگیری ئەگرن، ٣ سێ کەسیان گوللەباران ئەکەن، گیراوەکان، هەڤاڵان مامۆستا سەعدی خەرپانەی، مامۆستا سادق مەعروف، حاکم هوشیار مەلامستەفا بیارەیی، کاوە کولکنی، شەهید ئاوات گوڵپی تێدا بوون.

کاک ئاوات پێشمەرگەی شاخ بوو، پێشترلەناو حیزبی شیوعیدا بووبوو، دواتر لای یەکێتی بوو بەفەرماندەی فەوج، نمونەی پێشمەرگەی پێشەنگ و رۆشنبیرو لێوانلێو لەئەدەب، شیرین و خۆشەویست، بەداخەوە تائێستاش لەوبنارە شوێنەکەی بەچۆڵی ماوەتەوە. کادرو فەرماندە شەهیدەکانی هاورێم بەشەهید بوونیان هەریەکەو بەئەندازەی خۆی داخی

ناوە بەدڵمدا، بەڵام داخی ئاوات داختر لەداخ بوو، تائێستاش لەدڵی مندا قەتماغەی ئەو داخە نەیبەستوە. دوای ١٤چوارده رۆژ لەدیل کردنی بەپێداگرتنی ئەوانەی خەڵکی گوڵپ بوون و بزووتنەوەی ئیسلامی و پارتی بوون گوللەباران کرا.

هۆکارەکەش کینەو بەغالەتێک بوو لای ئەوانە، بەغیلیان دەبرد بەئازایەتی و مەردایەتی و کەسایەتی ئاوات، بەبەراورد لەگەڵ خۆیاندا. لەگەڵ ئاواتدا سێ پێشمەرگەی دیلی دەستەکەی کوردۆ قاسمیان شەهید کرد ئەوانیش ئەمانە بوون، عامری عەلاق، فەلاح و عومەر.

هەرئەمرۆش١٩٩٤/٥/٤ هێزێک کەئە چوون بەرەو خورماڵ لەنزیک گردی چەقڵاوا کەوتنە بۆسەو ئەم فەرماندەو پێشمەرگانە شەهید بوون، حەمەئەمینی شکۆف، (ئیبراهیم بۆینی) ئەویش یەکێک لەپێشمەرگە دێرین و ماندوەکانی یەکێتی نیشتیمانی بوو لەسنووری هەڵەبجەو هەورامان ، ئەم تێکۆشەرە کەسایەتیەکی هێمن و لەسەرەخۆ چالاک بەدژی بەعسیەکان.

بەداخەوە لەشەڕی ناوخۆدا ئەوانەی تاکە یەک گوللەشیان بەبەعسیەکان و سەدامیەکانەوە نەنابوو، لەم شەڕی ناوخۆدا دەیان قارەمانی بەعسی بەزێن و فەرماندەو تێکۆشەری ماندویان شەهید کرد، لەنمونەی ئەم فەرماندە کەناوی برایم ڕەشید کەرەم وەیس بوو، هاوسەرەکەی شەهید براهیم شاژنێک، فاتمە عەلی عەبدولڕەحمان خوشکی کاک جەلال کوڵکنی و ئەویش پێشمەرگەبووە لەشاخ، دوای شەهید بوونی هاوسەرەکەی ئەرکی سەرشانی قورسترو بەخێو کردن و گەورەکردن و پەروەردەکرنی سێ کیژۆڵەی جوانی بەناوەکانی، تابان و بێلان و کەژانی کەوتە سەرشان، ئەو ئەرک و پەروەردە کردنەی گەیاندە کۆتای.

بەداخەوە ئەوکات حکومەتی ئێران زۆر لایەنی سیاسی کێشەکان و گرفتەکانی بۆ روون نەبوو بووەوە، نەیان ئەزانی لەبنەوە لەبەرامبەر خۆیان و ئێمەش لەدولای ترەوە ئاراستەو هاوکاری ئەکرێن. بۆیە بەداخەوە ئێران هاوکاری و پشتیوانی کردن تائەو ڕادەی لەرووبەرو بوونەوەکاندا تۆپ و کاتیۆشا بارانیان دەکردین لەسنوورەکانی خورماڵ و هەڵەبجەو پێنجوێن و قەڵادزێدا. بەناو خاکی ئێران دا هێزەکانی بزووتنەوەو پارتیان ئەگواستەوە لەهەڵەبجەوە بۆ پێنجوێن و بۆ قەڵادزێ و بەپێچەوانەشەوە، بۆ هەر جێگەیەک

پێویستیان بەهێز هەبووایە لەسنووری ئەو سێ شوێنەوە هێزەکانیان بەناو ئێراندا ئەگواستەوە.

یەکێتیش لەبەرامبەر ئەمەدا دەستەوەستان نەوەستا، لەبتوێن و پشتدەر پەلاماری پارتیان دایەوەو سەرجەم بنکەو بارەگاکانیان داگیر کردن و لەسنوورەکەدا دەریان کردن. ئێمەش لەشارەزوورەوە پەلاماری هەڵەبجەو خورماڵ و ناوچەکەمان دایەوەو هەورامان و تەوێڵەو بیارەشمان لێ سەندنەوە کردنمان بەودیودا. بەڵام ئەمە بووە هۆی قوربانی و زیانی گیانی لەهەردوولا، کەبەراستی زیانەکەی ئێمە گاریگەر و بەرچاو بوو.

رۆژی١٩٩٤/٥/٤دا بزووتنەوە لەناوشاردا فەرماندەی محوەر محەمەد سلێمان ئەمیرخان ئێناخیان شەهید کردبوو. حەمە پیاوێکی ماندوی رێکخستنەکانی یەکێتی بوو، لەدوای ساڵی ١٩٧٧ وە تاکاتی راپەرینی بەهاری ساڵی١٩٩١ بەردەوام بوو لەخەبات کردن و تێکۆشان.

رۆژی ١٩٩٤/٥/٥ رۆژێک دوای شەهیدەکانی ناو شارۆچکەی خورماڵ و دەوروبەی، لەهەڵەبجەش پارتی یەکێک لە فەرماندەو پێشمەرگە هەرە ئازاو پارتیزانەکانی سەردەمی شاخی بەناوی لەتیف ساڵح (لەتیف عەنەبی) شەهید کرد، ئەم شەهیدە زوڵم لێکراو بوو، خاوەنی ماڵ و منداڵ و منداڵەکانی ووردو هاوسەرەکەی حەسیبەخان مەردانە و بەسەختترین شێوەی ژیان، پەروەردەی کردن و ژیانیان بەشێوەیەکی ناخۆش بەڕێکرد، تا گەورەی کردن و پێی گەیاندن.

هەر لەرۆژی ١٩٩٤/٥/٥و لەناو شاری هەڵەبجەدا ٧حەوت کەسی بزووتنەوە و یەک کەسی یەککگرتو یەک کەسی پارتی بوونە قوربانی، ئەوانیش ئەمانەبوون،١- مامۆستا سەیفەدین بامۆکی، ٢- کەیکاوس محەمەد ڕەمەزان، ٣- کەمال عەبدولا نادر ، ٤- فوئاد جەمیل، ٥- باقی قادر ڕەشید، ٦- فائق عیزەت عەبدول کەریم، ٧- بەشیر عەبدولا، لەگەڵ سەدیق حەمە تەقی عەبدولڕەحمان ئەندامی یەککگرتوو. ، فەریق تۆفیق عەلی ( ئەندامی رێکخستنی پارتی) .

لێرەدا تاوانێک بەدەستی یەکێتی ئەنجام درا، کەلەتاوانەکانی بزووتنەوە قێزەونتر بوو. ئەویش شەهید کردنی سێ خوێندکاری بێتاوان و بێلایەن بوو، بەناوەکانی سۆران مارف عەبدولڕەحمان، نەوزاد غەفور حاجی

محەمەد، فەیسەڵ غەفور حاجی محەمەد، ئەمانە برابوون و خاڵە غەفور هەر ئەو دووکوڕە و دووکچی هەبوو.

لەم سەروبەندەدا مام جەلال لەوڵاتدا نەبوو، بەهۆی چەندین هەوڵ و نێوەنـد گیـریەوە ئەوە بـوو هەردوو مەکتەبـی سیاسـی یەکێتـی و پـارتی لەسەلاحەدین کۆبوونەوە بۆ چارەسەری کێشەکان، بریاریان دا چەندین لیژنە دروست بکەن بۆ پارێزگاکان، تادیلەکان ئاڵوگۆڕ بکەنەوەو هێزەکان بکشێنەوە بۆشوێنەکانی پێشتریان و بارەگا داگیر کراوەکان چۆڵ بکەنەوە بۆیەکدی.

لیژنەکان دەست بەکار بوون، یەکێتی دڵنیا نەبوو لەپارتی ترسی هەبوو پەلاماری مەڵبەندی بادینان بدەن، کاک فەریدون عەبدلقادرو چەند هەڤاڵی تر لیژنەی بادینان بوون، کاک مەسعود بەرزانی دڵنیای کردنەوە هیچ روو نـادات. مـام جەلالـیش گەرایەوە ئومێـد زیـاتر بـوو، هەرلەدوای دڵنیـا کـردنەوەکەی هەڤـالانی ئێمە لەلایەن کـاک مەسـعودەوە، پـارتی پەلامـاری مەڵبەندی بادینانیان داو گرتیان، دوای ئەوەش بۆسەیان دانابووەوە بۆهەڤال حەســەن کوێســتانی، لەبۆســەکەدا رۆژی ١٩٩٤/٥/١٧ تەقەیــان لێکــردن و کوێستانی و هەڤاڵەکانی کەشەش کەس بوون بەبریندراری گیران و شەهیدیان کردن ئەم بۆسە لەلایەن جەماعەتی حزبولاوە (ئەدهەم بەرزانی) دانرابوو. کاک حەسەن کوێستانی خەڵکی شارۆچکەی گەلاڵەی لای حاجی هۆمەرانە، سەرکردەیەکی نەرم و نیان و سادەو ساکار بوو، ساڵی١٩٨٤ ئەوکاتەی کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە بەسترا لەنزیکەوە ناسیم و بوو بەهاوڕێم ، بەتایبەت ئەوکاتەی کرایە ئەندامی دەستگای کۆمەڵە.

قارەمـانی داسـتانەکانی ناوچەکـانی هەولێـر و خۆشـناوەتی و باڵەکـایەتی و بنـاری قەنـدیل بـوو، لەسـەردەمی خەبـاتی شـاخ دا بەدژی رژێمـی بەعس، لەفەرماندەیی کردنی هەرێمی ١٢ و دواتر تیپی سۆران و بەرپرسی سەربازی مەڵبەنـدی سـێ و دواتـر لە بەرپرسـایەتی مەڵبەنـدەکەدا دەوری کـاریگەرو بەرچاوی تەی کردو بردەسەر، لەرۆژە سەخت و تەنگانەکانی گەلەکەماندا. بەداخەوە بەدەستی کورد شەهید کرا. بارودۆخەکە لەگرێژنە دەرچوو شـەڕ هەموو ناوچەکانی گرتەوە. یەکێتی و خەڵک لەتۆڵەی ئەمەدا چوونە سـەر لقەکانی پارتی، لقی کەرکوک لەدەربەندیخان، مەسعود ساڵەیی بەرپرسی لق و

ستافەکەی گیران، و لقی سلێمانی، لەسلێمانیش دەرویش ئاغاو قادرقادرو کەمال حەسەن و نیزامەدین گلی و چەندین بەرپرس و فەرماندەیان گیران.

## ئەی چۆن ئەبێ؟

لەسەرەتای مانگی ١٩٩٤/٥وە هێزەکانی حکومەتی هەرێم لەقیادەکانی مەنتیقەو لیواکان هەڵوەشانەوە، رێکخستنەکانی سنووری شارەزور لەچوارچێوەی مەڵبەندێکدا بەناوی مەڵبەندی شارەزوور لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٤ دا رێکخران و کوردۆقاسم بووە بەرپرسی مەڵبەندو کاک حامیدی حاجی خالی جێگری بوو، جیابوونەوە لەسلێمانی و بارەگای مەڵبەندی شارەزوور چووە هەڵەبجە، هێزە چەکدارەکانی یەکێتی لەسنووری شارەزووردا پەرشوبڵاو بوون، بەشێکیان سەربە کۆمیتەی باڵای مەکتەبی عەسکەری سلێمانی بوون، هەڤاڵ جەمیل هەورامی بەرپرسی ئەم ئۆرگانە بوو، هەڤالان کەمال شاکیرو ئەحمەد قەدەفەری سەرپەرشتی لای شارەزووریان دەکرد، بەشێکی تری هێزەکانی شارەزوور لەگەڵ کاک ئەکبەر ئێناخی و مەهدی و چەند فەرماندەیەکی تری سنوورەکە چووبوون و لەلیوایەکی تایبەتدا بوون، فەرماندەی لیواکە کاک ئاواتی شێخ جەناب بوو.

بەشێکی تریان لەگەڵ مەڵبەند بوون و کاک قادر کۆکۆیی سەرپەرشتی دەکردن، منیش لەدوای هەڵوەشانەوەی لیواکان متەفەرقەو بێکار بووم، لەم سەروبەندەدا لەکوێ پێویست بووایە خۆم و دەستەکەم خۆمان ئەگەیاندە ئەوشوێنانە.

ڕۆژی ١٩٩٤/٥/٨ کاک کوردۆ ئاگاداری کردم سەردانی بکەم لە هەڵەبجە، کاتێک گەیشتمە ئەوێ ووتیان چوون بەرەو هەورامان، هەڵەبجە و شارەزوور بارودۆخێکی زۆر ناخۆشی هەبوو لەم ڕۆژانەدا، خەڵکی لەناو کەلاوە و داروديواری ڕوخاودان، بێکار و بێدەرامەت، گرانی و نەخۆشی و هەژاری دایتەنیون، دڵەڕاوکەی شەڕو مەترسی ژیانیشیان هاتووەتە سەر. لە

هەڵەبجە دەرچووین تادەرەشیش کەسمان نەبینی، کاک ئەمیری شێخ جەلالی شێخ محەمەدی نەقشبەندی ئەم ماوە خۆی و مەفرەزەیەک بەئوتۆمبێلی خۆیەوە لەگەڵمایە، ئەمیر کوڕێکی لێهاتو پیاوی تەنگانەیە، ووتی لەوە ناکات لێرەوە هاتبن، ووتم کەمێکی تر بڕۆ، لەپێچی دەرەشیش سەرمان بردە دیار بینیمان قافڵەیەکی سەیارەو هێزێکیش بەپێ کەوتونەتە دەشتی سەبان و کاتیش پاشنیوەڕۆیە. هێزە پیادەکە هەرلەئێستاوە ماندو و پەکیان کەوتووە. ڕۆیشتین و دامان بەلای هێزە پیادەکەدا، بۆ برادەرانمان پرسی ووتیان لەپێشەوەن.

لەئاوایی خارگێلان گەیشتین بە کاک کوردۆو کاک شەوکەت و کاک مەحمود سەنگاوی، ووتیان هاتی؟ ووتم بەڵێ. چووینە کەنار ڕێگاکەو لەقەرەباڵغی دوورکەوتینەوە پرسیم ئەتانەوێ چیبکەن؟ ووتیان پەلاماری بیارەو ئەو ئاواییانەی نێوان خورماڵ و بیارە ئەدەین، بەرنامەکەیان شپرز بوو، من ووتم وانابێ، کاک شەوکەت یەکسەر هەڵچوو، ووتی ئەی چۆن ئەبێ؟ ووتم تورە مەبە هێزەکەی بەدواتانەوەیە هەر لەئێساوە پەکی کەوتووە، چەند کاتژمێریتر تاریک دەکات، لەبیارە دوو تەقە بکرێت لەم هێزە ئەبێ ئەمشەو لە دەرودەشت بن تابەیانی.....تاد، کاک شەوکەت ووتی ئەوە برهانی تۆپخانە ئێستا ئەڵێم بیارە بەتۆپ تۆپ باران کاول بکات. ووتم جا بیارە بۆ؟ ووتی ئەی تۆ ناڵێیت لەبیارە تەقەتان لێ دەکەن، ووتم با، بەلام خۆ خەڵکی بیارە تەقەت لێناکەن تا تۆ تۆپبارانیان کەیت.

بڕێکیتر قسەوگفتوگۆمان کرد، کاک مەحمود ووتی کاک شەوکەت حەمە ڕاس دەکات، ووتی باشە ئەی چی بکەین؟ ووتم ئەبێ هێزێک لەڕێگەی خەرپانییەوە بچێتە سەید سەلام بۆ نێوان بەڵخەو بیارە، ئەگەر بەندەنی بەڵخە نەگیرابوو ئەوە بەئاسانی ئەگەینە شوێنی مەبەست پشتی بیارەش ئەشکێ، هێزەکە بکەن بەدووبەش، ئێمە لەگەڵ بەشێکی ئەچین بۆ بەندەن و سەید سەلام، کەئێمە گەیشتینە ئەوێ، ئێوە لەگەڵ ئەو هێزەی تر لەڕێگای گشتییەوە بەرەو بیارە بێن و پێشڕەوی بکەن.

ووتیان باشە، مەهدیمان بانگکرد بووین بە دووبەش کاک شەوکەت و کاک مەحمودو کاک کوردۆو لیوای تایبەت و زۆرینەی هێزەکەشیان لەلابێ لە خارگێلان بمێنەوە، من و مەهدی برام و هێزێکیتر کە حەمەی مەدحەت و

ئەحمەد سۆیلەمیشی و چەند هەڤاڵی تر بوون بەئوتۆمبێل بگەڕێینەوە لەخەڕپانییەوە بچینە سەید سەلام کە گەیشتینە ئەوێ ڕێگای بیارە تەوێڵە ئەبڕین و هێزێکیش لەسەرداوە بنێرین بەرەو بیارە بێتەوە ، کە ئەوە ڕوویدا ئێوەش بەرنامەی خۆتان دابنێن، بەشێکتان دێن بەرەو بیارە و لەگەڵ ئێمە یەک ئەگرنەوە هێزێکیش بەرەو گوڵپ و باخەکۆن و سەرگەت بڕوات.

کاک کوردۆ ووتی من لەگەڵ ئێوەدا دێم، زۆرباشە، کوڕێکی بانگ کرد بەناوی عەلی بەرلووتی، ووتی خۆتان ئامادەکەن، کەووتینەڕێ بە ئۆتۆمبێل هەر٣٠ سی خولەکی برد هیزێکی ١٠٠سەد کەسیمان بە دۆڵی خەڕپانیدا، بردە بەندەنی بەڵخە لەوێوە دەگەڕاینە خوارەوە، ڕێگای تەوێڵە بیارەمان بڕی و بیارەش کەوتە بەردەستمان، دۆشکاو هاوەنی ٨١ ملیمان پێ بوو، دۆشکاکە دەستی کرد بەتەقەکردن لەبەرزاییەکانی بیارە و چەند گوللە هاوەنیش هاوێژران، ئەوچەکدارانەی لەبیارەدا بوون هەڵهاتن بێ تەقەو بەرگری چۆڵیان کرد، ئوتۆمبێلەکانمان ناردنەوە بۆ لای کاک مەحمودو ئەوان، ئەوانیش هەر ئەو پاشنیوەڕۆو ڕۆژی دواتر پەلاماری ئاواییەکانی ئەو بنارەو چیای شرامیان دابوو.ئێوارەی ڕۆژی١٩٩٤/٥/٨ کاتێک گەیشتینە سێڕیانی سەید سەلام هێزەکەمان کردە دووبەش، بەشێکی بەرەو تەوێڵە، من خۆم لەگەڵ ئەمبەشەدا بووم و بەشێکیشی بەرەو بیارە داگەڕانەوە، حەمەی مەدحەت و ئەحمەد سۆیلەمیشی لەگەڵ ئەو هێزەی لەگەڵیان بوو لەگەڵ مەهدی ناردمن بۆ بیارە، کاتێک جیابووینەوە حەمە و ئەحمەد لەلای مندا وەستابوون نەئەڕۆیشتن وەک بڵێیت داواکاریەکیان هەیە، مەهدیش بەدیاریانەوە وەستابوو، لەم کاتەدا حسێنی حاجی دەروێش هات بۆلامان حەمەی مەدحەت ووتی حسێن بەرە لەگەڵ خۆت، نیشانە شکێنێکی بێوێنەیە بە ئاڕ بی جی، منیش ووتم ئادەی کاک حسێن گوللەیەک بگرە ئەو قوللەی رووبەروومان، گوللەیەکی هاویشت بۆترۆپکی لوتکەکەی پشتی هاوینە هەوارەکەی وەزەنێ، بەجوانی لێیدا، ئەملاوئەولام ماچ کرد، ووتی کاک حەمە ئەم شەڕە تەواو بوو دێم بۆلات ئیشم هەیە. ووتم بەسەر چاو حسێن گیان، بەداخەوە دوو ڕۆژ دواتر شەهید بوو، نەمبینییەوە تابزانم ئیشەکەی چیە. کاک حسێنی حاجی دەروێش پێشمەرگەیەکی گورج و گۆڵ و بەهیمەت بوو، خەڵکی ئاوای سۆیلەمێشی گلاڵی نشینی شارەزوورە، هەر ئەو ئێوارەیە چوبووە بیارە ،

لەوێ مـــاوەتەوە تاشـــەوی ١٠لەســـەر١٩٩٤/٥/١١، لەو شـــەوەدا خـــۆی و پێشمەرگەیەکی تر بەناوی فارس عەزیز لەبیارەوە بەئۆتۆمبێل دێنە خوارەوە بۆ شـارەزوور، لەسـەروی ئـاوای زەردەهـاڵەوە مەفرەزەیەکی پارتی تەقە لەئۆتۆمبێلەکەیان ئەکەن و هەردووکیان شەهید کردن، پاش ٢٠بیست سـاڵ بەرپرسی ئەومەفرزە تەقەکەی کردبوو، لەهەمان شوێنی ئەودوو شەهیدەدا بەکارەساتی ئۆتۆمبێل کۆچی دوای کرد.

بەڵێ خواحافیزیم لێکردن و بەگاڵتەوە بانگم کردە مەهدی و ووتم : ئاگات لێیان بێت، ئەمانە گەلاڵین، مەهدیش ئەیزانی چی ئەڵێم، هەر بەئەنقەست پرسـی ئاگـام لەچـی بێـت؟ ووتـم لەبیـارە، هەمـوو دایـانە قاقـای پێکەنـین و ڕۆیشـتن. منـیش لەگەڵ هێزێکـدا بەرەو تەوێـڵەو سـەر سـنوور ڕۆیشـتین. بەداخەوە هەر چواریان مەهدی برام، ئەحمەد سۆێلە میشی، حسێنی حـاجی دەروێش و حەمەی مەدحەت شەهید بوون و ئێستا نەماون.

جیـا لەو شــەهیدانەی لەشــەڕەکاندا شــەهید دەبــوون، ئەم مــاوە بزووتنەوەو پارتی لەناوچەی هەورامـان و هەڵەبـجەدا چەنـدین هـاوولاتی و پێشمەرگەیان بەئاشکرا شەهید کردن، لەسەر ئەوەی گوایا ئەندامی یەکێتین لەوانە: ١- فەتـاح ڕەحمـان مـحەمەد لەخورمـاڵ بـزووتنەوە لە١٩٩٤/٨/٢٥دا بردیـانە بارەگـای ئەحـمەد ئـاواو بەئەشـکەنجەدان شــەهیدیان کـرد، ٢- موعتەسەم غەفور حەمەئەمین بابا، لەبیارە مەفرەزەیەکی پارتی تەقەی لـێ دەکەن و بریندار دەبێت، لە ڕۆژی١٩٩٤/٦/٢٤دا بەبرینداری شەهیدیان کرد، ٣- شیروان عەبدولخالق خەڵکی تەوێڵە لەمانگی ١٩٩٥/٤دا گیرا لەلایەن لقی ١٢ی پارتیەوە، تائێستاش بێسەرو شوێنە.

## شەڕەکانی نێوان هەڵەبجە و سەیدسادق

لەشەڕی ناوخۆدا، بەشێک لەقیادەی یەکێتی هەمیشە ئەیویست شەڕەکان لەناو سلێمانی دوور بخاتەوە، ئەوەبوو، کاتێک پارتی داوایان کرد دەیانەوێت بەبێ شەڕ لەسلێمانی دەرچن، لەڕێگەی کاکە حەمەی حاجی مەحمود و مامۆستا شێخ محەمەد بەرزنجیەوە. دوای گفتوگۆی کاک عارف تەیفور و کاک مەحی الدین ڕەحیم لەگەڵ ئەو دوو بەڕێزەی ناوم هێناون لەلایەک و کاک عومەری سەیدعەلی و کاک عومەر عەبدوڵاو کاک عومەر فەتاح لەلاکەی ترەوە، لایەنی یەکێتی ڕازیی و ئامادە بوون، ئەو هەموو گەورە بەرپرسەی پارتی و نزیکەی ٩٠٠ نۆسەد پێشمەرگە ڕێگابدەن، بە پاس و ئۆتۆمۆبێلی جۆراو جۆرەوە، لەژێر ئاڵا شینەکەی کاکە حەمەوە ڕەوانەیان بکەنەوە بۆ پشتی خورماڵ و وشکەناو کەلی ملەخورد بۆلای بزووتنەوەی ئیسلامی. کاکە حەمە لەکتێبەکەی خۆیدا (ڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەک) لە بەرگی چوارەم دا واباسی ئەو ڕەوانە کردنەو هەڵوێستی ترسنۆکانەو سەرشۆڕانەی سەرانی پارتی ئەکات، پیاو شەرم دەکات بیگێڕێتەوە، خوێنەری بەڕێز ئەگەر مەبەستت بوو ڕاستی ئەم بابەتە پشت ڕاست بێتەوە بۆت، ئەوە کتێبەی کاکە حەمە بەرگی چوارەم بخوێنەرەوە. ئەمە گەورەترین هەڵەبوو یەکێتی کردی کەبوو بەهۆی کردنەوەی بەرەیەکی شەڕ لەپشتەوە بەدژی خۆی، من دژی دەرکردنەکەنیم بەبێشەڕ، دەبوو یەکێتی بۆ هەولێریان بنێرێت نەک بۆ هەڵەبجەو هەورامان.

ئەوانیش دوای ئەوەی خۆیان ڕێک خستەوەو لەگەڵ بزووتنەوە بوونە هاوپەیمان، مەردانەو بێ پێچ و پەنا بەپشتیوانی تۆپخانە و کاتیوشا گەلی ئێران هێرشیان بۆسەر هێزەکانی هەرسێ کاک (عومەرەکە) بۆ هەڵەبجەو خورماڵ دەست پێکرد، دوای ئەوە هەردوو شوێنەکەیان لەدەس سەندین بۆماوەی شانزە مانگ لەنێوان هەڵەبجە و سەیدسادق دا، لەگەڵ بزووتنەوە شەڕیان کردین و لەوماوەدا دەیان کادرو فەرماندەو باشترین و دڵسۆزترین پێشمەرگەیان شەهید کردین.

لەدەست دانی هەڵەبجە و هەورامان و دروست بوونی ئەو بەرەی پشتەوەی شەڕ بۆ یەکێتی و ئەو هەموو زەرەر و زیان و خوێنە، کاریگەریە

خراپەکـانی بـۆ سـەر بەرەکـانی شـەڕ لە حـاجی هـۆمەرانەوە بـۆ کەڵەک، لەدەستدانی پێگە جەماوەرییە بەرفراوان وحزبییەکەی یەکێتی لەشارەزوورو ئاسـەوارە خراپەکـانی ئەو بـابەتە کە تائێسـتاش کـاریگەری خـۆی هەیە، لەئەستۆی هەڵەو دوودڵی یەکێتی خۆیەتی لەشەڕ لەگەڵ پارتیداو بەتایبەتیش لەئەستۆی ئەو سێ کاک عومەرە بوو.

لەو ماوەدا پارتی و بزووتنەوە شاری هەڵەبجەو هەرسێ ناحیەکانی، خورماڵ سیروان و بیارەیان دابڕی لەسلێمانی، ناوچەکە واتە نێوان سنووری ئیدارەی هەڵەبجەو و ناحیەی سەیدسادق بوو بەمەیدانی شەڕ، لەوشەڕانەدا زیـانی گیـانی زۆر بەر هەرسـێ لایەن کەوت. جارجـاریش لەومـاوەدا واتە لەسـاڵی ١٩٩٤دا، چەنـدین جـار یەکێتـی پەلامـاری شـارۆچکەی هەڵەبـجە و سیروانی ئەداو ئەیگرتن دواتر پاشەکشەی دەکردەوە، هەروەهـا پـارتی و بزووتنەوەش پەلاماری شـارۆچکەی سەیدسادقیان ئەدا و ئەیـانگرت دواتـر پاشەکشەیان پێدەکرایەوە.

لەشـەوی ٢٢لەسـەر١٩٩٤/٨/٢٣دا هێزێکـانی پـارتی و بـزووتنەوە بە پاڵپشـتی تۆپخـانە و کاتیوشـاکانی سوپای پاسـداران و قەرارگـای ڕەمەزان هێرشیان کردە سەر سەنگەرەکانی یەکێتی لەناو ئاواییەکانی ناوگردان گامێش تەپەو گـردی حـاجی ئەولا و ئـاوایی حـاجی قـادر و دواتـر بەرەو نـاو شارۆچکەی سەیدسادق ، لەسەرتای ڕۆژی ٨/٢٣ دا هێزەکانی یەکێتی شکان و تاسەراوی سوبحان ئاغا کەوتە دەست پارتی و ;زووتنەوە، دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ یەکێتی پەلاماری دانەوە و هەموو ئەو شوێنانەی گرتبوویان لێیان سەنرایەوە، ئەمڕۆ چەندین فەرماندە و پێشمەرگەی یەکێتی بوونە قوربـانی لەوانە، فەرماندەی فەوج شەهید عومەری حاجی محەمەدی کوڵکنی و شەش پێشمەرگەی دەستەکەی، خاڵە کەریمی مۆریاسی، کەمالی مەلاکۆڵەی گولانی. چەندین پێشمەرگەش بریندار بوون، لەوانە مامەڕەشە.

لەڕۆژی ٨/٢٤دا یەکێتی لەناوچەی نەوڕۆلیەوە پەلاماری هەڵەبـجەی داو هێزەکان چوونە ناوشارەوە، بەڵام دەمەو ئێوارە دوبـارە پاشەکشـەیان کردەوە، تەرمی دوو شەهیدیشمان بەجێما، یەکێکیان عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلاتاهیر و ئەویتریان ئەفسەری ئاساییش و بەرپرسی هۆبەی خانەقین بوو. هاوکات لەگەڵ پەلاماردانی هەڵەبجەدا، لەشارەزوور و سەیدسادقیشەوە دوای

هێزە شکاوەکانی پارتی و بزووتنەوە کەوتن و پەلاماری ئاوایی قەدەفەری و گردی مەتا درا، لەم پەلامارەدا فەرماندەی سریە ئەحمەد بڕنەو شەهید بوو، دواتر لەناو ئاوایی قەدەفەریدا ١٦ شانزە سەربازی لیوای تایبەت بوونە قوربانی. لەکاتی پاشەکشەی ناوشاری هەڵەبجەدا ئەو هێزەی چووبووە ناو شارۆچکەی سیروان ئەوانیش گەڕانەوە بۆ ناوگردان، لەنێوان سیروان و ناوگردان دا لەلای پردی کۆنی زەڵمدا هەڤاڵ حەمەرەشیدی عەلی شەریف گوڵخە بەجەڵتەی دڵ شەهید بوو.

هەر لەدرێژەی پەلاماردانەکانی یەکێتی لەلایەک و بزووتنەوەو پارتی لەلاکەی ترەوە، لەشەڕیکدا کە شارۆچکەی سەیدسادق لەدەست یەکێتی دەرهێنرا، کۆمەڵێک پێشمەرگە لەهەردوولا بوونە قوربانی، لەوانە لە ڕۆژی ١٩٩٥/١/١ و سەرەتای ساڵی نوێ، کاک قادر کۆکۆیی و ئازادی کوڕی، قادر کۆکۆیی لەهەردوو شۆڕشی ئەیلول و نوێدا پێشمەرگە و فەرماندە بووە، پیاوێکی دڵسۆز بۆگەل و وڵاتی، پێشمەرگەیەکی بە دیسپلین، فەرماندەیەکی بە جەرگ و نەترس، نەک هەر خۆی، بنەماڵەو هاوسەرو منداڵەکانیشی دەربەدەری و ئاوەرەیی لەبن چیاو و ئەشکەوت و ئێران و کۆچ و کۆچبار و پێشمەرگایەتی و شەهید بوون پیشەیان بووە. بەڵام ئەم کۆستەی دواجاری ئەم بنەماڵە جێگەی داخ و پەژارەو حەسرەتی نەبڕاوەیە، ڕاوچیانی کورد کوشتن، لاشەی کوڕی نەوجەوان و باوکی پیرە هەڵۆیان پێکەوە خەڵتانی خوێن کرد.

بەداخەوە لەشەڕی ناوخۆ و شەڕی کورد بە کورد کوشتندا، دەیان فەرماندەی وەک کۆکۆیی پیرە هەڵۆ، پاش دەیان ساڵ شەڕکردن و بەرەنگار بوونەوەیان لەگەڵ دوژمنانی کورد و داگیرکەرانی کوردستان دا، سەدان نەوجەوانی سەرەتاو دەستپێکی کوردایەتی وەک ئازاد کۆکۆیی، ئەوان دواجارو ئەمان ئەوەڵ جار بوونە قوربانی بیری تەسکی حزبایەتی و پاوەنکاری و پاوەن خوازی.

## ٣١ ئابی ١٩٩٦

لەشـەڕی نـاوخۆی کوردسـتانداو لەدوای سـاڵی ١٩٩٣ وە، لەنێـوان بزووتنەوەو یەکێتی دا، دواتر لەسـاڵی ١٩٩٤ وە لەنێوان یەکێتی لەلایەک و بزووتنەوە و پارتی لەلاکەی ترەوە، درێژەکێشانی ئەم شەڕانە، بەپچڕپچڕی تا ساڵی١٩٩٨ و هانابردنی لایەنە بەشەڕهاتوەکان بۆ دەوڵەتانی دەوروبەر لەوانە ئێران، عێراق، تورکیا، هەتـا بـۆ ئەمریکا و بەریتانیـاش. لەم نێوانەدا پارتی دیموکراتی کوردستان بەقیادەی کاک مەسعود بەرزانی یـاریزانێکی سەرکەوتو و براوەی نێو مەیدانەکە بوو.

لەو هانا بردن و داوای یارمەتی کردنانەدا، سەرەتا هێنـان و دەست راکێشانی سوپای پاسدارانی ئێران بوو بۆسەر مەرزەکان و تۆپباران کردن و لێدانی هێزەکانی یەکێتی، لەقەڵادزە و پێنجوێن و خورماڵ و پردی زەڵم دا، ئەمە بـۆ پشـتیوانی بـزووتنەوەو پـارتی لەسـاڵەکانی ١٩٩٤ و١٩٩٥. یـان گواستنەوەو هێنان و بردنی هێزەکانیان ( پارتی و بزووتنەوە) لە هەڵەبجەوە بۆ مەریوان و لەوێوە بۆ پێنجوێن، یان بۆ سەردەشت لەوێوە بـۆ قەڵادزێ، کاتێـک لەودوو شـوێنەدا یەکێتـی دەری دەکـردن، ئێـران بەپـێچەوانەوە لە قەڵادزێ و خانەو پیرانشارەوە سەردەشتەوە بۆهەڵەبجە بەناوخاکی ئێراندا ئەیهێنانەوە پەلاماری یەکێتیان ئەدایەوە، یەکێتی پەلاماری لەشـارەزوورەوە ئەدانەوە. کێ ئەمە بەجاشایەتی و خیانەت ئەزانێ؟

یان ڕازی کردنی تورک و هێنانی بە هێزی پیادەوە، بە پشتیوانی تۆپ و تانک و فڕۆکەوە، بۆ دەرکردنی یەکێتی نەیاری پارتی، لە بەنی هەریر کەپک و زینەتیر و ئـالانە، لە شـەقڵاوە و شاخەسـوور و هیـران، لەدەورو بەری بەری ڕێگای هاملتۆن، لەڕەواندزو باڵەکایەتی .....تاد، کێ ئەمە بەجاشـایەتی و خیانەت ئەزانێ؟ زیاد لەوانەش پەنا بردن بۆ عێراق و سەدام و سوپاکەی و هێنانی ئەنجامدەرانی پرۆسەکانی ئەنفال و کیمیایی و بێسەرو شوێنکەرانی ٨ هەشـت هەزار پیـاوی بەرزانـی. هێنانیـان بـۆ سـەر پایتەختی کوردسـتان و

بارەگای پەرلەمان، بۆ دەرکردنی هاوپەیمانەکەی خۆی کەئێستا بووەتە نەیاری. کێ ئەمە بەجاشایەتی و خیانەت ئەزانی؟ لەگەڵیشیدا ڕازی کردنی ئەمەریکاو بەریتانیاو چاونوقاندن و داگرساندنی گڵۆپی سەوز تاهێزەکانی عێراق هێڵی ۳٦سی و شەش و ناوچەی دژەفڕین ببەزێنن، کێ ئەمە بەخیانەت دەزانێ؟ بەڕای من کاکی برا ئەوە نەخیانەتەو نەجاشایەتی، ئەوە یاریکردنێکی ژیرانەیە لەشەڕەکاندا بۆشکاندنی بەرامبەر.

ساڵی ۱۹۹٦ و ماوەیەک بەر لە ۳۱ ئاب هێزەکانی باشووری ڕۆژ هەلاتی سەر بەحزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بنکەو بارەگاکانیان لە قسلان کونەقەلی بناری بەمۆدا نەمابوون و هاتبوونە ئاوایی ناوتاقی نزیک بەدەربەندیخان و لەوێشەوە گوازرابوونەوە بۆ تانجەرۆ و کۆمەڵگای باینجان. فەرماندەو بەرپرسەکانی ئەم هێزانە ناسراو برادەرمان بوون. یەکێک لەوکەسانەی ناسراو هاوڕێی ڕاوشکارمان بوو ناوی بەهرۆزی مەنوچەریە، کەخەڵکی ئاوایی شۆشمێی سەرووە. ئەوکات بەبریاری پەرلەمان و حکومەتی باشوور، ئەم حزبە خەباتی چەکداری سڕکردووە، بەلام جاروبار مەفرەزەیان بەدزیەوە ئەڕۆنەوە بۆ ڕۆژهەلات.

بەر لە ۳۱ ئاب، ڕۆژێک بەهرۆز هات بۆلام داوای ئۆتۆمبێلەکەی لێکردم ئەوکات ماڵمان لەگەڕەکی ئاشتی شاری سلێمانی بوو، ووتی بەیانی ئەچم تادەربەندیخان، ئۆتۆمبێلەکەم نەدایە ووتم شۆفێرەکەی خۆم ئەتبات. شۆفێرەکە پێشمەرگەیەک بوو بەناوی عیسا مەحیەدین، بەیانی زوو ڕۆیشتن، بەهرۆز بەتەنها خۆی هات و عیسا سواری کردو ڕۆیشتن، دوای نیوکاتژمێر ئۆتۆمبێلەکە گەڕایەوەو لەبەر دەرگادا وەستا، بەهرۆز دابەزی و داوای تفەنگی تاپڕی شکاری کرد کاتێک تفەنگەکەم بردە دەرەوە کەسێکی تریان لەگەڵ بوو.

ئەوان ڕۆیشتن، دواتر زانیم بەهرۆز چەکوچۆڵەی مەفرەزەیەکی بەسەیارەکەی من بردووە بۆ سەرسنووری بەمۆ، مەفرەزەکەش بەبێچەک سواری پاس بوون و بەرەو مەرز ڕۆیشتوون. لەوێ چەکەکانیان وەرگرتوەو چوونەتە ناو ئێرانەوە. پاش نیوەڕۆ بەهرۆزو عیسا هاتنەوە، سەیارەکەیان هێنایەوە. دوای ئەمە هەفتەیەکی نەبرد لەقەلاچوالانەوە ئاگادار کرام، مام جەلال داوات دەکات، چووم گەیشتمە پێشەوە بینیم مام جەلال تورەیە، کاک

فەرەیدون عەبدلقادرو کاک عومەر فەتاح لەلای مام دانیشتبوون، سلاوم کرد مام جەلال بەتورەی و بەدەنگی بەرز وەلامی دامەوە، لەدلی خۆمدا ووتم چی قەوماوە، هیچ شکنابەم، بەتورەیی و بەدەنگیبەرز ئەیوت لەیەکێتی دەرت دەکەم و زیندانت دەکەم و....تاد، کاک فەرەیدونیش بەئاماژە بۆمن ووتی قسە نەکەی، لەدلا ئەموت قسەی چی، نازانم مەسئەلە چییە، من تائەوکاتە دانەنیشتوم و بەبێدەنگی بەپێوە وەستاوم، مام جەلال بەرەبەرە هێواش بووەوە، کاک فەرەیدون ووتی دانیشە دانیشتم، دوای کەمێک مام جەلال ووتی بۆ وازمان لیٚ ناهێنی؟ بۆ وامان لیٚ ئەکەی؟....... جەناب . ووتم چیبووە مام جەلال؟ وەلامی نەدامەوە، کاک فەرەیدون ووتی بۆ بەسەیارەکانت مەفرزەی دیموکرات رەوانەی سەرمەرز ئەکەی، نازانی ئێمە کاتی ئەوەمان نییەو........تاد ؟ مام جەلال ووتی عێراق دوژمنمانە، تورک دوژمانە، پارتی و بزووتنەوە شەرمان دەکەن، دەورمان دراوە خەلکی کوردستان دوو حەسارى لەسەرە یەکێک لەلایەن عێراق و یەکێکی تر لەلایەن پارتیەوە، تەنها ئەم نەفەسەمان ماوە(مەبەستی ئێران بوو) تۆش ئەمەمان لیٚ ئەگری، ئەمە سەردەمی شاخ و شەری پارتیزانی نییە، بە ئارەزووی خۆمان شەری ئەم دەولەت و ئەو دەولەت بکەین، بەرپرسیاری و ئیدارە و ژیان و گوزەرانی خەلک لەسەر شانمانە. یەکێتی و ئەم خەلکە ناکەم بەقوربانی جەنابت، قۆلبەست دەکەم و تەسلیمی ئێرانت دەکەم.

دوای سائێک بێ دەنگی، ئەوجا کاک عومەرو کاک فەرەیدون ووتیان ئەوە ئێستا جەعفەری لێرە بووە، گلەی کردووە، مەفرەزەیەکی دیموکرات لەناوچەی رِوانسەر لێیان گیراوە وتویانە بەسەیارەکانی حەمەی حەمەسەعید ئەمانهێنن بۆسەر سنوور، ئەگەر تائێستا ئەوکارەت کردووە لەمەودوا مەیکە؟ تائەوکاتە من بێدەنگ دانیشتبووم، کەقسەکانی ئەوان تەواو بوو، نەمویست مناقەشیان بکەم، چوونکە ئەمزانی مام چەندە توورەیە، ووتم باشە بەسەر چاو. ئیتر دوای کەمێک مام جەلال خەریکی نامە خوێندنەوەو کاغەزەکانی سەر مێزەکەی بوو، ووتیان بەمن تۆ برۆو ئێوارە وەرە بۆمالی کاک فەرەیدون بۆ سەر چنار.

ئێوارە سەردانی کاک فەرەیدونم کردو پێکەوە لەو بارەوە قسەمان کرد، ووتی مام جەلال تۆی خۆش ئەوێت، بروا بکە ئەم بارودۆخە لەم کاتەدا

کەبەسەر یەکێتیدا هاتووە، هەرکەسیتر بووایە بەو شێوە ئێرانییەکان گلەیان لەسەر بووایە، مام سزای ئەدا. لەوێ زانیم ئەو مەفرەزە ئەوانە بوون بەهرۆز بردونی بۆ بەمۆو سەر سنوور، دواتر کە چوونەتە ناو ئێران، لەئاوایی بیاشوشی نێوان جوانڕۆو رەوانسەر کەوتونەتە کەمین و یەکێکیان گیراوە بەناوی خەلیل، ئەو بووە لەگەڕانەوە بۆ تاپڕەکە لەگەڵ بەهرۆزدا هاتوەو زانیویەتی ئۆتۆمبێلەکە هی منە. منیش راستی بردنی سیارەکەو گواستنەوەی چەکوچۆڵە پێی و ڕۆیشتنی مەفرەزەکە، عیسا بۆی باس کردبووم. کاک فەرەیدون ووتی ئێمە دژی کوردی ئێران و کۆمەڵە و دیموکرات نین، هاوکاریمان کردوون یارمەتیمان داون پشتیوانیان بووین، بەڵام ئەوە سەردەمێکی تر بووە، ئێستا سەردەمێکی ترە، ناتوانین دژایەتی ئێران بکەین. منیش ووتم کاک فەرەیدون، ئەزانم، بەڵام ئەوە یەکەم جارو دواجاریش بووە، بۆشم باس کرد کەچۆن چۆنی بەهرۆز ئەو ئۆتۆمبێلەی بردووە، لە راستیدا فێڵی لێکردوم ئەوە دووبارە نابێتەوە دڵنیابە. ئەویش ووتی زۆرباشە برۆ خوات لەگەڵ، خۆم قسە لەگەڵ مام جەلال دەکەمەوە، تۆش ئەبێ ئاگات لەخۆت بێت، ووتم باشە بەسەر چاو، لەماڵی کاک فەرەیدون هاتمە دەرەوە.

لەوکاتەدا من ئیشی فەرمیم نییە، خولی کۆلێژی سەربازی قەڵاچوالان کرابووەوە، بۆ فەرماندەکانی سەردەمی شاخ و پارتی زانی، چووم بووم بەخوێندکاری خولەکە، لەوێش بوومە ئەقدەمی خولەکە.

لەوماوەدا هێزەکانی پارتی لەهەموو بەرەکانی شەڕدا شکابوون و شپرزە بووبوون، لەقۆڵی هەڵەبجەوە چەند جارێک هێرشیان کردبوو بۆ سەیدسادق و شکابوون، لە١٧ی ئاب بەدواوە لەدۆڵی خانەقا و گەلاڵە و لەچۆمان و حاجی هۆمەران و ناوچەکەو داروسەلامیش ڕاونرابوون، کاک نیاز دەرگەڵەییش بەخۆی و لیوایەکەوە هاتەپاڵ یەکێتی و ناوچەکەی تەسلیم کرد. یەکێتی لەگەڵ ئێرانییەکان رێککەوتووە و وەک جاران نییە سنوورەکانی لێ ببەستێ و تۆپ بارانی هێزەکان بکات، ئەوەش نییە پارتی هاواری لێ هەستاو، ئەیوت سوپای پاسداران هاتون و پشتیوانی یەکێتی دەکەن، ئەمەی کردە بیانو بۆ هێنانی عێراق و گرتنی هەولێر و دەرهێنانی لەدەستی یەکێتیدا لەرۆژی ٣١ ئابی ١٩٩٦.

ئالەم کاتانەدا پارتی یادی پەنجا ساڵەو کۆنگرەشی کرد، هەردووکیان ئامادەکاری بوو بۆ هێرشێک، چوونکە هەڕەشەیان دەکرد، لەگەڵ ئەم ئامادەکاریانەشدا ژێر بەژێر لەگەڵ عێراق دا خەریکی ئامادەکاری بوون بۆئەنجام دانی ئۆپەراسیۆنی ۳۱ی ئابی ۱۹۹٦ بوو.

لەگەڵ ئامادەکاریەکانیشیدا هاتو هاوارو سەروسەدایەکی ئێجگار زۆری بەرپاکردو شکانەکانی لەشەڕگەکاندا خستە سەرسوپای پاسدارانی ئێران بێ ئەوەی ئەسڵ ئەساسی هەبێت، پاسدار بەشداری شەڕیان کردبێت، یەکێتی لەوکاتەدا سەرکەوتوو بوو، هێزەکانی پارتی شکاو و لە هەموو بەرەکاندا هەڵدەهاتن، چاودێرانی سیاسی و سەربازی پێشبینی ئەوەیان دەکرد یەکێتی پەلاماری سەلاحەدین بدات و پارتی بچێتە ئەوبەر زێ و لەم بەر نەمێنن، کەچی یەکێتی هێزەکانی پێچایە ناوچەکانی سیدەکان و برادۆست.

لە۲۳ی ئابدا یەکێتی هێرشی بەرفراوانی کردە سەر دەوروبەری ڕەواندز و سەر چیای جوندیان و گرتیان. یەکێتی لەو باوەڕەدا نەبوو ئەمریکا ڕێگا بدات عێراق هێرش بکاتە سەر هەولێر[1]، لەگەڵ ئەمەشدا ئەمریکا داوای کردبوو لەیەکێتی ئەو شوێنانەی لەدوای ۱۷ی ئابەوە دەستی بەسەردا گرتوون چۆڵیان بکاتەوە.

لەوکاتەدا ئۆپەراسیۆنی ۳۱ ئاب بۆسەر هەولێر دەستی پێکرد، هەڤاڵانی خوێندکاری کۆلێژی سەربازی قەڵاچوالان مۆڵەت دراین، چوونکە زۆربەی خوێندکارەکان فەرماندە کۆنەکانی هێزی پێشمەرگە بوون، هەرکەسەو چووەوە بۆ سنووری خۆی، منش چوومەوە بۆ شارەزوور، ئەو ڕۆژە گەیشتمە سەراو، ئێوارەی ڕۆژی٦/٩/١٩٩٦ بوو. لە سەراوی سوبحان ئاغا، کاک شەوکەتی حاجی مشیر بەرنامەی هێرشێکی بۆسەر پارتی لەئاواییی گردەنازێ و عەلیاوا دائەنا. چوومە لای و ووتم کاک شەوکەت لەچ قۆڵێکەوە پێویستە تامن بچم لەگەڵیان، ووتی پێویست ناکات هەموو قۆڵەکان

---

[1] – لەکتێبی دیداری تەمەندا، بەشی دووەم لاپەڕە۲٤۹ بۆ۲٥۹ بەڕوونی مام جەلال باسی ۳۱ ئاب دەکات، وەلەم بارەوە بەوردی باسی کردووە، پێویستە خوێنەر ئەوکتێبە بخوێنێتەوە. لەوێدا ئاماژەی بەوە کردووە کەئەمەریکا بەڵێنی داوەو ووتویەتی هێزی عێراق جوڵە بکات بەئاراستەی هەولێر لێی ئەدەین، هەرئەوەش بووەتە هۆکاری دڵنیایی یەکێتی و لەوباوەڕەدا نەبووە عێراق بتوانێ بێتوو هەولێر بگرێت.

بەرپرسی خۆیان لەگەڵە. منیش بە پێکەنینەوە ووتم وەک بەرپرس نا وەک پێشــمەرگەیەک، ووتــی ئــارەزووی خــۆتە لەگەڵ کــێ ئەڕۆی بــڕۆ. ئەم بەرخوردەی کاک شەوکەتم پێناخۆش بوو. ئەویش لەوەوە هات نەیئەتوانی تازە هیچ کەس لەو کەسانەی بەرپرسی قۆڵەکان بوون لابات.

هێزەکان شەو کەوتنەڕێ بۆئەوشوێنانەی بۆیان دیاری کرابوو، مـن لەگەڵ ئەوانەی گردەنازێ ڕۆیشتم، نەمهێشت بەرپرسـی قۆڵەکەش بزانـێ، وەنەش هاتبوو لەگەڵ هێزەکەیدا. دەمەو بەیانی ئاواییەکەو دەورو بەری گیرا، بارەگـایەکی بـزووتنەوەی ئیسـلامی لەنـاو ئـاوایی گردەنازێدا بـوو، ئەوان شەڕیان نەدەکرد رێککەوتنێک کرابوو لەگەڵ بزووتنەوە، دەمەو بەیانی بوو پێشمەرگەیەک بەناوی عەزیزعەبدولقادر حەسەن(عەزەمەجەی گەلالی)شەهید بوو، چەند پێشمەرگەیەکیش بریندار بوون، یەکێکیان سالح برای مام عەزە بوو لاقی شکابوو ناردنمانە دواوە، مام عەزە حەمەی کوڕی سەرتیپ بوو، نەڕۆیشـــت لەگەڵ تەرمەکەی بـــاوکی، لەم کـــاتەداو بەر لە هێرشـــەکە دەنگوباسێک بلاو بووەوە گوایا پارتی لە هەڵەبجە داوایان کردووە مۆڵەتیان بدەن تـا ٢٤ بیست و چوار کاتژمێر دوای ئەوە تەسلیم ئەبن، دیارە ئەمە بۆئەوە بووە ئێمە لەم هێرشـە ساردبینەوە تـا ئەوان ئەنجامی هێرشـەکەی عێراق بۆ سەر هەولێریان بۆ دەرکەوێ بزانن ئاخۆ بەرەو سلێمانی دێن یان نا .

بەرلەنیوەڕۆ بارەگاکەی بزووتنەوە ووتیان لە هەڵەبجەوە بەجادەدا وەفدێکی بزووتنەوە دێت ئاگادربن تەقەیان لێ نەکەن، ووتمان باشە. ئاگاداری ئەو مەفرەزەمـــان کـــرد لەســـەر جـــادە و ڕووبەڕووی ئـــاوایی قەیەفەری سەنگەریان گرتووە. وەفدەکە هاتن، هاتن و چوونە بارەگاکەی خۆیان، دوای کەمێک داوایان کرد من لەگەڵیان دانیشم، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی خۆمان چووم لەبارەگاکەیاندا کۆبوونەوەیەکمان کرد، یەکەم جار ووتیان پارتی داوا ئەکاو بە ئێمەیان ووتوە پێتان بڵێین ئەگەر لێرە زیاتر نەچنە پێشـەوە، ئەوا ئەوان شەڕناکەن. دووەم ووتیان ئەوە شەڕەو نازانین چی دەبێت، ناکرێ ئەم بارەگای ئێمە لێرەدا لەنێوان ئێوەو پارتیدا بێت، ئەمانەوێت بیپێچینەوە و بچین لەمزگەوتێک یان ماڵێک لە سەیدسادق بین تابارودۆخەکە ئەبرێت بەبارێکدا، منیش ووتم زۆرباشە، دەستیان کرد بەخۆکۆکردنەوەو ئێمەش هاتینە دەرەوە.

کاتێک ویستیان لەئاواییی دەرچن لەباتی ئەوەی بەرەو سەیدسادق بڕۆن هاتن بۆلای ئێمەو بەرەو هەڵەبجە دەڕۆن، ووتم بەپێشمەرگەکان رایان گرن، وەستان سێ ئۆتۆمبێلیان پێ بوو چەندکەسیان دابەزین، ووتم بڕیار بوو بۆ سەیدسادق بڕۆن ووتیان ئێرەو سەیدسادق جیاوازی نییە و هێزەکانی یەکێتی لەسنوورەکەدا بڵاون نەوەک برادەرانمان توشی کێشە ببن، بیان بەینەوە بۆ هەڵەبجە باشترە، منیش ووتم فەرموون بڕۆن، کاتێک سواری سەیارەکانیان بوونەوە، ئەندامێکی وەفدەکەی بزووتنەوە، پیاوێکی باڵابەرزی پێکەوتەی گەنم ڕەنگ بوو، کاتێک خواحافیزیان کرد خۆی گرتە دواوەو ئاخر کەس ڕۆیشت، دەستی دابەدەستمەوە دەستی گوشیم و بردمیەلاوە ووتی، هەرئێمە گەیشتینە قەدەفەری ئەوان هێرشتان بۆدەکەن، وریابە چوونکە بەئێمەیان ووتووە پارتی و عێراق لە هەولێرەوە بەرەو کۆیە دێن، ووتم باشە زۆر سوپاس ئێوە بڕۆن ئێستا ئەیکەینە گۆڕستان بۆیان. ئەو ڕۆیشت و من نەم پرسی تۆکێیت، لەیەک دوو پێشمەرگەم پرسی ووتم ئەم پیاوە کێی بوو؟ ووتیان نایناسین، دواتر لە ڕێک کەوتنێکی ئێمەو بزووتنەوەدا، وەفدی بزووتنەوە کاک عەبدولڕەحمان عەبدرەحیم و چەند کەسی ترو ئەو پیاوەشیان لەگەڵ بوو کە بەمنی ووت هەر ئێمە ڕۆیشتین پارتی هێرش دەکەنە سەرتان، دوای گفتوگۆو قسە کردن دانیشتبووین بەهێواشی لەکاک عەبدولڕەحمانم پرسی ئەو پیاوە کێیە؟ ووتی چۆن کاک ڕەوف گرێزەیی فەرماندەی هێزی شارەزوور ناناسی، خۆم تەریق نەکردەوە ووتم با ناوەکەیم لەبیر چوبوو.

بابێمەوە سەر باسەکەی خۆم، پێشمەرگە بڵاوەیان کردبوو بەئاویداو لە پەناو پەسوێ و بندیواراندا دانیشتبوون ماندو بوون، شەهید مەهدی ونوری خێڵ حەمەی و ئازادی حاجی عومەر و هادی عەبەی عەزیز نەورۆڵی و چەند هەڤاڵی ترم بانگ کرد و دابەشم کردن و ووتم ئامادەبن هەرئێستا پەلامای ئاوایی دەدەن، فریانەکەووتین مەفرەزەکانی تر کە لەوێ بوون دامەزرێنین، ئاواییان دایە بەرتۆپ و هاوەن چەند پێشمەرگەیەک شەهید و بریندار بوون یەکێک لەشەهیدەکان کوڕێکی کوڕانە بوو بەناوی سیامەند. شەڕدەستی پێکردو هەردوولا لەناو ئاواییدا تێکەڵ بووین.

ئازادی حاجی عومەر بریندار بوو بەچەند پێشمەرگەیەکم ووت بیبەنەدواوە، ئەفسەرێک هاتبوو سەیارەیەکی لاندکرۆزی پیکابی پێبوو ئازوقەی هێنابوو، ئەیویست بگەڕێتەوە ووتم نەڕۆی ئەم دووبریندارە بەرە، دووبریندار لەسەر جادە قیرەکە کەوتبوون، ئەیوت پەلەمە نەئەوەستا بە زۆر هێنامەدواوە، ویستم لێیدەم ووتی کاک حەمە خزمی ماڵی ڕەحیم ئێلانقۆزیم، ووتم باشە بەس بریندارەکان بەرە دواوە.

بەرپرسی ئەو دەستەی لەوبەری جادەوە واتە لەبەری قوڵخوردەوە دامنابوو ئاگای لێبێت پارتی دەستی نەگاتە ئەو بڕکەماڵە پشتی جادەی ئاوایی گردەنازێ، هەردامناو هاتمە ئەمبەرەوە لامکردەوە ئەبینم پێشمەرگەکان هەڵدێن بەرەو سەیدسادق بانگم کردنەوە ئەوە بۆ کوێ ووتیان ئەوە فلانەکەس بەرپرسمانە ڕۆیشت، گێڕامنەوەو بردمنەوە شوێنی خۆیان، هاتمەوە بۆلای مەهدی کاتێکم زانی، پارتی لەناو ماڵەکانی ئەوبەردان، نوری و مەفرەزەکەی دوبارە رایان کردبوو، پارتی هاتبوونە شوێنەکەی. شەڕ گەرم بوو، هەردوولا هەوڵمان ئەدا ئاوایی لەدەست خۆمان دابێت، لەوکاتەدا پیکابەکە هاتەوە، پێشمەرگەیەک هاتوو ووتی فیشەکم هێناوە کاک شەوکەت ئەم نامەشی دامێ ووتی بیدەرە حەمە، نامەکەی بەدەستەوە بوو، وەرم گرتوو خوێندمەوە، کاک شەوکەت بۆ منی نووسی بوو ناوەرۆکەکەی دەست خۆشی و داوای لێبووردنیشی کردبوو بۆ ئەوەی ئێوارە ساردبووە لەگەڵم، دیارە لەسەیدسادقەوە ئاگای لەبەرگریەکە بووەو لەوانەشی پرسیوە بریندارەکانیان بردووەتە دواوە کێ لە گردەنازێیە؟ دیارە وتویانە حەمە لەوێیە، بۆیە ئەو نامەی بۆ نوسیبووم .

پارتی لای نیوەڕۆ هێرشیان چڕکردەوە، ئێمەو چەند پێشمەرگەیەک مابووینەوە لە گردەنازێ لەگەڵ ئەو هێزەی بۆ قوڵخورد نەچوبوون و گەرابوونەوە، بەڵام پێشمەرگەی ئازا بوون، ماوەیەک بەرگریان کردو لێرەش شکاین، لەوکاتەدا پێشمەرگەیەک تفەنگەکەی فیشەکی بەرکەوتبوو میلەکەی قوفڵ بووبوو ناوی سۆران هەیاس و خاڵۆزامە، هاتبوو ئەیوت بۆم چاککە ووتم راکەبڕۆ دواوە چاک ناکرێت ئێستا ئێمەش دێین، ووتی ناڕۆم تائێوەش نەیەن، سۆران خوێندکار و کوڕێکی بەجەرگ بوو خۆبەخشانە هاتبوو. کاتێک بڕیارماندا ئێمەش پاشەکشە بکەین، بەرەو ئاوایی مەسەکان چووین و دواتر

بەرەولای ئاوایی گامێش تەپە بامانداپەوە بۆ سەرجادەی سەرەکی نێوان سەیدسادق و گردەنازێ. لەکاتی پاشەکشەکردندا، پێشمەرگەیەکی ئازای لای مەھدی برام بەناوی حەسەن شەمێرانی، رەشاشی بی کەی سی پێبوو، ماوەیک ئەڕۆیشت و دائەنیشت تەقەی دەکرد تائێمە ئەگەیشتینە لای دووبارە مەسافەیەکیتر ئەڕۆیشت و جێگیر ئەبوویەوە، بەوشێوە گام گام، تالەئاوایی دەری کردین. نەوەری حەمەی ئەول محەمەدیش مەفرەزەیەک و چەند برینداریکی دەرکردبوو پێش ئێمە ھەربەو شێوە.

لەکاتی گەرمەی شکانی ھێزێک لەبەرەیەکی شەڕداو پاشەکشە بۆ دواوە، زۆر زەحمەتە بتوانی لەمەسافەیەکی کەمەوە لەدوای ھێڵی بەرە شکاوەکەوە، بەخێرایی بەرەیەکی ترو ھێڵێکی تری بەرگری دروست بکەیتەوە، ئەمڕۆ من و ھەڤاڵەکانم وامان کرد. لەگردەنازێ ھەرچەندە بەرەی شەڕی یەک ڕۆژە بوو ھەر ئەو ڕۆژە گرتبوومان پاش نیوەڕۆ لێیان سەندینەوە، دوای دوو کاتژمێر ھێڵی نوێمان بۆ بەرگری لەنزیک ناوگردانەوە بۆسەر جادەی گشتی و بۆناو ئاوایی گامێش تەپە دروست کردەوە. بەکەمترین پێشمەرگە، زۆرجار ئەمە روئەدا بەڵام بەھێزێکی فریاکەوتنەوە، وەک ئێرانییەکان دەڵێن ھێزی تازەنەفەس. ئەم ھێڵی دووەمە ئەمڕۆ من شانازی پێوە دەکەم، لەبەر ئەوەیە بەھێزە شکاوەکەی گردەنازێ دووبارە ئەمەمان درووست کردەوە، شتێکی تریش کەھۆکاری سەرکەوتنەکەیە ھێزەکانی پارتی لەئاواییی گردەنازێ بەم لاوە بەدواماندا نەھاتن، خۆئەگەر ڕاست ئەو ڕۆژە بە جادەدا دوو ئۆتۆمبێل و ئۆتۆمبیلێکی ھەڵگری دۆشکا بھاتایە بەرەو سەیسادق نەک گامێش تەپە کە کەسی لێ نەمابوو، سەیدسادقیش چۆڵی دەکرد، ھەرچەندە چەندین ئەندامی سەرکردایەتی و چەندین فەرماندە و ھێزێکی زۆر لە سەیدسادقدا بوو.

بۆ سەیدسادقیش ئەگیرا؟ خۆ ھێزی یەکێتی ئەتوانم بڵێم لە ڕۆژھەڵاتی ناویندا بەناوبانگترین ھێزی شەڕکەری مەیدان بوو بۆ ئەو سەردەمە[1]. چوونکە ئەندامانی سەرکردایەتی و بەرپرسەکان پەلامارەکەی عێراق و پارتی بۆ سەر

---

1_

هەولێر و گرتنی پشتی شکاندبوون. بەڵێ ئێستا هێزی قارەمان و پەلاماردەری بێوێنەو چاونەترسی کوردستانی وا پەیدابوون، نەک لە خاوەرمیانەدا بەڵکو بێ وێنەن لەسەرتاسەری جیهاندا، ئەوانەش وەک هێزەکانی شۆڕش گێڕی پەیەدە و یەپەژەن بەڕاستی من شانازیان پێوە ئەکەم.

بەڵام بەگومانیشم، کورد میللەتێکی بێکەسە، هەرچەندە خاوەنی هێزی وەک هێزی ڕۆژئاواو خاوەنی هێزی پێشمەرگەی وەک باشووری کوردستان و باکوریش .... بێت، بەلام دوورنیە سیاسەتی بەرژەوەندی خوازی ڕسوایی نێودەوڵەتی بەتایبەتی ئەمریکاییەکان و ڕوسەکان، دواجار ڕەنج بەخەسارمان کەن لەدوای شکانی تیرۆر، ناڵێم لەدوای تەواو بوونی تیرۆر، چوونکە تیرۆر فکرە کۆتای نایەت، ئەشکێ، لاواز ئەبێ، ون ئەبێ، خۆحەشار ئەدا، لەڕووی سەربازیەوە، بەڵام دواجار بەشێوەیەکی ترو لەجێگەیەکیتردا لەفۆرمێکی تردا سەرهەڵ ئەداتەوە.

ئەم هێڵە نوێیەی بەرگری، هەر ئەمڕۆ دوای دوو کاتژمێر وابەهێز بوو سەدان پێشمەرگەو دەیان فەرماندەی بۆگەڕانەوە، بەپێویستی ئەزانم لێرەدا دەوری دوو کچی قارەمان لەیاد نەکەم، ئەو دووکچە بوونە هۆکاری بەخشینی ورەو ئازایەتی بەئێمەو گەڕانەوەی هێزیش بۆ ناوچەکە، ئەو دوو شێرە کچە دوو کادری ئەوکاتی مەڵبەندی شارەزوورو هەردووکیان خەڵکی هەورامان بوون، تازە یەک کاتژمێری تێپەڕ نەکردبوو، لەدروست کردنەوەی خەتی بەرگری گـامێش تەپە، ئۆتـۆمبێلێکی پیکـابی شەقوشـڕ لەلای سەیدسـادقەوە بەرەو گامێش تەپە دەرکەوت بەوانەی دەورو بەرم وت: هێزمـان بۆهـات، گەیشتە پەنامان و وەستا، دوو کچەکە بەجلی پێشمەرگانەوە دابەزین، دەمانچە بەقەدو ورە لەدەم و چاویان ئەباری، دوای چاکوچۆنی و ماندو نەبوونی کردنی ئێمە، ووتیان ئەوە ئاو ئەوە نانیشمان بۆ هێناون، من نەم ئەزانی بەچ وشـەیەک، کەشیاوی ئەوان بێت هەستی نـاخم بۆیانـدەربڕم و چیـان پێبڵـێم؟ شـەهید مەهدی ووتی: مەڵبەند بەقوربانتان بێت، منیش هەر ئەوەندەم لەدەس هـات ووتم دایکم بەقوربانتان بێت، هەربژین هەر بژین........ لەدڵا داوای لێبووردنم لەدایکیشم کرد، دایکیشم گوناحە، لەسـاڵی ١٩٧٨ وە بەکردەیی پێشـمەرگەو بەشاخەوە بووە لەگەڵمان، ئەویش پێشـمەرگە و دایکێکی نەترس بـوو. لەو بارەوە، لەبارەی هەڵوێستیەوە شتێکتان بۆ ئەگێڕمەوە بەکورتی .

شەڕی ناوخۆ بوو، یەکێتی لەتەنگانەدا بوو، شکابووین، برادەرێک خۆی لائەدا لەشەڕەکان و بەرپرسیش بوو، ڕۆژێک دایکم هاتبوو بۆسەردانمان، بۆبەرەی شەڕ بەڕێکەوت ئەو برادەرەش هاتبوو بۆ سەردان، من و مەهدی و دایکم لەخەیمەیەکدا بووین، برادەرەکەش هات بۆلامان، دەستی کرد بەقسەکردن و ووتی من ئێوەم خۆش ئەوێت دنیا کەمی ڕۆشتوەو زۆری ماوە، با بەئازا ئازا نەتان دەن بەکوشتن ئێوەش وەک خەڵک بکەن ..............
لێرەدا دایکم قسەکانی پێ بڕی و پێیوت: یەعنی ئەتەوێ بڵێیت با کوڕی خەڵک شەهید بن و ئەمان ترسنۆکبن و شەرمەزاری لای ڕەفیقەکانیانبن، ئەمان بمێننەوەو دواجار لەجێگەدا بەپیری بمرن، دەی عەیب نییە پیاوی کورد لەجێگادا بمرێت، بەتایبەت بۆ من کوڕم لەناوجێگەدا بمرێت، هەستە سەگی سەگباب ئەزانم قیادە موەقەتە ناردویتی، دەنگی بەرز کردەوە ئەوە کوا جەبار فرمان......؟ مەهدی بەهەورامیانە ووتی، ئەیا (دایکە) عەیبە.....

کابرا حەپەساو بێ خواحافیزی لەخەیمەکەدا ڕایکردە دەرەوە، چەند برادەرێک نزیکی خەیمەکە بوون سەریان کێشا پرسیان ئەوە چیبوو؟ ووتمان هیچ نییە. هەرسێکمان بێدەنگ بووین و مەهدی ووتی لەبەیانییەوە (لەکاتی قسەکانەوە) یا ئەڵاو یا پێغەمبەرمە، هەر ئەمزانی دایکم قسەیەکی خراپ ئەکات. دووبارە دایکم وەڵامی دایەوە، ئەوە قسەی خراپە من ئەیکەم؟ یان ئەوەی ئەو جاسوسە ئەیکات.... بەئاماژەو برۆی چاو مەهدیم بێدەنگ کرد. دوای دایکم گەڕایەوە، مەهدی ووتی چاوت لێیە دایکم بەتەمایە تاکەی بمێنێ؟ ووتم تاکەی؟ ووتی ئەوەنییە ئەترسێ ئێمە بەپیری لەجێگەدا بمرین و ئەو شەرمەزار ببێت، دەستمان کرد بەپێکەنین .

هەردوای گەیشتنی کچەکان[1]، کاک جەمیل هەورامی بەهێزەوە هاتوو دەست خۆشی لێکردین و سەرەخۆشی لە کاکە حەمەی شەهید عەزەمەجە کرد هێڵی بەرگریەکەی قایم کرد. کاک جەمیل هەورامی لەتەنگانەدا پیاوێکی بەهیمەتە، ئێستاش سەرەڕای نەخۆشی و ئەو هەموو ماندوبوونە، هەر بەردەوامە و هەر بەنەفەسی سەرەتای خەباتییەوە ئیش دەکات. دوای کاک

[1]- دوو کچە کادرەکەی مەڵبەندی شارەزوور، یەکێکیان شلێر غەفور عیزەت بیارەی و ئەویتریشیان جوان عەزیز عەبدوڵا سۆسەکانەیی بوو،

جەمیل هەڤالانی کۆمیتەی سەیدسادق[1] و کاک شەوکەت و کاک شۆڕش ئیسماعیلیش هاتن بۆلامان،

## ٣١ئاب و ئاودیوبوون

چەند ڕۆژێک لەگەڵ هێزەکەدا لەگامێش تەپە ماینەوە، ئەو هەڤالانەی لەیادم دابێت، شەوی٨لەسەر٩ی/٩/ ١٩٩٦ شەهید فازل شیرەمەڕی، حەمەسیاسی، عەلی بچکۆل، شەهید مەهدی،....تاد پێکەوە بووین لەنێوان گامێش تەپەو قاینەیجەدا. دوای نیوە شەو پاسەوانەکان هەڵیساندم سەیرم کرد عەلی بچکۆل و برادەرەکانیش بەخەبەرن، پرسیم چیە؟ ووتیان وەرە تەماشای ئەو چراو چراخانە بکە، لە سەیدسادقەوە تا کەولۆس جادەکە ئەدرەوشایەوە، سەرەتا مەسیرەکە لەبەرچاوم گۆرابوو، وام ئەزانی لە سەیدسادقەوە بەرەو هەڵەبجە ئەڕۆن.

ووتیان خەڵکە بەرەو پێنجوێن ئەچن، دەمەوبەیانی دوو پێشمەرگەمان نارد هەواڵ بزانن، هاتنەوە ووتیان خەڵکی سلێمانی و شارەکانیترن بەرەو ئێران ئەڕۆن کاک حەسەنی مام سالحمان بینیوە ووتویەتی پێیان بڵێ ئەوە کاک شەوکەت و ئەوانیش ڕۆیشتن، دووبارە پێشمەرگەیەکی ترمان نارد بۆ لای کاک جەبار جەلال بەرپرسی کۆمیتەی رێکخستنی سەیدسادق، ئەویش گەڕایەوە ووتی برادەران لەکۆمیتە بوون ووتیان کاک جەبار چووە بۆ گامێش تەپە خەبەر بدات بە پێشمەرگەکان پاشەکشە بکەن. مەهدی ووتی بامن بچم بەدەم برادەرەکانمەوە بۆلای قاینەیجە، منیش هاتم بۆسەیدسادق کاک کەمال هەورامیم بینی ووتی سلێمانی چۆڵی کردووە، ئوتۆمبێلێکی پێبوو داوام کرد

---

[1]- ئەوکاتە کاک جەبار جەلال بەرپرسی کۆمیتەی سەیدسادق بوو، کۆمیتەکەیان چالاک و ستافەکەیان بەردەوام هاوکاری پێشمەرگە و شەڕەکانیان ئەکرد، لەوانە: هەڤالان شاخەوان ئەحمەد فەتحولا، حەمە زیرنجۆی، عومەری مەحمود ڕەشید و...تاد، ئەمڕۆ کاک جەبار جەلال دوای سەرەخۆشی حەمەی مام عەزە مەجە، ووتی حەقە ئەم هەڵوێستەی تۆ باوکت شەهید و مامت بریندار بووە بەڵام هەڤاڵەکانت بەجێ نەهێشتوە، بەئاوی ئاڵتون بنوسرێتەوە .

ووتم بمدەرێ بچم منالەکانم بهێنم لە سلێمانی ووتی ئەی خۆم چیبکەم، ووتم بڕۆ بۆلای مەهدی تائێستا دێمەوە، دیارە ڕووگیر بوو سەیارەکەی دامێ، خۆی بەپێ کەوتەڕێ بۆقاینەیجە.

لەڕێگە بەرەو سلێمانی تاکو تەرا ئوتۆمبێلمان ئەبینی، هەواڵی ناوشارمان ئەپرسی ئەیان ووت چۆڵە و هیچ باسێک نییە بەلام دەلێن یەکێتی بارەگاکانی خۆی لەقەلاچوالان سوتاندوە، گەیشتینە ناوشارو تاماڵی خۆمان لەئاشتی جار جار ئەمانبینی خەڵک لەدەرگاوە سەر ئەکێشن و ئێمە ئەبینن ئەڕۆنەوە ژوورەوە، بەڕاستی ترسمان لێنیشتبوو نەوەک لەجێگەیەکەوە تەقەمان لێبکەن، گەیشتینە بەردەرگاو دابەزین منالەکان لەحەوشەدا لەگەل دایکیان خەریک بوو زیرە بکەن ڕەنگیان زەرد بووبوو، منیان بینی هاتنەوە سەر خۆیان، بەپێکەنینی نائاساییەوە ووتم نەترسن هیچ نییە وەرن سەرکەون، منالەکان بچکۆلانە بوون دانیال تەمەن شەش سال و سەریال سێ سال و ژیوار یەک سالان بوو. دەرگامان داخست و کلیلەکانمان دا بەماڵی کاک ڕەحیم ئێلانقۆزی دراوسێمان، زوگەڕامەوە بۆسەیدسادق، لەجادەی پشتەوە بەرەو شانەدەری گەیشتینە فەرعەکەی قاینەیجە، مەهدی لەوێ ئامادە بوو، ووتی پاشەکشەمان کردووە ئەوە هێزەکەم خستووەتە ڕێ بەرەو ناڵپارێز، بەلام دوو سێ ڕەبیەمان ئالای زەردیان هەلکردووە نەهاتوون، لەوێ ئەو دوو پێشمەرگەم پێبوو دامبەزاندن و ووتم لەگەل مەهدی وەرن، کاک کەمال هەورامیم سوارکرد ئێوارە چووینە پێنجوێن ئێمە دابەزین و ئۆتۆمبێلەکەم تەسلیمی کاک کەمال کردەوە و سوپاسم کرد، لەناو پێنجوێندا خەڵک و پێشمەرگە بەناویەکدا دەهاتن و دەچوون، کەس لەکەسی نەئەپرسی، پرسیاری کاک شەوکەت و برادەرانمان کرد ووتیان چوون بەرەو گەرمک، وتویانە پێشمەرگە بەرەو ئەوێ بێن، بەلام کاک حەمەی حاجی مەحمود لێرەیە، بارودۆخێکی ناخۆش پاشەکشەیەکی ئابڕووبەرانە بوو.

بێ ئەوەی کەس بەدواتەوە بێت یان تەقەیەکت لێبکرێت سەدان کیلۆمەتر چۆل بکەیت، ئەوهێزەی پارتی لە سنووری هەلەبجە، نزیکترین خال لێیانەوە سەیدسادق بوو، چۆلیش کرابوو نەدەهاتنە ناوی.

من لەدلا بڕیارم دا بەرەو باشماخ بچم، کەوتمە ڕێ لەلای ڕاوگانەوە بۆ ناو شار بەرێگادا ژیوار بەکۆلمەوە سەریال بەدەستمەوە کاک ئەحمەد

قەدەفەری و کاک عەلی بچکۆل بەئۆتۆمبێلێکەوە دایان بەلاماندا، بانگم کردن و داوام لێکـردن کەمێـک ئەم منـاڵانەم بۆنزیـک کەنەوە، هەر وەڵامیشـیان نەداینەوە، ئەوەندەی نەبرد لەوسەرەوە گەڕانەوە، پرسیان بۆکوێ ئەڕۆی؟ ووتم بۆ باشماخ، ووتیان ئێمە ئەچین بۆ سەیرانبەن، دواتر دەرکەوت ڕاستیان نەکرووە، گەڕابوونەوە بۆ دۆڵـی بـووزان و چووبـوون بـۆ لای هەڤـاڵانی سۆشیالیست.

کاکە حەمەی حاجی مەحمود لەکتێبی (ڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەک) دا لەلاپەرە(٥٨٣) دا ئەنوسـێت (( لەو مـاوەیەدا زۆرێـک لەبرادەرانـی یەکێتـی هەوڵیان ئەدا بێنە لای ئێمە بەڵام وەرمان نەگرتن، ووتمـان ئەتـوان بمێنەوە خەلیل سەرکانی و عەلی بچکۆل و ئەحمەد هاتبوون و دواتر تەسلیم بەپارتی بوونەوە، هەروەهـا هەندێکی تـر نامەیـان ناردبوو ئێمە تەسـلیمی پارتیـان کەینەوە ووتمان ئێمە کەس تەسلیم ناکەینەوە، کێ تەسلیم دەبێتەوە خۆی بڕواتەوە خۆ ئێمە نەقلیات نین...)) .....تاد، هەر لەوێدا کاکە حەمە دەڵێت ئەگەر ئەوانە بڵـێن وانیـیە ناوەکانیـان بـڵاو دەکەمەوە. ئەو کـادرانەی کـاکە حەمە باسیان ئەکات داوایان کردووە تەسـلیمی پارتیـان بکـات، سـەربە مەڵبەنـدی ڕێکخستنی شارەزوور بوون، زۆربەی کادرەکانی یەکێتی ئەیانناسن و ئەزانن کێن، نامەی یەکیشیان لەگیرفانی ئەحمەد قاجرید گیرا، ئەحمەد پێشمەرگەی پـارتی بـوو لەگەڕانەوەی هێزەکانی یەکێتیـدا کـوژرا بـوو لەنزیـک ناڵپـارێز، نامەکەیان هێنا بۆ کاک شەوکەتی حاجی موشیر، من کۆپیەکیم لێ وەرگرت. دواتر یەکێک لەوبرادەرانەو خاوەنی نامەکە کە بۆ برادەرانی پارتی نوسیووە ناوەڕۆکی نامەکە داوا ئەکات زەمینەیان بۆ ساز بکەن تا بگەڕێنەوە و تەسلیم بینەوە. نامەیەکی بۆمەکتەبی ڕێکخستن نوسیبوو بۆ پاکانە کردن، بەبیرم دێت لەنامەکەدا زۆر بەبێ شەرمانە و بەتەعلیقەوە نوسـیبووی ئەو پیـاوە بەرزە پروپاگەندەمان بۆ ئەکـات، مەبەسـتی کـاک شـەوکەتی حـاجی موشـیر بـوو. نوسەری نامەکە ئەوە یەکەمجاری نەبووە، چەند هاوڕێی ئەوکاتی هەن، ئەڵێن لەسەر هەڵبژاردنێکی ناو مەڵبەندەکە کۆی کردوینەتەوەو داوای لێکردوین لەگەڵیـا بچین ببین بە پـارتی، بەڵام ئێمە پەشـیمانمان کردەوە، بەهەرحـاڵ ئەوشتانە، لەناو حیزبەکەی ئێمەدا گرنگ نیـن، گرنـگ ئەوەیە وەلات بـۆ کـێ

هەیە، ئەوانە ئێستا پۆستی باڵاو تایبەتیان هەیە. دەقی ئەونامەم لەبەڵگەنامەکاندا دانابوو لەسەر داوای هاوڕێم ئەنووەر بازگر لام برد.

بەڵێ مەهدی و کۆمەڵێک پێشمەرگە، هەر دوای ئەوە ئێمە بەجێمان هێشتبوون، لەجادە لایانداوەو بەناو ئاواییەکاندا بەپێ هاتوون، ووتیان بزووتنەوەی ئیسلامی چاودێری دەکردین، هاتوون بەسەیارەیەکەوە داویانە بەلاماندا‌و دواتر گەڕاونەتەوە، ئێمەش نەمان ویستووە، دەرگیر بین لەگەڵیان ئەگینا چەکمان دەکردن و بەسەیارەکەی ئەوان پێشمەرگەکانمان بە دوو سێ کاروان نزیک دەکردەوە، بۆیە وامان بەباش زانی لە جادەی سەرەکی دوور بکەوینەوە.

کاکە حەمەی حاجی مەحمودیش لەو بارەوە لە ڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەکدا لەلاپەڕەی ٥٨١ دا نوسیویەتی ( لەناڵپارێز بووین دوجار سەیارەی بزووتنەوەی ئیسلامی لەپێش هێزەکانی پارتییەوە هاتن و لاندکرۆزێکی سپی و سۆپەرێکی ١٩٨٢ بوو کاک حەمەدۆلاشی ناسینی....تاد). لەدرێژەی بابەتەکەیدا کاکە حەمە دەڵێت بزووتنەوە جاران بەنهێنی جاسوسیان بەسەرەوە دەکردین بۆ پارتی بەڵام ئێستا بەئاشکرا ئەیکەن.

ڕۆژی ١٩٩٦/٩/١١ من لە باشماخ بووم منداڵەکانم لای منالی دۆست و ناسراو داناو گەڕامەوە بۆ پێنجوێن ئەمویست کاکە حەمەی حاجی مەحمود ببینم بزانم ئەگەر دەچێت بۆ سورێن لەگەڵ ئەودا بڕۆم، چوونکە ئەترسام بچمە ئەو بەری سنوور، لەسەر گلەییەکانی سەردار جەعفەری لای مام جەلال کردبووی. ئەم بابەتەم پێشتر باس کردووە، کاکە حەمە لەوێ نەمابوو، پێنجوێنیش خەڵکی کەمی لێمابوو چۆڵ بوو بوو، لەپڕبووە فڕکانفڕکان ووتیان ئەوە هێزی پارتی هاتنە ملەکەوە، گەڕامەوە بۆ سەر سنوور زۆر قەلەق بووم، دوای یەک کاتژمێر پارتی گەیشتنە سەر سنوور هەر بەسواری ئۆتۆمبێل تاکوتەرا پێشمەرگەی متەفەریقە لەباشماخ دا بوون، هێزەکان هەموو بەرەو دۆڵیی شلێر و سەیران بەن ڕۆیشتبوون.

ئەوانەی گەیشتنە باشماخ پەلاماری ئۆتۆمبێل و دوکانەکانیان ئەدا، زیاتر بۆ تاڵان و شڕە خۆری ئەگەڕان، ئاگایان لەخۆیان نەمابوو، لەهەر شوێنێکەوە دوتفەنگ تەقەی لێبکردنایە ڕایان دەکردە دواوە، وەک ئەوەی ئەمڕۆ لەباشماخ ڕویدا.

پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ، هێزێکی پارتی خۆی کرد بەناو ئەو هەزاران ژنومندالانەدا کەلەسەر سنوورەکە تائەوکات ئێران دەرگای بۆنەکردبوونەوە، قائیمقامی پێنجوێن خوالێخۆش بوو جەمال جەلال خەریک بوو گفتوگۆی دەکرد لەگەڵ بەرپرسانی ئێران بۆکردنەوەی سنوورەکە بەروویاندا، چوونکە خەڵکەکە برسی بوون، دووڕۆژ بوو بێنان و ئاو بوون، ئێرانیش دەرگاکەیان نەدەکردەوە..

لەوکاتەدا ژن و منداڵ لەسەر مەرزەکەو زۆر لەپێشەوە هاتوو هاواریان بەرزبووەوە، من و چەند کەسێکی تر لەدواوە بووین، لەوانە کاک ئازادی کوڕی مام غەفو، مام غەفور پێشمەرگە و تێکۆشەری دێرین و خۆشەویستی جووتیارانی دەشتی هەولێر و چیای قەرەچوغە، ناسراو بە مامە غەفە، یەکێکە لەفەرماندە ئازاو دیارەکانی ناو هێزەکانی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، مامە غەفە خۆی و کوڕەکانی و هەموو خزمەکانی پێشمەرگەی دڵسۆز و بەوەفای کوردستان بوون و هەن، بنەماڵەکەیان خاوەنی چەندین شەهیدی قارەمانن. ئەمڕۆ ئازادی کوڕی کەوتبووە سنووری باشماخ و خەریکی ڕەوانە کردن و پەڕاندنەوەی خێزانەکانیان بوو. نەمان زانیبوو ئەو چەکدارانە بەلای ئێمەدا ڕۆیشتون و چوونەتە ناوخەڵک و داوای چەک و دەمانچە و سویچی ئۆتۆمبێلەکانیان لێ کردبوون.

بۆیە لەدواوە ڕێگەمان لێگرتن و تەقە دەستی پێکرد، ئیتر بە لێشاوی خەڵکەکە ملیناو لەماوەی ۳۰سی خولەکدا هەموو چوونە ئەوبەرەوە بۆ ناو ئێران هەرچەندە پاسدارەکان تەقەی هەواییان کرد بەسەر خەڵکەکەدا بەڵام خەڵک گوێیان پێنەدان.

لەو کاتەدا خەڵکەکە بە لێشاو چوونە ئەوبەرەوە، چەکدارەکانی پارتیش بەرەودوا بۆ پێنجوێن هەڵهاتن، بەجۆرێک ئەو چەندین ئوتومبێلەی لە خەڵکیان سەندبوو لەناو ساحەکەدا بەبەربڵاوی و بەخێرای زۆرەوە ئەرۆیشتن تائەگەیشتنە جادەی دەم دەروازەی سنوورەکە لەوێ بەهۆی تەسک بوونەوەی ڕێگاکەو ئەو ئۆتۆمبێلانەی پەکیان کەوتبوو وەخۆشیان ڕێگەی یەکتریان نەئەدا، چەندین پێکادانی ئۆتۆمبێلیش ڕوویدا، ڕێگای هەڵهاتن و گەڕانەوەیان لێگیرا، ئەوەبوو چەندین ئۆتۆمبێلی فڕێندراویان بەجێ

ئەهێشتەوە و دائەبەزین و بەپێیان رایان دەکرد، جەنازەی سێ قوربانیشیان بەجێهێشت.

دوای ئەوە من لەپەنایەکەوە سەیری باودۆخەکە دەکەم بەتەنیا، کاک ئازادم لێ وون بوو، کاتێکم زانی لەدەستی چەپەوە یەکێک بانگم ئەکا، لامکردەوە ئەبینم عەلی شێخ عیزەدینی هانەسورەیە، خۆی شەتەک داوە بەتاقم و تفەنگەوە بەرەو لای من دێت، هاتوو گەیشتە لام زۆر حەزم کرد هاورێیەکم بۆپەیدا بوو، قەد ئەو هەڵوێستەیم لەبیر ناچێت، عەلی کورێکی بەغیرەتیشە. دوای ئەوە مەرزەکە چۆڵ بوو عەلی ووتی چیبکەین؟ من نەمئەویست نییەتی دڵی خۆم بۆکەس باسبکەم، بڵێم ترسم هەیە لەئێران ناوێرم بچمە ئەو بەرەوە، بۆیە دواجارو سەر لەئێوارە بڕیارم دا بچمە ئەو بەرەوە، ووتم بە عەلی بابڕۆین، چووین ئوتۆمبێلێکی لاندکرۆزی خاکی مەوقعی سلێمانی کە بەلیوا بارام بووبوو، پارتی بردبوویان و لەنیوەی رێگا بەجێیان هێشتبوو، پڕیشیان کردبوو لەچەکی کلاشینکۆف، هێنامان و سواربووین چەکو چۆڵەکەی خۆیشمان تێدا دانا، کردمانە ئەو بەرەوە کەس پرسیاری لێنەکردین خۆمان کرد بەناو خەڵکدا، عەلیش لەوێ دیارنەما. مامۆستا بارام ئۆتۆمبێلەکەی بینی بوو هات بۆلامان، ووتم مامۆستا ئەوە ئۆتۆمبێلەکەتمان لێ سەندنەوە، کاک غازی مەلاعەلیشی لەگەڵدا بوو، ووتیان دەس خۆش سەیارە بۆخۆت بەڵام بزانین ئامانەتیەکی تیا بووە ماوە ووتم پڕە لەپارچە چەکی کلاشینکۆف و ئار بی جی و یەک گونییەی سپیشی تیایە. گونییەکەیان دەرهێناو ووتیان چەکەکانیش بۆ خۆت و ئەوان رۆیشتن، منیش چەکەکانی ئەوان و ئەوەی خۆیشم لەوێ دابەدەست ئەوکەسانەوە چەکیان کۆدەکردەوە. دەمانچەو دووربینەکەی خۆم نەدانێ شاردمەوە تاریکی کرد بینیم حەمەی مزەفەری خەڵکی نۆدشە لەوێیە، حەمە کاتی خۆی پێشمەرگەی حزبی دیموکرات بووە لەکۆمیتەی شارستانی هەورامان، لەدەرەتفێ و هاوار ئەو بەرپرسی پەیوەندیەکانی حزب بووە، برادەرم بوو، دوای ئەوە سالی ١٩٨٩تەسلیم بووەتەوە بەحکومەتی ئێران، ئێستا کارمەندی ئیدارەی ئیتلاعاتە لەمەریوان.

زۆر باوەڕم پێی بوو، بردمەلاوە، ووتم ئەتوانی ئەو دەمانچەو دووربینەم بۆوەرگری نەفەوتێ، ووتی بەسەر چاو، دووربینەکە کاتی خۆی لای

خۆیـان (دیمـوکرات) کرپبـووم، حەمە داوای مەشـروبی دەکـرد، بەرێـکەوت لەوکاتەدا خێزانێک هاتن ووتیان بتلێک مەشروب لەناو ئۆتۆمبێلەکەمان دایە نازانین چیلێبکەین، پێم ووتن لەفرسەتێکدا فرێی بدەنە کەناری ئەو ریگەوە. هیچ نییە مەترسن.

بەحەمەم ووت ئەوشتەی تۆ داوای ئەکەی، لەنزیکمان دا هەیە، بانگم کردە پیاوەکە ووتم شتەکەت چیلێ کرد بمدەرێ، لێم وەرگرت و دامەدەست حەمە، ئەمە بەرتیلی دووربـین و دەمـانچەکەمە. ئیتـر مـن بـێخەم بـووم و ئەوشـــەوە منـدالەکانم دۆزیەوە بـردنمە جـێگەیەک کـاک ســەید نەجیمـی هانەسورەیی لەوێبوو، پێکەوە بووین تا بەیانی. سەید نەجیب کوڕی سەید عەبدورەحیم کوڕی سـەید عەبدولڕەحمان، دانیشـتوی ئـاوایی هانەسـورەی نـاوچەی نەورۆلـین، ئەم بنەمـالە لەبـنەچەدا لەئـاوایی خانەگـای نـاوچەی هەورامان و پاوەوە لەکوردستانی رۆژهەلاتەوە هاتوون.

بنەمالەکەیان خـاوەنی پیـاوانی گەورە و رێزدار بوون، خـالۆ سـەیدنەجیب ئێسـتا لەژیانـدا مـاوە، هەرچەنـد بنەمـالەیەکی ئـاینی و کـۆمەلایەتی بـوون لەڕابـووردودا وەنەخـــش و جـــێگە دەســـتیان لەوبـــارەوە دیـــار بـــووەو هەرکێشـەیەکی کۆمەلایەتی و عەشـیرەی چارەسـەرنەکراو بـووبێ دواجـار لەسـەر دەستی ئەمان چارەسـەر کراوە، لەگەل ئەوەشدا لایەنی کوردایەتی و نیشتیمان پەروەریەتیەکەیان فەرامۆش نەکردوە، بەتایبەت خالەسەید نەجیب پێشمەرگەو لەتێکۆشەرە دێرینەکان و دۆستی نزیکی مـام جەلالە، وائەمرۆ دوجار ئاورە بووە لەهەلەبجە ئاوارەی دەستی بزووتنەوەی ئیسلامی بووە بۆ سلێمانی و لەوێشەوە ئاوارەی دەستی ٣١ی ئاب بووە بۆ باشماخ .

## گەڕانەوە بۆ سورێن

لەدوای تێپەڕ بوونی دوو رۆژ بەسەرمانەوەمان لەباشماخ، مندالەکانم لەگەل خێزان و منالەکـانی کـاک عوسـمان هەورامیـدا نـارد بـۆ ناوشـاری مەریـوان بـۆ مـالی کـاک ئەبـووبەکر شۆشـمێی پـورزای کـاک عوسـمان و دۆستێکی بەوەفای منیشە لەگەل عەزیمەخانی خێزانیدا.

ئەو رۆژە چادر دابەش کران ، من چادرم وەرنەگرت، بەشێوەی کاتی لای ماڵی کاکە سەید نەجیمی هانەسورەییدا مامەوە، دوای چەند رۆژێک، کۆمەڵێک پێشمەرگەو گەنج لەسەروی ماڵی سەیدەوە چادریان هەبوو، یەکێک لەوانە ئەسکەندەری قادر بەگ هەڵەبجەی بوو، ئەسکەندەر ئاساییش بووبوو، چەند جارێک هاتن بۆلام ووتیان وەرە بۆ لای ئێمە، منیش چەند شەوێک دەچووم بۆ لایان، ئەسکەندەر بوو بوو بەحکایەت خوێن، داستانی بۆ ئەگێراینەوە، بەبێ پەردەو بەبێ شاردنەوە باسی ئەوەی دەکرد چۆن بەناوی ئاساییشەوە خەڵکیان ترساندوەو پارەیان لێسەندون.

لەو بارەوە ئەوەندە چالاکی خۆیانی لەئاساییش بۆ گێراینەوە من شەرمم دەکرد لەخۆم گوێیان بۆ بگرم، ئێمە چیمان کردووە  بۆ رازی کردنی خەڵک و ئەو چیمان بۆ باس دەکات، ئەسکەندەر وایئەزانی جارێکی تر ناگەڕێینەوە ناو کوردستان، من بەبیستنی ئەو حکایەتانە زۆرنیگەران بووم، چۆن دەزگایەکی وا یان کادرەکانی ئەوکارانەیان کردوە، بەقسەی ئەو زۆربەی چالاکیەکانیان بەرپرسەکانیان ئاگادار بوون، یان بەفەرمانی ئەوان ئەوەیان کردوە. بەقسەی ئەسکەندەر ئەوەی خوا پێیناخۆش بێت کردویانە، بەتایبەت لەگەڵ ئەوانەی ئیشیان کەوتوەتە ئەم دەزگایە، بەتایبەت لەگەڵ توجارو بازرگان و دەولەمەندو بەڵێندەرو  ئاڵتون چی و بەتایبەت ئەو ئێرانیانەی هاتونەتە ناو هەرێم.

ئێوارەیەک  لەلای کاک سەید دانیشتبووم، ئاگاداریان کردم ئۆتۆمبێلێکی لاندکرۆز هاتووە شۆفیرەکەی هەواڵی تۆ دەپرسێت، هەرهەستام و هاتمەدەرەوە بینیم لەپەنا چادرەکەدا وەستان، دیار نەبوون کێن ئۆتۆمبێلەکە جامی رەش بوون، هەڵوێستەیەکم کرد، دەرگای شۆفێرەکە کرایەوە ئەبینم کاک بەختیاری یارئەحمەد بەگە، ئەوکات بەرپرسی پەیوەندیەکانی پارتی بوو لە مەریوان، دوای چاکوچۆنی ووتی وەرە ناو ئۆتۆمبێلەکە ئەو پیاوە بۆلای تۆ هاتوە، سەرم کێشایەناو بینیم بەنی ئەحمەدە ئەندامی قەرارگای رەمەزان، ووتی ( در زیر زمین پیدات میکونم) منیش سەرکەووتم و دوای چاکو چۆنی ووتی چ خەبەر؟ منیش ووتم خەبەر لای ئێوەیە، `ئەوەیە ئەی بینی، ووتی ئەوبارودۆخە کۆتای دێت، منیش ووتم ئەزانم کۆتای دێت بەلام کەی؟ ووتی ئینشەڵا زۆر نابا، هەواڵی مناڵەکانی پرسی ووتم  چوون بۆ نەوسوود. پرسی

ئەیخۆت چی ئەکەی؟ وەرە بابچین بۆ مەریوان ، ووتم جاریَ لێرەم لەگەڵ ئەم خەڵکە. ووتی ئەی مەهدی برات لەکوێیە؟ ووتم ئەو لەگەڵ هێزەکان لەسەیران بەنە(بەندە). ئەوهێزانەی چووبوونە سەیرانبەن، بەشێکی زۆریان لەم دیو مابوونەوە، لەدۆڵی شلێر نەچوبوونە ناو خاکی ئێران، پارتی لەکوێیەوە تائەوێ هاتبوون بێ ئەوەی کەس ڕێگریان بکات، لەێ لێیان دراو توشی شەڕ بوون و خراپ شکان، دیل و کوژراویشیان لێ بەجێما، ئەو هێزانەی یەکێتی کاک شەوکەتی حاجی موشیر وکاک جەمیل هەورامی سەرپەرشتی ئەکردن، لەوکاتەدا کاک شەوکەت چووبوو بۆقاسمەڕەش ، مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزووریش لەوێ بوون، لەو شەڕەی ئەوێدا لەهێزەکانی یەکێتی کادری ژیرو دڵسۆز عەلائەدین ئێتاخی برای شەهید فاتیح و پێشمەرگەیەکی هێمن و لەسەرەخۆ بەناوی میقداد حەمەڕەشید خەڵکی بناری سورێن بوونە قوربانی و کاک بەکری حاجی سەفەریش بریندار بوو، لەپارتیش چەندین کەس کوژران بە جێمان لەوانە کەسێکی بەرزانی بەناوی تەتەر عەلی سەبری، پارتی لەجیاتیدا چوار کادری یەکێتی گوللەباران کرد، ئەوانیش ئەم هەڤاڵانە بوون: ١- ئەمجەد حاجی خالید برای کاک حامید، ٢- ئەحمەد سۆیلە میشی گلاڵی، ٣- مامۆستا ستار ڕوخزایی، ٤- فایقی ڕابە .

ئەم پەلامارە لەدوای ئەوە ئەنجام درا هێزەکانی پارتی بە چەکی (بی کەی سی) تەقەیان کردبوو بەناو خەڵکی مەدەنی داو چەندین ژن و منداڵیان بریندار کردبوو.

بەڵێ کاک بەختیار خولکی کردین بچین بۆماڵی خۆیان لەمەریوان، ووتم دواتر خۆم دێم بۆلات، بەڵام ئێستا ئیشێکم پێتە ئەگەر بتوانی بۆم بکەیت مەمنونم، ووتی بەسەر چاو فەرموو، ووتم ئەگەر کاک فەرەیدون عەبدولقادر ئاگادار بکەیت من لەباشماخم، هەر ئەوەندە. ووتی بەسەر چاو کاک فەرەیدون لەتارانە. ووتم ئەگەر کاکە حەمەی حاجی مەحمودیش لەمەریوان بوو زەحمەت نەبێ بیبینە پێی بڵی حەمە لەباشماخە هەواڵی ئەپرسێت. ووتی کاکە حەمە نەهاتوە بۆ ئێران، لەم ڕۆژانەدا لەهەڵەبجەدا بووە لای مامۆستا مەلاعەلی، پێم وابێت بچێت بۆ لای کاک مەسعود. لەدڵا ووتم بەختیار پارتیە حەز ئەکا ئەو قسانە بکات، کاتێکم زانی خەڵکێکی زۆر لەدەورمان کۆبوونەتەوە، ئەوان ڕۆیشتن و من لەگەڵ خەڵکەکە وەستام،

دەستیان بەپرسیار کردن کرد لەمن، هەواڵی بارودۆخەکەیان ئەپرسی خەڵک زۆر بێتاقەت بوون. منیش بەئارەزوی دڵی ئەوان قسەم دەکرد، ووتم ئەم بارودۆخە ئەوەندە نابات ئەگەڕێینەوە ....تاد، خەڵکەکە نازانن من جگە لەم خەمە گەورە، خەمێکیتری لابەلاشم هەیە.

نزیکەی دە رۆژی ترمان لەئوردوگا بەسەر برد، ئێوارەیەک لاندکرۆزێکی ئەمبوولانس هاتبووە ناو ئوردوگاکە بەرێککەوت کاک عوسمان سۆفیان بینی بوو لێیان پرسیبوو، حەمەی حەمەسەعید ئەناسی؟ ئەویش وتبووی وەرە تەنها شۆفێرێکی تیابوو فارس بوو، کەهاتنەلامان کاک عوسمان ووتی شۆفێری ئەم ئەمبوولانسە هاتووە بۆلای تۆ. منیش بەخێرهاتنم کردو دانیشتین و دوای خواردنەوەی چایەک لەکتریە رەشی ئەسکەندەردا، پێموت ئەمرکە، ووتی من کاک فەرەیدون عەبدولقادر ناردومی بۆلای تۆ، ئەگەر فەرمانێکت بەئۆتۆمبێل هەیە ئەوە لەخزمەتتدام، بردمەلاوە هەواڵی کاک فەرەیدونم پرسی و هەندێک پرسیارم کرد، پیاوێکی ژیر بوو، تێگەیشت کەبەگومانم لێی، ووتی من لەقەرارگاوە هاتوم ناوم فەرهادیە زۆربەی برادەرەکانی بەرپرس لەیەکێتی ئەناسم و برادەرین، ناوی چەند هەڤاڵێکی بردو ووتی (من پیشمرگ اتحادی میهنی هستم) باشە ووتم بمبەرە ناو شاری مەریوان، ووتی ( چشم: مریوان، کرمانشا، تهران، هرجای شما میخاهی) منیش سوپاسم کردو بێدەنگ بەخاڵۆ سەیدم ووت ئەچمە مەریوان ، سەرکەوتم و لەرێگا بە ئاغای فەرهادیم ووت من لەمەریوان ئەمێنمەوە مناڵەکانم لەوێن بەڵکو لەوێوە بیان بەیت بۆ نەوسوود، ووتی بەسەر چاو.

گەیشتینە ناو شار تاریکی کردبوو، لەبەر دەرگای ماڵی ئەبووبەکردا دابەزیم، ووتم ئەمە ماڵی خزمانە فەرموو، ووتی من دانابەزم ئیشم هەیە ئەچمە قەرارگاو بەیانی دێمەوە بۆلات. ئەورۆیشت و من دام لەدەرگا، خاتوو عەزیمە دەرگای کردەوە، برایەکی ئازیز ئەوەبۆ درەنگ هاتیت؟ دەستم بەسنگەوە گرت بۆی، بەراستی ئەو خوشکێکی ئازیزە، لەچەندین رۆژی ناخۆش و تەنگانەم دا پەنام بۆ بردوەتەوە. ئەوە یەکەم جار لەساڵی ١٩٧٨ ولە ئاوایی شۆشمێدا، دووەم جار ساڵی ١٩٨٧ و لەهاواردا سێهەم جار ئێستا ساڵی ١٩٩٦ و ئەمە لەمەریوان دا. لەبەرگی یەکدا ئاماژەم بە ساڵانی ١٩٧٨ و١٩٨٧ داوە.

چوومە ژوورەوە ئەبووبەکر و دانای کوڕی لەئامێزم ئەگرن قوڵپەی گریان گەروی گرتوون، ماڵ قەرەباڵغ و وەک خۆیان دەڵێن شلوقە، میوانی تریان هەیە وردە وردە ناو هۆڵەکە ئاسایی بووەوە، منداڵەکانی کاک عوسمان نەزیرەخانی خێزانی و کچەکان و میوانەکان یەک یەک بەخێر بێیت، ئەی عوسمان کوا ؟ ئەو نەهاتووە، رەنگە بەیانی بێت. دوای کەمێک منداڵەکانی خۆم نابینم، بەرلەوەی من پرسیار بکەم، عەزیمەخان ووتی ئەوە منداڵەکان لەنەوسوودەوە ئاغای شاوەیسی(میر ئەحمەد) هات بەدوایاندا زۆر هەوڵمان دا نەڕۆن هەر بردنی زۆرمان پێناخۆش بوو.

دەی ئەوێش هەرماڵی حاجی برایمە فەرقی چیە ماڵتان ئاوا بێت. (حاجی برایم ،باوکی عەزیمەخانەو پیاوێکی کۆمەڵایەتیی و ناسراوە خاوەن سفرەو نان) ە .

شەو لەوێ خەوتم خەوێکی خۆش، بەڵام پڕلەخەو بینینی تێکەڵ و پێکەڵ، بەیانی نزیک بەکاتژمێر ۱۰دە فەرهادی هاتەوە، لەوێ بەئاغای فەرهادیم ووت منداڵەکان خۆیان رۆیشتون بۆ نەوسوود، ماڵی خزمان هاتوون بردویانن، تۆئەم نیوەڕۆ لای ئێمەبە و دوای (نهار) نانی نیوەڕۆ ئازادی بڕۆ خوات لەگەڵ، هەرچەندە خاوەن ماڵ خولکی گەرمیان کرد، بەڵام نەمایەوە و ماڵ ئاوایی کرد، منیش سوپاسم کردو پێم ووت بەکاک فەرەیدون[1] بڵێ هێناومە لەمەریوان لای ماڵی خزمەکانی ماوەتەوە. ئیتر هەر ئەو ڕۆژە هەوارم گواستەوە بۆماڵی کاک فاروقی وەیسی بۆڕیەری، ماوەیەک لەماڵی کاک فاروق بووم، رۆژێک چووم بۆ بارەگای پەیوەندیەکانی سۆشیالیست، پیاوێکی بەتەمەن بەناوی کاک بارامی مەلا عەبدوڵای کولکنی لێبوو، هەواڵی کاکە حەمەی حاجی مەحمودم پرسی، ووتیان لەتارانە، ووتم ئەگەر هاتەوە بۆ ئێرە حەز دەکەم ببینم، ژمارە تەلەفۆنی ماڵی کاک فاروقم لابەجێ هێشتن، زۆر خولکیان کردم و ووتیان میوانی ئێمەبە تاهەرکات کاکە حەمە دێتەوە،

---

[1]– کاک فەرەیدون عەبدلقادر سەرکردەو پیاوێکی بەوەفا بۆ هاوڕێ و هاوسەنگەرەکانی ، من قەد ئەو وەفاو دڵسۆزیەی لەیاد ناکەم لەناو کۆمەڵەو یەکێتی و شۆڕشدا بۆ ئێمەو بنەماڵەکەمان لەڕوی مەعنەویەوە هەیبووە، ئەو پیاوە قەدری ماندوبوون و خەباتی هاوسەنگەرکانی خۆی ئەگرت. کەئەوە یەک لە سیفەتەکانی خەڵکی سیاسییە.

سوپاسم کردن و ووتم لێرە لەماڵی خزمانم. هەرلە مەریوان مامەوە تا ئەوکاتەی کاک جەمیل هەورامی و مەهدی و کاک ئەکبەرو برادەرەکانی تر لەگەڵ هێزەکەدا لەبانەوە هاتنە مەریوان لەوێوە کاک ئەکبەر هێزەکەی برد بۆدۆڵەبی.

کاک جەمیل چەند رۆژ لەمەریوان مایەوە خەریکی ئامادە کردنی جلوبەرگ و کەوش و پێڵاو بوو بۆ هێزەکان، دەبوو چەندین بەرگ درو پێکەوە شەورۆژ کاربکەن تاتەواویان بکەن، بەرگ دورەکانی مەریوان ئامادە نەبوون جلەکان بدورن، چوونکە بەحیسابی ئەوان ئێمە پیاوی ئێرانین و ئەوان دژی ئەو پەنا بەریەی ئێمەن.

لە پێشمەرگەکانی خۆمان جەوهەری خەیات و گۆناخانی خێزانی و مونازیلە خانی خوشکی مەکینەی خەیاتیان بەکرێ گرت و دەستیان کرد بە جل دورین و کاک بەختیاری بەرپرسی پەیوەندیەکانی پارتیش بەبۆنەی دۆستایەتی ئێمەوە چەند کەسێکی رازی کردبوو ئیشیان لەگەڵدا بکەن. بەختیار ئێوارەیەکیش هەموومانی میوان داری کرد لەماڵەکەی خۆیدا.

دوای ئەوەلەگەڵ کاک جەمیل و هەڤالانی تردا چوومە مرانە، وردەوردە پێشمەرگە کۆدەبوونەوە و رۆژانە هێزەکە زیادی دەکرد، کاک شەوکەتیش دەهات و دەچوو لەگەڵ ئێرانییەکان خەریکی ئامادەکاری و بنکەو بارەگا دانان و پەیدا کردنی پێویستیەکانی پێشمەرگە بوون، چەند هەفتەیەکیش لەوێ بووین من بێتاقەت بووم، لەگەڵ مەهدی و کاک بەمۆ هاواریدا قسەم کرد ویستم رازیان بکەم بچینە سورێن و بەپارتیزانی بکەینە ئەوبەرەوە بۆ هاوار، وەک جاری جاران پێم وابوو مەفرەزەیەکی ٣-٤ کەسی بەباشی ئیدارە دەکەین .

مەهدی ئەیوت لەهێزەکان دانەبڕین باشترە تا چەند هەفتەی تر ئەگەر بەرنامەی هێرش و گەڕانەوە نەبوو ئینجا برۆین، ئەو هەفتەش من مامەوە لەلایان، دوای هەفتەکە بەمەهدی و بەمۆم ووت من ئەڕۆم بۆ سورێن بۆلای کاکە حەمە، لەوێ ئەگەر زانیم بارودۆخەکە لەبارە ئەچمە ئەوبەرەوە، ئەمزانی چەند پێشمەرگەیەک و چەندین ئەندامی رێکخستن لە چۆمی پاڵانیاو جاورن، خۆیان پەناداوە. لەوانە والی حەمەرەشید، ئەحمەد سلێمان، کۆسار

برام.........تاد. لەهەورامان پارتی لاوازبوون، ناوچەکە زیاتر بزووتنەوەی لێبوو.

ڕۆژێک داوایان کردبوو چەند پێشمەرگەیەکی خوێنەوار ئامادە بکەن بۆ خولی فێربوونی بەکارهێنانی کاتیوشاو هاوەن و جیهازی بێتەل. کاک جەمیل پێشمەرگەکانی ئامادە کرد، پێنج کەس ئامادەبوون ئەوانیش ئەمانە بوون: ئەختیار عەزیز، باخەوان محەمەد، شاخەوان کەریم، ڕێبوار بەشیر و دانا حەمەحسێن ، هەر ٥ پێنجیان ئەندامی ڕێکخستن و خەڵکی تەوێڵەی ناوچەی هەورامان بوون . کاتێک کەوتنەڕێ منیش بەو ئۆتۆمبێلەی ئەوانی ئەبرد گەڕامەوە بەرەو مەریوان، ئەوان لە سەربازگەیەکی ئێراندا لەپشتی ئاوایی ولەژێری مەریوان دابەزین و من چوومە ناو مەریوان، لەماڵی کاک فاروق بووم تەلەفۆنیان کرد ووتیان کاکە حەمە هاتوەتەوە، هەر ئەوڕۆژە چووم کاکە حەمەم بینی، باسی بارودۆخەکەی کردو ووتی ئێمە سورێنمان قایم کردوە، هەر لەبانیشارەوە تانەوێ، یەکێتیش خەریکی خۆرێکخستنەوەن، بەتەمان لە چەندین قۆڵەوە بچنەوە ناوەوە. ووتم کاکە حەمە ئەمەوێت تائەوکاتەی یەکێتی ئەگەڕێنەوە من بچمە سورێن و لای برادەرانی ئێوەبم، ئەگەر نامەیەکم بدەیتێ بۆ ئەوبرادەرانەی ئەوێتان مەمنون ئەبم، ووتی پەلەت چیە باوەڕ ناکەم ئەوەندە دوابکەون؟ لەدڵا ووتم ڕەنگە کاکە حەمە حەزنەکات بڕۆمە سورێن، ڕەنگە لەبەر پارتی بێت .........تاد، ووتم کاکە حەمە من بەدزیەوە تاچەند ڕۆژێک لەوێ ئەبم خۆم ئاشکرا ناکەم، لەوێوە ئەچمە ئەوبەرەوە بۆهاوار، مەفرەزەمان لەوێن ئەمەوێت بچمەوە بۆلای ئەوان. ووتی باشە لێرەبە تا دوو ڕۆژیتر خۆم ئەگەڕێمەوە پێکەوە ئەچینەوە ، پرسیم لەکوێوە ئەچینەوە، ووتی لەکانی خەیارانەوە، ووتم دەی زۆرباشە من ئەچمە دزلی بۆماڵی خالۆ زۆرابم لەوێ چاوێت دەکەم ، ووتی بڕۆ.

لەڕۆژی ١٩٩٦/١٠/٨ کاکە حەمە بەئۆتۆمبێلەکەی خۆیان و لەگەڵ کاک برزودا نارمیە ئاوایی دزلی، لەوێ مامەوە دوای دوو ڕۆژەکە کاکە حەمە خۆی لەگەڵ سێ کەسی تردا هاتن، کاک حەمە ووتی شەڕ بووە برادەران داویانە لەپارتی فەوجێکیان گرتوون، ووتم دیارە ئێوە زوتر لە ئێمە دەستان پێکرد.خواحافیزیم لەماڵی خالۆ زۆراب کردو بەئۆتۆمبێلەکە تاجادە هەبوو هاتین، لەوێ دوکەسیان کە کاک برزو کاک حەمە غەفووربوون، لەبناری چیای

داڵەمێز لەنزیک هەشە (ورچە) ڕێ لەگەڵ ئۆتۆمبێلەکەدا گەڕانەوە بۆمەریوان، من و کاکە حەمەو کوڕێکی گەنج بەناوی سەرکەوت، پێکەوە سێ کەسی کەووتینە سەرەتای هەورازێکی سەرەو ژوورەو توند بۆ سەرکەلی چنارە، ماوەیەک بوو بەپێ ڕێگەمان نەبڕیبوو، تاهاتینە سەر ملەو کەووتین بەدیوی عێراق دا هەوا تاریکی کرد.

دوای ماوەیەک لەو شاخە بەرزەوە دابەزین بەدیوی ئەمدیودا لەوچیا ساردوبەرزەی سورێنەوە بەرەو خوار، کوێرە ڕێگایەکمان گرتبووە بەر، کاتێکمان زانی کوێرە ڕێگاکەشمان لێ ونبوو، ماوەیەک ئەملاو ئەولامان کرد نەمان دۆزیەوە، خڕەبەردو دڕکوداڵ و بووتەگەونی کوێستانیش ئەوەندەیتر بەهیلاکی بردین. وەستام و کاکە حەمە لەتەنیشتمەوە بوو پرسیم کاکە دەمانجەت پێیە ووتی نەوەڵا چەقۆشمان پێنییە، ووتی مەترسە ناوچەکە لەخوارەوە هەمووی بەدەست خۆمانەوەیە، بەپێکەنینەوە ووتم لەوە ناترسم ئەترسم ورچێک پەلامارمان بدات، ووتی لەورچ خراپتر ئەم شوێنە ئەڵغامی تیایە بێئەمەل بووین لەدۆزینەوەی ڕێگاکە.

کاکە حەمە ووتی ئەبێ دانیشین لەجێگەی خۆماندا تا بەیانی ڕۆژ دەبێتەوە، هەر لەشوێنی خۆماندا دانیشتین، بەردو دڕک و داڵەکەمان بەدەست خشاندن پاک کردەوەو هەرسێکمان لەپەنای یەکەوە دانیشتین و پشتمان کردە یەک و هەریەک ڕومان کردە شوێنێک تادەمەو بەیان.

لەسەرکەوتن و بڕینی هەورازی ئەودیودا عارەق کردنەوە، جلەکانی تەرو خوساندبووین، لەکاتی دانیشتندا سەرما زۆری بۆ هێنابووین شەوێکی ناخۆش و نالەبارمان تێپەڕکردو گەیاندمانە دەمەو بەیان. کاتێک لەبەری لای ڕۆژهەڵاتەوە سەر لوتکەو قوللەی چیابەرزەکان لەناو ئاسۆدا دەرکەوتن، کاکە حەمە ووتی وا ڕووناکی کرد با وردە وردە بجوڵێین، هەستاین و کەمێک وەرزشمان کرد، بەر پێمان دەرکەوت وردبووینەوە لەدەورو بەری خۆمان، تەماشا دەکەین کوێرە ڕێگاکە لەلای دەستی ڕاستەوەیە ئێمە بەرەولای دەستی چەپ سۆراخمان کردوە.

بەرەوخوار بووینەوە، کاتیک تیشکی زێڕینی خۆر کەوتە سەر لوتکەی چیای شنروێ و بەسەر بالانبۆ و بێزەلدا پەخشبوو بۆسەر زەواڵی و قەوالی، ئێمە گەیشتینە سەر کانی و ئاوی دەربەنی ئاوایی چنارەی سورێن.

لەوێ لەگەڵ پێشوازی پێشمەرگەکانی سۆشیالیشت و میوانداریان بۆ قاوڵتی بەیانی رووبەرو بووین، دەستەیەک پێشمەرگەی میوان نەواز، زووبەزو بەرەو کۆمباریان ڕاخست و پەتوو بەسەریدا، دەرکردنی نانی گەرم یەکیەک لەتەنوردا و دانانی لەسەر سفرە، ئامادەو دەم کردنی چایی، چێژو لەزەتی بۆمن دوبارە نەبووەتەوە.

دوای نیوەڕۆ بەڕێکەووتین بۆ خانەی گوڵان، هەر ئێمە گەیشتین و وەفدی پارتی هاتن. کاک محی الدین رەحیم و هەیئەتێک، من چوومە ژورێک تاتەواو بوون و گەڕانەوە کێشەو گفتوگۆیان لەسەر چەککردنی ئەو هێزەی لای شیرەمەرو چەند بابەتیتر بوو، ئێمە یەک شەو لەگوڵەخانە بووین، یەکێتی هێرشەکەی لەشەوی ١١لەسەر١٢ی مانگی١٩٩٦/١٠ دا دەست پێکرد، ئەم هێرشە لەکۆبوونەوەیەکی فراوانی رۆژی١٩٩٦/٩/٢٠ لە نزیک گوندی شێنێی سەربەناوچەی قەڵادزێ بەسەرپەرشتی مام جەلال بڕیارەی لێدرابوو، بەناو نیشانی گەردەلولی تۆڵە.

## گەردەلوولی تۆڵە

ئەمە لەئەدەبیاتی یەکێتی دا ناوی ئەوهێرش و پەلاماردانەوەی یەکێتی نیشتیمانییە لەهەموو قۆڵەکانەوە بۆگرتنەوەی سنووری زۆنی سەوزو جاران دوای ئەوە پارتی لە ٣١ی ئابدا لەدەستی سەندبووین، تەشکیلاتی هێرشەکە بەم شێوەی خوارەوە بوو:
قۆڵی پێنجوێن- شارەزوور، هەڵەبجە، بەسەرپەرشتی فەرەیدون عەبدولقادرو بەهاوکاری هەریەک لەهەڤالان کاک جەمیل هەورامی، کاک شەوکەتی حاجی موشیر، کاک مەحمود سنگاوی، شەهید شێخ حسێن سور و مام رۆستەم و چەندین فەرماندەی تر، سەرەتا پێنجوێن و گەرمک و ناوچەی شلێر و ناڵپارێزو شارباژێریان پاک کردەوە دواتر بەرەو سەیسادق و هەڵەبجە هاتن، دواتر بەوردی هاتنەکەیان بۆلای ئێمە بۆشارەزوورو هەڵەبجە باس دەکەم.

قۆڵی چۆمان – سلێمانی، بەفەرماندەی کاک کۆسرەت رەسوڵ و بەهاوکاری چەندین فەرماندە و سەرکردەی تر لەوانە: کاک مەلابەختیار، کاک عومەر عەبدولا (ملازم عومەر)، کاک عیماد ئەحمەد، کاک مستەفا چاورەش،

کاک سالار عەزیز، کاک عوسمانی حاجی مەحمود و مامۆستا جەمال و چەندین کادرو فەرماندەیتر، ئەم قۆڵە سەرتا ناوچەی سیوەیل و کەناروێ و ماوات و چوارتاو شارباژێرو دەوروبەریان پاک کردەوە، دواتر بەرەو ئەزمرو سلێمانی رۆیشتن پارتی کەلێرەدا شکا ئیتر خۆی نەگرتەوە تاناو هەولێر. یەکێتی خۆی لەبەر ئاگاردارکردنەوە و هەڕەشەیەکی عێراق لەدێگەڵە بەولاوە لەدوایان نەچوون .

قۆڵی بەمۆ- گەرمیان و دواتر بەرەو سلێمانی، بەفەرماندەی هەڤاڵ جەبار فەرمانی دوژمن تۆقێنەرو بەهاوکاری هەڤالان کاک شێخ جەعفەر، عەدنانی حەمەی مینا، کوردۆقاسم، مەحمودی مامەعەزە، مامۆستا موحسن، ئاواتی شێخ جەناب و چەندین کادرو فەرماندەیتر. لەدەستپێکی هێرشەکەیان دا بنار چیاکانی بەمۆ و خۆشک و زمناکۆیان لەڕووی رۆژهەلاتەوە پاک کردەوەو دواتر بەرەو دەربەندیخان و گەرمیان پێشرەویان کرد و بەرەو سلێمانی لەگەڵ قۆڵەکانی تر یەکیان گرتەوە، پارتی زۆرترین زیانیان لەم قۆڵەوە بەرکەوت. لەم قۆڵەوە، فەرماندەی بەوەجی داستان خولقێنەری یەکێتی مەحمودی مامە عەزە شەهید بوو. لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەدەوری ئەنوەر دۆلانی و ئەو هێزەی لەقەرەداخ بوون بکەم بۆپشتیوانی ئەم قۆڵە، ئەم هێزە مامۆستا عەلی عەبدوڵاو سەرکەوت حەمەزەکی لەگەڵ بوو، مامۆستا دیل بوو لای پارتی بەردرابوو هاتبووە سلێمانی و لەوێوە چوبووەوە بۆ قەرەداخ هێزەکەیان نزیکەی ٥٠ پەنجا پێشمەرگە بوون لەدۆڵی کانی ساردەوە هاوکات لەگەڵ رەتڵی بەمۆدا لەدواوە دایان لەدەربەندیخان. ئەم هێزە بڕیار بوو بچێتە دەربەنی بازیان، نەچوون هاتنە دەربەن.

قۆڵی مەرگە_ جافایەتی، دوکان بەفەرماندەی مستەفای سەیدقادر بوو بەهاوکاری فەرماندەکانی تری ئەو سنوورە لەوانە کاک توفیق کانی وەتمانی، غەریب سەعید و مامۆستا مەهدی و چەندین کادو فەرماندەی تر. ئەم قۆڵەسەرەتا، بناری مەرگە و بنگرد و دواتر بەرەوچیای قەرە سرت و جافایەتی و سەرکەڵو بەرکەڵو و بەرەو سورداش و دوکان هاتن و لەگەڵ هێزەکانی تر یەکیان گرتەوە. پارتی چوونە ئەوبەر دوکان و ماوەیەک خۆیان گرتەوە.

قۆڵی قەڵادزێ- بناری قەندیل و رانیە، بەفەرماندەیی لیوا خەلیل دۆسکی و بەهاوکاری فەرماندەکانی ئەو سنووره لەوانە کاک موحسن بایز، کاک عەبدوڵا بۆر،کاک حەمەی ووتمان و چەندین کادرو فەرماندەیتر، ئەم قۆڵە لەوە دەچوو گرفتیان هەبووبێ، دوای گەیشتن بەو ئامانجەی بۆیان دیاری کرابوو پاشەکشەیان کردەوە، دوبارە هێرشی بۆکرایەوە ئەمجارە کاک حەمەی حاجی مەحمود و هێزەکەی سۆشیالیست و زەحمەت کێشانیش بەشداری کارایان کرد، بەتایبەت کاکە حەمە خۆی.

بابێمەوە بۆلای گوڵەخانەو هاتنی رەتڵی پێنجوێن بەرەو شارەزوور. ئەوشەوە لەگوڵەخانە بووین رەتڵەکەی یەکێتی لەسنووری پێنجوێنەوە گەیشتبوونە کانی مانگاو دەوروبەری پێشرەویان دەکرد بەرەو ناڵپارێز، ئاگاداری کاکە حەمەیان کرد، ئەوە پارتی لەهەورامان و هەڵەبجەوە بەرەو سەیدسادق و سلێمانی رادەکەن، هاتینە سەربان و چراو چراخانی قافڵەی ئۆتۆمبێلەکانمان بینی لە بیارەوە بەرەو خورماڵ دەهاتنە خوارەوە، لەهەڵەبجەو شارۆچکەی سیروانیشەوە بەرەو ناوگردان و سەیدسادق بەپردی کۆندا، ئەرۆیشتن.

ئەوانی هەورامان و خورماڵ بەرەو پردی زەڵم و تەپەرێزینە هاتن، کاکە حەمە هێزێکی نارده سەرجادە و منیش لەگەڵیاندا چووم، ووتی رێگەیان لێبگرن و چەکیان بکەن، زوو بەرلەوەی ئەوان بگەنە ئاستی گوڵەخانە ئێمە گەیشتینە سەرجادە، هەموومان لەبەری گوڵە خانەوە بووین، لەوکاتەدا کاک کاوەی کوڕی شەهید رەوفی خەلیفە سەعید لەمبەر جادەکەوە رایکردە ئەوبەرەوە چرای یەکەم ئۆتۆمبێل لێیدا، دیارە بینیان و قافڵەکەیان وەستا، ورده ورده گەڕانەوە، لەوشوێنەدا لەنێوان ئەوان و ئێمەدا بەرزاییەک هەیە ئەوە بوو لەچاو وون بوون و دواتر کەدەرکەوتنەوە لەسێڕیانی خورماڵ زەڵم هەڵەبجەدا دەرکەوتنەوە، بەرەو شارۆچکەی سیروان و ئەوانیش بەدوای ئەوانەی هەڵەبجەدا لەپردی کۆنەوە بەرەو سەیدسادق خۆیان قوتار کرد. ئێمەش گەڕاینەوە بۆ گوڵەخانە.

ئەم هێزانەی پارتی بەرلە۳۱ ئاب ماوەی ۱٦ شانزه مانگ بوو، لەهەڵەبجەو هەورامان لەپەنای بزووتنەوەی ئیسلامیدا وەک بەرەیەکی پشتەوە، هێزێکی زۆری یەکێتیان مەشغوڵ کردبوو، بووبوون بە پشتیوانێکی

باش بۆ بەرەکانی شەڕی ناوخۆی نێوان پارتی و یەکێتی لەهەولێرەوە تاحاجی هۆمەران، جاروبار لەگەڵ بزووتنەوە هێرشیان دەکرد بەرەو سەیدساق و لەوکاتانەشدا بزووتنەوە لەگەڵ یەکێتیدا شەڕیان وەستاندبوو، بەتەنها مەشغولیەتیان دروست دەکرد. وائێستا بەهۆی گەردەلولی تۆڵەوە لەم هەلهاتنەدا خۆیان رزگار کردو بەرەو هەولێر رۆیشتن. خۆئەگەر ئەم هێزە رای نەکردایەو هەر لەشوێنی خۆیاندا بوونایە وەک جاران ئەوە بۆ پارتی باشتر بوو.

بەڵام بەرای من پارتی زانیاریەکیان هەبوو لەسەر ئەوە کەئێرانییەکان بەیەکێتیان وتبوو ئەگەر بزووتنەوەش بەوانەوە رامالن ئێمە هیچ نیگەرانییەکمان نابێت لەو بارەوە، بۆیە ئەوانە وابەبێ ئەوەی هیچ فشاریان لەسەر بێت رایان کردو بزووتنەوەیان بەجێهێشت. لەو کاتەدا بزووتنەوە بەتەحویل دانەوەی دیموکراتەکان نیگەرانی ئێرانییەکانیان لەسەر خۆیان رەواندەوە، دواتر ئەو بابەتە بەوردی ئەخوێنیتەوە.

بەڵی شەو کە ئێمە گەیشتینەوە لای کاکە حەمە لە سەیدسادقەوە سۆشیالیشت ئاگاداریان کرد واهێزەکانی پارتی لە سنووری پێنجوێنەوە هاتنەخوارەوەو لە سەیدسادقیش بەرەو سلێمانی رۆیشتن، ئەوانەی بەری هەڵەبجەش بەهەمان شێوە. ئەو شەوە نەخەووتین ئەوەندەی نەبرد رۆژ بووەوە، بەیانی زوو کاکە حەمە هێزەکانی سۆشیالیستی خستەڕێ بەرەو سەیدسادق منیشی لەگەڵ خۆیدا برد گەیشتینە سەرجادە، هیچ هاتوچۆیەک نەبوو نەبەرەو سەیدسادق نەبەرەو هەڵەبجە. تەنها لە سەیدسادقەوە ئۆتۆمبێلێکی پیکابی( جی ئێم سی) بەرەو هەڵەبجە دەهات، گەیشتە لامان و رامان گرت، بۆ هەواڵ پرسین و زانیاری وەرگرتن کاتێک سەرنشینەکانی دابەزین، ئەبینین کاک کەمال هەورامی و رزگاری عەزەقوڵ و شۆفێرێکە، سێ کەسن، ئەمانە پێشمەرگەی یەکێتین ، کاکە حەمە پرسیاری لێکردن بۆکوێ؟ وتیان ئازوقە ئەبەین بۆ کاک جەمیل هەورامی، کاک جەمیل لەکوێیە؟ رۆیشتووە بەرەو هەڵەبجە. نەخێر ئێمە نەمان دیوەو کەس بەرەو هەڵەبجە نەرۆیشتووە، ئینکاری زۆریان کرد. منیش دودڵ بووم، بە کاک حەمەم ووت با من لەگەڵ ئەماندا برۆم بۆ هەڵەبجە، کاکە حەمە ووتی نابێ بەتەنها برۆیت بابرادەرانی ئێمەش لەگەڵتابێن تائەگەیتە هێزەکەی خۆتان. کاک حەمە

سەراوی بانگکردو نزیکەی ٧ حەوت کەسی بەسەیارەیەکی لاندکرۆزەوە لەگەڵدا ناردم، ووتم کاکە حەمە عەزیەتە و پێویست ناکا بائەم برادەرانە لەگەڵ خۆتبن، من لەگەڵ ئەم سێ پێشمەرگەدا ئەڕۆم، قبووڵی نەکرد، دوای پیکابەکەی کەمال هەورامی کەووتین، لەبازگەی پردی زەڵمدا کە تەنها بزووتنەوەی لێبوون رایان نەگرتین و رۆیشتین، بەڵام بەسەروسیمایاندا دیاربوو بێئاگاو سەرسورمان گرتنی.

گەیشتینە بازگەکەی دەروازەی شارۆچکەی سیروان، لەوێ پرسیان بۆ کوێ ووتمان ئەچینە هەڵەبجە، بەجۆرێک شڵەژان من تێگەیشتم کاک کەمال بەهەڵە هاتووە، هیچ کەس و هێزی یەکێتی بەرەو هەڵەبجە نەهاتون، بەڵام تازە هاتوین و بەرەو هەڵەبجە ملماننا. گەیشتینە بازگەی زەمەقی و دەروازەی شاری هەڵەبجە، دیارە ئەم بازگە ئاگادار کراون، بڵاوەیان کرد و سەنگەریان لێگرتین، پرسیان بۆ کوێ؟ ووتمان بۆ هەڵەبجەو هێز لەدواوەیە ئێمە لە پێشەوە هاتویین بۆ ئاگادار کردنی بزووتنەوەو م مەلاعەلی، برێک هاتوهاوارو فرکان فرکانیان کرد ئێمە لەسەیارەکان دانەبەزین. ئاگام لێبوو لەپەناوە کەسێک بەبێسیم قسەی لەگەڵ کەسێکیتر دەکرد دیارە ئەو کەسە لەناو هەڵەبجەدایە، ئەیوت دوو ئۆتۆمبێلی پڕ لە پێشمەرگەی یەکێتی و سۆشیالیشت هاتوون، حەمەی حەمەسەعیدیان لەگەڵە، دێنە ناوەوە، دوای بگرەو بەردەیەکیتر ووتیان فەرموون برۆن. لەوێش رزگارمان بوو دیارە لە ناو شارەوە مۆڵەت بەبازگەکە درابوو رێگەمان بدەن برۆینە ناو شار.

هەر بەگەیشتنمان بۆ ناوبازاری هەڵەبجە سەربان و ئەمبەر و ئەوبەری شەقامەکان بزووتنەوە گرتبوونی و خەڵکەکە رایان دەکرد بەملاوبەولادا و بازارو دوکان داخراو لەچاو تروکانێکدا هەموو چۆڵی کرد. ئێمەش هیچ خۆمان تێک نەداو بەرەو بینای شارەوانی رۆیشتین، لەنێوان شارەوانی و قائیمقامیەتی ئێستادا بزووتنەوە جادەکەیان بڕیبوو بەبلۆک و بەرد و دار، پیکابەکە لەبەردەم شارەوانیدا وەستاو ئێمە لامانـدایەوە بە دەستی چەپدا بەرەو گەڕەکی کانی قوڵکە، کاک کەمال و رزگارمان بەجێهێشتن، برادەرێک ووتی نەهاتن بەدواماندا، منیش ووتم برۆ، خواخوامان بوو دوورکەوینەوەو خۆمان قوتارکەین. گەیشتینە گەڕەکی شارەوانی، بارەگای لقی ١٢دوانزە لەوێ بووبوو، دابەزین، کەس لە دەرەوە نەبوو،

کەسێکمان بینیی لەلق ئەهاتە دەرەوە قەنەفەیەکی بەسەرشانەوەیە، لێم پرسی دەنگوباس چیە ووتی وەڵا پارتی هەر شەو چۆڵیان کردو ڕۆیشتون، کەسیان لێرە نەماوە، ئەم بەیانییە براو خزمەکانی سەید بەهادینی ئیمامی لەلای دەریاچەکەوە هاتبوون و بێئاگابوون لەوەی ئێرە چۆڵ کراوە، سەریاندا لەلق و بینیان چۆڵ بوو بەرەو عەنەب ڕۆیشتن، پرسیم کەی و چەند کەس بوون؟ ووتی ٣٠خولەک نابێ نزیکەی ١٠دە کەس بوون، ئەوبرادەرەی ئەم پرسیارەمان لێ دەکرد فوئادی ئاغابەگی بەڵخەیی بوو، دواتر ئەنسارول ئیسلام گوللەبارانیان کرد.

لەجادەی کەمەربەنی هەڵەبجەوە گەڕاینەوە بۆ زەمەقی، بینیمان وا پیکابەکەش هاتەخوارەوە، بەئاماژە ووتمان وەرن بەدواماندا، لەبیری ئەوەدا بووم چۆن لەبازگەکە تێپەڕین و چیبڵێین، ترسم هەبوو لەدواوە تەقەمان لێبکەن، بەڵام ئەمەم بەبرادەرەکانم نەوت. نزیک بووینەوە لە بازگەکە، ئەبینین کەسیان لەسەر جادەدا نییەو هەموویان چوونەتە لاوە سەیری خوارەوە بۆ لای شارۆچکەی سیروان دەکەن، ئاگایان لەئێمە نییە، ئێمەش نزیک بووینەوە وەستاین و بینیمان وا قافڵەیەکی نزیکەی ٥٠ پەنجا ئۆتۆمبێل لە شارۆچکەی سیروان دەرچوون و بەرەو بازگەکەی هەڵەبجە دێن، یەکێکیان بانگی کرد ئەوە هێزەکەی ئێوەیە؟ ووتمان بەڵێ، ڕزگارمان بوو، لە چ بارودۆخێکەوە بۆ چ بارودۆخێکیتر. لەوێ وەستاین، پێش ڕەوانی قافڵەکە ئێمەیان بینی هێواشیان کردەوە، نەیان ئەزانی ئێمەین، بەئاماژە ئیشارە ووتمان وەرن خۆمانین، چەکدارەکانی بازگەکە کەس نەیزانی چیان لێهات لەناوماندا ون بوون، هێزەکە هاتن و هەموو بەڕیکوپێکی لایاندایە کەناری جادەوە، هەڤاڵان کاک شەوکەتی حاجی موشیر، کاک مەحمود سەنگاوی و کاک جەمیل هەورامی و چەندین کاکیتر، پرسیان ئێوە لەکوێ بوون و چۆن لە هەڵەبجەوە دێنە خوارەوە؟ سەریان سوڕما. ئێمەش بە کورتی داستانەکەمان بۆ گێڕانەوە.

دواتر هەموو پێکەوە بەرەو ناوشار ڕۆیشتین، هێزەکان بڵاوبوونەوە بەچەند ئاراستەیەکدا، خەڵک وردە وردە هاتنەدەرەوە، لەوکاتەدا گەیشتینە ناو بازار و نزیک دەبووینەوە بۆلای بینای شارەوانی شار، چەند کەسێک هاتن ووتیان بە کاک جەمیل هەورامی مامۆستا مەلاعەلی دەڵێت بابێن بۆ ئێرە. مەبەستی ئەوە بوو بەرپرسەکان بچن بۆ لای بۆ بارەگای سەرەکی

بزووتنەوە. برادەران هەرکەسەو دەچوو بەدەم ئەو ئەرکەوە بۆی دیاری کرابوو، برادەرانی سۆشیالیستیش گەڕانەوە بۆلای کاکە حەمە. ئەو شەوە لە هەڵەبجەدا ماینەوە، بەیانییەکەی لەگەڵ کاک جەمیل و هێزێکدا بەرەو بیارەو تەوێڵە ڕۆیشتین. هێزمان لەبیارەو تەوێڵەو ئەو شوێنانەدا کە پێویست بوو دانا.

دوای ئەوە بەکاک جەمیلم ووت، ئەمەوێت بڕۆم بۆسلێمانی، هاتمە خوارەوە، کاک شەوکەت و کاک مەحمودیش لە هەڵەبجەدا نەمابوون کاک شەوکەت چووبوو بۆسلێمانی و کاک مەحمودیش بۆلای دوکان، ئەو هێزە زیادەی لای هەڵەبجەو شارەزووریان بردبوو، مادام لەگەڵ بزووتنەوە هیچ ڕویـنەدا هێزێکی کەم لە هەڵەبجەو هەورامان مایەوەو کاک جەمیل سەرپەرشتی دەکرد.

پەلەم بوو تا بگەمەماڵەوە. ئەو ڕۆژە لە سەیدسادقەوە چوبووم بۆ سلێمانی بەدوای منداڵەکاندا واتە ڕۆژی ١٩٩٦/٩/٨ کلیلی ماڵەکەمان دابوو بەماڵی کاک ڕەحیم ئێلانقوزی، دراوسێمان بوون، ماڵێکی بەڕێز و دراوسێی باشبوون، من کرێچی و لەناو ماڵی کاک هاشم بۆینیدا بووم، خۆی لە ئەوروپا بوو، ماڵەکەی دابوو بەئێمە تێیدا بژین کرێشی لێ وەرنەئەگرتین. کە گەیشتینە سلێمانی چووم بۆ وەرگرتنەوەی کلیلەکانمان، ماڵی کاک ڕەحیم ووتیان تافریاکەووتین دەرگاکانیان شکاندبوو، نازانین چیان بردوە خۆمان کێلۆنمان داوەتەوە لەدەرگاکان، ووتم کەلوپەلی ناوماڵ هیچ نییە برابێت تەنها خەمی یەک شتمە بۆیە بە پەلەش هاتووم بزانم ئەوشتەیان نەبردوە، بەدەم قسەکردنەوە دەچوینە ژوورەوە کاک ڕەحیم پرسی ئەوشتە چیە؟ خۆم کرد بەژوورێکدا و ووتم ئەم شتانەیە نەبراوە، ووتی ئەو دەفتەرانەیە دەی ئەوە چیتیایە؟ ووتم بەڵێ کاکە ڕەحیم ئەوە دەس نووسی وەرگێڕانی کتێبی بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگە، لەبەر خۆیەوە کاک ڕەحیم، ئەی ماڵت ئاوابێت دەی ئەوە چییە؟.

دەفتەرەکانم کۆکردەوەو زۆر دڵخۆش بووم لەگەڵ خۆمدا هێنامنە دەرەوە و کلیلەکانم دایەوە بە کاک ڕەحیم و هاتم بۆماڵی کاک بەهرۆز عابید بۆ عەقاری، لەوێ دامنان، خۆیشمان شەو لای کاک بەهرۆز ماینەوە، لە ماڵی بەهرۆز بووین ووتیان یەکێتی سلێمانی چۆڵ کردوەتەوە ئێوە چی دەکەن

لێرە؟ جێگەی بڕوا نەبوو کاک بەهرۆز ووتی ئێوە لێرەبن بامن بڕۆم هەواڵ بزانم، لای عەسر بوو بەهرۆز ووتی هەواڵی کاک شەوکەتم پرسیوە وتویانە شەو بەرەو سەیدسادق ڕۆیشتون، کاک جەمیل وئەوانیش خەریک بووە لەگەڵ بزووتنەوە دەرگیربن، بەلام هاتون و هەڵەبجەو هەورامانیان بەجێ هێشتوەو چوون بۆ لای نەوێ و بەردەبەل بۆبناری سورێن.

سێ پێشمەرگەم لەگەڵ بوو ووتم کاک بەهرۆز ئێمە لە شار دەچینە دەرەوە، ووتی بۆکوێ؟ ووتم با تۆ ئاگادار بیت دەچم بۆ تانجەرۆ بۆبارەگای حزبی دیموکرات، ئەگەر شتێک بوو لەماڵی کاک مەنسوری فەتاحی دەبم. بەیانی وەرە بۆلامان، تاریکی کرد چووینە تانجەرۆ بۆ ماڵی مەنسور، جگەلەوەی کاک مەنسور برادەرمەو لەسەر ئەوان کێشەم بۆ دروست بووە، سوهێلە خانی خێزانیشی خوشکی کاک بەهرۆزی مەنوچەریەو دۆست و خزمن، وەک ماڵی خوشکی خۆمە شەرم و تەعاروف ناکەم. شەو درەنگی کردبوو کاک بەهرۆز عابد هات بۆ تانجەرۆ، ماڵەکەی دۆزیبووەوە، دوای کەمێک ووتی ئێشم پێتە چووینە دەرەوە، ووتی ئێستا ئیقباڵی برات لە هەڵەبجەوە ئاگاداری کردم بە تەلەفون، ووتی سەید عومەری عەبابەیلێی چووە بۆ ماڵی خۆمان بۆلای دایکم، پێی وتووە، مەفرەزەیەکی دیموکراتم لە هاوارەوە هێناوە بۆ هەڵەبجە لە عەنەب بزووتنەوە دایبەزاندن و بردیانن، بەمنیشیان ووتوە لەلای هەرکەس باسی بکەیت ئەتکوژین. وامن بەئێوەم ووت بەلام ناوم مەبەن. ( دواتر ئاشکرا بوو خەڵکیتر زانیان سەید عومەر هێناونی بۆیە وابە ئاشکرا ناوم هێناوە) .

لەگەڵ ئەوەشدا بەهرۆز پێی ووتم، کاک عومەر فەتاح ئەمڕۆ لەمەڵبەندی سلێمانی بووە، منیش ووتم بەیانی ئەچم بۆ مەڵبەندو تۆش وەرە بۆ ئەوێ. چوینەوە ماڵەوە کاک مەنسور، پرسیاری کرد چیڕوویداوە؟ ووتم هیچ، ووتی نا چوویتە دەروە ئاسایی بوویت، هاتیتەوە گۆڕاوی، بردمەلاوەو بەبێدەنگ پرسیم مەفرەزەتان لەسنووری هەڵەبجەدا هەیە؟ ووتی بەڵێ، ووتم گیراون لای بزووتنەوەن، ووتی چۆن؟ بۆم باس کرد، ئیتر کاک مەنسور کەوتە پەیوەندی کردن و پرسیار کردن، تازە ئەم شەو نەخەوتین، دیموکرات سەرەتا گومانیان لەیەکێتی بوو ئەومەفرەزەی گرتبن، کاتێک هەستم کرد گومانیان لەخۆمان هەیە پێم ناخۆش بوو.

بۆیە بەیانی ڕۆژی ١٩٩٦/١٠/٢٠ زوو لەتانجەڕۆ دەرچووین و هاتینە ناوشار چووینە مەڵبەندی سلێمانی، هەواڵی کاک عومەر فەتاحمان پرسی وتیان لێرەبووە بەلاّم ئێستا چووەتە دەرەوە، هەر خەڵک بوو بەرەو ئەزمر و عەربەت دەچوون، شار سامناک و چۆڵی ئەنوێنێ. کاک عومەر هاتەوە چووم بۆلای هەواڵی لای شارەزوورو هەڵەبجەی ئەپرسی ووتم من لێرە بووم ئاگاداری ئەوێنیم، پرسی هێزت لەگەڵە؟ لەدلاّ ووتم کاتی ئەوە نییە بڵێم متەفەرقەم و هێزی چی، ووتم ئەمرکە.

ووتی بەڵکو بڕۆیت بۆ لای تاسلوجە بۆلای کاک مەحمود سەنگاوی لەوێیە. کاک کۆسرەت و ئەوان لە دوکانن زەختیان لەسەرە، پارتی ئەیەوێت لە خوارەوە دزەبکات. ووتم بەسەر چاو، لای کاک عومەر هەستاین و پرسیاری بەنزینمان کرد بەنزین دەست نەدەکەوت، برادەرێک نەشم ناسی ووتی ئەو کورە بنێرە بابێت، ڕۆستەم چوو بەدوایا لەوسەرەوە هاتەوە دوو دەبە بەنزینی هێنا سەیارەکەی مەوقعی[1] سلێمانیم پێبوو بەنزینمان تێکردو چووین بۆ تاسلوجە، قەرەباڵغ بوو هەریەکەو بەلایەکدا بەرەو دوکان بەرەو بازیان بەرەو سلێمانی خەڵک و پێشمەرگە تێکەلاّ و دەهاتن و دەچوون کەس بەکەسەوە نەبوو.

لەسێڕیانی تاسلوجە هەواڵی کاک مەحمودم پرسی لەشۆفێری تراکتۆرێک لەسەر ملەی تاسلوجە دەهاتە خوارەوە، ووتی نازانم نەم دیوە، بەلاّم ئەنوەر دۆلانی لەسەرەوەیە، ڕۆیشتین گەیشتینە سەرملە ووتیان کاک مەحمودو هێزێک بەرەودەربەندی بازیان ڕۆیشتن، چووین بە دوایاندا گەیشتینە نزیک ئوردوگای باینجان و دەبینین پارتی بەهێزێکی زۆرەوە هاتوون و لەنزیک گۆپاڵەدا لەگەڵ هێزەکەی یەکێتی ڕووبەڕوو، گەیشتون بەیەک و تەقە دامەزراوە، پارتی بەرەو دوا وەرگەڕاون و پێشمەرگەو خەڵک دوایان کەوتون و کەس بەکەس نییە.

---

[1] ئەو ئۆتۆمبێلە، لاندکرۆزی ناوچەی سلێمانی بوو، ئەوەبوو لە باشماخ لە پارتیمان سەندبووەوە، لە ئێران و لە باشماخ دامنابوو لای پێشمەرگەیەک، لەگەڕانەوەدا هێنابوویەوە. دواتر داوایان کردەوە نەمان دانەوە، ووتمان ئێمە لە دەست پارتیمان سەندوەتەوە.

هێزە شکاوەکەی پارتی لەتەکیە بوون بە دوو بەشەوە، بەشێکی بەرەو چەمچەماڵ و بەشێکی بەرەو ئاغجەلەر، ئیتر هێزەکانی یەکێتی لەکۆڵیان نەبوونەوە تا ئەوانەی چەمچەماڵیان کردن بەناو حکومەتی عێراقیدا و چوونە کەرکوک. ئەوانەی لای قۆڵی ئاغجەلەریش بۆ تەقتەق و لەوێشەوە بۆ دێگەڵە، ئێمە بەدوایانەوە بووین، لەتەقتەقەوە بە جادەکەی ئازادیدا سەرکەووتینەوە بۆ کۆیە لەبازگەکەی سێڕیانی تەقتەق کۆیە هەولێردا گەیشتینەوە بەو هێزانەی لە دوکانەوە هاتبوون و بەرەو دێگەڵە دوای هێزە شکاوەکانی پارتی کەوتبوون.

دەنگ و باسیش بڵاوبووەوە عێراق لە رێگای نێردراوی تایبەتەوە ئاگاداری یەکێتی کردووە لەوە زیاتر نەڕۆن و بووەستن، ئەگەر بەرەو هەولێر بێن بەرەنگاریان ئەبینەوە.

لە نزیک ئەو بازگەی سەر سێڕیانی کۆیە هەولێر ئازادی، کاک کۆسرەت بانگی کردم ووتی بەڵکو بڕۆیت بۆ دۆڵی سماقوڵی هێزێکمان لەوێیە لایان بیت تا هێزی تری بۆ ئەنێرین، ووتم بەسەر چاو، ڕۆیشتین گەیشتینە ئەوێ جەماعەتەکەی کاک مەحمود سەنگاوی لەوێ بوون، لەمبەر ئاوەکەوەی سماقوڵی گەلیەوە لەبن دار بەڕوەکاندا لەسەر رێگاکەدا بێسەنگەر و پەناگا دانیشتبوون، پرسیارم کرد هەرئەمانەن لێرەدا، ووتیان کاک سەرچڵی کاک سەرحەدی خەلیفە لەوبەرە پەڕیمەوە بۆلایان کاک سەچل و نزیکەی ١٨ هەژدە کەس بوون، دواتر کاک مەحمودیش هات بۆ ئەوێ و ماوەیەک پێکەوە بووین، ئەو شوێنە بوو بەسنووری نێوان زۆنی سەوزو زەرد. پارتی سنووری شەقڵاوە و دۆڵی هیران و خەلیفان و دۆڵی خۆشناوەتی بەپەلە و بەشپرزەییەکی زۆرەوە قایم کرد، بەڵام قەلەق بوون لەبەرگریکردن لەناو هەولێردا خۆیان ئامادە کردبوو بۆدەرچوون، بۆیە ئەو رۆژانە جارێکی تر پەنایان بۆ عێراق بردەوە، بەڵام یەکێتی لەدێگەڵە بەولاوە نەرۆیشتن. دوای هەفتەیەک لەئەنقەرە رێکەوتنێک کراو شەڕەکە وەستا.

بەرای من ئێرانیش ئاگادار بوون لەم بابەتە، هەرچەندە ئێران هاوکاری و پشتیوانی یەکێتیان کرد بۆ گەڕانەوەو گرتنەوەی زۆنی سەوز دوای ٣١ ی ئاب، ئەمەش بۆ ڕاگرتنی بالانس و تەوازنی هێزەکان. چوونکە دەوڵەتەکانی دراوسێی کوردستانی باشوور هەرچەندە هەردەوڵەتێک و

پشـــتیوانی لایەک لە پـــارتی و یەکێتـــی دەکـــات، لە شـــەڕەکاندا، بەڵام ئەو پشتیوانییە بۆ ئەوەنییە لایەک لاکەیتر بەتەواوەتی بشکێنێ، بەتایبەت دەوڵەتی ئێران ئەوە سیاسەتیەتی سەبارەت بەپارتی و یەکێتی، رەنگە بۆ چوونی تورکەکان لەم بارەوە جیاواز ترَبێت.

لە٣١ی ئابدا، هەولێری لێ دەرکەی، پاشەکشەو چۆڵ کردنی ناوچەکانی تری ژێر دەستی یەکێتی، لەلایەن یەکێتی خۆیەوە، لەباری سـەربازی و تـاکتیکی جەنگیەوە، شتێکی چاوەڕوان نەکراو و تاڕادەیەک ئابڕو بەرانە بوو، چوونکە تەنها لەناو هەولێردا سوپاو هێزەکانی عێراقی هێرشیان کردە سەر یەکێی و شارەکەیان لەژێر دەست یەکێتی دەرهێناو تەسلیمی پارتیان کرد.

لەناوچەکانی تری هەولێر و سلێمانیدا، عێراق هێرشیان نەکردە سەر هێزەکانی ئێمە لەگەڵ پارتیدا، لەم شوێنانەدا یەکێتی ئەوەندە بەرگری نەکرد، تابزانن ئاخۆ ئەگەر پارتی شکا عێراق لەوێش دێت بەدەمیانەوە، چوونکە بێگومـان ئەگەر یەکێتی لە دەرەوەی هەولێردا بەرەنگـاری بکردایە، پـارتی ئەشکا و توانای شەڕکردنی لەگەڵ یەکێتیدا نەبوو. بەڵام یەکێتی ئەمەی نەکرد و پاشەکشەی بەرەو سنوورەکانی عێراق ئێران کرد، پارتیش بەبێ بەرگری تاسەر سنوورەکان هاتن.

لە هێرشـی پـێچەوانە و گەڕانەوەی یەکێتیـدا، لە دوای یەکەم پێکـدا هەڵپژان، پارتیش بەهەمان شێوە زۆربەی زۆری سنوورەکانی زۆنی سەوزی چۆڵ کردو گەڕانەوە.

دواجارو لەم ئۆپەراسیۆنانەدا، لەنێوان عێراق و پارتی و یەکێتیدا، یەکێتی هەولێری لەدەست دا، پارتی هەولێری دەست کەوت، ئۆپۆزسیۆنی عێراق گورزی کەمەرشکێنیان بەرکەوت.

# داستانی تەسلیم کردنەوەی دیموکراتەکان

لەوکاتەدا یەکێتی پاشەکشەی کرد بۆ ئێران و پارتی بالادەستە لە سەرتاسەری کوردستاندا، حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لەچەندین لاوە مەفرەزەیان ئەناردنەوە بۆ ئەودیو بۆ ناو خاکی ئێران. بەرای من ناردنەوەی ئەم مەفرەزانەی دیموکرات بۆ رۆژهەلات بە ئاگاداری پارتی بوو، پارتی ئەیانەوێ ئەمە وەک کارتێکی فشار دواتر ئەگەر بۆیان کرا بەکاریان بێنن لە بەرامبەر ئێران دا.

چوونکە پارتی پێی وابوو ئیتر تەواو یەکێتی کۆتایی هات و لە ناو ئێراندا ئەمێننەوەو جارێکیتر ناگەرێنەوە، بەلام لەوانەیە ئەوکات یەکێتی مەفرەزەکانی بە پارتیزانی بنێرێتەوە بۆ ناو کوردستانی باشوور. ئەگەر ئەوە رویدا، ئەوا لەوکاتەدا پارتی لەگەڵ ئێراندا گفتوگۆ دەکەن، بۆ رێگری کردن لەناردنەوەی مەفرەزەکانی یەکێتی. واتە ئەگەر ئێران رێگەیدا مەفرەزەکانی یەکێتی بە پارتیزانی بێتەوە، ئەوە پارتیش رێگە ئەدا مەفرەزەکانی دیموکرات بچنەوە بۆ رۆژهەلات.

بەڵێ ئەو مەفرەزەی دیموکرات کەلەوکاتەدا واتە لەسەرەتایی مانگی ١٩٩٦/١٠دا نێردرابووەوە بۆ ناوچەی هەورامان و سنووری شارستانی پاوەی سەر بەپارێزگای کرماشان، دوای گەرانەوەیان لەرۆژهەلات، لەلایەن بزووتنەوەی ئیسلامیەوە لەعەنەب گیران و تەسلیم کرانەوە بە ئێران ئەمانە بوون: ١_ حەمە عەزیزی قادری خەڵکی ئاوایی نەروی سەر بەشارستانی نەوسوود ٢- ئەرشەدی رەزایی خەڵکی ئاوایی شۆشمێی خوارو هەمان شارستان ٣- داریوشی ئیسلام دوست خەڵکی شارستانی نەوسوود ٤- عەدنانی ئیسماعیلی، ٥- مەعروفی سوهرابی ٦- یونسی محەمەد پور ٧- مزەفەری کازمی، ئەم چوارەی دوایشیان خەڵکی شاری پاوەو دەورو بەری بوون .

ئەم مەفرزە لەرۆژی ١٣٧٥/٥/٦ شەمسیدا، لەنزیک شاری پاوەو لە باکووری رۆژئاوایی شارەکەدا، لە جێگەیەکدا بەناوی هانە براڵو، پاسدارێکی خانەنشین کراو بەناوی حاجی غولامی موعازی ئەکوژن. هێزە ئەمنییەکانی

ئێران، ئەکەونە چاودێری کردن بۆ دۆزینەوەو لەداو خستنیان، ئەو مەفرەزە دوای کوشتنی ئەو پاسدارە خانەنشین کراوە، ئەکەونە ڕێ و ئەگەڕێنەوە بۆ کوردستانی باشوور بۆ لای هەڵەبجە.

لەگەڕانەوەدا کاتێک ئەگەنە دۆڵی هاوار، دیارە ئاگادار ئەکرێن یەکێتی لە هەڵەبجەو هەوراماندا نەماون و پاشەکشەیان کردووە بۆ دەورو بەری سەیدسادق. بزووتنەوەی ئیسلامی لەهەڵەبجەو دەورو بەریدان. هێزە ئەمنییەکەی ئیرانیش بەدوایانەوە بوون و چاودێریان کردون و زانیاری تەواویان لەسەریان هەبووە. هەوڵیان داوە بۆ لەداو خستنیان.

ئێوارەی ڕۆژی١٩/١٠/١٩٩٦ مەفرەزەکەی دیموکرات لە ئاوایی چۆڵکراوی هاواردا ئەبن، پیاوێکی خەڵکی هاوار بەناوی مام قارەمان، ئەبینن و ئەیانەوێ بینێرن بۆ هەڵەبجە، تا ئۆتۆمبێلیان بۆ بنێرێت، لەوکاتەدا لە هەڵەبجەوە ئۆتۆمبێلێک ئەڕوات بۆهاوار شۆفێرەکەی ناسراویان دەبێت، دەڵێن بمانبەرە خوارەوە بۆ هەڵەبجە، ئەویش پێیان دەڵێت بارودۆخەکە ئاسایی نییەو یەکێتی پاشەکشەی کردوەتەوە لەسنوورەکەدا نەماون، بزووتنەوە لەسەرجادەن، ئەرشەدی ڕەزایی وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت باشتر کەیەکێتی لێ نییە.

هەر ئەو ئێوارە دێنە خوارەوە، کاتێک ئەگەنە نزیک ئاوایی عەنەب بازگەی بزووتنەوە ڕایان ئەگرن، تائەو ئێوارە لەوشوێنەدا بازگەیان نەبووە. داوایان لێدەکەن دابەزن، ئەوانیش دێنە خوارەوە، دوای چەند خولەک لەگفتوگۆی نێوانیان، ئەرشەد دەڵێت ئەگەڕێینەوە بۆ سلێمانی، بزووتنەوە پێیان دەڵێن خۆمان ئەتانبەینەوە، ناکرێ بەئاشکرا بڕۆن.

بەناوی میوان داریەوە ئەیانبەنەماڵێک لەئاوایی عەنەب، لەوێ پێیان دەڵێن، ئەبێ چەکەکانتان دابنێن بەجیا چەکەکانتان ئەنێرینەوەو خۆشتان بەبێچەک ڕەوانە دەکەینەوە، بەم قسانە فریویان دەدەن، تاچەکو چۆڵەکەیان لێوەر ئەگرن، ئەو شەوە چەند کەسێک سەردانیان ئەکاو دوای ئەوە دەست وپێیان ئەبەستن و ئەیانخەنە ناو ئۆتۆمبێلێکی ئەمبوولانس و ئەیانبەن بەرەو شارۆچکەی تەوێڵە، فەرموون لەسەر چۆنییەتی گرتن و تەحویل دانەوەیان لە زاری داریوشی ئیسلام دۆستەوە کە یەکێکە لەو حەوت کەسە گیراوەیە،

دواتر بەپێی پلانێك خوشكەزایەكی ئێرانییەكان فریو ئەدا، ئەوانیش ئازادی دەكەن و ئەویش هەڵدێت، داریوش ئێستا لەوڵاتی سوئێدە.
((ئێمە تیمێكی ٧ حەوت نەفەری بووین، لەرێككەوتی١٩/١٠/١٩٩٦دا، لەلایەن حزبەوە، بەمەبەستی ئەنجام دانی ئەركێكی تەشكیلاتی گەڕابووینەوە بۆناوچەی هەورامانی بەشی ڕۆژهەلات. لەكاتی گەڕانەوەمان بۆ عێراق لەمەرزەوە گوزەرمان كردو بەنهێنی هاتینە ئاوایی هاوار. تەنها پیاوێكی بەتەمەنمان بینی بەناوی مام قارەمانی كەیكاوس، ئۆتۆمبێلێك لە هاوار بوو، تەنها ئەرشەدی رەزایی چوو بۆ ئەوەی پێی بڵێت بمانباتەوە بۆ هەڵەبجە. ئێوارەبوو لەگەڵ سەید عومەر سواربووین و هاتین، بەر لەوەی بگەینە یەكەم بازگەی ئاوایی عەنەب بە٢٠٠ دووسەد مەتر، بەریان گرتین و ووتیان دابەزن ئێمە دابەزین، پرسیاریان كرد ئێوە كێن ؟ ئەرشەد ئێمەی ناساند و بزووتنەوە ووتیان مەچنە هەڵەبجە بارودۆخەكە ئاسایی نییەو وەرن لای ئێمەبن، خۆمان رەوانەتان دەكەینەوە، سەید عومەر پێی ووتین ئەتوانن لەگەڵیان برۆن جێگەی نیگەرانی نییە، من ئەیانناسم بزووتنەوەی ئیسلامین وبرپكیشیان خزمی خۆمن. ئێمە لەماشێنەكەی سەیددا دابەزین و لەگەڵیان ڕۆیشتین بۆبارەگاكەیان بۆ ئاوایی عەنەب، ئەرشەد داوای هاوكاری لێكردن و ووتی بەڵكو رەوانەمان كەنەوە بۆ سلێمانی، ئەوانیش قبووڵیان كردو ووتیان تازە ئێستا شەوە بەیانی بەبێچەك ئەتان گەێنینە سلێمانی و خۆمان لەوێ چەك و چۆڵە و كەلوپەلەكانتان تەسلیم دەكەینەوە، با بەخۆتان نەبێت باشترە.
ئێمەش بە دڵنیایی تەواوەوە چەكەكانمان و هەموو ئەوشتانەی پێمان بوو هەتا رادیۆو پێناسەكانیشمان تەحویل ئەوان دان، بەنییەتی ئەوەی بەیانی لە سلێمانی تەحویلمان بدەنەوە. دوای ئەوە وەسائیلەكانمان تەحویل دان، بردینیانین بۆ مەدرەسەكەی (قوتابخانەكەی) عەنەب، لەمەدرەسەكەدا بووین چەند نەفەرێك هاتن بۆلامان، دوای چاكوچۆنی و بەخێرهێنان یەكێكیان كە دیارە بەرپرسیان بوو، دوای چاكوچۆنی خۆی دەناساند، ووتی من یەكێتیم ناوم مەهدی حەمەسەعیدە، منیش ووتم تۆ كاك مەهدی نیت، ووتی مەهدی برای حەمەی حەمەسەعید ئەڵێم، ووتم منیش ئەو ئەڵێم، ووتی چۆن ئەزانی ئەونیم؟ ووتم كاك مەهدی خزمانەو چۆن نایناسم، بەپێكەنینەوە ووتی شۆخیم (گاڵتەم) كرد، من بزووتنەوەم جەماعەتی ئەنوەر عەنەبیم هاتم بزانم

هیچتان پێویست نییە؟ نیگەران نەبن ئینشائەلا بەیان ئەتان گەیێنینە سلێمانی، ئێمەش سوپاسمان کرد.

بەیانی زوو بەر لەڕووناک بوون، هاتن ووتیان با کاک ئەرشەد بێتە دەرەوە، ئەرشەد ڕۆیشت و نەگەرایەوە، دوای ئەو منیشیان بانگ کرد، چوومە دەرەوە تاریک بوو کەسم نەئەبینی، چەند هەنگاوێک لەگەڵ کەسێکدا ڕۆیشتم و لە دواوە شتێکیان کرد بەسەرمداو چەند کەسیش پەلاماریان دام و دەست و پێیان بەستمەوەو فڕێیان دامە ناو ماشێنێکەوە ئەوانیتریشیان بەهەمان شێوەو یەکیەک هێنا، دوای چەن کاتژمێرێک ڕۆیشتن بە ماشێن، خۆمان لە ناو ئێراندا بینییەوە لەوێ زانیمان تەحویل دراوینەتەوە )) .

بەڵێ ناو کەوانەکەو تائێرە دەقی قسەکانی داریوشی ئیسلام دۆستە.

حزبی دیموکرات سەرەتا گومانیان لەیەکێتی بوو لەو بارەشەوە برێک سەرو سەدایان بەرز بووەوە ، دواتر بۆیان دەرکەوت داستانەکە چۆنە، بێدەنگ بوون، بەلام لەڕێگەی چەند کەسێکەوە پەیوەندیان بە مامۆستا مەلا عەلیەوە کرد و داوایان کرد لەوبارەوە وەلامیان بدەنەوە چۆن بووەو چیان لێکردون، ئەوانیش حاشایان کردو نەچوونە ژێرباری ئەوبابەتە، بەلام تازە رووداوەکە ئاشکرا بوو، خەڵکی عەنەب مەفرەزەکەی دیموکراتیان بینیوە، سەید عومەر شوفێری ئۆتۆمبێلەکە ئەیناسین، ئوتۆمبێلێکی خۆیان ئەو شەوە مەفرەزەکەی دیموکرات ئەبەنەوە بەرەو سنوور لەنزیک تەوێڵەدا پەکی کەوتبوو، ئەچن لەناو تەوێڵە ئۆتۆمبێلێکی تر ئەهێنن، ئەوشوفێرەی لە تەوێڵەوە بردبوویان لەگەڵ خۆیان کاتێک ئەچن بەرەوسەر سنوور، خەڵکی تەوێڵەیەو جەماعەتی بزووتنەوەی ناسیون.

زیاد لەوانەش داریوش کەیەکێکە لەو حەوت پێشمەرگەی دیموکرات،[1] ئازاد کراو چۆنییەتی رووداوەکەی بەو شێوەی سەرەوە باسکردووەو لەمیدیاکاندا بلاوبووەتەوە. من لام مەبەست بوو چۆنیەتی هەڵهاتن و ڕزگاربوونی داریوشی ئیسلام دوست بزانم، پرسیارم کرد لەبنەماڵەکەیان، ئاوایان ووت: بارەگاکانی حیزبی دیمکرات لەتانجەرۆدا بوون، نزیک بەباخی نەوزادی نوری

---

١

بەگ، خوشکەزایەکی داریوش باخەوان و پاسەوانی باخەکەی نەوزاد بوو بەناوی عەدنان عەلی، عەدنان ئێرانیەکان ئاگادار دەکات ئەگەر خاڵۆی ئازاد بکەن ئەتوانێ مەنسوری فەتاحی بکوژێت، لەژێریشەوە دیموکرات ئاگادار دەکات.

مەنسور ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی حیزب و لەتانجەرۆ دادەنیشت، ئێرانیەکان داوا دەکەن ژنومنداڵەکەی داریوش لەعێراقەوە بگەڕێتەوە بۆ ئێران و وەک زەمانەت (بارمتە) بن، تاعەدنان لەگەڵ داریوش کارەکە ئەنجام ئەدەن، دیارە عەدنان داواو مەرجی ئەوەبووە خاڵی بهێنە باخەکەو لەوێ پێکەوە بڕۆن بۆ کوشتنی مەنسور، دوای گەڕانەوەی هاوسەرو منداڵەکانی داریوش، ئێرانیەکان داریوش لەزیندانەوە ئەهێننەوە سلێمانی و ئەیبەنە باخەکەی نەوزادو لەوێ لەگەڵ عەدنان پێکەوە ئەچنە خوارەوە بۆ بارگاکانی دیموکرات، دیارە دیموکراتیش ئاگاداربوون و چاوەڕێیان کردوون، ئەمان ئەگەن و ئەوان پێشوازیان دەکەن.
بەرنامەکەی عەدنان سەری گرتوو داریوشی رزگار کرد، لەڕاستیدا بۆمن جێگەی سەرنجە، ئەگەر ئاوا بووبێت، چۆن دەستگایەکی وەک دەزگای ئاسایشی ئێران لەلایەن کەسێکی سادەو ساکارو کرێکارەوە هەڵخەلەتاون.
بەڵێ لەوەش زیاتر بڵاو بوونەوەی نامەکەی سەفیری کەبیری ئێرانە لەبەریتانیا بۆجەرمی کوڕبین و بێدەنگی بزووتنەوەی ئیسلامیش لەو بارەوە، ئیتر شک و گومان لەسەر ئەو روداوە نەماو سەلمێندرا کە بزووتنەوە ئەو کارەی کردووە.

بەدرێژای خەبات و تێکۆشانی لایەنەسیاسییەکانی کوردی باشوور بەدژی عێراق، پەیوەندی دۆستانەمان لەگەڵ ئێراندا هەبووە، بۆ ئێمە بەتایبەت لەدوای هاتنە سەرکاری کۆماری ئیسلامی ئێران، بەتایبەتیش دوای راگەیاندنی دوژمنایەتی، لەلایەن سەدام و حزبی بەعسەوە بەدژی ئێران، هەموو لایەکمان بەتایبەتی پارتی و سۆشیالیست و یەکێتی و......تاد، بەردەوام و پچڕپچڕیش بووبێ ئێران هاوکاری کردوین و ئەو پەیوەندیە دۆستانەیەمان هەبووە لەنێواندا، ئێمەش هاوکاری ئەوانمان (ئێران) کردووە، لەکاتی شەڕی ئێران و عێراق دا بەتایبەت لەدوای ساڵی ١٩٨٥وە تاساڵی ١٩٨٨.

ئۆپۆزسیۆنی ئێرانیش لەبەردەست و لەناو ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێردەستی لایەنە سیاسییەکانی کوردستانی باشوور بوون بەئێستاشەوە، ئەوە ماوەی١٠ دە ساڵە لەپەناو لەژێر دەستەڵاتی حکومەتی هەرێم دان، تائێستا بەفەرمی و بەئاشکرا نەدەوڵەتی ئێران داوای تەسلیمکردنەوەی کەسیانی کردووە، نەهیچ لایەک و نەهیچ حزبێک و نەحکومەتی هەرێمیش هیچ کەسێکی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی تەسلیم بە ئێران کردووەتەوە. ڕەنگە لەشۆڕشی ئەیلول و لەم دواییانەشدا لێرەو لەوێ لە پەناو پەسوێدا، خەڵک لەئۆپۆزسیۆنی ئێرانی کوژرابن یان تەسلیم کرابنەوە ئەویش زۆرکەم و بەشاراوەیی بووە.

بەرای من ئەوە شتێکی چاوەڕوان کراو بوو لەوکاتەدا، گرتن و تەسلیم کردنەوەی ئەو مەفرەزەی حزبی دیموکراتی ئێران، شتێکی نهێنی و کەسیتیش نەبوو، وەک ئەوەی خەڵک و حزبی دیموکراتیش خۆیان تاوانەکە دەدەنە پاڵ ئەنوەر عەنەبی بە شەخسی لەناو بزووتنەوەدا، نەخێر ئەوە وانییە ئەوکارە بە شەخسی ناکرێت. ئەولایەنە ئەوەی کرد لەپای ئاسایی کردنەوەی پەیوەندییان لەگەڵ ئێراندابوو، چوونکە ئێرانییەکان لەسەر ٣١ی ئاب و لە گرتنەوەی هەولێر لەلایەن سوپای سەدام و دەرهێنانی لە دەست یەکێتی و تەسلیم کردنی بە پارتی، لایەنگری بزووتنەوەی ئیسلامی بۆ ئەو بابەتە و دانیشتن و بەشداریانکرد لەگەڵ پارتیدا لە حکومەت لە هەولێر، ئێرانییەکانی تووڕە کرد لەبزووتنەوە و لێیان نیگەران بوون، بزووتنەوە ویستی بەم کارەیان نیگەرانی ئێرانییەکان برەوێننەوە.

لەدرێژەی هەوڵ و تەلاشەکانی دیموکرات بۆ ئاشکرابوونی چارەنوسی ئەو شەش ئەندامەیان، لە ئەوروپا داوا لەجەرمی کوربین جێگری بەرپرسی مافی مرۆڤ لە پەرلەمان دەکەن، لەوبارەوە هاوکاریان بکات، لەوەلامی نامەیەکی سکرتێری حزبی دیموکراتدا، ساڵی ٢٠٠٣، کوربین لەگەڵ مورتەزای سەرمەدی سەفیری کەبیری ئێران لە بەریتانیا پەیوەندی ئەگرێ، سەفیر پێی دەڵێت لەوبارەوە هیچ زانیارییەکی نییە، ئەگەر دواتر زانیاری دەست کەوت وەلامی دەداتەوە.

لە ڕۆژی ٢٧ی مارسی ٢٠٠٤دا سەفیری کەبیر بە نوسراوێکی فەرمی وەلامی کوربین دەداتەوە، لەو نامەدا دەڵێت:

ئەوانە حەوت کەسی حزبی نایاسای دیموکرات بوون، لە خاکی عێراقەوە دزەیان کردووەتە ناو خاکی ئێران، پاسدارێکی خانەنشین کراویان تیرۆر کردووە، کاتێک گەڕاونەتەوە لەسەر سنوور بزووتنەوەی ئیسلامی لێیداون شەش کەسیان کوژراون و یەکێکیان دیلکراوە، ئەو دیلکراوە بەمداخەلەی عەبدولکەریمی جەلالی کەیەکێکە لەسەرانی دیموکرات، حەمەی حەمە سەعید دیلەکە لەبزووتنەوە ئەسەنێتەوە چوونکە خزمایەتیان هەیە. ئێستا ئەو کەسە لە وڵاتی سوئێدە. ئەمە دەقی وەرگێڕدراوی نامەکەی سەفیری کەبیری ئێرانە، لە ڕۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی حزبی دیموکرات دا بڵاوکراوەتەوە.

نامەی سەفارەتی جمهوری ئیسلامی لە بەریتانیا بۆ
جەرمی کوڕبین دەستەی مافی مرۆڤ

پارلەمان
لەندەن ۲۹ی مارسی ۲۰۰٤
جەنابی ئاغای کوڕبین

سەبارەت بەنامەی مورخەی ۱۱ی سێپتێمبەری ۲۰۰۳ کە لەونامەدا پرسیاری بارودۆخی شەش کەسی ئەندامی حزبی نایاسایی دیموکراتی کوردستانی ئیرانتان کردبوو. ئاگادارتان دەکەم بابەتەکەم لەگەڵ بەرپرسانی پەیوەندیدار لە ئێراندا باس کرد، ئەم زانیاریەی خوارەوە لەلایەن سەفارەت خانەوە وەرگیراوە.

لەئۆکتۆبەری ۱۹۹٦دا دەستەیەکی تیرۆریستی پێکهاتوو لەحەوت کەس، لەئەندامانی نایاسایی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لە ڕێگەی سنووری هاوبەشمانەوە لەگەڵ عێراق دا هاتونەتە ناو قەڵەمڕەوی جمهوری ئیسلامی، ناوی ئەم حەوت کەسە بریتییە لە : عەدنانی ئیسماعیلی، مزەفەری کازمی، یونسی محەمەد پور، محەمەد عەزیزی قادری، ئەرشەدی ڕەزایی، مەعروفی سوهرابی و داریوشی ئیسلام دوست. دوای چالاکیەکی تیرۆریستی لەلایەن ئەم دەستەوە کەبووە هۆی کوشتنی غولامی موعازی کەپیاوێکی خانەنشین کراوی سوپای پاسدارانی ئینقیلابی ئیسلامی بوو، گەڕاونەتەوە بۆ بنکەکانی خۆیان لە باکووری عێراق لە گەڕانەوەدا لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستانی عێراق بەشەڕ دێن لەم شەڕەدا شەش کەسیان ئەکوژرێن، یەکێک

لەوانە بەناوی داریوشی ئیسلام دوست لەلایەن بزووتنەوەی ئیسلامییەوە دیل ئەکرێت، دوای مداخەلەی عەبدولکەریمی جەلالی یەکێکە لەسەرانی ئەو تاقمە، زیاتر بەهۆی خزمایەتییەوە سەرئەنجام حەمەی حەمەسەعید داریوش لەدەست بزووتنەوە وەرئەگرێتەوەو ئازاد ئەکرێت. بەپێی ئەوزانیاریەی هەیە داریوشی ئیسلام دوست ئێستا لەوڵاتی سویدە و ئەندامی کۆمەڵەی کاوای حزبی نایاسایی دیموکراتی کوردستانی ئێرانە

لەگەڵ رێزدا

مورتەزا سەرمەدی سەقیز کەبیر

کۆپی دەقی نامەکە بە زمانی فارسی



# دەقی نامەکە بەزمانی ئینگلیزی

*Embassy of the*
*Islamic Republic of Iran*

In the Name of the Almighty

The Rt. Hon. Jeremy Corbyn MP
Vice-Chair, Parliamentary Human Rights Group
213a Blackstock Road
London
N5 2LL

29 March 2004

Dear Mr Corbyn

I refer you to letter of 11 November 2003 concerning your inquiry about the situation of six members of the banned Kurdistan Democratic Party of Iran. The matter was communicated to the relevant authorities in Iran and the following information was received by this embassy.

In October 1996 a terrorist team comprising seven members of the banned Kurdistan Democratic Party of Iran entered the territory of the Islamic Republic of Iran via our common borders with Iraq. The names of the seven are as follows: Pilnam Hamzeh, Mozaffar Kazemi, Yunis Mohammadpour, Mohammad Aziz Ghaderi, Arshad Rasula, Maaroof Sohrabi, and Daryoosh Eslamdoost.

Following a terrorist operation by this team that caused the death of Gholam Mosni, a retired man from the personnel of the Islamic Revolutionary Guards, they were engaged in a gun battle with the forces of the Islamic Movement of Kurdistan while returning to their bases in northern Iraq. In this gun battle six members of the team were killed and one man, Daryoosh Eslamdoost was captured by the members of the Islamic Movement of Kurdistan.

After interventions and follow-up by Abdulkarim Jalali, one of the present leaders of this outlaw group, and further interventions by Mohammad Mohammadzadeh, who is one of the in-laws of Daryoosh, he was ultimately freed from the detention of the Islamic Movement of Kurdistan. According to information available to us Daryoosh Eslamdoost is presently residing in Sweden and is an active member of the banned Kurdistan Democratic Party of Iran.

Sincerely yours

Mortaza Sarmadi
Ambassador

[illegible]

# حکومەتی هەرێم و دوکانتۆنی

لە پاش ئۆپەراسیۆنی یەکەمی گەردەلولی تۆڵە، لە دوای ٣١ی ئاب یەکێتی دەستی گرتەوە بەسەر ئەو سنوورەی لە ٣١ی ئابدا لێی سەنرابوو جگە لە شاری هەولێر، لە گرتنەوەی سنوورەکەو سەندنەوەی لەپارتی، شان بەشانی هێزەکانی یەکێتی، هێزی چەندین حزب بەشدار بوون، لەوانە: حزبی سۆشیالیستی کوردستان، حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان، پارتی پارێزگاران و دیموکراسی خوازان. دواتر لەنێوان ئەم حیزبانە و یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا، هاوپەیمانێتیکی نوێ بەناوی هاوپەیمانی دیموکراتی کوردستان دروست بوو، لەدوای ٣١ی ئاب، ئەمە لەدژی ئەو هاوپەیمانێتی و هەماهەنگیەی نێوان پارتی و ڕژێمی بەعس بوو بەر لە ٣١ی ئاب بۆگرتنەوەی هەولێر و کوردستان و دەرهێنانی لەژێر دەستی یەکێتیدا.

ئەم هاوپەیمانێتیە ڕۆژی ١٩٩٦/١٠/٢ ڕاگەیێنراوێکی هەبوو کەلەوێدا هەر پێنج لایەن جەختیان کردوەتەوە لەسەر ئەوەی، هێشتا کوردستان مەترسی لەسەرە، پێویستە هەر پێنج لایەن هەماهنگی و پەیوەندی فراوانتر و توندوتۆڵتر پەرە پێبدەن، فراوان بکەن و هەنگاو بەرەو هاوپەیمانییەتیەکی فراوانتر بۆپاراستنی کوردستان و دەست کەوتەکانی بنێن. ئەوەبوو لە ١٩٩٦/١٢/٥دا نوێنەرانی هەر ٥ پێنج حیزبەکە بەرنامەی کاری هاوپەیمانییەتیەکەیان واژۆ کرد.

لە پێشەکی بەرنامەکەدا جەخت کراوەتەوە لەسەر ئەوە، هاوکاری پارتی دیمۆکراتی کوردستان و ڕژێمی عێراق لە ٣١ی ئاب دا، قۆناغێکی نوێی لەهاوخەباتی هێزە نیشتیمانییەکانی کوردستانی هێناوەتە ئارا دژ بەو هاوکاریە بۆ پاراستنی، دەست کەوتەکانی کوردستان دوای ١٩٩١.

لەبەرنامەکەدا جەخت کراوە لەسەر هەشت خاڵ و سەبارەت بەبنەماکانی پەیوەندی و کاروباری ناو خۆش لایەنەکانی هاوپەیمانییەتیەکە ڕێک کەوتون لەسەر ١٠دە خاڵ.

لەدوای ئۆپەراسیۆنی گەردەلولی تۆلە و گرتنەوەی سنوورەکان، لە شەڕی ناوخۆی هەرێمدا جۆرێک لە هاوسەنگی نوێ هاتە ئاراوە، بۆیە دەوڵەتانی وەک ئەمریکا و بەریتانیا و تورکیا کەوتنە پەیوەندی کردن و هەوڵی ئاگر برو ئاشتی لە کوردستان دا، بۆ ئەو مەبەستە مام جەلال و کاک مەسعود بانگهێشت کران و ڕێککەوتننامەی۱۹۹٦/۱۰/۳۱ی ئەنقەرەی لێکەوتەوە و شەڕ لە نێوان یەکێتی و پارتیدا وەستا.

پارتی لە دوای ئۆپەراسیۆنی ۳۱ی ئاب، لەمانگی۹ ساڵی ۱۹۹٦دا هەوڵی دا لەگەڵ لایەنەکانی شیوعی و یەکگرتوو و بزووتنەوە و زۆریش لەگەڵ سۆشیالیست و کاکە حەمە خۆیدا، بۆئەوەی بەشداری بکەن لەو حکومەتەی لای زۆنی زەرد و پارتی، جگە لە سۆشیالیست ئەوانی تر هەموو، قبووڵیان کرد و بەشدار بوون.

هەرلەم کاتەدا کاک مەسعود بەرزانی لێبووردنێکی گشتی دەرکرد، بۆ یەکێتیەکان و ئەو خەڵکەکەی ئاوارەیان کردبوون لەگەڵ عێراقدا، بۆ گەڕانەوە و تەسلیم بوونەوە بەپارتی. نازانم لەوکاتەدا کاک مەسعود، چۆن بیرکردنەوەیەکی هەبووە لەسەر ئەو شکانە سەربازیەی کاتیەیی یەکێتی بەدەستی عێراق و بەرەزامەندی ئەمریکا، بیانوەکەش لەوکاتەدا بۆ ئەمریکا گوایا هاتنی ئێران بووە بۆ ناوچەکە.

هەرچۆن بووبێ گوزەشت، کاک مەسعود خۆی ئەیزانی یەکێتی کۆتایی نایەت، باشتر وابوو لەو کاتی شکانەدا لەباتی داوای تەسلیم بوونەوە، داوای ڕێکەوتن و ئاشتی بکردایە. ڕەنگە دەور و بەرەکەی پێیان کردبێ. چوونکە کاک مەسعود خۆی حزبییە و ئەبێ بزانێ، حزبێکی سیاسی نەتەوەیی، نەتەوەی کورد، نزیک بە نیوسەدە خەبات و بەرگری و قوربانی بدا، بۆ ڕزگاری ولەوپێناوەدا حزبەکەی ئەویش وخەڵکی تریش ڕیشەی قوڵی جەماوەرییان هەیە، لەنێوەندی نێودەوڵەتیدا ناسراون، خاوەن هەزاران هەزار شەهید و سەدان هەزار پێشمەرگە و ئەندام و لایەنگر و کەم ئەندام و بێسەرو شوێنن، دەوڵەتانی ناوچە بۆهاوسەنگی سیاسی پێویستیان پێیانە هەروا بەئاسانی و بەشکستێکی کاتی ئەویش بەدەستی یەکێک لەدەوڵەتانی ناوچەکە تەواو کۆتاییان نایێت بۆیە ئەگەر ئەو ڕۆژە من لەجێگەی کاک

مەسعوددا بام، لەباتی لێبووردن و داوای تەسلیم بوونەوە، داوای دانیشتن و ڕێککەوتنم دەکرد.

من نازانم چەندە ڕاستە ئایا ئەمە وابووە یان دروست کراوە، بیستومە لەشەڕێکی ناوخۆدا، کاک مەسعود تورە بووە لەسەرکردەکان و فەرماندەکانی سەر پەرشتیاری هێزەکانی پارتی، گوایا پێی وتون پارەو ئازوقە و ئیمکاناتی٦٠٠٠٠شەست هەزار پێشمەرگەم لێ وەرئەگرن، بەڵام دوجار پێویستم پێتان بووە، جارێکیان تورکم هێناوە و جارێکیان عێراق. من نازانم ئیتر ئێوەم بۆ چییە؟.

بابێمەوە بۆ لای دروست بوونی دوکانتۆنەکە، پارتی بەولایەنانە بۆشایی و کەلێنەکانی نێو حکومەتی هەرێمی پڕکردەوە. لەم لاش یەکێتی حکومەتێکی دامەزراندەوە، لە دوای دروست بوونی هاوپەیمانی دیموکراتی و دابەش بوونی بەکردەی زۆنی زەرد و سەوز، بۆبەڕێوە بردنی کاروبارە ئیدارییەکانی زۆنی سەوز، یەکێتی لە پاشماوەی بەشە حکومەتەکەی کە لە هەولێر هاتبووە دەرەوە وەک شەرعیەتێک کە سەرۆکی حکومەتەکەشی لایە، لە ڕۆژی ١٩٩٧/١/٢٦دا بڕیاری دا بۆشاییەکانی کابینەی دووەم بەسەرۆکایەتی سەرۆکی کابینەی دووەم کاک کۆسرەت ڕەسول عەلی پڕبکاتەوە، کابینەکە لە سلێمانی دەست بەکارەکانی بکاتەوە.

دوای وەرگرتنی کاندیدەکان، کاندیدەکانی سۆشیالیست و زەحمەتکێشان و پارێزگاران و بزووتنەوەی ئیسلامی، کابینەکە تەشکیل کرا. بزووتنەوە لە حکومەتی هەولێر و سلێمانیش بەشداری کرد. بە قسەی پێشینان بزووتنەوە بوونە کاری دوو دایکە. شیوعی هەرلەوەی هەولێردا مانەوە لە سلێمانی بەشداریان نەکرد.

ئەمە وەزیرەکانی کانتۆنی سلێمانی کابینەی دووەمی حکومەتی هەرێم بوون:

| | |
|---|---|
| کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی | سەرۆکی وەزیران |
| د.کەمال فوئاد | جێگری سەرۆک وەزیران |
| جەبارفەرمان | وەزیری پێشمەرگە |
| عومەر عەبدوڵا | وەزیری ناوخۆ |
| د.ئەرسەلان بایز | وەزیری پەروەردە |
| محەمەد شاکەلی | وەزیری ئەوقاف |

| | | |
|---|---|---|
| سالار عەزیز | وەزیری کشتوکاڵ | |
| قادر جەباری | وەزیری پیشەسازی | - سۆشیالیست |
| عەبدولڕەحمان نەورەسی | وەزیری داد | - بزووتنەوە |
| بەهمەن حسێن | وەزیری ئاوەدان کردنەوە | - زەحمەتکێشان |
| نەجم سورچی | وەزیری ڕێگاوبان | - پارێزگاران |
| سەعدی ئەحمەد پیرە | وەزیری تەندروستی | |

## جارێکی تر شەڕی بزوتنەوە ١٩٩٧

لەسەرەتای ساڵەوە ماتەم باڵی کێشابوو بەسەر شەرگەکاندا، من لە هەڵەبجە دا مابوومەوە، لەگەڵ عەدنانی حەمەی مینا، عەدنان بەرپرسی فەرماندەی ٦ شەشی شارەزوورو لێپرسراوی مەڵبەندیش بوو، من لەوکاتەدا هیچ پلەو بەرپرسیاریەتیەکی فەرمیم نەبوو، بەرپرس و فەرماندە دیارەکانی ناوچەکە جۆرە هەڵوێستێکیان وەرگرتبوو، نەدەهاتنەوە هەڵەبجە و هەورامان، من نەمزانی هۆکارەکان چین. ئەوەندی بیانو بوون شتێکی تر نەبوو، ئەوترا بۆ عەدنان بەرپرسی مەڵبەندو بەرپرسی فەرماندەییشە.

لەبەرئەوە بارودۆخەکە نائارام و گرژی هەبوو، من بەخۆبەخشانەو لەبەر عەدنان مامەوە و بڕیارم دا تا بارو دۆخەکە بەوشێوە بێت عەدنان بەجێ نەهێڵم، ئەویش ڕێزی تایبەتی لەمن دەگرتوو بۆ هەموو شتێک ڕاوێژی پێ دەکردم، بارەگای مەڵبەند و فەرماندەیش پێکەوە بوو لەبینایەکی حکومەتدا لەناو کۆمەڵگەی عەنەب، بەبڕیاری مام جەلال نۆژەن کرابووەوە لەسەر بووجەی سکرتاریەت.

لەناو شارۆچکەی سیروان و بیارەو لە ئاوایی بەڵخە هێزمان دانابوو، بەڵام کەم و وەک پێویست نەبوو. جگە لەوەش لەناو شاری هەڵەبجە و لە چەندشوێنێکدا پێشمەرگەمان دانابوو، لەوانە لە کۆمەڵگەی زەمەقی، لەبارەگای کۆمیتەی هەڵەبجە و لەگەڕەکی کانی قولکەدا. بارەگای مەڵبەندو فەرماندەیش

نـزیکەی ٥٠ پەنجـا پێشـمەرگە ئەیپاراسـت، ئەمـانە چەنـد کـوڕێکی ئـازا بەرپرسیان بوون لەوانە: بورهانی حەمەباقی، بلەرەشی گەلالی......تاد.

لە ڕۆژی١٩٩٧/١/١٥دا لەئەنقەرەی پایتەختی وڵاتی تورکیا جارێکی تر ئەمریکا یەکێتی و پارتی کۆکردەوە، بەسەرپەرشتی ڕۆبێرت جێگری وەزیری دەرەوە، لەم کۆبوونەوەدا چەند خاڵێک بڕیاریان لێدرا لەوانە:

دیـاری کردنـی هێـزی ئاشـتی پـارێز بـۆ نێـوان یەکێتـی وپـارتی، لە تورکەکـان. ڕاگرتنـی شــەڕی ڕاگەیانـدن، ئـاڵوگۆڕی دیلەکـان و بەردانـی هەموویان لەگەڵ چارەسەرکردنی کێشە و گرفتی ئاوارەکانی شەڕی ناوخۆ. بـۆجێ بەجێکردنـی ئەم خـاڵانە هەیئەتێـک لە هەردوولاو بەئامـادە بـوونی نوێنەرانی ئەمریکا و بەریتانیا و تورکیا پێکهات.

نوێنەرەکانی یەکێتی ئەمانە بوون، حەمەتەوفیق ڕەحیم، عەدنان مفتی و شەهید شازاد سائیب. لەپارتیش سامی عەبدولڕەحمان، عیزەدین بەرواری، سەفین دزەیی و د. پیرۆت ناوێک بوو. دیارە لەم ڕێکەوتنەدا داوای تورکیاش هەیە، بەڵام داواکە ڕوو لەیەکێتیـیە، چـوونکە برادەرانـی پـارتی لەبـنەوە، هاتووچۆی پەکەکەیان لە باشوورەوە بۆ باکوور خستوەتە ئەستۆی یەکێتی، بۆیە بەجیاو دوای چەند ڕۆژ لەم کۆبوونەوەو ڕێککەوتنە، تانسۆچیلەر داوای لەمام جەلال کرد ڕێگە نەدا هێزەکانی پەکەکە لە کوردستانی باشـوورەوە بچنەوە ناو خاکی باکوور.

پارتی لە بیانو ئەگەڕان بۆ دروست کردنەوەی جەولەیەکیتری شەڕ، چوونکە پێیان وابوو شەڕەکە لە بەرژەوەندیانە، هەرواش بوو پێشبینییەکەیان ڕاسـت دەرچـوو، پـارتی ئەوەی لەشـەڕدا دەسـتی کەوت زیـاتربوو لەوەی لەئاشتیدا دەستی ئەکەوێت. یان ئەگەر یەکێتی نەیکرد ئەوە برێک پاشەکشە ئەکا لەداواکانی بەتایبەت گومرگی برایم خەلیل، چوونکە لە کۆبـوونەوەی ئەنقەرەدا باسی لێوە کراوە و یەکێکە لە داواو خاڵەکانی یەکێتی.

مام جەلال دوای گەشتەکەی لەئێرانەوە گەرایەوە، لەگەڕانەوەکەیدا گەورە بەرپرسـانی ئێـران لە فرۆکەخـانەی میهرئابـادا ڕۆژی ١٩٩٧/٢/٢١ پێشوازی گەرمیان لێکرد، دوای مـانەوەی لە ئێرانـدا بۆمـاوەی ٥ پێنج ڕۆژ چەندین کۆبوونەوەو دیداری لەگەڵ بەرپرسانی کۆماری ئیسلامیدا ئەنجام دا.

لە ڕۆژی ١٩٩٧/٢/٢٦دا لەرێگـای پەروێزخـانەوە گەرایەوە هەرێمـی کوردستان و لەلایەن مەکتەبی سیاسی یەکێتی و ئۆرگانەکان و نوێنەرانی لایەنە سیاسییەکان و خەڵکێکی زۆرەوە پێشوازی کرا. دوای چەند ڕۆژێک لەکۆبوونەوەکـانی دا لەگەڵ ئورکانەکـانی پێشـمەرگە و حـزب دا باسـی لە سـەفەرەکەی و هەڵوێسـتی تورکیـا و ئێـران دەکـرد سـەبارەت بە عێـراق و هەرێمی کوردستان و دۆستایەتیان لەگەڵ گەلی کـورد و..........تـاد. هەشـت ڕۆژ لەدوای گەڕانەوەی مام جەلال پارتی لەلای دێگەڵە و بنەباوێوە پەلاماری سـەنگەرەکانی یەکێتیـان دا و لە ڕۆژی١٩٩٧/٣/٦ دا هێزێکیـان بەپـارتیزانی لەناوچەی شوانەوە هاتنە ناو چەمچەماڵەوە ، پێشمەرگە و خەڵک بەرەنگاریان بـوونەوەو تارومارکیـان کـردن، نـزیکەی ١٥ پـانزە قوربـانی و دیلیـان بەجـێ هێشت، ئەوانیتریشیان هەڵهاتن و لەبازگەی ڕژێمەوە لەمەقانەوە خۆیان کرد بەناو حکومەتی عێراقدا و لە کەرکوکەوە ڕژێم ڕەوانەی هەولێری کردنەوە.

بڕیار بوو لە ڕۆژی ١٩٩٧/٣/١١دا هەیئەتەکانی هەردوولا کۆببنەوە، وەک دووەم کۆبوونەوەی ڕێکەوتنی ئەنقەرە، بەڵام برادەرانی پارتی لەسەر کوشتنی هەڤاڵ مەحیەدین ڕەحیم، نەچوونە نـاو کۆبـوونەوەکەوە، تۆمەتی کوشتنەکەیشـیان خسـتە سـەر یەکێتـی، هەرچەنـدە ئەوەی مـن بیسـتومە لەوبارەوە دوورو نزیک کوشتنی مەحیەدین پەیوەندی بەیەکێتی نیشـتیمانی کوردستانەوە نەبووەو لەناو پارتی خۆیاندا بووە.

دوای چەند ڕۆژ کاک عەدنانی حەمەی مینا بۆی باس کردم، ووتـی ئەو شەوەی لای مامۆستا مەلاعەلی بوویت، کاتێک لە ژوورەوە ئێوە خەریکی قسەکردن بوون، ئەو دوو پێشمەرگەکەی لە دەرەوە بوون بانگیان کردوون، هـاتونەتە ژوورەوە لێیـان داون، ئەوکـات زانـیم قرەقـری نـاو بارەگـای بزووتنەوەو چوونەدەرەوەی مامۆستا مەلاعەلی، لەکۆبوونەوەکەداو دواتر کاتی ڕایی کردنی ئێمە، مامۆستا باسی ئەمەی کردووە بۆمن ، من وام زانیوە باسی ڕوداوەکەی سیروان ئەکات، دوو پێشـمەرگەکە کاتێک مـن هـاتومەتە دەرەوە سوار بووم باسیان نەکردووە، مەگیر مامۆستا دڵی داونەتەوەو ئەملا و ئەولای ماچ کردوون و ووتویەتی بەحەمە نەڵێن، دواتر بۆ کاک عەدنانیان باس کردووە.

دواتر هەندێک کەس سەرنج و گومانیان هەیە لەسەر مردن و کوشتنی کادرو سەرکردەکانی پارتی و جێگەی پرسیارە بۆیان، لەوانە : مەحیەدین ڕەحیم، ملازم کەریم، جەوهەر نامق، سیروان نەورۆلی، فەلەکەدین کاکەیی و لەم دواییەشدا فەریدون جوانڕۆیی.

بابگەڕێمەوە بۆلای هەڵەبجە و بیرەوەریەکانی خۆم لەو ماوەدا، ئەوماوە لەگەڵ کاک عەدنان و برادەرەکانی ترماندا لەوێ لە هەڵەبجەو شارەزوورو، بە پشتیوانی ڕاستەو خۆی مام جەلال ئیشی باش و بەرچاو کرابوو، خەڵک وردەوردە ترسیان لەترسان و تۆقانی توندرەوی توندڕەوەکانی ناو بزووتنەوە و سزاو ئەشکەنجەی بزووتنەوە ئەرەویەوە. خەڵک بەئاشکرا هاتوو چۆیان دەکردین، بۆ بۆنەو کۆڕ وکۆبوونەوەکان بەشداریان دەکرد. توندڕەوەکانی بزووتنەوە ئەمەیان پێ قبووڵ نەدەکرا و لەبیانو دەگەڕان ئیجرائاتێک بکەن بۆ ترساندنەوەی خەڵکی ناوچەکە.

ئەوە بوو ڕۆژی١٩٩٧/٣/٢٧ من سەردانی دۆڵبیان ئاواییەکەی خۆمانم کرد لە هەورامان، ئاوایی چۆڵەو تەنها باوکم لەوێیە، شەو لای ئەوماینەوە، لەناو خانەباخدا (کوخ- کەوێل)، منداڵەکانیشم بردبوو، شەو باران باری، ئێوارەکەی کاک قادری حەپسەو کاک ئەنوەری حاجی عوسمانی سۆفی عەلی سەردانیان کردین، ئەوان شەو گەڕانەوە، ئێمە ماینەوە تابەیانی، جادەکە جگە لە ئێمە کەسی تر هاتوچۆی پێدا ناکات، تایبەتە بەخۆمان.

سەرلەبەیانی ڕۆژی١٩٩٧/٣/٢٨ کاتێک گەڕاینەوە بەدوری ٥٠٠ مەتر لە خانە باخەکەوە لوغمێک لەژێرلاستیکی دواوەی لاندکرۆزەکەدا تەقیەوە، سەرەتا وامان زانی (ئارپیجی) بوو لێمان درا، شوێنەکە شاخ و بەردەمی چۆمێکی قوڵە، وادانراوە لەگەڵ تەقییەوە ئۆتۆمبێلەکەش هەڵداتە خوارەوە.

یەکەم کەس من دابەزیم، پێشمەرگەیەک بەدوای مندا هاتە خوارەوە میلی راکێشا تەقە بکات، ووتم ئەوە چیە، ووتی ئارپیجیان لێداین، ووتم کوا کەس دیار نییە. دووکەڵ و غوبارەکە رەویەوە، بینیم ئۆتۆمبێلەکە دواکەی نەماوە، جێگەی تایەو ویلەکانی کەوتوەتە چاڵێکی قوڵەوە. ئەوجا زانیم ئەڵغام بووە. بەرێکەوت دەرچووین، ١٠دە کەس لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا بووین، کەس خوێن لەلووتی نەهات، شۆفێرەکە سامی حاجی عەلی بوو، باوکم و بابا ناجی و سەنگەر یونس و رۆستەم هەیاس بوون، لەگەڵ خۆم و فروزان دایکی

منالەکان، دانیال و سەریال و ژیوار. کاتێک زانیم ئۆتۆمبێلەکە لەدواوە کەوتوەتە ناو چاڵی ئەڵغامەکەو بەر نابێتەوە، ئەم هێشت کەسیان دابەزن و بەم لاو بەولادا ڕاکەن لەترسی ئەڵغامی تر. تاهێور بوونەوەو یەک یەک دامبەزاندن و ڕۆستەم دەستی ئەگرتن و دوری ئەخستنەوە.

ئەوەندەی نەبرد خەڵکێکی زۆر هاتن بەدەمانەوە، یەکەم جەماعەت بزووتنەوەی ئیسلامی هاتن، ئێمەیان بینی لەدووری ئۆتۆمبێلەکەوە چاک و چۆنیان کردو ووتیان سەلامەتن ووتمان بەڵێ، سەریان کێشایە خوارەوە ئۆتۆمبێلەکەیان بینی و هاتنەوە سەرەوە ووتیان ئەوە لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا بوون؟ ووتمان بەڵی، ووتیان ئەوە موعجزەیەو شتی وانابێت. لەوکاتەدا کۆمەڵێک کوڕی گەنجی تەوێڵەی هاتن، تابلۆی ژمارەی ئۆتۆمبێلەکەیان بەدەستەوە بوو ووتیان لەو گردەی سەرەوە دۆزیومانەتەوە.

دواتر گومانمان لەو جەماعەتەی بزووتنەوە بوو، ئەوان بۆیان دانابین، چوونکە دواتر هەموو ئەوکەسانەیان بانگ کردبوو کەلەوێ بینیانن هاتون بەدەم ئێمەوە. ئەو ئۆتۆمبێلانەشیان ماوەیەک حجز کرد کەپێیان بوو.

لەرۆژی ٤/ ١٩٩٧/٤دا خوێندکاران و مامۆستایان و خەڵکێکی زۆر بەتایبەت گەنجان و لاوان و ژنان لەهەڵەبجەوە بەسواری دەیان ئۆتۆمۆبێلی جۆراوجۆر و پاسی کۆستەر، بەئاڵای سەوزەوە لەهەڵەبجە کەوتنە ڕێ بۆ سلێمانی، ئەو ڕۆژەیان لەهاوینە هەواری سەرچناردە بردە سەر. ئێوارەکەی کەگەڕانەوە لەبازگەی سیروانی بزووتنەوەی ئیسلامیدا چەکدارەکانی بزووتنەوە تەقەیان لەئۆتۆمبێلەکان و لەخەڵکەکە کرد و سەیران و شادیەکەیان لێکردن بە شین، چەندین کەس بریندار بوون و چەندین کەسیان گرتن و شاردنەوە. خەڵکێکی زۆریش پەنایان بۆماڵان بردبوو لەناو شارۆچکەی سیرواندا خۆیان شاردبووەوە.

ئێوارەی ڕۆژی١٩٩٧/٤/٤ من و کاک ئەحمەد قەدەفەری لە بارەگای فەرماندەی و مەڵبەند بووین لە هەڵەبجە، ئاگاداریان کردین لە شارۆچکەی سیروان شەڕە، خەریکی پەیوەندی و قسەکردن بووین لەگەڵ بزووتنەوە، خەڵکێکی زۆریش ڕوویان کردووەتە ئێمە و هاتوون بۆ مەڵبەند، بۆ هەواڵپرسین و دۆزینەوەی منداڵەکانیان، بزووتنەوەش لە هەردوو سەری شارۆچکەی سیروانەوە بازگەیان داناوەو دامەزراون ئەوخەڵکەیی لە

هەڵەبجەوە چوون بەرەو شارۆچکەی سیروان تەقەیان لێکردون و گەڕاونەتەوە. لە سەیران کەرەکان ئەوانەی دەرچوو بوون و هاتبوونەوە بۆهەڵەبجە هاتبوونە مەڵبەند و لەبارەی ڕوداوەکەوە کەچۆن چۆنی بووە زانیاریمان وەرگرتبوو، شەو درەنگی کردبوو باران بارینیش دەستی پێکرد.

بڕیاردرا من سەردانی مامۆستا مەلا عەلی بکەم و لەسەر ڕوداوەکە گفتوگۆ بکەین، پێشمەرگەشمان ئاگادار کردن وریابن و شوێنەکانمان قایم کرد. دوای ئەوەمن ڕۆیشتم، سەیارەکەی کاک عەدنانم برد لەگەڵ شۆفێرەکەی و دوو پێشمەرگەدا، پێشمەرگەکان گەرمیانی و سەر بەهێزەکەی پارێزگاری بارەگای مەڵبەند بوون، پاسەوانەکانی خۆم ناردبوون بۆ لای دەستەکانی دەوری مەڵبەند بۆ شارەزایی. کاتێک گەیشتمە بارەگای بزووتنەوە کاک عەبدرەحمان عەبدرەحیم لە بەردەرگا چاوەڕێی دەکردم، چووینە ژورەوە مامۆستا مەلاعەلی هات بەدەممەوە، دوای چاکوچۆنی دانیشتین و رووم کردە مامۆستا و پرسیم تۆچۆنی باشی؟ مامۆستا ووتی جا ئەم سەکبابانە ئەهێڵن باشبین، مەبەستی لە توند ڕەوەکانی ناوخۆیان بوو، دەستمان کرد بەقسەکردن ئەوانیش بێئاگای خۆیان لە ڕوداوەکە دەر ئەبڕی و مامۆستا هەڕەشەی دەکرد لە جەماعەتی تەوحید و حەماس و (هیواو ڕەزوان) کوڕانی مامۆستا سابیر، ئەمانە دوبرابوون خەڵکی کفری بوون، برایەکیشیان پێشمەرگەی یەکێتی و شەهید بوو بوو، ئەیوت لێیان قبووڵ ناکەم ئەمە ئەوان بوون لە شارۆچکەی سیروان ئەم هەرایان ناوەتەوە.

منیش داوام کرد لەمامۆستا، یەکەم: هەوڵی بەپەلە بدات بۆ لابردن و دور خستنەوەیان لەسەر جادە، دووەم: ئاگاداریان بکات نەوەک ئەوکەسانەی گیراوان بەدزیەوە ئەمشەو بیانکوژن. ئەوانەی لە دەوری مامۆستادا وەستابوون و چەند کەسیش لە دەرگاوە سەریان هێنابووە ژوورو ئەیان ووت، ئەمانە لە سلێمانی گەڕاونەتەوە لەلای بارەگای بزووتنەوە لەسەر جادەکەدا هاوهویان کردووەو ئالای سەوزیان کردووە بەچاوی ئاساییشەکانی بازگەکاندا، ئەوانیش بۆیە تەقەیان کردووە، هەروەها ئەیانووت پێشمەرگەی ئێوەش تەقەیان کردووە، منیش ووتم جارێ پێشمەرگە لەوێدا نەبوون، ژن و منداڵ خوێندکار لەناو سەیارەوە هاتوهاواریش بکات ئەبێ

تەقەی لێبکرێت؟ دوای ئەوە ئێمە ئاگادارین کەسی ئێمە تەقەی نەکردووە لە سیروان.......تاد.

لەم قسانەدا بووین یەکێک هات پارچە کاغەزێکی دابەدەست مامۆستاوە بڕێک سەیریکردو وەک بڵێیت حاڵی نەبوو چییان بۆ نووسیوە بەئاماژە بەکابرای ووت ها چییە؟ ئەویش کە لەبەردەم دەرگاکەدا وەستابوو هات بۆلای و دەمی نابە پەناگوێییەوە قسەیەکی بۆکرد و مامۆستا ساتێک بێدەنگ بوو، بەبێدەنگی هەستاو چووە دەرەوە، دەنگەدەنگ و قرەقرێک پەیدا بوو، ئەو برادەرانەی لەو دەورەدا بوون دەرگاکەیان داخست و نەیان هێشت من بزانم چییە یان چی ڕویداوە، من خۆم تێنەگەیاند واتێکەیشتم لە دەرەوە هەڕەشەیان لەمن کردووە. ئەوەندەی نەبرد مامۆستا هاتەوە دانیشتەوەو ووتی ئێوە ئاگاداری ئەوانەی خۆتان بکەن با بارودۆخەکە ئاسایی بکەنەوە، ئێمەش ئاگاداری مەلامحەمەدی هۆریێنی دەکەینەوە ئەوانە بانگ بکاو هەرکەسیش گیراوە بەری بدەن.

دوای تەواو بوونی قسەکانمان هەستاین بگەڕێینەوە بۆمەڵبەند، مامۆستا مەلاعەلی خۆی هەستاو لەگەڵمان هاتە دەرەوە، ووتی ئەوانە ئاژاوەچی بوون تۆ گوێ نەدەیتێ هەرچیان کردووە بەو برادەرانە بەمنیان کردووە، ئەوە سجنم کردون و ئەوەیان لێقبووڵ ناکەم. من وام زانی مامۆستا باسی ڕوداوەکەی ئێوارەو شارۆچکەی سیروان ئەکا، لەدڵا ووتم خەتابارەکانیان هێناوە بۆلای، میش ووتم ئاساییە مامۆستا ئەو شتانە ڕوو دەدەن گرنگ ئەوەیە لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرێت .

دوای چەند ڕۆژ کاک عەدنانی حەمەی مینا بۆی باس کردم، ووتی ئەو شەوەی لای مامۆستا مەلاعەلی بوویت، کاتێک لە ژوورەوە ئێوە خەریکی قسەکردن بوون، ئەو دوو پێشمەرگەکەی لە دەرەوە بوون بانگیان کردوون، هاتونەتە ژوورەوە لێیان داون، ئەوکات زانیم قرەقرەی ناو بارەگای بزووتنەوەو چوونەدەرەوەی مامۆستا مەلاعەلی، لەکۆبوونەوەکەداو دواتر کاتی ڕایی کردنی ئێمە، مامۆستا باسی ئەمەی کردووە بۆمن ، من وام زانیوە باسی ڕوداوەکەی سیروان ئەکات، دوو پێشمەرگەکە کاتێک من هاتومەتە دەرەوە سوار بووم باسیان نەکردووە، مەگیر مامۆستا دڵی داونەتەوەو ئەملا

و ئەولای ماچ کردوون و ووتویەتی بەحەمە نەڵێن، دواتر بۆ کاک عەدنانیان باس کردووە.

بەڵێ من گەیشتمەوە بارەگای مەڵبەند، دوای چەندین پەیوەندی و قسەکردن لە نێوان هەردوولادا، بریار درا ئەوشەوە وەفدی هەردوولا بچینە شارۆچکەی سیروان بۆ ئاگربرو لەوێ لە نزیکەوە کێشەکان چارەسەر بکەین، نوێنەری بزووتنەوە کاک عەبدولرەحمان و مەلاعومەری کەلاری بوون، نوێنەری یەکێتیش من بووم (حەمەی حەمەسەعید)، شەوی ٤لەسەر١٩٩٧/٤/٥ لە هەڵەبجەوە کاتژمێر نزیکەی ١٠ دەی شەو چووین بەرەو شارۆچکەی سیروان، لە بازگەی زەمەقی لە دەروازەی هەڵەبجە یەکمان گرتەوەو بەرەو سیروان کەووتینە رێ، ٣سێ ئۆتۆمبێلمان پێبوو، کاتێک نزیک بووینەوە لە شارۆچکەی سیروان ووتیان با لە پێشەوە ئۆتۆمۆبێلەکەی کاک عەبدولرەحمان بروات، ئەو هێزەی سەرجادە بزووتنەوەن ئاگاداریان بکات لە چوونی ئێمە، سێ پێشمەرگەی بزووتنەوە کە پاسەوانی عەبدولرەحمان بوون لەگەڵ دوو پێشمەرگەی دەستەکەی لای من بەسەیارەکەی کاک عەبدولرەحمان رۆیشتن گوێمان لێبوو کەگەیشتنە لای ئەو جەماعەتەی لەسەر جادە کەبوون، دەنگیان دان کێن؟ ئەمان وەلامیان دانەوە بزووتنەوەو یەکێتین، بۆلای ئێوە دێین، ووتیان ئێمە جەماعەتی یەکێتین ، ئەوانەی ئێوە بایەکێتیەکان لەپێشەوە بێن بۆلامان .

لەوکاتەدا رۆستەم هەیاس یەکێکە لە پێشمەرگەکانی ئێمە، دەڵێت ئێوە بووەستن بامن بچمە لایان، بە پیادە ئەڕوات بەرەو لایان، ئۆتۆمۆبێلەکەش لەسەرخۆ نزیکیان دەبێتەوە، ئیتر لەلای ئێمەوە دورکەوتنەوە گوێمان لەقسە و گفتوگۆیان نەما، لەپڕ لەشوێنەکەدا بوو بەتەقە، ئێمەش کەوردەوردە بەدوایاندا دەچووین لەجێگەی خۆمان دا وەستاین، ئەوەندەی نەبرد شۆفێرو پاسەوانەکانی کاک عەبدرەحمان، بەشپرزەی هاتنەوە، ئۆتۆمبێلەکەشیان بەجێ هێشتبوو، پرسیارمان کرد ها چی بوو؟ ووتیان یەکێتی بوون، ووتویانە جەماعەتی تاهیرە بچکۆلین، ئەو پێشمەرگەی کاکە حەمە گەیشتە لایان و(مەبەستیان لە رۆستەم بوو) دوای ئەوە تەقەیان لەئێمەکرد، ئێمەش ڕامان کردە دواوە سەیارەکەشیان بردین.

دەرکەوت ئەمانە درۆیان کردووە جەماعەتی هیواو ڕەزوان بوون، لەگەڵ جەماعەتەکەی پێیان ئەوترا حەماس، هەردوولا سەر بەتوند ڕەوەکان بوون، بۆ فریودانی ئێمە وتویانە یەکێتی و جەماعەتی تاهیرە بچکۆلین، هیچ حیسابێکیان بۆ بزووتنەوەو مامۆستا مەلاعەلی نەدەکرد. دواتریش بوون بە جوندول ئیسلام. دیارە بە درۆو فێڵ وتبوویان یەکێتین وە لەیەکێتیش سەربە هێزەکەی تاهیرە بچکۆلین فێڵەکەیان سەری گرت و ئێمەیان خەڵەتاند.

کاتێک ڕۆستەم گەیشتبووە لایان وتبوویان بێچەک وەرە پێشەوە، ئەویش گوێیان بۆ ناگرێ و ئەڕواتە ناویان، گرتبوویان و لێیان پرسی بوو ئەوانەی ناو ئۆتۆمبێلەکە کێن؟ ڕۆستەمیش کەزانیبووی بزووتنەوەن وتبووی جەماعەتی خۆتانن ئەوە ئۆتۆمبێلەکەی کاک عەبدولڕەحمان عەبدولڕەحیمە. لەوکاتەدا تەقەیان بەسەر ئۆتۆمۆبێلەکەدا کردبوو، ئەوانیش حمایەکانی کاک عەبدولڕەحمان، ئۆتۆمۆبێلەکەیان بەجێ هێشتبوو لەگەڵ چەکەکانی خۆشیان، بە شپرزەی ڕایان کردبوو، گەڕانەدواوە بۆلای ئێمە.

کەگەیشتنەوە بەئێمەیان ووت جەماعەتی یەکێتی بوون، ڕۆستەم گەیشتە لایان و تەقەیان لەئێمە کرد، پێداگریان لەسەر ئەوە دەکرد ئەیان ووت ڕۆستەمیش تەقەی لێکردوین.

کاک عەبدولڕەحمان و مەلا عومەر ئەیان ووت ئەمانە ڕاست دەکەن، من عەقڵم نەی دەبڕی، ئەمزانی ڕۆستەم شتی وا ناکات. بەڵام لەبەر ئەوە ئەوان پێداگریان دەکردو ئەیان ووت یەکێتین، ئۆتۆمۆبێلەکەی کاک عەبدولڕەحمانیش جیهاز و دەمانچەو کەلوپەلی خۆی تێدابوو جێمابوو، پێم وتن وەرن لەگەڵ من سواربن بابچین ئەگەر هی هەرلایەکمان بوون ئێستا دەرئەکەوێ.

وتیان تۆخۆت برۆ بائێمە لێرەدا چاوەڕێت بکەین، منیش بە عەیبەم دەزانی نەڕۆم و بگەڕێمەوە، کاک عەبدولڕەحمانیش زوو زوو دەیوت کاک حەمە ئۆتۆمبێلەکەم جیهازو دەمانچەو شتی شەخسی خۆمی تیایە، بۆیە من بەتەنها ڕۆیشتم، کاتێک گەیشتمە شوێنەکە کەسی لێ نەمابوو، کەمێکیتر بە لەسەرەخۆیی ڕۆیشتم لە کەنار جادەکەوە کەسێک بانگی کردم ووتی وەرە بۆ ئێرە، وەستام و دابەزیم ئۆتۆمبێلەکەم لەسەرجادەکەدا ڕاگرت، بانگم کرد ئێوە کێن یەکێکتان بێتە ئێرە، ئەوان زۆر فێڵبازانە ووتیان ئێمە یەکێتین، تۆ

ئەگەر یەکێتی نیت بگەڕێرەوە ئێمە نایەین؟ ووتم من حەمەی حەمەسەعیدم ئێوە یەکێتین کێن؟ ووتیان جەماعەتی کاک تاهیرین، ووتم کوا تاهیر؟ ووتیان ئەوەتا لەو مەکتەبەی پشتەوە چووە بۆلای ئەو بزوتنەوانەی گرتوومانن.

بەدەم قسەکردنەوە نزیکیان بوومەوە ووتیان کاک تاهیر ووتویەتی، ئەگەر کاکە حەمە هات بابێت بۆ ئەوێ. بەدەم ئەم قسەکردنەوەوە چووم و نزیک بوومەوە لێیان، بینیم سێ کەسن دەموو چاویان هەڵبەستوە، زانیم جەماعەتی بزووتنەوەن بەڵام تازە تووش بووم و ناتوانم دەرچم، چاکوچۆنیم لەگەڵ کردن، ووتم یەکێکتان لەگەڵم بێن بابچین بۆلای تاهیرو ئێوەش ئاگاتان لەو ئۆتۆمۆبێلە بێت، یەکێکیان بەناو کەلاوەکانی کۆمەڵگا ڕووخاوەکەدا پێشم کەوت، کەمێک ڕۆیشتین زانیم دوانەکەش بەدوامەوەن، بارانیش بەخوڕەم دەبارێ، ئەوەندە تاریکە، کاتێک بروسکە ئەکەوێ ئەوەی پێشەوە ئەبینم بەڵام نازانم ئەوانەی دواوە چەند لێمەوە دوورن.

هەر ٥٠ پەنجا مەتر دوورین لە شەقامە گشتییەکەوە. من بێچەکم، دەمانچەیەکی بچوکی جۆری سمسم پێ بوو، لە گیرفانی پاڵتۆکەم دا شاردبوومەوە. دەمانچەکەم دەرهێناوە بەدەستمەوەیە ئەمەوێت فرسەت بهێنم و بدەم لەسەری ئەوەی لە پێشمەوەیە، لەوساتەدا ئەوەی دواوە یەکێکیان بانگی کرد، دەی عەلی، ئەوەی پێشەوە بەکەوانەی و بەخێرای رای کردەلاوە، منیش پێچەوانەی ئەو بەدەستی چەپدا قەڵەمبازێکم داو کەووتمە چاڵێکەوە، ئەوانی دواوە یەکێکیان دوو دەست ڕێژی کرد بەسەرمدا گوللەکان لەپەنامدا ئەیاندا لەزەوی، خۆم خست بەپشت داو ئامادەم کەهاتنە سەرم بەدەمانچەکە لێیان دەم، چەند خولەک بەوشێوە لەناو چاڵەکەدا، مامەوە کەچی نەدەنگ هەیە و نەکەس دیارە، بۆم دەرکەوت ئەوانە وایان زانیوە کوژراوم رایان کردوە و ڕۆیشتون. کە دڵنیا بووم کەس لەوناوەدا نییە هەستام و لەسەر خۆ بەرەو جادەکە گەڕامەوە.

گەیشتمە نزیک ئۆتۆمۆبێلەکەم چراکانیم نەکوژاند بووەوە، لەوکاتەدا یەکێک لەخوێندکارە سەیران کەرەکان لەوناوە خۆی حەشار داوە دەهات بۆلای ڕۆشنایی چراکان، گەیشتە نزیکم ناسییمەوە کوڕێکی خەڵکی ئاوایی هاوار و کاکەیی بوو، پێکەوە سواری ئۆتۆمۆبێلەکە بووین و بەرەودوا گەڕاینەوە بۆ لای جەماعەت.

گەیشـتینەوە ئەو شـوێنەی کە کـاک عەبـدولڕەحمان و مەلاعـومەرم بەجێم هێشتبوون، ئەوانیش لە شوێنی خۆیاندا نەمابوون، گەڕابوونەوە بۆلای بازگەکەی دەروازەی هەڵەبجە، گەیشتمە لایان مەلاعومەرو عەبدولڕەحمان و کۆمەڵیک چەکدار هاتنە بەردەم ئۆتۆمبێلەکەو پرسیان چی بوو؟ ووتم ئێوە بۆ گەڕانەوە بۆ ئێرە؟ ووتیان تۆش دیار نەمای و ئێمەش گەڕاینەوە. پرسـیان چی بوو کێ بوون؟ منیش زۆر بێتـاقەت بووم، هەرئەوەنـدە وەڵامـم دانەوە ووتـم کـێ بـوون؟ جەمـاعەتی ئێـوە بـوون، پێشـتر پێشـمەرگەکانی ئێـوە نەوەستاون تابزانن کێن، ئەوانە بەفێڵ وتبوویان یەکێتین برادەرەکانی لای ئێوەش لە ترسنۆکیدا ڕایان کردووەتەوەو ئۆتۆمۆبێلەکەشیان بەجێ هێشتووە، پێشـمەرگەکانی ئێمەشـیان بە فێـڵ گرتـووە، ووتیـان ئەگەر وایە تـۆ چـۆن دەرچوویـت؟ خـۆ ئـێمە گوێمـان لەقسـەکانتان بـوو، ووتـم هەرچـۆن بـوو دەرچووم، دواتر بۆ کاک عەبدولڕەحمانم گێڕایەوە چیم بەسـەر هـاتووە و چۆن دەرچووم.

ووتیـان ئێسـتا چیبکەین؟ منـیش ووتـم بـابچینەوە بـۆ لای مامۆسـتا مەلاعەلی بـۆ هەڵـەبجە، کـات بووبووە نزیکی بەرەبەیـان. گەیشـتینەوە لای مامۆستا هێشتا نەخەوتبوو، مـن قسـەکانم بۆکرد و چیمـان بەسـەر هـاتبوو گێـڕامەوەو ووتـم هیـواو ڕەزوان و برادەرەکـانی ئێـوەن لە سـیروان، هەر بەتالان و بڕۆی یەکێتیەکانەوە نەوەسـتاون ئۆتۆمۆبێل و جیهاز و چەک و دەمانچەکەی برادەرەکانی خۆیشتیان بردووە، ئەوانی لە دەوری مامۆسـتادا بوون ئەیان ووت وانییە. منیش ووتـم مامۆسـتا ئەوەی ڕوویـداوە ڕوویـدا، جەنابت هەوڵ بدە ئەو دوو پێشمەرگەی لەگەڵ ئێمەدا بوون بە فێڵ گرتویانن سەرنگونیان نەکەن، ووتی نا خەمت نەبێت.

لەوکـاتەدا یەکێـک دەرگـاکەی کـردەوە و ووتـی ئەوە مەلامـحەمەدی هۆرێنی و جەماعەت هاتن، ئەمانە لە سیروانەوە هاتبوون، بزووتنەوە خۆیان لەگەڵیان دانیشتن، سـەرەتا نەیانهێشـت ئـێمە بیانبینین، ئۆتـۆمبێلەکەی کـاک عەبدولڕەحمانیشـیان هێنـابووەوە، بەڵام دەمـانچە و کەلوپەلەکـانی کـاک عەبـدولڕەحمانیان بردبـوو. دوای کۆبـوونەوەی خۆیـان ئـێمەش بینیمـانن مەلامـحەمەدی هـۆرێنی وبرادەرێکـی هێـزی سـیروانی ئـێمە بـوون. ووتیـان کێشەکەمان چارەسـەر کـردووە. دیـارە ئەمـان(بزووتنەوە) هەر لە ئێوارەوە

پەیوەندیان بە جەماعەتی خۆیانەوە هەبووە لە سیرواندا، مەلا محەمەد بەرپرسی هێزێکی بزووتنەوە بوو لەشارۆچکەی سیروان.
ئەوەندەی من حاڵی بووم هۆرێنی لای مامۆستا ووتبووی خەتاو تاوان لەو جەماعەتەی خۆیان بزووتننەوە بووە، کە لەناو شارۆچکەی سیرواندا بوون و هیچ حیسابێکیشیان بۆ بزووتنەوەو ماڵی مامۆستا نەدەکرد. دەمەو بەیانی هەموومان چووینەوە بۆ سیروان، سەردانی بارەگایەکی بزووتنەوەو بارەگای یەکێتیمان کرد، ئاسایشی هەڵەبجەش هاتبوون، بۆ دۆزینەوەی خوێندکارە وون بووەکان و ئەو پێشمەرگانەی لای ئێمە. هەموو دۆزرانەوەو بەردران جگە لەڕۆستەم هەیاس، دواتر زانیمان رۆستەمیش شەو لەدەستیان هەڵهاتووەو لەماڵێکدا خۆی شاردوەتەوە، نزیک بەنیوەڕۆی ڕۆژی ٤/٥ هاتەوە بۆ هەڵەبجە.
لە ڕۆژی ١٩٩٧/٤/٥دا کێشەکەمان لەشارۆچکەی سیروان هێور کردەوەو گەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە، گەیشتینە بارەگای مەڵبەندو ووتیان لە هەورامان بارودۆخەکە ئاڵۆزەو یەکێتی و بزووتنەوە بەرامبەر بەیەک سەنگەریان گرتووە. هەردوولا بروسکەمان کرد بۆ هێزەکانی خۆمان بۆهەورامان، ئاگادارمان کردن لێرە کێشەکان چارەسەر کراون، ئێوەش بارودۆخەکە ئاسایی بکەنەوە. دوای ئەوە لەگەڵ کاک عەدنانی حەمەی مینە بە تەلەفۆن قسەم کرد، لە عەربەت بوو ووتم بگەڕێنەوە بۆ هەڵەبجە باشترە. ئەو داوای کرد ئێمەونوێنەرانی لایەنەکان بچین لە شارۆچکەی سەیدسادق لەگەڵ نوێنەرانی بزووتنەوەدا کۆببینەوە، سەبارەت بەو گرژی و ئاڵۆزیانەی کە لەشارۆچکەی سیرواندا ڕۆژی پێشتر روویان دابوو. لایەنە سیاسییەکانی تر لەناوچەکەدا دەیانزانی ئەم ڕێگری کردنانەی بزووتنەوە بەرامبەر بە هەموولاو خەڵکی مەدەنیشە، بۆ نموونە ڕێگری کردن لە سەیران و شادی و خۆشی و گۆرانی وتن و هەڵپرکێ .......تاد. یان قەدەغە کردنی ڕێوەڕەسمە کلتوری و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵی کوردەواری.
بەڵام لایەنەکانی تر نەئەوێران خۆیان بکەن بە تەرەف، هەمووی بەتەمای یەکێتی بوون. بێگومان پارتیش دژی ئەو هەڵسوکەوتانەی بزووتنەوە بوو وەک بیر و باوەڕ، بەڵام سیاسەت لە کوردستان دا ئاواییە بۆ شکاندنی یەکێتی پارتی ژێربەژێرو بە ئاشکرا هاوکاری بزووتنەوەیان دەکرد، بەرای

من ئەگەر یەکێتی نەبا پارتی یەک ڕۆژ مۆڵەتی بزووتنەوەی نەئەدا سیاسەت بکات لە کوردستان دا.

بەڵێ نوێنەرانی بزووتنەوە، یەکێتی، ڕاپەڕین (نەهزە)، سۆشیالیست و شیوعی، لە سەیدسادق لە بارەگای کۆمیتەی ڕێکخستنی یەکێتیدا کۆبووینەوە، ڕێک کەوتین و بڕیار درا هەموولا هەوڵ بدەین بارودۆخەکە ئاسایی بکەینەوە، لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا ئاگادار کراین، لە هەورامان شەڕ دەست پێکردووە. بزووتنەوە تەقەیان لە کۆمیتەی ڕێکخستنی هەورامان کردبوو.

لەوێ من و کاک کەمال شاکرو کاک ئەکبەر ئێناخی، لەگەڵ نوێنەرەکانی بەشدار بوو لەو کۆبوونەوەدا بەپەلە گەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە. دوانیوەڕۆی ڕۆژی ٤/٥ دووبارە لە هەڵەبجە لە بارەگای بزووتنەوە کۆبووینەوە، بە شداربوانی ئەم کۆبوونەوە لە بزووتنەوە مامۆستا مەلا عەلی، مامۆستا شێخ محەمەد، دکتۆر ئیبراهیم و کاک محەمەد بابان، لەگەڵ هەمان ئەو بەشدار بوانەی کۆبوونەوەکەی سەیدسادق بوون. لێرەش بڕیار درا بارودۆخەکە ئاسایی بکرێتەوە و لیژنە هاوبەشەکەی لایەنە سیاسییەکان بچێت بۆ بیارە کۆبوونەوە لەگەڵ هەردوولا بکرێت. مامۆستا محەمەد بابانیش بەنامەیەکەوە چوو بۆ سلێمانی بۆلای مام جەلال.

ئەم ماوە بزووتنەوە پێشێلکاری زۆری کردو بەئاشکرا ئاگری شەڕی خۆش دەکرد، بۆیە هێزی پێشمەرگەی یەکێتیش کەوتنەخۆو دانانی بەرنامە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هەر پەلامارێک لەلایەن بزووتنەوەوە بدرێت، بەڵام ئەم خۆئامادە کردنەی یەکێتی دەبوو لەدەرەوەی سنووری قەزای هەڵەبجەدا بێت، چوونکە هێزەکانی یەکێتی لە هەڵەبجەو هەورامان لە دوای شەڕەکانی ساڵی ١٩٩٣وە وەک بارمتە وابوون لە ژێر دەستی بزووتنەوەو ئێرانییەکاندا، لەدوای ئەوە کە لە ساڵی ١٩٩٣ و ١٩٩٤دا چەندین جار یەکێتی لە هەڵەبجەدا شکاو پاشەکشەی کردبوو، بارەگای مەڵبەندەکەشی گیرابوو، ئیتر لەکاتی ڕێکەوتن و ئاشتی کردنەکانی دواتردا بزووتنەوە بەپێی ئاشتی نامەکان و لەژێر چاودێری ئێرانییەکاندا ڕێگەیان نەئەدا یەکێتی هێزی زیادە و پێویست بەرێتەوە بۆ سنووری قەزای هەڵەبجە.

بۆیە هەرکات بزووتنەوە پەلاماری هێزەکان و کۆمیتەکانی حزبی یەکێتی بدایە لە سنووری هەڵەبجە و هەورامان زیانی پێئەگەیاندن یان دەری

دەکردن. ئەوەبوو ئامادەکاری هێزەکانی یەکێتی لە مانگی ١٩٩٧/٤دا بۆ فریاکەوتنی بارەگای مەڵبەندو کۆمیتەکانی هەڵەبجەو هەورامان هیچی نەبەخشی، یەکێتی لەم شەڕەدا هەڵەی گەورەی کرد، چوونکە بڕیاریدا لە ٥ پێنج قۆڵەوە پەلاماری هەڵەبجەو خورماڵ بدات بۆ تەمێ کردنی بزووتنەوە، یەکێتی پەلامارەکەی داو هێزی تایبەت و پێویستیشی هەبوو، بەڵام دوای ئەوە تەقە دەستیپێکرد لەسەرەتای کاتژمێری یەکەمی شەڕەکەوە هێزەکان لەژێر فشاری ئێراندا گەڕێندرانە دواوەو نەیانهێشت لەهیچ قۆڵێکەوە پێشرەوی بکەن، ئەوەش دەستی بزووتنەوەی واڵا کرد پەلاماری بارەگای مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوورو ئەو هێزە کەمەی هەڵەبجە و هەورامان کەوەک بارمتە وابوو بدەن و پاشەکشەمان پێبکەن بۆ ئەمبەر دەریاچەی دەربەندیخان و سەیدسادق.

دواتر وردەکاری بڕیارەکەی یەکێتی و پەلاماردانی هێزەکان و ئاگادار کردنەوە و گەڕاندنەوەیان لەلایەن ئێرانەوە، دوای ئەوە پەلاماری بزووتنەوە بۆ سەر بارەگای مەڵبەند و هێزەکانی پاسەوانی مەڵبەندەکە ئەخوێنیتەوە. بەناونیشانی( خۆتان ئازادن لەهەر بڕیاردانێک جگە لەتەسلیم بوون)

## خۆتان ئازادن لەهەر بڕیاردانێک جگە لە تەسلیم بوون

بزووتنەوە لە دوای مانگی یەکی ئەمساڵەوە (١٩٩٧)، چەندین پێشێلکاری و کاری ناڕەوایان بەرامبەر بە یەکێتی ئەنجام دا لەوانە لەشارەزووردا، ١- کادرو فەرماندەی دێرین تاهیر مەحمود حەمەئەمین ناسراو بە تاهیرە بچکۆلیان لەشارۆچکەی سیروان گرت و بردیان لە نزیک دەریاچەکەدا گوللەبارانیان کرد، ناوبراو بێ چەک دانیشتبوو لە پێشمەرگایەتی خەریکی کاری ڕاوەماسی بوو. ٢- هەرهەمان ڕۆژ ئەحمەد عەلی ئەمینیان بەبێچەک گرت و ئەویشیان گولله باران کرد. ٣- لەناو هەڵەبجەو لەمانگی ڕەمەزاندا لە ڕۆژی ١٩٩٧/١/٢٥دا کاتێک خەڵک لە ناو بازاردا ئەڕواتەوە بۆ ماڵەوە بۆ ڕۆژو شکاندن، سێ پێشمەرگە لە بازارەوە

ئەگەڕێنەوە بەرەو ماڵ دراوسێی یەکتر بوون هەرسێکیان بەڕۆژو بووبوون، بێچەک بوون، لە کۆڵانێکدا لە نزیک ماڵەکانی خۆیاندا گرتنیان و بردنیان لەنزیک گردە درۆزنەی لای ئاوایی تەپەکوڕە گوللە بارانیان کردن، بەیانی دۆزرانەوە تەرمەکانیان هێنرایەوە بۆ هەڵەبجە، لە مزگەوتی شێخ سمایلدا مامۆستاکە ئەیشۆردن، لەگەڵ کاک عەدنانی حەمەی مینا بەدیارەوە بووین لە گیرفانی جلەکانیان دا لوقم و شیرینی بەربانگ کردنەوەکەیان دەرهێنا. ئەو بێتاوان و بەناحەق شەهید کراوانەش بەزمانی ڕۆژوەوە ئەمانە بوون:١- فەلاح حەمەئەمین عەبدولڕەحمان ٢- موعتەسەم محەمەد عەلی ٣ - عەتا ئاغا عەلی. لەژیانمدا ئەوەندە خۆمم بەسوک نەهاتوەتە بەرچاو، بەئاشکرا سێ پێشمەرگەت بگرن و گوللەبارانیان بکەن، تۆ لەبێدەستەلاتیا بڵێت ئەوە دەستە بۆ تێکدانی یەکێتی و بزووتنەوە. کاک عەدنان وایووت.

بەڵێ لەکاتی سەرپێچیەکان و شەڕ فرۆشتنەکانی بزووتنەوەدا لە دوای مانگی ١یەکی ساڵی ١٩٩٧دا یەکێتی کەوتبووە خۆو لەکۆبوونەوەیەکی فەرماندەیی گشتیشدا لەسەرەتای مانگی١٩٩٧/٤ بڕیارێک درابوو، لە بەرامبەر لاساریەکانیدا گورزێک لەبزووتنەوە بدرێت. دیاربوو بزووتنەوە ئەمەی بیستبووەوە، بۆیە لە کۆبوونەوەکانی ڕۆژانی ٤و١٩٩٧/٤/٥ بەجدی هەوڵیان ئەدا توندڕەوەکانی ناو بزووتنەوە کۆنترۆڵ بکەن و بارودۆخەکە ئاسایی بکەنەوە. وە لە دوای کۆبوونەوەکان مامۆستا مەلا عەلی عەبوولعەزیز داوای کرد سەردانێکی بکەم و پێکەوە هەندێک قسە بکەین. واتە دوا نیوەڕۆی ڕۆژی ٤/٥، ئەو ڕۆژە کاک عەدنانی حەمەی مینا لە هەڵەبجەدا نەبوو، چوبوو بۆسلێمانی بۆ مەکتەبی ڕێکخستن، بۆیە من لەسەر دانەکەم بۆ لای مامۆستا بە بروسکە (پەیام) ئاگادارم کرد.

سەردانم کرد لە بارەگای خۆی لە هەڵەبجەدا، تەنها کاک ئازاد فەرەیدونی بەڵخەیی لابوو، لەوکاتەدا ئازاد لەبەردەستیدا هاتوو چۆی دەکرد، پێی ووت مۆڵەتمان بدەو باکەسیش نەیەتە ژوورەوە، مامۆستا سەرەتای قسەی دامەزراندو باسی ئاڵۆزیەکانی کردو لەوبارەشەوە گلەیی لە یەکێتی هەبوو، من پرسیم ئێستا چیبکەین؟ ووتی من ئەمەوێت مام جەلال ببینم هەرچەندە وتراوە گوایا من ناچمە لای مام جەلال، ئەوە وانییە و ئەزانم کێ وای بەمام ووتوە هەرچی کێشەو ئاژاوە هەیە ئەوکەسەیەو بزووتنەوەشی

توشی ئەم هەموو دەردی سەریە کردووە. ئەمزانی کێ دەڵێت، بەلام بۆ دڵنیا بوون لەوەی بزانم مەبەستی مامۆستا عەلی باپیرە، پرسیم مامۆستا ئەتوانم بزانم مەبەستت کێیە؟ ووتی ئەی چۆن نازانی مەبەستم کێیە؟ مەبەستم قاتڵەکەی حەمە سوڵتانە.

منیش ووتم مامۆستا ئەوەندەی من بزانم بە سەردانی تۆ بۆلای مام زۆربەی کێشەکانی نێوان بزووتنەوەو یەکێتی چارەسەر ئەبن، خۆت ئەزانی مام جەلال سەرکردەیەکە باوەڕی تەواوی بە دیموکراسی، ئاشتی، فرەیی، پێکەوە ژیان هەیەو ئێوەشی خۆش ئەوێت، حەزئەکەم لەو بارەوە حکایەتێکت بۆ بگێڕمەوە، ووتی ئادەی ووتم: مام جەلال ساڵی ١٩٨٧ لە هەورامانەوە منی بانگ کردە یاخسەمەر لەسەر شکاتێکی جەنابتان گوایا من ڕێگری هاتووچۆی ئێوە دەکەم بە دۆڵی هاواردا.

ئەوەبوو مام منی بانگ کردو لەوبارەوە گفتوگۆمان کرد، حەزدەکەم ڕای مام جەلال لەسەر بزووتنەوە ئەوکات کە بۆ منی باسکردووە، بۆت بگێڕمەوە، ئەوەبوو لێی پرسیم بۆ ڕێگریت لە هاتووچۆی بزووتنەوە کردووە بەدۆڵی هاوارداو نەتهێشتوە بارەگا دابنێن؟ من پێم ووت مامە دۆڵی هاوار بنکەو بارەگای ئێمەی لێیە هێزەکانی عێراق زاڵن بەسەر ناوچەکەدا هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی لە ناوچەکەدان، عێراق و ئێرانیش هەریەکەو دەیانەوێت ڕۆژانە زانیاریان لەسەر ئەم ناوچە هەبێت و دەست بەسەر ئەو چۆم و دۆڵەدا بگرن، لەسەر داوای خۆیشت ئەوێ تاکە ڕێگای هاتووچۆی یەکێتی و ئێرانە بەتایبەت بۆ بریندارەکان و وەفدەکان، لەڕووی ئەمنییەوە ئێمە تائێستا قایم کرتوومانە، ئێستا بزووتنەوە یان ئەو کەسانەی لەدوای ٥/١٣ وە چوونەتە ئێران، وایان کردووە ناوچەکە قەرەباڵغ و بێسەرو بەریەکی پێوە دیارە، خەڵک بەیانی لە شاری پاوەی ئێرانن، نیوەڕۆ لە دۆڵی هاوارن شەو لە هەڵەبجەن و بەپێچەوانەشەوە........ هەمووی بەناوی بزووتنەوەشەوە، ئێمە ووتومانە با ئەو خەڵکە هاتووچۆ دەکات ئێمە بزانین بزووتنەوە کامەن و خەڵکیتر کێن، ئەمەو لەگەڵ چەندین کێشە و گرفتی تر .........تاد.

بەڵێ مامۆستا، مام جەلال دوای چەندین قسە و باس و ڕێنمای تر بۆمن، ووتی (( حەمە بزووتنەوەی کوردایەتی بەبێ لایەنی ئیسلامی تائێستا وەک ئەم دەستە پەنجەیەکی نوقسان بێت، نوقسان بووە، بە درێژای مێژووی

سیاسی کورد دوژمنەکانمان پێمان نەوێراون، دواجار پەنایان بۆ ئەوە بردووە کە کورد مورتەد و کافرن بەناوی دینەوە چەندین جار کوردستانیان کردووەتە کوشتارگاو شۆڕشەکانیان شکاندوە.

بەئاماژە بۆ دەست و پەنجەی خۆی ووتی بە دروست بوون ئەم بزووتنەوە، دەستەکە نوقسان نییە، ئەوانە ئەتوانن لای دەوڵەتانی عەرەبی و ئیسلامی پشتگیری گەورە و کاریگەر بۆ کورد مسۆگەر بکەن .....تاد )) ووتم ئەمە رای مام جەلال بووە لەسەر ئێوە مامۆستا، بەڵام ئێستا چوار کەسی توندڕە و بوون بە هۆکاری شەڕێکی نەخوازراو و ڕشتنی خوێنی پێشمەرگە و تێکۆشەرەکانی خەباتی شاخی هەردوولامان...........تاد .

لە ڕاستیدا دوای ئەم قسانە بینیم مامۆستا مەلاعەلی موتەئەسرو فرمێسکێک لە چاوی هات، قورئانێک لەسەر مێزەکەی دانرابوو، رووی کردە من و ووتی بڵێ بەحەقی ئەو قورئانە هەرچیم پێ ئەڵێیت و هەرچیم پیشان ئەدەیت جگە لەمام جەلال بۆ کەسی تری باس ناکەم، منیش سوێندەکەم خوارد، سەرەتا دەستی کرد بە گیرفانی عەباکەیدا کۆمەڵێک نامەی دەرهێناو لە بەردەمم دا داینان ووتی ئەوانە هەموو بخوێنەرەوە، منیش سەیرێکی مامۆستام کردو بە ڕووخسار وەک بڵێم بۆ بیان خوێنمەوە، ووتی هەمووی بخوێنەرەوە، منیش دەستم کرد بە خوێندنەوەیان. لێرەدا بە کورتی ئاماژە بەناوەرۆکی دونامەیان دەکەم.

یەکەم نامەیەکی مامۆستا عەلی باپیر بوو بۆ مامۆستا مەلا عەلی خۆی ، لەم نامەدا مامۆستا باپیر جۆری دابەش کردن و لیستی ئەو کەس و ئۆرگانانەی بزووتنەوەی نووسی بوو، کە پارەیەکی لە کاک کۆسرەت وەرگرتووە، ئاوا دابەش کراوە، بۆ ئەوەی ڕابەر ئاگادار بێ و بزانێ چۆن دابەش کراوە. بە حیسابی یەکێتی بزووتنەوە یان مامۆستا مەلا عەلی ئاگادارنین لەو پارەی ئەیدەن بە مامۆستا باپیر. هەروەها یەکێتی لەو بڕوایەدا بوو، زۆرینە لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیردان و کێشەو گرفتەکان ماڵی مامۆستا مەلا عەلی دروستیان دەکەن.

دووەم نامەیەکی مامۆستا دڵشاد گەرمیانی بوو بۆ مەکتەبی سیاسی بزووتنەوە، لەنامەکەی کاک دڵشاد دا، ئاماژە بۆ ناردنی چەک و تەقەمەنی دەکات لە لایەن یەکێتییەوە بۆ گوڵەخانە بە نهێنی، لەگەڵ ناردنی هێزی

پێشمەرگە بۆ ناو بارەگاو رەبیەکانی سۆشیالیست، بەکورتی لەم نامەدا دەڵێت دوای تەواو بوونی ئامادە کاریەکان یەکێتی هێرش دەکات لەگوڵەخانەو بناری سورێنەوە بۆ شارۆچکەی خورماڵ و لەجادەشەوە بۆ پردی زەڵم و هەڵەبجە.

ئەمانەو چەندین نامەی ترم خوێندەوە. مەبەستی مامۆستا مەلا عەلی ئەوەبوو من ئەم نامانە ببینم، پێمان بڵێت ئەوە ئەگەر یەکێتی بەتەمایە پشتگیری باڵی مامۆستا باپیر بکات بەدژی ئێمە، ئێوە تێبگەن ئەوە وانییە، سەبارەت بە ڕاستی و دروستی ئەو نامانە ئایا دروست کراون یان ڕاستین بۆ هەر کەسێک کە مەبەستییە، بۆ یەکەمیان دەبێت تەئکید لە ئیدارەی یەکیتی و لەکاک کۆسرەت بکات ئایا بەنهێنی پارەیان داوە بەمامۆستا عەلی باپیر، بۆ دووەمیان ئەکرێ پرسیار لە کاکە حەمەی حاجی مەحمود یان فەرماندەکانی ئەوکاتی یەکێتی بکرێت، ئایا بەرنامەیەکی واهەبووە، یەکێتی چەک و تەقمەنی بنێرێت بۆ بارەگاکانی سۆشیالیست.

من بۆ خۆم ئاگاداری بەرنامەی وا نەبووم، یان ئەکرێ کاک دڵشاد زانیاری هەڵەیان لەو بارەوە پێدابێت.

دوای خوێندنەوەی نامەکان هەمووم دەق کردەوەو دامنانەوە لەبەردەم مامۆستادا، ئینجا دەستی پێکردو وتی: ئێمە دژی سەدام بووین، چوونکە زاڵم بوو لەوبارەوە چیمان پێکرابێ نکوڵیمان نەکردوە، کەلەساڵی ١٩٨٧ دا چووینە ئێران لەبەرنامەدا نەبووە هێزی چەکدار بۆ بزووتنەوە دروست بکەین، مام جەلال خۆی پارێزگاری سنەی پێناساندین، لەڕێی ئەوەوە بەرپرسانی باڵای جمهوری ئیسلامیمان ناسی بەپشتیوانی ئەو بزووتنەوەمان دروست کرد، خۆی پێی دروست کردین و لای ئێرانییەکان چەکی بۆ وەرگرتین. کەچی ئێستا من و کاکە عوسمانم لە هەڵەبجەین بارەگای ڕابەری بزووتنەوە لە هەڵەبجەیە، ئەو دێت ئەڕوا بۆلای عەلی باپیر بۆ خورماڵ مەرحەبای ئێمە ناکات.

دواجار وتی کاکە حەمە من لە تۆ ئەپرسم ئەوانەی توندڕەو ئاژاوەو گرژی دروست دەکەن و خەڵک ئەکوژن لای کێن و لە پەنای کێدان، کێش هەر خەریکی سوڵح و کوژانەوەی ئاگری فیتنەیە؟ بڕۆ بەویژدانی خۆت ڕاستیەکانی بۆ باس بکە من ئەزانم مام جەلال چەند تۆی خۆش ئەوێ و بڕوای بە قسەت هەیە. ئێمە ئەزانین مام جەلال سەرکردەیەکی گەورەیە، ئێمە

واحیسابمان کردووە چۆن سەرکردەیی ئێوەیە هی ئێمەشە نابێ جیاوازیمان بکات، نابێ بە گوێی کۆسرەت و جەبار فرمان بکات.......تاد، ئینشاالله هەمووشت حەل دەکەین .

ووتم نامەیەک بنوسە بۆ مام جەلال داوای دیاری کردنی کات بکە بچیت بیبینی، با من بۆی بەرم، نامەکەی نوسی و من گەڕامەوە بۆ بارەگای مەڵبەند لە کۆمەڵگەی عەنەب، ئێستا ئەو کۆمەڵگە زۆرەملێیەی عەنەب گەڕەکێکی شاری هەڵەبجەیە بە ناوی گەڕەکی شارەوانی، لە مەڵبەند کاک کەمال شاکرو ئەحمەد قەدەفەری لێ بوون، پرسیان مامۆستا ئیشی چیبوو؟ بە کورتی بۆم باسکردن، ئەوانیش ووتیان ئەگەر ئەوە نییەتیان بێت زۆر باشە.

بەڵێ هەر ئەو ئێوارەیە بەجیهاز بروسکەیەکم کرد بۆ مام جەلال، ئەمە ناوەرۆکی بروسکەکە بوو ( لە / حەمەی حەمەسەعید. بۆ/ جەنابی مام جەلال دوای سڵاو، ئەمڕۆ مامۆستا مەلا عەلیم بینیوە، هەندێک ڕاسپاردە و نامەیەکیشی هەیە بۆ جەنابت ) ئەویش هەر ئەو ئێوارە وەڵامی دامەوە بەم جۆرە.

( لە/ مام جەلالەوە، بۆ/ حەمەی حەمەسەعید، دوای سڵاو سبەینێ دوای عەسر وەرە بۆ لام، بۆ شوێنەکەی کاک ئەرسەلان) . مەبەستی بارەگای مەکتەبی ڕێکخستن بوو لە تەنیشت گردی پارێزگای سلێمانی، کاک ئەرسەلان بایز بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخستن بوو.

ئەوشەوە لەگەڵ هەڤالان لە بارەگای مەڵبەند بووین، بە تەلەفۆنیش لەگەڵ کاک عەدنان قسەمان کرد، ئەویش پێی خۆش بوو، ئەو سەردەمە ئێمە نەمان ئەتوانی لە مالان یان لە ماڵی خۆماندا بخەوین، بەردەوام دەبوو لەناو پێشمەرگەو بارەگاکان دا بمێنینەوە، بۆیە لە ناو مەڵبەندا شوێنی پشوودانمان دروست کردبوو.

لە دوای عەسری ڕۆژی ٦/٤/ ١٩٩٧ چوومە سلێمانی، کاتێک گەیشتمە ناو بارەگای مەکتەبی ڕێکخستن، کەسێک چوو کاک ئەرسەلانی بانگ کردو دوای چاکوچۆنی ووتی وەرە بەدوامدا، چووینە ژوورێکەوە تایبەت بوو بە ژووری کۆبوونەوە، سڵاوم کرد و مام جەلال ووتی دانیشە کورسی نەبوو، یەک کورسی چۆڵ هەبوو شوێنی کاک ئەرسەلان بوو،کاک ئەرسەلان ووتی

لەسەر ئەو کورسیەی من دانیشە. ئەوچوو کورسی بۆخۆی هێنا. جەماعەت بەخێر هاتنیان کردم و منیش وەڵامم دانەوە، تەماشام کرد ئەوانەی لە دەوری مێزەکەدان ئەمانەن : کاک حەمەی حاجی مەحمودی سکرتێری حزبی سۆشیالیست، کاک قادر عەزیز سکرتێری حزبی زەحمەت کێشان، کاک عومەر ئاغای سورچی سەرۆکی حزبی پارێزگاران.

مام جەلال جارێکیتر، بەخێر بێیت حەمە ئادەی چیت پێیە، ئێمە چاوەڕێی تۆمان دەکرد بۆمان باس بکە، من لەرووم نەدەهات بڵێم مامۆستا قورئانی داوم کە بەخۆت نەبێ ئەم قسانە لای کەس باس نەکەم. ووتم مام جەلال مامۆستا مەلا عەلی هەندێک شتی پێ وتوم ئەبێ بۆخۆتی بگێڕمەوە، ئەوێش بەتوڕەییەوە، نا چیت پێیە باسی بکە باشەمانیش گوێیان لێبێت چوونکە ئێمە بڕیاری خۆمان داوە سەبارەت بەبزووتنەوە،

منیش لە دڵا ووتم ئەمە مام جەلال تاڵەبانییەو ئەزانم ئیتر ئەگەر قسەیەکی تربکەم تووڕە دەبێت، بۆیە سەرەتا نامەکەم دایە دەستی و ئینجا قسەکانی مامۆستام گێڕایەوە وەک خۆی بێکەم و زیاد، ئینجا باسی نامەکانم بۆ کردن، قسەکانی من تەواو بوو، مام جەلال پرسی ئەی ڕای خۆت چییە لەسەر ئەو قسانەی مامۆستاو باروودۆخەکە؟ منیش ووتم: مام جەلال مامۆستا مەلا عەلی ڕاست دەکات، پیاوێکی سادەو ساکارە، بەڕاستی ئیشی ژێربەژێر و فروفێڵ نازانێ، هەرچی ووت لە دڵەوە ئەیڵێت. وەئەویش و خەتەکەی سەربەئەو هاوکاری ئێمەن و لایەنگری چارەسەرکردنی کێشەکانن. مام سەیرێکی جەماعەتی کرد و کاک قادر عەزیز ووتی کاکە حەمە وایکرد بەزەییمان بەمەلا عەلیدا بێتەوە، کاکە حەمەی حاجی مەحمودیش ووتی ئەی مام جەلال من نەمووت؟ ئیتر نازانم کاکە حەمە پێشتر چی وتبوو، کاک عومەر سورچیش بێدەنگ بوو، لەوە دەچوو مێشکی مەشغوڵ بێت هەر ئاگای لێ نەبێت باسی چی دەکەین .

دوای کەمێک گفتوگۆ لەگەڵ ئەوبرادەرانەدا، مام جەلال خواحافیزی لەوان کردو ووتی وەرە، چووینە سەرەوە لە ژوورێکدا دانیشتین، کاک ئەرسەلان و کاک جەمیل هەورامی بانگ کرد، ووتی با وەڵامی نامەکەی مامۆستا بدەمەوە، ئەو دەستی کرد بە نامە نووسین، کە تەواو بوو ووتی با بۆتان بخوێنمەوە، نامەکەی خوێندەوەو کاک ئەرسەلان و کاک جەمیل ووتیان

زۆر باشە، مام جەلال نامەکەی پێچایەوەو دایە دەستم، ناوەڕۆکی نامەکەی مـام جەلال، ئەوەیە ئەڵێت حەمە هـاتوو نـامەکەتم پێگەیشـت، وەئامـادەیی دەربڕیوە مامۆستا سەردانی بکات و کێشەکان بەگفتوگۆ چارەسەر بکەن.

ئەوشەوە لە سلێمانی مامەوە بەیانی گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە تا نامەکە بگەیێنمە دەست مامۆستا، گەیشتمە عەربەت بینیم هێزێک بەرەو شارەزوور بەڕێوەیە، دۆشکاو کاتیوشایان پێیە لەلایاندا دابەزیم کاک ئەنوەر دۆلانیـان لەگەڵدا بوو، کاک ئەنوەرم بردەلاوە ووتم بۆکوێ؟ ووتی بـۆلای ئێوە دێین قەرارە پەلاماری هەڵەبجە بدەین، چۆن ئەی تۆ ئاگادار نیت؟ منیش لە دڵا ووتم ئەمە ئامادەکاریە بـۆ بڕیـارەکەی پێشـتر دراوە، لەسـەری نەڕۆیشـتم، کەوتمەڕێ بەرەو سـەیدسادق، لە سـەیدسادق ئەبینم بەشـێک لە برادەرانی کـارگێڕو ئەنـدام مەڵبەنـدەکان لەوێن و ئەوبەریـان بەجـێ هێشـتوە هێزێکی زۆریش لەوێیە، هەر لەو شـوێنەدا لەشـار دەرئەچیت بەرەو هەڵەبـجە کاک عەدنانم بینییەوە، پرسیم کـاک عەدنـان من ئێوارە لای مـام جەلال بووم و وەلامی نامەکەی مامۆستا مەلاعەلی داوەتەوە بڕیارە مامۆستا بهێنم بۆلای، کەچی ئەبینم هێزەکان ئەکەونەڕێ بەرەو ئەوێ، لەو بەریشەوە برادەرانتان بانگ کردووەتەوە بۆ ئەمبەر، ئەگەر هێرش ئەکرێت ئیتر من بۆ بڕۆمەوە بۆ ئەوبەر(هەڵەبجە)؟ کاک عەدنان نەیئەزانی چی بڵێت، ووتی نا تۆ بڕۆ نامەکە بەرە کاک کەمال و ئەحمەدیش لەوێن لە مەڵبەند، لەو کاتەدا کاک مەحمودی حاجی سالح و یەک دوو ئەندام مەڵبەند پەیدابوون و لە لاماندا دابەزین کاک عەدنان پێی ووتن ئێوە لەگەڵ کاکە حەمە بچنەوە ئەوبەر ووتیان باشە، منیش کەوروتمە ڕێ بۆ هەڵەبجە و بە کاک مەحمودم ووت وەرە لای من سواربە ووتی تۆ بڕۆ ئێمە خۆمان دێین بەدواتا، کە نەهاتن.

لە ڕاستیدا دەبوو کاک عەدنان بە منی بوتایە هەر ئەمڕۆ هێرشـەکە دەکەین، ئاگات لە خۆت بێت، بۆ دوو شت، یەکەم: من نەدەچوومە بارەگـای بزووتنەوە نامەکەم بە کەسێکدا ئەنارد، چوونکە لەوکاتەدا تەقە دروست بوو لەلای شیرەمەڕ من لای مامۆستا مەلاعەلیدا لە هەڵەبجە دانیشـتبووم، هـاتنە ژوورەوە ووتیان ئەوە یەکێتی هات، مامۆستا حەپەسا ووتی حەمە تۆ نامەی ئەو پیاوەت هیناوەو هێزیش بەدواتەوەیە دێنەسەرمان، خۆی پیاو بوو بەمنی ووت هەستە بڕۆ بەڵکو شتێک بکەیت، ئەگینا ئەیتوانی بڵێت، جارێک وەرەن

ئەمە بگرن و وەک بارمتە دایبنێن. وەک ئەوەی مامۆستا شاهۆی بکردایە کەچی کرد بەمەلاسدیق و جەمیل عەبدولڕەحمان.

لەوکاتەدا جوندل ئیسلام کارەساتی خێڵی حەمەی خولقاند، مامۆستا شاهۆ بەرپرسی مەڵبەند بوو، یەکێتی کەوتنە ئامادەباشی و بزووتنەوەش بەهەمان شێوە، لەوکاتەدا مامۆستا مەلا شێخ سدیق و کاک جەمیلی قایمەقام ئەچنە مەڵبەند و ئەڵێن هاتووین بۆ لاتان داوا ئەکەین هێمن بن باشەڕەکە گەورە نەبێت و ئێمەش وەک بزووتنەوە تێوە نەگلێین، دوای وتوویژ لەو بارەوە، کاتێک کە ئەیانەوێت هەستن بڕۆنەوە، برادەران ئەڵێن مەڕۆن لای ئێمە میوانبن، ئەوانیش ئەڵێن، بۆجاریکی تر ئێستا بافریا بکەوین بەڵکو بارودۆخەکە بەهەمومانەوە ئارام بکەینەوە، هەڵ ئەسن و کەس لەڕووی نابێت بڵێت ئێوە لێرە بارمتەن، برادەرانی ئێمەش هەر ئەڵێن نابێ بڕۆن و ریگاوبان گیراوە و توشی شتێک ئەبن، ئەوانیش هەر سوور ئەبن لەسەر ئەوە کەبڕۆن، ئەو خولکە گەرمە قبوولْ ناکەن و هەڵئەسن بڕۆن، یەکێک لە برادەرانی مەڵبەند بەشەرمەزاریەوە، پێیان ئەڵێت کاکە داوای لێبووردن ئەکەین ئێوە لای ئێمە سجنن، ئەو دەمانجەو شتانەتان دانێن، ئەوانیش سەر سوڕمان ئەیانگرێ و دائەنیشنەوە. دوای مام ئەمەی زانی لەشەڕو ئاژاوەکە پێی ناخۆشتر بوو.

دووەم : بۆ ئەوەی ئەو هێزانەی لەناو هەڵەبجە و هەوراماندا هەمانن پێشتر ئامادەمان بکردنایە، هیچ نەبێ بیان زانیایە کە ئەمڕۆ هێرش ئەکرێت. دواتر من نەگلەیم کرد و نەپرسیم لە کاک عەدنان بۆچی تۆ بەمنت نەوت هێرش دەکەین. بەڵێ من لەسەیدسادقەوە کەشتمەوە مەڵبەند، لەگەڵ کاک د.کەمال و ئەحمەد قەدەفەریدا دانیشتم و پێم ووتن مام نامەی نووسیوە بۆ مامۆستا مەلاعەلی کە بچێت سەردانی بکاو کێشەکان بە گفتوگۆ چارەسەر بکەن. بەڵام هێزێکی زۆریش لە سەیدسادق کۆکراوەتەوە.

د.کەمال و قەدەفەری ووتیان تۆ بڕۆ نامەکەی بۆبەرە، ووتم با برادەرانی مەڵبەند لە دواوەن دێن، کاک مەحمودی حاجی سالْحیش لەگەڵ خۆم ئەبەم، ماوەیەک چاوەڕێمان کرد نەبوو، ئەحمەد ووتی هەستە بڕۆ بەتەمای مەحمود مەبە نایەت بۆ هەڵەبجە ووتم لە دواوەیە ئێستا دێت، ووتی نایەت. ووتم چۆن ئەزانی؟ ووتی ئەزانم .

من ڕۆیشتم دەوروبەری نیوەڕۆ بوو، چوومەوە بۆلای مامۆستا بەخێرهاتنی گەرمی کردم و ووتی مام جەلالت بینی؟ ووتم بەڵێ، پرسی تەندروستی چۆنە ووتم وەڵا زۆر باشە؟ نامەکەی مام دایە دەستی و خوێندیەوە، دوبارە جارێکی تر خوێندیەوە، لەوکاتەدا یەکێک هات ووتی ئاغای ئێرانی[1] ئەیەوێت بێتە ژورەوە، مامۆستا ووتی جارێ باچاوەڕێ بکات، من ئەمبینی لەپشتی جامخانەکەوە ئێرانی هەردەهات و ئەگەڕایەوە.

لەپڕ ئاغای ئێرانی بەبێپرس خۆیکرد بەژوردا، سڵاوی کردو کاغەزێک لەناو دەستیدا بوو، ووتی چ خەبەر، مامۆستا ووتی باشەو ئەوە حەمە نامەی مام جەلالی هێناوە ئینشاالله هەموو شت چارەسەر دەبێت. لەوکاتەدا ئێرانی نامەکەی دایە دەست مامۆستا، ئەویش دەستی کرد بە خوێندوەی نامەکە منیش تەماشای دەکەم بینیم مامۆستا ڕووخساری گۆڕاو پارچە کاغەزەکەی لەسەر مێزەکەدا داناو، ڕووی کردە من ووتی کاکە حەمە تۆ نامەی ئەو پیاوەت بۆمن هێناوەو هێزیش بەدواتەوەیە دێنە سەرمان ئەمە یەعنی چی؟ منیش ووتم شتی وانییە مامۆستا باوەڕناکەم، من ئەگەربزانم شتی واهەیە نەدەهاتم بۆلای تۆ. ئێرانی ووتی چۆن ئەوە مەحمود سەنگاوی لە توەقوت هاتووەتە ئەمبەرو بەرەو ئێرە دێن، کوردۆ قاسم لە ملەیی دارێیە، لەم قسانەدا بووین پشتی دەرگا و جام خانەکەی ژوورەکەی مامۆستا پڕبوو لەخەڵک هەریەکەو قسەیەکی دەکرد، یەکێک دەرگاکەی کردەووەو ووتی مامۆستا ئەوە لە شیرەمەڕ تەقە دەستی پێکرد. تەواو من قسەم نەما، مەلا عەلی ووتی تۆ بڕۆ بەڵکو لەگەڵ مام جەلال قسەبکەی، من هەستام و خواحافیزیم کرد.

هاتمەدەرەوە بینیم دوو کەسی ئێرانی وەستاون نەشم ئەناسین، ووتیان کاکە حەمە زەحمەت نەبێ برادەرانی ئێمە کەمێک ئیشیان پێت هەیە، ووتم من بەپەلەم ئەبێ بڕۆم ووتیان هەر چەند دەقیقەیەک، ووتم باشە

---

[1] - ئێرانی شۆرەتی ئەندامێکی ئیدارەی ئیتلاعات بوو، پێشتر و لەکاتی گرتنی هەڵەبجەوە ئەمناسی، کورد بوو، ماوەیەک بەرپرسی ئیدارەی چوانرۆ بوو. کاتێک لەگەڵ حیزبی دیموکراتدا بەر لەهێرش کردنە سەر هەڵەبجە لە وتووێژدا بووین بۆ چۆڵ کردنی ناوچەکە، لەگەڵ ئەم ئاغای ئێرانییەدا گفتوگۆمان ئەکرد، نوێنەری سوپا بوو.

فەرموون یەکێکیان پێش کەوت ئێمەش بەدوایدا باماندایەوە بۆ کۆلانی پشتی بارەگای مەکتەبی سیاسی بزووتنەوە، دەرگای ماڵێک کرابووەوە چووینە ژوورەوە چەند کەسێک لە ماڵەکەدا بوون، تا ئەمڕۆ من نەمزانیوە بارەگای ئێران لەو شوێنەدایە. ئەمە بارەگای قەرارگای نەسرە، دانیشتین و چاییان هێناو ووتیان ئەمە چۆنە؟ ووتم چی چۆنە؟ ووتیان ئەم هێرشە چۆن دەکەن؟ ئەوە خراپە و......تاد.

منیش ووتم من لای مام جەلال بووم باسێک لە هێرش کردن نەبووە، ئێستا من بەپەلەم ئەبێ بڕۆمەوە بۆ مەڵبەند تابزانین چی دەکەین، یەکێکی ئەسمەری لەشولار لاواز دەستی کرد بە قسەکردن و توڕەیش دیارە، ووتی مەڕۆ بۆمەڵبەند بڕۆ بۆ سەراو بەجەبار فرمان بڵێ بابێت بۆ ئێرە بۆلای ئێمە تاکێشەکان حەل بکەین، منیش سەیرێکم کردو ووتم جەبار فرمان چۆن بێتە ئێرە؟ ئەوە شەڕەو ئێستا ڕێگە داخراوەو لەکاتی ئاساییشدا جەبار فرمان نــایەتە هەڵەبــجە، نەک ئێســتا، ووتــی لەکــێ ئەترســێ بــڕۆ پێــی بڵێ(سەردارسیاهکگل) سەردار ئاسیابانی لەوێیە ئێمە خزمین من مەلەکشاییم. منیش ئەمویست ڕزگارم ببێت ووتم باشە بزانم چۆن دەبێت. لەوێ هەستام و خۆم گەیاندەوە بارەگای مەڵبەند.

دوای ئەوە من لای مامۆستا دەرچووم، بروسکەیەکی بۆ مام جەلال ناردووە دەڵێت (کاک حەمەی حەمەسەعید نامەو ڕاسپاردەکانی هێنا و بەنرخن، کاک حەمەی حاجی مەحمودیش هەروای نووسیوە، کەچی ئەوە لەشکرکێشی ئەکرێتە سەرمان). دیارە کاکە حەمە لە کۆبوونەوەکەی سلێمانیدا هاتووەتە دەرەوە نامەی بۆ مامۆستا نووسیوە سەبارەت بە هەڵوێستی مام جەلال لە کۆبوونەوەی دوێنێ ئێوارەدا.

مام جەلال وەڵامی بروسکەکەی مامۆستا دەداتەوەو ئەڵێت: لەشکر کێشی لە ئارادا نییە و ئەو هێزە هاتووە بۆ سەراو بۆ سەر ئێوە نییە. دوای ئەوە مامۆستا بە بروسکەیەکیتر داوا دەکات و دەڵێت: مام جەلال خۆت تەداخول بکە، بۆ گەڕانەوەی هێزەکان، ئێمەش بەدڵ و بەگیان ئامادەی کۆبوونەوەو بەئاشتی چارەسەر کردنین. بەرلەوەی مام جەلال وەڵامی ئەم بروسکەش بداتەوە، لە هەموو لاوەتەقە دەستی پێکرد و بارودۆخەکە لەدەست دەرچوو.

بەلێ من گەیشتمەوە مەلبەند کاک کەمال و برادەرانم بانگکردو دەورو بەری مەلبەندمان قایم کرد، ووتم کاک دکتۆر دابەش کردنی پێشمەرگە بهێلە بۆ من و تۆ برۆرە لای جیهازو تەلەفۆنەکان بۆ پەیوەندی کردن و وەلام دانەوە. دەستم کرد بەدابەش کردنی ئەو پێشمەرگانەی پاسەوانی مەلبەند بەم شێوەی خوارەوە:

تیپەکەی بورهانی حەمە باقی لەنێوان گەڕەکی شارەوانی و کانی قولکەدا، جەماعەتی بلەڕەش لەسەر جادەو بەردەم مەلبەندا، چەند پێشمەرگەیەکی متەفەرقە وەک حەمەرەشیدی ئەحمەد کوێرو مام هەلمەت و ئازادی حاجی عومەرو عەبدولای برای و حەمەی حاجی کەرەم و سەلاحی مەحمودو وەهبی پاشای نامدار و.............. تاد، دانران لەنێوان مەلبەندو ئەو هێزەی بزووتنەوەدا کە لەپەنای مەلبەندو خانووە زاتیەکانی عەنەبدا بوون ، ئەمانەی ناوم هێناون پێشمەرگە دێرینەکان بوون بەتەنها بەرەیەکی شەڕیان گرتبوو. پێشمەرگەکانی دەستەکەی خۆیشم بۆ شارەزای دەستەکان دابەش کران. بەجیهازی دەستی، مەهدی برامم دۆزیەوە، قسەم لەگەل کردو پرسیم لەکوێیت؟ ووتی بەرەولای تۆ دێم، ووتم ئەزانم گەیشتویتە کوێ؟ ووتی لە دۆلاش دەرچووم، دۆلاش ئاواییەکی نزیک پردی کۆنی زەلمە لەبەری لای سەیدسادقەوە.

جگە لە بارەگای مەلبەند، لە زەمەقیش شەهید ڕەفعەت ئێناخی بارەگای هەبوو، کاک موحسینی مەلاحەمەمین ئاساییش بوو لەناو شاردا لەگەل بزووتنەوە پێکەوە بوون، نوری خێل حەمەیی، لەگەل مەفرەزەیەک بارەگایان هەبوو لەگەڕەکی کانی قولکەدا، بارەگای ئیدارەو دارای لەلای مەکتەبی ئەحمەد موختاردا بوو لەکانی قولکە کاک مەنسوری ئەنوەر بەگ بەرپرسی بوو.

لەم کاتەدا کاک کەمال هات ووتی تەلەفۆنی مەلبەندیان بڕیووە، ووتم برۆ بۆ مالی مام وریا هاواری لەوێ تەلەفۆن هەیە، کەچووبووە ئەوێ لەگەل پەیوەندیەکانی بزووتنەوە قسەی کردبوو، وتبووی بۆچی هاتوون و گەمارۆی مەلبەنتان داوە؟ پێیان وتبوو شەڕە ئێوە لەوبەرەوە پەلاماری پردی زەلم و شیرەمەڕتان داوە ئەتانەوێ لە هەلەبجە شەڕ نەبێت......تاد، ڕاستیشیان دەکرد. بۆ پەیوەندی کردن منیش چوومە مالی مام وریا، پەیوەندیم بەبارەگای

ئیدارەوە کرد، پێشمەرگەیەک وەڵامی دامەوە ناوی عەبدولڕەحمان بوو، ووتم لە ناو شارەوە هەرکەسی خۆمان بەچەکەوە دێت بەرەو مەڵبەند لەوێ گلی بدەنەوە لەلای مەکتەبی ئەحمەد موختار هێڵی بەرگری دروست بکەن خۆشمان لەپشتەوە دێینە لاشانتان.

تەلەفۆنم بۆ تەلەفۆنی کۆمیتە کرد، بزووتنەوە وەڵامیان دایەوە دام خستەوە، لەگەڵ مەڵبەندی بزووتنەوە قسەم کرد، ووتم نەدەبوو تەلەفۆنەکانی مەڵبەند ببڕن، چوونکە نەبوونی پەیوەندی کارەکە خراپتر ئەکا. ووتیان ئێمە نەبووین، ئەو برادەرەی قسەم لەگەڵ دەکرد، کاک عەبدوڕەحمان عەبدوڕەحیم بوو نێوانمان باش بوو، دواجار ووتی کاکەحەمە بۆ لای ئێمە میوان نابن؟ منیش ووتم باوەڕ ناکەم بگاتە ئەوەی ئێوە ئەو عەزیەتە بکێشن، ئێمە بەتەماین ئێوە میوان داری بکەین، ئیتر پەیوەندیمان بڕا.

لە نزیک نیوەڕۆدا لە هەموو مزگەوتەکانەوە ئەڵاهو ئەکبەر دەستی پێکرد و بانگەواز دەکرا، دەستیان لێ مەپارێزن لەو کافرانە، جیهاد بکەن لەڕێگای خودادا . سەرەتا پەلاماری لیستی سەوزی نێو ئاساییشیان داو کاک موحسینی مەلا حەمە ئەمین و یەک کەسیتر بەبرینداری گەیشتنە لامان، دوو کەس لەدەستەکەی خۆم نارد بۆلای نوریێ خێڵ حەمەیی هاتنەوە ووتیان لەوێ نەماون بارەگاکەیان چۆڵ کردووە، دیارە شەڕیان نەکردبوو خۆیان شاردبووەوە، لە دوو لاوە پەلاماری لای کاک ڕەفعەتیاندا لە زەمەقی بەڵام جگەلەوەی هێرشەکەیان شکاندن، پەلاماری بازگەکەی بزووتنەوەشی داو گرتیان، ڕەفعەت ئێناخی شێرە کوڕە، قارەمانانە شەڕیان کرد تاشەو بەسەردا هات، دوو پێشمەرگەیان شەهید و چەندیش بریندار بوون، شەهیدەکان ئەمانە بوون: ١_ فازل محەمەد زێبا خەڵکی ئاوایی سەراوی نەورۆڵی نشین باوکیشی لەشۆڕشی ئەیلولدا شەهید بووە، ٢_ سەرکەوت حەسەن حەمەسەعید خەڵکی ئاوایی تاوێرە بوو.

دوای ئەوە لەسێ لاوە پەلاماریان بۆسەر مەڵبەند دەست پێکرد بەم شێوە: یەکەم لە گەڕەکی مامۆستایانەوە، ئەمانە دەستەکەی بورهانی حەمە باقی ڕێگەی لێگرتن و لە شەڕێکی دەستە و یەخەدا فەرماندەی هێزەکەی بزووتنەوە بە ناوی شێخ عەزیزی سازانی کوژرا و خراپ شکان. دووەم لەلای عەنەبەوە بۆ سەر مەڵبەند و گەڕەکی گرییانەییەکان، ئەمانیش نەیان

توانی بێنە پێشەوە و شکان و چەند سەنگەرێکیشیان دەستی بەسەردا گیرا.سێهەم لە بەردەم ئاوایی جەلیلەوە هێزێک بە دوو ئۆتۆمۆبێلی هەڵگری دۆشکاوە دوور بە دوور بەهاوەن و دۆشکا تەقەیان دەکرد لە بارەگای مەڵبەند.

دووبارە پەیوەندیم کردەوە بە مەهدیەوە ئەمجار پرسیم لەکوێی ووتی نزیکی شارۆچکەی سیروانین، گەڕامەوە بەسەر هێزەکەدا بۆ ورەبەزکردنەوەیان پێم ئەوتن یەک کاتژمێری تر هیمەت بکەن هێزەکان ئەگەنەلامان. من نازانم ئێران ئاگاداری یەکێتی کردووەتەوە ئەگەر پاشەکشە نەکەنەوە بۆ شوێنەکانی خۆتان ئەوە لەگەڵ ئێمەدا دەرگیر ئەبن، مەهدیان ئاگادار کردووەتەوە بگەڕێنەوە، گەڕاونەتەوە بەرەو سەیدسادق، بەڵام ئەو دڵی نایەت بە من بڵێت شتێکی واهەیە.

دەمەوعەسر مەهدی خۆی پەیوەندی کرد هەواڵی ئەپرسی دەنگوباستان چۆنە ووتم ئێمە زۆرباشین ئێوە بۆ نەگەیشتن، بە دەنگێکی بزرکاوەوە ووتی ئێمە گەڕاینەوە، لەوکاتەدا خەڵک بەدەورمدا بوون ئەو قسەم بیست دەنگی بێ سیمەکەم کزکرد و پرسیم بۆ چی بووە، ووتی نازانم هەرچۆن بووە خۆتان بگرن تا تاریک دەکات، رام کرد بۆلای کاک کەمال تابزانم بەبروسکە هیچیان بەو نەوتووە، ووتی نەوەڵا چیت بیستووە، ووتم مەهدی ئاوایی ووت. دکتۆر کەمال پیاوێکی ئازاو نەترسە، هەوەها قەدەفەریش، بەڵام ئەمڕۆ لەبەرچاوم قەدەفەریەکەی جاران نەبوو، دکتۆر ووتی بەڵکو چارەسەری ئەو دۆشکانەی لای جەلیلە بکەیت شپرزیان کردوین، ووتم جابەچی خۆ ئێمە دۆشکامان نییە، بەڵکو بێنە پێشتر ئەوکات بە (ئاڕ بی جی) لێیان ئەدرێت، بەتوڕەییەوە ووتی کاک عەبدوڵای مامە[1] تەقەی لێکردون ئەگینا نزیکتر دەبوونەوە، منیش بەپێکەنینەوە ووتم: باشتر کاری عەبدوڵا راست بێت ئەگینا ئەنیشتنە ملمان.

---

[1]عەبدوڵای مامە خەڵکی تەوێڵەیە لەناوچەی هەورامان، پێش ڕاپەڕین کادر و پێشمەرگە و فەرماندی بەتالیۆنی هەورامانی حیزبی شیوعی بوو، لە پارتیزانی و لەخەباتی شاخ دا یەکێک بوو لە پێشمەرگە دڵسۆز و چالاکەکان، دوای ڕاپەڕین سەنگەری خەباتی گواستەوە بۆناو ڕیزەکانی یەکێتی نیشتیمانی، ماوەیەک بەرپرسی کۆمیتەی هەورامان بوو.

یەکێک ووتی لەو ژوورەی ئیدارەدا دۆشکای لێیە، ئادەی بیهێنن، دەریان هێنا دیمیترۆفێکی یەک لولەیە، لێی نازانین، عەرەبێک لەگەڵ کاک کەمال بوو یەک دەستی هەبوو ووتی من لێی ئەزانم هات و بردمانە حەوشە و کەلاوەیەک دامان مەزراند ڕووبەڕووی دۆشکاکانی ئەوان، ووتم ئادەی لێیاندە لەو دوو پیکابە، من چوومەلاوە و بەدووربین سەیرم دەکرد کابرای عەرەب یەک فیشەکی تەقاند و ووتم دەست خۆش دەی هەر بەدوربینەکە تەماشا دەکەم خۆم حازر کردووە بزانم شوێنی گوللەکانی دیارە، تەقەی نایەت لای کردەوە ووتم چیە بۆ نایتەقێنی؟ عەرەبەکە ملێکی نایە لاوە و ووتی مەکسورە (شکا).

تەواو یەک گولەی تەقاندو شکابوو، لەوکاتەدا پێشمەرگەیەک هات ووتی کاک بورهانی حەمەباقی[1] ووتویەتی با کاکە حەمە بێتەوە بۆ ئێرە، ووتم بۆ؟ ووتی نازانم، ڕۆیشتم و گەیشتمە لای بورهان، ئەبینم بزووتنەوە هێزێکی زۆری هێناوە بەرامبەریان و بەبڵند گۆیەک کە لەسەر ئۆتۆمبێلێکی لاندکرۆز دانراوە، لەگەڵ بورهان دا قسەدەکەن، ئەیان ووت تەسلیم بن پارێزراو ئەبن، خۆمان بە سەلامەتی ڕەوانەی گەرمیانتان دەکەینەوە، مۆڵەت تان ١٠دە خولەکی ترە ......تاد ، لەوکاتەدا بورهان سەیرێکی منیکرد، لەدەم و چاویدا هەستم بە بچوکترین نیشانەی ترس نەکرد، بە ڕاستی گەرمیانییەکان لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژێکی تەنگ بوو فریامان کەوتن، هەمیشە کوڕی ڕۆژی تەنگانە بوون. ئەکرەمە سوری برای بورهان چەکی بی کەی سی بەدەستەوە بوو، خۆی و دوو کەسی ترو ئەوانەی بەدەوری مندابوون بەگوللەو دەست ڕێژی ئاگر وەڵامی بانگەوازەکەی بزووتنەوەیان دایەوە.

لەوکاتەدا یەکێک هات و ووتی پێشمەرگەیەکمان لەو کوچەی ئەودیودا بریندار بووە، چوومە سەری سەیرم کرد شوێنەکەشی پەناگا بوو، لەهیچ شوێنێکەوە گولله نەیئەگرتەوە. کوڕیکی گەنج و جوان، ناوی عەبدوڵا فەتاح

[1]بوورهان خەڵکی کانی مارانی ناوچەی کفریە، سەرتیپی پاراستنی مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوور بوو، ئەمڕۆ لەگەڵ ئەکرەمی برای هیمەتی مەردانەیان نواند.

سەعید[1]، خەڵکی ئاوایی میرقاسم بوو، بەدوو پێشمەرگەی دەستەکی خۆم و هاوڕێیەکی خۆیدا ناردم بۆماڵێک، دواتر سەرم لێدا باش بوو.

دواتر هاتمەوە شوێنەکەی، کاتێک وردبوومەوە ئەبینم لەقاتی دووەمی ماڵەکانی د. یوسفی بەڵخەییەوە تەقەیان لێ ئەکرێت، ئەوماوە د. یوسف خۆشی لە دەوروبەری هەورامان خۆی شاردبووەوە، پارتی بوو نەچوو بوو هەولێر، گومانم کرد یوسف خۆی لە ماڵەوە بێت. لەلای عەسرەوە، چەند هەڤاڵێک هاتن داوای فیشەک و گوللە ئارپیجیان دەکرد، ناردم بۆناو مەڵبەند بۆلای کاک کەمال بۆ فیشەک، لەسەر پارچە کاغەزێک نووسی بووی بەرپرسی تەقەمەنی هادی کۆکۆیی و سەلاح مەحمود دەڵێن ٤٠٠ چوار سەدفیشەکمان هەبووە، هەر بەیانی دابەشمان کردووە. منیش ناردم بەسەر برادەراندا گەڕان و پێیان وتن دەست بەفیشەکەوە بگرن.

ڕۆستەم هەیاس پێشمەرگەی دەستەکەی خۆم بوو کوڕێکی ئازاو چاونەترسە خاڵۆزاشمە، پێپلەیەکمان(پەیژە) دانا بۆ سەربانێک پێم ووت تۆ لەسەر ئەم پێپلەوە چاودێری ماڵەکەی یوسف بکەو ئەمان بەجێ نەهێڵی ووتی باشە. من دووبارە هاتمەوە بۆ نزیک مەڵبەند، تابزانم عەرەبەکە دۆشکاکەی چاک نەکردووە، ووتیان جیهازەکە داوات دەکات، چووم کاک کەمال شاکیر ووتی من قسەم لەگەڵ کردوون، ئەزانم کاک فەرەیدون عەبدولقادرە جارێکی تر فریامان کەوتەووە، پرسی بارودۆخەکەی ئەوێ چۆنە ؟ بۆم باس کرد بەکورتی و ووتم بەگشتی باشین، ئێستا ئێمە زاڵین بەسەر گەڕەکی شارەوانیداو مەڵبەند پارێزراوە و بەشێکی گەڕەکەکانی کانی قولکەو مامۆستایانیشمان لێ سەندوون. ووتی زۆرباشە تازە ئاوایی لێهات خۆتان موختارن هەر بڕیارێک دەدەن ئێمە لەگەڵتانین جگە لە تەسلیم بوون، پرسی تێگەیشتی ووتم بەڵێ.

---

[1] دوای ئێمە خاوەن ماڵەکە عەبدوڵایان ڕەوانەی نەخۆشخانەی عەنەب کردبوو، دکتۆرەکان خوێنیان بۆ هەڵواسیبوو، بەڵام دڕندەکانی ناو بزووتنەوە، ئەوانەی خوا بەو گەورەییە دروستی کردون و تۆزقاڵێک ڕەحمیان بەرامبەر بەبەندەکانی نییە، چووبوونە سەر بریندارەکان و شەهیدیان کردبوون، یەکێک لەوانە عەبدوڵای جوانەمەرگ بوو، سۆندەی خوێنەکەیان لە دەستی کردبووەوە و فڕێیان دابوو. عەبدوڵاش شەهید بوو، عەبدوڵا کوڕێک مێر مندالی شیرینی جوان، تەمەنی لەدەوری ١٨ هەژدە سالان دا بوو

لەگەڵ کاک کەمال و ئەحمەدا بڕیارماندا بەرگری بکەین تاشەو دادێت، دوای ئەوە پاشەکشە بکەین بۆ ملەی داری، بۆلای ئەو هێزەی گەرمیان کە لەوێ ماوەو نەیکردووەتەوە ئەوبەر دەریاچەکە، بەڵام ئێستا تاشەو بەسەردا دێت، من بچمەوە بۆلای پێشمەرگەکانی کە لەلای بەری چەپی مەڵبەندەوە بەرگری دەکەن، واتە نێوان گەڕەکی شارەوانی و ناوشار، ئەوانیش وردە وردە خۆئامادە بکەن و ئەو کەلوپەلەی پێویستەو بەکۆڵ ئەگوازرێتەوە، وەک بێسیم و ئەرشیف، جیای بکەنەوە ئەوی تری بسوتێنن، من گەڕامەوە بۆ شوێنی خۆم. برادەران بریندارەکان و شەهیدەکانیان لەماڵاندا دانا بوو هەموو شتەکانیان لە مەڵبەند لابردبوو ئامادە بوون.

دواتر زانیمان لەو کاتەدا کە هێزەکانی یەکێتی بەرەو هەڵەبجە و پردی زەڵم جوڵاون، ئێران یەکێتی و مام جەلالی ئاگادار کردووەتەوە نابێ هێزەکانتان بەرەو هەڵەبجە پێشڕەوی بکەن و دەبێ بگەڕێنەوە دواوە، ئەگەر پاشەکشە نەکەن ئەوە لەگەڵ ئێمەدا دەرگیر ئەبن. یەکێتیش تەقەی دەست پێکردووەو بێ ئەوەی یەک سەنگەری گرتبێ، پاشەکشەی پێکراوە، ئەمەش بزووتنەوەی یەک چاو کردووەتەوە، هەموو قورسایی شەڕەکەو هێزەکەیان رووکردوەتە سەر بارەگای مەڵبەندو ئەو هێزە کەمەی کە لەکۆمەڵگەی زەمەقیدا بوو، بەفەرماندەی شەهید ڕەفعەت ئێناخی، لە کوردەواریدا ئەمە پێی ئەوترێت گورگانە خواردو، واتە مەڵبەند لەم شەڕەدا گورگانە خواردو کرا. بەڵام لەگەڵ ئەمەدا مام جەلال و کاک فەرەیدون هەوڵیان دابوو لەگەڵ ئێران و بزووتنەوەدا، ئەوانیش ئەو هێرشەی سەر ئێمە ڕاگرن. بەڵام لەبەرئەوە ئێمە جیهازە دەستیەکانمان بێ شارژ(شەحن) بوون راکاڵەکەی مەڵبەندیش پێچڕاوەتەوە هیچ پەیوەنییەکمان بە کەسەوە نەماوە، بێئاگاین لەوەی بزووتنەوە بڕیاری داوە لە کاتژمێر ١٢ی شەوەوە ئاگربەست ڕابگەیێنن، بەڵام ئەو بڕیارەیان بەکردەیی جێبەجێ نەکرد. من دواتر لە کاک عەدنانم بیست، ووتی مام جەلال ئەو شەڕەی پێ باش نەبووە، برادەرانی تر پێداگریان کردوە. منیش ووتم بێگومانم.

ئەمڕۆ تا کاتژمێر٩ نۆی شەو مەفرەزەکانی ئێمە لە مەڵبەند و لەزەمەقیش بارەگاکانیان پاراست و یەک مەفرەزەش لە جێگەی خۆیدا پاشەکشەی نەکردووە. بەڵام بارەگای مەفرەزەیەکمان لەناو شاردا وەک

پێشتر ئاماژەم پێدا چۆڵ کرابوو خۆشیان تەسلیم کردبوو، ئەوبارەگا نوری خێڵ حەمەی بەرپرسیان بوو، بارەگای ئیدارەمان لەناو شاردا دوو پاسەوانی تێدابوو گیرابوو، ئاساییش مشتەرەک بوو لەگەڵ بزووتنەوە ئەوانەی ئێمەیان شەهید و بریندار کردبوون، بارەگایەکمان هەبوو لەلای باخی میر بەناوی بارەگای سەید حەسەن سەید قادر چەند پێشمەرگەیەکی لێ بوو، ئەوانیش پێشتر چۆڵیان کردبوو، چووبوون لە ماڵان خۆیان شاردبووەوە.دواتر بیستم پەیوەندیشیان بەبزووتنەوەوە کردووە پێش ئەوەی تەقە دەست پێبکات، بارەگای هەورامان لە بەڵخە و بیارە شەڕیان کردبوو دواتر خۆیان بەجێیان هێشتبوو لەو چەم و دۆڵانەدا خۆیان شاردبووەوە.

من کاتژمێر ٨:٣٠ هەشت و نیوی شەوگەڕامەوە ناومەڵبەند برادەران وتیان ئامادەین، بەرنامەمان دانا هێزەکەمان هەموو بانگ بکەینەوە دەوروبەری بینای بارەگای مەڵبەند، لە هەر قۆڵێکەوە لە چەند شوێنێکدا یەک یەک دوو دوو پێشمەرگە بەجێ بمێنن جار جار تەقە بکەن، کاک سەلامی عەزە سمێڵە بەرپرس بێت لەکاتی کەوتنەڕێدا ئەوانەی لای ڕاست لەگەڵ خۆی بهێنێ و ئەوانەی لای چەپیش یەکێک دانرا بیان هێنێ لەبیرم نەماوە کێ بوو. دوو ئۆتۆمۆبێلەکەی من و کاک د.کەمال شاکیر لەوێ بەجێمان، کوڕەکان ویستیان بیان سوتێنن نەمهێشت لەبەر دوو هۆکار، یەکەم: بەئاگر و دوکەڵی سوتاندنیاندا ئەوان ئەزانن ئێمە پاشە کشە دەکەین، دووەم: وەوتم دواتر هەر ئەکەونەوە دەست خۆمان.

بەڵێ لەبارەگای مەڵبەندەوە لەکۆمەڵگەی عەنەبەوە کەوتینە ڕێ بەرەو کۆمەڵگە زەمەقی بەبەردەم شاردا بۆلای ئەو برادەرانەی ئەوێ، بریار درا لەمەڵبەندەوە تازەمەقی ئازادی حاجی عومەرو مەفرەزەیەک بینە پێش قەرەوڵ، لەزەمەقییەوە بۆ ملەی دارێ سەید کەمالی کانی تویی لەگەڵ مەفرەزەیەکی چالاک بینە پێشرەوی هێزەکە لەپێشەوە. لەو کاتەدا پرسیم کاک کەمال مجەفرەی جیهازەکە کوا؟ وتی بەکۆڵی چەوساوەوەیە، چەوساوە نازناوە ناوی ڕاستی سابیرە، سابیر دەستی شعر و نوسینی هەبوو بە نازناوی چەوساوە، سابیر کادری ناو مەڵبەند بوو، دایکی خەڵکی ئاوایی جەلیلەی پشتی هەڵەبجەیە، باوکیشی خەڵکی ئاوایی شیرەمەڕی لای خورماڵە. بەڕاستی کورێکی پاک زەحمەت کێش و ئازاش بوو، یەکێک بوو لە کادرە

ماندوەکانی یەکێتی لە سنووری هەڵەبجە، ئێستا لە ئەوروپایە لە وولاتی بەریتانیا.

لە کۆمەڵگەی عەونەب دەرچوین گەیشتینە نزیک کۆمەڵگەی زەمەقی لەناو هێزەکەدا بووە دەنگەدەنگ، وەستاین پرسیارمان کرد ئەو دەنگەدەنگە چیە؟ ووتیان چەندین پێشمەرگەی بریندار کەئەتوانن بەپێی خۆیان بێن بەجێمان هێشتون، برینداەکان لەماڵی دراوسێیەکی مەڵبەندا دامانـاون، بریاربووە کاتێک کەوتینەڕێئاگاداریان کەین لەبیرمان چووە. جگەلەمانە دوو هەڤاڵیتر لەو پێشمەرگانە بەجێ مابوون پێشمەرگەی تیپەکەی مەڵبەند بوون، لە شوێنێکدا شەڕیان کرد بوو، شوێنەکەیان ئەکەوتە نێوان برادەرەکانی خۆمان و بزووتنەوە، دەستیان لە ئێمە بڕابوو، بەڵام کاتی پاشەکشەکە بوورهان چووبوو بەدوایاندا لەشوێنەکەدا نەمابوون، دواتر زانیمان لەبەر دەم ماڵێکدا بوون خاوەن ماڵەکە سەر بەلایەنێکی تری سیاسی بوو پێی وتبوون کەس نەماوە هەرێیوە لێرەدان وەرنە ماڵەوە من ئەتان شارمەوە. بەڵام بەداخەوە خیانەتی لێکردن و دوای تەسلیمی بزووتنەوەی کردن. ئەوانیش ڕۆژی دوای شەڕەکە بردنیان لەلای کانی حەمەوخان هەردووکیان گوللە باران کردن، ئەو دوو شەهیدە مەزلومە ئەمانە بوون: ١- حەمە ئەحمەد مەحمود خەڵکی ئاوایی مەلاهۆمەری ناو زنگنە، ٢- جەمال مەحیەدین خەڵکی ئاوایی بنپەڵکی گەرمیان.

ئەوماڵەی پێشمەرگەکانی لێبوو ناوی خاوەن ماڵ کاکە حەمەی ڕۆستەمە خەڵکی تەوێڵە بوو، بەچەند کەسێکم ووت، ئەوەستین بگەڕێنەوە بیان هێنن، هەریەکەو بە بیانویەک نەرۆیشتن، ناحەقیشیان نەبوو ماندو هیلاک بوون. بۆیە خۆم گەڕامەوە چوار پێشمەرگەی چەلەنگ و شارەزا کە لەوکاتەدا لێمانەوە نزیک بوون لەگەڵ خۆم بردن .

دیارە کەسێک کە بیرەوەریەکانی خۆی سەبارەت بەرووداوێک یان پێشهاتێک ئەگێڕێتەوە، تەنها ئەو سەحنەیە وێنا و نمایش ئەکاو ئەگێڕێتەوە، کەخۆی دیویەتی، بەرەو ڕوو بووە لەگەڵی، ئەوەش بەشێکی کەمە لە بگرەو بەردە و قسەوباسەکانی سەرجەم کون و قوژبنی کۆی دیمەن و سەحنەی پێشهات و ڕوداوەکە.

بۆیە زۆر جار نووسەری ڕوداوەکان ئەبنە جێگەی گلەیی و ڕەخنە لای کارەکتەرو هاوڕێکانی تریان، بۆ ئێمەش لە شۆڕشدا، ئەوەیە ئەبینە جێگەی گلەیی لای هاوسەنگەرەکانمان. بە نموونەو بەدڵنیاییی ئەمەی من ئەیگێڕمەوە، سەبارەت بەم شەڕەی بزووتنەوەو پەلاماردانی مەڵبەندی شارەزوور، لای چەندین هاوڕی و برادەری ترم، لەو ڕۆژەداو سەبارەت بەخودی ئەم ڕوداوە، شانۆکەو قسەوباسەکان لای ئەوان بەجۆرێکی ترە و جیاوازیان هەیە ، ئەو لایەکی کەمی لەڕووبەری شانۆکە بینیوە، هەڵسوکەوتو پەیوەندی تەنها بە خۆی و سەنگەرەکەی و ئەو چەند هەڤاڵەی دەورو بەریەوە هەیە.

لێرەدا قسەی دوو هەڤاڵتان بۆ ئەگێڕمەوە سەبارەت بەم شەڕەی ئەمرۆی مەڵبەند، کەمن بێئاگا بووم لەو بەشەی ڕووداوەکە، کە بەدڵنیاییش گێڕانەوەکانیان ڕاست و دروستە.

یەکەم: کاک کەمال شاکیرە، ئەوکات جێگری مەڵبەند بوو، سەبارەت بەو ڕۆژە دەڵێت: (( ئەو ڕۆژە کاک عەدنان بەرپرسی مەڵبەند لە هەڵەبجەدا نەبوو، بەڵام بڕیار بوو بگەڕێتەوە لامان باسێکیش لە هێرش کردن بۆسەر ناوچەکەو بەری شارەزوور نەبووە، لەلایەن یەکێتیەوە. دەڵێت ئەوکاتە تۆ(حەمە) چویت بۆلای مامۆستا مەلاعەلی دوای ماوەیەک، مامۆستا بەهۆی ئەنوەر ناوێکەوە پرسیاری کردووە ئەو هێزە چییە لە سەیدسادق، منیش بێئاگایم پیشان داوە، دواتر لەگەڵ کاک جەبار بە جیهاز قسەم کردووە و هەمان پرسیارم کردووە، بەناوی مامۆستاوە ووتومە داوای وەڵام دەکەن))، وەڵامی کاک جەبار فرمانیش ئەوەبوو ووتی یەک سەعاتی تر لاتانین. ئەمیش وەڵامی مامۆستا دەداتەوە، کاک کەمال خۆی قسەی لەگەڵ ئەکا، دەڵێت مامۆستا ئەوهێزە بۆ پێنجوێن ئەڕوات، ئەویش دەڵێت وا بەراییان هاتە ملەی داری و ئیمامی زامن پێنجوێنی چی؟ هەروەها کاک کەمال دەڵێت، مام جەلال لە دەوروبەری نیوەڕۆدا قسەی لەگەڵ کردوم پرسیویەتی ناتوانن ئەو شەڕە ڕاگرن؟ (دیارە ئەمە لەدوای ئاگادار کردنەوەو گەڕاندنەوەی هێزەکانی یەکێتیەوە بووە لەلایەن ئێرانییەکانەوە) کاک کەمال ئەڵێت بە مامم ووت چۆن و بەچی ڕایگرین ئەوان هاتوونەتە سەر مەڵبەند، دوای ئەوە لەگەڵ دوو هەزار........قسە ئەکرێت. هەروەها کاک کەمال ووتی بەرلەوەی کاک

فەرەیدون عەبدلقادر قسە بکا لەگەڵ تۆ، بە منی ووت ئەوە لەباتی کاک جەبار قسەت لەگەڵ دەکەم، ئێوە بەتەمای ئێمە مەبن بۆخۆتان بڕیار بدەن چی دەکەن)) . دیارە کاک جەبار سەرلەبەیانی بەکاک کەمالی ووتوە سەعاتێکی تر لاتانین، دڵی بەرای نەداوە یان لەڕووی نەهاتووە ئێوارە پێی بڵێت فریای خۆتان بکەون.

دووەم: عومەر عەبدولکەریمە کە ئەوکات ئەندام مەڵبەند بوو، عومەر ئەوەندەی من ئەو ڕۆژە بینیم جگەلەوەی کادرێکی هۆشیارە بە هیمەتیش بوو. ئەو سەبارەت بەم ڕۆژە دەڵێت: (ڕۆژێک بەر لە شەڕەکە کاک عەدنانی حەمەی مینا مەڵبەندی کۆکردەوە، لە بارەگای کۆمیتەی سەیدسادق، نزیکەی ٣٠سی کارگێڕ و ئەندام مەڵبەند و کادر بووین، لەوانە جووتیارمەجید، مەحمودی حاجی ساڵح، جەلال کاکەلی، بەکری زەراعە، عەلی ئەکبەر، فەتاح کۆکۆیی، فەرەجی حەمەساڵح و.........تاد ، لە کۆبوونەوەکەدا ووتی بارودۆخەکە خراپە، حەمەی حەمەسەعید و کەمال شاکیر و قەدەفەری لەوین لە هەڵەبجە بۆیە دەبێ هەر ئێستا هەمووتان بگەڕێنەوە بۆلایان، لەوێ هەموو هەستاین بێینەوە بۆلای ئێوە، بەڵام ئیتر ئەوەبوو هەندێکیان نەهاتنەوە، ئەوانەی هاتینەوە بۆلاتان من ئاگادار بم ئەمانە بوون: ١- خۆم عومەر ٢- فەرەج حەمەساڵح، ٣- بەکری زەراعە، ٤- فەتاح کۆکۆیی، ٥- عەلی ئەکبەر ).

بەڵێ، بابگەڕێمەوە بۆ سەر باسەکە، خۆم و ئەو چوار هەڤاڵەی گەڕاینەوە، لەزەمەقیەوە بۆ مەڵبەند ئەمانە بووین: ١- شەهید شیروان ئەبوبەکر سۆسەکانی،٢- نوەر محەمەد ئەولمحەمەد تەپەکوڕەیی،٣- هادی کۆکۆیی خەڵکی ئاوایی باوەکۆچەک،٤- ڕۆستەم هەیاس عەزیز تەوێڵەی و خۆم. ئەمانە هەر چوار کوڕی بەجەرگ و پیاوی تەنگانەن، گەیشتینەوە گەڕەکی شارەوانی دوو لەهەڤاڵەکان ڕۆیشتنەوە بۆلای ماڵەکەو ئێمەش بووینە پاسەوانیان بریندارەکان لەوێ نەماون، دواتر زانیمان ئەوانە برینەکانیان سوک بووە لەگەڵ هێزەکەدا بوون ئێمە نەمان زانیوە، بەڵام دووبریندار سەختمان دۆزیەوە بردنمان لەماڵی کاک وسێن هاواریدا کە پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول و سەر بەبرادەرانی پارتی بوو دامانان بۆیە ئەو ماڵەم دیاری کرد جێگەی گومان نەبوو لای بزووتنەوە، وەخۆشم متمانەم پێی هەبوو.

بەڵێ ئێمەش دووبارە گەڕاینەوە بەرەو کۆمەڵگەی زەمەقی. شەوی ۷لەسەر۱۹۹۷/٤/۸هەڵەبجە بۆنی باروت و خوێنی لێدێت شەوەزەنگە، کارەبا و ڕووناکی تێدا نییە، ئەم بارو و دۆخەی ئەم شەوی ئەم شارە، پێشتر و پاشتر زۆر جار دووبارە بووەتەوە، خەڵکە چارەڕەش و بێدەرەتانەکەی بێزار و وەڕس بـوو بەردەوام لە دڵە کـوتەدان، هەرکەس و لایەک بەتـایبەت لەم شەڕانەی ناوخۆدا بە شێوەی کاتی شارەکەی ئەکەوێتە دەست، بە بیانوی لایەنگری و ئەندامێتی ئەم حزب و ئەو گروپ، لە هاولاتییان چەندین کەس لە خـوێنی خۆیانـدا ئەگەوزێـنن، کۆمەڵێـک ئەخەنە زینـدان و ئەشـکەنجەی وەحشیانەیان دەکەن، کۆمەڵێک ماڵ تالان دەکرێن و شڕە و شیتاڵیان هەر ڕۆژەو بەدەست جەماعەتێکەوەیە، خەڵک نەفرەت لەم بارودۆخەو لەسیاسەت دەکەن، ساڵ بەساڵ خۆزگە بەپارن،

لەگەڕانەوەدا ئەوەندە کەووتینە ناو تەلبەند و هـاتینەوەدەر شـەکەت بووین، ئەم شارە لە بەرترس ماڵێکی نییە چرای ڕۆشن کردبێ بۆیە ڕێگەمان لێ تێک چووە و خەریکە ڕۆژ بێتەوە لەنزیک بەنزینخانەی کۆن کەووتینە ناو کەمینەوە دووبارە بەرەو دوا گەڕاینەوە، ئاگامان لە کاک د.کەمال و هێزەکە نەماوە گەیشتونەتە کوێ و جیان بەسەر هاتووە. لەگەڵ بانگی بەیانی دا لە گەڕەکی تووە وشکدا خۆمان کرد بەماڵێکی نیوە کەلاوە و ڕوخاودا، ماڵەکە دوو هۆدەی بەدار و نایلۆن تێدا دروست کرابوو، بڕیارماندا لەوێ بمێنینەوە، بەمنیـان ووت تۆ سـەر و چـاوت هەڵبەسـە بـا نەتناسـن، خـاوەن مـاڵ نوەر ئەیناسێ نەشمان پرسی ماڵی کێیە، تەقەماندا لە دەرگا، بەرلەوەی بیکەنەوە چرایەکی فانۆسیان هەڵکرد، ئینجا پیاوەکە ووتی کێن؟ نوەر ووتی خۆمانین، دەرگـاکەی کردەوە بێپرس هەموومـان چووینە ژوورەوە، ژنێکی لەشولار باریکی بالاَمام ناوەندی خۆی داوەتە پشـتی پیـاوەکە سـەرەتا هـادی ووتـی پێشمەرگەین و ئەمانەوێ تا سبەینێ ئێوارە لێرە جێگەمان بکەنەوە، بێ وەلاَم دانەوە پیـاوەکە دانەویەوە شـەوقی چـراکە زیـاد بکـات، کوڕەکـان بە جـارێ ووتیان مەکەمەکە. منیش بێدەنگ لە سوچێکەوە لە پشتی کوڕەکانەوە دانیشتم و خۆم داوەتە پەنایان بۆئەوەی ڕووناکی چراکە لێم نەدا، ژنەکە هەر بە پێوە وەسـتاوە لە پەنـا پیاوەکەیـدا، پیـاوەکەی بەسـەر پێشـمەرگەکاندا هـات و دانەویەوە دەست ماچێنی لەگەڵ کردم و ووتی کاکە حەمە داوای لێبووردن

دەکەم سەرەتا نەمناسیت، منیش سەرەتا ئەوم نەناسی و پرسیم کێیت؟ ووتی نامناسی؟ ووتم نەوەڵا. ووتی حەمە تەپەکورەیم سالی ١٩٧٩ لای خۆت پێشمەرگە بووم و دواتر گیرام و ٢٠بیست سال حوکم درام، ناوی پێشمەرگایەتیم فەرهاد بوو، ووتم ڕاست ئەکەیت، باشتر ئاسودە بووین، پرسیم منالتان نییە؟ ووتی نا، ووتم ژنەکەت خەلکی کوێ و ناوی چییە و کچی کێیە؟ ووتی ناوی حەلاوە و نەورۆلیە و کچی میرزا حەمەئەمین و خەلکی تریفەیە[1]، زۆرباشە. پرسیم ئێستا خۆت کارت چییە؟ ووتی لەناو بازاردا لەسەر عارەبانە ئارد ئەفرۆشم بە کیلۆکیلۆ.

مالی میرزا حەمەمین کاتێک من ناسیومن دۆستی یەکێتی بوون، دواتر زانیم بوون بەبزووتنەوە، ئەویش لەسەر کێشمەکێشی هەلەبجەو نالەباری بارودۆخەکەی ئەوکاتە. مالەکەی حەلاوی کچی لەو مالە هەژارە بێدەرامەتە هەژارانە بوو داخ و خەفەتی ئەویشم کێشا، بەلام حەلاو دل و دەروونی دەولەمەندانە و ئەیویست هەرچیان هەیە بماندات و بەیەک ژەم بیخۆین. ئێمەش قبوولمان نەدەکرد، لەبەر ئەوە حەلاو مەشغول نەبێ و خۆی سەغلەت بکاو دەرو دراوسێکەی بزانن ئەم مالە میوانیان هەیە، بەحەمەم ووت با حەلاو ئەمرۆ بچێتەوە مالی باوکی، ئێوارە بێتەوە، ئەیوت نابێ باخواردنتان بۆ ئامادە بکا، منیش حەمەم تێگەیاند، ئەولێرە نەبێت ئێمە ئاسودە ترین، بۆیە حەلاوی نارد و ووتمان خۆشت برۆ بۆ بازار بەدەم عارەبانەو ئاردەکەتەوە.

بەر لەوە حەمە بڕوات ووتمان ئێمە ئەچینە ناو هۆدەکەی ترتان دائەنیشین، ووتی ئەو هۆدەی تر هیچی تێدا نییە، ووتمان باشتر، ووتی چاک نەکراوە، منیش سەرم ڕاکێشایە ناو هۆدەکەوە، بینیم تەختەکەی خۆل بوو بەلام تەخت کرابوو، کەمێک شرە و کەلوپەلی تێدابوو، دەرگایەکی ئاسنی هەبوو کەوتبووە تەنشت ژوورەکەی تر، بەلام دەرگای هەردوو ژوورەکە

[1] تریفە ئاواییەکی بنار چیای بالانبۆیە، نەورۆلی نشینە، ئەم ئاواییە بەقەد ناوەکەی جوانە، زێد و نیشتیمانی شەهیدان فەرەج تریفەیی، مەلابرایم، عەبدولکەریم، عومەرچاو جوان و ڕۆستەمی برای، ئاوات فەتاح، عەلی حەمەئەمین و دلاوەرە. لە دوای سالی ١٩٧٥ و لەدروست بوونەوەی شۆڕشی نوێدا، خەلکەکەی دۆست و ئەندام و لایەنگری یەکێتی و کۆمەلە بوون، لەناو پێشمەرگەدا خاوەنی چەندین تێکۆشەری گیان فیدای شەهید و هەم زیندون، بۆیە هەستم ئەکرد حەلاویش لەو بنەمالانەیە .

کەوتبوونە سەر حەوشەیەکی بچوک دیوارەکانی بەبەرد و لەتە بلۆک بە وشکەکەڵەک هەڵچنرابوون، ژووره چاک نەکراوەکەش پەنجەرەیەکی ئاسنی پێوە بوو بەبێ شوشە و بەنایلۆن داپۆشرا بوو. ووتم حەمە زۆر چاکە لێرە دائەنیشین، بەڕەیەکی هێناو لە سوچێکەوە ڕایخست و لەسەری دانیشتین، ووتم ئیتر خۆشت برۆ بەڵام نیوەڕۆ وەرەوە ئەگەر توانیت بزانە دەنگوباس چییە.

نیوەڕۆ حەمە هاتەوە بۆ لامان، ووتی یەکێتی لە هەڵەبجەدا نەماون بزووتنەوە بە ڕاست و چەپدا فرکان فرکانیانە هەرکەس بۆخۆی تالآنی مال و بارەگاکانی یەکێتی دەکەن، جەماعەتێکیش لەم سەرەوە مالآن ئەگەڕێن. نوری خێڵ حەمەیش تەسلیمی بزووتنەوە بووە. چیتر هەیە؟ دەنگوباس وایە دەڵێن چەندین پێشمەرگە شەهید بوون، خەڵک ئەیان ووت پێشمەرگەو بریندار لە مالآندان و بەدوای ئەواندا ئەگەڕین. لەم قسانەدا بووین تەقەی دەرگاهات، حەمە چووەدەرەوە، دەرگاکەی کردەوە، منیش لەسوچێکی پەنجەرەکەوە تەماشای دەرگاکە دەکەم، بینیم حەلاو هاتەووە، لەبەر خۆیەوە قسە دەکات، ووتم بابرۆمەوە بەدەم ئەو پیاوانەوە ئێستا برسیان بووە، حەلاو خۆی کرد بەژورەکەی ترداو حەمەش بۆلای ئێمە، ووتی هیچ نییە حەلاو بوو هاتەوە.

دووبارە ووتم حەمە خۆت برۆرەوە بۆ بازارو دەورێکی تر بدەرەوە، بەڵکو حەلاویش بنێریتەوە، ووتی خۆم ئەڕۆم ئەو بالێرە بێت قەیناکات، حەمە ڕۆیشتە دەرەوە، حەلاو بەدوایدا دەرگای حەوشەی داخست و هات بۆ ژوورەکەی ئێمە ووتی باشتێکتان بۆ ئامادە کەم برسیتان بووە؟ منیش ووتم هیچمان ناوێت لەودیو بێدەنگ دانیشە.

ئەو چووەوە هۆدەکەیتر، نزیک بە بانگی عەسرە دووبارە تەقەی دەرگاکە هات تەقەی نائاسایی ئەوەندەم زانی حەلاو خەریکی دەرگاکەی ژوورەکەی ئێمەیە زانیمان لەدیوی دەرەوە قوفلی کرد. ئینجا چوو بۆ پشتی دەرگای حەوشەکەو کردیەوە ئەوانەی لە پشتی دەرگاکەوە بوون پرسیان دادەگیان پیاوەکەتان کوا؟ ووتی لە بازارە، ووتیان ئیجازە هەیە سەیرێکی مالەکەتان بکەین، من کەگوێم لەمەبوو دەستم برد دەمانچەکم دەرهێناو بەئاماژە بەهەڤالەکانم ووت نەجولێن، بەسوکی پێم وتن، کەلەدەرگاکەی

ئێمەوە سەریان کێشا ئەوکات دووکەستان تەقە لەوانە بکەن و دوانی ترتان لە پەنجەرەکەوە بۆ ئەوانەی ناو حەوشەکە.

حەلاو بێ شلەژان ووتی فەرموون هاتن و دیاربوو سەریان کێشایە ژورەکەی ترونە چوونە ژوورەوە، یەکێک دەستی دایە قوفڵی ژوورەکەی ئێمەو ووتیان کلیلی ئەم ژووره کوا؟ حەلاو ووتی بەسەر چاو، لەوکاتەدا من تەماشای دەرگاکە دەکەم و ئاگام لەوە نییە بزانم ڕووخساری هەڤاڵەکانم چی پیشان ئەدا، گوێم لێبوو حەلاو ووتی براکەم کلیلەکە دیار نییە جاخۆ هیچی لێ نییە بیشکێنن.

لەوساتەدا لە دەرەوە بوو بەدەنگەدەنگ و یەکێکیان بەوانی تری ووت وەرن کاکە مادام وایە مەیشکێنن، گەڕانەدواوەو لەدەرگای حەوشەکە چوونەدەرەوە، ئاگام لێبوو دوای دەرچوونی ئەوان حەلاو بەحەپەساوی، بەناوحەوشەکەدا دەهات و دەچوو، ئەیووت یاجەدی سەیدی هانەسورە، یائەڵا، سەی ئەورەحیم ماڵی تۆیە .........تاد. دەرگاکەی کردەوە لێمان لەدڵا زۆر تورەبووم لێی لەسەر ئەوەی دەرگاکەی لەسەر قوفل کردبوین بەڵام بەخێر گەڕا، کلیلەکەش لەناو قوڵی کراسەکەیدا بوو بوو. قرەقر و شلەژانەکەی دەرەوەش ئەوە بووبوو، لە ماڵێکی خوارتری ماڵەکەی حەلاوە، پێشمەرگەیەکیان گرتبوو بە ناوی عوسمانی عەلی رەشیدی تەپەکورەیی.

دەمەو ئێوارە حەمەم بانگ کرد ناوێکم پێ ووت پرسیم ئەم کەسە ئەناسیت؟ ووتی بەڵێ ئەیناسم، ووتم بڕۆ بۆلای بیدۆزەرەوە ئەگەر خەڵک بەدەوریا بوو بیبەرە لاوە باتەنها بێت، ئەوکات پێی بڵی حەمەی حەمەسەعید لە شوێنێکە ناردوومی ئاگادارت بکەم، ئەگەر ووتی لەکوێیە بابێم بۆلای لەگەڵ خۆت بیهێنە، ئەگەر ووتیشی باشەو یان زانیت ئەترسێ، ئەوە خۆت وەرەوەو شوێنەکەی پێ مەڵێ؟

ئەوەندەی نەبرد ئۆتۆمبێلێک لەبەردەرگای دەرەوە لەسەر کۆڵانەکە وەستا، حەمە هاتەوە، لە کونی نایلۆنی پەنجەرەکەوە سەیری دەرگاکەم دەکرد، برادەرەکەشم بەدوایدا هاتە ژوورەوە، دوای چاکوچۆنی ووتی ماڵتئاوابێ چی ئەکەی لێرە؟ ووتم مەپرسە، تەکبیرمان بکە، ووتی خۆت ئامادەکە باخۆت بەرم، دڵم نەدەهات کوڕەکان بەجێبهێڵم، پرسیم ئەی ئەمان؟ ووتی ناکرێ هەمووتان بەیەکەوە، دواتر تەکبیری ئەوانیش دەکەم .

ووتم من ئامادەم، هەستاین و بەپێشمەرگەکانم ووت خەمتان نەبێت کاکە دێتەوە بەدوای ئێوەشدا.

ئەو پێش کەوت و لەپێشەوەی ئۆتۆمۆبێلەکەدا سوار بوو، قەمەرەیەکی کرۆنا بوو شۆفێرەکەی دەرگای ئۆتۆمۆبێلەکەی لکاندبوو بەدەرگای حەوشەکەوە، هەر لەدەرگای حەوشەکەوە دەستم برد دەرگای قەمەرەکەم کردەوەو سوار بووم، دەرچووین و گەیشتینە نزیک مزگەوتی شەهیدان لەسەر رێگای عەبابەیلێ، چووینە کۆلانێکەوە لە بەردەرگای ماڵێکدا دابەزین و چووینە ژورەوە، ماڵێکی چۆڵ و پاک وتەمیز، ووتی ئەمە ماڵی خۆمان نییە، ماڵی خۆمان کەمێک قەرەباڵغە، ووتم زۆرباشە، دوو برادەری خۆی بانگ کرد بۆلای من و خۆی گەڕایەوە بەدوای کوڕەکاندا. چەند ڕۆژێک لەوێ مامەوە، خەریک بوو خۆمان ئامادە بکەین بچین بەرەو هاوار، ئەو شەوەی بڕیار بوو دەرچین بەرەو هاوار، ڕۆژەکەی ئاگاداریان کردین وەفدی یەکێتی لە هەڵەبجەن لە بارەگای بزووتنەوە بڕیارماندا پێشمەرگەکان هەر لەماڵان و لە هەڵەبجەدابن، من بڕۆم بۆلای وەفدەکەی یەکێتی و خۆم بکەم بەناو ئەواندا، برادەرەکەم چوو هاتەوە ووتی نوێنەری سۆشیالیست و پارێزگاران و شیوعی و کاک عەدنانیش لەوێیە قسەم لەگەڵ کردووە و ووتویەتی بابێت، بەڵام نابێ بزووتنەوە تۆ ببینن و بزانن لەگەڵ مندا بوویت.

ئەی چی بکەین ووتی ئەوکاتە کە ئەگەڕێینەوە خۆمان دەکەین بەناو کاروانی سەیارەکانیان دا تۆدابەزە و لەگەڵ ئەواندا سەرکەوە، دەرچووین من لە دوای ئۆتۆمۆبێلەکەدا خۆم پەنادا و دانیشتم گەیشتینە بەردەرگای بزووتنەوەو جەماعەت هاتنەدەرەوە، بۆناو حەوشەو سەرجادەکە من تەنها کاک عەدنانم ئەبینی لەسەر پلیکانەکانەوە وەستابوو پلەکان بەرز بوون، کاک عەدنان گەڕایەوە بۆژوورەوە لەوێدا جەماعەتێک ویستبوویان تەقە لە عەدنان بکەن، پێم وابێ گوللەی ئارپی جی شیان روو تێکردبوو، ئەمە خزمەکانی ئەو شێخ عەزیزە بوون کەلەشەڕەکەدا کوژرابوو، لەوکاتەدا کوڕەکە هات سواری ئۆتۆمۆبێلەکە بووەوە ووتی بابڕۆین بارودۆخەکە باش نییەو کاک عەدنان چووەتەوە ژوورەوە، ئەوە مامۆستا شێخ محەمەد بەرزنجیش هاتوەتە دەرەوە قسە لەگەڵ ئەو جەماعەتە دەکات، بەڵام گوێی بۆ ناگرن. ئێمە گەراینە دواوە و ووتم یەکسەر بڕۆ بۆ ئەو بەر بەرەو سەیدسادق، هاتین کەس

ئۆتۆمۆبێلەکەی ڕانەگرت تاهاتینە گردە نازێ من لەوێ دابەزیم و برادەرەکە گەڕایەوە بۆ هەڵەبجە.

ئەو برادەرەم کاکە حەسەن عەبدوڵا مستەفا بوو، بە شێخ حەسەن ناسراوە، ئەندامی یەکگرتوی ئیسلامیە، خەڵکی ئاوایی عەبابەیلێیە.

یەکگرتـوی ئیسـلامی لە ڕۆژی ٢/٦ سـاڵی ١٩٩٤دا خـۆی وەک حیزبێکـی ئیســلامی ڕاگەیانـد، ئەمینـداری ئەم حیـزبە نـوێیە مامۆسـتا سـەلاحەدین بەهـائەدین هەورامـیە، لە بـنەچەدا خەڵکـی ئـاوای دزئـاوەری کوردسـتانی ڕۆژهەلاتە.

کـاتی ڕاگەیانـدنی ئەم حیـزبە بـارودۆخی هەرێمـی کوردسـتان و بەتـایبەت نـاوچەی هەڵەبـجە و هەورامـان، لە بەر شــەڕی نـاوخۆ ئاسـایی نەبـوو، لە سەرەتاوە من بۆخۆم نەک وەک یەکێتی بەگومان بووم لەم حیزبە، ئەوەندەش پێم کرا دژایەتیم کردن، چوونکە پێم وابوو ئەمانە کۆپی ئیخوانن و زادەی وەهــابییەتن، باوەڕیــان بە دەســتەلاتی ئیســلامی هەیە بە دژی ئــازادی ،دیموکراسی، نەتەوە و کۆمەڵگەی مەدەنی. بڕوام وابوو هەرچەندە سەرەتا واخۆیان پیشان ئەدەن ڕێکخستنێکی ئیسلامی مەدەنی و مۆدێرن و ڕیفۆرم خوازن و باوەڕیان بەچەکداری نییە، ئەوە تـاکتیکە، دواجـار کە بەهێزبـوون خۆیان چەکدار ئەکەن.

بزووتنەوەش دژیان بوون، ئێمە ئەودەمانە کەلەگەڵ بزووتنەوە چاوپێکەوتن و کۆبوونەوەمان ئەکرد، بۆمان دەرکەوت هەڵوێستێکی خراپ و توندیان هەیە بەرامبەر بە یەکگرتوو. دژایەتی و ترسی من لە یەکگرتوو، ئەوەبوو سەرەتا مزگەوتەکانیـان بەکـار ئەهێنـا بـۆ ڕاکێشـانی جەمـاوەر بەلای خۆیانـدا، جگەلەوەش لە کـاتی گرانـی و بـارودۆخە نائاسـاییەدا هاوکـاری و دەسـتی کۆمەکی وولاتانی ئیسلامیان بۆ کورد، لەڕێگای پڕۆژەکانی دروست کردنی مزگەوت و هەتیوانە و هەژارانە و بێوەژنـانە و ......تـاد، خسـتبووە خـزمەت فراوان کردنی لایەنگران و ئەندامان و دەنگ دەران بۆ خۆیان.

شـێخ حەسـەن ئێسـتا بەرپرسـی مەڵبەنـدی هەڵەبـجەیە، پێشـتر ئەنـدامی ئەنجـومەنی پارێزگـای سلێمانی بـوو، ئەوکـات خزمەتـی باشـی بە شـاری هەڵەبـجە کـرد، بەبـێ گوێـدان بە بیـری تەسـکی حیزبـایەتی. نـاوبراو لە نوسراوێکی دا سەبارەت بە یەکگرتو ئاوا دەنوسێت:

(١٩٩٤/٤/٦ ئەو ساتە وەختە بۆ ڕاگەیاندن زۆر سەخت بوو بۆ یەکگرتو، چوونکە شەڕی ناوخۆی نێوان یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامی بوو، لەو ڕۆژانەدا بزووتنەوە شکستی هێنابوو سەرکردایەتیەکەی لەسەر ئەشکەوتان گیرابوو، بەلام یەکگرتو ناچار بوو چوونکە ڕیگەی تری نەمابوو، یەکگرتو لەسەر بنەمای باوەڕی بەدەوڵەت و دەستەلاتی مەدەنی و دیموکراسی خۆی ڕاگەیاندبوو، نەک دەوڵەت و دەستەلاتی دینی یان ئاینی و خەلافەت و مێژوو. ............ هەلومەرجی کوردستان ئەوکاتە لەباربوو بۆ دووبارە بوونەوەی دروست بوونی ئەفغانستانێکی تر لە شاخ و چەکداری ئیسلامی و بیری توند و پشتیوانی کردنیان لەدەرەوە...هتد،

بەلام ڕاگەیاندنی یەکگرتو هەموو ئەو هەولانەی لەبار برد..... یەکگرتو ناچار کرا بەشداری حکومەتی پاش ٣١ ئاب بکات، یەکگرتو کوردستانی بوون و کوردایەتی خستە پێشی خۆی لە هەموو هەنگاوەکانیدا مام جەلال شاهیدی بۆ دان، حیزبە ئیسلامیە عیراقیەکانی بەجێهێشت لەبەر حیزبە کوردیەکان، لەپێناو پاراستنی هەرێمی کوردستان و دابین کردنی سەربەخۆیی بۆ کوردستان).

ماوەیەک دوای ئێمە کاک عەدنان و وەفدەکە گەڕانەوە بۆ سەیدسادق.

دوای ئەوەرێککەوتن کرایەوە لەگەڵ بزووتنەوە، بەلام بەشێکیان هەر پابەند نەدەبوون بەرێکەوتنی نێوان بزووتنەوەو یەکێتیەوە، لەوانە هێزی دووی سۆران، مەڵبەندی ٨ هەشتی کەرکوکی بزووتنەوە، ئەم مەڵبەندە بارەگای لە شارۆچکەی خورماڵدا بوو، لە مانگی٤/١٩٩٧دا دەستیان کرد بەڕاونانی ئەوکەسانەی دۆست و لایەنگری یەکێتی بوون.

هەروەها دەرکەوتایە هەرکەس پەیوەندی هەیە بە یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە، دەبوو بڕی ٥٠٠٠ پێنج هەزار دیناری سویسری بدات بەو مەڵبەندە، دوای ئەوەش کەفالەتی ٥٠٠٠ پێنج هەزاری تری لێ وەرئەگیرا لە ناو کەفالەتنامەکەدا ئەنوسرا نابێت فلانەکەس بەهیچ شێوەیەک نە بە نهێنی نە بەئاشکرا پەیوەنی بەحزبە عیلمانییەکانەوە هەبێت، ئەگەر پەیوەندی هەبوو ئاشکرا بوو ئەوە بڕی ٥٠٠٠ هەزاری تری لێ ئەسەنرێ .

سەبارەت بەم بابەتە قسەم لەگەڵ مامۆستا مەلاعەلی رابەری کشتی بزووتنەوەی ئیسلامیدا کرد، سەرەتا ووتی شتی وا چۆن دەبێت؟ ووتم مامۆستا دەقی کەفالەت نامەکانم لایە، داوای کرد وێنەیەکی لەو کەفالەت نامانە بۆ بنێرم، منیش دەقی ئەم وێنەیەم بۆ نارد.

بسم الله الرحمن الرحيم

| | |
|---|---|
| بزووتنەوە ئیسلامی | ژمارە: ١٤٤ |
| لەکوردستان/عێراق | بەروار؛/ / ١٤١ |
| مەڵبەندی٨ی کەرکوک | ١٩٩٧/٥/١ |

بۆ/ -

ب/کەفالەت

السلام عليكم ورحمةالله وبركاته

من کەناوم مەجید ئەحمەدە، ئەبم بەکەفیلی ئیبراهیم عەلی سابیر کەبەهیچ شێوەیەک نەبەنهێنی و نەبەئاشکرا پەیوەندی بەهیچ لایەنێکی عیلمانییەوە نەکات، وەئەگەر بەپێچەوانەوە دەرچو ئەوا بڕی ٥٠٠٠ هەزار دینار تەسلیم بەمەڵبەند بکەم.

کەفیل/ مەجید ئەحمەد     ئیبراهیم عەلی سابیر     لپرسراوی مەڵبەند/ ئیمزاو مۆر

## گەردەلولی تۆڵەی دووەم١٩٩٧/١٠/١٣

دوای شـــەڕەکانی بـــزووتنەوە بارەگـــای فەرمانـــدەی ٦شەشـــی شارەزوورمان بردەوە بۆ سەراوی سوبحان ئاغا. فەرماندەی شارەزوور یەکێک بوو لە فەرماندەییە گەورە و بەهێزەکانی یەکێتی نیشتیمانی، هێزەکانی سەر بەم فەرماندەییە، تۆکمە و شەڕکەرو گوێرایەڵ بوون.

لە سـەرەتای مـانگی ٩نۆی سـاڵی ١٩٩٧تەوە لەلایەن مـام جەلالەوە کۆبوونەوەی فەرماندەی گشتی سەبارەت بە بارودۆخەکە ئەنجام درابـوو، کاک جەباریش دوای ئەو کۆبوونەوە دەستی کرد بەکۆبوونەوە کردن لەگەڵ فەرماندەییەکان و هێزەکان و ئۆرگانەکانی سەربە فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان.

ئەمە خۆ ئامادە کردن بوو بۆ لێدانی پارتی، لێدانێکە بەشێوەیەک بێت پارتی مل بدات بۆ ئاشتی، بەرنامەکە بەم شێوە دانرابوو: دوا کۆبـوونەوەی فەرماندەیی گشتی لە ڕۆژی ١٩٩٧/١٠/٩ لە قەڵاچوالان ئەنجام درابـوو، لەو کۆبوونەوەدا نەخشەی ئۆپەراسیۆنەکەی گەردەلولی تۆڵەی دووەم دانرابوو. بڕیار بوو بەشی زۆری ئەو هێزانەی بەشداری دەکەن لەو ئۆپەراسـیۆنەدا پێشتر بڕۆنە ڕانییە لەوێ مـانۆڕێکی گەورەی سـەربازی ئەنجام بـدرێت و دوای مانۆڕەکە هێزەکان بۆ شەوەکەی بچنە شوێنەکانی خۆیان، کـاتژمێری سفر ٢دووی شەوی ١٢لەسەر١٩٩٧/١٠/١٣ بوو، بەناوی گەردەلولی تـۆڵەی دووەم. ئەم ئۆپەراسـیۆنە گەورەو گـران بـوو، لە کـاتی دیـاری کـراودا لە چەنـدین قـۆڵەوە هێرشـەکە ئەنجـام درا، بەم شـێوەی لای خـوارەوە: قـۆڵی سماقوڵی زیارەت بە سەرپەرشتی عومەر عەبدوڵا و مەحمود سـەنگاوی و چەنـدین فەرمانـدەی تـر. قـۆڵی چۆمـان حـاجی هـۆمەران بە سەرپەرشـتی موحسن بایز و حەمەی حاجی قادر و چەندین فەرماندەی تر.

قۆڵی بالیسان خەلیفان، بالیسان زینەتیر شـەکرۆک، بالیسـان سپیندارا‌ن شاخە سور، بالیسان کەپکی حەمە ئاغا بەنی هەریر. بە فەرماندەی جەبـار فرمان و چەنین فەرماندەی تر لەوانە، عومەر فەتاح، عوسمان حاجی مەحمود،

مستەفای سەید قادر، عەدنان، مەلانەجم، عەبدولابۆر، مامۆستا مەهدی، ئاریز عەبدولا، من خۆم لەقۆلی بەنی هەریر بووم لەگەڵ کاک جەبارو عەدنان.

قۆلی هیران شەقلاوە، هیران چیای سەفین، بە سەرپەرشتی کاک کۆسرەت، شێخ جەعفەرو چەندین فەرماندەی تر. قۆلی کۆیە دێگەلە بەسەرپەرشتی کاک ئەرسەلان بایز و بورهانی سەعید سۆفی و چەندین فەرماندەی تر.

لەم ئۆپەراسیۆنەدا پارتی شکا و هەڵهاتن هەڵهاتنێکی کەم وێنە، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا حەوزەیەکی بەرفراوانی بەجێ هێشت و قەڵەمرەوێکی زۆر کەوتەدەست یەکێتی، لەلای قۆلی بالیسانەوە، کەپکی حەمە ئاغا و بەنی هەریر شاخەسور و کلاو قاسم و زینەتیر و زەرتکان و گوندەکانی دۆڵی ئالانەی تاگوندی بناوێ و چیای ئیرۆن گیران. لە هەموو قۆڵەکانەوە مەساحەی زۆر لەمەی بالیسان زیاتر گیرا، لەوانە لە قۆلی سماقولیەوە دۆلی هەرمێ و قۆپی سوسێ و دۆلی بێرۆکەو ناودارۆکان وسەری بنەباوێ و گوندی سوسی و داری حەمە گیران.

لە قۆلی هیران شەقلاوەوە، زورکی هیران و سەری هیران و گردی جاسوسان و دارەبەن و گردی گەورەو کەپکی شیلانە لەگەڵ کەپکی حاجی سالح و کەپکی گەرۆتە و ناولانک و گردو لوتکەکانی چیای سەفین گیران. لەقۆلی چۆمانەوە شاخە شێخ ناسر و خانۆل و وێلزێ و سۆرەبان و کۆلیتار و کۆلانە فاتان و زنجیرە چیاکانی دێزیلە و درەبی و سەری باڵەک و هەموو ئاواییەکانی دۆلەکانی خانەقاو وەرتێ و تا ئەگاتە حافز، قۆپ و شاخی سەری کێل و زینی ماویلیان و سەری ڕولاو و شاخی سور و کۆخان و ساکۆت و زینی گۆران و چیای مامەروت و شارۆچکەی قەسرێ گیران، لەم بەرەیەدا هێزێکی پەکەکە بەشداری کرد. ئەو بەشداریەیان بوو بەهۆی ئەوەی بیانو بدرێتە دەست تورک زووتر بێن بەدەم داواکەی پارتییەوەو فریایان کەون.

چوونکە پارتی بۆ خۆگرتنەوەو بەرگری پەنای بردە بەر دەوڵەتی تورکیا، تورکیش بەهانایانەوە هات و بەشداری کردەی کرد، بەهێزی هەوایی زەمینی و تۆپخانە، یەکەم هێرشی تورک لە قۆلی چۆمان حاجی هۆمەران بوو، لە ڕۆژی ١٣/١٠/١٩٩٧دا دەستی پێکرد، لەو هێرشەدا دۆلی خانەقای بە فڕۆکە جەنگیەکانی بۆمباباران کرد، لەو ڕۆژە بەدواوە هێزەکانی ئاسمانی

تورک شەو ڕۆژ بەردەوام بوون لە لێدانی هەموو بەرەکانی شەڕی یەکێتی لە حاجی هۆمەرانەوە بۆ گۆمەسپان.

ڕۆژانی دواتریش جگە لە هێرشە هەوییەکان هێرشی زەمینیشی کردە سەرمان بەهێزی کۆماندۆ و بەپاڵپشتی تۆپ و تانک دوای زیانێکی زۆری گیـــانی لەرۆژی١٩٩٧/١١/١٩دا ئـــێمەی گەڕانـــدەوە ئەو شـــوێنانەی بەرلە١٩٩٧/١٠/١٢ لێی بووین.

بـابێمەوە بۆلای بیرەوەریەکانم لەگەڵ گەردەلولی تۆڵەو نەعرەتەو هاڕەی بۆمبا هاوێژەکانی تورک لەچیای بەنی هەریر و چەقەڵی سپی، دوای تەواو بوونی نمایشی هێزەکان لە مانۆڕەکەی ڕانیەدا، هێزەکانی فەرماندەی ٦ شەشمان گواستەوە بۆ دۆڵی بالیسان، هەر فەرماندەیەک ئەو جێگەی بۆی دیاری کرابوو، پێشتر چەند جارێک بە پارتیزانی و بە شەودا چووبوون بۆ شناسای و ئاشنابوون بە شوێنەکان، هەندێکیان بە ڕۆژدا مابوونەوە.

هێـزەکەی شـارەزوور کـرا بە دووبەش بەشـێکی وەک پشـتیوانی (یەدەک) دانرا، بەشێکیشی بۆ پەلاماردانی کەپکی حەمە ئاغا، سەر لە ئێوارەی ڕۆژی ١٠/١٢دوای تاریک بـوون وردە وردە نزیک بـووینەوە، تـاریکی کرد خۆمان گەیاندە سەرەتای ئەو دۆڵەی ئەکەوێتە لای ڕاستی زینەتیر بەرامبەر بە ئاوایی بلەێی ئەودیو ئاوایی خەتێ، لەوێوە سەر دەکەوی بۆ کەپک و بەنی هەریـر، ڕۆژی پێشـتر دوو دەسـتە پیشـمەرگە چووبـوونە نـاوقەدی چیـاکە لەئاست گوندی تالاوا. بۆ ئەوەی ئەو هێزەی پارتی لە کەپک هەڵدێن بەرە و بەنی هەریر لەو نێوانەدا بەریان لێبگرن، ئەو دوو دەسـتە وایـان کردو دوو ئۆتۆمبێلیشیان گل دانەوە، ئەو هێزەی پارتی لە کەپک و بەنی هەریر سوپای ٧حەوت بوو، ئەو سوپا بەتەواوی لەو شەڕەدا هەڵوەشایەوە.

دەمەو بەیان کە پەلاماری کەپک درا، دوای بەرگریەکی کەم هەڵهاتن و شوێنەکانیان بەجێهێشت، بەرەو بەنی هەریر، لە ڕێگا ئەو کەمینانەی ڕۆژی پێشتر چووبوون لێیان دان ئەوەندەی تر ورەیان بەردا و بەنی هەریریشیان بەجێهێشت تائاستی گوندی ئالانە. کە ڕۆژ بووەوە ئێمە لەگەڵ کاک جەبـار گەیشتبووینە جێگەیەک دەشتای و شوێنی سـەربازگە بـوو، ئەکەوتە نێوان بەنی هەریر و چەقەڵی سپی، چەقەڵی سپی چەند ڕەبیەیەکی لێ بـوو، ئیتر لەوێوە جادەیەکی پێچاوپێچ ئەڕواتە خوارەوە بۆ سپیلک، دوا ئامانجی ئێمە

سپیلک بوو، بڕیار بوو ئەگەر شەقلاوە لە قۆڵی هیرانەوە گیرا، دوای ئەوە لە هەنگاوی دووەمدا ئێمە شۆڕبینەوە بۆسەر سپیلک، بەڵام ئەوە ڕوینەدا.

لە خوارەوە چ لە دۆڵی بالیسان خەلیفانەوە، چ لە دەشتی باسرمە هەریرەوە تەماشای سەر چیای کەپک و بەنی هەریر دەکەی وا دێتە بەر چاو لە زینەتیرەوە تا پشتی سپیلک تیخەشانێکە تەسک و باریک. بەڵام کە ئەچیتە سەر شاخ دنیایەکی بەرین و بەرفراوان، دەیان دۆڵ و لاپاڵ و نزار و خۆرەتاو و گرد و تەپۆلکە و دەشت و پانتای داپۆشراوە بە داری چڕی داربەڕو گوێژ و بەلاڵوک، لەوەڕگە و مەڕتەعە، بەڵام وشک و بێئاو.

ڕووبەرێکی پان و بەرینی سەر ئەو زنجیرە چیایە کە دەیان ڕەبیە و مەقەڕی پارتی لەسەر بوون، چۆڵکران بێ ئەوەی فشارێکی ئەوتۆیان لەسەر بێت، پێشمەرگە ڕووی دەکردە هەر جێگەیەک ئەوان هەڵدەهاتن، من لەگەڵ کاک جەباردا بووم، ڕاست بەجادەدا ئەڕۆیشتین، دەورووبەری کاتژمێر ١٢دوانزەی نیوەڕۆ بوو گەیشتینە، ئەم بەری ئەو دەشت و سەربازگەی کە برێک تانکەر و شۆفل و ئالەتی ڕێگاوبانی لێ بوو. ئەوبەریشمان چەقەڵی سپی بوو، لەوێ دانیشتین بە دووربین کەووتینە چاودێری ناوچەکە.

تەنها چەکێکی دژە هەوایی لەوسەری چەقەڵی سپی تەقەی دەکرد بەسەر ئێمەوە گوللەکانی بە هەواوە ئەتەقینەوە، لەبەر بەرفراوانی ناوچەکەو بەربڵاوی بەرەی شەڕەکە، هێزەکان لەکەپکی ئەحمەد ئاغاوە تا ئەو جێگەی باسم کرد ونبووبوون، تەنها هێزێکی فەرماندەیی شارەزوور لەگەڵ کاک عەدنان دا وەک یەدەک بەجادەدا هاتبوون و بڵاوەیان نەکردبوو گەیشتنە پێشەوە، لەوکاتەدا کاک مستەفای سەید قادریش لە ئاست ئێمەدا بووبوو، لە دەستی چەپەوە، کاتێک پێمان زانی گەڕایەوە بەدەم و چاوی بریندار و خوێناویەوە، بەهۆی پارچەی دژە هەواییەکەوە بریندار بووبوو، لەدەستی ڕاستەوە هێزێکی شارەزوور چوونە خوارەوە بۆ ناو دۆڵەکە، دەستەیەک پێشمەرگەی پارتی لە ڕووی دۆڵی ئالانەوە مابوونەوە تەقەیان لەوهێزە کردو کاک بەمۆ هاواریان بریندار کرد.

لەسەر بەنی هەریر ڕۆژی یەکەمی هێرشەکە تاکوێ گەیشتبووین لەوشوێنەدا ماینەوە ئەمان توانی زیاتر بڕۆین، کاک جەباریش ئەیووت با لەسەریان نەوەستین، لەوکاتەدا کاک مەلانەجم و کاک ئارێز عەبدوڵا و

مامۆستا مەهدی هاتنە لامان، بەڵام جگە لە کاک عەدنانی حەمەی مینا کەسی تریان نەک هێز پاسەوانەکانی خۆیشیان بە تەواوی لەگەڵدا نەهاتبوون، هەموو بڵاو بووبوونەوە، کاک جەبار خۆی تورە کرد لەسەر ئەوە بۆ هێزەکانتان دیار نییە، کاک مەلانەجم وەڵامی دایەوە ووتی هێزەکان لە ئێوارەوە بەڕێوەن دوای ئەوە لە شەڕدا بوون، دواتر ووتی تۆ ئەزانی ئێمە لە کوێوە بۆکوێ ناوچەکەمان کۆنترۆڵ کردووە؟ خۆ دەبێت بزانی قۆڵەکانی تر چیان کردووە، ئەمە هەنگاوی یەکەم بووە ئەبێ بۆ هەنگاوی دووەم هێزەکان ڕێک خەینەوە. من پێم ناخۆش بوو، کاک جەبار لێیان توورە بوو، لە ڕاستیدا پیاوی بە هیمەتی وەک مەلا نەجم حەیف بوو نیگەرانی کەی.

لە١٠/١٤ لە دۆڵی ئالانەوە هێزەکان نزیکی خەلیفان بوونەوە، لەلای ئێمەشەوە لەسەر بەنی هەریرەوە هێزێکی پێنجوێن پەلاماری چەقەڵی سپی و دەوروبەری داو گیرا، ئەو هێزە زاڵبوون بەسەر سپیلکدا، دواتر فڕۆکە جەنگیەکانی تورک لەو هێزەی داو نزیکەی ٢٠بیست شەهیدو بریندااری لێکەوتەوە، یەکێک لە شەهیدەکان فەرماندەی هێزەکە شەهید شێخ حوسێنە سوربوو، سێ پێشمەرگەش هەر لە هەڤالانی سنوری پێنجوێن هەمان ئێوارە شەهیدبوون بەناوەکانی حسێن جامانەو دوو برای تر بەناوەکانی حەسەن و حسێن خەڵکی ئاوایی خاوخەنانی دۆڵی شلێر بوون.

لێدانی فڕۆکەکان بۆ ئێمە لەناکاو بێئاگابووین، ئەوەبوو شپرزیان کردین بۆیە پاشماوەی هێزەکە لەچقەلی سپی گەرایەوەو پارتی هاتەوە ناو چقەلی سپی. لەگەڵ ئەمەدا لەقۆڵی حاجی هۆمەرانەوە ناوچەی نێوان گلاڵە چۆمان گیراو پارتی لەو قۆڵەوە کشانەوە بەرەو رایات. لەقۆڵی لای چیای شەکرۆکیشەوە فەرماندەی کەرکوک ناوچەکەیان ڕامالی و گەیشتنە سەر ڕێگای گشتی شەقڵاوە هەریر، شەوی ١٠/١٥ دوبارە فڕۆکەکانی تورک بە چڕی سەری بەنی هەریر و دۆڵی ئالانە و بالیسانیان بۆردومان کردەووە.

لە١٠/١٧دا لە هەموو قۆڵەکانەوە شەڕ هەبوو پارتی باڵەکایەتی بەجهێشت کشانەوە بەرەو ڕەواندز، ئەمڕۆ پارتی و یەکێتی شەڕیان ڕاگرت لەسەر داوای ئەمریکاو بەریتانیا. لەگەڵ بەردەوامی گەردەلولی تۆڵەدا هەوڵەکانی ڕاگرتنی شەڕو ئاگربەس بەردەوام بوون، لە ڕووی دیپلۆماسییەوە، مام جەلال، کاک دکتۆر بەرهەم، کاک شادزاد سائب درێغیان نەکرد بە تایبەت بۆ

تێگەیاندنی دۆستانی کورد، دکتۆر بەرهەمیش بۆ تێگەیاندنی ئەمریکیەکان، بۆ ئەوەی هەوڵی خۆیان بخەنەگەڕ و فشار لەسەر تورک دروست بکەن، سەرئەنجام سەرکەوتوو بوون لەو بارەوە، ئەوەبوو مام لەگەڵ دیڤدویڵش قسەی کردبوو، دیڤدیش لەگەڵ تورکەکان هەوڵی داو ئەنجامی سەرەتایی ئەوەبوو تورک داوایان کردبوو با یەکێتی بۆردومانی سەر سەرکردایەتی پارتی لە سەری ڕەش ڕاگرێ و کارەبای هەولێر بکەنەوە ئێمەش بۆردومانی فڕۆکەکەن ڕائەگرین. ئەوەبوو لەو بارەوە مام جەلال بروسکەیەکی بۆ هەموولا کرد، بەم دەقە:

( لە/ مام جەلالەوە بۆ/ هەمولایەک، دوای سڵاو

دوێنێ تورکە پەلامار دەرەکان بەهۆی ئەمەریکاوە داوایان کرد کەئێمە واز لە بۆردومانی سەری ڕەش بهێنین و ئەوانیش واز لە فڕۆکە هەڵسان و بۆردومان کردنمان بهێنن. بەمەش توانیمان بەهێزی خۆمان دووژمنی تۆرانی ناچار بکەین واز لەلایەکی دوژمنایەتییەکەی بهێنێ هەروەک دەریش کەوت ئەوەیان بۆ فریاکەوتنی جاشەکانیان کردووە).

بەلام پارتی ڕایگەیاند شەڕ ڕاگرتنەکەیان بۆ ماوەی ٣ سێ ڕۆژ دەبێت، ئەوەبوو دوای ٣ سێ ڕۆژەکە شەوی ١٠/٢١ لە قۆڵی شەقڵاوەوە هێرشی کردە سەر هێزەکانی یەکێتی، بەلام هیچیان پێنەکرا. لە ڕۆژی١٠/٢٢دا هێرشیان کردە سەر چیای سەفین و هەرهەمان ڕۆژ پەلاماری گوندی دەرگەڵەیان دا. لە ڕۆژانی ٢٣و ٢٤دا چەندین جار فڕۆکە بوومب هاوێژەکانی تورک بۆمب بارانی قۆڵەکانی ترو ئێمەشیان کردەوە لەبەنی هەریرو کەپکی ئەحمەد ئاغاو دۆڵی بالیسان و تالاوا دا.

لەم ڕۆژانەدا و دوای بۆمب باران کردنی چەقەڵی سپی لەلایەن فڕۆکەکانی تورکیاوە، سەر لەئێوارەیەک لە بەنی هەریردا خەریکی ئامادەکردنی نان بووین لەگەڵ چەند هەڤاڵێک، کۆبوبووینەوە لە دەوری ئاگرێک، ئەو ئێوارە ماسی تونامان گەرم دەکردەوە. خەلیل ڕیشاوی ڕادیۆکەی کردبووەوە، لەسەر ڕادیۆی پارتی بوو، هەواڵەکانی بەرەکانی شەڕی ئەو ڕۆژەی بڵاو دەکردەوە، هەموو بێدەنگ گوێمان ڕادەێرابوو،

سەرتا لە بەرەی بەنی هەریرەوە دەستی پێکرد و ووتی: (لەپەلامارێکی هێزەکانمان دا لەسەر چیای بەنی هەریر بۆسەر جاش جەلالیەکان ناوچەکەیان لێ پاککرایەوەو بەدەیان کوژراویان لێ بەجێ ماوە کە لاکی کوژراوەکانیان لەژێر دەستی پێشمەرگەکانی پارتیمان دایە، کەلاکی یەکێک لە کوژراوەکان حەمەی حەمەسەعید بەرپرسی فەرماندەیی هەورامانە).

برادەرەکانم هەموو تەماشایەکی منیان کردو هەندێکیان دایانە قاقای پێکەنین، منیش یەکسەر کەووتمە بیری ئەوە ئێستا دایکم گوێی لێ ئەبێ و سەکتە دەکات، چی بکەم بەزوترین کات قسەی لەگەڵدا بکەم. دەستم ناگاتە جیهاز لە خوارەوەیە. بەڵام کاک عەدنان بە بروسکە مەڵبەندی شارەزوور و کۆمیتەی هەورامانی ئاگادار کردبوو پێی وتبوون ئەو هەواڵە درۆیە. منیشیان ئاگادار کردەوە بەیانی بچمە خوارەوە بۆ گوندی تووتمە لە دۆڵی بالیسان تا لەوێ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان چاوپێکەوتنم لەگەڵدا بکات.

بەیانی هاتمەخوارەوە گەیشتینە سەرجادە لە ئاستی ئاوایی خەتێدا لەوسەرەوە کۆمەڵێک پێشمەرگە هاتن و گەیشتنەلامان و خەریکی چاکوچۆنی بووین لەگەڵیاندا، لەوکاتەدا چەندین بۆمب لە نزیکمانداو لەبەرو پشتی جادەدا زەویەکەیان هەڵتەکاند و ئینجا فرۆکەکان دەنگیان بەردایەوە، پێشمەرگەکان دوای ئەوە رایان دەکرد بۆ ژێر ئاوەرۆیەکی جادەکە، منیش بانگم کردن ئەوان دەمێکە لە سەرمان ئاوابوون بۆ کوێ بگەڕێنەوە؟ پێشمەرگەیەک هاتبووە خوارەوە لەگەڵما بە ناوی میران مەحیەدین خەڵکی تەوێڵە بوو لە پەنامدا ڕاکشابوو، ووتم هەستە میران تەیارەکان گەیشتنەوە تورکیا تۆ خۆت داوە بەزەویدا، ووتی ناتوانم، بۆ ناتوانی؟ نازانم، چوومە لایەوە دەستیم گرت ڕاستی کەمەوە هاواری بەرز بووەوە، ئەبینم هەردوولاقی بەرکەوتوون، خۆیشم قۆڵم گەرم بوو، یەکێک لەولاوە هات ووتی کاک حەمە خۆشت بریندار بووی، چوومە کەنار جادەکەوە پاڵتۆکەم داکەند و بینیم ساچمەیەک چوەتە ناو ماسولکەی قۆڵی چەپم و دەرنەچووە، بۆیان بەستم و ووتم میران هەڵگرن باکەمێک نزیکی بکەینەوە، یەکێک بەپەلە چوو ئۆتۆمبێلمان بۆ بهێنێ، دووکەس بەدیار میرانەوە دانیشتن و ئێمە چووین بەرەو بارەگای (خەلفی) پشتی بەرەی شەڕ لە تووتمێ.

لەوێ چاو پێکەوتنە تەلەفزیۆنییەکەم کرد، دوای ئەوە چووینە چادری نیاارەی فەرماندەییەکەمان، بۆ پشوودان هەردانیشتین و ووتیان کاک حەمە میوانت هات هەستام چووم بە پیریانەوە ئەبینم دایکم و کۆمەڵێک پیاوی هەورامین، دایکمم بینی تەزویەک گرتمی، بۆ ئەو هەموو خەم و خەفەتەی ئێمە داومانەتێ.

دایکی هەموو پێشمەرگە و تێکۆشەرەکان ئەوە بەشیان بووە، وای بەحاڵی ئەودایکانەی بە شەهدیش تەرمی کوڕەکانیان نەدی تا ماچێکی ڕوومەتی ساردۆبوی سپی هەڵگەڕاویان بکەن، هاوار بۆ ئەو دایکانەی نازانن مەزاری کوڕە شەهدەکانیان لەسەر کام دوند و کام داوێن و ناو کامە لێرەواردا قەلوداڵ خواردنی، هاوار سەد هاوار بۆئەو دایکانەی جگەر سوتاو دەرون قرچاو سەرو سیما چرچ و لۆچ رەش هەڵگەراون، هاوار بۆ کزە و چزەی زامی دڵی ئەو دایکانەی گەردنی کوڕەکانیان بینی لەژێر چەقۆدا بەجلی پرتەقالیەوە.

بە پێکەنینێکی تەزویرەوە بەرەو پیری دایکم چووم، کاتێک دەستم بۆ درێژ کرد تادەستی بگرم کەوتە سەرزەوی، نەم ئەزانی پەلاماری دایکم بدەم لەسەر زەویەکە هەڵی گرمەوە یان چاکو چۆنی لەگەڵ پیاوەکان بکەم، باوەش گرتنەوە بۆ دایکم و هەڵگرتنەوەیم لە پێشتر زانی تا عەلی مامەیارە و چەند هەڤاڵێک لەدەستیان سەندم و بەباوەش بردیان بۆ چادرەکە، منیش لام کردەوە بۆلای میوانەکان و بەخێرهاتن و دەست ماچێنمان تەواو کرد وچووین بۆلای دایکم، هاتەوە هۆش و دوو ڕۆژ لامان مایەوە سەرەرای بەدرۆ خستنەوەی هەواڵەکە بەپەیامی جیهازی و ڕادیۆی و تەلەفزیۆنی، ئەو دوو ڕۆژە سەدان کەس لەخزمان و دۆستان و ئەندامانی حزبی و کەسوکاری پێشمەرگە قەرزار باریان کردین بەهاتنیان لە هەورامان و هەڵەبجە و شارەزوور و سلێمانییەوە بۆ دۆڵی بالیسان .

لە ڕۆژی ٢٦/١٠/١٩٩٧دا پارتی لە چەندلاوە لە قۆڵەکانی ترەوە بە پشتیوانی فڕۆکەو تۆپخانە هێرشی کردە سەر سەنگەرەکانی یەکێتی، لەوانە بۆ ناوچەی باڵەکایەتی، بۆ سەرچیای بنەباوێ، بۆ شاخە سور و زەردکانی نزیک کلاو قاسم. هاوکات لەگەڵ ئەم پەلامارانەی پارتیدا، هێزێکی فەرماندەیی شارەزوور لەسەر چیای بەنی هەریرەوە چووە خوارەوە بۆ سەر هەردوو

گوندی سیساوا و باویان و دەستیان بەسەردا گرتن و بارەگای ڕێکخراوی پارتیان لە شارەدێی سیساوا سوتاند، بەیانی سەرکەوتنەوە بۆسەر شاخ، لەم هەڵمەتەدا پێشمەرگەیەکی دێرین فەرماندە کەرتێکی ئازا خەڵکی ئاوایی سۆسەکانی ناوچەی هەورامان بەناوی نەوشیروان ئەبوبەکر بووە قوربانی و تەرمەکەشی بەجێما. لە٢٨ و٢٩ی مانگدا جاریکیتر فڕۆکەگەلی تورک بووردومانی هێزەکانی یەکێتیان لە شاخەسورو زەرتکان و لە دۆڵی سماقوڵی و سەری سەفین و ئاواییەکانی سماقوڵی گەلی و ئاقوبان و چیای گوشینەدا کردەوە.

لە ڕۆژی ١٩٩٧/١٠/٣٠ پارتی بە پشتیوانی فڕۆکە و تۆپخانە و تانک سێ هێرشی کردە سەر هێزەکانی فەرماندەیی شارەزوور بۆسەر چیای گوربە شیلانە لە زنجیرە چیاکانی بەنی هەریرو هەر سێ هێرشەکەیان تێک شکێنراو دوای تێک شکانەکە فڕۆکەکەنی تورک زۆر بەچڕی بەرزاییەکانی چەقەڵی سپی و زنجیرەی بەنی هەریریان بۆردومان کردەوە، لەم بووردومانانەدا چەندین پێشمەرگە شەهید و بریندار بوون، لەمەو بەر لەناو رەبیە کۆنەکان و بن بەردو ناوبنگەڵە دار بەروە چڕەکاندا خۆمان ئەشاردەوە لە فڕۆکەکان، بۆیە لەدوای ئەم بۆردومانانەوە دەستمان کرد بە سەنگەر هەڵکەندن و قایم کردنی زنجیرەی بەنی هەریر.

لە ڕۆژی ١٩٩٧/١١/١دا هێزێکی مەڵبەندی شارەزوورو فەرماندەیی گەرمیان پەلاماری چیای بنەباوێیان داو دەستیان بەسەر ١٢ دوازدە ڕەبیەی پارتیدا گرت، لە ڕۆژی ١١/٣دا هێزی پێشمەرگە هێرشی کردە سەر زینی ماویلیان، قۆپی چەورێ، بناری چیای هەندرێن، زنجیرەی تاور و زنجیرەی ڕۆڵەی و هەموو ئەو شوێنانەیان کۆنترۆڵ کرد لەم هێرشەدا بە تەواوی دۆڵی ئاکۆیان پاک کرایەوە، لە١١/٤دا پارتی چوار جار هێرشی بۆسەر قۆڵی باڵکایەتی کردەوە لەوێ سەرکەوتوو نەبوون بۆیە شەوی١٩٩٧/١١/٥ دەستیان کردەوە بەتۆپ بارانی ئێمە لەسەر زنجیرە چیای بەنی هەریر تابەیانی بەردەوام بوون.

لە ڕۆژی ١١/٨دا هێزەکانی پارتی و کۆماندۆی تورک بەپاڵپشتی فڕۆکەو تۆپخانە، ئێمەیان لەبەنی هەریر دەرکرد و پاشەکشەمان کرد بۆ زینەتیرو کەپکی ئەحمەد ئاغاشمان بەجێهێشت، هاوکات لەگەڵ هێرش بۆسەر

بەنی هەریر لە دۆڵی ئالانەشەوە بۆتالاواو تاسەر گەردەنەی خەتێ هاتن. هەر هەمان ڕۆژ لەقۆڵی شەقلاوەوە بۆ هیران و لەگۆمە سپانیشەوە هێرشیان کرد و لەوێش پێشڕەویان کردبوو، هێزەکانی یەکێتیان پاشەکشە پێکردبوو.

لە ڕۆژی ۱۱/۹وە تا۱۹۹۷/۱۱/۱۹ لە هەموو بەرەکانەوە شەڕبەردەوام بوو لەماوەی ئەو ۱۰دە ڕۆژەدا پارتی کەوتبووە حاڵەتی پەلاماردان و چەندین هێرشیان بەتوندی لەلایەن هێزەکانی یەکێتییەوە تێک شکێندرا، بەلام دواجار بە پشتیوانی بەرفراوان و ڕاستەو خۆی هێزی ئاسمانی و زەمینی و تۆپخانەکانی سوپای تورک و دەبابەکانیان، پارتی توانی هێزەکانی یەکێتی بگەڕێنێتەوە بۆ شوێنەکانی پێش۱۹۹۷/۱۰/۱۲و لە چەند قۆڵێکیشەوە زیاتر بێنە پێشەوە، ئینجا شەڕەکە وەستاو ئەمریکیەکان کەوتنە تەلاش بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان بەتەواوەتی، ئەوەبوو دواجار و لە ساڵی ۱۹۹۸دا ڕێککەوتننامەی واشنتۆن لێکەوتەوە.

ڕۆژی ۹۷/۱۱/۱۰مام جەلال بە بروسکە پەیامێکی دا بەهێزەکان ئەڵێت (تورک ئاگاداری باڵوێزی ئەمەریکایان لە ئەنقەرە کردووەتەوە، لەوێدا وتویانە لە هێرشەکانیاندا بۆسەر یەکێتی، هێزەکانی یەکێتیان ناچار کردووە بگەڕێنەوە بۆ شوێنی پێش ڕۆژی ۱۹۹۷/۱۰/۱۳ ئیتر لەوە زیاتر ناڕۆین و ئەوەستین). پێشتریش دوجار کاک شازاد سائیبیان بانگ کردبوو پێیان ڕاگەیاندبوو، (ئەگەر یەکێتی نەکشێتەوە بۆ شوێنی پێش ڕۆژی ۱۰/۱۳ئەوە بەردەوام ئەبین لە لێدانیان).

یەکێتی لەم شەڕەدا دەست پێشخەرو بەحیساب پارتی ناچار بکات ملبدات بۆ ئاشتی بەتەواوەتی، هەرچەندە دواجار ڕێککەوتنی لێکەوتەوە، بەلام بەرای من یەکێتی زەرەری کرد و پارتی قازانج، نەک هەر ئەمجارە لە هەموو جەولەکانی شەڕی ناوخۆدا، دواجار و سەر ئەنجام بەقازانجی پارتی شکاوەتەوە.

زیانە دیارو بەرچاوەکانی یەکێتی لەم شەڕەدا.

یەکەم: لە ڕووی گیانییەوە جگە لە شەهید بوونی دەیان پێشمەرگە و کادرو فەرمانـدەی پێشـکەوتو و سـەدان بریـندار، ئەم سـەرکردە و فەرمانـدە بە هەیبەتانەشی لەدەستدا کە نەئەتوانێ دروستیان بکاتەوە نە شوێنەکانیان پڕبکاتەوە، لەوانە: تەحسین کاوانی، سەید جەوهەر، شێخ حسێنە سور، مەلا

نەجم، مامۆستا مەهدی، بەکر عەلی قادر(مەلابەکر)، فازل شیرەمەڕی، کانەبی جەوهەر ڕەشید، هیوا مەحمودعەبدولا، غەفار سالح، کەریمی کاکە حەمە، شیروان ئەبووبەکر سۆسەکانی، فەقێ حەسەن، برایمە کوێر و.....تاد، لەم شەڕانەدا هەڤاڵ عوسمان بانیمارانی دووبرای پێکەوە شەهید بوون.
دووەم: لەدەست دانی چەند ناوچەیەک لەدوای ١١/١٩وە کەوتنەدەست پارتی، ئەو شوێنانە بەر لە١٠/١٢ بەدەستیەکێتی خۆیەوە بوون.
سێیەم : سەرفیاتی شەڕەکە بۆیەکێتی لەوکاتەدا زۆرو هەرچی هەبوو سەرفی کرد، بەڵام بۆ پارتی وانەبوو، ئەوان هەم پارەیان هەبوو هەم ئەوەی سەرفیان کرد لەسەر دەوڵەتی تورک بوو.

لەم شەڕی گەردەلولی تۆڵەدا هێزەکانی یەکێتی بەم شێوەی خوارەوە بەشدارو دابەش کرابوون، یەکەم: قۆڵی بالیسان، ١- محوەری بالیسان دۆڵی ئالانە بەرەو خەلیفان، بناری کۆرک و بە جادەی سەرەکیدا هێزەکانی دەشتی بتوێن گرتیان. ٢- محوەری بالیسان کەپکی ئەحمەد ئاغاو بەنی هەریر، هێزەکانی فەرماندەی شارەزوور و بەشێک لە هێزەکانی ناوچەکەی خۆیان واتە دۆڵی خۆشناوەتی و دەشتی هەریر گرتیان. ٣- محوەری بالیسان بەرەو کلاو قاسم و زینەتیرو شاخی شەکرۆک و شاخەسور لەلایەن هێزەکانی فەرماندەییەکانی گەرمیان و کەرکوکەوە گیران.

دووەم: قۆڵی هیران ١- محوەری هیران شەقڵاوە، ٢- محوەری هیران سەری سەفین، فەرماندەییەکانی دووی هەولێر وحەوتی سلێمانی و هێزە تایبەتەکانی کاک کۆسرەت و هێزەکانی تەوفیق کانی وەتمانی بەپشتیوانی هێزی تۆپخانە هێرشیان کردە سەر ئەم شوێنانەو گرتنیان، سۆرکی هیران و کەپکی شیلانە و دارەبەن و ئاوایی ئاقوبان و گردی گەورە و گردی جاسوسان و کەپکی حاجی سالح، ئەم شوێنانە لەیەکەم پەلاماردا گیران و ئەو هێزەی سەری سەفین گەیشتنە کەپکی قەل زاڵ بەسەر شەقڵاوەدا. ٣- محوەری هیران زنجیرە چیای دڕەبی هێزەکانی جووتیاران و شەهیدانی ماکۆک و کاروخ و وەرتێ و چەکوچ پەلاماریان داو گرتیان.

سێیەم: قۆڵی سماقولی ١- محوەری سماقولی بۆ سەر چیای بنەباوێ هێزەکانی دوکان گرتیان، ٢- محوەری سماقولی بۆ دۆڵی سماقولی سەرو چاوەو دەورووبەری، ٣- محوەری سماقولی بۆ سەری سۆرکی سوسێ

و ناودارۆکان بەشێک لە فەرماندەیی گەرمیان و هەولێر بوون، بۆ هەنگاوی دووەم لەم قۆڵەوە هێزێکی مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەوزور بەشداری کرد. چوارەم: قۆڵی چۆمان حاجی ئۆمەران، هێزەکانی لەشکری باڵەک، لەشکری قەندیل، هیزی حزبی سۆشیالیست، هێزەکانی چۆمان و ڕەواندزو چەندین مەفرەزەی سنوورەکانی خۆیان بەگشتی بەشداریان تێدا کرد. پێنجەم: قۆڵی کۆیە دیگەڵە بوو، هێزەکانی فەرماندەیی کۆیەو چەند فەرماندەیەکی هەولێر و کەرکوک و گەرمیان بوون .

ئەم هێزانەی یەکێتی لەڕاستیدا هێزێکی تۆکمەو قارەمان و پەلاماردەرو ورە بەرز بوون، ئەو بەرنامەی بۆیان دانرابوو بەتەواوەتی جێبەجێیان کرد، بەڵام بەداخەوە دواجار بەهۆی بەشداری کردنی پەکەکە لەمحوەری سیدەکان کەنەئەبوو یەکێتی ڕێگە بدات، تورک دێتە ناو پرۆسەکەو بەشداری کاریگەر دەکات لە ئۆپەراسیۆنەکەدا، لەسەرجەم قۆڵەکانەوە بۆ پشتیوانی کردن لەپارتی دژ بەیەکێتی، سەر ئەنجام ئەو هێزە تۆکمەو کەم وێنەیەی پێشمەرگەی یەکێتی لەو ئۆپەراسیۆنەدا ئەشکێ کەلەئەدەبیاتی یەکێتیدا بەگەردەلولی تۆڵە دووەم ناودەبرێت. دواتر یەکێتی ئەو هێزەی بۆڕێک نەخرایەوە وەک جاران.

بۆیە ئەڵێم بەشداری پەکەکە هەڵەبوو ، نەدەبوو یەکێتی مادام هێزی تەواوی هەیەو پێویستی بە پشتیوانی کەس نییە، بە هیچ جۆرێک ڕێگە بدات پەکەکە لەو میحوەرەوە بەشداری شەڕەکە بکات. هەرچەندە لەوە ئەچێ یەکێتی نەیتوانیبێت ئەو ڕێگریە بکات.

دواجار لە ڕۆژی ١٩٩٧/١١/٢٤دا جەنابی مام جەلال سەردانی بتوێنی کرد، لە شارۆچکەی چوار قورنە کۆبوونەوەیەکی فراوانی بە فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە کرد، لەوکۆبوونەوەدا گفتوگۆ لەسەر وەستاندنی شەڕەکە کرا، باسی ڕاوبۆچوونی ئەمریکا و بەریتانیا و دۆستانی کورد کرا، هەموولایەک قایل بوون بە وەستانی شەڕو ئاگربڕ، لەوکۆبوونەوەدا داواکرا تورک وەک ناوبژیوان قبووڵ نەکرێت چوونکە بووەتە تەرەفی شەڕ، هەر ئەمڕۆ پارتی لە ڕاگەیاندنەکانییەوە ڕاگرتنی شەڕەکەی ڕاگەیاند، بەڵام مەرجی هەبوو، مەرجەکەی ئەوەبوو نابێ لەوشوێنانەوە یەکێتی لێیە پەکەکە هێرشیان بکاتە سەر.

دوای وەستانی شەڕەکە، بارەگای خەلفی فەرماندەیی ٦شەشی شارەزوورمان هێنایە سەروچاوە، وردە وردە هێزەکەمان لە دۆلی بالیسان کەم کردەوە، لەگەڵ کاک عەدنان یەکترمان ئەگۆڕی و سەردانی لای هەڵەبجە و شارەزوورمان دەکردەوە، دەچووین بۆ سەردانی ماڵ و منالی هاوڕی شەهیدەکانمان، بۆ یەکەم جار لەدوای گەردەلولی دووەمی تۆلە هاتمە سلێمانی چووم بۆلای خێزان و منالەکانی شەهیدان سەید جەوهەر و شەهید شێخ حسێنە سور. دوای ئەوان چوومە عەربەت و شارەزوور بۆلای منالە چاوگەشەکانی، مەلابەکر، فازل شیرەمەڕی و شیروان ئەبوبەکر و....تاد.

هەرلەم ڕۆژانەدا سەردانی نەخۆشخانەی شارەزووری گشتیم کرد، بۆ سەردانی چەند بریندار وەهەروەها بۆ دەست خۆشی لە دکتۆرەکان و کارمەندانی ئەم نەخۆشخانە، کەبەراستی ئەو ماوە خزمەتی پێشمەرگە و کەسوکاریان و جەماوەریی ناوچەکەیان بەشێوەیەکی باش و ڕێکوپێک کرد و ئەرکی سەرشانیان بەدڵسۆزانە جێبەجێ کرد.

نەخۆشخانەی شارەزووری گشتی، لەسەراوی سوبحان ئاغادا بوو، ئەم نەخۆشخانە سەربازی و سەر بە دەستگای تەندروستی پێشمەرگە بوو، دەستگای تەندروستی، هەڤاڵ دکتۆر محەمەد خۆشناو ئەندامی فەرماندەیی گشتی لێپرسراوی بوو، خۆشناو کەسێکی دڵسۆزو چالاک و دکتۆرێکی بەڕێزە، بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە دکتۆر سەباح هەورامی بوو، سەباح یەکێکە لە دکتۆرە ماندووەکانی، سنووری پارێزگای سلێمانی، لە سالانی ١٩٨٨ و ١٩٨٩ لە قۆناغی شەشدا چەندین جار لەلایەن رژێمی بەعسەوە گیراوە، لەکاتی ناخۆشی و شەڕەکانی ناوخۆدا لە شاری هەڵەبجەدا خزمەتی ئەکرد و بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی هەڵەبجە بوو، سەرەڕای هەڕەشە لێکردن و ئازاردانی، ناوچەکەو خەڵکەکەی بەجێ نەهێشت.

لەسالی ١٩٩٨ خۆی و دکتۆرەکانی تری هاوکاری وەک: د.شوان و د.عەباس و د.سۆزانی خێزانی د.عەباس نەخۆشخانەی شارەزووری سەربازیان پەرە پێداو ڕۆژانە د.سەباح چەندین نەشتەرگەری تێدا ئەنجام ئەدا.

دروست کردن و ئامادەکردنی ئەم نەخۆشخانە لەناوچەکەدا بووە ناوەندێکی گەورەی تەندروستی و خزمەت گوزاری و چارەسەر، لەناوچەکانی تریشەوە خەڵک و نەخۆش سەردانیان ئەکرد و چارەسەر ئەکران. ئەم ناوەندە

تەندروستییە خزمەت گوزارە، بە پشتیوانی مام جەلال و ماندو بوون و شەونخونی کاک دلێری سەید مەجید بەردەوام بوو، تائەوکاتەی حکومەتی هەرێم دەستی ئاوەدانی و خزمەت گوزاری کرایەوە لە هەڵەبجە و شارەزوورو ناوچەکەدا.

لەرۆژی ٩٧/١١/٣٠دا یادی شەهیدانی گەردەلولی تۆڵەی دووەم لەسەر گردی سەیوان کرایەوە، گەورەترین ئاپۆرەی جەماوەریی نمایش کرا، مام جەلال لەناو ئەو ئاپۆرە جەماوەرییە بەرفراوانەدا، ووتارێکی پێشکەش کرد، سەبارەت بەشەڕەکە و ڕاگرتنی و دواتر چارەسەر کردنی کێشەکان و زۆرلایەنی تری بارودۆخەکەی ڕوون کردەوە.

بەڵی ئەمڕۆ ٢٠ بیست ساڵی ڕێکە بێ دابڕان لەناو پێشمەرگە و هەڤاڵە پێشمەرگەکانم دام، لەساڵی١٩٧٧ وە تاکۆتایی ساڵی ١٩٩٧، لەو بیست ساڵەدا بەردەوام و بێ دڵەراوکە خەریکی جێبەجێ کردنی ئەرکەکانم بووم، ئەرکی شەڕو بەرگری لەکوردستان و یەکێتی، بە درێژای ماوەی ئەو بیست ساڵە تەنها یەکەم ساڵی سەرەتا وەک پێشمەرگەیەکی ئاسایی خزمەتم کردووە، دوای ئەو ساڵە، لەساڵی ١٩٧٨وە تا ساڵی ١٩٩٧ کەدەکاتە نۆزدە ساڵ، لەو ١٩ نۆزدەساڵەدا بەرپرسیاریەتی و ئەرکی سەر شانم ساڵ بەساڵ زیاتر بووە، سەرتا فەرماندەی مەفرەزە و دوای ئەوە پلەبەپلە، جێگری کەرت و فەرماندەی کەرت و جێگری تیپ و فەرماندەی تیپ تا ڕاپەڕین، دوای ڕاپەڕینیش فەرماندەی هێزو دواتر بەپلەی لوا، ج - لیوا و دواتر جێگری فەرماندەیی  تا کۆتایی ئەمساڵ ساڵی ١٩٩٧.

لەماوەی ئەو ١٩ نۆزدە ساڵەدا پلەو بەرپرسیاریەتیەکان کەپێم سپێردراوە، بۆ یەکجاریش لەسەر داوای خۆم نەبووە، زیاتر لەوەش زۆر جار ئەو شوێنانەم بۆ دیاری کراوە کە کەس لە هاوڕێکانم نەیان ویستووە، یان نەیان کردووە، ئەمە نەک تا ساڵی ١٩٩٧ بەڵکو دواتر و تا ساڵی٢٠١٢ .

مەبەستم بوو بڵێم دوای کۆتای شەڕی گەردەلولی تۆڵەی دووەم و لە کۆتای ساڵی ١٩٩٧دا دوای ٢٠ بیست ساڵ لە ئەرکی پێشمەرگانە، لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٨ و لەڕۆژی ١٩٩٨/١/١٠دا بە بڕیارێکی مەکتەبی

ڕێکخستن و لەسەر داوای مام جەلال گوازرامەوە بۆ ناو ڕێکخستن، بۆجێبەجێ کردنی کاروباری حزبی[1].

بەر لەوەی بڕیارەکە بدرێت مام بانگی کردمە بارەگای خۆی لە قەلاچوالان، پێی ووتم ئەوە بڕیارم داوە لەناو پێشمەرگەدا نەمێنی و بتگوازینەوە بۆناو کاری سیاسی و ڕێکخستن، ووتم مام جەلال جەنابت ئەمر دەکەی بەلام من سیاسەت و ڕێکخستن نازانم، سەیرێکی کردم و بەپێکەنینەوە پرسی ئەی چی ئەزانی؟ ووتم وەلا مامە کاری من هەر تفەنگ تەقاندن و کاری پێشمەرگانەو شەڕبووە، ووتی نانا تۆ پێشمەرگە و شەرکەرێکی سیاسیت، ئەوە لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی ڕێککەوتویین و مەڵبەندەکەمان بردوەتەوە هەڵەبجە، شەوکەت بەرپرسی مەڵبەندەو ئەویش پێیباشە تۆ بە جێگری دابنرێیت، وردە وردە پێکەوە کێشەکانی شارەزوورو هەڵەبجە و هەورامان چارەسەر بکەن و مامی خۆشت پشتیوانت ئەبێ نەترسی بێگومانم سەرکەوتویت. ووتم بەڵی جەنابت ئەمر ئەکەی بەسەر چاوان ئینشاالله درێغی ناکەم.

---

[1] ئەمە دەقی بڕیارەکەیە( لەسەر ڕەزامەندی هەڤاڵی بەڕێز مام جەلال، فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بڕیاردرا بە گواستنەوەی هەڤاڵ( حەمەی حەمەسەعید) لە هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە بۆ مەکتەبی ڕێکخستن و دانانی بە جێگری لێپرسراوی مەڵبەندی(٩)ی ڕێکخستنی شارەزوور.

## لە پێشمەرگایەتییەوە بۆ حیزبایەتی

لە مانگی ١٩٩٨/١دا بارەگای مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزووری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەناو شاری هەڵەبجەو لەناو بینایەکی پەڕپوتدا بوو، ئەو بینایە کابرایەک لەسەر زەوی شارەوانی دروستی کردبوو بۆ یانەی مەی خواردنەوە. کاک حەمەی حاجی مەحمود لێی کریبوو، کاک شەوکەتی حاجی موشیر بەرپرسی مەڵبەند کردبووی بەبارەگای مەڵبەند. سنوری جوگرافی کارکردنی مەڵبەندەکە پێک هاتبوو لە سنووری قەزاکانی، هەڵەبجە، سەیدسادق، پێنجوێن، شارەزوور و ناحیەی عەربەتیشی لەسەربوو، عەربەت لەڕووی ئیدارییەوە سەر بەقایمقامیەتی مەرکەزی سلێمانییە. ئەم سنورە دابەش کرابوو بەسەر(٦) کۆمیتەی ڕێکخستندا،

بارەگای فەرماندەی ٦شەشی شارەزووریش لەسەراوی سوبحان ئاغا بوو، کاک عەدنانی حەمەی مینا فەرماندە و منیش (حەمەی حەمەسەعید) جێگری ئەو فەرماندەییە بووین. ستافەکەشی ئەم هەڤاڵانە بوون: کەمال هەورامی، عەلی یارئەحمەد و چەند هەڤاڵی تر. ئەم فەرماندەییە بەرپرس بوو لە هێزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی لەهەمان سنووری جوگرافی مەڵبەندەکەدا کەنزیکەی ٧٠٠ حەوت سەد پێشمەرگە بوون.

لەدوای دەرکردنی بڕیاری گواستنەوەکەم لە فەرماندەییەوە بۆ مەڵبەندو ڕەزامەندی هەردوولا لەڕۆژی ١٩٩٨ /١/٢٠ سێشەمە دوای کۆبوونەوەیەک لە بارەگای فەرماندەی لە سەراو خوا حافیزیمان لە هەڤاڵانی فەرماندەی کردو لەگەڵ کاک عەدنان و چەندین هەڤاڵی تردا چووین بۆ هەڵەبجە، دەوروبەری نیوەڕۆ بوو گەیشتینە بارەگای مەڵبەند، کاک شەوکەت و هەڤاڵانی مەڵبەند و کۆمیتەکان و برێک هاوولاتیش پێشوازی گەرمیان کردین و بەدەم و چاو و ڕوخساریاندا دیاربوو بەگشتی پێیان خۆش بوو. لە کۆبوونەوەیەکدا کاک عەدنان سەرەتا قسەی کردو دواتریش کاک شەوکەتی حاجی موشیر قسەی کرد و خۆشحاڵی خۆی و هەڤاڵەکانی دەربڕی و ووتی بێگومانم مەڵبەندەکەمان لەسەردەستی حەمەدا پێش ئەکەوێ و بەهەموو

شێوەیەک پشتیوانی دەکەین. مامیش پشتیوانی تەواوی دەکات. قسەکان تەواو بوو، کاک شەوکەت ڕووی کردە هەڤالانی مەڵبەندو پرسی کەس قسەی هەیە، دوو هەڤال بەیەکەوە ووتیان هیوادارین جێگر بێت ڕێگر نەبێت. ئەوانیش قەدەفەری و مەحمودی حاجی ساڵح بوون

کاک شەوکەت وەلامی ئەو قسەی نەدایەوەو ووتی کێیتر قسەی هەیە؟ بەلام بەروخساریدا دیاربوو پێی ناخۆش بوو. کەس قسەی نەبوو، بە گشتی هەڤالان ووتیان بەخێرهاتنی کاک حەمە دەکەین و پیرۆزبایی لێ دەکەین، خۆشحاڵین بە هاتنەکەی و هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازین. ئەوکات واتە لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٨دا، بەڕواڵەت کۆمەڵێک کادری بە توانای دڵسۆزی دڵگەرمی سنوورەکە کۆبووبوونەوە لە مەڵبەندەکە و کاریان دەکرد ئەنجومەنی مەڵبەند پێک هاتبوو لەم هەڤالانەی خوارەوە:

کارگێڕەکانی مەڵبەند/مام وریا هاواری بەرپرسی بەشی کۆمەلایەتیی، لەگەڵ مامۆستا عەبدولا بەلخەیی و جەلالی حاجی کاکەلی.

فەرەجی حەمەساڵح/ بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندن، لەگەڵ سێ کادر بەش بەناوەکانی عەلی حاجی فەرەج، سەلاحە ڕەش کۆکۆیی و عومەر عەبدول کەریم.

مامۆستا فەتاح کۆکۆیی/ بەرپرسی بەشی ئیدارەو دارایی، لەگەڵ عومەری حاجی ئەحمەد، عەلی ئەکبەر و حەمەسەلیم فەتح الله کادری بەش.

ئەحمەد قەدەفەری/ بەرپرسی بەشی پەیوەندییەکان.

مەحمودی حاجی ساڵح/ بەرپرسی بەشی ڕێکخستن، لەگەڵ شلێر غەفور، حەمە شارەزووری، مامۆستا جەمال هەورامی، سابیر چەوساوە کادر بەش.

جەبار جەلال/ بەرپرسی بەشی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان، لەگەڵ هەورامان حەمەنوری و مامۆستا عوسمان عەبدولا.

بەرپرسی کۆمیتەکان / جووتیارمەجید لێپرسراوی کۆمیتەی پێنجوێن، مامۆستا کەریمی شێخ عەلی لێپرسراوی کۆمیتەی هەڵەبجە، بەکری زەراعە بەرپرسی کۆمیتەی سەیدسادق، مەلا ئەحمەد (مەلا ئەحمەدی جەیران) بەرپرسی کۆمیتەی قەزای شارەزوور، عەبدولای مامە بەرپرسی کۆمیتەی هەورامان، حەمەی غەفور شەریف بەرپرسی کۆمیتەی عەربەت.

کادرەکانی ئەندام مەڵبەندو ناو مەڵبەند، ئەوکات ئەمانە بوون: شلێر غەفور، عومەر عەبدولکەریم، عەلی ئەکبەر، مامۆستا عوسمان عەبدولا، عومەری حاجی ئەحمەد، مامۆستا بەکر حەمەئەمین، مامۆستا عەبدولا، جەلالی حاجی کاکەلی، هەورامان حەمەنوری، جەمال هەورامی، قادر بێستانی، بەکری زەراعە، سەلاح رەش وحەمەرەزا......تاد، بەرپرسی رادیۆی مەڵبەند/عەلی حاجی فەرەج بوو لەگەڵ ستافێکدا. ئەگەرناوی چەند کادرێکم لەبیر چوبن داوای بووردنیان لێ دەکەم.

رادیۆی دەنگی شارەزوور، ئەمە رادیۆی مەڵبەند بوو ئەم هەڤاڵانە ئەیانبرد بەڕێوە: ١- سەلاح رەشید - بەڕێوەبەر، ٢- ئیمام باباله - بێژەری بەشی هەورامی، ٣ – نیان فەتاح - بێژەری بەشی سۆرانی، ٤- کۆچەر عومەر- بێژەر، ٥- عادل سەیفەدین -بێژەر،٦- چنور عەزیز - بێژەری بەشی هەورامی، ٧- هەڵۆ خالد -کۆنترۆل، ٨- سارا ساڵح - کۆنترۆل، ٩- هاژە عەبدولا- وەرگێڕ، ئەنسات، ١٠- عومەر سەعید سەرگەتی-نوسەر، ١١- محەمەد عەبدولا- کارەبایی.

دەستم کرد بەئیشکردن لەناو مەڵبەندا، سەرەتا ئەمزانی دەبێت ماوەیەک گوێ بگرم تا لەگەڵ هەڤاڵەکان ئاشنابیم و زیاتر شارەزای کاروبارەکان ببم، بەڵام لێپرسراوی مەڵبەند، ئەیویست هەر زوو کاروبارەکان ڕووبەڕووی من بکاتەوە. ئەمەش ئەگەرایەوە بۆ ئەو متمانەی کاک شەوکەتی حاجی مشیر بەمنی هەبوو، هەر لەومماوەداو بۆ یەکەم جار کارێکی کۆمەلایەتیی هاتە پێش، ئەویش بەڕێوە بردنی کۆڕێک بوو بۆ ساڵیادی کۆچی دوای خوالێخۆش بوو شێخ عوسمانی نەقشبەندی لە١٩٩٧/١/٢٧دا.

دەبوو بەشی کۆمەلایەتیی و بەشی ڕاگەیاندنی مەڵبەند هاوکاری بەڕێوەبردنی ئەو کۆڕە بکەن، ئەوانیش منیان ئاگادار کرد و پێیان ڕاگەیاندم تۆ ووتاری مەڵبەند و یەکێتی ئەخوێنیتەوە، ووتار خوێندنەوە و قسەکردن و وەستان لەبەرانبەر خەڵکدا بۆمن شتێکی قورس نەبوو، چوونکە دەیان کۆڕ و کۆبوونەوەم لەگەڵ پێشمەرگەو خەڵکدا کردووە لە شاخ و لە بنکەو بارەگاو ئاوایییەکانداو دواتریش لە شارو شارۆچکەکاندا لە کاتی بانگەشەی هەڵبژاردن دا. شارەزای کاری چاکەو خوا پەرستی و کارە خزمەتگوزاری و تەندروستییەکانی حەزرەتی شێخیش بووم بە تایبەت لە بواری تەندروستی

و پەنادان و حەوانەوەی بێنەوایاندا، بەڵام قسەکردن لە کۆڕێکی ئاوادا، دەبێت قسەکەر شارەزای بوارەکانی شەریعەت و تەریقەت و تەسەوف و ڕێبازی نەقشەبەندی بێت. من ئەوکات شارەزایم وەک پێویست لەسەر ئەو بوارانە نەبوو، بۆیە داوام لە هەردوو هەڤاڵی ڕۆشنبیر و شارەزا لەو بوارەدا هەڤاڵان مامۆستا ئەیوب ڕۆستەم و عەلی حاجی فەرەجی نەورۆڵی کرد، بۆ نوسینی ووتارەکە هاوکاریم بکەن، ئەوانیش دریغیان نەکرد.

نەقشەبەندی ڕێبازە، ڕیشەی ئەم ڕێبازە لە مێژووی سۆفیگەری ئیسلام دا ئەگەڕێتەوە بۆ ڕێبازەکانی ( تەیفوری، سەدیقی، خواجاکان) دامەزرێنەرەکەشی محەمەد کوڕی محەمەدی بووخاراییە کەبەشاهی نەقشەبەند ناسراوە، ناوەرۆکی ڕێبازەکەشی نەقشکردنی یان نەخشاندنی ناوی خوایە لە دڵی سۆفیدا بەشێوەیەک بۆ تەنها ساتێکیش لەزیکری خودا غافڵ نابێت. ( ای برادر درطریق نقشبند- نقش حق را دردل خود نقشبند).

سۆفیگەری واتە پاککردنەوەی ڕۆح بە مەرجێک هەرگیز پیس نەکرێتەوە، ئەویش بە دوورکەوتنەوە، لە هەواو هەوەس و ئارەزووەکانی نەفس، کەرەستەکەی خودا پەرستی ڕاستەقینەو سلوک کردنە، ئاکامەکەشی بینین و چەشتنە لەڕێی دەرونەوە، بینینی خوا بەبەسیرەت و چێژکردنی بە خۆشەویستی خودایی، سۆفی بە جۆرێک پەروەردە دەکرێت نەک هەر حەز و ئارەزوەوکانی سنووری ڕەوای خۆیان نابەزێنن، بەڵکو زۆرجار ئارەزووە ڕەواکانی خۆشی کۆنترۆڵ و خەفە دەکات و هەموو ژیانی خۆی بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا تەرخان دەکات.

عیرفانیش واتا باڵاکردنی ڕۆح و تەی کردن و بڕینی هەنگاوەکانی سۆفیگەری و وەرگرتنی بەهرە لە (کەراماتی ئەولیا) دواجار گەیشتن بە (وحده وجود). ئاها حافز فەرموو یەتی: (بمی سجاده رنگین کن گرت پیرمغان گوید- کەسالک بیخبر نبود زراەورسم منزلها). ئەشتوانین بڵێین مەکتەبی یان ڕێبازی عیرفان و تەسەوف بەرجەستەیی خۆشەویستی خودا و پێغەمبەرو چاکەکارانە، بەجۆرێک خۆشەویستیەکە لەدڵ و ناخەوە هەڵقوڵاوە، ئەو خواناسیە ئامێتەیە لەگەڵ ویژدان و عەقڵ و مەعریفە، ئەوکات خوا ناسیەکە دەبێتە خواناسی ڕاستەقینە، بەپێچەوانەی خواناسیەک خاڵی بێت لە خۆشەویستی و عەقڵ. تەسەوف پاک کردنەوەی ناخ و دڵ و دەروونە لە

خراپە، لەبووغزو کینە، لە توڕەیی، ناشیرینی، خۆپەسەندی و تەکەبوور. پڕبوون و ڕازاندنەوەی دڵ و دەروونە بەبڕواو خۆشەویستی، بە عەقڵ و مەعریفەو ڕەوشتی بەرزو جوان، تا خاوەنی ئەو دڵە دەبێت بەخاوەنی دڵێکی سەلیم. (الا من اتى الله بقلب سليم).

ڕۆژی ١٩٩٨/١/٢٢ کە ڕۆژی پێنج شەمە بوو لە شاری سلێمانی بووم، دۆست و هاوڕێی خۆشەویستم لایقی وڵەدبەگی لە شاری پاوەی کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە هاتبوو بۆلام، پێکەوە پێش نیوەڕۆ چووین بۆ بەشداری پرسەی خوالێخۆش بوو حاجی ژن دەوڵەت خێزانی حاجی جەزای تەوێڵەیی، دوا نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ چووین بۆ بەشداری لەکۆبوونەوەو ئامادەکردنی ڕێوڕەسمی یادەکە لە بارەگای کۆمەڵەی ژیانەوەی هەڵەبجە، ئەم بارەگا لەناو شاری سلێمانیدا بوو. بەشداربوانی کۆبوونەوەکە ئەم هەڤاڵانە بوون: شەوکەتی حاجی موشیر، وریا براخاس هاواری، مەلائەحمەدی جەیران، سابیر چەوساوە، شێخ سەلاح، عەلی حاجی فەرەج، حەمەی غەفور شەریف و حەمەی حەمەسەعید.

لەم کۆبوونەوەدا هەموو ئامادەکاریەکان کران. لەوانە قەدەفەری پەیوەندی بەهەموو لایەنە سیاسییەکانەوە بکات، هەرکەسیان شتی هەیە بۆ کۆڕەکە ووتار یان بروسکە، شەمە ڕۆژی ١/٢٤ لەگەڵ خۆییدا بیهێنێت بۆ بارەگای کۆمەڵەکە. مام وریا و بەشی کۆمەڵایەتیی دەعوەت نامەکان دابەش بکەن. دوای کۆبوونەوەکە بڕیار درا هەردوو بەرپرسی کۆمیتەکانی تانجەرۆ و قەزای شارەزوور لەگەڵ سابیردا بچن بۆ سەردانی خانەقای باریکە بزانن چیمان پێویستە. هەروەها بڕیار درا عەلی حاجی فەرەج و شێخ سەلاح لەگەڵ هەردوو کۆمیتە، لیژنەکانی ئاسایشی کۆڕەکەو پێشوازی دروست بکەن لەخۆیان و لەچەندین کادریتر.

ئەمانەوێت یادێکی شایستە بۆ ئەو پیاوە مەزنە بکەین، بەتایبەت من ئەمویست مادام یەکەم ئیشەو ئەم مەڵبەندەدا ئەیکات جێگە دەستم دیاربێت. ڕۆژی١/٢٣ چوومە نوسینگەی ڕادیۆو تیڤی گەلی کوردستان، بۆ ئەوەی ڕۆژی دیاری کراو ئامادەبن لەگەڵ هەڤاڵ شێخ جەمال هەڵەبجەی قسەمان کردو بڕیاری دا خۆی بێت سەرپەرشتی ڕێکخستنی بەرنامەکان بکات، ئەوەندەی تر دڵخۆش بووم بەتوانا و هیمەتی شێخ جەمال. لەوێوە دەعوەت

نامەکانی هەورامییەکانم برد بۆ پێشانگای مەولەوی بۆلای حاجی باقی هەورامی. ئێوارەکەشی چووم بۆ لای کاک شێخ سابت برای شێخ عوسمان و دووای ئاگادار کردنی لەبەرنامەکان و پێدانی ژمارەیەک دەعوەت نامە بریار درا ئەو ووتاری بنەماڵە پێشکەش بکات. شەو ئاگاداریان کردم بەیانی قەرارگای ڕەمەزان دێنە هەڵەبجەو سەردانی مەڵبەند دەکەن بۆ پیرۆزبایی دەست بەکاربوونی بەندە.

ڕۆژی ١/٢٤ گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە، چوومە بارەگای مەڵبەند، نوێنەری لایەنەکان و کۆمەڵێک میوانی هاووڵاتی هاتبوون بۆلام، ئێشککرەکانی مەڵبەند ووتیان خەڵک و میوانی زۆر دێن بۆلات پێویستە ئەم چەند ڕۆژە لێرە بیت، منیش ووتم بەسەر چاو، ئەوە سەرگەرمی ئەویادەین لەدوای یادەکە لە خزمەتیان دام. قەرارگای ڕەمەزان هاتن و پێشوازی گەرممان لێکردن، بەرپرسی وەفدەکەیان بەنی ئەحمەد بوو، بەنی پیاوێکی بەدەستەڵات و زۆرجار ئەو بەنوێنەرایەتی ئێران دەهات بۆ نێو بژیوانی لە شەڕەکانی ناوخۆدا، دۆستی یەکێتی بوو، لە ساڵی ١٩٩١بەدواوە بۆ یادی ڕۆژی ٣/١٦ زیاتر ئەو دەهات بە نوێنەرایەتی وڵاتی ئێران، خەڵکی باکووری ئێران بوو، لەگەڵ منیش جگە لە بابەتە سیاسییەکان و کارە پەیوەندیدارەکان بەیەکێتی و شۆڕشەوە، تێکەڵایەتی و دۆستایەتیمان هەبوو.

ڕۆژی ١٩٩٨/١/٢٦ بەیانییەکەی گەڕامەوە بۆ سلێمانی و پێش نیوەڕۆ لەکۆمەڵە کۆبوونەوەی کۆتاییمان کرد، بۆ نیوەڕۆکەی لەگەڵ هەڤاڵان عەلی حاجی و کەمال هەورامیدا چووینە خانەقای باریکە و لەگەڵ مامۆستا مەلا سەید کازم و مامۆستا مەلا فەرەجدا شوێنی ڕێوڕەسمەکەو دەووروبەریمان تەماشا کرد و دواتر لەگەڵ فەقێکانی ئەوێدا کە بەشدار دەبوون لە چالاکیەکاندا دانیشتین.

ڕۆژێکی خۆشە یادێکی شایستەی پیاوێکی مەزنە، حەشاماتێکی زۆر خرۆشاوەتە باریکە، لە کاتژمێر ١١ یانزەوە لە بڵندگۆکانەوە شعرو پەخشان و قەسیدە ئەخوێنرێنەوە، لەکاتژمێر ١ یەکی تەواودا یادەکە بەخوێندنەوەی پارچە هۆنراوەیەک لەلایەن شێخ جەمالەوە بەدەنگە زوڵاڵەکەی دەستی پێکرد. دوای تەواوبوونی هۆنراوەکەی، کاک جەمیل هەورامی بانگ کردە سەرشانۆکە بۆخوێندنەوەی ووتاری بەخێرهاتن، دوای کاک جەمیل کاک

شەوکەتی حاجی موشیر ووتاری جەنابی مام جەلال تاڵەبانی خوێندەوە.
دوای ووتاری مام جەلال، ئیمام بابالەی نوسەرو شاعیر پارچە پەخشانێکی خوێندەوە.

بەڵی ئەمڕۆ لە کۆمەڵگای باریکە، لە تەکیە و مزگەوتەکەی پەنا ماڵی شێخدا کۆبووینەتەوە و بەسەدان مورید و مەنسوب و زانایانی ئاینی و خەڵکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی کۆبوونەتەوە، مەراسیمێکی شایستە بەڕێوە دەچێت. دوای ئیمام بابالە منیش ووتارەکەی مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوور ئەخوێنمەوە. لەکاتی خوێندنەوەی ووتارەکەمدا سۆفیەکان ئەگریان و دانەدانە لەناو خەڵکەکەدا حاڵیان دەکرد، جارجاریش یەکێک بەدەنگێکی گەورەو بەرز ئەیوت حەی...حەی خەڵکەکەی ڕائەچڵەکاند. لەنێوان ووتارەکان دا دەستەی فەقێکان بە موناجات و قەسیدەکان بەشداریان دەکرد و ئەوەندەی تر کۆڕەکەیان ئەڕازاندەوە، دواجار بە ووتارێکی بنەماڵەی شێخ لەلایەن شێخ سابتی برای شێخ عوسمانەوە کۆتای بەرێوەڕەسمەکە هات. هەڤالانی یەکێتی جگە لە خۆمان و کادرەکانی شارەزوور، کاک شێخ جەعفەر شێخ مستەفاو کاک کوردۆ قاسم و چەندین کەسیتر بەشدار بوون.

شێخ عوسمان پێشترو لەدەورانی مەلەکیدا لە عێراق ژیاوە و ماڵ و تەکیەو شوێنی نیشتەجێبوونی لە هەورامان و لە بیارەدا بووە، بیارە ناوەندی ناحیەو سەر بە قەزای هەڵەبجەیە. لە دوای شۆڕشی ساڵی١٩٥٨دا شێخ کۆچ ئەکا و هەواری ئەگوازێتەوە بۆ وڵاتی ئێران و لە ئاوایی دوو ڕوودا (دووئاو) لە جێگەیەک بەناوی مەحمود ئاوا لە نزیک ئاوایی سەوڵاوا نیشتەجێ دەبێت.

ئەسەدوڵا عەلەم وەزیری دەربارەی شاهەنشا لە کتێبی بیرەوەریەکانیدا بەناوی( یادداشتهای علم )، باسی سەردانێکی حەزرەتی شێخ و کوڕەکانی دەکات بۆ تاران و چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەسەدوڵا، بە پیاوێکی گەورە ناوی دەبات و دەڵێت کەڵکی بۆ ئێران دەبێت. هەروەها لەیاداشتەکانی ساڵی ١٣٥٢ی عەلەم و لەرۆژی چوار شەممەی ٧ مانگی ئازەردا دەڵێت: سەرلەبەیانی چاوم کەوت بەشا، ئاگادارم کرد لە داواکاریەکەی شێخ عوسمان نەقشبەندی، کە بەیانییەک زوو سەردانی کردبووم، ( پیاوێکی خاوەن

جەماوەرە لە کوردستان، هەروەها لە عێراقدا لایەنگری زۆرن)، ئەیەوێت لە تاران خانەقا دروست بکات، فەرمووی یارمەتی بدەن.

لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران و ڕووخانی ڕژێمی شای ئێران، لە ساڵی ١٩٧٩دا جارێکیتر گەڕایەوە بۆ عێراق و ماوەیەک لە بیارەدا مایەوە، دواتر کۆچی کرد بۆ شاری بەغداو لەبەغداشەوە بۆ وڵاتی ئوردن و لە ئوردنیشەوە بۆ وڵاتی تورکیا و لە ئەستەنبووڵ گیرسایەوە، دواجار لەوێ و لەووڵاتی غەریبیدا ساڵی ١٩٩٧وەفاتی کرد.

حەزرەتی شێخ عوسمان دوای خۆی سێ کوڕی مابوون بە ناوەکانی شێخ مەلیک، شێخ ناسیح، شێخ د. مادح ، شێخ مەلیک و شێخ ناسح کۆچی دواییان کرد، شیخ د. مادح لەژیاندا ماوە، شێخ ناسیح دۆست و هاوڕێیەکی خۆشەویشت بوو بۆمن، لەدوای ڕاپەڕینەوە هاتەوە کوردستان و لەشاری سلێمانی دادەنیشت و جارجاریش دەگەڕایەوە بۆ ئەوروپا، پیاوێکی کراوە و ڕۆشنبیرو کۆمەڵایەتیی و بەوەفا بوو بۆ هاوڕێکانی.

## سەردانی کۆمیتەکان و ئاڵوگۆڕ ۱۹۹۸/۲

لەم ماوەدا خەڵکی هەورامان و ئاواییەکانی دەورووبەری هەڵەبجە و دەشتی شارەزوور دەهاتن وسەردانی مەڵبەندیان دەکرد، هەم بۆ پیرۆزبایی لەمن و هەم بۆ پیرۆز بایی لەمەڵبەند بەبۆنەی جەژنی رەمەزانەوە، لەو سەردانانەیان دا هەموو داواکاری پشتگیری مەڵبەندیان دەکرد بۆ ئاوەدان کردنەوەی گوند و ناوچەکانیان، لەوبارەوە بەرپرسی مەڵبەند کاک شەوکەت هەوڵ و تەلاشی بەرچاو بوو.

هەرلەو چوار چێوەدا رۆژی ۱۹۹۸/۱/۲۷ وەفدێکی خەڵکی تەوێلە لەگەڵ کاک جەمیل هەورامی و منیش لەگەڵیاندا چووینە بارەگای مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتیمانی و لەگەڵ کاک دکتۆر فوئاد مەعسوم دا کۆبووینەوە بۆ دوو مەبەست، یەکەم : پشتیوانی خۆیان ڕاگەیاند سەبارەت بە دەست پێشخەری جەنابی مام جەلال بۆ ئاشتی، دووەم : داوای ئاوەدان کردنەوەی هەورامانیان کرد، وەفدەکەی هەورامان پێک هاتبوو لە: محەمەد سان ئەحمەد (مام ڕەیس)، مامۆستا مەلا سەید عەبدولڕەحمان، مامۆستا مەلا سەید ڕەشاد، باقی حەسەن هەورامی، حاجی اللەکەرەم حاجی تەوفیق، ڕافیع عەزیز حەبیب، عەبدولی عەلیە ڕەش، مامۆستا ئەیوب کوێخا ڕۆستەم، عوسمانی سۆفی حەمەکەریم.

دکتۆر هەم سوپاسی کردن و هەم بەڵێنی پشتیوانی پێدان. ڕۆژی ۱/۲۸ گەڕامەوە بۆمەڵبەند و پێشوازیم کرد لە هەڤالانی ڕێکخستن و پێشمەرگە دێرینەکان خۆشمان ئامادەکرد بۆ بەیانی ڕۆژی ۱/۲۹ کەیەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانە بۆ پێشوازی خەڵک لە بارەگای مەڵبەندا.

رۆژی جەژن خەڵکێکی زۆر رویان کردە مەڵبەند و لەگەڵ هەڤالان پێشوازیمان کردن، لایەنە سیاسییەکانی هەڵەبجەش سەردانیان کردین لەوانە بزووتنەوەی ئیسلامی، یەکگرتووی ئیسلامی، ڕاپەڕینی ئیسلامی و حزبی شیوعی. ئێمەش پاش نیوەڕۆی هەمان رۆژو رۆژانی دواتر سەردانی ئەولایەنانەمان کرد کەهاتبوونە لامان لەگەڵ سەردانی رابەری گشتی

بزووتنەوەو جێگرەکەی، هەروەها سەردانی زانایانی ئاینی و چەندین ماڵی شەهیدان. سەردان و بەسەرکردنەوەی خەڵک بۆلای ئێمە و ئێمەش بۆلای خەڵــک و بنەمــاڵەی شــەهیدان و نەخــۆش و پیــاوە دیارەکــان تــا رۆژانی٣٠و١٩٩٨/١/٣١ هەر بەردەوام و درێژەی کێشا. لەگەڵ سەردانیان بۆ مەڵبەند نوێنەرانی ئاوایی بەشارەت و سازان داوای هاوکاری و پشتیوانی مەڵبەندیان دەکرد بۆ ئاوەدان کردنەوەی ئاواییەکانیان.

ڕۆژی ١٩٩٨/ ٢/١ کاک شەوکەت گەڕایەوە مەڵبەندو منیش چوومە سلێمانی بۆبەشداری پرسەی میرزا فازل (فالەی ئەشکە) پیاوێکی خوێنەوارو دەوڵەمەنی دەورانی عەشایری بووە لەهەورامان، پیاوێکی ژیرو قسەزان بوو، دەڵێن کاتێک باوکی کچی دوای کردووە پارەی سپی ئەوکاتی بەمەن (کەوچ) لەنێوان وەرەسەیدا دابەش کراوە.

ڕۆژی ٢/٢ لەگەڵ چەنـد میـوانێکی کـوردی ڕۆژهەلات چـووین بـۆ دەربەندیخان بۆلای کاک عەدنان و پاش نیوەڕۆدوا گەڕامەوە بۆ عەربەت و ســەردانی بارەگــای ڕادیــۆی شــارەزوورم کــرد. ســەلاحە رەش باســی کەموکورتی ڕادیۆکەی کردو منیش بەڵێنم پێدا بۆی چارەسەربکەم.

دوای سەردانی بارەگای ڕادیۆ سەردانی بارەگای کۆمیتەی تانجەرۆم کــرد و لەگەڵ کــاکە حەمەی غەفــور دانیشــتم و ســەبارەت بەکێشــەکانی ناوکۆمیتەکەیان قسەی کردو منیش چەند پێشنیارێکم بۆ کرد بۆ چارەسەر. کۆمیتەکەی پێک هاتبوو لە سێ کارگێرو حەوت ئەندام کۆمیتە شەشی کەرتی هەبوو دوانی متەفەرقەو کەرتیان نەبوو. بەم شێوەی خوارەوە:

شەفیق ئەحمەد عەلی/ بەرپرسی رێکخراوەکان، عەلی مستەفا / ئیدارە و مالیە، لەیلا عەبدولکەریم / پەیوەندیەکان و سەرپەرشتی کەرتی ژنانی دەکرد. کەرتی عەربەت- محەمەد مەحمود حەمە ئەمین. کەرتی برایەتی – فاتح فەرەج. کەرتی مامۆستایان- مامۆستا رەزا باپیر، کەرتی فەرمان بەران – عەلی حسێن. کەرتـی جووتیـاران _ ئیبراهیم ئەحمەد حەسەن (برایمی زەراعە). کەریم عەدولقادر ئەندام بەشی رێکخستن. محەمەد ئەحمەد ئەندام بەشی ئامارو ئیدارە. ئەم کۆمیتە لە کۆمیتە چالاکەکان بوو.

دوای ئەوە لەوێ هەستاین، سەردانی بارەگای لقی ژنانمان کرد، بۆ پیرۆزبای جەژن، گوڵزارخان بەرپرسی لقی ژنانی شارەزوورە، ژنێکی بەڕێز و عاقڵە لای من ڕێزی تایبەتی هەیە.

کاتژمێر ٤ی پاشنیوەڕۆ کاک شەوکەت و مامۆستا جەمال و کاک حەمە شارەزووری هاتنە لامان و لەوێوە کاکە حەمەی غەفوریشمان بردو چووین بۆ لای بارەگای کۆمیتەی قەزای شارەزوور(هەڵەبجەی تازە). کۆمیتەکەیان دوبارە ڕێک ئەخەینەوە، کاکە حەمەشارەزووری دەبێتە بەرپرسی کۆمیتەو مەلا ئەحمەد، ئەگوازینەوە بۆ سەیدسادق، بۆ جێگەی بەکری زەراعە بەبەرپرسی کۆمیتە. هەر ئەمڕۆ لە کۆمیتەی هەڵەبجەی تازەدا جگە لەمەلا ئەحمەد بەرپرسی کۆمیتەکە گوازرایەوە، مەلا حسێنیش بەپلەی کارگێڕ گوازرایەوە بۆ کۆمیتەی پێنجوێن، مامۆستا ئەیوب ڕۆستەمیش بەپلەی خۆی بۆ مەڵبەند گوازرایەوە.

هەیکەلی کۆمیتەی نوێ بەم شێوەی خوارەوەی لێهات:

حەمە شارەزووری بەرپرسی کۆمیتە.

ئەختیار عەزیز کارگێڕی ڕێکخستن.

عومەری حاجی حەمەئەمین ڕێکخراوەکان

سەرتیپ سابیر لێپرسراوی کەرتی هەڵەبجەی تازە

کامەران کەریم قازی –کەرتی سیروان

ئەمیرە سەدیق – کەرتی ژنان

ئەحمەد قاجری –کەرتی زەڕایەن

سەرکەوت سەرحەد – کەرتی نەسرت

عومەر خەرجانەیی – کەرتی جووتیاران

مامۆستا نوری ڕەشید– کەرتی مامۆستایان

ئەنوەر ڕەشید – ئەندام کۆمیتە بەرپرسی پەیوەندیەکان

ڕەحمانی حەمەلاو – ئەندام کۆمیتە لەبەشی ڕێکخستن.

شەوی ٢ لەسەر٣/ ٢ لەقەزای شارەزوور بووین، ڕۆژی١٩٩٨/٢/٣ بەیانی زوو هەستایین، بڕیاربوو دوای کاتژمێر ١٠دەی سەرلەبەیانی کۆبوونەوە بکەین لەگەڵ ستافی نوێی کۆمیتەدا، بەر لەکۆبوونەوەکە بەشداری

چەند پرسەیەک و سەردانی چەند ماڵێکمان کرد لەوانە: خوشکێکی قادری میرزا کەریم نەورۆڵی، خەزووری شەهید مەحمود گەرمیانی، ماڵی سەید نورەدینی هانەسورەیی و ماڵی کاکە حەمەی مەلامارف.

دوای پرسەکان دەستمان کرد بەکۆبوونەوە لەگەڵ ستافی نوێی کۆمیتەکەدا، سەرەتا پیرۆزبایمان لێکردن و دواتر داوامان لێکردن، لەئەنجامدانی ئیشوکاری حزبیدا گورجوگۆڵ و لە چوونە ناو خەڵکو تێکەڵاوی جەماوەردا چالاکبن. داوامانکرد کەدەبێت ستافەکەیان یەک گرتوو بێت، رێز لەیەک بگرن و بەدژی یەکتر قسەنەکەن، بچنە ناوخەڵک، داوا بکەن لە هەمووکەس، کە هاوکارمانبن و شەرم نەکەن لەوەی خولکی خەڵک بکەن بۆ لایەنگری و هاوکاری کردنی یەکێتی، بەشداری رێوەڕەسم و هەموو کۆڕو کۆبوونەوەکان بکەن، بەشداری خۆشی و ناخۆشی خەڵکبن، خۆیان واتە کادرەکان لەناو خەڵکدا دیارن، بۆیە دەبێت دەست و دەم و داوێن پاکبن و رێز لە پیاوانی ئاینی و پیرۆزیەکان بگرن. هەموو ئەو رێگایانە بگرنە بەر کەبەهۆیانەوە خەڵک لەدەوریان کۆدەبێتەوە. لەگەڵ ئەوشدا دەبێت ریزەکانی رێکخستن پاکبکرێتەوە لەخەڵکی خراپ، کادرەکانی کەپۆستی ئیدارەیان هەیە دەبێت نموونەی خەڵکی دڵسۆزو ئیشکەربن، دەوامی رێک و پێک بکەن، هاوکاری و کارئاسانی بۆ ئەو هاووڵاتییانە بکەن کەڕێیان ئەکەوێتە ئیدارەکانیان....تاد.

دوای کۆبوونەوەی کادرەکانی کۆمیتەکە، ئەو هەڤاڵانەمان بانگ کرد لە دائیرەکاندان، ئەوەی لەبیرم بێت، ١- کاک شاهۆی شێخ حەمەئەمین، بەرپرسی ئیدارەو مالیە، ٢- مامۆستا مەحمود جێگری بەڕێوبەری قوتابخانەی ئەحمەد موختار، ٣- عەلی حاجی عەبدوڵای زەڵمی بەڕێوبەری ئاو ئاوەڕۆ، ٤- عەزیز گوڵپی بەرپرسی فەرمانگەی کارەبا، پێمان راگەیاندن لەم بەرواروەوە ئەندام کۆمیتە نین و لادراون. زیاتر لەسەر ئەوە بوو لە ٣١ ئابدا هەڵوێستیان نەبووە، شاهۆ بەرگری کرد لەخۆی ووتی نەخۆش بووم لەچۆمان مۆڵەتم وەرگرتووە گەڕاومەتەوە.

پاشنیوەڕۆی هەمان رۆژ هاتینە عەربەت و لە بارەگای کۆمیتەی تانجەرۆ کۆبوونەوەمان کرد بە پێشمەرگەکانی هێزی دووی مەڵبەند، لەم کۆبوونەوەدا ئەوانیش ئامۆژگاری و رێنوێنی کران بۆ ئەوەی ئەرکەکانیان بە

ڕێکوپێکی بەڕێوە بەرن ، پاشان ئەو ڕێنوێنیانەی لە فەرماندەیی گشتییەوە دەرچووبوون، پێیان ڕاگەیەنران. لەوانە، نەمانی پلەی فەرماندە کەرت و جێگر کەرت، تەنها پلەی فەرماندە تیپ و فەرماندەی هێز و جێگری فەرماندەی هێز ماوە، هەروەها لەمەودوا پێشمەرگەی خێزاندار یارمەتی مانگانەی بووە بە ٧٠٠ حەوت سەد دینار و سەڵتیش بووە بە ٦٠٠ شەش سەد دینار.

دوای ئەم کۆبوونەوە لەگەڵ هێزەکەدا، کۆبووینەوە لەگەڵ کۆمیتەی شەهیدان و کەم ئەندامانی شارەزووردا کرا، بەرپرس و جێگری ئەم کۆمیتەیە هەڤاڵان عومەری حاجی مەحمودی تەپەتۆڵەکە و مەحمودی میناله بوون، بارەگای کۆمیتەکەش لەناحیەی تانجەرۆ لەعەربەت دا بوو.

ئەم ماوە کەبەرۆژدا سەرقاڵی ئیشوکارم بەشەویشدا خەریکی پاکنوس کردنی کتێبی وەرگێڕدراوی بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگم، لە ڕۆژی ١٩٩٨/٢/٤دا کۆبوونەوەمان لەگەڵ ستافی کۆمیتەی سەیدسادق دایە، ئەمڕۆ کاک بەکری زەراعە لە بەرپرسی کۆمیتەی سەیدسادقەوە گوازرایەوە بۆناو مەڵبەند، کاک مەلا ئەحمەدی جەیرانیش لە هەڵەبجەی تازەوە هێنرایە سەیدسادق و دانرا بە بەرپرسی کۆمیتەکە. ستافی تازەش دانران، لە کۆبوونەوەی ئەمڕۆی ئەم کۆمیتەیەش هەمان ئەو ئامۆژگاری و ڕێنوێنیانەی درابوونە کۆمیتەی هەڵەبجەی تازە دران بەمانیش.

ئەمە تەشکیلاتی نوێی کۆمیتەی سەیدسادقە:

ئەحمەد حەمەساڵح بەرپرسی کۆمیتە. عەلی مستەفا کارگێڕی کۆمیتە.

فازل نەسرەدین کارگێڕی کۆمیتە. ئەحمەد حەمە عەزیز ئەندام کۆمیتە.

عەلی عەبدوڵا شەریف ئەندام کۆمیتە. نەجیب عەبدوڵا گامێش تەپەیی ئەندام کۆمیتە

عەبدوڵا عەبدولقادر ئەندام کۆمیتە. بەناز دەروێش ساڵح کارگێڕی کەرتی ژنان

ئەندام کۆمیتە فەخریەکان

هوشیار مستەفا، بەڕێوبەری ناحیە. نامق عەبدولکەریم، بەڕێوبەری کشتوکاڵ.عەبدوڵا حەمەعەلی، جیگری لێپرسراوی جووتیارانی شارەزوور.

ماجد محەمەد ئەحمەد، کارمەندی شارەوانی. ماجد عەبدوڵا کارمەندی گومرگ.

لەم کاتەدا دەستمان کردبوو بە کۆبوونەوەکان و دووبارە ڕێکخستنەوەی بەشەکانی مەڵبەند و کۆمیتەکان، ئەوەبوو جەنابی مام جەلال لەگەڵ کاک د.فوئاد و چەند کەسێکی تردا ڕۆژی ١٩٩٨/٢/٦سەردانی تارانی کردو کاک شەوکەتیش لەگەڵیان ڕۆیشت، بەڵام بەر لەڕۆیشتنی کاک شەوکەت بەرپرسی مەڵبەند، ڕۆژی ٢/٥ من دانیشتم لەگەڵ کاک شەوکەت پێکەوە قسەمان کرد لەسەر ئەوە تادەگەڕێنەوە چی دەکەین. ئەم ماوە ڕۆژانە سەرگەرمی ئیشوکارین و ڕۆژانەش پێشوازی لە میوان و ئەوکەسانە دەکەین کەسەردانمان دەکەن.

ڕۆژی٢/٦ نوێنەری مەڵبەند کاک جەبار جەلال سەردانی یەکگرتووی ئیسلامی کردو بەبۆنەی ساڵیادی دامەزراندنیانەوە ووتاری مەڵبەندی خوێندەوە، یەککگرتووی ئیسلامی لە ڕۆژی ١٩٩٤/٢/٦دا خۆیان راگەیاندووە.

لە ڕۆژی٢/٧دا گرژی لە هەڵەبجەدا دروست بوو، لەسەر ئەوە کەئاساییش لە شارۆچکەی سەیدسادقدا خەڵکی ئەوانی گرتووە، چوونکە بەچەکەوە بەشێوەیەکی نائاسایی بەناو بازاردا گەڕاون، ئەوانیش لەسەر جادەی سەرەکی نێوان هەڵەبجە و سەیدسادق لە ئاواییی گردەنازێ بازگەیان دانابوو، بۆگرتنی ئەندام و لایەنگرانی یەکێتی. بۆیە لەگەڵ بزووتنەوە لە هەڵەبجە پێکەوە دانیشتین و لیژنەیەکمان دروست کرد بەنوێنەرایەتی هەردوولامان چوون بۆ چارەسەر کردنی کێشەکە. شەو لەگەڵ کاک کۆسرەت و مەکتەب ڕێکخستندا لە بارەی ئەو گرژی و ئاڵۆزیەوە قسەمان کرد، ئەمشەو بەیانیش خەڵکێکی زۆری خۆمان لە شوێنەکانی ترەوە پەیوەندیان دەکردو لەبارەی ئەو ئاڵۆزیەوە پرسیاریان دەکرد، بەتایبەت ئەوانەی هاتوچۆی ناوچەکە دەکەن، ئەم جۆرە کێشانە پێشتر و دواتریش بەردەوامن لەهەر ناوچەیەکی تری کوردستاندا لەسەر پابەند نەبوونیش بێت بەرێنماییەکانی هاتوچۆوە هەرکەسێکی سەر بەبزووتنەوەی ئیسلامی سزابدرێت، ئەوان لە سنووری هەڵەبجەدا خەڵکی سەر بەیەکێتی ئەگرن و سزای دەدەنەوە.

لێرەدا دەبێت بڵێم لە دوای ساڵی ١٩٩٢وە تاساڵی ٢٠٠٣ خەڵکی سەربە یەکێتی نیشتیمانی لە سنوورەکەدا لەلایەنگرو دەنگدەرەوە تا ئەندامان و کادران و پێشمەرگە هەمیشە لە مەترسی دابوون و مەرگ چاوەڕوانی کردون، بۆیە ئەوانەی لەو ١١یانزە ساڵەدا لە هەڵەبجە و سیروان و خورماڵ و ئاواییەکانی ناوچەکەدا مانەوە جێگەی ستایشن، زۆریان ماڵ و سەروەت و سامان و هەتا ئوتۆمۆبێلیشیان بەتاڵان براو تائێستاش یەکێتی بۆی نەپرسیونەتەوە، لە کاتێکدا خەڵکێک هەن لەپەنای یەکێتیەوە بە ملیۆنان دۆلار و دینار سەروەت و سامانیان کەڵەکە کردووە یەک ڕۆژیش بۆ خەبات لەناو یەکێتیدا یەخەی کراسەکەیان چڵکی نەگرتووە.

لە ڕۆژی ٢/٩دا لەگەڵ هەڤالان جەبار جەلال و مەحمودی حاجی ساڵح فەرەجی حەمەساڵح دا چووینە سلێمانی سەردانی پارێزگار مامۆستا جەمال عەبدولمان کرد و وکۆبووینەوە قسەمان لەسەر خۆئامادە کردن کرد بۆ بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمی ساڵیادی ڕۆژی ٣/١٦ی کیمیاباران کردنی هەڵەبجە. مامۆستا جەمال عەبدول حەمەئەمین پیاوێکی کورد پەروەر دڵسۆز بۆ گەل و نیشتیمان، خۆشەویست لەناو جەماوەردا، دەست و دەم و داوێن پاک، نەرم نیان، خۆزگە لەهەر ناوچەیەکی کوردستاندا، کورد و کوردایەتی چەند بەرپرسێکی لەوێنەی مامۆستا جەمال عەبدول هەبووایە. دواتر و هەمان ڕۆژ سەردانی د.ئەرسەلان بایزمان کرد بووەتە بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخستنی یەکێتی و باسی زیادەی موچەی ئەو ١٩٧مامۆستیانەمان کرد کەلە لادێکانی سنووری مەڵبەندی شارەزووردان، چوونکە زیادەی ئەو موچە یەکێتی ئەیدات. هەرهەمان ڕۆژ بەفرسەتمان زانی سەردانی کاک ئاوات عەبدول غەفور بکەین بۆ پیرۆزبای بەبۆنەی دەست بەکاربوونی لە ئاسایشدا.

ڕۆژی ٢/١٠ لە عەربەت پێش نیوەڕۆ لە بارەگای کۆمیتەی تانجەڕۆ کۆبوونەوەمان کرد لەگەڵ ستافی کۆمیتەکە، سەبارەت بە گورجوگۆڵ کردنەوەی هەڤالان و چوونە ناو جەماوەریی خەڵک قسەمان کرد. دواتر سەردانی فەرماندەیی شارەزوورمان کرد لەسەراو قسەمان لەسەر پرچەککردنی لەشکری مەڵبەند کرد بەتایبەت ئەو یەکانەی لەشکەرەکە کەلەوبەری پردی زەڵمن، واتە بەری هەڵەبجەو هەورامان.

شەوی ٢/١١ لە بارەگای مەڵبەند کۆبوونەوەمان لەگەڵ کارمەند و پێشمەرگەو کارگێڕ و ئەندام بەشەکاندا کرد سەبارەت بەشێوەی ئیشوکاری خەفەرو پاسەوانی و ئیدارە و هەموو ئەو ئەرکانەی پەیوەندیان بەئەوانەوە هەیە لەدوای دەوامی ڕۆژ تاڕۆژی دواتر دەوام ئەکرێتەوە، بەرنامەی نوێ و دەفتەری نوێی یاداشتی خەفەراتمان دانا.

پێش نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی لە بارەگای فەرماندەی بەشداریمان کرد لە ڕێوڕەسمێکی کۆمەڵایەتیی بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نێوان تیرەی باشکی و هەمەوەندییەکان، باشکی ناوی تیرەیەکی سەر بەعێلی گەورەی جافە، جاف سەرەتاو لەدێر زەمانەوە، لەڕۆژهەلات لە هەرێمی کرماشان و بەشیکی سنەدا ژیاون، ئەوکات ئێران زەمین لەژێر دەستی ساسانی و سەفەویەکان و دوای ئەوانیش قاجاریەکاندا بووە، سەرەتای کۆچی جاف لە ساڵی ١٧٣٧ تەوە دەست پێئەکات ڕاست دەورانی سەفەویەکانە، ئەردەلانییەکان لە ژێردەستی سەفەویەکان دان، بابانەکانیش لەژێردەستی عوسمانییەکان و سوڵتان موورادی چوارەم دابوون ئەو دەورانە، کێشە لەنێوان جاف و ئەردەلانەکان دروست ئەبێ و ئەکێشێ بۆ شەڕو کوشتار، بۆیە یەکەم کۆمەڵی خێزانی جاف لەژێر دەستی ئەردەلانەکانەوە کەسەد ڕەشماڵ بوون کۆچ ئەکەن بۆدەشتی دزیئایش بۆلای بابانەکان بە سەرۆکایەتی کەسێک بەناوی زاهیر بەگ، نازناوی مورادی بۆ سەر ناوی جاف، لەهاوکاری جافەکانەوە هاتوە بۆ سوڵتان موورادی چوارەم.

دزی ئایش ئەوکات مەبەست لە دەربەنی خان و دەوروبەریەتی لەوانە کانی سارد، سەلیم پیرک و بانی خێڵان، لەڕێوڕەسمەکەدا جەماوەرێکی زۆر و نوێنەرانی لایەنەسیاسییەکان و بەرپرسانی حکومی و زۆربەی سەرۆک تیرەکانی هۆزی جاف و خزمانی هەمەوەند ئامادەبوون، بەشی کۆمەڵایەتیی مەڵبەندی شارەزوور سەرپەرشتی ڕێوڕەسمی ئاشتبوونەوەکەیان دەکرد. کێشەکە ئەوە بوو پێشمەرگەیەکی خۆمان کە کوڕی یارئەحمەدی موانی بوو پێشمەرگەیەکی لای کاک فاروقی کوڕی کەریم ئاغای هەمەوەندی بە هەڵە کوشتبوو لە بازگەی سەیدسادق دا، ئەوانیش واتە هەمەوەندیەکان کوڕەکەی یارئەحمەدیان لە جێگەدا کوشتبووەوە، کەسەر بەتیرەی باشکی بوو.

لە کۆبوونەکەوە ڕۆیشتین بۆ بەشداری کردنەوەو داگیرساندنی پرۆژەی کارەبای ئاوایی گامێش تەپەی دەشتی شارەزوور، دوائیشی ئەمرۆم و دوای گامێش تەپە کۆبوومەوە لەگەڵ ئەوستافەی خەریکی دروست کردنی بینای بارەگای مەڵبەندن لەناو شارۆچکەی سەیدسادق دا، ئەوستافە دوو کەسی باوەڕ پێکراوی مەڵبەندن بەناوەکانی کاک بەختیاری عەلی حەمەگیانە و حاجی خەسرەوی ئیبراهیم ڕەزا هەڵەبجەیی لەگەڵ ئەندامێکی مەڵبەندا بەناوی کاک جەلالی حاجی کاکەلی.

لەبەر ئەوە ئەم برادەرانە ڕاسپێردرا بوون بووجەی تەواومان نەبوو بۆ تەواو کردنی بیناکە، ئەمان خۆیان کاسب بوون و بەخۆبەخشانە کاریان دەکرد. کاک شەوکەت بەنییەتی گواستنەوەی بارەگای مەڵبەندەکەی لە هەڵەبجەوە بۆ ناو سەیدسادق ئەم بینای دروست کرد، من ڕای خۆم لەوبارەوە بەکاک شەوکەت وتبوو، ئەمزانی مام جەلال ئەوە قبوڵ ناکات. کەتەواو بوو نەمان ئەتوانی بەبێ مۆڵەتی سەرووی خۆمان بگوازینەوە، هەندێک لەبرادەرانیش ئاگام لێبوو کاک شەوکەتیان پێچابوو ئەیان ووت بابگوازینەوە بۆسەیدسادق، بۆیە لەکۆبوونەوەیەکی مەکتەبی ڕێکخستندا کاک شەوکەت بەر لە کۆبوونەوەکە بەمنی ووت تۆ پێشنیاری گواستنەوەی بارەگای مەڵبەند بکە لە هەڵەبجەوە بۆ سەیدسادق لای کاک ئەرسەلان بایز، ووتم من ئەو پێشنیارە ناکەم.

لەدوای کۆبوونەوەکە کاک شەوکەت ووتی بەکاک ئەرسەلان لە هەڵەبجە شوێنمان نییە و لە سەیدسادق بینای نوێمان هەیەو ناوەڕاستی سنووری مەڵبەندەکەشە بۆنەگوازینەوە؟ کاک ئەرسەلان بایز ووتی ئەوە لە دەستەڵاتی مندا نییە، بەجەنابی مام جەلال بڵێن. کاک شەوکەت ووتی مادام وایە باحەمە بڕوات بۆلای مام و ئەم باسەشی لەگەڵ بکات، کاک ئەرسەلان بە ئاماژەی بڕۆ بۆمن ووتی نەکەی.

کاک ئەرسەلان ووتی خۆتان ئەزانن منیش ووتم دوایی خۆمان لەمەڵبەند قسەی لەسەر دەکەین، کۆبوونەوە تەواو بوو و هەستاین کاک ئەرسەلان بردمیە لاوە ووتی شتی وابەمام جەلال نەڵێیت لێت تورە دەبێت. ووتم قوربان من ئامادە نەبووم ئەمە بەتۆ بڵێم ئێستا چۆن بە مام جەلال ئەڵێم، ووتم بڕۆ هەڵتەکاندنەکەت لەوەی شەهید نیازی دەچوو، پرسی چۆن؟

ووتم ساڵی ١٩٨٢ لەشەڕی هێزی پشتیوان بەشاخەکەی پشتی ئاڵوەتانەوە بووین، سێ شەورۆژ لەبەر سەرماو بێ خەو خۆراک بووین، ئەوکات کاک شەوکەت فەرماندەی تیپی ١١ی هەورامان و ئێمەش فەرماندە کەرت بووین، پاش نیوەڕۆی ڕۆژی سێهەم کاک شەوکەت ناردبووی بێت بۆئێرە، نزیکەی ١٠٠سەد مەترێک هاتمە خوارتر، بینیم کاک شەوکەت و شەهید نیازی لەپەنایەکەوە دانیشتون، دوای سڵاو کردن لەلایاندا دانیشتم کاک شەوکەت ووتی بارودۆخەکە خراپە و ئەگەر وا بڕوات پێشمەرگە بەدەسمانەوە نامێنن بۆلەبۆل دەستی پێکردووە، منیش ووتم جا چی بکەین؟ ووتی لەگەڵ کاک عومەر عەبدوڵا قسەم کردووە بەڵکو بمان گۆڕن، منیش ووتم زۆرباشە دەستت خۆش، دەستی کرد بەباخەڵی پاڵتۆکەیدا دەفتەرێکی دەرهێناو ووتی ئەوە قەڵەم و کاغەز تۆ بروسکەیەک بکە بۆ مام جەلال، داوا بکە بابتان گۆڕن، منیش دەفتەرەکەم لەدەس وەرگرتوو ووتم چی بنوسم؟ نیازی بەئاماژەی برۆ ووتی نەکەی، منیش پەشیمان بوومەوەو ووتم وەڵا کاک شەوکەت من بروسکە ناکەم. بۆخۆت یان کاک نیازی یان مامۆستا شاهۆ نایکەن؟ ووتی لەبەر ئەوە مام جەلال تۆی خۆش ئەوێت، ووتم نا، نەمکردو گەڕامەوە بۆ شوێنەکەی خۆم.

لە باسەکەی خۆمان لامان داوە، بەڵی لە٢/١٢ پێنج شەمە لە بارەگای مەڵبەند کۆبوونەوە لەگەڵ ستافەکانی هەردوو کۆمیتەی هەورامان و هەڵەبجە کرا، ٢٣بیست وسێ کادری هەردوو کۆمیتەکە ئامادە بوون، قسەوباسەکانی ئەم کۆبوونەوەمان بۆ لێکدانەوەی هەردوو کۆمیتەکەیە لەچوار چێوەی یەک کۆمیتەدا. لە٢/١٤ دا دوای ئیشوکارو ڕایی کردنی هونەرمەندانی هەڵەبجەی تازەو نوێنەرانی هونەرمەندانی هەورامان و خورماڵ کەئەوانیش هەرلەوێوە هاتبوون، دەستمان کرد بە کۆبوونەوەی بەشی ڕاگەیاندن، لەسەر جیاکردنەوەی بەشی هوشیاری لەڕاگەیاندن و ڕادیۆش بەجیا وەک بەشێک، بەشداربوانی کۆبوونەوەئەمانە بوون: فەرەجی حەمەساڵح، ئەیوب ڕۆستەم، عەلی حاجی فەرەج و عومەر عەبدولکەریم.

لە١٩٩٨/٢/١٥دا کۆبوومەوە لەگەڵ نوسینگەی مەڵبەند، نوسینگە وەک بەشێک کادری خۆی هەبوو ، بەڵام ئیشەکانیان کەم و کورتی تێدا بوو ئەویشمان ڕێک خست. کاک شەوکەت ئەمڕۆ گەڕایەوە مەڵبەندو پاش نیوەڕۆ

لەگەڵ کاک شەوکەت و کاک فەرەجی حەمەساڵح دا کۆبووینەوە پێشنیارەکانی کۆبوونەوەی ڕۆژی پێشترمان کردە بڕیارو بە کاک شەوکەتم ئیمزا کرد بەم شێوەی خوارەوە: ١- عومەر عەبدولکەریم گوازرایەوە بۆ بەشی پەیوەندیەکان.٢- کەمال هەورامی جێگری کاک فەرەج و چاودێریکەری پەیام نێرەکانی (ت ڤی) . ٣- کاک عەلی حاجی فەرەج بەرپرسی بەشی هوشیاری و ڕۆشنبیری. ٤- کاک ئەیوب ڕۆستەم بەرپرسی ڕاگەیاندن. ٥- سەلاحە ڕەش بەرپرسی ڕادیۆی شارەزوور. ٦- یاسین خالد و پشتیوان گوڵپی بۆ تیڤی. هەر ئەمڕۆ لەگەڵ بەشی ئیدارەو دارای مامۆستا فەتاح کۆبووینەوە. دوای نیوەڕۆش کۆبووینەوە لەگەڵ ڕێکخراوە دیموکراتیەکان هەڤاڵان جەبار جەلال و مامۆستا عوسمان و هەورامان حەمەنوری ئامادە بوون و قادر بێستانیش گوزرایەوە بۆ ئەم بەشە.

ئەمڕۆ ٢/١٩ دوای بەڕێ کردنی هەڤالانی کۆمیتەی تانجەرۆ و بەڕێوبەری ناحیە و سەرجەم بەرپرسی ئیدارەکانی ئاو کارەبا و پەروەردەو شارەوانی تانجەرۆ کە بۆ پیرۆزبایی دەست بەکاربوونی من هاتبوون، لەگەڵ ئەنجومەنی باڵای شاری سلێمانی کۆبووینەوە، ئەم ئەنجومەنە بۆ هەندێک نیشوکار سەردانی مەڵبەندیان کردبوو، لەوانە: شێخ حەسەن، مامۆستا عومەرو، مامۆستا جەلال و حاجی جەمال. ١٩٩٨/٢/٢٠ جەنابی مام جەلال لە ئێران گەڕایەوە، چاوەڕی ئەکرێت کوفی ئەنان ئەمڕۆ سەردانی بەغدا بکات بۆقسەکردن لەسەر ڕێگا چارەی قەیرانی ئەمریکا و عێراق، وەفدەکانی پارتی و یەکێتی لە کۆیە لە کۆبوونەوەدان.

ڕۆژی ٢/٢١ لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی مەڵبەندا بووین، دوای کۆبوونەوەکە بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی خوالێخۆش بوو حەمە پایدەری هەڵەبجەیمان کرد، دواتر چووم بۆ سەر قەبرانی قادر حامید پاڵانیایی، لەسەر قەبران بووین قەبرەکە تەواو بوو، ئاگاداریان کردین زیندو بووەتەوە، سەرقەبرانمان چۆڵ کرد و گەڕاینەوە، من بە فرسەتم زانی سەردانی مامۆستا کەریمم کرد نەخۆش بوو. لە ڕۆژی ١٩٩٨/٢/٢٢دا لە بارەگای مەڵبەند بەجیا لەگەڵ هەریەک لە هەڤالان جەبار جەلال و هەورامان حەمەنوری و مامۆستا فەتاحدا دانیشتنم کرد سەبارەت بەو لیژنەی لیکۆڵینەوە، کە پێشتر و بەر لەهاتنی من دروست کراوە لەسەر چەند کادرێکی مەڵبەند.

٢/٢٣ یش لە بارەگای مەڵبەند پێشوازیمان کرد لە وەفدێکی بزووتنەوەی ئیسلامی قسەمان کرد لەسەر زیاتر ئاشتی و پێکەوە ژیان و کارئاسانی بۆ هاتووچۆی تیمەکان و وەفدەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ ناوچەی هەورامان و خورماڵ، بۆ زیاتر خزمەت کردن و ئاوەدان کردنەوە، چوونکە ئەوناوچە بەهۆی شەڕو شۆڕەوە لەدەستی ئاوەدانی دوور بووە. دوای ئەوان کۆبوونەوەی ڕاگەیاندن کرا لەسەر ڕێوڕەسمی یادی ١٩٨٨/٣/١٦.

لە ڕۆژی ٢/٢٤دا هەمان کۆبوونەوە درێژەی پێدراو، لیژنەیەکیش لە ڕاگەیاندن دروست کرا بۆتەواو کردنی چارەسەری کێشەی کارمەندی هەردوو هەڤاڵ ئیمام باباله و ئاگری بورهان قانع. دواتر چوومە بارەگای قائیمقام لەگەڵ نوێنەری بزووتنەوەی ئیسلامی قسەمان کرد لەسەر چۆنییەتی بەڕێوەبردنی یادی ٣/١٦، ئێمە داوامان کردو ووتمان، ئەو یادە دەبێت حکومەت بیکات حزب دەست تێوەردان نەکات، ئەوانیش ئەیان ووت ئێوە خۆتانن حکومەت، ئەبێ لیژنەی هاوبەش دابنێین ئێمەش قبووڵمان نەکرد. ووتمان ئەوەتا قائیمقام کاک جەمیل عەبدولڕەحمانە و لەسەر میلاکی بزووتنەوەیە. تاڕادەیەک ئەوان ڕاستیان دەکرد ئەو چەند ساڵە یەکێتی یادەکەی دەکردەوە. لەم ماوەدا تیڤی گەلی کوردستان لە شارۆچکەی سەیدسادق و ئاواییەکانی دەوروبەریدا پەخشی خراپ و یان هەر نەبوو، بۆیە لەگەڵ ئیدارەی گشتی خەریکی دانانی بوورجێک بووین لەناو شارۆچکەکەدا پەلەمان بوو بۆ٣/١٦ تەواو ببێت، بۆیە ڕۆژی ٢/٢٥ کاک شەوکەت خەریکی ئەوە بوو. منیش لەگەڵ هەڤاڵانم لە هەڵەبجە خەریکی ئامادەکاری بووین تازۆرترین خەڵک بەشداری ڕێوەڕەسمەکە بکات.

ڕۆژی ٢/٢٦ پارێزگاری سلێمانی سەردانی ناوچەکەی کرد، ئێمەو مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی و نەهزەی ئیسلامی و قائیمقامی هەڵەبجە و سەرجەم ئیدارەکان و جەماوەرێکی زۆر چووین بۆ شارۆچکەی سیروان بۆ پێشوازی، ڕەنگە خەڵک هەبێت ئێستا ئەمە بخوێنێتەوە بڵێت بڕوانە چەند بێ ........ بوون، کاکە ئەوکات وابوو خەڵک حکومەتی خۆش ئەویست چاوەڕێی خزمەتگوزاری بوون، ئەوسەردەمە هەم بەرپرسەکان بڕێک دڵسۆز و هەم خەڵک زۆر ئاگای لەکردەوەو کاری نابەجێ و ناپەسەندی هەندێکیان

نەبوو، منیش ئەزانم ئێستاو دوای بیست وپێنج ساڵ حوکمڕانی نەک پارێزگار چەندین وەزیر و مەکتەب سیاسیش بێت بۆ هەڵەبجە، لەگەڵ ڕێزم بۆ دەستەڵات و ئێمەی سیاسییەکانی کورد مەگەر وەک بەعسییەکان بەزۆر دەوروبەرەکەی خۆمان یان موچەخۆرانی دەوڵەت، بەزۆر بتوانین چەند سەد کەسێک بهێنین و ڕیزیان کەین بۆ پێشوازی. بۆ؟ چوونکە خۆمان جیاکردەوە لە خەڵک، نێوانمان ئاسمان و ڕێسمانە. سامەگەر ئەوکاتەی ئەم دەسەڵات و حزبانە بەخۆدا بچینەوەو خەڵکەکە ئاشت بکەینەوەو ببینەوە بەپشتوپەنای هەژاران، ئەوەی بردومانە بیدەینەوە، داوای لێبووردن لە خەڵک بکەین، تێکەڵیان ببینەوە، ژیانی ئاسایی بکەین وەک ژیانی ئاسایی ئەوان. ئەمە روو دەدات؟ ئامادەین بیکەین؟ نازانم.

زووزوو لە باسەکان دەرئەچم بەدەست خۆم نییە. بابگەڕێمەوە، لەگەڵ جەنابی موتەسەڕیف لە سیروانەوە گەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە، پێش پێشانی ئوتۆمبێلەکان و بووق و فیقی ئەمبوولانس و ئۆتۆمۆبێلی ئەستێرە لەسەر شانەکان ئاپۆڕەی دیمەنێکی شلۆق و شێواو و ناشیرینی دروست کردووە، لە کەرنەڤاڵی گواستنەوەی بووک دەچێت. دوای ئیشوکارو بەسەرکردنەوەی ئیدارەکانی هەڵەبجە بۆ نیوەڕۆ میوانی مەڵبەندن، پاش نیوەڕۆیش پێکەوە سەردانی بیارەو تەوێڵەش دەکەین، بەڕێوەبەری ناحیەی خورماڵیش دیاری ئەکرێ و دەست بەکار دەبێت.

لەم ماوەدا من تازە نەفەسم شەوانەش هەر خەریکی کۆبوونەوە و بینینی خەڵکم، ئەوەتا شەوی ٢٦لەسەر١٩٨٨/٢/٢٧ لە ماڵەوە کۆبوونەوەم هەیە لەگەڵ کەمال هەورامی و ئەیوب رۆستەم و ئیمام باباڵە لەسەر بەرنامەی هەگبە و هەوارگە، بەرنامەیەکی تایبەتی ڕادیۆ و تیڤی گەلی کوردستانە.

ڕۆژی٩٨/٢/٢٨ لە مەڵبەند کۆبوونەوەمان هەبوو لەگەڵ هونەرمەندانی سلێمانی و هەڵەبجە و شارەزوور، بەشداری یادی هەڵەبجە دەکەن لە ٣/١٦دا کاک عەبدولی حەمەجوان بەرپرسی وەفدەکەیانە، پیاوێکی خۆشەویست و ئێسک سوکە. باسی ئەو بارودۆخەی هەڵەبجەمان کرد بۆیان کە بەهۆی ئیسلامیەکانەوە پێش هاتووە، ئەوانیش وتیان ناڕازی مەبن لەهەڵەبجە لەناو

سلێمانی و لەگەڕەکی قالاوا دوێنێ مەلایی گەڕەک و کۆمەڵێک خەڵک چوونەتە سەر قاوەخانەیەک، سەتەلایت و تەلەفزیۆنەکەیان شکاندوە.

## مانگی بۆنەکان

مانگی (٣) سێی سالی میلادی بۆ کورد، دوای ڕاپەڕینی سالی ١٩٩١ بە مانگی بۆنەکان ناسراوە، لەوانە کیمیابارانی هەڵەبجە لە٣/١٦ی سالی ١٩٨٨دا، ڕاپەڕینی جەماوەریی کوردستان لە٣/٥ی سالی ١٩٩١ و نەورۆزی کوردان و سەرەتای سالی نوێی هەتاوی لە ٣/٢١ی هەرساڵێکدا.

بابچمە لای بیرەوەریەکانم لە مانگی بۆنەکانی سالی ١٩٩٨دا. ئەمەوێت تەنها لەم مانگەدا بیرەوەرییەکانی ڕۆژانە بگێڕمەوە، دواتر ئەو ڕوداو پێشهاتانە بگێڕمەوە کەبابەتن، چوونکە تۆمارکردن و نوسینی وردو درشتی کاری ڕۆژانە زۆری ئەوێ و بەچەندین بەرگ کتێب تەواو نابێت، وا بزانم گێرانەوەی کاری ڕۆژانەی مانگی ١٩٩٨/٣ وەک نموونە بۆ مانگەکانی تری ساڵ بەس بێت، بەم شێوەی خوارەوە: ڕۆژی٣/١ خەریکی ئامادەکردنی بابەتێکم کەلەفارسیەوە وەرم گێڕاوە، ناونیشانی بابەتەکە بەفارسیەکەی ئەمەیە(صفت کوهی اورامان) بڕیارە کاک ئاگری بورهان قانع بێت بیبات بۆ کوردستانی نوێ، بڵاوی بکاتەوە. ناوەڕۆکی ئەم بابەتە باس لە کۆتایی هێنان بەدەستەڵاتی عەشائیری دەکات لە ئێراندا لەلایەن دەوڵەتی نەسرەدین شای قاجارەوە، دوا دەسەڵاتی عەشائیری لە ئێراندا کەماوە هەی سان و سوڵتانەکانی هەورامان بووە، دەوڵەتی قاجار و نەسرەدین شا، فەرهاد میرزای مامی بەنازناوی (معتمد الدوله) ناردووە بۆ سنەو رای سپاردووە بۆ کۆتایی هێنان بەو دەستەڵاتە عەشائیریانانەی کە لە هەورامان ماون.

کاک کەمال هەورامیش سەرگەرمی کلێشەی نوسراوێکە بۆ پەیوەندیە باڵاکانی یەکێتی و بزووتنەوە، لە نوسراوەکەدا داواکاری مەڵبەندی شارەزوور ئەخرێتە بەرچاو سەبارەت بەو بەندانەی لەناو ڕێکەوتننامەی تاران دا هاتوون و تائێستا جێبەجێ نەکراون لەنێوان یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامیدا. وە لە

ڕۆژی ۱۹۹۸/۳/۲دا سەردانی مەکتەبی ڕێکخستنمان کرد و لەگەڵ کاک ئەرسەلاندا ناوەڕۆکی ئەو نامەمان باس کرد.

دواترو لە ڕۆژی ۳/٤دا سەردانی کۆمیتەکانی سنووری پێنجوێنمان کردو لە کۆبوونەوەیەکدا هەردوو کۆمیتەی ڕێکخستنی پێنجوێن و شلێرمان لێک دایەوەو لە چوار چێوەی یەک کۆمیتەدا ڕێکمان خستنەوە، هەرهەمان ڕۆژ سەردانی بارەگای قائیمقام و ئیدارە حکومیەکانمان کرد. لە ڕۆژی ۱۹۹۸/۳/۷ دا لەهەڵەبجەی تازە (قەزای شارەزوور) داین یادی ساڵرۆژی ڕاپەڕینی ساڵی ۱۹۹۱یەکی خەڵکی شارەزوور دەکەینەوە، پاش نیوەڕۆ لەناو ئاپۆرەی جەماوەرێکی زۆری سنوورەکەدا بەئامادەبوونی هەموو هەڤالانی مەڵبەند و کۆمیتەکان ڕێوڕەسمی یادەکە بەڕێوەچوو، لەم یادەدا ووتاری مەڵبەندمان پێشکەش بە جەماوەر کردو باسی دەوری قارەمانییەتی جەماوەر و بەتایبەتیش یەکێتی نیشتمانیمان کرد. ئێستا ڕۆژی ۳/۸ دیاری کراوە بۆ یادی ڕاپەڕینی شارەزوور و هەموو ساڵێک لەم ڕۆژەدا یادەکە ئەکرێتەوە، بەلام ڕاستیەکەی ڕۆژی ۳/۷ یە یادی ڕاپەڕینی خەڵکی شارەزوور، پێشترو لە بابەتێکی ئەم کتێبەدا هۆکاری گۆڕینی ڕۆژەکەم باس کردووە. ئەم ڕۆ واتە ڕۆژی۱۹۹۸/۳/۸ ئەنجومەنی مەڵبەندی شارەزوور لای جەنابی مام جەلالین لە قەلاچوالان، بەئامادە بوونی کاک ئەرسەلان بایز بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخستن، سەعات ۱۱ی پێش نیوەڕۆ کۆبوونەوەمان دەستی پێکرد بۆنانی نیوەڕۆ لەوێ بووین و کۆبوونەوەکەمان تا ئێوارە درێژەی کێشا، قسە لەسەر ئەنجام دانی چالاکی زیاتر و هەوڵدان بۆ زیاتر گەشەکردنی مەڵبەندەکە و هەوڵدان بۆ چەسپاندنی ئاشتی زیاتر لەگەڵ لایەنە سیاسییەکان بەتایبەت بزووتنەوەی ئیسلامی کرا.

مام جەلال ڕێنمای و ئامۆژگاری هەڤالانی لەسەر ئەرکی ئەم قۆناغەی کوردستان کرد. لەم کۆبوونەوەدا باسی گواستنەوەی بارەگای مەڵبەندەکە لە هەڵەبجەوە بۆ سەیدسادق هاتەوە ناو، کاک شەوکەت و یەک دوو برادەری تر بەحساب ژیرانە خستیانە بەردەم مام جەلال، بەلام وەلامی ئەو بەتوڕەییەوە ئەوە بوو، ئەو مەڵبەندە مەڵبەندی بارودۆخە سیاسییەکەی هەڵەبجەو شارەزوورو هەورامانە، ئەگینا مەڵبەند لەسنووری پارێزگادا تەشکیل ئەکرێت، بۆیە بارەگای لە هەڵەبجەدا دەبێت. بەلام بەڵێنیشیدا بیناکەی

سەیدسادق پێویستی لەڕووی کەرەستەوە دابین بکات ئەگەر چەند بەشێک لەگەڵ کارگێرەکان بێنە ئەوێ کێشە نابێت. من ئەمەم زۆر پێخۆش بوو، چوونکە پێشتر لە مەڵبەند لەسەر ئەم بابەتە گفتوگۆمان کردبوو رای خۆم وتبوو، برادەرەکانی ئەوکات زۆرینە ماون ئەمە ئەزانن، وتبووشم مام جەلال لەسەر ئەو پێشنیارە نیگەران دەبێت لێمان. ئەوەتا پێش بینییەکەم وا دەرچوو.

لە ڕۆژی ٣/٩دا کۆبوونەوەی کارگێری مەڵبەندمان کرد بۆ دانانی بەرنامەیەک بۆ مەڵبەند لەسەر رۆشنایی کۆبوونەوەکەی دوێنێی ئەنجومەن لەگەڵ مامدا، لەو کۆبوونەوەشدا لەو برە پارەیەیی کە ٤٠ چل هەزار دینار بوو هاوکاری مەڵبەند کرابوو، ٩ نۆ کادر داوایان کرد پارەیان بدرێتێ بۆخۆیان، من باسم کرد ئەوە پارەی ئۆرگان و ئیشوکارە، نادرێت بەکادر بە شەخسی، بەلام کاک شەوکەت قبوولی کردو ئەو نۆ هەڤاڵە نیوەی زیاتری پارەکەیان برد، من بە لاماوە شتێکی گونجاو نەبوو، بەلام ئیتر لەبەر ئەوە تازە چوبوومە مەڵبەندەکە لەسەری نەرۆیشتم. بەلام ئەو هەڤالانەم لەبەر چاوکەوتن، پێم خۆش نییە ناوی ئەو نۆ هەڤاڵە بنووسم، بەلام ئەگەر لەوبارەوە وترا وانییە ناوەکانیان لەلاپەرەکەی خۆمدا بلاو دەکەمەوە. لە ڕۆژی ٣/١٠ دا لە بارەگای مەڵبەند کۆبووینەوە لەگەڵ ستافی لەشکری بارەگای مەڵبەند، ئەم هەڤالانە ئامادە بوون و تەشکیلاتی لەشکرەکە کرا بەم شێوەی خوارەوە:

کاک عەبدوڵای مامە سەر لەشکر، عەبدوڵا پێشمەرگەی دێرینی حزبی شیوعی بووە لە شاخ و ئەوکاتیش فەرماندەی بەتالیونی هەورامان بووە. کاک ڕەفعەتی حاجی دێوانە جێگری سەرلەشکر، ڕەفعەت پیاوێکی بەئەزموون و خەڵکی ئاوایی عەنەبە. کاک فەتاحی حەمەئاغای گەلاڵی فەرماندەی هێز، فەتاح پێشمەرگەی دێرینی حزبی شیوعی بووە، لە دەرەوەش بەرپرسایەتی هەبووە. کاک سەیدکەمالی کانی تویی فەرماندەی هێز. سەید خەڵکی ئاوایی کانی توی ناوچەی نەورۆڵیە، پیاوێکی لەسەرەخۆو لەدلا وریایە.

دوای نیوەڕۆ من چووم بۆ سەیدسادق و کاک فەتاحی حەمەئاغامان برد و لەوێ هێزەکەمان بۆ تەشکیل کرد. لای عەسری هەمان ڕۆژ هاتمەوە بۆ هەڵەبجە ئێوارەکەی لەگەڵ کاک شەوکەت چووین بۆ گولانی سەرو، چووینە بن دار زەیتونە کۆنەساڵەکان، لەوێوە بەرەو ژوورو بەرەو خوار

تاچاو بڕبکات دیمەنی باخە هەنارە ڕووت و بێگەڵاکان، بەش بەش و پارچە پارچە بە پەرژین و تەیمان لێک جیا کراونەتەوەو زۆریان (کولبە) یان خانەباخیان تێدا دروست کراوە. بە شاش و شەوێلی لەناو تیرە یان ریزە بنە هەنارەکاندا دار قەیسی و لەناو تەیمان و پەرژینەکانیشدا دار چوالەکان وەک تارای بووکی ئاوداماں سپی و سور گوڵ داپۆشیون. هەرکەس ئەیەوێت دیمەنێکی هەرگیز نەشۆڕاوە لە مێشکدا تۆمار بکات ، با لە نەورۆزی ساڵدا بچێتە سەر گردی گوڵان و ساتێک دۆڵی باوەکۆچەک سەرەو ژور بەرەو چاوگ، ساتێکیش سەرەو خوار بەرەو حەسەن ئاوا نیگا ئاژن بکات و دیمەنی هەرگیز لەبیر نەکراو تۆمار بکات.

دوای سەرمەست بوون بەو دیمەنە، لەگەڵ کاک شەوکەت بەرەوخوار بووینەوە بۆگوڵانی خوارو، لەوێوە خۆمان کردەوە بەناو شارداو بەفرسەتمان زانی کاک سەید نەجیبی هانە سورەیی لەسەر ڕێگامانە بەسەر بکەینەوە، کاتێک دەرگایان لێکردینەوە لە حەوشەدا کوڕەکان هاتن بە پیرمانەوە، فەرموون دوای چاکو چۆنی خۆمان کرد بە ماڵا، ئەبینین مام سەید نەخۆشەو لەسەر جێگە کەوتووە، ئێمە بەرێکەوت چووین و ئەوانیش وا دەزانن بەبۆنەی نەخۆشیەکەیەوە سەردانمان کردووە، ماوەیەک لای دانیشتین و خوڵکی گەرمیانی کردین بۆنانی ئێوارە، بەڵام بەڵێنمان نەداو گەڕاینەوە بۆبارەگا بۆناو پێشمەرگەو هەڤاڵانمان.

ئەمڕۆ ١٩٩٨/٣/١٢ چوومە سلێمانی بۆ بارەگای مەکتەبی ڕێکخستن، دواتر سەردانی بارەگای ڕاگەیاندنی ناوەندی یەکێتیم کردو لە کۆبوونەوەیەکدا لەگەڵ کاک مستەفای ساڵح کەریم باسمان لەپرۆژەی وەرگێڕانی کتێب کردو لەو چوار چێوەشدا داوام کرد کێ باشە بۆ پێدا چوونەوەی کتێبی بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگ، ئەم کتێبە لە زمانی فارسیەوە خۆم وەرم گێڕاوە بۆسەر زمانی کوردی، ئەویش وەڵامی دامەوە باشترین کەس ئێستا بۆ زمانەوانی مامۆستا عوسمان هەورامییە. دواترو هەرهەمان ڕۆژ سەردانی هەڤاڵ جەبار فرمانم کرد لە دەرەوەی وڵات گەڕاوەتەوە.

بۆ بینینی مامۆستا هەورامی و قسەکردن لەسەر پێدا چوونەوەی کتێبەکە ڕۆژی١٩٩٨/٣/١٣ لەگەڵ هەڤالان کاک شەوکەتی حاجی مشیرو

هەڤاڵ کاک حەمەشارەزووریدا سەردانی مامۆستامان کرد و دوای دانیشتنێکی دۆستانە و باس وخواس لەسەر نووسین و وەرگێڕان، من بۆخۆم سودی باشم لە هەورامی وەرگرت و بەڵێنیشی دامێ پێدا چوونەوەکە بگرێتە ئەستۆ.

ئەمرۆ ١٩٩٨/٣/١٤لەگەڵ ڕێکخراوەکان و لایەنەسیاسییەکان و پێشمەرگە و ئاسایش و پۆلیسدا سەرگەرمی ئامادەکارین بۆ پێشوازی میوان و بەڕێوەبردنی ڕێوڕەرمی هەشتەمین ساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجە و دەوروبەری. نوێنەری مەڵبەند کاک عەلی حاجی فەرەجی نەورۆلی چوو بۆ شارۆچکەی دەربەندیخان بۆ بەشداری کردن لە ڕێوڕەسمی کردنەوەی مزگەوت و خانەقایەک، کە هی خوالێخۆش بوو شێخ عوسمانی نەقشبەندیە و لە ڕۆژی ٣/١٥دا ئەکرێتەوە. بریار بوو من بەشداری ئەو ڕێوەڕەسمە بم، بەڵام لەبەر ئەوە لەو ڕۆژەدا من لە سەیدسادق کۆبوونەوەم هەیە لەگەڵ ستافی مەکتەبی ڕێکخستندا.

لە ڕۆژی ١٩٩٨/٣/١٥ هەڤالانی مەکتەب هاتن و لە شارۆچکەی سەیدسادق دا کۆبووینەوە لەگەڵیان بۆ ڕێکخستنی لیستی پێداویستەکانی مەڵبەند و کۆمیتەکان و پێشمەرگەکانی لەشکری پارێزگاری مەڵبەند. چوونکە ڕۆژی ٣/٨ جەنابی مام جەلال بەڵێنی جێبەجێکردن و کڕینی پێداویستیەکانی پێدابووین، نوێنەرانی مەکتەب ئەمرۆ پێک هاتبوون لە هەڤالان کاک ئازاد جوندیانی و کاک ئاسۆ عەلی و نوێنەری هەموو بەشەکانی تری مەکتەب. هەروەها قسەشمان کرد لەسەرشێوەی کاری ڕێخراوەی، من باوەڕم بەم شێوە لەکاری حیزبی و ڕێکخستن نیە، بتەوێ هەمووکەس حیزبی بێت، یان زۆرترین خەڵک ڕێک بخەیت، مادام بەرەو خەباتی مەدەنی و پەرلەمانی هەنگاو دەنێین، باشترە ڕێکخستن نوخبە بێت و جەماوەر ئاراستە بکات.

ئەمرۆ ڕۆژی ١٩٩٨/٣/١٦ کەسوکاری شەهیدانی کیمیاباران و خەڵکی هەڵەبجە و دەوروبەری لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ بەدواوە هەموو ساڵێک لەم ڕۆژەدا لەگەڵ میوانانی ناوەوە و دەرەوە، ئەم یادە دەکەینەوە، بەوبۆنەوە چالاکی جۆراو جۆر ئەنجام دەدەن. دوای ڕاپەڕین تەنها لە ساڵی ١٩٩١دا ئەم یادە نەکراوەتەوە، چوونکە لە ١٩٩١/٣/٧ لەشارەزوور ڕاپەڕین سەرکەوت، تا٣/١٦ لەو هەشت ڕۆژە پڕجەنجاڵیەی

راپەڕیندا ئامادەکاری ئەویادە نەدەکراو شاری هەڵەبجەش قەدەغە کراو کەسی تێدا نەئەژیا.

هەرچەندە وەک پێشتر باسم کردووە لە هەڵەبجەی تازەدا لەسەر پێشنیاری گەنجێکی هەڵەبجەیی بەناوی کاک دانای ڕەحیم ماچۆی هەڵەبجەیی، لە ڕۆژی ١٩٩١/٣/١٦دا لەلایەن خەڵکی هەڵەبجەوە لەقەزای شارەزوور ڕێوەڕەسمێکی خنجیلانە کرایەوە، ئەو ڕۆژە من خۆم بەشدار نەبووم، چوونکە سەرگەرمی شەڕو بەرپەرچ دانەوەی پەلاماردانەوەکانی رژێمی سەدام بووین بۆ سەر کفری و کولەجۆ و دەوروبەری، بەڵام هاوکاریان بووین و کاکە حەکیمی مەلا ساڵح و چەندکەسی تر بەنوێنەرایەتی تیپی ١١ی هەورامان لەگەڵیان بوون، بۆ بەشداری و بەڕێوە بردنی یادەکە. (تیپی ١١ی هەورامان ناوی ئەو یەکە سەربازیە پێشمەرگانەیەی یەکێتی بوو بۆ سنووری هەڵەبجەو هەورامان لەوسەردەمەدا)

بەڵێ یادی ئەمسال، ساڵی ١٩٩٨ سەرەتاو سەرلەبەیانی ڕۆژی ٣/١٦ بەکۆبوونەوەیەکی لایەنەسیاسییەکان لەبارەگای قائیمقامی شارەوە دەستی پێکرد، لەوێ کاک جەمیل عەبدولڕەحمانی قائیمقام سەرپەرشتی کۆبوونەوەکەی کرد، لەو کۆبوونەوەدا من نوێنەری یەکێتی بووم، لە کۆبوونەوەدا هەموو لایەنەکان ڕووی دەمی گلەیان لەسەر یەکێتی نیشتیمانی بوو، ئێمەش ناچاربووین بەوەڵام دانەوەی هەموو لایەک، ئەوترا یەکێتی کۆنترۆڵی یادەکەی کردووە، خۆیان قسەو ووتار دەدەن و هەر خۆشیان چالاکیەکان بەڕێوە ئەبەن. لە ڕاستیدا تاڕادەیەک وابوو، چوونکە لە سنوورەکەدا ئەوکات ئێمە واتە یەکێتی زۆرینە بووین، پەرۆشی بەڕێوەبردنی ڕێوەڕەسمەکە بووین بەهێمنی و بەئاشتی، ئەو بەرپرسیاریەتەی لەسەر شانی ئێمەبوو، لەسەرشانی ئەوان نەبوو، ئەوان بەشێکیان بۆیان بکرایە تێکیان ئەداو ئاژاوەشیان دروست دەکرد، هەموو ساڵ ئەرکی پارستنی شوێنەکەو شارەکەو خەڵکەکە، بووجەی پێویستی یادەکە، لەسەر یەکێتی بووە ئەمە جگە لە ماندوبوون چارەسەر کردنی چەندین کێشەیتر کە لەو ڕۆژەدا دروست دەکران. بەڵێ قەراو بڕیارەکانی کۆبونەوەکە بەدڵی ئێمە درا، کەمێک خاتری لایەنەکانی تریشمان گرت

دوای کۆبوونەوەکەی قائیمقامیەت هاتینە مەیدانی عومەری خاوەر، لەوێ خەڵک کۆئەبنەوەو بەپێ ئەچین بۆسەر مەزاری شەهیدان، کاک شەوکەت و چەند هەڤاڵێکی تریش بۆ پێشوازی میوانەکانی دەرەوەی هەڵەبجە چوون بۆ شارۆچکەی سیروان، ئەمڕۆ کاک کۆسرەت بەشداری دەکات بەنوێنەرایەتی یەکێتی و مام جەلال. کاتژمێر ١٠ی بەیانی لە عومەری خاوەرەوە ئاپۆرەی جەماوەرو لایەنەکان و کاربەدەستانی حکومەت بەرێکەوتن بۆ سەرمەزارەکە، دوای گەیشتنی هەموو لایەک بەخوێندنی قورئان رێوەڕەسمەکە دەستی پێکرد، مامۆستا جەمیل ووتاری حکومەتی خوێندەوە، دوای ئەو کاک کۆسرەت رەسوڵ ووتاری خوێندەوەو بەناوی مام جەلالەوە سەرەخۆشی لەکەس و کاری شەهیدان کردو بەڵێنی زیاتر ئاوەدان کردنەوەو خزمەت کردنی کۆمەڵانی خەڵکی ناوچەکەی دا، دوای ئەویش ووتاری کۆماری ئیسلامی ئێران لەلایەن عەلی وەلیولای پەنایییەوە خوێندرایەوە، ئەوکات عەلی پەنایی نوێنەری وڵاتی ئێران بوو لە سلێمانی، ئەویش بەڵێنی هاوکاری و پشتیوانی وڵاتی ئێرانی بۆ خەڵکی هەڵەبجەو کورد دووبارە کردەوە، لەدوا جاردا بە ووتاری بنەماڵەی شەهیدان کۆتایی بە رێورەسمی سەرلەبەیانی هات. بۆ نیوەڕۆ کاک کۆسرەت و وەفدی یەکێتی لای مامۆستا مەلاعەلی عەبدولعەزیز بوون، دوای نیوەڕۆ سەردانی ئێمەیان کرد لەبارەگای مەڵبەند.

ڕۆژی دووەمی یادی هەڵەبجە لە١٩٩٨/٣/١٧ لەشارۆچکەی هەڵەبجەی تازە ( قەزای شارەزوور) دا ئەکرێت، چالاکیەکانی ئەمڕۆ هونەرمەندانی شارەزوورو هەورامان بە هاوکاری مەڵبەندی رێکخستنی شارەزوور ئەنجامی دەدەن. نوێنەرانی یەکێتی بۆ بەشداری یادەکە ئەمڕۆ بریتین لە هەڤاڵان حاکم قادر حەمەجان، مەحمود سەنگاوی، سەکەوتی کوبەو سەیفولای عەلی بەگی قادرخان.

دوای بەشداری رێوەڕەسمەکە پێکەوە سەردانی ماڵی کاک حەمەسەعیدی حەمەی سان ئەحمەدی شەمێرانی و ماڵی کاک سەید عەبدولڕەحمانی کوڕەزای مەولەوی تاوەگۆزی شاعیرمان کرد. دوای گەڕانەوەی ئەوان من چووم بۆ بەشداری کردنەوەی پێشەنگایەکی شێوەکاری هونەرمەندێک تایبەت بە کیمیاباران لەبینای قوتابخانەی سروود.

له رۆژی۳/۱۸دا کۆبوونەومان هەبوو لەگەڵ بەشەکانی راگەیاندن و ڕێکخراوه دیموکراتیەکان لەسەیدسادق، له گەڕانەوەدا بۆ هەڵەبجە دیمەنی جوان و پڕ له ئاوی چۆم و جۆگەو جۆبارو شەتاوان و چاڵاوەکانی دەشتی شارەزوورمان ئەبینی که بەهۆی بارانی بەلێزەمی ئەم چەند رۆژەوه پڕبوون و دیمەنێکی سەرنج ڕاکێشیان دروست کردووه. دەشتی شارەزوور بەپیتوبەرەکەترین دەشتەکانی کوردستانه، ئەگەر بێتو حکومەتی هەرێم وەوەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێریی بەرنامەو نەخشەی دروستیان هەبێت بۆ بەرهەم هێنانی بەرهەمه کشتوکاڵیەکان، هیچ کات پێویستمان بەهاوردەکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی دەرەوه نابێت. بەڵام بەداخەوه بەهۆی نەبوونی بەرنامەو پلان جووتیاران دامەزراون بەکارمەند لەئیدارەکانی دەوڵەتداو زەویەکانیان بەجێهێشتووه، ئێوارەی ئەمڕۆ لەهەڵەبجه سەردانی ئەو هاووڵاتییانەمان کرد که ماڵەکانی خۆیان چۆڵ کردووه لەبەر لافاو.

له رۆژی ۳/۲۱دا بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوه لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم دا لەوانه کاک ئازاد باقی هەورامی، هێرش حەسەن کەڵەکنی و بێستون حەمەحسێن دا چووین بۆ هاوینەهەواری دوکان، هەر گەیشتینه پێشەوه ویستمان ئاگر بکەینەوه، قاپێکی چکۆلانه بەنزینی تێدابوو من ئەمکرد بەسەر خەڵوزەکەدا لەوکاتەدا ئازاد شخارتەی لێداو گڕی گرت بەگڕەکەوه بەنزینەکه رژا بەسەردەستی مندا و دەستم سوتا، ئێشی شوتان ئێجگار سەختە، نازانم ئەوانەی دەبه نەوت و بەنزتن بەخۆیاندا دەکەن و ئاگر لەخۆیان بەر ئەدەن و ناشمرن حالیان چۆنەو چ بارێک دەکێشن، ئیتر سەیرانەکەمان نەکردو گەڕاینەوه بۆ سلێمانی چوومه نەخۆشخانەو دکتۆر دەوای کردو بەوبۆنەوه تارۆژی ۳/۲٦ له ماڵەوه بووم، رۆژی۳/۲٦ مەڵبەند بەبۆنەی نەورۆزەوه ڕێوڕەسمی ئاهەنگه سەیرانێکی جەماوەریی ڕێکخست له سەیرانگای سەراوی سوبحان ئاغادا، من لەبەر بەشداری له ڕێوڕەسمی پرسەی دادە عائیشەی دایکی بێستونی کاک حەمەحسێنەوه بەشداریم له ئاهەنگەکەدا نەکرد.

رۆژی۳/۲۸گەڕامەوه بۆهەڵەبجەو دوای جێبەجێ کردنی ئیشوکاری ئاسایی مەڵبەند، بەشداری پرسەی سەلاح حەمەرەحیمم کرد هاوڕێی قوتابخانەم بوو بەسەلاح بیله ناسراوه، دواتر سەردانی باوک و دایکی شەهید شیروان ئەبووبەکرم کرد لەکۆمەڵگای عەنەب، دوای سەردانی ئەوان

بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی ئەمینی فەتالی بەگم کرد لە مزگەوتی ڕیشە لە گەڕەکی کانی قولکەی هەڵەبجە، دوای ئەو پرسە، چووم بۆ ماڵی خاڵۆ حسێنی ئەلە جەوتە بۆلای حەسەنی برای[1]، ئێوارە گەڕامەوە بارەگای مەڵبەند و کاک شەوکەتیش لە چارەسەری کێشەیەکی کۆمەڵایەتیی دا بووبوو لەسەیدسادق گەرایەوە ئەمشەو پێکەوە لەبارەگای مەڵبەند بووین، کاک شەوکەت باسی ماندوبوون و خەباتی خۆی کردو گلەیشی هەبوو، لەهاوڕێکانی بەتایبەت لەمام جەلال، ئەیوت ئەگەر مام جەلال نەبێ ئەوانە ناتوانن دژایەتی من بکەن،

لە ڕۆژی٣/٢٩ دا سەرەتای ئیشوکارم بەکۆبوونەوەیەک دەست پێکرد لەگەڵ هەڤالانی پێشمەرگەی سەر بەهێزی یەکی لەشکری مەڵبەند، کێشەو گرفتیان هەبوو بۆم چارەسەر کردن، دوای ئەوکۆبوونەوە، لەگەڵ وەفدی بزووتنەوەی ئیسلامی دانیشتین بۆقسەکردن لەسەر چارەسەری کێشەکانی نێوانمان، سەرۆکی وەفدی بزووتنەوە بەرپرسی مەڵبەندی یەکی بزووتنەوە کاک عەبدورەحمان عەبدولڕەحیم بوو، دوای ئەوان کۆبوونەوە لەگەڵ مامۆستایانی چەند قوتابخانەیەکی ناوشاری هەڵەبجە، ئەوانیش داواکاری و کێشەو کەموکورتیان هەبوو، دوا کۆبوونەوەی پێش نیوەڕۆی ئەمڕۆمان، کۆبوونەوەیەک بوو لەگەڵ ئەندازیاران و مەساحەکانی پلاندانان لەهەڵەبجەدا.

دوای نیوەڕۆ بەشداریمان کرد لە ڕێوڕەسمی پرسەی حاجی عومەری عەنەبیدا، دوای پرسەکە سەردانی خاڵۆ مەحمودی تەیمەز باوکی شەهید مەهدیە ڕیشەم کرد نەخۆش بوو، دواتر سەردانی حاجی مەحمودی ڕێشاویم کرد بەبۆنەی نەخۆشییەوە، باوکی دوو پێشمەرگەی دێرینە خەلیل و فاروق. دوای سەردانەکەی حاجی، لەگەڵ هەڤالانمدا سەردانی ماڵی حاجی فایەقی بۆینیم کرد بۆ سەرەخۆشی لێیان بەبۆنەی کۆچی دوایی کچەکەیانەوە.

شەوی٢٩لەسەر ٣/٣٠ سەردانی پورە عوزرای فەتالی بەگم کرد لە ئێرانەوە هاتووە، بۆ بەشداری پرسەی ئەمینی برای، پورە عوزرا، ئەو ژنە

---

[1] حسێن و حەسەن و حەمەڕەشید کوڕی خاڵۆ ئەلی محەمەد ناسراو بەئەلەجەوتە، خەڵکی دەڵەمەڕو لەتیرەی زەردۆیین، قسەخۆش و قسە تەنزئامێز بوون، خەڵکی هەڵەبجەو سنوورەکە دەیان قسەو حکایەتیان لەدەم دەگێڕنەوە بۆپێکەنیین و دڵخۆشی. برایەکی تریشیان هەبوە بەناوی حەمەکەریم ئەو فەقیرحاڵ و بێژن و منال سەری ناوەتەوە.

خزمەت گوزارەی خەڵکی ئاوایی شۆشمێی کوردستانی ڕۆژهەلاتە، لەبەرگی یەکی ئەم کتێبەدا باسم کردووە، لەبەر خزمەت کردنی پێشمەرگە لەسەردەمی خەباتی شاخدا، نازناوی دایکی پێشمەرگەیان بەسەردا بڕی بوو.

لە ڕۆژی ١٩٩٨/٣/٣٠دا پێش نیوەڕۆ لە بارەگای مەڵبەندا خەریکی ئیشوکاری ئاسایی مەڵبەند بووم، دوای نیوەڕۆ سەردانی کاکەوەیسی کوڕی عەبەکەی وەهابم کرد، کاکەوەیس ئەڵغام لەژێر پێیدا تەقیوەتەوە لەکولێن دەشت لەسەر ئاوی سیروان، پێیان بڕیوەتەوە، کاکەویس خۆی و بنەماڵەکەی پێشمەرگەی دێرینن. دواتر لەگەڵ هەڤاڵان مام وریاو حەمە هاواری و عومەر باینگانیدا بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی دایکی جەوهەر بۆینیمان کرد.

لەم سەروبەندەدا ئێمە شەوانە لە هەڵەبجەدا ئەمێنینەوە ئەبێ یان لە بارەگاو لەناو پێشمەرگەدا بخەوین یان لە ماڵان بەنهێنی و کەس پێمان نەزانێ لە ماڵی کێدا ئەخەوین، زۆرتر لەماڵی خزم و دۆستدا دەمێنینەوە، ئەمشەو ئێمە لەماڵی بەهمەن بەگ بووین، لەگەڵ شێخ ئەنوەری شێخ فەرەج و چەند پێشمەرگەیەکدا، ئەوانەی هاتووچۆ و دۆستایەتیمان دەکەن یان میوانداری و ئەچینەماڵیان، دواتر گروپەکانی ناوبزووتنەوەی ئیسلامی تەشقەڵەو بیانوویان پێدەگرن، شەوانە بەدزیەوە ئەچنە سەریان و لێدان و جەریمەو ئیجرائاتی جۆراو جۆریان بەبیانووی جۆراوجۆرەوە دەکەن. خەڵکیان ترساندوە، زۆربەی دۆستەکانمان هەڵەبجەیان بەجێهشتوە.

ئەمڕۆ٣/٣١ دوا ڕۆژی مانگی بۆنەکانە دوای تەواوکردنی ئیشوکاری حزبی لەبارەگای مەڵبەندا پێشوازیم کرد لە وەفدێکی یەکگرتووی ئیسلامی، ئەم سەردانە بۆقسەکردن بوو لەسەر هاوکاری و هەماهەنگی یەکتر لەسەر ڕۆشنایی سەردان و کۆبوونەوەکەی ئەمینداری گشتی یەکگرتوو، مامۆستا سەلاحەدین بەهادین بۆلای مام جەلال، لەم کۆبوونەوەدا ئێمە نارەزاییەتیمان دەربڕی لەسەر تێکدان و شێواندنی کلتورووی کوردەواری و تەقاندنەوەو وێران کردنی مەرقەدو نزرگەو قەبرسان و شوێنە پیرۆزەکانی سنوورەکە کەماوەیەکە بە نهێنی و بەشەودا ئەنجام ئەدرێت. ئەوانیش ئەوکارانەیان مەحکوم دەکرد.

دواتر برادەرانی یەکگرتوو باسیان لەوە دەکرد کە گوایا هەنگاو و کارەکانی ئێمە بەدژی ئیسلامی سیاسی بێت. وە ئەیان ووت ئێوە

ئیسلامی سیاسی بەنەیارو کۆسپ ئەزانن لەبەردەم خۆتان دا. بۆیە پێمان وتن، ئێمە وابیرناکەینەوە ئیسلامی سیاسی کۆسپ بێت لەبەردەماندا، چوونکە باوەڕمان بەئازادی و بە دیموکراسی هەیە، وەکاتێک ئێمە دروست بووین و شۆڕشمان کردووەو دەستمان داوەتە چەک، شتێک بە ناوی ئیسلامی سیاسی لە گۆڕێدا نەبووە، بەتایبەت یەککرتوو، ئەگەر هەشبووبێ نهێنی بووە. خەباتی ئێمە بەدژی داگیرکەرانی کوردستان و بۆ رزگاری نیشتیمانی و نەتەوەییە...هتد بووە. کۆبوونەوەکەمان لە کەشێکی دۆستانەدا تەواو بوو بەڕێزەوە بەڕێمان کردن.

## نیسانی ١٩٩٨

ئەمڕۆ ١٩٩٨/٤/١ لە هەڵەبجەین ئەم ماوە جەماوەریی گەڕەکەکانی شار و ئاوایییەکانی دەوروبەر، زوو زوو سەردانی مەڵبەند دەکەن، داواکاریان زۆرە و ئیدارەکانی حکومەتیش کارەکانیان و پرۆژەکانی ئاوەدان کردنەوەیان بەسستی و خاوی بەڕێوە دەڕوات، ئێمەش وەک مەڵبەند زوو زوو دەچینە لای سەرۆکی حکومەت و جێگرەکەی و وەزارەتەکان و پارێزگارو بەرپرسە ئیدارییەکانی پەیوەندیدار بە ئاوەدان کردنەوەوە، زیاتر بۆ رێگاوبان و کارەبا و تەندروستی و پەروەردەو.....هتد، ئەوەندە چووینەتە سەریان و داواکاریمان زۆرە ناشیرین بووین لەلایان ، بەڵام تاک و تەرا هەندێک بەرپرس هەن پێیان خۆشە زوو زوو بچیتە سەریان و داواکاریەکانی خەڵکیان لەگەڵ باس بکەین.

ئەمڕۆ سێ وەفدی خەڵک هاتن سەردانیان کردین و داواکاری هەمووشیان بۆ کارەبایە، وەفدی یەکەم نوێنەرانی جەماوەریی خەرپانین کە لە کۆمەڵگەی عەنەب نیشتەجێن، داوا دەکەن پرۆژەی کارەبا بچێتەوە بۆ ئاوایییەکەیان ، وەفدی دووەم خەڵکی ئاوایی گریانەن و وەفدی سێیەم مامۆستا مەلا حەمە ئەمین و جەماوەریی ئاوایی زەمەقی سەرون، ئەوانیش داوای پشتگیری و هەوڵی مەڵبەند دەکەن بۆ کارەبا. بەتەلەفۆن و بەنووسراو ئەوەی خەرپانی و زەمەقیمان جێبەجێ کرد.

ئەمڕۆ١٩٩٨/٤/٥ لە شارۆکەی سەیدسادق لە بارەگای کۆمیتەی رێکخستن، هەیئەتی لەشکری پارێزگاری مەڵبەند کۆبوونەتەوە، داواکاری و کێشەیان هەیە، لەبارەی چەک و تەقەمەنی و خواردن و واجباتەوە، لەگەڵیان کۆبوومەوە، ئەم هەڤالانە ئامادەی کۆبوونەوەکەن : عەبدوڵای مامە، حاجی ڕەفعەتی دێوانە، جەمالی ئەلی محەمەد هەورامی، سەلامی فەتاح تریفەیی، فەتاحی حەمە ئاغای گەلالی، سەید کەمالی نەورۆلی، عەلی حسێنی شەمێرانی(عەلی سوور)، ئەم هەڤالانەی سەرەوە بەرپرس و فەرماندەن لە لەشکری پارێزگاری مەڵبەندا.

لەم کۆبوونەوەدا باسی هەموو کەموکورتیەکانیان کرا، ئێمەش بەڵێنمان دانێ، ئەوان ئەرکی ڕێکوپێکی خۆیان ئەنجام بدەن و سەرپەرشتی هێزەکانیان بکەن، لەنزیکەوە ئاگاداریانبن و ئێمەش کەموکورتیەکانیان بۆ چارەسەر بکەین. دوای ئەم کۆبوونەوە چووم بۆ دەربەندیخان، بۆ بەشداری کردن لەڕێوڕەسمی پرسەی باوکی ژنی شاخ خاتوو بەیانی هاوسەری حەمەقاشتی، بەیان ژنێکی ماندوی ڕێگای کوردایەتی و کچی حاجی ئەحمەد فەتاحی ئاوایی فەقێ جنەیە، لەساڵی ١٩٨٣وە هاتووەتە شاخ و پێشمەرگە بووە.

لە ڕۆژی٧و١٩٩٨/٤/٨ دا کەدەکاتە ڕۆژی یەکەم و دووەمی جەژنی قوربان لە هەڵەبجەو لەبارەگای مەڵبەندا پێشوازیمان لە میوان و لایەنە سیاسییەکان و دواتر ئێمەش سەردانی ئەوان و سەردانی ماڵە شەهیدەکانمان کرد، ئەم جەژنە لە بارودۆخ و کەشێکی ئارامدا بەڕێوەچوو.

ئەمڕۆ٤/١٢ لە شاری سلێمانی بووم سەردانی مەکتەبی ڕێکخستنم کرد لەگەڵ کاک ئەرسەلان بایزو کاک ئاسۆ عەلیدا، هەماهەنگیمان کرد بۆ کۆبوونەوەی هاوبەشی مەکتەب لەگەڵ مەڵبەند لەهەڵەبجەدا، دواتر سەردانی کاک ئاواتی شێخ جەنابم کرد، بڕیار بوو ئێوارە لە بارەگای تیڤی خاک هیرۆخان ببینم، بۆ ئەوەی یارمەتی پورە عوزراکەی دایکی پێشمەرگە بکات، بەڵام چاوپێکەوتنەکە ڕێکنەکەوت.

ڕۆژی٤/١٣ لەسلێمانییەوە لەگەڵ هەڤاڵانی مەکتەبدا چووینە هەڵەبجەو لەوێ کۆبووینەوە، ئامادەبوانی مەکتەب ئەمانە بوون: کاک ئەرسەلان، کاک ئاسۆ، مامۆستا موحسن عەلی ئەکبەرو مەلاقادر. لەکاتژمێر دوودا ئەم هەڤاڵانە و کاک شەوکەت و ئەندامانی کارگێڕی مەڵبەند کۆبووینەوە. سەرتا کاک ئەرسەلان باسی بارودۆخی کوردستانی بە گشتی کردو دواتر باسی ئاشتی نێوان پارتی و یەکێتی کرا، واباس کرا ئێمە ئامادەو بەپەرۆشین لەسەر ئەوەی ئاشتی ڕاستەقینە بێتە ئاراوە، کۆی کێشەو گرفتەکانمان لەگەڵ پارتی چارەسەر بکەین ئەمە لەبەرژەوەندی گەلەکەمانە، بەڵام پارتی بروبیانوو دەگرن و مەرجیان هەیە، بەتایبەت مەرجی براگەورەیی ئێمەش ئەو مەرجەمان قبوول نییە. هەروەها دژی دەرهێنانی نەوتی شیواشۆکن، وەگومرگی کالاو شمەک لە هەولێر بۆ سلێمانی دووقاتی گومرگی هەولێر حاجی ئۆمەرانە بۆ ئێران، بۆ بەردانی دیلەکان مەرجیان هەیە و.......هتد،

ئەمانە نیشانەی دورکەوتنەوەو دژایەتی کردنی ئاشتین لەلایەن پارتیەوە، دواتر باس لەکێشەو کەم و کورتیەکانی مەڵبەندەکە کرا.

رۆژی ١٩٩٨/٤/١٤ لەگەڵ کاک شەوکەت لەسەراوی سوبحان ئاغا لەگەڵ کاک عەدنان بەرپرسی فەرماندەیی کۆبووینەوەو باسمان لە ئامادەکاری و هەماهەنگی کرد بۆ رۆژی ٤/١٦ لەم رۆژەدا جەنابی مام جەلال دێتە شارەزوور. رۆژی ٤/١٥ هەموو هەڤالانی مەڵبەند لە فەرماندەی شارەزووردا بانگهێشت کران ، دەعوەتەکە بەبۆنەی ئەو پێشمەرگە دیلانەوە بوو ئازاد کرابوون، دیلەکان لە٣١ی ئابی ١٩٩٦دا، کاتێک پارتی بەعسی هێنایە سەر هەولێر، ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگە دیل کرابوون لەلایەن عێراقەوە، لەزیندانەکانی سەدامدا بوون بەشێکیان لەم رۆژانەدا ئازاد کراون.

ئەمرۆ٤/١٦ لەسەراوی سوبحان ئاغا مەڵبەند و فەرماندەیی پێکەوە سەیرانە ئاهەنگێکمان رێکخستووە تایبەتە بەپێشمەرگەو کادرەکانی یەکێتی، هەموو ئۆرگانەکانی پێشمەرگەو حزبمان بانگ کردووە، بڕیارە جەنابی مام جەلال بێت و کۆمەڵێک میوانیش لەگەڵ خۆی بهێنێ، بەر لە نیوەڕۆ مام جەلال هاتوو ئەم بەڕێزانەشی لەگەڵ خۆی هێنابوو، کاک کۆسرەت سەرۆکی حکومەتی هەرێم، سەفیری روسیا لە عێراق، کاک عومەر عەبدوڵا (ملازم عومەر)، کاک عومەر ئاغای سورچی سکرتێری حزبی پارێزگاران، کاک قادر عەزیزی سکرتێری حزبی زەحمەتکێشان، کاکە حەمەی حاجی مەحمود سکرتێری حزبی سۆشیالیست، ئەمانەو دەیان بەرپرس و فەرماندەی یەکێتی و لایەنەکانی تری لەگەڵ خۆی هێنابوو. لەهەڵەبجەشەوە پارێزگاری سلێمانی و وەفدێکی سەربە نەتەوە یەکگرتووەکان گەڕانەوە ئەمرۆ سەردانی ئەو شارەیان کردووە، هاتنە سەراو بۆلای مام جەلال. کۆمەڵێک هونەرمەند میوانداری کرابوون لەوانە: کاک عومەری خەزانی هەڵەبجەیی، کاک عوسمان گەچینەیی هەورامی سیاچەمانە بێژ، لەگەڵ چەندین هۆرە چڕی جاف، هەریەکە و هۆرە و گۆرانی بە شێوەی ناوچەی خۆی بۆڕازاندنەوەی میوانداریەکە پێشکەش کرد.

لە رۆژی ١٩٩٨/٤/٢١ دا مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز رابەری بزووتنەوەی ئیسلامی لە هەڵەبجە میوانداری مام جەلال سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمان کردووە بۆنانی نیوەڕۆ، بزووتنەوەی ئیسلامی و مامۆستا

هەوڵ دەدەن دۆستایەتیان لەگەڵ یەکێتیدا باشتر بکەن، چوونکە هێزو پێگەی بزووتنەوە زیاتر کەوتووەتە هەرێمی زۆنی سەوز واتە ئەو ناوچە کە یەکێتی تێدا باڵا دەستە، ئەوەیە لە دوای ٣١/ئابی ١٩٩٦وە پارتی یەکلایەنە لە هەولێر حکومەتی هەرێمی تەشکیل کردووەو یەکێتیش دوای گرتنەوەی سنووری پارێزگای سلێمانی و بەشێک لە ناوچەکانی پێشتر لەژێر دەستیدا بووە بۆخۆی حکومەتی تێدا تەشکیل کردووە، بزووتنەوە هەرچەندە لە حکومەتی زۆنی زەرددا بەشداری بە دوو وەزیر کردووە، لەم لاشەوە لە حکومەتی زۆنی سەوزدا بەشداری کردووە و ئەیەوێت ئەو گلەییانەی لای یەکێتی و هاوپەیمانەکانییەوە لێیکراوە دڵیان بهێنێتەوە. لەم بارەشەوە زیاتر ئێرانی لامەتڵەبە، چوونکە لە شەڕی بزووتنەوە و یەکێتیدا، پێشتر ئێرانییەکان بەئاشکراو بێ دوودڵی پشتیوانیان لەبزووتنەوە کردوە بەدژی یەکێتی، لەوشەڕانەی هەورامان و هەڵەبجە و خورماڵ و دەشتی شارەزووری بەری هەڵەبجەدا ئێرانیەکان پشتیوانی بزووتنەوەیان کرد، بۆچەندین جار یەکێتی شکاو پاشەکشەی کرد، ئەوە بزووتنەوەو هێزەکەی نەبوون یەکێتیان شکاند، بەڵکو ئەوە تۆپخانەو کاتیوشاو چەکوتەقەمەنی و پشتیوانی قەرارگای رەمەزان بوو بۆ بزووتنەوە بەدژی یەکێتی. بەڵێ ئەمڕۆ مام جەلال و وەفدی هاوڕێی، بۆ نانی نیوەڕۆ لەلای بزووتنەوەو دوای نیوەڕۆش سەردانی ئێمەی کرد لە بارەگای مەڵبەندا پێشوازیمان لێکردو لەکۆبوونەوەکەدا باسی لەوەکرد مامۆستا مەلاعەلی و برادەرەکانی، بەڵێنی ئاشتی راستەقینەو چارەسەرکردنی کێشەکانیان داوە لەگەڵ یەکێتیدا، دوای مۆڵەتیدا ئێمە قسەبکەین، کاک شەوکەت ووتی من خۆم لەکۆبوونەوەکەدا بووم باوەک مەڵبەند کاک حەمە قسەبکات، بەڵێ منیش مۆڵەتی قسەکردنم گرتوو، دوای بەخێرهێنانیان دەستم کرد بەقسەکردن لەسەر بارودۆخەکەو کێشەکان و پابەندنەبوونی بزووتنەوە بەرێککەوتنەکانەوە، مام جەلال قسەکانی منی بەدڵ نەبوو، بۆیە لەوەلامەکانی مندا بەتوورەییەوە : حەمەی حەمەسەعید ئێوە فێری ئیدارەدانی ململانی و سراع نەبوون ئەتانەوێ یان وافێربوون هەر بەکەڵەگایی سیاسەت بکەن....تاد، دوای تەواو بوونی کۆبونەوەکە لای عەسرەوە گەرایەوە بۆ قەلاچوالان.

لە رۆژی١٩٩٨/٤/٢٩ میوانم هەبوو میوانەکانم کوردی رۆژهەلات بوون ، لەوانە کاک عەبدول حەمیدی سابقی خەڵکی شاری پاوەو کاک

موحسنی کەیخوسرەوی، سابقیەکان ناسراون بۆ ئێمەی کوردانی باشوور بەتایبەت ناوچەی هەورامان، ئەمەش لە دوو کاتی جیاوازدا ئەم بنەماڵە ناسراون یەکەم جار لە شۆڕشی ئەیلولدا، بەهۆی ئەوەوە ئەوان دەوڵەمەند و توجار بوون و شۆڕش و پێشمەرگەو خەڵکیش لە ناوچە رزگارکراوەکاندا پێویستیان بەوان بوو، عێراق حەساری خستبووە سەر ناوچە رزگارکراوەکان، ئەوان جگەلەوەی پێداویستیەکانی خەڵکیان ئەهێنایە سنوورەکە بە قەرز معامەلەشیان دەکرد تا ئەوکاتەی پارە دەبێت، من بیستومە پارەشیان بەقەرزداوەتە هێزی خەبات بۆمووچەی پێشمەرگە.

جاری دووەم دوای ڕووخانی ڕژێمی شاو لە شۆڕشی نوێدا بوو، من بۆخۆم لەوکاتەوە ئەیان ناسم، کاک عەبدولحەمیدو کاک عیزەتی برای و .......هتد. ئەمجارەش ئەم بنەماڵە بەتایبەت لەدوای کیمیاباران و کۆڕە و ماڵ و حاڵیان کەوتەوە خزمەت ئاوارەکان، من لێرەدا نامەوێت ستایشی ئەم بنەماڵە بکەم بەتەنها لەڕۆژهەلات، هەموو کوردەکانی ڕۆژهەلات پشتیوان و خزمەتی خۆیان بۆ کوردەکانی باشوور لەتەنگانەدا دیارو لەبەرچاوە.

بەتایبەت لەکاتەکانی راگواستنی ئاواییەکان، کیمیاباران، ئەنفال و کۆڕەودا، هەر ئەوان لە ئێمەی کوردی باشوور ئازاترن، لەڕاستیدا ئەوەی ئەوان کردویانە ئێمە ناتوانین بیکەین. لەشاری پاوەدا بنەماڵەی واهەن هەربەتەنیا یەک خێزانیان دەبەرابەری بنەماڵەی سابقی خزمەتی کوردەکانی باشووریان کردووە، بۆ نموونە ماڵی حاجی برایمی کەیخوسرەوی شۆشمێی باوکی ئەم کاک موحسنەی هاوڕێی کاک عەبدولحمید کە ئەمڕۆ میوانی منن.

مەبەستم بوو بڵێم سەرەرای ئەو هەموو بەدەمەوە بوونەی ماڵی سابقی بۆ ئێمەی کوردانی باشوور، کەسێکی کوردی باشوورو خەڵکی ناوچەی هەورامان لەم ماوەدا معامەلەی کردبوو لەگەڵ کاک عەبدولحەمید داو پارەیان بردو خواردبوویان، ئەویش لە ڕێگای عیلاقات و قەرارگای ڕەمەزانەوە شکاتی کردبوو، کەسێکی قەرارگا بەناوی بەنی ئەحمەد هاتە هەڵەبجە و لەگەڵ کاک شەوکەت دا قسەی کرد بۆ چارەسەری کێشەکە و ووتی بانەکەوێتە قانون زۆری پێ دەچێت تۆ چارەسەری بکە. بەڵگەو سورەت حیسابەکانی لای کاک شەوکەت بەجێهێشت و ئەو ڕۆیشت. کاک شەوکەت لەمنی پرسی ئەم پیاوە ئەناسی ووتم بەڵێ خزمیشمانە. ناردمان

بەدوای ئەوکەسەدا پارەکەی کاک عەبدولحەمیدی بردووە سەردانمان بکات، نەهات و ڕای کرد بۆ دهۆک، کاک شەوکەت باوکی بانگ کردو کاتێک قسەی لەگەڵ کرد کابرا تورە بوو ووتی چ پەیوەندی بەئێوەوە هەیە، کاک شەوکەت سجنی کردو خۆی ڕۆیشت و بەجێی هێشت لای من، منیش دوای یەک ڕۆژ کابرام بەرداو ووتم برۆ بەڵام هەوڵ بدە کورەکەت بێتەوەو حیساباتی خۆی لەگەڵ ئەم پیاوەدا بکات. دوای سێ ڕۆژ بروسکەم بۆ هاتووە ئەڵێت: وەرە بۆ (م-ڕ). کەچوومە ئەوێ بەرپرسی مەکتەب کاک ئەرسەلان بوو، بێ پرسیار خۆی تورە کردو ووتی ئێوە حەقتان چییە بەو بابەتەوە؟ دیارە ئێوەش ......، منیش ووتم دیارە چی؟ پارەمان وەرگرتووە. ووتی ئەوە بنەماڵەیەکی باشن و یەکێتین و یارمەتی خەڵک دەدەن، ئێوە بۆتان نییە بانگیان کەن، منیش ووتم قوربان ئەوە خزمی منن و هیچ باشنین و یەکێتیش نین. دیارە کاک ئەسەلان مەبەستی زۆرتر کاک شەوکەت بوو، بەڵام نەوێرا خۆی بانگ بکات، کاک شەوکەتیش ماوەیەک بەرلەئێستا گلەیی لەهەڤاڵەکانی خۆی لای من کردوە کەدژایەتی دەکەن بەناحەق یەکێک لەوانە کاک ئەرسەلان بوو.

باشە ئێمە حەقمان نیە بەسەرەوە بەسەر چاو. بەڵام ئەوانەی ماڵیان خوراوە، یەکێتی و کورد قەرزاریانین، ئێ کاک عەبدولحەمید بۆ وەڵام ئەمڕۆ هاتووە و کاک موحسنیشی بۆ واستە هێناوە چوونکە ئەزانێ ئێمە (یەکێتی) حورمەتی ئەو ماڵەمان لایەو قەرزاریانین. بەتەمان حەقەکەیان بۆ وەرگرینەوە، ئەوە بوو ئێمەش نەمان توانی هیچیان بۆ بکەین. سابقی نازانی حەقەکەی بووە بەقوربانی ململانێکانی ناو یەکێتی.

ڕۆژی ٤/٣٠ بەرنامەم دانابوو بەیانی ڕۆژی ١٩٩٨/٥/١ جەژنی کرێکارانەو دەوام نییە میوانەکانم بەرم بۆ سەیران، لە سلێمانی مامەوە پەیوەندیم کرد بە مەڵبەندەوە خەفەر ئاگاداری کردم بروسکەت بۆ هاتووە کاک نورەدینی سەید قادری باخچە لەهۆڵندا کۆچی دوایی کردووە، میوانەکانم بەجێ هێشتوو چووم بۆ گەڕەکی خەبات بۆ ماڵی کاک عادل و مامۆستا عوسمانی برای. کاک نورەدین جگەلەوەی ماوەیەک فەرماندەی کەرتی تانجەرۆی تیپی (٥٥)ی قەرەداغ و پیاوێکی کۆمەڵایەتیی و پێشمەرگەی دێرین و بنەماڵەیەکی گەورەو دیاری یەکێتی بوون، پیاوێکی سەخی تەبع و پاک و لایەنگری خەڵکی هەژاو پشتیوانی ئەوانە بوو زوڵمیان لێ دەکرا. بۆ منیش کە

لە شۆڕشدا ناسیبووم برایەکی ئازیز بوو. پێشتر ئازادی برای لە شەڕی ناوخۆدا شەھید و دکتۆر جەبار(نەبەز) ی زاوای پێشمەرگەی دێرین و لە راپەڕینی ١٩٩١دا شەھید بوو، دوای خۆیشی عادلی برای کە ئەویش پێشمەرگەی دێرین و لە شاخ کەم ئەندام و باڵێکی براوەوە کۆچی دوایی کرد و دوای ئەویش مامۆستا عوسمان برا گەورەیان کۆچی دوای کرد و دواتر دایکیان دادە ڕەحمە[1]، شای ژنان بەحەسرەتی ئەوانەوە دیقی کرد و سەری نایەوە . ئەوەندەی نەبرد کاک عومەر و کاکە حەمەی براشیان کۆچی دواییان کرد. ئیتر ڕۆژی یەکی ئایار داوای لێبوردنم لەمیوانەکانم کردو نەمبردن بۆسەیرانکە.

## کردنەوەی خولی ڕۆشنبیری بۆ کۆمیتەکان

پێشتر بڕیاردرابوو لەم مانگی ئایار خولی ڕۆشنبیری بۆ ھەڤاڵانی ئەندامانی ئەنجومەنی کۆمیتەکان و مەڵبەندیش بکرێتەوە، یەکەم خول لە بارەگای کۆمیتەی تانجەرۆ لە شارۆچکەی عەربەتدا پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ١٩٩٨/٥/١ کرایەوە. ئەم خولانە بۆ پێدانی زانیاری گشتییە بە کادر، دیارە لەوڵاتی ئێمە بەھەڵە ئەم ووشە (کادر و کادری پێشکەوتوو) بەکار ئەبرێت بە ھەموو کەس ئەوترێت کادر، یان کابرا خۆی بەخۆی دەڵێت کادری پێشکەوتوو.

بەلانی کەمەوە کادر ئەوکەسەیە، کەئەم تایبەت مەندیانەی خوارەوەی تێدابێت. ١- کادر: ئاستێکی بەرزترە لە ئەندامانی ستاف، ستافەکە ئەگەر سیاسی بێت یان تەندروستی، یان ئیداریی، یان ئەندازەیی، یان

---

[1]دادە ڕەحمە ھاوسەری سەید قادری باخچە، کچی سەید محەمەدی باخچەیە، بەر لەدادە ڕەحمە، سەید قادر خاتو عائیشەی کچی مەلاساڵح ھاوسەری بووە، ژنێکی قورئان خوێن و منداڵانیشی لەوسەردەمەدا فێری قورئان خوێندن کردون، دایکی مامۆستا عوسمان و کاکە عومەر و کاکە حەمە بووە، دادە ڕەحمەش دایکی کاک نورەدین و عادل و ئازاد و سەربەست و شێرە و شلێر و پاکیزەیە.

هەربووارێکیتر. ٢- کادر ئەو کەسەیە لە بوارە پیشەی و پسپۆڕیەکەی خۆیدا، خاوەنی شارەزایی و زانیاری و ئەزموون و هوشیاری باڵاو، ئەتوانێ رۆڵی لێپرسراوی، یان بەرپرسی ستاف، یان هەر ئۆرگانێکیتر ببینێت و سەپەرشتی ستافەکەی بکاو ئیدارەیان بداو رێنوێنی و ئاراستەیان بکات. ٣- کادر ئەوکەسەیە بەبەردەوام بەرچاو روونی و جیهان بینی بۆ هەرکێشەو روداو گۆڕانکاری و ئەگەرێکی چاوەڕوان نەکراو هەبێت. ٤- کادر ئەبێ خەسڵەت و توانای سەرکردایەتی کردن و بڕیاردان و شیکردنەوەی هەبێت. ٥-کادر دەبێ بتوانێ لەکاتی پێشهات و تەنگانەو پێویست و لەناکاودا، بڕیار بدات.

کادری پێشکەوتوو: ١- ئەو کادرە بەئەزموون و ماندو پسپۆڕانە ئەگرێتەوە، کە لەڕووی پۆستەوە بەرپرسایەتی باڵایان هەیە، یان لەئۆرگانێکی باڵادا کار دەکەن، بەڵام نەچوونەتە ناو ئۆرگانێکی بڕیارو سەرکردایەتی باڵاوە. ٢- کادری پێشکەوتوو ریزبەندی بەندی پێش سەرکردایەتی باڵایە. یان کادری ئامادەیە بۆ پۆستی باڵای سەرکردایەتی. ٣- ئەبێ تایبەتمەندی و خەسڵەتی سەرکردایەتی باڵای بەهەمەوو مەرجەکانەوە تێدا بێت. لەکوردستاندا کادرگەلێک لەناو سەرکردایەتی حیزبە سیاسیەکاندا هەن مەرجی کادری پێش کەوتویشیان تێدا کەمە،

٤- کادرو کادری پێشکەوتوو پلەکانی زانستی و ئیدارەی و رێکخراوەیی نین. بەڵکو جیاکردنەوەی بەشێکە لەئەندامان، لەسەر بنەمای ژیری و توانا و هوشیاری و ئەزموون و شارەزای و خزمەت و پسپۆڕی.

٥-کادر و کادری پێش کەوتوو، ئەو ڕەگەزانەن کەبوونەتە کۆڵەکەو پایە، بۆ پارتی سیاسی، ئەمانە ئەڵقەی پەیوەندی و گەیەنەرن لە نێوان سەرکردایەتی و ئۆرگانەکانی خوارەوەدا. ٦- کادر و کادری پێشکەوتوو لەناو پارتی سیاسیدا ئەبنە خاوەنی پلەو پۆست، بەڵام مەرج نییە هەموو خاوەن پلەو پۆستێک، تایبەتمەندی کادر و کادری پێشکەوتوی تێدا بێت.[1]

یان بەکارهێنانی وشەی فەرماندە، زۆر جار ئەبینی ئەو پێشمەرگانەی گیانیان بەخت کردووە، لەسەر شەقامەکان وێنەیان بۆدانراوە، ئەمە لەلایەن

[1] - ئەم زانیاریانەی لەسەر کادر خالبەندیم کردون، بەراوێژ لەگەڵ کاک نیاز سەعیدی پەیمانگای کادران بووە.

هاوڕێکانیانەوە یان لەلایەن خزم و کەسوکاریانەوە، لەسەری نوسراوە شەهیدی فەرماندە فڵانە کەس، خۆی فەرماندە ئەو کەسەیە (بەرپرسی یەکەیەکی سەربازی سەر بەخۆبێت لەسنوورێکی جوگرافیایی دیاریکراودا، لەکاتی روداو پێشهاتدا بتوانێ بریاربدات، لەکاتی شەڕدا بتوانێ فەرماندەیی هێزەکەی ژێر دەستی بکات، لەکاتی پەلامارو هێرشدا یان لەکاتی بەرگری و پاراستندا بتوانێ نەخشە دابنێت و ئیدارەی هێزەکەی بدات و خاوەن بڕیاری سەربەخۆ بێت لەکاتی نائاسایی و لەناکاودا ......تاد ). هەرچەندە شەهید هەر شەهیدەو بەرزترین پلەیە ، شەهیدانمان بەژمارە زۆرن و کاروانەکەشیان بێکۆتاییە، بەم شێوەی ئێستا وێنە دروست کردن و دانانیشی هەڵەیە، چوونکە تایەکێک کەسوکارو بنەماڵەکەی دەست رۆیشت و ئەتوانن وێنەی بۆدانێن، دەیانیتر ئەوەیان بۆ ناکرێت. ئەمەش جیاوازی دروست دەکات نیگەرانی لێدەکەوێتەوە، ئەکرێت شارەوانی حکومەت یان حزبەکان، لەهەر شارو ناوچەیەکدا مۆنۆمێنت یان دیوار بەندێک، باخچەیەک یان مەیدانێک هەبێت بەیەک ئاست و شێوە وێنەی هەموو گیان بەخت کردوەکانی ئەو سنوورە دابنێن و بشمێننەوە، نەک وەک ئەوانی ئێستا هەرکەس بۆخۆی و دایئەنێت و زووش خراپ ئەبن لەناو ئەچن. بابێمەوە بۆ سەر باسەکەی خۆم.

دوای کردنەوەی خولەکە من وتەیەکی بێسەرو بەرو پچڕپچڕم پێشکەش بە ئامادە بوان کرد هیوای سەرکەوتنم بەئاوات بۆ خواستن و بەجێم هێشتن. دوای ماوەیەک لەکردنەوەی خولیترو لەکۆمیتەکانی تردا تێگەیشتم ئەو خولانە بەقەد ئەرک و ماندوبوونەکەیان بەرهەمیان نییە، نازانم رەنگە نوقسانی لە هەردوولاوە بێت، هەم لەوەوە زانیاریەکە دەدات، هەم لەوەوە زانیاریەکە وەرئەگرێت، خۆی بەگشتی لەولاتی ئێمەدا و لەئاستی گشتیدا سیاسەتمەدار و سیاسی و کادر و کادری پێشکەوتوو، لە هەردوو بوارەکەدا سیاسی و سەربازی زۆربەی زۆرمان کوڵەوارین، خۆ بۆ ئەم جۆرە کەسانە مەرج نییە خاوەنی بڕوانامەی بالابن، بەڵکو لانی کەم دەبێت بخوێننەوە و متالەعەو متابەعە بکەن، رەنگە هەبن ئەم راستیەیان لاتاڵ بێت، رەنگە هەبن بڵێن ئەوە لە رابردوودا وابووە، ئێستا نەوەیەک پێگەیشتوە هەموو خاوەن بڕوانامەن. دەی نەک هەموو، بەشێکی ئەو خاوەن بڕوانامانە لەزانکۆو پەیمانگاکانی ئێمەدا دێنەدەرەوە ئەوەندەی بۆبەدەستهێنانی

بڕوانامەکە کاری کردووە، ئەوەندە بۆ بەدەستهێنان و وەرگرتن و فێربوونی عیلم و زانیاری و زانست هەوڵی نەداوە؟. بۆئێمەی کورد سەردەمیش جیاوازی هەیە، لەسەردەمی رابورد بەڕای من باشترین زانکۆ بۆ بەدەست هێنانی بڕوانامە خۆپڕچەک کردن بووە بەزانیاری گشتی و ئەزموون لەمەیدانی کردەوەدا .

ئەم بەشدار بوانەی خولەکانی ئێمەش هەر بۆ ئەوەی ناوی کادری لەسەر بنرێت، بەشداری کردووە، ئەمەجگە لەوەی زۆریان بە ئیجباری بەشداریان کردووە، هەیانە خوێندن و نوسین نازانێ، لە دەرچووی خولی رۆشنبیری کادرم پرسیوە چی فێربوویت؟ وەلامی داوەتەوە، وەڵا هیچ، پرسیومە بۆ؟ بەخوا کاکە مامۆستاکەمان قسەی شەیتانانە دەکات، قسەی شەیتانانەی وەک چی؟ وەڵا وەک مەترپالیزم، ئایلۆدۆژی، سترانجی.....تاد .

ئەمڕۆ ١٩٩٨/٥/٣ لە هەڵەبجە لە بارەگای مەڵبەند ئەنجومەنی مەڵبەند کۆبووەوە، بۆ قسەکردن و گفتوگۆ لەسەر ئەم بابەتانەی خوارەوە:

١-بارودۆخی سیاسی،٢- مەڵبەندو حکومەت،٣-جەولەکانی مەڵبەندو فەرماندەی پێشمەرگە بۆ ئاواییەکان، ٤-راگەیاندن و چالاکیەکانی، ٥- یەکلاکردنەوەی بارەگای مەڵبەند، لە سەیدساق بێت یان لەهەڵەبجە، ٦ - تەکاندنی سەقفی بینا حکومیەکانی سنوورەکە، لەلایەن بزووتنەوەی ئیسلامی و خەڵکیشەوە.

ئامادەبوانی کۆبوونەوەی ئەمڕۆ ئەم هەڤاڵانەن: ١-شەوکەتی حاجی موشیر، ٢- م فەتاح کۆکۆیی ، ٣-ئەحمەد قەدەفەری، ٤-کەریمی شێخ عەلی، ٤-کەمال هەورامی،٥-حەمەی غەفور شەریف، ٦-جەمال هەورامی، ٧-حەمە شارەزووری، ٨-عومەر عەبدولکەریم، ٩-شلێر غەفور، ١٠-قادر بێستانی، ١١-بەکری زەراعە، ١٢-م عەبدوڵا بەڵخەیی، ١٣-جەبار جەلال، ١٤-م بەکر بۆیسان سووری، ١٥- عومەری حاجی ئەحمەد، ١٦-جەلالی کاکەلی، ١٧-مام وریا هاواری، ١٨- جووتیار مەجید، ١٩- مامۆستا عوسمان عەبدوڵا، ٢٠- حەمەی حەمەسەعید ، ٢١- سەلاح رەش، ٢٢- مەحمود حاجی سالح .

ئەوانەی مۆڵەت بوون : ١- فەرەج حەمەسالح، ٢- هەورامان حەمەنوری. ئەوانەی گوازراونەتەوە: ١- حەمەرەزا، ٢- عەلی ئەکبەر. ئامادەنەبوو: مەلا ئەحمەد جەیران.

ئەوەی بیرم بێت لە کۆبوونەوەی ئەمڕۆدا لەسەر ئەو شەش خاڵە قسە و گفتوگۆ کرا، لەسەر حکومەت و حزب، بڕیارمان دا پشتگیری ئیدارەو هەڤاڵەکانمان بکەین و دەست لە کاریان وەرنەدەین، تا حکومەت هەیبەتی هەبێت و لە سنووری هەڵەبجەشدا حیسابی بۆبکرێت لەلایەن ئیسلامیەکانەوە، هەوڵیش بدەین حکومەت لەتەوێڵە و بیارەو خورماڵدا بەلانی کەمەوە ئیدارەکان دەوامی ئاسایی بکەن و ئەوکارمەندو بەرپرسانەی رایان کردووە یان دەرکراون لەسنوورەکەدا بیان گەڕێنینەوە شوێنی خۆیان. هەروەها لای سەرۆکی حکومەت و وەزیرەکان و پارێزگاردا بەدوادا چوون بکەین بۆ داواکاریەکانی خەڵک و بۆ بڕیار لێدان و جێبەجێ کردنیان، چونکە دەزانین داهاتوپارە زۆرە.

جەولەکانی (گەشتەکانی) هاوبەشی مەڵبەندو فەرماندەیی درێژە پێبدەین و ئاواییەکان و خەڵکەکەو دۆستەکانمان بەسەر بکەینەوە. بارەگای مەڵبەند یەکلا کرایەوە دەبێت لە هەڵەبجەدا بێت، ئەو بەشانەی چوونەتە سەیدسادق دەبێ بێنەوە بۆ هەڵەبجە، ئەمە بەپێداگری من و هەڵەبجەییەکان بوو، دوای ئەوە من لەگەڵ بەرپرسی مەڵبەندی بزووتنەوە بچینە لای مامۆستا مەلاعەلی تێبگەێنین پشتیوانیمان بکات تا پۆلیس و ئاسایش ڕێگری بکەن لەتەکاندنی سەقفی بینا حکومیەکان. بەهۆی گرانی و نەبوونی شیشی ئاسنەوە خەڵکی بیناکانیان هەڵ دەتەکاند شیش و بلۆکەکەیان دەفرۆشت. بەتایبەت لەسنووری هەڵەبجە و دەشتی شارەزوورو کۆمەڵگاکانی نەسرو باریکەدا.

لە ڕۆژی ٥/٣ تا٥/٦ لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگەو (نزار عەنەبی) بەرپرسی کەرتی ڕێکخستنی عەنەب و هاوار، کامێرەمانەکەی مەڵبەند، هەرێم کوڕی مام ئەمینی سەرگەت، بەنهێنی و بەپێ چوومە ئاواییەکانی هاوارو لەوێوە بۆ جاورو دۆڵبیان و سێ ڕۆژ ماینەوە، مەبەستی ئەم سەردانە بۆئەوە بوو هەموو جارێ لەکاتی شەڕو ئاڵۆزیەکاندا ناوچەی هەورامان و لای تەوێڵەمان لێ ئەگیرێ، لەبەر ئەوەی چەپەکەو یەک ڕێگای ئۆتۆمبێلی لەسەرە، لەگەڵ کاک شەوکەت و حاکم قادردا قسەم کردووە (حاکم پارێزگارە) و باسی کردنەوەی ڕێگایەکی ترم کردووە لە تەوێڵەوە بێتە دۆڵبیان و لەوێوە بۆ ئاوایی پالانیا و بەناو ئاوایی جاوردا بێتەوە سەر ڕێگای

هاوار- هەڵەبجە، لەبەر ئەوە ئێستە بارودۆخ لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامیدا ئارامەو ئەگەر بتوانم ئەم کارەبکەم لە ڕووی سەربازیەوە بۆ ئێمە گرنگە و ئاواییەکانیش لێی سودمەند دەبن. دیارە ئەوکات ئەم بەرنامەمان بۆ جێبەجێ نەبوو، بەلام دواتر نەک ڕێگایەک دوو ڕێگای ترم کردەوە، یەکێکیان لە هاوارەوە بۆ ئاوایی دەرەتفێ و لەوێشەوە بەسنووری عێراق ئێراندا بۆ تەوێڵە، ئێستا لە هەڵەبجەوە ڕێگای ئۆتۆمۆبێل لەهاوارەوە بەدەرەتفێدا ئەڕواتە شارەدێی تەوێڵە، ڕێگای دووەم بەر لەوەی بگەیتە ئاوایی بەڵخە بەدەستی چەپدا ئەڕوات و دەچێتە سەر چیاکانی پشتی تەوێڵە و دائەبەزێتەوە بۆ هاوینە هەواری ئاوێسەرو ئەگاتەوە تەوێڵە، لەشوێنی خۆیدا باسی دەکەین چۆن هەوڵمان دا حکومەتی هەرێم ئەم دوو ڕێگاو ڕێگای هەڵەبجە بۆ ئاوایی بۆین دروست بکات، لەبەر ئەوە ئەندازیارەکان کولفەکەیان بەچەندین ملیارد دینار دیاری کردبوو، وەزارەتی ئاوەدان کردنەوە، ڕەفزی کردو نەیان کرد. بەلام ئێمە بەوەرگرتنی یەک بیلدۆزەرو هاوکاری کاک مەهدی کۆکۆیی بەرپرسی بنکەی ئاوەدان کردنەوە هەڵەبجە، هەر سێ ڕێگاکەمان دروست کرد.

ئەم ماوە سەردان و بەسەر کردنەوەی لایەنە سیاسییەکان لەسنووری هەڵەبجەو شارەزووردا زووزوو ئەکرێت، هەم ئەوان سەردانی مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوور دەکەن و هەم ئێمەش ئەوان بەسەر دەکەینەوە، هەر لەو چوار چێوەدا ڕۆژی ١٩٩٨/٥/٩ ئەمینداری گشتی بزووتنەوەی ڕاپەڕین(نەهزە) مامۆستا شێخ سەدیق عەبدولعەزیز وچەندین لەئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیان یاوەری بوون، سەردانی ئێمەی کرد لەبارەگای مەڵبەندی شارەزووردا.

مامۆستا مەلاشێخ سەدیق پیاوێکی هێمن و لەسەرەخۆو بەڕێزە، پەرۆشی ئاشتی و قەد لەگەڵ توندووتیژی و ئاژاوەدا نەبووە، لەڕاستیشدا حزبەکەیان لەسنووری هەڵەبجەو سلێمانیدا کۆمەڵێک کادری باش و بەتوانایان هەیە، ئەمڕۆ لەگەڵ کاک شەوکەتی حاجی موشیرو چەند هەڤاڵێکی مەڵبەندا پێشوازیمان کردن، قسەوباسمان لەچوارچێوەی ئاشتی و تەبای و پێکەوە ژیاندا بوو، جەنابی مام جەلال دووجار، جارێک بەنامەو جارێک بەزارەکی ئامۆژگاری کردوم کە دەبێت حورمەتی مامۆستا مەلاشێخ سەدیق

بکرم، هەرچەندە خۆی پیاوی بەڕێزەو من هەمیشە ڕێزی تایبەتم لێگرتووە، بەڵام لەبەر ئامۆژگاریەکەی مام جەلال سەردان و بەسەرکردنەوەکانم بۆلای بەڕێزیان زیاتر کردبوو. دوای بەڕێکردنی مامۆستاو وەفدی یاوەری لەگەڵ کاک شەوکەتدا چووین بۆ قەزای شارەزوور بۆ بەشداری کردنەوەی خولی رۆشنبیری بۆ کادرانی کۆمیتەی قەزای شارەزوور. نیوەڕۆ لای کاک رزگار شەمێرانی بووین، رزگار کادرێکی ئاگاو چاونەترسە لەبواری ئیسلامی سیاسیدا چالاکەو کاردەکات.

ئەم ماوە ئەمانەوێت زیاتر بارودۆخی ناوچەکە بە تایبەت هەورامان و خورماڵ ئاسایی بکەینەوە، هەوڵ ئەدەین بارەگای ڕێکخستن بەرینەوە ناوچەکە، دوای ڕێکخستن، ئیدارەکانی حکومەت بگەڕێنەوەو دەوری خۆیان ببینن. بۆئەم مەبەستە سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٩٩٨/٥/١٤ لەگەڵ کاک شەوکەت و چەند هەڤاڵێکی ئەنجومەنی مەڵبەندا چووینە شارۆچکەی خورماڵ، لە دەروازەی شارۆچکەکەدا مەڵبەندی دووی بزووتنەوە پێشوازیان کردین، پێشمان کەوتن بەرەو بارەگای مەڵبەندەکەیان لەناو شارۆچکەکەدا، ئێمە نزیکەی ٣٠سی پێشمەرگەمان لەگەڵ خۆمان بردبوو، ئامۆژگاریمان کردبوون کە وریابن و غافڵ نەبن و نەشبنە هۆی ڕوودانی روداو، چوونکە متمانەمان نەبوو بەو بزوتنەوانەی ناو خورماڵ کەخەڵکی ناوچەکە نەبوون، ئەوانە توندڕەو دواتر هەموو بوونە جوندو لەدوای جوند داعش درووست بوو بوون بەداعش.

ڕاستە مەڵبەندەکەیان ئاگادارەو ئێمە بەفەرمی ئەچین، بەڵام لەناو بزووتنەوەدا کەسبەکەس نییەو چەندین گروپ و دەستەو تاقم هەبوون، بزووتنەوەش خۆی بۆی کۆنترۆڵ نەدەکران، هەر ئەمڕۆ لەدەروازەی شارەوە تاگەیشتین بە بارەگاکەیان هەر ڕیشدار بوو بەرودواو بەدەورو پشتماندا گفوهوڕیان بوو، جاروبار لولەی چەکەکانیشیان دەکردە ئێمە و بەئاماژەش هەڕەشەیان دەکرد، لەگەڵ ئەم مەڵبەندە کۆبوونەوە دەستی پێکردو باسی بردنەوەی بارەگای ڕێکخستنمان کردو دوای ماوەیەکیتر ئیدارەکانیش بگەڕێنەوە، بۆئەوەی دەستی کارو خزمەتگوزاریش بگاتەوە ناوچەکەو چیتر لەمە زیاتر هاوولاتییان نەبنە قوربانی.

شارۆچکەی خورماڵ وێران و ڕێگاوبانەکان چاڵوچۆڵ و لەسەر جادەو لە ناوەراستی مەیدانەکەیدا هەرکەس بە ئارەزووی خۆی دوکان و کوخ و کەویێلیان بە نایلۆن و دارو بەرد دروست کردبوو، کوچە و کۆڵانەکان بێ ئاوەڕۆ بۆگەنیان کردبوو، ڕیزی عارەبانە ڕێگەی هاتوچۆی ئۆتۆمۆبێل و خەڵکیشیان گرتبوو، بۆکەس زاتی دەکرد بەکەس بڵێت بڕۆرە دواوە هەرخاوەن عارەبانەیەک کلاشینکۆفی خۆی بەمەخزەنی حەفتاوپێنجیەوە لەسەر عارەبانەی خۆی دانابوو، هەبوو چەکی نەبوو بەلام ڕیزێک نارنجۆکی (ڕومانە) لەخۆی بەستبوو، بەوناوەدا ئەسوڕانەوە. دوای کۆبوونەوەکە وتیان حەزدەکەین سەردانی مەڵبەندی چەمچەماڵیش بکەن، پێکەوە ڕۆیشتین بۆ ناو کۆمەڵگای خورماڵ، مەڵبەندی ٨ هەشتی چەمچەماڵ لەناو بینایەکی هەیکەلدا بوون، ئاخر لەم وڵاتدا بینا نییە چەندین جار دەرگاو پەنجەرەو وایەری کارەباو بۆرییە ئاو و کاشیەکانی لێنەکرابێتەوە.

بەرپرسی مەڵبەندی چەمچەماڵ مەلا جەلال جەوهەر بوو، ئەمانە تورەو و وەک مەڵبەندی دووی هەورامان ئەهوەن نەبوون، مەلا جەلال باسی ئەوەی دەکرد ئەوە ئیسلامیش بوو بەخاوەنی چەکی ئەتۆم، باسی پاکستانی دەکرد، ئەندامێکی مەڵبەندی دوو لەلای منەوە دانیشتبوو، بەهێواشی وتی مەلا جەلال جنۆکەش لە لەشی خەڵکدا دەرئەکا، پرسیم چۆن؟ وتی نیوەی ئەم خەڵکەی تێلاکاری کردووە. ئەوەندەی نەبرد مەلا جەلال باسی ئەوەی کرد، کە هێزێکی ئەحتیاتی باشیان لەوانیتر هەیە، مەبەستی ئەوەبوو هێزێکی (جنۆکەکان) هاوکاریان دەکەن، دوای ماوەیەک دانیشتن هەستاین و ئەوانیشیان هێناو پێکەوە نانی نیوەڕۆمان لەلای مەڵبەندی دووی بزووتنەوە خوارد.

ئێوارە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی شەو چووم بۆ بەشداری پرسەی دایکی شێخ حسێنی شێخ مستەفا، لەوێ هەستام و چووم بۆ مزگەوتی عەبدولا لوتفی تەرمی کاک نورەدینی سەی قادر لە ئەوروپاوە هێنراوەتەوە تابەیانی لەوێ دانیشتم، بەیانی کاک شێخ جەعفەر و برادەرانیتر هاتن و چووین بۆگردی سەیوان و پاش بەخاک سپاردنی من گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە.

ئەم ماوە بزووتنەوە کەوتونەتەوە پێشێل کردنی هەندێک مادەو بڕگەکانی ڕێککەوتننامەی نێوانمان هەرچەندە چەند بەندێکیان هەر جێبەجێ

نەکردوە، وەدەستیشیان کردووە بەگواستنەوەی ئەو هێزانەی سنووری هەولێریان بۆ هەڵەبجەو دەوروبەری. بەپێچەوانەی خاڵێکی ناو رێککەوتن نامەی نێوانمان کە دەڵێت: دەبێ بزووتنەوە ئەو هێزانەی لەناوچەکانی ترەوە هێناویەتی بۆ هەڵەبجەو هەورامان ، بیانگێڕێتەوە بۆ ئەو شوێنانەی پێشوی خۆیان. بۆیە ئەمڕۆ رۆژی ٥/١٩ بەبروسکە مەکتەبی سیاسیم لەو حاڵەتە ئاگادار کردەوە، دوانیوەڕۆ چووم بۆکەلار بۆبەشداری پرسەی هاوسەری حاجی ئیبراهیمی قەڵاتەبزان.

وابەرەو بیست و سێهەمین ساڵیادی دامەزراندنی یەکێتی و بیست و دووهەمین ساڵیادی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ ئەچین، راگەیاندنی یەکێتی داوای کرد بۆ ئەوبۆنە چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی بۆ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان و ڕادیۆ بکەم، بۆ ئەومەبەستە ڕۆژی٥/٢٦ لەگەڵ هەڤاڵ حەمەی ئەبووبەکر(حەمە هاواری) پێشمەرگەی ساڵی ١٩٧٦بووە، چووینەوە بۆ دۆڵی هاواو گریانەو کولێن دەشت و ئەشکەوتەکانی گوێ ڕووباری سیروان، ئەم شوێنانە جێگەی حەوانەوەو مانەوەی پێشمەرگەکانی سەرەتای شۆڕش بووە لە ساڵی ١٩٧٦ بەدواوە، کاک فەلاحی ئەحمەد رەشید و بەختیار فەتاحی بیارەیی لەلایەن راگەیاندنەوە هاتوون و خەریکی وێنە گرتنن، ئەمانە دوو کوڕی گەنجی خوێن گەرمی چالاک و دڵسۆزن. رۆژی ٥/٢٧ هاتینە تەپی سەفاو چووینە ئەو جێگە یەکەم مەفرەزەی شارەزوورو یەکەم شەو جێگە ژوانیان بووە لەوێدا یەکیان گرتوەتەوەو چوونەتە دەرەوە، دواترو ڕۆژی ٥/٢٧ برادەرەکانی راگەیاندنمان لەگەڵ شارەزایەکدا نارد بۆبناری چیای سورێن بۆسەر کانی سیانی، چوونکە لەسەر ئەم کانییە ڕۆژی ١٩٧٦/٦/٢٧ ئەو حەوت هەڤاڵە کۆبونەوەو مەفرەزەیان بۆخۆیان تەشکیل کردووە.

ئەوانیش ئەمانەبوون: شەهید عەلی شیعە، فەرماندەی مەفرەزە، شێخ عەلی کەشکۆڵ رابەر سیاسی، حەمەسەعیدە سور(د.رەزا)، شەهید شەوکەتی حاجی موشیر، حامیدی حاجی خالید، محەمەدی حاجی مەحمود، تۆفیق رەحیم (حاکم کامەران).

بەڵی خۆشم رۆژی ٥/٣٠ بۆ رادیۆ لەعەربەت و رۆژی ٥/٣١ لە باخچەی گشتی سلێمانی بۆ سەتەلایتی گەلی کوردستان سەبارەت بەدامەزراندی یەکێتی لە١٩٧٥/٦/١دا و هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ

له۱۹۷٦/٦/۱دا قسەم کرد. لەسەر دروست بوونەوەی شۆڕش و مەفرەزە چەکدارەکانی، بۆیەکەم جار کام مەفرەزەو لەکام ناوچەدا، کامیان پێش ئەویتر چووەتە شاخ، بۆ ئێمە ئەوانەی لەسەرەتای شۆڕشەکەوە لەگەڵ بووین، هەرچەندە مێژوویەکی دوور نییە و زۆربەمان ماوین، کاتێک قسە دەکەین لەسەر یەک بابەتی دیاری کراو قسەکانمان جیاوازی تیایە، بۆ نموونە لەسەر ڕۆژی دەرچوونی فلان مەفرەزە، یان کێ فەرماندەی ئەو مەفرزە بووە، قسەکانمان جیاوازی تێدایە[1].

بەداخەوە ئەوەیە مێژووی کورد، جا شۆڕشەکەی دوێنێی ئێمە بەراورد بکە لەگەڵ نوسینەوەی مێژووی بازۆر دوور نەڕۆینە دواوە ئیمارەتە کوردییەکان، ئەبێ مێژووە ڕاست و دروستەکە، لەگەڵ ئەومێژووەی سەر کاغەز و نوسراوەکە، چەند دوور لەیەک و جیاواز بێت؟. سەبارەت بەنوسینەوەی مێژوو ووتەو رای جیاوازجیاواز هەن، دەڵێن مێژوو براوەکان دەینووسنەوە بۆیە لێوانلێوە لەدرۆو چەواشەکاری، دەڵین مێژوو حکایەت خوانەکانی دەربارەکان دەینووسنەوە، دەڵێن مێژوو مێژوو نوسانی دەستەلات و ئیمپراتۆرەکان دەینووسنەوە بۆیە کەم ڕێک دەکەوێت ڕاستی تێدابێت، دەڵین مێژوونوس روئیای خۆی تێکەڵ بەمێژوو دەکات یان بەدڵی ئەربابەکەی دەینووسێتەوە،........تاد .

یادی ڕۆژی دامەزراندنی یەکێتی و هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ ئەمڕۆ ۱۹۹۸/٦/۱ هەڤالانی ئەنجومەنی مەڵبەند لەبارەگای مەڵبەند لەهەڵەبجە کۆبوونەوەو پێشوازیمان کرد لەو میوانانەی سەردانیان دەکردین، میوانەکانیش دۆست و ئەندامان و لایەنگرانی خۆمانن، لەگەڵ نوێنەرانی لایەنەسیاسییەکانی ناوچەکەو لەرۆژی سێهەمیش دا واتە٦/۳ بۆ پیرۆزبایی، نسرولای رشنودی (ئاغای ئحسانی) کەئێستا سەرکنسوڵی ئێرانە لەهەولێر لەگەڵ سەمیرناوێک کە نوێنەری کۆماری ئیسلامی ئێران بوون سەردانیان کردین. لەرۆژی ٦/۳دا کوردستانی نوێی ژمارە ۱٦۲٦ ساڵی حەوتەم

---

[1] لەکتێبی دیداری تەمەندا لەبەشی دووەم لەلاپەرە ٥۱ بۆ ٦۰ مام جەلال لەبابەتێکدا بەناوی (سەرتای خەباتی چەکداری یەکێتی) کام مەفرەزە یەکەم جارو کام دووەم جارو لەچ ناوچەیەکدا بوون هەمووی ڕوون کردووەتەوە.

بابەتێکی وەرگێڕدراوی بڵاو کردبوومەوە بەناوی چیای هەورامان. ڕۆژی ٦/٥ سەتەلایتی گەلی کەردستان لەبەرنامەیەکی تایبەتدا چاو پێکەوتنەکەمی سەبارەت بە ٦/١ بڵاوکردەوە.

ئەمڕۆش ١٩٩٨/٦/٨ لەهەڵەبجەم دوای ئیشوکاری مەڵبەند سەردانی کاک حەمەیوسفی بەڵخەیم کرد، لەزیندانی ئەبوغرێب ئازاد کراوە، ساڵی ١٩٨٧ گیراوە و ئەمڕۆ دوو ڕۆژە گەیشتوەتەوە ماڵی خۆی لەهەڵەبجە، کوڕێکی پێشمەرگە بووەو شەهید بووە تائەمڕۆش پێیان نەوتوەو نەیزانیوە، لەبەرگی یەکی دەنگی خاکدا لەلاپەڕە ٥٦ بۆ٥٩ باسم کردووە چۆن و لەسەر چی گیراوە، لەوێدا بەهەڵە نوسراوە ساڵی ١٩٩٩ ئازاد کراوە، ڕاستیەکەی لەمانگی شەشی ١٩٩٨دا ئازاد کراوە.

ئەمشەو شەوی ٨ لەسەر١٩٩٨/٦/٩ خەریکی وەرگێڕانی بابەتێک بووم لەسەر کۆنفرانسی کورد و عەرەب، ڕۆژنامەیەکی ئێرانی بەناوی ئاویەر بڵاوی کردووەتەوە، ناونیشانی بابەتەکە ئەمە بوو: (کۆنفرانسی کورد و عەرەب بۆ کام مەبەست) کۆنفرانسی کورد و عەرەب لە ڕۆژانی ٢٧و١٩٩٨/٥/٢٨ لە قاهیرەی پایتەختی وڵاتی میسردا بەڕێوەچووە، لەماوەی هەفتەیەکدا ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی جیهان لەبارەیەوە نوسیان، ئەم کۆنفرانسە بەسەرپەرشتی ڕۆژنامەنووس و کۆنە ئەفسەری سەردەمی خوالێخۆش بوو جەمال عەبدول ناسرەوە بەڕێوەچووە، ناوی ئەحمەد حەمروشە، نوێنەرانی پارتی و یەکێتی و حزب و ڕێکخراوەکانی تری کوردستانی و ڕۆشنبیران و کەسایەتی عەرەبی و میسری تێدا بەشداریان کردوە.

ڕۆژی٦/١٩ کاک ئەحمەد قادر باوکی کاک ئەکرەم کۆچی دوای کردبوو چووم بۆ بەشداری پرسەکەی، لەوێ ئاگاداریان کردین بزووتنەوە بەزیلی سەربازی داویانە لەبرای مام والی تازەدێی لەوێوە چووین بۆ تازەدێ بۆ بەشداری پرسەکەی، بۆ ڕۆژی دواتر حاکم قادر و چەند هەڤاڵێکی تر لە سلێمانییەوە هاتن بۆ بەشداری لەپرسەی باوکی ئەکرەم و لەوێشەوە پێکەوە چووینەوە بۆتازەدێ بۆپرسەی براکەی مام والی.........................

ئەم ماوە کێشەی ئیدارەو بەڕێوەبردنی مەڵبەندو نەبوونی ئازوقەو خۆراکی پێشمەرگەمان هەیە، برادەرانی مەڵبەند داوای لابردنی کاک حەمەسەلیم فەتحوڵا دەکەن، حەمەسەلیم بەرپرسی ئیدارەی ناو بارەگای مەڵبەندە،

برادەران گلەییان هەیە لەسەر ئەوە نان و چێشتەکە بەشیان ناکا، یان گۆشتی تێدا نییە، هەر ڕۆژێکیش ئەگەر گۆشتی تیابوو زۆرکەمە. نازانن ئەو برەپارە، ئەدرێت بە مەڵبەند زۆر کەمەو بەشی مانگێکی تەواو ناکات بەرێک و پێکی، کاک حەمەسەلیم گوناحی نەبوو. ئەوەتا ئەو هەموو کۆبوونەوانە دەکەین بۆ ڕێکخستنەوەی بەشەکان بۆ کەم کردنەوەی خەرجیە، ئەمانەوێت شتێک بکەین سەری مانگ قەرزار نەبین، کەچی نەمان توانی سەرکەوتوبین ، هەمیشە ئەو پارە کەوەرئەگیرا بۆ ئەم مانگە، قەرزی مانگی پێشووتری پێ دەدرایەوە.

ئەمرۆ١٩٩٨/٦/٢٦ لە هەڵەبجەدا بووم دوو لاپەڕەیی چاپ کراویان بۆ هێنام بە ناونیشانی ( ڕوون کردنەوەیەک لەمەکتەبی ڕێکخستنی بزووتنەوەی ئیسلامیەوە) کە لە ڕۆژی ٦/٢٥دا دەرچووە. لەو نوسراوەدا، بزووتنەوە ئامۆژگاری لایەنە ئیسلامییەکان دەکات کە بەنزیک بوونەوەو یەکدەنگیان، کەلێنەکانی ئیسلامی سیاسی پڕبکەنەوە. دواتر هەڕەشە دەکات بەتایبەت لەیەککرتووی ئیسلامی، لەسەر ئەوە لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا پرسیار لە مامۆستا سەلاحەدین ئەمینداری گشتی یەکگرتوو کراوە، سەبارەت بەحزبی ئیسلامی و هێزی چەکداری، لەوێدا مامۆستا ڕاشکاوانە وەڵامی داوەتەوە، بزووتنەوە دەڵێت لەوێدا پلارو توانجی بۆسەر کارو بیر کردنەوەی جیهادی بزووتنەوە هەبووە، لەسەر ئەمە وەڵامێکی مامۆستا سەلاح ئەدرێتەوە، لەلایەن کەسێکەوە بەناوی (ئاگر عەبدوڵا) ئەویش بێ ئحترامی کردووە بەناوبراو، یەکگرتووش لە بازاری هەڵەبجەدا ڕێگە بەکادرێکی ناسراوی بزووتنەوە ئەگرن، گوایا ئاگر عەبدوڵا ئەوە.

لە ڕۆژی ٦/٢٢دا بزووتنەوەش دوو ئەندامی یەککرتوو ئەگرێ و ئیهانە دەکات تاڕادەی بێ ئحترامی پێکردن ئەوانیش م . مادی و کاک عادل بوون، پێیان دەڵێن یەککرتوو خەنجەر بۆکزی دەرهێناوە بۆ ئەو ئەندامەمان......تاد .

ڕۆژی ٦/٢٨ خوشکێکی دوو شەهید هاتە مەڵبەند، داوای کرد یارمەتی بدەین دەچێت بۆ نەخۆشخانە، ٢٠٠دووسەد دینارم بۆ نووسی، مامۆستا فەتاح کۆکۆیی بەرپرسی ئیدارە بەنامەکەوە هاتە لام و ووتی پارەمان لانییە، بایەکێک بەقەرز بیداتێ تادوایی ئەیدەینەوە، گەڕا یەک کادری مەڵبەند نەبوو

دووسەد دیناری پێی بێت ، ناردم کاک حەمەسەلیم هات ئەویش ووتی وەڵا پارەمان نییە.

ئەمە لەکاتێک دایە، پارتی دەستی بەسەر داهاتی کوردستاندا گرتووەو دەروازەی برایم خەلیلی کۆنترۆڵ کردوە، ئۆرگانەکانی حیزبی برادەرانی پارتی بووجەو نەسرییەی خەیاڵیان لەژێر دەست دایە. یەکێتیش بۆ هەندێک کەس و بەرپرس، بەخەربارو بۆ هەندێکیان و ئۆرگانەکانی بەمسقاڵ .

ئەمڕۆ ۱۹۹۸/۷/۷ کاک حیلمی عەلی شەریف کۆچی دوایی کرد، کاک حیلمی هەروەک پێشتر باسم کردووە تێکۆشەرێکی سیاسی و سەربازی گەلەکەمان بووە، دەوری گرنگ و بەرچاوە لەکوردستان و بەتایبەتیش لەهەڵەبجە و شارەزوور وسلێمانیدا هەبووە، یەکێک بووە لەتێکۆشەرەکانی سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول. هەر ئەمڕۆش کاک کۆسرەت سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران سەردانی شارەزووری کرد، لەم سەردانەیدا جگە کۆبوونەوەیەکی حزبی لەگەڵ هەڤالانی مەڵبەندی شارەزووردا، لەسێ شوێنی جیاوازدا سێ کۆبوونەوەی جەماوەرییشی لەگەڵ خەڵکدا کرد، کۆبوونەوەیەک لەگەڵ جەماوەریی شارۆچکەی سەیدسادق و کۆبوونەوەیەک لەگەڵ جەماوەریی ئاوایییەکانی بناری سورێندا، لەئاوایی نەوێ و دوا کۆبوونەوەشی لەگەڵ جەماوەریی شارۆچکەی عەربەتدا بوو، لەم سەردانەدا جەماوەرێکی زۆر ئامادەبوون و کۆبوونەوەکانیشی زۆر قەرەباڵغ بوون، لەکۆبوونەوەکاندا خەڵک داواکاری هەبوو، ئەویش بەڵێنی جێبەجێکردنی ئەدا. ئەو ماوە ئێمە لەشارەزووردا بووین، ئەو بەرپرسانەی حکومەت هەر لەسەرۆک وەزیران و جێگرەکەی و وەزیرەکانیان و بەڕێوەبەرەگشتییەکان و......هتد، کە هاتونەتە سنوورەکە و بەڵێنی ئاوەدانی و بووژانەوەی ناوچەکەیان داوە، دواتر دەبوو ئێمە بەردەوام دوایان بگرین و بیریان بخەینەوە بۆ جێبەجێ کردنی بەڵێنەکان، بۆیە لەوبارەوە ئەرکی سەرشانمان قورس بوو. چوونکە هەندێک بەرپرس بەڵێنیان ئەدا و کارەکانیان جێبەجێ نەدەکرد، بەڵام ئەبێ ئەوەش بڵێم لەبەر ئەوە خاوەن بەڵێنەکان یەکێتی بوون، منیش دەست کەوتەکانم دەکرد بەبارەقەڵای حزبی، زیاتر بۆ کۆکردنەوەی دەنگ بۆکاتی هەڵبژاردنەکان. ئەمڕۆ لەکۆبوونەوە حزبییەکەدا کێشەی قەرزمان هەبوو مەڵبەند مەبلەغێکی بەرچاو قەرزار بووین، کاک کۆسرەت بۆی بژاردین.

ئێوارەکەشی لەگەڵیدا ڕۆیشتینە سلێمانی بۆ بەشداری لە ڕێورەسمی پرسەی خوالێخۆش بوو کاکە حیلمی عەلی شەریف.

کاک کۆسرەت، ئەمرۆ هەرچەندە وەک سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێم ئیدارەی سلێمانی سەردانی شارەزووری کردبوو، لەپەنای ئەم سەردانەوە کێشەکانی مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزووری یەکێتی نیشتیمانیشی بۆ ئێمە چارەسەر کرد، کێشەکەشمان بچوک نەبوو، بڕیاردان بوو بۆ بژاردنی ۱۰۰سەد هەزار دینار قەرزی مەڵبەندو سەرف کردنی ٤٠ چل هەزار دیناری ئەو سەردەمە بۆ کڕینی ئەساس بۆ بینای نوێی مەڵبەند لە سەیدسادق. قەرزەکەمان زۆرتر پارەی کارەبای بیناکانی بارەگا حیزبییەکان بوو، کاک کۆسرەت ووتی ئێوە حیزبن من ناتوانم قەرزەکانتان بدەمەوە لەپارەی حکومەت، منیش ووتم کاک کۆسرەت پارتی نەسریەی لقی ٢٥ بیست و پێنج بەرابەری مەڵبەندە، یەکێتی مانگانە بڕێکی خەیاڵی ئەدەنە بزووتنەوەی ئیسلامی، ئەوە جگەلەوەی ژێربەژێر ئەیدەن بەمامۆستا باپیر، ئەوهەموو پارانە بۆ دژایەتی مەڵبەندی شارەزوور، بەکاردێتەوە، ووتی باشە لەپارەی یەکێتی قەرزەکەتان بۆ دەبژێرم.

هەروەها جێبەجێ کردنی بەڵێنەکانی کە بەخەڵک ئەدرا، تاڕادەیەکی باش کاک کۆسرەت بەڵێنی خۆی جێبەجێ ئەکرد. زیاد لەوەش ئەو دۆستایەتی و خۆشەویستیەی کەهەیبوو بۆ پێشمەرگەو فەرماندەکانیان وایکرد بوو، جگە لەوەی ئێمە بە تایبەت من لە مەڵبەند و مەهدی برام لە فەرماندەیی، چیمان داوا بووایە بۆ ناوچەکانی سنووری کارکردنمان دەیزانی داوای ڕەوایە دریغی نەئەکرد.

بۆ نمونە: چەند ڕۆژێک بەر لە١٩٩٩/٣/١٦ لەگەڵ مەهدی برام و مامۆستا نائب سابیر هاواری سەردانمان کرد لەسلێمانی لەبارەگاکەی خۆی، دوای چاک و چۆنی لە دەنگوباسی ناوچەکەو هەڵەبجەی پرسی، ئێمەش وەڵامان دایەوە، ووتی بۆ ٣/١٦ دێمە هەڵەبجە، ووتمان بەخێر بێیت، باسمان لە داواکاری خەڵک و کەسوکاری شەهیدان کرد، ووتی چیمان پێبکرێت دریغی ناکەین، بۆ ئەمساڵ کۆمەڵێک پرۆژەش جێبەجێ ئەکەین. بە پێکەنینەوە ووتی خۆت و مەهدی چیتان پێویستە؟ ووتمان سەلامەتی تۆ، ووتی نا بەڕاستی چیتان پێویستە، پێم بڵێن. منیش ووتم کاک کۆسرەت شتێک هەیە ئەگەر

بتوانی و مەجال هەبێت بیکەیت ئەوە بۆ من و مەهدیە، ووتی فەرموو، ووتم ئەم کورە کاکەیی و مامۆستاو خەڵکی هاوارە لەگەڵمان، لەزووەوە داوا ئەکات ئەڵێت هەرکات چوونە لای کاک کۆسرەت بمبەن بۆلای، ئەوە هەر بۆ بینینی تۆو سەردان هاتووە، کاکەییەکان لە هەڵەبجەدا دۆستمانن، بەر لە داگرتنی ئاواییەکان لەسەر سنوورو لە سێ ئاوایی هاوارو هاوارەکۆن و دەرەتفێ دا ئەژیان. بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی و قایمیی سنوورەکەیانەوە زۆر خزمەتی پێشمەرگەیان کردووە، خاوەنی دەیان پێشمەرگە و شەهیدی قارەمانن، ئێستاش لە هەڵەبجەدا ئەژین لەدوای دروست بوونی حەرەکەی ئیسلامی و شەڕی ناوخۆ و بەتایبەت لەلایەن توندڕەوەکانیانەوە کەوتونەتە بەر مەترسی. لەباری ژیان و گوزەرانیشەوە بارودۆخیان خراپە.

داواکەمان ئەوەیە ٥٠٠ پێنج سەد کەسیان بۆ دامەزرێنە، لە ئیدارەکانی حکومەتدا، کاک کۆسرەت کەمێک وەستاو ووتی ٥٠٠ پێنج سەد کەس زۆرە، ٣٠٠ سێ سەد کەسیان بۆ دائەمەزرێنم بەمەرجێک جیاوازی نەکەن لەنێوان یەکێتی و لایەنە سیاسیەکانی تردا. ووتمان دەست خۆش، بەسەر چاو ئەوان زۆرتر یەکێتی و دوای یەکێتیش پارتیان هەیە، لە ئەنجومەنەکانیان و مامۆستا نائب و چەند کەسی تر لیژنەیەک دروست ئەکەین و ناوەکانت بۆ ئەهێنین. ئەوەبوو دوای یەک هەفتە و بۆ یادی ١٩٨٨/٣/١٦ لە ١٩٩٩/٣/١٦ فەرمانی دامەزراندنی بۆ ٣٠٠ سێ سەد کوڕ و کچی گەنج و تێکەڵاو لە خاوەن بڕوانامە و نەخوێنەوار دەرکرد.

لە ڕۆژی٧/١٩ی هەر ساڵێکدا خەڵکی پێنجوێن و دەوروبەری یادی ڕاپەڕینی ڕۆژی ١٩٨٠/٧/١٩ دەکەنەوە، لەم ڕۆژەدا ساڵی ١٩٨٠ سوپای ڕژێمی سەدام شوانێکی شەهید کردووە بەناوی دێوانە مەجید، لەتۆڵەی کوژرانی ئەفسەرێک و دوو سەربازی سوپاکەیدا، کە لەلایەن پێشمەرگەیەکی یەکێتی نیشتیمانییەوە کوژابوون، کاتێک ئاواییەکانی سەر سنوورو دۆڵی شلێر و دەوروبەری شارۆچکەی پێنجوێن ساڵی ١٩٧٩ داگیران و لە سێ کۆمەڵگەدا نیشتەجێکران، ئەوانەش کۆمەڵگاکانی شانەدەری و ناڵپارێز و ڕاوگان بوون، سنووری ئاواییە ڕاگوێزراوەکان و ناوچەکە بەناوچەی قەدەغەکراو دیاری کرا، خاوەن ئاژەڵ و مەڕومالاتی ئەو ئاواییانەی لە ڕاوگان نیشتەجێ کرابوون، پیاوێکی هەژاریان گرتبوو بە شوان، ئەوەبوو

چەند سەد مەترێک لە پێنجوێن و ڕاوگان دوورتر ناوچەی قەدەغەکراو( مەحەڕەمە) بوو، شوانەکەش ئاژەڵەکەی لەوێ ئەلەوەڕاند. ئەوکات پێشمەرگەکانی هەرێمی ٣سێ لە شارباژێر و بەشی زۆریشیان لەگەڵ پێشمەرگەکانی هەرێمی یەک لەڕۆژهەلات و لە سنووری شاری مەریوان دا بوون، هاتووچۆی پێشمەرگە لە باشوورەوە بۆ ڕۆژهەلات لەرێگای ئاواییەکانی دۆڵە سورەوە بۆ کوڵێتان و سیامێوە و سەرکەوتن بەچیای کانی سێف و دابەزینەوە بۆ ئاواییەکانی تازەدێ و کوڕی گەبڵە، دواتر بە نێوان ئاواییەکانی تووتمان و هوشیاریدا لە چەمی بووزان و ئاودیو بوون لە مەرزەوە بۆ ئاواییەکانی ئاسناواو مرانە و دۆڵەبێ لە ڕۆژهەلات، بەلام جارجار مەفرەزەی بچوک بچوک و تاک تاک پێشمەرگەی شارەزا لە شارباژێرەوە بە چیایی تالیەردا و بەپەنا پێنجوێن و ڕاوگاندا لە مەرزەوە ئەپەڕینەوە بۆ ئاواییەکانی باشماخ و بایاواو ساوێن و جەژنی ئاوا لە ڕۆژهەلات.

لە١٩٨٠/٧/١٨ کاتێک یەکێک لە پێشمەرگەکانی هەرێمی سێ بەناوی عەبدوڵا نەرزەنەیی برای عەولا نەرزەنەیی لە شارۆچکەی پێنجوێن دەبێت لەماڵەوە ئەیەوێت بەڕۆژدا بپەڕێتەوە، دەستەیەک سەرباز ئەیبینن چەکی پێیە، داوای لێ دەکەن خۆبەدەستەوە بدات، ئەویش تەقەیان لێ ئەکاو ئەفسەرێک و دوو سەربازیان لێ ئەکوژێت، عەبدوڵا خۆی دەرباز کردبوو لە شوێنەکەدا، بۆیە سوپا و جاش دەچێتە شوێنەکەو عەبدوڵا نادۆزنەوە، عەبدوڵا نەرزەنەیی کوڕی حسێن سەعیدە، ناوی ڕاستەقینەی بەختیارە، لەناو شۆڕش و پێشمەرگەدا بە عەبە بچکۆل ناسراوە، کوڕێکی جوان و قارەمانێکی کەم وێنە بوو، سەرەتای پێشمەرگایەتی لەدەستەکەی هەڤاڵ مەلا بەختیاردا بووبووە پێشمەرگە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٩دا عەبدوڵا لە شەڕێکی دەستەویەخەدا لەناو ئاوایی مۆریاسی سەربە ناحییەی بەرزنجە لەگەڵ سوپای عێراق دا بەسەختی بریندار بوو، هەرچەندە ئەوسەردەمە بۆ چارەسەر نێردرایە تاران بەلام دواجار کەم ئەندام بوو.

عەبدوڵا بچکۆل بەو کەم ئەندامییەوە درێژەی بە پێشمەرگایەتی و خەبات دا، تاله ڕۆژی١٩٨٤/٩/١٦دا لە گەڕەکی خانووە قوڕەکانی سلێمانیدا مەفرەزەی ئەمن و جاشی شەعبی هاتنە سەر عەبدوڵا و دوو هاوڕێی بە ناوەکانی هیوا

یەک باڵ و سەباح سەیدسادقی، بەرەنگاری هێزەکەی دووژمن بوونەوە و لەشەڕێکی ئازایاندا عەبدوڵا بچکۆل ناوی نا تۆڵەی ملازم سەید کەریم، گیانی سوپارد، سەباح و هیوا یەکباڵیش دەرچوون. هیوا پێشترو لەشەڕێکدا ساڵی ۱۹۸۳ لەئاوایی پارەزانی ناوچەی شارباژێردا باڵێکی بەگوللەی شەست تیری کۆپتەرە جەنگیەکانی سوپای عێراق پەڕیبوو.

هەر لەوشەرەدا پێشمەرگەیەک بەناوی حاجی رەحمان شەهید بوو، پێشمەرگەی ئازاو ناسراوی ناوچەی پێنجوێنیش ئەکرەم ئیبراهیم محەمەد پێنجوێنی بریندار بوو، بریندار بوونێکی سەخت لووتی پەڕیبوو، بەهۆی ئەو بریندار بوونەوە دواترو لە ۱۹۹۸/۹/۸دا ئەکرەمیش شەهید بوو.

بەڵێ لەوێ لەتۆڵەی کوژراوەکانیاندا دێوانە مەجیدی شوانیان شەهید کرد. خەڵکی ئازاو چاونەترسی پێنجوێن و ناوچەکەش لەتۆڵەی دێوانە مەجیددا ڕۆژی ۱۹۸۰/۷/۱۹دا راپەڕین و خۆپیشاندانێکی گەورە و بێوێنەیان بەدژی دام و دەزگاو سوپاو جاشەکانی رژێم بەرپاکرد.

وا ئەمرۆ ۱۹۹۸/۷/۱۹ لە شارۆچکەی پێنجوێن و بەئامادە بوونی جەماوەرێکی زۆر بەشداری دەکەین لە فیستڤاڵی یادی هەژدەهەمین ساڵرۆژی ئەو یادەدا ، لیژنەی باڵای سەرپەرشتی یادەکە پێک هاتووە لە هەڤالان کاک عومەر غەریب کاک ئازاد سەوزەو کاک جووتیار مەجید.

چەندین ووتار خوێندرانەوە، دەبوو ووتاری یەکێتی دووەم ووتار بێت، کرا بەچوارەم ووتار، ووتارەکە نوسرابوو بڕیار بوو من بیخوێنمەوە، بەڵام کە چوومە سەر شانۆکە گلەیم کرد لە بێسەروبەری بەڕێوە بردنەکە و ووتارەکەم نەخوێندەوە، خۆم چەند جوملەیەکی رەخنە ئامێزم پێشکەش کردن. خەڵک و ڕێکخستن هەموو هاتنە دەوروبەرم و دەس خۆشیان لێکردم، دەرکەوت زیاتر داخی قسەکانی کاک بەکری حاجی سەفەریان لە دڵایە، کاک بەکر ئەو ڕۆژە زۆر خراپ قسەی کرد باسی پێنجوێن چییەتی و بەدژی ئاواییەکانی دەرەوەی پێنجوێن قسەی کرد، بە جۆرێک گرنگیدا بەپێنجوێن و خەباتی ئەوانی تری بێ ئەهمیەت کرد، من لەوبڕوادا نەبووم ئەوجۆرە قسانە لە پیاوێکی وا ببیستم. بۆیە منیش قسەکانی کاک بەکرم پێناخۆش بوو لەدڵا ، لەبەر شەخسیەتی کاک بەکر خۆی، چوونکە من کاک بەکر لەوە بە گەورەتر ئەزانی.

## هەڵبژاردنی ئۆرگانە حزبیەکان

پرۆسەی هەڵبژاردن لەوڵاتی ئێمەدا کوردستان، بەهۆی بارودۆخی کۆمەڵایەتیی عەشایری تایفەگەری و ناوچەگەریەتی و گەشەنەکردنی ئاسایی و هەندێک جاریش دەست تێوەردان و.......هتد، زۆر جار ئەو ئامانجە ناپێکێ کە هەڵبژاردنەکەی لە پێناودا ئەنجام ئەدرێت، ئەویش هەڵبژاردن و دیاری کردنی کەسی شیاوە بۆ شوێنی شیاو، ئەمە بە تایبەت لەناو حزب و ئۆرگانەکانیدا لەناو شانەیەکی حزبییەوە تا کۆنگرەو هەڵبژاردنی سکرتێرو رابەرایەتیش. ئەو ئەزموونەی من هەمە لەگەڵ ئەم پرۆسە، کەمتر بینیومەو رێکەوتووە دەنگ دەرەکان لەسەر بنەمای شیاوی و لێوەشاوەیی و دانایی و زانایی و بڕوانامەو رابردووی کەسە کاندید کراوەکە دەنگ بدەن .

ئەوەیە پیادە کردن و مومارەسەکردنی دیموکراسیش بەقۆناغەکانی گەشەکردنی ئاساییدا تێپەڕ نەبوو بێت، ئەنجامی پرۆسەکانی هەڵبژاردن تێیدا ناعەدالەتی و کەموکورتی و زۆر جاریش غەدری لێدەکەوێتەوە، زۆر جار جگە لەوەی لەم پرۆسەدا مافی مافدار ئەخوری، کۆمەڵانی خەڵکیش باجەکەی دەدەن. لەم بارەوە ئەمەوێت بڵێم سەرەتای ئەزموونی من لەهەڵبژاردنی ئەنجومەنی ئاواییەکانەوە دەست پێدەکات، لەسەردەمی خەباتی شاخ دا.

شتێکی نوێ و پرۆسەیەکی جوان و داهێنانی سەرکەوتوبوو، لەلایەن شۆڕشی نوێی کوردستانەوە، نەک هەر لەو ئاواییانەدا لەژێر دەستی پێشمەرگەدا بوون بەڵکو ئەم پرۆسەی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی ئاواییانە، پەلیشی هاویشتبوو بۆ ئەو ئاواییانەش کەبەشەودا پێشمەرگە دەچوونە ناویانەوە.

لەم پرۆسەدا کاندیدەکان خۆبەخش بوون واتە بێبەرامبەر خزمەتیان دەکرد، ئەوکەسە دەردەچوو ئەرکی سەرشانی قورس بوو، لەبەرگی یەکدا ئاماژەم کردووە بەئەرک و رۆڵی ئەنجومەنی ئاوایی، کەچارەسەر کردنی کێشە و گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی خودی ئاوایی و نێوان خێزانەکانە، کێشەکانی شەڕو بەکژدا چوونی یەکدی، لەسەر: منداڵ، رێگاوبان، هاتووچۆی

ناوکوچەو کۆڵان، لەوەڕگە و زەویوزار، مەرومالات و .....هتد، زۆرجاریش چارەسەرکردنی کێشەکانی ئاوایی لەگەڵ ئاواییەکانی دراوسێیدا. ئەمانەو جێبەجێکردن و گرتنە ئەستۆی ئەرک و کاروبارەکانی پێشمەرگە، هەرکات هێزێک یان مەفرەزەیەک ڕێگەی دەکەوتە ئاوایی، ئەنجومەن سەرەتا دەهاتە لای مزگەوت یان ئەو شوێنەی پێشمەرگەکانی لێکۆدەبوونەوە، ئەگەر ئەنجومەن ئامادە نەبووایە یان جێگری هەبوو یان کەسێکی ڕادەسپارد لەباتی خۆی ئیشوکارەکانی ئەنجامبدا. لەوانە ئیشی دابەش کردنی پێشمەرگە بەسەر مالاندا بۆنان خواردن، گرتنی خانوو بۆخەوتنی پێشمەرگە بەشەودا، ئەگەر ئاواییەکە مزگەوتی نەبووایە، یان لە مزگەوت جێگەیان نەبووایەتەوە. بردنی نامە و هەواڵ بۆ جێگەیەکی تر یان ئاواییەکیتر. دیاری کردنی ئۆتۆمبێل یان تراکتۆر یان وڵاخی بەرزە بۆ گواستنەوەی پێشمەرگە یان بریندار یان بار، لە ئاواییەکەوە بۆ ئاواییەکیتر یان بۆناوچەیەکی تر. کۆکردنەوەی پێتاک یان خواردن.......هتد.

جا ئەم کاندیدەی ئاوایی زۆرجار ڕکابەری نەبوو، هەمووکەس نەدەچووە ژێر ئەم بارە قورسە، لەم کاتەدا هەموو ئاوایی دەنگیان دەدایە. بەلام لە ئاواییەکدا تایفەگەری و منافەسەی عەشایری هەبووایە چەند کاندیدێک دەبوو، ئەوکات ئەو تایفە یان ئەوبنەماڵە کە زۆرینە بوون ئەوە کاندیدی ئەوان بەرندە دەبوو، بۆیە زۆرجار کەسێکی بێتوانا یان نەزان یان هەڵنەسوڕاو دەردەچوو لە بەرامبەر کەسێکی بەتواناو لێوەشاوەدا.

ئەم ساڵیش واتە ساڵی ١٩٩٨ لەگەڵ پرۆسەی هەڵبژاردنی ئۆرگانە حزبیەکاندا ڕووبەڕوو بووم، سەرەتا لە کۆمیتەکاندا بۆ هەڵبژاردنی سەرۆک پۆل( شانە) دواتر ئەنجومەنی کۆمیتە، ئەندامانی کۆمیتە، جێگرانی کۆمیتە، یان بۆ پڕکردنەوەی شاغیرەکانیان. دواتر هەڵبژاردن لەمەڵبەندا بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی مەڵبەند، یان هەڵبژاردنی نوێنەرانی ئۆرگانەکان بۆ کۆنگرە و کۆنفرانسەکان، ئۆرگانەکانی تری وەک خوێندکاران، ژنان ....هتد.

بەشێوە گشتیەکەی هەڵبژاردن کۆڵەکەی سەرەکی دیموکراسییە، ئەبێ لەگەڵ بین و کاربکەین بۆ نەهێشتنی لایەنە خراپەکانی و دواتر بۆنەهێشتنی ئاسەوارەکانی. لەهەڵبژاردنی نوێنەرانی ئۆرگانەکانی حزبی و نوێنەرانی ئەنجومەنی نیشتیمانی و کۆی پرۆسەکانی هەڵبژاردنی ئەم وولاتدا، عەشیرەت

بازی و ناوچەگەریتی، دارایی و سەروەت و سامان، دەستەو دەستەگەری، دەست تێ وەردانی دەسەڵات داران و لایەنگری کردنیان، لەهەڵبژاردنەکاندا دەیان کەسی بێتواناو هیچ لەباردا نەبووی کردووەتە بار بەسەر حزبەکان خۆیان و کۆمەڵانی خەڵکیشەوە، لەم وولاتدا دەم و چاو، رووخسار جوانی و ناشیرینی، کاریگەری هەیە لەسەر هەڵبژاردنی کاندید یان کەوتنی. بەداخەوە تائێستاش ئەوە بۆنزیکەی٢٥ بیست و پێنج ساڵ دەچێت، نەمانتوانیوە ئەو لایەنە خراپانەی کاریگەر، بۆ سەر پرۆسەی هەڵبژاردن بنبڕ بکەین. کورد دەڵێت (مەیمون جوان بوو ئاوڵەشی گرت) ئەوتا بەوحاڵەوە هەوڵی تەزویر کردنیش ئەدەین. بەڵێ سەرەرای لێکەوتە خراپەکانی، هەڵبژاردن باشترین شێوازە بۆ دیاری کردنی نوێنەرانی دام و دەزگاکانی هەرێمی کوردستان.

لێرەدا باسی هەڵبژاردنێکی ئەمرۆی چوار ئەندام مەڵبەندی مەڵبەندی رێکخستنی شارەزوور دەکەم، ماوەیەک بوو چوار ئەندام مەڵبەند بەهۆی گواستنەوە یان وەرگرتنی پلەو پۆستی ترەوە، شوێنیان چۆڵ بوو، ئەمانویست چوارکەس دیاری بکەین لەوکادرانەی هەبوون و شیاوبوون، بەڵام لەنێوان شەهید شەوکەتی حاجی موشیرو من و ئەنجومەنی مەڵبەندا چەندین جار دانیشتن و کۆبوونەوەی فەرمی و لابەلاش کران، بەڵام نەئەگەشتینە ئەنجام.

من لەسەر رۆشنایی ئەو هەڵبژاردنانەی چەند مانگی رابردووی ئەنجومەنی کۆمیتەکان و ئەو گفتوگۆو دانیشتنانەی هەڤاڵانی ئەنجومەنی مەڵبەند بەگشتی و جارجار دانیشتن و کۆبوونەوەش بەجیا لەگەڵ مندا، ئەمزانی و تێگەیشتم برادەرەکانم نایانەوێت لەسەر پێوەرەکانی لێوەشاوەی و مستەحەقی ئەو چوار کادرە هەڵبژاردنیان بۆ بکرێت، لەناو ئەوانەی خۆیان کاندید دەکەن.

بۆیە دواجار لەگەڵ بەرپرسی مەڵبەند دانیشتم و چەند پێشنیارێکم بۆ کرد، لەوانە: یەکەم: دیاری کردنی چوار کەس بەبێ هەڵبژاردن لەلایەن بەرپرسی مەڵبەند و جێگرەکەی و بەرپرسی بەشی رێکخستن، بە ئاگاداری مەکتەبی رێکخستن.

دووەم: بە هەڵبژاردن بەڵام دەنگدان لەنێوان ئەو کەسانەی خۆیان کاندید دەکەن لەگەڵ دەستەی کارگێری مەڵبەند. ئەم پێشنیارانە بۆ ئەوەبوو، کادرە چاو نەترس و چالاکەکان بێنە پێشەوە، ئەو سەردەمە چاو نەترسی و

ئازایەتیش زەروربوو، چوونکە سنووری مەڵبەندی شارەزوور سنووریکی ئاڵۆزو پڕمەترسی و یەکیتی لە شەڕەکانی ناوخۆدا چەندین جار شکابوو بارەگاکانی لەناو شاری هەڵەبجەدا گیرابوون.

دواجار بڕیاردرا بەرپرسی مەڵبەند خۆی بەشدار نەبێت لەدەنگ دانەکەدا، جێگر و دەستەی کارگێڕی بە هەڵبژاردن ئەو چوار پلە دیاری بکەن. ئەوە بوو لە ڕۆژی ١٩٩٨/٧/٢١دا لەکۆبوونەوەیەکی دەستەی کارگێڕدا، شەش کاندید هەبوو، بڕیارماندا نابێ ئەو شەش کەسە خۆیان دەنگیان هەبێ، ئێستاش من تێنەگەیشتم لەسەر چ بنەمایەک، نەمان هێشت کاندیدەکان، خۆیان دەنگیان هەبێ ئەوانیش ئەم هەڤاڵانەبوون: ١- ئەیوب ڕۆستەم، ٢- عەلی حاجی فەرەج، ٣- شاخەوان فەتحوڵا، ٤- سابیر چەوساوە، ٥- عەلی مستەفا، ٦- عەزیز روخزایی.

دەستەی کارگێڕی شەش کەس بوون، جێگریش یەک کەس، لە پڕۆسەیەکی نهێنیدا دەنگ درا ئەنجامەکەش بەم شێوەی بوو:مامۆستا ئەیوب ڕۆستەم/ ٥ پێنج دەنگ، عەلی حاجی فەرەج/ ٧ حەوت دەنگ، عەلی مستەفا /٢ دوو دەنگ، سابیر چەوساوە / ٢ دوو دەنگ، مامۆستا عەزیز روخزایی /٧ حەوت دەنگ، شاخەوان فەتحولا / ٥ پێنج دەنگ. عەلی مستەفاو سابیر چەوساوە دەرنەچوون.

# بەتەمەنەكان بە ئەزموونن

ساڵی ١٩٩١ و لە ڕاپەڕینی دووەم دا نیازی شەهید بووبوو، دوای تەواو بوونی ڕێوڕەسمی پرسەو سەرەخۆشیەكەی هاوڕێكانی نیازی چوونەماڵەوە بۆلای باوكی. باوكی ناوی عیزەت حەسەنە، خاڵۆ عیزەت پیاوێكی كورد پەروەرو پڕ ئەزموون بوو لە سیاسەتدا، لە ساڵانی پەنجاكانی سەدەی ڕابردووەوە خەریكی كوردایەتی و حزبایەتی بووە. كاك باقی حاجی حەسەن هەورامی دەڵێت پیاوی كاسب نابێ بووەستێ بەدیار بارودۆخی سیاسییەكەوە، بڵێت بابزانم چی ڕوو دەدات. لەسەرەتای ڕاپەڕینەوە سەرمایەدار و دەوڵەمەند كەم بوون، لە سلێمانیدا بەپەنجەكانی دەست دەژمێردران، یەكێكیان كاك باقی هەورامی بوو، خاوەنی ئۆتێل مەولەوی و پارەیەكی باش بووە. ئێستاش ماوە و تەندروستی باشە.

كاك باقی دەڵێت لە سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشەوە لە دوای ساڵی ١٩٦١، كاك عیزەت كاسبی دەكردو ٢٥٠٠ دوو هەزارو پێنج سەد دیناری هەبوو، منیش لەسەر سینییەك خەیارم ئەفرۆشت بەترش و خوێوە، چووم بۆلای كاك عیزەت پێموت پارەكەتم بدەرێ باكەسابەت بكەم بە شەراكەت. دەڵێت، پێیووتم جارێ بووەستە بزانین بارودۆخی سیاسی بەكوێ ئەگات. ووتی من نەوەستاوم بەدیار بارودۆخی سیاسییەكەوە، ئێستا من خاوەنی ئەو سەرمایەم، خاڵۆ عیزەت ئێستاش هەر دەڵێت بزانین بارودۆخی سیاسی چی بەسەردێت، باقی هەورامی دەڵێت پیاوی كاسب نابێ بوەستێ و چاوەڕێی باردودۆخی سیاسی بكات.

بەڵێ بە خاڵۆ عیزەتمان ووت ئەمانەوێت وێنەیەك بۆ شەهید نیازی دروست بكەین و لەدەروازەی شارۆچكەی تەوێڵەدا دایبنێین. لە وەڵامدا ووتی نەخێر ڕازی نیم، ووتمان بۆ؟ ووتی باهەر خەفەتی شەهید بوونەكەی لە دڵما بێت، خەم و خەفەتی وێنە دڕاندن و فڕێدانەكەشی نەبینم و نەخۆم، بەكورتی ڕازی نەبوو لەسەر دروست كردن و دانانی وێنەكە.

ئەوکات ئێمە کەم تەجروبەو کەم پێشبینی بووین. ئەمانووت کێ ئەتوانێ وێنەی پێشمەرگەی قارەمان و تێکۆشەری وابدڕێ و فڕێبدات؟ نەمان ئەزانی خالۆ عیزەت پیاوی دنیا دیدەوە پێشبینی کەرە. دوای چەند ڕۆژێک بەتەنیا ڕۆشتمەوە بۆلای خالۆ عیزەت، قازی کوڕی لەوێبوو ئەتوانێ ئەو شایەتیەم بۆ بدات، لەوەلامی دووبارە ئەو پرسیارەدا، خالۆ عیزەت بۆچی رازی نیت پەیکەر یان وێنەی شەهید نیازی دروست بکەین؟ کێ وەبۆ وێنەی ئەدڕێت یان فڕێ دەدات؟.

خالۆ عیزەت بەشیکی زۆری ئەو روداو بەسەر هاتانەی دواتر رویان دا، شەڕی ناوخۆی نیوان یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامی و یەکێتی و پارتی کەچۆن شوێنەکان لەیەک ئەگرن و مالی یەکتر تالان دەکەن و ئەندام و لایەنگرانی یەکتر عەزیەت دەکەن، لەگەل ئەوەشدا ئەو پەیکەرو وێنانەی شەهیدەکانی یەکتر ئەشکێنن و فڕێی دەدەن، بۆ باس کردم.

بەراستی و ئەبێ دانی پێدابنێم منێکی بێ ئەزموون ئەوکات لەدلا ئەمووت خالۆ عیزەت تێک چووە، ئاخۆر چۆن پیاوێکی نەخوێنەوار دەم لەو پێشبینیانە دەدات. تادواترو روداوەکانیش رویان نەدا، من لەڕووم نەدەهات ئەو پێشبینیانەی خالۆ عیزەت بۆکەس بگێڕمەوە.

ئەوە بوو بینیمان دەیان وێنەو هەیکەلی شەهیدەکانی کوردستان لەپارک و مەیدان و بلوارو شوێنە گشتیەکاندا شکێندران و دڕێندران و فڕێدران، سوکایەتیان پێکراو کەسوکارەکەشیان ئازاری زیاتر لە ئازاری شەهید بوونەکەیان پێگەشتەوە، پەیکەری شەهید گریانەیی و شەهیدی سەرکردە ئازاد هەورامی لەوانە بوون، لەشارۆچکەی تەوێلە لە شەڕی ناوخۆدا، چۆن داعشەکان لەموسل بە پیک لەمۆزەخانەکان دا هەیکەلەکانیان وردوخاش دەکرد، ئەوانیش وردوخاش کران و فڕێدران.

بەلی لە بابەتێکی پێشتردا راو پێشنیاری خۆم کردووە لەسەر دروستکردن و دانانی وێنەی شەهیدەکانی کوردستان، بەم شێوەی ئێستاو هەرکەس بۆخۆی لەسەر جادە و بانەکان دا وێنە بۆ شەهیدەکەی دروست دەکات شتێکی گونجاو نییە، چوونکە ژمارەی شەهیدەکانی کوردستان خەریکە لەدەیان هەزار تێپەڕ دەکەن و بەردەوامیش کاروانەکە بێکۆتایی و

نەبڕاوەیە، ئەمە جگە لەوەی ئەو وێنانە بەم شێوەی ئێستا دروست ئەکرێن و دائەنرێن پاش ماوەیەک خراپ ئەبن و نامێنن.

پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ ١٩٩٨/٧/٢٢ لە ڕێوەڕەسم و گردبوونەوەیەکی جەماوەریی فراواندا لە شارۆچکەی زەڕایەن، کەلەلایەن حەمە شارەزووری بەرپرسی کۆمیتە و هەڤالانی ڕێکخستنی قەزای شارەزوورو زەڕایەنەوە ڕێکخرابوو بەئامادەبوونی هەڤالانی مەڵبەند پەردەمان لابرد لەسەر وێنەی شەهید مامۆستا ستار برای شەهید عەلی عومەر، مامۆستا ستار لەو شەهیدانەیە کەلە ٣١ی ئابی ١٩٩٦دا پارتی گوللەبارانی کردون، لە بابەتێکی پێشتردا لەبارەی شەهید کردنەکەیانەوە روونکردنەوەی زیاتر دراوە. ئەمڕۆ لەم ڕێوڕەسمەدا ووتارێکم هەبوو لەجیاتی مەڵبەند. سەرەتا قسەکردن بوو لەسەر دروست بوونی یەکێتی و دروستبوونەوەی شۆڕش، ئینجا سەرەتاو هاتنی ئێلی جاف بۆ ناوچەکە، شەڕەکان و لەشکرکێشی دەورانی عەشائیری جاف و دوای ئەوە دەورو کاریگەری خەباتی بەرچاوی تیرەکانی هۆزی جاف لەناو شۆڕشداو بەتایبەت لەگەڵ یەکێتی و هێزی پێشمەرگەدا، چوونکە مامۆستا ستار و هاوڕێکانی کە گوللەباران کران سەربەهۆزی گەورەی جاف بوون. هەروەها باسی بەدیلی شەهید کردنی شەش کوڕی قارەمانی سەر بەتیرەکانی جاف، ئەمویست بەم شێوە هانیان بدەم بەدژی پارتی.

دواقسەم لەسەر ئاشتی و بۆچوونی یەکێتی بوو لەوبارەوە. یەکێتی گەیشتبووە ئەو بڕوایە لەهەموو جەولەکانی شەڕی ناوخۆدا زەرەرمەندی یەکەمە، بۆیە بەراستی ئێمە لەگەڵ شەڕدا نەبووین و ناشبین. دوای کۆبوونەوەکە لەگەڵ حەمە شارەزووری، سەردانی چەندماڵێکی هەژارمان کرد لەناو قەزای شارەزووردا نەخۆشیان هەبوو، لەوانە ماڵی عارف کەریم ناسراو بە عارفە کەملەو حەمەئەمینی حەمە خاڵۆی تەوێڵەیی.

کاک حەمەئەمین خەڵکی تەوێڵەیە، لەسەرەتای شۆڕشی نوێ و دروست بوونەوەی مەفرەزەکانی پارتیزانیدا، خۆی و دادە مەلەی خێزانی بەهۆی ئەوەوە ماڵیان بەهاوینان لەناو خانە باخ و لەشوێنێکی چەپەکدا بوون، خزمەتێکی بەرچاویان کردوە، کاک حەمەئەمینی حەمە خاڵۆ ئەوسەردەمە بەتایبەت ساڵی ١٩٧٧بۆ١٩٨٠ جێگەی متمانەی ڕێکخستنی شار بوو بۆ لای ئێمە، مەفرەزە پارتیزانەکان.

تەویڵەییەکان، دوای شەڕی عێراق و ئێران و ئاوارەبوونیان کەوتنە سلێمانی و هەڵەبجە، ئەوانی ناو شاری هەڵەبجە و دەورووبەری، دوای کیمیا بارانی هەڵەبجە، کەوتنە هەڵەبجەی تازە، بەداخەوە تامابوون بەڕەزالەت گوزەرانیان کرد، نەمان توانی پاداشیان بدەینەوە. ڕەنگە خوێنەر بڵێت جاجەناب یارمەتی تۆیان داوە و تۆ ئاگاداری خزمەتکردنیان بوویت، دواتریش مەسئول بوویت، بۆ پاداشتان نەدانەوە، ئەوە راستە، بەڵام هەر خاڵۆ حەمە ئەمین و دادە مەلە نەبوون بێوەفایمان بەرامبەریان کردبێت، لەناوچەکەی ئێمە بەسەدان خێزانی وامان هەن، لەسەرئاستی کوردستان بە هەزاران جووتیار و گوندنشینی خزمەتکار هەن لە ڕیگای شۆڕش و پێشمەرگەدا سەریشیان و ماڵیشیان داناوە، تائێستاش کەس لەدەرگای جێماوانی نەداون، لەبەرامبەریشدا هەزاران خائن و خۆفرۆش بەرهەمی ڕەنجەکەی ئەوان دەخۆن.

ئەوە خەتاو تاوان لە من و ئەوی تر نییە، ئەوە شۆڕش و حیزبەکان لەڕێبازی ڕاستەقینەی خۆیان لایان داوە. تاوانبارانی ئەم بابەتەو ئەوبارو دۆخە نالەبارو نابەجێیە و تۆرانی خەڵک لەدەستەڵات و حیزبەکان، حیزبەکەی من و پارتی دیموکراتی کوردستانن.

لەدوای ئەنجامدانی ئیشوکاری مەڵبەند، رۆژی هەینی ٧/٢٤ گەڕامەوە بۆ سلێمانی و چووم بۆ ماڵی کاکە حەمەی حاجی سەعیدی سەرگەتی، کاکە حەمە پیاوێکی کاسبی ناسراوی ناوچەی هەورامانە و دۆستمان بوو، لەم رۆژانەدا یەکێک لەکوڕەکانی بەڕوداوی ئۆتۆمۆبێل کچێکی کوشتوە، پێش نیوەڕۆ لەگەڵ چەند پیاوێکی ناسراوی هەورامیدا سەردانی ماڵی باوکی کچە کوژراوەکەمان کردو دوای نیوەڕۆش منداڵەکانی کاکە حەمەمان برد بۆ مزگەوت بۆ بەشداری کردن لە ڕێوڕەسمی پرسەی کچەکەدا.

# پەکەکە و بردنی منداڵان

لەدوای راپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ ئەو شار و شارۆچکانەی کوردستانی باشوور کەوتنە ژێر دەستی پێشمەرگە، پەکەکە لە زۆربەی ئەو شارانەدا بەشێوەی نهێنی و نیمچە ئاشکرا، بارەگایان کردەوەو دەستیان کرد بە رێکخستن، بەتایبەت لەناو کوڕو کچانی مێرمنداڵدا، هەنگاو بەهەنگاو ئامادەیان دەکردن، تائەوکاتەی رازی دەبوون بیان نێرنە دەرەوە بۆبنکە سەرەکیەکانی پەکەکە، ئەوکات بە نهێنی و بەبێ ئاگاداری کەسوکاریان ئەیانبردنە جێگەی مەبەست، لەوێ ئەو منداڵانەیان لە کەمپی مەشق و راهێناندا پەروەردە دەکرد، زۆربەی ئەوانەی پەروەردەیان تەواو دەکرد، جەنگاوەر و گەریلای چالاک و ئازایان لێ دروست دەبوو، ئێستا لەومنداڵانە سەدان گەریلای باشووری لەناو ریزەکانی پەکەکەدا هەن و پێگەیشتون و بەرپرسایەتیشیان هەیە، کەم رێکەوتووە، لێیان گەڕابێتەوەو وازیان هێنابێت، ئەوانە یان شەهید بوون یان لەسەر رێگای خەبات بەردەوامن.

لەم هەفتەی رابردوودا دوو کوڕی تەمەن ١٥ساڵان بەناوەکانی سیامەند هۆمەر عەزیزو مەسعودهەیاس عەزیز دیار نەمان هەردووکیان کوڕە خاڵی منن، خوێندکار بوون، چەند ڕۆژێک گەراین بەدوایاندا نەدۆزرانەوە، ئاساییش و پۆلیسمان ئاگادار کردبووەوە، دایک و باوکی منداڵەکان زۆریان بۆمن هێنابوو، ڕۆژی٧/٢٥ زانیاریم وەرگرت پەکەکە بارەگایەکی لەناو شاری سلێمانیدا هەبوو وتیان لەوێن و بەتەمان بیان نێرن بۆ قەندیل، دایکەکانیان سەردانی بارەگاکەیان کردبوو، پێیان وتبوون لای ئێمە نین دوای ماوەیەک دەرکەوت لای ئەوان بوون و رەوانەی لای قەندیلیان کردبوون. هەوڵی زۆرمان دا بیان نێرنەوە بۆئەوەی خوێندنەکەیان نەفەوتێت، کەس وەلامی نەدراینەوە،

رۆستەم هەیاس پێشمەرگەی دەستەکەی منەو برای یەکێک لە منداڵە فرێندراوەکانە، ئاگاداری کردم ووتی ئەتوانم منیش دوو کەسی پەکەکە بفرێنم بەڵکو بە ئاڵوگۆڕ منداڵەکانمان بدەنەوە، ووتم باشە ئۆتۆمبێل و پێشمەرگەم

دایەو ڕویشت، شەو ئاگاداریان کردم ووتیان دووکەسمان لەبارەگاکەی سلێمانی گرتوەو هێناومانن بۆ هەڵەبجە. ووتم باشە ئاگاتان لێیان بێت عەزیەتیان نەکەن و هیچیان پێ نەڵێن و حورمەتیان بگرن، تەنها ئەوەندەیان پێبڵێنن کە ئێمە کەسوکاری ئەومندالانەین ناوەکانیان بدەنێ، بالەگەڵ بەرپرسەکانیان قسە بکەن بڵێن ئێمەیان لەسەر ئەوان گرتووە تائەوان نەنێرنەوە ئێمەش ئەمان بەرنادەن.

ڕۆژی١٩٩٨/٨/١ چوومەوە بۆ هەڵەبجە، لە مەڵبەند خەریکی ئیشوکاری ئاسایی خۆمان بووم، ناردم ڕۆستەم هات، ووتم ئەو برادەرانەی پەکەکەت لەکوێ داناوە؟ ووتی لەماڵێکی خزمانن ووتم بڕۆ بیان هێنە بۆ ئێرە، لەبەرامبەر بارەگای مەڵبەندا شوێنی مانەوەو پشوودانی خۆمان هەبوو، چوون هێنانیانن بۆ ئەوێ، نیوەڕۆ چووم بۆلایان پێکەوە نانمان خوارد، کوردی ڕۆژئاوا بوون، قسەم لەگەڵ کردن ووتم ئێوە لەسەر ئەو دوو منداڵە گیراون، لای ئێمە میوانن بەڵکو داوابکەن ئەوان بنێرنەوە تائێمەش ئێوە بەربدەین. دوای چەند خولەک لە گفتوگۆ بۆم دەرکەوت گاڵتەیان دێت بە قسەکانمان. زۆر بێئاگان لەدنیا، تەنها کوردو کوردستان ئەزانن، ئەیانووت ئێمە هەر شەهید ئەبین ئێوە بشمان کوژن هەڤاڵ مەسعود و هەڤاڵ سیامەند جێگەکەمان پڕدەکەنەوە، ئامادە نەبوون تەلەفۆنێک بکەن بۆ بەرپرسەکەیان بڵێن ئێمە گیراوین ئەیان ووت ئێمە ترسنۆک بووین ئەگینا ئێوە نەتان ئەگرتین. بۆیە پاش چەند ڕۆژێک ناچار بەرمان دان و ڕۆیشتن.

لەم هەفتەدا حەوت کادری مەڵبەند لەوانەی خۆیان بەشیاوی ئەوە ئەزانن ببنە ئەندام مەڵبەند نامەیەکیان داوە بەمەکتەب ڕێکخستن و تیایدا باسی ئەوەیان کردووە لەم ڕۆژانەی ڕابردوودا چوار کەس کراون بەئەندام مەڵبەند حیساب بۆ ئێمە نەکراوە، هەڵبژاردن لەنێوان شەش کەسدا کراوە. بۆدیاری کردنی چوار ئەندام مەڵبەند. لە ڕۆژی ٨/٢ /١٩٩٨ دا لەبارەگای مەڵبەندا لەگەڵیان کۆبوومەوەو ڕازیم کردن لەکاتێکی تردا هەوڵ ئەدەین پلەی ئەوانیش بەرز بکرێتەوە، ئێستا میلاکمان تەواو شاغرمان نییە. خۆ ئەگەر مەکتەب ڕێکخستن بڕیار دەدات لەمیکلاک زیاتر پلەبەرز بکاتەوە ئەوە مەڵبەند لاریمان نییە، بەڵام مەکتەب ئەوەی نەدەکرد.

دوانیـــوەڕۆی ئەمـــڕۆ چـــوومە هەڵەبـــجەی تـــازەو لەوێ لەگەڵ شـــارەزووری و مامۆســـتا ئەیـــوب ڕۆســـتەم و ئەنـــدامانی کـــۆمیتەدا لە ڕێوەڕەسمێکدا پێشوازیمان کرد لەکۆمەڵێک خەڵکی بناری هەورامان، چەندین خێزان و پیاوی بەتەمەن و گەنج و لاو بوون، بڕیاریان دابوو لەناو ڕیزەکانی یەکێتی نیشتیمانیدا خەبات بکەن.

ئەمڕۆ ٨/٤ لە هەڵەبجە پێشوازیم کردلە٣٠سی جووتیاری سەر جۆگەی دەڵێن بەنوێنەرایەتی هەموو جووتیارانی بەردەم ئەم جۆگە هـاتوون، داوای چارەسەر کردنی کێشەی ئاوی زەویە کشتوکاڵیەکانیان دەکەن، منیش دوای پێشـوازی و میوانـداری و ڕێزگرتنیـان هەوڵمـدا رازیـان کەم ئەوە کێشـەی ئیدارەی کشتوکاڵەو دەبێت حکومەت چارەسەری بکات، رازی نەبوون.

لەراستیدا ئەم کێشە دەیان ساڵە هەیەو چەندین جار چارەسەر کراوە، بەڵام ساڵانەو بەپێی تەڕە ساڵی و وشـکە سـاڵی و کەموزیـاد بـوونی ئـاو و زۆربوونی خەڵک و ئاوەدانی نـاوچەکەو ڕاکێشـانی پرۆژەکـانی ئـاو لەسـەر سەرچاوەی زەڵم بۆ شـاری هەڵەبـجە و خورمـاڵ و ئاواییەکـانی دەوروبەر. چارەسـەر کردنی کێشـەکە جێگیر نابێت.

ساڵانی زوو کە ئاو زۆربووەو ئاوەدانی و خەڵـک کـەم بـووە، ئـاوی سـەرچاوەی زەڵم بۆ باخەکانی ئاواییەکانی زەڵم و ئەحمەد ئاوا بووە، زیادەی ئەوان هاتووە بەجۆگەی دەلێندا، سەرچاوەی جۆگەی دەلێن لەئاواییی ئەحمەد ئـاواوە سـەرچاوە ئەگـرێ و زەوی سـەدان جووتیـاری ئاواییەکـانی ئـاوایی ڕۆستەم بەگ، دێکۆن، گۆمەلار، خێڵی حەمە، تەپەکوڕە و دەلێنی ئـاودێری کردووە، تـا گەیشتوەتە ئـاوایی بەکـراوا. بەڵام نـاوی جۆگەکە، لەنـاوی دوا ئاوایی سەرجۆگەکەوە کە (دەلێن)ە وەرگیراوەو ناونراوە.

بەڵێ مـن بەحـوکمی پێشـمەرگایەتی لە سنوورەکەی ئەوانـدا هەمـوو خەڵک و جووتیارانی ئەو ئاواییانەی سـەر جـۆگەی دەلـێن ئەناسـم و لەگەڵ زۆریـــان دۆســـت و تێکەڵـــین، بـــۆیە نازیـــان هەیە لەســـەرمان، لەهەمـــوو کێشەکانیاندا لایەنی ئەوانم گرتووە  چوونکە ئەزانم مافی خۆیانە، ئەوە بوو قسەم لەگەڵ کاک حاکم هوشیار مەلامستەفا بەڕێوبەری ناحیەی سـەیدساق کـرد و نـاردنم بـۆلای و ئەمجـارەش کێشـەکە بەقـازانجی جووتیارەکـان چارەسـەر کرا.

هەر ئەمڕۆ لەبیارە هاووڵاتیەکی لاو بەناوی (بەهزادی بەهمەن بەگ) لەلایەن هێزی دووی سۆرانی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە کوژرا بوو، شێوەی کوشتنەکەشی بەئەشکەنجەدان و پێداکێشانی بلۆکی چیمەنتۆ بوو. لەسەر کێشەیەکی ئاسایی و بچوکی کۆمەڵایەتیی، بەهزاد لەلایەن پوریێکیەوە لەسەر نیزاعی باخ و موڵک شکات کراوە لای ئەو کەسانەی هێزی دووی سۆرانی بزووتنەوەوەی ئیسلامی کە ئیدارەی بیارەیان بەدەستەوەیە.

لەدوای رێککەوتنی یەکێتی و بزووتنەوە، لەناوچەی هەوراماندا ئەم هێزە تا ئێستاش رێگە نادات ئیدارەکانی حکومەتی هەرێم بگەڕێنەوە ناوچەکە و ئیدارەی خەڵک لەلایەن پۆلیس و ئاسایش و ناحیەوە بەڕێوە ببرێت. خۆیان لەباتی ئاسایش و پۆلیس حوکمڕانی دەکەن، حوکمڕانیش بەو شێوە لەسەر داوایەکی کۆمەڵایەتیی بەکوتەک و بلۆک شکات کراو لەناو بازاردا مێشک ئەپژێنن و کەسوکارەکەشی کوتەک کاری دەکەن، بەهمەن بەگ دۆستی ئێمە بوو، هەرچەندە یەکێتی نەتەوەیی خۆی کردە خاوەنی بەهزاد، بەڵام فەرماندەیی شارەزوور ئاگاداری مەڵبەندیان کردو وتیان بەهزاد پەیوەندی بەئێمەوە هەبووە و ئیشی بۆکردووین، هەڤاڵ هوشمەن غەفور عیزەتیش کادری رێکخستنی یەکێتییە لەبیارە، ئاگاداری منی کردو وتی بەهزاد لە رێکخستن دا کاری کردووەو لەم ماوەشدا ئابوونەی سێ مانگیم بەسەریەکەوە داوەتە رێکخستنی هەورامان.

ئێمە نەک لەبەرئەوەی بەهزاد ئەندامان بووە ئەبێ لەسەری بێینەدەنگ و تۆڵەی بکەینەوە، هەر هاووڵاتیەک کەزوڵمی لێئەکرێت و ئازار ئەدرێت، لەبەر ئەوەی ئێمە (یەکێتی) ئیدارەمان بەدەستەوەیە ئەرکی خۆمانە ئەبێ بەرگری لەو کەسانە بکەین. بەڵام لەبەر ئەوە ئیدارەی هەورامان نەگەڕاوەتەوە ناوچەکە و ئێمەش (یەکێتی) لەگەڵ بزووتنەوە رێکەوتنمان هەیە، ئەبێ لە رووی سیاسییەوە بەرگری لەخەڵک و ئەندام و دۆستەکانی خۆمان بکەین.

بۆیە شەوی ٥ لەسەر٦ی ١٩٩٨/٨لەگەڵ مەڵبەندی سلێمانی بزووتنەوەی ئیسلامی لەو بارەوە قسەم کرد، پێم وتن ئێمە لەگەڵ ئێوە رێکەوتنمان هەیە، لەم ماوەدا ئەوە دووەم جارە لەناوچەکەدا خەڵک ئەکوژن، یەکەم جار لەخورماڵ بەلێدانی زیلیی سەربازی هەڤاڵێکتان شەهید کردین،

خەڵکیش و خۆشمان گومانمان هەبوو بە ئەنقەست بووبێ، لەبەر ناسکی بارودۆخەکە لەسەری نەرۆیشتین و بەدواداچوونمان نەکرد، وائێستاش لەبیارە بەئەشکەنجە و بەشێوەیەکی نامرۆڤانە هەڤاڵێکی ترتان شەهید کردین، بۆیە من بەفەرمی و بەناوی یەکێتیەوە، ئاگادارتان دەکەم، ئەبێ لەبەرامبەر ئەو تاوانەدا ئیجرائات بکەن و وەڵامتان هەبێ بۆ یەکێتی لەوبارەوە.

ئەوانیش بەشێوەیەکی هێمنانەو دۆستانە وەڵامیان دامەوەو ووتیان هەرچەندە ئەوهێزە کێشەیان هەیەو بزووتنەوە لە هەوڵی چارەسەر کردنی دایە، ئەم هەنگاوەشیان واتە کوشتنی بەهزاد جێگەی قبووڵکردن نییە، مامۆستا مەلاعەلیش زۆرتوڕەیە لێیان. ڕۆژی پێشتر بەهەڤاڵ شاخەوانم وتبوو ئاگاداری کۆمیتەی ڕێکخستنی هەڵەبجە بکات لافیتەیی سەرخۆشی بۆ بنووسن، کاتێک یەکێتی نەتەوەیی خۆی کردە خاوەنی بەهزاد، لەم لاشەوە فەرماندەی و ڕێکخستن منیان دڵنیا دەکردەوە کە کاری حزبی و هەواڵگری بۆ ئێمە کردووە. خۆم پەیوەندیم بەمامۆستاکەریمی شێخ عەلیەوە کرد تا پێی بڵێم، لەسەر لافیتەکە چی بنووسن، مەبەستم ئەوە بوو بەناوی کۆمیتەوە پرسەو سەرەخۆشی لەکەسوکارو بنەماڵەی دۆستمان بەهزاد بەهمەن بکەن و نەنوسن ئەندام بووە. ئەوە بوو مامۆستاکەریم مەجالی نەدا تا بزانێت من چی ئەڵێم، پرسی کاکە حەمە لافیتەی چی ئەمە تەرحی کێیە؟ بۆ کەس هەیە لافیتەی یەکێتی بەرێت لەبیارە هەڵیواسێت؟ ووتم ئەوە تەرحی منە، ئەی بۆنییە ڕێکخستنی هەورامان ئەیبەن. مامۆستا هەروا بە توڕەیی لەسەری ڕۆیشت و ووتی: لافیتەی ناوێت ئەگەر ڕاست دەکەن بابەیانی بچین بۆ بەشداری پرسەکەی ئەگەر ئەشتەوێ شەڕ هەڵگیرسێنی ئەوە ئێستا ئەڵێم لافیتەی بۆ بنووسن. ووتم بەیانی خۆم ئەچم بۆ بەشداری پرسەکەو لافیتەشی بۆ ئەنووسم. دواجار نەلافیتەمان نووسی و نەتوانیمان بچین بۆبیارە بۆ پرسەکە، دواتر من خۆم سەردانی ماڵی بەهمەن بەگم کرد لە سلێمانی.

لەم ماوەدا سەرئێشە زۆری بۆ هێنابووم، من لەساڵی ۱۹۸۰وە نەخۆشیەکم لەگەڵە ساڵانە چەندین جار ئازارم دەدات، ئەویش سەر ئێشەی توندە، دەردی سەر، لە شاخ ئەوکات دەستم نەئەگەیشتە دکتۆرو نەخۆشخانە، بۆچارەسەر ئەگەر دەست کەوتایە زۆرجار دەوای ئارام کەرەوەم بەکار

ئەهێنا، ئەگەریش نەبووایە ئەوا ئازارەکەم بەردەوام دەبوو تائەو کاتەی بەشێوەی سروشتی خۆی نەئەما.

ساڵی ١٩٨٢دکتۆر هەژار کوڕی شێخ عوسمانی شێخ مارفی نەرگزەجاڕی هاتبووە دەرەوە، دکتۆری شۆڕش بوو، ڕۆژێک سەردانم کرد لە ئاواییی حاجی مەمەنی شارباژێری سەخت، باسی نەخۆشی و ئازارەکەم بۆکرد، دوای ئەوە هەندێک پرسیاری لەبارەی نەخۆشییەکەوە لێکردم، وەڵامم دایەوە، پێی ووتم تۆ نەخۆشیەکەت جیوبە (سینوزیت) و پێویستت بە عەمەلیات هەیە، دیارە ئەو عەمەلیاتە لەشار ئەکرێ تۆش ئێستا ناتوانیت ئەو عەمەلیاتە بکەیت، ئەوەبوو لەوبارەوە هەندێک ڕێنمایی کردم و پێی ووتم هەرکات ئازارت هەبوو دەرمانی دژی چڵک (ئیلتهاب) بەکار بهێنە، هەندێک کەپسولی (دژی چڵک)ی دامێ و لێم وەرگرت.

ساڵی١٩٨٤لەکاتی وتووێژی یەکێتی و میریدا چوومە سلێمانی و سەردانی دکتور باقرم کرد، ئەویش هەرئەوەی پێ ووتم کاک د. هەژار پێی وتبووم، ئەو ڕۆژە بەشێوەی کاتی جیوبی بۆشۆردم. ماوەیەک باش بووم و دواتر وەک جارانم لێهاتەوە. بەوشێوەیە ئازارم جارجار بەردەوام دەبوو تاساڵی ١٩٩٨.

ئەمڕۆ١٩٩٨/٨/٨، ١٠ دەهەمین ساڵیادی ڕێککەوتنی عێراق و ئێرانە پاش ٨ هەشت ساڵ شەڕێ ماڵ وێرانکەری نێوان ئەو دوو وڵاتیە. لە هەڵەبجەدا بووم، لاپەڕەیەکی چاپکراویان بۆ هێنام، بەناونیشانی( روون کردنەوەیەک سەبارەت بە ڕوداوەکانی ئەم دواییە. کۆمەڵی ئیسلامی بەناوی سەنتەری تەبلیغاتەوە لە٩ ربیع الثانی١٤١٩ دەری کردوە. لەوێدا دەڵێت:

(هەر لەگەڵ بەردەوام بوونی ڕەووتی کاروانی جیهاد و هەڵکردنی مەشخەڵی یەکتا پەررستی و بەرزڕاگرتنی وشەی الله اکبر، موسڵمانانی کوردی بە جەرگ و نەوەکانی باوە گەوریان سەلاحەدین پێشەنگ و نموونەی ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکە پیرۆزە بوون، بەلام لەگەڵ ڕۆشتنی کات و هۆکارەکانی دەرەکی بەگشتی و ناوەکی بەتایبەتی ئەو ڕەوتە پاک و بێگەردە لەسکەی خۆی دەرچوو، کاروانەکە تێکەڵی پۆخڵەواتی دژ بەیەکتا پەرستی بوو .......تاد) ، دیارە مەبەستیان بزووتنەوەیە.

دواتر هەندێک هەڕەشەو لەکۆتاییشیدا داوا لەهەموو کۆمەڵ و گرووپە ئیسلامیەکان دەکات بە تایبەت بزوتنەوی ئیسلامی ڕەچاوی سێ خاڵ بکەن. لەوانە: ١-دەست هەڵگرتن لەڕاونان و بۆسە دانان بۆ مجاهدان و دۆستانی کۆمەڵ، دەڵێت بەپێی ئایەت ناچار کراین بۆ وەڵام باجی بەرامبەر زۆر گەورەتر دەبێت. ٢- وازهێنان لەدەرکردنی ماڵ و منالی کۆمەڵەکە. ٣- دەڵێت ئەگەر نەبینە مایەی خێر بۆ حەق ویستان و خوا ویستان، نابینە گەرەیەکیش( ڕەنگە گرێ بێت) لەبەردەم خەباتی ئیسلامخوازانی کوردی موسڵمان).

ماڵی تەحسین خان دۆست و ناسراوم بوون، ماڵیان لە سلێمانی دا بوو، ئەمڕۆ ١٩٩٨/١٠/١٠ خاتوو شەهێنی کچی مزەفەر خانی ڕەزاوی خێزانی کاک تەحسین ئاگاداری کردم بچم بۆماڵیان، پێشتر بەڵێنی دابوومێ بەرێگای کوردەواری چارەسەری ئەو ئازارەی سەرئێشەم بۆ بکات. سەردانەکەم کرد و دوای نانی نیوەڕۆ پێی ووتم ئێستا چارەسەرەکەت بۆ دەکەم ئەویش بەم شێوە:

حەوت بەردی خڕی ناو چۆمی ئاوی هێنابوو، هەریەکەو بەقەبارەی هێلکەیەک یان بچوکتر، بەردەکان بەڵخیان پێوە بوو، لەسەر سینییەک لەسەر ئاگری تەباخ گەرمی کردبوون بەشێوەیەک کەسور بووبوونەوە. برێک گوڵە حاجیانەی وشک کراویشی لەناو مەنجەڵێکی فافۆندا دەکوڵاند.

پێی ووتم ئێستا بەدانیشتنەوە دوو بەتانی ئەدەم بەسەرتا، ئەو مەنجەڵە گوڵە حاجیەکانی تێدایە و کوڵ ئەدا لەبەردەمتا دائەنێم، دەبێت هەڵمەکەی بچێت بەدەم و لوتتاداو هەڵیمژی بەشێوەیەک سەرت نزیک ئەکەیتەوە کەنەسوتێی، تائەوکاتەی هەست ئەکەیت هەڵمەکە نامێنێ و کەم دەبێتەوە، ئینجا ئەوکات پێم ئەڵێیت، منیش بەمەقاش یەک لەوبەردە سورەوکراوانە ئەخەمە ناو ئاوی گوڵە کوڵاوەکان دوبارە هەڵمەکە زیاد دەکاتەوە ئەبێ خۆتڕاگری تا حەوت بەردەکە یەک یەک ئاوەکە دەکەنەوە بەهەڵم و دوای سارد ئەبنەوە، ئەوکات بەتانییەکان لادەبەیت.

بەو شێوە چارەسەرەکەی بۆ کردم دوای ئەوە هەستم دەکرد کەسەرم سوک بووە و بەئاسانی نەفەس هەڵدەمژم، ئێوارەی هەمان ڕۆژ سەردانی دکتۆرە لەمیعە تەوفیقم کرد، باسی کوڵاندنی گوڵە حاجیانە و

بەردەکانم بۆ کرد و ووتم هەست دەکەم باش بووبم دەستی کرد بە پێکەنین، پرسی ئێستا ئازارت هەیە؟ ووتم نا بەڵام هەفتەی پێشو زۆر ئازارەکەم توند بوو، دوای پشکنین ووتی ئێستا بۆت ئەشۆم و ٨/١٥ عەمەلیاتت بۆ دەکەم خۆت ئامادەکە.

ئەمڕۆ ٨/١١ پاش نیوەڕۆ لەشاری هەڵەبجە لەبارەگای قەرارگای رەمەزان لەسەر ئەوکێشانەی دروست بوون لەنێوان ئێمەو بزووتنەوەدا کۆبووینەوە، نوێنەرانی ئێران بەنی ئەحمەدو کەسێکی تر بەناوی ئەمیری لەکۆبونەوەکەدا ئامادە بوون، قسەمان کرد لەسەر پێشێلکاریی بزووتنەوەو پابەند نەبوونیان بەرێکەوتنی نێوانمان و بەو بەڵێنانەی لەکۆبوونەوەکانی سێ قۆڵیدا ئەیدەن، هەروەها لەسەر کوشتنی بەهزاد بەهمەن بەگ لەبیارەدا لەلایەن هێزی دووی سۆرانی بزووتنەوەوە، بڕیار درا ئەوان لەگەڵ بزووتنەوە دانیشن و پێشیان بڵێن یەکێتی لەوە زیاتر بێدەنگ نابێت و وەڵامی دەبێت.

هەرچەندە ئەوان بەشێوەیەک لەشێوەکان پشتگیری بزووتنەوەیان دەکردو ئەیانوت مامۆستا مەلا عەلی ناتوانێ ئەوانە کۆنترۆڵ بکاو بەقسەشی ناکەن، کۆمەڵێکیان ناحاڵین، ئێوەش بەڵێنتان داوە پارەی مانگانە بدەن بەبزووتنەوەو نەتانداوە. منیش ووتم ئەوانیش مانگانە لەگەڵ نەسریەی ئۆرگانەکانی یەکێتیدا وەری ئەگرن، جارجار دوادەکەوێ، هەرجارێک دواکەوت ئەوان کێشەیەک دروست بکەن، ئێمە داوا لەمام جەلال دەکەین ئەوپارەیان ببڕێت.

ئەمڕۆ ١٩٩٨/٨/١٢ چاوەڕێ دەکەین مام جەلال لەمەرزی پەروێز خانەوە لەئێران بگەڕێتەوە بۆ هەرێمی کوردستان. ئەم رۆژانە هەواڵ و زانیاری میدیا جیهانییەکان، زۆرتر لەسەرتەقینەوەکانی تەنزانیاو کینیایە لەنایروبی و داروسەلام، شەڕو دەرگیریش لەئەفغانستان گەرمە لەنێوان تاڵیبان و ئەحمەد شامەسعوددا، ئەحمەد شامەسعود ناوبانگی شێری دەرەی پەنج شێری بەسەردا براوە، ئێران نیگەرانە بەکۆنترۆڵ کردنی شاری مەزار شەریف لەلایەن مەلاعومەری تاڵیبانەوە، لەگرتنی ئەم شارەدا تاڵیبانەکان ١١ یانزە دیپلۆماتی ئێرانیان بێسەرو شوێن کردوە.

ئەمڕۆ ٨/١٥ لەسلێمانی و لەنەخۆشخانەی ئاشتی دکتۆرە لەمیعە عەملیاتی جیوبەکەی بۆکردم، لەو ڕۆژەوە تائێستا بۆیەکجاریش ئەوئازاری سەرئێشەم بۆ نەهاتوەتەوە.

سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٩٩٨/٨/٢٦ لەسلێمانییەوە لەگەڵ وەفدێکی شورای باڵای ئیسلامی(مجلس اعلى) سەردانی هەڵەبجەمان کرد لەم سەردانەدا سەرەتا داوایان کرد شارۆچکەی سیروان بەسەر بکەینەوە و دواتر ئاوایی عەنەب، سەردانەکانمان کردو ئێوارە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی، سوپای بەدر سەر بەشوراییە، ساڵی ١٩٨٨ لەشەڕی گرتنی هەڵەبجەدا بەشداربوون، چەندین کەسیان لەشەڕەکەو بەکیمیاوی گیانیان لەدەستدا، ئێستا دەیانەوێت گۆڕەکانیان بدۆزنەوە بەڵام نادۆزرێنەوە. لەکتێبی (گازبارانی هەڵەبجە و ڕاستی ڕوداوەکە)دا چاپی یەکەم و لەساڵی ٢٠١٤دا لەبابەتی قوربانیانی ٣/١٦دا بەلیستێک ناوی شەهیدەکانی هەموو لایەنەسیاسییەکانی بەشداربووم لەشەڕەکەدا بڵاو کردوەتەوە، بەهۆی کاک د.بەرهەمەوە هەمان ساڵ چەندین جار پەیوەندیم بەکەسێکی پەیوەندیەکانی مەجلسەوە کرد بۆ ئەوەی ژمارەو ناوی شەهیدەکانیانمان بدەنێ، ماوەیەکێش چاپ کردنی کتێبەکەم دواخست، بەڵام نەیانتوانی بماندەنێ.

لەکۆبوونەوەیەکی ئەنجومەنی مەڵبەندا ڕۆژی ٨/٢٩ کاک شەوکەتی حاجی موشیر خواحافیزی لێکردین و پێی ڕاگەیاندین سەفەری ئەوروپا دەکات، لەسەر بڕیاری مام جەلال من (حەمەی حەمەسەعید) سەرپەرشتی مەڵبەندەکە دەکەم تابەرپرسی مەڵبەند دائەنرێ. هەر بەو بۆنەوە ئەمڕۆ لەگەڵ کاک شەوکەت سەردانی ئیدارەو لایەنەسیاسییەکانی هەڵەبجەمان کرد.

ئەمڕۆ کۆمەڵێک کەسایەتی شاری هەڵەبجە سەردانی مەڵبەندیان کرد، هەندێک ڕێنمایی و پێشنیاریان هەبوو بۆ ئێمە، لەوانە شێخ نەجمەدینی هانەسورەیی.[1] دوای کۆبوونەوە لەگەڵ کەسایەتییەکان لە کۆبوونەوەیەکی

---

[1] بزووتنەوەی ئیسلامی لەچوار چێوەی دژایەتی کردنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا، لە هەڵەبجەو هەورامان و ئەو شوێنانەی ئەو دەمە باڵادەست بوو تیایا، گرتن و زیندان کردن و ئەشکەنجەدانی کەسایەتییە کۆمەڵایەتی و پیاوە دیارەکانی ناوچەکەش لەبەرنامەیاندابوو. لەکاتی شەڕەکانی نێوان یەکێتی و بزووتنەوەدا، بزووتنەوە دەستیان گرتبوو بەسەر خانو

کارگێڕیدا لیژنەیەک بۆ چارەسەری کێشەکانی کۆمیتەی سەیدسادق دانرا، لیژنەکە پێک هاتبوو لە هەڤالانی کارگێڕ: مەحمودی حاجی سالح، جەبار جەلال و فەرەجی حەمەسالح.

ڕۆژی ١٩٩٨/٩/١ لەگەڵ مەڵبەندی دووی بزووتنەوە لە شارۆچکەی خورماڵ کۆبووینەوە، قسەو باسمان سەبارەت بە ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکە بوو لەلایەن ئەوانەوە، بۆئەوەی چیتر ڕێگری نەکەن لەبەردەم کارکردنی هەڤالانی ڕێکخستنی خورماڵ دا. ڕۆژی ٩/٢بەشداری ڕێوڕەسمی کردنەوەی کارەبای شەش ئاوایی ناوچەکەمان کرد، خەڵکەکە لە ڕێوەڕەسمەکەدا سوپاس و پێزانینی خۆیان بۆ یەکێتی و هەڤالانی مەڵبەند دەربڕی لەپای پشتگیری و پێداگری بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژەکانی ئاوەدانی لەناوچەکەدا. لە ڕۆژی ٩/٣دا سەردانی کاک کۆسرەت و کاک ملازم عومەر عەبدوڵاو مەکتەبی ڕێکخستنمان کردو باسی کۆبوونەوەکانمان بۆکردن لەگەڵ هەریەک لە قەرارگای ڕەمەزان و بزووتنەوەی ئیسلامیدا.

لەدوای کاک شەوکەت ئەمویست وردە وردە ئەو بەشانەی لە بەشەکانی مەڵبەند لە شارۆچکەی سەیدسادق دانراون بگەڕێنمەوە بۆناو مەڵبەند بۆ هەڵەبجە، هەرچەندە چەند هەڤالێک ناڕازی بوون، بەڵام بەگوێم نەکردن، ئەمڕۆ٩/٧ بەناوی ئەوەوە نوسینگەی مەڵبەند لە هەڵەبجەدایە کۆمپیوتەرەکەم بردەوە بۆ هەڵەبجە. هەر ئەمڕۆ کاک جەمیل هەورامی دەست بەکار بوو بەلێپرسراوی مەڵبەند، لەکۆبوونەوەیەکدا دوای بەخێرهێنان لایەنگرانی ئەو رایەی کەدەبێت بەشێکی مەڵبەند لە سەیدسادق بێت، هەوڵیان دا کاک جەمیل ڕازیبکەن کەئەوان لە سەیدسادق دەوام بکەن، وەدەیانووت با ئەوبارەگا وەک بارەگای دووەم و خەلفی مەڵبەند هەبێت، وەئەرشیفی مەڵبەندیش لەوێ بێت، بەڵام من و لایەنگرانی ئەوەی کەدەمانووت دەبێت مەڵبەند لەیەک جێگە و ئەویش هەڵەبجە بێت، ڕازی

---

ماڵومولکی کادرەکانی یەکێتیدا کەلەبەردەستیان دا بوو، خانوەکەی منیان لەتەوێڵە کردبوو بەزیندان.

ماوەیەک چەندین کەسایەتی وەک شێخ نەجمەدین و شێخ عیزەدینی برای و ئەحمەدی مەلەک و...لەوێ زیندان بوون.

نەبووین و کاک جەمیلیشمان تێگەیاند کە بۆ چی خراپە ئەوبەشەی مەڵبەند لە سەیدسادق بێت.

لەوانە: دوو مەسرەفی، دەوام نەکردنی هەندێک بە بیانوی ئەوەی لەو بەربوون یان لەمبەرن، لەوانەش گرنگتر دڵەڕاوکێ و قەلەقی و ترس و دڵنیا نەبوونی جەماوەرەکەی یەکێتی و ڕێکخستن لەبەری هەڵەبجەو هەورامان، ئەیان ووت بەشێوەی کاتی لێرەن، ترسی بەجێهێشتنەوەی ناوچەکەیان زیاتر ئەبوو.

دوانیوەڕۆی ئەمڕۆ چووین بۆ هەڵەبجەی تازە بۆ بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی باوکی کاک حەمە شارەزووری، ڕۆژانی ٨ و ١٠/ ١٩٩٨/٩یش بەشداریم کرد لە ڕێوڕەسمی پرسەکانی باوکی کاک حەمەی مالیە لە هەڵەبجە و عەلی چاوەش تەوێڵەیی لە سلێمانی و مژدەی برای شەهید حەمەعەلی لە سلێمانی و لە مزگەوتی عەبدوڵا لوتفیدا.

ئێوارەی ٩/١١ لە سلێمانی کاک حەمەی حاجی حەمەشەریف گێڵدەرەی میوانداری کردم و نەیهێشت بگەڕێمەوە بۆ هەڵەبجە، من زۆرکەم میوانداریم قبووڵ کردووە یان کاتی خۆم بەوەوە سەرف دەکەم، ئەویش بۆ کەسێک کە خۆشم بووێت، ئەم ئێوارە لای کاکە حەمە مامەوە، جگەلەوەی خۆشم ئەوێت وەک یەکێتی قەرزاری ئەم پیاوەم.

حەمە کوڕی حاجی حەمەشەریفی گێڵدەرەیە، لەسالانی ٣٠ سیەکانی سەدەی ڕابووردودا باپیری کاکە حەمە هاتوتە هەڵەبجەو لێرە نیشتەجێ بووە، گێڵدەرە ناوی ئەو ئاواییەیە کەئەکەوێتە ڕۆژئاوای شارۆچکەی دیرینی بەرزینجە و بەرانبەر ئاوایی مایاوا لەناوچەی شارباژێر، ئاوایی کاژاویش ئەکەوێتە لای دەستی ڕاستی ئاوای گێڵدەرەوە، لوتکەی چیای کوڕە کاژاویش ئەکەوێتە باکوروی گێڵدەرە.

ئامینەخانی کچی حاجی حەمەئەمینی مریەم کە خەڵکی هەڵەبجەیە هاوسەری حاجی حەمەشەریفە، خێزانێکی دیارو ناسراوی هەڵەبجەن، پێنج کوڕ و چوار کچیان هەیە، کوڕەکانیان ئەمانەن: حەمەعەلی، حەمە، قادر، برایم و ئیسماعیل ناسراو بە عەبدول لەگەڵ د.قادردا پێشمەرگەی دێرینن، کچەکان: نەزیرە، پەریخان، ڕوخۆش و بەیان، ئەم خێزانە جگە لەوەی لەسەرەتای سەرهەڵدان و دروست بوونەوەی شۆڕشی نوێوە دوو کوڕیان

پێشمەرگەبوون لەناو هێزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی دا، خێزانەکەشیان لە خێزانە زۆر ماندووەکانی ناوچەکەیە، لەو خێزان و بنەماڵانەن هاوکاری یەکێتی و پێشمەرگە بوون و لەسەر کورە پێشمەرگەکانیان دەردیسەری زۆریان بینی و بەسەرهات.

جگە لەو دوو کورەیان کە پێشمەرگە بوون، کاکە حەمەش یەکێک بوو لە کادرە چالاک و هەڵسوڕا و ماندونەناسەکانی ڕێکخستنی ناوشاری کۆمەڵە و یەکێتی، دەوری کاکە حەمە و گیانبازی ئەو لە دەهەی هەشتاکانی سەدەی ڕابووردودا، جگە لەکاری حیزبی و ڕیکخستنی نهێنی ناوشار، لە هاوکاری و یارمەتی دان و شاردنەوەی مەفرەزەکانی پێشمەرگە و بەشداری لەئەنجام دانی چالاکیەکانیاندا، دیار و بەرچاو لەیاد نەکراوە.

لەبەرگی یەکەمی دەنگی خاکدا دوای چاپ کردنی کتێبەکە، بۆم دەرکەوت و زانیم دوو بابەت لەدەست نوسەکەدا هەن بەلام لەکاتی کۆمپیوتەر کردن(حروف چینی) دا ونبوون، لەکاتی پێدا چوونەوە و هەڵەبریشدا، پێم نەزانیون. ئەو دوو بابەتەش یەکەمیان سەبارەت بەهەڵدانەوەی گۆڕی خوالێخۆش بوو، مەلامستەفای بەرزانی و دووەمیان سەبارەت بەهەندێک خێزانی ماندو و کەسایەتی خاوەن هەڵوێستی کوردانەی هەڵەبجەو دەوروبەری بوون.

ئەو خێزانانەی لەهیچ کات وسات و بارودۆخیکدا، فشاری رژێم نەیترساندن لە نموونەیماڵی حاجی حەمەشەریفی گێڵدەرە و ماڵی رەشە عەزیز و ماڵی حەمەی لاسلکی و ماڵی عەلی شەمعێ و دەیان ماڵیتر........هتد،

حیزبی بەعس زۆربەی کەسایەتییەکانی هەڵەبجەشی توشی هەڵو لادان لە ڕێبازی کوردایەتی کردن، بەلام هەندێک ملیان بۆ داواکانی رژێم نەدا، خۆراگرو خاوەن هەڵوێست و نەترس بوون، لەوانە شێخەکان و سەیدەکانی هانەسورەو پیاوی تێکۆشەری وەک مەلاکەریمی مۆردینی و سابیری فەرەجی شاتری و ....هتد . خێزانی ماندو و کەسایەتی خاوەن هەڵویست، لە سنووری هەڵەبجە و هەورامان و شارەزووردا بەسەدانن رەنگە ناوهێنانی یەکەبەیەکەیان ئیمکان نەبێت، چوونکە باس کردنی ئەوانە بۆخۆی پێویستی بە کتێبێکی سەربەخۆیە، بۆ ئەوەی منیش ڕووبەڕووی گلەیی

نەبیمەوە، ئەوە هەڵ ئەگرین بۆ کاتێکی ترو ئەو کتێبەی باسی دەکەم، ناوی ئەو چەند کەسایەتی و خێزانانەشم بە نموونە هێناوە.

لەو کتێبە تایبەتەدا باسی دەکەم، تەرخان ئەکرێت بۆ دەوری جوامێرانەی کوردایەتی بنەماڵە و کەسایەتییەکان، بەشێکیشی تەرخان ئەکرێت بۆ خائینەکان، ئەوانەی دژی گەل و شۆڕش بوون، گەرچی ئێستا لە هەرحزب و پلەو پۆستێکدابن.

ئەوانەش هەڵخەڵەتان و لەگەڵ و نیشتیمانی خۆیان هەڵگەڕانەوە و تێکەڵ بە خیانەت و گەل و نیشتیمان فرۆشی بوون، چ بەنهێنی و چ بەئاشکرا، بەتایبەت کەسایەتییەکان و پیاوە دیارەکان، لەکۆتایی دەهەی هەفتاکان تا کۆتای دەهەی هەشتاکانی سەدەی رابردوو کەم نەبوون.

لەم بەرگەدا هەوڵمدا بە کورتی و لەپەراوێزیشدا بێت، ناوەرۆکی هەردوو بابەتە وون بووەکەی بەرگی یەکەم بخەمە بەر چاوی خوێنەر. بەڵام نەمتوانی.

## گیان لەدەستدانی قارەمانێک

پێش نیوەڕۆی رۆژی ١٩٩٨/٩/١٢ لەبارەگای مەکتەبی رێکخستن، کۆبوونەوەمان هەبوو، کۆبوونەوەکەی مەکتەب لەگەڵ مەڵبەندەکان سەبارەت بە ئیشوکاری حزبی و رێکخستن بوو، دوانیوەڕۆی هەمان رۆژ لە هەڵەبجە کۆبوونەوەی کارگێڕی مەڵبەند ئەنجام درا، گفتوگۆ و مناقەشە کرا لەسەر بابەتەکانی کۆبوونەوەکەی مەکتەب و جێبەجێکردنی بڕیارەکانی. لەم کۆبوونەوەشدا بڕیار درا بەیانی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی مەڵبەند بکرێت، رۆژی ٩/١٣ لە هەڵەبجەو لەبارەگای مەڵبەندا کۆبوونەوەی ئەنجومەنی مەڵبەند بەسترا، لەکۆبوونەوەکەدا هەواڵی شەهید بوونی فەرماندە و پێشمەرگەی دێرین رەفعەت جەعفەر ئێناخی و برهانی برای و موختار عەباس دەرە بەیانیمان پێگەیشت. ئەم هەڤاڵانەمان لە سەر رێگای عەربەت زەرایەن بە کارەساتی پێکادانی ئۆتۆمۆبێل گیانیان لەدەست دابوو.

لەکۆبوونەوەکەدا بڕیار درا لە ڕێوەڕەسمێکی شایستەدا هەڤالانی گیان بەخت کردو بەخاک بسپێرین، ئەوەبوو پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ لەگۆڕستانی گولانی شاری هەڵەبجەدا لە ڕێوەڕەسمێکی جەماوەریی فراواندا تەرمەکان بەخــاک ســپێردران، لەو ڕێوەڕەســمەدا، لەبــاتی مەڵبەنــدو فەرمانــدەیی شارەزوورو پێشمەرگە دێرینەکان و هاوڕێ و هاوسەنگەرانیانەوە ووتارم پێشکەشکرد. گیان لەدەست دانی ڕەفعەت[1] ئێناخی، چۆڵ بوونی سەنگەرێکی لەشکان نەهاتووی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو. بەتایبەت بۆ ئێمەی یەکێتی سەنگەرەکە لەکاتێکی ناسک و نائاساییدا چۆڵ بوو.

لەم مــاوەدا بڕیــارێکی سەیروســەمەرەش پەخــش کــرا بەســەر مەڵبەندەکانی ڕێکخستنی یەکێتی دا، دەڵێت ئەبێ ئەنجومەنی مەڵبەندەکان و کۆمیتەکانی ڕێکخستن بەشداری بکەن لەوخولانەدا، لە بارەگای خولی مەشقی سەربازیدا کراونەتەوە، من سەرەتا واتێگەیشتم، لەو خولەدا مامۆستایانی بوارە جیاجیاکانی سیاسی، ئیداریی، مێژوویی......هتد ئامادە کراون بۆ دەرس وتنەوە و پەروەردەکردنی کادرەکانی حزبی و ڕێکخستن. زۆرم پێخۆش بوو، بۆیە یەکەم دەستە لەمەڵبەندی شارەزوور خۆم وەک جێگری مەڵبەندەکەو نزیکەی ٤٠ چل هەڤال تێکەڵاو لەئەنجومەنی مەڵبەندو کۆمیتەکان، لەڕۆژی ١٩٩٨/٩/٢٠ پەیوەندیمان کرد بەبارەگای سەربازگەی مەشقی ٧ حەوتەوە لە بەکرەجۆ. لەگەڵ ئەفسەرێکی گورج وگۆڵ و پاک و تەمیزدا بەناوی قارەمان

---

[1]- ئێناخیەکان لەشۆڕشی نوێ و لەناو هێزی پێشمەرگەدا چەندین کوڕی قارەمانیان پێگەیشت و پەروەردە بوون و هەنگاو بەهەنگاو پلەبەپلە گەیشتنە پلەی فەرماندەیی و لەکاتە جیاجیاکانی شەڕو گیانبازی و بەرگریدا دوا پلەی قارەمانییەتی و مەردایەتی کە شەهید بوونە پێی گەیشتن.

لەوانە: شەهید عەلی حەمەتەقی فەرماندەی مەفرەزە، لە کارەساتی هەکاری ڕزگار بوو، بەڵام دواترو لە ساڵی ١٩٨٠ دا لە مەریوان شەهید بوو، شـەهید فـاتیح مستەفا ئێناخی فەرماندەی مەفرزە لە کەرتی دووی تیپی ١١ی هەورامـان شـەهید بـوو سـاڵی ١٩٨٢ لە ئاڵوەتـانی سەردەشـت، شـەهید مـحەمەد سلێمان فەرمانـدەی بەتـالیۆن شـەهید بـوو لە ناوشاری هەڵەبجە ، شەهید عەلائەدین عومەر ساڵی ١٩٩٦شەهید بوو لەناوچەی شلێر، شەهید ڕەفعەت جەعفەر، شەهید عەبدوڵا ڕەق سـاڵی ٢٠٠٢ لەچیای شنروێ لە شـەڕێ تیرۆریسـتانی ئەنسـارول ئیسـلامدا، شـەهید ئەشـرەف غەفـار ئاغا فەرمانـدەی سـریە، ساڵی٢٠١٤ لە یەنیجەی دوزخورماتو شەهید بوو.

دانیشتین و هەندێک قسەوباسمان کردو لیستی ناوەکانمان پێشکەش کرد. دەوامی ئەمڕۆ هەر بۆ یەکتر ناسین و شارەزابوونی شوێنەکە بوو، دوای نیوەڕۆ گەڕاینەوە، ڕۆژی دووەم کە دەکاتە ٩/٢١ هەموومان لەگەڵ هەڤالانی مەڵبەندەکانی تر لە مەیدانی مەشق ئامادە بووین و کاک جەبار فرمان هات و وتەیەکی پێشکەش کرد بەبۆنەی کردنەوەی خولەکەوە، دوای قسەکانی نەوەستا و ڕۆیشت.

بە قسەکانی کاک جەباردا زوو تێگەیشتم ئەویش نازانێت ئێمە بۆچی هاتووین بۆ ئەم سەربازگە، ئەمڕۆیش لەلایەن ئەفسەرەکەوە مۆڵەت دراین و سەربازگەکەمان چۆڵ کرد. ڕۆژی ٩/٢٢ یەکەم ڕۆژی دەوامەو لەمەیداندا ئامادەبووین و کراین بەچەند دەستەیەک و کاک قارەمان برێک ڕێنوێنی کردین، سەباز چۆن لەمەیدانی مەشقدا هەڵسوکەوت دەکات. ئینجا عەریف و ڕەئیس عورەفا ئیعازیاندا ڕێک بووەستین و پشووبەو وریابەو بۆ پێش و بۆ پاش وەرگەڕێ، هەرکەس سریەو فەسیلی خۆی ناسی و نیوەڕۆی ئەمڕۆش تەواو بووین، من مۆڵەتم لە کاک قارەمان وەرگرت و کاک زرار جۆلاشم لەگەڵ خۆم برد و چووینەوە بۆ ناوشار لە ڕێگە پرسیم کاک زرار ئەوە خەریکی چین؟ وتی وەڵا نازانم، بەراستی مەخسەرە جاڕیە، بەردەوام بووین، بەو مەخسەرە جاڕیەوە تا ڕۆژی ١٠/٣ ئەمڕۆ ڕۆژی تاقی کردنەوەی مەڵبەندەکان بوو، مەڵبەندی شارەزوور لەراکردندا یەکەم بووین، ئەندام کۆمیتەیەکی کۆمیتەی ئالپارێز بەناوی کاک ڕێبواری حەمە شۆخەوە یەکەمەکەمان بوو، منیش هەر بۆ ئەوەی ئەو برادەرانەی بەشداری ئەم بریار و خولە بێ بەرهەمە بوون و بەراستیش ئەوان بە مەخسەرە جاڕیەوە تەواویان کرد، دەمانچەیەکم پێشکەش بەرێبوار کرد مەڵبەندەکانی تر کردیان بەگاڵتە، وتیان ئێوە مەڵبەندی شارەزوور لە ساڵی ١٩٩٣ وە خەریکی مەشقی راکردن و پێش بڕکێن لە هەڵەبجەوە بۆ سەیدسادق ئیتر بۆیەکەم نەبن..

هەر ئەو ڕۆژە لەگەڵ کاک زرارو چەندین کادری مەڵبەندەکانی تر سەردانی هەڤالانی مەکتەبی سیاسیمان کردو لەوبارەوە قسەوباسمان لەگەڵ کردن، بەسەراحەت و بێشەرم پێمان وتن بەراستی ئەمە سەرلێشێوانە، ئەنجومەنی ئۆرگانی ڕێکخستن ببەیت لەو دەشتە فێری راست و چەپی

بکەیت، پرسیارمان کرد ئەمە تەرح و بەرنامەی کێیەو حیکمەتەکەی لەچی دایە؟ ئەوانیش بێئاگایی خۆیان پیشاندا، دواتر برادەرێکی خۆم کاک جەمیل هەورامی ووتی من ئەوەم پێشنیار کردبوو بۆ مام جەلال.

ئەوەبوو وەجبەی دووەم ئامادەکران و پێش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٩٨/١٠/٦ گەیشتنە بارەگای مەشقی حەوت، من لەگەڵ هەڤالانی شارەزوورەدا چووم و لەوێ ئەوان مانەوەو من گەڕامەوە، دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ ئەوانیش گەڕانەوە و ئاگاداریان کردین مەکتەبی سیاسی بڕیارەکەی هەڵوەشاندوەتەوە.

ئیشی ئەنجومەنی مەڵبەندەکان و کۆمیتەکانی حزبی دیارە چییە، ئەوەیە لەناو خەڵکدابن، خەریکی خەڵک ڕێکخستن و کۆکردنەوەی ئەندام و لایەنگرو جەماوەریی دەنگ دەربن، بەشداری لەبۆنەو یادەکان و خۆشی و ناخۆشی خەڵکدابن، لەم سەردەم و کاتەدا لە سنووری ئێمەدا خەڵک زیاتر بە تێکەڵاوی و بەسەردان کردن و بەشداری کردن لە ڕێوەڕەسم و بۆنەکانیاندا، لەلایەن کادرو ئەندامە حزبیەکانەوە لەدەوریان کۆدەبنەوە، لەکۆمەڵگای ئێمەدا زیاتر هۆکاری کاریگەر سەردانی نەخۆشەکانییانە، بەشداری خەم و پرسەکانی ماتەمینی و بەدەمەوە چوونی کێشە کۆمەڵایەتییەکانیانە، پشتگیری داواکاری و جێبەجێکردنی مافەرەواکانیانە. خەڵک داواکاری و کێشەو گرفتی تەواو نابێ بەردەوام پێویستی و داواکاری نوێ دێتە پێشەوە، ڕێکخستن ئەبێ بەردەوام ئامادەیی هەبێت لەناو خەڵکدا. پاڵدانەوە لەسەر خەرمانی خەباتی رابردوو دەست کەوتەکان سەروەریەکان دەست پێشخەریەکان، ئەگەر لەگەڵ کاری ڕۆژانەدا گرێیان نەدەیتەوە، کاریگەریان لای جەماوەر نابێت، ئێمەی یەکێتی لەوبارەوە کورتمان هێناوە. بەتایبەت لەوکاتانەدا کەخەریکی شەڕی ناوخۆ بووین.

سەبارەت بەکاری حزبی و ڕێکخستن و کۆکردنەوەی خەڵک هەڵەی وامان کردووە، من ئێستا شەرم دەکەم باسی بکەم، بەتایبەت لەبارەی ئەوبەڵێنانەی ئەدرا بەخەڵک تا دەنگت بداتێ، یان بێتە ناو ڕێکخستنەکانتەوە، کەزۆرجار ئەوە دەچووە چواچێوەی بەکرێگرتنەوە، زیاتر لەمانەش لەباتی کۆکردنەوەی جەماوەری دەنگدەر و رابەرایەتی و ئاراستەکردنی، جیاکردنەوەی لە ڕێکخستن، چەند بەهەڵەدا چووبووین، لەم سەردەمەدا کەسەردەمی هەڵبژاردن و خەباتی پەرلەمانی دیموکراسییە، لەباتی ئەوەی

هەوڵ بدەین ڕێکخستنێکی کەم و پوخت، پەروەدە بکەین و جەماوەرمان بۆ ئاراستە بکات، هەوڵی ئەوەمان ئەدا هەموو کەس حزبی بێ و ببێتە ئەندام.

ئەمەی خوارەوە ئیشوکاری حزبی من بووە لەماوەی ١٢ داوازدە ڕۆژدا لە ١٩٩٨/١٠/١٢تا ١٩٩٨/١٠/٢٤کۆبوونەوەیەکی کارگێڕی مەڵبەند بۆ پێدا چوونەوەی ئیشوکاری مانگی رابردوو. لەگەڵ هەڤاڵ جەبار جەلال سەردانی ماڵی کاک ئەکبەر ئێناخی و کۆبوونەوەیەک بۆچارەسەر کردنی رووداوی گیان لەدەستدانی هەڤاڵانمان شەهیدان ڕەفعەت جەعفەر ئێناخی و بورهانی برای و موختار عەباس دەرەبەیانی. لەگەڵ کاک جەمیل هەورامی سەردانی کاک جەبار فرمان و کۆبوونەوە لەگەڵیدا بۆ پرسی بەهێزکردنی پاسەوانی هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندو کۆمیتەکان لە سنووری قەزای هەڵەبجەدا. پێشوازی لەمامۆستا مەلا عوزێرو مامۆستا مەلابەهادین وەڕاسی و چەند کەسایەتیەکیتر، کۆبوونەوە لەگەڵیان و چارەسەرکردنی کێشە و جێبەجێکردنی داواکاریەکەیان. ئەنجام دانی کۆبوونەوەیەکی فراوان لەنێوان ئەنجومەنی مەڵبەند و ئەنجومەنی کۆمیتەی سەیدسادق دا، سەرەتا بە ووتارێکی کورتی خۆم کۆبوونەوەکەم دەست پێکردو دواتر وتووێژو گفتوگۆ لەگەڵ کاک جەمیل هەورامی بەدرێژی دەستپێکردو من بەجێیان ئەهێڵم ئەچم بۆ ئەنجامدانی ئیشوکاری ئاسایی ناو بارەگای مەڵبەند لە هەڵەبجە.

بەشداری پرسەو ماتەمینی لە ئاوایی زمناکۆ هی خوالێخۆشبوو کاکە حەمەی نادر باوکی پێنج پێشمەرگەی دێرین و کەم ئەندام و قارەمان، ئەوانیش هەڤالان: ئەحمەد، سابیر، حەمەکەریم، فایق و فاتیح. بەشداری پرسەی خوالێخۆش بوو عیزەتی کەریمی لە هەڵەبجە، برای کاک مستەفا عەبابەیلێیی (مچەکەچەڵ) و کاک ئەحمەد. کۆبوونەوەیەک لەگەڵ قەرارگای ڕەمەزان لە هەڵەبجە و ڕەخنەگرتن لێیان و دەربرینی ناڕەزاییەتی لەسەر ئەوە وەک چاودێری بێلایەن چاودێری ڕێککەوتنی ئێمە و بزووتنەوە ناکەن.

بەشداری پرسەی خوالێخۆشبوو کاک بەهادینی حاجی سەفەر لە سلێمانی، بەشداری پرسەی برای مامۆستا مەلا غەفور لەگردی مامەیارەی سلێمانی. سەردانی چەندین ماڵە شەهید و بەسەر کردنەوەی چەندین پێشمەرگەی دێرین لە گەڕەکی سەرای هەڵەبجە، لەوانە ماڵی شەهید

کەیکاوس، شەهید حەمەتەوفیق، پورە قەتە دایکی کەم ئەندام هاشم بۆینی....هتد.

کۆبوونەوەیەکی فراوان لەگەڵ کەرتی ڕێکخستنی سیروانییەکانی هەڵەبجەی تازە لەناو مزگەوتی گەڕەکەکە، هەرچەندە قەدەغەیە کۆڕو کۆبوونەوەی حزبی لەناو مزگەوتدا. سەردان و بەسەر کردنەوەی چەندماڵێک لەوانە: ماڵی کاک کوێخا ئەحمەدی عەبدوڵا چواردارانی، ماڵی مام عەزیزی گڵەجاڵی، ماڵی حاجی مەحمودی دێتەڵای گڵەجاڵی، ماڵی عەزیزی سەرتیپی پێشمەرگە، ماڵی سەید عەبدولڕەحمانی سەید عەبدولرەحیمی تاوگۆزی، ماڵی سەید فەتاحی بانی بۆلانی و...هتد. سەردانی چەندین نەخۆش لەگەڕەکی شارەوانی هەڵەبجەو، کۆبوونەوە لەگەڵ کاکەییەکانی هاوارو ناوچەکە بۆ دڵدانەوەو دەربڕینی پشتیوانی یەکێتی بۆیان، لە بەرامبەر ئەو هەڕەشە وترساندنەیان لەلایەن بزووتنەوەوە. کەلەلایەن چەند کەسێکەوە ئاگادار کرابوونەوە، دەبێ یان موسڵمان ببن یان دەبێ جزیە بدەن.لە کۆتایی ئەو ١٢ دوازدە ڕۆژەدا، پێشوازیم لە نوێنەرانی ئاوایییەکانی چەمی بووزان کرد، ئەو دۆڵەی ئەکەوێتە دەستی چەپی ئاوای کانی مانگا، لەسەر ڕێگای پێنجوێن ناڵپارێز پێی دەوترێت چەمی بووزان، من هەوڵم دا تابزانم ناوەکە لەچییەوە هاتوە بەڵام بۆم ساخ نەبووەوە، ئەم دۆڵە چەندین ئاوایی لێیە، لەوانە: کوڕی گەبڵە، کوڕەمێو، تازەدێ، تووتمانی سەرو خوارو، هوشیاری، هوشیاری پێشتر ناوی ڕەشان بووە، چەمی بووزان لەشەڕی ئێران عێراق دا مەیدانی جەنگ و هەموو ناوچەکە بووبووە مەیدانی مین، بەتایبەت سنووری ئاوایی ڕەشان، دوای ڕاپەڕین، پێشمەرگەی کەمئەندام و دێرین هوشیار بیاوێڵەیی کەپێشتر لاقێکی لەدەست دابوو، ئاوایییەکەی بۆ پاککردنەوە لەوێ لاقەکەی تری لەدەستدا، ئاوایەکەش وەک وەفا بۆ هوشیار ناوی ئاوایییان لە ڕەشانەوە گۆڕی بۆ هوشیاری.

خزمانی چەمی بووزان هاتبوون، بۆئەوەی پشتگیریان بکەین بۆ چاککردنی ڕێگاکەیان و ئاوەدان کردنەوەی گوندەکانیان. هەروەها پێشوازی خزمانی شەمێرانی لەمەڵبەندو پرسینەوەو بەدوادا چوون بۆ داواکانیان. بەشداریم لە ڕێوڕەسمی پرسەیەکی ئەوان (شەمێرانییەکان) لە ئاوایی ئیمامی

زامن، دوا چالاکیش بەشداری لە پرسەو ماتەمینی هەورامانی کوڕی رەئوف پالانەی و پیاوێکی خێل حەمەییدا بوو لە هەڵەبجەدا.

## کۆبوونەوەیەکی فراوان 1998/10/27

یەکێتی نیشتیمانی کوردستان سەرەرای ئاڵۆزی ناوچەکەو ئەو کێشەو گرفتانەی لەچەند ساڵی رابردوودا بەرۆکی گرتبوو، لەوانە شەڕەکانی ناوخۆ لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی و پارتی و لەپاڵ ئەمانەشدا دەستێوەردان و پشتگیریەکانی دەوڵەتانی ناوچەکە لەشەڕەکانی ناوخۆدا بە دژی یەکێتی بەتایبەت هێرشەکانی زەمینی سوپای عێراق لە٣١ی ئابی ١٩٩٦ داو هێرشەکانی زەمینی و هەوای سوپای تورکیا لە گەردەلولی تۆڵەدا، لە راستیدا ئەمانە گورزی کەمەر شکێن بوون لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە بەر یەکێتی نیشتیمانی کەوتن بۆ پشتیوانی پارتی دیموکراتی کوردستان.

وەک ووتمان یەکێتی لەم سالانەدا سەرەرای ئەمانە لەناو خۆی خۆیشیدا کۆمەڵێک کێشەو گرفت رووبەرووی بووەتەوە. لەوانە دەستەو دەستەگەری و تاقم بازی، ئەم کێشە جگەلە ئاسەوارە خراپەکانی لەوانە دەرکەوتن و پێدان و وەرگرتنی پلەو پۆستی بالا لەناو حزب و حکومەتدا لەلایەن کۆمەڵێک بەناو کادرەوە، کە زۆر جار بێتواناو بێکەڵک و ترسنۆکەکان حەقی کادرە شیاو لێوەشاوەکانیان دەخوارد. ئاها زۆرجار بە ئاشکراو بێ پەردە ئەوترا فلانەکەس (لەپڕێ بوو بە کوڕێ). ئەم جۆرە بەرپرسانە زۆرجار دەبوون بەبار بەسەر ئۆرگانەکانی حزب و حکومەتەوە، ئەم کێشە دەبووە هۆی چەندین دەرئەنجامی خراپ بۆ یەکێتی.

جگە لەوەش ئاسەواری خراپی دەستە و دەستەگەری نەک تەنها لەبوارە سیاسییەکەداکەدا لەبوارەسەربازیەکەشدا گەیشتبووە رادەیەک، من دیومە لەبەرەکانی شەڕدا فەرماندەیەک وەک پێویست ئەرکی خۆی یان ئەو

پلانەی بۆی دیاری کراوە جێبەجێی نەدەکرد بۆ ئەوەی فەرماندەکەی هاوشانی کەلەدەستەیەکی ترە بشکێ.

ئەمەو چەندین کێشەی تری ڕێکخستن و شەهیدان و پێشمەرگە و لەسەرووی هەمووشیانەوە سەرکردایەتییەکی ناتەباو نەگونجاو و کاری گەریشی بۆسەر فەرماندەیی گشتی هێزی پێشمەرگە هەبوو، بۆیە کۆمەڵێک کادر داوامان کرد کۆبوونەوەیەکی فراوان بکرێت، لەوکۆبوونەوەدا بۆ چارەسەری ئەم کێشەو گرفتانە گفتوگۆ بکرێت.

ئەوەبوو لەسەر داوای مەکتەبی ڕێکخستن لە ڕۆژی ١٩٩٨/١٠/٢٧دا کۆبوونەوەیەکی فراوان لەئەندام مەڵبەند بۆسەرەوە واتە بەبەشداری ئەنجومەنی مەڵبەندەکان و مەکتەبەکان و ئۆرگانەکانی تری یەکێتی لەهۆڵی ڕۆشنبیری سلێمانی بەسترا. لەم کۆبوونەوەدا سەرەتا هەڤاڵ د.ئەرسەلان بایز قسەی کرد و دوای ئەو کاک کۆسرەت قسەی کرد.

دوای کاک کۆسرەت چەندین هەڤاڵ لەسەر کێشەو گرفتەکان دواین و پێشنیاریشمان بۆ چارەسەر خستەڕوو، لەوانە د.شاهۆ، کاک مەلابەختیار و منیش(حەمە).....هتد، ئەوکێشانەی لەم کۆبوونەوەدا من باسم کردن ١- دەستەو دەستەگەری، ٢- پێدا چوونەوەو بژار کردنی هەموو دەزگا حزبییەکان، ٣- فەسادی ئیداریی و ڕۆتینیات لە دەزگاو ئیدارە حکومیەکاندا، ٤- ئەو جیاوازی بۆشاییە گەورە و دیار و ئاشکرایەی درووست بووە لەنێوان سەرکردەو لێپرسراوەکان لەلایەک و کادرو ئەندام و پێشمەرگە لەلایەکی ترەوە لەڕووی ژیان و گوزەران و....هتد، ٥- باشکردنی ژیان و گوزەرانی کەسوکاری شەهیدان و پێشمەرگەو فەرماندەکانیان، بۆ چارەسەر کردنی گرفتەکان  پێشنیارم گەڕانەوە بوو بۆ پەیرە و لەگەڵ سزاو پاداش تا بەستنی پلینیۆم یان کۆنگرە.

بەداخەوە کێشەو گرفتەکان چارەسەر نەکران و بەردەوام و بە تێپەڕ بوونی کاتیش زیاتر بوون، هەندێک کێشەو ئاسەواری خراپ و گەندەڵی لەناو حزبەکاندا لە کوردستان و لەناو حکومەتەکانیدا خەریکە ئەبن بە دیاردە.

# هەوڵی بەرهەمهێنانی فلم

لە مانگی ١٩٩٨/١٠دا مامۆستا ئەیوب رۆستەم چەند جارێک باسی بەرهەم هێنانی فلمێکی کوردی لەگەڵ کردم، لەدوای راپەڕین شەڕەفی یەکەم شانۆگەری برابوو بەهونەرمەندانی هەورامان کەلە ٨/ ٨/ ١٩٩١دا لەناو وێرانەی کەلاوە روخاوەکانی شارەدێی تەوێڵەدا نمایشیان کرد، مامۆستا ئەیویست بەرهەم هێنانی یەکەم فلمی کوردیش هەر بۆ هەورامان بێت، ئەو فلمەش سەرچاوەکانی زنجیرە پەلامارو هێرشەکانی قاجاریەکان بۆسەر هەورامان و بەرگری و شکاندنی قاجاریەکان بێت لەلایەن هەورامییەکانەوە. بۆ ئەم مەبەستە ڕۆژی ١٩٩٨/١١/١ لەگەڵ هاوڕێم مامۆستا ئەیوب سەردانی هەڤاڵ مەلابەختیارمان کرد، ئەوکات بەرپرسی مەکتەبی ڕێخراوەکان بوو. کاتێک ئەمەمان لەگەڵ باس کرد، لەوەلامدا وتی ئەمە سەرچاوەی راستییە؟ مامۆستا ئەیوب وتی بەڵێ قوربان خۆ داستانی مامالێ نییە.

کاک مەلا بەختیار بەڵێنیدا هاوکاریمان بکات، پرسی چەند پارەی ئەوێت؟ مامۆستا وتی سەد هەزار دینار. کاک مەلا وتی ئەو پارە زۆرە، من ئەتوانم مانگانە هەزار دینارتان بدەمێ، مامۆستا وتی پێشەکی ٣٠سی هەزار دیناری ئەوێت، بۆیە بریاردرا بۆ ئەو مەبەستە بچینە لای دەوڵەمەندێکی هەورامی ٣٠سی هەزارەکە قەرز بکەین و مانگانە بیدەینەوە، هەر ئەو رۆژە مەلا هەزارەکەی بۆ سەرف کردین، منیش وتم لە مەڵبەند ئۆتۆمۆبێلێک و هەرێم ئەمینی وێنەگر تەرخان ئەکەم بۆ کارەکە، لەوێ هەستاین و هاتینە دەرەوە.

بریارمان دا بچینە لای کاک باقی حەسەن هەورامی بۆ قەرز کردنی پارەکە، لەڕێگە من وتم ئەو قەرزەمان ناداتێ، مامۆستا وتی کاک باقی خۆی حەزو ئارەزویەکی بۆ بابەتەکە هەیە، تێیگەیێنین ئەمانداتێ. چووینە لای قسەی زۆرمان لەوبارەوە بۆ کرد، لەوەلامدا وتی ئێوە یەکێتین با مام جەلال یان هێرۆخان ئەوپارەتان بدەنێ. مامۆستا وتی ئەوان هەورامی نین، ئێمە ئیشەکەمان بۆ هەورامانە، ئینجا بۆ هەموو کوردە. زۆر قسەمان کرد کەڵکی

نەبوو، هەتا مامۆستا ئەیوب ووتی خانووەکەم لە بارمتەدا دائەنێم بەڵام کەڵکی نەبوو، کاک باقی بەڵێنی نەدا.

ماوەیەکی زۆر هاتین و ڕۆیشتین هەوڵەکەمان سەرنەکەوت، بۆیە مامۆستا ئەیوب پارەکەی بردەوە بۆ مەلابەختیار، ئەویش ووتبووی ئەوە تازە سەرف کراوە وەری نەگرتبووەوە، پێی ووتبوو چالاکیەکی پێ ئەنجام بدەن.

ئەمەوێت لێرەدا بە کورتی باسێک لەسەر لەشکرکێشی و هێرشەکانی قاجاریەکان بۆ سەر هەورامان بکەم کە بابەتی فلمەکە بوو، فەرهاد میرزا مامی نەسرەدین شای قاجارە، لە ساڵی ١٢٩١ هجری قەمەریدا دیاری ئەکرێت بۆ بەڕێوەبردنی حکومەتی کوردستان، مەبەست لە حکومەتی کوردستان قەڵەمرەوی ئەمارەتی بەنی ئەردەلانە. لەوکاتەدا فەرمانی بۆ دەرئەکرێ فەرهاد میرزا تووشی نەخۆشی دەبێت، بۆیە داوای بەخشین دەکات لە پۆستەکەی، نەسرەدین شاە رازی نابێت و دوای سێ مانگ چاک دەبێتەوە، لە تارانەوە ئەکەوێتەڕێ بۆ سنە بە هاوڕێیەتی کوڕێکی رەزاقوڵی خانی والی، کە لەوسەردەمەدا دانیشتوی تاران بووە. فەرماندەی فەوجی سنەی بۆ داناوە، کەدەگەنە جێ میرزا زەکی وەزیر لادەدات و لە ڕێگەی گەروسەوە رەوانەی تارانی دەکاتەوە.

فەرهاد میرزا لەڕۆژی هەینی١٤ی مانگی ذیلقعدەدا ئەگاتە سنەو دوای پێشوازیەکی گەرمی لەلایەن هەموو چین و توێژەکانی ناوچەکەوە شەرەفە مەلیک هەموو کەسایەتییە دیار و ناسراوەکانی پێ ئەناسێنێ. دوای ئەوە ئەگاتە بینای بارەگای فەرمانرەوایی وتەیەک پێشکەش دەکات بۆ هەموو ئەوانەی لەوێ وەستاون، بەم دەقەی خوارەوە : من تالەم ویلایەتەدا حاکم بم لەگەڵ هیچ یەکێک لە ئێوەدا لە هیچ کاتێکدا درۆ ناکەم، ئێوەش نابێت لەگەڵ مندا هیچ کات درۆ بکەن، هەرکات درۆ و ساختە لە هەرکەسەوە دەرکەوت بەبێ پەردەپۆشی و شاردنەوە سزا ئەدرێت. سەراحەت پێتان ئەڵێم من بۆ دڵسۆزان و ڕاستگۆیان بەهەشتی بەرینم و بۆ ئاژاوە چیان و درۆزنان دۆزەخ، (ان الابرار لفی نعیم وان الفجارلفی جحیم). ..........تادوایی.

دوای چەند رۆژ دەست دەکات بەدەور و تەسلیم و تەشکیلات و ڕێکخستنەوەی ئیدارەو دانانی بەرپرسی بلۆکەکان و ناوچە و ئاواییەکان، میرزا شوکروڵای سنەیی دەڵێت : بەشێوەیەک ڕێکوپێک بوو لەگەڵ خەڵک لە

نۆکەرو ئەندامێکی ولایەتەوە کەسی بێکار نەهێشتەوە، نانی کەسی نەبڕی، هەرکەسەو بە ئەندازەی شیاوی و لیاقەتی خۆی کاروبارو ئیشی بۆ دیاری کرد. خەڵکی خۆشحاڵ کرد. دوای ئەوە هەموو هۆز و تیرەکانی ناوچەکە دێن و ئامادەیی خزمەتکاری دەبن، بەڵێنی وەفاداری بەمامی شاه دەدەن، جگە لە هەورامییەکان. ئەویش بەرنامەی ئەبێت بۆ گرتنی هەورامان و تۆڵەکردنەوە.

دەڵێن هەورامیەکان تەسلیم نابن و ناشیانەوێت شەڕبکەن لەگەڵ دەوڵەتی قاجاردا، گوایا کاتێک فەرهاد میرزا ئەکەوێتە ڕێ بۆگرتنی هەورامان بەشەڕ، پیاوانی دیار و سلتانەکانی هەموو بەشەکانی هەورامان کۆدەبنەوە و بڕیار ئەدەن نوێنەر بنێرن بۆلای فەرهاد میرزا پێی بڵێن ئێمە کارمان بەسەر دەوڵەتەوە نیە، بۆخۆمان لەناو ئەم دارو بەردە سەختەدا دانیشتووین، ئەگەر بێنەسەرمان ناچار شەڕتان دەکەین.

بۆ ئەم مەبەستە شێخی تەوێڵە ئەچێت بۆلای فەرهاد میرزا، لەدانیشتنەکەیاندا پەیامی سوڵتانەکانی ئەداتێ و ئەڵێت هەورامی نایانەوێت شەڕی ناسرەدین شا بکەن، وازیان لێبهێنن، ئەوانیش کاریان بەسەر دەوڵەتەوە نیە. فەرهاد میرزا وەڵامی شێخ ئاوا ئەداتەوە.

(ما شیخ و زاهد نمی شناسیم یا جامی باد یانروی ساقی)،

شێخیش پێی ئەڵێت.

(ما میرو سلتان نمی شناسیم یا عدل و احسان یان قهر باقی).

ئەمجا بەرپرسی بلۆکەکانی بەم جۆرە داناوە:

بلۆکی جوانڕۆ بۆ عەلی ئەکبەر خان(شرەف الملیک)، گاوەرۆ و ژاوەرۆ و کەلاتەرزان بۆ میرزا ڕەزا عەلی(دیوان بەگی)، سورسور بۆ ئەسەدولا بەگی وەکیل. بلۆکی ئیلاق بۆ میرزا عەبدولعەزیز سدیق دیوان کوڕی میرزا موسای معتەمد، ناوچەی کەرەفتو بۆ میرزا یوسفی مشیرە دیوان. بلۆکی مەریوان بۆ محەمەد باقر خان ، ناوچەی تیلەکۆو خوڕخوڕە بۆ میرزا محەمەد عەلی، ناوچەی هۆبەتوو و ساراڵ و قراتورە و حسێن ئاوا بۆ ئیسماعیل خانی کوڕی خەسرەوخانی ناکام.

بلۆکی بانە بۆ کەریم خان حاکمی پێشوی ئەوێ. بلۆکی سەقز بۆ محەمەد عەلی خانی سەقزی، ناوچەی ئسفەند ئاوا بۆ قشم بەگی سالح

ئاوایی، ناوچەی چاردوڵی بۆ بوولیخانی چاردولی، ئیلات و عەشایر بۆ حەوت کەسی ئیلات، ئەرمەنی و یەهود بۆ زەین عابدینی فەراش باشی. بۆ کاروبار و بەرپرسی هەردوو بلۆکەکانی هەورامان خۆی پاراست . ئەمانە دەست بەکار بوون، دڵسۆزو دەست پاک و خزمەت گوزارەکان پاداش و گەندەڵ و تەمەڵەکانیش سزا ئەدران ......تادوایی.

دوای ٣ سێ مانگ بۆ بەسەرکردنەوەو سەردانی قەڵای شائابادی مەریوان لەگەڵ جەماعەتێک ئەکەوێتە ڕێ، بەگەیشتنیان بۆ سنووری مەریوان، حەسەن سانی هەورامی کەچەندین ساڵە ملی نەداوە بەحکومەتی وەخت، شازادەش ئەوان بەسەرچاوەی یاخیگەری و ئاژاوە گێڕی ئەزانێ،حەسەن سان لەگەڵ براکانی مستەفا بەگ و بارام بەگ، بەقسەی میرزا شوکروڵا ، لەگەڵ ١٠٠٠ هەزار تفەنگچی هەورامیدا غەڕاو بێباک دێتە لای شازادە (فەرهاد میرزا).

شازادە لەسەر سەرهەڵدان و بێباکی و حوکمڕانی و حساب نەکردنی حەسەن سان لە رابردوودا نیگەران دەبێت و وەبەم سەردانە بێباکانەیەش ئەوەندەیتر لەدڵا ئەکوڵێ، گوایا لەکاتی هاتن و لە ڕێگاش تفەنگچیانی هەورامی چەندین حەرەکاتی نەشیاوی وەک ئیهانە بۆ شازادە ئەنجام دەدەن. شازادەش لە بەرامبەر هەموو شت چاو و پۆشی و خۆی بێئاگا ئەکا. تائەگەنە ئاوایی بێلو (بیلک ).

لە ئاوایی بێلو شازادە مزگەوتەکە دەکاتە مەنزڵگای حەوانەوە، لەوێ بەرنامەی کوشتنی حەسەن سان دائەنێ و ئەیکوژێت و بارام بەگ و مستەفا بەگیش ئەگرێ. دوای گەڕانەوەی بۆ سنە فەرهاد میرزا بەم شێوەیە چیرۆکی کوشتنەکەی سان گرتنی براکانی ئەگێڕێتەوە :

((ئەو شەوە لە مزگەوتی بێلو بەهۆی بیرکردنەوە و خەیاڵ فراوانییەوە بۆ کوشتن و لەناوبردنی حەسەن سان خەو نەچووە چاوم. بە بیرکردنەوەی قوڵ و بە نییەتێکی پاک پەنام بردە بەر قورئانی مەجید، قورئانەکەم کردەوە ئایەتی موبارەکی (یایحیا خذ الکتاب بقوه) هات، ئیتر هیچ ڕاڕای و قەلەقیەکم نەما، ئیتر بەوپەڕی ورەو توانای دڵەوە سور بووم لەسەر نییەتەکەم، ئەویش دەست بەکار بوونم بوو بۆ کوشتنی حەسەن سانی هەورامی. کاتێک گوێم لە بانگی بەیانی بوو بۆجێبەجێ کردنی ئەرک و خوێندنی نوێژ وەپەنابردن بۆ

بەر دەرگای خواوەند هەستام، دوای نوێژو داوای سەرکەوتن لە یەزدانی غالب و کارساز، ناردم بەدوای فەراش باشی زەین العابدین خاندا بەبێ ئەوەی کەس لە هاوڕێکانم بزانن. کەهات فەرمانم پێکرد خۆی و دە نەفەر لە پاسەوانەکانی هەڵبژاردەو وریاو چالاک، لەقاوەخانەی (ژووری فەقێکان) مزگەوتەکەدا ئامادەبن، بە بێترس و مەردانە بۆ ئەنجام دانی ئەو ئەرکە دژوارە. پێم ووت لەگەڵ هاتنی حەسەن سان و براکانی بۆ ناو قاوەخانەکە دەست بەجێ سان ئەکوژن و براکانی قۆڵ بەس دەکەن.

لەبەر ئەوە لەنیاز گرتنەوەکەدا ئەو ئایەتە موبارەکە هاتبوو وەگومانیشم لە ئازایەتی و دلێری پاسەوانەکان و فەراش باشی نەبوو، ناردم بەدوای عەلی ئەکبەر خان و موعتەمدو دیوان بەگیدا، هاتنەلام و ماوەیەک لەگەڵیان دا قسەم کرد و لەگەڵ دەرکەوتنی تیشکی خۆر بەبێ دڵەڕاوکە ناردم حەسەن سان و براکانی بێن بۆمزگەوت بۆ وەرگرتنی (خلعت) دیاری جلوبەرگی شاهانە، دواتر بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان. سان و براکانی هاتن و برێک مجامەلەو لوتف و مهرەبانیم نواند بەرامبەریان، بەڵێنی ئمتیاز و پلەو پایەو کاروبارم دانێ، دوای ئەوە پێم ووتن لەبەر ئەوە مەریوان ئاواییەکانی گەورەو فراوان نین مانەوەی ئێوە بەم قەرەباڵغیەو بەم هێزە زۆرەوە دەبێتە مایەی زیان لێکەوتنی ئاواییەکان و ئەرک لەسەر خەڵک و ڕەعیەت، دیاریەکانتان لەقاوەخانەی مزگەوت دا ئامادەیە برۆن لەبەری بکەن و برۆن خواتان لەگەڵ، بچن بەدەم کاروبارتانەوە.

هەرسێ برا خۆیان کرد بە قاوەخانەکەدا، دوای چوونی ئەوان بۆناو قاوەخانەکە، بەهێواشی بەعەلی ئەکبەرخان و ئەوانیترم ووت ئەگەر ئێستا فەرمانی گرتن و قۆڵبەس کردنی ئەم چەتانە بدەم چی روئەدا؟ بەبزرکاوی و بەپاڕانەوە پێیان ووتم ئێستا کاتی ئەوە نییەو ئێمە ئامادەیی تەواومان نییەو هەزار تفەنگ چی هەورامی شەڕکەر دەست لەسەر ماشەی تفەنگ لەدەرەوە وەستاون. منیش زەردەیەکم کردو ووتم ئەگەر خوا بیەوێت ئەوەندە ئەهمیەتی نییە. هێشتا ئەوان وەڵامیان نەدابوومەوە لەناو قاوەخانەکەدا هات و هاوار بەرپابوو، بەپەلە فەراش باشی خۆی کرد بەمزگەوتەکەدا و مژدەی دا ئەوە سانمان کوشت و براکانیشی قۆڵبەس کران، منیش خاتر ئاسودە و بەسوپاسی یەزدانی تاک و تەنیا زوبان پاراو بووم، عەلی ئەکبەر خان پیاوانە

شمشێری لەکێلان دەرکردو چوەدەرەوە لەبەردەرگاکەی مندا وەستا، ووتم پەتێک ببەستن لەقاچی حەسەن سان و رایکێشنە دەرەوە، کاتێک لاشەی پیسی ئەویان فرێدایە بەردەمی تفەنگ چیەکانی، ئەو هەموو تفەنگ چیە شەرکەرە بەبینینی لەشی بێگیانی سان ئەو ناوەیان چۆل کردو کەس لەودەورو بەرەدا نەما هەموو رایان کرد و ئێمەش دوبرا ستەمکارەکەیمان زەنجیر کرد و لەگەل خۆم هێنامنەوە)) . ئەمەی ناو کەوانەکان قسەکانی شازادەیە هەرچەندە جێگەی باوەڕ نییە بە کوشتنی حەسەن سان ١٠٠٠ تفەنگچی هەورامی لەچاو تروکانێکدا هەلهاتبن و دیار نەمابن- حەمەی حەمەسەعید .

میرزا شوکرولا درێژەی دەداتێ و ئەنوسێت، دوای ئەوە ئەم شازادە قارەمانە بەم بەرنامە حەسەن سانی کوشت و براکانی گرت و هێنانییەوە بۆ ناوەندی ویلایەت ریشەی سەرهەلدان و چەتەگەری و یاغی بوونی کۆتایی پێهێنا. ئەنجام دان و سەرکەوتنی شازادە لە ئەرکی واسەخت و دژواردا بووە جێگەی سەرسوڕمانی خەلکی و دروست بوونی نەزم و نیزام و گوێرایەلی هەموو سنوورەکان. هەروەها بووە هۆی بەهێزی و بەتوانایی معتمد دەولە. بەو بۆنەوە ئەم بەیتانە هۆنراوەتەوە:

| | |
|---|---|
| بسال فرد پس از الف در نهار خميس | بەبيلک اندر مقتـول شـد حسـن سلتان |
| دو گرگ همراه او از بـرادرانش بوود | بغـل و كـنـد مقـيد سـوار بـر پالان |
| بفـال آيـه خنهـا بـقـوه آمـد | عيان شـود از اسر آيه معـجـز قـرآن |
| نبوود كار چنين سهل نزد اهل خـرد | خداى خواست كاين كار سخت شد آسان |

دوای سالێک هەورامییەکان هەول و کۆششی زۆریان کرد بەڕێگەی جۆراوجۆر بۆ بەردانی بارام بەگ و مستەفا بەگ، بەلام ئەنجامی نەبوو، بەلێنی دانانی بارمتەو گوێ رایەلی خزمەت کردن و ئیتاعەت کردن هیچی نەبەخشی.

هەورامییەکان دوای ئەوە دلنیابوون کە ئەو دوو زیندانکراوەیان پێ ئازاد ناکرێ، ئیتر کەوتنە هەول و بیر کردنەوە و دانانی بەرنامەی تر، تازە دەستیان لەوان شۆرد.

یەکێک لە هەوڵەکانیان ئەوەبوو محەمەد باقرخان پیاوی جێگە باوەڕی شـــازادە کە کردبـــووی بە حـــاکمی مەریـــوان و سەرپەرشـــتیاری نـــۆژەن کردنەوەی قەڵای شائاباد پیاوێکی گەورە و دانشمەندیش بوو، بیگرن و بیبەنە هەورامان لەوێ دەست بەسەر و حەپس بێت، تاشازادە بارام بەگ و مستەفا بەگ ئازاد نەکاو نەیانێرێتەوە بۆ هەورامان ئەمانیش باقرخان ئازاد نەکەن، ئەگەر شازادە ئەمەی نەکرد محەمەد باقرخان لە تۆڵەی حەسەن سان و ئەو دوو بەگزادەدا بکوژن، لەنێوان خۆیان دا کوڕانی بەگزادەکان و خزمەکانیان لەسەر ئەم بەرنامە رێککەوتن . نوسەر درێژەی دەداتێ و دەڵێت بەهۆی خەفیە (جاسوس)ەوە باقرخان ئاگادار کرا لەبەرنامەی هەورامییەکان، ئەوەبوو کەوتەوە خۆی و شازادە فەرهاد میرزایشی لەبەرنامەکە ئاگادار کردەوە.

شازادە (معتمد الدولە) ئەم هەواڵەی لای خۆی هێشتەوەو کەسی لێ ئاگادار نەکردەوە، لەوپەڕی غرورو لەتاو بڕوا بەخۆبوونەوە بێ پێشەکی و هیچ قسەو باسێک، عەلی ئەکبەر خان(شرەفە الملک) و میرزا غەفار معتمدو میرزا رەزا – عەلی دیوان بەگی و جەماعەتێکی سنەیی و کۆمەڵێک سەربازی سەر بەفەوجی کوردستانی بەنییەتی سەردانی قەڵای شائابادی مەریوان لە ڕۆژی هەینـی ٢٣ی محەرەمـی سـاڵی ١٢٨٦ کەوتە ڕێ. ڕۆژی٢٧ی مانـگ گەیشتە نزیک ئاوایی ئەنجمنە، لەو دەشتایەدا کەپێی ئەوترێت شێخ سلێمان لای داو خەیمەیان بۆ هەڵداو مایەوە بۆ پشوودان، بەهۆی ئەوکەسانەوە کەلەگەڵ عەلـی ئەکـبەر خـان و میـرزا رەزادا بـوون و خزمایەتیـان لەگەڵ هەورامییەکاندا هەبوو، هەورامییەکانیان لە هاتنی شازادە بەو هێزەکەمەوە ئاگادار کردەوە (بەقسەی نوسەر فەرهاد میرزا بەهێزی کەمەوە هاتووە، ئەمە بـۆمن جـێگەی بـڕوا نیـیە، چـوونکە نوســەر لایەنگـری لە شـازادە ئەکـاو هەورامییەکان بەیاخی و شەڕەنگێز ناو ئەبات – حەمەی حەمەسەعید).

ئەوانیش واتە هەورامییەکان کەوتنەخۆ و هێزێکیان کۆکردەوە نزیکەی دوو هەزار تفەنگچی چالاک و شەڕکەر بەرنامەیان دانا شەو هێرش بکەنە سـەر شازادە و هێزەکەی. ( ئەمەش زیادە پێوەنـانە بۆ شـاردنەوەی شکستەکەی شازادە لەو هێرشەداو هەڵهاتن و گەڕانەوەی بۆ سـنە، چوونکە هەرکەس شارەزای هەڵکەوتەی جوگرافیایی هەورامانی شامیان بێت ئەزانێ لە شـەو ڕۆژێکدا دوو هەزار تفەنگچی کۆناکرێتەوە- حەمەی حەمەسەعید ).

عەلی ئەکبەر خان و میرزا ڕەزا لە نێوان شک و گومـان و ڕاسـتیدا ئەچنە لای شازادەو ئاگاداری دەکەن لەوەی کە بەبڕوای ئەوان هەورامییەکان لە هاتنی شازادە بە هێزی کەمەوە ئاگادار کراون، وەلەوانەیە ئەمشەو هێرش بکەنە سەریان. بە کورتی ئەم دوو کەسە سەردانی هەموو بەرپرسەکانی ئەو هێزە دەکەن و دەڵێن ئەبێ زۆر وریابن و ئەگەر شتێکی واڕوویدا چارەسەری بکەین و عەلی ئەکبەرخان دواجار ئەڵێت من هەورامییەکان بناسم بەهۆی ئەو بارودۆخەوە بەسەریان دا هاتووە بێباکانە ئەمشەو ئەو هێرشە دەکەن.

کێشەکە لەوەدایە زیان بەدەستگای شازادە بگات، ئەوکات پێمـان دەڵێن شازادەیان برد و لەژێرەوە لەگەڵ هەورامییەکان ڕێکەوتن و بە کوشتیان دا، ئەوکات لای شازادەی تاج دار (نەسرەدین شا) و پیاوانی دەوڵەت ئێمە تاوان بارئەبین .

شازادەش(فەرهاد میرزا) بەهۆی ئەو لەخۆبایی بوونەی لە دوای کوشتنی حەسەن سان و ئەو غرورەی کە هەیبوو ئەم بۆ چوونەی ئێمەی بە ئەفسانە ئەزانی. دواجار ئەڵێت: چووینە لای شازادە و بەشێوەیەکی جوان بۆمان بەیان کرد ئەم هەواڵە گەیشتووە هەرچەندە دوورە هەورامییەکان بووێری ئەوەیان هەبێ جورئەتی ئەم جەسارەتە بکەن، بەڵام نـابێ ووتەی گەورە بەرپرسـان لەیاد بکەین کە ووتویانە : نابێ دوژمن بەبێ تواناو بەسوکی سەیربکەیت.

با لێرەدا نەسەنگەر و نەپەناگەیی هەیە بگوازینەوە بچینە سەر گردێکی نزیکی ئاوایی سەوڵاوا، ئەگەر هەورامییەکان هەنگاوێکی وەحشیانەشیان نـا سـەرکەوتوو نـابن و بە سـزای نییەت و ڕەفتاریـان ئەگەن. ئەگەر هیچیش ڕوینەدا ئەوە ئێمە زەرەرمان نەکردووە و سبەینێ مەنزڵێک زیاتر چووینەتە پێش.

ئەڵـێ شــازادە ئەمەی بە مەحـاڵ ئەزانــی و برێـک پێکەنــی و بەگـاڵتە پێکردنەوە پێی ووتم خان تۆم زۆر بە ئازاو بەورە ئەزانی چییە بەم شـێوە ترساوی؟ ئەڵـی پێم ووت قوربـان خـودا بزانـێ مـن لەگیـانی خـۆم ناترسـم، مشەوەشی و ترسی مـن ئەوەیە خـودا نەکەردە زیانێک بە سوپای شـازادە بگات و ببێتە هۆی بەدناوی من. دووبارە زەردە خەنەیەکی کرد و قسەکانی منی قبووڵ نەکرد. ئەوەبوو لای شازادە دەرچووین و هەریەک گەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان. برادەرەکانی خۆمان کۆکردەوە و پێمان ووتن نابێ ولاخەکان

زین و کورتان لێبکەنەوە، هەمووتان ئامادە و ناخەون و تفەنگ و فیشەکدان ناکەنەوە، خۆم راکشام و بڕێک لەشەو تێپەڕی و چەکوچۆڵەی خۆم پۆشی، دەنگی بانگی بانگدەری ئوردو بەرزبووەوە، شازادە داوای کردبووم، چووم بۆلای دیارە ئەمیش بێخەم خەوی نەکردووە، گەیشتمە لای فەرمووی الحمدالله ئەوە ڕۆژ بووەوە و ئاسەواری هەواڵی(اراجیف) ترسنۆکانەیی سنەییەکان دەرنەکەوت من وەلامم نەدابووەوە دەنگی تەقەی تفەنگ بەرزبووەوە، وەک تەرزە بارینی گوللە بەسەر ئوردودا دەستی پێکرد. خەڵکی ناو ئوردو بەسەر لێشێواوی بەیەکدا دەهاتن و دەچوون، شازادە فەرمانی دا سەربازو سوارە بەرگری بکەن. منیش پێم ووت ئێمە لە دەشت و دوژمن لە سەنگەردا چۆن بەم هێزەکەمەوە چارەسەری هێزێکی هەزار کەسی هەورامی ئەکرێت چاکتر وایە سواربین و بڕۆین لەم بەلا دەرچین خۆمان رزگار کەین .

ئەبینم راکردنی پێ دژوار و نەنگە، لەوکاتەدا بەهەزاران گوللە ئەبارین بەسەر خەیمەکەدا ( ئەمەش زیادە پێوەنانە- حەمەی حەمەسەعید) ، بەرێکەوت لەپێش چاویدا گوللەیە بەرقاچی من کەوت و بریندار بووم، شازادە بەشڵەژاویەوە پرسی بەرکەووتی، پێم ووت بەڵی، بینیم هێشتا نییەتی نییە بەڕێ بکەوین ، منیش پێم ووت دەرکردنی گیانە، ئیتر ئاغا و نۆکەری لە بەیندا نییە فەرموو و سواربە بابڕۆین، بە ئەمیر ئاخوڕم ووت ئەسپی هێناو بیەوێ و نەیەوێ قۆڵی شازادەم گرتوو سواری ئەسپەکەم کرد. خۆشم بەپێی خوێناویەوە سوار بووم، معتمد و ئەوانی تر هاتن بەسواری و بەغاردان بەرە دواوە بۆ شار گەڕاینەوە، شازادە بەدەم رێگاوە ئەم شعرە عەرەبیەی چەندین جار ئەوتەوە:

فلیس الفرار الیوم عارا علی الفتی اذا عرفت منه الشجاعه بالامس

دوای بڕینی ماوەیەک رێگا ئیتر هەستمان کرد ئافاتێک بەدوامانەوەنییە ئارام بووینەوە، شازادە هەواڵی برینی قاچەکەمی پرسی، منیش خۆم تائەوکاتە باش برینەکەم نەدیبوو، لە جێگەیەکدا دابەزیم و برینەکەم تەماشا کرد بەر ئێسقان نەکەوتبوو، بە پشتوێنەکەی پشتی خۆم توند برینەکەم بەستو سوار بوومەوە، بەخێرای هاتین لەماوەی شەو ڕۆژێکدا گەیشتینەوە ناو شار سنە. تائیرە گێڕانەوەی عەلی ئەکبەر خان بوو.

دووباره میرزا شوکرولا درێژەی دەداتێ و لەوبارەو دەڵێت: دوای بەجێ هێشتنی شازادە وهاوڕێکانی ئەوانەی لە مەیدانی شەڕەکەدا مابوونەوە سەربازەکان ماوەی یەک سەعات بەرگریان کردبوو سەرئەنجام عەباس میرزا سوڵتان و محەمەدبەگی نایب لەگەڵ چەندین سەربازی سەربەفەوجی زەفەر کوژرابوون و هەورامییەکان دەستیان بەسەر سەربازگەکەدا گرتبوو، دوای ئەوە دەست بە کوشتار و تالان دەکەن چل سەربازی پاسەوانی تایبەتی شازادە ئەکوژن، لەگەڵ ژمارەیەک خەڵکی سنەدا، لەگەڵ بەتالان بردنی هەموو چەکوچۆڵە و کەرەستەکانی ئوردوی سەربازیەکەدا.

لەوکاتەدا یەک نەفەری قاپوچی شازادە لەترسی دەرکردنی گیاندا دەچێتە ناو خەیمەکەی شازادە و لەناو سندوقی جلوبەرگی شازادەدا دەستێک جلی شاهانە دەرئەهێنێ و دەکاتەبەری، لە دڵی خۆیدا کەس زاتی نییە مامی پادشای ئێران بکوژێت، لەسەر کورسیەک لەناو خەیمەکەدا دائەنیشێ، کاتێک کۆمەڵێک تفەنگچی هەورامی ئەگەنە ناو ئەو خەیمە قاپوچی پێیان دەڵێت بۆشەڕم ناکەن ئێوە نازانن من مامی پادشام؟ هەورامییەکانی قین لەدڵ بەبیستنی ئەو فەرمایشتەی قاپوچی هێرش دەکەنە سەری و بەخەنجەر پارچە پارچەی دەکەن. ڕۆستەم بەگی کوڕی حەسەن سان لەو کاتەدا لەگەڵ دەستەیەکدا بەدوای شازادەدا ئەگەڕێن سوێندی خواردووە تا شازادە نەکوژێت ناگەڕێتە دواوە، ئەوانەی قاپوچیان کوشتوەو بەشازادەیان زانیوە، بەپەلە یەکێک لە تفەنگ چیەکان ئەنێرن بۆلای ڕۆستەم بەگ، مژدەی کوشتنی شازادەی دەدەنێ و دەڵێت شازادە لە خەیمەکەی خۆیدا خۆی شاردبووەوە پارچە پارچەمان کردوە.

ڕۆستەم بەگیش خوڕەم و دڵخۆش ئەگەڕێتەوە بۆلای ئوردو، دوای ماوەیەک هەواڵی گەیشتنەوەی شازادەیان بۆ ناوشاری سنە پێ ئەگات، ئەوکات ئەزانن ئەوە کە کوژراوە قاپوچی شازادە بووە نەک شازادە خۆی.

میرزا شوکرولا لەلاپەڕە۲۹۱-۲۹۲ی کتێبەکەیدا تحفەی ناسری درێژە بەباسەکە دەدات، بەڵام هەورامییەکان و لەشکرەکەیان بە چەتەو شەڕفرۆش و ئاژاوەچی و تالان چی ناو ئەبات و فەرهاد میرزاو جاش و بەکرێ گیراوەکانی وەک شەرەفە مەلیک ودام و دەستگای قاجاریە بە پیاوانی

دەوڵەت  و دابینکەری ئەمن و ئاسایش و دامەزرێنەری وڵات، بەم شێوەی خوارەوە:

شازادە (معتمدالدولە) بەگەیشتنەوەی بۆ ناوشاری سنە وەک ماری بریندار پێچی ئەخوارد، لەتاو شکان و هەڵهاتنی دا لەشەڕی چەتەو ڕێگرانی هەورامی ئەشراردا، لەتاو ئابرو چوون و ڕاکردن و بەجێهێشتنی سوپاکەیدا ئەم دنیا بەرین و فراوانەی وەک دڵی حەسود لێ تەنگ بووبووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا شەرحی روداو بەسەر هاتەکەی  بێ درۆ و بێ کەموکورتی وەک خۆی  ڕاستگۆیانە نووسی بۆ  تاران  و نەسرەدین شای مامی لێ ئاگادار کردەوە، ئەویش پیاوێکی بەغیرەت و شایەکی بەهێزبوو، بۆ ئەم هەنگاوە پڕلە جەسارەت و شەڕەنگێزیەی هەورامییەکان، تێک ئەچێ و خۆی ئەخواتەوە، بۆیە بڕیار دەدات بەناردنی هێزو لەشکرکێشی بەرەو سنە،  فەرمان دەردەکات شازادە خۆی سەرپشک و ئازادە  بۆتەمێ کردنی مل هوڕان و لەناوبردن و وێرانکردنی ئەو ناوچەو ئەو هۆزە (هەورامان) خراب کارە.

بەڵێ دوای ئەم روداوە بە ماوەیەکی کەم هێزەکانی دەوڵەتی نەسرەدین شا و هێزێکی گەورەی جاش بەناوی چریکی ناوچەی لەچەندین لاوە هێرش دەکەنە سەر هەرسێ بەشەکەی هەورامانی لهۆن و شامیان و تەخت، لەبارەی ئەم هێرشەوە ( فەخرالکتاب) دەڵێت:

حاجی عەلی قەمبەر خان ناسراو بە (سەعد الدولە) بە دە هەزار تفەنگچی پیادە و یەک هەزار سوارەوە، مستەفا قولیخان (ئعتماد ئەلسەڵتەنە) بە پێنج هەزار سەربازی فەوجی هەمەدانەوە، بیوک خانی سەرتیپ لەگەڵ فەوجی ورمێ و ئەفشارەوە، ئەمانە هەموویان بە سەرپەرشتی حاجی عەلی قەنبەرخان گەیشتنە سنە، بەرلەگەیشتنی ئەمانە حەمە عەلی خانی سەرهەنگ لەگەڵ پێنج هەزار نەفەری فەوجی زەفەر و لەگەڵ  هەزاران چریکی (جاش) مەریوانی و سەقزی و بانەییدا، کە سێ عرادە تۆپ و دە عرادە قنپسیان پێ بوو نێردران بۆ شامیان و بەرانبەر دەربەند کەڵوێ کەسەرەتای ئەو ناوچەیە هێرشەکە ئەکرێتە سەری، سەرهەنگ محەمەد عەلی خان خۆی لەگەڵ ئەو هەموو لەشکرەدا گەیشتە گردی شێخ سلێمان کە ئەکەوێتە ڕووبەرووی دەربەن کەڵەوێ.

لەناوەراستی مانگی سەفەری ساڵی ١٢٨٦دا حاجی قەنبەر عەلی خان و سەران و سەردارانی سوپای دەوڵەتی و لەشکر گەیشتنە سنە، شازادە فەرهاد میرزا بەپێی شارەزای و ئەودەستەڵاتە تامەی پێی درابوو، سوپای دەوڵەتی دابەش کرد و کردی بە دوو رەتل. رەتلی یەکەم بۆلای ئەو رەتلەی پێشتر لەگەڵ سەرهەنگ محەمەد عەلی خاندا چووە بەرەو مەریوان، بۆ سەر هەورامانی تەخت، پێک هاتبوو لە دوو فەوجی پیادە و هەزار سوارە بەسەرپەرشتی حاجی قەنبەر عەلی خان و بە هاوڕێیەتی میرزا رەزا عەلی، ئەمانە کەوتنە رێ بۆلای سەرهەنگ حەمە عەلی خانی.

رەتلی دووەم بەسەرۆکایەتی مستەفا قولیخان و بەهاوڕێیەتی بیوک خانی سەرتیپ و پێک هاتبوو لە دوو فەوجی هەمەدان و ئەفشار، هەروەها گەورە جاشی بەناوبانگ عەلی ئەکبەرخان لەگەڵ تفەنگ چیانی سوارە و پیادەی عەشایری جوانرۆ و باشوکی و کەشکی و ......تاد ئەمانەش لە هەمان بەرووارەوە لەرێگای کرماشانەوە بەرەو هەورامانی لهۆن کەوتنە رێ بۆسەر نەوسوود بۆسەر حەمەسەعید سان.

کاتێک حاجی قەنبەر عەلی خان گەیشتبووە لای محەمەد عەلی خان و لەسەر گردی شێخ سلێمان جێگیر بووبوون ، سەرگەرمی دانانی بەرنامە بوون بۆ سەر دزلی و ئاواییەکانی دەرەکیە و دەمەیە و لەناکاو لە غەرەی رەبیع سانی دا شەڕ بەرپا بوو، ئەمە بەهۆی پەلاماردانی لەناکاوی هەورامییەکانی شەڕەنگێزەوە بۆسەر سوپای دەوڵەتیڕوویدا، شەڕێکی سەخت و دژوار لەم پەلامارەدا شەڕەنگێزانی هەورامی زیانێکی گەورەیان بە سوپای دەوڵەتی گەیاند، توانیان چەندین بەرپرس و پیاوی ئازاو ناوداری دەوڵەت بکوژن، لەوانە هەڵۆخانی بەنی ئەردەڵان سوڵتانی فەوجی زەفەر و دوو جێگر و یاوەری فەوجی پێنج و دەیان سەربازی تر. ئەمە بوو بەهۆی سەرکەوتن و ورەبەرزی هەورامییەکان و ترس و لەرزی خستە دڵی سوپا و سەرانییەوە. بۆیە عەلی خان فەرمانی دا بە تۆپ خانە تۆپ بارانی پەلامارەدەران و ناوچەکە بکەن، بەهۆی تۆپ بارانەوە چەندین پەلاماردەری هەورامی کوژران و ئەوانی تریان شڵەژاو پەرێشان بوون. بەڵام ئەمە نەبوو بەهۆی سەرکەوتنی سوپاو ورە بەرزبوونەوەی.

هێزەکەی دەوڵەت کە بەرەو نەوسوود کەوتبوورەوڕێ (شەرەفە مەلک) و هێزەکانی پێشڕەویان بوون تا گەیشتنە کەناری رووباری سیروان لەدوو ئـاو، بەر لەگەیشـتنیان بـۆ دوو ئـاو حەمەسـەعید سـان بەسەرپەرشـتی عەبدولڕەحمان بەگی کوڕی پێنج سەد تفەنگ چی هەورامی ناردبوو بەرامبەر بەراگـوزەری ئـاوەکەدا سـەنگەریان گرتبـوو، بەشـێوەیەک نەهـێڵن کەس لەسیروان بپەڕێتەوە، سوپای دەوڵەت بەراییان گەیشتە نزیک ئاوی سیروان و ئاگـادار بـوون لەبەرامبەریانـدا لەشـکری هـۆزی شـەرەنگێز(هەورامان) دامەزراون بۆیان، توشی ترس و دڵەڕاوکێ بوون بەتایبەت کەزانیان ناتوانن لەبەری لای خۆیانەوە بەمەسافەی پێنج سـەد مەتر نزیکی ئاوەکە ببنەوە، لەشکر لەبەرتینویەتی و ترس بێتاقەت و پەرێشانی هەموویانی داگرتبوو. لەو بارەوە عەلی ئەکبەر خان - شەرەف ملک ووتی: لەتاو تینویەتی و بێئاویدا بەچۆکدا هاتین، بۆیە (ئعتماد ئەلسەڵتەنە) و سەرتیپ بیوک خـان بەزمـانی زبرو تـوڕەییەوە بەرەو ڕووی مـن بـوونەوە ئەیـان ووت ئەمە چ ڕێگەیەکە ئێمەت لێرەوە هێناوە، ئێمەت لێرەوە بەئەنقەست هێناوە بۆئەوەی سوپا لەبەر تینویەتی بەهیلاک بچێت و لەدڵەوە لەگەڵ هەورامییەکانی.

منیش سوێندی گەورە گەورەم دەخوارد و دەم ووت ئێوە شارەزا نین ڕێگەی هەورامانی لهۆن تەنیا ئەم ڕێگەیە ڕێگای تری نییە، منیش ئەوەندەی ئێوە هێز و تفەنگچیم لەگەڵدایە، ترسـم لەئێوە زیاترە، بەگوێیانـدا نەدەچوو لەتاو تینویەتیدا زمانیان ئەیگرت، من بەردەوام دڵنەواییم دەکردن، ئەمـووت سەبرتان هەبێ ئەمە کاتی گیان بازیە نەک قسە فڕێدان.

ئەمووت بەئاسانی ئەم قەڵا سەختە ناگیرێت، زەحمەت و تینویەتی و برسێتی و ماندوبوونی ئەوێت، ئاسودەبن ئەگەر خۆم و هەمـوو هێزەکەمم بەکوشت داوە ناهێڵم ئەمشەو ئەم سوپاو لەشکرە بێئاو و لەدڵەڕاوکەدا بێت. زوو سەیفوربەگی نائب و مەلا ئەوڕەحمانی خاڵۆزام و ئەمین بەگی وەکیـل جوانڕۆم بانگ کردن و پێم ووتن هەرچۆن بووە بەڵکو لەنزیکی ئەم لەشکرەدا کانیاوێک بدۆزنەوە، ئەوانیش پێنج سـەد تفەنـگ چیـان لەگەڵ خۆیـان بردو کەوتنە سەروخوار گەڕان بەرێکەوت کانییەکیان دۆزیەوە، هەرچەندە لەتفەنگ هاوێژی هەورامییەکانەوە دوور بوو بەڵام هەستان بەرێگری کردن و برێک گوللەیـان هاویشـت، بەڵام لەشـکر نەگەڕانەوە و گەیشـتنە سـەر کـانییەکە و

لەدەوروبەریدا سەنگەر بەندیان کرد. کاتێک هەواڵیان دامێ منیش سەرانی سوپام ئاگادار کرد و پێکەوە چووینە سەر کانییەکە و کۆمەڵ کۆمەڵ لەشکر ئاویان خواردەوە و ئاویان برد و گەیاندە هەموو لایەک.

(ئیعتیماد ئەلسەڵتەنە) و بیوک خان ئەو شەوە فەرمانیان دەرکرد بۆ فەوجەکانیان بەشێوەی مار پێچ خۆیان بگەیێنە قەراغ ئاوی سیروان، ڕۆیشتن و بەیانی زوو هەموو لەشکر سەرگەرمی بەستنی سەنگەرو خۆ قایم کردن بوون، لەشکری عەشایری جوانڕۆ و جاف زۆربەیان مەڵەوانیان ئەزانی لە شوێنێکی ئەمینەوە پەڕینەوە و لەوبەر ئاو سەنگەر بەندیان دەست پێکرد. لەشکری هەمەدان و ئەفشاریش زۆریان مەلەوان بوون و لەگوزەرگاو بگارێکی ترەوە خۆیان و ئەسپ و ئەسبابی لەشکریان پەڕاندەوە بەهاوکاری تفەنگچیانی جوانڕۆ بە زەحمەتێکی زۆر تۆپخانەو قنپەسەکانیان بردە ئەوبەری ئاو، دوای ئەوە پارێزەرانی گوزەرگەی ئاوەکەیان بەتۆپ خانەو نارنجۆک باران و گوللە باران کردن و پەرش و بڵاو بوونەوەو ڕێگاکە کرایەوە. بەکر بەگ بەرپرسی ئەو لەشکرەی هەورامییەکان بوو پیاوێکی ئازاو شەڕکەر و بەناوبانگ بوو، گوللەتۆپێکی بەرکەوتبوو، دوای کوژرانی ئەو بەرگری لەبەرامبەر سوپای دەوڵەت دا لەسەر ئاوی سیروان نەما.

لەدوای ئەم سەرکەوتن و کردنەوەی ڕێگایەدا، لە ڕێگەیەکی سەخت و پڕ لە درەختەوە تێپەڕ بووین و گەیشتینە نزیک سنووری نەوسوود و لەوێ سەنگەر بەندیمان بەشێوەیەکی قایم کرد و شوێنی مانەوەمان دیاری کرد، ئەو شەوەمان بەئاسودەیی بە ڕۆژ گەیاند، ڕۆژی دوای حەمەسەعید سان زانی مەیدانی شەڕ لەبەردەمیدا بەرتەسک بووەتەوە، داوای هێزی کردبوو لە بەگزادەکانی هەورامانی تەخت، هێزێکیان گەیشت و تفەنگچیانی هەردوو هەورامان لەبەیانییەوە تا ئێوارە بەرەنگاریان کرد و مەردانە بەریان بە لەشکری بەهێز و بێشوماری پڕچەک و چۆڵەی دەوڵەت گرت، بەڵام نەهاتنە پێش، لەچەندین پەلاماردا سەرکەوتن بۆ سوپای دەوڵەت بوو. لەگەڵ ئەمەشدا گرتنی نەوسوود بەبێ خەڵکی شارەزا مەحاڵ بوو، لەم بارەوە عەلی ئەکبەر خان درێژەی دەداتێ و دەڵێت: بۆ ئەو مەبەستە بیرم لەوە کردەوە چەند کەسێک لە بەگزادەکانی لهۆن بەپێدانی دەست کەوت و دیاری و ئمتیاز بەڵێن لێوەرگرم تابەهۆی شارەزاییانەوە هاوکاری سوپای دەوڵەت بکەن، لەوانە

وەک محەمەد بەگی خاتو خانمێ و کۆمەڵێکی تر کەخزمایەتی و دۆستایەتیان لەگەڵ مەحمود بەگی داریانیدا هەبوو. بەهۆی مەحمود بەگەوە بەڵێنەکانم دانێ و ئەوانیش ئامادەدەی خزمەت کاری بوون، بەهۆی شارەزاییانەوە لەناوچەکەدا کۆمەڵێک تفەنگچی جوانڕۆییان برد و لەڕێگایەکی سەخت و لاپێوە چوونە جێگەیەکی بێشک و لەشوێنی پێویستدا سەنگەریان بەست. دوای ئەوە منیان ئاگادرکردەوە لەگەیشتن و سەنگەربەندیان، منیش مژدەم دا بەسەرانی سوپاو لەشکر، بەپەلە هێزمان بەرێکردو بە ناڕەحەتیەکی زۆر هەموومان لەهەمان ڕێگاوە ڕۆیشتین و زاڵبووین بەسەر نەوسووددا، کاتێک هەورامییەکان بەم هەنگاوەیان زانی، ئێمە خۆمان قایم و سەنگەرمان گرتبوو، هەنگاوێکی وا بە خەیاڵی هیچ هەورامییەکدا نەهاتبوو، بە بینینی ئەم بارودۆخە قەلەقی و سەرسوڕمان گرتنی.

بەڵێ حەمەسەعید سان زانی ڕێگای دەربازبوونیان نەماوە، دەستیان کرد بەشەڕێکی مان و نەمان و پەلاماردانی خوێناوی، کوڕە ئازاکانی خۆی و هەموو هێزەکەی مەردانە هاتنە مەیدان و شەڕێکی سەرشێتانە و مەردانەیان دەست پێکرد، بەڵام هیچیان پێنەکرا، هێزی بێشومار و چەکوچۆڵە و تۆپخانەی سوپای دەوڵەتی قاجار لەکوێ و هێزی عەشایری هەورامی بەچەکوچۆڵەی وەرەندڵ و ساچمە و جانبێزارو ژێرساف و ماوزەڕ.....تاد لەکوێ. ئەو ڕۆژە بەبێ ئومێدی گەڕانەدواوە، ڕۆژی دواتر لەشکری هەردوو هەورامان هاوکات هێرشی مەردانەیان دەست پێکردەوە بۆسەر سوپای مەنسور، لەم هێرش و بگرەوبەردەیەدا ژمارەیەکی زۆر لە هەردوولا کوژران و بریندارێش بەسەدان کەس بوون. ئەم شەڕەی ئەمڕۆ لەبەیان زووەوە تائێوارەیەکی درەنگ بەردەوام بوو. من هەوڵم دا ئێمە پەلامارو هێرش دەست پێبکەین دوای تۆپبارانی قورسی سەنگەر و ناو قەڵای نەوسوود و تەختی حەمەسەعید سان خۆی و نشینگەی، بە تۆپی خارا کوب و قنبەس و نارنجۆک کەوەک تەرزە بەسەریاندا دەباری، من (عەلی ئەکبەرخان) بوومە پێشرەوی هێرش و پەلامارمان لە هەمولاوە بۆسەر شەڕەنگێزانی هەورامی دەست پێکرد، شەڕ لەبەیانییەوە تانیوەڕۆ بەردەوام بوو بارینی گوللەو نارنجۆک و تۆپ و قنبەس بەوێنەی بارینی تەرزە بوو ئەمە هێزی دوژمنی پەرێشان و توشی دڵەڕاوکە کرد. تا بەهۆی مەرحەمەتی ئیلاهی و (یمن اقبال)

شاهەن شاهیەوە نەسیمی سەرکەوتن ئاڵای لەشکری دەوڵەتی شەکاندەوە و شەڕەنگێزانی هەورامی و هۆزی بەدکاریان شکان و ناچار بوون هەورامان و قەڵای ستەمکاریان نەوسوود چۆڵ بکەن و پەنابەرن بۆ خاکی شارەزوور. ئەوەبوو دەنگی شەیپوری شەیپور چیانی سوپا بۆشادی و خۆشی ئەم سەرکەوتنە لەهەموولایەکەوە بەرز بووەوە، بەرپرسانی سوپاو چەکدارانی دەوڵەتیش بەربوونە تالانی سەروماڵی خەڵکەکە.

تائێرە گێرانەوەو قسەکانی شرف الملک(عەلی ئەکبەر خانە).

میرزا شوکرولا لەدرێژەی نوسینەکانیدا دەڵێت: بەم شێوە دژوار و پڕزەحمەت و ناخۆشە هەورامانی لهۆن گیراو کەوتە دەست سوپاو دەوڵەتی قاجاریە. دوای ئەوە شازادە ئاگادار کرایەوە لەم سەرکەوتنە گەورە، لەوەڵامی ئەو مژدانەیەدا وەڵامی عەلی ئەکبەرخانی بەم شعرە داوەتەوە.

عالم ناسوت تو لاهوت باد　　　　افرین بر دست و بر بازوت باد

بەکورتی تا دوای گرتن و وێرانکردنی لهۆن لەلایەن ڕەتڵی دووەمی سوپای قاجارەوە، هێشتا بەرپرسانی ڕەتڵی یەکەم (سەعد دەولە)و حەمە عەلیخان بۆگرتنی هەورامانی تەخت لەجێگەی خۆیان نەجوڵاون و بەو هێزە زۆر و بێ شومارەوە هەر خەریکی پاراستنی سەربازگەو بنکەکانی خۆیانن لەسۆڵاوا تا نزیک مەریوان.

لەلهۆنەوە عەلی ئەکبەر خان سەبارەت بەچۆنییەتی هێرش و پەلامارەکانیان بۆسەر ناوچەکەو نەوسوود بەنوسراوێک ئاگاداری حاجی سەعد دەولە دەکات، سەرەتای نوسراوەکەی بەم هۆنراوە دەست پێدەکات:

ما سه تن کردیم کاری خیش را　　　　نوبت از تو شد بجنبان ریش را

دیارە حاجی ریشێکی درێژی هەبووە، حاجی و سەران و بەرپرسانی سوپاو ڕەتڵی یەک هۆنراوەکەو نامەکەی خان کاری تێکردون، بوتە هۆی جوڵەو نواندنی غیرەتیان، بەجۆش و خرۆش هاتون و بڕیاریان داوە ئەوانیش بۆگرتنی هەورامانی تەخت و دزڵی مەردانە بێنە مەیدانی جەنگ، بەتایبەت کەڵکیان لەو بەرنامەی کرینی هەندێک بەگزادە وەرگرتووە کە بەهۆی ئەوانەوە هێزیان ناردوەتە پشتی بەرەکانی شەڕەوە بەنهێنی ئەمەش کاریگەری باشی هەبووە لەسەر یەکلا کردنەوەی شەڕەکە بۆ بەرژەوەندی سوپای دەوڵەت و سەرکەوتنی.

سەرانی رەتلی یەک گەڕاون ئەو کەسانەیان دۆزیوەتەوە لە سنووری هەورامانی لهۆندا دوژمن و نەیاری حەسەن سان بوون، دڵنەوایان کردون و بەڵێنی دەستکەوت و پلەو ئمتیازیان پێداون، ئەوەبوو بەر لەهێرش کردن بەشەو بەنهێنی لەڕێگای سەخت و لاپێوە هێزیان بردوە و پشتی هێزی چەکداری عەشائیری هەورامانیان گرتووە[1]، لەوانە لەڕێگای دەربەن کەڵەوێ و لەڕێگای بندۆل و لەچەند ڕێگایەکی ترەوە. ئەمە وایکردوە بەر لەدەست پێکردنی هێرشەکە سوپای دەوڵەت و جاشە کوردەکانی هاوکاریان زاڵ بوون بەسەر شامیان و دزلی و دەرەکیەو هەموو ئاوابیەکانی بەرەی پێشەوەی شەڕگەکانی هەورامییەکاندا.

سوپا لەپێشەوە پێشڕەوی دەکات، رووبەرووی بەرەنگاری تفەنگ چیانی هەورامی دەبێتەوە، کاتێک ڕۆژ دەبێتەوە لەدوایانەوە هێزی دەوڵەت لێتان دەدات، بەلام شەڕی مان و نەمان دەکەن و خۆیان لە غافلگیری رزگار دەکەن. لەکورترین ماوەدا هێزی هەورامییەکان کۆئەبنەوەو لەشەڕێکی تێکرژان و دەستەویەخەو خوێناویدا سەدان کەس لەهەردوولا ئەکوژرێن.

بەلام کوژرانی سەرکردەکانی سوپای هەورامان بەتایبەت دوو سەرکردەی شەڕکەرو بەناوبانگی هەورامی لەوانە شێخ کولەکەو بارامی میرزا بەگ کاریگەری دەبێت بۆ شکانی هەورامییەکان. شێخ کولەکە هەمیشە لەشەڕو دەرگیریدا پێشرەو بووە، بۆیە نازناوی کولەکەی بەسەردا براوە، ئەوسا لەقاپاخی کولەکەئاوی تەپڵ دروست کراوە، ئەویش ئەوتەپڵەی پێ بووەو لەشەڕەکاندا شەڕکەرانی بەهۆی تەپڵ لێدانەوە هێناوەتە جۆش و خرۆش.

کوژرانی سەران و سەردارانی هەورامی و ئەو خیانەتەی لە لای خۆیانەوە سەری هەڵداوە، لەگەڵ نابەرابەری لە هێزو چەک و تەقەمەنیدا، وایکردوە دوای چەندین ڕۆژ هەورامانی تەختیش شکاوەو لەلایەن رەتلی یەکی سوپای قاجارەوە دەستی بەسەردا گیراوە.

---

[1] - بەڵێ پێشترو دەورانێکی تر هەورامان بەفێڵ و حیلەو بەهۆی خیانەتەوە لەلایەن خان ئەحمەد خانەوە گیراوە ، فەرموون ئەم هۆنراوە لەوبارەوە،

| | |
|---|---|
| نەبەگە مامونە نە تەیموری لەنگ | هیچ کەس هەورامان نەگرتەن بەجەنگ |
| غەیرجەخان ئەحمەد بەگلەر خانان | ئەویچ بە دهۆ(حیلە) گرتەن هۆرامان |

پاشماوەی لەشکری شکاوی هەورامان لەرێگای هەسون و ملەخوردەوە ئاودیوی خاکی شارەزوورو ژێر دەستی عوسمانی بوون، لەسلێمانی لەگەڵ حەمەسەعید سان وپاشماوەی لەشکری شکاوی لهۆن یەکیان گرتەوە. لەدوای شەڕ تالان و سوتانی ئاواییەکانی هەورامان دەست پێ دەکات، خەڵکە دیل کراوەکە ئەگوازنەوە بۆسنە، بەفەرمانی فەرهاد میرزای شازادە بەناونیشانی سەرکەوتن بەزەنجیر کراوی و سەری بڕاوی بارامی میرزابەگ و شێخ کولەکەش دەکەن بەسەری نێزەوەو بەناو بازارو دوکان و کوچەو کۆلانی شاری سنەدا ئەیانگێڕن.
بۆچاودێری ناوچەکەش دەوڵەت سەربازگەیەک لەحەوشی بارانی یان مارانی دەکاتەوەو سالانە چەند فەوجی سەرباز تێیدا خزمەت دەکەن. ئەوسەردەمە لەبەر نەبوونی تەلگراف و چاپار خانە هەواڵ لەسنەوە بۆتاران و وەرگرتنەوەی، وەلام نزیکەی ٢٠بیست رۆژی پێ چوە، فەرهاد میرزا هەواڵی سەرکەوتنیان و داگیر کردنی هەردوو بەشی هەورامان ئەنێرێت بۆ نەسرەدین شای قاجار. دوای ئەوە هەورامانی لهۆن ئەخاتە سەر ئیدارەی جوانرۆ و عەلی ئەکبەر خان دەکاتە حاکمی، هەورامانی تەختیش ئەخاتە سەر بلۆکی مەریوان و میرزا رەزا عەلی (دیوان بەگی) دەکاتە حاکمی. حەمەسەعیدسان و کوڕەکانی و دەورو بەرەکەی لەگەڵ کوڕەکانی حەسەن سان رۆستەم و برزو لەگەڵ سەدان خێزان لەسلێمانی ئەمێننەوە تا ئەوکاتەی بەبەڵێن و لێبوردن ئەگەڕێنەوە بۆ ئێران.
کۆچی هەورامییەکان بۆ سلێمانی و شارەزوورو مانەوەیان بۆماوەی ساڵێک زیاتر و کێشمەکێشی دەوڵەتی قاجاری و عوسمانی لەسەریان دورو درێژە و ئێرە جێگەی نییە. بۆیە بەچۆنییەتی گەڕانەوەی حەمەسەعید سان بەبەڵێن و دواتر کوشتنی خۆی و کوڕەکانی کۆتایی ئەهێنم.
دوای یەک ساڵ مانەوەیان لەئاوارەییدا و داوای قاجاریەکان لە عوسمانییەکان بۆ تەسلیم کردنەوەیان بەئێران، کوڕەکانی حەسەن سان رۆستەم و برزو لەگەڵ مامەکانیان کەوتنە هەوڵی دۆزینەوەی کەسایەتی و پیاوانی قسەڕۆیشتوی لای شازادەکان.
بۆ ئەومەبەستە دەست بەدامێن و پەنایان بۆ زۆر کەس برد، دیاریترین و دڵنیاترین کەس لەوانە ئەحمەد سوڵتان بوو، ئەحمەد سوڵتانیش

پەنای بردە بەرماڵی مامۆستا مەلا ئەحمەدی شێخ ئیسلام، مەلا ئەحمەدیش لای شازادە فەرهاد میرزا داوای بەخشینی بۆکردن، شازادەش بەپێی( احسن العفو عند القدرە) شازادەش داوا و پارانەوەکەی شێخ ئیسلامی قبووڵ کرد و عەفوی کردن.

بڵاوبوونەوەی دەنگوباسی بەخشینی کوڕەکانی حەسەن سان بووە جێگەی دڵخۆش بوون و ئومێدەوار بوونی ئاوارە هەورامییەکان بۆ زێدو نشینگەی باوباپیرانیان، دوای ئەمان حەمەسەعید سانیش بڕیاریدا خاتو فەیروزە خانمی خێزانی بنێرێتەوە بۆلای عەلی ئەکبەر خان حاکمی بلۆکی جوانڕۆ و لهۆن، لەوکاتەدا موسا خانی برای ئیدارەی لهۆنی بەڕێوە ئەبرد، خاتو فەیروزە هاوسەری سان کچی شێخ عەلی عەبابەیلێیە، خاتونێکی شۆخ و شەنگ و لەش ولار جوان و سنگین بووە، لەگەڵ رۆستەمی کوڕیدا ئەوکات رۆستەم منداڵێکی نەوجەوان بووە گەیشتنە جوانڕۆ، خاتون داوای لەعەلی ئەکبەر خان کردو ووتی هاتوم داوات لێبکەم بچیتە خزمەت شازادە فەرهاد میرزا ، بۆبەخشینی سان و گەڕانەوەی هەموو ئاوارەکان و خزم و کەسوکارمان. ئەگەر بیان بەخشن، من ناگەڕێمەوە ئاگاداریان دەکەین هەموویان بگەڕێنەوە بۆئێران. دوای گەیشتنی خان بۆلای شازادە و وتو وێژکردن لەگەڵیا لەوبارەوە شازادە لەڕێگەی خانەوە خاتونی دڵنیاکرد بەم قەرارە (( وا من لەتاوان و هەموو کەموکورتیەکانی سان و دارو دەستەکەی بوورام، بەمەرجێک پادشای جەمجا (نەسرەدین شا) لەمن ببیستێ و داواکاری من قبووڵ بکات، منیش قەد ناهێڵم بەقەد سەرەمویەک زیانی گیانی و ماڵی بەر سان بکەوێت )).

خاتو فەیروزە خانم بەم قسەو بەڵێنە رازی بووەو وەفدێکی ناردوە بەدوای سان و ئاوارەکاندا گەڕاونەتەوەو گەیشتونە شاری سنە، حەمەسەعید سان لەماڵی میرزا عەبدوڵا دەبێت و لەوێ میوانداری ئەکرێت و بەرپرسان و خەڵکەکەی تریش لەناو شاردا جێگەو رێگەیان بۆ ساز ئەکرێت. سان و ماڵ و منداڵی ٣ سێ مانگ لەماڵی میرزادا میوان ئەبن، شازادە(فەرهاد میرزا) بەگەڕانەوەی سانو خۆ بەدەستەوەدانی دڵخۆش بووە، بۆیە حەزی کردووە کێشەکەشیان چارەسەر ببێت، لەو سێ مانگەدا لەگەڵ نەسرەدین شاو وەزیرەکانی پەیوەندیداردا خەریکی گفتوگۆو رازیکردنیان بووە، هەوڵی

زۆریداوە بەڵێنەکەی نەشکێ، بەڵام دواجار رای شاە ئەوەبووە کە ئەبێ سان و کورەکانی لەناو ببرێن، واتە بکوژرێن، بەفەرهاد میرزای وتوە بەلەناو بردن نەبێت شەڕو ئاشوبی هەورامییەکان کۆتایی نایێت.
لەم کاتەدا ئەوانی لە بێلو گیرابوون، بارام بەگی برای حەسەن سان لەزیندان دا مرد، مستەفا بەگی براشیان لەدوای مردنی بارام بەگ لەسەر داوای میرزا رەزا عەلی بەرپرسی بلۆکی مەریوان ئازاد کرا، بەمەرجی ئەوە بنێرن ماڵ و منداڵەکەی بێنە سنەو لەشاردا بمێنەوەو و لێرە ژیان بکەن.
لەراستیدا مستەفا بەگ پەیوەندی بە سیاسەت و شەڕو ئاژاوەکانەوە نەبوو. دوای ٣ سێ مانگەکە شازادە فەرهاد میرزا، عەلی ئەکبەرخان بانگ دەکاتەوە بۆ سنەو نامەو دەست و خەتی نەسرەدین شای پیشان دەدات سەبارەت بەلەناو بردنی سان و کورەکانی. بەراشکاوی پێی دەڵێت نابێ هیچ کەسی تر ئاگاداری ئەم بەرنامە بێت، ئەمە ئەرکێکی گەورەی خزمەتگوزاریە بەوڵات، ئەمە لەتوانا و ئازایەتی کەسی تردا نییە جگە لەتۆ، لەو بارەوە هیچ جۆرە بروبیانو هێنانەوەیەک قبوول نییەو ناکرێت، هەر جۆرە کەمو کورتی و ئاشکرا بوونێک لەم رازەدا دەبێتە هۆی مەترسی بۆ سەر گیانی تۆ.
خانیش رازی بێت یانا لەدڵەوە بووبێ یان نا، بەڵێنی ئەنجام دانی جێبەجێکردنی فەرمانەکە دەدات، دوای قەرارو بریار لای شازادە دێتە دەرەوە. ئینجا خان لەدڵی خۆیدا ئەکەوێتە بیری دۆزینەوەی رێگای لەناو بردن و کوشتنیان. رۆژێک سەردانی حەمەسەعید سان دەکات لەماڵی میرزا عەبدوڵاو دەڵێت بڕیارم داوە داوا لەشازادە بکەم رەزامەند بێت و بریارت بۆدەربکا بگەڕێیتەوە بۆ لهۆن و ئیدارەدانی حکومەتی ئەوێ وەربگریتەوە، بەمەرجێک عەبدولڕەحمانی کورت وەک بارمتە لەجوانڕۆ بمێنێتەوە. سان بەمە رازی دەبێت و دەست دەکەن بە خۆ ئامادەکردن و خۆکۆکردنەوە بۆ جوانڕۆ، خان لای شازادە بۆ دڵنیایی بریارو دیاری بۆ وەر ئەگرێ و دوای هەفتەیەک لەسنەوە ئەکەونە ڕێ بەرەو جوانڕۆ.
سان بەماڵ و منداڵ و کەسوکارو دەور و بەرەکەیەوە، کاروانێکی نزیکەی ٢٠بیست وڵاخی بەرزەن، عەلی ئەکبەرخان دەڵێت: ( لەشار دەرچوین دەرکەوت سان گومانی هەیە، زۆر زیرەک و بیرتیژیش بوو، بۆئەوەی بزانێت

چی لەژێر سەر ئێمەدایە لەرێگادا هەندێک هەنگاوی نا، لەوانە کاتێک لەرێگادا بۆ مانەوەو پشوودان بارمان ئەخست، جاری واهەبوو سان دوو فرسەنگ لەدوای ئێمەوە ئەیخست، جاری واهەبوو فرسەنگێک لەئێمەوە دەچوە پێشتر باروبارخانەی ئەخست.

ئەمە بۆ ئەوە وایدەکرد پەی بەنییەتی دڵی ئێمە ببات، تابزانێ ئاخۆ من چاودێری دەکەم یان نا، گومانمان لەسەری هەیە یان نا، بۆئەوەی هیچ گومانێکی نەبێت، منیش بەتەواوەتی خۆم لێی بێئاگا کرد و لێم نەپرسی، تاخۆی سەردانی نەکردایە من داوای بینینیم نەدەکرد. لەم لێنەپرسینەوە و ئهمالکردنەی من ئەوەندەی تر دڵنیابووەوە، بەگەیشتنیان بۆ جوانڕۆ مۆڵەتم دانێ لەکوێ خۆیان دەیانەوێت لەوێ بمێننەوە، ئیتر بەتەواوەتی دڵنیابوو لەوەی شتێک لەگۆڕێدا نییە.

دوای چەند رۆژێک لەپشودانیان ئاگادارم کردەوە و پێم ووت لەمە زیاتر پێویست ناکات لەجوانڕۆدا بمێننەوە، بنێرە عەبدولڕەحمانی کورت لەنەوسوودەوە بێتەوە بۆ قەڵاو و ئێوەش بڕۆنەوە بۆ لهۆن. بەمە زۆر دڵخۆش بووزوونامەبەری نارد عەبدورەحمان هاتو گەیشتە جوانڕۆ، سان لەگەڵ خۆی هێنای بۆ قەڵاو منیش پێشوازی گەرمم کردن و برێک رێزم نواند بەرامبەریان. لەم کاتەشدا زوزو شازادە ئاگادارم دەکات بۆچی لەجێ بەجێ کردنی ئەرکەکەتدا دوا کەووتی؟.

بەگەیشتنی عەبدورەحمانیش ئیتر هۆکاری دواکەوتنی جێبەجێ کردنی ئەرکەکە نەمابوو. سەیفور بەگ جێگری ئیدارەی قەڵاو و حکومەتی جوانڕۆ بوو، شەوێک دوای تێپەڕ بوونی چوار کاتژمێر لەشەو ناردم بەدوایدا هات بۆلام پیاوێکی زیرەک و بەئیدارەش بوو. بەنهێنی ئەم بابەتەم لەگەڵیا باسکرد، دوای گفتوگۆ و تەکبیر وڕاوێژ، دواجار لەسەر ئەوە پێکهاتین بەیانی رۆژ بووەوە من داوای سان و کوڕەکانی بکەم بێن بۆناو قەڵا بۆلام، پێیان بڵێم ئەمڕۆ گفتووگۆ و خەریکی نوسینی بڕیارنامەی ناردنەوەی سان بۆ لهۆن و مانەوەی عەبدولڕەحمان ئەبین، سەیفور بەگیش بەیانی زوو دەستەیەک چەکداری کردە بهێنێ و لە ژوورێکی قەڵادا بیان شارێتەوە. فەرمانیان بداتێ نیوەڕۆ لەکاتی نان خواردن و راخستنی سفرەدا، کاتێک ئێمە لەگەڵ سان و کوڕەکانیدا ئەچینە سەر سفرە، سەیفور بێتە ژورەوە، من بڵێم فەرموو

ئەویش بەتوڕەییەوە بڵێت پاسەوانەکانت قسەیان پێ وتوم دانانیشم و ئەو نانە ناخۆم تاخۆت نەیەیتە دەرەوە و محاسەبەیان نەکەیت، منیش بچمەدەرەوە، لەگەڵ چوونەدەرەوەی مندا چەکدارە پەنادراوەکان هەڵکوتنە سەر سفرەی نانەکەو سان و کوڕەکانی زەنجیر بکەن. ئەوشەوەمان بەقەلەقی و بەبڵێ و مەڵێ گەیاندە بەرەبەیان.

سەیفور بەگ ئەرکی خۆی جێبەجێ کرد، ئێمەش سەرگەرمی قسە کردن و نوسین بووین کات بەنیوەڕۆ گەیشت سفرە ڕاخرا چووینە سەر خوان و دەستمان بۆبرد، سەیفور هاتە ژوورەوە وتمان فەرموو ووتی نان ناخۆم و دانانیشم خۆی تێک دابوو، پرسیم بۆ؟ ووتی پاسەوانەکانت جنێویان پێداوم ئەبێ بێیت هەرئێستا سزایان بدەیت، سان زیرەک و دەرکی بەشتێک کرد و یەکسەر ووتی سەیفور جوان نییە بۆتۆ داواچی بێت لەسەر لەخۆت بچوکتر، تۆبەر پرسی ئیدارە و دامو دەستگای خانی، ئەبێ ئیدارەیان بدەیت دانیشە، سەیفوریش زوزو سوێندی ئەخوارد دانانیشێ، تامن نەچمە دەرەوە دارکاریان بکەم، منیش توڕە بووم و بە پێی پێ خاوس دەرچوومە دەرەوە، لەگەڵ هاتنە درەوەی ئێمەدا چەکدارەکان رژانە ژوورەکەو لەسەر سفرەکە سانو و کوڕەکانیان قۆڵ بەست کرد. بارودۆخەکە تێکچو خەڵک دەستیان کردەوە، بەدەستی خاڵی پەلاماریان ئەدا، لەناو قەلاو لەدەرەوەی قەلاشدا هەموویان گیران. بەتایبەت کەسایەتی و پیاوە دیارەکانیان. هەرلەوێدا حەمەسەعید سان و کەسایەتی دیارو بەناو بانگی هەورامی میرزا ئەبووبەکر درانە بەر گوللەو کوژران.

ئەوەندەی نەبرد فەیروزە خانمی هاوسەری سان بە پێ خاوس و بەهاتو هاوار و قژو روومەت رنینەوە هات منی سوێندا عەبدولڕەحمان نەکوژم، منیش پەرێشانی خاتون کاری تێکردم و عەبدولڕەحمان و رۆستەمم نارد بۆ ناو زیندان. لەبەر ئەوە رۆستەم منداڵ و بێتاوان بوو بۆدڵنەوایی دایکی بەرم داو ناردمەوە بۆلای. مۆڵەتیشم دانێ بۆپرسە دانیشن، دایکم و کەسوکاری خۆمان و خێزانەکانی نایب و وەکیل و بەگزادەکانی جوانڕۆم ئاگادار کرد بەشداری پرسەو سەرەخۆشی سان بکەن و دڵنەوایی فەیرۆزەخانم بدەنەوە.

لەبەر ئەوە شـازادەزووزو تەئكیـدی بـۆ كوشـتنی عەبـدولڕەحمان دەكردەوە، نەمتوانی دوای بخەم، بۆكوشتنی كوڕە گەورەی سان بەرنامەیەكم دانا، كە بڵێین خۆی خۆی كوشتوەتەوە، بەم شێوە: بەیانییەكزووپیاو كوژێكم بانـگ كـردو پـێم ووت ئەبـێ بڕۆیـت لەزینـدانەكەدا لەگەڵ پاسـەوانەكەدا عەبدولڕەحمان بخنكێنی و دوای مردنی شاڵەكەی پشتی خۆی بخەیتە ملی و بەجێی بهێڵـی دواتـر پاسـەوانەكە بەراكـردن و هـاتو هـاوارەوە بێت بەدیـار خەڵكەكەوە بڵێت عەبدولڕەحمان خۆی ئەخنكێنێ من چاری ناكەم فریاكەون، وایان كـردو خنكاندیان كاتێک پاسـەوانەكە هـات مـن پێم ووت بـڕۆ دایكی ئاگادار بكە بڵی عەبدولڕەحمان نیگەرانی زیندان و بـاوكیەتی ئەیەوێ خۆی بكوژێت من چاری نـاكەم تـۆوەرە بەڵكو بەقسـەی تـۆ ئـارام بێتەوە. دایكی بەراكردنەوە هات بۆناو قەڵا ئێمەش ناردمان بۆ ناوزیندانەكە، كاتێک چاوی كەوتبـوو بەلاشـەی بێگیـانی كـوڕەكەی و زمـانی درێـژ بـووە و بەلادەمیـدا هاتوەتە خوار، هەردو ئەگریجەی خۆی بڕی و هەوڵی خۆكوشتنی خۆیشیدا بەلام نەیانهێشت.

منیش دەست بەجێ شازادەم ئاگادار كردەوە لەئەنجام دانی ئەركەكە.

ئەگێڕنەوە دەڵێن فەیروزە خاتون دوای هەفتەیەک ڕۆستەم ئەبات و دەچێتە تەكیەی ماڵی شێخ لەرەوانسەر، لەوێ لەتەكیەدا كوڕێكی دەبێت و ناوی ئەنێن جەعفەر، هەمان جەعفەر ئەو جەعفەرسانەیە كەدواتر بوو بەسانی هەورامان. هەروەها ئەگێڕنەوە بەبڕیاری شازادە تەرمی حەمەسەعید سان ئەهێڵنەوە و لەناوەراسـتی حەوشـەی قەڵای جوانڕۆدا دایئەنێن، هەمـوو سـەرەک هـۆزو تیرەكـانی كرماشـان و جـاف و گـۆران كـۆدەكەنەوە لەدەوری تەرمەكەدا ئەوەستن و فەرمانیان پێ دەكەن ئەبێ یەكی خەنجەرێک بدەن لەتەرمەكەی چەند سەرۆک عەشیرەتێک نایانەوێ لێی بدەن، بەلام بەزۆر ئەوكارەیان پێ دەكەن، سەرۆک عەشیرەتی ئێناخی بەزۆریش خەنجەرەكەی لێنادات، زیندانی دەكەن تاشازادە فەرمان دەردەكات پارچەیەک لەگوێیەكی بكەنەوەو دوای ئەوە ئازادی بكەن، ئەوانیش فەرمانەكەی شازادە جێبەجێ دەكەن، ئەودەمە سەرۆک تیرەی ئێناخیەكان پیاوێكی مەردو سەنگین و نەترس بووە بەناوی عوسمان بەگ.

خوێنەری بەڕێز بۆزیاتر ئاشنا بوونت بە چۆنییەتی لەشکرکێشی قاجاریەکان بۆسەر هەورامان و سەرکوت کردنیان، ئەتوانی بگەڕێتەوە بۆ کتێبەکانی (تحفەی ناسری) بەناو نیشانی تەئریخ و جغرافیای کوردستان لەنوسینی میرزا شوکرولای سنەیی، ناوبراو بەدرێژی لەوبارەوە باسی کردووە لەلاپەڕە ٢٧٥-٢٤٠ی کتێبەکەیدا. هەروەها لەکتێبی(منشآت فەرهاد میرزا) و پێدا چوونەوەی غولام رەزای تەباتەبائیدا لە لاپەڕەکانی ١٩٨بۆ٢٠٢وە لە ٢١١بۆ٢١٣.

## دوومانگی کۆتایی ساڵی ١٩٩٨

لەرۆژی١٩٩٨/١١/٢دا دوای ئیشوکاری ئاسایی حزبی لەگەڵ کۆمەڵێک لەهەڤاڵانی مەڵبەندا، بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی هاوسەری مامۆستا مەلاعەبدولای دەڵەمەڕیمان کرد، مەلا عەبدولا پیاوێکی قسەرۆیشتوی هەڵەبجەیەو لەتیرەی زەردۆیییە، زەردۆییەکان لەبنەچەدا نیشتەجێی ئەوبەری ئاوی سیروان بوون، بەشێکیان لە باینگان و ئاواییەکانی دەوروبەریدا لەرابردوویەکی زۆردوردا نییە کۆچیان کردووە بۆئەم بەری سیروان، ئەمانیش وەک زۆربەی تیرەو هۆزەکانی تر بەشێکیان ئەکەونە ناو خاکی عێراق و بەشێکی تریان ناو ئێران، سنووری زەردۆییەکان لە عێراق دا ئەکەوێتە باشووری خۆرهەڵاتی شاری هەڵەبجە، لەوانە ئاوایی گردەناوێ لەدامێنی خۆرهەڵاتی چیایی بالامبۆ، ئاوایی ڕێشاو ئەکەوێتە باشووری چیای شنروێ، ئاوایی دەڵەمەڕ ئەکەوێتە باشووری خۆرئاواو دامێنی چیایی شنروێ.

جەماوەریی ئەم ئاواییانە لەدوای کۆچ پێکردنیان لەسەر زیدی باو باپیریان ساڵی ١٩٧٩ هاتنە شاری هەڵەبجە. لەدوای کیمیابارانی هەڵەبجەش وەک باقی تیرەو هۆزەکانی تری ناوچەکە پرش و بلاو بوونەتەوە بەشێک بۆ شارەکان سلێمانی و هەولێرو دەوروبەر، هەندێکیشیان ئەنفال کران و بەشێکی تریان ئاوارەی وڵاتی ئێران بوون .

لەسنووری باکووری خۆرئاوایی شارۆچکەی سەیدسادقیشدا تیرەی زەردۆیی لەمبەرو لەوبەری چەمی چەقاندا هەن، خۆشیان بەزەردۆی رەسەن ئەزانن و بەر لە کـۆچ پێکردنیـان لەئاواییەکـانی وشـقبەو(بەرکەورگان) و لەدۆڵـی دۆلەچەووتیشدا ئاواییەک هەربەناوی ئاوایی زەردۆییەوە هەیە لەوێدا ژیاون. زۆرتـرین خەڵکـی تیـرەی زەردۆیـی لەنـاو شـاری کرماشـاندا ئەژیـن. زەردۆییەکان لەڕابووردا دوور بوون لە هەندێک مەسائیلی وەک سیاسی و شـەڕو شـۆڕ دەرگیـر بـوون لەگەڵ دەورو بەردا، زۆرتـر خەریکـی کـارو کەسابەت بوون، بۆ بژێوی ژیـان پیشـەی سـەرەکی و کاریـان لەرابـردوودا بنێشـت کـردن و ئاژەڵداری بـووە، لەدوای روخـانی رژێمـی شاهەنشـاهی لەئێراندا، هەندێک بنەماڵەو کەسایەتی دیاریان بەشداری شۆڕش و کوردایەتی بـوون و لەوپێناوەشـدا قوربـانی بەرچاویـان دا، لەدیـوی عێراقیشـدا لەگەڵ خزمانی ئێناخیدا دەرگیر بوون و هەردوولا زیانی گیانی وماڵیان بەرکەوت، زەردۆییەکان ئێستا پیاوی کاسب و سەرمایەداریان هەم لەم دیو لەباشوور و هەم لەودیو لەرۆژهەڵاتدا هەیە.

مامۆسـتا مەلا عەبـدوڵا پیـاوێکی دڵسـۆزو کـورد پەروەرو لەشـەڕی ناوخۆدا لەیەک کاتدا دۆستی ئێمەش و مامۆسـتامەلا عەلیش بوو، لە کـاتی ئاڵۆزیەکان دا هەوڵـی زۆری ئەدا خـۆی و کۆمـەڵێک پیـاوی تـری نـاوچەکە، بۆئەوەی شەڕ نەبێت لەوبارەوە زۆر مانـدو دەبوو، چەنـدین جـار ئەکەوتە نێوان و ژیانی ئەکەوتە مەترسی، جارێک رەحمەتی شەهید شەوکەتی حاجی موشیر پێی ووت مامۆستا، ناحاڵی زۆرە لەم نێوانەدا شەهید ئەبێت. ووتـی کـاک شـەوکەت ئەگەر بەشـەهید بـوونی مـن کێشـەی یەکێتـی و بـزووتنەوە چارەسەر ببێت حەزدەکەم هەرئەمڕۆ شەهید ببم.

بەڵـێ دوای بەشـداری کـردن لە رێوڕەسـمی پرسـەی هاوسـەری مامۆستا مەلاعەبدوڵا، سەردانی ماڵی خاڵۆ رەزای نامدارمان کرد، خاڵۆ رەزا سەربەتیرەی ئێناخیەکانە و پیاوێکی بەتەمەن و بەڕێزە، خـاوەن ئەزمـوونی زۆرە لەژیانی کۆمەڵایەتیی و سیاسی و عەسکەریدا. هەموو تەمەنی لەشاخ و بەچەکداری و پێشمەرگایەتی و ماوەیەکیش لەزیندان و بەدور خراوەیی بـۆ ناوەراست و باشووری عێراق بەسەر بردوە، مرۆڤ کاتێک لەلایدا دائەنیشی

لەداستان گێڕانەوە و بەسەرهاتەکانی کەبەسەریدا هاتون لەزەت ئەبات و قەد بێتاقەت نابێت.

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ۱۱/۳ دوای تەواوبوونی ئیشوکار لەبارەگای مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوور لە شاری هەڵەبجەدا، هاتمە سلێمانی لەگەڵ هەڤاڵان قەدەفەری و جەبار جەلال و فەرەجی حەمەساڵح دا لەماڵی خۆمان پێشوازیمان کرد لەوەفدێکی مەڵبەندی ڕێکخستنی یەکگرتووی ئیسلامی، لەکۆبوونەوەیەکی دۆستانەدا قسەوباسمان لەسەر هاوکاری و هەماهەنگی نێوانمان کرد وداوایان کرد کاک کۆسرەت هاوکاریان بکات و ئێمەش پشتیوانیان بکەین.

ئەمڕۆ ۱۱/۸ ڕۆژی ساڵیادی یەکساڵ تێپەڕ بوونە بەسەر شەهید بوونی ۲۵ بیست و پێنج پێشمەرگەی قارەمانی فەرماندەی شەشی شارەزوورو سنووری مەڵبەندی شارەزوور. ئەوانیش شەهیدانی فەرماندە شێخ حسێنە سور، فازل شیرەمەڕی، کەریمی کاکە حەمەی کانی پانکە، مەلابەکر و شیروان ئەبووبەکرو هاوڕێیانی تریانن. لە ڕێوەڕەسمێکدا یادمان بەرز ڕاگرتن ڕێزمان لەکەسوکارو بنەماڵەکانیان گرت.

ڕۆژی ۱۱/۹ هەڤاڵ عیماد ئەحمەد و ستاف و کارمەندانی وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێم سەردانیان کردین لەبارەگای مەڵبەند و دوای پشوویەک، باسی کەموکورتیەکان و پێداویستیەکانی خەڵکی هەڵەبجە و نەخۆشخانەکانمان کرد بۆیان لەڕووی تەندروستیەوە. دواتر لەگەڵیان دا سەردانی بارەگای قائیمقامان کردو دواتریش پێکەوە چووین سەردانی دکتۆر و کارمەندەکان ونەخۆشەکانمان کرد. دوای سەردانەکان ئەوان چوون بۆسەردانی مامۆستا مەلا عەلی و بزووتنەوەی ئیسلامی، ئێمەش گەڕاینەوە بارەگای مەڵبەند. لای ئێوارە کۆبوونەوەم کرد لەگەڵ پێشمەرگەکانی دەستەکەی خۆم، دوو وەجبەن ئەمڕۆ یەکتر ئەگۆڕن، بە لەوەی وەجبە گۆڕاوەکە بڕۆن کۆبوونەوەکەمان کرد.

ئەمە دەقی کۆبوونەوەکەیە: ئادەی وەرن لێرەوە بەدوو ریز بووەستن، باشە، وەستان شێوەی وەستانەکەیان نارێک و پێکە. جوان بووەستن، پێدەکەنن، ئەوە بەچی پێدەکەنن ؟ کەس قسە ناکات. ئەمە کۆبوونەوەیە، ڕێک بووەستن، ئادەی ئەو پێڵاوەت هەڵکێشە چۆن پێشمەرگە پێڵاو ئەکا بەسەر

پێوە؟ بڕوانە جلەکانیشیان هەریەک بەجۆرێکە، سەرە تۆ بۆچی جلی ڕەشت لەبەردایە، سەر دائەخاو وەڵام ناداتەوە، لەمەودوا ئەبێ لەکاتی ئەرک و دەوام دا جلەکانتان یەک جۆر بێت ئەویش جلی خاکیە، باشە؟ بەڵی بەسەر چاو.

ئێ، هەڤالان هەندێک قسەتان بۆدەکەم، لەمەودوا ئەبێ وابکەن، کێ ناتوانێت بەوجۆرە هەڵسوکەوت و دەوام بکات و ئەرکی خۆی ببینێ، لەدوای کۆبوونەوەکە ئەتوانێ بڵێت من ناتوانم بەو جۆرە دەوام بکەم. مۆڵەتی ئەدەمێ بەئاشـتی و برایـانە خواحـافیزی لەهەڤاڵەکـانی بکـاو بـڕوات، یـان داوای گواستنەوە بکات بۆکوێی ویست ئەیگوازینەوە، ئەگەر چەکەکەش هی خۆی بـوو ئەوە بەچەکەوە نەقڵـی دەکەیـن . بەڵام دوای کۆبـوونەوەکە ئەوانەی ئەمێننەوە، لەو بەرنامەیە بۆیان دیاری ئەکرێت لایاندا ئەوە بێگومان بێ سزا ئەدرێن. باشە؟ هەموویان، بەڵی بەسەر چاو.

ئـێمە هەموومـان پێشـمەرگەین، خۆتـان ئەزانـن پێشـمەرگە دەبێـت ئامـادەی گیـان فیـدایی بێـت لەرێگـای بیروباوەڕەکەیـدا، راسـتە ئێسـتا پێشمەرگایەتی جیاوازی هەیە لەگەڵ پێشمەرگایەتی سەردەمی شاخ دا، ئێستا پێشـمەرگایەتی ئاسـانترە، لەنـاو خەڵکـداین، نـان و خـواردن زۆرمو لەبەردەستمان دایە، بەئۆتۆمبێل هاتوچۆ دەکەین. بەتایبەت ئێوە یان ئەوانی تری وەک ئێوە پاسەوانی بەرپرسەکانن. من حەقم نییە پاسەوانی هەڤالانی تر چۆن هەڵسوکەوت دەکەن، نابێت ئێوە چاو لەوان بکەن، ئەبێ ئەوان چاو لەئێوە بکەن.

ئەزانـن چەنـد ناشـیرینە، کاتێـک بەرپرسـەکان ئەچـنە شـوێنە گشتیەکانەوە، پاسەوانەکانیان پاڵپاڵێن دەکەن، بەحیساب دڵسۆزی ئەنوێنن. زۆرجار ڕێگە لەئیشوکاری ڕێوەڕەسمەکان یان بۆنەکـان ئەگرن، بەردەمـی خەڵـک ئەگـرن، زۆرجـار دوو بەرپـرس یـان زیـاتر ئەچـنە جـێگەیەک پاسەوانەکانی یەکێکیان ئەوەندە بێشعورن پاڵ بەپەرپرسەکانی ترەوە ئەنێن، یان لەبەردەم ئامادە بواندا ئەوەستن و بەردەم و بەرچاویان ئەگرن.

دیوتانە بەئۆتۆمۆبێل خەریکە خەڵک بشێلن؟ ئاهـا کاتێک سـەردانی شوێنێک ئەکرێت پاسەوانەکان چۆن لەدەرگاوە ئەچنە ژوورەوە، خەڵکەکەش لەدەرەوە چاوەڕێ دەکەن و ڕێگەیان نییە بچنە ژوورەوە، ئاهـا لەم ڕۆژانەدا کاکی بەرپرس لەهۆڵەکەدا قسەی دەکرد پاسەوانەکانی خۆی لەژوورەوە زیاتر

بوون تا جەماوەرەکە، نیوەی جەماوەرەکەش لەدەرەوە بوون و بەجێیان هێشت.

ئەگەر ئێوە ئەتانەوێت پارێزگاری لەمن بکەن، لەدوورەوە بووەستن و وریابن، قەد مەێنە ناو مزگەوت و ناو کۆڕی پرسەو ماتەمینییەکان، وەڵا خەڵک جنێو بەو جۆرە بەرپرسانە دەدەن من خۆم گوێم لێبووە. لەراستیدا ئێمە لەناو خەڵکی خۆمان داین خەڵک ئاگای لێمانە، لەم ڕۆژانەدا لەرێوەرەسمێکدا بووم بەرپرسێکی هاوڕێی خۆم هات پاسەوانەکانی بەرودوایان گرتبوو چەند کەس لەناو خەڵکەکەدا ووتیان تەماشای ئەم فشەکەرانە، ئەوە بۆ ناچن لەبەرەکانی شەڕدا واخۆتان بنوێنن، زانیم بۆیە ئەوەیان ووت من گوێم لێبێت، برادەرە بەرپرسەکە خۆیشی گوێی لێبوو. ئێوەش خەریکە چاو لەوانەبکەن، لەراستیدا من بەو جۆرە حەرەکاتانە زۆرجار لەباتی ئەوانە تەریق بوومەتەوە و خەجاڵەتیم کێشاوە. هیچ جۆرە ئەتەکێتێک، یان رێزو حورمەت و گەورەو بچوکیەک کەعورفە لەکاتی بەرێوە چوونی رێوەرەسم و کۆڕو کۆبوونەوەو بۆنەکاندا نییە.

ئەوە لەلایەک لەلایەکی ترەوە، کاتێک لەجێگەیەدا میوانداریمان دەکەن، یان نان ئەدرێت، ئێوە قەد هەڵپەی نان خواردن نەکەن، لەکەنارەوە بووەستن، تاخاوەن ماڵ خۆی نانتان دەداتێ، یان ئەگەر بەش دابەش کرا نەچنە پێشەوە پەلامار بدەن یەکێکتان بەئارامی نانی ئەوانی تر وەرگرێت، خۆ ئەگەر نەشما ئاساییە تاقێک نان نەخواردن مرۆڤ نامرێت لەبرساندا.

بۆخۆشتان رێز لەیەک بگرن، جنێودان و شەڕەشەق عەیبە، سەنگین بن، کاتێک وەفدی حزبی تر دێن بۆلامان یان هەڤاڵانی خۆمان لەئۆرگانەکانی ترەوە سەردانمان دەکەن، ئەبێ لەپێشوازیاندا بووەستن و رێزیان لێبگرن، دوای ئەوە کەئێمە دائەنیشین، ئەبێ ئێوە پاسەوانەکانی ئەوان رێزلێبگرن و لەجێگەیەکدا ئاو چاییان بدەنێ. شتێکیتر کەباڵەبیرم نەچێت ئەوەیە، من رازی نیم کەستان جگەرە بکێشی، جگەرە خراپە بۆ تەندروستی مرۆڤ، بەتایبەت بۆئێوە گەنجن، جگەلەوەش پیسەو دەوروبەرەکەتی پێی ناڕەحەت ئەکەی.

لەوکاتانەی لەمەڵبەندا یان لەکۆمیتەکاندا یان لەبارەگاکانی پێشمەرگەدا بەشەو ئەمێنینەوە ئەوان پاسەوانی خۆیان هەیە، ئێوەش پاسەوانی خۆتان بەجیا دابنێن. ئەبێ رێزی تایبەت لەدراوسێکانی بارەگاکان یان ماڵ و

بارەگاکەی خۆمان بگرن، بەتایبەت بائەوەتان پێبڵێم ئەبێ ئەو کچ و ژنانەی دێنە بارەگاکانمان بۆ بەشداری کردن لەکۆبوونەوەکاندا، یان ئیشمان لەگەڵ دەکەن، یان بۆکارێکی خۆیان دێن واحیساب بکەن ئەوانە دایک و خوشکی خۆتانە.

ئەوکەسانەی یان ئەو میوانانەی دێن بۆلای من لەبارەگا ئەوە برادەرانی کادرو ئیدارەو پێشوازی لێرە هەن و ئەزانن چۆن قسەیان لەگەڵ دەکەن ، ئەو میوانانەی بۆماڵەوە دێن قەد درۆیان لەگەڵ نەکەن، بڵێن خەوتوە یان کۆبوونەوەی هەیە، ئەوکەسەی سەرە پاسەوانییەتی ئەگەر کابرای ناسی یان نەیناسی ئەوە بەخێرهاتنی ئەکاو ئاگاداری بەرپرسی دەستەکەی خۆی ئەکا. ئەویش بەپێی ئیشەکەی و کاتەکە و حسابی ئەو شوێنەی لێیەوە هاتوە مەبەست دوری و نزیکیە، یان خۆی وەڵامی دەداتەوە یان ئەیهێنێ بۆلای من. لەم کۆبوونەوەدا ئەمرۆ هەر ئەمەندە بەسە، لەمەولا مانگانە کۆبوونەوە دەکەین. جائێستا بزانم کێ قسەی هەیە؟ کەس، ئەی کێ ئەمەی پێناکرێت یان تاقەتی نییە؟ کەس نییە. باشە سەرکەوتوبن.

رۆژی ١٩٩٨/١١/١٠ مەکتەبی رێکخستن ئاگاداریان کردین رۆژی پێنج شەممە ١١/١٢ هەڤاڵ جەبار فرمان دێتە سنووری کۆمیتەی هەڵەبجەی تازە(قەزای شارەزوور) ئەیەوێت کۆبوونەوەیەکی جەماوەریی بکات لەگەڵ جەماوەریی ناوچەکەو کەسوکاری شەهیدانی گەردەلولی تۆڵەو پێشمەرگەی ناوچەکەو فەرماندەکانیان. بۆرۆژی دیاری کراو هەڤاڵانی کۆمیتە ئامادەکاریان کرد و لەمەڵبەندیشەوە من و هەڤاڵ جەبار جەلال لەبارەگای کۆمیتەی ناوبراودا ئامادەبووین.

کۆبوونەوەیەکی فراوان رێکخرا، کاک جەبار لەکۆبوونەوەکەدا سەرەخۆشی لەکەسوکاری شەهیدەکان کرد بەناوی مام جەلال و فەرماندەیی گشتیەوە، ئەوکات کاک جەبار ئەندامی مەکتەبی سیاسی و جێگری هەڤاڵ مام جەلال بوو بۆ کاروباری هێزی پێشمەرگەی کوردستان، هەرلەکۆبوونەوەکەدا سوپاسی هێزی پێشمەرگەی شارەزوورو مەڵبەندی رێکخستنی شارەزووریشی کرد، بۆ ئەو دەورە بەرچاو کاریگەرەیان، کەبەخوێنی شەهیدەکانیان لەدوای ٣١ی ئاب تەرازوی هێزی یەکێتیان راست کردەوە

لەبەرامبەر پارتی، کەپێشتر توانیبوویان بەپشتیوانی سوپای عێراق و لەشکری تورک یەکێتی توشی شکست بکەن.

لەکۆتای کۆبوونەوەکەدا باسی ڕێکەوتنی یەکێتی و پارتی کرد و لەسەر گرنگی ڕێکەوتنەکەی واشنتۆن قسەی کرد. بۆنانی نیوەڕۆ کاک جەبارو هەڤاڵەکانی و ئیمەش میوانی کاک سەرحەدی خەلیفە یونس[1] بووین لەئاواییی دسکەرە، هەرلەم ماوەدا کاک کۆسرەت ڕەسوڵیش لەسنووری بتوێن و پشدەردا خەریکی کۆڕو کۆبوونەوەی جەماوەریی بوو، ئەویش لەسەر هەمان ئەوبابەتانە قسەی بۆ خەڵک و پێشمەرگەو کەسوکارەی شەهیدان دەکرد.

دوای ئەم سەردانەی ماڵی کاک سەرحەد، وابڵاو بووەوە کاک جەبار بۆ ئاشت کردنەوەی کاک سەرحەدو ئەو بنەماڵە سەردانەکەی کردوە، گوایا لەسەر کوشتنی عومەر و حەمەی کوێخا قادری ئاوەکەڵەیی دڵگران بوون لەیەکێتی. کوێخا قادری ئاوەکەڵەیی خوشکەزای خەلیفە یونسە. لەڕاستیدا

---

[1]سەرحەدی خەلیفە یونس ڕیش سپی و براگەورەی تیرەی ڕوخزایی سەر بەهۆزی گەورەی جافە، پیاوێکی کۆمەلایەتی و قسە ڕۆیشتوی نێو تیرەو هۆزەکانە. لەئاشتەوایی کۆمەلایەتیدا دەوری بەرچاو و لەبارەی سیاسی و کوردایەتیشەوە، لەهەردو شۆڕشی ئەیلول و نوێ دا بەشدار بووە و پێشمەرگایەتی کردوە و بەرپرسایتیشی هەبووە. ئەم بنەماڵە وەک هەر بنەماڵەیەکی تری ئەم کوردستانە لەسەر کوردایەتی و بارودۆخە سیاسییەکانی بەسەر عێراق و کوردستاندا هاتون، توشی چەرمەسەری و بگرەو بەردەی ئەو بارودۆخ و ڕۆژگارانە بوون، ڕەنگە ئەگەر بنوسرێتەوە بۆخۆی کتێبێکی لێ بەرهەم بێت. لەڕاستیشدا ئەوە ئەرکی نەوەکانی ئەم بنەماڵەو تیرەکەی خۆیانە کەئینشائەلا ئەو ئەرکە جێبەجی بکەن.

کاک سەرحەد دوبرای هەیە بەناوەکانی کاک ئەنوەرو کاک ئەکبەر، لەگەڵ ٩ نۆ کوڕدا، چەندین لە کوڕەکانی لەناو ڕیزەکانی یەکێتی نیشتیمانیدا بەهیمەت و خەباتی خۆیان جێگەیان گرتوە و بەرپرساتەتیان هەیە. ئەمەش ناوی کوڕەکانە: ڕۆستەم مامۆستا، سەرکەوت ئەندامی پەرلەمان کوردستان، مامۆستا سەردار پێشمەرگەو لەرۆژی ١٩٩٦/١٠/١دا شەهید بوو لەشەڕی ناوخۆدا، سەرچڵ بەرپرسی ئاسایشی قەزای سەیدسادق شەهید بوو بەکارەساتێکی دڵ تەزێن لەڕۆژی ٢٠٠٧/١/٦دا، تەیمور، جەوهەر بەرپرسی ئاسایشی قەزای هەڵەبجە، سیروان قایمەقام، سالار ئەندامی ئەنجومەنی ناوەندی یەکێتی ، سامان دواین کوڕی بچوک.

بنەماڵەی کوێخا قادرو کوڕەکانی لەشۆڕشی نوێ دا دەوری بەرچاویان هەبوو لەدوو روەوە، یەکەم : ماڵەکەیان لەئاواییی ئاوەکەڵە لەبناری قەرەداغی رووی شارەزوورەوە بووبووە بنکەو بارەگای پێشمەرگەو دیواخان و سفرە و نانیان هەموومان لەسەری حەواوینەتەوە و تێربووین. دووەم: کوڕەکانیان پێشمەرگایەتی و کاری رێکخستنیان دەکرد، بەڵام بەداخەوە بەهۆی هەڵەی یەکێکیانەوە بەناوی مامۆستا عومەر، سەرەتای شۆڕش نەیتوانی درێژە بەپێشمەرگایەتی و شۆڕش بدات، تەسلیم بووەوەو دواتر هاوکاری دەستگای ئەمنی رژێمیکرد، لەدوای راپەرین، لەرۆژی ١٩٩٢/١٠/٦دا وون و بێسەرو شوێن بوو، بنەماڵەکەیان بەدەستی یەکێتی ئەزانی، لەدوای ئەم روداوە حەمەی برای چووە ناو پارتی و ئەویش لەرۆژی ١٩٩٤/٥/٤دا بووە قوربانی شەڕی ناوخۆی نێوان یەکێتی و پارتی. دوای حەمەش بەکر کوڕێکی روخۆش و خۆشەویست و پێشمەرگەی دێرین و برا بچوکیان بوو بەنەخۆشی کۆچی دوای کرد، ئێستا تەنها برایەکیان ماوە پیاوێکی بەڕێزە بەناوی کاک مستەفای کوێخا قادر. زۆرن ئەم جۆرە خێزانانە شۆڕشەکانی کورد لەباتی پاداش، زوڵمیان لێکردون.

رۆژی ١١/١٤ مەکتەبی رێکخستن هاتنە هەڵەبجە، لەبارەگای مەڵبەند کۆبوونەوەیەکی هاوبەشی ئەنجومەنی مەڵبەند لەگەڵ ئەنجومەنی مەکتەب کرا، لەو کۆبوونەوەدا لەسەر سێ تەوەر قسە و گفتوگۆ کرا، یەکەم: چۆنییەتی چوونە ناو خەڵک و خۆ ئامادەکردن بۆ هەڵبژاردن و کاروباری رێکخستن، دووەم: چۆنییەتی کارکردن لەگەڵ حزبەکانی ترو پاراستنی ئاشتی و تەبایی و پێکەوە ژیان، سێیەم: لەسەر گرتنی عەبدوڵا ئۆجەلان لەئیتالیا و چارەنوسی خۆی و پەکەکە، وەدەربڕینی ناڕەزاییەتی و خەمی خۆمان لەوبارەوە.

لەرۆژی١١/١٥ بەرپرسەکانی سنووری شارەزوور لەبارەگای مەکتەبی رێکخراوەکان لەسلێمانی کۆبووینەوە، بۆدانانی بەرنامەیەک بۆ ئامادەکاری پرۆسەی هەڵبژاردن. لەم کۆبوونەوەدا بڕیاردرا هەموو ئەو بەرپرس و کادرانەی خەڵکی شارەزوورو هەڵەبجەو هەورامان و پێنجوێنن وە لەدەرەوەی سنووری مەڵبەندی شارەزووردان بخرێنە گەرو لەلیژنەکانی قەزاو ناحیەکاندا دابنرێن، بەشدار بوانی ئەم کۆبوونەوە ئەمانە بوون: مەلا بەختیار، بەکری حاجی سەفەر، جەمیل هەورامی، م شاهۆ، حەمەی

حەمەسەعید. دواتر لەگەڵ کاک جەمیل هەورامی سەردانی د. ئەرسەلان بایزمان کرد و لەسەر ڕێکخستنە نهێنییەکانی سنووری کۆمیتەی هەڵەبجەو هەورامان قسەو باسمان کرد، تائێستاش کۆمەڵێک ڕێکخستن بەنهێنی ماونەتەوە، بەهۆی بارودۆخی سیاسی ناوچەکەو شەڕەکانی ناوخۆوە، ئاشکرا نەکراون و بەنهێنی کار دەکەن. مەکتەبی ڕێکخستن داوا دەکات ئەوانە بەئاشکرا بخرێنە سەر کۆمیتەکان و چیتر بەنهێنی نەمێننەوە. ڕێکخستنەکانیش گومانیان لەبارو دۆخەکەو ئەو ئاشتی و شەڕ وەستانە هەیە لەنێوان یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامیدا، ترسیان هەیەو دەڵێن ناتوانین ئاوارە ببین، چ گرنتیەک هەیە جارێکیتر بەجێمان نەهێڵنەوە.

ڕۆژی١١/١٦ لەبارەگای کۆمیتەی ڕێکخستنی هەڵەبجەدا، لەکۆبوونەوەیەکی فراوانی کۆمیتەکەدا، ئاڵوگۆڕی بەرپرسی کۆمیتە بەڕێوەچو، هەڤاڵ مامۆستا کەریمی شێخ عەلی کەماوەیەکی زۆرە لە کاتی شەڕو ئاڵۆز ی و گرژیەکان دا بەرپرسی کۆمیتەیە وە سەرکەوتوش بووە، گۆڕا بە هەڤاڵ هەورامان حەمەنوری، کەریم هێنرایەوە ناو مەڵبەند. دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ لەشارۆچکەی سەیدسادق کۆبووینەوە لەگەڵ ئەنجومەنی کۆمیتەو لەسەر ڕێکخستن و ئامادە کردنیان و دروست کردنی لیژنەی ئیشکردن بۆ هەڵبژاردن قسەمان کرد.

ڕۆژی١١/١٨ لە بارەگای کۆمیتەی تانجەرۆ لەعەربەت بەبەشداری ئەنجومەنی کۆمیتەکانی هەڵەبجەی تازەو تانجەرۆ و ئەنجومەنی مەڵبەند کۆڕێک بۆ د.جەزا گیرا، ناوبراو لەچوارچێوەی ئامادەکاری بۆ هەڵبژاردنەکان، قسەی لەسەر ئامارو هەڵبژاردن کرد. جەماوەریی ئاواییەکانی بناری سورێن لەم ماوەدا سەردانی مەڵبەندیان کردو داوای پرۆژەی خزمەتگوزاری دەکەن، منیش بەڵێنم داوە لەگەڵ بەرپرسانی ئیداریی ناوچەکەو پارێزگار.سەردانیان بکەین. ڕۆژی ١٩٩٨/١١/٢٥ ئاواییەکانی بناری سورێنمان بەسەر کردنەوە حاکم قادر حەمەجان و وەفدێکی ئیدارەکانی حکومەت هاتوون و لەکۆبوونەوە لەگەڵ جەماوەریی ئاواییەکاندا گوێ بۆ داواکاریەکانیان ئەگرن و بڕیارە بەپێی توانا لەبووجەی پارێزگا پرۆژە خزمەتگوزاریەکانیان بۆجێبەجێ بکەن.

ڕۆژی ١١/٢٦ لەگەڵ ژمارەیەک لەجەماوەریی ئاواییەکانی کاکەیی نشینی هاوار، هاوارەکۆن و دەرەتفێ سەردانی سەرۆکی حکومەت، کاک

کۆسرەتمان کرد، دوای ناساندن و بەرز نرخاندنی خەباتی کاکەییەکان و بەردەوامیان لەسەر ڕێبازی کوردایەتی، مامۆستا نائیب سابیر بەنوێنەرایەتی ئامادەبوان داواکاریەکانیانی خستە بەردەم سەرۆکی حکومەت. کاک کۆسرەتیش بڕیاریدا لایەنە بەرپرسەکان ڕابسپێرێت بۆ ١- کردنەوەی هۆڵی پرسەو جەمخانەکەیان، ٢- دروست کردن و چاک کردنەوەی ڕێگای ئاواییەکانیان، ٣- دروست کردنی پردی نێوان هاوارو دەرەتفێ.

ڕۆژی ١١/٢٨ نزیکەی ٥٠٠ پێنج سەد کەس لەهەورامییەکانی دانیشتوی سلێمانی سەردانی سەرۆکی حکومەتیان کرد، لەهۆڵی ژووری بازرگانی سلێمانی بەشداری کۆبوونەوەیەکیان کرد، کاک کۆسرەت سەرۆکی حکومەتی هەرێم. لەکۆبوونەوەکەدا بەڵێنی دا هەورامان لەبەرچاو بگرێ بۆ ئاوەدان کردنەوە.

ڕۆژی ١١/٢٩ لەبارەگای کۆمیتەی تانجەرۆ کۆبوونەوەیەکی فراوانی ئەنجومەنی مەڵبەندی شارەزوورو بەرپرسانی ئیداریی شارەزوورمان ئەنجام دا، لەم کۆبوونەوەدا وێرای قسەوباس و گفتوگۆکانمان سەبارەت بەدابەشکردنی ئیشوکارو خۆئامادەکردن بۆ زیاتر چوونە ناوجەماوەر، بڕیاریش درا بۆ ڕۆژی ١١/٣٠ پێشوازیەکی گەرم لەسنووری مەڵبەندا لە مام جەلال بکەین. مام جەلال دوای سەفەری بۆ ئەمریکاو واژۆ کردنی ڕێکەوتننامەی واشنتن لەنێوان یەکێتی وپارتی داو کۆتایی هێنان بەشەڕی ناوخۆ لەکوردستانی باشووردا لە ئێرانەوە ئەگەرایەوە.

ڕۆژی دیاری کراو لەڕێگای خاڵی سنووری پەروێزخانەوە مام هاتەوە، سەعات دوانزەی نیوەڕۆ گەیشتە ئاوایی میرەدێی نێوان شارۆچکەی زەڕایەن و شارۆچکەی دەربەندیخان، جەماوەریی شارەزوورو پێشمەرگەو ڕێکخستنەکانی یەکێتی لەمیرەدێ وە تا نزیک شاری سلێمانی لەپێشوازیدا وەستابوون، دڵخۆشی خەڵک بۆ ڕێکەوتنەکە و ئاشتی لەکوردستان دا ئەوەندە گەرم بوو، ئاپۆرەی خەڵک و کەژاوەی ئۆتۆمۆبێلەکانیان لەمیرەدێوە بۆسلێمانی ئەوەندە گەورە و فراوان بوو بە سێ کاتژمێرو نیو مام تێپەڕی و گەیشتە سلێمانی.

لەسەرەتای مانگی یانزەوە وەرگێڕانی کتێبی بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگم تەواو کردبوو، ئەمویست حروف چینی بکەم و ئامادەی چاپ بکرێت

ئەگەڕام کەسێک بدۆزمەوە هاوکاریم بکات، ئەوەبوو خوالێخۆشبووی هاوڕێم پیاوی تێکۆشەری کوردو ڕۆژە سەختەکان، ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی کوردۆ قاسم بەرپرسی مەڵبەندی پێشمەرگە، بەشی رووناک بیری مەڵبەندی پێشمەرگەی راسپارد ئیشەکەم بۆ بکەن، رۆژی ١٩٨٨/١٢/١ سەردانی فەرماندەیی گشتیم کرد لە سەربازگەی سەلام بۆ ئەو مەبەستە، چوومە بەشی روناکبیری مەڵبەند ، دەست نوسەکانی وەرگێرانەکەم تەسلیم کردن و گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە.

بەشی روناکبیری مەڵبەندی پێشمەرگە ئەوکات ئەوانەی ئیشەکەی منیان گرتە ئەستۆ ئەم سێ هەڤاڵە بوون،١- کاک سەلاحەدین ئیسماعیل محەمەد ناسراو بەسەلاح رەنجدەر خەڵکی کەرکوکە، کوڕێکی لەشولار باریک و هێمن و لەسەرەخۆ و کادرێکی ئاگایە، ئێستا جێگری مەڵبەندەکە و بەرپرسی هەمان بەشە. ٢- خاتو چیای خوشکی شەهید ئاسۆی دەلاک کچێکی جوان و شۆخ و شەنگ و بەئەدەب. ٣- چنارخان کچێکی ناسک و ژیرو وریاو گورج و گۆڵ ئەم دوو کچە ئیشی حروف چینییەکەیان بۆکردم، جێگەی خۆیەتی لێرەدا سوپاسیان بکەم و سوپاسی ئەوانەش بکەم هاوکاریان بوون، وەداوای لێبووردن لەهاوکارەکانیان بکەم ناویانم نەزانی.

هەر ئەمرۆ لەسەربازگەی سەلام گەڕامەوە و گەیشتمەوە شاری هەڵەبجە چوومە مزگەوتی دارولئیحسان و بەشداری رێورەسمی پرسەی پیاوێکی خەڵکی تەوێڵەم کرد بەناوی حەمە ئامله، خوالێخۆش بوو، باوکی دوو پێشمەرگەی دێرینی یەکێتی نیشتیمانی بوو بەناوەکانی سەعدون و شاهۆ. سەرلەئێوارە گەڕامەوە بارەگای مەڵبەند، بڕیار بوو ئەم شەو چەند کەسێک ببینم ئەوانە بەپەیامنێرەکەی خۆیان وتبوو ئەبێ لەماڵێکدا بیبینین بەنهێنی، وە خاوەن ماڵەکەش جێگەی متمانەو نهێنی پارێز بێت کاکە حەمەش بەتەنها بێت، منیش وەلامم دانەوە رەزامەندیم دەر بڕی لەسەر داواکەیان کاتژمێر ١١یانزەی شەوم بۆدانان شەوی١لەسەر٢ی/١٢/١٩٩٨.

ناردم کاک ئازادی حاجی عومەری عەنەبی کە پێشمەرگەی دێرین و کوڕێکی ئازاو گورج و گۆڵە، مالیشی لەهەڵەبجەیە هات بۆ مەڵبەند، پێم ووت ئەمشەو چەند میوانێک بەنهێنی لەماڵی ئێوە ئەبینم، بۆیە بۆ ئەو مەبەستە خۆت ئامادە بکە، ووتی باشە، چی بکەم؟ ووتم غەزاڵ خان و منداڵەکانت بنێرە

بۆماڵی باوکت یان هەرکەسی تر، چوار پێشمەرگەت ئەدەمێ دوانیان لەسەربانی ماڵەکەتان بەوریایی دانیشن و خۆیان ئاشکرا نەکەن لەو دیوەدا ئێمە دائەنیشین لەدیوێکی (ژوریکی)تردا دوانەکەی تر خۆیان بشارنەوە، من کاتێک دێم ئەوان هاتبن، چوار پێشمەرگەی تر لەگەڵ خۆم ئەهێنم لەم سەرو ئەوسەری کۆلانەکەوە بەجێیان ئەهێڵم. ئەوکات تەلەفۆن نەبوو تاکی واکی نەبوو بۆیە پێم ووت بەوریاییەوە ئاگاداری کۆلان و دەورووبەری ماڵەکەتبە، ئەگەر ئەوان هاتن و زانیت نییەتیان خراپە لهۆنی کوڕی نوری حاجی ئەولە دراوسێتانە بنێرە بۆلام، نهێنی نییەت خراپیان ئەوە بێت لهۆن پێم بڵێت کاک ئازاد ووتی بەیانی لەمەڵبەندە، ئەوە واتا نییەتیان خراپە، ئەوکات من دێم و ئێمە ئەوان چەک دەکەین و ئەیانگرین و ئەڵێین هاتونەتە سەرمان. ئەگەر زانیت ئاساییین و نییەتیان خراپ نییە، لهۆن پێم بڵێت کاک ئازاد ووتی بەیانی میوانی منە، ئەوکات دێم بۆ لایان، بەلام لەهەردوو حاڵەتەکەدا ئێوە ئەبێ وریابن.

کاتژمێر ١١/٣٠ یانزە و نیو برایەکی ئازاد خۆی هات بۆلام لهۆن لەماڵ نەبوو بوو، ووتی کاکەم وتویەتی بەیانی میوانی منە، ووتم بەسەر چاو ئەو ڕۆیشت و شەهید حەمەرەشیدی مام ئەحمەدم بانگ کرد لەگەڵ پێشمەرگەکان ڕۆیشتین، پێشتر ئامۆژگاریم کردبوون چۆن چۆنی هەڵسوکەوت بکەن، کاتێک گەیشتینە بەردەم ماڵەکە چوار پێشمەرگەکەمان داناو شوێنمان بۆ دیاری کردن مامە رەشەم لەگەڵ خۆم بردە حەوشەکە لەپەنا دارێکدا مایەوە، منیش چوومە ژورەوە، دەمانچەیەکی سمسم لەژێر شاڵەکەمدا قایم کردبوو. بەئازادم وتبوو ئەوان چوار کەسن وابکە لەلایەکەوە دانیشن، دوای چاک و چۆنی ئەبینم سێ کەس هاتون دوانیان لەلایەکەوە دانیشتون و یەکێکیان بەرامبەریانە، پێم ووت فەرموو بڕۆرە ئەو بەر بامن بەرامبەرتان دانیشم، ئەویش چوە شانی هاورێکانی و منیش لەجێگەکەیدا دانیشتم، دوای کەمێک قسەو یەکتر ناسین، بۆم دەرکەوت ئەمانە پێشتر یەکێتی بوون و لەسەر کێشەی کۆمەلایەتیی هاتونەتە هەڵەبجە و ئێستا دەیانەوێت ئێمە هاوکاریان بکەین بۆ چارەسەری کێشەکەیان و ئەوانیش پەیوەندیان بەیەکێتیەوە هەبێت. منیش بەڵێنم دانێ لەگەڵ شەهیدی نەمر کاک شەوکەتی حاجی موشیر هەوڵی چارەسەر کردنی کێشەکەیان بدەین و

ناشـمانەوێ لەنـاو لایەنـی تـردابن و پەیوەنـدیان بەئـێمەوە هەبێـت بـۆم ڕونکردنەوە تاتوشی کێشەی زیاتر نەبن، ووتیـان ئـێمە لەئێسـتاوە خۆمـان بەیەکێتی ئەزانین کێشەشمان چارەسـەربێ یان نەبێ، دوای تەواو بـوونی دانیشتنەکەمان داوایان کرد مۆڵەتیان بدەین بڕۆن پێم وتن من خەڵکم لەگەڵە ئەڕۆم ئێوە دواتـر بـڕۆن بانەتـان بیـنن ئـێمە ڕۆیشـتین. ئەوەی مـن بیـرم لێکردبووەوە وانەبوو، ئەوان دوو کلاشـینکۆف و دەمانچەیەکیـان پـێ بـوو، کلاشینکۆفەکانیان لەدیوەکەدا لەدوری خۆیـانەوە هەڵسپاردبوو. خـوێنەری بەڕێز: ئەوکەسانە ئێستا مـاون، ئاگادارم کردن لەنوسینەوەی ئەم دیدارە، داوایان لێکردم ناویان نەهێنم، بۆیە ناویان نەهاتووە.

ئەمڕۆ ١٢/٢ لەبارەگای مەڵبەند لەهەڵەبجە تائێوارە خەریکی ئیشوکارو بینینـی خەڵـک بـووم، ئەم مـاوە لەهەڵەبـجە شـەوانە لەمـاڵە دۆسـەکانماندا ئەخەویـن زیـاتر هەوڵ ئەدەیـن بەنهێنـی بچیـنە ماڵەکـان، ئەم شـەو شـەوی ٢لەسەر٣ی/١٢ لەماڵی کاک بەهمەن حەمەرەشید بووین، بەهـمەن پیـاوێکی سـەخیە، یەکێتیەکـی دڵسـۆزە، ئەم مـاوە گـرانییەو لەهەڵەبـجەو هەورامانـدا ئیشوکار کەمە، بەهمەن هیچ سەرچاوەیەکی ژیانی نییەو بەقاتر دارفرۆشـی دەکات، لەهەڵەبجەوە بەیانی ئەڕوات بۆ چیاکانی دەوروبەری هاوار و ئێوارە ئەگەڕێتەوە، ڕۆژی دوایی بارە دارەکەی ئەفرۆشێ.

ڕۆژی١٢/٣ پێـنج شـەممە لەدەوام بـووین و چەنـد دەروێشـێکی حەزرەتی شێخ عوسمانی دوورود هاتن بۆمەڵبەند، ووتیان ئێمە لە گونـدی حەسەنە کەڕە دائەنیشین و ڕانە (گەلە) مەڕەکانی شێخ بەخێو دەکەین، خەڵکی دەوروبەر نارەحەتمان دەکەن بەتایبەت لەهەمووڵاوە خەڵک دێن بۆ بڕینەوەی داربەڕوەکـان ئەیبەن بـۆ سـوتاندن، کاتێک ئەچـین داوا دەکەیـن دار نەبـڕن هەڕەشەشمان لێدەکەن، ئاگاداری ماڵی شێخمان کردووە ئەوانیش وەڵامیان بۆ ناردوین سەردانی جەنابت بکەین و ئاگادارت بکەیـن لەبارودۆخەکەمـان. منیش بەڵێنم دانێ بەیانی ١٢/٤ ڕۆژی هەینییە سـەردانیان بکەم بـۆ ئـاوایی حەسەنە کەڕە.

حەسەنە کەڕە یان حەسەنە کاڕێ ناوی ئەو ئاواییەیە ئەکەوێتە سەر جادەی نێوان ئاواییەکانی چنارەو سیارەیی نێوان دەربەنیخان و زەڕاییەن، لەدوای سـاڵی ١٩٨٧ چـۆڵ کرابـوو بووبـووە نـاوچەی قەدەغەکـراو، مـاڵی

شێخیش لەئاوایی خارگێلانی لای هەورامانەوە دەرکرابوون و گەلەو گۆتالیان هێنابووە ئەمبەری تانجەرۆ، ئەو ئاواییەیان لای خاوەنەکەی کەسلێمان بەگ بوو کڕیبوو، مەڕومالاتیان گواستەوە ئەوێ و گەلەخان و مالیشیان لێ دروست کردوە، جگە زەوی بەراو و ئاوی باش بۆ کشتوکاڵ، مەساحەیەکی بەرین و فراوان لەوەڕگەو مەرتەع و لێرەواریشی هەیە، شێخ ناوەکەی گۆڕیوە بە حەسەنە گەورە.

بەڵی ڕۆژی١٢/٤ چووم بۆ ئاوایی حەسەنە گەورە و سەردانم کردن منداڵەکانیشم لەگەڵ خۆم برد، ناوچەیەکی دڵگیرو تەختایی و ئەمبەرو ئەوبەری پڕلێرەواری (جەنگەڵ-دارستان) داری بەروە، میواندارییان کردین. کاک شێخ ئەنوەری عەبابەیلێی و کاک عەزیزیشمان لەگەڵ خۆمان بردبوو. لەوێ بەڵێنم دانێ لەگەڵ کاک حەمەقاشتی لەدەربەندیخان و لەشارەزووریش لەگەڵ خزمانی خوالێخۆش بوو حاجی ڕەفعەتی تەرخانی و کاک سەرحەدی خەلیفە یونس روخزایی و کاک مارف ئاغای گەلالی قسە بکەم خزمانیان ڕاسپێرن ئاگایان لەماڵی شێخ بێت بەتایبەت بۆبڕینەوەی دارەکان، ڕاستە گرانییەو سوتەمەنی دەس ناکەوت و خەڵک هەژارە، ئەگەر هەر دار ئەبڕنەوە لەدوری ماڵەکانەوە بیبڕنەوە. لەڕاستیدا هەموویان هاوکار بوون.

ئەمڕۆ شەممە١٩٩٨/١٢/٥ پێش نیوەڕۆ کۆبوونەوەی ئەنجومەنی کارگێڕی مەڵبەندمان ئەنجامداو کاروباری حزبی بەشەکانمان بۆ مانگی ١٩٩٨/١١ هەڵ سەنگاند و بەرنامەمان بۆ مانگی ١٢ دانا. دوای نیوەڕۆش من و چەند هەڤاڵێک سەردانی مزگەوتمان کرد بۆ بەشداری لەڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمی خزمێکی کاک کەمال تاماس، دواتر سەردانی ئاوایی دوانزە ئیمامان کرد بۆبەشداری پرسەیەکیتر.

ئەمڕۆ ١٢/٦ یەک شەممە لەگەڵ هەڤالانی مەڵبەند لەوانە ئەحمەد قەدەفەری، مامۆستا فەتاح کۆکۆیی، مامۆستا عوسمان عەبدوڵا، مامۆستا عەبدولا بەڵخەیی و چەندین کادریترو نزیکەی ٢٠ بیست پێشمەرگە سەردانی ئاوایی بەشی پیرکمان کرد لەسەر دەریاچەی دەربەندیخان، ئەم ئاواییە شەمێرانی نشینەو شەمێرانییەکان هەموویان دۆستایەتی و تێکەلاویان لەگەڵ ئێمەدا هەیە، بەهەموو بیرو بۆ چوونە جیاوازەکانەوە. پێشوازی و میوانداریەکی گەرمیان کردین، نیوەڕۆ لای ئەوان نانمان خوارد. پاش نیوەڕۆ

بەشێک لەهەڤاڵانمان گەڕانەوە و ئێمەش بەشێکمان لەدەریاچەکە پەڕینەوە و چووینە ئەوبەر سەردانی ئاسەوارو وێرانەی قەڵای پشت قەڵای شەمێرانمان کرد. دواتر سەردانی ئاوایی سەرشاتەی تاوگۆزی نشینمان کرد دواتر چووین بۆسەردانی ئاوایی زمناکۆ و چەندین ماڵە دۆستنمان بەسەر کردەوە لەوانە ماڵی پێشمەرگە دێرینەکان، فایق و ئەحمەد و سابیر و خزمانی تریش هاتن ولەوێ کۆبوونەوە ، ئێوارە هاتینەوە بۆ ئاوایی توڵەبی شەمێران شەو لەماڵی کاک حەمەرەشید ماینەوە یەکێکە لەدۆستە ئازیزەکان خێزانی خەڵکی هۆرێن و ژنێکی میوان دۆست و بەدەست و بردە.

بەیانی رۆژی ١٢/٧ هەستاین و لەدوای نان و چا خواردن لەڕێگەی دەربەندیخانەوە گەڕاینەوە، لەگەڕانەوەدا لەئاست ئاوایی کۆکۆیی شەمێراندا لامان داو سەرکەووتین بۆسەر کانی وزمان، ئەم کانییە ئەکەوێتە نێوان هەردوو چیای زەواڵێ و بەردە دووکون، کاتێک سەردەکەوێ بۆنێوان ئەو دوو لوتکە، چیایەکی سەر بۆ ئاسمان هەڵبڕیوە، بەناو ئەو سروشتە جوانەدا گوزەر دەکەی کەهەر لەپێنارەوە جادەی خاکی و سەربازی عێراق دروستی کردوە، پێچاوپێچ سەردەکەوێ و بەلای کانییەکەدا گوزەر ئەکا تا ئەگاتە سەر ملە، راست لەنێوان هەردوو لوتکەکەدا کۆتای دێت.

جادەی خاکی بەناو جەنگەڵ و داربەڕوە پیرو کۆنەساڵەکاندا بەجۆرێکە، لەزۆر شوێن دا شۆفێرو سەرنشینانی ئۆتۆمۆبێلی دواوە ئەوەی پێشی خۆیان لێ دیار نامێنێ، جارجارو تازیاتر بەرز ئەبیتەوە لەسەر پێچەکاندا لائەکەیتەوە پانتایی شین و مەنی ئاوی دەریاچەکەت لەسەرعارەبان، بەپانی لەنێوان توڵەبی و کانی کەوە و چەمەڕەش لەبەری چەپەوە و تون و کانی خان لەبەری راستەوە، بەدرێژایی لەنزیک دیواری بەربەستە بۆدواوانی زەڵم و تانجەرۆ، لەلایەک و سیروان لەلاکەی ترەوە، بەپەلەکانی ئەمبەرو ئەوبەرەوە کە ئاوەکەیان کشاندوە بۆناو دەراو چۆمەکان دیمەنێکی هەرگیز لەبەر چاو ون نەبوو دەکەوێتە بەرچاوت.

تازیاتر سەرکەویت لێرەوارەکە چڕتر ئەنوێنێ چوونکە لەئاوەدانی دوورترەو تەوری دار بڕینەوەی پێنەگەیشتوە. ئەم بەرو ئەوبەر نزارو خۆرەتاو، شیواو شیو و دۆلاو دۆڵ، ئاهەنگ و ئاوازی تێکەلاو لەتیمی قاسپە قاسپی کەو، تیووتیوەی مرەڕەش و تریکەی سمۆرە و قژەقژی قژاڵکە،

فیکەفیکی قوڵتەو پیقەی کەڵی کەڵ هەرز، چ ئاوازدانەرێک داینـاوە خودایـا؟ جگە لەدانەری تۆیی زەمان نەبێ؟

تەیموری لەنگ لەبیرەوەریەکانی خۆیدا ئەڵێت: هەرکەس ئەیەوێت لەژیانیدا دیمەنێک ببینێ و هەرگیز لەبیریدا نەسڕێتەوە، بابچێت لەئاستەر ئاباد ڕووبکاتە دەریای خەزەر ببینێ چۆن لەئاسۆدا شینایی ئاو ئاسمان بەیەکەوە نوساون.

منیش ئەمەوێت بڵێم هەرکەسیش ئەیەوێت لەوڵاتی مندا دیمەنێک ببینێ و قەد لەبەر چاویدا ون نەبێت، بابڕواتە سەرملەی نێوان زەواڵی و بەردە دوکون، زەواڵێ لای چەپی بێ و شانی بەردە دووکون لای ڕاستی، ڕووبکاتە باشووری ڕۆژ هەڵات، بەردەمی (مۆردکە و بانی بۆلان و بێمارۆک و زارێن)ە[1]، چاو بگێڕێ لەدەستی چەپی باڵانبۆ و سەرسورەوان ببینێ، لەدەستی ڕاستی قەواڵێ و خۆشک و بەمۆ، ئینجا بەسەر وڵاتی حەزرەتی مەولەویدا، بەرەو باشووری خۆرهەڵات باوەجانی نشین و وڵاتی پارسانان بخاتە بەر دیدی خۆی، تاببینێ چۆن ڕەشایی قوللەکانی داڵەهۆو باوە یادگار، بێزەل و کۆیلەو ماکوان چەقیونەتە شینایی ئاسمان.

یەکێک لە ئەرکە سەرەکیەکانی حزبایەتی بەسەر کردنەوەی کەسوکاری شەهیدەکانە، ئەمە بۆ ئەو حزبانەی کوردستان کەهێزی پێشمەرگەیان هەبووە و لەمەیدانەکەدا ڕووبەڕووی داگیرکەران و دوژمناندا وەستاونەتەوە، یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەم بوارەدا لەپێشی پێشەوەیە. ئەرکەکەش زیاتر ئەکەوێتە سەرشانی کادرەکانی ڕێکخستن و دوای ئەوانیش ئۆرگانەکانیتر، بەسەر کردنەوەی ئەم توێژە لەژیانی حزبایەتیدا ئەبێ بەردەوام بێت. بەداخەوە ئێمە بۆ ئەم ئەرکە نەبەرنامەمان هەبووە و نەبەردەوامیش بووین. لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ کەوە زیاتر لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا بەبێ بەرنامەو بەپچڕپچڕی و بەناڕێکوپێکی دەستمان داوەتە جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە. من پێشتر کەلەفەرماندەیش بووم تالەتوانامدا بووبێت هەوڵی بەسەرکردنەوەی هەڤاڵە شەهیدەکانی سنووری

[1] ناوی سێ ئاوایی نشینی تاوگوزین. بێمارۆکیش کانیاو هەوارگەو زەویەکی کشتوکاڵ هەمان ناوچەیە.

ئۆرگانەکەی خۆمانم داوە. بەڵام دوای گواستنەوەم بۆ ناو ڕێکخستن نییەتم هێناو ئەمویست لەسنووری مەڵبەندی شارەزووردا ئەم ئەرکە بەتەواوەتی ڕاپەڕێنم بەڵام سەرکەوتو نەبووم.

ڕۆژی ١٩٩٨/١٢/٩ چوارشـەممە لەسلێمانییەوە هـاتمە شـارۆچکەی عەربەت سەردانی کۆمیتەی شـەهیدان و کەم ئەندامانی شارەزوورم کرد، لەگەڵ بەرپـرس و ئەنـدامانی کـۆمیتەکە کۆبـوومەوە، بەرپرسی کـۆمیتەکە هەڤاڵی کەم ئەندام کـاک عومەری حاجی مەحمودی ئاوایی تەپەتۆڵەکەی شارەزوور بوو، ناوبراو پێشمەرگەی دێرین و لەشەڕدا بریندار بووە، بریندار بوونەکەی بووەتە هۆی لەدەست دانی لاقێکی.

ستافی کۆمیتەکەش هەر کەسوکاری شەهیدان بوون، سەرەتا لەگەڵ ئەواندا ئەوەمان باسکرد بەرنامەیەک دابنێین بۆ بەسەرکردنەوەی کەسوکاری شـەهیدان. دوای کۆبوونەوەکەمـان، کـاک جەمیل هەورامـی هـات و چووینە بارەگـای کـۆمیتەی تـانجەرۆ لەگەڵ ئەنجـومەنی کـۆمیتەدا کۆبـووینەوە، سەبارەت بەئیشوکارەکانی سنووری کۆمیتەکە قسەمان کرد

دوای ئەو کۆبـوونەوە، مـن سـەردانی بارەگـای یەکێتـی ژنـانم کـرد گوڵزارخانی نەقشبەندی بەرپرسی ژنـانی شـارەزوورە، گوڵزار خـان، کچی شێخ تائیبی شـێخ عـومەری نەقشـەبەندیە، پوری شـەهید شـەوکەتی حـاجی موشیرە لەبیارە، ساڵی ١٩٩٧ بـووەتە بەرپرسـی لقی شـارەزووری یەکێتی ژنانی کوردسان، لەساڵی ١٩٩٩دا گەڕاوەتەوە سکرتاریەت و بووەتە ئەندامی سکرتاریەتی یەکێتیەکەیان، لەسەر دەستی ئەو لقەکە گەشە کـردن و پێش کەوتنـی بەخـۆوە بینـی، چـالاک و خۆنەویسـت و خۆشەویسـت بـوو. لەشارەزوردا ڕێکخستن و خەباتی ژنان کەموکورتی زۆرە، هەرچەندە لەچاو هەندێک ناوچەی کوردستاندا باشترە، هەندێک کەموکورتیان هەبوو داوایان کرد بۆیان جێبەجێ بکەین، ئێمەش بەڵێنمان دانێ بۆیـان چارەسـەر بکەیـن، بەمەرجێ ئەوەی ئەو کێشەو گرفتانەی نێویەکێتیەکەیان چارەسـەر بکەن و ئێمەش لەچارەسەر کردنەکەدا هاوکاریان بین. کۆمەڵەو ڕێخراوەکانی ژنـان هەمێشە کێشەیان لەهی پیاوان زۆرترن.

دواتر پێکەوە پێشـانگای هونەرمەنـدانی شـارەزوورمان لەنـاو بینـای خوێندگایەکدا کردەوە. پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ لەگەڵ هەڤاڵانی مەکتەبی

شەهیدان سەردانی ژمارەیە ماڵە شەهیدمان کرد، سەرەتا لەئاوایی گردەنازێ، سەردانی ماڵی لەعلەخانی خێزانی شەهید مامە ڕەوفی حاجی سابیرو منداڵەکانیمان کرد، دواتر چووینە شارۆچکەی سیروان و ماڵ ومنداڵ و خێزانی شەهیدان مستەفای حەمەی شەمەی تەپەگولاوی و حاجی عەلی و تاهیرە بچکۆل و شەهیدێکی تری خەڵکی ئاوایی کاگردالمان کرد.

هەر ئەمڕۆ و دوای سەردانی شارۆچکەی سیروان، لەشاری هەڵەبجەدا سەردانی ۳۰سی ماڵە شەهیدمان کرد. سەردانی کەس و کاری شەهیدان بۆمن لەلایەک دڵ خۆش و ئاسودەم دەکات، لەبەر ئەوە ئەرکی سەرشانم جێبەجێ کردوە. لەلایەکی ترەوە دڵگرانم دەکات، بەهۆی بینینی منداڵە بێنازەکانیان و سەختی گوزەرانیان، هەروەها بەهۆی گێڕانەوەو بیستنی ئەو داستانە تاڵ و پڕماجەرایانەی بەسەریاندا هاتوە.

ئەمڕۆ پێنج شەممە۱۹۹۸/۱۲/۱۰ لەنەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی بووم، یەکێک لەپێشمەرگەکان بەناوی ئیقباڵ سەعید کەبرامە نەخۆش بوو، کاک د.تاهیر هەورامی عەمەلیاتی ڕیخۆڵە کوێرەی بۆکرد، کاک تاهیر پێی وتم  کاتی سڕکردن دڵی وەستاوە بەدەستگا هێناومانەتەوە.

سەر لەبەیانی ئەمڕۆش شەممە ۱۹۹۸/۱۲/۱۲ چووم بۆ ئاوایی قەرەگۆل بۆ بەشداری کردن لەرێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی، خوشکی مام واحدی مکائیلی، مام واحد بەرپرسی دەستەیەک پێشمەرگەیە پیاوێکی کۆمەلایەتیی و ئیشکەرە. تیرەی میکائیلی، سەربەهۆزی گەورەی جافن، سەرەتا ئەم تیرە لەناوچەی جوانڕۆ لەئاوایی دەوان یان دەودان لەنزیک ناحیەیی باینگان لەکوردستانی ڕۆژهەلات ژیاون، لەوێوە بەشێکیان کۆچیان کردوە بۆباشور، سەرەتا لەکێلە سپی(سیروان) لەنزیک قۆرتاس ماوەیەک نیشتەجێ بوون، دواتر کۆچیان کردوە بەرەو قەرداغ و لەوێوە بلاو بوونەتەوە، جافە ڕەشکەش سەر بەتیرەی میکائیلین، مەزارگەی پیرمیکائیل لەئاوایی دەوانە، لەسنوری ناحییەی باینگان، سەربەفەرمانداری پاوەیە لەپارێزگای کرماشان. دواتر چووم بۆ بەشداری پرسەی برای مام ناجی قاجری لەهەڵەبجەی تازە، مام ناجی پێشمەرگەی دێرین و کەم ئەندامە، لەدوای ئەنفال و کیمیاباران لەگەڵ مەفرەزە پارتیزانەکاندا هاتبووە خوارەوە

لوغمی پێدا تەقیوەو لاقێکی لەدەست داوە، لەکادرە دڵسۆز و ماندوەکانی یەکێتی نیشتیمانی و رێگای کوردایەتیە.

پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆ گەڕاینەوە بارەگای مەڵبەند، دوای ئەنجام دانی کارو فەرمانی فەرمی ناو مەڵبەندەکە، سەردانی ئەو ژنانەمان کرد کەخولی فێربوونی خوێندن و نوسینمان بۆکردونەتەوە، لەنزیکەوە لەرەوشی بەرەو پێشچوونی دەورەکەمان پرسی و دەست خۆشیمان لەمامۆستاکانیان کرد. دوای ئەم بەسەرکردنەوەیە لەگەڵ هەڤالانی کۆمیتەی هەڵەبجەدا سەردانی ماڵی چەند دۆستێکی خۆمانمان کرد، لەوانە فەرەجە سوری بۆینی، حاجی جەباری وەلی، داود بەگی دەرەشیش ئەمانە تێکۆشەری دێرین و خەباتگێری بەردەوامن. دوا سەردانی ئەمڕۆمان بۆلای کەسوکاری خوالێخۆش بوو عەبدولای خالێی نەورۆلی باوکی کاک خەلیلی هونەرمەندو مۆسیقار بوو، بۆ پرسەوسەرەخۆشی لێیان.

بۆبەیانی رۆژی یەک شەممە١٢/١٣ دوای ئەنجام دانی ئیشوکاری مەڵبەندو پێشوازی و بەڕێکردنی میوانەکان، لەگەڵ چەند هەڤاڵێکدا چووین بۆ شارۆچکەی هەڵەبجەی نوێ. لەوێ لەگەڵ هەڤالانمان لەو کۆمیتەیەدا بەشداریمان کرد لەڕێوڕەسمی پرسەی خوالێخوش بوو حاجی ئەولای زەڵمی باوکی کاک عەلی بەرپرسی فەرمانگەی ئاوی ئەو شارەو هەروەها دواتر بەشدار بووین لەرێوڕەسمی پرسەی پیاوێکی تری شەمێرانیدا.

ئەمڕۆ ١٢/١٤ چوومە سلێمانی سەردانی فەرماندەیی گشتی هێزی پێشمەرگەمان کرد، فڕۆکەی کۆپتەری نەتەوە یەککگرتووەکان بەسەر شاری سلێمانیدا خول ئەخوا، شەو لەسلێمانی مامەوە، شیروانی برام لەسویدەوە قسەی لەگەڵ کردم، ووتی ئەدیبەی خوشکم لەگەڵ دوو منداڵەکەی ئەسیرو فرمێسک معامەلاتیان تەواو بووە بۆسەفەری وولاتی سود ئەبێ لەم رۆژانەدا لەتاران خۆیان بناسێنن بەسەفارەتی وولاتی ناو براو، ئەدیبە خێزانی شەهید کەیکاوس کۆکۆییە، لەگەڵ ئەم دوومنداڵەیدا شیروان هەوڵی داوە بیانباتە ئەوروپا، مام جەلالیش هاوکاری کردون، ئەوەبوو هەر ئەمساڵ سەفەرەکەیان کرد.

ئەمشەو شەوی ٧ لەسەر٢٠١٧/٥/٨ خەریکی نوسین و پیت چنینی ئەم یاداشتو بیرەوەریەی ١٩٩٨/١٢/١٤ بووم شتێکی سەیر روویدا، کاتێک

ناوی ئەسیرم ئەنوسی دەنگی زەنگی مەسنجەر هات، دەستم بۆ موبایلەکەم بردو نامەکەم کردەوە ئەسیر پارچە ڤیدیۆیەکی ناردوە هی خۆیەتی لەئاسمانی سەرزەوی وولاتی نەرویج فڕۆکەوانی دەکات و گۆرانی هەورامی لێ دەدات، لەژێریا نوسیویەتی (یەکەم گۆرانیەی هەورامیە ئاسمانێ) واتە بۆ یەکەمجار گۆرانی هەورامی لەئاسمانەوە. ئەسیر ئێستا فڕۆکەوانە. لەوولاتی سوئێد خوێندنی تەواو کردوە، لە بەشی فڕۆکەوانی لەساڵی ٢٠١٦ بۆ ٢٠١٧ لەو وولاتدا ١٤ چواردە خوێندکار بەرندە بوون یەکێکیان ئەسیر کوڕی شەهید کەیکاوسە، ئێستا لە شاری یوتۆبۆری بەشی پراکتیکی تەواو ئەکات، بۆفڕکەوانی فڕۆکەی نەفەر هەڵگر، لەمانگی٢٠١٧/٤ دا دوجار فڕیوە و بەسەرکەوتویی نیشتوەتەوە.

ئەم ماوە ئێمەو لایەنە سیاسییەکان لەشارەزوورو هەڵەبجە و هەورامانـدا بۆ زیاتر ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکەو باشترکردنی پەیوەندیەکانمان سەردانی یەکدی دەکەین، ئەم سەردان و بەسەر کردنەوانە زیاتر لەنێوان مەڵبەندەکان و لقەکاندایە، بارەگا سەرەکیەکانی هەموو لاشمان لەناوشاری هەڵەبجەدایە، لەو چوارچێوەدا ئەمرۆ١٩٩٨/١٢/١٥ دوای کۆبوونەوەیەک لەگەڵ فەرماندەکانی لەشکرە تایبەتەکەی مەڵبەندی شارەزوور، لەگەڵ هەڤالانی مەڵبەندا لەبارەگای مەڵبەند پێشوازیمان کرد لەوەفدی مەڵبەندی ٣سێی راپەڕینی ئیسلامی.

بارەگای مەڵبەندی ٣سێ راپەڕین لەهەڵەبجەی تازەدایەو کاک حەمە سینەمۆکی بەرپرسیانە، لەکۆبوونەوەیەکی دۆستانەدا باسمان لەچارەسەر کردنی ئەو کێشانە بەگفتوگۆی ئاشتیانە کرد، کەلەنێوان ئەندامان و هەڤالانی هەردوولاماندا جارجار روو دەدەن، حەمە سینەمۆکی گەنجێکی وردو عاقڵە. داوای کرد لەسنووری قەزای شارەزووردا زیاتر هاوکاری یەکبین، ئێمە زیاتر هاوکاریان بین بەتایبەت لەئیدارەکانی حکومەت دا، ئێمەش بەڵێنی هاوکاری زیاترمان دانێ.پاش نیوەڕۆی هەمان رۆژ لەگەڵ برادەرەکانم مزگەوتی دارولئحسانی هەڵەبجەدا بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی خوالێخۆش عەبدولعەزیز خەڵکی تەوێڵەی ناوچەی هەورامانمان کرد، ناوبراو ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستانەو لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کردوە.

سیاسەت کردن و حزبایەتی لەم سەردەمەو لەکوردستان دا ئەوەندە قێزەون بووە، شیرازەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکانیشی تێک داوە، وای لێهاتوە ئەوانەی کینە لەدڵ و زۆرتەسک بیر دەکەنەوە بەشداری رێوەڕەسمە کۆمەڵایەتییەکانی یەکدیش ناکەن.

دوای پرسەکە سەردانی کاک مەعروف حەمەئەمین خەڵکی تەوێڵە، پیاوی کورد پەروەرو دۆستی یەکێتیمان کرد، باوکی هەڤاڵان پەیام و رزگار.... شەویش لەبارەگای مەڵبەند بووم و دوو چەکداری لایەنێکی تر هاتبوون بۆ لامان، لەماڵی هاوولاتیەکی دراوسێی مەڵبەندا چاوم پێکەوتن، لەسەر کێشەی کۆمەڵایەتیی لەناوچەی بازیانەوە هاتبوونە هەڵەبجەو چەکی ئیسلامیەکانیان وەرگرتوە، داوایان دەکرد ئێمە هاوکاریان بکەین و ئەوانیش لەنێو لایەنەکەی خۆیاندا کار بۆ ئێمە بکەن. من بەڵێنم نەدانێ، بەڵام رازیم کردن وازبهێنن و چەکەکانیان تەسلیم بەولایەنەی خۆیان بکەنەوەو لەماڵی خۆیان دانیشن، ئەگەر چەکداریش دەکەن ئەوە لای خۆمان ئەیان کەین بەپێشمەرگە، تائەوکاتەی کێشەکەیان چارەسەر ئەبێ.

دواتر کێشەکەیان چارەسەر کرا، ئەوانیش وازیان هێنا لەچەکداری، پاش ماوەیەک داوایان کرد نوسراویان بۆبکەین بگەرێنەوە سنووری خۆیان، ئێمەش نوسراومان دانێ و ئاگاداری مەڵبەندی سلێمانیمان کرد لەوازهێنانەکەیان .

ئەمرۆ چوارشەمە ١٢/١٦ دوای تەواو کردنی ئیشوکاری مەڵبەندو راییکردن وبەرێکردنی میوان و ئەو هاوولاتییانەی بۆ ئیشوکاری جیاجیاو جۆراوجۆر روو لەمەڵبەند دەکەن، مزگەوتی جمهوری شاری هەڵەبجە بەشداریمان کرد لەرێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی خوالێخۆش بوو عەبدوڵای ئەمنە، هەر ئەمرۆ بەئامادەبوونی بەشێک لە کادرەکانی ئەنجومەنی مەڵبەندو کۆمیتەی هەڵەبجە لەماڵی هاوولاتی و دۆستی یەکێتی حاجی حەسەنی کۆساوایی کۆبوونەوەیەکمان کرد، لەگەڵ ئەندام و دۆستەکانمان، زۆربەی خزمانی ئاوایی کۆساوا لەو کۆبوونەوەدا ئامادە بوون.

دوای ئەم کۆبوونەوە لەگەڵ کاک جەبار جەلال کارگێری مەڵبەندو بەشێک لەهەڤالاندا چووین بۆ ئاوایی خێڵی حەمە، لەوێ بەشداریمان کرد لەخولی کۆتایی یاری ئاشتی، ئەم خولە لەلایەن وەرزشەوانانی تیپە

میلەیەکانی ئاوایییەکانی دێ کۆن، ئاوایی شەکرالی، هەردوو ئاوایی بەشارەتی سەرو خوارو، ئاوایی شەشک، هەردوو ئاوایی تەپی سەفاکان و خێڵی حەمەدا بەڕێوە دەچوو. ئەمساڵ تائێستا باران نەباریوە، هەواو ژینگە تۆزاوی و پیسە.

ئەمشەو شەوی ١٦ لەسەر ١٩٩٨/١٢/١٧ ئەمەریکا بەفڕۆکە، ٣٠٠سێ سەد ساروخی تۆماهۆکی کێشا بەشاری بەغدادا، ئەمە لەتۆڵەی سەرپێچیەکانی سەدام حسێن دا، شەوی ١٧لەسەر١٨ی ١٩٩٨/١٢دا ئەم ساروخ بارانە بۆسەر بەغدا دووبارە بووەوە و فڕۆکەکانی بەریتانیاش بەشدار بوون لەو لێدانەی عێراق دا. شەوی ١٨لەسەر١٢/١٩دا بۆجاری سێهەم درایەوە لەعێراق، روسیا لەسەر ئەمە نیگەرانی خۆی دەربڕی و بڕیاری دا سەفارەتەکانی لەئەمریکا بکێشێتەوە.

رۆژی ١٢/١٩ لەشارۆچکەی سەیدسادق دووکۆبوونەوەم کرد، یەکەم لەگەڵ ستافی رادیۆی شارەزوورو دووەم لەگەڵ فەرماندەو پێشمەرگەکانی هێزی یەکی لەشکری تایبەت، دواترو هەرئەمرۆ سێ کۆبوونەوەی جیاجیام کرد لەگەڵ هێزەکانی تری لەشکر، لەهەڵەبجە و زەمەقی و سیروان.

لەرۆژی ١٢/٢٩دا لەشاری سلێمانی بووم، سەرلەبەیانی کاک فەرەیدونی غەفور کارگێری کۆمیتەی هەڵەبجە ناسراو بەفەرەیدونی حەبێ، سەردانی کردم و چەکدارێکی بزووتنەوەی ئیسلامی هێنابوو بۆلام، فەرەیدون یەکێکە لەکادرە چالاک و نموونەییەکانی یەکێتی لەهەڵەبجەدا، نموونەی ژیروی و بەوەفایی و بێدەنگیە.

ئەو چەکدارەی بزووتنەوە ئەمرۆ هێناویەتی بۆلام، خەڵکی ئاوایی سەراوی ناوچەی نەورۆڵیە پاسەوانی رابەری بزووتنەوەو بەرپرسی جبەخانەیان بوو، ئەم کورە وازی هێنابوو لەبزووتنەوە. دوای بینینی دەست خۆشی و داوای سەرکەوتنم بۆکرد، بەڵێنم دایە دەستگا ئەمنی و سەبازیەکان ئاگادار بکەم لەواز هێنانەکەی. هەر ئەمرۆ سەردانی فەرماندەی گشتیم کرد و چوومە بەشی رووناکبیری، بۆ بەسەرکردنەوەی ئەو کارمەندانەی کتێبی وەرگێڕدراوی تەیموری لەنگ، پیت چین (کۆمپیوتەر) دەکەن بۆم.

ئەمرۆ چوار شەممە ١٢/٣٠ /١٩٩٨خەریکی واژۆ کردنی کارتی پیرۆزبایی بووم بۆلایەنە سیاسییەکان و ئۆرگانەکانی یەکێتی و کەسایەتییەکانی سنوورەکەمان بەبۆنەی هاتنی ساڵی نوێی ١٩٩٩ی میلادیەوە.

هەر ئەمڕۆ کاک عەدنانی حەمەی مینا لەوڵاتی سویدەوە کارتی پیرۆزبای بۆ ناردوم، کاک شەوکەتی حاجی موشیریش لەلەندەنەوە بەفاکس پیرۆزبایی هاتنی ساڵی نوێی لێکردوم.

کەش و هەوای سلێمانی و ناوچەکە هەورو باراناوییە، بڕیارە لەم رۆژانەدا جەنابی مام جەلال سەردانی کاک مەسعود بەرزانی بکات لەسەلاحەدین. هەر ئەمڕۆ بەشداری رێوڕەسمی پرسەی دادە شیرینی براخاس، خوشکی مام وریا هاواریمان کرد، دواتر بەشداری رێوڕەسمی پرسەی خەزوری کاک عومەری حاجی عنایەتمان کرد.

پێنج شەمە رۆژی ۱۹۹۸/۱۲/۳۱ دوارۆژی کۆتایی ساڵی ۱۹۹۸ تە، ئەمڕۆ ساڵێکی تەواوم بەرێکرد وەک جێگری مەڵبەندی رێکخستنی شارەزووری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، ئاسودەم بەوەی بێ دودڵی و قەلەقی بەدڵسۆزی و بەگەرم و گوڕییەوە چالاکانە ئەرکەکانی سەرشانم ئەنجامداوە، هەوڵی سەرکەوتنی رێبازەکەی خۆم داوە کە کوردایەتیە و خزمەتی گەلەکەمە، لەڕێگای بەرنامەکانی یەکێتیەوە. بەهیوای ئەوەی لەم ساڵی نوێی ۱۹۹۹دا هەروا بەردەوامبم و لەپاڵ سیاسەت و خزمەت کردنەوە، بتوانم لەبوواری خوێندنەوە و نوسین و وەرگێڕانەوە هیمەتی زیاتر بکەم لەو رێگایەشەوە کەبەراستی کورد کەموکورتیمان زۆرە کەلێنێک پڕبکەمەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا تەمەننای ئەوە دەکەم، شەڕو گرژی ئاژاوە لەنێوان خۆماندا بنەبڕ بکرێت. هەموو تواناکان یەک بخرێن بۆ بەدەست هێنانی مافە رەواکانی گەلەکامان. گومان لەوەدا نییە یەککگرتوو و یەکدەنگ و یەک هەڵوێست نەبین رەنج بەخەسارین. بەداخەوە تائێستا رێککەوتن نامەی واشنتۆنی نێوان یەکێتی و پارتی، نەخراوەتە بوواری جێبەجێکردنی تەواوەوە. ئاسۆی بارودۆخی سیاسی عێراق بەڕونی بەرەو ئەوە دەچێت ئەم رژێمە دیکتاتۆرە نەمێنێ، یەکێتی نێوان کورد خۆی و کورد و ئۆپۆزسیۆنی عێراق پێویستی ئەم سەردەمەیە، ئەوەتا عێراق هەڕەشە لەئەمەریکا و بەریتانیا گەورەترین هێزەکانی دنیا دەکات، سازمانی مللەل(رێکخراوی نەتەوەکان) زۆربەی وڵاتانی ئەندامی سازمان خوازیار و داواکارن عێراق بڕیارەکانیان جێبەجێ بکات. ئەوانە دوپاتی دەکەنەوە گەلانی باکوورو باشووری عێراق ئەپارێزن، عێراقیەکان خۆیان دڵنیان لەوەی عێراق بڕیارەکان جێبەجێ ناکات و ئەوانیش

لێی دەدەن، ئەوەتا حەمەسەعید سەحاف بەتورکیا دەڵێت: رۆژێک دەبێت پەشیمان ببیت لەوەی خاکەکەت ئەخەیتە ئەختیار ئەو دەوڵەتانە بۆلێدانی ئێمە.

هەر ئەمرۆ سەبارەت بەئیشوکارو بارودۆخی مەڵبەندەکامان، نامەیەکم بۆ مام جەلال نوسی، لەگەڵ نامەیەکی کاک شەوکەتدا کەلەئەوروپاوە بۆخۆمی نوسیوە ناردمن بۆ مام جەلال، نامەکەی کاک شەوکەت هەندێک پێشنیار بوون بۆمن تالەسنووری شارەزووردا کاریان لەسەر بکەم و مەبەستم بوو مام ئاگادار بێت لەو پێشنیارانەو گلەیشی تێدابوو لەیەکێتی.

لەبەر دوو هۆکار ناوەرۆکی نامەکەم ئاشکرا نەکردوە، یەکەم مافی من نییە، دووەم رۆژێک دەبێت یەکێک لەو بەرێزانە لەبیرەوەریەکانی خۆیاندا دەقی نامەکە بڵاو دەکەنەوە. پاش نیوەڕۆش سەردانی ئەنجومەنی وەزیرانم کرد، کاک عومەر عەبدولڵام بینی کاک کۆسرەت لەوێ نەبوو، لەوێوە سەردانی پارێزگای سلێمانیم کرد، کاک ئاسۆی شێخ نوریم بینی، وەڵامی نامەیەکی بەڕێوەبەرایەتی خانوبەرەی سلێمانیان داوەتەوە، بەڕێوەبەرایەتی خانوبەرە خانوەکەی منیان داوە بەژنێک بەناوی فاتمەخان، لەم نامەدا پارێزگا ئەوبڕیارەو بڕیاری ٩٦ پارێزگایان، هەڵوەشاندوەتەوەو خانوەکە بووەتەوە بەهی ئێمە، ئەم خانوە لەباتی زەوی پێشمەرگە دراوە بەمن. لیژنەیەک خەملاندویانە بەبڕێک پارە کە ٢٨٠٠٠ بیست و هەشت هەزار دۆلارە، ١٦٠٠٠ شانزە هەزاری لەبری زەوی پێشمەرگایەتی ئەبەخشرێم و ئەبێ نیوەکەی تری ئەو پارە خۆمان تەسلیمی حکومەتی هەرێمی بکەین . نەمان بوو پارەکە بەسەر یەکەوە بیدەین، کاک د.بەرهەم کردی بەقیست بۆمان، چەند کەسێکی تریش بوون لەوانە کاک عەباس عەبدولرەزاق، دوای پێدانی دوو قیست لەپاشماوەکەی بەخشرایین.

# ساڵی ١٩٩٩

ئەمڕۆ ڕۆژی ١٩٩٩/١/١یە بەرامبەر بوو بەڕۆژی هەینی، بۆیە کاک کۆسرەت سەرۆکی حکومەتی هەرێم، ئیدارەی سلێمانی، بڕیاری دا ڕۆژێک زیاتر واتە ڕۆژی شەمەش بکاتە پشوو، سەرلەبەیانی ئەمڕۆ هەرچەندە پشووەو دەوام نییە، من لەگەڵ کاک دڵسۆزی محەمەد سان ئەحمەد و ئقباڵ و چەند کەسێکیتردا گەڕامەوە بۆشارەزوور، بەیانی ئەمڕۆ کەلەماڵەوە دەرچووم، دایکی منداڵەکان لەبەرخۆیەوە گلەیی دەکرد، گلەییەکانی لەسەر ئەوەبوو من هەمووکاتی خۆم تەرخان کردووە بۆ سیاسەت و یەکێتی، ئەوە ساڵی نوێیەو مناڵ بەتەمابوون بیانبەم بۆگەڕان و دیاریان بۆ بکڕم، بەبۆنەی سەرەتای ساڵی نوێوە، بەیانی داوای خەرجیان کردووە و نەبووە. جێهێشتنی ماڵ بەیانی بەجەوێکی ناتەندروستەوە بوو، لەبەر ئەوە ماڵ و مناڵەکەم بەوجۆرە جێهێشتبوو، بۆخۆم لەدڵا ناڕەحەت بووم، بەڵام بەروخسار دەرم نەدەبڕی.

لەسلێمانی دەر چوون و گەیشتینە ناو شاری هەڵەبجە، سەرەتا سەردانی بارەگای مەڵبەندو کۆمیتەی هەڵەبجەمان کرد، بۆ پیرۆزبایی ساڵی نوێ لە کارمەندەکان و پێشمەرگەکانی پاسەوان. ئەم کارمەند و پاسەوانانە بەخزمەترین و دڵسۆزترین کەسانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانن، لەهەموو ئۆرگانەکاندا لەسەرانسەری کوردستان، کەکەمترین موچەو یارمەتیان هەیەو زۆرترین ئەرک و ماندو بوون لەسەرشان و لەئەستۆیان دایە. ئەمە لەحزبەکانی تریشدا ئەو دوو بەشە بەهەمان شێوەن. من بۆخۆم لەبارەی ئەوانەوە ئاسودەم، چوونکە ئەوانە بەپێی توانا ڕێز دەگرم و هاوکاری دەکەم.

دوای ئەو سەردان و پیرۆزباییە، بەشدار بووین لەڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی خاتوو تەیبە فەرەج سلێمان، خوالێخۆش بوو دایکی هەڤاڵان کاک سەلاح و کاک حەمەئەمین(د. هەورامان) حەمەنوریە، ئەم خێزانە لەخەڵکە نیشتیمان پەروەرو سەرەتا نیشتەجێکانی شاری هەڵەبجەن، هەربۆیە بەو

بنەماڵەو خێزانانەی هەڵەبجەیی رەسەنبن، پێیان دەڵێن ئەوانە لە سیانزە ماڵەن. ئەم خێزانەش لە سیانزە ماڵەن و لەدروست بوونەوەی شۆڕشی نوێوە لەریزی رێکخستنەکانی کۆمەڵەو یەکێتی دا جێیان گرتووە و تائێستاش بەردەوامن. لەدوای پرسەکە سەردانی کاک سەرتیپ تاهیر سان ئەحمەدمان کرد، بەهۆی نەخۆشی فەقەراتەوە لەماڵەوە کەوتوە، ئێوارە گەڕامەوە بۆ سلێمانی.

گەیشتینەوە ناو شار ئۆتۆمبێلی کاک ئارازی حەمەحسێنی حاجی فەرەجم بەئامانەت بردبوو خۆم ئۆتۆمبێلم نەبوو، لەشەڕی ناوخۆدا ئۆتۆمبێلەکەم برابوو، سەرەتا چووینە ئەسحابە سپی کاک ئاراز لەوێ دوکاندارە، هێنامان ئێمە بگەیێنێ و ئۆتۆمبێلەکەی بباتەوە. کەگەیشتینە ماڵەوە ئێمە دابەزین و خوڵقێکی دەێمی کاک ئارازو کاک دڵسۆزمان کرد، باش بوو ئەوان دانەبەزین. لەدڵا پێم خۆش بوو ئەمزانی هیچمان نییە.

خۆمان کرد بەماڵدا، بەرۆژو بووین ١٤ چواردە هەمین رۆژی رەمەزانە. ئەو جەوەی ماڵ و بەیانی بەتەمابووم ئێستا ببینم وانەبوو، جەوێکی ئاسایی و ئەوەی پێشان ئەدا شتێکرووێداوە بەباری باشەو خۆشیدا. دوای دانیشتن و چاکوچۆنی، کچە گەورەکەمان دانیاڵ تەمەنی(٩) نۆ ساڵان بوو، رای کرد بۆ ژورێکی ترو هاتەوە نامەیەکی بەدەستەوە بوو، نامەکەی دامێ و ووتی کاکە نامەی مام جەلالە. لێم وەرگرتوو خوێندمەوە، مام جەلال بەبۆنەی ساڵی نوێوە نامەی پیرۆزبایی بۆ نوسیبووم، لەکۆتایی نامەکەدا بە تێبینی نوسیبووی ئەوە بەدیاریەکی چکۆلەش بەسەرم کردیتەوە، دوای چەند جار خوێندنەوەی نامەکە، دایکی منداڵەکان زەرفێکی هێناو ووتی ئەوە لەگەڵ ئەو نامەدا کورێک هێناویەتی، زەرفەکەم کردەوە پارەی تێدا بوو، ژماردم (٥) پێنج هەزار دیناری سویسری ئەوکاتە بوو.

ئیشوکاری سیاسی و حزبایەتی زۆرجیاوازە لەکاری ئیداریی و حکومەت داری، سیاسییەکان و حزبیەکان ماندوبوون و پشوودان بەلایانەوە گرنگ نییە، بەتایبەت لەسەروبەندی پرۆسەکانی هەڵبژاردنەکاندا یان شەڕەکاندا، بەشەو رۆژ کاردەکەن. لەوکاتانەدا سیاسییەکان کادرەکانی ئیداریی سەربە حزبەکانی خۆیان ئەخەنە گەڕ بۆ ئیشوکارو سەردان و بەسەرکردنەوەی خەڵک، هەندێک جار بەشێک لەکادرە ئیدارییەکان خۆیان

لەئەرکە حزبیەکان ئەدزنەوە، لەملاولەولا و بەئاشکرا دەڵێن ئێمە حزبی نین، لەکاتێکدا زۆرێک لەوانە تـا رێکخسـتنی حزبەکەیـان پشـتگیری کـردون بـۆ گەیشتن بەپۆستی ئیداریی، خۆیان بەدڵسۆزترین کادری حزبـی حزبەکەیـان نیشان داوە.

من یەکێک لەوکادرە حزبیانەم، زۆرجـار توشـی بگرەو بەردە بـووم لەگەڵ بەشێک لە کادرەکانی ئیدارەدا، لەسەر خۆدزینەوە لە ئەرکە حزبیەکان، یـان لەسـەر ئەوە بـوونەتە هـۆی زویرکردنـی خەڵـک لەیەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان، بەکـاری نـابەجێ بەشـێوازی جیـاواز جیـاواز، لەوانە: رۆتینـات، ترسنۆکی، خۆبەزلزانی و تەمبەڵی، زۆر جاریش رەشوە (بەرتیل) وەرگرتن و گەندەڵی. تا ئەمڕۆش ئەوانە بەهۆی دەستەو دەستەگەریەوە، وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون و خۆیان لەدەست سزادان و لێپرسینەوە قوتار کردوە، سەروەت و سامانی کوردستان تالان کرا، دەیان بەرپرس و کۆلکە بەرپرس لەهیچەوە بوون بەملیۆنێر، کەس نییە هەتا پارلەمانیش یەکێک بگرێ و بیداتە دادگا، تالێی بپرسن ئەمەت لەکوێ هێناوە.

لەگەڵ کادرە تەمبەڵ و هیچ لەبار نەبووەکانی حزبیشدا، جـار جـارو لێرەو لەوێ دەرگیرو توشی جۆرەها گرفت بووم. خۆم خاڵی لاوازم نییەو هەوڵـم داوە کەموکـورتیم نەبێت، بـۆ ئەوەی زاڵـبم بەسـەر بـارودۆخەکەدا، بۆئەوەی یەکێک وەڵامم نەداتەوە، بەشەوڕۆژ کـار دەکەم، بۆنمـوونە ئەمڕۆ سـەرەرای ئەوە کەرۆژی پشـووی فەرمـیە، لەبەیـانییەوە وەک ئەوەی لەسەرەوە باسم کردووە نەوەستاوم.

ئێسـتاش دوای نـان خـواردنی ئێـوارە، کەدەکـاتە شـەوی ١لەسەر٢ی/١/١٩٩٩ سەردانی نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانیم کرد، بۆ بەسەرکردنەوەی کیژۆلەیەکی خەڵکی ئاوایی سۆسەکان، لەناوچەی هەورامان، بەناوی ماریا نوری حاجی عەبدوڵا، ئەم کچە (تەبەنێ) چەقیوەتە چاوی، لەبەر ئەوە لەنەخۆشـخانە بەسـتەری کـراوە، (خەوانـدویانە). تەبەنە ئەو ئـالەتەیە سەرێکی کونی تیایە دەزوەکەی پێوە ئەکرێ، سەرەکەی تـری تیـژە تیژێکـی کۆل. کلاشی هەورامی پێ ئەچنرێ، وەک سوژن وایە بەلام وەک سوژن نیو کەوانەیی نییە، درێژی نزیکەی ٨ هەشت سم ئەبێت و ڕاستەو ڕێک.

لەم ســـەردانەم دا ئەمشـــەو، دوای ســـەردانی ماریاخـــان، هەمـــوو نەخۆشەکانی بەستەری نەخۆشخانەکەم بەسەر کردەوە. دوای گەڕانەوەم بۆماڵەوە کۆمەڵێک میوانی ترم هاتبوون، هەرچەندە درەنگانی شەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوانیش دانیشتم و یەک یەک بەڕێمکردن، میوانی دواجاری ئەمشەو کاک عەلی مامەیارەو ئامانجی کوڕی بوون، عەلی لەبنەچەدا کوردی ڕۆژهەڵات و مامەیارەی باوکی خەڵکی ئاوایی نۆریاوی نزیک شارۆچکەی پاوەیە، خزمی شەهید غەفور دەرەشیشن، ئامانجیش کوڕێکی نەوجەوانی شیرینە، ئێستا دانیشتوی ئاوایی تەپەکوڕەی شارەزوورن لەبەری هەڵەبجە. لەسەرەتای شۆڕشی نوێ و لەدروست بوونەوەی مەفرەزەکانی سەرەتاوە من ئەم بنەماڵە دەناسم و پەیوەندیمان هەیە، بنەماڵەیەکی ماندون، لەڕۆژە سەختەکاندا هاوکارمان بوون، بەتایبەت کوڕەکانی مامەیارە، عەلی و کەریم بەر لەوەی ببنە پێشمەرگە، لەڕێکخستن کاریان دەکردو پەیوەندیشیان بەمەفرەزەکانی هێزی پێشمەرگەوە هەبوو.

سەرلەبەیانی ڕۆژی١٩٩٩/١/٢ لەسلێمانییەوە خۆم گەیاندە هەڵەبجەو خۆم ئامادە کرد بۆکۆبوونەوەی ئەنجومەنی مەڵبەند، کۆبوونەوەکەمان ئەمڕۆ بۆدانانی بەرنامەی ئیشوکاری ئاسایی ڕێکخستن و حزبی و خەڵکە.

کاک جەمیل هەورامی لێپرسراوی مەڵبەندەکەیە، ئێمە هەردووکمان خەڵکی هەورامان و دۆستی نزیکی تاڵەبانی و نێوانیشمان دۆستانەو پڕمتمانەیە، بۆیە ئیشوکارەکان زۆرتر من ئەنجامیان ئەدەم و خۆیشم چاوم لەوەیە لەئایندەدا ببمە بەرپرسی یەکەمی مەڵبەندەکە بۆیە ماندوبوون ناناسم.

کۆمەڵێک کادری گەنج و کوڕی باشیش لەم مەڵبەندەدا کۆبوونەتەوە، لەگەڵ هەندێکیان هاوتەمەن و هەندێکیشیان لەمن بەتەمەنترن، بەڵام لەخەباتدا و لەناو یەکێتیدا من لەهەموویان کۆنترم. کادرەکان سەر بەدوو باڵی جیاوازن هەندێکیان خۆیان بەخەتی کاک جەبار فرمان و عومەری سەید عەلی ئەزانن و هەندێکی تریان خۆیان بەپەیرەوی خەتی کاک کۆسرەت ئەزانن.

پەیرەوانی خەتی یەکەم من بەدۆست و نزیکی خۆیان ئەزانن، هەمیشە دەردی دڵ دەکەن و شتی شاراوەیان لەمن نییە، لەهەوڵی ئەوەدام جیاوازییان نەکەم و هەردوولایان ڕێز لێبگرم، ئەوەی زیاتر ئیش کەرو چالاکە زیاتر دڵسۆزە بۆیەکێتی و کوردایەتی منیش زیاتر هاوکاری بکەم.

لەم دەمەدا ئەمانە ئەو کادرانەن لەسنوورەکەدا لەچوارچێوەی تەشکیلاتی مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزووردا جێیان گرتووە: ١- جەمیل هەورامی ٢- حەمەی حەمەسەعید ٣- فەتاح مەحمود نادر کۆکۆیی ٤- فەرەجی حەمەسالحی عەبابەیلێیی ٥- حەمەی غەفور شەریف هەڵەبجەیی ٦- عومەرحاجی ئەحمەد تەپەڕێزینە شارەزوور٧- مەحمود حاجی سالح گێلەک شارەزوور ٨- م عەبدوڵا بەڵخەیی ٩- ئەیوب کویخا ڕۆستەم تەوێڵەیی ١٠- جووتیار مەجید شەریف پێنجوێنی ١١- مامۆستا عوسمان عەبدوڵا تەپە گوڵاوی شارەزوور ١٢- محەمەد ئەحمەد عەلی تەپی سەفایی شارەزوور ١٣- ئەحمەد محەمەد عەلی کوڵکنی شارەزوور ١٤- شاخەوان ئەحمەد فەتحلا دۆڵە سوری ١٥- سەلاح ئەحمەد رەشید کۆکۆیی ١٦- م عەلی حاجی فەرەج نەورۆلی ١٧- جەبار جەلال مەحمود گولانی بەرکێو ١٨- وریا براخاس هاواری ١٩- ئەحمەد مەحمود سان ئەحمەد قەدەفەری شارەزوور ٢٠- بەکر عەبدولرەحمان بەکری زەراعە ٢١- کەریم عەلی شێخ کەریم عەبابەیلێی٢٢- مەلا ئەحمەدی جەیران کەلاری ٢٣- شلێر غەفور عیزەت بیارەیی ٢٤- هەورامان محەمەد نوری هەڵەبجەیی ٢٥- قادر بێستانی شلێر ٢٦- جەلال حاجی کاکەلی شانەدەری ٢٧- کەمال حسێن هەورامی ٢٨- جەمال حسێن هەورامی ٢٩- فارس عەزیز ٣٠- م عەزیزکانی میلی.

یەکێتی نیشتیمانی کوردستان مەڵبەندەکانی ڕێکخستنی لەئاستی پارێزگاکاندا دروست و تەشکیل کردوە، بەلام بۆهەڵەبجە تایبەتمەندی داوەتێ، بەهۆی بارودۆخی سیاسی و جوگرافی و سەربازیەوە، جیاواز لەمەڵبەندەکانی تره، مام جەلال خۆی پشتیوان و بەردەوام لەسەر خەتە لەگەڵ ئەم مەڵبەندەدا، بەتایبەت لەدوای کۆتای هاتنی شەڕی ناوخۆ مەبەستیەتی ئەم مەڵبەندە گەشەبکاو پێش بکەوێ بەردەوام چاوی لێمانە،زووزوش سەردانی مەڵبەندو ناوچەکە دەکات، هەتابۆ بەشداریکردن لەبۆنەو کۆڕو کۆبوونەوە کۆمەلایەتییەکان خۆشی هەندێک جار ئامادە دەبێت، ئەگەر خۆشی بۆی نەکرێت بەشدار بێت، یان من بەنوێنەرایەتی ئەو بەشداری دەکەم یان نوێنەری تایبەت ئەنێرێت.

ئەوەتا ئەمڕۆ ١/٤ بە پەیامێک بەبێسیم ئاگادارم کردوە، فاتمەخانی عەبدولعەزیز دایکی هەڤال حەکیمی مەلاسالحی گەورە کۆچی دوایی کردوە،

ناوبراو خوشکی مامۆستا مەلا عوسمانی رابەری بزووتنەوەی ئیسلامی و مامۆستا مەلا عەلیە، خێزانی مەلاساڵحی گەورەشە.

ئەم ماوە لەهەڵەبجەدا شەوانە لەماڵە دۆستەکانمدا ئەخەوم ناهێڵم کەس بزانێت لە چ ماڵێکدام، ئەمشەو لەماڵی بەهمەن حەمەرەشیدا بووم، بێسیم چیەکە ئەیزانی لەکوێم شەو کاتژمێر ٩ئێ وەڵامی بروسکەکەی مامی بۆ هێنام، واتەشەوی ٤ لەسەر ٥ /٩٩/١/ مام جەلال وەڵامی داوەمەوەتەوە و دەڵێت: بەیانی خۆم دێم بۆ هەڵەبجەو بەشدار ئەبم لەرێورەسمی پرسەکەیدا. ئەم شەو خەریکی خوێندنەوەی رۆژنامەی ژمارە ١٧٧٦ی کوردستانی نوێ بووم، بابەتەکانی ئەم ژمارە زۆرتر لەسەر گرژی نێوان ئەمریکاو بەریتانیا لەلایەک و عێراق لەلاکەیترەوە نوسراون.

بەیانی رۆژی١٩٩٩/١/٥ لەگەڵ هەڤاڵانی مەڵبەندا لەبارەگای مەڵبەندا، چاوەڕێی مام جەلال و هەڤاڵەکانیمان دەکرد بێن و پێکەوە بچینە مزگەوت، کاک جەمیل هاتوو ووتی بەم زوانە ئەوان ناگەن، بائێمە برۆین بۆ مزگەوت بۆ بەشداری کردن لەپرسەکردا، چووین بەشداری پرسەکەی فاتمەخانمان کرد مزگەوتی شافعیدا، زۆر دانیشتین مام و برادەرەکانی نەگەیشتن، دواکەوتن، کاک جەمیل لەوێیش ووتی با بچینەوە مەڵبەند چاوەڕێیان بکەین، هاتینەوە مەڵبەندو چاوەڕێی مام جەلال و هەڤاڵەکانیمان دەکرد، ئەوان لەگەڵ کاک کۆسرەتدا هاتن و لایان نەدایە مەڵبەندو خۆیان راست چوونە مزگەوت.

ئێمە دوبارە گەڕاینەوە بەدوایاندا بۆ مزگەوتەکە، کەگەیشتینە ئەوێ مام جەلال و برادەرەکانی دانیشتبوون، مام وای ئەزانی ئێمە ئێستا هاتووین بۆ بەشداری پرسەکە، من بەروخساری مام جەلالدا تێگەشتم و زانیم توڕەیە لێمان، بارو دۆخەکەم پێناخۆش بوو، لەدڵا ووتم کەهەستاین چووینەوە بۆ مەڵبەند دەیکەم بەخەتای کاک جەمیل هەورامی، بەراستیش خەتای ئەو بوو. کاتێک هەستاین یەکسەر مام جەلال و هاوڕێکانی گەڕانەوە بۆ سلێمانی و لاشیان نەداو سەردانی مەڵبەندیشیان نەکرد.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١/٨ رۆژی هەینییە، دوای ئیشوکاری ئاسایی سەردانی پرسەی حاجی مستەفای حاجی قادری تەوێڵەیی باوکی کاک هیوای هاوڕێی دەورانی خوێندکاری خۆم و کاک دکتۆر ئازادم کرد، حاجی پیاوێکی کورد پەروەرو هەمیشە دەم بەخەندە بوو. هەر ئەمڕۆ پرسە نامەیەکم بۆ کاک

عەبدولحەمیدی سابقی نارد بۆ شاری پاوە لەکوردستانی رۆژهەلات بەبۆنەی کۆچی دوایی خوالێخۆش بوو حەمە سەعدی برایەوە.

پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ هەواڵێکی ناخۆشم پێگەشت، یاری تۆپی پێ بووە لە شارۆچکەی هەڵەبجەی تازە (قەزای شارەزوور)، کێشە لەیاریەکەدا دروست بووە، کەسێک بەناوی مستەفای مەدحەت مالوانی، کەسەر بەتیرەی گەلالی هۆزی جافە، دەست دەداتە گۆڵت(دەمانچە)، کوڕێکی رێکوپێک بەناوی عومەرە ریشە کەئەویش سەر بەتیرەی نەورۆلی لەهۆزی جافە، دەستی مچە بەرزدەکاتەوە تادەستی دوربخاتەوە، لەوکاتەدا گوللەیەک دەردەچێت و بەر عومەر دەکەوێت و گیان لەدەست ئەدا.

دەستبەجێ منیش ئاگاداری پۆلیس و ئاسایشی شارۆچکەکەم کرد، بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکی سەرشانیان لەو بارەوە، پەیوەندیشم کرد بە چەند ریش سپیەکی هەردوو تیرەکەوە، داوام لێکردن هەوڵ بدەن کێشەکە گەورە نەبێت. شەڕەکەی مستەفا لەگەڵ ئیسلامیەکانی سەر بە (نەهزە) بووبوو، بۆیە کاک حەمە سینەمۆکی ئەندامی سەرکردایەتی نەهزەو چەند کەسێکی سەر بەبزووتنەوەی ئیسلامیش لە پەیوەندی بەو بابەتەوە زیندانی کرابوون. لیژنەیەکیشمان دروست کرد بۆچارەسەر، نوێنەری یەکێتی لەو لیژنەدا هەڤاڵ ئەحمەد قەدەفەری بوو.

رۆژی ١٩٩٩/١/٩ مام جەلال سەردانی کاک مەسعود بەرزانی کرد لەسەری رەش، مەبەستی ئاشکرای سەردانەکەی بۆ جێبەجێکردنی خێرای بەندەکانی رێکەوتننامەی واشنتۆنی نێوان یەکێتی و پارتی بوو. هەر ئەمڕۆ بزووتنەوەی ئیسلامی نامەیەکیان بۆمن نوسیبوو، لەونامەدا داوایان کردبوو وەلامیان بدەینەوە بەندکراوەکانیان لەهەڵەبجەی تازە تاکەی ئەمێننەوەو بۆچی گیراون. منیش داوام لەلیژنەکەو ئاسایش کرد زانیاری تەواوم بەنێ تاوەلامی بزووتنەوە بدەمەوە.

بزووتنەوەی ئیسلامی لەناوچەکەدا پێشتر ئەوەندە کاری نابەجێ و توندڕەویان بەرامبەر بە خەڵکی سەربەیەکێتی کردبوو، بەتایبەت لەو شوێنانەدا کە بزووتنەوە بالادەست بوون، سڵیان لەهیچ نەکردبووەوە، بۆیە دواتر کەپارچە پارچەو لاواز بوون هەرشتێکروویدابا ئەگەر دەستی ئەوان یان گومان لەدەستی ئەوان کرابا، لەرووداوەکاندا، ئاسایش و پۆلیس و

پێشمەرگەش ئەوانەی سەر بەیەکێتی بوون، هەوڵیان ئەدا وەک ڕێویەکە وتویەتی ( تا قەباڵەم ونیا توکم شنیا) بکەن، لەتۆڵەی ئەو زوڵمەی لەباڵادەستی بزووتنەوەدا بەرامبەر بە ئێمەی کردبوو، ئەمانیش (مقابەلە بە مسل بکەن)تۆڵە بکەنەوە. بەڵام ئێمە مەبەستم بەرپرسەکانی یەکێتیە، لەترسی مام جەلال هەمیشە لەهەوڵدا بووین بۆ ئەوەی هێزەکانی یەکێتی بیر لەتۆڵەکردنەوە نەکەنەوە و ئێمە نابێ ببینە هۆی تێک چوونەوەی ئاشتی و ئارامی نێوان بزووتنەوە یەکێتی.

هەر ئەمڕۆ نامەیەکم بۆ کاک کوردۆقاسم نوسی لەسەر ئاڵوگۆڕو تەشکیلاتی نوێی لەشکری مەڵبەند، مام وریا هاواری و عومەری کوێخا ئەحمەدی کۆکۆییم نارد بۆلای و نامەکەیان بۆ برد. مەلاحسێن ئەندامی مەڵبەند و خەڵکی ناوچەی شلێرە ئەمڕۆ هاتەلام ماوەیەک بەرلەئێستا گیرابوو لەئێران، گلەیی ئەوەی لێکردم کە لەکاتی گرتنەکەیدا بۆمان نەپرسیوەتەوە، هەرئەمڕۆ ئاگاداریان کردم ئەمشەو واتە شەوی ٩-١٩٩٩/١/١٠ حەسەن سۆفی لەشاری هەڵەبجە لەماڵی مەروان ناوێکدا لەکاتی پارشێوکردندا کوژراوە، حەسەن سۆفی خەڵکی کەلارو بەرپرسی تاقمی حەماس بوو، کەسوکارو دەوروبەرەکەی حەسەن کوشتنەکەیان خستە ئەستۆی بزووتنەوە خۆیان.

دوای ئیشوکارەکانم پاش نیوەڕۆ مزگەوتی دارولئیحسانی هەڵەبجە بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی خوالێخۆش بوو مەحیەدین فەتاحی تەوێڵەیمان کرد، ئێوارەی ئەمڕۆ بۆبەربانگ و ڕۆژو کردنەوە لەگەڵ هەڤالان مامۆستا عوسمان عەبدوڵاو جەبار جەلال و عومەری حاجی ئەحمەددا میوانی خانەقای شێخ عەلی شێخ ئەحمەدی شێخ حیسامەدینی نەقشەبەندی تەوێڵە بووین لەگەڕەکی کانی عاشقانی هەڵەبجە، شێخ عەلی پیاوێکی لەسەرەخۆ و بەڕێزە. شەو ڕۆژی ڕابردوو بەردەوام باران باریوە خەڵک دڵیان خۆشە، شێخ عەلی بۆی گێراینەوە ووتی دوو ڕۆژ پێشتر، شێخ مەلیکی کوڕی حەزرەتی شێخ عوسمان موی محاسنی [1] لەخانەقای بیارە دەرهێناوە بۆیە ئەم بارانە باریوە.

---

1

مـوی موحاسـنی شـەریف، دوو تـاڵە مـوی ڕیشـی پـێغەمەبەری ئیسـلام مـوحەمەدە (د.خ) لەسـەربێت، دانەیەکیـان لە خانەقـای تەوێڵەو دانەیەکیـان لەخانەقای بیارەیە، دەڵێن هەرساڵێک کەم بارانی بێت، ئەو موە دەرئەهێنن و تەڕی ئەکەن ئیتر باران دەبارێت. ڕازی یان داستانی هاتنی ئەو دوو تەڵەموە، بەناوی موحاسنی شەریف بۆ تەوێڵەو بیارە بەم جۆرەیە:
ئەگێڕنەوە حاجی شێخ ئەحمەدی شەمسەئەدین، کوڕی شێخ عوسمانی (سراج ئەدین) گەورەی تەوێڵە، دوسـاڵ دوای وەفـاتی شـێخ مـحەمەد بەهـائەدین، ئەچێت بـۆ سـەردانی خانەقاکـانی شـارەکانی تورکیـا بەتـایبەت شـارەکانی کوردستانی باکور، لەوکاتەدا سوڵتان عەبدولحەمید کوڕێکی دێوانەی ئەبێت، ئاگاداری سوڵتان ئەکەن ئەڵێن پیاوچاکێک هاتوە، چەندین کەسـی، دێـوانەی چـاک کـردوەتەوە، ئەنێرن بەدوای شـێخ داو ئەیـبەن بـۆ ئەسـتەمول، کـوڕە دێوانەکەی سـوڵتان چـاک ئەکـاتەوە، ئەویـش ئەڵێت چیت ئەوێت، شـێخیش داوای دوو تەڵ موی ڕیشی پێغەمبەری لێ ئەکات، ئەویش موەکانی ئەداتێ و سەرەتا ئەیانهێننە ئەحمەد ئاوا، ئەحمەدئاوا ئاوایی شێخ ئەحمەد شەمسەدین بووە، دواتر ئەبرێنە باخەکۆن، لەوێ تا ئەم دواییەش ژورێک هەبوو بەناوی ژوری موحاسـن، دواتـر ئەبـرێنە خانەقاکـانی تەوێڵەو بیـارە، ئێسـتا لەوێ پارێزراون.

ئەمڕۆ ٩٩/١/١٠ لەکۆبوونەوەیەکدا لەبارەگای مەڵبەند دوای گفتوگۆ و قسـەو بـاس، ئـاڵوگۆڕی بەرپرسـەکانی لەشـکرو هێزەکـانی نـاو مەڵبەندمان جێبەجـێ کـرد، ئەم ئـاڵوگۆڕە پێشـتر بەڕاوێـژ لەگەڵ بەرپرسـی مەڵبەنـدی ڕێکخسـتنی پێشـمەرگە بڕیـاری لێدراوە، مەڵبەنـدی ڕێکخسـتنی هەڵەبـجەو شارەزوور لەبەر ئاڵۆزی سنوورەکەو دژایەتی تاقم و گروپە توند ئاژۆکانی ناوبزووتنەوەی ئیسلامی بەرامبەر بە یەکێتی، بەبڕیاری جەنابی مام جەلال لەشـکرێکی سـەربازی سـەربەخۆی پێشـمەرگە بۆپاراسـتنی مەڵبەنـدەکەو کۆمیتەکانی تەشکیل و ڕێک خرابوو.

ئـاڵوگۆڕکردنی بەرپرسـەکان لەنـاو ئۆرگـانی سـەربازیدا، یـان لەنـاو ئۆرگانی حزبیشدا بەتایبەت لە بەرپرسە باڵاکانی ئەو ئۆرگانانەدا، زۆرجار بۆ گەشـەکردن و پێشـکەوتن و تۆکمەکردنەوەی پێشـمەرگەو ڕێکخسـتنە. یەک لەهۆکارەکانی گەشەکردن و بەزیندو مانەوەی ژیانی سیاسـی حزبـایەتی و

پێشمەرگایەتی ئەو حزبە، ئاڵوگۆڕە. بەتایبەت لەوڵاتێکی وەک عێراق و نەتەوەیەکی داگیرکراوی وەک کورد، لەلایەن دەستەڵاتی ناوەندو رژێمێکی نادیموکراسی دا حزبەکان ناچار کراون باڵی سەربازی و هێزی پێشمەرگە دروست بکەن بۆبەرگری کردن لەحزب و لەخەڵک. وەک رژێمەکانی عێراق و هێزی پێشمەرگەی کوردستان.

بەڵی زۆرجار لەکاتی کۆبوونەوەی ئاڵوگۆڕدا، ئەو بەرپرسانەی لادەدرێن ئامادە نابن دەورو تەسلیم بکەن لەکۆبوونەوەکاندا، زۆرجاریش برێک کەلوپەلی ئۆرگانەکە نادەنەدەست ئەوکەسەی دەچێتە شوێنەکەیان. ئەمرۆ ٣ سێ کەس لەکۆبوونەوەکەی ئێمەدا ئامادە نەبوون، لەوانە سەرلەشکری لادراو، بەڵام من ئاڵوگۆڕەکەم کردو ئەو هەڤاڵانەی دانرابوون دەستبەکار بوون لە شوێنەکانی بۆیان دیاری کرابوو بەم شێوەی خوارەوە:

مام وریای براخاس دانرا سەرپەرشتی و ئیشوکارەکانی سەر لەشکر بکات، عومەری کوێخا ئەحمەدی کۆکۆیی بۆشوێنی مامۆستا جەمال خەرپانەی جێگری سەرلەشکر، فاتیح دەگاشێخانی بۆ شوێنی کاک جەمالی ئەلی محەمەد ئیدارەی لەشکر، سەیدکەمالی کانی توی بۆ شوێنی حاجی رەفعەتی حاجی دێوانەی عەنەبی، حەمەمۆریاسی بۆ شوێنی فەلاح زۆراب، موختار سەردار بۆ شوێنی سەلام فەتاح، ئیسماعیل کانی پانکەیی بۆ بەرپرسی بەشی چاودێری و پشکنین. دوای تەواو بوونی ئاڵوگۆڕەکە بەنوسراوێک، لەسەر چۆنییەتی ئاڵوگۆڕەکەو رەزامەندی و نارەزاییەتی هەڤاڵان، فەرماندەیی گشتی و مەڵبەندی پێشمەرگەم ئاگادار کردەوە.

دوای تەواو بوونی کۆبوونەوەکە، وەڵامی نامەکەی بزووتنەوەی ئیسلامیم دایەوە لەسەر کێشەکەی هەڵبجەی تازەو گرتنی ئەندامەکانی ئەوان. دواتر لەگەڵ ئەنجومەنی مەڵبەندا، هەڤاڵانی تازە دەست بەکاربووی لەشکرمان برد بۆ بارەگای لەشکرو لەوێش بەئامادە بوونی فەرماندە کەرتەکان و دەستەکان و کۆمەڵێک پێشمەرگە کۆبووینەوەو هەڤاڵانی نوێمان پێناساندن و لەبارەی ئاڵوگۆڕەکەوە قسەم بۆکردن، زۆر جار لەکاتی ئاڵوگۆڕو لابردن و دانانی بەرپرسێکدا ژێردەستەکانی یان ئەندامەکانی ئەو ئۆرگانە ئەبنە دوو بەرە رازی و ناڕازی کەم و زۆر، بەشێوەی گشتی

ناڕازیەکان کەمترن، ئەوانەن بەرپرسەکە لێیان نزیک بووە، ئەمڕۆ بەڕواڵەت لەناو هێزەکەدا کەس ناڕازی نەبوو لەم ئاڵوگۆڕەی ناو لەشکری مەڵبەندا.

شـــەوی١٠لەســـەر/١١ چـــوومە شـــاری ســـلێمانی، لەبەر ئەوەی بەئیشوکارەکانم دا ڕابگەم، زۆربەی کاتەکانی شەوم تەرخان کردووە بۆ بەشـداری لە ڕێوڕەسـمی پرسـەی ئەو مـردوانەو بەسـەرکردنەوەی ئەو نەخۆشانەی کەبەڕۆژدا نەمتوانیوە سەردان و بەسەریان بکەمەوە. ئەمشەو سەردانی ماڵی کۆچ کردو کاک مستەفای حاجی قادری تەویڵەیم کرد، دواترو هەر ئەمشەو سەردانی کاک عیزەت مستەفا ناسراو بەعیزەتی مـچەم کرد، ناوبراو تێکۆشەری دێرین و پیاوێکی ماندوە لەڕێگەی کوردایەتیدا، ئێستا نەخۆشەو لەسەر جێگە کەوتوە، باوکی کاک بەیانە، بەیانیش یەکێک بـووە لەڕێکخستنە دێرینەکانی کۆمەڵەو یەکێتی.

شـەوی١٢لەسـەر١٣/١/١٩٩٩ لەگەڵ مەهـدی برامـدا سـەردانی کـاک ئەرسەلان بایزمان کرد لە سلێمانی، نامەیەکی کاک شەوکەتی حاجی مشیرم بۆبرد نامەکە کاک شەوکەت لەبەریتانیاوە نوسیبووی بۆ کاک ئەرسەلان و بۆ جەنابی مام جەلال، کاک ئەرسەلان دوای خوێندنەوەی نـامەکە پرسـی ئەمە پێش یەک مانگ لەمەوبەر نوسراوە، بۆ زوتر نەتناردووە؟ ئەی مام نوسخەی خۆی دیوە؟ ووتم ئێوە لەگەڵ مام لەدەرەوە بوون، بەڵی مامیش ئەوەی خۆی دیوە. ڕەنگە نامەکە ڕۆژێک بێت لەیاداشتەکانی ئەو بەڕێزانەدا بڵاو بکرێتەوە.

دواترو هەر ئەمشەو سەردانی کاک جەمیل هەورامیمان کرد بۆ هەواڵ پرسین و بەسەرکردنەوەی بەبۆنەی نەخۆشیەوە. لای کاک جەمیل دەرچوین و سەردانی حاجی ژن سۆسەن و کاکە حەمەی حاجی نادرمان کرد، حاجی سۆسەن شێرە ژنێکە و جەلالیەکی توندڕەوە، هاوسەری خوالێخۆش بـوو حاجی ئەولەی نەسەیە، کاکە حەمەش یەکێکە لەمامۆستا دێرین و تێکۆشەرە کۆنەکانی حزبی شیوعی لەناوچەی هەوراماندا.

ئەمشەو یادی حەوتەمین ساڵەی ڕۆژنامەی ڕۆژانەی کوردستانی نوێیە، بەو بۆنەوە مام جەلال ووتاری هەیە لەتەلەفزیۆنی گەلی کوردستاندا، دواتر کاک کۆسرەت پیرۆزبای لەسەرنوسەرو ستافی ڕۆژنامە نوسەکانی ڕۆژنامەکە کرد، دوای ئەو سەرنوسەری ڕۆژنامەی هەفتانەی ئاویەر( آبیدر) بەوبۆنەوە پیرۆزبای و قسەی کردو هیوای بەردەوامی بۆ خواست، قسەکانی جوان و

ئەدەبی و سەرنج راکێش بوون، ئاوپەر ناوی ئەو کێو و ملەو دۆڵ و یالانەیە کە ئێستا بووەتە جوانترین سەیرانگاو گەردشگای شاری سنە لەکوردستانی رۆژهەلات، ئەم کێوە ئەکەوێتە بەشی باکووری رۆژئاوایی شارەکەو رووبەرووی شار هەڵکەوتووە.

ئەمڕۆ۱۹۹۹/۱/۱۳ چوارشەممە لەشاری هەڵەبجە لەبارەگای مەڵبەندا ئیشوکاری ئاسایی رۆژانەی حزبمان لەگەڵ هەڤالانی مەڵبەندا جێبەجێ کرد، دوای نیوەڕۆ سەردانی ماڵی حەمەجەعفەری سەلەمان کرد بۆسەرەخۆشی لە منداڵەکانی، ناوبراو خەڵکی ئاوایی دەرەتفێی کاکەیی نشینە لەناوچەی هەورامان، ئێستا دانیشتوی گەڕەکی شارەوانین لەشاری هەڵەبجەدا، حەمەجەعفەر تەمەنی نزیکەی ٦٠شەست ساڵەو دوێنێ واتە رۆژی ۱/۱۲ لەماڵەکەی خۆیدا خۆی هەڵواسیوە، کاتێک منداڵەکانی پێی دەزانن تەواو بووەو گیانی دەرچووە.

دواتر سەردانی ماڵی وەستا ناسری وەستا حەمەئەمینمان کرد بۆ بەشداری لەرێورەسمی پرسەی وەستا عەلی برای کەلەشاری پاوەی کوردستانی رۆژهەلات مردووە، پرسەنامەیەکیشمان نارد بۆ پاوە بۆ کوڕەکانی وەستا عەلی. فڕۆکەکانی هاوپەیمانی لەفڕکەخانەی ئینجەرلیک موشەکیان گرتوەتە پایەگایەکی موشەکی عێراق لەنزیک شاری موسڵ، عێراق داوای گفتوگۆ دەکات لەئەمریکاو لە بەریتانیا، بارودۆخی ناوچەکە بەرەو ئاڵۆزی زیاتر ئەڕوات، ئەمڕۆ ۲٦ مانگی رەمەزانە چاودێرانی سیاسی دەڵێن لەوانەیە دوای جەژنی رەمەزان بدرێت لە عێراق.

کاک فەرەیدون عەبدلقادر بەبۆنەی داگیرساندنی مۆمی هەشتەمین سالیادی کوردستانی نوێ وە پیرۆزبایی کردوەو دەڵێت بەڕێوەم بۆکوردستان بۆکارکردن و دەوڵەمەندکردنی رۆژنامەکە. ئەم ماوە ئاو کەمی کردوەو کێشەی کەمی ئاو کارەبا شارو شارۆچکەو دێهاتەکانی کوردستانی گرتوەتەوە.

ئەم ماوە هەندێک کەس لەناو لایەنە سیاسییەکانەوە داوایان وەک دۆست و لایەنگر بۆ یەکێتی کاربکەن، ئەوانەی من ئەیانناسم و پەیوەندیان هەیە دەیان کەسن، ئەوانەیان وەک بیروباوەر و بەراستی دۆستایەتیمان دەکەن زۆر کەمن، زۆرتریان بۆبەرژەوەندی خۆیان و هۆکاری جۆراو جۆر

وایلێکردوون بەناوی دۆستایەتیەوە پەیوەندیان هەبێت، هەیانە بۆپارە و دەست کەوت، هەیانە ئەترسێت بارودۆخەکە خراپتر ببێت و یەکێتی لەناوچەکەدا بالادەستر بێت، هەیانە ئەترسێت لەشەڕەکاندا دیل بکرێت، ئەمانە لەراپۆرتەکانیاندا زۆرجار هەواڵی درۆ دەدەن. هەشیانە بەپێچەوانەوە بەدرۆ لایەنەکەی خۆشی ئەخەڵەتێنێ هەواڵی درۆیان دەداتێ و دەڵێت لەناو فلان لایەندا سەرچاوەم هەیە.

ئەم جۆرە پەیوەندی وچەپەچەپ و ژێربەژێرە، زیاتر لەناو ئۆرگانە ئەمنی و هەواڵگریەکانی نێو لایەنە سیاسییەکاندا هەیە، نەک لەگەڵ یەکتردا زۆرجار درۆ دەکەن، بگرە ئۆرگانەکان لەناوخۆی خۆیاندا کادریان هەیە بەدرۆ و ساختەکاری ئۆرگانەکەی خۆی فریوداوەو تووشی گەورەترین هەڵەو گەندەڵی کردووە.

من بۆخۆم لەبەر ئەوە دەیان ساڵە لەم بارەوە، خەڵک و کادر و پێشمەرگەی ئەم حیزب و ئەو گروپ، داوای پەیوەندیان کردووەو ئامادەییان پیشانداوە کارمان بۆ بکەن، زۆرتر ئەزموونم هەیەو ئەو جۆرە خەڵکانە ئەناسم، باوەڕناکەم کەسیان توانیبێتی فێڵم لێبکات، لەناو ئەوانەدا کەسی راستگۆ زۆر کەم هەیە، زۆریشیان دەست برو ساختەچی و خەڵکانی دانەمەزراون.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کەسانە ئەمە ئەرکیانە یان پیشەیانە بەگشتی جێگەی متمانە نین، کاری ژێربەژێرو بەکوردیەکەی خەفیەگەری(جاسوسی) بەتایبەت ئەوانەی بۆ نەیاران و دوژمنانی گەل و داگیرکەرانی وولاتیان ئەو کارە دەکەن، لای دوژمنەکانیش سوک و ڕسوان، یاساکەی وایە کەسێک وەفای بۆ خاک و ئاو و برای خۆی نەبێت، دوژمنیش متمانەی پێنابێ، ئەمانە زۆرجار دوواجار چارەنوسیان بزرکردن بووە لەلایەن ئەو دوژمنانەوە کە کاریان بۆکردون، کاتێک کەئیشیان پێنەماون، نەوەک رۆژێک بێت نهێنییەکانیان ئاشکرا بکەن.

ئەمرۆ١٩٩٩/١/١٤ پێنج شەممە دوای ئەوە لەشاری هەڵەبجە سەردانی تێکۆشەری دێرین کاک سەید نەجیمی هانەسورە دەکەم بەبۆنەی بەسەلامەت دەر چوونییەوە لەوەرگەڕانی ئۆتۆمبێلدا. یەکێک لەو دۆستانەی کەکاری ژێربەژێر دەکات بەڵام جێگەی متمانەیە، بەناوی هەکار لەماڵی دۆستێکی

هەردوولاماندا ئەبینم، دوای گفتوگۆ و راگۆڕینەوە نامەیەکی لێوەردەگرم، لەبەر ئەوە بڕوام بەزانیاری و بۆچوونەکانی هەیە، دیاریەکی بەناوی دیاری مام جەلالەوە ئەدەمێ.

دواتر ئیشوکارەکانی مەڵبەند جێبەجێ دەکەم و شەو ئەگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، شەو هەڤاڵی ئیشککری مەڵبەند تەلەفۆنی بۆکردم، ووتی بزووتنەوەی ئیسلامی ئامادە باشن (ئینزار). بۆیە پەیوەندیم کرد بەبزووتنەوەوە و پرسیارم کرد چی روویداوە ئامادەباشن؟ لەوەلامدا ووتیان پەیوەندی بەناوخۆیی خۆمانەوە هەیە، راستیشیان دەکرد، بەڵام من بۆ مەبادا ئاگاداری فەرماندەییەکانی ناوچەکەو لەشکرەکەی پاسەوانی مەڵبەندم کردەوە کە ئاگادارو وریابن.

هەر ئەمشەو نامەیەکم لەسەر بارودۆخی ئەم دواییەی سنووری قەزای هەڵەبجەی شەهید بە (٣ ) سێ خاڵ نوسی بۆ هەڤاڵ مام جەلال و لەگەڵ نامەکەی هەکاردا بۆم نارد. عێراق ئەمشەو لەکاناڵەکانی راگەیاندنەکانییەوە هەڕەشە دەکات لەکوردستان و لە شیعەکانی باشوورو وڵاتی کوێت. چین و فەرەنساو سۆڤیەت داوای هەڵگرتنی گەمارۆکانی سەر عێراق دەکەن. بلند ئەجەوید چەند رۆژێکە کابینەی دەوڵەتی تورکی تەشکیل کردوە، دەڵێت ئەگەر ئەمریکا و بەریتانیا بیانەوێ دوای جەژنی رەمەزان بدەن لە دەوڵەتی عێراق، ئێمە ڕێگایان نادەین کەڵک لەپایەگاو فرۆکەخانەی ئنجەرلیک (incirlik) وەرگرن. وەک وەلامێک بۆ ئەجەوید ئەمریکا ئەڵێت پەیوەندیمان زۆرباشە لەگەڵ هەردوو سەرکردەکەی کوردو باشتریش دەبێت. مەبەستی لە مام جەلال و کاک مەسعودە، هەر ئەمشەو نامەیەکی پیرۆزبایشم بەبۆنەی مانگی پیرۆزی رەمەزان و جەژنەوە بۆ مامۆستا قادری لەشاری پاوەی کوردستانی رۆژ هەلات نوسی.

ئەمرۆ ١/١٦ شەممە لەسلێمانی بووم ئاگری بورهان قانع سەردانی کردم، ئاگر کوڕێکی باشەو حەزدەکەم پێبگات، لەمەڵبەند ئیشوکاری راگەیاندن و رادیۆی دەکات، لەکاری هونەری و نەخشەی بەرگ و چاپ کردنی کتێبی بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگیشدا هاوکارمە، منیش زیاتر بەبۆنەی خۆشەویستی خۆم بۆ باپیرەی مامۆستا قانعی شاعرو مامۆستا بورهانی باوکیەوە لەوە زیاتر کەهەیە رێزی دەگرم. ژیواری کوڕم و هاواری

کوڕی مەهدی برام سەری منداڵی دراوسێیەکمانیان شکاندوە، فروزان خان دایکی ژیوار منداڵەکەی بردوە بۆ لای دکتۆر ٤٠ چل دینار خەرجی بووە، خۆیشم سەردانی ماڵی دراوسێکەم کردو داوای لێبووردنم لێکردن.

حسێن عەبدوڵا محەمەد(مەلاحسێن) خەڵکی وێنە کارگێری کۆمیتەی شلێرە سەردانی کردم، پێشتر بۆماوەی ٣سێ مانگ گیراوەوە لەئێران، من نەم ئەزانی لەسەرچی گیراوە، بەڵام لەگەڵ پەیوەندیەکانی یەکێتی و ئێران و ئەو ئەندامانەی قەرارگای رەمەزان کە بارەگایان هەبوو لە هەڵەبجە هەوڵم ئەدا بۆ بەردانی، ئەوەبوو جارێکیش لەسەردانێکم دا بۆ لای مام باسی ئەم بابەتەم کرد مام جەلال تورە بوو، ووتی وازی لێبهێنە.

دیارە دواجار بەرپرسانی ئەمنی یەکێتی ئازادیان کردو ئەوان ئەیانزانی لەسەر چی گیراوە، کەلەئێران گەرایەوە لێرش ماوەیەک گیرا، من بۆخۆم زانیاریم هەبوو هەندێک چەکوچۆڵەی حزبی دیموکرات کاتی خۆی ناوچەکەیان بەدەستەوە بووە لە ئاواییەک بەناوی قەرەچەر لەسەرشیوی سەقز لەماڵی کابرایەک بەناوی حەسەن ئاغای قەرەچەر شاردراوەتەوە، ئەو حەسەن ئاغا خۆی کوژرابوو بەدەستی حزبەکانی رۆژهەڵات، ئەوترا شوانی ماڵی ئەو حەسەن ئاغا دواتر هاتووە بۆ باشوور، ئەوشوانە وتبێتی بەمەلاحسێن ئەزانم چەکەکان لەکوێ شاردراونەتەوە مەلاش هەوڵی دابێ لەگەڵ کابرای شوان بچن بۆ قەرەچەرو چەکەکان بهێنن بۆ خۆیان، ئەوەی ئەم زانیاریەی بەمندا، ووتی کاتێک ئەمان رۆیشتون چەکەکان نەماون لەو شوێنەدا کەشوانەکە پێشتر پێی زانیون، بۆیە بەدەستی بەتاڵ هاتونەتەوە.

مەلاحسێن لای من حاشای لەمە دەکرد، ئەیوت ئێرانییەکان پێیان وتوم جاسوسی عێراقی، هەروەها ئەیوت ئازاد کردنەکەم دیل بەدیل بووەلەگەڵ چەند کەسێک، ئەوانەش ئەو کەسانە بوون لەنزیک دەربەندیخان تەقەیان کردووە لەمەفرەزەیەکی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی.

ئەمشەو١٦لەسەر١/١٧ لەئۆتێل مەولەوی لەگەڵ کاک باقی هەورامیدا میوانی حاجی حیشمەتوڵای هەمەدانین، حاجی پیاوێکی بەڕێزو کاسبە فەرشناسی باشەو خەریکی کڕین و فرۆشتنی فەرشی کۆنەیە، کاتێک لەپێشوازی ئۆتێلەکەدا لای حشمەتوڵا دانیشتبووین و خەریکی چاخواردنەوە بووین، لەکات ژمێر ٩/٣٠ خولەکدا بوومە لەرزەیەکی توند سلێمانی هەژاند

میوانانی ناو ئۆتێلەکە هەموو بەبێ پێڵاو رایان کردە خوارەوە بۆسەر شەقامەکە.

ئەمرۆ۱۹۹۹/۱/۱۷ لەبارەگای مەڵبەند کۆبوونەوەی کارگێری مەڵبەند کراو دوای ئیشوکاری ئاسایی کاک جەمیل هەورامی و هەندێک لە هەڤاڵان گەرانەوە، منیش بۆ ئێوارە میوانی کاک حەمەسەلیم فەتحوڵام لەبارەگای مەڵبەند، کاک حەمەسەلیم پێشمەرگەیەکی دڵسۆزی هەردوو شۆرشی ئەیلول و نوێیە، کادرێکی بەوەفاو دڵسۆزە، ئەندامی بەشی ئیدارەو بەرپرسی چێشتخانەیە، ئەو بەدڵسۆزی و بەبەرنامە خەرج ئەکاو برادەرانیش گلەیی لێدەکەن، ئەوانەی ئەوژەمەی لەمەڵبەند نان ئەخۆن ئەیاونەێت خواردنەکە خۆش و گۆشتی لەگەڵ بێت. حەمە سەلیمیش ئەوە ناکاو بەردەوام لەگەڵ ئەو برادەرانەدا گلەو بۆڵەیانە.

ئەمرۆ۱۹۹۹/۱/۱۹ سێ شەممە رۆژی جەژنی رەمەزانە لەبارەگای مەڵبەند پێشوازیمان کرد لە جەماوەریی سنوورەکە و نوێنەری لاسیەنە سیاسییەکان، بەبۆنەی جەژنەوە سەردانی مەڵبەند دەکەن، دوای نیوەرۆش دابەش بووین من و بەشێک لەهەڤاڵان لەبارەگای مەڵبەند مانەوە بۆ پێشوازی ئەوانەی لەئاوایییەکان و شارو شارۆچکەکانی ترەوە دەهاتن، کاک جەمیل و بەشێکی تر لەهاڤاڵان چوون بۆسەردانی بارەگاکانی لایەنە سیاسییەکان، ئەم سەردان و بەسەر کردنەوەو پێشوازی کردنەی خەڵک بۆ بارەگا حزبیەکان و لایەنەکان بۆ لای یەکدی بەبۆنەی بۆنەکانەوە شتێکی دروست و جوان نییەو نەبووە لای من، لەگەڵ بیرو بۆ چوونی سیاسیش ناگونجێ، جگە لەعەزیەت دان و بەفیرۆدانی کات و مەسرەفی زیادەو قورس کردنی ئەرکی سەر شانی هاوولاتییان شتێکی تر نییە، لایەنی سیاسی ئەکرێت لەو بۆنانەدا چەندە پێی دەکرێت سەردانی منالی شەهیدان و نەخۆش و ئەو کەسانە بکات کەپێویستە. بەهیوای ئەوە ئەم جۆرە لەئەرک و مەینەت و سەرف کردنی کات بەبێسوود نەمێنی و کۆتایی پێبێت.

هەر ئەمرۆ کاتێک لەپێشوازی میوانەکاندا لای دەرگای سەرەکی هۆڵەکەی مەڵبەندا وەستابووم کۆمەڵێک میوان دانیشتبوون جووتیارێکی خەڵکی ئاوایی عەنەب لەناو میوانەکاندا بوو، بەشێوەیەک تەماشای منی دەکرد، بەروخساریدا هەستم کرد قسەیەکی پێیە، کاتێک میوانەکان هەستان و

یەک یەک دەستمان ئەدایە دەستیان، ئەو جووتیارە دەستی گوشیم و بەهێواشی ووتی زەحمەت نەبێ، چەند هەنگاو بەدوایدا چووم و ووتم فەرموو، ووتی ئەم بەیانییە ولاخم دەرکردووە بۆ دەشت، لەنزیک کانییەکەی (حەمەوغان) حەمەخان تەرمێک کەوتووە. لەبەر ئەوە میوان بەدیارمەوە وەستابوون ووتم باشە تۆبڕۆ، پرسیاری زیاترم لێنەکرد. دوای ڕۆیشتنی کابرا ئاگاداری ئاساییشم کرد چوون بۆ هێنانەوەی تەرمەکە، دوای دۆزینەوەو هێنانەوەی ئاگاداریان کردم ووتیان ماوەیەکە کوژراوە ناناسرێتەوە بردیان بۆ پزیشکی دادوەری. لای عەسرەوە دایکیشم لەتەوێڵەوە هات بۆلامان.

شەوی١٩ لەسەر ٢٠ لەگەڵ کاک جەمیل هەورامی میوانی کاک (هوشیاری کەریم بەگی ئەفراسیاب بەگ) بووین شەویش هەرلای ئەو خەوتین. ئەفراسیاب یان ئەفراسیاو بەگ کوڕی ڕۆستەم سانی کوڕی حەمەسەعید سانە واتە برازای جەعفەر سانە، ئەفراسیاب بەگ ساڵی ١٨٨٧لە شارۆچکەی نەوسود لەدایک بووە، ڕۆستەم سانی باوکی منداڵ بوو عەبدولڕەحمانی براشی نەوجەوان بوو کاتێک بەفەرمانی نەسرەدین شای قاجار لەقەڵای جوانڕۆ لەسەر سفرەی میوانداری حەمەسەعید سانی باوکیان کوشت و عەبدولڕەحمانی برایان خنکاند.

ڕۆستەم سان لەبەر ئەوە منداڵ بوو ڕزگار بوو لەدەست سەیفور بەگ و عەلی ئەکبەر خان (شەرەفەمەلیک) چوونکە ئەمانە جێبەجێکاری فەرمانەکە بوون. ڕۆستەم سان ڕۆژگارو چارەنوسی هەرکوشتن بوو، بەڵام ئەمجار نەبەدەستی دوژمنانی کورد بەڵکو بەپیلانی ناوخۆ، کاتێک بۆسەردانی خزمانی کاکەیی ئەچێتە هەوارگەی چاڵانی هاوار، شەو کەسێک بەناوی حسێن لەنزیکەکانی خۆی فرسەتی لێ ئەهێنێ و بەگوللەی تفەنگی شکاری (وەرەندڵ) ئەیکوژێ. ئەفراسیاب بەگی کوڕیشی دواترو لەدەورانی سانییەتی جەعفەرسانی مامیدا ئەبێتە فەرماندەی لەشکری هەورامان.

ئاڵوگۆڕو پێشهات و ڕوداوەکان١٨٩٥بۆ١٩٣٠ لەناوچەکەدا لەوانە پەلامار و شکانەکانی قاجاریە بۆسەر هەورامان، جەنگی جیهانی یەکەم، جەنگی عوسمانی و پەلامار بۆ سەر هەورامانی لهۆن، مەشروتەو د- مسەدق، ڕەزاخان و شەهریوەری ١٣٢٠، هاتنی ڕوس و پەلامارردانی هەورامانی

شامیان و تەخت، شەڕەکانی ناو خۆی هەورامان و هەورامان لەگەڵ جوانڕۆ و لەگەڵ سەرداره ڕەشید و لەگەڵ مەنمی و گەڵباخی، دواتر ئاشتی و یەکێتی نێوان هەورامان و هۆزەکانی دەوروبەرو پەلاماردانەوەو ڕاماڵینی لەشکرە داگیرکەرەکان، هەندێک جاریش بەهانا چوونی دوژمنەکانیان لەکاتی شکستیاندا وەک بردنەوەی سالارە دەولەی قاجاری لەهەورامانەوە بۆ تاران و دووبارە، شکانەوەیان لەباخی شادا لەنزیک تاراندا، ئەفراسیاو بەگ قارەمان و دەوری کاریگەری هەبووە، لەزۆربەی ئەو ڕوداو و پێشهات و شەڕو پەلاماردانانەدا .

ڕۆژی دوایی ئاسایش و پۆلیسی هەڵەبجە ئاگاداریان کردم تەرمەکەی دۆزراوەتەوە خەڵکی ئاوایی عامورەیە ناوی فەرەجە سوری حاجی سەعیدە، دوژمنایەتی هەبووە لەگەڵ بنەماڵەیەکی تری سنووری خورماڵ ئەوان کوشتویانە.

ڕۆژی١٩٩٩/١/٢١ لەشاری سلێمانی بووین سەرلەبەیانی کاک جەمیل هەورامی سەردانی کردین و پێکەوە بەبۆنەی جەژن و هاتنەوەشی لەئەوروپاوە سەردانی کاک جەبارفرمانمان کرد، لەوێوە لەگەڵ کاک جەبارو کاک عومەری سەید عەلیدا چووین بۆسەردانی ماڵی حاجی محەمەدی بەلەبزانی باوکی مامۆستا جەمال[1]. هەرهەمان ڕۆژو لەگەڵ ئەو هەڤاڵانەدا سەردانی کاکەحەمەی حاجی مەحمود سکرتێری حزبی شۆسیالیت و کاک حامیدی حاجی خالیدمان کرد، دوای نیوەڕۆ من ئەوانم بەجێهێشت و بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی مامۆستا مەهدی حەسەنە مەلەی هەورامیم کرد لەبەغدا کۆچی دوای کردووە، خزمی باوکمە، دواتر سەردان و بەسەر کردنەوەی چەند ماڵە شەهیدێکم کرد، لەوانە دایکی شەهید ڕەفعەت جەعفەر ئێناخی و ماڵی شەهید موختار نۆجەژنەیان بوو، لەکوردەواریدا کەسی کۆچ

[1] – ماڵ حاجی محەمەدی بەلەبزانی یەکێکە لەو ماڵە جووتیارانەی هەڵەبجەیە لەڕێگای کوردایەتیدا زیندان و ئاوارەبوون و دەربەدەری زۆربەی بەشی ژیانیان بووە، مامۆستاجەمالی کوڕی کادری کۆمەڵەو ڕێکخستنی دێرین و دواتریش پێشمەرگە بووە لەگەڵ خێزان و براکانیدا، حاجی محەمەدی باوکی و خوشک و براکانی تریشی لەساڵی ١٩٨٧ دوای ڕاپەڕینی ڕۆژی ٥/١٣ ماڵوحاڵیان بەجێهێشت و هاتنە شاخ، کوڕێکی قارەمان و پێشمەرگەشی بەناوی جەلال شەهید بوو.

کرد و یان شەهید، یەکەم جەژنی دوای مردنەکەی پێی ئەوترێت نۆ جەژنە، دۆست و خزم و ناسراوانی ئەو کەسە کۆچ کردوە لەوجەژنەدا سەردانی ماڵەکەیان ئەکەنەوە و جارێکی تر دڵ نەوایی و سەرەخۆشیان لێ ئەکەنەوە. ئەمەش دیاردەیەکی یان عورفێکی کۆمەڵایەتی نەشیاو خراپە، هیچ حوکمێکی شەرعی نیە. دواتر سەردانی ماڵی عوسمان عەلی جاف[1]. ڕۆژانی دواتر لەسلێمانی و هەڵەبجەو شارەزوور دەیان ماڵە شەهیدو دۆستە دێرینەکانی ماندوم لەرێگای کوردایەتیدا بەسەر کردەوە.

ئەم ماوە خەڵکی کوردستان لەسەروی هێڵی ٣٦ توشی ترس و دڵەڕاوکێ بوون، بارودۆخێکی نادیار لەپێشیانە، بەهۆی ئەو ڕاگەیاندنەوە کە ئەمریکا ووتی حەوت حزب و لایەن لەعێراق دا هاوکارو یارمەتی دەرن بۆ روخاندنی عێراق و هاوکاریشمان کردون، لەوبارەوە ناویشی هێناون لەوانە پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکێتی نیشتیمان کوردستان، ئاشووری، ئای ئێن سی، میساقی وەتەنی، مەجلسی باڵای ئیسلامی، بزووتنەوە.

کوردەکانی باشووری هێڵی ( ٣٦ ) و ژێر دەستەڵاتی سەدام و عێراق، چاوەڕێی لوتفی ئەمریکاو رزگارکردنیان و کەوتنەوەیان بۆ سەر هەرێمی سەرو هێڵی (٣٦) دەکەن. یەکێتی و پارتی لەوبارەوە ئامادەباش وخەریکی پەیوەندی و ئامادەکارین، عێراقیش لەرێی عیزەت دوریەوە خەڵکی ناردوە بۆلایان و ئامۆژگاریان دەکاو داوا دەکات هاوکاری بەرنامەی ئەمریکا بۆدژایەتی عێراق نەکەن.

ڕۆژی١/٢٣ دوای ئەنجام دانی ئیشوکاری حزبی و رێکخستن لەکۆبوونەوەیەکی کارگێڕی مەڵبەندا، مۆڵەتم وەرگرت بۆ یەک هەفتە، ئەمەوێت لەم هەفتەدا کتێبی بیرەوەریەکانی تەیمور چاپ بکەم، گەڕامەوە سلێمانی و بەرۆژدا سەردانی بەشی راگەیاندنی مەڵبەندی پێشمەرگەم دەکرد و بەشەویشدا خەریکی خوێندنەوەی کتێبی مێژووی نادر شای ئەفشار بووم، ئەمویست دوای تەیمور ئەوکتێبە وەرگێرم، بەلام کاتێک لەخوێندنەوەی

---

[1] - عوسمان جاف خەڵکی هەڵەبجە بوو پێشمەرگەیەکی ئازا بوو، لەشەردا بەسەختی بریندار بوو پشتی شکا، ماوەیی چەند ساڵێک لەسەر کورسی و بەکەم ئەندامی ژیا، دواتر بەهۆی برینەکەیەوە شەهید بوو.

بوومەوە پەشیمان بوومەوە، چوونکە من بەدوای ئەو کتێبانەدا ئەگەڕێم ، بۆ ئێمەی کورد لەم سەردەمەدا بەکەڵکبن.

بەیانی ڕۆژی ١/٢٤ شەهێن خانی کچی مزەفەرخانی ڕەزاو هاوسەری کاک تەحسینی حەسەنخانی ڕەزاو هات بۆ لام و ووتی پۆلیسی سلێمانی هاتون تەحسینیان بردوە، ئەم بنەماڵە کورد پەروەرو لەدەورانی عەشائیریدا سان و خانی ناوچەی هەورامانی شامیان بوون، شامیان ئەکەوێتە نێوان شاری سنەو مەریوان، بەتایبەت ناوچەکانی سەوڵاواو بەشێکی ژاوەرۆ ئەگرێتەوە، تەحسین کوڕی بچوکی حەسەن خان پەنابەرەو لەشاری سلێمانی نیشتەجێیە.

تەحسین پێشتر لەگەڵ گروپێکی چەکداری ناڕازی ئێرانی بوو، بنکەیان لەسوسێ بوو لەسەر ڕێگای دوکان سلێمانی، شەهێن خانی هاوسەری و تەحسین خان ئەندامی ڕێبەرایەتی ئەو جەماعەتە بوون، تەحسین بەرپرسی پەیوەندیەکانی ئەم گروپە بوو لەگەڵ عێراق، داوای کردبوو لەڕێگای دۆستێکی هەردوولامانەوە دەیانەوێت واز لەوگروپە بهێنن و لەشاری سلێمانی دانیشن، چوونکە بیرو بۆچوونیان جیاوازە لەبیرو بۆچوون و ڕیبازی هاوڕێکانیان. ئەوەبوو لەوێ وازیان هێناو کاتێک ویستیان بەجێبهێڵن کێشەیان بۆدروست بوو ئاساییشی سلێمانی چوو بەدەمیانەوە، تەقەولێکدان دروست بوو چەندکەسێک کوژران و تەحسین هاتە سلێمانی و ئەوانیتریان هەڵهاتن و چوونە هەولێر. بابێمەوە سەرباسەکەی خۆمان تەلەفۆنم کرد بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس، ووتیان تەحسین لەسەر کەفالەت بانگ کراوەو ناردومانەتەوە بۆ ماڵی خۆی.

مۆڵەتی هەفتەکەم بەئیشوکارو بەناخۆشی و بەقەلەقی بەسەربرد، ناخۆشی و قەلەقیەکەی ئەوەبوو، یەکەم ئەوکات لەڕێگای نوسینگەوە تەلەفۆن دەکرا بۆ ئەوروپا، شەوی٢٤لەسەر ٩٩/١/٢٥ لەنوسینگەی هەڵەبجەوە تەلەفۆنم کرد بۆ شیروانی برام بۆ سوئێد، پێی ووتم لێرە باس لەوە ئەکرێت بەریتانیاو عێراق ژێر بەژێر ڕێک کەوتبن، دووەم منداڵەکانی شەهید کەیکاوس لەتاران چاوەڕێن سەفەرکەن بۆ سوئێد داوای پارەیان کردووە بۆیان بنێرم پارە نییە، سێیەم چاپ کردنی کتێبەکە ئەمڕۆ و بەیانی هەر دوائەکەوێ،

ئەوانەی کتێب ئەنوسن یان وەرئەگێڕن، تاچاپ ئەکرێت و ئەکەوێتە بازار بەبێ هەڵەوکەم و کوڕی ئەزانن چەدەردو خەفەتێکی هەیە.

رۆژی ١٩٩٩/١/٢٥ بۆدابین کردنی برێک پارە، هەندێک کەلوپەل و ئەشیای ناوماڵمان بردەبازار بۆ فرۆشتن، حەزم نەدەکرد خەڵک بزانێ کەلوپەلی ناوماڵی منە، بەکاک مەریوان سابیرم ووت تۆبیفرۆشە بڵێ هی خۆمە، مەریوان خەڵکی خورماڵە پێشمەرگەو شۆفێری ئۆتۆمبێلی خۆمە کوڕێکی دڵسۆزو دەست پاکە.

هەرئەمڕۆ سەردانی کاک کوردۆ قاسم و کاک سەلاح چاوشینم کرد لەسەربازگەی سەلام، سەلاح چاوشین، خەڵکی سلێمانی و کوڕی سەعید حەمە قەزازە، من لەشۆڕشی نوێدا ناسیومە، فەرماندەیەکی لەسەرەخۆ و پیاوێکی بە ئەدەبە، لەگەڵ من و مەهدی برامدا دۆستە، دۆستێکی پاک و راستەقینە، جگە لەسیاسەتکردن و پێشمەرگایەتی هاتوچۆی دۆستانەی خێزانیشمان هەیە، مریەم خانی خێزانیشی یەکێکە لە شاژنە تێکۆشەرەکانی شاخ و ساڵی ١٩٨٤ هاتووەتە دەرەوە کچی حەمەعەلی تەوفیق سیتەکیە لەبنەماڵەیەکی ماندوی رێگایی کوردایەتین، خوشکی کاک عەبدولرەحمان سیتەکیە.

بۆئەوە سەردانم کردبوون پێیان بڵێم لەشوێنێکەوە بەقەرز برێک پارەم بۆ قەرز بکەن، بەڵام کەبینیمن پەشیمان بوومەوە و لەروم نەهات ئەو داوایە روو بەروی ئەوان بکەم، لەگەڕانەوەمدا ووتم سەردانی کاک ئەرسەلان بایز دەکەم و پێی ئەڵێم هاوکاریم بکە، هاتمەوە بۆ مەکتەبی رێکخستن، گەیشتمە بەردەرگاو کاک ئەرسەلان هاتەدەرەوە ووتی ئەچم بۆ کۆیە، لای ئەویش قسەم نەکرد.

لەوێوە لەگەڵ مامۆستا فەتاح کۆکۆیی چووین بۆئیدارەو دارایی، تابزانن چ بڕیارێک لەبارەی لە٣٥٪ کادرەکانەوە دراوە، لەوێش ووتیان کاک دارۆی شێخ نوری وتویەتی ناکرێت. ویستمان بگەڕێینەوە بۆ هەڵەبجە ئاگاداریان کردین ووتیان ئاگاداربن بزووتنەوەی ئیسلامی بازگەیان لەپردی زەڵم داناوەو خەڵک ئەگرن.

هەفتەی مۆڵەتەکەم تەواو نەکرد، رۆژی ٢٧/ ١/ ١٩٩٩ گەڕامەوە بۆ مەڵبەند ومناڵەکانیشم هێنا بۆلای لەمیعەخانی هاوسەری هادی برام ، لەمیعە

کچێکی بووە، ناومانا (کەویار)، کەویار ئێستا هونەرمەندێکی بەتوانای دەنگ خۆشە.

رۆژی ١/٢٨ بزووتنەوەی ئیسلامی هێزێکی کۆکردەوەو بردیە خورماڵ بۆ گرتنی چەند توندڕەو پیاو کوژێکی نێو ریزەکانی بزووتنەوە خۆیان، بڕیارە بەیانی جەنابی مام جەلال و کاک کۆسرەت بێنە هەڵەبجەو میوانی بزووتنەوەبن، دیارە مامۆستا مەلاعەلی ترسی هەیە لەوەی ئەوانە ئاژاوەیەک بنێنەوە، بۆیە ئەوهێزەی ناردوە بۆ گرتنیان. دوانیوەڕۆ کاک عەبدڕەحمان عەبدڕەحیم بەرپرسی مەڵبەندی بزووتنەوە لەهەڵەبجەو کاک فاروق بەرپرسی ئاسیش لەهەڵەبجە ئەویش ئەندامی بزووتنەوەیە، هاتنە بارەگای مەڵبەندی شارەزووری یەکێتی و من و کاک جەمیل هەورامی لەگەڵیان کۆبووینەوە، بەرنامەمان دانا بۆ پێشوازی لەمام جەلال و هەڤاڵەکانی و پاراستنیان و بەسەلامەتی گەڕانەوەیان. ئێمە حەزمان نەدەکرد بێن نەشدەکرا بەمام جەلال بڵێین حەزناکەین بێیت بۆهەڵەبجە، چوونکە ترسمان هەبوو شتێک رووبدات.

شەوی شەوی ٢٨لەسەر ١/٢٩ ناردم بەدوای دۆستێکی خۆماندا بەناوی نهێنی (سێکۆ) بۆ ئەوەی ئەو مەفرەزە چەکدارە نهێنییەی خۆمان لەناو هەڵەبجەدا بخاتە ئامادە باش بۆبەیانی، ئەمانە لەدەوروبەرو نزیکی بزووتنەوەدا بوون، سەر لەئێوارەش سەردانی ماڵی برایمی کاکە ئەحەم کردبوو لەگەڵ سەردانی نەجمەدینی مەلامحەمەد بەرپرسی پۆلیسی هەڵەبجە. ئەمانە سەر بەبزووتنەوەو دۆستمان بوون.

هەر ئەمشەو بەرپرسی هێزەکانی هاوپەیمانان لەکەنداو وتی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی راڕاو قەلەقن، لەوە دەچێت نەتوانن عێراقی دوای سەدام ئیدارە بدەن، لەوە ئەترسین دوای سەدام بارودۆخەکە خراپتر بێت و عێراق پارچەپارچە ببێت.

١٩٩٩/١/٢٩ رۆژی هەینییە کەشوهەوای خۆشە، سەرلەبەیانی کاک جەمیل عەبدلڕەحمان[1] قائیمەقامی هەڵەبجە هاتە مەڵبەند، لەهەڵەبجەوە لەگەڵ

---

[1]کاک جەمیل عەبدلڕەحمان ئەودەم قائیمەقامی هەڵەبجە بوو، لەسەر میلاکی بزووتنەوەی ئیسلامی، خەڵکی ئاوایی پریسی سەروە لەناوچەی نەورۆلی، پیاوێکی بەڕێزو نوسەرو

مەکتەبی سیاسی بزووتنەوەو برادەرانی یەکگرتووی ئیسلامیدا بۆ پێشوازی لەمام جەلال و هەڤاڵەکانی چووینە ئاوایی گردەنازێ، ئۆتۆمبێلی خۆم بەرۆستەم هەیاسدا ناردوە بۆلای کاک عومەری کوێخا ئەحمەدی کۆکۆیی، عومەر سەرلەشکرە، ئەو هێزەی پاسەوانی لەئۆرگانەکانی یەکێتی دەکات لەناوچەکەدا، عومەر بەرپرسیاریانە، هێزێکی گەڕۆکی (٥٠) پەنجا کەسی لەبەردەستدا دانراوە، بۆ ئەوەی ئەگەر هەرچیەک ئەمڕۆ روویدا ئەو زووبێت بەدەممانەوە.

من و کاک جەمیل عەبدولڕەحمان لەگەڵ کاک جەمیل هەورامیدا رۆیشتین بۆ گردەنازێ. لەئۆتۆمبێلێکدا بووین مامۆستا جەمیلیش قەلەق بوو، لە رێگادا دەردی دڵی دەکرد بۆ ئێمە سەبارەت بەم پاشاگەردانی و بێسەرەوبەریەی ناو بزووتنەوە.

لەئاواییی گردە نازێ ئەندامان و بەرپرسانی لایەنەسیاسییەکان و جەماوەریی ناوچەکە کۆبووبوونەوە بۆ پێشوازی، لەنزیک سەعات ١١ی پێشنیوەڕۆ مام جەلال گەیشت و پێکەوە گەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە، لەرێگادا خەڵک لەئاواییەکانەوە هاتبووە سەرجادە بۆرێزگرتن لەهاتنی مام، لەمبەرو لەوبەری رێگاشدا پێشمەرگەو ئاسایش و پۆلیس پاسەوانیان دەکرد، گەیشتینەوە هەڵەبجە سەرەتا چووینە ماڵ و شوێنی مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز، دوای بەخێرهێنان و پشوویەکی کورت، چا خواردنەوە مام جەلال دڵخۆش بوو بەبەخێرهێنان و میوانداریەکە، بەقسەی خۆش و داستان گێڕانەوە ئامادەبوانی شادو دڵخۆش کردبوو. کاک شێخ جەعفەری شێخ مستەفا ئەو رۆژە یەکێک بوو لەیاوەرەکانی مام، مامۆستا مەلا عەلی رووی کردە شێخ جەعفەرو ووتی پێم خۆش بووناوی ئاواییتان گۆڕی، ووتی ئەوە لای ئێمەش ئاواییەکمان هەیە بەناوی ئاوایی دەڵەمەڕ، هەمووجارێک بەمەلا عەبدولای دەڵەمەڕی دەڵێم ئەم ناوە جوان نییە، بۆ نایگۆڕن و ناوی بنێن کانی گوڵ؟ بەقسەم ناکەن، ئێوە باشتان کرد ناوەکەتان گۆڕی، مام لەم لاوە پرسی ناوی چی؟ مامۆستاش ووتی ئەی ناوی ئاوایی حەمەی کەرەمیان

---

شاعیر بوو، نازناوی شاعیری شاخەوانە، دۆست و هاوکاری هەمولایەنە سیاسییەکان بوو. خۆشەویستی مام جەلال بوو.

گۆڕیوە بۆ ئاوایی شێخ مستەفا. دوبارە داستانەکەی دەڵەمەڕی گێرایەوە بۆ مام جەلال. دەڵەمەڕ ناوی ئەو ئاواییەیە کەدەکەوێتە خۆرهەلاتی شاری هەڵەبجە لەدەستە چەپی ئاوایی عەبابەیلێوە، ماڵەکانی ئاوایی بەرلەداگرتنی لەساڵی ١٩٧٩دا، ئەکەوتنە دەروازەی شێوێکی دامێنی چیای شنرۆێوە، جەماوەری ئاوایی لەتیرەی زەردۆیین، دەوروبەری بەدارستانی چڕی داربەڕو داپۆشراوە. بۆ دابین کردنی ژیان و گوزەران جەماوەری ئاوایی زۆرتر خەریکی ئاژەڵداری و بنێشت کردن و جووتیاری بوون.

دەڵەمەڕ ئاواییەکی ئاودارە، سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی خەڵکەکە دوکانی بوو بەناوی کانی خوامرد و کانی ژنان، جگە لەو کانی و سەرچاوانە دەڵەمەڕ خاوەنی چەندین سەرچاوەی تری ئاوە لەوانە چاوگی دەڵەمەڕ ئەم چاوگە ئەکەوێتەخواروی ئاوای و بۆ ئاودانی کشتوکاڵ بەکار ئەهێنرێت، کانیاوەکانی تر لەوانە کانی دڕکە و کانی کەوەخان و کانی چەمی کلاش دڕ .

دوای ڕاگواستنی ئاوایی حکومەتی عێراقی ئاوییەکەو دەوروبەری کردە سەربازگەو سەربازگەیەکی تایبەت بە تۆپخانەی تۆپی دوور هاوێژو بەکارهێنانی لەشەڕی هەشت ساڵەی عێراق و ئێران دا. لەدوای ڕاپەرینی بەهاری ١٩٩١ دەرکردنی سوپای داگیرکەری عێراق لەکوردستان دا و ئاوەدانکردنەوەی ئاواییەکان، بەهۆی نزیکی دەڵەمەڕ یان کانی گوڵ بەقەولی خوالێخۆش بوو مامۆستا مەلا عەلی، لەهەڵەبجەوە خەڵکەکەی نەگەڕانەوە و بوونە شارنشین. ئەم نەگەڕانەوەیە نەبووەتە هۆی بێنازی ئاوایی، چەند جووتیارێک بەتایبەت ئەوانەی خاوەنی ئاو زەوییەکانن چەندین پارچە باخەهەنارو زەیتون و داری میوەی جۆراوجۆری تری وەک هەنجیرو تریان داناوەتەوە و خانەباخیان لەسەر دروست کردوە، بەشێکی زۆریش لەزەویەکانی دەڵەمەڕ لەلایەن کاک ئاسۆ بامۆکیەوە کراوە بەباخ و زەوی بەراو، بەلێدانی بیرو دابین کردنی ئاو دروست کردنی باخ و خانو و پرۆژەی ئاژەڵ داری، دیمەنێکی جوان و سەنج ڕاکێشی بەخشیوە بەئاواییەکەو دەوروبەری

بەر لەخواردنی نانی نیوەڕۆ بۆخوێندنی نوێژ، مام جەلال و مامۆستا لەگەڵ خەڵکێکی زۆر چووین بۆ مزگەوتی پاشا، لەوێ نوێژکراو گەڕاینەوە بۆلای ماڵی مامۆستا، دوای نان خواردن کۆبوونەوەی هەردوو مەکتەبی

سیاسی بزووتنەوەو یەکێتی کرا. دوای تەواو بوونی کۆبوونەوەکە ڕۆیشتین بۆ ئاوایی سەرگەت بۆماڵی مامۆستا مەلا شێخ محەمەدی بەرزنجی، دوای پشویەک و چاو مێوە خوراو لای ئێوارەوە مام جەلال گەڕایەوە بۆ قەڵاچوالان و ئێمەش بەقەرەباڵغی و بەهێزەوە تاگوڵەخانە ڕۆیشتین و ڕەوانەمان کردەوە.

ڕۆژی ۱۹۹۹/۱/۳۰ کۆبوونەوەی کارگێڕیمان کرد سەبارەت بەسەفەری مام جەلال بۆ لای بزووتنەوەی ئیسلامی و سەردانی ناوچەکە، مام جەلال مەبەستیەتی دۆستایەتی ڕاستەقینەی یەکێتی و بزووتنەوە، گەڕانەوەی ئارامی و ئاشتی بۆ هەڵەبجەو هەورامان و شارەزوور. ئێمەش مەبەستمانە بەهۆی دڵنیابوونی بزووتنەوەو شەخسی مامۆستا مەلاعەلی لەیەکێتی، ئەو بتوانێ بزووتنەوە پاک بکاتەوە لەو گروپ و کەسە توند ئاژۆیانە، قسەمان لەسەر ئەوە کرد ئەرکی مەڵبەند لەوبارەوە قورسەو ئەبێ شان بدەینە بەری. دوای نیوەڕۆش سەردانی ئەوبارەگا نوێیەی مەڵبەندمان کرد لەگەڕەکی شارەوانی، بارەگاکە ئێستا نۆژەن ئەکرێتەوە، بەتەماین تەواو بوو بچینە ئەوێ، شوێنی بارەگای ئێستامان، باش نییە لەناو ماڵانەو ئەمنییەتیشی نییە.

ڕۆژی۱۹۹۹/۱/۳۱ کۆبوونەوەم هەبوو لەگەڵ بەشی چاودێری و بەدواداچوونی ڕێکخستندا، ئەم بەشە بەرپرسێکی هەیە پلەی کارگێڕی مەڵبەندە، چەندین ئەندامی هەیە، پلەیان لەحزبدا ئەندام مەڵبەند یان ئەندام بەش یان کارگێڕی کۆمیتەیە. ئیشوکاری ئەم بەشە چاودێری کردنی ئۆرگانە حزبیەکانە لەسنووری ئۆرگانەکەی خۆیدا، هەروەها بەدواداچوونی بڕیارەکان و فەرمانەکانی ئۆرگانەکان دەکات. هەر ئەمڕۆ کۆبوونەوەمان کرد لەگەڵ پێشمەرگە دێرینەکانی سنوورەکە، هەوڵی کۆکردنەوەو ڕێکخستنەوەیان ئەدەین، هەڵەبجەو هەورامان و شارەزوور ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگەی دێرین و ئازاو دڵسۆزی هەیەو لێیە. دوای ئەو کۆبوونەوانە لەگەڵ هەڤاڵانی مەڵبەندا چووین بۆ بەشداری پرسەی ماڵێکی هەژار، دایکی مناڵەکانی ئەو ماڵە مردوە بەناوی بەدیعەی لالۆ عەبەی دەگا شێخانی خزمی باوکمە.

لای ئێوارەوە ئاگاداریان کردم باوا حاجیم (عەزیز بارام هۆمەر) لەماڵی پورمە نەخۆشەو داوای کردووە سەردانی بکەم، منیش لەهەڵەبجەوە

چووم بۆ هاوینەهەواری وەزنێ، ماڵی پورە گوڵچینم لەوێن و لەخانەباخدان نەهاتونەتەوە بۆ ناوشار. وەزەنێ ناوی ئەو هاوینە هەوارە دلگیرو جوانەیە لەناوچەی هەورامان، کەئەکەوێتە سەرجادەی بیارەو تەوێڵە لەنێوان ئاوایيەکانی دەگاشێخان و بەڵخەدا، ڕووبەڕوی خۆرنشینەو ئەنواڕێ بەسەر دەشتی شارەزووردا. وەزەن واتە تاڤگە، تاڤگەیەک ١٢ دوانزە مانگی ساڵ بەردەوام ئاوی لێ بێتە خوارەوەو بەڵخ گرتبێتی و سەوزو خوڕەم بێت.
وەزەنێی نزیک بەڵخەش خاوەنی تاڤگەیەکی وا جوان و بەرزە، ئەکەوێتە بەشی سەروی دۆڵێکەوە (٣٠٠ )سێ سەد مەتر لەسەروی تاڤگەکەوە چەند کانییەکی سازگار لەگەروی دەربەندێکدا هەڵدەقوڵێن و ئاوەکانیان یەکدەگری و دێتە خوارەوە بەسەر تاڤگەکەدا، لەو بەرزاییەوە هاژە دەکاو دەڕژێتە ناو گۆمێک، لەوێوە بەرەو خوار بەچەند جۆگەلەیەک دابەش ئەکرێت بەسەر باخەکانی ئەمبەرو ئەوبەری دۆڵەکەدا.
کەلەباخەکان دەرچویت بەلای ڕاستدا جەنگەڵی داربەڕو و داری قەزوان داری (بنێشــت)ە . وەبەلای چەپــدا بــاخە مێوەکان(ڕەزەدێمەکــان) لەگەڵ باخەکانی بادام و چەقالە کێویەکان و بەلالوک و جەنگەڵەکانی داربەڕودا ناوچەکەیان سەر سەوزو سەوز پۆش کردوە، لەهەرچوار وەرزی ساڵدا وەزەنێ دیمەنێکی سەرنج ڕاکێش و دڵگیرەی هەیە. جادەی سەرەکی بیارە-تەوێڵەش بەئاسۆیی باخەکان و دۆڵەکەی ئەمبەرو ئەوبەر ئەبڕێت، ئێستا سەرجادە بووەتە هاوینە هەوارێکی خۆش و دلگیر. کاتێک گەیشتمە ئەوێ بینیم باوام دانیشتوەو باشە، دوای چاکوچۆنی پرسیم چیتە باوا دەڵێن نەخۆشی؟ ووتی کەمێک لاقەکانم ئێشیان هەیە، پرسیم تەمەنت چەندە؟ ووتی دایکم بەمەلۆتکەیی بردومیەتە خزمەت شێخ محەمەد بەهائەدین، ئەویش دەستی هێناوە بەسەرمداو دوعای بەسەردا خوێندوم.
ئەمڕۆ ١١٧سەدو حەڤدە ساڵە شێخ وەفاتی کردوە. برێک دلنەوایيم کردو ویستم لەگەڵ خۆم بیهێنمە هەڵەبجە، پورم ووتی مەیبە دەبێتە ملت، گوێی لێبوو ووتی بۆ ئەبمە ملی تفەنگێکم بداتێ و قەرەوڵی (پاسەوانی) بۆ دەکەم. هەوا تاریکی کردو گەڕامەوە بەرەو هەڵەبجە، لەڕێگەدا لەدلا ئەگەڕێم بۆ ماڵە دۆستێک بەنهێنی لێی بخەوم، دۆزیمەوە گەیشتینە ناوشارو و بەئۆتۆمبێلی پاسەوانەکانم ووت بەجێمان بهێڵن و بڕۆن بۆبارەگای مەڵبەند،

ئەوان رۆشتن و من و دوو پێشمەرگەش خۆمان کرد بەماڵی پێشمەرگەیەکی دێرین و چاونەترسدا، ئەویش ماڵی کاک ئازادی حاجی عومەری عەنەبی بوو.

ئەمرۆش ١٩٩٩/٢/١ لەهەڵەبجەو لەبارەگای مەڵبەند بەشداری و سەرپەرشتی چەند کۆبوونەوەیەکمان کرد، یەکەم کۆبوونەوە لەگەڵ خوێندکاران بوو، ئەم ئۆرگانەی تایبەت بەخوێندکاران بەناو ئۆرگانێکی پیشەییە، بەڵام لەراستیدا لەکوردستان زیاتر لەئەرکە پیشەییەکەیان کەلە چوارچێوەی خزمەتکردن بەخوێندکاران و دابین کردنی پێداویستیەکانیان و ئاسانکاری بوواری خوێندنە بۆ خوێندکاران، ئەرکی سیاسی و حزبیش ئەسەپێندرێ بەسەریاندا، لەلایەن حزبەکانی کوردستانەوە. هەرگروپ و کۆمەڵەیەکی خوێندکاریش بەناوەکەیان دا ئەناسرێنەوە کەسەربەکام لایەنی حزبین، بۆنموونە قوتابیانی کوردستان سەر بەپارتی دیموکراتی کوردستانن، کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان سەربە یەکێتی نیشتیمانی کوردستانن. ئەم کۆمەڵانە لەسیاسەت و بۆچوونی راست و هەڵەی حزبەکانی خۆیان دەرناچن، حزبەکانیشیان بەو مەرجە هاوکاریان دەکەن.

ئۆرگانێکی چالاک و زیندوشن لەخەباتی شاخ و شاردا لێپرسراوانی حزبی و حکومی و فەرماندەکانی پێشمەرگەرگە زۆربەیان لەناو ئەم ئۆرگانانەوە پەروەردە کراون و هاتوون.

ئەمرۆ کۆبوونەوەی دووەمان کۆبوونەوەی حزبیە، دووبەشە، کۆبوونەوە لەگەڵ ئیدارەی مەڵبەند بۆرێکخستنەوەو بە رێکوپێکی بەڕێوەبردنی ئیشوکارەکانی ئیدارەیە، ئیدارە بەرپرسێکی هەیە پلەی کارگێرو ستافەکەشی چەندین ئەندام مەڵبەندو ئەندام بەش و کارمەندو کارگوزارن، ئەرکیان وەرگرتن و دابەش کردن و سەرف کردنی هاوکاری و نەسریەی مەڵبەندو ئۆرگانەکانییەتی لەگەڵ دانان و جێبەجێ کردن و بەڕێوەبردنی بەرنامەی کارە ئیدارییەکان، لەوانە بەکرێ گرتنی بیناو دیاری کردنی جێگاو رێگا بۆ بەشەکان، چێشتخانەو چایخانەو دابین کردنی پێداویستیەکانیان، دانانی کاتی کۆبوونەوەکان و ئاگادار کردنەوەی ئەندامانی ئۆرگانەکان بۆبەشداری کردن، سەرپەرشتی پاسەوانی و پاک و تەمیز راگرتنی بنکەو بارەگاکان، تەشکیل کردن و سەرپەرشتی کردنی لیژنەکانی کڕین.

بەشـی دووەمـی ئەم کۆبـوونەوە کۆبـوونەوەی کـارگێڕ بـوو لەگەڵ بەرپرسـانی کۆمیتەکـانی ڕێکخسـتنەکان، بـۆ پێدانی ڕێنمـای نـوێ، لەگەڵ ئەوەشدا لەم کۆبەونەوەدا بڕیار درا بەرپرسی کۆمیتەی ڕێکخستنی تانجەرۆ بارەگاکەی لەشارۆچکەی عەربەتە، بەناوی کاکە حەمەی غەفور شەریف پلەی ئەندام مەڵبەندو خەڵکی هەڵەبجەیە بگوازینەوە بۆ بارەگای مەڵبەند، لەبەشی ڕێکخستن بکرێتە بەرپرسی ئامارو سەرژمێری، ئەوکات ئامارو سەرژمێری بەشی سەربەخۆ نەبوو، ئەوبەشە سەر بەرێکخستن بوو، تەنها ئەوکادرەش شارەزابوو لەو بوارەدا، ئامارو سەرژمێری. هەرلەم کۆبوونەوەدا بڕیاردرا کاک عومەر عەبدولکەریم ئەندامی مەڵبەند بکرێتە بەرپرسی کۆمیتەکە لە جێگەی حەمەی غەفور شەریفدا.

ڕۆژی ١٩٩٩/٢/٢ سـەرلەبەیانی لەهەڵەبـجەوە سـەردانی بارەگـای رادیۆی شـارەزوورم کـرد لەشـارۆچکەی سەیدسـادق، لەوێشـەوە چـوومە شارۆچکەی عەربەت و سەردانی ماڵی کاروانە سـورم کـرد، دواتـر چـوومە شاری سلێمانی و سەردانی بارەگای سکرتاریەتی مام جەلالم کرد، نامەیەکم بۆ مام نارد، شەوی رابردوو بۆم نوسیوە لەبیرم نەماوە ناوەڕۆکی نامەکە چی بووە.

ڕۆژی١٩٩٩/٢/٤ پێنج شەمە پێش نیوەڕۆ لەشـارۆچکەی هەڵەبـجەی تازە لەگەڵ ستافی کۆمیتەی ئەوێ بەشداریمان لە ڕێوڕەسمی دوو پرسـەدا کرد. هەڵەبجەی تازە ناوی ئەو شارۆچکەیە کەلەدوای مانگی ٣ی ساڵی ١٩٨٨ ڕژێمی بەعس و سـەدام، شـاری هەڵەبجەیـان کیمیابـاران کـرد، ئەو بەشـەی لەخەڵکەکەی ئاوارەی سلیمانی و ناوچەکانی تر بووبوون، کۆی کردنەوەو ئەم شارۆچکەی بۆی دروست کردن، لەسەر ڕێگای سلێمانی دەربەندی خان لەدەشتی شارەزووردا، ناویان نا هەڵەبجەی نوێ یان (حلبجە مدینە سدامیە) بۆیە پێکهاتەی دانیشتوانی ئەم شـارۆچکە تێکەڵاوە لەجەمـاوەری ناوەنـدی قەزای هەڵەبـجەی کـۆن و ناحیەکـانی بیـارەو خورمـاڵ و سـیروان. دواتـر ئیدارەی حکومەتی هەرێمی کوردستان هەڵەبجەی نوێی کردە ناوەندی قەزای شارەزوور.

یەکەم پرسـەی پیـاوێکی خەڵکـی تەوێڵەبـوو بەنـاوی حەمەئەمـین حەمەخاڵۆ، ئەم کۆچ کردووە، پیاوێکی نیشتیمان پەروەرو زیرەک و جێگەی

متمانە بوو، لەسالانی ١٩٧٨بۆ سالی ١٩٨٢ لەبەرئەوە باخدارو هاتوچۆی ناو باخەکەی دەکرد، مەفرەزەی پێشمەرگەکانی یەکێتی لەهەورامان لەسەرەتای شۆڕشی نوێدا، لەناو باخەکەیدا ئەماینەوە خزمەتی ئەکریدن و زانیاریشی لەسەردوژمن ئەداینێ. پرسەی دووەم هی ژنێک بوو بەناوی بەهیە نەجیب مستەفا ئەویش خەلکی تەوێلە بوو لەناوچەی هەورامان، دوانیوەڕۆ گەڕامەوە بۆ هەلەبجەو سەرپەرشتی دوو کۆبوونەوەم کرد، یەکەم لەگەل مامۆستایانی خوێندگا دواناوەندیەکان، ئەوانەیان کە ئەندام یان دۆست و لایەنگری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بوون، کۆبوونەوەی دووەم لەگەل ستافی لقی خوێندکارانی[1] شارەزوورو کۆمیتەکانی سەر بەلقەکەیان بوو. ئەم کۆبوونەوانە بۆ ئاسانکاری و خۆئامادەکردن بوو بۆهەلبژاردن، چوونکە خوێندکاران هەلبژاردنیان لەپێش بوو. ١٩٩٩/٢/٦رۆژی شەممە سەرلەبەیانی سەردانی کۆمەلگەی زەمەقیم کرد بۆسەردانی بارەگای پێشمەرگەکانی لەشکری مەلبەند، هەر لەوێش بەشداری رێوڕەسمی پرسەی هاوولاتی حەمەخان مستەفا خەسرەو مامی پێشمەرگەی دێرین کاک موختار سەردارمان کرد. دواتر لەهەلەبجە راگەیاندنی یەکگرتووی ئیسلامی سەردانیان کردین لەبارەگای مەلبەندی شارەزووری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، داوایان کرد بەبۆنەی پێنج هەمین سالیادی دامەزراندنی یەکگرتووەوە لێدوان بدەم، منیش بەوبۆنەوە پیرۆزباییم لێکردن و سەبارەت بەدەوری یەکگرتووی ئیسلامی و کاریگەریان لەسەر پرۆسەی سیاسی لەکوردستان دا قسەم بۆ کردن.

سەر لەئێوارەی ئەمڕۆ هەوالی کۆچی دوایی مەلیک حسێن پادشای ئوردن بلاوبووەوە، دواتر هەوالەکە بەدرۆ خرایەوە و وترا لەکۆشکی تایبەتی خۆیەتی، ئەم هەوالە لەتیڤی بزووتنەوەی ئیسلامیەوە پەخش کرا، چوونکە ئێمە گوێمان ڕادێرابوو بۆ ووتاری مامۆستا مەلاعەلی باپیر دوێنێ هەینی ١٩٩٩/٢/٥ لەسلێمانی پێش نوێژی کردوە، ئاگاداریان کردین ووتارەکەی توندبووە، منیش ئەمویست بەوردی گوێی لیبگرم.

---

[1] – خوێندکارانی کورسستان مەبەست ئەو رێکخراوە پیشەییەیە کەسەربە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بوو.....

بەیانی رۆژی ١٩٩٩/٢/٧ پێش نیوەڕۆ ئیشوکارمان تایبەت بوو بۆ کاروبــاری خوێنــدکاران و ئامادەکردنیــان بــۆ هەڵبژاردنــی نــوێنەرانی رێکخراوەکەیان، پاش نیوەڕۆش لەگەڵ بەشێک لەهەڤالانی مەڵبەندا سەردانی شــاری سلێمانیمان کرد بۆبەشـداری لەرێورەسـمی دوو پرسـەدا، پرسـەی خوالێخۆش بوو عەلی مایجان هەڵەبجەیی و نەجیم نوری عەبابەیلێی .

١٩٩٩/٢/٨رۆژی دووشــەممەیە، رۆژێکـی بارانــاویی و رەشــەبایە، ســەرلەبەیانی لەشــاری ســلێمانییەوە جەنــازەی خوالێخـۆش بــوو حــاجی محەمەدی بەلەبزانی بـاوکی مامۆسـتا جەمالمـان بردەوە بۆهەڵەبجە، دوای بەخاک سپاردنی لەگۆڕستانی شەهیدان، لەگەڵ ستافی ئەنجومونی مەڵبەندی شارەزوور بەشداری رێورەسمی پرسەی شێخ عەبدولامان کرد لە مزگەوتی شەهیدان.

هەرئەمرۆ چووین بۆ ماڵی مامۆستا شێخ محەمەدی مفتی بۆسەرەخۆشی کردن مامۆستا پوری مردوە، بۆنیوەڕۆ لای ئەو نانمان خوارد، دوای نیوەڕۆ لەبارەگای مەڵبەند کۆبووینەوە بۆتەواو کردنی ئیشوکاری خوێندکاران، ئامارەکانمان رێکخست و دابەشمان کرد، کاندیدەکانمان یەک بەیەک سپارد هەریەکەو بەشوێنی خۆیان، دەنگ دەرەکانمان لەرێی کەسایەتی و مامۆستایان و خزم و کەسوکاریانەوە ئاگادار کردەوە، دەنگ بەنوێنەرەکانی خوێندکاران بدەن. بڕیارە هەر ئەمڕۆش تەرمی مەلیک حسێن بەئامادەبوونی زۆربەی سەرۆک و بەرپرسەکانی ناوچەکەو جیهان بەخاک بسپێردرێت.

# چیای بەمۆو ڕاوە کەو

چیای بەمۆ بەو کێوە بەرزو سەخت و دڵگیرە دەوترێت کە دەکەوێتە نێوان خاڵی سنووری باشوورو ڕۆژهەلاتی کوردستان، ڕۆژهەلاتی چیاکە شارۆچکەی سەلاسی باوەجانی و چیای بەناوبانگی داڵەهۆ و بەخشی ئەزگلەیە، باشووری ڕۆژهەلات و باشووریشی شارۆچکەی سەپێڵی زەهاو و چیای شەڕواڵ دڕەیە، باشووری خۆرئاوا و خۆرئاواشی شارۆچکەی باوەنور و دەشتی پێوازە باکوورو باکووری خۆرئاواشی چیای خۆشک و شارۆچکەی دەربەندیخانە، ١٧٦٠مەتر لەئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە.

بەمۆ پێک دێت لەدەیان دەرەو دۆڵ و کەل و ملەو هەردەو کۆسار، درێژیەکەی نزیکەی٧حەوت کیلۆمەترە، پانیشی لەهەندێک شوێندا نزیک بە ٣سێ کیلۆمەترە، زۆربەی زۆری ڕووبەری چیاکە بەجەنگەڵی داربەڕو دەرەبەن داپۆشراوە، داربەڕوە بەتەمەنەکانی جێگەی سەرنجی ئەوکەسانەن دەچنە سەر چیا، شیوە قوڵ و سەختەکانی دەیان ئەشکەوت لەخۆدەگرن، کونە بەردو ڕەمەندو مابەرزەکانی جێگەی خۆحەشاردان و خۆشاردنەوەی پەزو کەڵە کێویەکانە، گیان لەبەرە کێوی و باڵندەکان بێشومارن بەتایبەت کەوەکان کە لەرووی نزارو لاپاڵ و سەرقوللەو بندارەکاندا بەخوێندن و قاسپەقاسپیان سازو ئاوازی دڵگیرو سۆزدار دەخوڵقێنن.

لەکوردستان دا لەخۆشی ناوی ئەم چیاوە زۆر لە خێزان و بنەماڵەکان ناوی منداڵەکانیان ناو ئەنێن بەمۆ بەتایبەت ناوی کوڕەکان، هەڵکەوتەی جوگرافیایی چیاکە هەڵکەوتەیەکی ستراتیجی و گرنگ بووەو هەیە، لە سەردەمی کۆن و ئێستاشدا بۆ لەشکرکێشی ئەو ئەمیرو سوڵتان و لایەنانەی کە لەناوچەکەدا بەشەڕهاتوون.

لەشۆڕشی ئەیلولدا بنکەیەکی قایمی پێشمەرگەی کوردستان بووە، لەشەڕی هەشت ساڵەی عێراق و ئێراندا، لەساڵی ١٩٨٠ تا ساڵی ١٩٨٨ سوپای عێراقی لەسەر بووە، لەکۆندا پیاوە ناودارو ڕاو شکارچیەکان بەتایبەت لەوەرزی بەهاراندا چوونەتە سەر بەمۆ و کاتی خۆیان بەخۆشی و ڕاو و شکارەوە

بەسەر بردوە. روبەری چیاکە بەگشتی دەکەوێتە سنووری عێراقەوە، سوپای عێراق لەسەردەمی سەدام و شەڕی عێراق و ئێراندا ڕێگای ئوتۆمبێلی بردوەتە سەر چیاکە، لەدوای روخانی حکومەتی سەدام و لەسەردەمی حکومەتی نوێی عێراق و لەکاتی شەڕی عێراق لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامی لەعێراق و شام(داعش ) دا، ئێران ڕێگای ئۆتۆمبێلی لەڕوی ئەزگلەو دەربەند دهۆڵەوە هێناوەتە سەر بەمۆ و لەساڵی ٢٠١٧دا تەواوی کردووە، ئێستا چیایی بەمۆ سوپای ئێرانی لەسەرە، جێگەی بنکەو بارەگاکەیان خاکی عێراقە.

١٩٩٩/٢/١١ ڕۆژێکی هەتاو کەشوهەوایەکی خۆشی هەیە، بۆ کەمێک دورکەوتنەوە لەسیاسەت و کۆبوونەوە، بڕیارم دا لەگەڵ دەستەیەک هاوڕێمدا بچینە ئەودیو چیای بەمۆ بۆسەیران و گەشت و ڕاوە کەویش بکەین. هاوڕێکانم ئەمانە بوون، مەهدی برام، کاک سەروەتی کەریم بەگ، خاڵم هۆمەری عەزیز بارام، بابای لالۆناجی، بەختیار فەتاحی وێنەگر، عەزیز سەعید، ڕۆستەم کوڕی خاڵە هەیاس و نەهاوەند کوڕی شەوکەت لهۆنی، نەهاوەند منداڵەو هەر بەتوپزی هاتووە لەگەڵمان.

دوانیوەڕۆیەکی درەنگ لەملەی سەرتەک ئاودیوبووین بەرووی ئەودیو چیای بەمۆدا، بەلای ڕاستدا کانی و ئاوی کانی کەڵە بەلای چەپدا کانی ڕەئیسانە، ئێمەچوینە سەرکانی ڕەئیسان، لە سەر کانییەکە مام ئەمینی چوارداران خانەباخێکی چێ کردوە. چوارداران بەر لەجێبەجێ کردنی بڕیاری ڕاگواستنی ئاواییەکانی سەر سنوورەکان، کە بەندێکە لە ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٧٥ی جەزائیر، ئاواییەکی دڵگیرو ئەکەوێتە بەردەم ملەی سەرتەک بەروی ڕۆژهەڵاتدا، جەماوەریی چوارداران جاف و سەر بەتیرەی خێڵی باوەن، خێڵی باوە لەبنەچەدا لەکوردستانی ڕۆژهەڵات و لەنزیک کرماشانەوە هاتونەتە ناوچەکەو لەبنار چیای بەمۆدا گیرساونەتەوە، بەشێکی خێڵی باوە کەکاتی خۆی لەشوێنی باوباپیریان ماونەتەوە ئێستا لەچەند ئاواییەکی کوردستانی ڕۆژهەڵات لەناوچەی کرماشاندا ژیان دەگوزەرێنن.

دوای ئەوە لەخانەباخەکەی مام ئەمینی چواردارانیدا، بنەمان خست، چەند کەسێک چوون بۆ دارکۆکردنەوە بۆ ئاگری شەو، مەهدی و چەندکەسی تریش لەبنەکەدا خەریکی ئامادەکردنی نانی ئێوارە بوون، من و سەروەت

بەگ و بەختیار فەتاحیش چووین بۆ (بنە) داوگە دانان تابزانین کەوەکانمان ڕاو دەکەن، کەوەکانمـان جـووتەن بـاڕی ئەمسالیشـن، لای کـاک ئەنـوەر عەبدلخالقی تەویڵەی کڕیومـانن. لەدەستەچەپی خـانە بـاخەکەو کانییەکەدا داوگەمان چێ کرد داوگەیەک هەرسێکمان لەناویا جێمان بێتەوە. کەوەکانی ئێمە دەستیان بەخوێندن کرد، کەوی کەژ وەلامیـان دایەوە لەهەر چوارلاوە کەوی کێوی هاتن سەروەت بەگ ئامادە بوو بۆ پەڕان تەقاندن بەختیاریش بۆ وێنەگرتنی دیمەنی شکارەکەمان.

کەوەکانی ئێمە زۆر خێرا بـوون واتە شـەڕکەربوون، لەمـاوەی ١٥ خولەکدا پێنج گوللەمـان هاویاشـت، دوان بەپەڕان و سـیان بە توتـو(فڵچە)، لەبەرئەوە بـاڕەکەو نەترسـێ و خـراپ نەبێت ئەبـێ یەکەم جـار لەداوگەدا کەمکەم ڕاویان پێبکرێت، واتە زۆر نەمێنێتەوە لەداوگەدا، بۆیە ئێمەش زوو هەسـتاین و کەوەکـانی خۆمـان داگـرت و چـووین بـۆ کـۆکردنەوەی کەوە کوژراوەکان، بینیمان دوو کەو کەوتوون سیانی لێمـان نەدابوو. بەر لەوەی تاریک بکا هاتینەوە بۆ بنەکە، لەدەرەوە نان و چایمان خوارد و شەو تاریکی کرد ئاگری سۆپای دارمان کردەوەو چرامان داگرساندو لەناو خانە باخەکەدا لەدەوری دانیشتین و شەوێکی خۆشمان بەسەر برد.

نیوەشەویش چووین بۆ ڕاوە شەوارە دوو ڕێویمان بینی کوڕەکان یەکێکیان کوشت، لەگەڕانەوەشماندا خـاڵە هـۆمەر چەقەڵێکی کوشـت وایزانـی ڕێویە کاتێک چوو بۆ سـەربڕینی، بریندار بوو پەلاماریدا قەپاڵی گرتبووە پانتۆڵەکەی، خاڵەش هاواری دەکرد فریام کەون خواردمی ئێمەش سەیری دیمەنەکامـان دەکرد زۆرخۆش بوو بەجارێ ئەماندایە قاقای پێکەنین.

بەڵێ ڕاو خوە مرۆڤ کە ئەم خوەی گرت بەئاسـانی نـاتوانێ وازی لێبهێنێ، ڕاو شکاری گیان لەبەرە کێویەکان لەکوردستانی ئێمە چەندین جۆرو شێوازی هەیە، لەوانە ڕاوە ماسی، ڕاوە ئاسک، ڕاوە کەڵ وبزن، ڕاوە مێ و بەران، ڕاوە پۆڕ، ڕاوە سوێسکە، ڕاوە تانجی و کەروێشک، ڕاوە کەو، ڕاوە بەراز........تاد .

ڕاوە کەو چەندین جۆری هەیە لەوانە: ڕاوە نێرەکەو کەلە ڕۆژی ٢٠ مانگی ٢ دووی هەموو ساڵێک لە گەرمەسێرەوە دەست پێدەکات و لەکۆتایی مانگی ٤ی هەمووساڵێکدا لەکوێستانەکاندا کۆتای دێت. شێوەی ئەم ڕاوە بەم

جۆرەیە: نێرەکەوی ماڵی لەناو قەفەزدا ئەبرێت لەچیا لەسەر دارێک یان لەسەر بەردێک دائەنرێت و دائەپۆشرێت، ڕاوچیەکەش لەدوری ١٠ بۆ٢٠ مەترەوە حەشارێک دروست دەکات و لەناویدا خۆی حەشار ئەدا کەوەکانی دەخوێنن و کەوی کێوی دێن بۆیان، کاکی ڕاوچیش یان داوی لەدەور کەوەکانی خۆی تەنیوەو کەوە کێویەکان پێوە دەبن، یان بە تفەنگی شکاری ئەیانکوژێ، دوای تەواو بوونی ماوەی ڕاوە نێرەکەو، ڕاوی ماکەو دەست پێدەکات.

ڕاوە ماکەویش بەم جۆرەیە: دوای ڕاوە نێرەکەو کەوەکان دوو دوو، جووت ئەگرن، واتە یەک نێرەو یەک مێیە، لەوماوەدا کەجووتەن ڕۆژانە مێیەکە خۆی لە نێرەکە ئەدزێتەوەو دەچێت لەو هێلانەی دروستی کردووە هێلکە دەکات، ڕۆژانە دوای هێلکەکردنەکە ئەگەڕێتەوە بۆلای نێرەکەی. کاتێک کەئیتر هێلکە کردنەکەی کۆتایی دێت، لەسەر هێلکەکان کڕئەکەوێت، نێرەکە چەند ڕۆژ بەدوایدا ئەگەڕێت نایدۆزێتەوە بێتاقەتی دەبێت، لەوکاتەدا ڕاوچی ڕاوەماکەو، ماکەوی ماڵی ئەبات دایئەنێت و خۆی حەشار ئەدا بەشێوەی ڕاوە نێرە کەوەکە، یان داو لەدەوری ماکەوەکە ئەتەنێ یان تفەنگ بەکار ئەهێنێ. ماکەوە ماڵیەکە دەستی بەخوێندن کرد بەپەلە نێرەکەوە کێویەکە کەبەدوای ماکەوەکەی خۆیدا ئەگەڕی، دێت بۆلای ماکەوە ماڵیەکە وائەزانێ جوتەکەی خۆیەتی، ئەم ڕاوە زۆر زەرەر نادا چوونکە هەر نێرە ئەکوژرێت.

ڕاوە دێوجامە، دێوجامە لەپارچە قوماشێکی خاکی مەتر بەمەتر یان مەترو ٢٠بیست سم دروست ئەکرێت، پارچە پەڕۆی ڕەشی بچوک بچوکی لەشێوەی مارو ئەستێرە و شتی تری سەرنج ڕاکێشی پێوە ئەلکێندرێت بەدورین، پارچە قوماشەکە کونێک لەناوەڕاستی دایە بەدوو قامیش ڕاست و چەپ بۆ گۆشەکانی پارچە قوماشەکە ئەکرێتەوە وەک چەتر، ڕاوچی بەدەستێکی ئەیداتە بەردەم خۆی بەدەستەکەی تری تفەنگەکەی هەڵگرتووە، بەلەسەرخۆیی هێواش هێواش ئەیگێڕێ، کاتێک کەوی دێوجامە ئەم دێوجامە ئەیبینێ، دەست دەکات بەچێرە چیر، هەموو کەوێک بۆ دێوجامە ناوەستێ، کەوی تایبەت خۆی هەیە، کەوەکان خڕئەبنەوە لەدەوری یەک، سەیری دێوجامەکە دەکەن، ڕاوچیەکە نزیک تر دەبێتەوەو لەبووردی تفەنگەکەیدا

ئەوستێ و کەوەکان زیاتر گرد ئەبنەوە، ئینجا تێیان ئەگرێ، ئەم جۆرە ڕاوە زۆر زەرەر ئەدا چوونکە نێرە و مێیە پێکەوە ئەکوژرێن.

دواتر ڕاوە سەرکانی هەیە بە پایزاندا، کەوی کێوی بەهاوین ئاو ناخواتەوە، بەپایزدا ئاو دەخۆنەوە، ئەوکات کەوەکان یەک دەگرنەوە ئەبنەوە بە پۆل بارەکانیشان (جوجکەکانیان) ئەوکاتە گەورە بوون و پێگەیشتون، ڕاوچی دەچێت لەسەر کانی یان نزیک ئاوەکان کۆلێت (داوگە) ئەبەستێ یان بەبەیانیان زوو یان ئێواران، کەو لەوکاتانەدا دێت بۆ ئاو خواردنەوە، کاتێک بەپۆل دێنە سەر ئاوەکان کابرای ڕاوچی بە تفەنگی پەڕان تێیان ئەگرێت جاری وا هەیە ۱۰دانە بەیەک فیشەکە تاپڕ ئەکوژێت. یان لەدەوری ئاوەکەدا داویان بۆ ئەنێتەوەو پێوە دەبن. ئێستا بۆڕاوە سەرکانی تۆڕیش بۆگرتنی کەو یان زرکەو بەکاردەهێنن.

لەکۆندا ڕاوێکیتر بۆ کەو گرتن هەبوو بەناوی (بەرەڕەت) ناوچەیەکیان بە ئاسۆیی پەڕژین دەکرد بەدرێژی نزیکەی ۱۰۰ مەتر لەگوزەری کەوەکانی کە لەگەرمە سێرەوە ئەگەڕێنەوە بۆ کوێستان لەسەرەتای بەهاراندا، هەر لەماوەی چەند مەترێک و دەرگایەک یان کەلێنێک لەپەڕژینەکەدا هەبوو، لەو کەلێنەدا ڕەتەکە دائەنرا بەم شێوە: چالێکی نزیک بە۳۰ سم هەڵدەکەندرا تەختەیەک بەچوارچێوەیەکەوە بەئەنجامە بەسترابووەوە لەسەر دەمی چاڵەکەدا دائەنرا، کاتێک کەوەکە پێی لەسەر تەختەکە دائەنا ئەکەوتە چاڵەکەوە، تەختەکە بەهۆی سپرنگێکەوە ئەگەڕایەوە جێگەی خۆی و کەوەکە لەچاڵەکەدا زیندان دەکرا، دوای ماوەیەک ڕاوچی دەچوو دەری ئەهێنان و کۆی دەکردنەوە.

هەر ئەم ڕاوە تەپکە یان بەرەڕەتە، بەجۆرێکیتر دەکرا ئەویش بەم شێوە: لەناوەراستی پەڕژینەکەدا یەک کەلەبەر یان دەرگا ئەهێڵرایەوە لەپشتی ئەو کەلەبەوە لەحوکمی یان بووردی ساچمەزەن یان وەرەندل، حەشارێک دروست دەکرا ئەم حەشارە پێی ئەوترا (سیپە) حەشار ڕاوچی لەناویا خۆی حەشار ئەدا و کاتێک کەوەکان لەم لاو لەولاوە ڕێگەیان نەبوو سەکەون بەرەو کەلـگەکە دەهاتن و ئە چوونە بەردەمی سیپەکەو ڕاوچیەکەش ئەیکوشتن.

مـن هەرلە تەمەنـی مێرمنـداڵیەوە لەبەر ئەوە بـاوکم ڕاوی دەکـردو منیشی لەگەڵ خۆی ئەبرد فێری ڕاوە نێرەکەو بـوو بـووم، لەدوای ڕاپەڕیـن لەوەرزی بەهاراندا هەرکـات فرسـەت هەبـووایە لەگەڵ چەنـد هـاوڕێیەکی ڕاوچیم، لەوانە خوالێخۆش بوان کاک نورەدینی سەید قادری باخچەو کـاک عـادلی بـرای و کـاک شـێخ ناسـیحی شـێخ عوسـمانی نەقشـبەنی یـان کـاک بەهرۆزی مەنوچەری دا ئەچوینە سـەر چیـای بەمۆ. هەرجارەو چەنـد ڕۆژ ئەماینەوە یان خەیمەمان ئەبرد یان لە ئەشکەوتەکاندا دەبووین، دوای ڕاپەڕین چەندین ساڵ لەسەر ئەم خووە خراپە بەردەوام بووم، تائەوکاتەی مام جەلال پێی تەرک کردم.

ئەویش بەم شێوە: مـام جەلال لەمـانگی ٧ ی سـاڵی ١٩٩٩سـەردانی بناری بەمۆی کرد و لەئاواییی هۆرێن کۆبوونەوەیەکی جەماوەرییان بۆ ڕێک خستبوو، خەڵکی هەموو ئاواییەکانی ڕۆژبەیانی و دەوروبەری چیای بەمۆ و بەرپرسەکانی ناوچەی گەرمیان لەو کۆبوونەوەدا ئامادە بوون، دوای ووتاری مام، جووتیارێکی ناوچەکە هەستابوو وتبووی مام جەلال ڕاو قەدەغە بکەن کەڵو بزن و کەویان نەهێشت، مام وتبووی چۆن ئەی ڕاو قەدەغەنییە؟ کابرا وتبووی با بەڵام هەر ئەکرێ، مام پێی وتبوون بائەنجومەنی ئاواییەکان هەر ئاواییەک و لەسنووری خۆیدا ڕێگری بکەن و نەهێڵن کەس ڕاو بکات.

مامە عەزەی باوکی شەهید مەحمود سـەرتەکی وتبـووی مـام جەلال ڕێگریمان پێناکرێ، حەمەی حەمەسەعید لەهەورامانەوە دێت ئێمەچۆن ڕێگری لێبکەین؟.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە مام گەڕابووەوە بۆ قەڵاچوالان، من لەتەوێڵە بووم بروسکەیەکم بـۆ هـات ئەمە دەقەکەیەتی( لەمـام جەلالەوە بـۆ کـاک حەمەی حەمەسەعید دوای سڵاو بەیانی وەرە بۆلام بۆ قەڵاچوالان). منیش نەم ئەزانی بۆچی بانگم دەکات، پەلەم بوو شەو زووتەواو بێت و بچمە خزمەتی، بەیانی کەووتمەڕێ کاتژمێر ١٠دەی سەرلەبەیانی گەیشتمە بارەگای مام ووتیان کاک مەحمـود سـەنگاوی لەژورەوەیە بـابێتە دەروە ئینجـا تۆش بـڕۆرە ژورەوە، کەمێک چاوڕێم کرد کاک مەحمود هاتەدەرەوە بینیم سـوربووەتەوەو تـوڕە دیارە، پرسیم کاک مەحمود چیە نازانی مام منی بۆچی بانـگ کردوە؟ کـاک

مەحمود لای نەکردەوە لە چاوەڕوانییەکەش دەرچوو ووتی بڕۆرە ژوور ئێستا خۆت ئەزانی بۆ بانگ کراوی.

لەوکاتەدا کاک مەلاییاسین ووتی فەرموو، چوومە ژورەوە مام جەلال قەڵەمێکی بەدەستەوەو سەیری نامەیەکی نوسراوی دەکرد، من سەلام لێکردو وەلامی دامەوەو ووتی بەخێر بێیت. فەرموو دانیشە، دانیشتم بێدەنگ، ئەویش خەریکی خوێندنەوەی نامەکەیەو سەیری من ناکا، بەروخساریدا تێگەیشتم شتێک هەیە، بەڵام زۆر تورە نییە. لەخوێندنەوەی نامەکەبووەوەو روی تێکردم دەنگوباس و هەواڵی هەورامان و هەڵەبجەو ناوچەکەی پرسی و منیش وەلامم دایەوە، دواتر ووتی حەمە ووتم بەڵێ مامەگیان، ووتی بۆچی راو ئەکەی؟ ووتم وەڵا مام جەلال حەزم لێیەتی، لەبەر ئەوە باوکم راوچی بووە هەر لە منالێیەوە فێربووم، حەزم لەڕاوە بۆیە ئێستاش جارجار ڕاوەکەو دەکەم، ووتی نابێ ڕاو بکەی سزات ئەدەم، ئەوە مەحمودیشم بانگ کردووە لەمڕۆ بەدواوە ببیستم ڕاوتان کردووە لەیەکێتی دەرتان دەکەم، ووتم بەسەرچاو مام جەلال جەنابت ئەمر دەکەی من تەواو ڕاوناکەم ، بەڵام هەمووکەس ڕاو دەکات، ووتی با عالەم بیکات ئێوە نابێ ڕاو بکەن، ووتم بەسەر چاو. دوای ساتێک بێدەنگی کەمێکی تردەستکاری سەرمێزو کاغەزەکانی کردو ووتی ئێ ووتم بەڵێ مامە، پرسی هیچت پێویست نییە؟ منیش ووتم نەوەڵا قوربان، ووتی ئەتوانی بڕۆیت، خواحافیزیم لێکردو هاتمە دەرەوە. لەو رۆژەوە ئیتر نەچوومەتە حەشارگەی ڕاوە کەو، ئێستا بیری ئەوکاتانە دەکەمەوە ئەو کەوە جوانانەم کوشتوە، بۆخۆم خەجاڵەتی ئەکێشم.

# بناری بەمۆ زێدی قارەمان

کوردستان بستبەبستی جێگەی شێرمەردان و پیاوانی بەرگری و زانایانی پایە بەرزە، کەلەڕێگەی پاراستنی خاک و ئاوی ئەم وولاتدا خۆیان کردوەتە قوربانی. ئەوانە ژیان و گوزەران و سەروەت و سامانی خۆیشیان، ئەوەی کەهەیان بووە لەو پیناوەدا لەدەستیان داوە، بەپێچەوانەی بەشێکی زۆر لەسەرکردەو فەرماندە شۆڕشگێڕەکانی شاخی ئەم سەردەمە، دوای رزگار کردنی بەشێکی خاکی باشووری کوردستان، لەدرێژەدان بە بەڕێوەبردنی ئیدارەو دەوڵەتداریدا سەریان لەبازرگان و قۆنتەرات چی و هەڵپەی تالانی سەروەت و سامانی کوردستانەوە دەرچوو.

بەتایبەت لەدوای ساڵی ٢٠٠٣ و روخانی رژێمی عێراقەوە، ئەو قارەمانییەتی و گیان فیداییەی دوێنێ نواندیان ئەمرۆ گۆڕیانەوە بە پوچترین کالا، بەجۆرێک ناوناوبانگی شۆڕش و شۆڕش گێڕیەتی و پێشمەرگایەتیان وا سوک و ناشیرین کرد، زۆرێک لە شۆڕش گێڕەکان بەشەرمەوە باسی رابووردویان دەکەن. ئەم باسە بەجێ ئەهێڵین بۆ ئەوانەی ئەو مێژووە پڕلە شەرمەزاریە ئەنوسنەوە، بێگومان ناوی قارەمانانی بەرندەی هەڵپەچی لە کۆکردنەوەی سەروەت و سامانی ناشەرعی بەفرو فێڵ لە نوسینەوەی ئەو مێژووەدا نابووێردرێت.

بابێینەوە بۆ سەر باسەکەی خۆمان، یادێک لەناوچەی بناری چیاکانی بەمۆ و خۆشک و زمناکۆ وەک زێدی قارەمانان بکەینەوە. سروشت و هەڵکەوتەی ناوچەکە زنجیرەیەک چیای سەخت و بەرز بەچەند ملەو دەربەندێک لێک جیابوونەتەوە، هەریەکەیان دەیان دەرەو دۆڵ و شیوی قوڵ و هەردەو پانتای و کەلومل و نزارو خۆرەتاوی لەخۆگرتوە، دەیان ئەشکەوت و بنڕەمەند و تاق و کونیان تێدایە، ڕووبەریان بەجەنگەڵی داربەڕو و دارقەزوانی دلگیر داپۆشراوە، ئاژەڵەکانی وەک بەرازو کەڵوبزن و چەقەڵ و ڕێوی و کەروێشک........تاد، لێرەدا ئەژین. باڵندەکانی وەک داڵەکەچەڵەکان، هەڵۆکان، بازەکان، قاژەکان و پۆلەکۆترەکان و پۆلە کەوەکانی بێشومارو

زرکەو، هەروەها چەندین جۆرە چۆلەکەو باڵندەو بولبول چیاکانی ئەوەندەیتر دڵگیر کردوە.

لەشۆڕشی ئەیلولدا ئەو سنوورە ناوچەیەکی گرنگ و ستراتیجی بووە بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بووەتە جێگەی بنکەو بارەگای هێزەکانی سنووری خانەقین و گەرمیان، ناوچەی رزگارکراو بووە، لەوێوە دەستەو پەل و لقەکانی بەتالیۆنی (٦) شەشی سەر بەهێزی خەبات بەربوونەتەوە بۆ قوڵای سنوورەکە بۆ ئەنجامدانی کارو چالاکی سیاسی و سەربازی، دواتر گەڕاونەتەوە بنکەو بارەگاکانیان، جگە لەو هێزانەی سنوورەکانی تری کوردستان بەشێک بوون لەو هێزە، بۆخۆی ناوچەکە خاوەنی چەندین فەرماندەی قارەمان و هێزێکی خۆیی پێشمەرگەی ئازاو دلێر بووە، کەناوبانگیان لەسەرانسەری سنووری سلێمانی و گەرمیاندا بڵاو بوو.

فەرماندەکانی بەتالیۆنی شەش سەرەتا شەهید فاخر مێرگەسوری بووە دوای ئەو فازل تاڵەبانی، دوای ئەویش ملازم ساڵح پێداوی و دواجاریش رائید عوسمان سندی بووە. فەرماندە دیارەکانی تریش ئەمانە بوون: ١- ئەکبەر حەیدەر، ٢- سمایل ئەحمەد بەنا، ٣- عومەری سەید مەحمود، ٤- ئەحمەد فەتاح رۆستەم، ٥- ملازم جوامێرسایە میر، ٦- مەلاعەلی شمشێر کول.

ئەم هێزانە دووژمن تۆقێن بوون، رژێمی ئەوکاتی عێراق داخ لەدڵبوو بۆیان، هەروەها گرنگی ناوچەکەو دەوری هێزەکە وای کردبوو رژێم لەدوای کۆتایی هاتنی شۆڕشەکە بەپلانی گڵاوی نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٧٥ بەناوی رێکەوتننامەی جەزائیر. بێ داکەوتن و مۆڵەت دان بە خەڵکی سنوورەکە هێرش بکاتە سەریان و کۆچیان پێبکات، هەموو ئاواییەکانی سنووری ئەوبەری سیروان لە خانەقین و نەفتخانەوە بۆ ژاڵەنا و لە تەنیشت دەربەندیخان چۆڵ بکات و خەڵکی عەرەب بهێنێتە سەر ئاوایی و زەوی وزار وکانی و ئاوەکانیان، وەلەناوچەکەدا چەندین ئوردوگای بۆکردنەوە، لەوانە: لەقۆرەتوو، مەحمود قەجەر، پەروێزخان، حاجیلەر، مەیدان، باخەنارە وقسڵان ، کونەقەل، کەمتاران، شاوازی و کۆزەناڵی. ئەو عەرەبە هاوردانەی چەکدار کردن و دەستیان کرد بە کشتوکاڵ کردن و مەروماڵات بەخێو کردن.

لەدوای کارەساتی ساڵی ١٩٧٥ کاتێک یەکێتی جاڕی دروست بوون و دواتریش دروست کردنەوەی مەفرەزەکانی هێزی پێشمەرگەی ڕاگەیاند، هەمان سنووری ئەوبەری ئاوی سیروان، واتە ڕۆژهەڵاتی گەرمیان بێ دواکەوتن چەندین مەفرەزەیان لەناوچەکەدا دروست کرد و بەچەک و تەقەمەنی خۆیانەوە دەستیان کردەووە بەخەباتی پێشمەرگانە و جەنگی چریکی (پارتی زانی) .

پێشمەرگەکانی بناری بەمۆ جگەلەوەی ماوەیەک شەهید شەوکەتی حاجی موشیر و ماوەیەکیش شەهید سەلاحی موهەندس بوونە بەرپرسیان، بەدرێژای مێژووی شۆڕشی نوێ خۆیان بەرپرس و هێزی پێشمەرگەی ناوچەکەیان بەڕێوە بردوە، لەشۆڕشی نوێدا ماوەماوە لەبەر فشارو هێرشەکانی سوپای عێراق بۆسەریان، بۆپشودان و خۆپاراستن دەهاتنە سنووری قەرەداغ یان شارەزوور و هەورامان، جگە لەوشەڕو بەرگریە بێوێنانەی سنوورەکەی خۆیان، لەو شەڕو بەرگریانەی سنوورەکانی تر بەشدار دەبوون و داستانی وایان تۆمار دەکرد دەبووە جێی شانازی هەموو گەلی کورد، لەوانە شەڕی ئالان و حاسڵ شەڕی چیای زەردە و......تاد، ئەوانە نابنە بیرەوەری من بۆیە بەجێیان ئەهێڵم بۆ خۆیان بێگومان هەریەکێک دەبێت لەبەشدارانی ئەو شەڕانە وردەکاری ئەو قارەمانییەتیانە بنوسێتەوە، بەڵام لێرەدا پێم باشە یادێک لە فەرماندەو پێشمەرگە ئازاو ناسراوەکانی بناری بەمۆ زێدی قارەمانان لەشۆڕشی نوێدا بکەمەوە تەنها بەنوسینی ناوەکانیان.

لەوانە:١- شەهید مامە عەلە ڕەش ٢- شەهید ئازادی کوڕی مام عەلە ڕەش ٣- شەهید مەحمودی مامە عەزە ٤-مام عەزەی باوکی مەحمود ٥- سەلامی کوێخا عەزیز ٦- سالحی کوێخا عەزیز ٧- ڕەئوفی یاسە ٨- حاجی عەبدوڵای حەبە ٩- سەدیقی سۆفی مەجید ١٠- سەدیقی عەلی تەوفیق ١١- عەزەی حەمەی خەنان ١٢- حسێنی حامید ١٤- غەفوری گەردە ١٥- باقی حاجی عەزیز ١٦- عەبدوڵا ساڵح ١٧- فایق یارئەحمەد ١٨- حەمەمینی ڕەسوڵ ١٩- حەمەفەرەج فەتاح ٢٠- حسێنی مەلا شەریف ٢١- ساڵحی مەحمود ٢٢- حەمیدی حاجی مینا ٢٣- ڕەشید حەمە ئەمین ٢٤- شەهید عەبەی دێفاتە ٢٥- سابیری کوێخا محەمەدی شمشێر کوڵ ٢٦- حەمید شمشێرکوڵی ٢٧- لالە سەعید ٢٨- سەعیدی حاجی تەوفیق ٢٩- ڕۆستەمی

ئەخلی ئەولا ٣٠- ستاری ساله قوله ٣١- سەعیدی حاجی عەبدلقادر ٣٢- ئەحەی دێحەبە ٣٣- ئەحمەد ئاربیجی ٣٤- حەمیدی کەریم خەسرەو ٣٥- حەمید ئەحمەد ٣٦- جەلەی حەمەی سالح ٣٧- سالحی عەلی فەرەج ٣٨- تەنیا محەمەد ٣٩- شاسوار عەبدولا ٤٠- وەلی ئەحمەد زەریفە ٤١- ئەمینی حسێن ٤٢- عەبدولکەریمی سەید عەبدولڕەحمان ئەمانەو دەیان شەهیدو قارەمانیتر.

داوای لێبووردن دەکەم لەو کادرو فەرماندەو پێشمەرگەو کەسوکاری ئەو شەهیدانەی سنووری بەمۆ ناویان نەهاتووە، لەهەردوو شۆڕشی ئەیلول و نوێدا بەشداری کاریگەریان هەبووە، بێگومان ناوهێنان و باسکردنی چالاکی و خەبات و دەور وماندوبوونی ئەوانە بۆخۆی کتێبێکی تایبەتی ئەوێت. من ئێستا نازانم کەسێک لەو سنوورە بەتەمایە بیرەوەریەکانی خۆی بنوسیوەتەوە یانا، ئەگەر نەنوسراونەتەوە بەهیوای ئەوەی بنوسرێنەوە لەلایەن تێکۆشەرانی سنوورەکەوە، بۆ ئەوەی ئەو بەشە لە مێژووی پرسەروەری شۆڕشەکانی گەلەکەمان بزر نەبێت.

١٩٩٩/٢/١٢ ڕۆژی هەینی بوو هەرلەوێ لەبناری چیایی بەمۆ لەسەرکانی ریئیسان ماینەوە، سەردانی ئاوایی پشتەو گلەجال و چەند شوێنێکی خۆش و دڵگیرمان کرد، نیوەڕۆ گەڕاینەوە لەلای دەربەنی سەرتەکدا ژنێک و منداڵێک وەسابوون لەکەنار ڕێگاکەدا، لەلایاندا وەستام و ووتم فەرموون، سواربوون، لەلای هۆرێندا دابەزین، ئەوجا ئەوان بەئێمەیان ووت فەرموون بچینەماڵەوە چاییەک بخۆن، سوپاسمان کردن و پرسیم من ڕەحمم بۆتان هەیە ئێوە کێن؟ ژنەکە ووتی خوشکی مەحمودی مامە عەزەم منیش دوای ئەوە دابەزیم و ڕێزی تایبەتم لێگرت و خۆم پێناساند ماڵئاواییم لێکرد.

بە جادەدا هاتینە خوارەوە، دەشتی بناری بەمۆ لە قسڵانەوە بۆ بێلولە و سەرئاوی هەواسان، سەوزی پۆشیوەو هەوایەکی پاک و دیمەنێکی جوانی هەبوو، بۆیە بڕیارمان دا لەو جادە تازەوە کە لەنزیک قسڵانەوە بۆ شێخان و بێلولە دروستکراوە بڕۆین، لەنزیک ئاوایی خەرکنێ، پیاوێکی سۆفی کورتە باڵای روخسار پانی نورانی بە ئاماژەی دەست داوای کرد بووەستین، وەستاین، ووتم فەرموو، پرسی هەواڵی ئەو زەلامانە نازانن ئەڵغامیان پیاتەقیوە؟ لەوکاتەدا دووژن لەئاواییەکەوە بەپەلە بۆلای ئێمەدێن، ووتمان

نەوەلا ئاگامان لێنییە، دوو ژنەکە گوێیان لەوەڵامەکەی ئێمە بوو دەنگیان بەرزکردەوە ووتیان ئەوان نازانن و گەڕانە دواوە.

لەوێوە تێپەڕمان کرد، گەیشتینە ئیمام زادەیەک، بە ناوی شێخ جبرەئیل کوڕی ئیمام موسای کازم، قەبرسانێکی کۆن و گەورەیە چەندین خانوی گومەزیداری روخاو نیوە روخاوە، ئەم ئاسەوارە بەدەستی خەڵک تێک دراوە زۆربەی کێلەکان کە نوسینیان لەسەرە شکێنراون، کورد دژی ئاسەواری باستانی خۆی و ناوچەکەشیەتی، یان وێرانی دەکات و کوێری دەکاتەوە یان لەبنەوەڕا هەڵی ئەتەکێنێ و دەری ئەهێنێ و بە بێگانانی ئەفرۆشێ.

هەندێک پارچە شکاوی کێلەکانم کۆکردەوە و لەجێگای خۆیانم دائەنانەوە و بەختیار فەتاح وێنەی لێدەگرتنەوە. زۆربەی نوسینی سەر کێلەکان بە زمانی عەرەبی و فارسی نوسراوە، نەوجەوانێکی شوان هات بۆلامان ناوی هێمن بوو، ووتی وەرە ئەمبەرەوە لێرە قەبری زیاتری لێیە، کاتێک چووم بینیم خانوەکان وەک خانەقایەکی کۆن و دێرینن ڕارەوی درێژ و تاق و پەنجەرەی هیلالی و ناوتەختی دیوەکان قەبری تێدایە، نوسین و بەرواریان لەسەرە، یەکێک بەروارەکەی ١٢٣٢ بوو.

لای عەسرەوە چووینە سەرسنووری درەیمی کوڕێک بەناوی عەدنان برنجی دەفرۆشت قۆریەک چایی بۆ هێناین، کوڕێکی ئێرانیش کاکەیی بوو هات بۆلام ناوی عەلی حەسەن بوو، ووتی ئەوبرادەرانە ووتویانە ئەوە حەمەی حەمەسەیدە، ئێمە لەودیو ناوی تۆمان بەباشە بیستووە، بۆیە زۆر حەزم کرد تۆم بینی ووتم بابچم مەرحەبای بکەم، پرسیم لەودیو خەڵکی کام ئاواییت؟ ووتی ئێمە کۆچەرین دووساڵە دەربەند دمۆڵ ئەگرین بەئیجار بەزستاناندا بۆ لەوەڕ خۆری، بەهاوینانیش کۆچ دەکەین بۆ ئێلاخ.

لای ئێوارەوە گەڕاینەوە لەسەر ئاوی هەواسان لەسەر گردێک لەبەری بەمۆوە کەمێک دانیشتین، رووبە رۆژهەڵات دیمەنێکی هەرگیز لەبەرچاو ون نەبوو وێنا بووبوو، بەردەم دەشتایی سەرسەوز تا دێی دێسوتگ دیارە، باشووری چیای شەڕوال درەیە بەری باکووری چیای بەمۆیە، لەوسەری ئەوسەر رووبەروو لوتکەکانی بەبەفر داپۆشراوی داڵەهۆ دیارن. دوای

تەماشاکردنێکی ئەودیمەنە سەنج راکێشە کۆتایمان بە گەشتەمان هێناو گەڕاینەوە بۆ شارەزوور.

## یاداشتەکانی ڕۆژانی 1999/2/13 بەدواوە

لەکۆبوونەوەی ڕۆژی٢/١٣ دا لەبارەگای مەڵبەند لەهەڵەبجە بڕیارماندا کاک مەلائەحمەدی جەیران کەبەرپرسی کۆمیتەی شارۆچکەی سەیدسادقە بگوازینەوە بۆبارەگای مەڵبەندو کاک عومەری حاجی ئەحمەدی گردی قازی دابنێین لەجێگەکەیدا . ڕۆژی ٢/١٤ لەبارەگای مەڵبەند سەرقاڵی ئیشوکاری ڕۆژانەبووم، هەر ئەم ڕۆ تارق عەزیز ئەندامی سەرکردایەتی حزبی بەعس و وەزیری دەرەوەی پێشتری عێراق و جێگری سەرۆک وەزیرانی ئێستای عێراق، کەپیاوێکی عەرەبی مەسیحییە، لە عێراقەوە دەچێت بۆ وڵاتی تورکیا، ڕۆشتنەکەشی بە ئۆتۆمبێل و بەخاکی کوردستان و بەنێو دەستەڵاتی پارتی دیموکراتدا گوزەر دەکات.
هەر ئەمڕۆ تیشکی خۆر ئەوەندە گەرم بوو لەگەڵ هەڤاڵ کاک کەمال تاماسدا لەحەوشەی مەڵبەندا چووینە ژێر سایە و سێبەر دانیشتین، دوانیوەڕۆش بەشداری ڕێورەسمی پرسەی پیاوێکی کۆکۆییم کرد لە مزگەوتی کانی عاشقاندا، ناوی کۆچ کردو خاڵە حەمە بوو. ئێوارەی ئەمڕۆش بۆ بەدوادا چوونی هەواڵێکی برادەرانی زانیاری لەڕێگەی پشتی عەبابەیلێوە چوومە سەرشاخی شنروێ و ئەشکەدۆڵ و دواتر لەڕێگەی تاوێرە و سەرکەنەوە گەڕامەوە بۆ عەنەب و شەو هاتمەوە بۆ هەڵەبجە. لەم سەفەرەدا کاک حەمەهاواری و کاک عەزیزی حاجی ئەولەم لەگەڵ خۆمدا بردبوو، هەواڵەکەش ئەوە بوو گوایا هێزی چەکداری گوماناوی بەنهێنی لەو شوێنانەدا بینراون، دواتر وترا لایەنێکی سیاسی ئێرانی بوون مەفرەزەی چەکداریان لەو دەورو بەرەدا بینراون.
ڕۆژی ١٩٩٩/٢/١٥ لەهەڵەبجەوە هاتمە بارەگای کۆمیتەی ڕێکخستنی تانجەرۆ لەشارۆچکەی عەربەت، بۆلای کاک عومەر عەبدولکەریم، بەبۆنەی دەست بەکاربوونییەوە وەک بەرپرسی کۆمیتەکە. هەر ئەمڕۆ چووم بۆ کۆیە

بۆلای حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لەگەڵ سێ بەرپرسی دیاری ئەو حزبەدا کۆبوومەوە ئەوانیش کاک کاوەی بارامی خەڵکی شاری پاوە، سەید رەزای درود گەرو کاک سەروان شاهۆ، ئەمانیش خەڵکی هەمان شاری پاوەن، قسەو باسمان کرد سەبارەت بەوەی گوایا چەند مەفرەزەیەکیان ناردوە بۆ دەورو بەری هەڵەبجە، ئەگەر ئەوە وایە بیان گێڕنەوە بۆئەوەی گرژی لە سنوورەکەدا دروست نەبێت. لەوەڵامدا ووتیان ئێمە کەسمان نەناردووەو ئاگادارنین. منیش سوپاسم کردن و شەو لەوێ لەماڵی کاک عەبدولکەریمی جەلالی مامەوەو بەیانی گەڕامەوە بۆ سلێمانی.

دوای رێککەوتنی پارتی و یەکێتی و راگرتنی شەڕی ناوخۆ، هەردوولا بەڵێنمان بەکۆماری ئیسلامی ئێران داوە رێگە نەدەین ئۆپۆزسیۆنی ئیرانی لە خاکی هەرێمی کوردستانەوە مەفرەزەکانی چەکدار بپەڕنەوە بۆ ئەودیو سنوورو چالاکی چەکدارانە ئەنجام بدەن، لەبەرامبەریشدا کۆماری ئیسلامی ئێران لەناوخاکی هەرێمدا هێرش نەکەنە سەریان و لەوبارەوە چاوپۆشی بکەن.

بەیانی زووی رۆژی ١٩٩٩/٢/١٦ لەکۆیە دەرچووم، کاتژمێر ١١ی نیوەڕۆ گەیشتمە سەربازگەی سەلام لەنزیک سلێمانی. لەوێ ئاگادار بووم عەبدولا ئۆجەلان، سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستانی باکوور گیراوە، لە تورکیا دەست بەسەرە، دەنگۆی ئەوە هەیە بەهاوکاری موخابەراتی چەندین دەوڵەت لەوانە تورکیا، ئیسرائیل، یۆنان، بەهاوکاری چەند بەرپرسێکی یۆنانی گیرابێت. ئۆجەلان لەکینیاوە چووە بۆ یۆنان، لەسەفارەتی یۆنان لەکینیا دەست کراوە بەجێبەجێ کردنی ئەو نەخشە گڵاوە. سەرئەنجام بەهاوکاری چەندین دەوڵەت ئەو کارە دژبە مرۆڤانەیە ئەنجام دراوە، ئێوارەی هەمان رۆژ هاتمەوە بۆ هەڵەبجە. کاناڵەکانی جیهانی بەتایبەت تورکیەکان ئێرانییەکان رۆژئاواییەکان و عەرەبیەکان سەرگەرمی بڵاوکردنەوە و شرۆڤەی هەواڵەکەی فڕاندن و دزینی ئۆجەلانن.

ئەمڕۆ ٢/١٨ لەسلێمانی خەڵک بە رێپێوان چوونەتە بەردەم دەرگای بارەگای UN بۆ پشتیوانی لە ئۆجەلان، تورکیا بەتۆمەتی لەتکردنی ولات ئۆجەلانی داوەتە دادگا، بەسەرۆکی باندی تیرۆریست ناوی دەبەن، سزای لەسێدارەدانە.

ئەمڕۆ۲/۲۱ لەهەڵەبجەم، هەوا ساردە، شەو باران باریوە، لوتکەی چیاکان بەفریان گرتووە، لەبارەگای مەڵبەندم، بڕیارە سلێمانی خۆپیشاندانی گەورە ئەنجام بدەن بۆ دژی گرتنی سەرۆک ئۆجەلان، حزبی شیوعی لە هەڵەبجە پەیوەندیان پێوە کردم بۆ زانینی رای ئێمە سەبارەت بەئەنجام دانی خۆپیشان دان لە هەڵەبجە، لەوەڵامدا پێم ووتن بەشدار ئەبین و پێمان باشە. دواتر کاک جەمیل هەورامی هات و مەڵبەندی یەکگرتووی ئیسلامی سەردانیان کردین و لەکۆبوونەوەیەکی هاوبەشدا بڕیار درا هاوکاری یەکتر بین و ئاشتی و تەبایی نێوان لایەنە سیاسییەکان پەرە پێبدەین، دوای کۆبوونەوەکە، رادیۆی بزووتنەوەی ئیسلامی هاتن و چاوپێکەوتنیان لەگەڵ مندا ئەنجام دا. لەوەڵامی پرسیارێکدا، ئایا چیبکرێ بۆ ئایندەی کوردوستان؟ لەوەڵام دا ووتم ئاشتی و تەبایی نێوانمان پەرە پێبدەین، هەڵوێستە سیاسی و دیپلۆماسیەکان یەک بخرێن، بیری تەسکی حزبایەتی وەلاوە بنرێت و پەیوەندیە ناوخۆی و دەرەکیەکان یەکبخرێن و.........تاد.

هەر ئەمڕۆ ئەندامانی قەرارگای رەمەزان لەوانە بەنی ئەحمەد و سادقی ئەرجومەند سەردانیان کردین و نیوەڕۆ لامان میوان بوون. پاش نیوەڕۆ سەردانی بارەگای نوێی مەڵبەندمان کرد لەگەڕەکی شارەوانی شاری هەڵەبجەدا، ئێوارەش لەگەڵ میوانەکانمان سەردانی کاک هوشمەندی یارئەحمەد بەگمان کرد لە بنچی دڕەی، ئێوارە لای ئەو میوان بووین و شەو هەردوولا گەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە. ئەمشەو شەوی ۲۱لەسەر۱۹۹۹/۲/۲۲ لەکاناڵە جیهانییەکانەوە کاروچالاکی کوردەکان لەسەرتاسەری جیهاندا بۆ پشتیوانی عەبدوڵا ئۆجەلان پەخش ئەکرێت .

۱۹۹۹/۲/۲۲ رۆژی دوو شەمە لەگەڵ کاک جەمیل هەورامی سەرگەرمی ئیشوکاری ئاسایی مەڵبەندی رێکخستنی شارەزووری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بووین، لەگەڵ مام وریا هاواری کارگێڕی مەڵبەند کۆبوونەوەیەکمان کرد بۆ رێکخستنی کاروبارەکان، پاش عەسر سەردانی ماڵی کاک ئیبراهیمی کاکەئەحە و ماڵی دایکی شەهید کەیکاوسم کرد، ئێوارە گەڕامەوە مەڵبەند، شەو سەردانی سەمیرەخانی خوشکی مامە رەشەی ئەحە کوێرم کرد، سەمیرە نەخۆشە، ماڵیان شپرزو خێزانێکی کەم دەست و زۆر هەژارن. مامە رەشەی برایان پێشمەرگەیە، بەڵام پێشمەرگەی راستەقینەی

پارێزەری وڵات، ئازاو بووێر، نەترس و چاوقایم، ئەم خێزانە خەڵکی ئاوایی عەبابەیلێن، ئەمشەو بەبینینی ناومال و باروودۆخی خێزانەکە و نەخۆشی سەمیرە خان لەدڵەوە دڵگرانی کردم، مامەرەشە هەموو جارێک کەخەرجی نامێنێ، پێم ئەڵێ کاکە حەمە من ئەزانم شەهید ئەبم تادوا جاری ژیانی ئاسایی و تەمەن ناکەم، بۆ هەر لەئێستاوە شەهیدانەکەم نادەنێ کە پێویستمە.

کۆبوونەوەکەمان لەگەڵ کاک جەمیل و مام وریا لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە بوو:

١ – پاسەوانانی کارگێڕەکان و ئەندام مەڵبەندەکان کۆکەینەوە، ئەوەی کەهەیەو ئامادەیە کەرتێکیان بۆ دروست بکەین، هەر هەڤاڵێک بەئیشوکار چووە دەرەوەی مەڵبەند پاسەوان لەگەڵ خۆی بەرێت، ئەوانەی وەهمی و نادیارن ناوەکانیان بسرێتەوە.

٢ –هەردوو بنەماڵەی شەهید حسێن و مەحمود مستەفا کۆکەینەوە و قسەیان لەگەڵ بکەین سەبارەت چارەسەر کردنی ئەو کێشەی هەیانە.

٣ – بۆ کێشەکانی کۆمیتەی هەڵەبجەی تازە لەسەر بروسکەی کاک حەمە شارەزووری کە بەرپرسی کۆمیتەکەیە، لیژنەیەکمان دروست کرد لە هەڤاڵان مام وریا، مامۆستا کەریمی شێخ عەلی، مامۆستا بەکر سەرسپی بۆیسان سووری. بریارە رۆژی چوارشەمە بچنە سنووری کۆمیتەکە.

٤ –کاک حەمەسەلیم و مامۆستا عابد کێشەیان هەیە، کاک حەمەسەلیم پێشمەرگەی دێرین و بەرپرسی ئیدارەی بارەگای مەڵبەندە، پیاوێکی دڵسۆزو ماندووە. بریار درا کاک جەمیل نامەیەکی پشتگیری بۆ داواکەی بنوسێ، مامۆستا عابدیش خەڵک عەنەب و کەسێکی دڵسۆز و خاوەن رەوشتی جوان و بەرزە بریار درا بارەگای مەڵبەندمان گواستەوە بۆ بارەگا نوێکەمان لەگەڕەکە شاروانی هەڵەبجە، بیکەینە بەرپرسی پرسگەی مەڵبەند.

٥ – بۆ چارەسەری کێشەی زەردۆییەکان، سەرەتا سێ کەسیان ببینین قسەیان لەگەڵ بکەین و گوێیان لێبگرین، تابزانین داواکاریان چیە، دوای ئەوە هەوڵی چارەسەری کێشەکانیان بدەین. زەردۆییەکان نیگەرانن لەیەکێتی، دەڵێن لێمان ناپرسرێتەوە.

رۆژی ٢/٢٧ بەیانی زوو لە سلێمانییەوە کاک شەماڵم رەوانەی تەوێڵە کردەوە بۆ ئەوە لەمەرزی شۆشمێوە بچێتەوە بۆ ئێران، بۆ رەوانە کردنی

منداڵەکانی شەهید کەیکاوس لەتارانەوە بۆ سوید، شەماڵ کوڕی محەمەد سان ئەحمەد (مام رەئیس) ە میوانم بووە ، ناوبراو لەساڵی ١٩٨١ سەربازی هەڵهاتو بووە و چوەتە ئێران وەک پەنابەر، کوڕێکی زیرەک و لێهاتو بوو، دوای ماوەیەک مانەوە لە شاری کەرەج لە ئوردوگای پەنابەران دەبێتە سەرپەرشتیاری ئوردوگاکە، بەهۆی تێکەڵاوی و هاتوچۆی لەگەڵ کاک سەربازی نادر هەورامی، دەبێتە دۆستێکی نزیک و جێگە متمانەی کاک ئیدریس بەرزانی لەکەرەج دا.

لەکاتی رێککەوتنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ساڵی ١٩٨٥بەدواوە لەگەڵ ئێران، شەماڵ دۆستی یەکێتی و لەناو ئێراندا دەوری باشی هەبوو، هاوکاری باشی یەکێتی کرد، بەتایبەت ئەو سەربازە هەڵهاتوە کوردانەی ناو ئوردوگاکە ئەگەڕانەوە بۆ ناو هێزی پێشمەرگە کار ئاسانی بۆ دەکردن، ئەوکەسانەی دەچوون بۆ ئەوروپا داوامان بکردایە پشتگیری دەکردن و یارمەتی ئەدان، دەیان دۆستی یەکێتی کە بەتۆمەتی جیاجیا لەزیندان بوون لەئێران بۆ ئازاد کردنیان هەوڵی زۆری دا، دوای کۆتایی هاتنی شەڕی ئێران و عێراقیش شەماڵ لە ئێران مایەوە و وەک کارمەندی فەرمی شارەوانی لە شاری کرماشان کاری دەکرد. برایەکیشی بەناوی بەرزان پێشمەرگەی یەکێتی و فەرماندەی کەرت بوو دوای راپەڕین شەهید بوو،

بەڵێ ئەمڕۆ، دوای رەوانە کردنی کاک شەماڵ بۆ تەوێڵە، سەردانی فەرمانگەی دادگای سلێمانیم کرد، بۆ معامەلاتی ئەوخانوەی لە عەقاری وەرم گرتووە لەباتی زەوی نیشتەجێ بوونی پێشمەرگایەتیم، دوای ئەوە لەکاتب عەدل واژۆیەکم کرد چووم بۆ هەڵەبجە.

لە هەڵەبجە سەرەتا لەبارەگای مەڵبەند تانیوەڕۆ ئیشوکارەکانی ئاسایی حزبی و پێشمەرگانەم جێبەجێ کرد، نیوەڕۆدوا سەردان و بەشداری رێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی یەکێک لە پیاوە دیارو ناسراوەکانی کاکەییم کرد بەناوی کاک رەحیمی شاقوڵی، خوالێخۆش بوو باپیری رێبین یارئەحمەدی راگەیاندکارە. هەر ئەمڕۆ و دوای بەشداری کردنم لەپرسەکەدا سەردانی چەند ماڵێکی ماندوی رێگای کوردایەتیم کرد کەخاوەن خەبات و تێکۆشانن و لێمان دڵگرانن، لەوانە ماڵی کاک حەمەی حاجی عوسمانی حەمەلە و کاک عەبدوڵای برای، لەگەڵ ماڵی پورە نەزیرەی هاواری دایکی شەهید جواد و

ماڵی مامۆستا محەمەدی دەڵەمەڕی هەموویانم ئاشت کردەوە، گلەیان هەبوو لە یەکێتی و گلەییەکانیشیان لەسەر حەقبوو.

جەماوەر و دۆستەکانی یەکێتی چەند دڵگران و نیگەرانبن لە یەکێتی بەسەردان و بەسەر کردنەوە ئاشت ئەبنەوە، ئەگەرچی داواکەشیان جێبەجێ نەبێت، باوەڕناکەم لە کوردستان هیچ حزبێک جەماوەرەکەی بەقەد جەماوەریی یەکێتی دڵسۆزو ئامادەی فیداکاری و قوربانی دانبن، بەداخەوە هەمیشە کێشە و گرفتەکان لەسەروە بۆخوارەوە شۆڕ دەبنەوە، مەبەستمە بڵێم کێشەکانی یەکێتی لەرابەرایەتیەکەیدان، نەک لەناو ئۆرگانەکانی خوارەوەو جەماوەرەکەیدا.

شەو چوومەوە بۆ ماڵی کاک عەزیزی حاجی ئەولە، ئەمشەو چەند راپۆرتێکم خوێندنەوە و نامەیەکم لەسەر بارودۆخی ناوچەکە و ئیشوکارەکان نوسی بۆ جەنابی مام جەلال. لەراگەیاندنەکانەوە کارو چالاکیەکانی کوردانی کوردستانی گەورەو رێکخراو کەسایەتی و سەرکردەی وڵاتانی ئازادی خواز بۆ پشتیوانی لە عەبدوڵا ئۆجەلان و دژی ئەو پیلانە گڵاوە نامەردانەیە هەروا بەردەوامە.

لێرەدا شتێک کە بۆمن جێگەی نیگەرانییە، هەڵوێستی برایانی پارتییە لە کوردستانی باشوور، سەبارەت بەو پیلانە و گرتنی سەرۆکی پارتی کرێکاران. تەماشابکەو بخوێنەرەوە هەڵوێستی پارتێکی کورد خۆی و هەڵوێستی سەرکردەیەکی عەرەب سەبارەت بەپیلانی دژی کوردان و خۆت بەراوردیان بکە، ئەوجا ئەزانی کورد چەندە بەدبەخت و نەزان و نەگبەتن.

بەڕێز قەزافی سەرۆکی لیبیا، لەسەر گرتنی ئۆجەلان و کێشەی کورد، ئەم ووتارەی داوە بە دەزگاکانی راگەیاندنی جیهانی و دەڵێت: لەیەک کاتدا وتەیەک ئاراستەی سێ لایەن دەکەم، برایانی تورک و براکوردەکانم و دەوڵەتەکانی بەشدار لەم پیلانەدا، بەبرایانی تورک دەڵیم خۆتان لەخشتە مەبەن شادی دەرمەبڕن، ئەگەر وادەکەن ئەوە هیچ لەمێژو شارەزانین، ئێوە خۆتان بەسەرکەوتنێکی بێ ناوەرۆک و پوچ هەڵمەخەڵەتێنن، چوونکە ئەستەنبوول پێش ئێوە شادی و خۆشی وای دەربڕیوە، کاتێک کەسەری گومەو عەبدول جەلیل و یەحیا سویدیان بری و بردە ئەستەنبوول، ووتیان یاخی بوان و جوداخوازەکانی تەرابوولس لەناو بران و ئیتر لیبیا هەتا هەتایە

پەیوەستی ئەستەنبووڵ دەبێت، ئێستا مێژوو بە عەقڵی ئەو کاتە پێدەکەنێ، ئەوەتا ئێستا لیبیا دەوڵەتی سەربەخۆیەو شادیەکەی ئەوسای ئەوان، خۆڵەخشتە بردن بوو. جارێکیتر ئەستەنبووڵ شاگەشکەبوو بەلەناوبردنی، عەبدول کەریم خەلیل و عەبدول حەمید ئەلزەهاوی و ئەلشەهابی وسەلیم ئەلجەزائیری و عەبدولقادر ئەلجەزائیری و.....تاد، مێژوو سەلماندی بە لەناوبردنی شۆڕشگێڕانی عەرەب نەتواندرا نەتەوەی عەرەب و سەربەخۆیی نەتەوەی عەرەب لەناو ببرێت.

هەروا قەزافی درێژەی دەداتێ و دەڵێت، دیمەنی ئۆجەلان کەمن نایناسم و وولاتکەم هیچ پەیوەندیەکی بەپارتەکەیەوە نییەو تورکیاش باش ئەمە ئەزانێت، بەڵام ئەم دیمەنە ئەوەنییە ئەم دوو ڕۆژە دەبینرێت، ئەم دیمەنە پێشتریش بیندراوە، کاتی شۆڕشی نەتەوەیی عەرەب ئەوکاتە کە نەخل ئەلمەتران ئەلبەعلەبەکی بەچاو بەستراوی و دەست بەستراوی و پاسەوانی تورک بەدوایەوە بردیانە دیاربەکرو کوشتیان، دیسانەوە ئەستەنبووڵ دڵخۆش و شادی گێڕا ووتیان ئەم جودا خوازەمان لەناوبردو بزووتنەوە جودا خوازیەکەی لەناوچوو، هەڵبەت ئەوە بزووتنەوەیەکی جوداخوازی نەبوو، بەڵکو بزووتنەوەی سەربەخۆیی میللەتێک بوو.

ئەوجا هەروا لەم کاتەدا ڕوو لەبرایانی کوردم دەکەم و پێیان ئەڵێم غەمگین مەبن، دوژمنانتان چەندە خوێنتان برێژن ئەوەندە سوتەمەنی دەکەن بەسەر ئاگری شۆڕشی کوردستاندا، تابەردەوامبن لە ڕشتنی خوێنی ئێوە کورەی سەربەخۆیی خوازی کوردستان زیاتر کڵپە ئەسەنێ، نکۆڵی کردن لەمافی سەربەخۆیی گەلان لەتاریکی و لەنەزانینەوە سەرچاوە ئەگرێ، ئەوەش نەزانین و تێنەگەشتنە لەمێژوو، چەندە دوژمنانتان زوڵمتان لێبکەن و نکۆڵی لەسەربەستی مافەکانتان بکەن سەرکەوتن دواجار هەر بۆ ئێوەیە.

سەبارەت بەو دەوڵەتانەش لەم پیلانەدا بەشداریان کردوە، کەمترین شت دەربارەیان بوترێت ئەوەیە، کەبێڕەوشت و ترسنۆک و بێویژدانن، ئەوانە بەرامبەر بەبەرتیل و سەوداو مامەڵەی پیس و چەپەڵ ئەوەیان کردووەو گەلەکۆمەکێیان لە کەسێک کردووە، شەرم بکەن لەو ڕەفتارە ترسنۆکانەیان.

بەڵێ ئەمە هەڵوێستی سەرکردەیەکی عەرەب بوو، دەربارەی گرتنی سەرۆکی پارتی کرێکارانی باکوور، لەگەڵ ئەمەشدا هەڵوێستی پارتی ئەوەبوو

لەلای ئەوروپییەکان بەتیرۆریست بیناسێنن، بۆئەو مەبەستە پارتی نامەیەکی وەزیری دادی ئەوکاتی هەولێر بەواژۆی وەزیر قادر جەباری ئەگەیێنێتە دەستی وەزیری دادی ئیتالیا بۆ تاوانبار کردن و دروست کردنی فایلێک بۆسەرۆکی پەکەکەو لەو نامەدا ویستویەتی ئۆجەلان وەک تیرۆریست بناسێنێ. من کاتێک ئەو دوو هەڵوێستە ئەخوێنمەوە خەریکە شەرم لەخۆم دەکەم.

ئەمڕۆ یەکشەممە١٩٩٩/٢/٢٨ دوای ئیشوکاری مەڵبەند، نیوەڕۆ بەشداری کۆبوونەوەیەکمان کرد لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی سنووری هەڵەبجەو شارەزوور، کۆبوونەوەکە لەفەرمانگەی فەرمانداری هەڵەبجەدا بەسترا، ئەولایەنانەی بەشداری کۆبوونەوەکە بوون ئەمانە بوون: یەکێتی، پارتی، یەکگرتوو، بزووتنەوە، شیوعی و سۆشیالیست. ئەم کۆبوونەوە بەسەرپەرشتی کاک جەمیل عەبدولڕەحمان قائیمقام بەڕێوەچوو.

مەبەستی کۆبوونەوەکە خۆ ئامادەکردن بوو بۆ ڕێکخستن و بەشداری کردن لە فیستیڤاڵی یادی رۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ کەرۆژی کیمیاوی بارانی شارەکەو ناوچەکەیە لەلایەن فڕۆکە جەنگیەکانی عێراقەوە. لیژنەی سەرپەرشتی دروست کرا، بڕیاردرا هەموومان بەشداربین بۆ پێشوازی میوانەکانی یادەکە، ووتاری حزبیمان نەبێت، لایەنە پەیوەندی دارەکانی وەک کۆمەڵەی قوربانیان و قائیمقام بەووتار بەشداربن، لەگەڵ نوێنەرانی حکومەتی هەرێم و ئەو میوانانەی لەدەرەوە دێن. ئەم یادکردنەوەش خەریکە ناخۆش دەبێت بەهۆی دوو هۆکارەوە، یەکەم: سالانە کارو چالاکیەکان کۆپی یەکترو چەندبارە بوونەوەیە، دووەم: هەموو ساڵێک کۆمەڵێ بەڵێن ئەدرێت بەجەماوەری ناوچەکەو کەمترینیان جێبەجێ دەبن.

دوای تەواو بوونی کۆبوونەوەکە لەگەڵ دەستەیەک لەهەڤاڵانی مەڵبەند و کۆمیتەی ڕێکخستنی هەڵەبجەدا، سەردانی خانەقای شێخ ئەحمەدی شێخ محەمەدی نەقشەبەندیمان کرد لەگەڕەکی کانی عاشقانی هەڵەبجەدا، شێخ عەلی کوڕی شێخ ئەحمەد پێشوازی کردین، کوڕێکی گەنج و بەڕێزە ئەو خانەقا بەڕێوە ئەبات، سەردانەکەمان بەبۆنەی ئەوەوە بوو، چەند شەوێک پێشتر خانەقاکە براوە فەرش و کەلوپەلەکانی براون، ئێمە لەگەڵ خۆمان فەرشێکی نوێمان بردووە بۆ خانەقاکە.

شێخ داوای کرد هەوڵ بدەین بۆ دۆزینەوەی کەلوپەلە دزراوەکەیان، بەڵێنماندا ئاگاداری پۆلیس و ئاسایش بکەین بکۆشن بۆ دۆزینەوەی فەرشەکانی ناو خانەقاکە. دواتر سەردانی چەند ماڵە دۆستێکمان کرد بەبۆنەی نەخۆشیەوە لەوانە خاڵەسەید نەجیمی هانەسورەو کاکە عەلی برای میرزا حەسەن.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/٣/١ ڕۆژی دووشەمە، مانگی٣ی هەموو ساڵێک بوەتە مانگی بۆنە خۆش و ناخۆشەکانی گەلی کورد، وەک: ڕۆژی٣/٥ یادی ڕاپەڕینی کۆمەلانی خەڵکی کوردستانە لەباشوور بەدژی ڕژێمی سەدامی بەعسی و ڕزگار کردنی پارێزگاکانی کوردستان، ٣/٨ ڕۆژی جیهانی ژنان، ڕۆژی ٣/١٦ یادی کیمیاباران کردنی شاری هەڵەبجەو دەورو بەری، ڕۆژی ٣/٢١ یادی جەژنی نەورۆزو سەرەتای ساڵی کوردی.

هەرهەمان ڕۆژ یادی ڕزگارکردنی شاری کەرکوکە بەدەستی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بۆیەکەم جار لەمێژودا ساڵی ١٩٩٩. وا ئێمەش ئەمڕۆ کۆبوونەوەی ئەنجومەنی کارگێڕیمان هەیە بۆ قسەکردن لەسەر خۆ ئامادەکردن و بەشداری کردن لەو بۆنانەداو بۆ دانانی بەرنامەی هەڵبژاردنەوەی ستافی کۆمیتەکان و مەڵبەند لە بەرپرسی پۆل (شانە) وە تا جێگری لێپرسراوی مەڵبەند.

ڕۆژی ٣/٢ دوای ئەنجامدانی ئیشوکاری مەڵبەند، بەنهێنی چوومە ماڵی مامۆستا زەردۆیی لەوێ کاکە حەمەی ئەلەشوانم بینی، دوای کەمێک گفتوگۆ گەڕامەوە بۆ بارەگای مەڵبەند، پاش نیوەڕۆ بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمینیی پیاوێکی هەڵەبجەییم کرد لەمزگەوتی کانی قوڵکە بەناوی ئەحمەد. دوای پرسەکە خەریکی خوێندنەوەی ڕۆژنامەکانی ئەمڕۆو ئەم هەفتەیەم، مانشێتی زۆربەیان لەسەر گرتنی ئۆجەلان و داوای دادگایی کردنێکی عادلانەی بۆ دەکەن، لەئەوروپاو ڕۆژهەلاتی ناویندا زۆربەی مەتڵەب و هەواڵ و بابەتەکانیان لەسەر ئەم ڕوداوەیە.

ڕۆژنامەی ژمارە ٢٢٧ ڕۆژی ٢/٢٦ی یەکگرتووی ئیسلامی لەمەڕ خۆشمان بەناوی لێدوانێک ناخۆشحاڵی خۆیان لەوبارەوە دەربڕیوە، لەلاپەڕەی چالاکیەکانی ئەو حزبەدا باسی سەردانێکی مەڵبەندی ٥ پێنجی

هەڵەبجەیان دەکات بۆلای مەڵبەندی شارەزووری یەکێتی و پێشوازی کردنیان لەلایەن ئێمەوە.

ئەمڕۆش ڕۆژی ١٩٩٩/٣/٤ لەگەڵ کاک جەمیل هەورامیدا چووینە بارەگــای کــۆمیتەی ڕێکخســـتنی تـــانجەرۆ لە شـــارۆچکەی عەربەت، کۆبوونەوەمــان لەگەڵ کــردن بــۆ روون کــردنەوەی چــۆنییەتی پرۆســەی هەڵبژاردنەوەی ئۆرگانەکانیان و خۆئامادەکردنیان لەو بارەوە. کاک شەماڵیش لەئێرانەوە دوای رەوانەکردن منداڵەکانی شەهید کەیکاوس هاتووەتەوە بۆ سلێمانی، ئەمڕۆ مام جەلال بۆ سەفەرەکەیان هاوکاری ناردبوو.

سەردانی مەلاحسێن عەبدوڵا محەمەد رەحیم کرد، بۆ ئەوەی پێی بڵێم کاک شەوکەتی حاجی موشیر لەبەریتانیایە داوای کردووە مەلاحسێن باسی چۆنییەتی سەردانەکەی بۆ گوندی قەرەچەری ناوچەی سەرشیوی سەقز نەکات بۆکەس تا خۆی دێتەوە.

ئەمشــەو شــەوی٤لەســەر١٩٩٩/٣/٥ تەلەفـۆنم کـرد بـۆ سـوئێد بـۆ شیروانی برام، قسەم لەگەڵ ئەدیبە و منداڵەکانی ئەسیرو فرمێسک کرد تازە لەتارانەوە گەیشتبوون، زۆر خۆشحاڵ بووم کە رزگاریان بووە، دوای ئەوان قسەم لەگەڵ کاک بەهرۆزی مەنوچەریدا کرد، داوام لێکرد ئاگای لەومنداڵانەی شەهید کەیکاوس بێت تا جێگیر ئەبن. هەر ئەمڕۆ بوومەلەرزەیەکیش سلێمانی هەژاند.

ڕۆژی ٣/٥ کاک بێستونی ئەسکەندەرو کاک حەسەنی باقی هەورامی و کاک سەباحی ئەندازیار کەلە ڕێکخراوی کرۆ کاردەکەن، چوون بۆدۆڵبیان دێکەی ئێمە بۆ ئەوەی ڕێگای ئۆتۆمبێلی بۆبەرن، جادە و ڕێگاو بانەکانی شـارو شـارۆچکەو ئاوابیەکـانی هەرێمی کوردستـان زۆر خراپ و وێرانن، ئەمڕۆ لەنزیک شارۆچکەی عەربەتدا پێکادانی ئۆتۆمۆبێلڕوویدابوو، د- فەهمی بەڕێوەبەری پەیمانگای کەلار بووبووە قوربانی.

هەر ئەمـڕۆ و دوای گەیشـتنمان بـۆ شـارەزوور لەگەڵ ئەنجـومەنی کۆمیتەی ڕێکخستنی سەیدسادق کۆبـووینەوە، سەبارەت بەهەڵبژاردنەوەی ئۆرگانەکانیــان قسەوباســمان کــرد، دوای نیــوەڕۆش چــووین بــۆ قەزای شـارەوزور لەوێـش بـۆ هەمـان مەبەسـت کۆبـووینەوە لەگەڵ ئەنجـومەنی کۆمیتەی ڕێکخستنی قەزای شارەزووردا.

ڕۆژی ١٩٩٩/٣/٦ ڕۆژی هەینی و پشووە، لەبەر ئەوە لەکەژو کێو دەشت و دەری کوردستان و سروشتە جوانەکەی قەد ئارەزوم ناشکێ، هەرکات فرسەتم بۆ برەخسێ لەشارو و لەماڵ دەرئەچم و کاتی خۆم لەوێ بەسەر دەبەم، بۆیە وا ئەمڕۆ دوای ئەوە چەند هاوولاتیەکی نەخۆشی هەورامانم لە شاری سلێمانی بەسەر کردەوە، ئێوارە لەگەڵ چەند کەسێکی هاوڕێم دا کەووتمە ڕێ بۆ سەر چیای بەمۆ، ئەوانیش کاک حەمەهاواری،کاک دڵسۆزی مام ڕەئیس، کاک عەزیزی حاجی ئەولە، کاک سەروەت بەگ و شیروانی کوڕی بوون، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکیش لەوانەی لەبیرم مابێ کاک رزگاری عەزەقوڵ، ڕۆستەم هەیاس و سەرتیپ حەمەرەزا. بۆ نانی ئێوارە لەشارۆچکەی دەربەندیخان میوانی ئارە و فاخر بووین، کوڕانی کاک حەمەئەمینی مەحمودی ڕۆستەم، ئارەو فاخر دووکوڕی گەنجی جوانی عاقڵ و دۆستی خۆشەویستن لای من، لە بنەماڵەیەکی بەڕێزی خزمانی هارونین.

دوای نانی ئێوارە کەووتینەڕێ بۆ لای ملەی سەرتەک، کاک بەکرە رەشم برد بۆ هێنانەوەی ئۆتۆمبێلەکەم، ئۆتۆمبێلەکەی مەهدی براشم لەکانی ژاڵە لەماڵی جووتیارێک دانا، لەوێ ولاخمان بەکرێ گرت و کەووتینە ڕێ لەرێگای پشتی کانی کەڵەوە، کەقەدیم پێی وتراوە ڕێگەی (تلەئەمنی)،سەرکەوتین و مانگەشەوی درەوشاوە ئەورێگا پێچاو پێچ و سەختەی بەناو تل و بەردو متکەکاندا (هەژگ- بنگەڵە داربەرو) بەرەولوتکەی سەرچیا سەردەکەوێ رووناک کردوەتەوە. ماوەیەکە پشووی شارو سەرکوشنی ئۆتۆمبێل تەمبەڵی کردوین، بۆیە جارجار لەسەر پێچەکانی ڕێگا ئەوەستین و پاڵ بەگابەردەکانەوە ئەدین وتەماشایەکی ڕۆژهەلات دەکەین، تاچاو بڕبکا چراوچراخانی ولاتی باوەجانی و سەلاس و دێهاتەکانی تاوگۆزی لەبێزەلەوە بۆداڵەهۆ و تا دەشتی سەرپێڵی زەهاو دیارن و ئەدرەوشێنەوە.
سەعات دوو نیوی شەو گەیشتینە سەر چیای بەمۆ، لەوێ دەست و برد ئاگرمان کردەوە بۆ هەرلایەک دەست دەبەیت داری داربەڕوی وشک کەوتون، ولاخ دارەکەمان باری خست و گەرایەوە، ئێمەش کوڵەکانمان کردەوە، تیانو تیانچەو (مەنجەڵ) قۆری و کتری، جلوبەرگ و سیپاڵی (جلی) لەبەرکردن لەکەژوکێو، لەگەڵ نان و خواردەمەنی لەیەک جیاکرانەوە، سەرتا چایی دەمکرا، وردە وردە ڕۆژبووەوە، دیمەنێکی هەرگیز لەیاد نەچوو،

قاسپەقاسپی کەوەکـان و ھەڵفڕینیـان لەمـبەرو لەوبەری نـزارو لاپـاڵ و خۆرەتاوەکـانەوە، تریکەتریکـی سـمۆرەو دارەودار کردنیـان، چریکەگەلـی چۆلەکەکان و قژەقژی قژاڵکەو قریوە قریوی قاژەکان و ھەڵفڕینیان لەزەویەوە بۆ ئاسمان و دابەزینەوەیان بۆ سەر زەوی، دیمەن و ئاواز و ئاھەنگ گەلێکی وایـان خوڵقانـدوە مەگەر ھەرخـالق خـۆی ھێـزی ئەو خوڵقانـدنەی ھەبـێ، یائیلاھی.

بەڵی رۆژی ٧ و ١٩٩٩/٣/٨ مـان تـانیوەڕۆ لەنـاو سروشـتی جـوانی سـەربەمۆی سەرکەشـدا بردەسـەر، پـاش نیـوەڕۆی رۆژی ٣/٨ ئەو نـان و خواردن و کەلوپەلی زیادەمان ھەبوو، بەجێمان ھێشت بۆ کاکە ساڵحی شوان و لەڕێگەی حەڵقانەوە ھاتینە خوارەوە بۆ کانی ژاڵەی دۆڵی سەرتەک. لەوێوە گەڕاینەوە بۆ شارەزوور.

رۆژی ٣/٩ سەردانی بارەگای کۆمیتەی قەزای شـارەزوورم کـرد و لەگەڵ ھەڤالانی کۆمیتەدا چووین بۆ بەشداری پرسەی خوالێخۆش بوو کاک عەبدولا ساڵح تەوێڵەی، عەبدولا پێشـمەرگەی شۆڕشـی ئەیلـول و ئێسـتاش پێشمەرگە بووە لە دەستەکەی کاک جەمیل ھەورامی، پێشمەرگەیەکی پاک و دڵسۆزی ھەردوو شۆڕشەکە بووە، ئەیلول و نوێ. ھەر ئەمڕۆ لە شارۆچکەی سەیدسادق سەردانی کۆمیتەی رێکخستنم کرد و لەوێشەوە چووینە مەڵبەند بـۆ ھەڵەبـجەی شـەھید، دوای نیـوەڕۆش بەشـداریمان کـرد لە ڕێوڕەسـمی پرسەو ماتەمینی ھونەرمەندی گۆرانی بێژ خوالێخۆش بوو کەریم دەرەتفێی.

رۆژی ١٠ /٣ لەگەڵ کاک جەمیل ھەورامی و کاک مەحمودی حـاجی ساڵح سـەردانی شـارۆچکەی پێنجوێنمـان کـرد، چـووینە بارەگـای کۆمیتەی رێکخسـتن، کۆبـووینەوە لەگەڵ ئەنجـومەنی کۆمیتەکە بە مەبەسـتی ئامـادە کردنیـان بـۆ ھەڵبـژاردنەوەی ئۆرگانەکـان، نیـوەڕۆ گەڕایـنەوە بۆبارەگـای کـۆمیتەی سەیدسـادق، لەوێ نـانی نیوەڕۆمـان خـوارد، پاشـنیوەڕۆ دوای سەردانی ماڵی ھەڤاڵ مەحمودی حەمەی فەتاحی شاتری، من چوومەوە بۆ بارەگای مەڵبەند لە ھەڵەبجە، ئەوانیش گەرانەوە بۆ سلێمانی.

رۆژی١٩٩٩/٣/١١ پێنج شەممە چووم بۆشـاری سلێمانی، سـەردانی ھەڤاڵ کۆڕدۆ قاسمم کرد لەماڵەکەی خۆیدا، سەبارەت بەھەڵبژاردنەوەی ئۆرگانەکـانی رێکخسـتن ھەنـدێک قسـەو باسـمان کـرد، دیـارە لەم دەمەدا

بەئاشکرا دەست تێوەردان هەبوو لەناو ڕێکخستنەکاندا دەستەیەک بەناوی کاک کۆسرەتەوە، دەستەیەکی تریش بەناوی کاک جەبار فرمانەوە، هەرلایەو ئەیویست لە بەرپرسی پۆلەوە بۆ ئەندام کۆمیتە، جێگری کۆمیتە، ئەندام مەڵبەند، کارگێڕ مەڵبەند تا جێگر مەڵبەند زۆرتر لاکەی خۆی بەرندەبن.

کاک کوردۆ ئەمڕۆ هەوڵیدا من لایەنگری و پشتیوانی لاکەی کاک جەبار فرمان بکەم، چوونکە خۆی سەر بەولایە بوو، من هەرچەندە بڕوام بەوجۆرە بیرکردنەوەو ئەو شێوازەی کارکردن نییە، بۆم باسکرد لەهەردوولا کادرە دڵسۆزو خوێنەوارو ئیشکەرەکان پشتیوانی دەکەم، لەگەڵ ئەوەشدا برێک بەڵێم بۆکرد ، چوونکە لەماڵەکەی خۆیدا بووین، بەڵام دواتر بەگوێم نەکرد، ئەم بیروبۆ چوونەی خۆم دواتر تا کۆنفرانسی مەڵبەندەکە بڕی کرد، ئەوە بوو منیش ساخ بوومەوە لەسەرلایەکیان، دواتر داستای لایەنگریەکەم لەلایەکیان دەخوێنیتەوە.

بەڵی لای کاک کوردۆ دەرچووم و چووم بۆ سەردانی باوکی شەهید نەوشیروان تەپە کوڕەیی، کاک حەمەی ئەول محەمەد، لە سلێمانی لەماڵی پوری شەهید نەوشیروان دادە ئایشە کەوتبوو، نەخۆشەو نەشتەرگەری بۆ کراوە. هەر ئێوارەی ئەمڕۆش سەردانی کاکە حەمەی حاجی مەحمود سکرتێری حزبی سۆشیالیستم کرد، کتێبی ڕۆژمێری پێشمەرگەیەک کە بیرەوەری و یاداشتی خۆیەتی و خۆی نوسیویەتیەوە پێشکەشی کردم و منیش سوپاسم کرد.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/٣/١٣ لەگەڵ کاک ئەحمەد قەدەفەری لە سلێمانییەوە چووین بەرەو هەڵەبجە، لەر ێگادا قسەوباسمان کرد لەسەر هەڵبژاردنی ئۆرگانەکان و دەستەو دەستەگەری، ئەویش ئەم شێوە کارکردن و دەست خستنە ناو کاروبارەکانی پێ باش نەبوو، بەڵام کەمێک سۆزی هەبوو بەلای دەستەکەی کە بەناوی کاک کۆسرەتەوە کاریان دەکرد، گەیشتینە سەیدسادق و ڕێوڕەسمی پرسەی باوکی حسێنی کادر هەبوو، ناوی کاکە حەسەن و باوکی شەهید سدیقیشە، سدیق حەسەن پێشمەرگەیەکی سەرەتای شۆڕشی نوێ و کوڕێکی پێکەوتوی جوان و ئازاو دڵسۆز بوو، بەداخەوە شەوێک لەئاواییی حاجی قادری مارف لەنزیک شارۆچکەی سەیدسادق کەوتە

بۆسەوەو شەهید کرا، بەشداری پرسەکەی باوکیمان کردو چووین بۆ هەڵەبجە.

لەهەڵەبجە دەستمان کرد بەرایی کردنی کاروباری رۆژانەی حزبی، دەستەیەکی نوێنەرایەتی حزبی زەحمەت کێشان سەردانی مەڵبەندیان کرد، دوای پێشوازی و بەخێر هێنانیان قسەوباسمان کرد لەسەر هاوکاری و کارئاسانی و یارمەتی دانیان، چوونکە واتازە خەریکن لەشارەزوور ئیش دەکەن و بارەگاو مەقەڕات دەکەنەوە، ئێمە هاوکاریانین و دۆستایەتیان دەکەین، چوونکە هەڵوێستیان لەسەر گروپە توند ئاژۆکانی ئیسلامی وەک هەڵوێستی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە لەسنوورەکەدا و ئامادەشن ئەویەکە سەربازیەی پێشمەرگە کەهەیانە شان بەشانی پێشمەرگەکانی ئێمە رووبەرووی ترۆریستان ببنەوە، دواتر ئەمە بەکردەوەڕوویداو باسی دەکەین لەجێگەی خۆیدا.

دوای رایی کردنی وەفدەکەی زەحمەتکێشان، هەر ئەمڕۆ لەگەڵ هەڤالانمان بەشداری چەندین رێوڕەسمی پرسەو ماتەمینیمان کرد، لەوانە عەلی گوێرەش و کەسێکیتر لەمزگەوتی ریشەدا، فەرەج محەمەد مەولود لە مزگەوتی شافعیدا، خێزانی مەلامحەمەدی سازانی و شێخ جەمیل سازانی لە مزگەوتی سازانییەکاندا، شەویش لەگەڵ کاک هەورامان حەمەنوری و کاک فەرەجی حەمەساڵح لە بارەگای مەڵبەنداماینەوە، رێکخستنەکانیش بەگشتی لە سنووری مەڵبەندەکەدا سەرگەرمی ئیشوکارن بۆ هەڵبژاردن و کاندیدەکان بۆ بەرپرسی ئۆرگانەکان هەرکەس بۆ سەکەوتنی خۆی شەو رۆژ ماڵەو ماڵ دەکەن.

دوای کاتژمێر ١٢ی شەو بەنهێنی و بەدزیەوە من و سێ پێشمەرگە بارەگای مەڵبەندمان بەجێهێشت و چووینە ماڵی کاک عەزیزی حاجی ئەولە خەووتین. سەر لەبەیانی زوو کەس لەخەو بێدار نەبوو لەماڵی کاک عەزیز دەرچووین و هاتینەوە بارەگای مەڵبەند، پەیوەندیم کرد بە لیژنەی ئامادەکاری ڤیستیڤاڵیساڵیادی رۆژی ٣/١٦ وە بۆ دڵنیابوون لەئەنجام دانی ئیشوکارەکانیان، دواتر لەگەڵ مام وریا هاواری چووینە شارۆچکەی سەیدسادق کاک جەمیلیش لە سلێمانییەوە هاتوو پێکەوە هەندێک ئیشوکارمان

کردو لەوێشەوە سەردانی عەربەتمان کرد، پاش نیوەڕۆ چووینە شاری سلێمانی.

رۆژی ٣/١٥ لەشاری سلێمانی سەردانی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران کاک کۆسرەت رەسوڵم کرد، سەبارەت بەسەردانی بەیانیان بۆ بەشداری لەرێورەسمی یادی کیمیابارانی هەڵەبجەو دەورو بەری قسەو گفتوگۆمان کرد، کاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی من گەڕامەوە بۆهەڵەبجە، پاش نیوەڕۆ و شەویش هەر لەبارەگای مەڵبەندا مامەوە، لەگەڵ لیژنەی ئامادەکارو کاک جەمیلی قائیمقام و پۆلیس و ئاسایش و پێشمەرگەدا ئیشوکاروبارەکانمان دابەش کرد و ئامادەبووین بۆ بەیانی پێشوازی میوانانی هەڵەبجە بکەین یادەکە بەرێکوپێکی و بێکەم و کورتی بەڕێوە بچێت.

## یانزەهەمینساڵیادی کیمیابارانی شاری هەڵەبجە

رۆژی ١٩٩٩/٣/١٦ یادی (١١) یازدەهەمین ساڵ رۆژی کیمیابارانی هەڵەبجەیە، هەمووساڵێک ئەم یادە دەکرێتەوە لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە، بەڵام بەهۆی بیری تەسکی حزبایەتیەوە بێ کێشەو گرفت و دڵگران بوون نابێ، ئێمە وەک یەکێتی نیشتیمانی لەبەر ئەوە کە حکومەت بەدەست خۆمانەوەیە لەهەڵەبجەدا، هەوڵ ئەدەین حکومەتی هەرێم فیستیڤاڵ و رێورەسمەکە ئەنجام بدات. بۆیە مۆرکی یەکێتی بوونی پێوە دیارە، هەوڵیش ئەدەین بیکەینە دەست کەوت بۆ خۆمان، لایەنەکانی تریش ئەمە دەزانن، بەڵام بێ دەستەڵاتن، بۆیە لایەنەکانی تر ساڵانە لەم یادەدا بەرەمزی بەشداری دەکەن، هەندێک جاریش هەر بەشداری ناکەن و بایکۆتی یادەکە دەکەن، بۆیە هەوڵ دەدەن ئەو یادە ساردوسرو کەمترین خەڵک بەشداری بکات، بەتایبەت لقی پارتی دیموکراتی کوردستان.

ئەمڕۆ لەبەر باران بارین و نەبوونی شوێنێکی فراوان لەناو شاری هەڵەبجەدا، یادەکە لەهۆڵی قوتابخانەی ئەحمەد موختاردا کرایەوە، هۆڵێکی بچوکە. کاتژمێر ٩بۆ ١٠ی سەرلەبەیانی ڕێورەسمەکە بەخوێندنەوەی چەند

ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەستی پێکرد، جەماوەرێکی فراوان و میوانانی زۆرئامادە بوون، کاک جەمیلی قائیمقام بەناوی ئیدارەی شارەکەوە ووتاری بەخێرهاتنی خوێندەوە، ناوەرۆکی ووتارەکەی داوای ئاوەدان کردنەوەو خزمەتگوزاری بوو، دوای ئەو کاک کۆسرەت بەناوی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمەوە ووتاری خۆی پێشکەش کرد، ناوەرۆکی ووتارەکەی ئەویش هەروەک جاران و سالانی پێشتر و ئەوکەسانەی بەناوی حکومەتەوە بەشداریان کردووە بەڵێنی ئاوەدان کردنەوەو خزمەتگوزاری زیاتری داو ووتی چیمان پێبکرێ درێغی ناکەین.

دوای ئەو مەلا شێخ محەمەدی بەرزنجی، ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزووتنەوەی ئیسلامی قسەی کرد، کەلەگەڵ مامۆستا عەلی باپیردا لەوێ ئامادە بوون، دوای ئەویش ووتاری کۆماری ئیسلامی ئێران، لەلایەن بەنی ئەحمەد، ئەندامی قەرارگای رەمەزانەوە پێشکەش کرا، بەرلە خوێندنەوەی ووتارەکەی ووتی ئەمە لەلایەن ئاغای حاجی مەسجدیەوە نوسراوە فەرماندەی قەرارگایە، مەسجدی پیاوێکی داناو هوشیارە، من لەسالی ۱۹۸۷ وە ئەیناسم دۆستێکی نزیک و بەوەفای مام جەلالە، سالی ۱۹۸۷ مام جەلال کەلە گوندی یاخسەمەر بارەگای هەبوو، بەنامەیەکەوە منی ناردە کرماشان بۆلای حاجی مەسجدی، دوای خوێندنەوەی نامەکەو هەندێک گفتوگۆ بەئامادەبوونی کاک ڕەفعەتی مەلا، (۲۰۰۰) دوو هەزار چەکی کلاشینکۆف و (۸)هەشت دانە تفەنگی قەناس و (۸۰۰۰) هەشت هەزار مەخزەنی کلاشینکۆفم لێوەرگرت، ئەمانەمان گەیاندە قەرەداغ بۆ لای مەڵبەندی یەک، بۆ دابەش کردنی بەسەر جووتیارەکانی گەرمیان و قەرەداغ دا بۆ بەرگری کردن لە شالاوەکانی ئەنفال، بەلام هەمووی گیرا، ئەم بابەتەم بەدرێژی لەبەرگی یەکەمی دەنگی خاکدا باس کردوە.

دوای ووتاری کۆماری ئیسلامی ووتاری کۆتایی، ووتاری بنەماڵەی شەهیدان پێشکەش کرا لەلایەن خوێندکارێکی بەئەدەب و ژیرەوە، کوڕی شەهدێکی کیمیاباران بوو، بەناوی سەرخێڵ غەفار گریانەیی، سەرخێڵ ئێستا بەڕێوەبەری مۆنۆمێنتی هەڵەبجەیە.

دوای تەواو بوونی ڕێوەڕەسمەکە سەرۆکی حکومەت و ئەوکەس و لایەنانەی لەوێ ئامادە بوون تاجە گوڵینەیان لەسەر مەزاری شەهیدان دانا،

لەوانە کاک حەمەی حاجی مەحمود و نوێنەری حزبی شیوعی. دواجار فەرمانگەی پۆستەو گەیاندنی شارەکە کرایەوە، لەلایەن وەزیر لیوا خەلیل دۆسکیەوە، میوانەکان گەڕانەوە، ئێمە تا پردی زەڵم لەگەڵیان چووین، دوای گەڕامەوە بۆ شارۆچکەی سیروان و بەشداریم لە ڕێوڕەسمی پرسەی برای کاک حسێنی خەلیفەدا کرد.

ڕۆژی ٣/١٧ چووم بۆ سەربازگەی سەلام لە سلێمانی، پاک نوسی کتێبی وەرگێڕدراوی بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگم بردەوە بۆ لای بەشی روناکبیری مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە، بۆئەوەی بۆ دواجار لەکۆمپیوتەردا هەڵە بڕییەکەی بکرێت.

# هەڵبژاردنەوەی ئەنجومەنی مەڵبەندی شارەزوور

ئەمڕۆ ٣/١٨ پێنج شەممە لە کۆمیتەی تانجەرۆوە لەشارۆچکەی عەربەت لیژنەی سەرپەرشتی هەڵبژاردنی ئۆرگانەکانی ڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتیمانی، سەربە مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوور، دەست پێ دەکەن. کاک ئەرسەلان بایز بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخستنی یەکێتی نیشتیمانییە، کاک جەمیل هەورامی بەرپرسی مەڵبەندەکەیە، من جێگری مەڵبەندم، ئەبێ دواجار لەکۆنفرانسی هەڵبژاردنەوەی ستافی مەڵبەندەکەدا منیش خۆم کاندید بکەم و بەهەڵبژاردن بیبەمەوە یان بدۆڕێنم.

لیژنەی سەرپەرشتی هەڵبژاردن لەمەکتەبی ڕێکخستنەوە ئەم هەڤاڵانەن، کاک عارف ڕوژدی، کاک ئاسۆ عەلی، کاک مەلاقادر. کاک جەمیل هەورامیش ئەندامە لەگەڵ ئەو لیژنەدا ئەبێ. کاک مەحمودی حاجی ساڵحیش بەرپرسی بەشی ڕێکخستنی مەڵبەندەکەیە. ستافی کۆنی ئەنجومەنی مەڵبەند هەموو هاتبوونە عەربەت، هەردوولا هەوڵیان ئەدا بۆ دەرچوونی ئەو بەرپرس پۆل و کەرتانەی کە ئەزانن سەربە ستافەکەی خۆیانن. چوونکە هەر لایەکیان زۆرترین بەرپرس پۆل و بەرپرس کەرتی دەرچوو، ئەولا دوای لە کۆنفرانسی مەڵبەندا زۆرینەی ئەنجومەنی مەڵبەند دەباتەوە.

لیژنەکەش بێلایەن نەبوو زوو دەرکەوت کاک ئاسۆو مەلاقادر هەریەکەو سەربەلایەکیانە، کاک عارفیش بەرواڵەت بێلایەنە. هەرکەدەست کرا بەئەنجام دانی پرۆسەکە چەندین کێشە دروست بوو، کاک ئەرسەلان هاتوو کۆبوونەوەیەکمان کرد لەگەڵ ئەنجومەنی کۆنی مەڵبەندو داوامان کرد بڕۆن و لێرە نەمێنن، وە تاکۆتایی پرۆسەکە لەسنووری هەرکۆمیتەیەکدا هەڵبژاردن دەکرێت ئەو ڕۆژە کەسیان نەچێتە سنووری ئەو کۆمیتەیە. بەڵام کاک مەحمودی حاجی ساڵح ئەبێ لەگەڵ لیژنەکەدا بێت، چوونکە بەرپرسی ڕێکخستنە. لەکۆبوونەوەکەدا هەمووان قبووڵیان کرد، بەڵام دوایی چەندین کارگێرو ئەندام مەڵبەند هاتنە لای من و وتیان نابێ مەحمودیش لێرە بێت ئەگینا ئێمەش ناڕۆین.

جەبـار جەلال وەک دەم راسـتی دەسـتەکەی خۆیـان، لەو بـارەوە نامەیەکی بۆمن نوسی بوو، لەنامەکەدا هەڕەشەی ئەوە دەکات، دەڵێت ئەگەر مەحمود وابکات ئێمەش دەست پێدەکەین، پێم ووتن مەحمود بەرپرسی ڕێکخستنە لیژنەکە بەبێ ئەو نـاتوانن ئیشـەکە بـکەن، ووتیـان ئەو خـۆی بەرپرسی ستاف و دژ بەئێمەیە ئەرقەلە دروست دەکات بۆ ئەوکەسانەی کە ئەزانێ سەربەستافەکەی خۆی نین، ڕاستیان دەکرد، بەڵام مـن دەمزانـی سەرەڕای ئەو هەمـوو فڕوفێڵە بەڵام هەر ئەدۆڕێن، منیش ووتـم هەرکەس کێشەی بۆ دروست کرا ئاگاداری من بکەن من لێرەم باوەڕ نـاکەم شـتی وا بکەن، ووتیـان تۆنـازانی ئەوانە هەر خەریکی فـروفێڵن، منیش ووتـم باشـە خۆتان بەکاک ئەرسەلان بڵێن.

ئەمڕۆ من سەرنجێکم لەسەر ڕێکخستن لەلا دروست بوو، بۆیەکەم جاربوو هەیکەلی ڕێکخستنەکانی وەک پۆل و کەرت ببینم و بناسم بەگشتی، وام دەزانـی ئەنـدامانی ڕێکخسـتن، لەهەمـوو چـین و توێژەکـانی کـۆمەڵن و بەتـایبەتیش وەک ڕێکخسـتنی سـەردەمی شـاخ، ڕێکخسـتن بەبیـرو بـاوەڕ و نوخبەیە، بەڵام ئەمڕۆ بۆم دەرکەوت نەخێر ڕێکخستنی ئێستا موچە خۆری بەکۆمەڵ ونـیمچە ئیجبـارین، بۆنمـوونە کاتێک ئەیـانوت کەرتـی شـارەوانی کـۆبێتەوە سـەرۆکی شـارەوانی بەرپرسـی کەرت و موچەخۆرەکـانی ئەو فەرمـانگەیە پۆلەکـان ئەنـدامەکان بـوون، کەرتـی کشـتوکاڵ، پەروەردە، فەرمانگەی ئاو تاد.......بەهەمـان شـێوە بـوون، کاتێک ئەمەم بینـی بەهەڤاڵ جەمیـل هەورامـیم ووت ئەوە هەمـوو ڕێکخسـتن وەک ڕێکخسـتنی ئەم سـنوورەیە؟ ووتـی ئەی چـی، منـیش ووتـم جـاخۆ حزبیـی بەعسـیش هەروا خەڵکیان کۆ دەکردەوە، ووتی ئەی تۆ ئەتەوێت ڕێکخستن چۆن چۆنی بێت؟ ووتـم وەڵا مـن ئەمەوێت ڕێکخسـتن لەسـەر ئاسـتی نـاوچە و گەڕەکەکـان جەماوەریی بێت و ئەندامەکان تێکەڵ بن و لەسەر ئەساسی بیرو باوەڕ بێت، ئەوەی ئێستا کە هەیە بەشێکی، هەرکەس و لایەک دەستەڵاتی لە سنوورەکەدا هەبوو دەبێتە ڕێکخستنی ئەو دەستەڵات و لایە، بەتایبەت موچەخۆرەکان.

ئەمڕۆ کۆمیتەی تانجەرۆ تەواو بوو، سێ کەرتی کۆمیتەی هەڵەبجەی تـازەش هەڵبژاردنیـان بـۆکرا، ئەوانەی تـانجەرۆ هەشـت کەرت بـوو حەوت

لێپرسراوی کۆن دەرچوونەوە لەگەڵ یەکێکی نوێ ئەوانیش ئەم هەڤالانە بوون:

| زنجیرە | ناوی پاڵێوراوەکان | ژمارەی دەنگ |
|---|---|---|
| ١ | ئیبراهیم ئەحمەد ئیبرایمی زەراعە | ٤٧ |
| ٢ | شەفیق ئەحمەد عەلی | ٣٤ |
| ٣ | لەیلا عەبدول کەریم | ٣٣ |
| ٤ | عەلی حەسەن | ٣١ |
| ٥ | حەمە کۆمەڵە | ٣٠ |
| ٦ | پرشنگ ئەکرەم | ٢٩ |
| ٧ | مامۆستا رەزا | ٢٩ |
| ٨ | کەریم عەبدولقادر | ٢٩ |

ئیبراهیم ئەحمەد ئیبرایمی زەراعە.پیاوێکی نەرم و هەردوولاکەی فریو دابوو. پرشنگ ئەکرەم ئەمە ئەندام کۆمیتەی نوێ بوو. ماموستا رەزا کورێکی ژیرو بەئەدەب بوو .

ئەمرۆ٣/١٩ هەینی ستافی نوێی کۆمیتەی هەڵەبجەی تازە هەڵبژێردان ئەم هەڤالانە دەر چوون:

١/ ئەختیار عەزیز خەڵکی هەورامان ٧١ دەنگ. ٢/ هاورێ کامەران خەڵکی ئەو بەری سیروان و ٦٢ دەنگ. ٣/ مامۆستا نوری ٥٩ دەنگ. ٤/ سەرکەوت سەرحەد ٥٤ دەنگ. ٥/ سەرتیپ سابیر ٥٢ دەنگ. ٦/ هیرۆ کچێکی گورج و گۆڵ و وریا ٤٠ دەنگ. ٧/ ئەحمەد قاجری ٣٧ دەنگ. ٨/ ئەنوەر رەشید گەلالی ٣٤ دەنگ. ٩/ مەسعود شەمێرانی مامۆستاو کورێکی سادە ٢٩ دەنگ.

١٩٩٩/٣/٢٠ رۆژی شەممە، ئەمرۆ چوومە سلێمانی سەردانی ماڵی مەهدی برام و کاک جەمیل هەورامیم کرد، قسەو باسمان لەسەر رێکخستنەوەی هێزی پێشمەرگە لەناوچەکە و بەتایبەت بەری هەڵەبجە کرد، نیوەڕۆ گەڕامەوە ماڵ، کاک هوشیاری کەریم بەگ سەردانی کردم و دوای

هەندێک گفتوگۆ دەربارەی ئیدارەی هەڵەبجە و بەتایبەت دائیرەی نفوس، دەزگایەیکی پەیوەندی تەلەفۆنم بەدیاری پێدا.

رۆژی یەک شـــــەممە ۱۹۹۹/۳/۲۱ رۆژی نەورۆزە، نەورۆز یەکەم رۆژی بەهـارە مامۆسـتا پیرەمێـرد فەرمـوویەتی جەژنێکـی کـۆنی کـوردە، سەبارەت بەجەژنی نەورۆز چەندین داستان هەن، ساخ نەبووەتەوە کامیان دروستە، لەگەڵ ئەوەشدا جەژنی سەرەتای ساڵی نوێیە، جەژنی ژیانەوەی دارو دەرەخـت و سـەردەرهێنانی گژوگیـاو گـوڵ و گـوڵزارە. ئەم جەژنە جەژنێکی کۆنی باستانی ئێران زەمینە، لەم سەردەمەدا دەوڵەتانی ناوچەکە، بەسیاسـییان کـردوەو هەوڵـی دژایەتـی و رێگـری کردنـی دەدەن، بەمەش ئەیسەلمێنن، بەڵێ جەژنێکی کۆنی کوردە.

دوێنێ دایکم لەتەوێڵەوە گیای خواردنی بۆ ناردوین، لەهەورامان دەیان جۆر گژوگیای خواردن بەبەهاراندا هەیە، ئەمەی بۆ ئێمە هـاتووە سێ جۆریەتی گەزنە، گۆزروانە و پونگە، ئەمانە بەر لەجۆرەکانیتر سەردەردەهێنن.

خەڵکێکی زۆر لەم نەورۆزەدا چوونەتە دەرەوە بۆگەشت و سەیران، ئێمە نەچووین، لەبەرئەوە بەنزین گران و پارەشمان نەبوو، منداڵەکانم ئێوارە بردە لای منداڵەکانی  ماڵی کاک تەحسینی حەسەن خانی رەزاو مـن و کـاک تەحسینیش هاتینەوە بۆ مـاڵی خۆمـان کارەبا نییە و لەبەر چرا دانیشتین، منـیش ئەم مـاوە خەریکی کـاری وەرگێرانم، ئەمشـەو لەبەر بێکارەبـایی و میوانەکەم دەفتەرو کتێبەکەم خستە لاوە.

سەر لەبەیانی ئەمرۆ۳/۲۲ چوومە شـارۆچکەی سەیدسـادق، لیژنەی هەڵبژاردنی کەرتەکان هاتن و پرۆسەی هەڵبژاردنی چەند کەرتێکی کۆمیتەی سەیدسادق دەستی پێکرد، دوای نیوەڕۆ ئەوەندە ناڕەزاییەتی و سکاڵا لەسەر هەڵبـژاردنەکە هەبـوو مـن بەجـێم هێشـتن و هـاتمە بارەگـایی فەرمانـدەیی شارەزوور لەسەراوی سوبحان ئاغا، لەوێوە چوومە کانی پانکە بۆ بەشداری لە رێوڕەسمی پرسەی کوڕێک، دوێنێ بەکارەسـەتی وەرگەڕانـی ئۆتۆمبێل گیانی لەدەست داوە، لەوێ مـاڵی حـاجی کـاکە حەمە میوانداریان کـردین و نەیانهێشت شەو بڕۆینەوە.

شەو کاک هەورامان حەمەنوری ئەندامی مەڵبەند سـەردانی کـردین، دواتریش کاک جەبار جەلال هات و نزیکەی ۱۰دە مەسئول پۆلی کەرتەکانی

کۆمیتەی سەیدساقی لەگەڵ بوو، ناڕەزاییەتیان دەرئەبڕی و گلەییان دەکرد کە فرو فێڵیان لەگەڵ ئەکرێت. رۆژی ٣/٢٣ هەڵبژاردنەکە تەواو بوو ئەو مەسئول پۆلانەی دەرچووبوون هێنرانە سەراو لەوێ ئەنجومەنی نوێ بۆ کۆمیتە هەڵبژێردرایەوە، ناڕەزاییەتی و نیگەران بوون پەرەی سەند، ناڕازیەکان زۆرتر فشاریان لەسەر من دروست کرد و داوایان دەکرد بەرگریان لێ بکەم، بۆیە بەڵێنم دانێ بەرگریان لێبکەم، ئەمانە سەربە ستافەکەی کاک جەبار فرمان و کاک عومەری سەید عەلی بوون، سەرەتاو لێرەوە خەریکە منیش تێکەڵ بەدەستەو دەستەگەری ئەبم، لەراستیشدا هەڵبژاردنەکە کەموکورتی زۆر بوو، دیارترین کەموکورتی ئەوەبوو پۆلێک کە٣٠ سی ئەندامی هەبوو ٥٠ پەنجا کەس بەشداریان دەکرد، ئەو ٢٠ بیست کەسە زیادە لەئاماردا ناویان نەبوو، بەڵام ئەیان ووت لەکۆبوونەوە بەشداریمان کردووە و ئابوونەشمان داوە. ئەمەو چەندین فروفێڵی تری هەڵبژاردن. لەم کۆنفرانسەدا ئەم هەڤاڵانەی خورەوە بوون بە ئەنجومەنی نوێی کۆمیتەی سەیدسادق:

١/ عومەری حاجی ئەحمەدی خەڵکی ئاوایی تەپە رێزینە. ٢/ عەلی مستەفا خەڵکی شارۆچکەی عەربەت. ٣/ فازل نەسرەدین، خەڵکی ئاوایی موانی شارەزوور. ٤/ ئەحمەد عەزیز خەڵکی شارۆچکەی سەیدسادق.٥/ حەسەن مارف،٦ / ئەنوەر حەسەن،یوسف جانی. ٧/ عەلی عەبدوڵا شەریف، ٨/ نەجیم عەبدوڵا حەسەن، گامێش تەپەیی. ٩/ عەلی محەمەد عەلی، ١٠/ عەبدوڵا عەبدولقادر، ١١/ ئەبووبەکر محەمەد فەتاح، پیاوێکی بێدەنگ و هەژار. ١٢ ئەحمەد رەشید ئەمین.

ئەمشەو لەگەڵ چەند هەڤاڵێک لە شارەزوورەوە چووم بۆکۆیە، بۆبەشداری لە رێوڕەسمی پرسەی برای کاک سەید رەزای پاوەیی ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی حزبی دیموکرات، شەو دوای پرسەکە لەماڵی عەبدلکەریمی جەلالی خەووتین و بەیانی گەڕامەوە بۆفەرماندەیی گشتی و سەردانی کاک کوردۆ قاسمم کرد.

ئەمرۆ٣/٢٥ پێنج شەممە چووینە شارۆچکەی پێنجوێن، هەڵبژاردنی ئۆرگانەکانی رێکخستنەکانی کۆمیتەی ئەوێ کرا، ئەوکات کۆمیتەی پێنجوێن و شلێر هەریەک کۆمیتە بوو، لێرە کێشەو گرفت نەبوو ئەوانەی بۆ ئەنجومەنی نوێی کۆمیتەکە هەڵبژێردرانەوە ئەم هەڤاڵانە بوون؛

١/ حەمە سەردار، کوڕێکی چالاک و ئیش کەرو خۆشەویست ناو جووتیارەکانی دۆڵی شلێر بوو. ٢/ هێرۆخان، هێرۆ خەڵکی لای قورووەی کوردستانی رۆژهەلاتە، پێشتر پێشمەرگەی کۆمەڵەی ئێران بووە. ٣/ عەبدولڕەحمان مینە، ٤/ مەلاخالید تاتانی، ٥/ مامۆستا خەلیل، ٦/ عەبدولڕەحمان، ٧/ مامۆستا ئیسماعیل، ٨/ ئیسماعیل، ٩/ محەمەد، ١٠/ کەریم حەمەسالح بۆیسانی. ١١ / جەبار سەعید زۆراب ١٢/ عەزیز محەمەد .

لەوێ کۆبوونەوەیەکمان لەگەڵ کردن و پیرۆزبایمان کردن و گەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە بۆ بارەگای مەڵبەند، ئێمە گەیشتینە هەڵەبجە و هەڵبژاردنی کەرتەکانی کۆمیتەی ئەوێ تەواو بووبوو، مابوو کۆنفرانسی هەڵبژاردنەوەی ئەنجومەنی کۆمیتەکە. ئەوکات کۆمیتەی هەورامان خورماڵ سیروان و هەڵەبجە هەر یەک کۆمیتە بوو. ئەم هەڤاڵانە دەرچوون :

١/ لوقمان عەزیز خەڵکی تەوێڵە،٤١ دەنگ.٢/ ئاواز خان ٤٠ دەنگ.٣/ م رزگار حەمەنوری ٣٩ دەنگ، ٤/ کاوە غەریب ٣٨ دەنگ، ٥/ مەریوان عەنەبی ٣٦ دەنگ، ٦/ مامۆستا سەربەست کۆکۆیی ٣٤ دەنگ، ٧/ مامۆستا ئەیوب عەبدولڕەحمان تەوێڵەیی٣٣دەنگ، ٨/ نزار عەنەبی ٢٩ دەنگ ٩/ عوسمان ٣٥ دەنگ.

دوای تەواو بوونی هەڵبژاردنەکە کاک شیروان شیروەندی هات بۆ مەڵبەندو نامەیەکی پێ بوو، ئەم نامە لێرەوە بۆ مام جەلال نوسرابوو، نامەکە سەبارەت بە تەداخول کردن و دەست تێوەردانی ستافەکەی کاک کۆسرەت نوسرابوو، وە لەونامەدا، باسی ئەوەش کرابوو کاک جەمیل بێلایەن نەبووە، باسی خرابی هەڵبژاردنەکەو گلەی لە تەداخول کردنی برادەران کرد بوو.

مام جەلال داوای کاک جەمیل و کاک مەحمودی کردبوو. کاک جەمیل داوای کرد لەوبارەوە من بروسکەیەک بۆ مام جەلال بکەم. منیش بروسکەکەم کرد بەم دەقە. (لە حەمەی حەمەسەعیدەوە بۆ هەڤاڵ مام جەلال، دوای سلاو کاک شیروان گەیشت و نامەکەمان خوێندەوە، ئەوەی سەبارەت بەتەداخول کردن و تەزویری کۆمیتەی سەیدسادق وایە راستە، بەلام کاک جەمیل هەورامی بێلایەن بووە). هەرچەندە شەوی پێشتر هەڤاڵێکی لاکەی مەحمودو ئەوان هاتبوو بۆلام ئەیوت کاک جەمیل هاوکاری ئێمە دەکات،

پێشتر بەڵێنی بەکاک کۆسرەت داوە. هەر ئەمشەو مام بروسکەیەکی بۆ کردمەوە، لەو بروسکەدا دەسخۆشی و سوپاسی کرد بووم .

دواتر کاک جەمیل و کاک مەحمود چوونە قەلاچوالان، لەوێ وتبوویان مام چووەتە سلێمانی، نزار ئامێدی پرسی بووی کاک جەمیل چیت کردووە وا مام تورەیە؟ وتبووی هیچم نەکردوە، بۆ چی بووە؟ نزار وتبووی دوای بروسکەکە بە ١٥ پانزە خولەک پرسیویەتی ئەرێ جەمیل هەورامی نەگەیشت؟ واتە لەهەڵەبجەوە بۆ قەلا چوالان.

بەڵێ، هەر ئەو شەوە مام گەڕابووەوە بینیبوونی و دیارە بەجیا لەگەڵ کاک جەمیل دانیشتبوو، پرسیاری بارودۆخەکەو هەڵبژاردنەکەی لێکردبوو، ئەویش وەڵامی دابووەوە. ئینجا مام پرسیبووی ئەم کورە مەحمود کوڕێکی چۆنە؟ کاک جەمیل وتبووی کادرێکی زۆر باشە، بەڵام ئەگەر کەسی دەس نەکەوێت لەگەڵ منداڵەکانی خۆی دەستەو دەستەگەری دەکات. کاک شیروان شیروەندی لەوێ ئامادە بووبوو، وتبووی مام جەلال ئێمە سۆشیالیست بووین لە شارەزوور ئەم کورە ڕێکخستنی کۆمەڵەبوو ئەمان ویست بیکوژین، بەڵام لەبەر باوک و کەس و کارەکەی نەمان ئەوێرا. مەبەستی کاک شیروان ئەوەبووە کە مەحمود لەڕێکخستنی سەردەمی شاخدا کوڕێکی چالاک بووە.

لای مام ئەم قسەی کاک شیروان بوو بوو، بەخێر بۆ کاک مەحمود، هەر دوای چەند ڕۆژ لەهەڵبژاردنەوەی مەڵبەندو لەکاتی ڕێکخستنەوەیدا، ئێمە ڕێک نەئەکەووتین بۆ دانانی کارگێرو بەرپرسی کۆمیتەکان، مام ووتی ئاگات لە مەحمود بێت ئەو قسەی کاک شیروان شیروەندی گێڕایەوە بۆم.

ڕۆژی ١٩٩٩/٣/٢٤ مام جەلال بروسکەیەکی تری بۆ من کردەوە، لەو بروسکەدا دەڵێت وەرە بۆلام، مام وریا هاواری وجەبار جەلالیش لەگەڵ خۆت بهێنە. نیوەڕۆ لەهەڵەبجەوە کەووتمە ڕێ بۆ قەلاچوالان، لەڕێگا لەنزیک گوندی لامەرکەزی مام وریا دەهات بۆ هەڵەبجە لەگەڵ خۆم گێڕامەوە، چووینە عەربەت کاک جەباریشمان لەگەڵ خۆمان برد، کاتژمێر ٢/٣٠ گەیشتینە لای مام بێوەستان پێشوازی کردین و لای دانیشتین، سەرەتا پرسی ئەزانن بۆ بانگم کردون؟ من وەڵامم دایەوە بەڵێ ئەزانین. ووتی دەی زۆرباشە، قسەتان بۆ دەکەم گوێ بگرن و دڵم بدەنێ، سەرەتا باسی دروست بوونی یەکێتی و خەبات و تێکۆشانی یەکێتی بۆکردین، دواتر باسی دەستەو

دەستەگەری و خراپیەکانی کرد، ئینجا ووتی ئەوەی دەستەو تاقم گەری و کلک لیکگریدان بکات، سزا دەدریت و زیندان دەکریت.

ئینجا سەبارەت بەوەزعی مەلبەندی شارەزوورو هەلبژاردنەکانی کومیتەکان چەند پرسیاریکی لەمن کرد، منیش وەک خوی و بەراستی و بێ زیادو کەم وەلامم دایەوە، ئینجا رووی کردە مام وریا و کاک جەبارو قسەی لەگەل کردن و ئەوانیش قسەی خویان کرد، دوای تەواو بوونی دانیشتنەکە یەکی ١٥٠٠ هەزارو پینج سەد دینار جەژنانەی داینێ، ووتی بو جەمیل و رەفیقەکانی دوینێ هاتون جەژنانە بەرن، بانەلین جیاوازیمان کراوە، بو ئەوانیش کاک جەمیل و کاک مەحمود و عومەری حاجی ئەحمەد ٤٥٠٠ چوار هەزارو پینج سەد دینارمان هینا.

زور جار مام جەلال بانگی کردوم بو لای خوی، بو ئیشوکاری گشتی و تایبەت یان بو لیپرسینەوە، ئەوە یەکەم جار بوو ببینم مام جەلال ئەوەندە دلخوش و ئاسودە بیت، زور بەریزەوە قسەی لەگەل کردین، دانیشتنەکەی لەگەلمان زورتر پیکەنین و نوکتە گیرانەوە بوو.

خواحافیزیمان لەمام کردو کاتژمیر ٦ شەشی ئیوارە گەیشتینەوە مەلبەند، برادەرانی مەلبەند هەموو لەوێ بوون، چوونکە بەیانی روژی جەژنی قوربانە، ئەوکات بو بونەو جەژنەکان لەمەلبەند دائەنیشتین و پیشوازیمان لە خەلک و حزبەکان دەکرد.

ئەمرو شەممە ١٩٩٩/٣/٢٧ یەکەم روژی جەژنی قوربانە، بەیانی زوو لەمالی کاک عەزیزی حاجی ئەولە لەخەو هەستام، ئاسمان هەوراوی و کەمیک هەوا گەردو غوبارە، دەنگی ئەلاهو ئەکبەری نویژی جەژن لەهەموو مزگەوتەکانی شارەوە دەنگ دەداتەوە، جەژنە پیروزەم لەگەل خاوەن مال و مندالەکانی کرد، چوومە ئەودیو بولای مندالەکانی شەهید نەریمان، جەژنانەم دانێ و دوای ئەوان سەردانی مندالەکانی شەهید مەهدی مەحمودی تەیمەزم کرد، مەهدی پیشمەرگەی پارتی و لەشەری ناوخودا بووە قوربانی، پیشتر پیشمەرگەی یەکیتی و برادەری ئازیزو خوشەویستم بووە.

ئەم بەیانییە مندالەکانیم بینی قورگم گیرا قسەم بونەکرا، بویە چەند ساتیک لەئامیزم گرتن و جەژنانەم دانێ و ئینجا چووم بو بارەگای مەلبەند، لەگەل کاک جەمیل و هەڤالانی ئەنجومەنی مەلبەند و ئەنجومەنی کومیتەی

هەڵەبجەو خوێندکاران و پێشمەرگە دێرینەکان، تا کاتژمێر ١یەکی پاش نیوەڕۆ پێشوازی میوانەکان و لایەنە سیاسییەکانمان کرد.

دوای نیوەڕۆ کاک جەمیل گەرایەوە بۆ سلێمانی، منیش لەگەڵ بەشێک لەهەڤالان سەردانی چەندین ماڵە دۆست و ماڵە شەهید و کەسایەتی شارەزوورمان کرد، سەرەتا ماڵی حاجی کاکە حەمەی شێخ سمایلیمان لەکانی پانکە بەسەرکردەوە، دواتر لە ئاوایی مایندۆڵ سەردانی حاجی عەبدوڵای ریشسپی تیرەی هۆز هەسەنی سەربەعەشیرەتیی غەوارەمان کرد، هەر ئەمرۆ دوای سەردانی بارەگای فەرماندەی و پیرۆزبای لە پێشمەرگەکانی شارەزوور، سەردانی ماڵی مام والی ریشسپی خزمانی یوسۆجانیمان کرد لەئاواییی سەراو، مام والی لەسەر هەڵبژاردنەکەی کۆمیتەی سەیدسادق، تانەی هەبوو، ئەیوت دیارە بڕیارتان داوە ئەو هەڤالانەی لە ٣١ ئابدا هەڵوێستیان نەبووە هەڵبژێرنەوە، ووتی ئەم هەڵبژاردنەتان وەک ئەوەبوو پەمو بژاربکەن، بەلام لەباتی گیا کەڵەکە لۆکەکانتان قرتاندوە، درێژەی دایەو ووتی جاران کادر بە تاقی کردنەوە دائەنرا ئێستا ئێوە خەڵکتان داناوەو هەڵبژاردوە بە ئەندام کۆمیتە، ئەلف بەکوتەک ئەزانێ، باشە کێ راپۆرتی بۆ ئەنوسێ کێ بۆی ئەخوێنێتەوە؟

برادەران هەندێکیان نیگەران بوون لە قسەکانی مام والی، بەلام من ئەمزانی ئەوە دۆستی مام جەلالەو لە دڵسۆزیەوە ئەو قسانە دەکات، بۆیە نەوەک کادرێک بەگژیدا بڕوات خۆم وەلامم دایەوە بەجۆرێک نەئەو نیگەران بێت و نەئەو برادەرانەش نیگەرانیان بمێنێت. لای مام والی هەستاین و لەرێگە کاک جەلال کولکنیمان بینی، ووتی چوومەتە مەڵبەند تۆی لێنەبووە دانەبەزیوم، منیش سوپاسم کردو ووتم ئێمە هاتینە فەرماندەیی بۆلای ئێوە. لای ئێوارەوە گەراینەوە بۆ هەڵەبجەو لەشارۆچکەی سیروان سەردانی بارەگای کەرتی رێکخستن و لە زەمەقیش سەردانی بارەگای لەشکرمان کرد.

ئەمرۆ یەک شەممە ١٩٩٩/٣/٢٨ دووەم رۆژی جەژن، سەرلەبەیانی لەگەڵ حاجی رەفعەتی دێوانە، مام وریا هاواری و مامۆستا کەریمی شێخ عەلیدا، چووینە عەربەت هەڤالانی ئەنجومەنی مەڵبەند لەکۆمیتەی تانجەرۆ چاوەڕێیان دەکردین، دوای پیرۆزبایی لە ئەنجومەنی کۆمیتەی تانجەرۆ، دەستخۆشیمان لێکردن بەبۆنەی پێشوازی و بەسەرکردنەوەیان لە چین و

توێژەکانی سنوورەکەیان بەبۆنەی جەژنەوە. ئەوانمان بەجێ هێشت و چووین بۆ شارۆچکەی زەڕایەن.

لە زەڕایەن سەرەتا بارەگای کەرتی ڕێکخستنمان بەسەر کردەوە، تەنها خەفەری لێبوو، ستافەکەیان چوو بوون بۆ سەردان و بەسەرکردنەوەی ماڵە شەهیدەکان، لەوێ یەکەم ماڵ کەسەردانمان کرد ماڵی سەید عەبدڕەحمان عەبدڕەحیم کوڕەزای مامۆستای پایەبەرز مامۆستا مەولەوی تاوەگۆزی بوو، سیدعەبدڕەعمان پیاوێکی پیرو ژیرو داناو زانایە زۆرم خۆش ئەوێت، فەرمووی حەمەی حەمەسەعید ئەوە چەند جارە من خەجاڵەت دەکەی، دەبوو من بێمە مەڵبەند بۆلای ئێوە، ووتم دوژمنت خەجاڵەت، حەقی تۆو بنەماڵەکەت لەسەر کوردو یەکێتی و ئێمەیە بۆیە دەبێ ئێمە سەردانی تۆ بکەین.

دوای ساتێک بێدەنگی خاڵە سەید ئەم دوو دێڕە شعرەی مەولەوی بۆ ئێمەو میوانەکانی تری خوێندەوە، ووتی مەولەوی بەزوانی هەورامیانەی خۆمان فەروویەی:

(پوس کوس گوش نم کێشان کەمکەم ئیسەرو ئۆسەرەن دووربینەکەی چەم) مەبەستی ئەوە بوو بەئێمە بڵێت: گوێکانی قورس و چاوەکانی کزبوون. من ناتوانم بڵێم کام شعرەی مەولەوی جوانترین و بەماناترینە، بەلام ئەم شعرەی لەلام بەرزترینە،

هەرچی دیت وەچەم شی وەسەفەردا
هەرچی مەوینی هانە گوزەدا
کەس حاڵی نەبی وەهیچ نەفاما
ئەو پەی چێش ویەرد ئید پەی چێش ئاما

ئەم پرسیارە مەعریفیەی مامۆستا مەولەوی سەبارەت بە مرۆڤ، بوون، ژیان، تائێستا کەس وەلامی نەداوەتەوە، بەلام مەولەوی ناس، مامۆستا ئەیوب ڕۆستەم پێیوایە کەسێک وەلامی داوەتەوە کەبەهەزاران میل لەزێدی مامۆستا مەولەویەوە دوورە، ئەویش تاگورە، شاعرو فەیلەسوفی گەورەی هیندی، تاگوردەڵێت: مرۆڤ هەر لەڕۆژی دەرک کردنیەوە بەدەوروبەری، هەتا سپاردنی دوا هەناسەکانی، بێجگە لەکۆمەڵێک یادەوەری هیچی ترنیە.

لەوێ هەستاین و سەردانی ماڵی ریش سپی تیرەی خێڵی باوە ئەحمەدی کوێخا عەبدولامان کرد، ئەویش لەگەڵمان هاتوو چووینە خوارەوە بۆ سەردانی بارەگای کۆمیتەو بنکەکانی پۆلیس و ئاسایش. لەوێ هەستاین و مام کوێخا ئەحمەد ووتی من ئەڕۆمەوە تۆسەردانەکانی خۆت بکەو بۆ نیوەڕۆ میوانی منن، زۆر هەوڵم دا نەچینەوە بۆلای لەبەر دووشت، یەکەم پیاوێکی کەم دەس و دووەم ئێمە زۆربووین، بەڵام قبووڵی نەکرد. دوای ئەو ئێمە سەردانی کاک شێخ بابا عەلی سۆڵە و کاک حەمەسەعیدی حەمەی سان ئەحمەد ریشسپی خزمانی شەمێرانمان کرد، هەردووکیان دۆستی مام جەلالن. دواتر سەردانی مناڵەکانی پێشمەرگە سدیق عەبدولا بەبۆنەی نۆجەژنەوە لەگەڵ مناڵەکانی شەهید ساحیب جەعفەرمان کرد، هەر لەدرێژەی سەردانەکانی ئەم پێش نیوەڕۆ، لەماڵی مامۆستا ئەیوب کوێخا رۆستەمدا کۆبوونەوەیەکمان لەگەڵ کادرەکانی سنووری کۆمیتەی قەزای شارەزوور و پیرۆزبایشمان لێکردن، مامۆستا ئەیوب کادرێکی هوشیارو رۆشنبیرو ئاگایە لەسنووری مەڵبەندەکەدا، لەکۆتایی ئەم سەردانانەدا ماڵی شەهید عومەرە ریشەو ئامینە خانی دایکی شەهید موختار و کاک کامەرانی کەریم-قازی و کاک حەمە زیرنجۆیمان بەسەر کردەوە.

نیوەڕۆ لەماڵی کوێخا ئەحمەد جگە لەئێمە کەنزیکەی ٣٠ سی کەس دەبووین، ریش سپیان و خزمانی خۆشیان نزیکەی ٥٠ پەنجا کەسی بانگ کردبوو وەک ماڵە شایی و زەماوەند لەهەموو دیوەکان (ژوورەکان) و حەوشەو حەیات دا سفرە و نان دانرابوو، عەشایری جاف هەروا خاوەن سفرەو نان و سەخاوەت دارن.

دوانیوەڕۆی ئەمڕۆ هەر لەشارەزوور درێژەمان بەسەردانەکانمان دا، یەکێک لە تێکۆشەرە دێرینەکان و بەرپرسی پێشمەرگە لەشۆڕشی ئەیلول دا کاک عەزیزە ناسراوە بە عەزە بەلەسۆییمان بەسەر کردەوە، نەوزادی کوڕیشی گەنجێکی تازە پێگەیشتوەو کادرە لەسنووری کۆمیتەی قەزای شارەزووردا، پاشان سەردانی ماڵی کاک سەرحەدی خەلیفە یونس ریشسپی خزمانی روخزاییمان کرد .

هەر ئەمڕۆ و لای ئێوارەوە چووینە شاری سلێمانی لەرێوە سەردانی ماڵی خۆمان کرد و مناڵەکان مات و زویر دیاربوون، دوای چاک و چۆنی و

جەژنە پیرۆزە ئەمزانـی لەبەر ئەوە مەلـولن دوو رۆژە جەژنە و مـن بـۆم نەپرسیون، دوای پشوویەکی کورت و چاخواردنەوەیەک لەدڵی خۆمدا ووتم دوایی دێمەوە و ئەمشـەو لایـان ئەبـم و قسـەیان بۆ دەکەم کە بۆچی دوو رۆژی جەژنە نەهاتومەتەوە بۆلایان.

لەگەڵ هەموو هەڤاڵەکانی ئەمرۆ پێکەوە بووین هەسـتاین و سـەرەتا چووینە ماڵی کاک نەوشیروان، بەڵام لەوێ نەبوو. لەوێوە سـەردانی کاک جەبار فەرمانمان کرد، دوا سەردانی ئەمڕۆمان، مـاڵی کاک جەمیل و مـاڵی کاک ئەرسـەلان بـایزبوو. ئێتر هەوا تـاریکی کـرد و برادەرانمـان مـۆڵەت دا بۆئەوەی بڕۆنەوە بۆ لای ماڵ و مناڵ و میوانەکانیان. من و چەند هەڤاڵێکیش کەماڵیـان لە هەڵەبـجە بـوو چـووینەوە بۆمـاڵی خۆمـان. دوای نـان خـواردن لەڕووی برادەرەکانمـدا بەمناڵەکـانم ووت بۆیە بەجەژنـدا لای ئێوە نەبـووم دەبوو لەمەڵبەنـد پێشـوازی لەخەڵـک بکەیـن، ئینجـا ئەبێ سـەردانی منـاڵانی شەهیدەکان[1] بکەین .........تاد ، دایکیان لەژێر لێوەوە ووتی ئەی کاک جەمیل بۆ هەر دوێنێ هاتبووەوە؟ منیش ووتم دابەشمان کردبوو، ئەویش لێرە لە سلێمانی سەردانی کردوە.

ئەمڕۆ دووشەممە ١٩٩٩/٣/٢٩ لەشاری سلێمانیم، کەش هەوراوی و هەوا کەمێک ساردە، لەگەڵ هاوڕێم کاک جەمیل هەورامی دەمانەوێت چەند ماڵە دۆست و ناسراوێکی سنووری هەڵەبجەو هەورامان، کەماڵیان لەشارە، بەبـۆنەی جەژنەوە بەسـەر بکەیـنەوە. هـاوڕێ کـامەرانیش هـاتو پـێکەوە سەردانەکانمان کرد، لەوانە ماڵی کاک باقی حەسەن هەورامی، حەمەی سان

---

[1] زۆرجار ڕویداوە مناڵەکان و دایکیان، گلەیی دەکەن و ئەڵێن مناڵی فلانە مەسئول یان ژنی فلانە بەرپرس ئاوا هەڵسوکەوت ئەکەن و ئاوا ئەژین، ئەمـانیش گلەیی لەبەخت و ژیانی خۆیان ئەکەن، من چەند جار ماڵ ومناڵی خۆم کۆ کردوەتەوە، پێم وتون، ئێوە نابێ خۆتان بەراورد بکەن لەگەڵ  ماڵومناڵی ئەوانە، ئەوانە هاوڕێی من نینن، هاوڕێی من فەرەج تریفەیی، ئەحمەد گرییانەیی، غەفور دەرەشیشی ، حسێنی مەجیدی مەلاحامدو مەحمودی حاجی فەرەج، مەحمود گەرمیانی، ئەحمەد شاتوانی، فرەیدون حەمەساڵح و حەمەسەعید سێتەلانی و هاوڕێکانی تریانن. ئەمانە لەسالانی ١٩٧٧ بۆ ١٩٨٢ فەرماندە کەرت و تیپ بوون و شـەهید بـوون. ئەبێ لەگەڵ مناڵەکـانی ئەوان و هاوسـەرەکانی ئەوانـدا خۆتـان بەراورد بکەن

ئەحمەد (مام رەئیس)، دکتۆر شاهۆ (قادر حەمە کەریم)، دکتۆر فەخرەدین مستەفا.

د. فەخرەدین ووتی تۆیەکەمجارە بێیت بۆماڵمان زۆریشم خۆش ئەوێیت، بەوبۆنەوە ئەم گوڵەت پێشکەش دەکەم، گوڵێکی جوان بوو لەناو ئینجانەیەکدا ناردی بۆناو ئۆتۆمبێلەکەم، منیش سوپاسم کردو پرسیم دکتۆر گوڵەکە ناوی چییە ؟ ووتی (بنت قونسل ) ی ناوە، ئەوانیش د.فەخرەدین و د. شاهۆ لەگەڵمان هاتن و دواتر سەردانی کاک حەمەی حاجی سەعیدی هانەدنی و حاجی مەهدی دەرەمەڕیمان کرد لەگەڵ ماڵی تەحسین خانی حەسەن خانی رەزاو. کاک دڵسۆز کوڕی مام رەیس لەوێ بوو بۆسەردانەکانی تر ئەویش کەوتە گەلمان.

لەدرێژەی سەردانەکانماندا سەردانی ماڵی مامۆستا بابا برای کاک جەمیلمان کرد، مامۆستا خۆی لەماڵ نەبوو، جەژنە پیرۆزەمان لە منداڵەکانی کرد، من بەبینینی جێگەو رێگەو بارودۆخی ناومال وسیماو روخساری منداڵەکان و دایکیان لەدڵا نیگەران بووم، چوونکە زۆر هەژارو دەس کورت و دڵتەنگ دیاربوون.

بەڵی هەر ئەمرۆ و لەگەڵ ئەو هەڤالانەدا سەردانی دکتۆر ئومێد حەمەکەریم و عەبدل غەفوری حاجی مستەفا و ماڵی کاکە حەمەسەعیدی رەشەی تەوێڵەیمان کرد، کاک حەمەسەعید پیاوێکی خزمەت گوزارو رۆشنبیرو کاربەدەستی شارەوانی بووە لەدەورانی خۆیدا، ئێستا بەتەمەن و نەخۆشیشە، کیشوەرخانی خێزانی ژنێکی سەلارو جوان و لەکاک حەمەسەعید برێک گەنجتر دیارە. کاک حەمەسەعید رووی کردە کاک دڵسۆز پرسی دایک و باوکت چۆنن؟ ئەویش ووتی باشن، ووتی دایکت لای لەیلای خوشکی عەبدلعەزیز لە گەڕەکی مالیدەر لەتەوێڵە قورئانی ئەخوێند، لەیلایان دا بەشو دایکت و کۆمەڵێک کچی تر کەلەلای لەیلاخان خوێندکاری قورئان بوون تەواویان نەکرد. ( دایکی کاک دڵسۆز ئەوکات کاک حەمەسەعید هەواڵی ئەپرسی تەمەنی ۹۰ نەوەد ساڵ بوو، ۱۰٦ سەدو شەش ساڵ ژیا، ژنێکی ژیرو قسەزان و زۆربەی گولستان و بووستانی سەعدی شیرازی و شعرەکانی حافزی لەبەر بوو). لای ئێوارەوە هاتمەوە ماڵ نامەیکم نوسی بۆ جەنابی مام جەلال و بۆم نارد.

رۆژی ١/٣٠ هەر لەسلێمانی بووین و دوای ئەنجام دانی ئیشوکاری ئاسایی و هەندێک سەردان و بەسەر کردنەوە، کاک جەبار جەلال و عومەر عەبدولکەریم سەردانیان کردم و گلەییان کرد، لەسەر ئەوە بۆ چی هەموو هەڤالانی لایەک لەلاکانی یەکێتی لە مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی هاتونەتە سەر خەت و هەوڵ دەدەن لەم کۆنفرانسەی هەڵبژاردنەوەی مەڵبەندی شارەزووردا لاکەی خۆیان سەرخەن، بەلام من بێباکم و خەریکی ئیش و کاریترم؟ پرسیم ئەی چیبکەم ؟ ووتیان ئەبێ ئەوانەی بوونەتە ئەندامی کۆنفرانس هەموو بەسەر بکەیتەوەو داوایان لێبکەی دەنگت بدەنێ، ووتم ئەگەر ئەوە نەکەم چی؟ ووتیان زورناو دەهۆڵیان ئامادە کردووە کەدەرنەچویت بەفیکەو قاو دەرت دەکەن و کەسێک تر دەبێت بە جێگر مەڵبەند.

منیش ووتم ئەوە ناکەم، چۆن ماڵەو ماڵ و بەدوایی ئەو ئەندامانەدا بگەڕێم، رۆژی کۆنفرانس ئەوکاتەی خەڵک خۆی کاندید ئەکا چەند خولەکێک مۆڵەتی دەدەن خۆی بناسێنی، ئەوکات خۆم ئەناسێنم وە هەمووشی من ئەناسن و ئەزانن چیم کردووە بۆ یەکێتی، لەبەر ئەوە دەنگم دەدەنێ. ووتیان وانییە لەدەستەو دەستەگەریدا هەرلایەک بێکەڵکترین کەسی سەربەخۆی نادا بە باشترین کەسی بەرامبەر، ووتم دەی من کوا سەر بەهیچ لایەک نیم من سەربە یەکێتیم، ووتیان ئەوە ناخوا فریای خۆت کەوە تۆ لەبەر ئەوە پێشمەرگەی دێرینی ولەفەرماندەییەوە هاتویت بۆ مەڵبەند و مام جەلال بەدانان دایناوی بەجێگر، ئێستا ئەگەر ئیش نەکەیت بۆ خۆت، دەرناچیت و دەنگ ناهێنی.

کاک حەمە زیرنجۆیی راپۆرتێک و نامەیەکی بۆ هێنابووم، ناوەرۆکیان زانیاری و وردەکاری بوو لەسەر کەم و کورتی و پێشێلکاری بەشێک لەهەڤالان و هەڕەشەو گورەشەی ئاساییش لەهەندێک ئەندام بۆئەوەی بەویستی ئەو هەڤالانە دەنگ بدەن، لە سنووری هەردوو کۆمیتەکانی سەیدساق و قەزایی شارەزووردا. منیش دەقی هەردوکیانم نارد بۆ مام جەلال. رۆژانی ٤/١ و ٤/٢ی ١٩٩٩ لەماڵەوەم، برادەرانی مەڵبەندو کۆمیتەکان و ئەندامانی کۆنفرانس و ئەوانەي خۆیان کاندید دەکەن بۆ ئەندامی ئەنجومەنی مەڵبەند دێن و دەچن و سەردان دەکەن و هەرکەس بەرژەوەندی

خۆی لەچیدا ئەبینێ ئاوا قسە دەکات، بەئاشکرا بوونەتە دوو بەرەو هەردوولاشیان بە من دەڵێن تۆ برا گەورەیت، ئەم رەوشە بەردەوام بوو تا رۆژی گرتنی کۆنفرانسی مەڵبەند کەرۆژی ١٩٩٩/٤/١٠ بوو.

ئەمرۆ شەممە ١٩٩٩/٤/٣ سەرلەبەیانی لەسلێمانییەوە چوومە شارەزوور، کەش و هەوایەکی خۆشی هەیەو هەتاوە، دوای بەسەر کردنەوەی هەردوکۆمیتەی تانجەرۆ و قەزای شارەزوور بەهاوڕێیەتی بەشێکی زۆر لەهەڤاڵانی حزبی و رێکخستن، بەشداریم کرد لەرێورەسمی پرسەی خوشکی مام ناجی قاجری و پرسەی کوێخا نوری ، نیوەڕۆ میوانی کاک فەتاحی مەدحەت مالوانی بووین، دوا نیوەڕۆ مزگەوتی گەورەی شاردا بەشداریمان کرد لەرێورەسمی ئاشتەوایی نێوان ماڵی مەدحەت کەلالی و عومەرە ریشەی نەورۆلیدا، سەرۆک هۆزەکانی سنوورەکەو زانایانی ئاینی و خەڵکێکی زۆر ئامادەی ئەو کۆڕە بوون، ووتاری یەکێتی نیشتیمانی بەو بۆنەوە من پێشکەشم کرد.

رۆژی یەک شەممە ٤/٤ لەهەڵەبجە دوای جێبەجێکردنی ئیشوکاری ئاسایی حزبی، بەشداریم کرد لە کۆڕی ماتەمینی پرسەی کوڕێکی حەمەنەجیم بەڵخەیی، دوانیوەڕۆ هاتمە سلێمانی لەرێگادا کاک رەحمان بەڵخەیی باوکی عادل هەورامی لەگەڵمان بوو، بەدەنگێکی خۆش و بەسۆزو دڵگیر چەند بەزم سیاچەمانەی بۆ ووتین. ئەمرۆ دوو شەممە٤/٥ لەسلێمانیم میوانم هەبوون غازی شاوەیسی و سەعدونی پورزای و شەماڵی مام رەیس و تەحسین خان، لەشەو رۆژی رابردوودا نزیکەی حەفتا جار زەمین لەرزە لەسلێمانی و دەوروبەری داڕوویداوە بەلام بێزیان بووە.

ئەمرۆ سێشەممە ١٩٩٩/٤/٦ سەردانی هەردوو شارۆچکەی زەڕایەن و هەڵەبجەی تازەم کرد، خەریکی کۆبوونەوەو قسەکردن و دڵدانەوەی ئەو هەڤاڵانی سنوورەکە و ئەو کادرانەی کەلەم هەڵبژاردنەوەی رێکخستنەکاندا خۆیان کاندید کردوەو بەرندە نەبوون (دەرنەچوون)، هەندێک نیگەران بوون خەریکم سەردانیان دەکەم و ئاشتیان دەکەمەوە.

ئاوهەوای ناوچەکە لەم بەهارەدا گەرم و ناخۆشە بەهۆی وشکەساڵیەوە جووتیار و مەڕدارەکان نیگەران و ترسیان هەیە، ئەترسن لەوەی ئەورەنجەی لەدوای ساڵی ١٩٩٩١کەوە لەکوردستاندا داویانە رەنج

بەخەساربن، ترسی جووتیارەکان لەوەی کە ئەو باخ و باخاتەیان بەتایبەت لەناوچە شاخاوی و کوێستانیانەدا ئاوەدان و سەوزیان کردوەتەوە وشک ببنەوە، ئەوانی لەدەشت و هەردەکاندا کشتوکاڵ و گەنم و جۆیان چاندوە وشک ببن . مەڕدارو خاوەن ئاژەڵەکان بەتایبەت لە گەرمەسێردا لەوەڕیان دەست ناکەوێ بۆ بەدەست هێنانی لەوەرگە دەبێ روو لەناوچەکانی تر بکەن یان دەبێ ئاژەڵەکانیان بفرۆشن.

نرخی جووتی مەرو بەرخ بەقسەی کاک ئەرکان لەکەلار بە ١٧٠٠هەزارو حەوت سەد دینارە، هەتا خەڵک مەترسیان هەیە لەوەی ئەمساڵ ئاوی خواردنەوەیان کەم بێت، لەدەرودەشت و ناوچە شاخاویەکان زۆربەی زۆری کانیاو چەشمە ئاوەکان وشکیان کردووە و نەزاونەتەوە یان بەشێوەیەکی بەرچاو کەمیان کردوە. لەشاری هەڵەبجەدا سەرچاوەی سەرەکی ئاوی خواردنەوەی خەڵک چاڵی قوڵە (بیر) زۆریان وشکیان کردووە.

ئەمرۆ چوار شەممە ٤/٧ سەردانی سلێمانیم کرد و مزگەوتی قەزازەکان گەڕەکی ئەسحابە سپی بەشداری رێورەسمی پرسەی دوو هاووڵاتی شارۆچکەی تەوێڵەم کرد، ئەوانیش ئەختەرخانی خێزانی کاک عومەری حەکە و کاک رەزای حاجی باباڵە بوون.

ئەمرۆ هەینی ١٩٩٩/٤/٩ کۆنفرانسی هەڵبژاردنەوەی ئەنجومەنی مەڵبەندی سلێمانی بوو، دەنگی منیان کردبوو، بەهۆی ئەوەوە کە بەیانی کۆنفرانسی هەڵبژاردنەوەی ئەنجومەنی مەڵبەندی رێکخستنی شارەزوورە، میوانم زۆربوو، هەموو ئەو هەڤاڵانەی دەرچوون بۆبەرپرسی ئۆرگانەکان و بەشداری کۆنفرانس دەکەن بۆ هەڵبژاردنەوەی ئەنجومەنی مەڵبەند، ئەوانیشی خۆیان کاندید کردووەو دەرنەچوون. هەموو دێن و دەچن و داواکاریان هەیە، ئەنجومەنی کۆنی مەڵبەندی شارەزوور ٤٠ چل کەسە، سنووری تانجەرۆ٤٦ کەس، سەیدسادق٥٧کەس، پێنجوێن٥٩ کەس، هەڵەبجەی تازە ٧٠ کەس، هەڵەبجەی شەهید ٣٣ کەس، داواکاریان پێشکەش کردوە. دەیانەوێت بەیانی بەشداری کۆنفرانس بن. لەمەکتەب رێکخستن و لەمەڵبەندیش کەس ئامادە نییە جوابی هیچ هەڤاڵێک بکات هیچ نەبێت بڵێت بەپێی یاسای حزبی ناتوانی بەشدار بیت، چەند هەڤاڵێک پێیانوتراوە حەمەی حەمەسەعید جێگری مەڵبەند ناڕازیە یان ئەگەر ئەو رەزامەند بێت ئێمە لاریمان نییە. لەم کاتی سەرقاڵی و

بێنەو بەرەدا کاک جەمیل داوای کرد بچم پێکەوە ڕاپۆرتی مەڵبەند ئامادە بکەین بۆ بەیانی.

ئەمڕۆ شەممە ١٩٩٩/٤/١٠ لەشاری سلێمانی بووین کۆنفرانس لەوێ و لەهۆڵی ڕۆشنبیری دەبەسترێ، لەبەر بارودۆخی ئەمنی لەهەڵەبجە نابەسترێ، چوونکە مام جەلال و میوانی تریش بەشداری دەکەن. لەهەڵەبجە و شارەزوور هەرچەندە لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی ڕێککەوتوین و بارودۆخەکە تاڕادەیەکی باش هێور بووەتەوە، بەڵام گروپ و تاقمە توند ڕەوەکانی لەپەناو لەناو بزووتنەوەدا خۆیان شاردوەتەوە، جێگەی متمانە نین.

بەڵی کاتژمێر ٨ سەرلەبەیانی چووینە ناو هۆڵەکە دوای هاتنە ژورەوەی ئەندامانی کۆنفرانس، کاک ئەرسەلان بایز و جەنابی مام جەلال و هەڤاڵانی تری مەکتەب ڕێکخستن و میوانەکان هاتنە ژوورەوە، لیژنەی سەرپەرشتی کۆنفرانس هەمان ئەو هەڤاڵانەی مەکتەبی ڕێکخستنن کەسەرپەرشتی هەڵبژاردنەوەی ئەنجومەنی کۆمیتەکانیان کردووە، لەچەند هەفتەی ڕابردوودا.

لەهەڵبژاردنەوەی کۆمیتەکاندا، بەشێک لەهەڤاڵانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی بۆ بەرژەوەندی و لایەنگری دەستەیەک یان لایەک لەو دوولایە، بەئاشکراو بەناوی کاک کۆسرەتەوە تەداخولیان دەکرد وە ئەیانویست بەزۆری زۆرداری و بەناوی فەرمادە سەربازییەکانەوە فشار دروست بکەن، ناچار مام جەلال خۆی هاتە سەر خەت و هێزێکی سکرتاریەتی بەسەرپەرشتی کاک ئازاد جوندیانی نارده سەیدسادق و هەڵەبجەی تازەو زەڕایەن.

ئەم ڕۆش لەسلێمانی و لەدەوروبەری هۆڵەکەدا هەرچەندە مام خۆی لێرەیە بارودۆخ زۆر ئاسایی نییە، کۆمەڵێک دێن و ئەم و ئەو بانگ دەکەن، ئەوانەی بانگ دەکران چیان پێئەوتن دەهاتن بۆ ئێمەیان ئەگێرایەوە، بەڵێنی جۆراو جۆریان ئەدا بەوانی لەدائیرەی حکومەتدا بوون، دەیان ووت ئەگەر دەنگ بەئێمە یان فلانەکەس بدەیت، دوایی پلەکەت بەرز دەکەینەوە، یان ئەیانوت ئەتگوازینەوە بۆ ئەو شوێنەی خۆت ئەتەوێ، هەروەها بەڵێنی هاوکاری مادی و جۆراوجۆریان ئەدا، هەڵسوکەووتی ناشیرین و قسەو قسەڵۆکی بێماناو بێتام، ئەیان ووت هەوراممییەکان یەکیەتی و مەڵبەندیان

داگیرکردوە، ئێمەی شارەزووری پیاوێکی گەورەمان نییە، هەروەها پەنایان بۆ سەرۆک هۆزو ئەندامانی فەرماندەییەکان بردبوو ئەیانبردنە سەرماڵان و بەناوی خزمایەتی و عەشیرەتەوە ئەندامانی کۆنفراسیان روگیر کردبوو، دەیان کەس لەوانەش بەڵێنیان ئەدانی دەهاتنەوە لای من ئەیان ووت بەدرۆ بۆ ئەوەی لەکۆڵم بنەوە بەڵێنم داوە دەنگیان بدەمێ، بەڵام ئەوەندە بێشەرمن بەدیار دایک و باوک یان مناڵەکانمەوە داوایان کردووە دەی باشە سوپاست دەکەین، بەڵام بەتەلاق سوێنمان بۆ بخۆ.

وایلێهات من بگەمە ئەو بڕوایەی خۆم کاندید نەکەم، بەکاک ئەرسەلانم ووت، لەتەنشت یەکەوە دانیشتبووین، ووتم خۆت ئاگاداری من مام جەلال بەئیجباری و خۆشم روگیر بووم لە ناو هێزی پێشمەرگەوە گواستمیەوە بۆ ناو ئۆرگانی حزبی، جەنابت برای گەورەو من لەقسەی تۆ دەرناچم ئەمەوێت خۆم کاندید نەکەم، ووتی شتی وا نەکەیت، بۆ؟ ووتم تاقەتی ئەم بارودۆخەو ئەم دەستەو دەستەگەریمە نییە،ئێستا فرسەتە من ئەمەوێت خۆم کاندید نەکەم و بگەڕێمەوە بۆ فەرماندەیی، ووتی نابێ هەر بۆخۆت عەیبەو دەڵێن ئەوە ئەترسێ دەرنەچێ، منیش کۆتام کرد.

لیژنەی سەرپەرشتی کۆنفراس، کاک ئەرسەلان بەرپرسی مەکتەب رێکخستن، کاک جەمیل بەرپرسی مەڵبەند، مام جەلال سکرتێری گشتی یەکێتی، ووتاریان خوێندەوە، مام جەلال دوای ووتارەکەی خواحافیزی کردو بەجێی هێشتین.

ئینجا دەرگای خۆپاڵاوتن کرایەوە، ماوەدرا هەرکەس و لەچەند خولەکدا خۆی بناسێنێ یان باسی خەبات و رابردووی خۆی بکات، یەکەم کەس من بانگ کرام، چوومە سەر سەکۆکەو بەکورتی خۆم ناساند ئەمە دەقی قسەکانمە لەو خۆناساندنەدا (ناوم محەمەد سەعید عەلیە، ناسراوم بە حەمەی حەمەسەعید، خەڵکی هەورامانم، لەدایک بووی ساڵی ١٩٦٢م، ساڵی ١٩٦٨ چوومەتە قوتابخانە، بەردەوام بووم تاساڵی ١٩٧٧لە پۆلی سێهەمی ناوەندیبووم، هەمان ساڵ و لەتەمەنی ١٦ شانزە ساڵیدا دەرچوومەتە دەرەوەو بووم بە پێشمەرگە. پێشمەرگەبووم تاساڵی ١٩٩٨، پێش راپەڕین پلەی پێشمەرگایەتیم فەرماندەی تیپی ١١ی هەورامان بووە، لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٨وە هاتومەتە ناو کاری

حزبی بەپلەی جێگری مەڵبەند. ئەگەر لەم هەڵبژاردنەدا دەرچووم و متمانەی ئێوەم بەدەسهێنا، پشتگیر و هاوکاری ئەوکادرانە ئەبم کە:

(یەکریزی یەکێتی بپارێزن، دڵسۆزبن بۆکوردو بۆ ڕێبازەکەی یەکێتی، خاوەن خەبات و هەڵوێستی جوامێرانەبن، ئازاو بەغیرەتبن، خاوەن قەڵەم و خوێندەواربن، دژی دوژمنانی کوردبن، ڕابردوویان پاک و هاوکاری دوژمن نەبووبن، پشتگیری ئەو کەسانە ئەبم ، خۆبەزل نەزانن، خاکیبن، فیزبەسەر خەڵکدا نەکەن و خزمەتکاری خەڵکبن، لەکارکردنندا جدیبن و تەمەڵی نەکەن، بەردەوام بیریان لای ماڵ و منالیان نەبێت، دەم و دەست و داوێن پاکبن، ڕاستگۆ و لەکاتی پێویستدا توانای بڕیاردانیان هەبێ، لەکاتی تەنگانەدا پشت لەرێبازەکەیان و کوردایەتی نەکەن.

دژی ئەوانە ئەبم کەئەم تایبەتمەندیانەیان تێدا نەبێت. دژی دەستەو دەستە گەری و ڕق لەیەک بوونم، ئەم دەستەو دەستەگەریە یەکێتی لاواز دەکات، دوژمنان و نەیارانی بەهێز، هەڤاڵان بڕوابکەن ئەوانەی من و تۆ سەنگەر لەیەک ئەگرین بۆیان خۆیان کێشەیان نییە، نەلەسەر بیرو بۆ چوون، نەلەسەر گەشەکردن و پێش کەوتن.

ئێمە بەیەکەوە جوانین، بەیەکەوە بەهێزین، بەیەکەوە خاوەن ڕێزو حورمەتین، بەیەکیتی و یەکریزی ڕابردوو داهاتومان پارێزراو ڕەنج بەخەسار نابین، لای من یەکێتی یەک حزبە، یەک ڕابەری هەیە.

نامەوێ زۆرکات بگرم، ئەگەر بمەوێت ئەوەی کردومە بەکورتیش ئامـاژەی پێبکەم کۆتایی نایەت، لەکۆتایدا ئەڵێم، لەهەموو ڕوداو پێشهاتەکاندا ئەوەی ئەرکی مـن بـووە، درێغـیم نەکـردوە، لەمەو دواش تالەسـەر ئەم بیـرو بـۆ چوونەبم بەدڵسۆزانە بەردەوام ئەبم، سوپاس بۆ هەموو لایەک، ئەوەی دەنگم دەداتێ سوپاسی دەکەم ئەوەی نایدا ڕقم لێی نابێ ).

دوای من ٢٥ هەڤاڵ خۆیان ناساند، پرۆسەی دەنگدان و ئەژمار کردن و جیـاکردنەوەی دەنگەکـان دەسـتی پێکرد، کـاک ئەرسـەلان تـا ئەوکـاتەش دانیشتبوو، پرسی حەمە دەرئەچیت؟ ووتم بەتەمام یەکەم بم، دەمانچەیەکی چواردەخۆری پێبوو لەسـەر تەپڵەکەکەی بەردەمـی هەردووکمـان دایـنابوو، ووتـــی ئەگەر یەکەم بـــووی ئەودەمـــانچە هەڵنـــاگرمەوە، دەســـت کـــرا بەخوێندنەوەی دەنگەکان لەژێر ناوەکەی منەوە لە١٠٠ سەد دەنگ تێپەڕی

کرد، دیم کاک ئەرسەلان سکرتێرەکەی کەناوی رزگارە بانگ کرد، پێی ووت بڕۆ لەناو ئوتۆمبێلەکەمدا دەمانچەیەکی تیایە بیهێنە، رزگار هاتەوە دەمانچەیەکی قادسیەی هێنابوو، دایە دەستم و ووتی بگرە ئەوە دەمانچەکەو من ئەڕۆم، منیش لەسەر رۆشنایی ئەو پەندە کوردییەی کە دەڵێت ( ئەسپی دیاری سەیری ناو دەمی ناکرێت) دەمانچەکەم وەرگرت و نەم ووت تۆ بەڵێنی چواردە خۆرەکەت دا بۆ پەشیمان بوویتەوە.

دەنگ دان تەواو نەبوو بوو، هەرێم ئەمین و بەختیار فەتاح دوو کوڕی جوان و خوێن شیرینن، وێنەگرو لە راگەیاندنی مەڵبەندا کار ئەکەن، هاتنە لامەوە ووتیان ئەوە تۆ یەکەمی کەپرۆسەکە تەواو بوو برادەرانی راگەیاندن گۆرانی سیاچەمانە ئەخەینە سەر بڵدگۆکان، منیش بە جدی ووتم شتی وانەکەن عەیبە رازیم نییە، ووتیان نا لاکەیتر زرناو دهۆڵیان هێناوە بڕیار بووە ئەگەر تۆ دەرنەچیت بەزرناو دهۆڵ دوات بکەون بۆ دەرەوە، ئەوقسانەم بیست بڕوام نەدەکرد، بەڵام هەر لەگەڵ تەواو بوونی پرۆسەکە و دەرکەوتنی ئەنجامەکان بۆم دەرکەوت کوڕەکان راستیان کردوە، بەراستی من بۆخۆم شەرمم دەکرد لەهەندێک قسەو هەڵسوکەوت، لەناکاو قاعەکە شلەژان و سیاچەمانە بەدەنگێکی بەرز دەنگی ئەدایەوە، بەشێکی خەڵکەکە شادی دەکرد و پیرۆزبایی کردن بوو لەیەک، بەشێکی کەمیش بەگلەو بۆڵەکردنەوە دەرچوونە دەرەوە .

من یەکەم دەنگ ١٨٩ دەنگ و شلێر غەفور عیزەت دووەم بوو، ١٦ هەڤاڵ خۆیان پاڵاوتبوو، مەڵبەند ١١ یانزە هەڤاڵی پێویست بوو یەک جێگر مەڵبەند و ١٠ ئەندامی ئەنجومەن، ٥ پێنج ئەندامیان بۆ بەرپرسی کۆمیتەکان و ٥ پێنج ئەندامیش بۆ کارگێڕی.

ئەو هەڤاڵانەی دەرچوبوون سەر بە دوو تەکەتول بوون بەم شێوە لایەنی یەکەم : ١/ شلێر غەفور عیزەت بیارەیی، ٢/ جەبار جەلال گولانی، ٣/ جووتیار مەجید پێنجوێنی، ٤/ وریا براخاس هاواری،٥/ فەتاح مەحمود نادر کۆکۆیی.

لایەنی دووەم: ١/ ئەحمەد قەدەفەری، ٢/ حەمە شارەزووری، ٣/ مەحمودی حاجی سالح، ٤/ م . عوسمان عەبدولا، ٥/ فارس عەزیز.

لیژنەکە داوای کرد ئەو ١٠ هەڤاڵە نەڕۆن و کۆببنەوە بێن بۆ بارەگای روناکبیری هەر لەتەنیشت هۆڵی رۆشنبیری، بۆ هەڵبژاردنی جێگرو کارگێڕ و

بەرپرسی کۆمیتەکان، هەڤالانی لایەنی دووەم ووتیان ئێمە ناچینە هەڵبژاردنەوە، با بەرێککەوتن رێک بکەوین لایەنی یەکەمیش ووتیان نا بە هەڵبژاردن، منیش لەنێوان ئەم دوو بۆ چوونەدا خۆم بەبێلایەن ئەزانم و پێم وایە هەرکامی بێت من لاریم نەبێت باشە. بەڵام ئەگەر بێتە سەر ئەوەی ئەم ٥بە٥ زۆرینەو کەمینەی لێ دروست بێت، من لایە نگری لایەنی یەکەم دەکەم . وە خۆشیان هاتنە لام و ووتیان تۆ هەڵبژاردنت بۆناکەین تۆدەنگی یەکەم و لای ئێمە جێگری مەڵبەندی. کەگفتوگۆ دەستی پێکرد من لایەنی ئەوانم گرت و ووتم ئەبێ بەهەڵبژاردن بێت، منیش بەیەکجاری ساخ بوومەوە لەسەر لایەک. ئەوەیە لەلاپەڕەکانی پێشتردا کەباسی دەستەو دەستەگەریم کردوە، وتومە (دوواجار منیش نەمتوانی بێلایەن بم و لەسەر لایەک ساخ بوومەوە).ئەمڕۆ نەگەیشتینە ئەنجام و کێشەکەمان وەک خۆی مایەوە بۆ بەیانی.

من کەهاتمە دەرەوە بڕۆم، ئەبینم خەڵکێکی زۆری یەکێتی لەسنووری مەڵبەندی شارەزوور و سنووری مەڵبەندی سلێمانیش لەدەورووبەرو حەوشەی بیناکەدان هەندێک دڵخۆش و هەندێک نیگەران.

ئەمڕۆ یەک شەممە ١٩٩٩/٤/١١ پێنج هەڤاڵەکەی لایەنی یەکەم هاتنە ماڵەوە بۆلای من پێکەوە چووینە بارەگای مەکتەبی رێکخستن، هەڤالانی لایەنی دووەمیش لەوێ بوون، کۆبوونەوە کرا کاک ئەرسەلان بەناوی مام جەلالەوە قسەی کردو ووتی دووکارگێڕ بدەن بەو هەڤالانەی تر واتە کاک ئەحمەد قەدەفەری و ئەوان، ئەمان واتە شلێرخان و برادەرەکانی رازی نەبوون، ئەیان ووت یان هەڵبژاردن یان ئەبێ هەر پێنجیان بەرپرسی کۆمیتەبن، خۆ ئەگەر ئەحمەد و برادەرەکانی ئەوەیان بکردایە، ئەیان توانی مادام هەرپێنج کۆمیتەکە بەدەست ئەوانەوەیە هیچ بڕیارێکی کارگێڕ جێبەجێ نەکەن، ئەوکات مەڵبەندەکە پەکی ئەکەوت. لێرەش نەگەیشتینە ئەنجام، کاک ئەرسەلان لەگەڵ مام جەلال قسەی کرد و ئاگاداری کردین ئێوارە کاتژمێر ٧:٣٠خولەک ئەچینە لای مام جەلال بۆ قەلاچوالان.

ئێوارە لەکاتی دیاری کراودا چووینە بارەگای مەکتەبی سیاسی، بینیمان ئەو برادەرانەی داوای رێککەوتن دەکەن پێش ئێمە لەوێن لەخوارەوە لەژووری ئیدارەدا دانیشتون، ئێمەش لەژورێکیتردا، وردە وردە لەیەک دائەبڕێین و خەریکە مەرحەبایی یەکتر نەکەین. برادەرێک هات ووتی کاکە

حەمە مام جەلال دەڵێت بابێتە سەرەوە، بەڵێ چوومە سەرەوە، دوای چاکو چۆنی ووتی دانیشە، دانیشتم بەرانبەری، کاک جەمیل هەورامی و کاک ئەرسەلان بایز و کاک شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەش لەلای دانیشتبوون، مام جەلال زۆر بەلوتف و بەروویەکی خۆشەوە دەستی کرد بەپرسیار کردن و قسە کردن لەگەڵ من، منیش وەڵامم ئەدایەوە و بەڵێم بۆدەکرد، دواجار پرسی حەمە قابیلە تۆ بەگوێی مامی خۆت نەکەی؟ ووتم چۆن مام جەلال، من ئەگەر بەگوێی تۆ نەکەم ئەی بەگوێی کێ دەکەم؟ ئەمرکە، باسی یەکێتی و کەمینەو زۆرینەی کرد و ووتی یەکێتی هی هەمووم انە ناکرێ ئەوەی دەرچووە و زۆرینەیە ئەوانیتر دەرکات، ئەوانە ٥بە٥ ن، تۆ بارەکە لاسەنگ دەکەی، تۆش ئەوە مەکەو سێ کارگێڕ بۆ لایەکیان و دووکارگێڕ بۆلاکەیتر، کۆمیتەکانیش وا دابەش بکەن، منیش ووتم بەسەرچاو مام جەلال، بەڵام خۆیان ببینەو قسەیان لەگەڵ بکە، ووتی بەڵی باشە وادەکەین، تۆ هەستە بڕۆ لاکەی خۆت بانگ بکە بەڵام لێرە لایەنگری ڕێککەوتن بە، من نەمویست، قسە لەقسەی مام جەلالدا بکەم، بڵێم مام جەلال لای منی چی؟ من لام کوا تۆ توشت کردوم؟ کاک جەمیل و کاک ئەرسەلانیش هیچ قسەیان نەکرد تامن لەوێ بووم.

من هەستام هاتمە خوارەوە بەهەڤالانم ووت مام جەلال وائەڵێت ئێستا ئەچینە سەرەوە، بەگوێی بکەین باشە، دەستیان کرد بە بۆڵەبۆڵ و ووتیان دەی دەرچوو دەرنەچوو جیاوازیان نییە ئیتر بۆ هەڵبژاردن کراوە؟ منیش ووتم ئێستا ئەچینە سەرەوە ئەمە بەمام جەلال خۆی بڵێن.

بردمن و چووینە سەرەوە، مام جەلال هەستاو یەک یەک دەستی دانێ و بەخێرهاتنی کردن، ئینجا لەسەر بابەتەکە قسەی بۆکردین و ئێمەش گوێمان گرت، ناوەرۆکی قسەکانی مام ئەوەبوو، یەکێتی هی هەموویەکێتیەکانە، مەبدەئی زۆرینەو کەمینە و سڕینەوەی لایەک لای لاکەیتر، شتی خراپەو ئێمە لەگەڵ ڕێکەوتن و تەوافوقین، لەهەڵبژاردنەکاندا ئەگەر دەرچوەکان بیانەوێ هەموو ئیشوکاری ئۆرگانەکان و پلەکانی حزبی لای ئەوان بێت، ئەوە قابیلی قبووڵ نییە، هەروەها ووتی حیزب نەئەنجومەنی پارێزگاو نەپەرلەمانە، لەهەڵبژاردنی ئۆرگانی حیزبیدا ناکرێ زۆرینە کەمینە بکاتە دەرەوە بەتایبەت

بۆحیزبێکی وەک یەکێتی، یەکێتی هی هەموو یەکێتییەکانە، زۆرینەی ئێستاش زۆرینەی ئەو کلک لێک گرێدانە ناشەرعیەیی هەندێکە.

برێک مەدحی مەڵبەندی شارەزووری هەڤاڵەکانی کرد و دواجار رووی کردە من ووتی حەمە وانییە؟ منێش لەترسی هەڤاڵەکانم لەژێر لێوەوە ووتم بەڵێ، یەکسەر بەروخساریدا زانیم نیگەران بوو. بەراستی ئەو هەڤاڵانە منیان بەرندە کردبوو بووبوومە یەکەم دەنگ، نەم ئەویست ئەوان کە بەتەما بوون من بەجێگری لێپرسراوی مەڵبەند هەڵبژێرنەوە و پێنج پلە کارگێڕیەکەش بۆخۆیان بێت، سازشی لەسەر بکەم. بەتایبەت سازش لەسەر پلەکانی ئەوان، بۆخۆم زۆر ئاسایی بوو لام ئەگەر لەمەڵبەندیش نەمێنم .

دوای ئەوە، مام رووی کردە جەماعەت و ووتی کێ قسەی هەیە؟ سەرەتا کاک جووتیار مەجیدی پێنجوێنی قسەی کرد، مام جەلال بەتوڕەییەوە ووتی کەریمی بەجووتیار بوو، ئەو دانیشت و مامۆستا فەتاح کۆکۆیی داوای مۆڵەتی قسەکردنی کرد، مام ووتی فەرموو، فەتاح ووتی مام جەلال ئەگەر دەرچوو دەر نەچوو وەک یەک وایە ئەم پرۆسەمان بۆ ئەنجام دا؟ وە ئایا ئەمە هەر بۆ مەڵبەندەکەی ئێمەیە یان بۆ گشت مەڵبەندەکانە؟ مام جەلال ووتی هەی هەی مەڵبەندەکەی لە ماڵی باوکی لەتەوێڵە و بیارەوە بەکۆڵ بۆ هێناوین[1] .

دوای ئەو مام وریا هاواری ئەیویست پینەو پەڕۆیکا، ووتی مام جەلال بەیانی بە نامەیەک وەلامت ئەدەینەوە، مام لەجێگەکەی خۆی لەسەر کورسیەکە هەستاو ووتی هەستن بۆ دەرەوە، قیڕاندی و ووتی دەی بڕۆن، هەڵەم نەکردبێ کاک ئەرسەلان و کاک جەمیل و شێخ عەبدولکەریم، پێش هەموومان کەوتن ژورەکە چۆڵ بوو، من بەدیاریەوە وەستاوم و نەچوومە دەرەوە، ووتی بڕۆ، ووتم مام ناڕەحەت مەبە و ئەمویست بڵێم بەسەر چاو بەدڵی تۆ دەکەین، نەیهێشت، قسەکە تەواو بکەم ووتی یالابڕۆ، ووتم ناڕۆم،

---

[1] / مەبەستی مام لەم قسەیە و ڕووی قسەکەی بۆ من بوو، ئەگینا مام جەلال ئەزانێ فەتاح کۆکۆییە و تیرەی کۆکۆیش سەربە هۆزی گەورەی جافن، ئەمە وەلام بوو بۆمن نەک فەتاح. من ئیتر تێگەیشتم و زانیم لەژێر لێوەوە وەلامم داوەتەوە شتێکی خرابم کردوە، ئەمویست دوای فەتاح بڵێم مام جەنابت چۆنت پێباشە وا ئەکەین، بەلام مەجال نەماو کۆبوونەوەکە تێک چوو.

ووتی دەباشە من ئەڕۆم، خۆی هەر دەهاتە دەرەوە نزیک بووبووەوە لە دەرگای ژورەکە، هاتە دەرەوە منیش دووربەدوور بەدوایدا هاتم، ئەو لەپێپلەکانەوە دەهاتە خوارەوە لەسەرەوە سەیری قاتی خوارەوەم کرد ئەو عالەمە وەستابوون، بیناکە کشومات ئەتوت کەسی لێنییە، کەس چوتەی لێوە نەدەهات، برێک کە لەڕێرەو هۆڵەکەدا وەستا بوون مامیان بینی خۆیان دەکرد بە ژورەکاندا، لەناکاو مام کەوت من لەدواوە پەلامارم داو قۆڵیم گرت، لەخواریشەوە سێ چوار کەس پەلاماریان داو هەستانیانەوە پێم وابوو یەکێکیان کاک ئەرسەلان بوو.

ئەو بارو دۆخەم ئەبینی بەراستی پەشیمان و شەرمم لەخۆم دەکرد پڕبەدڵ نیگەران بووم لەوەی ئێمە بوبووین بەهۆی نیگەرانی و تووڕە بوونی مام جەلال، مام بەدەستی ڕاستدا بایدایەوەو رووی کردە ژووری ئیدارە ژوورەکەی کاک ئاواتی شێخ جەناب، کاک ئاوات ئەوکات بەرپرسی ئیدارە بوو. بەکلکی گۆچانەکەی دەرگاکەی پاڵنا، بەشەکەی تری هەڤالانی مەڵبەند لەگەڵ کاک ئەحمەد قەدەفەری لەوێ دانیشتبوون، دەرگاکە کرایەوە و مام ووتی هەستن بڕۆن دەرنەچوون و تەواو. کەس نەیئەوێرا ورتە بکات. مام جەلال رۆیشتەوە بۆ ئەو بەر بۆ شوێنی پشوودانەکەی خۆی، کاک ئەرسەلانیش نیگەرانبوو رۆیشت، من و کاک جەمیل و شێخ عەبدولکەریم و چەند برادەرێکی ترلەوێ مابووینەوە و لەژورێکدا دانیشتین، شێخ ووتی تۆ نامەیەک بنوسە بۆ مام و من ئەیبەم، منیش ووتم چی بنوسم ؟ ووتی بنوسە بەیانی خۆمان ڕێک ئەکەوین و پێکەوە دێینەوە بۆلای جەنابت و تۆ چی بڵێیت وا دەکەین.

بەڵێ کاغەزو قەڵەمیان هێنا و من نامەیەکم بۆ مام نوسی ئەمە دەقی نامەکە بوو، بەڕێز جەنابی مام جەلال

سلاو، دوای سلاوم من زۆر زۆر داوای لێبووردن دەکەم، بووم بەهۆی ئەوە جەنابت نیگەران ببیت، بەیانی دێینەوە خزمەت و تۆ چی ئەمر بکەیت ئێمە وا دەکەین.

لەگەڵ ڕێزدا　　　　　　　　　　　　دڵسۆزت

حەمەی حەمەسەعید

کاک شێخ عەبدول کەریم هەستاو نامەکەی برد و رۆیشت بۆ ئەوبەر من و کاک جەمیلیش ماینەوە، ئەوەندەی نەبرد شێخ هاتەوە ووتی نامەکەم داوەتێ و مام جەلال ووتی بابەیانی وەلامتان ئەدەمەوە، ماوەیەک دانیشتین و شێخ ووتی بەم شەوە هیچ ناکرێت هەستن بابرۆین.

هاتینە دەرەوە من و کاک جەمیل پێکەوە سواری ئۆتۆمبێلێک بووین، لەقەلا چوالان دەرچوین، گەیشتینە نزیک تەگەران و شوفێرەکە ووتی ئۆتۆمبێلێک لەدواوە چرامان بۆئەدا ووتمان بووەستە، چووینە کەناری جادە و وەستاین ئۆتۆمبێلەکە لە پشتمانەوە وەستا، کاک کاملی سکرتاریەتی لێدابەزی و هات پرسی کاک حەمە لەگەڵ ئێوەیە ؟ ئەوانیش ووتیان بەڵێ، ووتی زەحمەت نەبێت، منیش دابەزیم و دوای چاک و چۆنی ووتی ئەو نامە بۆتۆیە بیخوێنەوە، بەلام با کەس نەیبینێ، منیش نامەکەم هەڵپچڕی و بردمە بەردەم چرای ئۆتۆمبێلەکەوە، خوێندمەوە، جارێکی تر دووبارە خوێندمەوە. کاک کامیل بەدیارمەوە وەستابوو ووتی ئێستا جوابی هەیە ووتم نا تۆ برۆ خوات لەگەڵ. ئەو گەرایەوەو منیش سوار بوومەوە، لەبەر خۆمەوە ووتم تەماشا من لەبەر خاتری مام جەلال یەکێتیم، ئێستا چۆن کێشەکە هەموو هاتە سەرشانی من و مام جەلالیان لێ نیگەران کردم. کاک جەمیل پرسی چیە ئەو نامە چی بوو؟ ووتم هیچ نییە بەیانی ئیستقالە دەکەم مام جەلال لەمن نیگەران بێت هەر سیاسەت ناکەم.

ئەمە دەقی نامەکەی مام جەلال بوو:

براگیان کاکە حەمەی بەڕێز

سلاوی گەرم

سوپاس بۆ نامەکەتان بەلام ناتوانم لێ تانی بشارمەوە ، کەمن دوای ٢٥ ساڵ خەبات لەگەڵتان ئەو هەموو دیفاعەی لێتان ، قەدری خۆمم لای ئێوە زانی.

زۆر سوپاستان دەکەم چوونکە ئازادی و سەربەستی هەیە لەناو (ی ن ک)دا بەلام ئێستا تێگەیشتم (رێز و نرخم) لەلای کتلەکەی ئێوە چەندە ! خواش لەسوڵتان مەحمود گەورە ترە .

هەربژی

٤/١١ برای دێرینت

مام جەلال

بەڵێ هاتینە سلێمانی من لە کاک جەمیل جیا بوومەوە، برادەرەکانم لەماڵی خۆمان کۆکردەوە، پێم وتن نەدەبوو بەوجۆرە قسەبکەین و مام جەلال نیگەران بکەین، ئێمە بەحیساب شەڕ بۆ ئەو دەکەین کەچی ئەو نیگەرانە لێمان، نامەکەم پیشان نەدان ووتم بەیانی کاتژمێر ٩:٣٠ خولەک کۆ ئەبینەوە، تابزانین چی دەکەین، پەیوەندیم بە کاک ئەرسەلان بایزەوە کرد باسی نامەکەم بۆ کرد و ئەبینم ئەویش نیگەرانە لێمان ، پێم ووت بەیانی دێم بۆلات. دوای ئەوە چووم بۆماڵی کاک عومەری سەید عەلی کاک جەباریش هات بۆ ئەوێ، لەسەر کۆبوونەوەکەو بارودۆخەکەی ئێوارەو قەڵاچوالان قسەم بۆکردن، نامەکەشم پیشان دان، ووتم من پێم باشە مام جەلال چۆن داوا دەکات بۆ دانانی کارگێڕو بەرپرسی کۆمیتەکان ئاوا بکەین، ئەگەر نا من واز دەهێنم و دەگەڕێمەوە بۆ فەرماندەیی، ئەوانیش نامەکەیان بینی و گوێیان بۆ قسەکانی من گرت و ووتیان وابکەن. لەراستیدا من وەک دەستەو کوتلەش پەیوەندیم بەو برادەرانەوە نەبوو، لەسنووری مەڵبەندی شارەزووردا، کاک جەبار جەلال بەرپرس و لەو بارەوە پەیوەندی هەبوو بە کاک جەبارو کاک عومەرەوە، ئەویش لەڕێی کاک کوردۆ قاسمەوە، لاکەی تریش کاک مەحمودی حاجی سالح چاو ساخیان بوو لەڕێی کاک عوسمانی حاجی مەحمودەوە.

لای ئەوان هەستام و گەڕامەوە ماڵ پەیوەندیم بە کاک ئەحمەد قەدەفەریەوە کرد، ووتم من و تۆ پێشمەرگەی دێرین و ماندووین حەق نییە ئەم برادەرانە بمان دەن بەگژیەکتردا، ئەبێ مام جەلال چ ئامۆژگاریەکی کردین وابکەین، ئێستا وا دەکەم بەیانی کۆبینەوە لای کاک ئەرسەلان و کاک جەمیل، خۆمان ڕێکبکەوین و دوای ئەوە بەبێ کێشە پێکەوە سەردانی مام جەلال بکەین و ئاشتی بکەینەوە، کاک ئەحمەدیش زۆری پێخۆش بوو ووتی بەسەرچاو وادەکەین .

من بۆم دەرکەوت مام جەلال دەیەوێت ئەوانەی دەستەو دەستەگەری دەکەن، وە لەم هەڵبژاردنەدا خۆیان سەغڵەت کردوە، لەشوێنێک ئەم لا دەیباتەوە و لەشوێنێکی تر ئەولا، دواجار مام بەرێکەوتن ئەو لایەی ئەیدۆڕێنێ هەندێک پلەیان بداتەوە و لەریزی براوەکان دایانێ و ئەوانەشی دەرنەدە چوون لە هەردوولا هەربە پلەکانی پێشتر لە ئۆرگانەکاندا دابنرێنەوە، وەهەر واشی کرد.

بەم بەرنـــامە مـــام جەلال بەســـەرانی کوتلەکـــان و دەســـت و پەیوەندەکەیانی سەلماندو پێی ووتن ئێوە هیچکارەن، بەلام دواجار ئەمە نەبوو بەدەرس، دەستەو دەست بازی شکلی گرتوو جیابوونەوە روویدا، بووە هۆی لاوازی یەکێتی، دوای جیابوونەوەکەش کۆنگرە نەیتوانی، ئاسەواری دەستەو دەستەگەری بنەبڕ بکات، بەلکو دوای کۆنگرە دەستەو دەستەگەریەکە بووە هۆی پەراوێز کەوتنی دەیان کادری بەتواناو دلسۆز، هەروەها بووبە هۆی سەرکەوتن و دەرکەوتنی دەیان کەسی بێتواناو هیچ لەباردا نەبوو. لە بەدەستهێنانی پلەی بالا لەسەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی و دواتر لەحکومەتدا لە وەزیری و لە پەرلەمانتاری .

ئەمە بارودۆخە، واتە دەستەو دەستەگەری، بوو بەدەردێکی کوشندە، بەرۆکی یەکێتی گرت، ئەو هێزە کەجێگای سەرنجی دۆست و دوژمن بوو، بەهۆی ئەو هەلە گەورەو کوشندە یەک لەدوای یەکانەی ڕێبەرایەتیەکەی، ئەوەتا لەسالی ١٩٩٢ ئەم هێزە، ئەم یەکێتیە بەرجەستە لە رۆژهەلاتی ناویندا، بەرجەستە لە شۆڕشگێڕیەتی، لەخوێن بەخشین، لەکوردستانی بوون، لەهەلوێستی راست و دروست، لەسەربەستی بیروڕا، لەسەربەخۆی بڕیاردان، لە باوەڕ بوون بەفرەیی، بەدیموکراسی، بەپارێزگاری و بەبەرگری، لەپەیوەندی دروستی ناوخۆیی و دەرەکی.........تاد، خاوەنی ٥٠ پەنجا کورسی پەرلەمانی کوردستان بووە، ئێستا هاتوەتە خوار بۆ ١٨هەژدە کورسی پەرلەمان لەهەرێمی کوردستاندا.

ئەمرۆ دوشەممە ١٩٩٩/٤/١٢ بڕیارە بچینە بارەگای مەکتەبی ڕێکخستن و لەوێ کۆبوونەوە ئەنجام بدەین، بەرلەوە لەمالی ئێمە کۆبووینەوە، برادەران ئاگاداریان کردم ووتیان ئامادەین دووکەسمان پاشەکشە بکەین لە پلەی کارگێڕی و ئەندام مەلبەندبین و هەریەکەو بەرپرسی کۆمیتەیەک وەئەستۆ بگرین، لەبەر ئەوە کێشەکە چارەسەربێت و ئەزانین تۆش فشارت لەسەرە، من ئەمەم پێخۆش بوو، چوونکە ئەوە هەستکردن بوو بەرپرسیاریەتی لەلایەن ئەو برادەرانەوە، بەلام ووتیان بۆ ئەمە مەرجمان هەیە، بەرلەوەی بپرسم مەرجەکەتان چیە، لێم پرسین ئەو دووهەڤالە ئامادەن پاشەکشە بکەن کێن؟ کاک جووتیار مەجید و مام وریا هاواری وەلامیان دایەوە ووتیان ئێمەین، سوپاسم کردن و ئینجا پرسیم

مەرجەکەتان چییە؟ ووتیان ئەو دوو هەڤاڵەی ئێمە پاشەکشەی بۆ دەکەین ئەبێ ئەحمەد قەدەفەری و حەمە شارەزووریبن. دیارە لای ئەم هەڤاڵانە ئەو دووکەسە لەوانی تر شیاوتر بوون و برێک لەدەستەو دەستەگەریەکەدا نەیان گەیاندبووە مریشکە رەشە.

پێش نیوەڕۆ لەگەڵ کاک ئەرسەلان بایز بەرپرسی مەکتەبی رێکخستن و کاک شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە کۆبووینەوە، لەبارەگای مەکتەب لەگردی پارێزگای سلێمانی، هەردوو هەڤاڵ داوایان ئەوە بوو هەردوولای مەڵبەند ئێستا واژۆی مەحزەری کۆبوونەوەکەو رێککەوتنەکە بکەین، ئینجا بڕۆینەوە بۆلای مام جەلال، بەلام نابێت ئەو مەرجەی هەڤالان لەمەحزەرەکەدا ئاماژە پێبکەین. برادەران پێداگریان کرد و ووتیان ئەومەرجەی تێدا نەبێ ئێمە پاشەکشە ناکەین، لەسەر ئەمە کاک ئەرسەلان نیگەران بوو، کۆبوونەوەکەی بە جێهێشت و رۆیشت، منیش خۆم نیگەران کردو هاتمە دەرەوە، هەڤاڵەکانی خۆمم لای شێخ بەجێهێشت و گەڕامەوە بۆماڵ. برادەرەکانی لاکەی تر ووتیان باشە ئێمە رازین بەومەرجە بایەکێکیان کاک ئەحمەد قەیەفەری بێت بەلام لەباتی حەمە شارەزووری ئێمە فارس عەزیز پێشنیار دەکەین بە کارگێڕ، لەسەر ئەمە رێکەوتین، مام وریاو کاک جووتیار پلەکانیان کارگێڕە بدەن بەو دوو هەڤاڵەی ناومان هێنان.

بەڵێ کاتژمێر٦ شەشی ئێوارەی ئەمڕۆ لە قەلا چوالان لای هەڤاڵ مام جەلال کۆبووینەوە لەماڵەکەی خۆیدا، ئامادە بوانی ئەم کۆبوونەوە ئێمە ١١ یانزە هەڤاڵەکەی ئەنجومەنی هەڵبژێرراوی نوێی مەڵبەند، کاک جەمیل بەرپرسی مەڵبەند، کاک عارف روژدی و لەگەڵ چەند هەڤاڵی تری مەکتەبی رێکخستن. کاک جەمیل و هەڤالانی مەکتەب داوایان کرد من (حەمەی حەمەسەعید ) قسە بکەم، سەرەتا بەناوی خۆم و هەموو هەڤالانەوە داوای لێبوردنم لە مام جەلال کردو پێم ووت، ئەوە هەردوولا پێکەوە هاتوینەتە خزمەت جەنابت و تۆ ئەمرت بەچی بێت ئێمە وادەکەین، پێشتر و ئێستا و دواتریش ئامادەی جێبەجێکردنی فەرمانی تۆین، ئامۆژگاریەکەی جەنابتمان وەرگرتووە، رێکەوتوین و بەڵێن ئەدەین کار بۆ یەکریزی و بۆپێشەوە چوونی یەکێتی نیشتیمانی بکەین بەبێ جیاوازی. تەشکیلاتی نوێی مەڵبەند بە هاوبەشی دەکەین.

مام زۆر خۆش حاڵ بوو، بەلام سەرەتا کەمێک گلەیی لەمن کرد، گوایا رۆژی پێشتر بەگوێم نەکردوە، خۆی وابوو دوێنێ من لەبەر هەڤاڵەکانم جدی نەبووم ئەگینا نەئەکەوتینە ئەمڕۆ و ئەم هەموو کۆبوونەوە یەک لەدوای یەکانە و مامیش نیگەران نەدەبوو لێمان . بەلام من لەوەلامی مام دا وتم، چۆن مامە دوێنێ و ئێستاو هەمیشەش بەگوێم کردویت و ئەشیکەم، ئینجا بەدڵی خۆش و پێکەنینەوە بەنوکتە گێرانەوە و قسەی خۆشەوە درێژەی بەکۆبوونەوەکەدا.

پرسی دەی مام وریا دەستەو دەستە گەریتان کرد؟ مام وریاش ئەیویست حاشابکات دەستیکرد بەقسە کردن و پاساو هێنانەوە، مام قسەکەی پێ بڕی و رووی کردە قەدەفەری وتی ئەحمەد دەستەو دەستەگەری باش نییەو ئەمەی ئێوە ئەیکەن زیان بەیەکێتی ئەگەیێنێ وانییە؟ ئەحمەد وەلامی دایەوە وتی بەڵێ مامە خراپەو زۆر بەخرابیش کردمان مەسەلەن من و ئەو کاک حەمەی حەمەسەعیدە لەسەرەتای شۆڕشەوە منداڵ بووین هاتینە دەرەوە، پێکەوە بووین و برادەرین، ئەم دەستەو دەستە گەریە وای لێکردبووم، حەزم دەکرد بەتەنەکەی ژەنگاوی سەری ببڕم، وتی ئەحمەد تەنەکەی ژەنگاوی بۆ؟ وتی مام جەلال بۆ ئەوە ئێشی زۆربێت. بوو بە پێکەنین و مام فەرمووی لێکردین بۆ سەر مێزی نان خواردن

کە چووینە سەر مێزی نان خواردن مام جەلال زۆر دڵخۆش بوو، لەناو یەکێتی و شۆڕش دا ئەوانەی نزیکی مام جەلال بووین، ئەمان زانی ئەگەر داوا کاریەکمان هەبێت لەمام، دەبێت ئەوکاتە داواکە بکەیت کە مام دڵی خۆشە.

من هەمیشە ئەگەر داواکاریەکم هەبوویێ لەو کاتانەدا کەمام دڵخۆش بووە، داواکاریەکانم کردوە، ئەڵبەتە داواکاری خەڵک، نەک بۆ خۆم و داوای شەخسی، وا ئەمڕۆ ئەم داوایانەم لێکرد و هەمووشی جێبەجێ کرد، دوای نان خواردن و لەکاتی گەڕانەوەدا، وتم مام جەلال برادەران لەبەر سەرقاڵیان بە دەستە و دەستە گەری و ئیشکردن بۆ خۆیان، هەرچیان بووە سەرفیان کردوە، کەسیان خەرجیان پێنییە، وتی بەسەر چاو یەکی چەندیان بدەمێ؟ وتم هەرچەند بڕیار ئەدەی بەزیاد بێت، وتی ٢٥٠٠ دوو هەزارو پێنج سەد دینار باشە؟ وتم خوا نەیبڕێ.

ووتی چیتر، ووتم تێکۆشەرێک و دۆستێکی دێرینت، لە هەڵەبجە نەخۆشەو سەردانم کردوە، داوای ئەوە بووە جەنابت ئاگاداربیت لەنەخۆشکەوتنەکەی، ووتی کێیە حەمە؟ ووتم خاڵە سەیید نەجیمی هانەسورەیی، ١٠٠٠٠ دە هەزار دیناریشی بۆ ئەو نارد و ووتیشی پێی بڵێ ئەگەر پێویستە دەینێرم بۆ تەهران.

پرسی چیتر؟ ووتم منداڵەکانی شەهید کاک قادر کۆکۆیی ئەیانەوێ سەردانت بکەن، ووتی بەسەر چاوان منداڵی قادر دیاری کردنی وەختیان بۆ چییە، کەی دێن بابێن.

داواکاری زیاترو پێویستری خەڵک هەبوو، بەڵام هەم لەم کاتەدا نەدەهاتنەوە یادم و هەمیش نەئەمویست زیاتر وەختی بگرم، سێ بارە فەرمووی چیتر؟ ووتم تەواو خۆشی سەری جەنابت. ئەوەبوو ئێمە هەمووومان و ئەویش بەدڵخۆشی خواحافیزیمان لەیەک کرد و شەو هاتینەوە سلێمانی.

ئەمڕۆ سێ شەممە١٩٩٩/٤/١٣ لەسلێمانم کەش و هەوا تۆزاوی و رەشەبایەکی ناخۆشی هەیە، خەڵکێکی زۆر لەوانەی نەخۆشی سنگیان هەیە، رویان کردوەتە نەخۆشخانەکان. هەڤاڵانمان چووبوون بۆ بارەگای مەکتەب بۆ واژۆکردنی کۆنوسی کۆبوونەوەی رۆژی پێشتر، من نەچووم، چەند برادەری تریش ئامادە نەبوو بوون، بۆیە خستبوویانە ئێوارە کاتژمێر ٦ شەش، ئاگاداریان کردین و لەکاتی دیاری کراودا هەموو ئامادە بووین، واژۆیی کۆنوسەکەمان کرد و بریار درا شەممەی داهاتوو کە دەکاتە ٤/١٧ یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی مەڵبەند بکرێت و بەرپرسی بەشەکان و کۆمیەکان دیاری بکرێن و دابنرێن.

ئەمڕۆ چوار شەممە ١٩٩٩/٤/١٤ لەشاری سلێمانیم، خەریکی ئامادەکاریم بۆ رێکخستنی رێوەرەسمێکی لێخۆشبوون، خوالێخۆش بوو کاک حەمەرەزای حاجی باباڵەی تەوێڵەیی بەکارەساتی ئۆتۆمبێل ژیانی لەدەست داوە، خێزان و بنەماڵەکەی دەیانەوێت خۆشبن لەو کەسەی روداوەکەی لەدەست قەوماوە. کاک جەمیل هەورامی چووە بۆ پەروێزخان بەپیر مامۆستا جەمالی حاجی محەمەدەوە لە هۆڵندا گەڕاوەتەوە، شەویش واتە١٤لەسەر٤/١٥ بۆ هەمان مەبەستی کۆڕی لێخۆش بوونەکە سەردانی ماڵی مام عەبدلخالق،

کاک عابدی حاجی باباڵە برای کاک حەمەرەزا و ماڵی مامۆستا سابیرم کرد. کاک شەماڵ محەمەد سان ئەحمەدیشم، بردبوو بۆ ئەو ماڵانە لەگەڵ خۆمدا، دواجار کاک شەماڵم بردەوە بۆماڵی پوری دادە پەخشان، پەخشان خان ژنێکی بەڕێز و هاوسەری شەهید عومەر تاڵەبانییە، عومەر تاڵەبانی یەکێک بووە لەبەرپرسەکانی هێزی پێشمەرگە لەشۆڕشی ئەیلولدا شەهید بووە دووکوڕی بەناوەکانی کاک شاهۆ و کاک سمکۆ بەمنداڵی لەپاش بەجێماوە، پەخشان خان بەرێکوپێکی و بەجوانی پەروەردەی کردن و پێی گەیاندن.

هەر ئەمشەو دوای ئیشوکارەکانم سەردانی مامۆستا جەماڵی حاجی محەمەدم کرد بۆ بەخێر هاتنەوەی لەوڵاتی هۆڵنداوە.

ئەمڕۆ پێنج شەممە ١٩٩٩/٤/١٥ کەش و هەوا ساف و هەتاوێکی گەرمی هەیە، لەشاری هەڵەبجە سەردانی رابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامی مامۆستا عەلی عەبدولعەزیزم کرد، بۆ بەخێرهاتنەوەی لەسەفەری حەجدا. مامۆستا بڕێک باسی سەفەرەکەی کرد و میوانیشی هەبوو زووزوو قسەکانیان پێ ئەبڕی، من ئەمویست زوو هەستم، نەیهێشت هەواڵی مام جەلالی پرسی و بەدیار خەڵکەکەوە زۆر مەدح و باسی چاکەو وەفای مامی کرد. تەزبیحی بەدیاری دامێ لەگەڵ قەڵەمێکی جواندا، ووتی ئەمە جوانە و جوانیش ئەنوسێ بۆتۆ باشە، چوونکە خۆشت جوان ئەنوسی. منیش سوپاسم کردو خواحافیزیم لێکرد، ووتم با قەرەباڵغی و میوانت کەم ببنەوە لەکاتێکی تری گونجاودا سەردانت دەکەم و هەندێک قسەی تایبەت دەکەین.

گەڕامەوە بارەگای مەڵبەند بۆ گەڕەکی شارەوانی، دوای ئەنجام دانی ئیشوکاری ئاسایی لەگەڵ چەند هەڤاڵێکدا چووم بۆشاری سلێمانی کاتژمێر ٢:٣٠ خولەک گەیشتینە مزگەوتی قەزازەکان لە گەڕەکی ئەسحابە سپی، خەڵکێکی زۆری هەورامی و خزمانی ماڵی کاک حەمە رەزای حاجی باباڵە و کوڕەکانی، لەلایەک و لاکەی تریش خزمانی جاف بوون لەگەڵ ریش سپیەکانیان، کوڕانی مام کوێخا سمایلی تەلان کاک مەحمود، لەگەڵ کاک مەلا رەسوڵی پێشنمازدا بەنوێنەرایەتی خزمانی جاف ئامادە بوون، دوای ووتاری مامۆستای ئاینی، ئەو خزمانەی جاف داوایان کرد خزمانی هەورامی داوایان چیە ئامادەین بۆ جێبەجێ کردنی، کوڕو براکانی کاک حەمەرەزایش بەخشینیان راگەیاند و کۆتایی بەکێشەکە هات.

ئەمڕۆ هەینی١٩٩٩/٤/١٦ لەشاری سلێمانی بووم، ئاسمان ساماڵە، بڕیارە سبەینێ مام جەلال سەفەر بکات بۆدەرەوەی وولات، مەڵبەندی کەرکوک و گەرمیان جیا ئەکرێنەوە و هەڵبژاردنیان بەجیا بۆ دەکرێت، بەلام هەڵبژاردنیان دوا دەخرێت بۆ دوای گەڕانەوەی مام جەلال. ئێوارە میوانی کاک حەمەحسێنی حاجی فەرەجی تەوێڵەیی بووم لەماڵەوە، کاک حەمەحسێن دۆستمەو پیاوێکی بەڕێزە، تا سەعات ١٠ی شەو لەلای مامەوە. ئاگاداریان کردم ساروخ دانراوە بۆ بارەگای کەرتی رێکخستنی یەکێتی لە شارۆچکەی سیروان، بەلام بێزیان بووە، هەرئەمشەو دوای تەقینی ساروخەکە بەرپرسی مەڵبەندی یەکی بزووتنەوەی ئیسلامی بەهاڤالانی ئێمەی لەمەڵبەند راگەیاندوە پێمان ناخۆش بووەو ئەو جۆرە کارانە نەیاری هەردوولامانە ئەنجامی دەدات بۆ نەهێشتنی متمانەی نێوانمان.

بێبارانی ئەمساڵ ترسی خستوەتە دڵی خەڵک بەتایبەت باخەوان و جووتیارەکانی کوردستان، ئەوانەی بەساڵا چوو و بەتەمەنن، دەڵێن بیرمان نایەت وشکە ساڵی و بێبارانی وا.

سەدام و حزبی بەعس و سوپا داگیرکەرەکەیان لەوکاتەوە دەستەلاتیان گرتوەتە دەست، تابەهاری ساڵی ١٩٩١،قۆناغ بە قۆناغ هەر قۆناغەو بە بیانویەک، بەردەوام خەریکی وێران کردنی کوردستان بوون، لەوانە راگواستنی گوندەکانی سەر سنوورلەساڵی ١٩٧٨ بەدواوە، دوای راگواستن و کۆکردنەوەی خەڵک لەئوردوگای زۆرەملێدا، ئینجا قەدەغەکردنی هاتوچۆ بۆ سەر باخ و مەزراوکێڵگەکان، ئینجا وشک کردنی هەموو باخ وباخات و مەزراکان، ئەمە بەناوی راگواستنی نەواری مەرزی( شریتی حدودی) و جێبەجێکردنی بەندێکی رێکەوتن نامەی شومی جەزائیرەوە، ئیتر لەوکاتە بەدواوە وێران کردنەکان بەردەوام بوون.

هەنگاوێکی تریان بەبیانوی، شەڕی پێشمەرگەو سوپاوە، ئەوەوەندەیتر کوردستانیان چۆڵ و وێران کرد. قۆناغ و هەنگاوێکی تریان، بەهۆی شەڕی عێراق ئێرانەوە بوو. تادواجار بەهۆی کیمیاباران و ئەنفالەوە لەکوردستاندا تەنها شارە گەورەکان مابوونەوە.

ئەوە بوو لەدوای راپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١وە بەشێکی زۆری کوردستان ئازاد کرا، جووتیاران و باخدارەکان و گوندنشینانی کوردستان،

سەرلەنوێ دەستیان کردەوە، بەئاوەدان کردنەوەو باخداری و ژیاندنەوەی مەزراو کێڵگەکانیان. ئەوە بۆ ماوەی ٩ نۆ ساڵە بەردەوام و بەهیمەتی خۆیان وولات ئاوەدان دەکەنەوە باخ و باخات و کێڵگەو مەزراکان زیندو دەکەنەوە، بەتایبەت ناوچەی هەورامان کە زێدی ئێمەیە، لەگەڵ ناوچە شاخاوی و کوێستانییەکانی کوردستان، لەهەموو ناوچەکانی تر زیاتر زەرەرمەند بوون، پێشینەی باخداری وەک سەرچاوەی گوزەران و ژیانیان دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ لەمەو بەر، ئەو سەرچاوە، حزبی بەعس بەتەواوەتی وشکی کرد، لەماوەی ١١یانزە ساڵدا. کێڵگەو مەزراکانی دەشت و گەرمە سێر لەبەر ئەوە پشتیان بەچاندنی دانەوێڵە بەستوە، زۆر زەرەر مەندنابن، هەرکات باران بوو گاسنیان دالەزەوی، بەرهەمی ئەو ساڵە مسۆگەرە.

بەڵام هەورامان و ناوچە شاخاویەکان لەبەر ئەوە باخداری دەکەن، باخیش بەتایبەت گوێزو هەندێک داریتر دوای دەیان ساڵ دێنەوە بەرهەم، کە وشک بوو تەمەنێکیتر نایەنەوە بەرهەم، بۆیە ئێستا هەورامییەکان لەهەموو کەس زیاتر نیگەران و خەمباری بێبارانی و وشکەساڵین. ئەترسن رەنج و هیمەتی ژیانەوە و ئاوەدان کردنەوەی ئەم ٩ نۆ ساڵەشیان، لەدەست بچێت، ئەمجارە بەهۆی کارەساتی سروشتی وشکە ساڵیەوە.

ئەمرۆشەممە١٩٩٩/٤/١٧ یەکەم رۆژی مانگی موحەڕەم پشووی فەرمیە، ئەنجومەنی نوێی مەڵبەند کۆبووینەوە لەبارەگای مەڵبەند لەهەڵەبجە، ئیشوکاری مەڵبەند دوبارە دابەش کرایەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

جێگری یەکەمی مەڵبەند / حەمەی حەمەسەعید، سەرپەرشتیاری بەشی راگەیاندن.

جێگری دووەم/ ئەحمەد قەدەفەری، بەرپرسی چاودێری و بەدوادا چوون.

فەتاح مەحمود کۆکۆیی/ بەرپرسی رێکخستن.

شلێر عیزەت غەفور/ بەرپرسی ئیدارە.

جەبار جەلال گولانی/ بەرپرسی پەیوەندیەکان .

فارس عەزیز/ بەرپرسی رێکخراوەکان .

وریا برا خاس هاواری / بەرپرسی کۆمیتەی رێکخستنی هەڵەبجە .

جووتیار مەجید پێنجوێنی / بەرپرسی کۆمیتەی رێکخستنی سەیدسادق .

م.عوسمان عەبدولا تەپە گولاوی / بەرپرسی کۆمیتەی رێکخستنی پێنجوێن .

مەحمودی حاجی سالح / بەرپرسی کۆمیتەی ڕێکخستنی تانجەرۆ .
محەمەد شارەزووری تەپی سەفایی / بەرپرسی کۆمیتەی ڕێکخستنی قەزای شارەزوور .

ئەمڕۆ مامۆستا جەمالی حاجی محەمەدیش هاتە مەڵبەند، لەئەورووپاوە گەڕاوەتەوە، دوای ئەوە سەردانی مەڵبەندی کرد پێکەوە سەدانی سەرقەبری حاجی محەمەدی بابیمان کرد، دواتر لەمزگەوتی دارولئیحسان بەشداری ڕێورەسمی پرسەی کوڕێکمان کرد بەناوی نەجم نارنجۆکی پێدا تەقیبووەوە.

ئەمڕۆ یەکشەممە ١٩٩٩/٤/١٨ لەبارەگای مەڵبەند پێشوازیم کرد لەخەڵکی ناوچەکە دەهاتن بۆ لامان بەمەبەستی پیرۆزبایی کردن، بەبۆنەی هەڵبژاردنەوەی ئەنجومەنی نوێی مەڵبەندوە، بەتایبەت ئەندام و لایەنگر و دۆستانی یەکێتی بەدڵخۆشیەوە پیرۆزباییان لە شلێرخان و هەڤاڵەکانی ترم دەکرد

ئەمڕۆ دوو شەممە ١٩٩٩/٤/١٩ پێش نیوەڕۆ لەبارەگای مەڵبەند بەردەوام بووین لەپێشوازی میوانەکانماندا، دوای نیوەڕۆ پێشوازی هەڤال کاک کۆسرەتمان کرد، لەگەڵ وەفدێکی یەکێتیدا هاتنە هەڵەبجە بۆ لای مامۆستا مەلاعەلی عەبدولعەزیز، بۆ بەخێرهاتنەوەی لەسەفەری حەجدا، ئەندامانی وەفدەکە ئەم هەڤاڵانەبوون: کاک سالار عەزیز، کاک حاکم قادر، کاک شێخ جەعفەر، کاک ئەرسەلان بایز، مامۆستا جەمال عەزیز و مامۆستا جەمال حاجی محەمەد.

مامۆستا مەلا عەلی لەبارەگای مەکتەبی سیاسی بزووتنەوە پێشوازی کردین، دوای بەخێرهێنانەوەو خواردنەوەی شەربەت و چایی، دەست کرا بەقسەو باسی سیاسی و سەفەری مامۆستاو ئەو چاوپێکەوتن و دیدارانەی لەپەراوێزی سەفەرەکەیان دا کردویانە سەبارەت بە کورد و حکومەتی عێراق و بارودۆخی ناوچەکە.

ئەمڕۆ مامۆستا لەکاتی گفتوگۆکاندا دەرکەوت بێئاگایە لە دووشت، ئەوە بۆمن جێگەی سەرسوڕمان بوو، یەکەم هێشتا ئاگادار نەبوو (مێد تی ڤی) داخراوە، دووەم ئاگادار نەبوو حامد ئەلبەیاتی نوێنەری ئەنجومەنی باڵای ئیسلامیە لە لەندەن، ئەیوت خۆم بینیومە و لە سعودیەدا بووە و قسەم لەگەڵ کردوە، دوایی روون بووەوە، ئەوە ئەو بینیویەتی کەسێکی تر بووە.

برادەرانـی مەکتەبـی سیاسـی بـزووتنەوە پێیـان نـاخۆش بـوو، ویسـتیان پەردەپۆشی کەن و بۆمامۆستای روون بکەنەوە، بەڵام پێداگری مامۆستا لێی تێکدان.

دوای گەڕانەوە لەبارەگای بزووتنەوە هاتینەوە بۆ بارەگای مەڵبەندی رێکخستنی شارەزوور، ئەنجومەنی نوێی مەڵبەند پێشوازی هەڤالانیان کرد و ئەوانیش پیرۆزبایی ستافی نوێی مەڵبەند و بارەگای نوێی مەڵبەندیان کرد. رۆژی سـێ شـەممە٤/٢٠ کۆبـوووینەوە لەبارەگـای کـۆمیتەی تـانجەرۆ لەشارۆچکەی عەربەت بۆ تەشکیلاتی نوێی ستافی کۆمیتە، دوای ماوەیەک گفتوگۆو راگۆڕینەوە رێک نەکەووتین، بۆیە من نامەیەکم نارد بۆمەکتەب رێکخسـتن و خۆشم چوومە سلێمانی. رۆژی چوار شـەممە٤/٢١ مەکتەبی رێکخسـتن ئاگاداریـان کـردم بـۆ بەشـداری کۆبـوونەوەی مەکـتەب، دوای گەیشتنمان و بەشداری کردن، پاش قسەکردن و وەرگرتنی رای هەڤالانی ئەندام مەکتەب، لەسەر نامەکەی من، د. ئەرسەلان بایز بڕیاریدا تەشکیلاتی کۆمیتەکان دوابخرێ تا مام جەلال لەدەرەوە ئەگەڕێتەوە. مام ماوەی چەند رۆژێکە لەتارانی پێتەختی ئێرانە. دوای نیوەڕۆ بەشداریم کرد لە رێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی باوکی کاک مەلابەختیار، ئێوارە گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە.

ئەمڕۆ پێنج شەممە٤/٢٢ سەفەرێکمان بۆ خوێندکارانی سنووری بەری هەڵەبـجە رێکخسـتوە، بچـن بـۆ گەشـت و سـەیران بـۆ سـەیرانگای زێـوێی پیرەمەگرون، هەڤاڵ مامۆستا سەربەست کەریم سەرپەرشـتی سـەفرەکەیان دەکات، لە سنووری هەڵەبـجەدا سـەفەرو سـەیران کێشـەی لـێ ئەکەوێتەوە، چوونکە چەکدارانی بزووتنەوەی ئیسلامی لەسەیرانگاکاندا هەڵ ئەکوتنە سەر سەیران کەرەکان، لەسـەر هەڵپەرکێ و گۆرانی و مۆسیقا شادی و خۆشـی سەیران کەرەکان، عەزیەت دەکەن و لێیان تێک دەدەن و سزایان دەدەن. من تانیوەڕۆ لەبارەگای مەڵبەند بووم، دوای نیوەڕۆ لەگەڵ کاک عەزیزی حاجی ئەولە کاک بێستونی حەمەحسێندا چووین بـۆ زێـوێ بـۆلای خوێندکارەکان، هەرچەندە وشکەسـاڵیە و ئـاو کەمە هەوای ئەم هەفتەیە زۆر گەرمە، بەڵام زێوێ فێنکە و دار تازە چرۆی کردوە، دەربەنـی پشـتی کانیاوەکـانی زێـوێ پەڵەیەک بەفری سپی پێوە دیارە. خوێندکاران کۆمەڵ کۆمەڵ لەبندارگوێزو دار هەرمێکانـدا دانیشـتون و هەنـدێک سـەرگەرمی نـان دروسـت کردنن بۆ

ئێوارەیان و هەندێکیش خەریکی وێنەگرتن و برێکیش خۆکۆ و ئامادە دەکەن بۆ گەڕانەوە، ئێمەش سەردانی هەموویانمان کرد و هیوای سەفەری خۆشمان بۆ خواستن.

ئەمڕۆ شەممە ١٩٩/٤/٢٤ شارەزوور کەش و هەواییەکی گەرمی هەیە، سەرلەبەیانی لەسلێمانییەوە چوومە هەڵەبجە، تانیوەڕۆ ئیشوکاری ئاسایی مەڵبەند ئەوەی لەئەستۆی منە جێبەجێم کرد، نیوەڕۆ کاک هوشیاری کەریم بەگی ئەفراسیاو بەگ، هاتووە بەدوامدا بۆ ئەوەی بچمەماڵیان، میوانیان هەیە، میوانەکان لەکوردستانی رۆژهەلاتەوە هاتوون و حەزیان کردووە من ببینن، دوای نیوەڕۆ سەردانەکەم کرد، لەوێ ماڵی کاک ئەنوەری مستەوفی باوکی کاک ئارامی هاورێم و کۆمەڵێک لەخزمانیان ئامادە بوون، کاک ئەنوەر پیاوێکی بەڕێزو رۆشنبیر و نیشتیمان دۆستە، ئاوەڵزاوای کاک هوشیارە، کاتێک هێزە سیاسییەکانی کوردستانی باشوور، دوای رێکەوتنی عێراق و ئێران پاش هەشت ساڵ جەنگی سەخت، رێکەوتن لە١٩٨٨/٨/٨دا، ئێمە پاشەکشەمان کردو چووینە ئێران، تیپی ١١ی هەورامان لەناوچەی پاوەو دەوروبەریدا گیرساینەوە، ئەوکات کاک ئەنوەری مستەوفی و ئارامی کوڕی و بنەماڵەکەیانم ناسی و بووینە دۆست، بەتایبەت کاک ئەنوەر خۆی و ئارامی کوڕی ئەهلی خوێندنەوەو نوسین و شعرو ئەدەبیات بوون.

دواتر ئارام بووە کەسێکی هەڵکەوتوو لەو بوارەدا، رەوانبێژ لەخوێندنەوەی شیعردا، دەنگێکی بەسۆز و ناسراو، وەرگێڕێکی خاوەن رەوشی تایبەت و بەتوانا. دایکیشی کاڵێ خان کچی کاکە برزوی میتران بنەماڵەیەکی ناسراو کورد پەروەرو دژی رژێمی شاهەنشاهی و پشتیوانی شۆڕشی گەلانی ئێران بوون،

بەڵێ ئەمڕۆ دوای ئەوە بەدیداری ئەوان شاد بوومەوە، دواتر چووم بۆقەزای شارەزوور بۆ بەشداری لەرێوڕەسمی پرسەو فاتیحەی دادە مەلیعە هاوسەری حەمەئەمینی حەمەخاڵۆی تەوێڵەیی، ئەم خوالێخۆش بووە لەسەرەتای شۆڕشی نوێ و مەفرەزەکانی سەرەتادا خزمەتی زۆری کردووە و یەکێک بوو لەو ژنانەی کە حەقی بەسەرمانەوە هەیە، بەڵام بەداخەوە وەک سەدان ژنە خەباتگێڕی تری ئەم کوردستانە، ون و بێ ناونیشانن.

بەئەرکی خۆمم ئەزانی تاپرسەکەی تەواو ئەبێ بەشداربم، ئێوارە ماڵئاواییم لە کورەکانی کاک نازم و کاک کازم و ئەوانی تر کرد، ئەمانیش لەپێناو یەکێتی و کوردایەتیدا ماندون و خەڵکی سادە و ساکار و دڵسۆزی گەلوولاتن. ئێوارە چوومە شاری سلێمانی و سەردانی کاک کوردۆ قاسمم کرد.

ئەمرۆیەک شەممە ١٩٩٩/٤/٢٥ لەماڵەوەم رۆژی پشوودان و چاوەڕێی گەڕانەوەی مام جەلالین، کاک جەبار جەلال و کاک حەمە زیرنجۆیی سەردانیان کردم دوای ئەوان کاک ئەختیار عەزیزو هەڤالانی کۆمیتەی قەزای شارەزوور هاتنەلام و باسی کۆمەڵێک کێشەیان کرد، چارەسەیان بکەم بەدڵی ئەوان، بەڵێنم دانێ چارەسەری کێشەکانیان بکەم، بەلام نەک هەموو شت بەدڵی ئەوان.

ئەمرۆ دووشەممە١٩٩٩/٤/٢٦ لەگەڵ کاک جەمیل هەورامی سەردانی ئەنجومەنی کۆمیتەی هەڵەبجەمان کرد، لەسەر شێوەی کارکردن و خۆگونجاندن لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامیدا گفتوگۆمان کرد، دواتر سەردانی مامۆستا ئەحمەدی کاکە مەحمود ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزووتنەوەی ئیسلامیمان کرد و داوامان لێکرد هاوکارمان بێت بۆ پێکەوە ژیان و ئاشتی، بۆمان باسکرد مام جەلال مەبەستیەتی لەگەڵ بزووتنەوەدا کۆی کێشەکانمان بەئاشتی چارەسەربکەین، بەتایبەت لەگەڵ ماڵی مامۆستا مەلا عەلی و برادەرەکانیاندا. دواتر گەڕاینەوە بۆ بارەگای مەڵبەند و ئیشوکاری ئاسایی رۆژانەی خۆمان جێبەجێ کرد.

پاش نیوەرۆ چووین بۆ ئاوایی قەیەفەری سەردانی کاک مەحمود باوکی هەڤاڵ ئەحمەد قەیەفەریمان کرد، کاک مەحمود پیاوێکی لەش ولار رێک و پێک و چکۆلانەیە، لەم ساڵانەی دوایدا نابینا بووە. هۆکاری نابینا بوونەکەی بەم شێوە بووە: ساڵی ١٩٨٨ پێشمەرگەی سۆشیالیست بووە لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی، لەبارەگای کانی خەیارانی بناری چیای سورێن بەدیوی ئێران دا، ئێوارەیەک خەریکی دار ئامادەکردن بووە بۆ سۆپا، لەوکاتەدا پوازی ئاسن ئەکوتێتە ناو دارەکە، پوازەکە دەرئەپەڕێ و بەتوندی بەرناوچاوانی ئەکەوێ، هەر ئەمە بووەتە هۆی نابینابوونی هەمیشەیی، کاتێک

تەماشای روخساری ئەکەی هەست ناکەی نابینایە، هەردوو چاوی ساخ و ئاسایی دیارن، بەلام بەداخەوە نابینا بوون.

ئێوارەی ئەمرۆ هەڤالان کاک جووتیار مەجید و کاک فەرەجی حەمەسالح و کاک جەبار جەلال سەردانیان کردم و لەسەر ئیشوکاری مەلبەند و کۆمیتەکان قسە و باسمان کرد.

ئەمرۆ سێ شەممە ٤/٢٧ سەردانی پارێزگاری سلێمانی کاک سالار عەزیزم کرد، داوام لێکرد هەوڵی چارەسەری کێشەی کەم ئاوی ئاوی خواردنەوەی هەڵەبجە بدات، کاک سالار خۆی پێشمەرگەی سەرەتای شۆڕش و شارەزای خزمەت و ڕابردووی هەڵەبجەو هەورامان و شارەزوورە، پێی ووتم بەرلەوەی باسی چۆنییەتی چارەسەری کەم ئاوی ناوچەکەبکەین، با مژدەیەکت بدەمێ، ووتم فەرموو ووتی لەسەر داوای خۆتان دوو پرۆژەی ئاودێری دەرچوە یەکێکیان بەبڕی ٣٥٠٠٠٠ سێ سەدو پەنجا هەزار دیناری سویسری بۆ تەوێڵەو ئەویتر بە بڕی ٢٠٠٠٠٠ دووسەد هەزار دیناری سویسری بۆ ئاوایی سەرگەت هەرلەناوچەی هەورامان.

منیش دەست خۆشیم لێکرد و ئینجا پرسی چیبکەین بۆ ئاوی هەڵەبجە؟ ووتم بەگشتی شارەکە ئاوی کەمەو پێشتر سەرچاوەکانی ئاو چاڵی قوڵ (بیر) بوون، ئەوانە ئێستا وشک بوون یان کەمیان کردوە، ئاوی سەرچاوەی زەڵم ئەویش کەمی کردوە، دیارە پرۆژەی ستراتیژی بۆ دابین کردنی ئاو ئێستا فریای شارەکە ناکەوێ، پرۆژەی بەدەست و بردیش بۆ چارەسەری کاتی، ئەوە شارەزایانی ئەو بوارە ئەزانن چی دەکەن.

ووتم سەرەتا ئەبێ لە گەڕەکی شارەوانییەوە دەست پێبکرێت، چوونکە ئەو گەڕەکە هیچ ئاو تۆڕی دابەش کردنی نییە. خەڵکێکی زۆرو بێ دەرامەتیشی لێیە، بارەگای مەڵبەند و بارەگای سەرەکی هێزەکانی پێشمەرگەی ناوچەکەش لەوێن. کاک سالار هەرلەوێ پەیوەندی بەخاتو کافیە خانەوەکرد، باسی بابەتەکەی لەگەڵدا کرد و ئەویش بەڵێنیدا لە زوترین کاتدا دەست دەکەن بە جێبەجێ کردنی پرۆژەکانی دابین کردنی ئاوی خواردنەوەی شاری هەڵەبجە بە گەڕەکی شارەوانیشەوە، منیش سوپاسم کردن .

رۆژی چوار شەممە ٤/٢٨ لەبارەگای مەڵبەند سەرگەرمی ئیشوکاری ئاسایی بووم، رۆژانی ٢٩و٤/٣٠ منداڵەکانی ئێمەو کاک عەزیزی حاجی ئەولە، لەگەڵ کاک بێستونی حەمەحسێن و کاک بابای لالۆ ناجی چووین بۆ بناری چیای بەمۆ بۆ گەشت و سەیران و لەپەناشەوە راوە ماکەو. کاتێک بەلای بۆیسان سووردا تێپەر دەبووین، خاوەن مەرێک زانی منداڵەکانم پێیەو بۆ سەیرانیان ئەبەم بەرخێکی بەدیاری دامێ، ئەم دوو رۆژە لەسەر کانی کەڵ و کانی رەئیسان بووین لەپشت ئاوایی چوارداران، کاک جەلالی عەلی ئاغاو کاک حەمە چاوشین هاتن بۆلامان هەرچەندە میوانداریم کردن نەمانەوە، چوون بۆ سەر سنوور بۆ راوی مەرەسوور. لەم سەفەرەدا دڵم زۆر خەمبار بوو بۆ بێبارانی و کەمکردنی ئاوی کانیا و زەرد ووشک بوونی بێوادەی گژوگیاو گوڵوگوڵزاری لاپاڵ و نزارەکان، بۆ سوتان و وشک هەڵگەراوی سروشتی دەرو دەشت و ناوچەکە.

## مانگی ئایاری ساڵی ١٩٩٩

ئەمڕۆ شەممە ١٩٩٩/٥/١ ڕۆژی جیهانی کرێکاران، لەشاری سلێمانی بووم، نیوەڕۆ لەگەڵ کاک بابای لالۆ ناجی میوانی کاک بێستونی هاوڕێم بووین. ڕۆژی یەک شەممە ٥/٢ پێش نیوەڕۆ سەردانی بارەگای رادیۆی شارەزوورم کرد، دوای نیوەڕۆش لەبارەگای مەڵبەند، ئیشوکاری ئاسایی حزبیم جێبەجێ کرد و ئاگاداری هەڤالانی مەڵبەند و کۆمیتەکانم کرد بۆ ئەوەی بۆ بەیانی لەبارەگای مەڵبەند لە هەڵەبجە ئامادەبن، بۆ بەشداری کردن لەرێوڕەسمی دەست بەکاربوونی مامۆستا جەمالی حاجی محەمەد وەک بەرپرسی نوێی مەڵبەند، هەروەها بۆ خواحافیزی و دەست خۆشی و سوپاس و پێزانینی هەڤاڵ کاک جەمیل هەورامی.

ئەمڕۆ سێ شەممە٣/٥ لە بارەگای مەڵبەند بووین لە هەڵەبجەدا، لەرێوڕەسمێکدا بەئامادەبوونی هەڤالانی مەکتەبی ڕێکخستن و مەڵبەند و بەرپرسانی هێزی پێشمەرگە لەناوچەکەدا مامۆستا جەمال دەست بەکار بوو و کاک جەمیلیش خواحافیزی کرد.

ئەمڕۆ سێشەممە ١٩٩٩/٥/٤ لەبارەگای مەڵبەند ئیشوکاری ئاسایی خۆم جێبەجێ کرد و دوای نیوەڕۆش بەشداریم کرد لەرێوڕەسمی پرسە و ماتەمینییەک، لە ئاوایی حەسەن ئاوا و دوو پرسەش لەمزگەوتی دارولئیحسان لەناو شاری هەڵەبجەدا. لای ئێوارەش سەردانی ئاوایی هاوارم کرد لەگەڵ کاک عەزیزی حاجی ئەولە، کاک بێستون حەمەحسێن، کاک تەحسینی حەمە ڕەق ، هادی برام و کاک بابای لالۆناجی، شەویش لەوێ لە چۆمی دووئاواندا ماینەوە. ئێرە شوێنی خەباتی سەردەمی شاخە.

ئەمڕۆش چوار شەممە ١٩٩٩/٥/٥ لەهاوار سەردانی ماڵی باوک و دایکی شەهید جەواد، دادە نەزیرە و کاک شەوکەتی شوکرەم کرد، نزیکی نیوەڕۆش گەڕاینەوە بۆ مەڵبەند و بروسکەم کرد بۆ هەڤالانی کۆمیتەی ڕێکخستنی پێنجوێن بۆ ڕۆژی ٥/٦ ئامادەبن بۆ تەشکیلاتی کۆمیەی نوێ.

ئەمڕۆ پێنج شەممە ٥/٦ لەشارۆچکەی پێنجوێن بووین، ستافی نوێی کۆمیتەمان تەشکیل کردەوە. ئێوارەی ئەمڕۆ چووینە شاری سلێمانی.

نوێنەرانی هەڵ بژێردراوی لقەکانی خوێندکاران لەشارو شارۆچکەکانی ترەوە هاتون بۆ هەڵبژاردنەوەی ستافی نوێی سکرتێرو ئەندامانی سکرتاریەتی کۆمەڵە. لەهۆڵی رۆشنبیری سلێمانی کۆنفرانسیان بەست، ئەنجامی تەشکیلاتی نوێیان بەم جۆرەیە:

١/ سکرتێر - هەڤاڵ خەلیل عوسمان هەولێر، بە٢١ دەنگی بێ رکابەر.

٢/ جێگری یەکەم– هەڤاڵ عەدنان کاکەڕەش، جێگری دووەم هەڤاڵ ئامانج عەبدولا حاجی سەعید، دوو لاوی چالاک و شیرینن.

٣/ راگەیاندن – داهێن هاشم خەڵکی هەولێر.

٤/ رێکخستن – ئیسلام محەمەد سالح زاخۆیی کوڕێکی ووردو حیزبی باشە.

٥/ پەیوەندیەکان – سەردار فەقێ.

٦/ ئیدارە و مالییە- کچێک بوو بەناوی شادان ئەبوبەکر ئەحمەد خەڵکی سلێمانی.

٧/ بێگەرد دڵشاد تاڵەبانی خەڵکی گوندی کەلکان کچێکی وریاو جوان و هەلسوڕاوە.

٨/ بەدوادا چوون - ئومێد لەتیف کەرکوکی.

بەرپرسی لقی گەرمیان، سەلاح، بەرپرسی لقی سلێمانی، ڕێبین، بەرپرسی لقی هەولێر، نەوزاد، بەرپرسی لقی سۆران، دڵشاد، بەرپرسی لقی راپەڕین، ئەرسەلان، بەرپرسی لقی زانکۆ، کاروان، بەرپرسی لقی زانکۆی سەلاحەدین، بۆکان ناوێک بوو، بەرپرسی لقی شارەزووریش عەلی عوسمان کاندیدی ئێمە بوو، خەڵکی هەڵەبجەیە، بەئومێدی ئەوەی دوارۆژ کادرێکی باشی لێدەربچێت. کوڕێکی هەژارو باوکی لەخۆپیشاندانەکەی ١٩٨٧/٥/١٣دا شەهید کرا. بەرپرسی لقی پەیمانگاکان، خوماری ناوە، بەرپرسی لقی کەرکوکیش، ئومێدە. برێک تەداخولات و دەست تێوەردان هەبوو، هەوڵدرا، لەباتی کاروان بۆ زانکۆ زانا عەبدولا سەعید دابنرێت، بڕیارە ئەندامانی ئەنجومەن کە ٢١ بیست و یەک ئەندامن ببنە ئەندامی پلنیۆم.

ئەمڕۆ هەینی ٥/٧ لە سلێمانی بووین، تۆزو خۆڵ دەبارێت، هەوای گەرمە. ئەمڕۆ شەممە ١٩٩٩/٥/٨بەبۆنەی کۆنفرانسی کۆمەڵەی خوێندکارانەوە لەشار بووم، سەرلەبەیانی لەگەڵ کاک کوردۆ قاسم بەرپرسی مەڵبەندی پێشمەرگە، چووم بۆ سەربازگەی سەلام، هەواڵێکی ناخۆشیان دامێ، ووتیان

شەش بەش لەکتێبی وەرگێڕدراوی تەیموری لەنگ دوای پیت چینی سوتاوە لەناو کۆمپیۆتەرەکردا، ووتیان ئەگەر بۆمان چاک نەکرێتەوە، دەبێ سەر لە نوێ کۆمپیۆتەری کەینەوە، هەر ئەمڕۆ کۆنفرانسی مەڵبەندی ڕێکخستنی گەرمیان ئەنجام درا، ستافی نوێی ئەنجومەنی مەڵبەندی گەرمیان هەڵبژێردرانەوە، مام جەلال بەشداری کردو ووتاری هەبوو، دوای ووتارەکەی هاتەوە سەربازگەی سەلام و لەوێشەوە چووە ناو شار. هەر ئەمڕۆ بەشداریم کرد لە ڕێوڕەسمی پرسەی مامی کاک لەتیفی حاجی فەرەج و سەردانی کاک قادری حاجی عەلیشم کرد لەدەرەوە گەڕابووەوە.

ئەمڕۆ یەک شەممە ١٩٩٩/٥/٩، مەڵبەندی شارەزوور یەکەم کۆبوونەوەمان کرد لەگەڵ ستافی نوێی کۆمیتەی تانجەرۆدا، لەم کۆبوونەوەدا دەبوو دوو کارگێڕ بەهەڵبژاردن دیاری بکرێت بۆکۆمیتە، لەبەر ئەوە دووکەس خۆیان کاندید کردو کەسیتر رکابەریان نەبوو، هەردووکیان دانران و هەڵبژاردنیان بۆنەکرا. ئەوانیش، کەریمی حاجی عەبدلقادر و حەمە کۆمەڵە بوون، هیچ کامیان لەئاستی ئەو ئەرکەدا نەبوون، لەزۆربەی کۆمیتەکان بەهەمان شێوەبوو، لەوانیش باشتر دەست ناکەوێت.

هەر ئەمڕۆ و دوای تەشکیلاتی کۆمیتەی تانجەرۆ لەگەڵ ئەنجومەنی نوێی کۆمیتەی هەڵەبجەی تازە ( قەزای شارەزوور) کۆبووینەوە، لەکۆبوونەوەکەدا بۆ دوو کارگێڕی کۆمیتە سێ هەڤاڵ خۆیان پاڵاوت، ئەوانیش ئەختیار عەزیز و سەرکەوت سەرحەد و ئەنوەر رەشید گلالی بوون، ئەنجومەنی کۆمیتە بەدەنگ دانی نهێنی سەرکەوت سەرحەد و ئەختیار عەزیزی هەڵبژاردن.

ئەمڕۆ سێشەمە١٩٩٩/٥/١١ لەبارەگای مەڵبەند خەریکی ئیشوکاری ئاسایی مەڵبەند و لەپێشوازی میوانانی بۆ پیرۆزبایی لەستافی هەڵبژێردراوی مەڵبەند و بەرپرسی نوێی مەڵبەند مامۆستا جەمالی حاجی محەمەد داین، هەڤالانی هەردوو مەڵبەندی سلێمانی و ڕاپەڕین ئەمڕۆ سەردانیان کردین. مەکتەبی شەهیدان و کەم ئەندامانی یەکێتی ئاگاداریان کردم بەیانی سەردانیان بکەم، سەبارەت بەشارەزوور کۆببینەوە بۆچارەسەری کێشەو گرفتی مەکتەبەکەیان لەناوچەکەدا.

ئەمڕۆ چوار شەممە ٥/١٢ سەردانی مەکتەبی شەهیدان و کەم ئەندامانی یەکێتیم کرد لە سلێمانی، لەگەڵ هەڤالان بەرپرسی مەکتەب و ئەندامانی کۆبوومەوە، داوایان کرد هاوکاریان بکەم بۆ سەرلەنوێ پێدا چوونەوەی هەندێک فۆرم لەسنووری هەڵەبجەو شارەزوورو پێنجوێن دا. لەدوای کۆبوونەوەکە لە سلێمانی دەرچووم و لە شارۆچکەی عەربەت کۆبوومەوە لەگەڵ کۆمیتەی شەهیدان و کەم ئەندامانی شارەزوور، هەڤال کاک عومەری حاجی مەحمودی تەپەتۆڵەکە پێشمەرگەی دێرین و کەم ئەندام بەرپرسی کۆمیتەکەیە، پیاوێکی دڵسۆزو لەبنەماڵە تێکۆشەرەکانی شارەزوورو ناوچەکەیە. لەکۆبوونەوەکەدا بەرنامەمان دانا بۆ زیاتر پاک کردنەوەو بژارکردنی تۆمارەکانی شەهیدان و کەم ئەندامان. هەر ئەمڕۆ و دوای ئەم کۆبوونەوەیە گەڕامەوە بۆ بارەگای مەڵبەند لە شاری هەڵەبجە، چوونکە ئاگاداریان کردم میوانی زۆرمان هەیە. لەکاتی رایی کردنی میوانەکاندا ئاگاداریان کردم جەنابی مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز رابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامی وەفاتی کردووە لەشاری هەولێر، دەست بەجێ بەبروسکە ئاگادری مەکتەبی سیاسی و جەنابی مام جەلالم کرد کە مامۆستا کۆچی دوایی کردوە.

هەر ئەمڕۆ کاتژمێر ٣ سێی پاش نیوەڕۆ چووم بۆ ئاوایی جەلیلە لەبنار چیای ئەشکەدۆڵ و بەردەرەشان، بەشداریم کرد لەرێوڕەسمی پرسەی کاک حەمەسەعید جەلیلەیی، کاک حەمەسەعید پیاوێکی تێکۆشەری دێرین و دۆستی یەکێتییە، بەداخەوە بەنەخۆشی (ڕەبۆ) تەنگە نەفەسی گیانی لەدەست داوە، دوای تەواو بوونی رێوڕەسمی پرسەی ناوبراو، گەڕامەوە بۆ بارەگای مەڵبەند، ئاگادار کرام بزووتنەوەی ئیسلامی ئەیەوێت سەبارەت بە گرتنی کۆڕی پرسەو ماتەمینی بۆ مامۆستا مەلا عوسمان، کۆبوونەوەیەک لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی ناوچەکە گرێ بدات، کاک وریایی براخاس بەنوێنەرایەتی ئێمەو مەڵبەندی یەکێتی بەشداری کۆبوونەوەکەی کرد.

بۆ ئێوارە کاتێکی کەم ماوە، نامەوێت هیچ کات لەدەس بدەم، بۆیە ئەمڕۆ بۆ دواجار سەردانی دووماڵی ماندوی یەکێتیم کرد، لەگەڕەکی کانی قولکە، ئەو دوو ماڵەش، ماڵی پێشمەرگەی دێرین کاک ئازادی حاجی عومەری عەنەبی و منداڵەکانی بوو، لەگەڵ سەردانی ماڵ و منداڵی کاک نوری حاجی

ئەولەی نەسەی سۆسەکانەیی، دوای بەسەرکردنەوەی ئەم دومالە، هەوا تاریکی کرد و پاسەوانەکانمان ناردەوە بۆ مەڵبەند و لەگەڵ کاک حەمە هاواری پێشمەرگەی دێرین و دانەبڕاوی ساڵی ١٩٧٦ و کاک شێخ ئەنوەری شێخ فەرەجی عەبابەیلێی تێکۆشەری دێرین، خۆمان کرد بەماڵی کاک بەهمەن حەمەرەشید سۆسەکانەییدا، لای ئەو میوانین بۆنانی ئێوارە و هەرلەوێش ئەخەوین.

ئەمڕۆ شەممە ١٩٩٩/٥/١٣ لەبارەگای مەڵبەند سەرگەرمی ئیشوکاری ئاسایی حیزبیم، ساڵیادی رۆژی ١٩٨٧/٥/١٣ تە، لەم رۆژەدا و لەساڵی ١٩٨٧ دا خەڵکی هەڵەبجە راپەڕین و روو بەرووی بەعسییەکان بوونەوە، بەدژی کۆچ پێکردن و روخانی ئاواییەکانی دەشتی شارەزوور، ئەم راپەڕینە گەورەو کاریگەر بوو، بۆیە سوپا و هێزە ئەمنییەکان بەتوندترین شێوە رووبەرووی خەڵک بوونەوە و نزیکەی ١٠٠ سەد هاوولاتییان لە هەڵەبجە و خورماڵ و سەیدسادق دا شەهید کرد، سەدانیشیان بریندار کرد. بەهەزاران خەڵکیش هەڵهاتن و رویان لەولاتی ئێران کرد، چەندین گەڕەکیشیان لەگەڵ خاکدا تەخت کرد لەوانە کانی عاشقانی هەڵەبجە. وردەکاری ئەم راپەڕینەو زانیاری زیاتر، لەبەرگی یەکی دەنگی خاکدا بلاو کراوەتەوە. بەبابەتێکی سەربەخۆ.

ئەمڕۆ هەینی ١٩٩٩/٥/١٤ رۆژێکی گەرم و تۆزاوی و خۆڵ بارین دەستی پێکردوە، بریارە تەرمی مامۆستا مەلا عوسمان بهێنەوە بۆ هەڵەبجە، من بەیانی زوو لەسلێمانییەوە هاتمە هەڵەبجە، خەڵکی ئاواییەکان و شارو شارۆچکەکانی نزیک جادە هاتونەتە سەر رێگا بۆ پێشوازی و رێزگرتن لەتەرمی مامۆستا.

گەیشتمە هەڵەبجەو لەگەڵ هەڤالانی مەڵبەندا، چووین بۆ گولانی خوارو بۆسەر قەبران، جەنازەکە لەنێو ئاپۆرەی خەڵکداو بەبەشداری هەزاران کەس گەیشتەوە، لەرێوەرەسمێکی قەرەباڵغ و لەنێو ئاپۆرای جەماوەرو بەبەشداری نوێنەرانی لایەنە سیاسییەکانی کوردستان و کۆماری ئیسلامی بەخاک سپێردرا، نوێنەرانی یەکێتی نیشتیمانی جگە لەئێمە و فەرماندەکانی پێشمەرگە، هەڤالانی مەکتەبی سیاسیش لەوانە کاک کۆسرەت رەسول، کاک عومەر عەبدولا ، کاک عومەر فەتاح و کاک عومەری سەید عەلیش بەشداربوون.

ئەمڕۆ شەممە ١٩٩٩/٥/١٥ سەرلەبەیانی چووم بۆ سەربازگەی سەلام، سەردانی بەشی ڕاگەیاندنی مەڵبەندی پێشمەرگەم کرد، لەکۆمپیوتەر ئاگاداریان کردین ئەو شەش بەشەی کتێبی بیرەوەریەکانی تەیمور، کە وون بووبوو هێناویانەتەوە، بەمە زۆر دڵخۆش بووم، بۆ دڵنیا بوون و بەراورد کردن دەقە فارسیەکەم نارد بۆ چنارخان، چنار کارمەندی بەشی کۆمپیوتەرو پیتچنینە. ژنێکی وریاو زیرەکە. نیوەڕۆ گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە، پورە مایجەمین پاڵانەی دایکی کاکە حەمەو کاک یادگاری مامە قادر مردوە، چووم بۆ بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەکەی. مام جەلال بەبروسکە وەڵامی بووسکەکەی داومەتەوە، دەڵێت بەیانی دێین بۆ هەڵەبجە، بۆ بەشداری کردن لەڕێوڕەسمی پرسەکەی مامۆستادا. منیش ئاگاداری کاک جەلال کوڵکنی و کاک عەزیز کوڵکنیم کرد، کەبەیانی مام جەلال دێت بۆ هەڵەبجە، ئەوانیش پاسەوانی ڕێگاو بان و ناوچەکەیان گرتە ئەستۆ. هەروەها بەرپرسی کۆمیتەکانی تانجەرۆ و سەیدسادق و هەڵەبجەم ئاگادار کرد، لەگەڵ هەڤاڵانی مەڵبەند، سەبارەت بە هاتنی مام جەلال بۆ هەڵەبجە.

ئەمرۆ یەک شەممە ١٩٩٩/٥/١٦ کاتژمێر ٩ نۆی سەرلەبەیانی مام جەلال و کۆمەڵێک لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکرداتیەتی، لەگەڵ چەندین فەرماندەی هێزی پێشمەرگە، گەیشتە هەڵەبجە ئێمەش لەمەڵبەندەوە چووینە کۆڕی پرسەکە، دوای بەشداری مام جەلال و هەڤاڵەکانی گەڕانەوە بارەگای مەڵبەندو سەردانی کردین، دوای پشوویەکی کورت و چا خواردنەوەیەک، ماڵئاوایی کردو لەگەڵ هەڤاڵەکانی گەڕانەوە بۆ سلێمانی. ئەم ماوە بارەگای مەڵبەند زۆر قەرەباڵغە، ئەو کەسانەی دێن بۆ بەشداری پرسەکەی مامۆستا زۆریان سەردانی ئێمەش دەکەن .

ئەمڕۆ دووشەممە ١٩٩٩/٥/١٧ لەهەڵەبجەین، گۆڕێکی بەکۆمەڵ لەسەربازگەیەکی کۆنی سوپای عێراقدا هەڵئەدرێتەوە لەئاوایی شانەدەری سەربە ناحیەی سەیدسادق، ئەو شەهیدانەی ناو ئەمگۆڕە بەکۆمەڵە، گیراو و بێ سەروشوێن کراوەکانی، شارۆچکەی خورماڵن کەلە سێڕیانی زەڵم دا گیرابوون لەگەڵ گیراوەکانی ناو شارۆچکەی سەیدسادق، کە لەڕۆژی ١٩٨٧/٥/١٣دا لەئەنجامی ڕاپەڕینەکەدا گیرابوون. بۆ ئەو مەبەستە داوای نوێنەری مەڵبەندی شارەزووری یەکێتیان کردووە بۆ ئامادەبوون لەکاتی

هەڵ دانەوەی گۆڕەکەدا، هەڤاڵان کاک ئەحمەد قەیەفەری و کاک جەبار جەلال گولانی بەشدار بوون.

ڕۆژانی ١٨و١٩ /٥ بەهۆی ئەوەوە کەمێک تەندروستیم باش نەبوو لەماڵەوە بووم، بەلام ڕۆژی پێنج شەممە ٥/٢٠ ، ئەو ئیشوکارانەی لەجێبەجێکردنیدا دوا کەوتبووم قەرەبووم کردنەوە. لەوانە سەردانی ماڵی کاک تەوفیقی سەیدشەریفی هەجیجی بەبۆنەی کۆچی دوایی باوکیەوە، دواتر سەردانی بەشی کۆمپیوتەری مەڵبەندی پێشمەرگە لەسەربازگەی سەلام، سەردانی شاری کۆیە بۆلای کاک سەروان شاهۆی پاوەیی بەبۆنەی کۆچی دوایی خزمێکیەوە لە کوردستانی ڕۆژهەلات، سەر لەبەیانی هەینی ٥/٢١ گەڕامەوە بۆ سلێمانی.

ئەمڕۆ شەممە ١٩٩٩/٥/٢٢ لەمەڵبەندی پێشمەرگە خەریکی ڕێکخستن و ریزبەندی بابەت و پێرستی کتێبی بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگ بووم، دوا نیوەڕۆش لەبارەگای مەکتەبی شەهیدان، بەشداری کۆبوونەوەیەک بووم لەگەڵ ئەم هەڤالانە: کاک سێخ جەعفەر شێخ مستەفا، کاک عوسمانی حاجی مەحمود، کاک بەکری حاجی سەفەر، کاک جەلال جەوهەر، کاک شەوکەتی حاجی موشیر وکاک سەعدون فەیلی بەرپرسی مەکتەب. مەبەست لەم کۆبوونەوە ریزبەندکردنی لیستی ناوی ئەو وارسی شەهیدانە بوو کە سێ شەهیدو بەرەو ژوریان هەیە، بڕیارە ئەو خێزانانە لەڕێوەڕەسمێکی تایبەتدا خەلات بکرێن. یەکێتی نیشتیمانی جگەلەوەی خاوەنی هەزاران شەهیدی سەنگەرو حیزبێکی خاوەن قوربانی بێشومارە، دەیان خێزانیش خاوەنی چەندین شەهیدن، خێزان هەیە خاوەنی ٨ هەشت شەهیدە، بەنمونە ساڵح سەعید بایز کەرکوکی، خۆی و ٧ حەوت کوڕی شەهیدن، ئەمەش ناوی کوڕە شەهیدەکانە، عادل، مەهدی، د- هادی، وەهاب، سەلاح، سەعدون و ڕەفیق.

ئێوارەی ئەمڕۆ و دوای کۆبوونەوەکەی مەکتەبی شەهیدان سەردانی کۆمەڵگای نەسرو شارۆچکەی زەڕایەنم کرد، لە نەسر بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی خوشکی هەڤاڵ ئاسۆ بەرپرسی کەرتی ڕێکخستنی نەسرم کردو لەزەڕایەن بەشداری پرسەی باوکی هەڤاڵ حەمەی عەلەمەنە، شەویش گەڕامەوە بۆ سلێمانی.

ئەمڕۆ یەک شەممە ١٩٩٩/٥/٢٣ سەرلەبەیانی تا ئێوارە لە مەڵبەندی پێشمەرگە لە بەشی کۆمپیوتەر خەریکی تەسمیم و گواستنەوەی کتێبەکەی تەیمور بووین بۆسەر دیسک. لێرەدا زانیم مامۆستا عوسمان هەورامی لەکاتی پێدا چوونەوەید زۆر برگەو وردەکاری ناو بابەتەکانی پەڕاندوە، زۆر نیگەران بووم ئەمشەو بەدڵگرانییەوە وەرگێڕانە دەست نوسەکەی خۆم بەراورد کردەوە لەگەڵ دەقە فارسیەکەدا و لەگەڵ پێدا چوونەوەکەی مامۆستادا، دووبارە دەسکاریم کردەوە، بێ ئەوەی هیچ لەمانا گشتیەکەی بگۆڕێت، ئەوە بووە سەبووری بۆم، بەلام هەندێک برگەو رستە پێویستی بە چاککردنەوە و دوبارە نوسینەوە هەیە. دووبارە نووسینمەوە.

ئەم شەو کوێستان محەمەدو پەروین حەسەن سەردانیان کردم، دوای ئەوان ئەختیار عەزیز و سەرتیپ سابیریش میوان بوون ، قسەو باسی ئەمشەو لەسەر هەڵبژاردن و رێکخستنی کۆمیتەکانی مەڵبەندی رێکخستنی شارەزوور بوو. ئەختیار مامۆستای دەستەو دەستەگەریە، ئەمشەو گوێم بۆگرت، بەلام بەقسەم نەکرد.

ئەمڕۆ دووشەممە ١٩٩٩/٥/٢٤ رۆژێکی گەرمە، خاڵە زۆرابم میوانمانە لەمەریوانەوە هاتووە لەگەڵ گوڵناری کچیدا. سەرلە بەیانی لەگەڵ کاک ئاگری بورهان قانع و چنارخاندا چووینە لای کۆمپیوتەری تیشک، دوای کردنەوەی فایلەکان لای کاک کاروان، لەگەڵ ئاگردا چووینەوە بۆ سەربازگەی سەلام بۆلای کۆمپیوتەری مەڵبەند، چنار هەموو بابەتەکانی بۆ راکێشاین و هێنامانەوە بۆ سلێمانی، ئەمشەو هەموو ئەورستەو پەرەگرافانەی مامۆستا پەراندبووی و بەلای خۆمەوە گرنگ بوون دوبارە دیاریمان کردنەوە، هەرئەمشەو لەگەڵ ئاگردا هەڵە بریشمان کردن و ئامادەمان کرد بۆ بەیانی ئاگر بیباتەوە بۆلای چنارخان.

ئەمڕۆ سێ شەممە ١٩٩٩/٥/٢٥ لەسلێمانییەوە لەگەڵ کاک بێستونی هاوڕێم و کاک عەزیزی حاجی ئەولە و کاک حەمەی عەبدوڵای حاجی نادردا و منداڵکانی خۆمان و خاڵمدا پێکەوەین، من لەهەڵەبجەو لەبارەگای مەڵبەند خەریکی جێبەجێ کردنی ئیشوکاری ئاسایی خۆم بووم، خاڵم و گوڵنار گەڕانەوە بۆ مەریوان.

ئەمڕۆ چوار شەممە ٩٩/٥/٢٦ لەدۆلبیانم، لەگەڵ هاوڕێکانم میوانی باوکم بووین، دوای ئەوە ئەم چەم و دۆڵەو هەورامان بەگشتی، بەهۆی کۆچ پێکردن و شەڕی ٨ هەشت ساڵەی عێراق و ئێرانەوە ئاواییەکان وێران و باخەکانیان وشک بوو بوون، ئێستا ئاوەدان کراوەنتەوە، چۆمی پالانیاو سۆسەکان و تەوێڵە دیمەنێکی سەرسەوزو زۆر جوانی هەیە.

نیوەڕۆ ڕان (ئاژەڵ) هاتەوە، عەلی ئەحمەد پالانەیی شوانە، باوکم چتیرە نێرێکی سپی مەرەزی سەربڕی بۆ میوانەکان، ڕۆژێکی خۆشە، ئێوارەش بابای لالۆ ناجی و خاڵە هۆمەرو ئقبالی برام لەتەوێڵەوە هاتن بۆلامان. بەم وشکەساڵی و بێبارانییە ئاوی چۆمی دەرەقازان زۆرە ئەوە بووەتە جێگەی ئومێدی باخەوانەکان، کەئەمساڵیش باخەکانیان وشک نەبن.

ئەمڕۆ پێنج شەممە٥/٢٧ لەدۆلبیان منالەکان مانەوە بەتەمان ئەمڕۆ (گزی و بارەکڵە بدەن[1])، من هاتمە تەوێڵە دایکیشم هات بۆسەرقەبران، لامان دایە ناو باخ و خانوەکەی گەڕیات لەدەروازەی شارەدێی تەوێڵەدا، ئەوە چەند ساڵە بەجێمان هێشتووە، بەهۆی شەڕی ناو خۆوە، ئێستا ماڵی هادی برام لێرەن، دارو درەختی میوە لەوانە گوێز، هەنجیر، سێو، هەنار گەورە بوون و پێگەیشتون، لەم باخچەی دەوری ماڵەکەدا.

ئەمڕۆ هەینی ٥/٢٨ لەسلێمانی بووم، کاک ئیحسان برای شەهید نەریمان لە هەڵەبجەی تازەوە بەدیاری جوتێک گیوەی (کلاش) بۆ ناردبووم و منیش بە نێردراوەکەیدا سوپاسم کرد، لەبەر ئەوە لەدڵەوە پێم خۆش نەبوو کوڕێکی گەنج بنەماڵە شەهیدی کەم دەرامەت دیاری بۆمن بنێرێ، بەلام عورف نییە دیاری ڕەد بکرێتەوە، ئەگینا ئەمناردەوە. بەلام بەوم ووت سوپاسی تۆ دەکەم، دەستی کاک ئیحسان خۆش بێت، ئیحسان کوڕی کاک

---

[1] – گزی و بارەکڵە ئەم دوو ووشە واتە گسک دان و بارەکڵە کێشان، بۆ پاک کردنەوەی باخە توەکانە لەهەورمان، بەر لەوەی تو پێبگات، بۆ ئەوەی دوایی بە ئاسانی توەکە کۆبکرێتەوە.

وشەی گزی واتا گسک، بارەکڵە ناوی ئەو ئالەتەیە کە لەپارچە تەختەیەک دروست ئەکرێ دەسکی هەیە، ئەو ژنە یان ئەو کەسەی گسک ئەدا پوشو پەلاش و بەردو خۆڵی زیادەی بن توەکان کۆدەکاتەوە، ئەوکەسەش بارەکڵە کێشە کۆمای خۆڵ و پوش و پەلاشەکە ڕائەکێشێ و ئیشی گسک دەرەکە ئاسان ئەکات.

ئیدریسی حاجی عەبدوڵای تەویڵەییە، باوکی لەشۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگەو لەسەر بێتەلی هێزی خەبات بووە، لەشۆڕشی نوێ کوڕێکی بەناوی کاک نەریمان بووە پێشمەرگە لەکەرتی دووی هەرێمی یەک، ئەوکات من بەرپرسی ئەو کەرتە بووم، نەریمان پێشمەرگەیەکی نموونەیی بوو، لەدڵسۆزی، ئازایەتی، گوێڕایەڵی، بۆیە لای من بووبووە جێگەی متمانە، ساڵی ١٩٨٥ بەدواوە گوازرایەوە بۆ ناوچەی گەرمیان لە سنووری تیپەکانی ٥١ و ٥٣ دا لەبەشی کۆمەڵایەتیی لەگەڵ کاک شەوکەتی حاجی حەمەساڵح دا ئیشی دەکرد، بەداخەوە ساڵی ١٩٨٨ لە ئاوایی سێوسێنانی ناوچەی قەرەداغ دا نەریمان شەهید بوو، بەهۆی کیمیا باران کردنی گوندەکەوە.

هەر ئەمڕۆ لەگەڵ خاتوو شلێر غەفورو کاک جەبار جەلالدا سەردانی کاک کوردۆ قاسممان کرد، دوای ماوەیەک قسەو باس لەسەر بارودۆخی یەکێتی بەگشتی و مەڵبەندی شارەزوور بەتایبەتی، جیاوازی لەڕاو بۆ چوونەکانمان دا هەبوو، رای شلێرخان و کاک جەبار لەگەڵ بۆ چوونەکانی کاک کوردۆدا نزیک و یەکانگیر بوون، من ئەمزانی لەبەر ئەوە ستافەکەی ئەوان وەبەتایبەت کاک جەبارو کاک عومەری سەید عەلی و کاک ئەرسەلان بایز بەتەواوەتی پشتگیری من دەکەن، نابێ بەئاشکرا بەدژیان بووەستمەوە، ئەگینا هەندی بیر بۆچوونیان هەبوو بەتەواوەتی دژی بووم، بەلام لەدڵەوە بەئاشکرا دەرمنەدەبڕی، ئەوانیش ئەوەیان دەزانی. بۆیە بۆ هەندێک بابەتی دەستەو دەستەگەری لەکۆبوونەوە تایبەتەکانیان دا ئەو کاتەی جێگرمەڵبەند بووم و دواتریش بەرپرسی مەڵبەند بووم منیان ئاگادار نەدەکرد لەسنووری مەڵبەندەکەدا، کاک جەبار جەلال یان کەسێکی تریان بانگ دەکردە بۆ کۆبوونەوە تایبەتەکانی بالایان.

من لەبەر ئەوە مام جەلال پشتی ئەگرتم زۆر باکم نەبوو بەدەستەو دەستەگەری. شەوەکەی لەگەڵ مامۆستا فەتاح کۆکۆیی و کاک جەبار‌دا چووین بۆ ماڵی مامۆستا جەمالی حاجی محەمەد. لەسەر ئەو بابەتانەی لەگەڵ کوردۆدا قسەمان کردبوو، ئەمشەو بۆماوەی سێ کاتژمێر کۆبووینەوە، بابەتەکانیش چۆنییەتی گەشەکردن و بۆ پێشەوە چوونی مەلبەند، ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی دوای هەڵبژاردنی ئۆرگانەکان، کاڵ کردنەوەی گرژی و گەڕانەوەی بارودۆخەکە بۆ حاڵەتی پێش هەڵبژاردن، رێگری کردن لە دەستەو

دەستەگەری و لیست و لیست کاری، لەسەر گرتنی کۆنگرە یان پلنیۆم، بۆ هەر بابەتێک هەرلایەک بۆخۆی چۆن بەباشی بزانێ و بەرژەوەندی لەچیدا بێت ئاوا قسە دەکات، من لەسەر هەموو شتەکان رای تایبەتی خۆم هەیەو ئەم بارودۆخەی ئێستا لەبەرژەوەندی یەکێتی دا نابینم و بەستنی کۆنگرە یان پلنیۆمیش سەرکەوتوونابێت و هیچ لەبارودۆخی خرابی یەکێتی ناگۆڕێت.

ئەمڕۆ شەممە ١٩٩٩/٥/٢٩، لەهەڵەبجە لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی کۆبوونەوەمـــان هەیە، ئەم کۆبـــوونەوە لەســـەر داوای ئـــێمە ئەکرێـــت، کۆبوونەوەکە لەبارەگای مەڵبەندی ١یەکی بزووتنەوە بەسترا، بەشدار بوانی کۆبوونەوەکە وەزارەتی ناوخۆ، مەڵبەندی یەک و دووی بزووتنەوە، مەڵبەندی رێکخستنی شارەزووری یەکێتی، فەرمانداری هەڵەبجەو مەکتەبی عەسکەری بزووتنەوەی ئیسلامی بوون.

نوێنەرانی مەڵبەندی شارەزوور لەم کۆبوونەوەدا، مامۆستا جەمال، خۆم (حەمەی حەمەسەعید)، ئەحمەد قەیەفەری، وریای براخاس و جەبار جەلال بوون. وەزارەتی ناوخۆ بریکاری وەزیر جەمالی ئەشرەف قارەمانی ئامادە بوو. قسەو باسەکانی ئەم کۆبوونەوە و داوای ئێمە ئەوە بوو، بڕگەو بەندەکانی رێکەوتن نامەی تارانی نێوان یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامی جێبەجێ بکرێن، نەک هەرچی لەبەرژەوەندی بزووتنەوەیە جێبەجێ بکرێت و ئەوەی لەبەرژەوەندی ئێمەیە دوابخرێت. بەتایبەتیش پێداگریمان کرد لەسەر جێبەجێ کردنی قانونی پارێزگاکان لەهەڵەبجەو لەو شوێنانەدا بزووتنەوە باڵادەستە، لەگەڵ گەڕاندنەوەی داهاتە گومرگیەکان بۆحکومەت و کۆتایهێنان بە چاو سورکردنەوەو هەڕەشەو گورەشە لەخەڵکی و وازهێنان لەگرتن و ڕاوەدونانی دۆست و لایەنگرانی لایەنە سیاسییەکانی تر لەناوچەکەدا.

بەڵێ ئەوانیش داواکاری و گلەیان هەبوو، سەرنج و تێبینی و داواکانی هەردوولا لەچوار چێوەی نوسراوێکدا گلاڵەو ئامادە کران، بۆ کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسی هەردوولا، بڕیارە پێنج شەممەی داهاتوو ١٩٩٩/٦/٣ ئەو کۆبوونەوە بکرێت. هەر ئەمڕۆ و دوای کۆبوونەوەکە، من گەڕامەوە بۆ سلێمانی، سەردانی گوڵزارخانم کرد لە یەکێتی ژنان، دواتر لەگەڵ کوێستان خان و کاک عومەری سەید عەلی و کاک شەماڵ عەبدلوەفادا یەکترمان بینی و لەسەر بارودۆخی گشتی قسەمان کرد.

ئەمرۆ یەک شەممە ١٩٩٩/٥/٣٠، لەقەلا چوالان بۆنانی نیوەڕۆ میوانی مام جەلال بووین، کاتێک ئەچووین بۆ قەلاچوالان لە ڕێگە شتێکی سەرنج ڕاکێشمان بینی، بەم وشکەساڵی و کۆتایی وەرزی بەهارە، لەبناری ئەزمڕ لەیەکەم لۆفەدا قەراغ جادە قیرەکە تەڕبووبوو، تراکتۆرێک لەوێ لەکەنار جادەکەدا وەستابوو، چەند کەسێک بەدار خەریکی هەڵکەندنی تەراییەکە بوون، ئێمەش وەستاین و سەیرمان کرد، پرسیمان ئەوە چی دەکەن؟ ووتیان کانی تەقیوە.

ئەمرۆ دوو شەممە ٥/٣١ لەهەڵەبجە لەبارەگای مەڵبەندا کۆبوونەوەمان هەبوو، بۆ دابەش کردنی کادرەکان بەسەر بەشەکانی مەڵبەندا، دوای بگرەو بەردەو ڕازی بوون و نەبوونی هەندێک، بەم شێوەی خوارەوە دابەش کران.

بەشی ڕاگەیاندن و ڕووناکبیری، حەمەی حەمەسەعید سەپەرشتی دەکات. ڕاگەیاندن: مامۆستا ئەیوب ڕۆستەم بەرپرسیەتی، ئەم هەڤالانە ئەندامن، عومەر سەعید، ئاگر بورهان قانع و مامۆستا عابد، وێنەگران عەبدولڕەحمان (هەرێم) ئەمین و مامۆستا ئحسان لەگەڵ چەندین پەیامنێر، لەگەڵ ڕادیۆی شارەزوور، سەلاحەرەش و (٩) نۆ کارمەند.

ڕوناکبیری: مامۆستا عەلی حاجی فەرەج نەورۆلی بەرپرسیەتی، ئەم هەڤالانە ئەندامن، مامۆستا سادق ئەمین و مامۆستا جەمال جەبار .

هەر ئەمرۆ سەردانی تەوێڵەم کرد بۆ بەشداری لەڕێوڕەسمی پرسەی خوالێخۆش بوو شەوکەت محەمەد، دوای تەواو بوونی ڕێوەڕەسمەکە سەردانی ماڵی شەهید نیازیمان کرد، ئێوارەش گەڕامەوە.

ئەمرۆ سێ شەمە ١٩٩٩/٦/١، (٢٤) بیست و چوارەمین ساڵیادی ڕۆژی دامەزراندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە، خەباتی سیاسی یەکێتی ئەمرۆ پێ ئەنێتە ڕۆژی یەکەمی (٢٥) بیست و پێنجەمین ساڵەوە، خەباتی چەکداری و دروست بوونەوەی شۆڕشی نوێش پێ ئەنێتە ڕۆژی یەکەمی (٢٤) بیست و چوارەمین ساڵیەوە. بەم بۆنەوە ئەمرۆ لەقەلا چوالان کۆبووینەتەوە، کاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی مام جەلال ووتاری یادی دامەزراندنی یەکێتی پێشکەش کرد، نیوەڕۆش لای بەڕێزیان میوان بووین. دوانیوەڕۆ گەڕاینەوە بۆ سلێمانی، هاتینە ئەوشوێنەی پێشتر باسمان کرد ئاو

و تەرایی لێوە هاتووە، لامان دا کانییەکی جوان چاڵی بۆکرابوو پڕبوو لەئاو خەڵک دەم و چاویان لێ ئەشت و خۆیان فێنک دەکردەوە. بەڵام تەنها هەریەک هەفتە بەردەوام بوو دوایی وشکی کردەوە.

ئەمڕۆ چوارشەممە ١٩٩٩/٦/٢، سەرلەبەیانی *لەسلێمانی* بووم منداڵەکان لەدۆڵبیانن، لەگەڵ ماڵی باوکم خەریکی ئیشوکاری ناو باخن، کەش و هەوا گەرمە، کارەبانییە سەهۆڵ دەست ناکەوێ، مۆلیدەی بچوکی کارەبامان هەیە شکاوە لای وەستاییە، ئەم بارودۆخە بووەتە کێشەی ڕۆژانەی خەڵک. ئۆتۆمبێلەکەم لای وەستایە چاوەڕی دەکەم بیهێننەوە و بچمەوە بۆهەڵەبجە، کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ تەواو بوو، کاتژمێر دوو گەیشتمە بارەگای مەڵبەند، مەکتەبی شەهیدان سەردانیان کردبوو لەوێ بینیمن، دوای بەڕێکردنی ئەوان ئیشوکاری ئاسایی خۆم جێبەجێ کردو ئێوارە چووم بۆ دۆڵبیان، ئەم ئێوارە قەیسی و تووی تازەمان خوارد، شەو لەبەر چرای دەستیدا خەریکی خوێندنەوەی کتێبی بەسەرهاتی سیاسی کوردم لە ١٩٥٨/٧/١٤ تاساڵی ١٩٨٥ بە قەڵەمی خوالێخۆش بوو میرزا مەنگوری نووسراوە، ئێستا روخساری میرزا مەنگوری لەبەر چاومە پیاوێکی قەڵەوی جامانە بەسەری چاوکاڵی روخۆشی شیرین، لەنەورۆزی ساڵی ١٩٧٤دا لەناو مەیدانی شارۆچکەی تەوێڵەدا لەشانۆگەری کاوەی ئاسنگەردا دەوری کاوەی ئەبینی، ئێمە خوێندکارانی قوتابخانەی سەرەتایی هەورامانیان بردبووین بۆ تەماشای شانۆگەریەکە، کچ و کوڕەکانی میرزا هاوپۆلمان بوون، پاکستان، کوردستان، بتوێن، شێرکۆ، لەبیرمە ئەیان ووت ئەم پیاوە لەسەر کتێبی (گەشتێک بۆ سەر ئەستێرەی مەریخ ) لەرانیەوە نەفی کراوە بۆ هەورامان.

ئەمڕۆ پێنج شەممە ١٩٩٩/٦/٣، لەهەڵەبجە لەبارەگای مەڵبەند بووم. دادگای تورکیا لەم هەفتەدا چەندین جار داگایی عەبدوڵا ئۆجەلان سەرۆکی دەستگیرکراوی پارتی کرێکارانی کوردستان دەکات، کوردەکان بەگشتی، بەبینینی ئۆجەلان بەوجۆرەو دانانی لەقەفەزی شوشەدا نیگەرانن، من بۆخۆم وادەزانم لەهەمووکەس زیاتر ئەودیمەنانە نیگەرانم دەکەن. ئەمڕۆ دوای بەڕێکردنی میوانەکانم و جێبەجێ کردنی ئیشوکاری ئاسایی ڕۆژانەی حزبی، ئێوارەکەی گەڕامەوە بۆ سلێمانی.

ئەمڕۆ شەممە ١٩٩٩/٦/٥ لەشارەزوور بووم، سەرلەبەیانی لەشارۆچکەی سەیدسادق بارەگای رادیۆی شارەزوورم بەسەرکردەوە، بەبۆنەی یادی چوارهەمین ساڵی دامەزراندنی رادیۆکەوە، پیرۆزباییم لەبەڕێوەبەر و کارمەندەکانی کرد، قسەم بۆکردن و لەرادیۆکەشەوە بەکورتی پەیامی خۆم بەوبۆنەوە بڵاو کردەوە. وەرزی پێگەشتنی ترۆزیە دێمی شارەزوورە، لەمبەرو لەوبەری جادەوە جووتیارەکان خەریکی کۆکردنەوەی بەرهەمەکەیانن و دەیگوازنەوە بۆبازارەکانی میوەو سەوەزە فرۆشی لەشاروشارۆچکەکانی دەورو بەردا. دوای گەڕانەوەم بۆ هەڵەبجە لەنزیک پردی زەڵمدا، هاووڵاتیەکی ناوچەکە دۆستی خۆمان بوو ئاگاداری کردم و وتی: بزووتنەوەی ئیسلامی هاتووچۆیەکی نائاساییان هەیە لەنێوان هەڵەبجە و خورماڵدا. دوای گەیشتنمان بۆ بارەگای مەڵبەند، دەستمان کرد بەجێبەجێ کردنی ئیشوکاری ئاسایی خۆمان. پاش نیوەڕۆش، بەشداریمان کرد لە رێوڕەسمی دووپرسەدا، یەکێکیان مزگەوتی دارول ئیحسان، پیاوێکی خەڵکی ئاوایی گەچێنەی ناوچەی هەورامان بوو، ئەویتریان مزگەوتی داروسەفا، رێوەڕەسمەکە لەداروسەفا پرسەی دوو هاووڵاتی خەڵکی ئاوایی (بۆیین) بوو، پیاوێک بەناوی مامە ساڵە باوکی تەهاو یاسین لەگەڵ دایکی کاک حەمەبرا. دواتر سەردانی ماڵی دادە عالیە دایکی شەهید کەیکاوسم کرد.

بۆیین ناوی ئاواییەکی کۆکۆیی نشینی سەر بەهەڵەبجەیە، دەکەوێتە رۆژهەڵاتی شاری هەڵەبجەوە، ئاوایی لەشوێنێکی سەخت و ناهەمواردا جێگەی گرتووە، بەردەمی ڕوباری سیروان و پشتیشی کێوە بەرزو بەناوبانگەکانی داڵەڕپی و شنروێیە، بەرلە ڕاگواستنی بۆ کۆمەڵگای زۆرە ملێ لەساڵی ١٩٧٩دا، نزیکەی ٥٠ پەنجا خێزان لەوێ نیشتەجێ بوون، بۆ بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەرانیان، خەریکی ئاژەڵ داری و دارفرۆشی و بنێشت کردن بوون، بۆساخ کردنەوەی بەرهەمە ئاژەڵی و دارو بنێشتەکەیان، بەباری قاتر دەبوو بۆتەوێڵە یان هەڵەبجە رۆژانە ٢٥ بیست و پێنج کیلۆمەتر بەپیادەڕەوی ڕێگا ببڕن.

خەڵکی ئاوایی خەڵکێکی سادە و ساکار و هێمن بوون، ئەو دەم زۆربەیان وەک هەموو ناوچە سەخت و دوورە دەستەکانی تری کوردستان نەخوێندەوار بوون، پیاوەکانیان زۆربەیان باڵا بەرزو چوارشانەو هەیکەل

قەوی بوون. زەحمەت کێش ترین خەڵک و ژنانیشیان هاوشانی پیاوەکان کاریان ئەکرد. لەهەردو شۆڕشی ئەیلول و نوێدا پێشمەرگەو فەرماندەی ئازاو دیارو بەرچاویان هەبووە، چەندین فەرماندە و پێشمەرگەی قارەمانیان لەبەرگری کورد و کوردستاندا شەهیدبوون.

لەسەرتای شۆڕشی نوێدا، بۆیین یەکێک بووە لەو ئاواییانەی کوردستان کەزۆرترین خزمەتیان کردووە.

ئەمرۆ یەک شەممە ١٩٩٩/٦/٦ سەرلەبەیانی کلێشەی کتێبی وەرگێڕدراوی بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگم برد بۆ کاک نەوشیروان مستەفا، پیشانم داو پێم ووت بەرلە چاپکردنی سەرنج و تێبینی خۆتم لەسەر ئەم کتێبە بدەرێ، لێی وەرگرتم و زۆری پێخۆش بوو، بردمی بۆتەماشای کتێبخانەکەی ووتی چ کتێبێکت بەدڵە بیبە، خۆی برێک گەڕاو دەستی برد دوکتێبی دەرهێناو پێی دام، یەکێکیان (کهنشینانی زاگروس)ئەویتر(قوم لر) ووتی ئەمانە بۆتۆ باشن، منیش وەرم گرتن و سوپاسم کرد، کوڕێکی بانگ کردو پێی ووت: هەرکات حەمە هات، من لێرە نەبووم دەرگای ئەم کتێبخانەی بۆبکەنەوە. لەلای ئەو هەستام و هاتمەوە بۆماڵی خۆمان.

ئاونییە کارەبانییە هەواگەرمە، خاڵۆ حەمە (حەمە کەلا) میوانمە، منیش دەستم کرد بەخوێندنەوەی کتێبێک، خاڵۆ حەمە پرسی ئەوەچی ئەخوێنیتەوە؟ ووتم کتێب، ووتی ئەزانم ناوی چیەو هی کتێبە؟ ووتم هی کاک مەلا بەختیارە و ناوی ( کۆڕبەندی چەند بابەتێک) ە، ووتی تیایدا نوسراوە دوای رزگار بوونی کوردستان، خەڵک بێ ئاو کارەبادەبێت و جادەو ڕێگاو بانەکان وێران؟ ووتم نەوەڵا، ووتی ئەی مەلابەختیار نەینوسیوە نابێ بەرلە عەلی عومەری[1] خزمەت بەخائینان و سەرۆک جاشەکان بکرێت؟ منیش پێکەنیم و کتێبەکەم دانا. عەلی عومەری لەبنەچەدا خەڵکی ئاوایی دوریسانی سەر بەفەرمانداری پاوەیە لەکوردستانی رۆژهەڵات، دوای ئەوە دێنە عێراق لەخانەقین نیشتەجێ ئەبن و درێژە بەژیان ئەدەن، دواتر ئەچێتە بەغداو لەوێ نیشتەجێ ئەبێت، ئەبێتە خاوەنی ئۆتێل ئەڵوەن. عەلی عومەری کوردێکی پاک و دڵسۆز، لەخزمەت کردنی کوردان لەبەغدا و بەهۆی هەڵوێستە نەتەوەیەکانییەوە ناوبانگ دەرئەکات. لەدوای ڕاپەڕینی گەلی کورد لەبەهاری ساڵی ١٩٩١دا

---

1

کۆچی دوای ئەکات و لەسەر وەسییەتی خۆی لەگۆڕستانی بابا سەرهەنگی دەوانی، لەشارۆچکەی تەوێڵەی ناوچەی هەوراماندا بەخاک ئەسپێردرێت.

ئێوارەی ئەمڕۆ سەردانی کاک باقی هەورامیمان کرد، داستانی گرتنی خۆی لەلایەن ئەمنی عێراقەوە بۆ گێڕاینەوە، ووتی لەزیندان بردمیانە شوێنێک زیندانییەکی تری لێبوو، کاتێک پاسەوانێک هاتوو پێی ووت گم، ئەویش بە هەورامیانە وەڵامی پاسەوانەکەی دایەوەو پێی ووت دایکت گم باوکت گم، دوای ئەوە بردیان و هاتەوە، چوومەلاییەوەو بەهەورامیانە پێم ووت خەڵکی کوێیت و لەسەر چی گیراوی؟ ووتی بەقوربانت بم تۆ کێیت؟ لەخۆشیدا نەیئەزانی چی بڵێت و چۆن قسە بکات، من خۆم پێناسان، ئەویش ووتی ئێرانیم خەڵکی هەورامانی تەختم، لەو کوێستانەی هەورامان کۆکەنم کردووە (لۆو گیا بڕین) مەفرەزەیەکی سوپای رزگاری گرتوومیان و تەسلیمی عێراقیان کردووم، بەئەندامی سوپای پاسداران ناساندویانم و ئەوەتا لێرەدا زیندانم. کاک باقی داستانی زۆرو خۆش خۆشی زیندانی لایە، یەکێک لەوانە لەگەڵ ئەم پیاوە کۆکەن و بەزۆر بەپاسدارکراوەیە. ووتی بەیانییەک رۆژنامەیەکمان کردبوو بەسفرەی نان، یەکی یەک سەمون و یەک هێلکەی کوڵاوی پاکرا و کوپێک چامان لەسەر دانابوو، کاتێک کە هاتە پێشەوە بۆ سەر سفرەکە، سەیرێکی کردوو، پرسی کاک باقی دەی گولمانە (ناخۆشمانە-چیمان نەکراوە)؟.

ئەمڕۆ دوو شەممە١٩٩٩/٦/٧، سەرلەبەیانی زوو لەگەڵ کاک جەبار جەلالدا سەردانی ماڵی کاک جەلالی حاجی کاکەلیمان کرد لە شانەدەری، کاک جەلال ووتی ئەمشەو لەدروە بووم، دەڕاسە ئیشی بۆ کردبوون. لەوێ دەرچووین و چووینە ناڵپارێز، لەلای کاک شێخ جەمالی شێخ نەسرە چاوەڕێی مامۆستا جەمالمان دەکرد، ناڵپارێز ئەمساڵ بووە بەناوەندی ناحییە، شێخ جەمال ئەیووت ئەترسین ئەمساڵ ئاوی خواردن نەمێنێ، کانیاوەکان خەریکە وشک ئەبن.

دواتر چووینە شارۆچکەی پێنجوێن لەبارەگای کۆمیتەی رێکخستن داخەڵکێکی زۆر کۆبووبوونەوە بۆ پێشوازی کردن، لەکۆبوونەوەیەکدا بەئامادە بوونی ئەندامانی کۆن و نوێی کۆمیتە، واتە دەرچوو دەرنەچوو، لەگەڵ مامۆستادا ئامۆژگاری و رێنوێنی خۆمان پێشکەش کرد، دواتر گوێمان

لە رەخنەوگلەیی ئامادەبوان گرت، ئەوەی گونجاو بوو بەڵێنی چارەسەرمان دا، دواجار هەموومان لەئۆرگانەکانی حزبیدا رێکخستن و جێکردنەوە، هەموو بەڵێنیان دا کێشە لاوەکیەکان بخەنەلاوە، لاپەڕەی نوێ بکەنەوەو درێژە بە تێکۆشان بدەن، بۆنیوەڕۆ هەموومان بردنە سەیرانگای بلکیان و میوانداریمان کردن.

ئەمڕۆ هەینی ١٩٩٩/٦/١١، لەماڵەوەم لەشاری سلێمانی، دەستم کرد بەوەرگێڕانی کتێبی چیانشینانی زاگرۆس.

ئەمڕۆ شەممە ٦/١٢ گەڕاینەوە بۆهەڵەبجە، پارەمان پێ نەبوو، لای کاک بێستون ٥٠ پەنجا دینارمان قەرزکرد، لە سەیدسادق ٢٠ بیست لیتر بەنزینمان کڕی بە ٣٥ سی و پێنج دینار، پێش نیوەڕۆ ئیشوکاری ئاسایی و رۆژانەی حزبی خۆمان جێبەجێ کرد، پاش نیوەڕۆش سەردانی هاوڕێیانی رێکخستنی هەڵەبجەی حزبی شیوعیمان کرد، هەرئەمڕۆ و لەهەڵەبجەدا سەردانی نەهزەی ئیسلامی و یەکگرتووی ئیسلامیمان کرد. لەکۆبوونەوەکانمان لەگەڵ هەرسێ لایەنی سیاسیدا، جەختمان لەسەر هاوکاری و تەبایی و پشتیوانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بۆئەوان کردەوە.

ئەمڕۆ یەکشەممە١٩٩٩/٦/١٣، لەهەڵەبجە لەبارەگای مەڵبەند بووم، مامۆستا جەمال و برادەرانی کارگێڕ چوون بۆ سەیدسادق، بۆ کۆبوونەوەو رێکخستنەوەی کۆمیتەی رێکخستنی ئەوێ. منیش دوای تەواوکردنی ئیشوکاری ئاسایی مەڵبەند دوای نیوەڕۆ لەگەڵ چەند هەڤاڵێکدا سەردانی ئەم ماڵانەمان کرد.

یەکەم ماڵی مامۆستا مەلا غەفوری شێخ ئەحمەدی عەبابەیلێیی، مامۆستا پێش نوێژیکەرو مامۆستای مزگەوتی مەسعەبە لەگەڕەکی کانی قوڵکەی شاری هەڵەبجە، رۆژانی هەینیش لەمزگەوتی خانەقای بیارە نوێژی جەماعەت ئەکاو وتاری هەینی پێشکەش دەکات، مامۆستا چالاکوانێکی چالاکی رێبازی تەسەوفەو دۆستێکی نزیکی ماڵی خوالێخۆش بوو شێخ عوسمانی بیارەیە، دۆستی پارتی دیموکراتیشە. مامۆستایەکی رەوانبێژو شارەزاو قسەزانە.

دووەم مـالّی شـێخ عەلـی شـێخ ئەحـمەدی شـێخ مـحەمەدی شـێخ حسامەدین، ئێستا لەهەڵەبجەو لەتەکیەکەی باوکیدا لەگەڕەکی کانی عاشقانی شاری هەڵەبجەدا دائەنیشێ، شێخ عەلی کوڕە بچوکی شێخ ئەحمەدە، پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆیە، دۆستێکی نزیکی ئێمەیە.

سێهەم مـالّی مامۆسـتا شـێخ مـحەمەدی شـێخ خالد، شـێخ مـحەمەد مامۆستاو وتار بێژی مزگەوتی جامعەی هەڵەبجەیە، خوێندگای ئاینی و پەروەردەکردنـی فەقـێ و مامۆسـتایانی ئـاینیش بەڕێوەئەبـات، لەبـوارەکەی خۆیدا چالاک و مامۆستایەکی بەڕێزو دیارە، دۆستی جەنـابی مـام جەلال و یەکێتی نیشـتیمانی کوردسـتانە، ئیسـلامیەکانی سیاسـی نـاوچەکە دژایەتـی دەکەن، بەتـایبەت بـزووتنەوەی ئیسـلامی، دژایەتیەکەشـی گەیشـتە ئاسـتی تەقەلێکـردن بەنییەتـی تیرۆرکردنـی، بەسـەختی برینـداریان کـرد، بەڵام خۆشـبەختانە گەیشـتە نەخۆشـخانەو چـاک بـووەوە. ئەم بـابەتە دواتـر و لەجێگای خۆیدا بەوردی باس دەکەین.

چـوارەم سـەردانی بارەگـای قەرارگـای رەمەزان لەنـاو شـاری هەڵەبـجەدا، ئەم بارەگـایە نـوێنەری قەرارگـای رەمەزانـی سـەر بە سـوپای پاسدارانی ئێرانی لێیە، لەم کاتەدا پیاوێک بەرپرسیەتی بەناوی حاجی ساحیب، زمانی عەرەبی بەباشی شارەزایە چوونکە خۆی عەرەب و خەڵکی ئەهوازە، بەرپرس و نوێنەرانی ئەم بارەگـایە چاودێری بـارودۆخی هەڵەبجە دەکەن، بەتایبەت پێشترو لەکاتی شەڕەکانی ناوخۆدا، ئەوکات زیاتر لەبزووتنەوەی ئیسـلامیەوە نزیـک بـوون، هەرچەنـدە ئەوان خۆیـان بەبـێلایەن دەزانـن و ئامۆژگاریان بۆ هەموو لایەک ئەوەیە خۆیان لەشەڕو ئاشوب بەدوور بگرن، زۆر جار بەشداری کۆبوونەوەکانی نێوانمان دەکەن.

ئەمـڕۆ شـەممە ٦/١٤ تـا ١٩٩٩/٦/٣٠ بەردەوام لەبارەگـای مەڵبەنـدو لەهەڵەبجەو شارەزوورو هەورامان و پێنجوێن دا خەریکی کۆبوونەوەو کاری حزبی و دەوام بووین، لەم ماوەشدا رۆژی ٦/٢٠ لە شارۆچکەی هەڵەبجەی تازە هەڤاڵ مەلابەختیار کۆڕێکی گرت بۆ هەڤالانی ڕیکخستن بەناونیشانی ( سیسـتەمی نـوێی جیهـانی و دەوری کـورد یـان چارەنوسـی کـورد لەم سیسـتەمەدا). رۆژی ٦/٢٤ سـەردانی کـاک عەدنـانی حەمەی مینـام کـرد لەشارۆچکەی دەربەندیخان  لەئەوروپا گەڕابووەوە. رۆژی٦/٢٦ بەشداری

ڕێوڕەسمی چەند پرسەیەکمان کرد، لەوانە کوڕی کاک مەقسودی حەمە حەسەنی تەوێڵەیی سەلاجەی نەووتیان چەند ڕۆژ پێشتر پێدا تەقیوەتەوە، زۆربەی ئەندامانی خێزانەکەیان بریندارو کوڕێکی تەمەن ۱۰ دە سالانیان بەناوی مەبەست گیانی لەدەست دابوو، هەر ئەمڕۆ لەهەڵەبجە بەشداری ڕێوڕەسمی ژنێکی سازانی و ژنێکی هاواریمان کرد، ژنە هاواریەکە هاوسەری حەمەی میرەبوو. دوای عەسری ئەمڕۆ لەگەڵ کاک جەبار جەلالدا سەردانی کەسوکاری شەهید نیازیمان کرد لەشارۆچکەی تەوێڵە، کاک عیزەت حەسەن باوکی شەهید نیازی تێکۆشەری دێرین و پێشمەرگەی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول کۆچی دوایی کردوە.

ڕۆژی دوو شەممە٦/٢٨ سەردانی چاپخانەی سەردەمم کرد، لەگەڵ کاک ئازاد بەرزنجیدا لەسەر بابەتەکانی وەرگێڕان قسەو باسمان کرد. هەر ئەمڕۆ سەردانی ڕێوڕەسمی پرسەی شێخ نوری شێخ ڕەشیدی عەبابەیلەیمان کرد لەمزگەوتی کانی ئاسکانی شاری سلێمانی، دواتر سەردانی پرسەی خێزانی کاکە حەمەی سەلیمی تەوێڵەییمان کرد لە مزگەوتی قەزازەکانی شاری سلێمانی.

لەهەفتەی ڕابردودا هاووڵاتییانی هەرێمی کوردستان کێشەی سەرەکیان بێ کارەبایی و بێ ئاویی بووە، زۆربەی کشتوکاڵی جووتیارەکان وشک بووەو ئاوی خواردنەوەش کەمی کردوە، هەر لەم هەفتەدا وەفدەکانی پارتی و یەکێتی لەئەمریکا بەچاودێری ئەمریکیەکان چەندین کۆبوونەوەیان ئەنجام دا بەڵام نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێک. لەڕۆژانی ڕابردوودا لەناوچەکانی خورماڵ و تەوێڵەو بیارەدا مەفرەزەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی چەندین پێشێل کاری و ڕێگریان کردووە لە هاتووچۆ و کارو چالاکی حزبی و سیاسی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان .

ڕۆژی چوارشەممە١٩٩٩/٦/٣٠، بەئامادەبوونی نوێنەرانی مەکتەبی ڕێکخستن، هەڤاڵان مامۆستا محسن عەلی ئەکبەر و کاک ئاسۆ عەلی دوکۆبوونەوەمان کرد، لەبارەگای مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوور، کۆبوونەوەی یەکەم لەگەڵ هەڤالانی کارگێڕو دواتر لەگەڵ ئەنجومەنی مەڵبەندا، کۆبوونەوەکان بۆ هەڵسەنگاندنی ئیشوکارەکانی دوای

هەڵبـژاردنەوەی ئەنجـومەنی مەڵبەنـدو ئۆرگانەکـانیتری حزبـی سـنووری مەڵبەندەکەو ئیشوکارەکانی رێکخستن بوو.

ئەمڕۆ پێنج شەممە ۱۹۹۹/۷/۱، لەگەڵ حاکم قادر پارێزگاری سلێمانی، سەردانی ناوچەی هەورامانمان کرد، ئەم سنووورە بەهۆی شەڕەکانی ناوخۆو رێگریەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی و گرووپە توندڕەوەکانەوە کەماوەیەکە ناوچەکەیـان خسـتوەتە ژێردەستی خۆیـان، هـیچ جـۆرە خزمەتگوزاریەکی نەلەلایەن حکـــومەتی هەرێـــمەوە، نەلەلایەن رێکخـــراوە خێرخـــوازیە جیهانییەکانەوە پێنەگەیشتوە.

بۆیە لەوبارەوە نـاوچەکە زۆر دواکەوتـووە، بڕیـارە لەم سـەردانەی ئەمـڕۆدا گـوێ بۆداواکاریەکـانی خەڵـکەکە بگیرێـت. هەڤـاڵان کـاک جەمیـل هەورامـی و کـاک شـێخ جەعـفەرو مامۆسـتاجەمال و کـاک لیـوا فەرەیـدون بەڕێوەبەری پۆلیسـی سـلێمانی و ئێمەش هەڤاڵانی مەڵبەنـدی شـارەزوور ئامـــادەی ســـەردانەکە بـــووین، کۆڕوکۆبـــوونەوە لەگەڵ جەمـــاوەر لەشارۆچکەکانی خورماڵ، بیارە، لەئاواییەکانی بەڵخە، سۆسەکان و تەوێڵەدا کرا. کێشەی سەرەکی خەڵکەکە کەم ئاوی و بێ کارەبـایی و خرابی رێگـاو بانەکان بوو. شەو لەتەوێڵە ماینەوە، بەیانی رۆژی هەینی ۷/۲ مۆلیدەی کارەبا بۆ ئاوایی سۆسەکان دانرا و نیوەڕۆش لەئـاوایی سـەرگەت میوانی مـاڵی مامۆستا شێخ محەمەدی بەرزنجی ئەندامی مەکتەبی سیاسـی بزووتنەوەی ئیسلامی بووین.

ئەمڕۆ شەممە ۱۹۹۹/۷/۳، هەوا لەرۆژانی رابردوو فێنکترە، بەرهەمی شـووتی شـارەزوور پێگەیشـتوەو ئەبرێتە بـازار، ئەمسـاڵ لەچـاو پارسـاڵدا زووتر پێگەیشتوە. کانیاو سەرچاوە ئاوەکان بەگشتی لەسەرتاسەری هەرێمدا زۆربەیان وشکیان کردوە، جووتیارەکانی شارەزوور کەڵک لەچاڵی قوڵ(بیر) وەردەگرن. لەبارەگای مەڵبەنـدی رێکخسـتنی شـارەزوور بەرلەدەوام کـردن ئیشوکاری ئاسایی خۆمم تەواوکرد، ئینجا ئامادەم بۆ پێشوازی و بەڕێکردنی میوانەکـانم، تائێسـتاش خەڵکـی نـاوچەکە و دۆسـتەکانی یەکێتـی دوای رێکەوتنمان لەگەڵ بزووتنەوە، هەر ئەترسن و بەترسەوە سەردانەکانیان بۆ لای ئۆرگانەکانی یەکێتی دەکەن.

ئەمڕۆ ئاگاداریان کردم هێزی هەورامانی بزووتنەوەی ئیسلامی لەشارۆچکەی خورماڵ خەڵکیان بانگ کردووەو کەفالەتیان لێ وەرگرتوون کەنابێت لایەنگر یان ئەندامی یەکێتی بن، ئەگەر دەرکەوت پەیوەندیان بەیەکێتییەوە هەیە غەرامە دەکرێن بە ۱۰۰۰۰ دەهەزار دینار، بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیم کرد بەئەندامێکی مەکتەبی سیاسی بزووتنەوەوە، خۆی بەدۆستی نزیکی مام و یەکێتی دەزانێ، ئەویش حاشای نەکردو دادوبێدادی بوو بەدەست مخالەفە و ئەوبارودۆخەی ناو بزووتنەوەوە، پێم ووت ئەگەر لەهەورامان ئەوفشارە لەسەر دۆست و لایەنگرانی ئێمە بەردەوام بێت، ئێمەش ناچار دەبین لەسنووری دەرەوەی هەڵەبجەدا، بەرامبەر بەبزووتنەوە هەمان هەڵسوکەوتی نابەجێ بکەین، بەڵێنیدا لەگەڵ مامۆستا مەلاعەلی قسەبکاو ووتیشی مامۆستا پڕو تورەیە لەوانەو بڕیارە لێپرسینەوە بکات، ئەوانە چەند گروپێ یاخین لەبزووتنەوەو کێشەی بۆدروست دەکەن، منیش پێم ووت چاوەڕێ دەکەین، بەڵام ئەم کارەی دوێنێ لەخورماڵ دۆستە نزیکەکانی مامۆستا کردویانە.

پێم ووت بەیانی جەنابی مام جەلال دێتە هەڵەبجەو کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسی هەردوولایە، من پێم خۆش نییە مام جەلال ئاگادار کەم لەو کارەی دوێنێی بزووتنەوە، پێم باش بووە بەرلەوەی ئەو ئاگاداربکەمەوە لەو پێشێل کاریانەی ئەم ماوەی بزووتنەوە، خۆتان ئاگادار بکەم.

ئەمڕۆ یەکشەممە ۱۹۹۹/۷/٤، خۆمان ئامادە کردووە بۆ هاتن و پێشوازی مام جەلال بۆ هەڵەبجە، بەدرێژایی ڕێگای سلێمانی هەڵەبجە، پاسەوان دانراوە، ئاگاداری کۆمیتەکانی ڕێکخستنی سنوورەکە و ئەندام و لایەنگرانی خۆمان کردەوە لە ناو سەیدسادق و سیروان و هەڵەبجەدا، تائەوکاتەی مام لەهەڵەبجە و سنوورەکەدا نەگەڕێتەوە، ئەمان نەچنەماڵەوە، لەبارەگاکان و سەرجادەو ناوبازارەکاندا بمێننەوە، وریای هەڵسوکەوت و جموجوڵی نائاسایی بن. ئەمە جگە لەئامادەباشی هێزەئەمنییەکان و پێشمەرگە.

مام هاتوو لەگەڵ بزووتنەوە کۆبوەوە، دوای گەڕانەوەی مام جەلال و هەڤاڵەکانی هاوڕێیی، من لەگەڵ هەڤالان فەتاح کۆکۆیی و جەبار جەلال و شلێرخان کارگێرانی مەڵبەند بەشداریمان کرد لە ڕێوڕەسمی پرسەی دایکی عەلی ئێناخی، ئینجا چووین بۆ قەزای شارەزوورو لەوێش بەشداریمان کرد

لەرێورەسمی پرسەی خوشکەزایەکی شەهید خەلیل سەراویدا. دوای عەسری ئەمڕۆش کۆبووینەوە لەگەڵ هەڤالانی کۆمیتەی ڕێکخستنی قەزاکەدا، قسەو باس و بابەتی کۆبوونەوەکەمان لەسەر کۆتایهێنان بەو ساردی و گلەی و گازندەییەی بەرامبەر بەیەک هەیانە، هۆکارەکەشی ئەگەڕایەوە بۆ هەڵبژاردنەکان و ئەو ڕێزبەندیەی دەستەو دەستەگەری درووستی کردوە. ڕۆژانی ٥و٦و١٩٩٩/٧/٧، لەهەڵەبجەو شارەزوور لەگەڵ هەڤالانی مەڵبەند، سەرگەرمی ئیشوکاری ئاسایی و حزبی خۆمان بووین.

ئەمڕۆ پێنج شەممە ١٩٩٩/٧/٨ لەشاری سلێمانی بووم، پێش نیوەڕۆ سەردانی هەندێک لە نەخۆشەکانی سنووری شارەزوورم کرد، لەنەخۆشخانەکانی سلێمانیدا. دوای نیوەڕۆ سەردانی کاک شێرکۆ بێکەسم کرد لەدەستگای چاپ و پەخشی سەردەم، پەیوەندیەکی دۆستانەم لەگەڵ ئەم شاعیرە گەورەی کوردا هەیە، ئەویش منی خۆش ئەوێت، جارێکیان لای مام جەلال بووبوو، چەند برادەرێک سەردانی مام دەکەن، قسەی باشیان بەرامبەر بەمن نەکردبوو، مام جەلال گوێی بۆ گرتبوون تاقسەکانیان تەواو کردبوو، کاتێک مام دەپرسێت تەواو ئەوانیش یەکێکیان دەڵێت بەڵێ، مام بەتوڕەییەوە دەڵێت هیچی وانییە ئێوە هیچتان لەباردا نییە، یەک ڕۆژ لەجێگەکەی حەمەدا ئیشتان پێناکرێ ئیتر بۆ وازی لێناهێنن، ئەمە کاک شێرکۆ بۆمنی گێڕایەوە، دوای کە ئەوان دەڕۆن کاک شێرکۆ دەڵێت مام جەلال زۆر خۆش حاڵ بووم، هەموو بەرپرسەکان وەک خۆیان هەن دەناسی، ئینجا بەرگری لەمن کردبوو باسی لەوە کردبوو سەرە رای کاری سیاسی کاری ڕۆشنبیری و نووسین و وەرگێڕانیش دەکات. سەردانی ئەمڕۆم بۆلای کاک شێرکۆ بێکەس بۆ ئەوە بوو بەڵێنی چاپ کردنی کتێبی چیانشینانی زاگرۆسی لێ وەرگرم، بەڵێنی داو دواتر لەکاتی خۆیدا بۆی چاپ کردم، بۆیە سوپاسی دەکەم، مام جەلال هاوکاروی پشتیوانی دەستگای سەردەم دەکات.

ئەمڕۆ هەینی ١٩٩٩/٧/٩، سەردانی هەورامانم کرد، سەرلەبەیانی چووم بۆدۆڵبیان کوێستان و چنورم بردنەوە بۆلای ئیقباڵ و باوکم، ئەمانە خوشک و برامن، زەحمەتکێش و ماندون، تالە چیا بووین، چکۆلە بوون و لەساڵی ١٩٧٨وە تا ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ لەبارەگاو لەئەشکەوت و لەبن ڕەمەند و لەئاواییە سوتاوەکان و سەرکانی و گوێ رووبار و چۆمەکاندا،

دواتریش لەئاوارەی لەگەڵمان دەهاتن و دەچوون ئێستاش ئەوە ماوەی ٨ هەشت ساڵە لەگەڵ دایک و باوکمدا، بەردەوام خەریکی ئاوەدان کردنەوەی باخ و باخات و راست کردنەوەی کەلاوەکانی ئاواییە سوتاو وێران کراوەکەی دۆڵبیانن.

پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ سەردانی تەوێڵەمان کرد، خەڵک بەترسەوە چاکوچۆنیمان لەگەڵ دەکەن، منیش لەبەر ئەوە لەناو ئاواییدا نەمامەوەو چووین بۆ هاوینە هەواری سێ مارەوار یان (سێ مارەوان) لەنزیک هاوینەهەواری ئاوێسەر، شەو لەوێ ماینەوە، سێ مارەوان کانی و ئاوێکی سازگارە، تەوقە گوێزێک و باخچەیەک کە ئێستا هەموو جۆرە دارێکی میوەیەکی تیایە ئەکەوێتە بەردەمی، لەبەرزاییەکەوە ئەروانێت بەسەر تەوێڵەدا، شوێنێکی سەخت و قایمیشە. خاوەن دارێتی ئەم باخ و کانیاوە سازگارە ئێستا کاکە حەمەی مەحمودە، زیاتر بەحەمەی نانەوا ناسراوە (حەمە تەپۆڵە). باخەوانی کوڕی کاکە حەمە میوانداری کردوین، جگە لەمن و پێشمەرگەکان کۆمەڵێک دۆست و برادەریش هاتون بۆلامان، لێرە لەوە ناترسین بزووتنەوە بێنە سەرمان و وەک برادەرانی پارتیمان لێبکەن. ( چەند ساڵ پێشترو لەئێوارەی رۆژی ١٩٩٥/١٠/٧دا لەهەورامان لەنزیک شارۆچکەی تەوێڵە، ڕێکخراوی کرۆ، کەلەسنووری سلێمانیدا، ئەندازیار کاک بێستونی ئەسکەندەر لێپرسراوی بوو، میوانداری هەڤاڵانی پارتی کردبوو، لەوانە کاک حەمەی کارگێڕی لقی ١٢ی پارتی، کاک هادی محەمەد سان ئەحمەد لێپرسراوی ڕێکخراوی تەوێڵە و کۆمەڵێک ئەندازیاریتری ڕێکخراوی کرۆ، لەوانە هونەرو دەرسیم، لەگەڵ هەندێک دۆست و ناسراوی تری کاک بێستون خۆی، شوێنی میوانداریەکە لەباخی قادر مەجنون دا لەنێوان شارۆچکەی تەوێڵەو ئاوایی سۆسەکاندا دەبێت،

مەفرەزەیەکی بزووتنەوە بەقیادەی مامۆستا مەلاعابد هەڵدەکوتنە سەریان و بەبیانوی ئەوە گۆرانی وتراوەو مەشروبیان خواردوەتەوە، سوکایەتیان پێ دەکەن، هەندێکیان لەدەستیان ڕادەکەن لەوانە کاک هادی و چەند کەسی تر. سیامەندی کوڕی کاک هادی و ئەندازیارەکان ئەزیەت دەدەن، بەقەمەی کلاشینکۆف گوێییەکی کاروان کوڕی مامۆستا ئیسماعیل شەق دەکەن (هەڵئەدڕن). کاکە حەمە دەگرن و خۆی و پاسەوانی چەک

دەکەن و ئەیان بەنەوە بۆ سێرپیانی تەوێڵە شۆشمێ، دواتر کاک نەسرەدین عەبدوڵا بەرپرسی دەستگای ئەیلول دەچێتە لایان و کاکە حەمەو هاورێکانی ئەهێنێتەوە).

ئەمشەو لەسیمارەوار بیرەوەریەکی ۲۱ بیست ویەک سالّی پێشترم هاتەوە یاد، ئەو بیرەوەریە دەبوو لەبەرگی یەکی دەنگی خاکدا تۆماری بکەم، بەلام والێرە گێرامەوە بۆ هاورێکانم بەم سێوەی خوارەوە: لەکۆتایی بەهاری سالّی ۱۹۷۸دا ئێوارەیەک لەئاواییی دەرەتفێی کاکەیی نشینەوە کەوتینەرێ بەسەر هێڵی سنووری دەستکردی پەیمانی زەهاودا، بەرەو چیاکانی سەر بۆئاسمان هەڵبڕیوی سنووری هەردوو هەورامانی تەخت و لهۆن لەبەشی عێراق و ئێراندا، کاتێک ئاوایی دەرەتفێمان خستە پشت سەرو گەیشتینە بن دارەبەنی سەربەن (دار قەزوانی سەر بەندەن) ئێرانییەکان پێی دەڵێن تەک درخت، هەوا تاریکی کرد، هەڤالان وەستان بۆ پشوودان، دوو سێ کەس دانیشتون و تاک تاکیش بە پێوە وەستاوین، چەند کەس نەفەس دەدەن لەجگەرەی داگرساوی شاراوەی ناو مشتیان، چەندکەس خەریکی خۆتوند کردنەوەن، گورج کردنەوەی قەیتانی پێلاو پوزەوانی، توندکردنەوەی شالّی پشت و رێککردنی تاقم و فیشەکدانن.

من لەوانەم بەپێوە وەستاوم، دەنگێک بەهێواشی باگ دەکات حەمە؟ لادەکەمەوە بۆلای دەنگەکە، گریانەیی بەئاماژەی پەنجەی دەستی دەڵێت وەرە، نزیکی بوومەوە خۆم چەماندەوە گوێم نزیکی دەمی کردەوە، فەرموو کاک ئەحمەد، دەڵێت تۆو سەدیق گریانەیی پێشکەون بەولاخەرێدا، لەوشوێنانەی رێگا ئەکەوێتە دیوی ئێران ئێوە هەر بەدیوی عێراقدا برۆن، تاسەرکانی و ئاوی وەزڵی، بەسەر چاو.

هەر بەپێوە وەستاوم سەیری باکووری رۆژهەلات دەکەم، چاوەرێی فەرمانی گریانەی دەکەین بڵێت برۆن، لەوکاتەدا شەوق و چراخانی کارەبای نەوسوودو هەردوو گوندی شۆشمێ سەروخوارو لەلای راستەوەو رووناکی لامپەکانی تەوێڵە لەلای چەپەوە ئەدرەوشێنەوە، پاسگاو پایەگاکانی چریک و ئەمنییەی شاهەنشاهی لەکۆتایی سنووری ئێران و لەدەستی راستدا، قەلاو رەبیەکانی سەربازەکانی بەعس، لەسەر بەرزاییەکانی دەوری تەوێڵە لەدەستی چەپدا.

لەو نێوانەشدا ڕەشایی و سامناکی چیا سەربەرز و بەھەیبەتەکانی ناوچەکە، دیمەنێکی وەحشەتناکی لەبەر دیدی مندا وێناکردوە. کەس چرتەی لێوە نایەت، ھەموو ھەستاونەتە سەرپێ و گریانەیی دێتە ناوەراست و بەدەوریا ئەلقە ئەبەستین، پێمان دەڵێت حەمەو سەدیق پێش قەرەوڵن، ناوی نھێنی شەو مامەرەشەیە، تائەگەینە جێی مەبەست، ئەگەر توشی تەقە بووین ئەوانەی دواوە ئاگاداری ئەوانەی پێشەوەبن، ھەرکەسیش دابڕا دەمەو بەیانی بێتەوە سەرکانی و ئاوەکەی لێژەی کەریم بەگ لەبەرامبەر ئاوایی پالانیا.

بڕۆن، کەوتینەڕێ، تاھاتینە سەر کانیاوەکەی وەزلی، وەزلی کانیاو باخێکە ئەکەوێتە لای شانی ڕۆژھەلاتی تەوێڵە، لەداوێنی کلاوەی قوللەی ھەسون، قوللەی ھەسون ئاوڕێژگەی سنووری ھەردوو وولات. ھەڤالان ماندون مانگەشەوە، ھاتووەتە سەرسەرمان، خوڕەی قەڵبەزی ئاوەکەی کەدەرژێتە ناو ئەستێلێکەوە لەبەردەمیدا، سەرنجی ئەوانە ڕادەکێشی کەشارەزا نین و یەکەم جاریانە ئەم شوێنە بەرزو سەخت و کانیاوە سازگارە پێدەزانن، بۆیە وردەوردە، یەکیەک و دوودوو، ھیواش ھێواش بەژێر شۆڵەی ئەو مانگە شەوەدا لەنێوان شاشی شەوێلی کەلاو لق و پۆی درەختەکانی سەرکانیاوەکدا، دێن بۆ ئاو خواردنەوە و پڕکردنی مەتارەکانیان. دوای ئاو خواردنەوەو مەتارە پڕکردن، بلاو ئەبنەوە بەناو باخەکەدا بۆ پشوودان، کۆمەڵ ناکەن، ڕەوییەی پارتیزانی وایە، بۆ ئەوەی ئەگەر لەناکاو دوژمن دەست ڕێژی گوللەی کرد، کەمترین زیانمان بەرکەوێت.

بەڵێ دوای پشوویەکی ٣٠خولەکی و بەجێھێشتنی وەزلی و داگەڕان لەخەڵەفیەوە بۆ ناو قولایی دۆڵی چۆمی ئاوایی دزاوەر، لەوێوە سەرکەوتنەوە بەھەورازی تاقەت پروکێنی ملەی (گویج) گۆیژدا، دووبارە داگەڕانەوە بۆسەر چاوگی ئاوێسەرو تاگەیشتن بە سێمارەوان، کێشەو گرفتی ماندوبوون، پرتەو بۆڵەی ھەڤالان، پرسیار کردن، ماومانە؟ بۆکوێ دەچین؟ مردین؟ چی قەوماوە خۆدوژمن بەدوامانەوە نیە....تاد کەسیش وەلام ناداتەوە.

دەمەو بەیانیی کەھێشتا دنیا ڕووناک نەبووەتەوە بەرێگای لابەلای ناو داربەڕوەکانی ( وەرەوێ) دا، گەیشتینە سەر کانی سێمارەوار، ناو باخەکەی کاک حەمەی مەحمود. ئەم شووێنەیە ئێسا لێی دانیشتووین، کاتێک ئێمەی پێشرەوانی پارتیزانەکان گەیشتینە لێواری دیوارو پەرژینی باخەکە، گەیاندمانە

ئەوانەی دواوە، هەرکەس لەجێگەی خۆی بووەستێت و دانیشن، ئێمە هاتینە پێسەوەو سەرکانی و تاریکایی ناو باخەکەمان خستە ژێر چاودێری، دنیا کشوماتە، جگە خورەی پلوسکی ئاوەکە سەدایەکی تر نییە، ئەوکات ناو باخەکە باخچەی داری میوەی لێ نەبوو، دوو ریزداری بی گەورە گەورەو بەرز لەگەڵ تەوقێک دار چناردا، حەوزو ئەستێلیشی نەبوو.

کەدڵنیابووین چۆڵە، گەیاندمانە دواوە وەرن، هەریەک ئەگەیشتە بن دارەبیەکان خۆی ئەدا بەئەرزدا، گریانەیی هاتە پەنامەوە ووتی تۆ لەهەمووان شارەزاتری ئەتوانی نەخەوی تاروناک ئەکا، دوای ئەوە من هەستێنێ، ووتم بەڵێ.

وردە وردە لەباخەکە دورکەووتمەوە، هاتمە لاشانی راستی سێمارەوار، لێرە دەڕوانێ و سوارە بەسەر دەرە تاریک و لێژڵەو سەرچەمەو چۆمی ئاوێسەریشدا، تەوێڵەش لەبەر دەستدایە، کاتێک روونـاکی کردەوە، بەدوربین سەرەتا دەوروبەری خۆم خستە ژێر چاودێری، دواتر رەبیەو پایگاکانی دەوری تەوێڵەو ئەو رێگایانەی دەرئەچن بەرەو دەورو بەری شارەدێکە.

کاتێک تیشکی خۆر لەسەر کەلی هەراتەوە دەرکەوت، لەبەردەمی خۆم دا دەنگە دەنگی منداڵم هاتە گوێ، سەرم بردە دیار ئەبینم وا دوو کوڕی مێرمنداڵ چەند سەر رەشەوڵاخیان داوەتە بەرو بەرەو لای من دێن، بۆئەوە نەوەک لەدورەوە چاوم کەن و بترسن و بگەڕێنەوە، خۆم لێشاردنەوە، لەپەنا گابەردێکی گوێ رێگاکەدا خۆم حەشاردا، رەشە وڵاخەکان گەیشتنە لام و ئەوی پێشەویان هەڵوێستەیەکی کرد، ئەوەی دوای ئەو قۆچێکی لێداو کەوتەوەڕێ، یەکێک لە منداڵەکان کلکی مانگاکەی دوای دواوەی گرتبوو، پێی لەزەوی گیردەکرد بۆئەوەی مانگاکە رایکێشی. کاتێک لەمن تێپەڕبوون زانیم تازە مەجالی راکردنیان نییە بۆدواوە بەهێواشی و بەهەورامیانە ووتم کاکەگیان چۆنن، بەبێشڵەژان هەردووکیان لایان کردەوە، ناسیمن کوڕی کێن، بەڵام نەمئەزانی ناویان چیە، بێدەنگ لەجێگەی خۆیاندا وەستان.

کەم کەم بەپرسیار کردن هێمنم کردنەوە و هاتنەلامەوە، من قسەم لەگەڵ دەکردن ئەوان ورد دەبوونەوە لەتفەنگەکەی دەستم و دووربینەکەی ملم. لەوکاتەدا کاک ئەحمەد سەری هێنایە دیار، دیارە گوێی لەدەنگە دەنگی

من و منالەکان بووە، هەستاوە هاتووە بۆلامان، دوای چاکوچۆنی لەگەڵیان، پرسی ئەیانناسی؟ ووتم بەڵێ منالی حاجی محەمەدی حاجیلەن، ووتی زۆرباشە ئەمە برایەکیان هەیە ناوی نەسرەدینە، برادەرم بووە پێکەوە لەشۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگە بووین.

رەنگە ئەوەی ئەم داستانە ئەخوێنێتەوە منیش و ئەو دووکەسەش بناسێ، بڵێت چۆن تۆ پێشمەرگە بوویت و ئەوانە مێرمندال، خۆ لەتەمەنێکدا بوون؟ ئەوە راستە ئەوکات من تەمەنم ١٦-١٧ سالان بوو، ئەوانیش تەمەنیان١٤و ١٥ سالان بوو.

گریانەیی ووتی بۆ نەیان نێرینەوە بۆ ئاوایی برێک شەکرو چاو نانمان بۆ بهێنن، تۆبلێیت لای خەڵک قسەنەکەن؟ منیش ووتم نا، باوەڕناکەم جگە لای مالی خۆیان لای کەسی تر باسمان بکەن؟ ووتم گەورەکەیان ئامۆژگاری دەکەین و ئەینێرین، بچکۆلانەکە لای خۆمان گل ئەدەینەوە، چەندمان کرد چکۆلەکە قایل نەبوو بەتەنها لای ئێمە بمێنێتەوە، بۆیە ناچار دوای ئامۆژگاری و رێنوێنی هەردووکیانمان ناردەوە. پێمان ووتن ئاگامان لە رەشەولاخەکانتانە تابێنەوە، ئەوان رۆیشتن، گریانەیی ووتی تۆ برۆ بخەوە ووتم خەوم نایە، ماوەیەک بوو ئەم وولاتم نەبینی بوو لەتەماشاکردنی تێر نەدەبووم، یادگاری و بیرەوەریەکانی منداڵی و باخ و هەواری باپیرم حاجی ئایزە بارام بەناوی ( لێژلە) لەبەردەماندا و هاتوچۆی تەوێلە و دەرە تاریک و رێگاکانی سەرلێژو راسارایی، خوێندگای ناوەندی و هاوڕێکانی قوتابخانەم، بیناکەی مەکتەب و مالی باپیرم کەلەوکاتەدا لێمەوە دیار بوون، وەک شریتێکی پچڕ پچڕ بەمێشک و بەبەرچاومدا دەهاتن. خۆشحالیەکی ئێجگارخۆشی دەدامێ.

بەڵێ لەگەڵ کاک ئەحمەد دانیشتین و چاوەڕێی هاتنەوەی کوڕەکان و چاودێری دەورو بەرمان دەکرد، ئەوەندەی نەبرد کوڕەکان لەبەردەماندا یەکی بەکۆڵێکەوە دەرکەوتن، لەناو ئاوایی تادەهاتنە ڕاگا (رێگا) کەلەی لای باخی باپیرم چڕی باخەکان نەیئەهێشت دیاربن لەئێمەوە. گەیشتن و کاک ئەحمەد بەکەیف و خۆشیەکی بێ ئەندازەوە پێشوازی کردن، نان و شەکرو چای و کەرەو مەنجەڵێک دۆلمەشیان هێنابوو، دواتر ئەو دوو کوڕە هەردووکیان بوونە پێشمەرگە، ئێستا ماون، یەکێکیان ناوی عەدنان و ئەویتریان ناوی

جەوهەرە، باوکیان ناوی حاجی محەمەدی حاجیلەیە. من شتەکانم بردەوە بۆسەرکانی و ئاگرم کردەوەو چاییم لێنا، برادەران هەرکەس بەخەبەر ئەهات ئەهاتە پێشەوە ئەیپرسی کێ ئەم نان و خواردنەی هێناوە؟ منیش ئەمووت، هەرلێرە دانرابوو ڕۆژبوەوە پێمان زانی، دڵسۆزی مام ڕەئیس نان و چایی خواردو چووە شوێنەکەی کاک ئەحمەد، ئەو ڕۆژەو شەوی دوایش لەوێ مانەوە. خەڵکیتر هاتن بۆلامان و ڕۆژی دووم هاتینە خوارەوە بۆناو باخەکانی ئاوێسەرو لەگوێ جۆگای ماوامی لەباخی حاجی مەجیدی حەمە میوانی ئەوان بووین و ئەو ڕۆژەش دۆڵمەو گۆشتیان بۆکردبووین.

بابێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، ئەمڕۆ شەممە ١٩٩٩/٧/١٠، بەیانی زوولە سێمارەوار هەستاین ئێرە کوێستانەو هەوایەکی فێنک و خۆشی هەیە بۆیە ئاگرمان کردەوە. دوای نان و چاخواردن، گەڕاینەوە بۆ ناو تەوێڵە،

بۆ نیوەڕۆ لەماڵی هادی برام لەگەڕیات ماینەوە. پاش نیوەڕۆ لەناو تەوێڵەدا ژمارەیە ماڵی کەسایەتی و دۆست و ئەندام و لایەنگری یەکێتی و پارتیشمان بێ جیاوازی بەسەر کردەوە. بڕیارمان دا ئەمشەو لەتەوێڵەدا بمێنینەوە، ئەو سەردانانەی ئەمڕۆمان بزووتنەوەی نیگەران کردبوو، چەند دۆستێک ئاگاداریان کردمەوە ئەمشەو ئاگاداری خۆمان بین، ئێمەش بۆخەوتن کۆبووینەوە لەماڵی کاک حەمەحسێنی حاجی فەرەج لەگەڕەکی پشتی حەوز، تابەیانی پاسەوان و کەمینمان دانا، نیوەشەو، دەنگە دەنگ پەیدا بوو هەستاین، پرسیارم کرد لە پاسەوانەکان ئەوە چییە؟ پێشمەرگەکان ووتیان مەفرەزەی بزووتنەوەیە، هاتون بڕۆن بۆ سەر سنوور، نەمان هێشتوە.

بۆخۆم چوومە بەردەمیان و ووتم فەرموون، بۆ کوێ؟ ووتیان مامۆستا ئێمەی ناردوە وتویەتی کاکە حەمە لێرەیە ئێوە بچنە چۆمی دزاوەر بۆ سەر سنوور بۆ پاراستنی ئەمنییەتیان، چوونکە ئەوانە میوان و پاراستنیان لەئەستۆی ئێمەدایە، منیش پێم ووتن سوپاستان دەکەین. پێویست ناکات کەمینی خۆمان لەوێیە، بگەڕێنەوە بەمامۆستا بڵێن دەستی خۆش، ئەوان گەڕانەوەو ئێمەش تابەیانی نەخەووتین.

سەرلەبەیانی ڕۆژی یەک شەممە ٧/١١ گەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە، لەبیارە مۆلیدەی کارەبا دانرا پیرۆزبایمان کردن و هاتینەوە بۆ هەڵەبجە، لەبارەگای مەڵبەند کۆبوونەوەمان کرد لەگەڵ بەرپرس و فەرماندەکانی لەشکری

پاسەوانی مەڵبەند و کۆمیتەکان، کۆبوونەوەکە بۆ پێدانی ئامۆژگاری و ڕێنوێنی بوو، تازیاتر وریاو ڕێکوپێکبن لەپاسەوانی و پاراستنی ئۆرگانەکانی حزبی و یەکێتی دا.

ئەمڕۆ سێ شەممە ١٩٩٩/٧/١٢، دوای جێبەجێ کردنی ئیشوکاری ئاسایی مەڵبەند، سەردانی بارەگای کۆمیتەی ڕێکخستنی هەڵەبجەم کرد، کۆبوومەوە لەگەڵ دەستەی پێشمەرگەکانی پاسەوانی کۆمیتەکە، گفتوگۆمان کرد لەبارەی چۆنییەتی جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی سەرشانیان و چەند کەم و کورتی و داواکاریان هەبوو بۆمان جێبەجێ کردن. دوانیوەڕۆ بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی خوشکی کوێخا کەریمی کۆکۆییمان کرد،ماڵی کوێخا کەریم لە ئاوایی باوە کۆچەک لەوماڵە تێکۆشەرو کورد پەروەرانەی سنووری هەڵەبجەو شارەزوورن، لەسەرەتای شۆڕشدا ئەرکمان زۆربووە لەسەریان، ماڵە خەزوری شەهید مەحمودی حاجی فەرەج بوون، لەو بنەماڵانەشن کەلەسنوورەکەدا ئێستا بوونەتە سەربازی ون، فەرەجی کوڕی کوێخا کەریم لەو پێشمەرگە چالاک و ماندوانەی مەفرەزەکانی سەرتای شۆڕش و یەکێتی نیشتیمانییە.

پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆش چووم بۆ شاری سلێمانی، بۆ بەشداری کردن لەڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی حاجی عەبدوڵای کەرکوکی لە گەڕەکی زێرینوک، حاجی عەبدوڵا پیاوێکی تێکۆشەرو ئاوارەی شاری کەرکوکە. کوڕێکی ڕێکوپێک و ژیری بەناوی سامان بێسیم چیی (عەدەد جهاز) مەڵبەندی شارەزوورە .

ڕۆژی پێنج شەممە ٧/١٥ لەشاری سلێمانی و مزگەوتی قەزازەکان لەگەڕەکی ئەسحابە سپی بەشداری ڕێوڕەسمی دوو پرسەمان کرد، یەکێکیان ناوی ڕەؤوف ئەبوبەکرە خەڵکی تەوێڵەو لەشاری لەندەنی وولاتی بەریتانیا کۆچی دوایی کردوە، ئەویتریشیان هەر خەڵکی تەوێڵەو دایکی یونسی خەیاتە.

ئەمڕۆ هەینی ١٩٩٩/٧/١٦، لەبارەگای مەڵبەند بووم، دوای تەواو کردنی ئیشوکاری ئاسایی و ڕۆژانە، تیمی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان هاتن و داوایان کرد، مەفرەزەیان لەگەڵ بنێرم بۆ هەورامان، پێم وتن خۆم ئەچم بۆهەورامان ، ئێوەش ئەبەم، تیمەکەی کاک دڵشاد ئەحمەد بوو، ئەیان ویست ڕاپۆرت و بەرنامەی ژیانەوەو ئاوەدانکردنەوە ئامادەکەن. ڕۆیشتین گەیشتینە

ملەی چنار لەبیارە، ئێمە دوو ئۆتۆمبێلمان پێبوو، یەکێکیان هی تیمەکەبوو ئەویتر هی من بوو، شەش پێشمەرگەمان لەگەڵ بوو، بەقەرەباڵغی نەچووین بۆ ئەوە نەبینە جێگەی سەرنج و پرسیار لای بزووتنەوە، ئەوان (بزووتنەوە) دوای رێککەوتنیشمان لەسنووری هەورامان خۆیان بەباڵادەست ئەزانی، زۆرجار رێگریان دەکرد، لەهاتوو چۆی ئێمە.

ئەمرۆ کاتێک گەیشتینە ملەی چنار لەبیارە، هێزی دووی سۆرانی سەر بەبزووتنەوە بازگەیان دانابوو، ئەم هێزە دواتر جندول ئیسلامیان راگەیاند، بەردەمیان گرتین، چەندین چەکداری لەم لاولەولای جادەکەوە دەستیان کرد بەفرکان فرکان و فیشەکیان لێخورین، چەند چەکداریش کەهاتنە بەردەم ئوتومبێلەکەی ئێمە، پێشمەرگەکانی ئێمە دەرگای ئۆتۆمبێلەکەیان کردەوە دابەزن، ئەوان هاواریان کرد دانەبەزن ئەتان کوژین، من بەبرادەرەکانی خۆمانم ووت دامەبەزن وەلامیشیان مەدەنەوە، یەکێکیان هاتە لای دەرگای لای راستەوە پرسی ئێوە کێن؟ من وەلامم دایەوە، یەکێتین، پرسی بۆکوێ؟ ووتم ئەچین بۆ تەوێڵە. ووتی نابێ بگەڕێنەوە، ووتم بۆ چی روویداوە؟ ووتی مەمنوعە نابێ بچن بگەڕێنەوە. ووتم باشە پەیوەندی بکەن بەمامۆستا مەلاعەلیەوە بڵێن مەفرەزەی راگەیاندنی یەکێتی دەچێت بۆ تەوێڵە، یەکێکیتر لەپشتی ئەمەوە کەمن قسەی لەگەڵ دەکەم وەستابوو، کاتێک گوێ لەناو هێنانیی ناوی مامۆستا مەلا عەلی بوو، لەباتی ناوی مامۆستا مەلاعەلی وشەیەکی ناشیرینی بەکارهێنا، ووتی مامۆستا........کێیە؟

بەشۆفێرەکەی خۆمانم ووت بگەڕێرەوە، گەڕاینەوە، بەدڵشادم ووت رێگایتر هەیە، ئێستا لەرێگای خەرپانییەوە ئەڕۆین، دڵشاد ئەحمەد ووتی دەرنگە بائێمە بڕۆینەوە بۆ سلێمانی. من پێداگریم نەکرد، ئەوان نەهاتن و راست گەڕانەوە بۆ سلێمانی، منیش چوومەوە مەڵبەندو پەیوەندیم کرد بەکاک قاسمی مەلامستەفای کۆکۆییەوە، روداوەکەم وەک خۆی بۆ باس کرد، دوای وتوێژێکی کورت ووتی ئەوانە سەرکێش و ناحاڵین چی بکەین؟، ئێوە ئەم ماوە هاتوچۆی هەورامان مەکەن. بەقسەکانی کاک قاسم دا زانیم ئەوانە(هێزی دوی سۆران) حیساب بۆ مەکتەبی سیاسی بزووتنەوەو ماڵی مامۆستاش ناکەن.

هەر ئەمڕۆ لەوبارەوە نامەیەکم بۆ مام جەلال نوسی و وێنەیشیم بۆ کاک سەعدی پیرەو کاک قاسم نارد، کاک سەعدی بەرپرسی پەیوەندیەکانی یەکێتیە، کاک قاسمیش دۆستی مام جەلالەو ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزووتنەوەیە، دوای عەسر خۆم لەڕێگای خەرپانییەوە چووم بۆ (دۆڵبیان) ئاواییەکەی خۆمان لەهەورامان.

ئەمڕۆ شەممە ١٩٩٩/٧/١٧ لەدۆڵبیان بووین، کاک باقی هەورامی و کاک حەمەحسێنی حاجی فەرەج و کاک بێستونی کوڕی و کاکە حەمەی حەبیب (خاڵە حەمە کەلا) میوانمان بوون، بۆ ئێوارەی ئەمڕۆ لەبەر ئەوە لەدۆڵبیان شوێنمان باش نەبوو، دادە سەبیحی خێزانی شەهید ستاریش میوانی کاک عەزیزی حاجی ئەولە بوو بوو، نەیتوانی بوو بچێتە خوارەوە بۆ تەلانەگەورە[1]، لای دایکم مابووەوە، ئێمە چووینە خوارەوە بۆ تەلانەگەورە، شەویش لەوێ ماینەوە.

لەنزیک کەپرو هەوارەکەی ماڵی کاک عەزیزدا شوێنیان بۆ چاک کردین، ئەوانیش میوانیان هەبوو، ئێوارە چەند کەسێک لەمیوانەکانیان لەوێ نەمانەوە، گەڕانەوە بۆ تەوێڵە، لەوانە کاک هادی حەمەی سان ئەحمەد بەرپرسی ڕێکخراوی تەوێڵەی پارتی لەگەڵ کاک موعتەسەم ئەولمحەمەد (پاشا).

ئێمە دوای نان خواردنی ئێوارەو پشوودان، بەجیا لەگەڵ پێشمەرگەکان، لەشوێنی خەوتندا دانیشتین. پێشمەرگەکانیش شوێنیان چاک کردو پاسەوانیان دانا، درەنگانی شەو کەهێشتا من و کاک بێستونی هاوڕێم لەپەنایەکەوە بووین نەخەوتبووین. کاک بەختیار مەحمود و خاڵە حەمەش نەخەوتبوون، شەوێکی تاریک و ئەنگوستە چاوە، جگە لە خوڕەی ئاوی چۆمەکە هیچ دەنگێکی تر نەبوو، لەناکاو بوو بەمیل ڕاکێشانی چەک و فیشەک لێخوڕین، گۆران جەلال بەرپرسی دەستەی پاسەوانەکانمان بوو، ٦شەش پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو، هاواری دەکرد چەکەکانتان فڕێ دەن، وەرنە پێشەوە، دەی تا نەکوژراون، لەبەرامبەریشدا هاتووهاوار بەرز بووەوە،

---

[1] تەلانە گەورە، ناوی باخێکی خۆش و مەشهورە لەناوچەی هەورامان و لە سەرچۆمی تەوێڵەدا، ئەکەوێتە نێوان ئاواییەکانی پالانیاو سۆسەکان، لەبەردەم ئاوایی دۆڵبیان دا، خاوەنی باخەکە، خوالێخۆش بوو حاجی عەبدولا نەسرولایە (حاجی ئەولە)، لەسەردەمی خۆیدا باخێکی پڕسەمەرو جێگای گەشت و سەیران بووە.

ئێمەین بزووتنەوەی ئیسلامی ڕێگەمان هەڵە کردووە، گۆران مەجالی نەدانێ هاواری دەکرد بابەرپرسەکەتان بێتە پێشەوە، دەی زوو. ئەم بگرەو بەردە کۆتایی نەهاتبوو من بەدەمانچەکەی دەستمەوە، گەیشتمە لای گۆران، ئەبینم قۆڵی کەسێکی گرتوەو بەبێچەک، لەوان دوور کەوتوەتەوەو بۆ لای ئێمەی ئەهێنێ، ووتی ها ئەوە مەلا عابدە، من قۆڵی مەلام بەدەستێک گرتوو دەمانچەکەشم بەدەستەکەی ترمەوە بەرزم کردبووەوە، لەو کاتەدا کاک حەمەحسێن هاواری کرد حەمە هەرچی ئەکەی بەعاقڵانە بیکە، دیارە کاک حەمەحسێن ترسی ئەوەی هەبووە بیکوژین[1]. لەولاوە دوبارە بووەوە بەهاتو هاوار مەفرەزەکەی بزووتنەوەیان پێچابووە گۆشەیەکەوە، گۆران و هاوڕێکانی داوای چەک دانانی ئەوانیشیان دەکرد. من پرسیم مەلا بۆ چی هاتویت؟ ووتی بەو قورئانەی خوێندومە لە ئاوایی جاوەرەوە هاتوم بچم بۆتەوێڵە ڕێگەمان هەڵەکردوە. ئەمزانی درۆدەکات، کاک باقی و کاک حەمەحسێن هەستابوون و زۆر تکایان کرد بۆ ئەوەی شتەکە گەورە نەبێ مەلاعابد بەر بدەین و بانگی گۆران و هاوڕێکانیشی بکەین واز لەوانی تر بهێنن، خاڵەحەمەش هاواری دەکرد لێیاندەن، بەقسەی ئەومان نەکرد، بەقسەی خاڵە حەمە کەلامان بکردایە ئەبوایە بمان کوشتنابیە.

من قسەی ئەو دوو پیاوە کاک باقی و کاک حەمەحسێنم بۆ هیچ شتێک ڕەدنەدەکردەوە، بۆیە یەکسەر ووتم باشە کاک حەمەحسێن. داوام کرد گۆران چەکەکەی هێناو بەمەلام ووت ئەوە چەکەکەت برادەرەکانت بانگ بکەو وەرن بڕۆن، چەکەکەم دایەوە، برادەرەکانی هاتن و زۆر شپرز بوبوون، مەلا ووتی ناڕۆین ئەبێ یەکێک بنێریت ڕەوانەمان بکات. کاک باقیش بە کاک بەختیاری خوشکەزای ووت تۆ بڕۆ لەگەڵیان، لەوکاتەدا کەوتنەڕێ، خاڵە

[1] لەو کاتەدا قسەکەی کاک حەمەحسێن کاریگەری هەبوو، چوونکە من خەیاڵم خراپ بوو کاتێک گۆران مەلای بەبێ چەک دایە دەستم، دڵنیابووم هاتوون بۆ چەککردن یان کوشتنمان.

ئەو شەوە ئێمە ئیتر نەخەوتینەوە. سەیرانەکەمان لێ تێکچوو، من بۆ هاوڕێکانم و میوانەکانم قسەم کرد، بۆم باس کردن، ووتم لەو کاتەدا زۆر (خەیاڵ) بیرم بەسەردا ئەهاتن، لەوانە: ئەمووت بیکوژم، نا کوشتنی ئەبێتە هۆی درووست بوونەوەی شەڕ لەنێوان یەکێتی و بزووتنەوە، مام جەلال تورە ئەبێت و ئەڵێت بۆچی گەیشتویتە ئەو شوێنە؟ نابەخوا لەویش خۆم قاچاخ ئەکەم، ئەم بیرانەو چەندی تر......

حەمە، ووتی: مەلا ئەمە حەمەکەی ترنییە. ( مەبەستی خاڵە حەمە، کاک حەمەی زاوای بوو کارگێڕی لقی ١٢ دوانزەی پارتی، ئەوەبوو پێشتر باسمان کرد لە میوانداریەکی رێخراوی کرۆدا چووبوونە سەریان و چەکیان کردبوون).

هەرچەندە مەلاعابد ئەوکات لەتەوێڵەدا بوو رێزی کەسوکاری ئێمەی ئەگرت، جارێکیشیان باوکم کێشەی باخ و ئاوی هەبوو بوو لەگەڵ مامەکانم، مەلاعابد بۆی چارەسەر کردبوون و نامەیەکیشی بۆمن لەوبارەوە نوسیبوو. نەم ئەزانی بۆچی ئەو شەوە هاتوەتە سەرمان. بەڵام دوایی کەسێکی بزووتنەوە کەلەو مەفرەزەدا بوو، بۆی گێڕامەوەو ووتی :( ئەو ئێوارە کەسێک هاتە بارەگاکەمان و قسەی لەگەڵ مەلا عابد کرد، ئەو رۆیشت و کاک مەلا عابد ئێمەی کۆکردەوەو پێی ووتین دووکەسی دەوڵەمەند لەو چۆمەی سۆسەکانن مەشروب ئەخۆنەوە، لای حەمەی حەمەسەعیدن، حەمەش دووکەسی لەگەڵ دایە، ئەچینە سەریان و ئەیانگرین. ئەمە بۆ ئەوە هاتبوو گوایا لەسەر مەشروب خواردن ئەو دووپیاوە بگرێ و ئەوانیش بەپارەیەکی زۆر سڵحی لەگەڵ بکەن) ، دیارە ئەو کەسە بەهەڵە زانیاریەکەی داوە چوونکە نە ئەو پیاوانە مەشروبیان خواردبووەوەو نەمنیش دووکەسم لەگەڵدا بوو زیاتر بووین.

ئەمشەو نەخەوتین و بەیانی بەورییاییەوە گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە نەوەک بزووتنەوە لەسەر رێگا بۆسەیان بۆ دانابین، لەنێوان بەڵخەو بیارەدا لاماندا و لەرێگای خەرپانییەوە گەیشتینەوە هەڵەبجەو هیچ باسێک نەبوو.

ئەمرۆ سێ شەمە ٧/٢٠ لەدوای تەواو کردنی ئیشوکارەکان لەهەڵەبجە، چووم بۆ شارۆچکەی دەربەندیخان، بۆبەشداری کردن لەرێوڕەسمی پرسەی خوالێخۆش بوو کاکە حەمەی مستەفا، حەمەی مستەفا خەڵکی ئاوایی عەبابەیلێی بنار چیایی شنروێیە، پیاوێکی کورد پەروەرو بەڕێز، راستگۆ و قسە رۆیشتوو، خاوەن دیوەخان و سفرەو نان بوو.

رۆژی ٧/٢١ لەسلێمانییەوە چووم بۆ شارەزوور، سەرەتا سەردانی حاجی عەبدوڵای شەریفم کرد لە ئاوایی خانە قەویلە (مایندۆڵ) ، خانەقەویلە ئەکەوێتە نیوان ئاواییەکانی کانی سپیکەی پەرخ و سەراوی سوبحان ئاغاوە، حاجی عەبدولا پیاوێکی قسەزان و دیاری ناو تیرەی هۆز هەسەنییە، کوڕێکی

بەناوی عەلی مایندۆلی کادری یەکێتیە، لەسنووری کۆمیتەی ڕێخستنی سەیدسادق. دواتر چوومە بارەگای مەڵبەند، ئەمڕۆ بارەگا زۆر قەرەباڵغ بوو، لەبەر ئەوە نەچوومە ژورەوە، هەرلە حەوشەکەدا لەگەڵ خەڵکەکە کەووتمە قسەو باس و نامە نوسین بۆیان، بەشی زۆریانم ڕەوانە کرد، دوای تەواو بوونی ئیشوکاری حزبی، پاش نیوەڕۆ سەردانی ڕێوڕەسمی چەند پرسەیەکی ناوشارمان کرد و دواجار کاک مالی مەقسودی حەمە حەسەنمان بەسەر کردەوە بۆ پرسەی کوڕەکەی.

ئەمڕۆ پێنجشەممە ٧/٢٢ هەوا گەرمی کردووە خزمەتگوزاری بۆ هاووڵاتییان کەمە بەتایبەت ئاوکارەبا، لەوبارەوە هاووڵاتییانی هەرێمی کوردستان کێشەو گرفت و دەردی سەریان زۆرە، بەتایبەت لەشارو شارۆچکەکاندا، ئەو هاووڵاتییانەی لەئاوایییەکانی دەرەوەی شارەکاندا دەژین گوزەرانیان باشترە بەتایبەت ئەوانەی لەناوچە شاخاوی و کوێستانییەکاندان.

ئەمڕۆ چووم بۆ شاری سلێمانی، پاش نیوەڕۆ بەشداربووم لەڕێوڕەسمی خواردنەوەی شەکراوی د.جوان و کاک شەوکەتی حاجی موشیر لە هۆڵی ئۆتێل ئەبووسەنا، ئەبووسەنا هاوارو دادی بوو لەدەست بێ ئاوکارەبایی و نەبوونی سەهۆڵ. ڕۆژی شەممە گەڕامەوە بۆ هەڵەبجەو لەبارەگای مەڵبەند پێشوازیمان کرد لە برایانی مەڵبەندی یەکی بزووتنەوەی ئیسلامی، لەدانیشتنێکی هەردوولاماندا قسەو باسمان کرد لەسەر کێشەو گرفتەکانی سنوورەکەو بڕیار درا هەردوولا بەراستی هەوڵی ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکەو کەمکردنەوەی گرفتەکانی نێوانمان بدەین.

پێش نیوەڕۆی ڕۆژی دوو شەممەش ١٩٩٩/٧/٢٦ چووم بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ مەکتەبی ڕێکخستن دا، لەکۆبونەوەکەدا دابەشکردنی ئەندام بەشەکان بەسەربەشەکانی مەڵبەندا بڕیاری لێدرا، دواتر لەگەڵ بەشی روناکبیری مەکتەبدا باس لەکێشەو گرفتی ئەوبەشە کراو بڕیار درا کەم و کورتیەکانی بەشی روناکبیری مەڵبەندی شارەزوور چارەسەر بکرێن. پاش نیوەڕۆ گەڕامەوە بۆهەڵەبجە، چەند میوانێک لەبارەگای مەڵبەند چاوەڕوان بوون، ئەوانم بەرێکردو لەگەڵ چەند هەڤاڵێک بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی زمناکۆ بارامم کرد، خوالێخۆش بوو خەڵکی عەبابەیلێ و بەپێکدادانی ئۆتۆمبێل گیانی لەدەست دابوو، دواتر سەردانی حاجی غەریب بۆینی برای شەهید

ئیبراهیم بۆینیم کرد، بەبۆنەی دەر چوونی لە نەخۆشخانە، پێش چەند رۆژ کۆمەڵێک خەڵک ئەچن بەگژیەکداو حاجیش نێوبژیوانی دەکات لەونێوانەدا بریندار بووبوو.

سەرلەئێوارەش چووم بۆ سەردانی ماڵی مام مەجید لەکانی پانکە مام مەجید پیاوێکی بەرێزە بەتەمەن و پێشمەرگەی دێرینە. رۆژی سێشەمەش ٧/٢٧ لەشارەزوور بووم لەسەراوی سوبحان ئاغا سەردانی کاک جەلال کولکنی و هەڤالانی پێشمەرگەمان کرد، لەوسەردانەدا قسەوباسمان لەسەر دابەش کردنەوەی هێزەکەی پارێزگاری مەڵبەندو هێزەکانی فەرماندەییمان کرد بەسەر رەبیەو بنکەکانی سنوورەکەدا.

دواتر سەردانی کۆمیتەی رێکخستنی سەیدسادق و بارەگای رادیۆی شارەزوورمان کرد، لەوێ لەگەڵ کۆمەڵێک هاوولاتی و کادری حزبی و چەند فەرماندەیەکی پێشمەرگەدا دانیشتین بۆقسە کردن لەسەر رەخساندنی بارودۆخێک بۆچارەسەر کردنی کێشەی نێوان ماڵی حەمەی کوێخا فەرەجی پەلی هێرۆیی و ماڵی خالیدی شێخ مەحمود( خالیدی خولە سور). هەردوولا خزمن بەلام کێشەیان هەیە.

پاش نیوەڕۆ بەشداریمان کرد لەرێورەسمی پرسەی حاجی ئەمنەی باوەژنی کاکە سابیری فەرەجی شاتریدا، شاتریەکان لەشارەزووردا تیرەیەکی دیاری جافن، دۆست و پشت و پەنای یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بوون لەسەرەتای شۆڕشدا، بەدەیان پێشمەرگەو کادرو فەرماندەو شەهیدیان بەخشی بەکوردو کوردستان، لەو رێگەشدا زەرەروزیانی زۆریان بەرکەوت، من لەگەڵ چەندین بنەماڵەیان جگە لە پەیوەندی حزبایەتی و پێشمەرگایەتی، دۆستایەتی و تێکەلاویشم هەیە، لەوانە بنەماڵەی حاجی تالیم، بەتایبەتی لەگەڵ حاجی خاوەری کچی قادری مارف شێرەژن و شاژن، ژنێکی بەقابیلیەت و بەهەیبەت، خاوەن دیوەخان و سفرەو نان، حاجی خاوەری خێزانی حاجی تالیم دایکی کاکە حەمە و حەسەن و عەلی و سالارو سەلام و سەردار، ئەم ماڵە، حاجی خاوەرو کورەکانی خزمەتی زۆریان بە یەکێتی و پێشمەرگە کردوە، بەداخەوە دوای سەرکەوتن وەک پێویست لەبەرانبەر کوردایەتی و ئەو خزمەتەدا پاداشت نەدرانەوە، بەلام من هەر ئەوەندەم لەدەس هات وەک

وەفـایەک دواتـر لەبەر خـاتری ئەم بنەمـاڵە لەدڵەوە لەخـوێنی بـرایەکم لەشاتریەکانی خزمیان خۆش بووم.

ئەمڕۆ سێ شـەممە ١٩٩٩/٨/٣ سـەرەرای بێتاقەتی و تـوڕەی خەڵک لەبـارودۆخە سیاسـی و ئـابووری و ئیـدارییەکەی نـاوچەکە، شـەپۆلێکی گەرمایەکی تاقەت پروکێنیش رووی لەناوچەکە کردوە. قاڵبێک سـەهۆل بە ٢٠بیسـت دینـارە لە شـاری سلێمانی، دەنگوباسـی هـاتنی هێزی سـەربازی ئەمریکا و فەرەنسا و بەریتانیا بۆ ناوچەکەو بۆ پارێزگاری لەکوردەکان هەیە. حزبی سۆشیالیست کێشەو گرفتی ناو خۆی حزبی هەیەو چەندین کادرو بەرپرسی سۆشیالیست خەریکە هەڵوێست وەرگرن و لەکاکە حەمەی حاجی مەحمود هەڵگەڕێنەوە، ئەویش لەهەوڵی چارەسـەرکردن و هێورکردنەوەی بـارودۆخەکەدایە. مـن وەک بەرپرسـێکی یەکێتـی حەزنـاکەم کـاکە حەمەو سۆشیالیست کێشـەی هەبێ، یـان لاوازببێت، چونکە کاکە حەمە دۆسـتێکی راستەقینەی مام جەلال و یەکێتی نیشتیمانیە، لەتەنگانەدا پشتگیرو هاوکاری یەکێتییە، بەلام بەداخەوە هەندێک برادەر وابیردەکەنەوە ئەگەر چەندکەسێک لەکاکە حەمە دوور بخەنەوەو بێنە ناویەکێتی ئەوە چالاکیان کردوە، من لەگەڵ برادەرانـی مەکتەبـی سیاسـی قسـەم کـرد، کەراکێشـانی کـادرو پێشـمەرگە لەناوسۆشیالیستەوە لاواز کردنـی دۆسـتێکی راسـتەقینەیە. بەلام بەپاسـاوی ئەوەی ئەگەر یەکێتی وەریان نەگرن ئەچنە ناو پارتی، وەلامیان دامەوە.

ئەمـڕۆ هەینـی ١٩٩٩/٨/٦ سـەرلەبەیانی لەگەڵ کـاک جەبـار جەلال سەردانی هەڤال کاک ئەرسەلان بایزم کرد لەدەرەوەی وولات گەڕاوەتەوە، کاک عادل نادر و یەکێتی ژنان سەردانیان کردم، هەرئەمڕۆ مامۆستا ئەیوب کوێخا رۆستەم و هەڤالانی کۆمیتەی قەزای شارەزوور سەردانیان کردم و گـلەی و نارەحەتیـان هەیە لەدەسـت بـارودۆخە حـزبیەکە و دەسـتەو دەسـتەگەری و ئەو دەسـت تێوەردانـانەی دەرەوەی مەڵبەنـدەکە بەرامـبەر بەمەڵبەند، داوایان کرد ئەگەر یەکێتی بەخۆدا نەچێتەوەو مەڵبەند سنوورێک بۆ دەستەو دەستەگەری دانەنێت دواجار کێشەکان قوڵبوونەوە یەکێتی زەرەر دەکات، منیش بۆم باس کردن مەڵبەند ناتوانێت کێشەی دەستەو دەستەگەری بنبڕبکـات، ئەودەردە لەسـەرەتاو لەدروسـت بـوونی یەکێتـی نیشـتیمانییەوە هەیەو بەردەوامەو بەردەوامیش دەبێت، لەگەڵ تێپەڕبوونی کـات و بەهۆی

جیاوازی ناوچەکانی ژێردەستەلاتیشی ئەو منافەسەو* ململانێ گۆڕاوەو ئەگۆڕێت، پێم ووتن بەڕای من بەتێپەڕبوونی کات ئەمە وەک دیاردەیەکی نەشیاو زەقترو تۆختر ئەبێت، بۆم باسکردن زۆرتر لەسەر دەستەلات و پلەو پۆستە نەک لەسەر جیاوازی بیرو بۆ چوونی سیاسی. هەڤالێک پرسی ئەی چۆن مام جەلال و برادەرانی مەکتەبی سیاسی ئەو کێشە چارەسەر ناکەن؟ پێم ووت ئاخر مام جەلال خۆی ئیدارەی ئەو ململانێ دەدات لەنێوان جێگران و بەشێک لەئەندامانی مەکتەبی سیاسیدا. ئەوان ڕۆیشتن و منیش دەستم کرد بەکاری وەرگێران.

ئەمڕۆ شەممە ٨/٧ /١٩٩٩ دوای ئەوەی دڵنیا بووم لەمەکتەبی سیاسی کە برادەرەانی سۆشیالیست وەردەگرن، سەردانی ماڵی کاک عەتاسەراویم کرد، چوونکە کێشەو گرفتەکانی ناو سۆشیالیست سەری کێشا بۆ دەرچوون و جیابوونەوەو بەجێ هێشتنی چەندین فەرماندەو کادرو پێشمەرگەی سۆشیالیست و هاتنیان بۆ ناو یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەوانە لەسنووری ئێمەدا، عەتاو رەمەزان دێکۆنی. لەوێوە سەردانی فەرماندەیی شارەزوورمان کرد، دواتر چووینەوە مەڵبەند کۆبوونەوەی گارگێڕیمان هەبوو. دوای کۆبوونەوەو ئەنجامدانی ئیشوکاری ئاسایی، لەگەڵ چەند هەڤاڵێکی مەڵبەندا هاتمە سلێمانی و سەردانی ماڵی شلێرخانمان کرد.

بڕیارە بەیانی لەگەڵ شلێرخان و کاک جەبار جەلالدا دانیشتنێکی تایبەت بکەین لەبارەگای مەڵبەند لەهەڵەبجە، ڕۆژی ١٩٩٨/٨/٨ کۆبوونەوەکەمان کرد شلێرخان هەندێک شتی تایبەتی بۆباسکردم، دوای کۆبوونەوەکە سەردانی ئەنجومەنی کۆمیتەی هەڵەبجەمان کرد، باسمان لەکێشەو گرفتەکانی کۆمیتەکە کرد، بڕیارە بەیانی سەردانی کاک د. کەمال فوئاد بکەین. ئەمڕۆ یادی ڕێککەوتنی ئێراق و ئێرانە دوای شەڕێکی خوێناوی هەشت ساڵە.

ئەمڕۆ دوشەممە ١٩٩٩/٨/٩ لەگەڵ هەڤالان کاک وریا هاواری و شلێرخان و جەبار جەلالدا چووین بۆ بارەگای مەکتەبی سیاسی لەقەڵاچوالان، کاک قادری حاجی عەلی و کاک د.کەمال فوئادمان بینین، دوای گفتوگۆ و باسکردنی بارودۆخی سیاسی و حزبی یەکێتی لەناوچەکە و پەیوەندیەکانمان لەگەڵ لایەنە سیاسییەکان و بەتایبەت لەگەڵ بزووتنەوەی

ئیسلامی و کێشەکانی ئیداریی لەشارەزوورو ناوچەکەدا، زیاتر لای کاک د. کەمال ماینەوە، دکتۆر باسی مێژوو و زمان و کلتوری ناوچەی هەورامانی کرد، ووتی پاکترین زمان یان لەهجەی کورد زمانی هەورامیە، لەهەوراماندا ئەو لەهجە پاکترینەکەی ئەوەیە ژنان پێی گفتوگۆ دەکەن، چوونکە ژنان لەپیاوان کەمتر لەناوچەکە چوونەتە دەرەوە، تێکەڵاوی ئەملاو ئەولا نەبوون. ئەیوت دەبوو زمانی فەرمی کوردی زمانی هەورامی بووایە. دواتر باسی ئەوسێ قەباڵەی کرد کەبەزمانی ڕۆمی و گریکی نوسراون و لەهەورامان دۆزراونەتەوە و لەساڵی ١٩٠٩ز دا براون بۆلەندەن و لەلایەن زمان ناسانەوە شیکردنەوەیان بۆکراوە، ناوەرۆکیان باس لەکڕین و فرۆشتنی مێوە دێم (ڕەز) دەکات.

قەباڵەکانی هەورامان: سەبارەت بەچۆنییەتی دۆزینەوەی ئەو قەباڵانەو گەیشتنیان بەدەرەوە و بەدەست پسپۆڕانی زمانەوانی لەلەندەن و ناوەرۆکیان و جۆری ڕێنوس و ئەلف و بێی قەباڵەکان. بەهۆی بڵاو کردنەوەیان لەچەندین گۆڤارو کتێبدا، لێرەدا پێویست بەدووبارە کردنەوە ناکات و ئێرەش جێگەی ئەو باسە نییە، تەنها بەکورتی لەوبارەوە ئاماژە بە لاپەڕە ٨٢ ی مێژووی هەورامانی مامۆستا حەمەئەمین هەورامی دەکەم بەم شێوەی خوارەوە:

لەوێدا دەڵێت: لەهەورامان لەلایەن سۆفیەکی شێخەکانەوە سێ پارچە پێستە ئەدۆزرێتەوە، ئەو پێستانە نوسینیان لەسەر بووە، لەساڵی ١٩٠٩دا بەهۆی د.سەعید خانی کوردستانییەوە گەیشتونەتە دەست پرۆفیسۆر (ئی. ئێچ. منس)، لەلەندەن پرۆفیسۆر منس یەکێک لەو پێستانە ئەنێرێت بۆلای (ئەی کاولی) کەنوسینی سەری بەئەلف و بێی ئارامی ئەبێت، بۆ ئەوەی ئەو، واتە پرۆفیسۆر کاولی وەک پسپۆڕی ئارامی لێی بکۆڵێتەوەو ناوەرۆکەکەی ڕون بکاتەوە.

دوای لێکۆڵینەوە لە دوو پارچە پێستەکەیتر کە بەزمانی گریکی بوون لەلایەن پرۆفسۆر منس خۆیەوە، دەرکەوت مێژووی نوسینی یەکێکیان بۆساڵی ٨٨ی پێش زایین ئەگەڕێتەوە، ئەوی دیکەشیان بۆ ساڵی ٢٢-٢١ پ ز ئەگەڕێتەوە. ئەوەی لەلایەن (مینس)ەوە سەبارەت بەناوەرۆکی ئەو دوو قەباڵە بڵاو کرایەوە لەڕێکەووتی ساڵی ١٩١٠زاینیدا بوو. بڵاو کردنەوەی ناوەرۆکی

ئەویان کە منس بۆ کاولی ناردوە دوا ئەکەوێ بۆ ساڵی ١٩١٩ زاینی.
لەلێکدانەوەکەی کاولیدا مێژووی نوسینی ئەمەیان ئەگەڕێتەوە بۆ١٢-١١ی پێش زایین.

بەپێی ئەو سێ مێژووە جیاجیایانەی سەر قەباڵەکان بۆمان دەر ئەکەوێ لەسەردەمی سێ فەرمان ڕەوایی جیاجیای دەورانی ئەشکانییەکاندا نوسراون.
ناوەرۆکیشیان سەندی کڕین و فرۆشتنی مێوە (ڕەزە) دەێمە.

لەقەڵا چوالانەوە هاتمە سلێمانی شەو لەماڵەوە خەریکی کاری وەرگێڕانی چیانشینانی زاگرۆسم، کاک بێستونی هاوڕێم لەلام بوو، بۆئەوەی بێتاقەت نەبێت کتێبی بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگم داوەتە دەستی و داوام لێکرد بیخوێنێتەوە.

ئەمڕۆ سێ شەممە ١٩٩٩/٨/١٠ بەیانی چووینە شارۆچکەی سەیدسادق تانیوەڕۆ لەبارەگای کۆمیتەو بارەگای رادیۆی شارەزوور خەریکی ئیشوکاری حزبی بووم، بۆنیوەڕۆ میوانی ماڵی کاک حەمەی کیوێخا فەرەج بووین، هەڤالانی فەرماندەیی شارەزوورو کۆمیتەو رادیۆم لەگەڵ خۆم برد، ماڵی کاکە حەمە لەگەڵ خزمەکانی خۆیان لەبناری شارەزوور ساردی و کێشەو گرفتیان هەیە، هەمووشیان دۆستی یەکێتی و ئێمەن، بۆیە هەولم دا رێک بکەون و چارەسەری کێشەکانیان بکەن تا گەورەتر نەبن و هەردوولا تووشی زیانی زیاترنەبن.

ئەمڕۆ٨/١١ لەگەڵ لقی خوێندکارانی شارەزووردا سەردانی کاک جەبار فرمانم کرد، خوێندکاران توێژێکی دڵگەرم و ئیشکەرو دڵسۆزن، ئەمەوێت لەسنووری مەڵبەندی شارەزووردا گەشەی زیاتر بکەن و لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە پێش کەون بۆئەو مەبەستە پەنا بۆ ئەملاوئەولا ئەبەم تا هاوکاری زیاتر بکرێن، بەلام بەداخەوە کێشەی دەستەو دەستەگەری لەوبارەوە رێگرەو ئەوانیشی کردوەتە دووبەش. دوا نیوەرۆ لەماڵەوەم کاتژمێر (٣:٥٠) سێ و پەنجاو خولەک رۆژگیرانڕوویدا.

ئەمڕۆ پێنج شەممە ٨/١٢ لەدەشتی شارەزووردا بووم لەگەڵ کاک جەبار جەلال و چەند هەڤاڵێکی تری مەڵبەندا سەردانی ماڵی چەند هەڤاڵێکی سەربەرێکخستنمان کرد لەئاواییەکانی کانی پانکە، قاڵی جۆو مواندا، دوا نیوەڕۆش سەردانی بارەگای کۆمیتەی قەزای شارەزوورو ماڵی چەند

هەڤاڵێکی ترمان کرد، لێرەش لەناو هەڤالانی کۆمیتەدا کێشەو گرفت هەیە، بۆیە بریارم داوە لایەنگری هیچ لایەکیان نەکەم دژی لاکەیتر، هەرچەندە یەکتر تۆمەت باردەکەن و هەریەکەو هەوڵ دەدات سۆزی من بۆ لای خۆی راکێشێ، منیش گوێ بۆ هەموویان ئەگرمم بەلام عەقلی خۆم بەرامبەر بە کێشەکانیان بەکار ئەهێنم. لەکانی پانکە مالی حاجی کاکە حەمە دۆستمە، حاجی کاکە حەمە پیاوێکی ناوداری ناو هۆزی جافە، تەمەنێک زۆرو پربەرەکەتی کرد، کاکە کەریمی کوری پیاوێکی بەهیمەت و شەهیدێکی شەری ناوخۆیە، مالێکی خاوەن سفرەونانن.

ئەمرۆ هەینی ٨/١٣ لەماڵەوە بەکری زەراعەو عەلی حاجی فەرەجی نەورۆلی سەردانیان کردم هەردوکیان کادری مەڵبەندی شارەزوورن گلەییان هەیە و داوا دەکەن من پشتگیریان بکەم، بەکری زەراعە پێشمەرگەو زیندانی سیاسی و کورێکی باشە، عەلیش پیاوێکی ئاگاو رۆشنبیرە.

ئەمرۆ شەممە١٩٩٩/٨/١٤ لە هەڵەبجە لەبارەگای مەڵبەندا بووم تا نیوەرۆ خەریکی جێبەجێکردنی ئیشوکاری ئاسایی رۆژانەی خۆم بووم، دوا نیوەرۆ سەردانی ئاوایی تەپەکورەم کرد بۆ بەشداری لەرێورەسمی پرسەی مام عەبدلقادر باوکی عەلی، دوانیوەرۆ سەردانی شاری سلێمانیم کرد شاهۆ محەمەد سان ئەحمەد گیراوە خەلکی تەوێڵەیە، لەگەڵ کاک سەرکەوت حەسەن بەرپرسی ئاسایش قسەم کرد، پێموت شاهۆ لەسەر چی گیراوە، ووتی لەسەر داوای وەزارەتی ناوخۆ گیراوە.

ئەمرۆ یەک شەممە ١٩٩٩/٨/١٥ نەچووم بۆ سەرکار، لەماڵەوە ئیشی وەرگێران دەکەم، شلێرغەفورو جەبار جەلال چوونەتە قەزای شارەزوور بۆ جێبەجێکردنی ئیشوکاری رێکخراوی ژنان، ئێوارە هاتنەوە سەردانی منیان کردو لەوبارەوە پێکەوە هەندێک گفتوگۆمان کرد.

ئەمرۆ دووشەممە ١٩٩٩/٨/١٦ رۆژێکی زۆر گەرمە سەرلەبەیانی لەگەڵ مامۆستا جەمالی حاجی محەمەددا سەردانی کۆمیتەی ناحیەیی تانجەرۆمان کرد لە شارۆچکەی عەربەتدا، زانایانی ئاینی لقی شارەزوور لە کۆنفرانسێکدا ئەمرۆ لێرە هەڵبژاردنەوەی لقەکەیان دەکەن. زانایانی ئاینی وەک رێخراوێک سەبەخۆنین، سەربەلایەنە سیاسیەکانی کوردستانن، لەدوای درووست بوونی ئیسلامی سیاسی وەک حیزب لەکوردستاندا، مەلاکانی سەربەرێخراوەکەی

زانایـان، لەبەرامـبەر مەلاکـانی ئیسـلامی سیاسـی و سـەلەفی و مەلاکـانی سـەربەگروپە تونـدڕەوەکان، کۆڵەوارن و وەنـاتوانن ڕووبەڕویـان ببـنەوە، زۆرجار مەلەکانی سەربەزانایان بە بەکرێگیراو هەتا هەڵگەڕاوە نـاودەبەن، زۆرجـار ڕێک کەوتـووە لەمزگەوتەکـان لەپرسـەکان لەکۆڕوکۆبونەوەکانـدا کەخۆم بەشـداربووم، منداڵێک وتـاری ئاگرین یـان تەفسـیری بـۆ قورئـان کـردوەو چەنـدین زانـای ئایینیش دانیشـتوون گوێیـان بۆگرتـووە، هێرشـی کــردوەتە ســەریان و تۆمەتبــاری کــردون بە بەرژەوەنــدی پەرســت، مورتەدو.......تاد، کەچی نەوێراون سەیریشی بکەن نەک وەڵامی بدەنەوە.

لەگەڵ مامۆسـتا بەشـداریمان کـرد لەکردنەوەی کۆنفرانسـەکەیاندا وەک میـوان دواتـر بەجێمـان هێشـتن و چـووین بۆمـاڵی مـام والـی بۆسـەردانی مناڵەکانی، مام والی پێشمەرگەی دێرین و خەڵکی شارباژێرە چەند ڕۆژ لەمەو پێش خۆی کوشتوەتەوە. هەر ئەمڕۆ سەردانی قائیمقامی هەڵەبجەمـان کـرد بەبۆنەی گەڕانەوەی لەسویسرا، لای ئێوارەش چووین بۆ ئاوایی دەرەشیش بۆ بەشداری کردن لە پرسەی جووتیارێکی ئاوایی بەناوی خاڵە حەمەئەمین.

ئەمـڕۆ سـێ شـەممە ١٩٩٩/٨/١٧ سـەردانی سـەربازگەیی سـەلامم کـرد لەنزیک شاری سلێمانی، لەگەڵ کاک جەبار فرمـان و کـاک کوردۆ قاسـم دا دانیشتین، ئەم دانیشتنە لەسەر داوای ئەوان بوو، سەرەتا هەواڵی بارودۆخی هەڵەبجە و شارەزوورو هەورامانیان پرسی، منیش وەڵامم، دانەوە ئینجا کاک جەبـار دەسـتی بەقسـەکردن کردو لەکاتی قسـەکردنیدا، هەسـتم کـرد چەنـد کـارگێرێکی مەڵبەنـد، چـووبنە لای و گلەییـان لەمـن کـردوە، منـیش وەڵامـی قسەکانم دایەوەو باسـی بارودۆخی نـاو مەڵبەندەکەم وەک خـۆی بـۆ روون کردنەوە، کاک جەبار ووتی وانییە تۆ ڕێگری لەبەردەم بەرنـامەی مامۆسـتا جەمالدا، منیش ووتـم وانییەو حەزدەکەم لەگەڵ مامۆسـتا جەمالـدا پێکەوە لەگەڵمـان دانیشـن، چـوونکە لەگەڵ مامۆسـتا جەمالـدا پەیوەنـدیمان باشـە، حەزیش دەکەم بزانم ئەوبەرنامەی م جەمال چییە من ڕێگرم لەبەردەمیدا؟ دوای هەندێک بێنەوبەرەو مناقەشە، ئەوەی ئەوان داوایان دەکرد من نەچوومە ژێر بار، کاتێک خواحافیزیم لێکردن، کاک جەبار بەساردیەکەوە ووتـی مـام جەلالیش نیگەرانە لێت، کـاک کـوردۆ هـات بەدوامـداو ووتـی مەڕۆ بچـۆ لە ژوورەکەی من دانیشە ئێستا منیش دێمەوە. من سەرەتا ویستم نەڕۆم بەڵام

تا حەوشەی دەرەوەش هاتم و کاک کوردۆ هات بەدوامدا، گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی کاک کوردۆ. کەهاتەوە واقسەی دەکرد قسەکانی جیاواز بوون لەقسەکانی پێشتر، ووتی مامۆستا جەمال لەتۆ رازیەو مەڵبەندەکەشی تەسلیمی تۆکردوە، ووتم ئێ وایە، ووتی دەی ئەبێ تۆش ئاگات لەبرادەرەکانی ئێمە بێت. ووتم کاک کوردۆ برادەرانی ئێوە کێن؟ من بەڵێنم بەمام جەلال داوە کێ ئیشکەرو دڵسۆز بێت پشتیوانی بکەم بێ جیاوازی، هەر واشم کردوە، لەبەر خاتری مام جەلال شەوورۆژ کار دەکەم، مادام مام جەلال لەمن بە گلەیە، ئەچم بۆلای بزانم گلەییەکانی لە سەرچییە؟ ووتی نانا، پێویست ناکات ئێمە تۆمان خۆشەوێت ویستمان پێکەوە دانیشین و ئەگەر لەمەڵبەندەکەدا ئەرقەلەو گرفت هەیە هاوکاریت بکەین، چوونکە ئێمە ئاگادارین هەندێک لای مام قسەت لەسەر دەکەن ، بەلام تۆ بەجۆرێکی تر تێگەیشتی. منیش تێگەشتم بابەتەکە چۆنەو چییە، درێژەم نەدایەو خواحافیزیم کردو چووم بۆسەردانی پارێزگار (حاکم قادر) بەرنامەمان دانا سبەینێ خۆی و ستافەکەی بێت سەردانی هەورامان بکەین.

ئەمڕۆ۱۹۹۹/۸/۱۸ لەگەڵ هەڤاڵ حاکم قادر حەمەجان و چەندین هەڤاڵی تردا سەردانی هەورامانمان کرد بۆکردنەوەی ئەوچوار مۆلیدە کارەباییەی بەهەوڵی مام جەلال دابینکرابوون بۆ شارۆچکەی خورماڵ، سەرگەت، سۆسەکان و تەوێڵە. کەش و هەوای ناوچەکە زۆر گەرمەو تەنها نزیکەی ٦ شەش کاتژمێر کارەبا نیشتیمانی ئەدرێت بە هاوولاتییان لە ٢٤ بیست و چوار کاتژمێردا .

ئەمڕۆ۱۹۹۹/۸/۱۹ لەماڵەوە بووم نەچووم بۆ دەوام، کەش و هەوایەکی گەرمی هەیە، ئاومان نییە دینەمۆی ئاو کێشانمان بەستوە لە شەبەکەی ئاوی ماڵەکەمان، تا ئاو بڕوات بۆ ناو تانکی سەربان ، ئەوەش کارێکی مخاڵەفەو نایاساییە. میوانی زۆرمان دێن و پارەشمان نییە، قەرزاری چەند دوکانیشین، بۆیە ناچار روداریم کردو نامەیەکم بۆ مام نوسی بۆ پارە. مەهدی برام و شەماڵی مام رەئیس سەردانیان کردم، بڕیارە رۆژی شەمە یەکگرتنەوەی بزووتنەوەی ئیسلامی و نەهزەی ئیسلامی ڕابگەیێنرێت، یەکێتی خەریکی ئاڵوگۆڕی وەزیرەکانە، سێ رۆژ لەمەوبەر بوومەلەرزە تورکیای هەژاندوە تائێستا نزیکەی ١٥ پانزە هەزار کوژراو ٢٠ بیست هەزار بریندار هەن.

ئەمرۆ هەینـی ٨/٢٠ لەسـلێمانییەوە چـوومە هەڵەبـجە بـۆ ئامادەکـاری پێشـوازی هـاتنی مـام جەلال، بریـارە سـبەینێ مـام بەشداربێت لە ئـاهەنگی یەککرتنەوەی بزووتنەوەو نەهزەدا، دوای ئەنجام دانی ئیشوکارەکان، شـەو بۆخەوتن بەنهێنی چوومە گەڕەکی شـارەوانی، لەمـاڵی پێشـمەرگەی دێرین فەیسەڵ کاکە وەهابدا بووم کاک عەبدوڵای حاجی عەلی سور لەگەڵ سەیاد هاواری لام بوون،

ئەمرۆ شەممە ٨/٢١/ ١٩٩٩ بەیانی زوو چوومە بارەگای مەڵبەند، کاتژمێر (١٠) دە ئاهەنگ و کۆڕو کۆبوونەوەکەی یەککرتنەوەی نەهـزەو بزووتنەوە دەست پێدەکات، لەناوباخی گشتی هەڵەبـجەدا، منیش خەریکی چاودێری و پرسـینەوەم لە ئامادەکاریەکـانی هێزەکـان و پێشـوازیکەران لەمـام جەلال، کاتژمێر٩ نۆ ئاگادار کرام لەلایەن سکرتاریەتەوە، ئاگادری بزووتنەوە بکەم مام ناتوانێ بەشدار بێت لەجیاتی ئەو کاک کۆسرەت دێت، منیش بەنـامەیە کاک عەبدولڕەحمان عەبدرەحیمم ئاگادارکردەوە.

دواتر خۆم و هەڤالانی مەڵبەند چووین بۆ باخی گشتی قەرەباڵغیەکی زۆر هەبوو ڕێوەڕەسمەکە کاتژمێر (١٠) دە دەستی پێکرد، سەرەتا مامۆستا مەلا عەلی ووتاری دەخوێندەوە، لەنیوەی ووتارەکەیدا بوو، کاک کۆسرەت لەگەڵ برادەرەکانی گەیشتن، لەوانە مستەفای سەید قادر، قادری حاجی عەلی، عیماد ئەحمەد و عومەر فەتاح ، شوێن نەبوو دانیشن، بڕێک بەپێوە وەستان، لەو هەموو ئەندامەی بزوتنەوە، کەس نەبوو بڵێت ئابابرادەرانی خۆمان هەسـتن ڕێـگە بـۆ ئەو میوانـانە چـۆڵ کەن، هەرچـۆن بـوو شـوێنیان بـۆ کـردنەوە، مامۆستاش درێژەیدا بەووتارەکەی، ووتارەکان و قسەکردنەکان غەڕابون و جۆرێـک وەک عەرزی عەزەلاتیـان پێـوە دیـاربوو، لەنێـوان دوو ووتـاردا چەکدارێکی نامۆ کەبەراست و چەپدا مەخزەن و فیشەک و نارنجۆکی بەخۆیدا هەڵواسـیبوو بەرەو لای سـەکۆی مکرۆفـۆنی بڵنـدگۆکان چـوو، چەنـدکەس لەسەرپەرشتیارانی ڕێوڕەسمەکە ویستیان ڕێگری لێبکەن و بیگێڕنەوە، بەلام بەگوێی نەکردن، دەستی گەیشتە میکرفۆنەکەو فویەکی پیاکرد و دەستی بەخوێندنەوەی شیعر کرد، شیعری چی؟ ئاگراوی بەجۆرێک رووی دەکردە ئـێمە و بەدەسـت ئامـاژەی دەکـردو دەینەڕانـد، برادەرێـک لەلامـا بـوو بەپێکەنینەوە ووتی: لەوە دەچێت دوای تەواو بوونی خوێندنەوەی شعرەکەی

ڤیروسیا بکات لەبیست سی کەسی خۆشیان و ئەوانیش بەئێمەوە دادورێت (بکوژێت). ڕێوڕەسمێکی قەرەباڵق و بێسەروبەر بوو، دوای تەواو بوونی برادەرانی ئێمە گەڕانەوە بۆ سلێمانی.

ئەمڕۆ ۱۹۹۹/۸/۲۲ لەبارەگای مەڵبەندی ڕێکخستن لە شاری هەڵەبجە بووین، کۆبوونەوەی دەستەی کارگێڕیمان هەبوو، هەموو هەڤالان ئامادە بوون بێجگە لە هەڤال شلێرخان، ئەم کۆبوونەوە تایبەت بوو بەهەڵبژاردنەوەی ڕێکخراوی ژنان و چەند بابەتێکی تر، لەم کۆبوونەوەدا مامۆستا جەمال باسی لەوەکرد، مام جەلال نیگەرانە لە هەڤال جەبار جەلال، چوونکە بۆ بەرژەوەندی دەستەکەی خۆیان تەداخولی کردووە، لەپرۆسەی هەڵبژردنەکەدا، لەراستیدا لاکەی بەرامبەر بەجەبارو ئەوان، ئەنجامی هەڵبژاردنەکەیان بەدڵ نەبوو بۆیە بەناراستی مام جەلالیان تێگەیاندبوو. دوانیوەڕۆ بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی عەلی شێخ کەریمی عەبابەیلێم کرد لەمزگەوتی دارولئیحسان، هەر ئەمڕۆ نامەیەکم بۆ مام جەلال نوسی سەبارەت بە تەشکیلات و ئیشوکارەکانی کۆمیتەی ڕێکخستنی هەورامان.

ئەمڕۆ ۱۹۹۹/۸/۲۳ لەماڵەوە بووم کاری وەرگێڕانی کتێبی چیانشینانی زاگرۆسم تەواو کرد، هەواڵەکان دەڵێن قوربانیانی زەمین لەرزەکەی تورکیا گەیشتوەتە ۱۲ دوانزە هەزار کوژراو ۳٤ سی چوار هەزار بریندار، لەدوای ۸/۲۳ تا ۸/۲۹ شتێکی ئەوتۆ نەبوو، بۆیە لەم چەند ڕۆژەدا دەستم کردووە بە پێدا چوونەوەی وەرگێڕانی چیانشینانی زاگرۆس .

ئەمڕۆ ۱۹۹۹/۸/۲۹ لەهەڵەبجەم، سەردانی ماڵی خوالێخۆشبوو عەبدولا ئێناخیم کرد، بۆسەرە خۆشی کردن لە منداڵەکانی. دوای جێبەجێکردنی ئیشوکاری ئاسایی مەڵبەند، لەگەڵ هەڤالان سەردانی بارەگای مەڵبەندی بزووتنەوەی ئیسلامیمان کرد بۆ پیرۆزبایی یەککگرتنەوەیان لەگەڵ نەهزەو لەهەمان کاتدا بۆ پیرۆزبای کردن لە مامۆستا مەلا عومەر بووەتە لێپرسراوی مەڵبەندەکە، دوای ئەم یەککگرتنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا گلەیی ئەوەمان کرد لەدوای یەککگرتنەوەکە دەستپێک، لەباتی دەست پێشخەری بۆزیاتر ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکە لەنێوان یەکێتی و بزووتنەوەدا، ئەمڕۆ یەکەم چالاکی ئەم بزووتنەوەی یەکبوونە دەرکردنی هەڤالانی ئەنجومەنی کەرتی ڕێکخستنی هەورامانی یەکێتی بووە لە هەورامان. ئەوانیش هەروەک جاران داوای

لێبووردن و نارەزایەتیان بەرامبەر بەوهێزەی خۆیان لەبیارەیە دەربڕی. دواتر سەردانی ڕێوڕەسمی پرسەیەکمان کرد لە مزگەوتی کۆکۆییەکاندا.

ئەمڕۆ ٨/٣٠ لەبارەگای مەڵبەند تانیوەڕۆ ئیشوکاری ئاسایی مەڵبەندم ئەنجامدا، مامۆستا ئیبراهیمی ڕەسوڵ ئابادی لەشاری پاوەی کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە هاتووە بۆسەردانمان، مامۆستا برای کاک یوسفی ڕەسول ئابادی نوسەری بەناوبانگی ڕۆژهەڵاتە، مامۆستا خاوەن ماڵمان بووە لەساڵی ١٩٨٨ تاساڵی ١٩٩١ ئەوده‌مە ئێمە ئاوارەی وڵاتی ئێران بووین ماڵی باوکم نەچوبوونە ناوئوردوگا، لەناوشاری پاوەدا بوون، کرێچی ماڵی مامۆستا بووین.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/٨/٣١ لەسلێمانی، لەبارەگای مەکتەبی ڕێکخستندا، مەکتەب و بەشی روناکبیری هەموو مەڵبەندەکان کۆبووینەوە، من و چەند هەڤاڵێکی مەڵبەندی شارەزووریش بەشدار بووین، قسەوباس و مناقەشە کرا لەسەر چۆنییەتی تەشکیل کردنەوەی ئەو بەشە لەمەڵبەندەکان، چەند پێشنیاری ئێمە بۆ گەشەکردن و پێش خستنی ئەوبەشە کرانە بەرنامەی کار.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/٩/١ لەهەڵەبجە خەریکی ئەنجامدانی ئیشوکاری ڕۆژانەی مەڵبەندم، سەردانی مزگەوتی دارولئیحسانم کرد بۆ بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی مامۆستا مەلا سەید نورەدینی سەرگەتی. ئەمڕۆ ١٩٩٩/٩/٢ وەفدێک لەهەڤالانی مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزووری یەکێتی، کۆبووینەوە لەگەڵ هەردوو مەڵبەندی یەک و دووی بزووتنەوەی ئیسلامی، بۆ قسەکردن لەسەر ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکە و چۆنییەتی بەگەڕخستنەوەی ئیدارەکانی حکومەتی هەرێم، بۆ کارئاسانی و پشتیوانی داواکاریەکانی هاووڵاتییانی سنوورەکەو پێشکەش کردنی کارە خزمەتگوزاریەکان.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/٩/٤ سەرلەبەیانی هەندێک میوانم لەماڵەوە بەرێکرد، لەوانە حاجی مەحمودی بەرلوت، لەگەرمیانەوە هاتبوو، کوڕێکی کوژراوە. دواتر سەردانی بارەگای ڕادیۆی شارەزوورم کرد، تەشکیلاتی تازەمان بۆکرد، هەڤاڵ فازل نەسرەدینمان دانا بەبەڕێوەبەری، فازل کوڕێکی گەنج و خەڵکی ئاوایی موانی شارەزوورە.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/٩/٥، لەهەڵەبجەم دوای تەواو کردنی ئیشوکاری ڕۆژانە، سەردانی گۆڕستانی گولانم کرد بۆبەشداری لەڕێوڕەسمی بەخاک سپاردنی

پیاوێکی نەورۆڵی لەئاوایی نوەر مار پێوەی داوە، دواتر بەشداری پرسەی کورێکی کاکەییم کردبەناوی رزگار وەحلە، لەئاوایی کاکەیی نشینی دەرەتفێ مینی پێدا تەقیوەتەوە.

رۆژی٦/٩/١٩٩٩، چووم بۆ شارۆچکەی قەزای شارەزوور، بەشداریم کرد لەرێورەسمی کۆری کۆمەلایەتی بۆ رێککەوتن و ئاشت بوونەوەی هەردووتیرەی گەلالی و سۆفی وەندا. ئەم دوو تیرە هەردوو سەربە هۆزی گەورەی جافن، هاوسنوورن لە شارەزووردا، چەند جارێک لەسەر زەوی ئاو پوشو پاوەن بەیەکدا هەڵگژاون، لەنێوانیان دا خەڵک کوژراوە.

ئەمڕۆ ٨/٩/١٩٩٩، لەشاری سلێمانی نوێنەرانی یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامی لە باڵەخانەی پارێزگادا کۆبووینەوە، ئەم کۆبوونەوە بەئامادەبوونی پارێزگار بوو نوێنەرەکانی یەکێتی بریتی بوون لە حاکم قادر حەمەجان، حەمەی حەمەسەعید، عوسمان شوانی هەولێری، شێخ عەلی کەشکۆڵ، جەبار جەلال و ئەحمەد قەیەفەری. نوێنەرانی بزووتنەوە پێکهاتبوون لە عەبدولڕەحمان عەبدولڕەحیم، عومەر مەحمود تریفەیی، جەمیل عەبدولڕەحمان قائیمقامی هەڵەبجەو کەسێکیتر.

بابەتەکانی کۆبوونەوەکە قسەوباس و مناقەشە بوو لەسەر، ئاساییکردنەوەی بارودۆخی هەورامان ، دەست وەرنەدان لەکاروباری ئیدارە حکومیەکانی ناوچەکە، تەسلیم کردنەوەی داهات و گومرگ، جێبەجێ کردنی هەموو بەندو خاڵەکانی رێککەوتن نامەی تارانی نێوان یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامی.

ئەمڕۆ ١٤/٩/١٩٩٩ لە شاری سلێمانی بووم، سەردانی بارەگای تەلەفزیۆنم کرد بۆ پیرۆزبایی، دواتر سەردانی بارەگای کۆمەڵەی ژیانەوەی هەڵەبجەم کرد، ئەم کۆمەڵە، کۆمەڵێک خەڵکی خۆبەخشی هەڵەبجەن لەسلێمانی نیشتەجێن، لەوێوە چووم بۆ بارەگای رۆژنامەی رۆژانەی کوردستانی نوێ، لەگەڵ کاک عادل موراد دانیشتین داوای کرد، وەلامی ئەوبابەتەی رۆژنامەی مجاهدینی خەلق بەژمارە ٤٩ چلونۆ لەسەر یەکێتی نوسیوە بدەمەوە. لەوێ دەرچووم و سەردانی بەڕێوەبەری گشتی چاپ و بلاوکردنەوەم کرد.

ئەمڕۆ ١٥/٩/١٩٩٩ لەبارەگای مەڵبەند لەهەڵەبجە کۆبوونەوەی مەکتەبی رێکخستن هەبوو، لەگەڵ ئەنجومەنی مەڵبەندا، دوای کۆبوونەوەکە من

بەشداریم کرد لەڕێوڕەسمی پرسەی ئەولابەگی مستەفابەگی پالانیاییدا. دواتر بەشداریم کرد لەپرسەی کوڕێکی عەلی ئاردەی هەڵەبجەیدا لەمزگەوتی کانی عاشـقان، ئەم کـوڕە حەوت ســاڵ لەمەوبەر لەئێـران لەلایەن ژنەکەیەوە کوژراوە، ئێستا تەرمەکەی دۆزراوەتەوە. پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆش چووم بۆ قەزای شـارەزوور بۆبەشـداری لە ڕێوڕەسـمی پرسـەی دووکەسـی گەلاڵـی سـەربەتیرەی کەریـم قـوایی لە ئـاوایی میـری سـور کوژرابـوون بەهـۆی دوژمنایەتیەوە.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/٩/١٦ سەردانی کاک قادری حاجی عەلیم کرد لەقەلاچوالان، بەیانی جەنابی مام جەلال لەگەڵ بەرهەڵستکارانی عێراقیدا سەفەر دەکات بۆ ئەمریکـا، ئەمڕۆ مۆڵەتم وەرگرت بۆ ئەوە سـەفەری وولاتـی ئێران بکەم. دوانیوەڕۆ گەڕامەوە سلێمانی کاک حەمەحسێنی حاجی فەرەج میوانم بوو.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/٩/١٧ لەسلێمانی بووم حاجی مەحمودی بەرلوت سـەردانی کردم، لەگەڵ مەهدی برام سەبارەت بەکێشەکەی قسەو گفتوگۆمان کرد، دوو بەرانـی بەدیـاری بـۆ هێنـابووین، کاتێک ماڵئـاوایی کـردین داوامـان لێکـرد بەرانەکانی بباتەوە، ووتی ئێمە عەشائیرین بچین بۆ لای هەرکەس دیاری بۆ ئەبەیـن، ئەمە نەبەرتـیلەو نەرەشـوە، ئینکـاری زۆری کـرد، ئێمەش لەسـەر نەڕۆیشتین. نیوەڕۆدوا لەگەڵ مەهدیدا، سەردانی حەمەی حەسەن بەڵخەیی قەرەداغمان کرد، لەنەخۆشخانەی چەمی ڕێزان بەستەری کرابوو، کاکە حەمە پیاوێکی باشودڵسۆزە جەڵتە لێیداوە. ڕۆژی ٩/١٨ لەمەڵبەنـد کۆبـوونەوەی بەشی ڕاگەیاندن کراو تەشکیلاتی نوێی بۆکراو بەرێکوپێکی ڕێکخرایەوە.

ئەمـڕۆ١٩٩٩/٩/١٩ مەکتەبـی ڕاگەیانـدنی یەکێتـی نیشـتیمانی بەهەمـوو بەشەکانییەوە هاتنە شارەزوور، هاتنەکەیان بۆ بەسەرکردنەوەی مەڵبەندی یەکێتی و سەردان و کۆبوونەوە بوو لەگەڵ مەکتەبی ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیدا. وەفدی مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکێتی بەسەرۆکایەی عادل مراد و ستافەکەی، بەئەندامیەتی شوان کەریم کابان و ستافەکەی، ستران عەبدوڵاو ستافەکەی، بەرزانی ڕادیۆ و ستافەکەی. سەرەتا لەشارۆچکەی سەیدسادق سەردانی بارەگای ڕادیۆیی شـارەزوورمان کرد، دواتـر چـووینە هەڵەبـجەو سـەردانی بارەگـای مەڵبەنـدی شـارەزوورمان کـرد، لەوێـوە چـووین بـۆلای قائیمقامی شار، لای کاک جەمیل عەبدولڕەحمان میوان بووین. دوانیوەڕۆ

لەگەڵ مەکتەبی راگەیاندنی بزووتنەوەی یەکبووندا، کۆبوونەوەی هاوبەش کرا بەرپرسی مەکتەبی بزووتنەوە کاك تەوفیق ئەوبەریە. وەفدەکەی یەکێتی خاتوو کەژاڵ ئەحمەدیان لەگەڵ بوو، کەژاڵ شاعرێکی جوان و ناسراو ناسکە، لەوێ دەرچووین بۆکاڵتەو پێکەنین ووتم خاتوو کەژاڵ برایانی موجاهد لەژێر چاوەوە تەماشایان ئەکردی، ووتی ئاگام لێبوو، بووبەپێکەنین. دواجار بارەگای کۆمیتەی هەڵەبجەی یەکێتی بەسەر کرایەوە، ئێوارە هەڤاڵانی مەکتەبی راگەیاندن گەڕانەوە بۆ شاری سلێمانی، ئێمەش لەهەڵەبجە ماینەوە. ئەمڕۆ لەکوردستانی نوێدا ئەوبابەتەی بەندە کەوەڵامی بابەتەکەی مجاهدینی خەلق بوو بڵاوبوەتەوە.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/٩/٢٠سەرلەبەیانی سەردانی ئاوایی سۆسەکانم کرد، دواتر هاتمە مەڵبەندو خەریکی ئیشوکاری ئاسایی حزبی بووم، دوانیوەڕۆ بەشداریم لە ئاهەنگی کۆمەڵەی خوێندکارانی لقی شارەزووردا کرد، لەو بەشدار کردنەدا ووتارم هەبوو سەبارەت بە ئیشوکارو بەرنامەی کاری کۆمەڵەی خوێندکاران.

## سەفەرێک بۆ ئێران

رۆژی ١٩٩٩/٩/٢٥ لەشاری سلێمانی سەردانی پەیوەندیەکانی یەکێتیم کرد ،بەنییەتی کارئاسانی و پێدانی بەڵگەی هاتووچۆ، لەوێوە چووم بۆهەڵەبجەو سەردانی بارەگای قەرارگای رەمەزانم کرد، پاسدارێکیان لەگەڵ ناردین بۆ مەرزی باشماخ، لەباشماخ پایگای قەرارگای لێبوو، لەوێش فۆرمیان بۆ پڕکردینەوە و بەئۆتۆمبێلی خۆیان چووینە مەریوان. شەولەماڵی خاڵە زۆراب ماینەوە. بەیانی رۆژی٩/٢٦ سەردانی ماڵی کاك فاروقی وەیسیم کرد، فاروق خەڵکی ئاوایی بۆڕیدەری ناوچەی ژاوەرۆیە، لەگەڵ خاوەری رەوفی خێزانیدا لەکاتی ئاوەرەیمان بۆ ئێران خزمەتی زۆریان کردوین و ماڵێکی بەوەفان خاوەر خەڵکی نەوسوودە. پێش نیوەڕۆ لەگەڵ فاروق و خاڵە زۆرابدا چاوەڕێمان کرد، تا ماکوانی کوڕی خاڵە زۆراب لەقەرارگادا بەڵگەکانی هاتووچۆمان بۆ وەرگرێتەوە، کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ بەڵگەکانی هێنایەوە ٤٥٠٠ چوار هەزارو پێنج سەد تمەنیان لێ وەرگرتبوو. کاتژمێر سێی پاش

نیوەڕۆ ئۆتۆمبێلێکی دەبڵ کابینەی کۆنی ڕزیومان بەدەربەس (خسوسی) برد بۆ نەوسوود، بە ۱۰۰۰۰دە هەزار تمەن، خاوەنەکەی ناوی سەید حەمەئەمین بوو، سەید خەڵکی ئاوایی کێمنەی هەورامانی دیوی رۆژهەلات بوو، خۆی شۆفێری نەئەزانی شۆفێری گرتبوو، سەید زۆر ڕەزیل و پیسکە بوو، هەرچەندە ئێمە ئۆتۆمبێلەکەیمان بەتایبەت گرتبوو، بەڵام لەڕێگە شۆفێرەکەی ڕائەگرتوو نەفەری تری سوار دەکردن و پارەشی لێوەرئەگرتن. لەمەریوان خۆی لەدواوە سوار بوو تا سێرای بیەکەرە، لەوێ هاتە خوارەوە لەلای ئێمەدا سواربوو، بەدەربەندی دلگیری دزلیدا گوزەرمان کردو بەناو ئاوایی دزلیدا تێپەڕمان کرد، بەچەند پێچ و لۆفەدا هەڵگەراین و بەتەختاییەکدا کە پێی دەوترێت مەیدان گوڵەنگان ڕەد بووین، بەپەناو دەستی راستی هەردوو ئاوایی دەمەیۆ و دەرەکیێ دا گەیشتینە سەرەتای ئەو سەرەو ژوورەی جادەکە دوای دەخولەک ئەتباتە ملەی ژالانە، ئێرە دەستی راستی حەوشی مارانیە، ئەوشوێنەی بۆیەکم جار دوای گرتنی هەورامان ئەرتەشی قاجاری کردیان بەسەربازگە، لەژالانەوە ڕێگاکە بەدەست چەپدا ئەڕواتە خوارەوە بەرەو شاری هەورامانی تەخت و بەدەستە راستدا سەرئەکەوێ بەچەند لۆفەیەکی سەخت و دژواردا بۆ سەرملەیەکی بەرز بەناوی کەلی تەتە، گەیشتینە سەرکەل دێیتەوە بەم دیودا ئەگەیتە کانیاو هەوارو قاوەخانەیەک بەناوی نوەیجەڕ، لەوێوە دەشتی پان و بەرینی شارەزوورو زنجیرە چیاکانی قەرەداخ و ئەم بەرو ئەوبەری دەربەندیخان واتە چیاکانی ناوتاق و گوڵان لەبەری لای راستەوە، زمناکۆ و زەواڵێ لەبەری لای چەپەوە لێمانەوە دیار بوون، ئەم ڕێگا بەو کوێستانە بەرزو ساردە کە سێبەشی ساڵ هەندێک شوێنی بەبەفر داپۆشراوە ئەتباتە جێگەیەک، سێڕیانە بەدەستی ڕاسدا لقێکی لێدەبێتەوە بۆ ئاواییەکانی دزاوەر، کێمنە، بێدەروازو هانەگەرمڵە، ئەم سێ ئاواییە ئەکەونە پشتی بیارە. لقێکی بەدەستی چەپدا سەرەو خوار دەبێتەوە و دەچێتە شارۆچکەی نۆدشە. لەنێوان هەردوو دەستی چەپ و راستدا راست لقێکە ئەڕوات بۆ شارۆچکەی نەوسوودو لەوێوە بەرەو پاوەو کرماشان.

بابێینەوە بۆ سەر باسەکەو لای سەید حەمە ئەمین، لەنوەیجەڕ پرسیم سەید کێمنە ئاوەدان بووەتەوە؟ وەڵامی دامەوەو ووتی: تا ئەرتەشی

(سوپای-عەسکەر) سەدام نەیەتەوە بیارەو تەویلە، ئیمە لەترسی گروهەک و ئەو حزبانە(دیموکرات و کومەڵە) ناوێرین ئاواییەکانمان ئاوەدان بکەینەوە.

ئەگەر دەستەلاتم هەبووایە دلم پیوە بوو خوی و ئوتومبیلە پزیوەکەی لەو شاخە بەرزەوە بەردەمەوە تابچیتە خوارەوە بو کیمنەی ئاواییەکەی خوی. وازم هینا لەقسەکردن لەگەلیدا لەدلا ووتم خراپتری لیئەبیستم. دوای نان خواردن و پشوودان لە قاوەخانەکەی نوەیجەڕ کەوتینە ڕێ، کاتژمێر(٧) حەوتی ئیوارە تاریکی کردبوو گەیشتینە نەوسوود.

دووشەو لەنەوسوود ماینەوە، هەلکەوتەی جوگرافیایی شاری نەوسوودو کانیاو چەشمە ئاوەکانی دەرەهەرات و شەمشی، حەوزە لارەو قەلوەزو ملە سەروا تەختەی سان و باخە چرو سەرسەوزەکانی، پاک و خاوێنی شارو خەلکەکەی دیمەنێکی دلگیرو دلفرێنە.

رۆژی ٩/٢٨ لەنەوسوودەوە چووین بو شاری پاوە، بە تاکسیەکی پەیکان من و منداڵەکان، دانیال، سەریال، ژیوارو فروزاخانی دایکیان. کرێی تاکسی دەربەس( خسوسی) لەنەوسوود بو پاوە ١٢٠٠هەزارو دووسەد تمەنە، شوفێرەکە ناوی هوشیار بوو، ووتی ئیجازە هەیە چەند کارتون موزیش بارکەم لەسندوقی دواوە، ووتمان عەیبی چیە، من لەدلی خومدا ووتم ناسراوە ئەیەوێت کرێی ئیمە کەم بکاتەوە، بەزەیی دیتەوە پیماندا.

کەوتینەڕێ لەرێگەدا ئەمان بینی زوربەی کانیاو ئەستێلە ئاوەکانی دەوری دیهاتەکانی بەروپشتی جادەشک بووبوون، باخ و باخات دارودرەخت خوڕەمی و سەرسەوزیان لەدەست دابوو، لەهەندێک چوم و دولدا باخەکان بەتەواوەتی وشک و زەرد هەلگەراببوون. چوونکە لەنەوسوود تا نزیکی پاوە زەویەکانی رەقان و چەکرە هەم گەرمەسێریشە وشکەسالیەکان کەریکەری زورە بو ووشک بوونی دارو درەختی ئەم زەویە چەکرو رەقانە.

کاتێک گەیشتینە پاوە چووینە مالی مامۆستا برایمی رەسول ئابادی، پێشتر باسم کردووە لەئاوارەیداو لەدوای سالی ١٩٨٨ مامۆستا برایم خاوەن مالمان بووە. لەوێ دابەزین و شوفێرەکە ووتی ١٣٠٠ هەزارو سێسەد تمەنم بدەنێ سەرەرای موز بارکردنەکەی ١٠٠ سەد تمەن زیادەشی لێ وەرگرتین، دیارە چوونکە ناسراو بوو، لەروومان نەهات قسە بکەین، بلێین تو کرێکەت ١٢٠٠ هەزارو دووسەد تمەنە موزیشت بارکرد و ١٠٠ سەد تمەن زیادەشت لەئیمە

وەرگرت. دانیال و سەریال و دایکیان لای دادەکاڵێ خێزانی مامۆستا برایم و کچەکانیان هیواو ئاسۆ و هێرۆ دانیشتن و ئەفشین هات من و ژیواری برد بۆ ئاوایی شمشێر، شمشێر ئاوابییەکی ئاودارو باخدارو سەرسەوزو کوێستانە بۆیە وشکەساڵی و کەم ئاوێ لێرە نەبووەتە هۆی وشک بوونی باخەکان و زەردو وشک هەڵگەڕانی دارودەرخت.

ڕۆژی ٩/٢٩ کاک شەماڵ محەمەد سان ئەحمەد (مام ڕەئیس) لەکرماشانەوە هات بەدواماندا بردینی بۆ کرماشان بۆماڵی خۆیان، شەماڵ کوڕێکی ژیرو وردو ناسک بوو، لەدایک بووی ساڵی ١٩٥٣ بوو، بەر لەشەڕی عێراق- ئێران لەئیدارەی دابەش کردنی خۆراک لە ناحیەی خورماڵ دامەزرابوو، ساڵی١٩٨٠ بەیانییەک لەنزیک خورماڵ پێشمەرگە بۆسەیان دانابوو، دەستەیەک سەرباز بەئۆتۆمبێلی سەربازیەوە کەوتبوونە بۆسەکەوە، بەرێکەوت شەماڵ گەیشتبووە شوێنی ڕوداوەکە، سەربازەکان جەنازەی سەبازێکی کوژراویان دابوو بە کۆڵیا، لەوەوە ترسابوو دوای ئەوەش گیرا بەسەرباز، بۆیە پاش ماوەیەک هەڵهات و چووە ئێران، لەوێ بووبەنوێنەری سەربازە هەڵهاتوەکانی عێراقی کەلە شەڕی ئێران و عێراقدا هەڵهاتبوون و ئوردوگایان لە شاری کەرەج بوو، دوای ماوەیەکیش بوو بەوەرگێڕ لەوەزارەتی کیشوەر، لای ئێرانییەکان بووبوو بەجێگەی دڵنیایی و متمانە دەیان کێشەو گرفتی بۆ پارتی و یەکێتی چارەسەرو حەل و فەسل کردوە. برای شەهیدی نەمر بەرزانی فەرماندەی کەرت لەتیپی سورێن بوو. ئیشوکارەکانی شەماڵ بۆخۆی کتێبێکی ئەوێت کەئێرە جێگەی نییە.

کاتژمێر (٥:٠٠) پێنجی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە کرماشان، چووم بۆ ناو بازار، ئەم هەفتە ئێرانییەکان یادی جەنگی ئێران- عێراق دەکەنەوە، لەناوەراستی بازاردا ڕێوەڕەسمێکی قەرەباڵغیان هەبوو، من چووم بۆ تەماشاکردنی پێشەنگا وێنەییەکانیان، وێنەی جۆراوجۆری شەڕەکان و شەهیدەکانیان و شەهیدانی کیمیابارانی هەڵەبجەو شوێنەکانی تری مەیدانە جەنگیەکانی تێدابوو. لەو شوێنەوە کەشوێنی دەرچوون بوو لە پێشانگاکەوە مێزێک دانرابوو دەفتەرێکی گەورەی لەسەر دانرابوو، کەسێک نزیکی بوو هات بەخێرهاتنی کردین و داوای کرد شتێکی لەسەر بنوسم، منیش بەکوردی چەند دێرێکم نوسی سەرەتا باسی هەڵگیرسانی شەڕەکە لەلایەن سەدامەوە

(ئەمە رای خۆمە کە عێراق شەڕی هەڵگیرساند)، دواتر سەبارەت بەگرتنی هەڵەبجە لەلایەن ئێران و پێشمەرگەوە بەهاوبەشی و دواجار شتێکم لەسەر شەهیدانی کیمیابارانی رۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ نوسی و تاریکی کردو شوێنەکەمان بەجێهێشت.

لەگەڕانەوەماندا بۆماڵی شەماڵ، چوومە دوکانێکی کتێب فرۆشی، خاوەنەکەی کوڕێکی جوان بوو بەناوی پدرام، دوای تەماشاکردنی کتێبەکان چەند کتێبێکم هەڵگرت، هاتمە لای خاوەنەکەیەوە کاک پدرام، پرسیاری نرخەکەیانم کرد گران بوون، بۆیە تەنها کتێبێکم کڕی ئەویش بە١٨٠٠ هەزارو هەشت سەد تمەن، ناونیشانی کتێبەکە( تاریخ کامل ایران) نوسەرەکەی دکتۆر عەبدوڵای رازییە.

بەیانی رۆژی٩/٣٠ /١٩٩٩زوو لەخەو هەستام و لەگەڵ ژیوار چووین بۆ وەرزش بۆ پارکی شیرین، ئەم پارکە لەسەر گردێک دروست کراوە، سەردەمی محەمەد رەزا شا ئەم گردە گەڕەکێکی لەسەربووە بەناوی تەوەکەل ئاباد، گەڕەکی ژنانی لەش فرۆش بووە. ئێستا پارکەکە دەرگای پیادەرەوەکەی ئەکەوێتە لای راستی سەروی چوار رای شەقامی جەوانشیر، لەدەمی دەرگاکەدا پەیکەری ژنێک دانراوە، تەورێکی بەدەستەوەیەو منداڵێکیش خۆی پێچاوە بەکراسەکەیەوەو چاکی کراسەکەی گرتووە. داستانی ئەوەیە لەکاتی شەڕی عێراق ئێراندا گوایا ئەم ژنە سەربازێکی عێراقی بەتەوەر لەناوچەی گێلان کوشتوە.

پێش نیوەڕۆ منداڵەکانم بردە ناو بازارو تا نیوەڕۆ گەراین، کاتێک گەڕاینەوە بۆماڵی شەماڵ من چوومەوە بۆلای پێشەنگاکەی حەفتەی جەنگ، لەریزێکەوە کە ئێوارە فریانەکەوتبووم، دەستم بە تەماشاکردن کرد، گەیشتمە لای وێنەی لەشێک بەبێسەر واتە سەری برابوو، ئەم وێنە هی سەرلەشکر هیمەت ناوێک بوو، لەژێر وێنەکەدا ئەم هۆنراوەی بۆ نوسرابوو:

عاشقان را سر شوریدە بەپیکر عجب است
سرداشتن نە عجب داشتن سر عجب است

دوای ئەو وێنە چەندین وێنەی جوان جوان و سەرنج راکێشی مەیدانی شەڕی عێراق ئێران هەبوون، لەناویاندا وێنەیەکی جێگەی سەرنج ئەوە بوو، لەمەیدانی جەنگدا ڕابەر-خامنەیی گەنجەو ریشێکی رەش و بەجلوبەرگی

پاسادارییەوە لەگەڵ دەستەیەک سەربازو پاسداردا لەجێگەیەکدا، کەدەورو پشتیان جەنگەڵی چڕی داربەڕوە دانیشتوون و پشوو دەدەن.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١٠/١ لەکرماشانەوە چووم بۆ سەردانی شارۆچکەی کرندی کاکەیی نشین، لەرێگادا بەرەو کرند، سەرەتا بەشارۆچکەی دێرینی مایدەشت دا گوزەرمان کرد، لەدەستە چەپی رێگاکەوە، لەناوەراستی شاردا ئاسەواری کاروان سەرا بەناوبانگەکەی مایدەشت دیارە.

کاتێک گەیشتینە کرند، سەردانی دوکانەکانی چەقۆ دروست کردنمان کرد، کرند بەدروست کردنی چەقۆی جوان و باش بەناوبانگە، بۆنیوەڕۆ لەسەروی شارۆچکەکەوە لەناوباخە گوێزەکاندا لەباخی پیاوێکدا دانیشتین شۆڕەتی شاکری بوو. کرێکاری هەبوو گوێزیان بۆ ئەتەکاند، شاکری کوڕێکی جوانکیلەی هەبوو، هاتەلامان و دانیشت پرسیم ناوت چییە؟ ووتی ناوم یەزدانە. دانیشتوانی شاری کرند کاکەیین (ئەهلی حەق)،

دوانیوەڕۆ بۆ سەردانی ڕیژاو رۆیشتین، لەکرندەوە بە جادەی باتاقدا ئەچیتە شارۆچکەی ڕیژاو. دەربەنی باتاق ئەوەیە تەیموری لەنگ دوای گەڕانەوەی لەبەغدا، بەباتاقدا ڕۆیشتووە بەرەو کرماشان و وەسفی ئەو دەربەندەی کردووە کەکوردەکان لەوێ ڕێیان لێگرتووە.

دوای برینی نزیکەی (١٠) دە کیلۆمەتر بەرەو سەرپێلی زەهاو بەر لەوەی بگەینە سەرەتای سەرەو خوارکەی رێگاکە بۆ دەشتی زەهاو، رێگاکە دەبێتە دوو بەش، بۆ ڕیژاو بەدەستی راستدا دوای مەسافەیەکی کەم سەرکەوتین بۆ سەرملەیەک و دوای ئەوە ئاودیو بووین بەناو جەنگەڵی دار بەروەکاندا شارۆچکەی ڕێژاومان لێوە دەرکەوت.

ڕێژاو ئەکەوێتە سەر گردێک لەنێوان دوو چۆمی ئاوداردا، بەردەمی مایە (دیواری بەردینی سروشتی ) بەرزو دوورو درێژە، پشتی زنجیرە چیاکانی دالاهۆیە روبارێکی روون و شیرین کە دەبێتە سەرچاوی سەرەکی ئاوی ئەڵوەند لەچیاکانی داڵەهۆوە سەرچاوە ئەگرێ و بەم دیوئەو دیوی شارۆچکەکەدا سەدان هیکتار باخ و باخاتی گوێزو هەنجیرو میوەی جۆراوجۆر ئاودێری دەکات. سەردانی ناو شارۆچکەکەو ئاوایی شێلانی لەهجە ماچۆ نشین و دەربەنی ڕێژاو ئەو سروشت و دیمەنە جوان و کەم وێنانەیە، سەردان و گەڕان بەناویاندا مەست و حەیرانت دەکەن و چێژی

تایبەت بەمرۆڤ دەبەخشن، ڕێژاو بەناوبانگە بەکاکڵە گوێزو هەنجیر. ئێوارە گەڕاینەوە بۆکرماشان

ئەمرۆ ٢/١٠/ ١٩٩٩ لەکرماشان لەناو شاردا سەردانی تەکییەی حەسەن( مەعاون مولکم ) کرد، ئەم تەکیە لەسێ بەشی سەرکی گەورە پێک هاتووە، تەکییەکە لەکۆتایی دەورانی قاجاریەکاندا حەسەن معاون مولک دروستی کردوە.

بەکۆکردنەوەی هونەرمەندانی ئێرانی سەرکەوتوو بووە روکەشی ئەم سێ بەشە بەوێنەکان و دیمەنەکانی ئەمیرو سوڵتانەکان و پاشاکانی ساسانی و قاجاری و دەیان دیمەنی تر لەسەر کاشی جوان و ڕەنگاو ڕەنگ بنەخشێنێ و برازێنێتەوە.

لەسێ ڕووەوە ئەم شوێنە بۆمن جێگەی سەرسوڕمان بوو، بۆ ئەو سەردەمەی کە دروست کراوە، یەکەم ئەندازەیی، دووەم شکڵو شێوە، سێهەم ڕەنگەکان. دیمەنی شێرێک کەکەوتوەتە ناو تۆرەوە، باوەڕناکم لەم سەردەمەدا هیچ نەقاشێک بتوانێ دووبارەی بکاتەوە، یان دیمەنەکانی کۆشک و سەراکان، یان سەحنەی ڕاو شکارەکان بەراستی میراس فەرهەنگی ئێرانە.

دوا نیوەڕۆ سەردانی (تاقی سان) یان (تاق بوستان) مان کرد، ئێرە ئاسەوارێکی جێگەی سەرنج، توانایەکی زۆر بەخەرج دراوە، نیشاندەری دەست و پەنجەی هونەری ژیرانە و کەم وێنەیە. لەسەر وردەکاری ئەم تاقە، ڕانما بەچاپ کراوی هەیەو هەرکەس سەردانی ئێرە دەکات ئەتوانی ئەو چاپ کراوە بکڕێت و بیخوێنێتەوە. یەکێک لەبەڵگەکان لێرە نامەی نوسراوی پێخەمبەری ئیسلام (محەمەد)ە (د.خ) بۆ کیسرای بزورگ.

لەرۆژی٣/١٠دا لەگەڵ شەماڵ و جەبار دزاوەریدا چووم بۆ ئیرشادی ئیسلامی کرماشان بۆ بینینی هورمزی بگلەری نوسەری کتێبی چیانشینانی زاگرۆس، لەوێ وتیان مانگێک لەمەو بەر خانەنشین بووەو لێرە نەماوە. تەلەفۆنەکەیم وەرگرت، پەیوەندیم پێوە کرد و داوام کرد ئەمەوێت بتبینم، خۆم پێناساند، پێم ووت یەکێک لەکتێبەکانت بەناوی چیانشینانی زاگرۆس وەرم گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، زۆری پێخۆش بوو، ووتی لەسەر سەفەرم بۆتاران دوای سێ رۆژی تر واتە ٦/١٠ ئەگەڕێمەوە و پاش نیوەڕۆکەی یەک ببینین لە کتێبخانەی کەتیبە، منیش خۆشحاڵ بووم و کەوتمە

ڕێ بۆ سەردانی سەید نەسرەدینی حەیدەری، ماڵی لەکرماشانە، سەید نەسرەدین ڕابەرو پێشەوای ئەهلی حەق، ئەویش لەماڵ نەبوو ووتیان چوەتەوە بۆ توشامی. ئاوایی تووشامی زادگای سەیدە، سەرزەوی پیرۆزە.

ڕۆژی ١٠/٤ گەڕاینەوە بۆ پاوەو ڕۆژی١٠/٥ لەپاوەوە کەوتمەڕێ بۆ بینینی ئانوبانو لەکەلی داود، یان دوکانی داود، ئەمڕۆ دوو دۆستی خۆشەویستم لەگەڵ خۆمدا برد، ئەوانیش کاک حەیدەری بارامی خەڵکی شۆشمێ و مامۆستا وەزیری قاسمی خەڵکی پاوە، ئەفشینی حەکیمیش شۆفێرەکەمانە. لەپاوەوە بۆ ڕەوانسەر و بەدەستی ڕاستدا چووینە شارۆچکەی کۆزەرانی کاکەیی نشین، لەوێش دووبارە بەدەستی ڕاستدا چووینە شارۆچکەی گاوارە، گاوارە شارۆچکەیەکی دڵگیرو ئاودارو هەر چوار لای باخ و باخات و مەزراو جەنگەڵی داربەڕوە. سێوی گاوارە لە کرماشاندا بەناوبانگە.

دوای گاوارە چووینە شارەدێی توشامی، لامان دایە تەکیەو هەواڵی سەید نەسرەدینمان پرسی گەڕابووەوە بۆ کرماشان. لەوێ لەتەکیەی سەید براکە، تەوافمان کرد و دواتر بۆ بینینی ئەسپە ڕەسەن و جوانەکان کەسێک پێشمان کەوت و دەرگای حەوشەیەکی گەورەی بۆکردینەوە، لەوێ چەند وێنەیەکمان گرت و ڕۆیشتین بەرەو شاری کرند. تاگەیشتینە کرند چەندین دەشت و دەرەو دۆڵ و گردو یاڵ و نزارو خۆرەتاومان بڕی، ئەو ناوچانە هەمووی بەدارستان و دارو درەختی چڕ داپۆشراوە، جگە لەدەشتی بێوەنیژ. قەبری سەید براکەو نەزەرگەی شێخ ئامۆشیش لەسەر ڕێگەمان بوون و زیارەتمان کردن. لەکرند نەوەستاین چووینە سەر جادەی باتاق و بەرەو سەرپێڵی زەهاو، بەرلەوەی بگەینە ناوشار، بەدەستی چەپ دا لاماندا وە بۆ دوکانی داود، دوای لادانەوەکە بە ٥٠٠ مەتر گۆڕستانێک ئەبینی، لەپشتی گۆڕستانەکەدا و بەنیوقەدی ماکەوە بەبەرزی نزیکەی ١٢ دوازدە مەتر تاقێک هەڵکەندراوە لەژێر تاقەکەدا، وێنەی شاژنی لۆلۆیی بەناوی (نی نی) یەوە، بەرامبەر بەشای لۆلۆیی بەناوی(ئانوبانی نی) یەوە نەخشێندراوە. وێنەکە لەکتێبی( ایران از آغاز تا اسلام) کریشمن، بەجوانی چاپ کراوە. بەراستی ئەم کارە هونەریەش جێگەی سەرسوڕمانە، چەند وێنەیەکمان گرت، لەوکاتەدا ئێمە سەرگەرمی تەماشاکردنی دیمەنی ئانوبانودا بووین، چەند ژنێکی ڕەش

پۆش لەسەر قەبرێک دانیشتبوون، دیاربوو ئەو قەبرە هی کوڕی ژنێکیان بوو تازەش مردبوو، ژنەکە شینی بۆ دەکرد، بەشێوەی چڕینی هۆرەیەکی دڵگیرو خەمگین، بۆیە من ماوەیەک بەدیاریەوە وەستام و گوێم بۆگرت، کاتێک ئەیوت ( رۆڵە خۆزگە هەر ئەوەڵ بار لەبار بچوای نەوەک مەرگت توم وە چاو بدیای) من دڵم هاتە کوڵ و خۆم پێنەگیراو دەستم کرد بەگریان، برادەرەکانم لەلای ئۆتۆمبێلەکەدا وەستابوون و بانگیان دەکردم وەرە خوارەوە دەرەنگە، کاتێک گەیشتمە لایان وەزیر سەیرێکی کردم و ووتی حەمەگیان ناحەقت نییە منیشی گریاند. دیارە مامۆستا وەزیر باشتر لە لەهجەکەی گەیشتبوو. گەڕاینەوە بۆ پاوەو شەو گەیشتینەوە، لەماڵی وەزیر نانمان خوارد و هەرلەوێ خەووتین.

بەڵێ رۆژی ١٠/٦ لەپاوەوە چوومەوە بۆکرماشان بۆلای بگلەری، لەڕێگەو لەنێوان شاری پاوەو رەوانسەردا، لەئاوایی قوڕی قەلا لەگەڵ ئەفشین بۆبینینی ئەشکەوتی (غاری) قوڕی قەلا لاماندا، ئەم غارە درێژترین غاری ئاسیایە. دواتر چوومە کرماشان و سەردانی کتێبخانەی کەتیبەمان کرد، بگلەری لەوێ بوو، دوای چاک و چۆنی و یەکتر ناسین، سەبارەت بەکتێبی چیانشینان و کتێبێکی تری ناوبراو بەناونیشانی( گوزر برتآریخ کرمانشاهان) قسەمان کرد، دوای ئەوە پێم ووت چیانشینان وەرگێڕانی تەواو بووەو ماوەیەکی تر دەچێتە ژێر چاپ، ئەمەوێت مۆڵەت بدەی (گوزر برتآریخ کرمانشاهان) یش وەرگێڕم، ووتی زۆرباشەو پێم خۆشە، بەڵام ئیمتیازی چیا نشینان بدەو بۆ ئەوی تریش ئەبێ قەرار داد بنوسین، من وام زانی تێنەگەیشتوم لەمەتڵەبەکەی، بۆیە پرسیم قوربان چیت فەرموو؟ تێنەگەیشتم؟ هەمان جوملەی دوبارە کردەوە. منیش ووتم ئاغای بیگلەری تۆ کوردیت و منیش بەنییەتی خزمەت کردنی کتێبخانەی کوردی ئەم کارە دەکەم، من پێشمەرگەم ئەمەوێت لەم بوارەشدا خزمەتی کوردستان بکەم، نوسین و وەرگێڕان لەلایەن منەوە بۆ پولوپارە نییە، من وامزانیوە تۆ زۆرزۆر پێت خۆشە کتێبەکانت وەرگێڕدرێنە سەر زمانی کوردی؟ ووتی نا ئێمە ئەبێ حەقی خۆمان وەرگرین، چونکە حەقی مافی دانەر پارێزراوە، ئەوە یاسای نێودەوڵەتی هەیە لەوبارەوە، کەزانیم سورە لەسەر داواکەی، ووتم وەڵا من پوڵم نییە. ووتی ئەبێ حەقی من بدەیت ئەگینا من ئەتوانم پەنا بەرمەبەر

ئینەرپوڵ. ڕێک نەکەوتین من هەستام و دەستم کرد بەتەماشا کردنی کتێب، کتێبێکم وەرگرت بەناونیشانی (نام آوران یارسان) کڕیم و خواحافیزیم کرد لە بگلەری و خاوەنی کتێبخانەکە، ئەوانیش خواحافیزی منیان کردو هیچیان نەوت دیاربوو بیگلەری بیری کردبووەوە و پەشیمان بووبوەوە لەداواکەی. لەوێ دەرچوین و شەو گەڕاینەوە بۆپاوە.

ڕۆژی ۱۰/۷ مەنسوری تاوگۆزی و حەمەجانی برای میوانداریان کردم بۆ هەوارەکانی مەیگوڕی، مەیگوڕێ هاوینەهەواری تیرەی ئیمامیەکانە لەهۆزی جاف، دەکەوێتە دەستە چەپی ڕێگای سەریاس باینگان، ئەو شوێنەیە لەدوای شەڕی عێراق- ئێران خاڵە حسێن ئیمامی خەڵکی دزۆڵە، ئاسەوارێکی بەقوڵنگەکاری دروست کردوە، خەڵک سەردانی دەکەن و زیاتر بە ئەشکەوتی خاڵە حسێن ناوی ئەبەن. چەند دۆست و برادەریشم لەگەڵ خۆم دا بردبوو بۆ میوانداریەکە، لەوانە: نەزیری مقەدەم خەڵکی جولاندێ، سادقی ئامۆزای نەزیر، قەیوم، وەزیری قاسمی، حەیدەری بارامی، باهیر و ئەفشین و چەند کەسیتر. ئەمڕۆ ڕۆژێک خۆش بوو، پشوومان داو خۆش گوزەرا. ئێوارە هاتینەوە بۆ شاری پاوەو سەردانی مامۆستا حەمەسەعیدی مستەوفیم کرد نەخۆش بوو.

ئەمڕۆ ۱۹۹۹/۱۰/۸هەر لەپاوە بووین، قەرارە بەیانی بگەڕێینەوە بۆ نەوسوود و لەمەرزی شۆشمێوە بگەڕێنەوە بۆ تەوێڵە. ئەمڕۆ ئەوەندەی کاتم هەبوو تەرخانم کرد بۆ بەسەر کردنەوەی دۆستەکانم، لەوانە مامۆستا مەلاقادری قادری ئیمام جومعەی شار، موحسینی حاجی ئیبراهیم شۆشمێی و عیزەتی ڕەسولی، نیوەڕۆش لەماڵیان میوان بووین، ئەنوەری مستەوفی کتێبی ( تآریخ مردوخ) ی بەدیاری دامێ و منیش زۆرسوپاسم کرد، چوونکە ئەوە بەنرخترین دیاری بوو، لای عەسرەوە زۆراب بەگی شمشێرو ئیبرایمی برای ئەسکەندەر شمشێری لە شمشێرەوە هاتبوون بۆلام، چوومەوە بۆماڵی موحسن و لەوێ بینیمن، دوو پیاوی بەڕێزو دۆستی خۆشەویشتن. دوای ماوەیەک ئەوان گەڕانەوە، منیش ماڵ ئاواییم لە موحسین کرد و کتێبێکیشی بەیادگاری دامێ بەناونیشانی( دستور زبان کوردی) لەنوسینی ئەمیری ئەمینی.

بۆ نانی ئێوارە میوانی لایقی ولەدبەگی بووین، لایق کوڕی بارامی ولەدبەگی خەڵکی ئاوایی نۆریاوە، دایکی عەتیەخان کچی مەلاحسینی پاوەییە، لایق یەکێکە لەو دۆستە نزیک و ناسیاوانەی لەساڵی ١٩٨٦ وە دۆست و ناسیاوین و کوڕێکی خوێن گەرم و بەوەفایە.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١٠/٩ دوارۆژی ئەم سەفەرەی ئێران، لەپاوەوە هاتینە نەوسوود، منداڵەکان دانیاڵ و سەریاڵ لەگەڵ دایکیان لەوێ مانەوە لەماڵی مەروانی جەلالی، بۆنیوەڕۆ من ژیواریش لەگەڵ موحسین چووینە دەرە چناران، باخی ماڵی موحسین خۆیانە، خاتوو عەتیەی دایکی لەوێ بوو نانی ساجی دەکرد، کەبابی بۆکردین. ئەم شوێنە ساڵی ١٩٨٠ و سەردەمی شەڕی پارتیزانی کاتێک ئێمە بارەگامان لەچیای پەرونی و چۆم و دۆڵی شۆشمێ خواروودا بوو، ئێرە دەرە چناران بارەگای هەڤالانی حزبی شیوعی بوو. دوانیوەڕۆ گەڕاینەوە بۆ نەوسوود بەدوای منداڵەکاندا، کەش و هەوای ئەمساڵ تا ئێستاش گەرمە، لەماڵی مەروان موبەریدە ئیشی دەکرد. دوای عەسر خواحافیزیمان لە هەموو لایەک کردو هاتینەوە بۆ تەوێڵە. مۆڵەتمان وەرگرتبوو لەمەرزی شۆشمێوە بگەڕێینەوە، ئەگینا دەبوو لەباشماخەوە بگەڕێینەوە.

## دوای گەڕانەوە لە سەفەر

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١٠/١٠، سەردانی دۆڵبیانم کرد، بۆلای ماڵی باوکم، دڵسۆزی مام رەئیس میوانم بوو، ئیقباڵی برام گیسکێکی بۆ سەر بڕیبووین، هەنار پێ گەیشتوە، باخەکانمان هەناری جوان و باشیان هەیە ئەمساڵ، ئەم ماوە من لێرە نەبووم ماڵی نەسرەدینی مام کەریم هاتون بۆ داوای کوێستانی خوشکم بۆ سالمی کوڕیان، کوێستان کچێکی ماندو ئێسا ئەو کاربەڕێ کەری ماڵە. باوکم نەیداوە و بەڵێی نەکردوە، چوونکە دایکم رازی نەبووە. عەسر کاک ستاری باوکی مامۆستا جەوهەری هاوڕێی خوێنکاریم هات بۆ دۆڵبیان، کاک ستار پیاوێکی بەڕێزو دۆستی خۆشەویستمانە، برا گەورەی کاک نەسرەدینە. ووتی چاوەڕێی تۆمان کردووە هاتوم بۆ داوای کوێستان بۆ کوڕی نەسرەدینی برام، منیش ووتم ئەوە باوکم و ئەوەش دایکم ئەوان حیسابن، دایکم ووتی من کچ نادەم بەشو، کاک ستاریش ووتی ئەی کچ هەر ئەبێ

شوبکات، ووتی ئاخر نایدەم بە ئاغالەر. باوکیشم گوێی گرتووە و قسەناکات. من قسەکەی دایکم پێناخۆش بوو، ووتم ئەی ئەو چەند کەسەیتر پێشتر هاتون بۆ داوای کوێستان و نەتدا خۆ ئاغالەر نەبوون؟ دیارە دایکم و باوکم لەبەر ئیشوکاری ماڵ حەزیان نەدەکرد کوێستان شوبکات. منیش حەزم دەکرد شوبکاو رزگاری بێت. بۆیە ووتم کاک ستار تۆ بەخێر بێیت، با ئیمە لەگەڵ کوێستانیش قسە بکەین ئەبێ رای ئەویش وەرگرین، سبەینێ وەڵامت ئەدەینەوە، ووتی نارۆم ئەبێ ئێستا وەڵامم بدەنەوە. هەرچۆن بوو کاک ستارم رازی کرد کەدواتر وەڵامی ئەدەینەوە. شەو لەگەڵ کوێستان و باوکمدا قسەم کرد و دایکم رازی کرد، بڕیار درا بە بەڵێ وەڵامی کاک ستار بدرێتەوە. شەو هاتینەوە بۆ تەوێڵە.

رۆژی ١٠/١١ گەڕامەوە بۆ سلێمانی، بەئۆتۆمبێلی (بیبە) نەریمانی کاک بورهانی حاجی عەلی، ئۆتۆمبێلەکەی خۆم ناردەوە بۆ دۆڵبیان بۆ هێنانی هەندێک دیاری بۆ دۆست و ناسراو، دیاریەکانیش ترێ و هەنار و گوێز بوو. رۆژی سێ شەممە ١٠/١٢ لەماڵەوە بووم لە سلێمانی.

ئەمرۆ ١٩٩٩/١٠/١٣ مام جەلال لەدوای سەفەرەکەی بۆ ئەمریکا گەیشتەوە شاری سلێمانی. چاپی یەکەمی کتێبی وەرگێردراوی بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگ لەچاپخانە هاتەدەرەوە، بۆیە ئەمرۆ یەکێکە لەرۆژە خۆشەکانی ژیانم. رۆژی ١٠/١٤ سەردانی هەڤالان کاک عەدنانی حەمەی میناو کاک کوردۆ قاسم و کاک جەمالی حاجی محەمەدم کرد.

ئەمرۆ ١٠/١٥ سەردانی مەڵبەندی یەکی رێکخستنی سلێمانی و کاک عومەری سەی عەلیم کرد، دوای ئەو سەردانانە، سەردانی ماڵی عەلی تەوفق بەرپرسی ئاسایشی پێنجوێنم کرد، عەلی پێشمەرگەی دێرین و کوڕێکی دڵسۆزە، بەبۆنەی کۆچی دوای خێزانەکەیەوە، خوالێخۆش بووی خێزانی خوشکی مامۆستا ئەیوب عەبدولڕەحمانی تەوێڵەییە.

دوانیوەڕۆش چووم بۆ هەڵەبجەی تازە ( قەزای شارەزوور) بۆ بەشداری لە رێوڕەسمی پرسەی خوالێخۆش بوو باوکی کاک رزگار شەمێرانی، رزگار کادرێکی رۆشنبیرو شارەزای بواری ئیسلامی سیاسییە. هەروەها بەشداری رێوڕەسمی پرسەی بورهان هارونی و حاجی حەمەحسێنی کۆکۆیی شەمێرانم کرد.

ئێوارەش لەسلێمانی لەگەڵ م. جەمالی حاجی محەمەد کۆبووینەوە بۆ قسەکردن لەسەر تەشکیلات و ڕێکخستنەوەی کۆمیتەی ڕێکخستنی شلێر لە ناحیەی گەرمک. هەردوکمان هاوڕا بووین، مامۆستا عەلی بچکۆل بکرێتە بەرپرسی کۆمیتە، مەلاحسێن و عەبدولڕەحمان مینەش بکرێن بە کارگێڕ کۆمیتە. عەبدولڕەحمان کادرێکی لەسەرەخۆو پیاوێکی بەئەدەب و سادەییە.

ڕۆژی ١٠/١٦ لەهەڵەبجە بەشداری دوو کۆبوونەوەم کرد یەکەم لەگەڵ قائیمقام و بەرپرسی ئاسایش و بەڕێوەبەری پۆلیسی هەڵەبجە، دووەم لەگەڵ ئەنجومەنی کارگێڕی مەڵبەندا.

ڕۆژی ١٠/١٧/ لەشاری سلێمانی سەردانی ئەم هەڤالانەم کرد: کاک حەمە شاکەلی وەزیر، مامۆستا ڕەنجە جێگری وەزیر، مامۆستا جوامێر جێگری مافی مرۆڤ، کاک مستەفا چاورەش و شێخ عەلی کەشکۆل لەپەیوەندیەکان.

ئەمڕۆ ١٠/١٨ لەگەڵ هەڤالانی مەکتەبی ڕێکخستن دا چووین بۆ سەردانی کۆمیتەی شلێر لە پێنجوێن بۆ ئاگادار کردنەویان لە تەشکیلاتی نوێ و لەو بارەوە کۆبوونەوەمان لەگەڵدا کردن. ئێوارە گەڕامەوە بۆ سلێمانی و ڕۆژی ١٠/١٩ لەبارەگای مەکتەب ڕێکخستن بەشداری کۆبوونەوەی بەشی ڕوناکبیریم کرد.

ئەمڕۆ ١٠/٢٠ لەسلێمانی چەندین کۆبوونەوەم کرد لەگەڵ نوێنەرە دەرچوەکانی ژنان کەبەشداری کۆنفرانسی هەڵبژاردنی سکرتاریەتی ژنان دەکەن، بۆ هەمان مەبەست شلێرخانم بەئۆتۆبێلەکەی خۆم ناردوە، چەند کۆبوونەوەشم کرد لەگەڵ چەندین هەڤالی سەربە ئەنجومەنی مەڵبەند بۆ هەمان مەبەست. شەوەکەی کاک ئەرسەلان بایز تەلەفۆنی بۆکردم وێنەی خۆم بنێرم بۆ مەکتەبی پەیوەندیەکان بۆئەوەی پاسپۆرتم بۆ دروست بکەن بۆ بەشداری لەکۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە ئەمریکا.

ڕۆژی ١٩٩٩/١٠/٢١ کۆنفرانسی یەکێتی ژنان بەستراو دەستیان بەکارەکانی کۆنفرانس کرد، ڕۆژی ١٠/٢٢ لەکۆنفرانسی یەکێتی ژناندا دەنگ دان بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی سکرتاریەت ئەنجام درا. هەر ئەمڕۆ کاک نێچیروان بەرزانی و وەفدێکی پارتی دیموکرات هاتوون بۆ قەڵاچوالان.

شەوی ٢٢لەسە٢٣ی ١٠ لای کاک عومەری سەید عەلی بووم، ئەنجامی هەڵبژاردنی سکرتاریەتی ژنان دەرچووە، ئەوانەی من کارم بۆکردبوون

چەندین ژنیان دەرچوو بوون پێم خۆش بوو لەوانە: پەیمان عیزەدین، سەیوان رۆستەم بەگ، پەروین حەسەن.......تاد ، ئەمرۆ ١٠/٢٣ لەگەڵ ئەکرەم ئەحمەد و قادر بێستانیدا سەردانی فەرماندەیی گشتیمان کرد. هەر ئەمرۆ پاسپۆرتەکەم وەرگرتەوە، بڕیارە سبەینێ ١٠/٢٤ کاتژمێر (٥:٠٠) پێنجی ئێوارە کۆبوونەوە بکەین و رۆژی ١٠/٢٥ کاتژمێر (٤:٠٠) چواری بەیانی بکەوینە رێ، لەسلێمانی دەرچین بۆ زاخۆ لەوێوە بۆ ئەمەریکا بۆ بەشداری لەکۆنگرەی نیۆیۆرک.

## کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراق

ئەمرۆ ١٩٩٩/١٠/٢٤، لەسلێمانیم، سەرلەئێوارە لەبارەگای مەکتەبی پەیوەندیەکانی یەکێتی دا کۆبووینەوە، ناوەرۆکی کۆبوونەوەکە، قسەکردن بوو لەسەر بەشداری کردنی یەکێتی لەکۆنگرەی بەرهەڵستکارانی عێراقیی لە ئەمریکا، لەگەڵ هەندێک زانیاری و رێنوێنی سەبارەت بەسەفەرەکە.
ئەم هەڤاڵانە بەشدار بوون لەکۆبوونەوەکە و ئەندامی وەفدی یەکێتین:
عیماد ئەحمەد، عادل موراد، مەلابەختیار، سەعدی پیرە، عارف روژدی، رزگارعەلی، حەمەی حەمەسەعید، ئاسۆ عەلی، رێبوار هەولێری، مامۆستا موحسن، کافیە خان، کوێستان محەمەد، کوردە خان، نەهلە خان، ئالا تاڵەبانی، عادل شوکر، د. قادر(شاهۆ)، د. نەبەز، د. تەیب، م .جەمال عەبدول، عەباس بەدری، خەلیل عوسمان، ستران عەبدوڵا، شێخ بابا تاهیر، ئارێز عەبدوڵا، جەمیل عەبدال، کاردۆ محەمەد، بەرزان چێوار، نەشئەت.
شەوی ٢٤لەسەر ١٠/٢٥ کاتژمێر (٤:٠٠) چواری سەرلەبەیانی لەبارەگای مەکتەبی رێکخستن کۆبووینەوەو کەوتینەڕێ، کاتژمێر(٨:٠٠) هەشتی بەیانی رۆژی ١٠/٢٥ گەیشتینە شارۆچکەی شەقلاوە. لەوێ لەلایەن وەفدێکی پارتیەوە بەسەرۆکایەتی سەلاح دەلۆ پێشوازی کراین، کاتژمێر (١:٠٠) یەکی پاشنیوەڕۆ لەوبەر پردی برایم خەلیل لەلای تورکەکان دابەزین، پاسپۆرتەکانیان بردین و تاکاتژمێر شەشی ئێوارە رایان گرتین.

ئەم ڕاگرتنەمان لەسەر پاسپۆرتی عادل مراد، کافیە خان و سەعدی پیرە بوو، لەکاتێکدا تەنها پاسپۆرتەکانی ئەوان تەزویر نەبوون، دوای چارەسەر کردنی کێشەکە سواری پاس بووین بۆ ئەنقەرە، کاتژمێر ١٠ دەی بەیانی ڕۆژی ١٠/٢٦ لەترمیناڵ ئەنقەرە دابەزین و بە تاکسی چووین بۆ ئۆتێل ئیلیت.

٣ سێ ڕۆژ لەئەنقەرە ماینەوە پاسپۆرتەکانیان بردبوو بۆ سەفارەتی ئەمریکا لە ئەنقەرە بۆ پێدانی ڤیزا، کاتێک هێنانیانەوە ئەوەی منیان گل دابووە سەعدی پەیوەندی لەگەڵ کردن و دوای چەند کاتژێر ئەوەی منیشیان هێنایەوە، ئەمەیان لێ نوسیبوو ( to attend a meeting in nework, (bearer notidentifible withclass entry .

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١٠/٢٩ بەیانی کاتژمێر (٤:٣٠)چوارو سێ خولەک لەئیلیت هەستاین و چووین بۆ فڕۆکە خانەی ئەنەقەرە، کاتژمێر (٩:٣٠) نۆ و نیو گەیشتینە فڕۆکەخانەی ئەستەنبووڵ و دابەزین و کاتژمێر (١١:٠٠)ی نیوەڕۆ سواری فڕۆکەی ئەستەنبووڵ – نیۆیۆرک بووین. کاتژمێر (١٢:٠٠) دوازدە نانیان داینێ، کاتژمێر (١:٣٠) یەک و نیو دوبارە خواردن دابەش کرا. فڕۆکەکە کاتژمێر ٣/٦ سێ و شەش خولەکە دەچێت بەرەو ئۆقیانوسی ئەتڵەسی، ٥/٢٥ پێنج و بیست و پێنج خولەک تا ٧/٤٨ خولەک هەر بەسەر ئۆقیانوسدا دەڕوات. ٠٣:٣ سێ کاتژمێر و سێ خولەکمان ماوە تا بگاتە نیۆیۆرک، کاتژمێر (٨:١٦) هەشت و شانزە خولەک بوو فڕۆکەکە چووە سەر وشکایی و بەسەر جزیرەکاندا بەرەو نیۆیۆرک دەڕوات. ئێستا کاتژمێر (١٠:١٠) دەودە خولەکی شەوە بەکاتی بەغدا، (٢:٤٥) دوو چل و پێنج خولەکی پاش نیوەڕۆیە بەکاتی نیۆیۆرک، نزیک بووینەتەوە لە نیۆیۆرک.

ئێستا بەکاتی ڕۆژهەڵات کاتژمێر (١٠:٥٠) دەو پەنجا خولەکە فڕۆکەکە لەفڕۆکە خانەی نیۆیۆرک نیشتەوە. واتە (١٢)دوازدە کاتژمێر لەناو فڕۆکەکە بووین. دوای کاری فڕۆکەخانەو پەنجە مۆرو داخڵ بوون، ئۆتۆمبێل ئامادە بوون چووین بۆ ئۆتێل شیراتۆنی نیۆیۆرک، من و رزگار عەلی لەفڕۆکە خانەکەدا پێش کەوتین و کارمان تەواو بوو چووینە دەرەوەو گەیشتینە ئۆتێلەکە، دەرچوونی ئێمە لەفڕۆکەخانە بەزوی بەڕێکەوت بوو، ئەگینا هاوڕێکانمان دواکەوتبوون هەندێکیان (٣) سێ کاتژمێر دواتر گەیشتنە ئۆتێل، واتە کاتژمێر (٧:٠٠) حەووتی ئێوارە بەکاتی نیۆیۆرک.

ئەمڕۆ دوای گەیشتنمان بۆ ئۆتێل شیراتۆن کارتی نان خوادن و بەشداری کۆنگرەیان بۆدروست کردین، دوای نان خوردنی ئێوارە چووینە هۆڵی کۆنگرە. کۆبوونەوە کرایەوە، لەلایەن دەستەی سەرپەرشتیاری کۆنگرەوە، لەو دەستەدا د. لەتیف رەشید نوێنەرایەتی یەکێتی و کاک هوشیار زێباری نوێنەرایەتی پارتی دەکرد. دوای کردنەوەی کۆبوونەوەکە، یەکەم کەس دیڤید شیفر ( سفیر فوق العاد المکلف قضیا جرائم الحرب) ووتاری خوێندەوە، دوای ئەو سیناتۆر( جون کیری) ووتاری پێشکەش کرد.

سێیەم ووتار ژنە پەرلەمانتارێکی بەریتانی بوو. یەکەم دانیشتنی کۆبوونەوە کۆتایی هات و دانیشتنی دووەم خرایە بەیانی کاتژمێر(١٠:٣٠) دەونیو.

ئەمڕۆ کاتژمێر(١٠:٣٠) دەونیو دووەم دانیشتنی کۆنگرە دەستی پێکرد، یەکەم کەس مام جەلال ووتاری پێشکەش کرد، ووتارەکەی جێگەی رەزامەندی و جێ سەرنجی هەمووان بوو. دواتر نوێنەرانی هەموو حزبە بەشدار بووەکان ووتاریان هەبوو، نوێنەری پارتی سامی عەبدورڕحمان و نوێنەری بزووتنەوەی ئیسلامی مەلا غەنی هەولێری، یەکگرتوو، زەحمەت کێشان فەتاح زاخۆیی و لەکۆتایشدا بەهادین نوری. دوای ووتارەکان، لیژنەکان بۆ کارە جیاجیاکانی کۆنگرە دروست کران، لەم دانیشتنەدا مشت و مڕو مناقەشە لەسەر دوو شت زۆر درێژەی کێشا، یەکەم فیدراڵی بۆ کوردستان، دووەم ئایا ئەوانەی لەکۆبوونەوەی سەلاحەدین دا ئەندامی کۆنگرەی بوون هەر ئەوانە ئەندامن یان خەڵکی تریش هەیە بۆ بوون بەئەندام؟

لەسەر فیدراڵی هەموو حزبە کوردییەکان بەرگریان دەکرد و بەشێکی عەرەبەکانیش دژایەتی. سەبارەت بە بەئەندام بوونەکەش وا بڕیاردرا هەر هەمان ئەندامانی کۆن، ئەندامی ( ئای ئێن سی) بن و کۆنگرەو (ئای ئێن سی) ش دەرگایان کراوەیە بۆ وەرگرتنی هەر حزب و کەسایەتی سیاسی و عەشائیر کە دژایەتی سەدام و رژێمەکەی بکات.

ئەولیژنانەش لەم کۆبوونەوەدا دروست کران لەوانە: لیژنەی سیاسی، مافی مرۆڤ، عیراقی دوای سەدام، مالی...تاد . لەم کۆنگرەدا لەپشتی کۆنگرەوە ئەمریکیەکان بەشدارن لە لیژنەکەدا، وە بۆ چارەسەری کێشەکان و لابردنی

کۆسپەکانی بەردەم کۆنگرە بەجیا لەگەڵ مام جەلال و کەسانی تردا دائەنیشن. دیڤد کەنوێنەری ئەمریکایە لەتورکیا و ئێستا لەم کۆنگرەیە، دەوری هەیە بۆ پشتگیری ئەوانەی دژی فیدراڵین.. هەوڵ ئەدا لەم کۆنگرەدا ئەو بڕیارە نەدرێ لەبەرژەوەندی کوردستان. کاریگەری تورکانی لەسەرە، کۆبوونەوە تەواو بوو، بەڵام لیژنەکان، دەستیان بە کارەکانی خۆیان کردو ئامادەیان دەکەن بۆ بەردەمی کۆبوونەوەی سبەینێ.

کۆبوونەوەی ئەمڕۆ ۱۹۹۹/۱۰/۳۱ دانیشتنی سێهەمی کۆنگرە کاتژمێر(۱۰:۳۰) دەونیو دەستی پێکرد. لیژنەکان کارەکانیان ئەنجام داوە. سەرەتا کازم بەتات قسەی کرد، لەقسەکانیدا سوپاسی مام جەلالی کرد سەبارەت بە پشتگیری داواکانی شیعەکان و دەرخستن و نیشاندانی مەینەتیەکانیاندا دەوری هەبووە. هەروەها سوپاسی کوردی کردو ووتی لەعێراقەوە هاتوم و ئەشکەڕێمەوە. لەوتارەکەیدا ووتی بەهەڵەدا نەچن سەدام هەمان سەدام و بەهێزیشە، دەبێ بەکردەوە بچینە مەیدانەوە، چەک بەدەستەوە بگرین خوێن بدەین، بەقسەو لەمەنفاوە`سەدام ناروخێت.

ئێستا کاتژمێر ۳سێ باش نیوەڕۆیە، دانیشتنی چوارەم بەستراوەو بەردەوامین، سەرەتای دانیشتن بەووتاری بینجامین غیلمان سەرۆکی لیژنەی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکانی مەجلسی نوابی ئەمریکایە کرایەوە. دوای ئەو بروسکەی یەکێتی ژنانی کوردستان خوێندرایەوە، ناوەرۆکی بروسکەکەیان پیرۆزبایی کۆنگرە و داوای سەرکەوتن بۆ کۆنگرە بوو.

دواتر بەرنامەی لیژنەکان کە ئامادەیان کردبوو بۆ بەردەم کۆنگرە، بەش بەش گفتوگۆ و مناقەشەی لەسەر کرا. لیژنەی دارایی بەتێکرای دەنگ پەسەند کرا، بۆ خەرج و سەرفیاتی کۆبوونەوەی شەقڵاوە تائەم کۆنگرە حسابات بەرێکوپێکی بکرێت، چەند بووە و بۆچی بووە، سەرکردایەتی نوێی کۆنگرە لەیەکەم کۆبوونەوەیاندا ئەم بابەتە روون بکەنەوە. لیژنەی مافی مرۆڤ بەندێکی سەبارەت بەهەڵەبجە بۆزیاد کرا، لەسەر ناوی کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆن مناقەشەی زۆرکرا، دواجار پێشنیارێکی سەلاح شێخلی، بەتێکرای دەنگ پەسەند کرا، ئەویش (کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی ) بوو. پەیرەوی ناو خۆ هەندێک بەندی زیادو کەمکرا.

کاتژمێر ٨ هەشتی شەو نان خواردن و پشوو بوو، دوبارە کاتژمێر ١٠ دانیشتن کرایەوە و بەردەوام بووین تا ١٢ ی شەو لەم دانیشتنەدا گفتوگۆ و مناقەشە لەسەر کاری لیژنەکان بوو. دوای ١٢ پشوو بوو تا ٢/٥ ی شەو.

بۆ دانیشتنی ٢/٥ ی پاش نیوەشەو، لەناو هۆڵەکەدا لەنوێنەرانی کورد تەنها نوێنەرانی یەکێتی نیشتیمانی هاتبووین، لەحزبەکانی تر تاکوتەرا یان هەر کەسیان نەهاتبوون. عەرەبەکانیش تاک و تەرا هاتبوون، لەدەرەوەی هۆڵەکە کێشمەکێش هەیە، جاروبار چەند کەسێک خۆیان بەژوردا دەکەن و دەچنەوە دەر، عەرەبەکان کێشەیان لەسەر کەم و زۆری ژمارەی ئەندامانی سەرکردایەتی (ئای ئێن سی)یە، لەسەر ئەوە بەدیاری کردن بێت یان هەڵبژاردن.

بۆ هەیئەتی سەرۆکایەتیش هەندێ داوا دەکەن نوێنەریان هەبێت و بێبەش نەبن، لەوانە: ئیسلامی، ئاشوری، تورکمەن و .... بەم جۆرە چاوەڕوان بووین تاکاتژمێر ٥ پێنجی بەیانی، ئەمریکیەکانیش دەڵێن نابێت سەرۆکایەتی لە حەوت کەس زیاتر بێت، لەسەر سەرکردایەتی بەکۆمەڵیش ئەحمەد چەلەبی دەڵێت ئەوکات کەس خۆی بە بەرپرس و خاوەنی ئیشەکە نازانێ، ئەو لایەنگری ئەوەیە کەسێک سەرۆک بێت .

کاتژمێر ٥/٣٠ هوشیار زێباری ئەندامی دەستەی سەرپەرشتی کۆنگرە هاتە ژورەوە، ووتی کێشەکان تەواو بوون، بەڵام جین مانکۆ نوێنەری تورکمان پاشەکشەو بایکۆتی کۆنگرەی کرد، بەنوسراوێکی دەس نوس.

هوشیار داوای لێبووردنی کرد لە دواکەوتنەکەیان و ووتی: ئەوە کێشەکان بوو، ئێستا گەیشتینە ئەوەی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی ١٢ دوازدە کەس بن. بۆ هەر لاو پێک هاتەیەکیش ژمارەیە دیاری کراوە کە هەمووی دەکاتە ٦٥ شەست و پێنج کەس، ئەمە بەکاتی بۆ دوو مانگ بۆئەوەی کۆنگرە بەفەشەلی کۆتایی نەیێت، ئەگەر بەم شێوەی ئێستا کۆنگرە سەرکەوتو نەبێت دوای دوومانگەکە ڕێگای تر بدۆزرێتەوە.

دوای هوشیار، ئەیاد عەلاوی قسەی کرد، لەسەرجۆری دابەش کردن و بەشداری لاکان و بەڕێوەبردنی ئەو ئەنجومەنە کاتییە، ئیسلامیەکان شێخ ئەبوو حەیدەریان هەڵبژاردوە بەنوێنەری خۆیان بۆ ئەو دوومانگە. عەلاوی ووتی: ئەمەش ژمارەی ئەندامانی هەرلایەکە بۆ ٦٥ کەسەکە:

کورد ١٥ پانزە کەس، ئەلوفاق٥ پێنج کەس، ئیسلامی ١٢ دوازدە کەس، قەومییەکان ٤چوار کەس، تورکمەن ٤چوار کەس، ئاشورییەکان ٣ سێ کەس، دیموکراتی عێراقی٣ سێ کەس، لیبراڵەکان٦ شەش کەس، مەلەکیە٥ پێنج کەس، عەشائیر ٢ دوو کەس، دیموکراتە سەربەخۆکان ٢ دوو کەس، یەککرتوو بزووتنەوە ٤ چوار کەس.

ئەیاد عەلاوی لێبووەوە لەخوێندنەوی ژمارەکان، هەندێک ناڕازی بوون و ناو هۆڵەکە بوو بەدەنگە دەنگ و قرەقرِ، یەکێک پرسیاری کرد ئەحمەد چەلەبی رازییە بەم لیستەتە؟ عەلاوی ووتی بەڵێ، لەدواوە چەندکەسێک هەستانەوە و ووتیان وانییە ناڕازیە. کاتژمێر بووەتە ٧ حەوتی بەیانی و چەلەبی نەهاتوەتە ژوورە و دەست نوسی پاشەکشەی نوێنەری ئاشوری خوێندرایەوەو کۆتایی بەم دانیشتنەش هات.

ئەمڕۆ١٩٩٩/١١/١ چاوەڕوانین کاتژمێر ٩ نۆی بەیانی دوا دانیشتنی کۆتایی کۆنگرە بەبەستریێ، کاتژمێر٩/٥ نۆ و نیو لەناو هۆڵەکەدا دانیشتبووین، مام جەلال هاتە ژورەوە پاش کەمێک چووە پشتی بلندگۆ( میکرۆفۆن) دەستی کرد بەقسەکردن، لەوتارەکەیدا باسی چاکەو پیاوەتی کەسێکی دەکرد بەناوی تۆماس پایک رنگ دەربارەی کورد و گەلی عێراق، هەروەها ووتی ئەمریکا نایەوێت تەداخول بکات لەکاروباری خەڵکی عێراق و ئۆپۆزسیۆنی عێراق، هەروەها نایەوێت کەسێک دیاری بکات بۆ شوێنی سەدام لەدوای روخانی رژێمی بەعس. تۆماس جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکایە، تۆماس دوای مام ووتاری پێشکەش کرد ناونیشانی ووتارەکەی ئەمە بوو ( THE REKOVERY OF IRAQ) کۆنگرە کۆتایی هات و بلاوەی لێکرا.

دوانیوەڕۆی ئەمڕۆ١١/١ من و چەندین هەڤاڵ بەسواری پاسی دووقات کەتایبەتە بۆ گەشت کردن و قاتی سەرروەی سەربەتاڵە چەندین ریز کورسی تیایە، چووین بۆ رۆژئاوایی شاری نیۆیۆرک، کەسێک بەمیکرۆفۆنی دەستیەوە رێنوێنی ئەکا، باسی ئەو شوێنە گرنگانە دەکات کە گەشتیاران ئەچن بۆسەردانی، ئێمە کاک ساڵح میرانی بەکوردی قسەکانی کابرای بۆ تەرجومە دەکردین. لە جێگەیەک کەناری ئاو بوو وەستاین تەماشای پەیکەری (نەسب ئەلحوریە) مان کرد لەوبەرەوە لەجزیرەیەکی ویلایەتی نیوجەرسیدا دانروە.

دواتر چووینە بەردەم بارەگای (یو ئێن) و هەروەها چەند شوێنی تر. مەلابەختیار بەدەنگی بەرز چەندجار ووتی بژی ئیمپریالیزم بژی سەرمایەداری. لەو شوێنانەی سەردانمان کردن تەنها شوێنێک جێگەی سەر سوڕمان بوو بۆمن ئەویش مزگەوتێکی زۆرگەورە بوو بەناوی ( المسجد خویە خیریە) ئەوانەی دەهاتن و ئە چوون و لەناو حەوشەو حەیاتی مزگەوتەکەدا بوون، وەک هێزی دووی سۆران و ئەنسار الاسلامەکەی لای خۆمان دەهاتنە بەر چاوم. سەر سوڕمانەکەم ئەوەبوو پێشبینی بینینی شوێنی واو دیمەنێکی وام لەئەمریکادا نەکردبوو. شەو هاتینەوە بۆ ئۆتێلەکە، من و رزگار عەلی ماندوبووین وزووخەووتین، بڕیارە بەیانی بچین بۆ واشنتن.

لەئۆتێلەکە شەوێک تەلەفۆنم بۆ بەهرۆز عابدی برادەرم کرد، بەهرۆز لەگەڵ رێکخراوەکاندا هاتووە بۆ ئەمریکا، پرسیم لەکوێی؟ ووتی لەنیۆیۆرکم، ووتم دەی وەرە بۆلام، پرسی تۆ لەکوێی؟ ووتم منیش لەنیۆیۆرکم، ووتی نیۆیۆرک لەکوێی؟ ووتم لەئۆتێل شیراتون، ووتی ناتوانم بێم چوونکە لەکارگەیەک ئیش دەکەم، منیش لەدڵا پێم ناخۆش و سەریشم سوڕما، بەهرۆز چۆن وادەڵێت، وام ئەزانی نیۆیۆرک تەنها ئەم شارەیە، دواتر زانیم ئەو شارەی بەهرۆزی لێیە بەفەلۆیە، ئەبێ بەفڕۆکە بۆی بڕۆیت ئەویش هەر ویلایەتی نیۆیۆرکە.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١١/٢ لەنیۆیۆرکەوە کاتژمێر ٨:٣٠ هەشت و نیو چووینە ئیستگای قیتار بۆ ئەوەی بچین بۆ واشنتۆن، کاتژمێر ٩:٢٠خولەک کەووتینە ڕێ، من و خەلیلی خوێندکاران لەتەنیشت یەک دانیشتبووین، مام لەسەر کورسیەکەی پشت ئێمەوە دانیشتبوو، لەرێگا هەرچەندە قیتارەکە خێراییەکەی زۆربوو، سەیری دەرودەشت و شارو شارۆچکەو ئاوایی و کێڵگەکان و دارستانەکانم لەپەنجەرەکەوە دەکرد و بۆ خەلیلم باس دەکرد ئاوەدانی و جوانی ئەو دیمەنانەو زووزو دەموت تەماشاکە. مام جەلال بانگی کردم حەمەی حەمەسەعید، ووتم بەڵی مامە، ووتی ئێرە و شارەزوور چەند جیاوازیمان هەیە؟ ووتم مام جەلال زۆر لەحسابدا نییە.

ماوەیەک ڕۆیشتین مام جەلال کەسێکی عەرەب لە ریزەکەی تەنشتمانەوە لەوبەر دانیشتبوو بانگی کردە لای خۆیەوە، وابزانم دەرەجە داری ئەرتەشی عێراق بوو تازەش هەڵهاتبوو، ماوەیەک قسەی لەگەڵ کرد و دواتر ئیزنی دا

چوەوە شوێنەکەی خۆی. دوای کەمێکیتر بانگی کەسێکی تری کرد بۆ لای خۆی قسەی لەگەڵ دەکرد منیش پاڵم دابووەوە سەرم نوساندبوو بەپاڵشتی کورسیەکەوە بۆ ئەوەی بزانم باسی چی دەکات، ماوەیەک گوێم لە گفتوگۆکەیان بوو بەکورتی ئەیوت ئێمە بەنەخوێندەوارەکان شۆڕشەکەمان سەرخست و ئێستا ئیدارە و حکومەتداری بەوان بەڕێوەناروات ئەبێ هەوڵ بدەن خاوەن بڕوانامەکان لەئەورووپاو ئەمریکا ئامادە بکەن بۆ گەڕانەوە بۆ کوردستان ئەم سەردەمە پێویستمان بەوانە. مەبەستی ئەوەبوو د- بەرهەم لەئەمەریکاو د- فوئاد مەعسوم لە ئەورووپا ئەو کوردانەی خاوەن بڕوانامەی بەرزن ئامادە بکەن بگەڕێنەوە بۆ کوردستان و لە ئیدارەو بەڕێوە بردنی هەرێمدا بەشداربن.

دوای ئەوە ئەو کەسە چوەوە شوێنەکەی خۆی، مام جەلال بەتەنها مایەوە لەسەر کورسیەکەی خۆی، لەبەر خۆیەوە جارجاریش گۆرانییەکەی حەسەن زیرەکی (کچان دەچنە مێرگولان) ئەوتەوە.

گەیشتینە واشنتن لەوێوە ئێمە چووین بۆ ئۆتێلێک لەنێوان واشنتن و ویلایەتی ڤەرجینیا، ئێرە زۆر خۆشترە لەنیۆیۆرک، بیناکان بەرزنین، دارودەرخت و پارکی زۆرە، هەرکە گەیشتین تەلەفۆنم بۆ ئازادی حاجی باقی کرد، نەمئەزانی لەچ ویلایەتێکە، دوای چاکوچۆنی ووتی وەرە بۆ ئێرە، ووتم لەکوێیت ؟ ووتی لە کالیفۆرنیا، داوای ئەدرەسم کرد و پرسیم کەی و چۆن بێم، ووتی ئەچیتە فرۆکەخانە و بەفرۆکە دێیت، پەشیمان بوومەوە لەرۆیشتن بۆلای ئازاد و ووتم بەتەما مەبە ناتوانم بێم بۆلات. ووتی دەی من دێم بۆلای تۆ، ئەدرەسی ئۆتێلەکەم پێدا.

پاش نیوەڕۆ لەگەڵ هەڤالان عیماد ئەحمەد، مەلابەختیار، عادل مراد، سەعدی پیرە و رزگار عەلیدا سەردانی بازارێکمان کرد. شەو گەڕاینەوە بۆ ئۆتێلەکە، ئەمشەو تەلەفۆنم بۆ حەسەن جاف کرد، حەسەن برای عومەر عەبدولکەریمە، ئەمشەو ئازاد هاتوو حەمەمینی حەمەکەریم تەوێڵەیی لەگەڵ خۆی هێنابوو، کاک هیواو هاوڕێی برایشی لەگەڵدا بوون، ئازاد لەکالیفۆرنیا و حەمەمین لەکەنتاکی و هیواو هاوڕێش لەواشنتۆن، زۆرم پێخۆش بوو، ووتیان خۆت کۆکەرەوە ئەچین بۆ ماڵی هاوڕێ و هیوا ئەوان لەگەڵ دایکیان لێرە ئەژین، نەچووم ووتم ئێوە بچن و بەیانی وەرنەوە بۆئێرە.

ئەمڕۆ ۱۱/۳ سەر لەبەیانی ئازادو حەمەمین و هاوڕێ هاتنەوە بۆلامان ووتیان مۆڵەت وەرگرە لە هاوڕێکانت ئەچین بۆ گەڕان و هەفتەیەکمان پێ دەچێت. ئێمە دوای کۆنگرەکە مام جەلال پێی ووتین چەند ئەمێننەوە بمێننەوە، بۆ ئەو مەبەستە کۆبوونەوەیەکمان کرد و چەند رەئیەک هەبوو، هەندێک دەیانوت مانگێک هەندێک دەیانوت ۲۰ بیست رۆژ بەسە، مامۆستا جەمال عەبدولمان کردە وەکیل ووتمان تۆ بریار بدە، ئەویش ووتی ۲۰ رۆژ باشە هەموو ووتمان باشە. ئیتر ئەو بیست رۆژە تاک تاک و چەند کەس پێکەوە دە چوون بۆ هەرجێگەیەک بە ئارەزوی خۆیان، بۆلای دۆست و برادەر و خزم، بریار درا دوای ۲۰ رۆژەکە هەموومان لەم ئۆتێلە یەکبگرینەوە تاپێکەوە بگەڕێینەوە بۆ کوردستان.

من خۆم کۆکردەوە و لەگەڵ ئازادو حەمە ئەمین و هاوڕێدا چووم بۆ واشنتن، بەر لەوەی بچینە ماڵی دایکی هاوڕێ، سەردانی بینای کۆشکی سپی و کۆنگرێس و دواتر چووینە لای قەڵەمەکەی جۆرج واشنتن، چەند وێنەیەکمان گرت. لەوێوە چووین بۆ ناو بینای (مەتحەفی تەیرانی ئەمریکی) ئەو فرۆکەو ساروخانەی ئەچن بۆ ناو بۆشایی ئاسمان و لەسەرەتاوە لەئەمەریکادا دروست کراون لەهەر مۆدێلێک نموونەیان لەم مەتحەفەدا دانراوە هەموویمان بینی و لەلایاندا وێنەمان گرتن، هەموو بەشەکانیمان بەسەرکردەوە. بۆنیوەڕۆدوا چووین بۆماڵی هیواو هاوڕێ، دایکیان ژنێکی میهرەبان و قەل و برنجی بۆلێنابووین لەگەڵ کولێرەی گەرم کەخۆی درووستی کردبوون.

دوای نیوەڕۆ لەگەڵ ئازاد و حەمەئەمیندا بەئۆتۆمبێلێکی ئیجارە کراو چووین بۆ ولایەتی پەنسلڤانیا لەشاری هارس بۆرگ لەماڵی برادەرێکی ئازاد بەناوی جەبار فرمان خەڵکی شاری سلێمانی ماینەوە، لەواشنتۆنەوە بۆ پەنسلڤانیا بەدرێژای رێگا ئەم دیوو ئەو دیوی شارێکا ئوتوبانییەکە دارستان و کێڵگەو شارو دێهاتی یەک لەدوای یەک، یەک لەیەک جوانتر، لەهەڵکەوتەیەکی جوانی نەبەرزو نەنزمدا دەبینرێت.

ئەمڕۆ۱۹۹۹/۱۱/٤ لە هارس بۆرگ کاتژمێر ۸:۳۰ هەشت و نیوی بەیانی دەرچووین بەرەو بەفەلۆ شارێکی سەربە ولایەتی نیۆیۆرک، دوای ۹ نۆ کاتژمێر تێپەڕبوون بەناو دەرەو دۆڵی بەرزو نزم دارستاناوی و بەپەنا و

بەناو چەندین شارو شارۆچکەو دێهاتدا گەیشتینە بەفەلۆ، سەرەتا چووینە فرۆکە خانەی ئەوشارە بۆ درێژکردنەوەی بلیتەکەی کاک ئازاد بۆ کالیفۆرنیا. لەوێ شادمانی برای ئەردەلانمان بینی، شادمان خەڵکی شاری سلێمانییە، پرسیاری کرد ئەچنەکوێ؟ ووتمان سەردانی ئەوخزمە هەورامیانە دەکەین کەلێرەن. شادمان ووتی ئێستا ئەچین بۆ بینینی تاڤگەکانی نیاگارا لەسەر سنووری کەنەدا، دوای ئەگەڕێینەوە شەو لەماڵی ئێمە دەبن و هەورامییەکانیش دراوسێمانن، زۆرن ناکرێت ئێوە سەردانی هەموویان بکەن، من هەموویان بانگ دەکەمە ماڵی خۆمان، ئێمەش قبووڵمان کردو پێمان خۆش بوو بچینە نیاگارا.

ڕۆیشتین ئەودیمەنە سەرسوڕهێنەرەی تاڤگەکان، ئەو ئاوە زۆرەی لەباکوورەوە وەک دەریا دێت و لەو مابەرزو سەختانەوە کە لەشێوەی نیوبازنەیە بەهاژە و کەف و تۆزەوە دەڕژێتە دەریایەکی ترەوە، ئەوەی خوارەوە وەک کلکەی پەنگاوێکی تەسکی دەریایەکی ترە، کەشتیە سیاحیەکان لەخوارەوە بەدوای یەکدا دێن بۆ بەردەمی تاڤگەکان و لەمەسافەیەکی چەند سەد مەتریدا تۆفانی ئاوەکە پێشیان ئەگرێ و ئەگەڕێنە دواوە، ئەمبەری ئەو کلکە ئەمریکاو ئەوبەری کەنەدایە، بەبەرزە پردێکی بەرزو سەرسوڕهێنەر بەیەکەوە بەستراون، لەوبەری پردەکەوەو لەناو خاکی کەنەدادا ئۆتێل و بوورجی بەرزی سوڕاوەی سیاحی دەبینرێن.

دوای ئەو سەردانە گەڕاینەوە بۆ بەفەلۆ و شەو میوانی ماڵی کاک شادمان بووین خۆی و خێزانی و ئەردەلانی برای پێشوازی و میوانداری گەرمیان کردین. چەند ماڵێکی هەورامیان بانگ کردو لەوێ یەکمان بینی، دواتریش سەردانی چەند ماڵێکی ترمان کرد، لەوانە بەهرۆز عابد، هادی مام رەئیس، کاکە نەسەی حەمەسەلیم. شەو هاتینەوە ماڵی کاک شادمان خەووتین و دەمەو بەیان هەستاین بۆگەڕانەوە، تەنها ماڵی حەکیمی حەمەی حەکیمان نەبینی بوو، سەردانی ئەوانیشمان کرد بۆماوەی ١٥ پازدە خولەک، خێزانی حەکیم کچی محەمەدی سان ئەحمەد (مام رەئیس ) و خوشکی شەماڵە، کاتێک خواحافیزیمان کرد لەدەرگاکەدا بەدزی برادەرەکانەوە زەرفێکی نامەی کرد بەگیرفانم دا، ووتم ئەوە چیە؟ ووتی مادام نمەکت نەکردین ئەوە نامەی گلەییە دوایی لەرێگادا بیخوێنەرەوە.

کاتژمێر ٧:٠٠ حەووتی سەرلەبەیانی لەبەفەلۆ دەرچووین، کاتژمێر ٢:٣٠ پاش نیوەڕۆ گەیشتینە، هارس بۆرگ، لەرێگادا نامەکەم کردەوە ١٠٠ سەد دۆلاری تێدا بوو. بەرێگایەکی تردا شەو کاتژمێر ٩ نۆ گەیشتینە واشنتۆن، دواتر چووینە ڤەرجینیاو لە چێشتخانەیەکی لوبنانیدا نانمان خوارد، لەوێوە چووینەوە بۆلای برادەرەکانمان بۆ ئەو ئۆتێلەی کە لێی بووین، خواحافیزیمان کرد لەئازادو حەمەمین، ئەوان چوون بۆماڵی ئیسماعیل.

ئەمرۆ ١١/٦ فەلاحی برای شەهید کەیکاوس لە ویلایەتێکی باشوورەوە هاتوە بۆلام، چووین سەردانی بازارمان کرد، ئێوارە میوانی د. نەجمەدین کەریم بووین مامیش لەوێ بوو. رۆژی ١١/٧ بەهەرۆزی مەنوچەری و شیروانی برام لەسویدەوە بەتەلەفۆن پەیوەندیان پێوە کردم و قسەمان کرد داوایان کرد ئەگەر پارەت پێویستە تا بۆت بنێرین، منیش پێویستم نەبوو سوپاسم کردن. کاتژمێر ٩:٣٠ نۆ و نیو مامۆستا شێرکۆو چەند هەڤاڵێک لەهارسن بۆرگەوە هاتن بەدواماندا، نیوەڕۆدوا کاتژمێر دوو گەیشتینە ئەوێ، لەماڵی مامۆستا میوان بووین و کوردەکانی ئەوێ هاتن بۆ لامان، حەسەنی برای عومەریش لەوێ بوو، پاش پشوودان چووین بۆناوبازارو هەندێک گەراین، جوتێک پێڵاوی جوانم بۆ دانیال کری.

شەو لەماڵی شێخ محەمەدی قلیاسانی بووین، من لەگەڵ ئەودا ئەچووم بۆ گەران، باسی ئەوەی بۆکردم هەموو خەڵکی ئەمریکا لە رۆژی ١١/٢٥ و رۆژی دواتری سوپاسی خودا دەکەن بۆ ئەو سەروەت و سامان و عیلم و دانشەی پێیداون، دوو کامێرای یەکبار مەسرەفم کری بە ١٢ دوازدە دۆلار عەبدولڕەحمان پارەکەی بۆدام.

ئەو هەڤالانەی هاتوین پێکەوە هاتوین بۆ لای ئەم برادەرانە ئەمانە بووین: د.شاهۆ حەمەکەریم، کوێستان محەمەد، شوان قلیاسانی، عادل شوکر، خەلیل و فەلاحی میوانی منیشمان هێناوە.

ئەمرۆ ١١/٨ لەماڵی کاک عەبدولڕەحمان ژاراوەیی میوانین، کوردەکانی ئەم شارە ٥٣ پەنجاو سێ ماڵن زۆربەیان هاتون بۆلامان، من و شوان و حەسەن عەبوولکەریم و شێخ محەمەد چووین بۆ ناو بازار، هەندێک وێنەمان گرت، لێرە گوێمان لەبانگی نیوەڕۆبوو، من پرسیم ئەوە چیە ئەو بانگە؟ ووتیان

ئەوە ئێمە کوردەکان و ئەفغانییەکان مزگەوتێکمان کردوەتەوە و مەلاشمان بۆ گرتووە.

دوای نیوەڕۆ هەموومان چووین بۆسەر چیای شەنەندە، سەر شاخ پڕە لە ئاژەڵی کێوی، دەهاتنە سەر جادەو ناو خەڵک، ناترسن خەڵک وێنەیان لەگەڵ ئەگرێت. ئەمشەو میوانی کاک سابیر خۆشناو بووین، من و شوان بۆ خەوتن هاتینەوە ماڵی شێخ محەمەد.

ئەمرۆ ۱۹۹۹/۱۱/۹ کاتژمێر ۸ هەشتی بەیانی لەشاری (هێرسن بۆرگین)ە وە گەڕاینەوە بۆ واشنتۆن DC، کاتژمێر 11:00 یازدە گەیشتینەوە لای ئۆتێلەکەمان لەشاری (خۆل چێرچ) نزیک لەواشنتۆن دی سی. پایتەختی ولایەتی ڤەرجینا شاری( دریچ مۆندە) . بۆنیوەڕۆ چووین لە چێشتخانەیەکی ئێرانیدا نانمان خوارد، خاوەن و کرێکارەکانی ئێرە هەموو ئێرانی بوون، ئێوارە کاتژمێر 4:00 چوار کاک هاوڕێ هاتەوە بۆلامان ووتی مادام بەیانی دەڕۆیتەوە ئەم ئێوارە میوانی منی کێشت پێخۆشە لەهاوڕێکانت بیهێنە، ئەگەر هەڵەنەبم ئەم هەڤاڵانەم برد: عادل شوکر، د.شاهۆ، بەرزان و خەلیل. هاوڕێ بردینی بۆ واشنتۆن و زۆرگەراین بەناو شاردا. شەویش چووینەوە بۆماڵی خۆیان، دایکی هاوڕێ ژنێکی زۆر بەڕێزە ئەم شەو خواردنی سلێمانی بۆکردبووین قەل و برنج و نانی گەرم .

ئەم ڕۆ ۱۱/۱۰ لەماڵی هاوڕێ هەستاین و خۆیشی هات و ئێمەی بردەوە بۆ لای هەڤاڵەکانمان، لەوێ خواحافیزیمان لێکرد و ئەو گەڕایەوە، ئێمە کاتژمێر ۸:۳۰ هەشت و نیو کەوتینەڕێ بەسواری پاس لە ڤەرجینیاوە بۆ نیۆیۆرک. بەناو ئەو هەموو دیمەنە جوانانەداو برێک بەسەر خاکی نیوجەرسیدا، دوای برینی ڕێگا بەسەر دوو بەرزە پردی بەرزو دوورو درێژ و سامناکدا، کاتژمێر ۱ ی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە سەر خاکی ولایەتی نیۆیۆرک، بەدرێژای ڕێگا دارستان و کێڵگەو ئاوەدانییە، لەچەند جێگەیەکدا رەوە ئاژەڵی کێوی و پۆلە باڵندەکانمان ئەبینی.

پۆلە باڵندە قازە کێویەکان کاتێک کەلەئاسمانەوە دائەبەزین بۆسەر زەوی و لە کێڵگەکانی ئەمدیو ئەودیوی ڕێگاکەدا ئەنیشتنەوە، ئەوەندە زۆر بوون مەسافەیەکی زۆری چەند سەد مەتریان لەزەوی دائەپۆشی. ئەو دیمەنانە سەرنج راکێش بوون، یەک لەوانە پردی سێ چوار قاتی بەرزی سەر دەریاو

ئەمبەرو ئەوبەری شارو ڕێگاو جادەی بەیەکدا هاتوو و چوو ، کەمن ناتوانم لێرەدا وێنایان بکەم. دواجار بەسەر یەکێک لەو جۆرە پردانەدا خۆمان کرد بەناو شاری نیۆیۆرک مەکەزی ویلایەتی نیۆیۆرکدا.

کاتژمێر ٢:٠٠ دوی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە ناو فڕۆکەخانە، کاتژمێر ٥:٤٥ پێنج و چل و پێنج خولەک سواری فڕۆکەی ئەستەمبوول بووین. کاتژمێر ٦:٣٤ شەش و سی و چوار خولەک فڕی و چووە ناو هەوا، کاتێک بەناو ڕارەوەکەدا لەهۆڵەکەوە دەهاتین بۆناو فڕۆکەکە، سێ کارمەندی ئەمنی ئەمریکی منیان گلدایەوە، چەند هەڤالێک بەلاماندا تێپەڕ بوون، من زمان نازانم، بەبرادەرەکانم ووت بەکاک سەعدی یان بەکاک عادل موراد بڵێن ئەوە منیان گل داوەتەوە. تائەوان گەڕانەوە ئەمان هەرچیان ئەوت، من ئەموت نازانم چیدەڵێن، ئەوەندە تێگەشتم یەکێکیان پرسی چەند پارەت پێیە؟ منیش دەستم کرد بە گیرفانم داو ئەو پارەی کە پێم بوو دەرم هێنا، لەو ساتەدا کاک عادل دەرکەوت، قسەی لەگەڵ کردن، بەمنی ووت ئەو پارە بخەرەوە گیرفانت، چەند قسەیەکی تریان کرد و کاک عادل ووتی بڕۆین، لەوان دەرچوین وکاک عادل پرسی بۆچی ئەو پارەت دەرهێنابوو؟ ووتم پرسیاریان کرد چەند پارەت پێیە. کاک عادل وایزانی بوو من ئەمەوێت پارەیان بدەمێ، ووتی وەفدی ئیسرائیلی لەناو فڕۆکەکەن، ئەوانە وایان زانیوە تۆ فەلەستینیت، ویستویانە قسەبکەیت و زمان و تەلەفزت بزانن.

ئێستا کاتژمێر ٨:٠٦ هەشت و شەش خولەکە، خێرایی فڕۆکەکە ١٠٣٨ کیلۆمەتر لەیەک کاتژمێردا، لەدەرەوە -٦٠ ژێر سفرە، تائەم یاداشتەم نوسی خێراییەکەی بوو بە١٠٤٠ کم، لەنیۆیۆرک بۆ ئەستەمبوول ٨٠٦٠ هەشت هەزارو شەست کیلۆمەترە، ئێستا کاتژمێر ٨:١٥ هەشت و پانزە خولەکی شەوە لەناو فڕۆکەکەدا، ١٥٤٠ هەزارو پێنج سەدو چل کیلۆمەتری بڕیوە، ٦٥٢٠شەش هەزارو پێنج سەدو بیست کیلۆمەتر ماوە تابگاتە ئەستەنبوول. ئێستا کاتژمێر ١١:٣٠ یانزەو نیوی شەوە بەکاتی ئەمریکا، کورسیەکەی خۆم لەپێشەوە جێهێشت و هاتمە دواوە بۆلای عادل مراد و عەباس بەدری، فڕۆکەکە لەسەر ئۆقیانوسی ئەتڵەسی بەرەو بروکسل و ئەمستردام ئەڕوات.

ئێستا کاتژمێر ٢:٣٠ دوو نیوە بەکاتی نیویۆرک، بەڵام خۆر هەڵاتوە و نانی بەیانی دەخۆین، فڕۆکەکەش سەر زەوی ئەڵمانیای داوەتە دواوە و تێپەڕیوە.

ئێستا خێرایی فڕۆکەکە ٨٧٠ کیلۆمەترە لەیەک کاتژمیردا، کاتژمێر ٢:٤١ دوو چل و یەک خولەکە، بەرەو نێوان بەلگراد و بووخارست ئەڕوات، ئێستا کاتژمێر ٣:٤١ سێ و چل و یەک خولەکی نیویۆرکە بەرانبەر ١٠:٤١ دەو چل و یەک خولەکی ئەستەمبووڵ. ئێستا فڕۆکەکە بەسەر دەریایی باڵکانەوە شۆڕدەبێتەوە بەرەو ئەستەنبووڵ، کاتژمێر ٣:٥٠ بەکاتی ئەمریکا لەفڕۆکەخانەی ئەستەنبووڵ نیشتەوە. واتە ١٠:٥٠ دە و پەنجا خولەکی بەیانی بەکاتی ئەستەمبووڵ.

کاتژمێر ١:٠٠ یەکی پاش نیوەڕۆ لەفڕۆکەخانەی ئەستەنبووڵ بەفڕۆکە سواربووین بۆ ئەنقەرە، کاتژمێر ٢:٠٠ دوو گەیشتینە فڕۆکەخانەی ئەنقەرە و بەپاس هاتینە ناو شارو چووین بۆ ئوتێل ( guleryuz )، ئەمشەو شەوی١١ لەسەر١٩٩٩/١١/١٢ لەئەنقەرە ماینەوە، کاتژمێر ٥:٠٠ پێنجی بەیانی دەرچوین بۆ فڕۆکەخانە، کاتژمێر ٩:٠٠ نۆی بەیانی ڕۆژی ١٩٩٩/١١/١٢ هاتینە دیار بەکرو لەفڕۆکەخانەکەدا دابەزین، فڕۆکەخانەکە ئاوەدان دیار نەبوو، ئەم شوێنە بەخزمەتگوزاریەکەیدا لەم وولات ناچێت، ئاسەواری وڵاتی کوردانی پێوە دیارە، بۆنموونە لەباتی سەوزایی و پارک و گوڵوگوڵزار، پڕە لەدڕک و داڵ و کۆپتەر و فڕۆکەی جەنگی تێدا ئەبینرێن.

کاتێک لەفڕۆکەخانە چووینە دەرەوە بۆ ناو شار، جیاوازیەکیتر دەرکەوت ئەم جیاوازیە هی نێوان کوردان خۆمانە، هەڵسوکەوت و مامەڵەی تورکەکان بوو بەرانبەر بە یەکێتی و پارتی، ئەوانەی یەکێتی بووین، بەئاشکرا دژایەتیان دەکردین و برێک بیانویان بۆ ئەدۆزینەوەو دوایان ئەخستین، ئەوانەی پارتی بوون پێشوازیان دەکردن. لەهاتنەدەرەوەدا، ئۆتۆمبێل لەدهۆک و زاخۆوە هاتبوون بۆ حەوشەی فڕۆکەخانەو بەسواری ئۆتۆمبێلەکانی خۆیان دەر چوون، ئێمەش بەجانتای کۆڵمانەوە ڕاکەڕاکە بۆلای پاس بۆئەوەی جێنەمێنین.

پاسەکە ئێمەی گەیاندە کاروان سەرا مەشهورەکەی دیاربەکر، دیاربەکر شارێکی گەورە و جوان و شیرینی کوردانە، شارێکی دێرین و پڕداستانی مێژوویی و هەستی نەتەوایەتی، سەرەرای زەبروزەنگ و کوشتن و بڕین و

گەمارۆدانی ناوچەکەلەلایەن دوژمنانی کوردەوە، دیاربەکر هەر زیندو و بەرزە. لەدەورانی رابردوودا ئەم شارە وەک قەلایەکی بەرگری عوسمانییەکان بەرامبەر بەنەیارەکانیان وەک عەرەبەکان، ئێرانییەکان، مەغۆلەکان بەکارهاتوە. شورایەکی قاییم کەخاوەنی چەندین بوورج و حەوت دەربازەی گەورەیە بەدەوری شاردا کێشراوە، کەلەسەردەمی ئیمپراتۆری رۆمی رۆژهەلاتدا دروستکراوە. ئێستا بەهۆی فراوان بوون و گەورەبوونی شارەوە لەدەرەوەی دیوارەکەدا چەندین گەرەک و بازاو ناوچەی ئاوەدان هەن.

دوای ئەوە چووینە، ناو کاروان سەراکە، ژورمان گرت، من و ئاریز عەبدولا لە یەک ژوردا جانتاکانمان دانا، پێکەوە چووین بۆ سەردان و گەرانی ناوبازار، ئاریز سالی ١٩٨٧ بۆماوەی یەک سال لێرە زیندان بووە، سەرەتا چووین بۆ جێگەیەک هەوالی برادەرێکی ئاریزمان پرسی بەناوی مەحمود ئیلیخت، لەوێ نەبوو، ئاریز ناونیشانی ژورەکەمانی لەکاروان سەراکەدا بۆ بەجێهێشت، دواتر لەبازاردا زۆرگەراین لەدلا واهەست دەکەم لەناو شاری سلێمانیدام، چووینە ناو دوکانێک بەرمالی (جانماز ) مەرەزی زەردی زۆر جوانی لێبوو، بەئارێزم ووت بەرمالێک بۆ دایکم ئەکرم، خاوەنی دوکانەکە پیاوێکی پاک و تەمیزی تەمەن نزیک بە ٦٥ شەست و پێنج سالان بوو، لەسەر بەرەیەک چوار مشقی دانیشتبوو، کچێکی تەمەن نزیک بە ١٤ چواردە سالان لەبەر دەستیدا بوو. کاتێک داوای بەرمالەکەم کرد دایگرێت تەماشای بکەم، پیاوەکە بەشێوە زاری هەورامیانە بەکچەکەی ووت ئەو بەرمالە داگرە بۆیان، بەئارێزم ووت، ئەزانی بەهەورامیانە قسەی کرد، کەووتمە قسەکردن لەگەل پیاوەکە بەهەورامیانە، پرسی خەلکی کوێی؟ ووتم هەورامان، ووتی رۆژئاوایی ئێران؟ ووتم بەلێ. منیش پرسیم تۆ خەلکی کوێی؟ ووتی: ئێمە خەلکو بنوگولینم، واتە ئێمەخەلکی بنگۆلین، کەمێک باسی هەورامانم بۆکرد و ئەویش باسی شێوەزاری زازایی کرد، ووتی ئێستا ژن و پیاوە بەتەمەنەکان و خەلکی ئاواییە دوورە دەستەکان هەربەم لەهجە قسە دەکەین، قسەکانی تێکەلاو بوو، جار جار ووشەی فارسی و تورکی بەکار ئەهێنا.

ئێوارە دەرەنگ گەراینەوە کاروان سەراکە، لێرەش چەندکەسی زازایی لێبوو، من بەهەورامیانە کەووتمە دواندن لەگەلیان کاک سەعدی پیرە نزیک

بووەوە لێمان، پرسی حەمە ئەوە چۆن تێدەگەی لەوزمانە؟ ووتم کاک سەعدی هەورامین بە هەورامیانە قسە دەکەین.

ئەم کاروان سەرا ساڵی ١٥٢١ بناغەی دانراوە ساڵی ١٥٢٧ تەواو بووە، سەرای لادان و پشوودانی کاروان چیەکانی باشوورو رۆژهەلات بووە، جێگەی ٧٠٠ حەوت سەد ئەسپ و حوشتر یان قاتری تێدا بووەتەوە. کاروان سەرا لەسەر شێوەی کۆنی خۆی نوێ کراوەتەوە، ٨٢ هەشتاو دوو ژورە، دیمەنێکی جوان و دڵگیری هەیە، موڵکی شارەوانی و شارە ٤٩ چل و نۆ ساڵە ئیجاری کابرایەکە. لەگەڵ ئاریز لەژورەکەی خۆماندا بووین درا لەدەرگا، کردمانەوە دووپیاو لەبەر دەرگاکەدا وەستابوون ووتیان مۆڵەت هەیە؟ ووتمان فەرموون، هاتنە ژورەوە، خۆیان ناساند یەکێکیان مەحمود ئیلیخت و ئەویتریان ناوەکەیم لەبیر چوە کابرایەکی بالابەرزی چوار شانەی سەرتاسی برۆ قەوی بوو، ئاریزیش سەرەتا مەحمودی نەناسیەوە. دوای کەمێک ئاریز دەستی بەقسە کردن کرد و هەواڵی چەند برادەرێکی خۆی لەمەحمود پرسی و ئەویش وەلامی دایەوە. مەحمود بەرپرس و ئەندامە لەحزبی سۆشیالیست، کوردە. لەدرێژەی مناقەشەو قسەکردن دا باسی ئۆجەلان و گرتنەکەی و (پێ کاکا) ووتم کاک ئاریز من ئەچمەدەرە، ووتی بۆ؟ ووتم رەنگە دووربین(کامێرا) میکرۆفۆن شتێک لەم ژورانەدا دانرابێت، ووتی جابۆ چیمان وتوە، باوەڕناکەم شتی وانییە. مەحمود تێگەیشت ووتی چیە ئەترسی، ووتم نا بەلام باسەکەی ئێوەم بەدڵ نییە. ووتی بۆ؟ ووتم ئێستا ئۆجەلان زیندانە و من حەزناکەم زەم بکرێت یان هەندێک قسەی نامەنتق بەرامبەری بکرێت، ئەوان لەقسەکانیاندا گلەی و رەخنەیان لە ئۆجەلان و پێکاکا بوو. ئاریز نەیهێشت بچمە دەرەوە. تازە منیش بەشداربووم لەقسەکردندا بەرگریم لەپێکاکا و ئۆجەلان دەکرد، مەحمود ووتی تۆ شەهابی شێخ نوری ناس دەکەی؟ ووتم بەڵێ ووتی کاتێک بردیانە بەردەم پەتی سێدارە چی ووت؟ ووتم، کەم بژی و کەڵ بژی و جنێو بەسەدام و رژێمەکەی. ووتی ئێ ئەوە قائدە سەرۆکە خاوەن هەڵوێستە، ئۆجەلان کەگیراوە یەکەم قسەی دەڵێت من دایکم تورکە، پاشان ئەو قسەو هەڵوێستانەی ئێستا لەزینداندا هەیەتی و ئەیکات، ئێمەو خەڵکی تریش چەندین ساڵ لەمەو بەر بۆمان پێشنیار کردوە، دوای ئەو هەموو کوشتارو وێران بوونی دێهات و زەرەرو زیانانەی

هەردوولا لەباکووری کوردستان، ئۆجەلان ئێستا ئەو قسانەی ئەوکاتی ئێمە دەکات. هەندێک تر قسە کران و ئەوان هەستان برۆن و ئێمەش رەوانەمان دەکردن، مەحمود لەبەردەرگاکە ووتی حەمە ئەو پێکاکا ئێوە پشتیوانی و بەرگریان لێدەکەن و پارتی دژایەتیان دەکات، پارتیان لەئێوە پێباشترە. زۆیش نابات شەڕتان دەکەن.

دوای رۆیشتنی ئەوان ئێمەش چووینە خوارەوە ئیدارەی کاروان سەراکە لەهۆڵی ژێر زەویەکەیدا، ئاهەنگێکی گۆرانی و مۆسیقای کوردیان بۆ ساز کردبووین شەوێکی خۆشمان گوزەراند. بەیانی رۆژی ١٩٩٩/١١/١٣ کاتژمێر ٥:٠٠ پێنج لەکاروان سەرا دەرچووین و بەسواری پاس لەدەرگای لای رۆژهەلاتی شارەوە هاتینە سەرریگایی دیاربەکر ماردین، لەرێگادا تاگەیشتینە ماردین چەندین ناوچەی چۆڵ و ئاسەواری ئاوایی و دێهاتی روخێنراو باخ و باخات و مەزرای وشک بوومان بینی بەناو ماردینی جواندا هاتینە خوارەوە بۆ سەر رێگای سلۆپی ئەنقەرە، ماردین وەک ئامێدی هاتە بەرچاکاتێک بەرە و سلۆپی هاتین، شاری قامیشلۆ و دێهاتەکانی کوردستانی رۆژ ئاوامان لەنزیکەوە بینی، ئاواییەکانی کوردستانی باکوورو رۆژ ئاوا، بەتەلبەند لەو دەشتەدا لەیەک دابڕێندراون. مرۆڤی کورد کاتێک ئەم دیمەنانە لەنێوان کوردستانی باکوور و رۆژئاوا، لەنێوان باشوور و هەردوو بەشەکەی رۆژئاوا و باکووردا ئەبینێ، هەروەها لەنێوان رۆژهەلات و باکوور و باشووردا، هەست بەکەمی و بێکەسی دەکا و ئالەوێدا خەم و نیگەرانی دایئەگرێ و جۆرێک لە بێ ئومێدی تێکی دەشکێنێ.

بەڵێ بەناو شارەکانی جزیرەو سلوپیدا گوزەرمان کردو بۆ کاتژێر ١١ یانزەی نیوەڕۆ سنوورە دەستکردە زۆرەملێکەی نێوان باکوور و باشوورمان خستە پشت سەرو هاتینە زاخۆ. دوای نان خواردن و پشوودان بەرێکەوتین بۆ سلێمانی، کاتژمێر ١٢:٠٠ی شەوی، ١٣ لەسەر١٩٩٩/١١/١٤ گەیشتینە بارەگای مەڵبەندی رێکخستنی سلێمانی و کۆتایی بە سەفەرەکامان هات.

# دەست بەکاربوونەوە

رۆژەکانی ١٤و ١٩٩٩/١١/١٧ لەسلێمانی لەماڵەوە بووم ئەم چەند رۆژە خەریکی پێشوازی و بەڕێکردنی میوان و هاوڕێ و دۆستەکانم بووم، هەروەها ناوەناوە سەردانی ئەو ماڵانەم دەکرد پرسە و ماتەمینیان هەبووە، لەوانە د. کەمال فوئاد ، باقی حەسەن هەورامی و .........تاد.

رۆژی ١٩٩٩/١١/١٩ رژێمی عێراق هێزی سەربازی جوڵە پێکردوە بۆ سەر سنووری نێوان هێزی پێشمەرگە و هێزەکانی خۆی، لە هێڵی ٣٦ سی و شەش، هێزی پێشمەرگە ئامادە باشە، دیارە سەدام بەم کۆنگرەی نیۆیۆرکە پەست و شڵەژاوە.

ئەمرۆ ١٢/٢٠ چوومەوە بۆ هەڵەبجە، لەبارەگای مەڵبەند کۆبوونەوەی دەستەی کارگێڕی مەڵبەندمان کرد، من بەکورتی باسی سەفەرەکە و بەشداریمان لە کۆنگرەی نیۆیۆرکدا بۆ هەڤاڵان کرد، دوای کۆبوونەوەکە مامۆستا ئەیوب رۆستەم داوای کرد لەگەڵ من و مامۆستا جەمالدا دانیشتنێک بکات، لەدانیشتنەکەدا باسی بێ سەروبەری رێکخستن و ناتەبایی نێوان هەڤاڵەکان و ئەو بارودۆخەی کرد کەبەهۆیەوە گەشەکردن و پێشکەوتن وەستاوە.

ئێمە سوپاسمان کرد و خۆشمان ئاگاداری بارو دۆخەکەین، بەڵام ناتوانین هیچ ئیجرائات بکەین، بۆیە دواتر من و مامۆستا جەمال پێکەوە دانیشتین و بڕیارمان دا من نامەیەک لەو بارەوە بۆ مام جەلال بنوسم، دواتریش مامۆستا سەردانی مام جەلال بکات و راستی بارودۆخی مەڵبەندەکەی بۆباس بکات. تا رێگەیەک بدۆزرێتەوە بۆ دەربازبوون لەو کۆسپ و تەگەرانەی بەردەم گەشەکردن و پێشکەوتنی مەڵبەندەکە، کەسەرجەم کێشەکان بەهۆی دەستە و دەستە گەریەوە دروست بوون.

من ئەمرۆ ١١/٢١ لەهەڵەبجە لەبارەگای مەڵبەند خەریکی بەڕێکردنی میوانم، دوای ئیشوکار، سەردانی ماڵی خوالێخۆش بووحاجی مەحمودی رێشاویم کرد، باوکی پێشمەرگەی دێرین و ئازاو چاونەترس خەلیل رێشاویە. بۆ بەشداری خەم و ماتەمی و سەرەخۆشی لێیان، بەبۆنەی کۆچی دوایی

حاجی باوکیەوە. لای ئێوارەش سەردانی پرسەیەکم کرد لە کانی پانکە. شەویش هاتمە سلێمانی.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١١/٢٣ لەهەڵەبجە لەبارەگای مەڵبەند بووم، قەرەباڵغ و خەڵک دێت و دەروات، منیش میوانی زۆرم هەبوون و دەستە دەستە بەڕێم کردن. ئەمڕۆ ١١/٢٥ سەرلەبەیانی لەشارۆچکەی زەڕایەن بەشداریم کرد لەڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی باوکی فایقە بچکۆل، فایق پێشمەرگەی دێرین و خەڵکی ئاوایی چوار دارانە، چوارداران ئەکەوێتە ئەودیو چیای بەمۆ بەدیوی رۆژهەلاتدا، فایق سەربەخێڵی باوەیە، خێڵی باوە بەرلەکۆچ پێکردن لەوناوچە نیشتەجێ بوون.

دواتر چووینە بارەگای کۆمیتەی رێکخستنی قەزای شارەزوور و زەڕایەن (وارماوا)، لەگەڵ ئەنجومەنی کۆمیتەدا کۆبووینەوە، لەم کۆبوونەوەدا باسی سەفەری ئەمریکاوبەشداری وەفدی یەکێتی نیشتیمانیمان کرد لە کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی دا. دوای کۆبوونەوەکە پێکەوە سەردانی چەند کۆڕێکی پرسە و ماتەمینی و چەند نەخۆشمان کرد. ئیشوکاری حیزبی ئێستا زۆرتر سەردان و بەسەر کردنەوەی خەڵک و سەردانی نەخۆس و بەشداریە لەڕێوڕەسمی پرسەو تەعزیەکانیاندا، چوونکە خەبات بووەتە خەباتی پەرلەمانی و هەڵبژاردن.

ئەمڕۆ١١/٢٦ خزم و کەسوکار لەتەوێڵە خۆیان ئامادە دەکەن سبەینێ رێوڕەسمی شەکراو خواردنەوەو ژن مارەبڕین بۆ ئیقباڵی برام ئەنجام بدەن، ئێمە ناتوانین بەشداربین، چوونکە ئەوهێزە چەکدارانەی ئیسلامیەکان لەبیارەن رێگری و زەحمەت دروست دەکەن بۆمان، ئێمەش خۆمانیان لێ لائەدەین. ئەمڕۆ سەردانی کاک کۆسرەتم کرد و هەندێک قسەمان کرد، سەبارەت بەو بارو دۆخەی هەورامان و هەڵەبجە و ئیسلامیەکان. بۆم باسکرد کەهەموو هەولێریە توندرەوەکان، لەناو هێزی دووی سۆرانی سەربەبزووتنەوەی ئیسلامیدا لەبیارە و دەوروبەریدا کۆبونەتەوە. ڕای خۆشم بۆ باسکرد کەلەوانەیە ئەوانە بزووتنەوە و بەتایبەت ماڵی مامۆستا مەلاعەلی بەجێبهێڵن و لەگەڵ گروپەکەی تەوحید یەکبگرنەوە و شتێکیتر درووست بکەن.

ئەمڕۆ ١١/٢٧ سەرلەبەیانی زوو ئیدریس عابد ئاگاداری کردم پورە نەهیەی هاوسەری عیزەت مستەفا مردوە، ئەو کچەی بڕیارە ئەمڕۆ

شەكراوی بخورێتەوە برازای كاك عیزەتە، ناوی تانیا كەمال مستەفایە، بۆیە ئاگاداری ئیقباڵم كرد ڕێوەڕەسمەكە دوابخەن بۆ كاتێكیتر، كاتژمێر ١٠دەی بەیانی هاتینە مەڵبەند، ئەمساڵ بەفرو باران كەمە، لەسەیدسادقەوە تەماشایی چیاكـانی سـورێن و هەورامـان دەكەیـت كەمێـك بەفـر لەبەرزە كلاوانـی سـەرچیاكاندا ئەبینـرێ، بەشـداری كۆبـوونەوەیەكی فراوانـی مامۆسـتایانی پەروەردەی هەڵەبجەمان كرد، لەهۆڵی بینای قوتابخانەی ئەحمەد موختاردا. بەشداری كۆبوونەوەیەكی ترمان كرد لەگەڵ ئەندام بەشەكانی مەڵبەندا، عادل مراد و هەڤاڵانی ڕاگەیاندنی یەكێتی سەردانی مەڵبەندیان كرد، بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمی دایكی شەهیدان فاتیح ئێناخی و عەلائەدینی برایم كرد. عادلی سەید قادر لەبەغدا كۆچی دوایی كردووە، شەو چوومە سلێمانی لەمزگەوتی عەبدوڵا لوتفی تابەیانی مامەوە بەدیار جەنازەكەی عادلەوە.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١١/٢٨ سەرلەبەیانی بەشداری ڕێوڕەسمی بەخاك سپاردنی تەرمی عادلی سەید قادرم كرد، لەسەرگردی سەیوان، پاش نیوەڕۆ بەشداری كۆڕی ماتەمینییەكەیم كرد لەمزگەوت، هەروەها بەشداری كۆڕی پرسەو ماتەمینی خوالێخۆش بوو نەهیە عەبدلمەجید هاوسەری عیزەت مستەفام كرد لە مزگەوتی قەزازەكان، ئێوارەی ئەمڕۆش بەشداری پرسەی خوشكی قادری موهەندسم كرد لەسەرچنار.

ئەمـڕۆ ١٩٩٩/١١/٢٩ چـووم بـۆ پێنجـوێن، دوای سـەردانی كـۆمیتەی ڕێكخسـتن، كۆبـوونەوەی فراوانمـان كـرد، لەگەڵ مامۆسـتایانی سـنووری پەروەردەی پێنجوێندا، نیيەتی ئەم كۆبوونەوە بۆ ئامادەكردنی مامۆستایانە تا لە هەڵبژاردنی یەكێتی مامۆستایاندا، زۆرترین دەنگ بەنوێنەرەكانی یەكێتی نیشتیمان كوردستان بدەن. دوای كۆبوونەوەكە گەڕاماوە بۆ هەڵەبجە.

ئەمـڕۆ ١٩٩٩/١١/٣٠ لەبارەگـای مەڵبەنـدی ڕێكخسـتندا، لەگەڵ هەڤـالانی ئەنجـومەنی مەڵبەنـد پێشـوازیمان كـرد، لە بەرپـرس و ئەنـدامانی مەڵبەنـدی ڕێكخستنی هەڵەبجەی یەكگرتووی ئیسلامی كوردستان، دوای بەڕێكردنیـان عەبدولكەریم حـاجی بەرپرسـی وەفـدێك لەمەكتەبی شـەهیدان سـەردانیان كـردین، پـێكەوە سـەردانی بارەگـای قائیمقـامی هەڵەبجەمـان كـرد، لەوێ كۆبوونەوەمـان كـرد، لەوكۆبـوونەوەدا قسـە لەسـەر ئامـاری شـەهیدانی كیمیاباران و شەهیدانی كوردستان بەگشتی كرا.

پاش کۆبوونەوەکە سەردانی ماڵی دایکی یەکەم شەهیدی شۆڕشی نوێمان کرد، یەکەم شەهید ناوی فاتیح شێخ حەیدەرە، لەبنەچەدا خەڵکی ئاوایی سازانە لەرۆژهەلاتی هەڵەبجە. دوای گەڕانەوەی ئەوان من بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی دوو ژنی کاکەیی خەڵکی ئاوایی هاوارم کرد. ئێوارە چوومە سلێمانی و سەردانی دەستگای چاپ و پەخشی سەردەمم کرد، لەگەڵ هەڤاڵان ڕەوف بێگەرد و شوان ئەحمەد و ئازاد بەرزنجیدا دانیشتین و بڕیار درا بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگ چاپی دووەم بکرێتەوە.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١٢/١ لەهەڵەبجە خەریکی ئیشوکاری ئاسایی مەڵبەند و بەڕێکردنی کۆمەڵێک میوانم، لەوانە نوێنەرانی سێ ئاوایی دەشتی شارەزوور، هاتون بۆئەوەی پشتیوانیان بین لای حکومەت تاپرۆژەی خزمەتگوزاری ئاو کارەبایان بۆ جێبەجێ بکەن.

پاش نیوەڕۆ بەشداری ڕێوڕەسمی دوو پرسەو ماتەمینیم کرد یەکێکیان پیاوێکی ناسراو قسەخۆش بووە لەناوچەکەدا بەناوی حاجی بابای حاجی محەمەدی حەمەالە خەڵکی تەوێڵەو ئەویتریان ژنێکی کاکەیی بوو. ڕۆژانی٢و١٢/٣ گەڕامەوە بۆ سلێمانی میوانم هاتبوون لەئێرانەوە، لەوانە کاک تەوفیقی ڕەحیمەی پاوەیی، لایقی ولەدبەگی، لەسلێمانیش میوانداری کاک باقی حاجی حەسەن هەورامی و کاک حەمەحسێنی حاجی فەرەجم کرد، ئەمان هاوڕێ و برادەری کاک تەوفیقن، لەسالانی١٩٦٥ بەدواوە پێکەوە کەسابەت و توجارەتیان کردوە، لەنێوان عێراق و ئێراندا. ئەم دوو ڕۆژە پێکەوە بووین، ئەوەندەش ماوە هەبوو، لێکدانەوەی چەندین وشەی بیرەوەریەکانی تەیمورم ئامادە کرد بۆ چاپی دووەم.

ئەمڕۆ شەمە ١٩٩٩/١٢/٤ لەهەڵەبجەم، سەر لەبەیانی سەردانی دووهاووڵاتی نەخۆشم کرد، دواتر گەڕامەوە بۆ مەڵبەند، لەکۆبوونەوەی کارگێری مەڵبەندا بڕیارماندا ئاڵوگۆڕو بەرپرسی نوێ بۆ چوار کۆمیتە دیاری بکەین، دوای پرسوڕاوێژ بەهەڤاڵان و گفتوگۆی نێوان خۆمان، کاک جووتیار مەجید بۆ پێنجوێن، کاک حەمەشارەزووری بۆ سەیدساق، مامۆستا عوسمان عەبدولا بۆ هەڵەبجە، مام وریا براخاس بۆقەزای شارەزوور دیاری کران. ئەمە وەک هەنگاوێک بۆ بەرەوپێش چوون و گەشەکردنی ڕێکخستن لەو شوێنانەدا.

ئەمڕۆ ١٢/٦ سەردانی ماڵی کوڕەکانی سەیدقادری باخچەم کرد لە سلێمانی، باخچە ئاواییەکی بناری چیای باکووری قەرەداغە بەرەوی دەشتی شارەزووردا، ئەکەوێتە بناری چیاکە، نزیکە لەئاوایی زرگوێز و ئەکەوێتە دەستەچەپی ئاوایی دارە رەش، ئەم بنەماڵە خێزانێکی گەورەو قەرەباڵغن، من بەهۆی شۆڕش و پێشمەرگایەتیەوە ئەیانناسم و دۆستی بەوەفان. دوای نیوەڕۆ لەگەڵ چەندین ئەندامی ئەم خێزانە سەردانی کاک کۆسرەتمان کرد. کاک کۆسرەت پێشوازی و ڕێزی زۆری گرتن من پێم خۆش بوو، چوونکە ماندون و خاوەن شەهیدن.

لەناو سەرکردەو بەرپرسانی شۆڕشدا، کەمن ئەوکەسانەی وەک کاک کۆسرەت رێز لەخەڵک و کەسوکاری شەهید و پێشمەرگە و کادرە ماندو ئازاکان بگرێ و دەرگایی ئاوەڵا بێت بەرەوی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵ دا.

ئەمڕۆ ١٢/٧ چووم بۆ پێنجوێن، باران دەبارێت، بڕیارە بەرپرسی مەڵبەندی شەشی بزووتنەوەی ئیسلامیش بێت، پێکەوە چارەسەری ئەو کێشە بکەین کە لەئاوایی سەرسوراوی ناوچەی شلێرڕوویداوە، نیوەڕۆ کاک عەبدرەحمان عەبدرەحیم هات و پێکەوە کۆبووینەوە لەگەڵ هەڤالانی یەکێتی و بزووتنەوە، کێشەکە هی دومامۆستا بوو چارەسەر کراو بڕیاریش درا یەکێتی و بزووتنەوە ئەوگرژییەیڕوویداوە، ئاسایی بکەنەوە. لەکۆبوونەوەکەی هەردوولاماندا کاتێک کەمن قسەم دەکرد، ئامۆژگاری و ڕێنوێنی هەڤاڵەکانی خۆمانم دەکرد، کە تەباو برابن لەگەڵ بزووتنەوە، کێشەو گرفت دروست نەکەن. کاک جووتیار بەرپرسی کۆمیتەی یەکێتی لەپێنجوێن بەتەعلقەوە بۆسەر بزووتنەوە ووتی( ئێوە لەهەڵەبجە تەباو برابن خەمی ئێرەتان نەبێت) من قسەکەیم پێخۆش بوو، مەبەستی بزووتنەوە بوو کەئەوانن لەهەڵەبجە کێشەو گرفت دروست دەکەن، کاک عەبدولرەحمان تێگەیشت، ووتی ئینشاالله لەهەموو کوردستاندا تەبایی و برایەتی ئامانجمانە.

هەر ئەمڕۆش بەر لەم کۆبوونەوە هەڤالان م .عوسمان عەبدولا بەرپرسی پێشوی کۆمیتە و کاک جووتیار مەجید بەرپرسی نوێی کۆمیتە دەورو تەسلیمیان کرد. منیش پاش نیوەڕۆ گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١٢/٨ لەهەڵەبجە لەبارەگای مەڵبەند، خەریکی جێبەجێکردنی ئیشوکاری ئاسایی حزبی بووم، بڕیارە ئەمشەو فەرماندەی ئەو مەفرەزە نهێنییە چەکدارانەی لەناو هەڵەبجەدا هەن لەجێگەیەکی تایبەت دا یەک یەک لەگەڵ مامۆستا کەریمی شێخ عەلیدا ببینین، ئەمانە لەڕێکخستنەکانی یەکێتی و خۆمان ڕێکمان خستون، چەکدار کراون بۆکاتی تایبەت و ئیشوکاریشیان تایبەتە. ئەمشەو دوو کەسمان لەو هەڤاڵانە بینی و دوای دوو کۆبوونەوەی نهێنی جیاجیا سەبارەت بەبارودۆخی ئێستای ناوچەکە و پەیوەندیەکانی نێوان بزووتنەوە و یەکێتی قسەمان کرد و پێم ڕاگەیاندن هەرچەندە گرژی و ئاڵۆزیەکان بەرەو ئاسایی بوونەوە دەچن، بەڵام دەبێ ئێوە هەر بەنهێنی بمێننەوە. هەروەها لەگەڵ چەند کەسێک بەرپرس لەهەڵبجەدا کەسەربە بزووتنەوەی ئیسلامی بوون، قسەمان کردبوو هاوکاری خەڵک بکەن، بەنمونە بەڕێوەبەری پۆلیس، پێمان وتبوو ئەوانەی لەسەر کاری سیاسی بیانوو تۆمەتیتر ئەدەنە پاڵیان کارئاسانیان بۆبکات. لەوچوارچێوەدا دیاری وەک دەمانچەو هەتا خانوشمان بۆ تاپۆ کردبوو. ئەوانە زیاتر لەبەرگی ٣سێی دەنگی خاکدا باس دەکەم،

ئەمڕۆ١٩٩٩/١٢/٩ پێنج شەمە پرۆسەی هەڵبژاردنی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان دەستی پێکرد، یەکێتی نیشتیمانی لەقەزای شارەزوورو سەیدساق و پێنجوێن و عەربەتدا بەرندە بوو، لەقەزای هەڵەبجەدا یەککرتووی ئیسلامی بەرندە بوو، ئێوارە لەگەڵ هەڤاڵانی مەڵبەندا چووینە دەربەندیخان، میوانی کاک عەدنانی حەمەی مینا بووین، شەوێکی خۆشمان گوزەراند، ئەوانەی ئەمشەو پێکەوە بووین، ئەم هەڤاڵانە بوون: م. فەتاح کۆکۆیی، جووتیار مەجید، جەبار جەلال، م. کەریمی شێخ عەلی، مام وریای براخاس هاواری و شێخ خالدی ڕاوگان.

ئەمڕۆ ١٢/١٠ سەردانی کاک عەلی شامارمان کرد لەدەربەندیخان بەبۆنەی نەخۆش کەوتنییەوە، عەلی شامار خەڵکی خانەقین و پێشمەرگەیەکی دڵسۆز و ماندوی ئەم کوردستانەیە، پێشمەرگەی سەرەتای شۆڕشی نوێیە، لەمەفرەزەکانی سەرەتادا لەهەورامان رابەرسیاسی ئەو مەفرەزە بووە کەمن یەکێک لە پێشمەرگەکانی بووم، بۆیە ڕێزی زۆرە لای من. هەر ئەمڕۆ چووین بۆکەلار، بۆ بەشداری کردن لەڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی حاجی ڕەفعەتی

سەرۆک تیرەی تەرخانی سەر بەهۆزی گەورەی جاف، حاجی ڕەفعەت پیاوێکی بەڕێز، نتم و لەسەرەخۆو قسە ڕۆیشتوی ناو عەشائیرە، بەداخەوە بەهۆی نەخۆشی شەکرەوە کۆچی دوایی کردوە. لەشەوی رابردووەوە تا ئەم ئێوارە، وردەوردە باران دەبارێت. ئێوارە گەڕینەوە بۆ هەڵەبجە.

ئەمڕۆ ١٢/١١ لەهەڵەبجە لەبارەگای مەڵبەند خەریکی جێبەجێکردنی ئیشوکاری ڕۆژانەی حیزبیم، شەویش فەرماندەی ئەو مەفرەزە نهێنییەی ناوشارم بینی بەناوی سیکۆ، سەبارەت بەئیشوکاری لەمەودوایان قسەو گفتوگۆمان کرد. ئێمە لەناوشاری هەڵەبجەدا لەبەر بزووتنەوەو گروپەکانیان هەندێک لەڕێکخستنەکانمان بەنهێنی ڕێکخستووە، لەوانەش مەفرەزەی چەکدارمان درووست کردووە.

ئەمڕۆش ١٢/١٢ هەر لەمەڵبەند بووم، ئێوارە چووم بۆ سلێمانی، ئەمڕۆ ١٢/١٣ لەسلێمانی بۆنیوەڕۆ میوانی کاک باقی هەورامی بووم و ئێوارەش لەماڵی مەهدی برام. ئەمشەو بارانی باش باری.

ئەمڕۆ١٩٩٩/١٢/١٤ سێ شەممە لەسلێمانییەوە گەڕامەوە هەڵەبجە، زۆر دڵم زۆرخۆشە چوونکە بارانی باش باریوەو ئەمڕۆش کەش و هەوای هەوراوی و بەفر لەسەرکاوانەوە هاتووە بەرەو دامێن و بنارەکان. چاوەڕێ دەکرێت ساڵی داهاتوو وشکەساڵیەکە کاڵببێتەوە و گەنمی جووتیارەکانی کوردستان باشبێت.

ئەمڕۆ ١١/١٥پارێزگاری سلێمانی حاکم قادر سەردانی هەڵەبجەی کرد، هاتە مەڵبەندو پێکەوە چووین بۆلای قائیمقام کاک جەمیل عەبدولڕەحمان، جەمیل پیاوێکی ڕۆشنبیرو شاعیرە، لەوێوە چووین بۆکردنەوەی هۆڵی خوێندگای ئەحمەد موختار جاف، لەم شارەدا هۆڵی تێدانییە بۆ کۆڕوکۆبوونەوەکان بۆ گردبوونەوەو چالاکیە ڕۆشنبیری و هونەریەکان، ئێمە دوامان کردبوو ئەم هۆڵە نوێ بکرێتەوە، لەم ڕۆژانەدا نوێکردنەوەکەی تەواو بووە. دوای کردنەوەی هۆڵەکە سەردانی نەخۆشخانەی گشتی هەڵەبجەمان کرد، نەخۆشخانەکە کەموکورتی زۆرە، مەڵبەند داوامان کردووە، پێش هەر پرۆژەیەکی ترکەم و کورتیەکانی نەخۆشخانەکە چاک بکرێ و پێویستیەکانی بۆ دابین بکرێت لەلایەن حکومەتەوە. دواتر حاکم گەڕایەوە بۆ سلێمانی و ئێمەش هاتینەوە بۆ بارەگای مەڵبەند. ئەمڕۆ لەکاتژمێر٢:٠٠ دوی پاش

نیوەڕۆوە تا ٣:٠٠ سێی شەو بەردەوام باران دەبارێت، بارانی ئەمشەو واتە زیاد کردنی سەدان هەزارتەن گەنم، زیاد بوونی ئاو، پڕبەرەکەتی کشتوکاڵ و زیادبوونی بەروبومی ناوخۆ، ژیانەوەی لەوەڕگەو بوژانەوەی مەڕومالآت لەکوردستان.

ئەمڕۆ ١٢/١٦ سەردانی ناو بازاری هەڵەبجەم کرد، بازارێکی شێواو نارێکوپێک ئاسەواری جەنگی ١٩٨٨/٣/١٦ و شەڕی ناوخۆیشی پێوە دیارە، لەروخساری خەڵکدا دەیان مەینەتی و زەحمەت و ترس ودڵەڕاوکە دیارن، ئەمڕۆ سەردانی دوکانی خالۆ حەسەنی ئەلە جەوتەم کرد، حەسەن و حسێنی برای و باوکیشیان ژیر و قسەزان و لەناوکۆمەڵدا بەقسەخۆش و تەنزئامێز ناسراون، دواتر سەردانی دوکانی مەلا عەبدولای دەڵەمەڕیم کرد، مەلا عەبدولا پیاوێکی ناسراوی ناوچەکە و دیندار و لایەنگری ئاشتی و برایەتیە، دۆستی نزیکی مامۆستا مەلاعەلی و مامۆستا مەلا عوسمان و دۆست و تێکەلاوی منیشە.

هەر ئەمڕۆ چووم بۆ سەردانی رێگای ناوچەی نەورۆلی، رێگاکەیان خراب و داوام کردووە تائەو کاتەی قیر ئەکرێت بەکاتی چاک بکرێت. لەنیوەی رێگادا گەیشتین بە ئامێرەکان و جادەکە بووبووە قوڕ، لەوێ دەست خۆشیمان لەکرێکارو شۆفێرەکان کردو گەڕاینەوە، دوانیوەڕۆ سەردانی سەرچیای بالآنبۆم کرد، حەمە هاواری پێشمەرگەی دێرین و قسەخۆش لەگەڵ چەند کەسیتردا هاوڕێمان بوون، سەرچیا بەفر دایپۆشیوە، لەوێوە تەماشای دیمەنی جوان و سەرپۆش سپی کێوەکانی سەرسوورەوان و کۆیلە و ماکوانمان کرد، ئەم چیاو کێوە بەرزانە ئەکەونە کوردستانی رۆژهەلآت و رووبەرووی چیاکانی بالآنبۆ و شنروێ لەکوردستانی باشوور هەڵکەوتون، رۆخانەی سیروان لەیەکی دابڕیون.

ئەمڕۆ ١٢/١٧ سەردانی بارەگای مەڵبەندم کرد، لەبەر ئەوە رۆژی پشووە تەنها ئێشکگری لێیە، نامەیەکی پرسەو هاوخەمییم بۆ مامۆستا مەلا قادریی قادری نوسی و ناردم بۆ شاری پاوە لەکوردستانی رۆژهەلآت بەبۆنەی کۆچی دوایی باوکی خاتوو شەمامی هاوسەریەوە.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١٢/١٨ لەبارەگای مەڵبەند کۆبوونەوەی ئەنجومەنی مەڵبەندمان کرد، یەکێک لەبەرنامەکانی کۆبوونەوەکە، خۆئامادەکردن بوو بۆ

دیاری کردنی پاڵێوراوانی یەکێتی بۆ ئەندامانی ئەنجومەنی شارەوانییەکان و سەرۆکەکانیان. پاش نیوەڕۆ خێزانی هادی جەمە لەئاواییی کانی ئاسکانەوە هاتبوو بۆماڵی کاک عەزیزی حاجی عەبدوڵا، هادی بریندار بووەو لەماڵەوە کەوتووە، بڕیارە بنێردرێتە دەرەوە، هاوسەرەکەی داوا دەکات بچمە لای مام جەلال و نۆرەی بۆ پێش بخات، خۆیشی نەخۆش بوو، ١١٥ سەدو پانزە دینارم پێ بوو دامێ تابڕوات سەردانی دکتۆر بکات، بەڵێنیشم دایە لەبەر ئەوە هادی برینداریەکەی قوسە ئیشەکەی بۆبکەم. ئێوارە چووومە شاری سلێمانی ئاوی سەرچنار تەقیوەو زۆریش زیادی کردوە، چووم بۆسەیری ئاوەکە، لەم ساڵانەی رابردوودا ئەوەندە بێ ئاویمان دیوە، بەتەقینی کانیاو و چاوگەکان زۆر دڵ خۆشم، لەبەر ئەوەی ئێمە ئەمانەوێت کوردستانی وێران و داروخاو بنیاد بنێینەوە، یەکێک لەهۆکارە سەرەکیەکانی بنیاد نانەوە ئاوەدان کردنەوەی ئاواییەکان و بووژانەوەی کشتوکاڵ ئاوە، ئەوەیش ئەوە چەند ساڵێکە بەهۆی وشکە ساڵیەوە دواکەتووە.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١٢/١٩ کاتژمێر ٨:٠٠ هەشتی بەیانی لەخەو هەستام، ئەمشەو دوو کاتژمێر خەوتوم، لەبەرئەوە لەئێوارەوە تا ٦ شەشی بەیانی خەریکی خوێندنەوەی بەرگی دوی کتێبەکەی کاکە حەمەی حاجی مەحمود بووم، رۆژ ژمێری پێشمەرگەیەک. لەگەڵ مامۆستا جەمالی حاجی محەمەددا چووین بۆ شارۆچکەی سەیدسادق، لەبارەگای کۆمیتە کۆبووینەوە لەگەڵ ئەنجومەنی کۆمیتە و کۆمەڵایەتیی و بەشێک لەپیاوە دیارو ناسراوەکانی سنوورەکە، ئامانجی ئەم کۆبوونەوە ئامادەکردنی ئۆرگانەکانی یەکێتی و دۆستەکانمان بوو، بۆ دانانی بەرنامەی کۆکردنەوەی دەنگ بۆ سەرۆک و ئەنجومەنی شارەوانی لە سەیدسادق.

دوای ئەم کۆبوونەوە سەردانی لقی ژنانمان کرد، گوڵزارخان و ستافەکەی ئامادە بوون، دوای تەواو بوونی قسەوباس لەگەڵ ئەوانیشدا، سەردانی ماڵی هادی جەمەمان کرد، نەخۆشەو کەوتوە ماڵەکەی لەکانی ئاسکانەوە هێناوەتە سەیدسادق. لەوێوە چووین بۆ سەراوی سوبحان ئاغا، سەردانی فەرماندەیی تایبەتمان کرد، هەڤاڵان عوسمان گەچێنەی و عوسمان سێدەری و هەڤاڵەکانیان پێشوازیان کردین و لەگەڵیان کۆبووینەوە. دواتر سەردانی فەرماندەیی ٦ شەشی شارەزوورمان کرد، لەوێ لەگەڵ هەڤاڵان جەلال

کولکنی و مەهدی برام و عەزیز کولکنی و بەمۆ هاواری و هەڤاڵەکانی تریاندا کۆبووینەوەو بۆ نیوەڕۆش میوانی ئەوان بووین.

هەر ئەمڕۆ پاش نیوەڕۆ هاتینە ناحیەی تانجەرۆو لەگەڵ ئەنجومەنی کۆمیتە و ڕێکخستنەکانی سنوورەکە، لە شارەوانی و پۆلیس و ناحیەو ئاساییش و چەندین کەسایەتی دۆستی یەکێتی لەسنووری عەربەت و شارەزووردا کۆبووینەوە، بۆهەمان مەبەستی کۆکردنەوەی دەنگی دەنگ دەران بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین دەنگ تاله پرۆسەی هەڵبژاردنی شارەوانییەکاندا سەرکەوتوبین. ئێوارە چووینە سلێمانی.

شەو سەردانی ماڵی کاک بەکری حاجی سەفەرمان کرد، بۆ پرس و ڕاوێژکردن پێی، ئەمانەوێت ئەو لەسنووری پێنجوێن دا ئاگاداربێت و ڕەزامەند بێت لەسەر کاندیدەکان، لەماڵ نەبوو. لەوێوە چووین بۆماڵی کاک سابیری فەرەجی شاتری لە گەڕەکی زەرگەتە داوامان لێکرد بۆ ئەم هەڵبژاردنە هاوکارمان بێت لەسنووری سەیدسادق دا. دواتر لەگەڵ قادر بێستانی گەڕامەوە بۆماڵی کاک بەکرو بۆماوەی یەک کاتژمێر کاتمان گرت، مەبەستمە کاک بەکر دڵی نەرەنجێ، لەسەردانێکمدا بۆلای جەنابی مام جەلال پێی ووتم ئەبێ ئاگاداربی کاک بەکر نیگەران نەبێ لێت. بۆیە مەبەستمە کاندیدەکانی پێنجوێن ڕەزامەندی ئەویشی لەسەربێت.

شەو درەنگی کردو هاتمە ماڵەوە ماندوم و خەو زۆری بۆهێناوم. ئەم هەموو هەوڵ و تەقەلا لەبەر خاتری مام جەلالە، ئەگینا بەشێک لەبەرپرسەکانی من لەخوار مامەوە بەئاشکرا هەوڵی تەواویان خستوەتە گەڕ بۆ ئەوەی سەرکەوتوو نەبین.

ئەمڕۆ ٢٠/١٢/١٩٩٩ ڕۆژی دووشەممە لەقەزای شارەزوور بووین، لێرەش کۆبووینەوە لەگەڵ ئەنجومەنی کۆمیتەی ناوەندی قەزاکەو ناحیەی زەڕایەن، یەک کۆمیتەیان هەیە، هەموو ئۆرگانەکانی حزبی و بەرپرسەکانی ئیداریی سەر بەڕێکخستن، لەگەڵ کەسایەتییەکانی سنوورەکە بەشدار بوون. ئەم کۆبوونەوەش بۆ خۆ ئامادەکردن و دیاریکردنی کاندیدەکانە. دوای کۆبوونەوەکە بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی مەحیەدین شەریف هاواریمان کرد. دواتر سەردانی ماڵی شەهید خەرمان عامل مەحەمەدمان کرد کچێکی سێ ٣ ساڵانی بەنەخۆشی زەردویی مردبوو، زۆر نیگەران بووم بۆی.

سەردانی رزگاری برای سابیرە سڵقەمان کرد، لەپێکدادانی ئۆتۆمبێل دا هەردوو لاقی شکاون. سەردانی ماڵی کاک حەمەسەعیدی حەمەی سان ئەحمەد شەمێرانیمان کرد، لەگەڵ جەباری برایدا سەبارەت بە کاندید کردنی ئەندازیار لوقمانی کوڕی شەهید ئەنوەری برایدا قسەمان کرد، ئەیەوێت خۆی کاندید بکات بۆ سەرۆکی شارەوانی هەڵەبجەی تازە، لێرە بەربژێر کردن ئاسان نییە، چوونکە پێک هاتەی کۆمەڵایەتیی و عەشائیری نێوانیان ساردو کەمێک دژبەیەکن، بەربژێر لەهەر تیرەیەک بوو تیرەکانی تر هەرچەندە رێکخستنی حزبی حزبەکەی تۆشبن، برێکیان هەر دەنگی نادەنێ.

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ قەزای شارەزوورمان جێهێشت و چووینە کۆمەڵگەی ئەسر سەردانی ماڵی کاک سەرحەدی خەلیفە یونس براگەورەی تیرەی روخزاییمان کرد. رەمەزانە من بەرۆژو نیم، لەماڵی لالە هەرچەند هەوڵیان دا نان و چێشت ئامادەکەن نەمهێشت. نان و ماستم خوارد زۆر بەلەزەت بوو. لەوێ هەستاین و هاتینە عەربەت، سەردانی ماڵی حاجی ئەکرەمی دەربەند فەقەرەییمان کرد، لەماڵ نەبوو خێزانەکەی فەرمووی گەرمی کردین و داوایان کرد بۆ ئێوارە لەوێبین، بەڵام نەوەستاین و چووینەوە بۆبارەگای کۆمیتەی عەربەت و دوبارە لەگەڵیان کۆبووینەوە، ئەو ئیشوکارەی دوێنێ تەواومان نەکردبوو ئەم ئێوارە لەگەڵ ئەنجومەنەکەدا تەواومان کرد. ئێوارە هەوا تاریکی کردبوو، مەکتەبی رێکخستن چاوەڕێی دەکردین لەسلێمانی، گەیشتین و لەگەڵ هەڤالان رزگار عەلی، ئاسۆ عەلی، مامۆستا کاوە و ئەبووبەکر خۆشناودا کۆبووینەوە. کۆبوونەوەکە لەسەر کێشەی چەند کادرێکی کۆمیتەکان بوو.

لەوێ هەستاین و چووینە ماڵی مامۆستا جەمال، لەوێ دانا نوری بەڕێوەبەری ناحیەی خورماڵ و جەلال بەرپرسی لقی کشتوکاڵی خورماڵ چاوەڕێیان دەکردین، لەگەڵ ئەوانیشدا کۆبووینەوەو بەرنامەمان دانا بۆ بەربژێرکردنی ئەندامانی شارەوانی و سەرۆکی شارەوانی خورماڵ، ئەمانە دوو کادری نەترسن، بەتایبەت دانا من زۆر لێی رازی بووم، ئیسلامیەکان لەخورماڵ زۆریان هێنابوو، دانا حسابی بۆنەدەکردن، هەڤاڵانی ئێمە لەکاتی شەڕی ناوخۆدا چاوترسێن بوو بوون. دوای ئەو شکانە لەدروست کردنەوەی

ڕێکخستندا ، دانا دەوری بەرچاوی هەبوو، ئەیتوانی بڵێت من بەڕێوەبەری ناحیەم، ناتوانم کاری حزبی بکەم، بەڵام قەد درێغی نەکرد.

هەر ئەمشەو هاتینەوە بۆماڵی کاک بەکری حاجی سەفەر لەگەڕەکی بەختیاری شاری سلێمانی، لەگەڵ کاک بەکر، دوو٢ کاتژمێرمان پێچوو، قسەمان لەسەر شارەوانییەکانی پێنجوێن ، ناڵپارێزو گەرمک دەکرد، چوونکە بەیانی ئێمە سەردانی ئەوێ دەکەین، ئەمانەوێ ئاخر رای کاک بەکر وەرگرین.

درەنگانی شەو هاتمەوە بۆماڵی خۆمان، بینیم خەڵکێکی زۆری کۆمیتەی عەربەت و زۆربەی کادرەکانی ئەو کۆمیتە لەوێ چاوەڕێی من دەکەن، لەسەر پاڵێوراوی سەرۆکی شارەوانی عەربەت قسەو سەرنج و ڕوون کردنەوەیان هەبوو. هەندێک لایەنگری ئەوەبوون نەجات خان کەخۆی سەرۆکی شارەوانی بوو، بەربژێر بێت، هەندێکی تر باسی کادرێکیان دەکرد، دەبوو بڕوانامەی شەشی ئامادەیی هەبێت، ئەو کادرە بڕوانامەی نەبوو. پێم وتن دواتر دێینەوە بۆلاتان و قسە دەکەین، زۆر ماندو شەکەت بووم، بەڵام دەرم نەئەبڕی. ئەوان ڕۆیشتن و ئێستا کاتژمێر ٥:٣٠ پێنج و نیوە، من هێشتا نەنوستووم، خەریکی نوسینەوەی ئەم یاداشتانەم، لەگەڵ منداڵەکان نان و چایی پارشێو ئەخۆین، هیچیشمان نییە بۆ بەرچایی.

ئەمڕۆ ١٩٩٩/١٢/٢١ سەرلەبەیانی لەناڵپارێزین، کۆبوونەوەمان هەبوو لەگەڵ ڕێکخستنەکان و دۆستەکانمان لەو شارۆچکەدا. دواتر چووین بۆ پێنجوێن کاتژمێر ١١:٠٠یازدە، کۆبوونەوەی جەماوەرییمان کرد لەگەڵ جەماوەریی پێنجوێندا. هەلەوێ ئەمڕۆ سێ٣ کۆبوونەوەی ترمان کرد، لەگەڵ جەماوەریی گەرمک و پێشمەرگە دێرینەکان و ژناندا. ئەمڕۆ دواجار سەردانی بارەگای کۆمەڵایەتیمان کرد. قسەوباس و گفتوگۆ و مناقەشەی ناو ئەم کۆبوونەوانە هەموو دانانی بەرنامەیە بۆ چۆنییەتی ئیشکردن و ئامادەکاری هەڵبژاردنی شارەوانییەکان، ئێمە ترسمان هەیە لەسنووری مەڵبەندەکەدا بدۆڕێین، بەتایبەت لەشارو شارۆچکە گرنگەکانی وەک هەڵەبجە، سەیدسادق و خورماڵ. لە هاتنە خوارەوەدا سەردانی چەند ماڵێکمان کرد لە عەربەت، ئێوارەی ئەمڕۆ چووینەوە بۆبارەگای کۆمیتەی تانجەرۆ.

ئەمرۆ ١٩٩٩/١٢/٢٢ لە سلێمانیم، لەگەڵ کاک شەوکەتی حاجی موشیر مناقەشەو باسی کتێبەکانی کاکە حەمەمان کرد، باسی ئەو مەقالەم کرد کاک قادر عەزیز سکرتێری حزبی زەحمەتکێشان لەرۆژنامەی ئالای ئازادیدا بڵاوی کردوەتەوە، بەناوی ( وەڵامێک بۆ چەواشەکاریەکانی کتێبی رۆژ ژمێری پێشمەرگەیەک).

لەگەڵ کاک قادر عەزیزدا بەتەلەفۆن قسەم کرد لەسەر ئەومەقالەی بڵاوی کردوەتەوە و رەخنەی لەکتێبەکەی کاکە حەمە گرتووە، چوونکە منیش رەخنەم هەیە لەسەر ئەو بابەت و زانیاریانەی لەچەند لاپەڕەیەکیدا سەبارەت بەخۆمن، یان ناوم هاتوە. لەسەرەتاوە زۆربەمان توند بووین و هەڕەشەی وەڵام دانەوەمان دەکرد، من لەرۆژنامەی هەواڵدا بەچەند بابەتێک هەندێک وەڵام و روون کردنەوەم بڵاو کردنەوە، سەبارەت بەوەی کەپەیوەندی بەخۆمەوە هەبوو، لەگەڵ بابەتێک کەپەیوەندی بەگرتنەکەی کاک نەوشیروان مستەفاوە بوو، دواترو وردە وردە ئەو شتانەم لا ئاسایی بوونەوە. ئێستا بووایە بەوجۆرە بەوشێوە ناشیرینەو بەتەعلیقەوە ئەو وەڵامانەم نەئەدایەوە. ئەمرۆ ناردبووم بەدوای چەندکەسێکدا لەتەوێڵەوە هاتبوون تاسەبارەت بەربژێرکردنی سەرۆکی شارەوانی تەوێڵەو ئەنجومەنەکەی پرس و ڕاوێژ بکەین، دواتر پێکەوە چووین بۆماڵی ماستا جەمال. دوای ئەوە ئەوانمان مۆڵەتداو رۆیشتن، ئێمە چووینەوە بۆلای کاک شەوکەت، بەرنامەیەکمان دانا دۆستە هەڵەبجەییەکانی یەکێتی لەشاری سلێمانیدا ببینین و راوێژیان لەگەڵدا بکەین سەبارەت بەبەربژێرەکانی هەڵەبجە.

ئەمرۆ ١٢/٢٣ پاش نیوەڕۆ لەماڵی مامۆستا جەمال، لەگەڵ هەڤاڵان کاک شەوکەت، م .شاهۆ و کاک جەمیل هەورامیدا کۆبووینەوە، ئاڵوگۆڕی ڕاوبۆچوونمان کرد، سەبارەت بە بەربژێرەکان، بەتایبەت ئەوەی هەڵەبجەو تەوێڵە. دواتر لەهۆڵی مەڵبەندی رێکخستنی سلێمانی کۆبوونەوەی فراوانمان کرد لەگەڵ هەڵەبجەییەکانی دانیشتوی ناو شاری سلێماندا، بۆ پرسوڕاوێژ، بەتایبەت بۆ بەربژێری سەرۆکی شارەوانی هەڵەبجەی شەهید. دوای کۆبوونەوەکە لەگەڵ کاک عومەری سەید عەلیدا هەندێک قسەمان لەگەڵ کاک سەرچڵ سەرحەد خەلیفەدا کرد. ئێوارە لەگەڵ هەڤاڵان کاک جەمیل، کاک شەوکەت، م. جەمال، کاک عەزیزی حاجی ئەولەو قادر بێستانی و جەباری

سەعید زۆرابدا لەماڵی خۆمان بووین و دوای نان خواردن هەموومان چووین بۆ ماڵی کاک بەکری حاجی سەفەر،کاک بەکر پیاوێکی دل و هەست ناسکە دەبێ بزانی چۆن دلنەوایی بکەیت.

ئەمرۆ ١٢/٢٤ لەگەڵ کاک جەمیل هەورامیدا لەسلێمانی سەرگەرمی ئیشوکاری سنووری هەورامان بووین تا کاتژمێردوازدەی١٢ شەو، کاک هوشیاری کەریم بەگیش لامان بوو.

ئەمرۆ ١٢/٢٤ لەهەڵەبجە بەشداری چەندین کۆبوونەوەمان کرد. رۆژی ١٩٩٩/١٢/٢٦ لەهەڵەبجەوە هاتینە سەیدسادق، سەردانی رادیۆی شارەزوورمان کرد. هاتینە عەربەت، م جەمال لەوێ لایدا کۆبوونەوەی هەیە، منیش هاتمە سلێمانی و چووم بۆ مەکتەبی رێکخستن. لەبارەگای بەشی روناکبیری لەگەڵ رێکخستن و چاودێری هەموو مەڵبەندەکاندا کۆبوونەوە هەبوو، ئاگاداریان کردین برادەرانی م.س دابەش کراوان وەک سەرپەرشتیاری مەڵبەندو ناوچەکان، کاک قادری حاجی عەلی دانراوە بۆ گەرمیان و شارەزوور.

دواتر سەبارەت بەو سەد١٠٠ پرسیارەی لەمەکتەب رێکخستن ئامادە کراوە بۆ وەڵام دانەوە، قسەوباس کرا. دوای کۆبوونەوەکە هاتمە ماڵەوە، ئێوارە لەگەڵ مامۆستا جەمال یەکمان بینی و من چووم بۆسەردانی کاک حەمە مۆریاسی، ئەمرۆ کاکە حەمە هاتوە بۆماڵەوە من لەوێ نەبووم. ئەمرۆ ١٢/٢٧ لەسلێمانی خەریکی ئامادەکردنی وەڵامی سەد١٠٠ پرسیارەکەین، لەگەڵ هەڤالان م. عەلی حاجی فەرەج و کەمال هەورامیدا.

ئەمرۆ ١٩٩٩/١٢/٢٨ لەسەیدسادق لەگەڵ کاک قادری حاجی عەلیدا کۆبووینەوە، قسەوباسمان کرد، سەبارەت بەو ئامادە کاریانەی بۆ هەڵبژاردنی شارەوانییەکان کردومانە، ئەویش رێنمایی هەڤالانی کردو سەرنج و تێبینییەکانی خۆی پێشکەش کرد. ئەو گەرایەوە بۆ سلێمانی و ئێمەش بۆ هەڵەبجە، بڕیارە بەیانی مام جەلال سەردانی هەڵەبجە بکات.

ئەمرۆ ١٩٩٩/١٢/٢٩ لەبارەگای مەڵبەندم ، ئاسمان ساماڵ و خۆرەتاوە، خەریکی ئیشوکاری ئاسایی و بەرێکردنی ئەو خەڵکەم لەکۆمیتەکانەوە دێن و سەردانی مەڵبەند دەکەن سەبارەت بە ئیشوکاری هەڵبژاردن، هەموو هەڤالانی ئەنجومەنی مەڵبەند کۆبوونەتەوە، مام جەلال هاتووە بۆ هەڵەبجە، لای

مەکتەبی سیاسی و رابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامیە. دواتر سەردانی بارەگای مەڵبەندی شارەزووری کرد لەگەڕەکی شارەوانی هەڵەبجەدا، دوای پێشوازی گەرم لە خۆی و هەڤاڵەکانی، کۆبوونەوە دەستی پێکرد لەگەڵ ئەنجومەنی مەڵبەندا. ئەوهەڤالانەی هاوڕێی بوون ئەمانە بوون: کاک د. کەمال فوئاد، کاک حەمە تەوفیق رەحیم و کاک مستەفا چاو رەش، لەم کۆبوونەوەدا کە هەڤالانی ئەنجومەنی کۆمیتەی هەڵەبجەش ئامادە بوون، پێشەکی مامۆستا جەمال هەستاو بەخێرهاتنی کردن و ویستی باسی بارودۆخی ناوچەکە و رێکخستن بکات، تەندروستی تەواو نەبوو، دانیشتەوەو ئاماژەی بۆ من کرد، منیش هەستام و قسەکانی مامۆستا جەمالم تەواو کردو ئەوەی پێویست بوو بەکورتی بۆم روونکردنەوە سەبارەت بەئامادەکاریەکانی هەڵبژاردنەکانی شارەوانیەکان. دووبارە بەخێرهاتنم کردنەوەو رووم کردە ئامادە بوان ووتم ئێستا گوێبیستی ئامۆژگاری و رێنوێنییەکانی مام جەلال ئەبین بفەرموو.

مام جەلال سەرەتا باسی بارودۆخی گشتی و چۆنییەتی ئیشوکاری حزبی و کارکردنی لەناو جەماوەردا بۆ کردین و برێک تورەش بوو، من ئێستاش نەمزانی ئەو نیگەرانییەی چی بوو، وایبۆچووم لەکۆبوونەوەکەی لەگەڵ بزووتنەوەدا تووڕەییەکەی هێنابوو، دوای تەواو بوونی ووتارەکەی، قەڵەم و کاغەزی بەدەستەوە گرتوو، لەسەر کلێشەی دەفتەری مەڵبەند بەقەڵەمێکی سور نامەیەکی نوسی ئەمە دەقەکەی بوو:

هەڤالانی مەڵبەند و کۆمیتەکانی بەڕێز

سلاوێکی گەرم

لەم ڕۆوە، پێویستە هەموو لێپرسراوەکان هەر لە هەڤالی لێپرسراوی مەڵبەندەوە تاسەر ئەندامانی کارگێرو کۆمیتەکان لە شوێنی خەباتی خۆیان دابن. هەفتانە هەر (٥) شەم و و هەینی بۆیان هەیە بچنەوە. ئەم بڕیارە پێویستە بەوردی جێبەجێ بکرێ

بۆ پێشەوە روەو سەرکەوتن

برای دلسۆزتان مام جەلال هەڵەبجە/ ١٩٩٩/١٢/٢٩

دوای ئەوە کاک د.کەمال زۆر بەنەمونیانی قسەی کرد لەسەر رێکخستن و چۆنییەتی کاری حزبی. دوای کۆبوونەوەکە هەموومان پێکەوە، چووین بۆ سەردانی ئەو پارچە زەوییەی کە مام بڕیاری داوە جەمخانە و

هۆڵی پرسەی لەسەر دروست بکات بۆ کاکەیەکانی هەڵەبجەو هاوار. دوای ئەوە ئەوان گەڕانەوە بۆ سلێمانی و مەڵبەندیش جمەی دێت و کەس ناوێرێت باسی ڕۆیشتنەوە بکات بۆلای ماڵومناڵی. ئەمشەو من جێگەم نەبووەوە لەمەڵبەند، لەگەڵ چەند کەسێکدا چووین لەماڵی کاک عەزیزی حاجی ئەولە خەووتین.

ئەمڕۆ ۱۹۹۹/۱۲/۳۰ لەبارەگای قائیمقامدا کۆبوونەوەی مەڵبەند و مەکتەبی سیاسی بزووتنەوە هەیە، لەگەڵ ئیدارەی شاردا، بۆ دیاری کردن و ئامادە کردنی چەند پرۆژەیەکی خزمەتگوزاری تا ڕای هەمووانی لەسەر بێت بۆ هەڵەبجە، دوێنێ مام بەڵێنی داوە ئەم کۆبوونەوە بکرێت و پرۆژەکان پێشنیارو ئامادە بکرێن، بدرێنە حکومەتی هەرێم و ڕێکخراوەکان، مامیش پشتگیری و هەوڵی خۆی بخاتەگەڕ تابە پارەی نەوت بەرامبەر بەخۆراک جێبەجێ بکرێن.

ئەمڕۆ ۱۹۹۹/۱۲/۳۱ دواڕۆژی کۆتای ساڵە، لەهەڵەبجەوە هاتمە سلێمانی، چووم بۆماڵی مام جەلال، ڕاپۆرتی هەموو کۆمیتەکانم سەبارەت بە بەربژێرەکان بۆ برد، کەتێیاندا ناوی سەرۆکە بەربژێرەکانی هەموو شارەوانییەکان و ئەندامەکانیان هاتووە، ماوەیەک لای مامەوە ووتی لاپەرەی تەوێڵە کامە بۆم دەرکرد نگایەکی خستە سەرو پرسی لەتەوێڵەدا دەرئەچن؟ ووتم مسۆگەرین، پرسی لەکوێ خرابین؟ ووتم هەڵەبجەو خورماڵ نەموێرا ناوی سەیدسادق بهێنم. دواتر هاتمەوە بۆماڵی خۆمان، مام هۆمەری شۆشمێی هاتبوو بۆلام لەئێرانەوە، مام هۆمەر خاوەنی هەوارەکەی پەرونییە لەسەر سنوور لەساڵی ۱۹۷۹دا ئێمە کردبوومانە بارەگا. یارمەتی زۆری داوین ئەوکات.

ئێوارە بەبۆنەی هاتنی ساڵی نوێوە، زانکۆی سلێمانی ئاهەنگیان ڕێکخستبوو، میوانداریان کردم و لای ئەوان نانی ئێوارەمان خوارد. شەویش خاڵە حەمە کەلا میوانم بوو، حاجی خەسرەو هات بەدوامانداو بردینی بۆماڵی خۆیان، بەختیار عەلی حەمەگیانەو حاکم ئەفراسیاب برای خەسرەو عەبدوڵای سلێمان بەگیش لەوێ بوون، تانیوە شەو دانیشتین و خاڵە حەمە داستانی بۆ ئەگێراینەوە، پیاوێکی ژیرو داناو شارەزایە لەمێژوودا، خوێندەواریشی نییە، هەرگیز لەلای خاڵە حەمەدا بێتاقەت نابیت.

## هەوڵی تیرۆرکردنی مامۆستا شێخ محەمەدی مفتی

ئەمرۆ ٢٠٠٠/١/١ لەشاری سلێمانی بووم، ئاسمان ساماڵ و دنیا خۆرەتاوە، شار قەرەباڵغە، بەبۆنەی سەرەتای ساڵی نوێی میلادیەوە، بەتەلەفۆن لەگەڵ م -جەمال قسەمان کرد، سەبارەت بەلیستی بەربژێرەکانی شارەوانییەکانی سنووری مەڵبەند گفتو گۆمان کرد. بەنامەش رای خۆم نوسیوە لەسەر لیستەکانیان. هەرئەوەشم لەگەڵ مام جەلال باس کردووە، جگە لەسەیدساق.

ئەمرۆ باوکم و ئیقباڵی برام لەتەوێڵەوە هاتبوون بۆلام و ئێوارە گەڕانەوە. بڕیارە ئەم ئێوارە سەتەلایتی کوردسات دەست بە ئیش و پەخشی بەرنامەکانی بکات. ئەمرۆ محەمەد عەبدلقادر رابەری سیاسی لەفەرماندەی شارەزوور خەڵکی ئاوایی قادری کاکەوەیس سەربەشارۆچکەی سەیدسادق کۆچی دوایی کردوە. ئۆتۆمبێلەکەم شکاوە و قەرزاریشم، م.جەمال ١٠٠٠هەزار دیناری بۆناردبووم. ناردم لەبازاردا برێک ئازوقەیان کڕی بۆماڵەوە، ئەوەی ماوەتەوە نەبەشی قەرزەکە دەکات نەئۆتۆمبێلەکەی پێ چاک ئەکرێتەوە. شەو سەردانی ماڵی عەبدول غەفور حاجی مستەفایی تەوێڵەییم کرد، پیاوێکی باش و بێجێگە قەرزار بووە، هەندێک دڵم دایەوەو پێمووت من لەخزمەتت دام، هەڵبەتە بەگیرفانی خاڵیەوە.

ئەمرۆ ٢٠٠٠/١/٢ ئاسمان ساف و خۆرەتاوە، لەگەڵ عومەر عەبدولکەریم بەیانی چووینە شارۆچکەی عەربەت، عومەر ئەندام مەڵبەندەو کوڕێکی وریایە، لەوێ سەردانی نەجات خان سەرۆکی شارەوانیمان کرد. دواتر لە سەیدسادق بەشداری رێورەسمی پرسەو ماتەمینی محەمەد عەبدولقادرمان کرد، لێرە قادر بێستانی و شێخ کامیل و دلاوەری حاجی عوسمانم بینین لەپێنجوێنەوە هاتبوون، ووتیان هەندێک قسەمان هەیە لەسەر بەربژێرەکانی سنووری پێنجوێن، بۆ بێینە هەڵەبجە بالێرەدا قسەکان بکەین، چووینە پەنایەکەوەو ئەوان قسەی خۆیان کرد، ڕاکانیان جوان و لەبەرژەوەندی

یەکێتیدا بوو، من ڕاکانی کاک بەکریشم بۆ ئەوان باس کرد، دواتر ئەوان گەڕانەوەو منیش چووم بۆ هەڵەبجە.

لەسەیدسادقەوە بۆ هەڵەبجە خۆرەتاوەکەی تینی زۆرەو هی ئەم وەرزە نییە گەنم تینو بووە، لەمبەر ئەوبەری جادەوە دەشت و کێڵگە گەنمەکان دیمەنێکی سەوزی زەرد باون. نیوەڕۆ لەگەڵ م.جەمال کۆبوونەوەیەکی کارگێڕیمان کرد، دوای کۆبوونەوەکە، ئەوچوو بۆ قەزای شارەزوورو منیش لەهەڵەبجە مامەوە. بزووتنەوە پێشێلکاری ڕێکەوتنەکان دەکات ئەمڕۆ بەتەلەفۆن لەگەڵ کاک عەبدرەحمان عەبدڕەحیم تێک چووین. دوای ئەو تەلەفۆنە لەگەڵ کاک جووتیارو مەلاحسێندا کۆبووینەوە قسەمان لەسەر ئیشوکارو ڕێکخستنی پێنجوێن و ناوچەی شلێر کرد.

پاش نیوەڕۆ کۆبوومەوە لەگەڵ پێشمەرگەکانی هەردوو هێزەکەی مەڵبەند، لەو کۆبوونەوەدا ئامۆژگاری و ڕێنوێنیم کردن، ئامادەم کردن بۆ هەر روداو پێشهاتێک، بەجۆرێک دەستپێشخەرنەبن، بەڵام ئەگەر روویدا درێغی نەکەن لەبەرگری و پاراستنی بارەگاکانیان.

سەردانی کۆمیتەی هەڵەبجەم کرد، هەڤاڵانی لقی خوێندکاران لەوێ بوون، پێکەوە سەردانی ڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمینی شێخ ئەنوەری شێخ مستەفامان کرد. دواتر سەردانی ئەحمەدی مەحمودی غەفورمان کردو هاتینەوە بۆ مەڵبەند. ئەم شەو سەردانی عەلی دەڵەمەڕیم کرد لەئەورووپاوە بەسەردان هاتوەتەوە، دوای ئەو سەردانە گەڕامەوە بۆمەڵبەندو خەووتم، دوای کاتژمێر ۱یەکی شەو ئیشکگرەکە هەڵیساندم و ووتی لەسلێمانییەوە تەلەفۆنیان کرد، ووتیان بەکاک حەمە بڵێ لەچەمچەماڵ لەنێوان بزووتنەوەی ئیسلامی و پۆلیسدا لەسەر مزگەوتێک گرژی و ئاڵۆزی دروستبووەو وریایی خۆتانبن .

ئێمەش خۆمان کۆکردەوەو ئاگاداری پێشمەرگەکانی پاسەوانی مەڵبەندو کۆمیتەی هەڵەبجەم کرد، وریابن و ئاگاداری خۆیانبن، نەخەووتمەوە، کاتژمێر ٥ پێنجی سەرلەبەیانی پاسەوانێک خۆی بەژووردا کردو ووتی لەلای بارەگای کۆمیتەوە هەڵەبجەوە تەقەیە. هەستاین و خۆمان بەست، بەتەلەفۆن لەگەڵ کۆمیتە قسەم کرد، هەڤاڵێک وەلامی دامەوە، ووتم ئەو تەقە چیبوو؟ ووتی لای ئێمەوە نەبوو، پەیوەندیم بەئاسایشەوە کرد ووتیان تەقە لە مامۆستا

شێخ محەمەدی موفتی کراوە، پرسیم ئەی چی بەسەر هاتووە؟ ووتی براوە بۆ نەخۆشخانە.

رۆژ بووەوە چووم بۆنەخۆشخانە د.عادل کۆکۆیی لەوێ بوو، دکتۆر عادل کوڕێکی ئیش کەرو دڵسۆزە، هەست بەو بەرپرسیاریەتەی سەرشانی دەکات، لەبنەماڵەیەکی کورد پەروەری خزمانی کۆکۆییە. هەواڵی شێخ محمدم پرسی ووتی برینداریەکەی سەخت بوو بۆیە بڕیارماندا زوو بینێرینە سلێمانی، ناردمان رەنگە ئێستا گەیشتبێ، هەرلەوێ پەیوەندیم بە م جەمال و کاک جەمیل هەورامی و کاک کۆسرەتەوە کرد، بۆ ئەوەی برادەران ئاگادارکەن و دکتۆرەکان راسپێرن ئاگایان لێی بێت، شێخ محەمەد مامۆستایەکی ئاینی بەڕێزو کورد پەروەرە دۆستی ئێمەیە. بەپەیامی بێ سیمیش مام جەلالم ئاگادار کرد لەڕووداوەکە.

ئێستا کاتژمێر ١٠دەی سەر لەبەیانی رۆژی ٢٠٠٠/١/٣ گەڕاومەتەوە بۆ بارەگای مەڵبەند، م.جەمال و برادەرانیتر لەسلێمانیەوە هاتوون و چوون بۆلای بزووتنەوە بۆ کۆبوونەوە. دوای ئەوەی ئەوان گەڕانەوە من چووم بۆ سلێمانی، لەنەخۆشخانەی فریاکەوتن مامۆستا مەلا شێخ محەمەدم بینی، عەمەلیات کرابوو باش بوو، زۆرم پێخۆش بوو. ماوەیەک لەلای مامەوە. خەڵک زۆرو بەپەرۆشەوە سەردانی دەکەن.

ئەمشەو لەسلێمانی مامەوە سکرتاریەت ئاگاداریان کردم ووتیان مام دەڵێت، لەسەر روداوەکەی هەڵەبجەو بریندارکردنی مامۆستا شتێک بنوسێ، بۆ رۆژنامەی کوردستانی نوێ، بەناوی مەڵبەندی رێکخستنی شارەزوورەوە بابەتێکم لەسەر روداوەکە نووسی و شەو ناردم بۆ بارەگای رۆژنامەکە.

ئەمرۆ٢٠٠٠/١/٤ لەسلێمانیم، ئەو بەیاننامەی مەڵبەند کەلەبارەی هەوڵی تیرۆر کردنی مامۆستا شێخ محەمەدەوە نوسیبووم لەکوردستانی نوێی ئەمرۆدا چاپ و بڵاو کراوەتەوە. کەش و هەوای هەرێم تەماوی و تۆزاویە، پاش نیوەڕۆ بۆ هەواڵ پرسینی کاک هێمنەرەش، سەردانی کاک ئارازی حەمەلاوم کرد، بینیم خۆی نەخۆشەو لەماڵەوە کەوتوە.

## بزوتنەوەی ئیسلامی پابەندی ڕێککەوتن نابێت

ئەمڕۆ ٢٠٠٠/١/٥ لەسلێمانیم، ئەمشەو بارانی باش باریوە، لەماڵی خۆمان چاوەڕێی هەڤاڵان کاک جەمیل هەورامی و م.جەمال و ئەحمەد قەیەفەری دەکەم، هاتن و پێکەوە چووین بۆ دیوانی پارێزگای سلێمانی، شاندی بزووتنەوەی ئیسلامیش هاتووە، پێکەوە کۆبووینەوە، بۆ قسەکردن و گفتوگۆ لەسەر جێبەجێ کردنی ئەو خاڵانەی ناو ڕێکەوتننامەی تارانی نێوان هەردوولامان کەتائێستا جێبەجێ نەکراون، ئەم ڕێککەوتنە ئێرانییەکان وەک لایەنی سێهەم چاودێرن بەسەریەوە، برێک لایەنگری بزووتنەوەش دەکەن. کۆبوونەوەکە تا کاتژمێر ٤ چواری خایاند و ئەنجامێکی ئەوتۆی نەبوو.

من لەو بڕوایەدام بزووتنەوە تا ئەو کاتەی ئێران پشتیوانیان بکات و بارودۆخە سیاسییەکەداکە لەبەرژەوەندیان بێت، وا بەئاسانی مل نادەن بۆ جێبەجێکردنی بەندەکانی ڕێککەوتن نامەکە.

ئەوەی پەیوەندی بەیەکێتیەوە هەیە، جێبەجێمان کردووە، لەوانە، مانگانە ٢ دوو ملیۆن دیناری سویسریان ئەدرێتێ. هێزە زیادەکانمان لەسنوەی هەڵەبجەدا پاشەکشە پێکردوە بۆبەری سەیدسادق. بەشداریان لەحکومەتدا بەکردەیی پێکراوە، لەوانە وەزیرەکان جێگرەکان پۆستەکانی تر کەبەر بزووتنەوە کەوتووە، دەوامی خۆیان دەکەن. بازگە زیادەکانمان هەڵگرتووە، تەنها بازگەی حکومیەکان ماون، بارەگاکانی سلێمانی و ڕانیەمان بۆ گەڕاندونەتەوە، ٣٠٠ سێ سەد هەزار دیناریان دراوەتێ بابەتی خوێنی دوکەس، ئامادەین بارەگاکانی تریان بۆچۆڵ بکەین، هەرکات گەڕانەوە.

ئەوەی لەئەستۆی ئەوانە جێبەجێی بکەن، تەنها تەقەیان ڕاگرتووە، هێزەکانیان بڵاوە پێ نەکردوە. تا ئێستاش لەهەورامان و هەڵەبجەو دەورو بەردا ماون، سەرگردو تەپۆڵکەو سەر جادەکانیان چۆڵ نەکردووە. بازگە حزبیەکانیان هەڵ نەگرتووە. ڕێگەیان نەداوە هێزەکانی ئێمە بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی پێشویان لەخورماڵ و هەورامان. ڕێگەیان نەداوە ڕێکخستنی هەورامان بگەڕێنەوە. لەو سنوورانەدا بالادەستن ڕۆژانە مخالەفە و

سەرپێچی دەکەن، گرتن، دەرکردن، لێدان و ئەشکەنجە، بەردەوامە. ناهێڵن ئیدارە حکومیەکان بگەڕێنەوە بۆ تەوێڵە و بیارە. لەهەڵەبجە و سیروان و خورماڵیشدا چ حساب بۆ حکومەت ناکەن.

من لەو باوەڕەدابووم هەتا یەکێتی کێشەی لەگەڵ پارتی و ساردی لەگەڵ ئێراندا هەبێ و جاروو باریش هێزەکانی سوپای عێراق لەسەر سنوورەکانی هەرێم، مەبەست ئیدارەی ناوچەی سەوزە، جموجوڵ بکەن و پەلاماری سەنگەرەکانی پێشمەرگە بدەن. بزووتنەوەی ئیسلامی زیاتر پێداگری دەکەن و داواکاری و بیانوی زیاتر ئەگرن. بۆیە تا باردودۆخە سیاسی و سەربازیەکە نەگۆڕێت بەرای من بزووتنەوە سەرکێشی زیاتر دەکەن.

بەڵێ دوای کۆبوونەوەکە لەپارێزگا هاتینە دەرەوە، لەگەڵ حاکم قادر، کاک جەمیل، م .جەمال و قەیەم فەریدا، پێکەوە چووین بۆ لای کاک کۆسرەت، بارانیش بەردەوام دەبارێت. لای کاک کۆسرەت، پرسیاری بارو دۆخەکەی کرد. من ئەوەی لەسەرەوە نوسیومە وەک رای خۆم بۆم باس کردو دواتریش برادەران هەریەکەو ڕاوبۆچوونی خۆی دەربڕی.

دواتر هەمووومان سەردانی مامۆستا شێخ محمدمان کرد، لەنەخۆشخانە. دواترو هەرئەم ئێوارە سەردانی مامۆستا مەلامحەمەد کوڕی مەلاعومەرمان کرد، ناوبراو وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامیە لەسەر پشکی بزووتنەوە. دوای هەندێک قسەو باس من ناخۆشحاڵی خۆمانم لەسەر هەوڵی تیرۆرکردنی مامۆستا شێخ محەمەدی مفتی دەربڕی، ئەویش بەهەمان شێوە. شەویش لەماڵی کاک جەمیل خەریکی ئامادەکردنی بەرنامەیەکی هەورامی بووین بۆ کوردسات بەبۆنەی جەژنی رەمەزانەوە، ئێستا کاتژمێر چواری (٤) دوای نیوەشەوە خەریکی نوسینەوەی ئەم یاداشتانەم.

ئەمرۆ ٢٠٠٠/١/٦ لەسلێمانی بووم، باران دەبارێت لە گەرمەسێرو پێدەشتەکاندا، بەفریش لەسەرچیاو تادامێنەکان هاتووە، بەشداری رێورەسمی پرسەی خوالێخۆش بوو، عائیشەخانی خێزانی بارام بەگم کرد، مزگەوتی سەلیم بەگ، لەشاری سلێمانی، بارام بەگ پیاوێکی بەرێزو قسەخۆش و ژیرو دانای ناوچەی هەورامان بووە، لەبنەچەدا خەڵکی ئاوایی شۆشمێی سنووری نەوسوودی کوردستانی رۆژهەلاتە. ئێستا لەناو خەڵکدا بەوە ناسراوە، بۆهەر

گرفتێکی کۆمەڵایەتیی، رای خۆی هەبووەو تەڵاقێکیشی بۆ خستوە. خزمی نزیک و مامی ئەدیبەخانی دایکی ساسانە.

هەر ئەمرۆ بەشداری رێورەسمی پرسەی کچی عیزەت رۆستەمم کرد لە مزگەوتی قەزازەکانی شاری سلێمانی، دایکی ئەم کچە کۆچ کردووە، بەناوی زوبێدەخان ئامۆزامە، مام حاجی عەبدولقادر، کوڕی نەبووە، لەدوو ژن دووکچی هەیە، زوبێدە کچی عیسمەت خان و بەدریش کچی خۆرشید خانە، بەدری کچی ژنی دووەم و خێزانی سەروەتی کەریم بەگی داود بەگە.

دواتر گەڕامەوە بۆ هەڵەبجەو چوومە بارەگای مەڵبەند، لەرۆژنامەی کوردستانی نوێ ئەمرۆدا، بەڕێز د-کەیوان ئازاد ئەنوەر لەلاپەڕەی خوێندنەوەی کتێبدا، بەبابەتێک هەڵسەنگاندنی بۆ وەرگێڕانی کتێبەکەی بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگ کردووە، کە خوێندمەوە دڵخۆش بووم و هەستم بەسەرکەوتن دەکرد.

ئەمرۆ١/٧ /٢٠٠٠ بەرامبەرە بە٣٠ رەمەزانی سالی ١٤٢٠، رۆژی جەژنی رەمەزانە، من لەهەڵەبجەو لەماڵی کاک عەزیزی حاجی ئەولە بووم، دوای نان خواردنی جەژن چووینە بارەگای مەڵبەند. تاکاتژمێر ١٠/٥ پێشوازی میوانانی جەژنمان کرد، هەرچەندە من دانیشتن لەبارەگای حزب و سەدانی خەڵک بۆ بارەگا حزبیەکان بەشتێکی باش و گونجاو نازانم، پێشنیاریشم کردوە، لەداهاتودا ئەم دیاردە کۆتایی پێ بهێنرێ .

دواتر لەگەڵ چەند هەڤاڵێکدا سەردانی مەڵبەندی یەکگرتووی ئیسلامی و مامۆستا مەلاعەلی رابەری بزووتنەوەی ئیسلامی و قائیمقام و ناوچەکانی سۆشیالیست و شیوعیمان کرد، بەبۆنەی جەژنەوە. هەر لەدرێژەی سەردانەکانماندا ئەمرۆ سەردانی ماڵی شێخ عەلی شێخ ئەحمەدی نەقشەبەندی و خاڵە شێخ نەجیمی هانەسورەییم کرد، نیوەڕۆدوا دایکم و باوکم لەتەوێڵەوە هاتبوون بۆ مەڵبەندو سەردانیان کردین، نامەیکیشم بۆ غازی محەمەد عەبدلقادر نووسی بەبۆنەی کۆچی دوایی دادە عەینای دایکیەوە. ئێوارەش سەردانی چەند ماڵە شەهیدێکم کرد.

ئەمرۆ٢٠٠٠/١/٨ هەوای خۆش ومامناوەندیە، پێش نیوەرۆ لەمەڵبەند پێشوازی میوان و پاش نێوەڕۆش سەردانی ماڵە شەهیدەکان و هەندێک کەسایەتی و خەڵکی هەژارم کرد، لەناو شاری هەڵەبجەدا، لەم سەردانانەشدا،

بوونە جێگەی گلەیی خەڵک، حەقی خۆشیانە، چوونکە ناتوانین سەردانی هەموو ئەوانە بکەین کەحەقی بەسەر کردنەوەیان هەیە.

ئەمڕۆ ٢٠٠٠/١/٩ لە کۆمەڵگەی زەمەقی، بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەی ژنێکی خەڵکی ئاوایی خارگێلانم کرد، دواتر سەردانی قەزای شارەزوورم کرد، لەبارەگای کۆمیتە کۆبوونەوەی فراوانمان کرد لەگەڵ ئەو هێزە تایبەتەی مەڵبەند کەپاراستنی ئاسایشی شاریان پێ سپێردراوە، پۆلیس و ئاساییشیش ئامادە بوون. لەو کۆبوونەوەدا باس لە چۆنییەتی پاراستنی سەروماڵی خەڵکو هەڵسوکەوت لەگەڵ جەماوەرو لایەنە سیاسییەکان کرا. هەر ئەمڕۆو لەقەزای شارەزوور سەردانی مەڵبەندی بزووتنەوەی ئیسلامی و ماڵی شەهید کەریمی عەبەی خاسەی شەمێرانیم کرد.

ئەمڕۆ ١/١٠ /٢٠٠٠ ئاسمان سایەقەو ساماڵە، هەوا ساردو کزەی هەیە، لەسلێمانی بووم سەروەت بەگی کەریم بەگ سەردانی کردم ، سەروەت بەگ پیاوێکی نەرمونیان و هەمیشە پاکوتەمیز، پێکەوە چووین بۆماڵی بەختیاری عەلی حەمە گیانە، ئاسۆی حاجی محەمەدی بامۆکیش لەوێ بوو، ئاسۆ کوڕێکی گەنج و جوان و ئێسک سوکە، خەریکی کەسابەت و توجارەتە. لەخێرخوازیدا ئازاو یارمەتی هەژاران ئەدات لەئاوەدان کردنەوی ناوچەکەشدا سەرەڕای درووست کردنی کێشەو گرفت بۆی جێگە دەستی دیارو بەرچاوە. لەوێ هەستام و سەردانی مەڵبەندی سلێمانیم کردو لەگەڵ کاک قادری حاجی عەلی هەندێک قسەمان کرد، سەردانی وەزارەتی دادم کرد لەگەڵ مستەفایی سەیدقادر قسەمان لەسەر کێشەی هەندێک لەپاڵێوراوەکانی شارەوانییەکان کرد، لای ئەو هەستام و سەردانی دادە عائیشە عەزیزم کرد، دادە عائیشە ژنێکی ماندو خزمەتی زۆری یەکێتی و پێشمەرگەکانی هەورامانی کردوە.

ئێوارەی ئەمڕۆش سەردانی کاک نەوشیروان مستەفام کرد بۆ جەژنە پیرۆزە، سەبارەت بەمەڵبەندی شارەزووریش هەندێک قسەمان کرد، پرسیاری هەندێک لەبەرپرس و کادرەکانی کرد، منیش وەڵامم دایەوە، ووتی حەمەگیان ئەوانە بۆ گاوانیش ناشێن، چجای بۆسیاسەت کردن لەودەڤەرە ئاڵۆزو جەنجاڵەدا، ئێستا بۆتە مەیدانی ململانێ وتەراتێنی ئیسلامیەکان و ئێران و عێراقیش دەستیان تێدا هەیە، بۆزیاتر ئاڵۆزکردنی بارودۆخەکە. منیش لەدڵا قسەکەم پێناخۆش بوو، ووتم کاک نەوشیروان دەی بۆ چەند کەسێک

لەوهەموو مەکتەب سیاسی و سەرکردایتیە لەسلێمانیدا کۆبوونەتەوە نانێرنە ئەوێ؟، بەتورەییەوە ووتی کێ، ئەوانە بەشیکیان لێرەش خۆیان ناگرن. من زانیم تورە بوو، ئیتر کۆتام کرد و بێدەنگ ماوەیەکی تر لای دانیشتم و لەوکاتەدا میوانی هاتن و منیش خواحافیزیم کرد.

ئەمڕۆ ١/١١ لەسلێمانی بووم، کورەکانی کاک سەرحەدی خەلیفە و سەرتیپ سابیر سەردانیان کردم، دوای بەڕێ کردنی ئەوان سەردانی بارەگای رۆژنامەی کوردستانی نوێم کرد، پێشتر جەنابی مام جەلال داوای چەند ژمارەیەکی رۆژنامەی موجاهدی کردبوو بردنم بۆ کاک ستران عەبدولا. لەوێوە سەردانی مەڵبەندی سلێمانیم کرد، کاک عومەری سەید عەلی و کاک قادرو کاک چەتۆ حەوێزی لێ بوو.

دواتر مامۆستا جەمالی حاجی محەمەدیش هات، لەوێ هەستاین، من و کاک قادری حاجی عەلی و م .جەمال سەردانی ماڵی کاک عادلی سەید قادری باخچەمان کرد، نیوەڕۆش سەردانی مامۆستا مەلا شێخ محەمەدی شێخ خالیدی هەڵەبجەمان کرد لەنەخۆشخانە. لەوێ دەرچووین من سەردانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمم کرد، لەگەڵ کاک رەوف بێگەرد و برادەرەکانی، جەژنە پیرۆزەمان کردو باسی چاپ کردنی کتێبی وەرگێڕدراوی چیانشینانی زاگرۆسیشمان کرد.

ئەمڕۆ ٢٠٠٠/١/١٢ لەسلێمانیم، هەوای زۆرسادە، لەسەر چیاکان بەفر باریوە، سەردانی کاک د.کەیوان ئازاد ئەنوەرم کرد، بڕیارە پێدا چوونەوەی کتێبی وەرگێڕدراوی چیانشینان دەست پێبکات و تامانگی چوار٤ ئامادەی چاپکردن بکرێت.

ئەمرۆ١/١٣ سەردانی شاری کۆیەم کرد، لەکۆیە هەڵمەتێکی ئاوەدان کردنەوەو پرۆژە خزمەتگوزاریەکان دەستی پێکردوە، لەوانە دروست کردنی رێگاوبان، بینای قوتابخانە، پارک و خانو و مزگەوت.....تاد، لەدلا ئەموت خوزگە بەم زوانەش لەهەڵەبجەدا ئەم پرۆژانە دەستیان پێدەکرد، ئیوارە لای ماڵی کاک عەبدول کەریمی جەلالی و کاک کاوەی بارامی خزمانی رۆژهەلات بووین. بەیانی رۆژی١/١٤ چووین بۆتەق تەق، لەکەناری زێکەدا ماینەوە راوە

ماسیمان کرد، مناڵەکانیشم بردبوون، بۆنیوەڕۆ لەوێ نانمان خوارد، ئێوارەش لەماڵی کاوە بووین.

ئەمڕ١/١٥ لەسلێمانی بووم، کەشوهەوایەکی ساردی هەیە، سەردانی کاک جەمیل هەورامییم کرد، ١٠دە فیشەکی چواردە خۆری دامێ، گوللەکەیان وەک بزمار وایە ووتی ئەم گوللانە ژەهراوین، ئەوە یەکەم جارە گوللەی لەو جۆرە ببینم. کاک جەمیل باسی هۆنراوەکەی شێخ رەزای دەکرد لەوەسفی عێلی جافا شێخ نوسیویەتی، منیش باسی ڕوون کردنەوەکەی کاکە حەمەی حەمەباقیم کرد، کاکە حەمە لەو بارەوە دەڵێت کاتێک جافەکان لەگەڵ فەیزڵابەگیاندا بەشەڕ هاتوون، شێخ ئەو هۆنراوەی لەسەر ئەو شەڕە هۆنیوەتەوە، دواتر سەتیپ خانی فەیزوڵابەگیان وەڵامی شێخ رەزا دەداتەوە و گوایا وەسف و سەناکە پێچەوانەیە.

ئەمڕۆ ١/١٦ پێش نێوەڕۆ سەردانی مەکتەبی رێکخستنم کرد، پاش نیوەڕۆ لەقەزای شارەزوور بووم، ساڵڕۆژی شەهید بوونی عومەرە ریشەیە، لەگردبوونەوەیەکی جەماوەرییدا، پەردەم لەسەر وێنەی لاداو بەو بۆنەشەوە ووتارێکم پێشکەش بە ئامادە بوان کرد. هەر ئەمڕۆو دوای تەواوبوونی ئەم رێوەڕەسمە، لە شارۆچکەی زەراییەن، کۆبوونەوەی فراوانمان هەبوو لەگەڵ تیرەی تاوەگۆزی، بابەتی ئەم کۆبوونەوە، قسەکردن بوو لەسەر وەزعی سیاسی، بارودۆخی ناوچەکە، بەرنامەو خەباتی یەکێتی، پرۆژەکانی خزمەتگوزاری، ئەم چالاکیانە لەچوارچێوەی بانگەشەی هەڵبژاردنەکانی شارەوانییەکانە. ئێوارە لە تی ڤی دا هەردوو چالاکیەکەی ئەمڕۆمان بڵاو بوونەوە. پێشتر گلەییمان هەبوو لەسەر ڕاگەیاندن کەگرنگی تەنها بەسلێمانی ئەدەن، ئەو هەموو کارو چالاکی پرۆژانەی ئێمە وەک شارەزوور ڕاگەیاندنەکانی یەکێتی، گرنگیان پێنادەن گلەییەکانمان لەوبارەوە بووە .

ئەمڕۆ ١/١٧ لە سلێمانی بووم، کاتژمێر نۆ٩ لەقەڵا چوالان ئەنجومەنی مەڵبەندەکان و مەکتەبەکانی یەکێتی کۆبوونەوەیان هەبوو لەگەڵ مام جەلال، من باوەڕناکەم لەناو سیاسیەکانی کوردستاندا، کەس توانیبێتی نەلەڕابوردو نەئێستاش وەک مام جەلال چالاک بێت، ئەم پیاوە شەوڕۆژ کاردەکات، ئەگەر لەشەوڕۆژێکدا ١٥ پانزە چاوپێکەوتن و کۆبونەوەی هەبێت، لەکۆبنەوەی یەکەمیدا چەند سەرحال و بەشەوق و زەوقە، لەکۆبونەوەی

پانزەهەم و کۆتایدا بەهەمان شێوەیە، لەڕاستیدا خوا تواناو داناییەکی وای داوەتێ کەلەسەروی تواناو دانایی مرۆڤێکی ئاساییەوەیە. بەڵێ بۆنیوەڕۆش میوانی ئەوبووین و ئەوعالەمەی بەشەوق و زەوقەوە رایی کرد.

ئێوارە لەگەڵ کاک ستار کەریم سەردانی ماڵی حاجی حەمەشەریفی بەڵخەیمان کرد، بەبۆنەی کۆچی دوایی کاک ئەحمەدی برایەوە. هەروەها ئەمشەو چەندین ماڵی هەڵەبجەیی و هەورامی و شارەزووریمان لەناو شاری سلێمانیدا بەسەر کردنەوە بەبۆنەی پرسەو سەرەخۆشی و نەخۆشەکانیانەوە، تاکاتژمێر ١ یەکی شەومان پێچوو، دواجار کاک ستار ووتی ئیتر بەسە حەمەگیان ماڵەوە دەرگامان بۆناکەنەوە. ووتم بەسەر چاو کاک ستار، ڕاستە من بۆ لای هەموو نەخۆش و پرسەیەک سەردان ئەکەم بەڵام ئەمەی ئەم ماوە زیاترو بەم شێوە بۆ بانگەشەی هەڵبژاردنەکانی شارەوانیەکانە.

## هەڵبژاردنی شارەوانییەکان

ئەمڕۆ ١/١٨ لەقەزای شارەزوور بووم، کۆبوونەوە لەگەڵ ئەنجومەنی کۆمیتەی ڕێکخستن، ئەم کۆبوونەوە بەئامادە بوونی بەربژێرەکانی سەرۆک و ئەندامانی شارەوانی بەڕێوەچوو، ناوەرۆکی کۆبوونەوە بۆ دروست کردنی لیژنەی بازنەکانی گەڕەک و کوچەو کۆڵانەکان بوو، وەڕێنمایی پێدانبوو بۆ ئیشکردن بۆدەنگ کۆکردنەوە.

دوای ئەم کۆبوونەوە سەردانی کۆمەڵگەی نەسرمان کرد، لەوێ بەئامادە بوونی خەڵک و گەنجانی کۆمەڵگاکەو ئەندامانی کەرتی ڕێکخستن، بارەگای ڕێکخراو ئازادی لاوانمان کردەوە، لەو کۆبوونەوەدا ووتارێکم پێشکەش بەئامادەبوان کرد، گەنجان و خەڵکەکە لەجۆش وخرۆشی شادی و خۆشی خۆیاندا کەیفیان لێدەباری، کۆمەلانی خەلکی کوردستان خەڵکێکی تامەزرۆی ئازادی و دیموکراسین، ئەم هەڵبژاردنەش بۆ شارەوانیەکان لەکوردستاندا یەکەم جارە، بۆیە بەباشی بەشداری دەکەن. بۆ نیوەڕۆ گەڕاینەوە بۆ قەزای شارەزوورو لەماڵی هەڤاڵ ئەختیار عەزیز میوان بووین.

پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ دووبارە لەبارەگای کۆمیتەی قەزای شارەزووردا کۆبووینەوە لەگەڵ لیژنەکانی ڕێکخراو ئامادەکراو بۆ ئیشکردن، ناوەرۆکی ئەم کۆبوونەوە ڕێنوێنی و فێرکرن و ئامادەکردنی هەڤاڵەکان بوو، بۆ ئەوە بزانن چۆن ئەچنە سەردانی مالان، چیان پێ دەلێن؟ هەلمەتی دەرگا بەدەرگا چۆن ئەنجام دەدەن؟ کوڕو کۆبوونەوە چۆن چۆنی لەگەڵ تیرەو بنەماڵەکان، لەگەڵ دانیشتوانی گەڕەکەکان ئەنجام دەدەن، دەبێ هەرتوێژەو بەزمانی بەرژەوەندی خۆی قسەی لەگەڵ بکەیت، هەروەها باسی ئەوەمان بۆ کردن ئەبێ زۆرتر لەو شوێنانەدا ئیش بکرێت کەدەنگی یەکێتی لاوازە یان خەلکی بێلایەنی زۆرتر تێدایە، باسی ئەوەمان بۆ کردن، گرنگتر لە ئیشکردن بۆ کۆکردنەوەی دەنگ، ژیری و وریایی چاودێری کرنی پرۆسەی ئەژمار کردن و جیاکردنەوەیی دەنگەکانە لەسەر سندوقەکان، هەروەها بۆمان ڕوونکردنەوە، پاکی و پاراستنی هێمنی و دوورکەوتنەوە لەگرژی، بەئاشتی و

برایەتی بەڕێوەبردنی هەڵمەتی بانگەشەکە، دواجار لەڕۆژی هەڵبژاردنەکەدا ئارامی و دوور بوون لەهەوڵی تەزویروگزی بۆ ئێمەی کورد لەم کاتەدا چەندە گرنگ و ئەهمیەتی هەیە، بەتایبەت بۆیەکێتی نیشتیمانی کوردستان، مام جەلالیش لەوبارەوە لەکۆڕو کۆبونەوەکانیدا چەندین جار ئەمەی چەندبارەو تەئکید کردوەتەوە.

ئێوارە گەڕامەوە بۆ سلێمانی میوانم هەبوو، ئەوانیش کاک ڕەحیم نوسەری ڕۆژهەلاتی، مام عەبدلخالق هەورامی، خاڵە حەمە کەلاو کاک بەرزان و دوو کوڕی تری کوردی ڕۆژهەلات بوون. پەلەم بوو تامیوانەکانم بڕۆن، ئەمویست ئەمشەو کلێشەی کتێبی چیانشینان ئامادەکەم بۆ کاک د.کەیوان ئازاد. هەرچەندە ماندووم بەڵام تائێستا کە کاتژمێر ٢:٣٠ دووسی خولەکی پاش نیوە شەوە نەخەوتووم و خەریکی نوسینەوەی ئەم یاداشتانەم، شەوق و زەوق و ئارەزوم بۆ کارە سیاسی و ئەدەبی و ڕۆشنبیرەکە، بەتایبەت وەرگێڕان و نووسین، ماندوبوونی لێ دوور خستومەتەوە.

ئەمڕۆ ١/١٩ لە شارۆچکەی زەڕایەن (واماوا)م، هەڤاڵانی ڕێکخستنی ئێرە بۆ کاتژمێر یەکی1:00 پاش نیوەڕۆ، کۆبوونەوەی جەماوەرییان بۆ ڕێکخستووین، لەکۆبوونەوەکەدا، قسەوباسەکان لەسەر هەڵبژاردنەکانە، جەماوەریی ئەم شارۆچکە خەڵکی ئەوبەری ئاوی سیروانن، واتە ناوچەی تاوەگۆزی و ئەودیو چیاکانی بەمۆ، خۆشک، زمناکوو زەواڵی، ساڵی ١٩٧٩ بەزۆر کۆچ پێکراون، هێنراونەتە دەشتی شارەزوورو لەم شوێنەدا نیشتەجێ کراون، بەگشتی خەڵکی ئەم شارۆچکە خەڵکێکی دڵسۆز بۆکوردایەتی، هەژارو نەدارو کەم دەست، تێکەڵاو لەچەند تیرەیەکن، لەوانە:

تاوەگۆزی، باوە، قوایی و گەڵەجاڵی و ئیمامی. ئەم تیرانە بەشێکیان کەوتونەتە کوردستانی ڕۆژهەلات و بەشەکەی تریان ئەمانەن لەزەڕایەن لەکوردستانی باشوور. بەهۆی ئەوەوە ساڵانی ١٩٧٧، ١٩٧٨، ١٩٧٩ لەشۆڕشی نوێدا، ئێمە زۆرتر سەردانمان دەکردن، چوونکە ناوچەکەیان کەنار و چەپەک و دڵنیابووین لێیان، جاسوسیان نەدەکرد بۆ داگیرکەرانی کوردستان، لەلایان زیاتر ئەحەواینەوە. زیاتر بوونە دۆست و ناسیاو، من زۆرم خۆش ئەوێن و لەلای ئەمان واهەست دەکەم لەهەورامانم، تێکەڵاویان دڵخۆش و ئاسودەت ئەکا، سادەو ساکارن، ئەوانیش هەروان ئێمەیان خۆش

دەوێت. ئەمڕۆ چەند پیاوێکی دیاریان هاتنەلام، ووتیان ئێمە یەکێتی نین، بەڵام هەموومان بڕیارمان داوە دەنگ بەلیستی ئێوە ئەدەین، منیش سوپاسم کردن و پێم ووتن ئەوە من قەرزارتانم و لەبیرم ناچێت.

دوای ئەم کۆبوونەوە، چووم بۆ شارۆچکەی عەربەت، لەوێش سەردانی کۆمیتەم کردو دواتر چووم بۆ شارۆچکەی سەیدسادق، لەوێش سەردانی بارەگای کۆمیتەو رادیۆی شارەزوورم کرد، ئەمڕۆ لەشاری سلێمانی کەسێک تەقەی کردبوو هاوڕێیەکی خۆی و پۆلیسێکی هاتوچۆی کوشتبوو، بکوژو هاوڕێکەی سەربە بزووتنەوەی ئیسلامی بوون. ئەمشەو خەریکی پاک نوسی ئەو سەرنج و تێبینیانەم کەلەسەر ڕۆژ ژمێرەکەی کاکە حەمەی حاجی مەحمود هەم بوون، بۆ ئەو برگەو بابەتانەی پەیوەندیان بەخۆمەوە هەبوو.

ئەمڕۆ ١/٢٠ لەشاری سلێمانیم، لەبارەگای کوردستانی نوێ کۆبوونەوەی فراوانی ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی مەڵبەندەکان هەیە بەسەرپەرشتی کاک قادری حاجی عەلی، سەبارەت بەبانگەشەی هەڵبژاردن و کاری ڕاگەیاندن لەو بارەوە، نوێنەری مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوور لەم کۆبوونەوەدا، مامۆستا ئەیوب ڕۆستەم بوو، مامۆستا ئەیوب شارەزای ئەو بوارەو کادرێکی هوشیارو ووردو دڵسۆزە.

دوای کۆبوونەوەکە کۆبوونەوەیەکیتر هەرلەوێ ئەنجامدرا، ئامادەبوانی ئەم کۆبوونەوە کاک قادر، کاک عادل موراد، کاک ستران و من و چەند کەسی تربوون. دوای کۆبوونەوەکە مامۆستا ئەیوب ئۆتۆمبێلەکەی منی بردو ڕۆیشت بۆ شارەزوور، بۆ سەردانی سەیدسادق و قەزای شارەزوور، پاش نیوەڕۆ دووبارە لەگەڵ کاک قادرو م- جەمالدا لەبارەگای ڕۆژنامەی الاتحاد کۆبووینەوە. ئەمشەو تەماشای تەلەفزیۆنی خاک دەکەم بەرنامەی چاو پێکەوتنی هەیە لەگەڵ کاک هۆمەری شێخ موس، کەڵکی زۆرم لێوەرگرت.

ئەمڕۆ ٢٠٠٠/١/٢١ لەشاری سلێمانی بووم، بەفربارین لەبەیانی زووەوە دەستی پێکردوە. سەردانی ماڵی سەرۆکی کەریم بەک و شێخ عەلی شێخ ئەحمەدم کرد لە گەڕەکی سەرچنار، دوێنێ ئەوان سەردانی منیان کربوو لەماڵ نەبوو بووم. داوام لێکردن قسە لەگەڵ خزم و کەسوکاریان بکەن دەنگ بەلیستی یەکێتی بدەن، نیوەڕۆ لەگەڵ کاک تەحسینی کوڕی حەسەن خانی ڕەزاو میوانی بەرزان بووین. پاش نیوەڕۆ بەشداریمان کرد لەڕێوڕەسمی

پرسەو ماتەمی سەید محەمەدی سەید فەتح الموبین لەهۆڵی مزگەوتی سەلیم بەگدا، سەید محەمەد باوکی سەید رەشاد و خەڵکی شارۆچکەی تەوێڵەن، دوای چۆڵ بوونی تەوێڵە ساڵی ١٩٨٢ بەهۆی جەنگی عێراق ئێرانەوە، ماڵی سەید رەشاد و باوکی سەید محەمەد کۆچیان کرد بۆ ئاوایی یەخشی تەرخانی نشین لەدەشتی شارەزووردا. دواتر هاتنە ناوشاری سلێمانی، بنەماڵەکەیان لای خەڵک رێزی تایبەتیان هەیە، چوونکە خواپەرست و خاوەن حورمەت و کەرامەتن. لەبنەچەدا خەڵکی ئاوایی کەلجین لەبەشی هەورامانی کوردستانی رۆژهەلاتدا، من هەر لە نەوجەوانییەوە دۆستایەتی و ناسیاوی تایبەتم هەیە لەگەڵیان، چوونکە دراوسێی ماڵی باپیرم حاجی عەزیزی بارام بوون، لەدەرە تاریکی دۆڵی ئاوێسەردا.

ئەمشەو لەماڵی کاک تەحسین بووم، داوام کرد لەشەهێنی خێزانی، مۆڵەت بدا تا بەشی دووەمی بەرنامەکەی شێخ موس تەواو ئەبێ، تەماشای بکەین منالەکان (کانالەکە) نەگۆڕن. بەڵی من بۆخۆم زۆر کەڵکم وەرگرت لەو چاوپێکەوتنەی کاک هۆمەر لەبەرنامەی دوێنێ شەو و ئەمشەوی، (T.V) خاکدا، زۆر بابەتی سەبارەت بەسەرەتا و دامەزراندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان روون کردنەوە، کە ناروون بوون لای من.

ئەمڕۆ ١/٢٢ لەشاری هەڵەبجەم، بەفر هەڵەبجە تا شارۆچکەی سیروانیشی گرتەوەتەوە، پێش نیوەڕۆ لەبارەگای مەڵبەند ئیشوکارەکانی چەند رۆژی رابردووم جێبەجێ کردن، پاش نیوەڕۆش سەردانی ئەومالانەم کرد هەڤالانی کۆمیتەی رێکخستنی هەڵەبجە بۆی دیاری کردبووم، تا داوایان لێبکەم دەنگ بەلیستی یەکێتی بدەن. ئێوارە میوانی کاک هوشیاری کەریم بەگی ئەفراسیاو بەگ بووم، ئەمڕۆ لەکەریم بەگم پرسی دەنگ بەکێ ئەدەی؟ ووتی من ؟ ووتم بەڵێ، ووتی ئاغەی موهەندس، مەبەستی کاک مستەفای حاجی بارامی کۆکۆیی بوو. مستەفا بەربژێری یەکێتی بۆ سەرۆکی شارەوانی هەڵەبجە. ئەمڕۆ ١/٢٣ لەهەڵەبجە لەبارەگای مەڵبەند، کۆبووینەوە لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی هەڵەبجەیی دانیشتوی شاری سلێمانی، کاک شەوکەتی حاجی مشیرو کاک جەمیل هەورامیش بەشداری کۆبوونەوەکە بوون. پاش نیوەڕۆ رۆیشتمە قەزای شارەزوور، هەندێک ئیشوکاری ئەوێمان ئەنجام داو ئێوارە رۆیشتمە

سلێمانی، لەوێ کاک قادری حاجی عەلیم بینی و ٥٠٠٠ پێنج هەزار دینارم لێوەرگرت.

شەو میوانی کاک حەمەحسێنی حاجی فەرەجی تەوێڵەیی بووم، داوام لێکرد داوا لەسەیوان ئیدریس برای شەهید نەریمان بکات پاشەکشە بکات لەبەربژێری سەرۆکی شارەوانی تەوێڵە، نەریمان خوشکەزای کاک حەمەحسێنە. مەڵبەند کاک دڵسۆز محەمەد سان ئەحەدمان بەربژێر کردووە بۆ سەرۆکی شارەوانی تەوێڵە. دواترو هەر ئەمشەو سەردانی مامۆستا سیروانی عەلی چاوشم کرد، نەخۆش بووە لەبەغدا عەمەلیاتی کردوە.

ئەمڕۆ ١/٢٤ لە قەزای شارەزوور بووم، پێش نیوەڕۆ لەبارەگای کۆمیتە خەریکی ئامادەکاری ئیشوکاری بانگەشەی هەڵبژاردن بووین، کۆبوونەوەیەکمان کرد بەخزمانی شەمێرانی، لەماڵی کاک حەمەسەعیدی حەمەی سان ئەحمەد، دوای ئەم کۆبوونەوە لەماڵی سەید عەلی گورگە چیایی کۆبوونەوەمان کرد بە تاوگۆزیە گورگە چیاییەکانی دانیشتوی قەزای شارەزوور. پاش نێوەڕۆ سەردانی مامۆستاو فەقێکانی مزگەوتی سۆفیەکانمان کرد و ٢٠٠٠ دوو هەزار دینارمان لە پێنج هەزارەکەی لای کاک قادر بۆسەرف کردن بۆ مزگەوت و مەدرەسەکەیان.

دوای ئەم سەردانە لە شارۆچکەی زەراییەن بەئامادەبوونی مام وریا هاواری و کاک عەباسی تاوگۆزی (مسلەحە) کۆبوونەوەیەکی جەماوەریی فراوانمان ئەنجام دا. دوای عەسری ئەمڕۆش بەشداری کۆڕی پرسە ماتەمینیی حەسەن ئیبراهیم تەوێڵەیمان کرد، دواجار لەماڵی سەرکەوتی مینەپەزە کۆبوونەوەیەکی ترمان لەگەڵ بەشێکی تری شەمێرانییەکاندا کرد. لەو پارەی کەمابووەوە ١٠٠٠ هەزار دینارمان بۆ سەرفیاتی کۆمیتەی رێکخستن سەرف کردو ٢٠٠٠ دووهەزاری مابووەوە ناردمان بۆ هەڵەبجەی شەهید بۆمامۆستا جەمال.

ئەمڕۆ ١/٢٥ لەقەزای شارەزوور بووم، کۆبوونەوەمان کرد لەگەڵ ئەو هەڤاڵانەی یەکێتی بەربژێر بوون و پاشەکشەیان کردبوو لە بەربژێری، دەست خۆشی و سوپاسم کردن، داوام لێکردن ئیش بکەن بۆ هەڤاڵەکانیان. هەر ئەم پێش نیوەڕۆ سەردانی ئیمامیەکانمان کرد و داوام لێکردن دەنگمان بدەنێ. دوانیوەڕۆ رێکخراو ئازادی لاوان و تیپی هونەری گەڕۆک ئاهەنگێکیان

ڕێکخستبوو، داوام لەکاک مەلا بەختیار کردبوو بەشدار بێت و ووتاریشی هەبێت، بەشداری کردو ووتاریشی پێشکەش کرد.

دواجارو ئەمڕۆ هەڤاڵانی کۆمیتەی ڕێکخستنم کۆکردنەوەو داوام لێکردن ئەبێ ڕۆژانە ڕاپۆرتی کارو چالاکیەکانیان ئامادە بکەن. شەویش لەگەڵ مام وریای براخاس میوانی ماڵی کاک سەرحەدی خەلیفە بووین.

ئەمڕۆ٢٠٠٠/١/٢٦ لەقەزای شارەزوور بووم، ئاسمان هەوراوی و نمەنمە باران دەبارێت، کاک ئاسۆی شێخ نوری لەپارێزگای سلێمانییەوە هاتە شارەوزور، ئاسۆ یەکێکە لە ڕێکخستنە دێرینەکانی کۆمەڵەو یەکێتی، زیندانی سیاسی بووەو لەناویەکێتیدا چەندین بەرپرسایەتی وەئەستۆ گرتووە، ئاسۆی شێخ نوری یەکێکە لەکادرە دڵسۆز و پاکەکانی ڕێگای کوردایەتی، ئەمڕۆ لەڕێوەڕەسمێکدا قائیمقامی قەزای شارەزووری ناساند، ئەویش کاک ئەحمەدی مام نوری خەڵکی ئاوایی خوڵامی و سەربەتیرەی هارونییە، ناوبراو سەربەلیستی حزبی سۆشیالیستی کوردستانە.

ئەمڕۆ بۆ نیوەڕۆ میوانی کاک دارای روخزایی بووم، پاش نیوەڕۆ، چوومە شارۆچکەی عەربەت و دوای ئەنجامدانی هەندێک ئیشوکاری بانگەشە، چوومە شاری سلێمانی و لەگەڵ کاک قادری حاجی عەلی کۆبوومەوە، بابەتی کۆبوونەوەکە ئەوە بوو، مامۆستا عەزیزی حەمەئەمینی شاسوار بەرێوەبەری کراوی سەرۆکی شارەوانی، قەزای شارەزوور بگۆڕدرێ بە کەسێکیتر، ناوبراو چەندین ڕاپۆرتی لەسەر بوو، هەڤاڵانی کۆمیتەی ڕێکخستنی قەزاکەو زەڕایەنیش، لەنوسراوێکدا کە زۆربەیان واژۆیان لەسەر کردبوو، داوای گۆڕینی ئەو دانانی کەسێکی تریان دەکرد، بەمەرجێک ئەندازیار بێت، کاک قادرو برادەرانیش بەڵێنیان دابوونێ کەبیگۆڕن، منیش لەلایەن مەڵبەندەوە کرابوومە وەکیل بۆ گۆڕین یان هێشتنەوەی بەحوکمی ئەوە، بەندە بەرپرسیاری ڕاستەوخۆی بانگەشەکە بووم، کاک مەحمود سەنگاویش داوای لێکردبووم ئەوەندەی ئەکرێ و مەجال هەیە نەیگۆڕم.

کاک قادرم رازی کرد، بەهێشتنەوەی ناوبراو، ووتی بەڵام ئەگەر دەرنەچوو خۆت تەحامولی بەرپرسیاریەتی دەکەیت. لەڕاستیدا هەندێک لەڕاپۆرتەکان، بارگاوی بوو بوون بە دەستەو دەستەگەریەوە، ئەوە یەک،

دووەم ماوەیەک بوو ناساندبوومان و ئیشمان بۆ کردبوو، ئەمانە بوونە هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری گۆڕینەکەی.

دوای ئەوە لای کاک قادر دەرچووم، مزگەوتی قەزازەکانی شاری سلێمانی بەشداری ڕێوڕەسمی پرسەو ماتەمی هاوسەری خاڵە عەبالەی تەوێڵەییم کرد، خاڵە عەباڵە پیاوێکی کورد پەروەر بووە، لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا و لەشەڕی پردی زەڵم دابەشداری کردوە. ساڵی ١٩٨٤ پێشمەرگەیەکی پارتی بەچەکەوە پەیوەندی بەیەکێتییەوە کردبوو، لەسەر ئەوە هەڤاڵانی پارتی کەسوکاری پێشمەرگەکەیان بانگ کردبوو بۆ وشکەناو، پارەی چەکەکەیان لێ سەندبوون.

یەکێتیش چەند کەس لەکەسوکاری چەند بەرپرسێکی پارتیان بانگ کردبوو، بۆ ئەوەی نیوەی پارەکە وەرگرنەوە بۆ باوکی پێشمەرگەکە. یەکێک لەوانەی بانگ کرابوو، خاڵە عەباڵە بوو، خاڵە، خاڵی کاک حەمەی حەمەسەعید( حەمەی پورە هەمینە) بوو. کاکە حەمە ئەوکات بەرپرسی ناوچەی هەڵەبجەی پارتی بوو.

ئەو شەوەی مەفرەزەکەی یەکێتی خاڵەو چەندکەسی تری بانگ کردبوو، بۆ بەیانییەکەی گەیشتنە لای من، کاتێک چووم بەدەم خاڵە عەباڵەوە، چەند مەترێکمان مابوو بگەینە یەک، خاڵە ووتی ( حەمە گیان، خوزگە لە پردەکەی زەڵم، لەگەڵ حەمە گوڵەی بکوژرامایە و ئەم وەزعەم چاو پێ نەکەوتایە) مەبەستی شەڕی پارتی و یەکێتی و ئەم گرتن و بانگ کردنانە بوو. منیش دوای چاکو چۆنی و بەخێرهاتنی، دەربرین و ووتنی ئەو ڕستەیە وای لێکردم، لەباتی ئیجرائات، بەڕێزەوە ڕەوانەی شاری بکەمەوە.

بابچمەوە سەر باسەکەی خۆم، ئێوارە گەڕامەوە ماڵ، شەو لەگەڵ کاک ستاری مام کەریم باوکی مامۆستا جەوهەری هاوڕێی سەردەمی خوێندکاریم، سەردانی ماڵی دادە کوبرای دایکی شەهید وریا بیارەییمان کرد، هەرئەمشەو سەردانی ماڵی کاک بەختیار عەلی حەمە گیانەمان کرد، دواتر سەردانی ماڵی بەرزانی مامە ڕەشەمان کرد، دوای نیو کاتژمێر یەکێک بەرزانی بانگ کردە دەرەوە، کاتێک هاتەوە شڵەژابوو، کاک ستار پرسی چیە، شتێکڕوویداوە؟ ووتی نا، کاک ستار دووبارە پرسی ئەی چیە؟ ووتی تاکسیەک لەبەر دەرگا وەستاوە، دوو مەلۆتکەی بۆ هێناوینەتەوە، دەڵێت ئەوە

لەنەخۆشخانە لەدایک بوون، منالی ئێوەن. کاک ستار هەستاو چوو بۆ دیوەکەیتر، هاتەوە ووتی بابنێرین پورە دەوڵەت بێت، من سەیارەکەی خۆم نارد پورە هاتوو من و کاک ستاریش هەستاین و لەوێ دەرچووین. دواتر زانیمان منداڵە ساواکان دوانەن، کوڕ و کچێکە، پێشتر دایکیان جیابووەتەوە، نیوکاتژێر دوای لە لەدایک بوونیان ناردویاننەتەوە. ئەو دوو ساوایە ناو نران سایەو سان، کچێکی مامیان بەخێو و گەورەی کردون بەناوی هێرۆ، ئێستا گەورەو نەوجەوانن، هێرۆ بەدایکی خۆیان دەزانن.

ئەمڕۆ٢٠٠٠/١/٢٧ لە قەزای شارەزوورم، لەبارەگای کۆمیتە خەریکی ئیشوکار بووین، خەڵکو کادرو رێکخستن و عەشایەر، دێن و دەچن و هەرکەس سەرگەرمی کاری خۆی و برێک ئیشوکارەکانیش تێکەڵ و پێکەڵن، داواکاری جۆراوجۆر، ئێمەش لەکاری بانگەشەو هەڵبژاردندا بێ ئەزموون.

لە بارەگای کۆمیتە دەرچووین و لەئاواییی زەراییەنی کۆن لەماڵی کاک سەباح کۆبووینەوە لەگەڵ خزموکەس و کاریان و خەڵکی ئاواییدا، هەندێکیان نیگەران بوون لەیەکێتی و ئاشتمان کردنەوە، کاک سەباح دڵسۆزو تەقەلا و هیمەتی لەبەر چاوە بۆ ئەم هەڵبژاردنە، بۆ نیوەڕۆ میوانداری ئێمە و ئامادە بوانیشی کرد.

پاش نیوەڕۆ هەڤالانی کۆمیتە کۆبوونەوەیەکی جەماوەریی گەورەیان رێکخست بوو، لە ناو شاردا، بەشداریمان کردو ووتاری یەکێتیمان پێشکەش کرد. دوای بەشداری کردنمان لەکۆڕی دووپرسەو ماتەمی دا بۆ حاجی غەریب تەرخانی و عابد قادر تەوێڵەیی. دوای پرسەکان لەگەڵ کاک مارف ئاغای حسێن ئاغادا لەبارەگای کۆمیتە کۆبووینەوە لەگەڵ بەشێک لەخزمانی گەلالیدا، داوامان لێکردن پشتیوان و هاوکارمانبن لەم هەڵبژاردنەدا. شەو چوومە شاری سلێمانی و سەدانی ماڵی کاک بەختیار عەلی هەڵەبجەیم کرد بۆ سەرخۆشی بەهیەی خێزانی بەبۆنەی کۆچی دوای دایکیەوە.

ئەمڕۆ١/٢٨ لەقەزای شارەزوور بووم، هەڤالانی کۆمیتە و بازنەکانی هەڵبژاردن دوو کۆبوونەوەی جەماوەرییان رێکخستووە، بۆ شەمێرانییەکان و هەورامییەکان بەجیاجیا، کۆبوونەوەکان قەرەباڵغ بوون هەرچەندە من خۆم هەورامیم، بەڵام دۆستایەتی و تێکەڵاویم لەگەڵ شەمێرانییەکان زیاترە، کۆبوونەوەکەی ئەوانیش گەرمترو بەڵێنەکانیان زۆرتر جێگەی دڵنیاییە.

هەر ئەمڕۆ لە دوو کۆبوونەوەی تری جیاجیادا، کۆبوونەوە لەگەڵ بنەماڵەکانی حەمەجانییەکانی سەربەتیرەی گەلالی و بنەماڵەکانی شێخانی نێرگزەجاڕیدا. دوای قسە کردن و گوێگرتن و وەڵام دانەوە هەردوولا بەڵێنیاندا دەنگیان بۆ یەکێتی دەبێت. ئێوارە چوومە سلێمانی لەگەڵ کاک قادر کۆبوومەوە، داوایکرد بەنامەو بەپەیوەندی کردن و چۆن گونجا ئاگام لە خورماڵ و دەوروبەری بێت. شەو لەسلێمانی خەووتم و بەیانی بەفر شارو دەوروبەری پۆشی بوو.

ئەمڕۆ ١/٢٩ لەقەزای شارەزوورم، دوای بەسەرکردنەوەی بازنەکانی هەڵبژاردن و هەڤالانی کۆمیتەی ڕێکخستن، بەشداری کۆبوونەوەیەکمان کرد لەماڵی کاک سەلام گوڵپیدا، ئەو کەسانی بەشدار بوون زۆرتر خەڵکی ئاوایی گوڵپ و خورماڵ بوون، بۆیە داوام لەکاک سەلام کرد دوای کۆبوونەوەکە، ئەکەسانەی ناوم نوسی بوون لەسەر پارچە کاغەزێک گل بداتەوە. ٧ حەوت کەس مانەوە، ئەوانەم بەجیا جیا ڕاسپارد بچنەوە کۆمەڵگاکەی خورماڵ و لەوێ پەیوەندی بەخزم و کەسوکارو ناسیاوەکانیانەوە بکەن، داوایان لێبکەن دەنگ بەلیستی یەکێتی بدەن، نامەشم نوسی بۆ چەند دۆست و ناسراوێک. دۆست و خزمەکانی د فایق محەمەد گوڵپی، لەم کۆبوونەودا بوون و ئەوانەشیان سەربە پارتی بوون دەنگیان بەئێمەدا.

لەوێ دەرچووین و بەشداری کۆبوونەوەیەکی ترمان کرد، لەماڵە عامورەیەکاندا، هەر لەناو شاردا کۆبوونەوەمان کرد لەگەڵ سەرجەم ڕێکخستنەکان و لایەنگرانی سەر بەکەرتی ڕێکخستنی هەڵەبجەی تازەدا. دوای بانگی عەسر چووینەوە بارەگای کۆمیتەو قسەمان کرد لەسەر ئەو کێشانەی لەبازنەکاندا، دروست بووە.

شەو لە سلێمانی بووم، شەوکەتی حاجی حامدی دزڵیەیی میوانم بوو، باوا حاجی ئایزەشم لەهەولێر بووە هاتوەتەوە و ئەمشەو لامانە، تەمەنی ١٢٤ سەدوو بیست و چوار ساڵە باسی شەڕی سەرداره ڕەشید (عەباس خان) و هەورامان دەکات، داستانی شەڕی جەعفەر سوڵتان و دەوڵەتی ئێرانمان بۆ باس دەکات خۆی لەوشەڕەدا لەدەشتی ڕەوانسەردا بەشدار بووە، دەڵێت، ئەوکات ڕەوانسەر تەنها ئەو چاوگە گەورە ئاوە بووە کە ئێستا هەیە، ماڵی لێ

نەبووە، دەوروبەری چاوگەکە، جەنگەڵی داربی و بەردەمی تاچاو بڕکات زەل و توودڕک و پیزڵ بووە.

هەر ئەمشەو کاک بەرزانی حاجی ئەولەو کاک عادل کەریم، سەردانیان کردم، قسەمان لەسەر ئەوە کرد، کاک عادل سەردانی خزمانی خێڵی باوە بکات لەشارۆچکەی زەڕایەندا. چوونکە باوکی کاک عادل لەخێڵی باوەیە.

ئەمڕۆ ١/٣٠ کاک عادل کەریم هاتوو پێکەوە سەردانی شارەزوورمان کرد، سەرتای بەیانی بارەگای کۆمیتەی ڕێکخستنمان بەسەر کردەوە، دوای پرسینەوە و قسەکردن لەسەر بەرنامە کاری ئەمڕۆ، ئاگاداریان کردین مام وریای براخاس لەلای خزمانی خێڵی باوە چاوەڕێمان دەکات، لەگەڵ کاک عادل چووین بۆ شارۆچکەی زەڕایەن، مام وریا لەماڵی کوێخا ئەحمەد ریش سپی و براگەورەی خێڵی باوە، هەموویانی کۆکردبونەوە، قسەمان بۆکردن و دوای تەواو بوونی کۆبوونەوەکە، سەردانی خاڵۆ سەید عەبدولڕەحمانی سەید عەبدولڕەحیمی تاوەگۆزی کوڕەزای مەولەوی شاعیرمان کرد.

خاڵۆ سەید بەتەمەن و لەماڵەوە کەوتووە، نەخۆشیشە. سەرەتا هەواڵی مام جەلالی پرسی، منیش وەلامم دایەوە ووتم مام ساخ و سلامەت و ئینشائەلا تۆش باش ئەبیت. من زوو زوو سەردانی دەکەم. چوونکە قسەزان و داستانی زۆری لایە، پیرێکی خوێن گەرم، نەجیب وخۆشەویست. هەرجارێک سەردانی دەکەم دوای چاک و چۆنی وهەواڵ پرسینی مام جەلال، شعرێکی مەولەوی ئەخوێنێ، بۆنیوەڕۆ میوانی کاک عەبدولکەریم هەورامی بەرپرسی لقی کشتوکاڵی بووین، لێرە چاوەڕێی کاک مەحمود سەنگاویمان کرد، ئەمڕۆ بڕیارە کۆبوونەوەیەکی جەماوەریی فراوان ڕێکبخرێت، بۆ هەڵەبجەییەکان، سەنگاوی هات و بەشداری کۆبوونەوەکەمان کرد.

هەر ئەمڕۆ سەردانی ماڵی کاک ئەرکانە سورمان کرد، ئەو ماڵە نەورۆڵیانەی لەقەزای شارەزوورن بەشێکیان لێرە کۆبوووبوونەوە، دوای ئەم سەردان و بەسەر کردنەوەیە، سەردانی ماڵی کاک عومەری حاجی حەمە ئەمینی قاجریمان کرد، حاجی حەمەئەمین پیاوێکی دیار و ناسراوی تیرەی هارونی سەربە هۆزی جافە.

شەو چووینە سلێمانی لەگەڵ مام وریاو چەند کەسیتر سەردانی کاک قادری حاجی عەلیمان کرد، باسمان لەکێشەو گرفتەکانی بانگەشەکە و چارەسەرەکانیشی کرد.

ئەمڕۆ ٢٠٠٠/١/٣١ لە شاری هەڵەبجەم، لە هۆڵی بارەگای مەڵبەند، بەئامادە بوونی م. جەمال و هەڤالانی کۆمیتەی ڕێکخستنی هەڵەبجەو هەورامان، کۆبوونەوەیەک کرا لەگەڵ لقی ژنان و کەسوکاری شەهیدان. دوا بە دوای ئەو کۆبوونەوە، کۆبوونەوەیەکیتر کرا، لەگەڵ نوێنەرانی هونەرمەندان، خوێندکاران، وەرزشکاران و چەند ڕێکخراوێکی تردا.

هەر ئەمڕۆ کاک حەمەی فەرەج یاریدە دەری مام جەلال بۆکاروباری کۆمەلایەتیی و مامۆستا عەبدولمەجید یاریدەدەر بۆ کاروباری ئیسلامی و کۆمەڵێک کادرو خەڵکیتر سەردانی مەڵبەندیان کرد لە هەڵەبجە. لەگەڵیان کۆبووینەوەو ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ هاوکاری و پشتیوانی مەڵبەند، لەم هەڵبژاردنەدا.

پاش نیوەڕۆ سەردانی ئاوایی حەسەن (هەسەن) ئاوامان کرد، دانیشتوانی ئێرە زۆربەیان کەڵوڕن، کەڵوڕەکانی کوردستانی باشوور لەبنەچەدا سەربە هۆزی کەڵوڕی کوردستانی ڕۆژهەلاتن لە باشووری کرماشان. لێرە لە هەسەناوا یەکێک لەبنەماڵەکان بەناوی حاجی کەریم دۆست و ناسیاوی ماڵی باپیرم حاجی عەلی محەمەد بوون، من بیرم نایەت حاجی کەریم و حاجی ئامینی خێزانی هاتوچۆی دۆڵبیانیان کردوە، ماڵی باپیریشم لەهەورامانەوە هاتوون و گەنم و جۆیان لای ماڵی حاجی کەریم لەهەسەناوا بەباری وڵاخ بردوەتەوە بۆ دۆڵبیان.

کاتێک من لەدەرەوە و پێشمەرگە بووم، مامە حاجی عەبدلقادرم بۆی باس کردوم ئەگەر ڕێم کەوتە هەسەن ئاوا ماڵیان بدۆزمەوەو خۆمیان پێ بناسێنم، ئەیووت حاجی کەریم عەسکەری لیواکەی زەعیم سدیق شەهیدیان کردووە لەسەر کێڵگەی کشتوکاڵیەکەی، بەلام حاجی ئامینی هاوسەری گەورەی ماڵ و کوڕەکانی پیاوی باشن بچیتە ماڵی هەرکامیان وەک ماڵی خۆمانە، لەوانە: کاک عەلی، کاک شەوکەت کاک ئەحمەد، کاک ڕەزا، کاک جەبار، کاک حەمە و جەمال و برهان، حەلاویش کچی تاقەنەو خوشکیانە. لە هەسەن ئاوان ئەگەر

لێت قەوما یان لەو دەوروبەرە رۆژت لێ بووەوە، ئەوان ئەتوانن بەرۆژ پەنات بدەن.

هەروا بوو چووینە حەسەن ئاواو دۆزینمەوە، وابزانم سەرەتا ساڵی ١٩٨١ بوو، ئەوانیش ووتیان ئێمەش بەدواتا گەڕاوین، هەرکات پێشمەرگە رێگەی کەوتبێتە ئێرە هەواڵمان پرسیوی، لەوکاتەوە تێکەڵاویم هەیە لەگەڵیان و وائەمڕۆش هاتوم بۆلایان لەماڵی کاک جەبار کۆبوونەوەمان کرد، کاک شەوکەت و کاک عەلی و ئەوانی ترو کوڕو کوڕەزاو خوشکەزاکانیان هەمووی ئامادە بوون. داوام لێکردن دەنگ بەلیستی یەکێتی بدەن.

دوای کۆبوونەوەکە لەهەسەن ئاوا دەرچووین و لەهۆڵی پەیمانگا، لەناوشار، کۆبوونەوەیەکی فراوانمان هەبوو لەگەڵ خزمانی کۆکۆیی، لەم کۆبوونەودا، کەسوکاری شەهیدان، پێشمەرگەکان، ئەندامان و دۆستان و لایەنگرانی یەکێتی و خەڵکی بێلایەنیش، ئامادە بوون، ووتاری ئەمڕۆم لەم کۆبوونەودا، وەبیر هێنانەوەی خەبات و تێکۆشانی کۆکۆییەکان بوو لەڕابوورد بۆکوردایەتی، ئەو قوربانی و خوێنەی لەو پێناوەدا داویانە، ئەو ماڵوێرانی و دەربەدەری و زیندان و کۆچ و رەوەی چەندین جارەیان، لەوپێناوەدا.

ئەمڕۆ و دواجار لەماڵی حاجی حەسەنی دەرەشیشیدا کۆبووینەوە لەگەڵ دەرەشیشەکاندا و ئێوارە هاتینەوە بارەگای مەڵبەند، دەرەشیش دوو ئاوایین، سەرو خوارو ئەکەونە باکووری خۆرهەڵاتی هەڵەبجەوە، هەڵکەوتو لەپێدەشتی شارەزوورو هەوراماندا، پێکهاتەی عەشیرەتیان تێکەڵاوە، ئەوانەی هەر لەسەرەتاوە دەرەشیشیان بنیات ناوە، دکتۆر محەمەد عەلی سوڵتانی لەکتێبی، (ئیلات و تەوائیف)دا دەڵێت دەرەشیشیەکان کەمانگەرن و لەکۆنەوە لەلای کامیارانەوە رۆیشتون بۆ شاەزوور.

ئەمڕۆ ٢/١ /٢٠٠٠ لە هەڵەبجە بووم، سەرلەبەیانی دەرچووم بۆ قەزای شارەزوور، کاتژمێر ١٠/٣٠ دە و سی خولەک لەناو شاردا، کۆبوونەوەیەکی جەماوەریی فراوانیان بۆ رێکخستبووین، لەم کۆبوونەوەدا بەکورتی مێژووی خەباتی یەکێتی و هەڵوێستەکان و قوربانی دانەکانیم وەبیر ئامادەبوان هێنایەوە، باسی پرۆسەی هەڵبژاردنەکانی شارەوانییەکان و گرنگی و

ئەهمیەتی پرۆسەی دیموکراسیم لەکوردستاندا کرد، دواجار داوام لێکردن دەنگ بەلیستی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بدەن.

دوای کۆبوونەوەکە سەردانی بارەگای کۆمیتەمان کرد، بۆنیوەڕۆ میوانی کاک عەزیزی بەڕێوەبەری کارەبای شارەزوور بووین. پاش نیوەڕۆ کۆبوومەوە لەگەڵ خوێندکارانی سنووری قەزای شارەزوور، قسەکردن و کۆبوونەوە لەگەڵ ئەم توێژەی کۆمەڵ من لەزەتی لێدەبینم، بۆیە ماوەی ١/٣٠ یەک کاتژمێرو نیو پێکەوە بووین، پێکەوە باسمان لەخەباتی خوێندکاران و دەوریان لەهەردوو شۆڕشی ئەیلول و نوێدا کرد، لەگەڵ دەوری کاریگەریان لەڕابووردو ئێستاو داهاتودا.

دواتر لەگەڵ هەڤاڵانی بازنەکانی هەڵبژاردن دا نزیکەی ١٠ دە خێزانمان لە زەڕایەن و مەرکەزی قەزاکەدا بەسەر کردنەوە، زیاتر ئەوانە بوون گلەییان هەبوو لێمان. ئەوانە کەلێمان نیگەرانن لەسەر حەقن، داواکاریان هەبووە، لەرابردوودا ماندوو بوون، کوردایەتیان کردووە، ماڵ وێرانی و دەربەدەری و خوێنیان داوە. ئێستا کوردستان ئازاد و ئەوانیش چاوەڕوانی پاداش و هیچ نەبێت بەسەرکردنەوەن، خەڵک دڵپاکو سادەو بێ کینەن، بۆیە بەسەردانێک بێ ئەوەی داواکاریەکانیان جێبەجێ کرابێت ئاشت دەبنەوە.

ئەمشەو چوومە سلێمانی سەردانی ماڵی کاک جەمیل هەورامیم کرد و لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامیدا قسەمان کرد، بۆئەوەی بەیانی پێکەوە سەردانی تەوێڵە و بیارە و خورماڵ بکەین، هەر ئەمشەو وەلامیان داینەوە ئامادەن بۆ سەفەرەکە، نوێنەریشیان مامۆستا مەلا محەمەد وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی دەبێت، لەگەڵ چەند کەسی تردا، بڕیارە من و کاک جەمیل و مامۆستا جەمالیش هەرسێکمان بڕۆین.

ئەمڕۆ٢٠٠٠/٢/٢ لەسلێمانییەوە چووینەوە بۆ هەڵەبجە، لەبارەگای قائیمقام کۆبووینەوە، بۆ ئەوەی سەردانی تەوێڵەو بیارە بکەین، ئەوە داواکاری ئێمەیە، وەفدی هاوبەش بچین و لەگەڵ خەڵکدا کۆببینەوە، لەکۆبوونەوەکاندا بەخەڵک بڵێین ئازادن دەنگ بەهەرلایەک بدەن، کەس ناتوانێ بە تۆبزی کەس ناچار بکات بۆ ئەوەی دەنگ بەحزبەکەی بدات. چوونکە هێزی چەکداری بزووتنەوە لەوێن، هەڕەشەیان لەخەڵک کردووە نابێ دەنگ بەیەکێتی بدەن.

بەر لەبەرێکەوتن کۆبوونەوەکێ کورتمان کرد، لەبارەگای قائیمقامدا، ئامادە بوان لەبزووتنەوە، مامۆستا مەلامحەمەدی وەزیر، کاک جەمیل عەبدولڕەحمان قائیمقام، کاک نەجمەدین مەلامحەمەد بەرپرسی پۆلیسی هەڵەبجە و چەند کەسیتر بوون. کاک نەجمەدینی مەلا محەمەد، بەڕێوەبەری پۆلیسی هەڵەبجەیە لەسەر لیستی بزووتنەوە، زاوای خولێخۆش بوو مامۆستا مەلا عوسمانە، ئێمە لەڕێگەری مامۆستا کەریمی شێخ عەلی عەبابەیلێیەوە، قسەمان لەگەڵ کردبوو، داوامان لێکردبوو لەکاتی گرژی و ئاڵۆزیەکاندا، ئاگای لەوخەڵکانە بێت کەبزووتنەوە لەڕێگەی پۆلیس و یاساوە کێشەیان بۆدرووست دەکات بەناحەق، نەجمەدین خۆی پیاوێکی نەرمونیان و لەسەرەخۆیە، هاوکاری کردین، ئێمەش هاوکاریمان دەکرد، یەکێک لەو هاوکاریانە لەخانووەکانی قایمقامی هەڵەبجەدا بوو بۆمان تاپۆکرد، کەئەوە پێچەوانەی یاسابوو.

لە یەکێتی، کاک جەمیل، م .جەمال و من(حەمەی حەمەسەعید)، لەگەڵ چەند هەڤاڵی تردا. ئێمە لەڕێگەی ڕێکخستن و دۆستەکانمانەوە، لەهەر سێ شارۆچکەکەدا ئاگاداری خەڵکمان کردبوو، بۆسەردانی ئەو وەفدە هاوبەشە، مەبەستیشمان ئەوەبوو، لەزاری بەرپرسانی بزووتنەوەوە خەڵکەکە ببیستێ، کەچەکدارانی بزووتنەوە، ناتوانن زۆر لەکەس بکەن، بۆگۆڕینی رایان لەسەر هەڵبژاردنەکە.

سەرەتا لەمزگەوتی تەوێڵەدا لەگەڵ خەڵکەکە دانیشتین و مامۆستا مەلا محەمەد قسەی کرد، دوای پێشەکیەک سەبارەت بە ڕێککەوتنی یەکێتی و بزووتنەوە، باسی هەڵبژاردن و گرنگی پرۆسەکەی کردو ووتی، چۆن خەڵک لەهەڵەبجە لەسلێمانی ئازادە دەنگ بەهەر کەس و لایەک دەدات، ئاواش لەتەوێڵە لەبیارە لەخورماڵ ئازادە دەنگ بەکێ دەدات، هەر بەرپرس و چەکدارێکی بزووتنەوە تەداخول بکات سزا ئەدرێت، ئێمەش لەو بارەوە قسەمان کرد و چەند کەسێکیش لەخەڵکەکە قسەیان کرد، لەوێ گەڕاینەوە بۆبیارە.

لەبیارە چووینە بارەگای ناحیە، بەڕێوەبەری ناحیە بەخێرهاتنی کردین و مامۆستا لێرەش دەستی بەقسە کردن کردەوە، دوای قسەکانی مامۆستا، کوڕێکی خەڵکی بیارە بەناوی ستاری حەمە سەمینۆف، باسی هەڕەشەو

گورەشـەی چەکدارانی هێـزی دووی سـۆرانی بـزووتنەوە کـرد بەرامـبەر بەخەڵکەکە. ووتی ئێستا ئێوە گەڕانەوە ئەوان دارکاریمان دەکەن. قسەوباسی زیاتر لەو بارەوە کراو بزووتنەوە وەڵامیان دایەوە، ووتیان لەمەودوا وانابێت و قبووڵیان لێناکرێت. کۆبوونەوە تەواو بوو هاتینە خوارەوە بۆ شارۆچکەی خورماڵ.

لەخورماڵ لەبارەگای مەڵبەندی بزووتنەوەدا کۆبووینەوە، لێرەش بەهەمان شـێوەی، بیـارەو تەوێڵە قسـەو گفتوگۆ کـرا، لەم کۆبـوونەوەدا بەربژێـری سەرۆکی شارەوانی ئارام گوڵپی بەشدار بوو، بەنـاوی بەربژێری بێلایەن، ئارام ئێمە ژێر بەژێر پشتیوانیمان دەکرد، لە خورماڵ کەس نەی ئەوێرا خۆی کاندید بکات ئەوەش بەناوی بێلایەنەوە خۆی بەربژێر کردبوو، هەر ئازایەتی بـوو. ئێـوارە گەڕاینەوە بـۆ هەڵەبـجە، بریـارە بەیـانی پرۆسـەی دەنـگ دان کاتژمێر۸ هەشت دەست پێبکات.

ئەمــــرۆ ۲۰۰۰/۲/۳ لە قەزای شـــارەزوور و شـــارۆچکەی زەڕایەن دا لەنـزیکەوە چـاودێری بنکەکـانی هەڵبـژاردن دەکەم، کێشـەو گرفـت زۆرە پێشێلکاری هەیە، بەتایبەت لەهەڵەبجە لەخورماڵ لە سیروان لە بیارە، تەقە کردن بەسەر خەڵکداو لە هەندێک بنکەدا خەڵک لەژێر لولەی بی کەی سی و رەشـاش دا دەنگیـان ئەدا، هەنـدێک خەڵـک بەهـۆی ئەو بـارودۆخەوە هەر بەشداریان نەکرد.

ئەمـرۆ تـائێوارە، ئێـوارەش تـا بەیـانی نەخەوتـم، لەگەڵ هەڤـالان هەرلە پەیوەندی و چاوەڕێی ئەنجامەکان بووین، کاتژمێر ۷حەوتی بەیانی دەرکەوت لەقەزای شارەزوورو ناحیەی ورماوا (زەڕایەن ) لیستی یەکێتی سەرکەوتوە، لەگەڵ دەرچـوونی هەردوو سـەرۆک شـارەوانییەکە. ئەوکـات لەگەڵ هەڤـاڵ سەرتیپ سابیر چووینەوە بۆ ماڵ خۆیان و خەووتین.

ئەمرۆ۲۰۰۰/۲/٤ لەقەزای شارەزوورم، دوای نیوەڕۆ چوومە سلێمانی و سەردانی کاک عادل مورادم کرد، ئەوان سەرگەرمی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان بـوون، منـیش چـووم بۆمـاڵی مامۆسـتا جەمـال، لەهەڵەبـجەوە هـاتبووەوە، نیگەران بوو لەوەی لەوێ دەرنەچووین. منیش حسابی دەنگەکانم بۆکرد و پێم ووت لەوبارودۆخەی ئەوێدا، ئەو ژمارە دەنگەی یەکێتی سەرکەوتنە.

لەم هەڵبژاردنەی ئەنجومەنی شارەوانی و سەرۆک شارەوانییەکاندا، ئێمە لەسنووری مەڵبەندی شارەزووردا، لەم شوێنانەدا لەهەڵبژاردنی ئەنجومەن و سەرۆک شارەوانییەکاندا بـراوەین، تەوێـڵە، پێنجـوێن، گەرمـک، ناڵپـارێز، عەربەت، زەڕایەن و قەزای شـارەزوور. لەهەڵەبـجە، خورمـاڵ سـیروان و سەیدسادق دا دۆڕاوین.

. شـەو گەڕامەوە مـاڵەوە، لەتەوێڵەوە نزیکەی ٣٠ سـی هەڤـاڵ هـاتبوون بۆلام، کۆبووینەوەو بەخێرهاتن و سوپاس و دەس خۆشی گەرمم لێکردن، لە ڕاستیدا تەوێڵە شارۆچکەیەکی دابڕاو لەحکومەت و لە یەکێتی و پێشمەرگە، لەژێر ئەو هەموو هەڕەشەو زۆرو فشارەدا بردیانەوە بە بردنەوەیەکی ڕەها. جگە لەوەش بۆمن و کاک جەمیل سەرکەوتن و ڕەدکردنەوەی نـامەیەکیش بوو، نامەکە لەلایەن تێکۆشەرێکی دێرینی تەوێڵەییەوە نوسرا بوو بۆ جەنابی مـام جەلال، کە دڵنیـاێ ئەکـا یەکێتـی لە تەوێـڵە دەرنـاچین. ئەمە داسـتانی نامەکەیە:

کاتێک بەربژێر دیاری کران بۆ سەرۆکی شارەوانییەکان، ئێمە واتە من و کاک جەمیل هەورامی، بەڕاوێژ لەگەڵ مامۆستا جەمـالی حـاجی مـحەمەد و هەڤالانی مەڵبەند، لەگەڵ مەهدی بەرپرسـی فەرماندەیی هێزی پێشـمەرگەی هەورامان، لەگەڵ هەڤاڵ فەخرەدین عەبدوڵا و چەندین کەسی تردا، بڕیار درا دڵسۆز محەمەد سان ئەحمەد بەربژێری سەرۆکی شاروانی بێت بۆ شارەوانی تەوێڵە. بەهەموومانەوە ئیشمان بۆدەکرد، دڵنیـاش بـووین دەردەچێت، نەک ئەو، هەرکەسی تریش بەربژێری یەکێتی بووایە دەرچوونی زامن بوو، بەڵام کەسایەتیەکە لەزۆر و کەمی دەنگەکاندا دەوری خۆی هەبوو.

لەکـاتی گەرمەی بانـگ گەشـەکادا، ڕۆژێـک مامۆسـتا جەمـاڵ نـامەیەکی لەگیرفانی دەرهێنا و ووتی ئەونامە بخوێنەرەوە، منیش تەماشام کرد نامەکە هی کاک حاجی حەمەسالحی حـاجی فەرەجی تەوێڵەیە، حـاجی تێکۆشـەری دێرین و کادری چالاکی باڵی مەکتەبی سیاسی بووە لە شۆڕشی ئەیلولـدا. ئێستا ماوەو لە شاری سلێمانی نیشتەجێیە. بۆمام جەلالی نووسیوە، مامیش لەسـەر گۆشەی لای چەپی نامەکەوە بەهامش نوسـیویەتی مامۆسـتا جەمـاڵ بزانە ئەوە چییە؟

## ناوەرۆکی نامەکە

من دوای بینینی ناو واژۆی حاجی لەسەر نامەکە و خوێندنەوەی هامشەکەی مام جەلال، دەستم بەخوێندنەوەی ناوەرۆکی نامەکە کرد، بەکورتی کاک حاجی حەمەسالح لەسەر بەربژێر کردنی دڵسۆز محەمەد سان ئەحمەد بۆسەرۆکی شارەوانی تەوێڵە، لەنامەکەدا دەڵێت، ئەوپیاوە (دڵسۆز) دەرناچێت، من بەئەرکی خۆمی ئەزانم ئاگادارت بکەم، تەوێڵە دوو تایفەی گەورەن، هیچ کەس لەو دوو تایفە دەنگ بەدڵسۆز نادەن، چوونکە دڵسۆز ئەو دوو پیاوە، جەمیل هەورامی و حەمەی حەمەسەعید بەربژێریان کردوە، ئەوانیش هەریەکەیان پیاوێکیان لەو دوو تایفە کوشتوە، جەمیل وەستا تەوفیقی کوشتوەو حەمەش حاجی حسێن.

دیارە لای من ئاسایی بوو، حاجی وەک باوکم تەماشا دەکەم. خەزووری کاک مەلابەختیاریشە، کاک بەختیار رێزی تایبەتی هەیە لایمن، بەڵام لای کاک شەوکەتی کوڕی، کەپێشمەرگەی دێرین و هاوڕێی پێشمەرگایەتیمە، گلەییم کرد، ئەویش نارەحەت بوو، ووتی من لەباتی ئەو داوای لێبوردنت لێدەکەم، ووتم ئاساییە بەڵام هەر حەزم کرد ئاگاداربی حاجی ئەو نامەی بۆمام نووسیوە. کەناوەرۆکەکەی ڕاست نیە.

خوێنەری بەڕێز لێرەدا بەرگی دووەمی دەنگی خاک کۆتایی هات. چاوەڕوانی بەرگی سێیەمبن، بەرگی سێیەم بیرەوەریەکانمە، لەساڵی ٢٠٠٠ – ٢٠٠٥، بابەتە سەرەکیەکانی ئەم بەرگە جیابوونەوەی هێزی دووی سۆرانە لەبزووتنەوەی ئیسلامی و درووست کردنی جندول ئیسلام لەبیارە، ڕاگەیاندنی شەڕکردنیان لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانی و حکومەتی هەرێم، دواتر گۆرینی ناوەکەیان بۆ ئەنسارول ئیسلام و گۆرینی ئەمیرەکەیان لەعەبدوڵا شافعیەوە بۆمامۆستا کرێکارو دەست کردن بەوتووێژ لەگەڵ یەکێتیدا. شەڕەکانی ئەو دەمە تاڕووخانی عێراق، لەگەڵ یاداشتەکانی ڕۆژانەی خۆم، لەو پێنج ساڵەدا، بابەتە گرنگەکانی ئەو (٥) پێنج ساڵەی بەرگی سێیەمی دەنگی خاک دەبن .

لێرەدا بەشی بەڵگە نامەکان دێت، بەڵگەنامەکان بەشێوەیەکی ڕێکخراو دانەنراون، نوسراو نامەی ئاڵوگۆڕ کراو بەڵگەنامەکان لەئەرشیفی مندا زۆرزۆرن، لەبەر ئەوە وەک عورفێک بیرەوەری باشترە بەشی بەڵگەنامەشی لەگەڵدا بێت، بەشێکی کەم نووسراو بەڵگەنامەم داناوە، کەپەیوەندیان بەناوەرۆکی بیرەوەریەکانی ئەم بەرگەوە هەیە.

بەنیازم لەداهاتوودا لەو نوسراوەو بەڵگەنامانەی هەمە، بەتەنها خۆیان لەچوارچێوەی کتێبێکی ١٠٠٠ هەزار لاپەڕەییدا چاپ بکەم

برای زۆر خۆشەویستم کاک محمد حمەسعید
هیوام خۆشیتە،

خۆشەویستم لە دەوری بەری چەن نامەیەکم
نووسی بۆتان بەڵام لەبەر ئەوەی لەکاتی خۆیە
کەسی نەبوو بیگەیەنێ دوایی نەمنارد . وا
لەم نامەیەدا ئەم چەند دێرە پەشی دەکەمەوە
بەشکو ئەو نامەکەی پێشی بێتە . وە ئەمە تەنها
بۆ ئێوە نی یە بەڵکو بە لایەنەکانی تریشم دەوێ،

١- بەڕێز ئێستا وەکو جاران نی یە هەموو مالێک
چەند چەکێکی تیا بێ، دوو بەرەکی تادانێکی گەورە یە

٢- بەڕێز داوا ئەکەم لە ترسنۆکی کاتی
نەکەن . بەقوربان نەعیب نەبێتە دەڵێی
کەر دێ بە دێ گەڕوات بەڵام چاوی

بەگورگێ بکەوێتە گەڵی دا ئەدرێتە دەم
میز ئەکا بە فوویدا. بەرتیر پیاوی تیادا
ئەکوژرێتە بەلام ترسنۆکێ لە بەر دەرگای
هەرگەوتە را ئەوەستێ و چار جاریشی پێ
دەکەنێتە دیاروار چەوڕ ئەگلێنێ. دە
ئەو ئانەی کە زمان درێژن ئەکەن لە هەموو
مریەکان برائێن لەکا میانی تاپا لەتوپایاندا
گوللە کەوتوە تە تە نیشتیان دە خویان
ئامادە ئەکەن بو کوللەی سەر سنگیان.
برام ئەهات بە خەیاڵمدا لە شوێنانی ترشدا
ڕوو بدات نەک لە هەوارمان کە هەموو کات
شوێنی ئاسایش و ترس بووە. دە نێوە

لەپێش هەرکەس دڵسۆز بوون زۆر ناخۆشیان
لەبارەی دوو بەرەکی یەوە چێشتووە ئیتر
نابێت ماوە بدەن کەگێرە شێوێنی هەوڵ
بدات تازەی بکاتەوە .

خۆشەویستم هەموکەس دەبێت لەگەڵ
هەڤاڵانە بەشکۆ زۆر بەرزی لەژیانی
خۆی بکۆڵێتەوە وە نمرە بۆ کارەکانی
خۆی دابنێ . بۆ نموونە ئێستا جنایەتە
ئەگەر لەژیانی سیاسی خۆت بکۆڵیتەوە
کاری وات هەیە کە سەد نمرە بۆ خۆت
دائەنێیت بەڵام کاری واش لە خۆتا بەدی
دەکەیت کە هیچ نمرەیەکی بۆ دانانێیت

جا که‌ داته‌ ژیان له‌یه‌ك بار و دۆخدا نابێت
هه‌وڵ بده‌ ئه‌و كاره‌ بكه‌یت كه‌ پێشتر وژانت
ناسووده‌ بووه‌، من زۆر دڵخۆش بووم كه‌
قوتابیم له‌ یه‌كلیه‌تی ده‌ یاخود پارتی ده‌ یا
شیوعی ده‌ یان هه‌ر لایه‌نێكی تر بوبێت.
به‌ڵام ئێستا زۆر دڵ گرانم كه‌ ده‌بیستم
ناكۆكی له‌ نێوان ئه‌و پارتیانه‌دا هه‌یه‌
ئیتر ئه‌وه‌ی بووه‌ با ڕۆیشتبێت.
هیوادارم هه‌موو لایه‌نه‌كان
ترسنۆك ئازا نه‌كه‌ن و ماوه‌یان
نه‌درێت كه‌ دووبه‌ره‌كی بخه‌نه‌ نێوان
ئه‌و تێكۆشه‌رانه‌ی كه‌ پاشماده‌ی
شه‌هیدانن

برات یاسین عبدالرحمن ١٠/٦/٩٢

ژمارە / ١٧١
بەروار ٢٢/٢/

لە شێروانەوە

بۆ بەرپرسی بەڕێز

السلام علیکم

[illegible]

[illegible] ٦٥ [illegible]

برات
شێروان

شیروان ناوی خوازراوە ئەندام مەڵبەند بووە لای مەڵبەندی شارەزوور، لەژێرەوە کاری بۆ بزووتنەوە کردووە، بەخشنامەی ژمارە ٦٥ و نەوانی دواتری ناردووە بۆ بزووتنەوە، بۆئەوکەسەی کەناوی بەڵێنە ئەویش ناوی خوازراوە.

مجلس الوزراء
وزارة شؤون الشهداء و المؤنفلين
المديرية العامة لشؤون الشهداء والمؤنفلين - السليمانية
مديرية شؤون الشهداء والمؤنفلين / حلبجة الشهيدة

ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفال کراوەکان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوەکان / سلێمانی
بەڕێوەبەرایەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوەکانی : هەڵەبجە شەهید
(لیژنەی لێکۆڵینەوەی مەیدانی)

Kurdistan Regional Government
Council of Ministers
Ministry of Martyrs And Anfal Affairs
General Directorate of sulaimaniyah

ژمــــارە: ١٨٩٣

زایـــــی: ٢١/ ٧ / ٢٠١٠
کـــوردی /٣٠ / پوشپەڕ/ ٢٧١٠

**بـــۆ بـــەڕێـــز / لایـــەنـی پـەیـوەنـدیـدار**

بابەت// روونکردنەوە

بەڕێزان ئێمە وەك فەرمانگەیەکی رەسمی حکومی هەڵدەستین بە ئیش و کارەکانی شەهیدانی شۆرشی گەلی کوردستان ، لە ڕێگەی لیژنەی لێکۆڵینەوەی مەیدانی یەوە ، کەوا هەردوو لایەنی سیاسی ﴿ یەکێتی نیشتمانی و پارتی دیموکراتی ﴾ هاوبەشن لەو لیژنەیەدا بە بێ جیاوازی و [illegible] حزبی و سیاسی ، زۆر بێلایەنانە هەڵدەستین بە ڕاپەڕاندنی ئیش و کارەکانی سەرجەم وارسی شەهیدان ، کە بەڕێزتان هاوکارێکی باش بوون لە سەرخستنی ئیش و کارەکانمان ، بۆیە وەك چۆن لە ڕابردوودا هاوکارمان بوون ئاواش دەمانەوێ بێلایەنانەو بە گیانی هەست کردن بە لێپرسراوێتی وەك دوولایەنی دەسەڵاتداری سنووری هاوبەشەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ، بۆیە داوکارین لە بەڕێزتان زۆر بە وردی لە سەر چۆنیەتی شەهید بوونی ناوبراو ﴿ شێخ احمدی احمد شاوا ﴾ و هاوسەرکەی بە ناوی ﴿ عالیە ﴾ کە لە ساڵی ﴿ ١٩٨٧ ﴾ لە سیوان کوژراون و بۆ نەکولانەوەی ئەو کارەساتە و دروست نەبوونی کێشەی کۆمەلایەتی زانیاری زۆر وردمان بۆ بنێرن بە هاوکاری و هەماهەنگی هەردوولاتان و دیاری کردنی نوێنەرتان بە بەڵگەو دیکۆمێنت کە روونی بکەنەوە ، ئێمەش زانیاری بەڕێزتان ئاراستەی سەرووی خۆمان دەکەین . تکایە بفەرموون ..

لەگەڵ ڕێزدا........

ســــەرنـــج / تکایە داواکارین لە ماوەکی کورتدا وەڵامان بدەنەوە ، چونکە ماوەیەکی زۆرە فایلەکەی لەلامانە

وێنەیەك بۆ

سەعدون محمد صالح تامدار
بەڕێوەبەر

- بەڕێز : مەڵبەندی ٢٨ ی هەڵەبجەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان .
- بەڕێز : لقی ١٢ پارتی دیموکراتی کوردستان.
- دۆسیەی شەهید .
- دۆسیەی گشتی .

[redacted]

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

سکرتێری گشتی

الاتحاد الوطني الكردستاني

الأمين العام

Patriotic Union of Kurdistan
Secretary General

برا گیان کاکە حەمە بابەیری

سڵاوێکی گەرم

سوپاس بۆ نامەکەتان بەڵام ناتوانم
لێتانی بشارمەوە، کە من دوای
(٥٠) ساڵ خەبات لەگەڵتان دێمە وەڵامی بۆ
دیفاع لێتان، قەدری خۆم لای ئێوە زانی.

زۆر سوپاستان دەکەم چونکە ئازادی و
سەربەستی هەیە لەناو ی. ن. ک دا
بەڵام ئێستە تێگەیشتم (بیروبۆچوونم)
لەلای کێشکەی ئێوە چ بەترە! خواستم
لە سوڵتان محمود گەورەترە.

هەر بژی برابو
برای دێرینت
مام جەلال

٤/١١

یەکێتی نیشتمانیی کوردستان
سکرتێری گشتی
الاتحاد الوطني الكردستاني
الأمين العام

Patriotic Union of Kurdistan
Secretary General

براگیان، هەڤاڵ کاکە عومەری حەمە سەعیدی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادی و سەرکەوتنتان ئاواتە. هیوادارم زۆر حورمەتی بەبۆچوونەکانی هەڤاڵانی کارگێڕ و مەڵبەند بگرێت. هەروەها زۆر حورمەتی مامۆستا مەلا صدیق ئیش بگرێت وە لەگەڵ هەموو حزبەکان تەبا و هاوکار بێت

نامەکەتان گەیشت زۆر سوپاست دەکەم. پێیم خۆشە ناوبەناو لە بیروبۆچوونەکانتان ئاگادار بم. ئەمەش وەڵامی نامەکەتان:

١- منیش هاوبیرتانم کە مامۆستا مەلا عەلی بچینینەوە باشترە. چیتر زەعیف نەبێت باشترە. و دۆستمان بێت باشترە.

٢- ڕێزیم وەک تۆیە لەسەر کاکە مەلا صدیق ئیش.

٣- شێخ محەمەدی بەرزنجی پیاوی ئێران نییە. لیست ستێک نەچوو
دۆستی زۆر نزیکی منە. هاوکاری جیدی ئێمەیە.
دۆستی ی.ن.ک و زۆریش پەروشیا ئەزموونەکەیەتی.
بەرەوالەت هەڵمەتێکی ئێمەیە ڕاستی یەکێتی

٤- هەوڵ بکرێ لیار بچێتەوە ناو کۆمەڵ، ئەمەش لەلام قوناعەرا باشە
بەتایبەتی کە ئەو دۆستی شێخ محەمەدی بەرزنجی زیاترە.
بۆ ستی تریش بۆ دوا ڕۆژ هەرباشە لەوێ بێت.

٥- ئێران بەتەمای هاوکاری یەکێتییە؛ ئێران نیازی بووە
لە ئیسلامییە (سوننیەکان) و سەرنەکەوت لەگەڵیان.

ئێوە ڕێککەوتن نامەی موورکراومان هەیە لەگەڵمان (لەسەر داوای خۆشیان)
کە دەڵێ دەستوورەکان لەژێر دەستی ی.ن.ک دابن : ئەمەش
هەم بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایشی خۆیان وە هەم لەبەر ئەوەی
تووشتان باست کردووە .

٦- هاوکاری ئەوەمان لەگەڵ کۆمەڵ بەستووە بە ڕێککەوتن و
هاریکاری وە هاوکاریمان لەگەڵ ی.ن.ک .

٧- پێویستە پشت ئەستوور بە خوای بێ لەسەر ڕەوەی ی.ن.ک دا
بیروباوەڕی پێشکەوتووی گونجاومان لەگەڵ ڕەوتی گەشە کردنی کۆمەڵایەتی
خۆمان زۆر ماندوو بکەین بۆ ڕاکێشانی ① دڵی جەماوەر بەلای ی.ن.ک دا
② وە بۆ بەهێز کردنی ڕێکخستنەکانمان و ③ بۆ گەشەپێدانی
هێزی پێشمەرگەی کوردستان و (٤) بۆ بەهێز کردنی هێزی پشتیوان
ئەوانیش بە چەکدار کردنی ئەندام و دۆستی ی.ن.ک و خەڵک
لە ناوچەکەدا .

براگیانی کاکە حەمە هیوادارم هەموو کاتێک تۆ توانای خۆتان
تەرخان بکەن بۆ بەدیهێنانی ئەو چوار ئەرکەی سەرەوە
وە هەوڵ بدەن ببنە هێزێکی تۆکمە و گەورە و دەسەڵاتداری توانا .

سڵاوم بۆ هەموان و هەر بژی بۆ

برای دڵسۆزتان
مام جەلال

دووکان
٢٠٠١/١٠/٢٣



تەوێڵە ساڵی ٢٠٠٦



هەڵەبجە، بارەگای مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوو، بانگەشەی هەڵبژاردن، بۆ پارلەمان و سەرۆکی هەرێم ساڵی ٢٠٠٩



له ڕاستەوە : شێخ محمد بەرزنجی ، مام جەلال ، م. مەلا عەلی



له ڕاستەوە : م. مەلا عەلی ، عیماد ئەحمەد ، حەمەی حەمە سەعید ، قاسم مەلا مستەفا



شارەزوور گوڵە خانە، حەمەی حەمەسەعید لەگەڵ حەمەی حاجی مەحمود



سەرۆک کۆمار، بەڕێز د.فوئاد، لەهەڵەبجە ساڵی ٢٠١٥



سەردانی بەڕێز نوری مالکی سەرۆک وەزیرانی عێراق بۆ هەڵەبجە



لە ڕاستەوە خوالێخۆشبوو ئەحمەد چەلەبی، حەمەی حەمە سەعید،
ئەمریکا، نیۆیۆرک ١٩٩٩



هەڵەبجە: میوانداری تارق هاشمی لە ماڵی حەمەی حەمە سەعید ٢٠١٠



هەڵەبجە : میوانداری بەڕێز د.ئیبراهیم جەعفەری لە ماڵی حەمەی حەمە سەعید.



ژیوار حەمەی حەمەسەعید لەگەڵ بەڕێز مام جەلال لەهەڵەبجە ساڵی ٢٠٠٣



بەشێک لەهەڤاڵانی مەڵبەندی رێکخستنی شارەزوور، لەگەڵ شەهید شەوکەتی حاجی موشیر
ساڵی ١٩٩٨



دەستەی کارگێری مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوور ١٩٩٩



هەڤاڵانی مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوور ساڵی ١٩٩٩



حەمەی حەمە سەعید و بەرپرسی هێزەکانی ئەمریکا – هەڵەبجە



هەڵەبجە: ماڵی حەمەی حمە سەعید لەگەڵ هونەرمەند شوان پەروەر



سنە: جەلالی مەلکشاهی شاعیر ناسراوی رۆژهەلآت لەگەڵ حەمەی حمە سەعید



قەزای شارەزور حەمەی حمە سەعید لەگەڵ دەستەیک لە ڕێکخستنەکانی یەکێتی



هەڵەبجە: عەبدولباری جەلالی خێرخواز خەڵکی ماکۆ لەگەڵ کوڕوکچەکەیدا، میوانی مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوور بوو، نزیکەی 2 ملیۆن دۆلاری بەخشی بە هەڵەبجە، لەم سەفەرەیدا.




سەردانی بەڕێز عمار حەکیم و وەفدی هاوڕێی بۆ هەڵەبجە



**ڕێزلێنان لەپێشمەرگە دێرین ودانەبراوەکانی شارەزوور، لەڕاستەوە ئەکبەر ئێناخی،**
حةمة زياد، خةليل سةركانى، مةلا ئةحمةدى دزكةرةي،



**سلیمانی دیداری مەولانا خالد، لەڕاستەوە بارامی ولدبگی، حەمەی حەمەسەعید، دکتۆر سەباح بەرزنجی، مامۆستا مەلا قادری قادری**



سەردانی بەرپرسی ڕێکخستنی سوشیال دیموکرات لەباشووری سوید، بۆمەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوور لەهەڵەبجە



ئەمریکا نیۆیۆرک، هۆلی کۆبونەوەکانی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی، ساڵی ١٩٩٩ ناسراوەکان لەراستەوە: کوردەخان، د نەبەز، حەمەی حەمەسەعید



هەڵەبجە کتێبخانەی هەژار موکریانی، واژۆکردن لەسەر کتێبی دەنگی خاک



بانگەشەی هەڵبژاردن بۆ پەرلەمانی عێراق، لەڕاستەوە: عەتا سەراوی، ئەحمەد قدەفەری، حەمەی حەمەسەعید، م.ئەرکان حەسەن، د.بەختیار شاوەیس، ئەکرەم ئەحمەد



تەوێڵە: سەردانی وەفدی پارێزگاو مەڵبەندی شارەزوور بۆهەورامان



هەڵەبجە:ساڵی ٢٠٠٣ سەردانی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کۆڵن پاوڵ، لەگەڵ پۆڵ بریمەر حاکمی مەدەنی عێراق، بە ئامادەبوونی بەڕێزان مام جەلال، کاک مەسعود، د بەرهەم ساڵح



گوندی شێنێ: لەڕاستەوە عەبدڕەحمان مسلح، هاوار مەهدی، ساسان محەمەد، عەبدوڵا بۆر،ژیوار محەمەد، حەمەی حەمەسەعید، سەلاح دیلمانی



هەڵەبجە:ماڵی حەمەی حمە سەعید، ساسان لە باوەشی پڕ مهرەبانیدا



جگەرگۆشەکانم لە ڕاستەوە: دانیاڵ ، ژیوار، سەریال




جگەرگۆشەکانم لە ڕاستەوە: ساسان ، ساشا ، سەهەند



گوندی مێژوویی پاڵنگان، حەمەی حەمەسەعید وتوێژ لەگەڵ دادەیەک کە خەریکی درووست کردنی نانی هەورامیە



هەڵەبجە: گەڕەکی مامۆستایان، ساڵی٢٠٠٨ حەمەی حەمەسەعید لەگەڵ تیپی یاری تۆپ تۆپێنی منالانی گەڕەک



ئەمریکا: واشنتۆن بەردەم کۆشکی سپی لە ڕاستەوە حەمەمین حەمە کەریم، حەمەی حەمە سەعید، ئازاد باقی هەورامی



سلیمانی : حەمەی حەمەسەعید لەگەل یۆست هیلتەرمان نووسەری کتێبی شەڕی عێراق و ئێران و گازبارانی هەڵەبجە



طوندى ثـةرى هيـرؤ - حـةمـةى حـةمـة سـةعيـد لـةطـةلَ .



تێکۆشەری دێرین محەمەد حەبیب ناسراو بەحەمە کەلا، خەڵکی تەوێڵە پیاوێکی نەخوێندەوار بەڵام ژیرو شارەزا لەمێژوودا، خاوەن هەڵوێستێکی کوردانە لەهەموو بارودۆخە جیاجیاکاندا.



ولاتی سوید شاری ئۆپسالا، سەردانی قەڵای ئۆپسالا، بەردەم پەیکەری گوستافی یەکەم،
لەراستەوە: حەمەی حەمەسەعید، ئەسیرکوڕی شەهید کەیکاوس



هەورامان: حەمەی حەمەسەعید و دایکی غەریبە عەزیز
نەخشەی مەزارەکەی شەهید مەهدی برای پیشان ئەدا



ئەمەریکا - نیویۆرک - ساڵی ۱۹۹۹-
حەمەی حەمەسەعید، دکتۆر نەجمەدین کەریم، مامۆستا جەمال عەبدول



مامۆستا مەلا عوسمان رابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامی، ئیبراهیم رەشید

شەهیدی مەرحوم عەبەکەی وەهاب، ئەم شەهیدە سالی١٩٧٨ خۆی و ٦ شەش کوری هاتە شاخ، بەردەوام بوون تاراپەرین دوای راپەرین کۆچی دوایی کرد. دەزگای شەهیدان ناونوسیان نەدەکرد لەلیستدا، چومە لای سەرۆک مام جەلال بەسەرهاتەکەم بۆباس کرد، ووتی حەمەگیان عەبەکەی وەهاب شەهیدی مەرحومە نامەی دامێ و دەزگاش لەلیستی شەهیدان دا تۆماریان کرد.





لەراستەوە حەمەی حەمەسەعید، شەهیدی فەرماندەو قارەمان رەشید ئەحمەد ناسراو بەرەشەی ئەحەکوێر



حەمەی حەمەسەعید، شەهید شەوکەتی حاجی موشیر



شەهید کۆسار برای حەمەی حەمەسەعید



تێکۆشەری دێرین و پێشمەرگەی سەرتای شۆرشی ئەیلول کاک حەمید رەشاش، حەمەی حەمەسەعید



لەراستەوە شەهید شیروان ئەبوبەکر سۆسەکانی. شەهید نیازی عیزەت، حەمەی حەمەسەعید



لەراستەوە قوباد تالەبانی، شەهید مەهدی برای حەمەی حەمەسەعید



١٩٩١/٣/١٦ یەکەم یاد کردنەوەی سال رۆژی کیمیاوی باران کردنی شاری هەلەبجە، لە قەزای شارەزوور، مۆسیقا ژەنەکە دانا هەلەبجەییە



قەلا چوالان وەستاوەکان، مەلابێساران، سەرۆک مام جەلال، شەهید مەهدیە ریشە، حاکم هوشیار، خەلیل رێشاوی.
دانیشتوەکان، شێخ ئەنوەری شێخ فەرەج عەبابەیلێیی، عوسمان هەورامی حەمەی حەمەسەعید



ئەمەریکا- واشنتۆن- مۆزەخانەی فرۆکەو گەشتی هەوایی- سالی ١٩٩٩



کاک نەوشیروان مستەفا-- شەهید مەهدی



کاک عومەر فەتاح- حەمەی حەمەسەعید



کاک سەرحەدی خەلیفە- حەمەی حەمەسەعید



نووسەر لە چەند دێڕێکدا:

ناوی محەمەد سەعید عەلی، لەناو شۆڕش و خەڵکدا بە (حەمەی حەمە سەعید) ناسراوە.

لەدایک بووی ساڵی ١٩٦٢ لەگوندی دۆڵبیان سەر بەناحیەی بیارە، لەناوچەی هەورامان، سەر بەپارێزگای هەڵەبجە.

ساڵی ١٩٦٨ چووەتە بەر خوێندن لەپۆلی یەکی سەرتایدا لەقوتابخانەی سەرەتای سۆسەکان، لەئاوایی سۆسەکان تاپۆلی پێنجەمی سەرەتایی خوێندوە، پۆلی شەشەمی سەرتایی لەقوتابخانەی هەورامانی سەرتایی تەوێڵدا تەواو کردوە، دواتر چووەتە قوتابخانەی ناوەندی تەوێڵەو ساڵی ١٩٧٧ لە پۆلی سێیەمی ناوەندیدا بووە. هەمان ساڵ، واتە ساڵی ١٩٧٧ پەیوەندی ئەکات بە ڕێکخستنی کۆمەڵەوە، هەرهەمان ساڵیش بووەتە پێشمەرگە لە مەفرزە سەرەتاییەکان لەهەورامان سەربە هێزی پێشمەگەی کوردستان. لەناو مەفرەزەکەی شەهید ئەحمەد گریانەیی.

ساڵی ١٩٧٨ بووەتە فەرماندەی مەفرەزە لەکەرتی دووی هەرێمی یەکی شارەزوور-هەورامان،

لەساڵی ١٩٧٩دا خێزانەکەشیان، کەپێک هاتووە لەدایکی بەناوی غەریبە عەزیز بارام، باوکی سەعید عەلی مەولود، پێنج برا بەناوەکانی هادی، مەهدی، ئیقبال ، کۆسار، شیروان و سێ خوشک بەناوەکانی ئەدیبە، کوێستان چنوور، هاتوونەتە دەرەوەو بوونەتە پێشمەرگە. دوو برای مەهدی و کۆسار شەهید بوون، هاوسەری ئەدیبەخانی خوشکیشی بەناوی کەیکاوس حەمەڕەشید،

جێگری هێزی ٣ سێی هەڵەبجە، شەهید بووە، خێزانەکەیان تاسەرکەوتنی شۆڕش و ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ لەشاخ ماونەتەوەو هەموویان پێشمەرگە بوون. بنەماڵەکەیان خاوەنی ١٢ دوانزە شەهیدە

لە ساڵی ١٩٧٩ دا لەسەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا بەشدار بووەو پشتیوانی خەڵکی هەورامان و شارەکانی پاوەو نەوسوودی کردوە بەدژی هێزەکانی حەمەڕەزا شای ئێران لەگەڵ پێشمەرگەکانی یەکێتی لەوسەردەمەدا.

لە ڕێنوێنی کردن و فێرکردنی شەڕی پارتیزانیدا بەفەرمانی مام جەلال لە دوای سەرکەوتنی ئینقلاب و لەسەرەتای شۆڕشی کوردەکانی ڕۆژهەلاتدا بەشدار بووە.

ساڵی ١٩٨٠ بووەتە جێگری فەرماندەی کەرتی دووی هەرێمی یەک تاساڵی١٩٨٢.

ساڵی ١٩٨٢ بووەتە فەرماندەی کەرتی دووی شەهید ئەحمەد گریانەیی لە تیپی یانزەی هەورامان تا ساڵی ١٩٨٥.

لەساڵی ١٩٨٢ دا سەرەڕای ئەوە فەرماندەی کەرت بووە، بەرپرسیاریەتی کۆکردنەوەو ڕێکخستنەوەی ڕێکخستنێکی نهێنی لەقەزای هەڵەبجەو دەوروبەردا لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە پێ سپێردراوە، تایەککرتنەوەی کۆمەڵەو سۆرشگێران.

ساڵی ١٩٨٥ دوای پاشەکشەی هێزەکانی یەکێتی بۆ شارباژێرو قەرەداخ و دوای لێکدانی هەردوو تیپی ١١ی هەورامان و ١٥ی شارەزوور، گەڕاوەتەوە بۆ هەورامان و بنکەیەکی دروست کردوەتەوە، خۆی بووەتە لێپرسراوی بنکەکە بەناوی بنکەی شنروێ لەهەورامان، دووبارە ساڵی ١٩٨٧ لەگەڵ هەڤاڵەکانیدا بنکەکەیان کردووتە بناغەی تیپی ١١ی هەورامان و تیپەکەیان دروست کردوەتەوە، لەو ئەرکەشدا سەرکەوتنی بەرچاو بووە.

لە ساڵی ١٩٨٧ بەرپرسی ئەرکی گواستنەوەی٢٠٠٠ دوو هەزار پارچە چەک یەکیەتی لەئەستۆدابوە، لەئێرانەوە بۆ قەرەداخ، بەفەرمانی بەڕێز مام جەلال و بەسەرکەوتوویی ئەرکەکەی ئەنجام داوە لەبارو دۆخێکی دژوارو ڕێگاکانی پڕمەترسی و سەختدا.

ساڵی ١٩٨٧ دوای درووست کردنەوەی تیپی ١١ی هەورامان بوەتەوە بەجێگری تیپی یانزەی هەورامان.

لەساڵی ١٩٨٨داو لەکاتی گرتنی شاری هەڵەبجەو ناوچەکە لەلایەن ئێرانەوە بەهاوکاری پێشمەرگە، سەرەڕای ئەرکی پێشمەرگانەی بووەتە لێپرسراوی مەیدانی پەیوەندیەکانی یەکێتی و هێزەکانی ئێران.

لەکۆتای ساڵی ١٩٨٨دا بوەتە لێپرسراوی پەیوەندیەکانی یەکێتی و ئێران لەشاری مەریوان.

ساڵی ١٩٨٩ بووەتەوە بەفەرماندەی تیپی ١١ی یانزەی هەورامان. بەر لەڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ مەفرەزەی پارتیزان بووە لە ناوچەی قەرەداخ و شارەزووردا. ئامادەکاری کردوە بۆ ڕاپەڕین، ڕۆژی١٩٩١/٣/٧لەگەڵ هەڤاڵەکانی رابەرایەتی ڕاپەرینیان کرد لەشارەزووردا.

ساڵی ١٩٩٢ بووەتە فەرماندەی هێزی ٣ ی هەڵەبجەو شارەزووری هێزی پێشمەرگە.

ساڵی ١٩٩٣ دوای درووست کردنی سوپای یەککگرتوی کوردستان، بووەتە جێگری لیوای ٢٠ ی حکومەتی هەرێم سەر بە وەزارەتی پێشمەرگە بەپلەی لواء.

ساڵی ١٩٩٦ بەدواوە بووتە جێگری فەرماندەیی ٦ ی شارەزوور.

لە ساڵی ١٩٩٦ خوێندکاری دەورەی کۆلیجی سەربازی قەڵاچوالاندا بووە بەپلەی ئەقدەمی کۆلیژەکە .( بە هۆی ٣١ ئابەوە تەواوی نەکردوە).

سەرەتای ساڵی ١٩٩٨ بووتە جێگری لێپرسراویی مەڵبەندی شارەزوور.

ساڵی ١٩٩٩ بەشداری کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی کردووە لە ئەمریکا.

ساڵی ٢٠٠٠ بووەتە سەرپەرشتیاری مەڵبەندی شارەزوور.

ساڵی ٢٠٠١ بووەتە نوێنەری بەڕێز مام جەلال لە شارەزوور.

ساڵ ٢٠٠٣ بووەتە لێپرسراویی مەڵبەندی شارەزوور تا ساڵی٢٠١٢ .

ساڵی ٢٠١٢ بووەتە بەرپرسی مەکتەبی چاودێری و بەدواداچوون تاساڵی ٢٠١٩.

سالی ۲۰۱۹بۆ وەزیری وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان کابینەی نۆهەم، دەنگی تێکڕای ئەنجومەنی سەرکردایەتی یەکێتی بەدەست هێناوە.

ئەندامی کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە بووە. ئەندامی هەر چوار کۆنگرەکانی یەکیەتی بووە.

لە کۆنگرەی ۳ سێ دا هەلبژێردراوە بە ئەندامی سەرکردایەتی لە ڕیزبەندی ۱٤ هەمین کەسدا، لەکۆنگرەی ٤چواردا دووبارە هەڵبژێردراوەتەوە بەئەندامی سەرکردایەتی.

لەسالێ ۱۹۹۸ بەدواوە سەرەڕای بەرپرسایەتیە سیاسیەکەی ئەرکی بەرپرسی پەیوەندیەکانی مەیدانی هێزە ئیسلامیەکان و لایەنەکانی تری لەگەڵ یەکێتی و پێشمەرگەدا پێسپێدراوە لە سنووری پارێزگای ئێستای هەڵەبجەو شارەزووردا.

بەشداری زۆربەی شەڕو بەرگریەکانی کوردستانی کردوە، سەرپەرشتی و فەرماندەیی دەیان شەڕی گەورەو بچوکی کردوە، لەسەدان چالاکی جۆراو جۆردا بەشدار بووە. لەشەڕی دژی تیرۆریستانی جندل ئیسلام و دواتر ئەنسارول ئیسلامدا دەوری کاریگەرو بەرچاوی هەبووە.

لەزۆربەی هەڵمەتەکانی بانگەشەکانی هەڵبژاردنەکاندا، بۆ هەموو خولەکانی پەرلەمانی عێراق و کوردستان، بەرپرسی یەکەم بووە لەناوچەکانیی سنووری مەڵبەندی ڕێکخستنی شارەزوردا.

سەرەڕای کاری سیاسی و حیزبی پێشمەرگانەو ئەو سەرقاڵیەی لەوبارەوە بە تایبەت دوای ڕاپەڕین، کاری نووسین و وەرگێڕانیشی بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە کردووە، لەوبوارەشدا خاوەنی چەندین کتێبی وەرگێڕدراو و نووسراوە لەوانە:

۱-بیرەوەریەکانی تەیموری لەنگ ٦شەش جار لەچاپ دراوەتەوە.(وەرگێڕان)

۲-چیا نشینانی زاگرۆس ۳ سێجار لەچاپ دراوەتەوە . (وەرگێڕان)

۳-گەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی ئیسلام ٤چوار جار چاپ کراوەتەوە. (وەرگێڕان)

٤-حەسەن سەباح بەرگی یەک ٤چوار جار چاپ کراوەتەوە . (وەرگێڕان)
٥-حەسەن سەباح بەرگی دوو ٤چوار جار لەچاپ دراوەتەوە. (وەرگێڕان)
٦-پیاوێک لە لوتکەی مەردایەتیدا (نووسراو) ٢ دوو جار لەچاپ دراوەتەوە
٧-گازبارانی هەڵەبجە و ڕاستی ڕووداوەکە (نووسراو) چاپی یەکەم
٨-دەنگی خاک بەرگی یەکەم (نووسراو) ٢ دووجار لەچاپ دراوە
٩-دەنگی خاک بەرگی دووەم (نووسراو) چاپی یەکەم

ئەمانە و بەڕێوە بردنی سەدان کۆڕو کۆبوونەوە و چاوپێکەوتن و ووتارو نووسین و وەرگێران و بڵاوکردنەوەی هەیە، لەناو ڕۆژنامەو گۆڤارو تەلەفزیۆنەکان دا بڵاو کراونەتەوە.

کەمال نەجمەدین